# موقەدیمەی

# ئیبن خەلدون



عبدالرحمن ابن خلدون





بەرگی یەکەم

وەرگێڕانی: سەعید بەشیر

# موقەدیمەی
# ئیبن خەلدون

**بەرگی یەکەم**

نوسینی: عبدالرحمن بن خلدون
وەرگێڕانی: سەعید بەشیر

چاپی یەکەم
٢٠١٦

**لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە(٥٢٩)**

## ناسنامەی كتێب

- ناوی كتێب: موقدیمەی ئیبن خەلدون
- نوسینی: عبدالرحمن بن خلدون
- وەرگێڕی كوردی: سەعید بەشیر
- تـــایپ: هـــەوار جـــزا غفور
- بەرگ: فواد كەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٦
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەكەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردن(١٢٤٠)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە.**

ناونیشان:

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێرست

# پێشەکی

لەناوەڕاستی ساڵی٢٠١٣ زاینیدا برای بەڕێزم کاك فوئاد کەولۆسی خاوەنی چاپ و پەخشی ڕێنما پێشنیاری وەرگێڕانی پێشەکی ئیبن خەلدونی بۆکردم و نوسخەیەکی تەرجەمەکراوی فارسی دایە دەستم، منیش پاش ئەوەی کە بەشێوەیەکی وورد و بەپێی توانای خۆم دەستم کرد بەخوێندنەوەی و بۆماوەیەك سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەم شاکارە بووم. وەرگێڕی فارسی بەڕێز محمد پروینی گنابادی وەك خۆی باسی دەکات لەپاش لێکۆڵینەوەو بەراووردکردنی پێنج چاپی عەرەبی بۆماوەی سێ ساڵ، ئەم پێشەکیە دەستیکردووەتە وەرگێڕانی بۆسەر زمانی فارسی و بەندەش لەپاش خوێندنەوەی بۆم دەرکەوت کە تانەندازێکی باش لەلێکۆڵینەوە و بەراورد کردنەکانیدا سەرکەوتوو بووە، چونکە لەمکارەیدا چەندین سەرچاوەی تایبەت بەباتەکانی ئەم کتێبەی پەیدا کردووەو لەبەردەستیدا بووە، بەتایبەت کتێبە مێژوویی‌و زمانەوانیەکان کەزۆر بەووردی مانای زاراوە و وشەکانی کردووەو تانەندازێکی باش لەڕوونکردنەوەی چەمکە ئالۆزەکانی کتێبی ناوبراودا سەرکەوتووبووە، هەرچەندە زمانە فارسیەکەی دوولەسەر سێی وشەکانی عەرەبین، بەڵام خۆشبەختانە بۆمن کارەکەی ئاسانتر کردبوو. هەربۆیە بەندەش بەباشم زانی لەبری وەرگێڕانی یەکێك لەچاپە عەرەبیەکان ئەم چاپە فارسیە وەرگێڕمە سەرزمانی شیرینی کوردی و بتوانم خزمەتێك بەکتێبخانەی کوردی بکەم.

پێشەکی ئیبن خەلدون یەکێکە لەشاکارە بەنرخ و گەورەکانی زانستی و مێژوویی لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا کەبەشێوەیەکی گەورە و بەرفراوان و بۆیەکەمجار لەبارەی

فەلسەفەی مێژوو کۆمەڵناسی و بنەماکانی زانستە ئابووری و سیاسیەکانەوە دواوە. سەرەڕای ئەمەش، ئەم زاناگەورەیە باسی هەموو ئەو زانستانەشی کردووە کەلە سەردەمەکەی خۆیدا بوونیان هەبووە. هەربۆیە دەتوانین پێشەکیەکەی ناوبراو وەك ئنسکلۆپیدیایەك دابنێین بۆ زانستەکان لەو سەردەمەدا. لەم پێشەکیەدا ئیبن خەلدون شێواز وکارکردی پێشینانی خستووەتە بەر ڕەخنەوە و پێی وابووە کە مێژوونوس دەبێت نەك تەنها بەدوای ڕووداوەکانەوە بێت، بەڵکودەبێت هۆکارە کانی ڕوودانی ڕووداوەکانیش بەشێوازێکی زانستی شیکاری لێکۆڵینەوە بکات.

دەتوانین بڵێین کە پێشەکی ئیبن خەلدون لەگرنگترینی ئەو دانراوانەیە کە لەپێتەختی دەوڵەتی عوسمانیدا ناوبانگی هەبووە، و لەنێو پیاوانی دەوڵەتی ئیمپراتۆریەتی ناوبراودا یەکێك بووە لەو پەرتووکە بەنرخانەی کە موتالا کراوە و سود لەزانستەکانی وەرگیراوە. ئەم زاتە لەگەڵ ئەوەی کە دەریایەك بووە لەزانستەکان لەهەمان کاتیشدا لەماوەی تەمەنیدا جێگەی ڕێزو پێزانینی دەسەلاتداران بووە و چەندین پۆستی بالای لەدەوڵەت و سەڵتەنەتە جۆراو جۆرەکاندا وەرگرتووە، و لەم سەروبەندەشدا ڕووبەڕووی چەندین مەترسی بووەتەوە، کەدەتوانین بڵێین هۆکارێکی گەورەی کەمی بەرهەم یان لەناوچوونی زۆرێك لەشاکارەکانی ئەم زاتەیە بەدەر لەپێشەکی، چونکە سەرقاڵبوون بەسیاسەتەوە والەمرۆڤ دەکات کەنەتوانێت بەپێی پێویست لەبواری زانستدا قاڵ ببێت. زانایانی ئەورووپا تائەوکاتەی کە پێشەکیان نەبینیبوو پێیان وابوو کە ڤیکۆ یەکەمین کەسێکە کەلەفەلسەفەی مێژوودا باس و بابەتی نوسیوە و بەدامەزرێنەری ئەم زانستەیان داناوە، بەلام هەرکە پێشەکی ئیبن خەلدونیان بینی کەسێ سەدەو نیو لەپێش ڤیکۆوە لەبارەی فەلسەفەی مێژوەوە باس و گفتوگۆی کردووە بۆیان دەرکەوت کەئیبن خەلدون دامەزرێنەری ئەو زانستانەیە. وەهەروەها واشیان دەزانی کەیەکەمین کەسیش کەلەبارەی زانستی کۆمەڵناسیەوە دواوەو قسەی کردووە ئۆگوست کانت بووە کەبنەماکانی بەشێوەیەکی زانستی داناوە، بەلام لەپاش بلاوبوونەوەی پێشەکی لەوە تێگەشتن کە

ئیبن خەلدون چوارسەدەو نیو لەپێش کانتەوە ئەم زانستەی دامەزراندوە. وەهەروەها زاناکان ئەوەیان بۆ دەرکەوت کەزانایانی ئابوری و کۆمەڵناسی وەك ژان پاتیست سای و کارل مارکس و باکونین لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا باسیان لەم زانستانە کردووەو بەپێشەنگیان زانیوون لەزانستە ناوبراوەکاندا، زۆر لەدوای ئیبن خەلدونەوەن و ناوبراو لەسەدەی چوارەمدا باسی لەو زانستانە کردووە. هەربۆیە خوێندنەوەو تەرجەمەی پێشەکی ئیبن خەلدون بوویە جێگەی گرنگی زانایان و هەڵکەوتوانی ئەورووپا. یەکێکی تر لەتایبەتمەندیەکانی ئەم زاناگەورەیە بریتیە لەو شێوازە زانستیە پێشکەوتووەی کەلەباس و بابەتەکانی ئەم پێشەکیەدا پەیڕەوی کردووە بەتایبەت لەباسی مێژووی خۆرهەلات بەجۆرێك بەبێ ترس پەردە لەسەر هەندێك حەقیقەت لادەبات و ڕاستیەکان ئاشکرا دەکات و، لەگەڵ باسکردنی سەروەریەمێژووییەکاندا کەموکورتیەکانی مێژووی نەتەوەی عەرەبیش زۆر بوێرانە باسدەکات و لەهەندێك شوێندا بەڕاشکاوانە ئاماژەبەوە دەکات کە لەبەر زاڵبوونی دەشتەکیەتی بەسەر عەرەبدا ڕوویان لەهەرکوێ کردبێت تائەندازەیەکی زۆر بوونەتە هۆی وێرانی و، هەندێکجاریش هەوڵی لەناوبردنی دەستکەوت وکەلتوری گەلانی تریانداوە وەك هەرەمەکانی میسرو کۆشکەکانی کیسرای فارسی ئەمەش دەتوانین بڵێین زانستی ترین شێوازی نوسینە کەلەدێر زەمانەوە تاوەکو ئێستا لەبوارە زانستی و مێژووییەکاندا پەیڕەوکراوە.

چونکە ئەگەر بەوردی سەیرێکی مێژووی ئاین و مەزهەبە جۆراو جۆرەکانی خۆرهەلات بکەین بەگشتی و بەتایبەت مێژووی ئیسلام و نەتەوەی عەرەب دەبینین زۆربەدەگمەن یان هەرنەبووە نوسەرێك بتوانێت بوێرانە لەگەڵ باسکردنی سەروەریەکانی گەل یان نەتەوە یان مەزهەب یان مێژووی ئاینێکدا کەموکورتیەکانیش باسبکاتُ و بیانخاتە ڕوو، ئەم کارەش وایکردووە هەموو کایە مێژووییەکان چ دینی یان دونیایی پیرۆزیەك وەربگرن کە دەستی ڕەخنەو حەقیقەت گوتنی مرۆڤەکانی پێنەگات و بەرگی تقدیس و پیرۆزکردنیان بەبەردا بکرێت و ئەگەر دواتریش لەماوەیەکی دوور یان نزیکدا کەسانێك

هەڵکەون‌و بیانەوێت ئەو چەمکە هەڵانە ڕاستبکەنەوە هەوڵی کوشتن‌و لەناوبردنیان بدرێت‌و لەئاینەکاندا بەبێ باوەڕو لەمێژووشدا بەکەسانێك دابنرێن کەسوکایەتی بەمێژووی نەتەوەکەی خۆیان دەکەن، ئەمەش بەشێوەیەکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرا لەمێژووی خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا دەردەکەوێت. لەکۆتاییشدا دەمەوێت ئەوەبڵێم کەهیچ بەرهەمێك بەدەر نیە لەکەموکورتی‌و دەربازنیە لەڕەخنەو هیواخوازین کەیەزدانی مەزن هاوکارو پشت و پەنامان بێت بۆ کاری چاکە.

سعید بشیر مستەفا

٢٢ – ٨ – ٢٠١٤ زاینی

# پێشەکی وەرگێڕی فارسی

لە ئوردی بەهەشتی ساڵی (١٣٣٤)ی هەتاوی پێشنیاری ئەوەم بۆ کرا کە پێشەکی (ابن خلدون) وەرگێڕمە سەر زمانی فارسی. منیش سەرەڕای نەبوونی هۆکارگەلێکی پێویست و کەش و هەوای گونجاو، بەڵام پێشنیارەکەم پەسەند کردو لە خودا پاڕامەوە کە هاوکارو یاریدەدەرم بێت بۆ ئەوەی لەم ئەرکە گەورەیەدا سەرکەوتوو بم، چونکە لە دێر زەمانەوە حەزم لەم شاکارە گەورەیەی جیهانی زانستی ئیسلامی بوو. چەند جارێکیش هەندێك بابەتم لە شاکاری ناوبراو وەرگێڕابوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك پێم وا نەبوو لە وەها کتێبێکدا چەندین هەڵەی فراوانی تێدا بێتو لە نێو چاپە جۆراو جۆرەکانیدا هەڵەکان هێندە ئاشکراو دیار بن. هەر بۆیە سەرەتا دەستم کردە وەرگێڕانی ئەو پەرتووکەی کە (المطبعة الازهرية)چاپی کردبوو لە ساڵی (١٩٣٠)زاینیدا بڵاو کرابوویەوە، بەڵام هێندەی نەبردلەوە تێگەشتم ئەم چاپە هەڵەی تێدایە هەر بۆیە بێ وەستان دەستم کردە گەڕان بە شوێن چاپێکی تردا. ئەوەبوو چاپی (المطبعة البهيية المصرية)م بەدەست خست، بەڵام ئەم چاپەش بە دوور نەبوو لە هەڵەو جیاوازی زۆری لەگەڵ چاپی یەکەمدا هەبوو. دواتر چاپی (معربی)کە لە (مطبعة الكشاف)ی بەیروت چاپ کرا بوو بە دەستم گەیشتوو، سەیرم کرد ئەم چاپەش بە هەمان شێوەی چاپەکانی پێشوو جیاوازی تێدایەو تەنانەت هەندێك جاریش لە بەشەکانیدا چەندین دێڕی تێدا نەبوو، یەك دوو بەشیشی بە تەواوەتی تێدا نەمابوو. ئەو کات چاپی ڕاست کراوەی

(نەصری هورینی)کە لە ساڵی (١٢٧٤)کۆچی کرابوو بە دەستم گەیشت، بەڵام دەبینم ئەمیش بە هەمان شێوەی ئەوانەی پێشوو بەدەر نیە لە هەڵەو جیاوازی گەلێکی زۆری تێدایە. لەم کاتەشدا ئاگادار بوومەوە لەوەی کە ئەم پێشەکیە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی (فەرەنسی)و لە کتێبخانەی گشتیدا هەیە. هەر بۆیە بە خێرایی چوومە کتێبخانەی ناوبراو، بەڵام بە داخەوە دەبینم لە سێ بەرگ تەنها یەك بەرگی لەوێدا دەست دەکەوێت. پاش ماوەیەك ئەوەم بۆ دەرکەوت کە (باروندسلان)لەسەر چاپەکەی پاریس کە بە گرنگیدانی خۆرهەلاّت ناسانی فەرەنسی (کاترمر)لە ساڵی (١٨٥٨)ی زاینی لە سێ بەرگدا بڵاو کراوەتەوە و بەراوردی کردووە لەگەڵ چاپی (بولاق)و چەند دانەیەکی دەست نوسدا. منیش بێ وەستان کەوتمە هەوڵ و کۆشش بۆ بەدەستهێنانی چاپی بولاق و چاپی پاریس کە ڕاسترین چاپی میسریە.

هەر بۆیە چوومە کتێبخانەکانی ئەنجوومەنی سناو کۆلێجی ماف و چاپەکانی ناوبراوم بەدەستهێناو لە کتێبخانەی کۆلێجی ناوبراویشدا چاپی پاریسو بەرگەکانی تریش کە وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی فەرەنسی لەوێدا هەبوون. لەم کاتەدا کە یەك لەسەر سێی ئەم کتێبەم وەرگێڕابوو، بڕیارمدا ئەو بەشانەی کە وەرگێڕدراون لەگەڵ چاپی پاریسدا بەراوردیان بکەم و پێش تەواوکردنی وەرگێڕانەکە پاشماوەی کتێبەکە سەرەتا هەموو بەشەکانی لەگەڵ چاپی ناوبراودا بەروارد بکەم، لەپاشان دەست بکەم بە وەرگێڕان. هەندێك جار پاش ڕوو بە ڕوو بوونەوەی هەڵەو جیاوازی نامۆ لە پەراوێزی چاپی (الکشاف)دا بە شێوەی دەستنووس هەڵەکانم ڕاست کردووەتەوە. سەرەڕای ئەمەش پێڕستگەلێکم لەو هەلاّنەی کە لەو چاپانەی لەبەر دەستمدا بوون ئامادە کرد. کە وا دەکات خوێنەر بە دڵنیاییەوە پەی بە وشە ڕاستەکان بەرێت. ئەمەش چەند نمونەیەکن لەو پێڕستانەی کە بە شێوەی ڕاست و هەڵە خستومەتە ڕوو.

| هـەڵە | ڕاسـت | هـەڵە | ڕاسـت |
|---|---|---|---|
| فلايغرب | فلايعزب | بناله | بنائه |
| لايقام | لايقاوم | تلونت | تلوثت |
| دهاء | دهماء | السيمة | الشيمة |
| ابن الرفيق | ابن الرقيق | أبلة | ابلمة |
| اسندى | اسدى | مكسعة | مكسبة |
| الخارج | الخراج | تبعاله | بفعاله |
| مداثر | مداشر | الحصول | الحصون |
| بح | ثبج | غفلة | عفة |
| قد | ثم | اعمال | اعمار |

بەڵام لە چاپی پاریس کاترمر (المالح)ی بە شێوەی نوسراوی ناڕاست لە پەراوێزدا هێناوەو (المايح)یش کە هەڵەیە لە دەقەکەدا چاپی کردووە. لەمانە گرنگتر وشەی(سنت انجل)بە شێوەی (سمت الجبل)چاپکراوەو چەندین هەڵەو نوسراوی ناڕاستی تر. بەدەر لەمانەش لە چاپەکەی پاریسدا چەندین دەستەواژەو تەنانەت بەشی زیادەش دەبینرێت. ئەمانەش چەند نمونەیەکن لە جیاوازیەکانی چاپی ناوبراو لە کتێبی (دراسات عن مقدمه ابن خلدون)دەقاو دەق دەخەمە پێش چاوی خوێنەران:

١ – لە بەشی سێ یەم دوابەدوای بابەتی(ڕێگەی گەشتنی گەندەڵی بۆ ناو دەوڵەت)بەشێك دێت لەبارەی ئەوەی کە یەکەم بازنەی فەرمانڕەوایی وڵات فراوان دەبێت و دەگاتە لوتکە. ئەو کات قۆناغ بە قۆناغ بچوك دەبێتەوە و سنوردار دەبێت و سەرەنجام بەرەو تیاچوون و ڕووخان دەڕوات. (بەرگی دووەم، لاپەڕە ١١٤ – ١١٧).

٢ – لەسەرەتای بەشی شەشەمدا پێش بەشی (زانست و فێرکاری لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا شتێکی سروشتیە)بەشێك هەیە لەبارەی ئەندێشەی مرۆڤایەتیەوە. (بەرگی دووەم، لاپەرە ٣٦٣).

٣ – لە هەمان بەش و پاش بابەتی ناوبراو بەشێکە (لەبارەی ئەوەی کە ڕووداوە ئەقڵیەکان بە ئەندێشەوە دەگەنە کەماڵ).

٤ – وە لە پاش ئەم بەشە بەشێکی تر لە بارەی ئەقڵی ئەزموونی و چۆنیەتی ڕوودانی باسکراوە.

٥ – لەپاش ئەو بەشەش بەشێك لەبارەی (زانستە مرۆیی و فریشتەییەکان باسکراوە).

٦ – دواتریش بەشێکی تایبەت بە(زانستی پێغەمبەران)هاتووە.

٧ – وە هەروەها دواتر بەشێك (لەبارەی ئەوەی کە مرۆڤ بەشێوەیەکی خودی نەزانەو لە ڕێگەی بەدەستهێنانەوە دەبێتە زانا). نوسراوەکانی هەر شەش بەشی ناوبراو دوازدە لاپەرە لە بەرگی دووەم و لاپەرەکانی (٣٦٤ بۆ ٣٧٦)ی بۆ تەرخان کراوە.

٨ – لە بەشی شەشەمدا پاش بابەتی (زانستی کەلام) بەشێك هەیە لەبارەی (دەرخستنی حەقیقەت لە متشابە) لە قورئان و فەرموودەو بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەو بیدعەچیەکان. بەرگی سێیەم، لاپەرەکانی ٤٤ بۆ ٥٩).

٩ – هەر لەم بەشەدا لەپاش بەشی (دانانە فراوانەکان لە زانستدا دەبنە ڕێگر لە بەردەم فێربوندا) بەشێك هەیە لە بارەی بابەت و ئەو مەبەستانەی کە زاناکان پێیان باش نیە لەبارەیانەوە بنوسن و بێجگە لەوان بە باشتر دەزانن. (بەرگی سیّ یەم لاپەرەکانی ٢٧٤ بۆ ٢٧٨).

١٠ – لە هەمان بەشدا پاش بابەتی(زۆرترین زاناکانی ئیسلام لە نەتەوەکانی تری بێجگە لە عەرەب بوون) بەشێك هاتووە لە بارەی ئەوەی کە کەسێك لە ژینگەی عەرەبدا

پەروەردە نەبێت و زمانی عەرەبی نەزانێت، بۆ ئەم کەسە فێر بوونی زانستەکان بەزمانی عەرەبی دژوارە. (بەرگی سێ یەم لاپەڕەکانی ٢٧٤ بۆ ٢٧٨).

١١ – لە بەشی شەشەمدا لە پاش(مەلەکەی شیعرو شاعیری لە دەرئەنجامی لەبەرکردنی زۆرەوە بەدی دێت) بەشێکە بەناوی باسی قسەی ئاسایی و دروستکراوو چۆنیەتی لێزانی و بێ توانایی لە دروستکراودا. (بەرگی سێ یەم لاپەڕەکانی ٢٥١ بۆ ٣٥٧). بەدەر لەمانەش پێویستە ئەوە بزانین کە چاپی پاریس چەندین بابەتی زیادەی تێدایە کە لە چاپەکانی میسرو بەیروتدا ئەو زیادانە بوونیان نیەو گرنگترین بابەتی زیادەی ناوبراو دەتوانین لەم بەشانەی خوارەوەدا دەستبخەین. بەشی خەت، بەشی تەسەوف، بەشی سیمیاء "جادوو" بەشی ڕێزمان، سەرەڕای بەشی حەدیس لە چاپی پاریسدا جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ چاپەکانی میسرو بەیروتدا هەیە، ئیتر لە ڕوانگەی درێژەدان بە بابەت یان لە ڕووی ڕێکخستنی باسکردنی بابەتەکانەوە بێت. (دراسات عن مقدمە ابن خلدون لاپەڕەکانی ١١٤ بۆ ١١٦). بەو شێوەیەی کە تێبینی دەکرێت ئێستاکە زانایانی میسری ئاگاداری ئەم جیاوازیانە بوونەتەوە و بە گشتی باسیان لێوە کردووە. منیش لەم وەرگێڕانەدا هەوڵم داوە تاوەکو هەموو ئەم زیادانە وەربگێڕم کە لە هەندێك جێگەی کەمدا دەستەواژەی زیادەو یەك دوو بەشیش لە چاپەکانی میسردا دەبینرێت کە لە چاپی پاریسدا بوونیان نیە، هەروەك چۆن لە پێشەکی خودی دانەردا بەشێك سەبارەت بە پەرتووکی (فاس)لە پەراوێزی چاپەکانی میسردا هەیە، بە جۆرێك لە چاپەکانی پاریسدا ئەم بەشە نابینرێت. هەر بۆیە من ئەم زیادانەشم وەرگێڕاوە تاوەکو هیچ جۆرە کەم و کورتیەك لەم وەرگێڕانەدا ڕوو نەدات.

## چاپی دار الکتاب اللبنانی:.

لەپاش تەواو بوونی وەرگێڕانی فارسیو لەگەڵ چاپەکەدا لە دەزگایەکی چاپو بڵاوکردنەوە نوسخەیەکی چاپی نوێم کڕی کە لە ساڵی (١٩٥٦) لە لوبنان لە پێنج بەرگدا

چاپ کرابوو، لەم دواییانەشدا گەشتبووە تاران، بەڵام مەگەر لە کاتی چاپی فارسیەکەداو لە هەندێك جێگەدا سوودی لێ وەربگرن. ئەم چاپە بە کەمێك جیاوازیەوە بەرانبەرە لەگەڵ چاپی (بولاق)دا، بەڵام بەراورد نەکراوە لەگەڵ چاپەکەی پاریسدا، بەڵام لە ڕووی دیزاین‌و کاغەزو جوانیەوە لە هەموو چاپەکان جوانتر و لەپێشترە، بە تایبەت گرنگترین جیاوازیەکانی لە چاپەکانی تر، بریتی بوو لەو پێڕستە جۆراو جۆرانەی کە تێیدا بوو، وەك: پێڕستی بابەتەکان، پێڕستی ناوی پیاوان و ژنان، پێڕستی گەل و نەتەوەکان‌و ولآتان‌و خانەدانەکان، پێڕستی شارو شوێنە جوگرافیەکان، پێڕستی ئەستێرەو بورجە فەلەکیەکان، پێڕستی گیانلەبەران، پێڕستی گیاکان، پێڕستی کانزاو زێڕو زیوو بەردە بەنرخەکان، پێڕستی ناوی کتێبەکان، پێڕستی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە پیرۆزەکان، پێڕستی بابەتەکانی کتێبەکە. سەرەڕای ئەمەش بلآوکەرەوە هەموو سەرچاوەکانی سەبارەت بە "ابن خلدوون" بە عەرەبی و نا عەرەبیەوە ناساندووە، بەڵام بە داخەوە لەبەر ئەوەی کە دەقی کتێبەکە ڕاست نەکراوەتەوە، هەر بۆیە دەبینین هەمان ئەو هەڵانەی کە لە سەرانسەری بەشی جوگرافی‌و بەشەکانی تردا بوونیان هەیەو لە پێڕستەکاندا دووبارە بوونەتەوە، چەندین هەڵەی تریشیان بۆ زیاد بووە. هەروەك چۆن لە پێڕستی بابەتەکاندا وشەگەلێکی هەڵە (صونج)و (مسایج)وەك بابەتگەلێکی زانستی ناسێنراون و لە پێڕستی ناوی پیاواندا (ابن الرفیق)کە هەڵەی (ابن الرقیق)ە، بە کەسێکی سەربەخۆ لە قەڵەم دراوە.

هەروەها لە هەمان پێڕستدا (ساریە بن زنیم یکتن)هەمان ئەو ساریەیە کە لە حەدیسەکەدا قسەی لەگەڵ کراوە (یا ساریە الجبل)بە کەسێتر لە قەڵەم دراوە. وە هەروەها لە پێڕستی ناوەکاندا (عناق ابی بردە)بە کەسێك دراوەتە قەڵەم، ئەمە لە کاتێکدا (ابو بردە)لە هاوەڵانەو (عناق)کارێلەکەیەتی و چیرۆکەکەشی زۆر بەناوبانگە. هەروەها (کسری عبدالمسیح)دەبینین ئەمە لە کاتێکدا (کسری)ناوی (انوشیروان)ە و (عبدالمسیح)ناوی کەسێکی ترە. لە پێڕستی گەل و نەتەوەکانیشدا (جوکیە)بە هەڵە

کراوە بە وشەی (حوکیە)یان (شاویە)کە مانای (شوان)دەگەیەنێت لەناو ڕیزی گەل و هۆزو نەتەوەو خانەدانەکاندا دانراوە. لە پێڕستی شارەکان و شوێنە جوگرافیەکاندا پێکهاتەی (کما مر)بە مانای ئەوەی کە ڕابورد (کنباص)بە مانای ڕێنمای شارەزاو (یسامت)بە هەڵە بە (یسامث)چاپ کراوە لەسەر شێوەی (یسامث اشبونة)کە ناوی شارەو لە پێڕستی ڕوەکەکاندایەو وەك هەنگوین و گولاْو لە بەشی گیاکان دانراوە. لە پێڕستی کانزاکاندا (شبرم، عرطنثیا، عشر، لاعیة، مازریون، فلجلشت، فربیون، ماهودانة)ئەمانە هەموو لە بەشی گیا پزیشکیە بەناوبانگەکانن کە لە ڕیزی بەردە بەنرخەکاندا هاتوون.

## هۆکاری بوونی هەندێك لە هەڵەکان:.

زۆرێك لە ڕاستکەرەوەکان کە شارەزای تێڕوانین و شێوازی بیرکردنەوەی دانەرەکان نەبوون هەروەك مەسەلە بەناوبانگەکە دەڵێت (شغلتنا) یان کردووە بە (شدرستنا). بۆ ڕوون بوونەوەی بیری خوێنەران ئەوە بە یاد دەهێنمەوە کە "ابن خلدون" لە شێوازی تێڕوانینی خۆیدا پابەندی ڕەهای هەندێك یاساو ڕێسا نەبووە، واتە لە بارەی فیعلە (مزید فیە)یەکان کە سەماعین‌و، هەرکەسێك ناتوانێت هەر فعلێکی موجەڕەد بباتە ناو یەکێك لە بابەتەکانی مەزیدو فیهیەوە. ابن خلدون وەك زۆربەی نەتەوەکانی بێجگە لە عەرەب سەرچاوەگەلێکی سەبارەت بە بابەکانی مەزیدو فیهی بۆ چەند مانایەکی تایبەت بەکار هێناوون، بەتایبەت ئەم کە دامەزرێنەری زانستێکی نوێ بووە و زانستی کۆمەڵناسی‌و سۆسیۆلۆجی بۆ یەکەمجار نووسیوە. زۆر پێویستی بە وشەو دەستەواژەی تازە هەبووە، هەروەك چۆن بۆ نمونە لە مەسەلەی بابەتی(قۆناغی پیری و داڕووخانی دەوڵەت)(لاپەڕە ١٧١ چاپی الکشاف)وشەی (تخلق)ی بە مانای کۆن بوون و هەڵوەرین لە گەڵ وشەی (هرم الدوله وتخلقها) واتە پیر بوونی دەوڵەت و داڕمان و هەڵوەرینی بەکار هێناوە، چونکە تەنها فیعلی موجەڕەدی (خلق)لە بابی (تفعل)و بە مانای کۆن بوون نەهاتووە، بەڵکو لەم بابەدا هەڵگری ماناگەلێکی ترە کە گونجاو نیە لەگەڵ ئەم پلەو مانایەدا. لە

چاپی (ب)و لاپەڕەی (١٢٠)و هەندێکی تر لە چاپەکان لە بری (تخلقها)بە شێوەی (تخلفها)چاپ کراوە، ئەمە لە کاتێکدا شێوەی پێشوو گونجاوترە.

هەروەها لە لاپەڕە (٤٨٠)ی چاپی (ك)دا وشەی (تنقیل)ی بەمانای (نقل)بەکار هێناوە، کە لە بەرگێراوەی (کتب)بێت، چونکە بابی (تفعیل)(نقل)بەم مانایە نەهاتووە. لە چاپەکانی (ب)لاپەڕە (٣٣٦)و (أ)لاپەڕە (٤٠٢)لەبری تنقیل (تلقین)چاپ کراوە. ئەمە لە کاتێکدا شێوەی دووەمیان بەهیچ جۆرێك گونجاو نیە بۆ ئەو مانایە. سەرەڕای ئەمانە "ابن خلدون" (انحفظ)و (کسب)ی بەکارهێناوە کە بەشێوەیەکی قیاسی فیعلی (حفظ)ی بە (انفعال)و (کسب)ی بە (تفعیل)قیاس نەکراوە، بەڵام دانەر هەروەك چۆن ئاماژەمان پێکرد لەم جۆرە شوێنانەدا شێوازی دەستەواژەی خۆی بە باشتر زانیوە لەم یاسایانەو کاری لەسەر فەلسەفەی بردنی بابەتەکانی موجەڕەد بۆ مەزید کردووەو، لە هەوڵی فراوانکردنی زاراوەکاندا بووە. هەروەها دانەر لە بابەتی زانستی کۆمەڵناسیدا چەندین جار وشەی (حاجی)بە شێوەیەکی داهێنەرانە بە مانای شارنشین لە بەرامبەر وشەی گوند نشینانەوە بەکار هێناوە، بە دڵنیاییەوە وشەی ناوبراو پێشتر بەم مانایە بەکار نەهێنراوە، هەرچەندە بە شێوەیەکی قیاسی هەڵە نیە، چونکە (حاجی)ئیسمی فاعیلی (حجابا لمکان)ە واتە (پەردەیەك بۆ شوێن). هەندێك جار هەڵەکانی ناوبراو لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە کە کۆپی کاران و ڕاستکەرەوەکانی پێشەکی ئاشنای شێوازی دەستەواژەی دانەر نەبوون، بە تایبەت کە دانەر ئاشنایيەکی تەواو و گشتی سەبارەت بە یاساکانی ڕەوانبێژی و زمان پاراوی عەرەب هەبووە و لە نوسەرە بە تواناو بلیمەتەکانی عەرەب هەژمار کراوە و لە قسەی کورتدا کار دەگەیەنێتە جێگەیەك کە لە هەندێك شوێندا چەندین بەشی یەك مێژوو لە چەند دەستەواژەیەکدا زۆر بە شێوەیەکی گوشراو باس دەکات، هەندێك جاریش ئەم کورتکردنەوەیە کەم و کورتی تێدا دەبێت و لەم ڕووەوەیە کە (دسلان)[1] لە هێنانی ئاوەڵناوی زۆرو ئەم جۆرە کورتکردنەوەیە سکاڵای کردووە، بەڵام

---

[1] وەرگێڕانی دسلان، بەرگی یەك لاپەڕەکانی (١١٢ و ١٧٩).

هەندێك لە نوسەرانی میسری قسەکەی (دسلان)ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن: دژواری و ئاڵۆزی وەرگێڕانی دسلان لە هەموو جێگەیەکدا پەیوەست نیە بە دەقی بنەڕەتیەوە.[٢] ئەڵبەت ناتوانرێت ئینکاری ئەوە بکرێت کە دسلان هەندێك جار ئایەتی قورئانی وەك دەقی کتێبەکە باس کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە وەرگێڕانی پێشەکیدا وردەکاریەکی زۆری کردووە، بەڵام پێشەکی ابن خلدون خاڵی نیە لە (ئیجازی)کەم و کورت و (اطنابی) تاقەت پڕوکێن.

بە هەرحاڵ توانای دەربڕینی دانەر ئینکاری نەکراوە، بە تایبەت کە ئەو دیباجەی کتێبەکەی لە لاپەڕەی یەکەمەوە تاوەکو لاپەڕەی شازدەی وەرگێڕانەکە واتە تاوەکو (پێشەکیەکەی)بە شێوەی پەخشانی مەسجەعی ئەندەلوسی نوسیوە، کە لەگەڵ پەخشانی مەسجەعی وڵاتانی تری عەرەبی زمان یان پەخشانی خۆرهەڵاتدا جیاوازیان زۆرە. واتە لەم شێوە پەخشانە مەسجەعیەی دووەمدا ڕستەی دوو بە دوو هاوتەریب و هاوشان نین، بەڵکو هەندێك جار بیست وشە خاوەن یەك مەسجەعن و دانەر لە وەها دیباجەیەکدا زۆری لە خۆی کردووە بۆئەوەی شێوەی دژواری بیرو ئەندێشە نوێکانی خۆی لە بارەی زانستی کۆمەڵناسی و ڕەخنە لە مێژووەکانی ڕابووردوو پێویستی شیکاریو بەشکردنی ڕووداوەکان و باسکردنی هۆکارەکانیان بخاتە ڕوو، لە کۆتاییدا بە شێوەیەکی زۆر مامۆستایانە دەری بڕیون. کەواتە پێویستە ئەوە بە بیر بهێنمەوە لەبەر ئەوەی کە پەخشانی پێشەکی ابن خلدون بە زمانی عەرەبی مەغریبی (ئەندەلوس و ئەفریقا) بەزۆرێك لە دەستەواژەکانی بۆ ئەو کەسانەی کە زیاتر لە دەقەکانی خۆرهەڵاتدا ڕۆچوون ڕوون نیە. بارون دسلان وەرگێڕی پێشەکی بۆ سەر زمانی فەرەنسی لەبەر ئەوەی ئاشنایی لەگەڵ زمانی عەرەبی شێوەزاری (الجزیرە و مراکیش)دا هەبووە، زۆرێك لەم کێشانەی چارەسەر کردووە. (منیش لە پەراوێزدا ئاماژەم بە هەندێکیان کردووە).

---

[٢] ابن خلدون حیاته و تراثه الفکری .

لەم ڕووەوە بەڕاستی پێویستە ئەوە بڵێین کە سێ بەرگی وەرگێڕانی (دسلان)بە تایبەت کتێبی (قوامیس العرب)لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا سودێکی باشی لێ وەرگیراوە.

سەرەڕای ئەمەش نووسەران و ڕاستکەرەوەکان ئاگاداری ئەم خاڵە نەبوون کە وشەو زاراوە وەك هەموو کارو بارە کۆمەڵایەتیەکانی مرۆڤ ڕووبەڕووی گۆڕانو دەستکاری کردن دەبنەوە، لەم ڕووەوە زانایانی زانستی زاراوە نەك تەنها زمان و زاراوەی یەك وڵاتو سەردەمێك دەخەنە ژێر لێکۆڵینەوەوە بۆ ئەوەی ماناو زاراوەکانیان لە هەر ڕوویەکی ئەو سەردەمەدا بدۆزنەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو وشەو زاراوەیەی کە نوسەر یان شاعیرێك لەسەردەمێکی تایبەتدا بەکاریان دەهێنێت، لەوانەیە لە ڕووی ماناو دەستەواژەوە لەگەڵ وشەو زاراوەی هاوچەرخەکانیدا لە هەمان سەردەمدا جیاواز بێت. هەر بۆیە بە پێویستی دەزانن کە فەرهەنگگەلێکی تایبەت بە هەر شاعیرو نووسەرێك بنوسرێت تاوەکو خاڵی ئاشنایەتی لەگەڵ زمان و دەستەواژەی تایبەتی هەر یەکەیاندا پەیدا بکەن. هەروەك چۆن بۆ نمونە ابن خلدون وشەی (عمران)ی کە بە کورتی مانای ئاوەدانی دەگەیەنێت بە مانا کۆمەڵایەتیو گشتیەکەی بەکاری هێناوە، یان لە وشەی (عصبیت)مانایەکی فراوانی بۆ هێناوە کە لە ڕاستیدا لەگەڵ ڕێکخستنە حزبیەکانی سەردەمی هاوچەرخدا جێ بە جێ دەبێت، هەرچەندە ئەم چەمکە سەرەتا لە دەسەڵاتی هۆزو تیرەی سەرۆك هۆزە دەشتەکیەکانەوە دەست پێ دەکاتو، گشتاندنی بۆ دەکات لە هەر دەسەڵاتێکی تاك لە کۆمەڵگەدا بەکاری دەهێنێت، ئیتر ڕەگەزی بێت یان ئایینی یان سیاسی، وە هەروەها پێی وایە کە هیچ بانگەوازێکی ئایینی یان سیاسیو هیچ جۆرە بزوتنەوەو گۆڕانکاریەك لە کۆمەڵگەدا بەبێ وەها دەمارگیریەك بەدی نایەت. هەروەها ئەو وشەی (ابنیە)ی بە مانای خێوەتو کارگەکان لەبری باڵەخانەو خانوو بەکارهێناوەو شتە لاوەکیە خودیەکان بەمانای یاساو ڕێسای زانستێك بەکاردەهێنێت، وەهەروەها سەبارەت بە وشەی (خلافت)(خلافیە)بەکار دەهێنێتو وشەکانی (حد ثانیة)کە ابن جوبەیریش بەکاری هێناوە بە مانای هەواڵە غەیبیەکان بەکاری دەهێنێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا دەکرێت هۆکارێکی

تر لە پەرتووکی هەر نووسەر یان شاعیرێکدا کاریگەر بێت و پەیوەندی بە هیچ کام لەو هۆکارانەوە نەبێت کە باسکران، بەڵکو پەیوەستە بە گۆڕانی فیکریو تێڕوانینی خودی نوسەرەوە، کە بریتیە لەوەی ئێمە لەم سەردەمەدا دەبینین کە پیشەسازی چاپ لە ئارادایەو بەرهەمی نووسەرو زاناکان چاپ دەکرێت و پاش ماوەیەك تێڕوانینی نوسەر لە هەمان ئەو بابەتانەی کە نوسیونی دەگۆڕێت، وە بیرو هزری نوێ تری لەلا گەڵاڵە دەبن‌و لە چاپی دواتری بەرهەمەکانیدا بیرو فیکرە نوێکانی بە چاپ دەگەیەنێت.

لەسەردەمانی ڕابووردوودا کە بەرهەمی نوسەران دەست نووس بووە دیسانەوە ئەم تایبەتمەندیە بوونی هەبووە، بۆ نمونە دانەر لە پەرتووکەکانی دواتری دانانەکەیدا بە دڵنیاییەوە چەندین گۆڕانکاری دەکردو دەیخستە بەردەم قوتابی‌و خەت خۆشەکانەوە. دەبینین لە ئەنجامدا هەموو ئەم جیاوازییە دروست دەبێت. هەر بەو جۆرەی کە لە ناو وەرگێڕانی بارودۆخی دانەردا دەیبینین، کاتێك لە میسر ژیاوە لەبەشەکانی سەرەتادا گۆڕانکاریگەلێکی کردووە، هەر بۆیە ناتوانرێت بە شێوەیەکی بە بڕشت جیاوازیەکانی پەرتووکە دەستنووسە کۆنەکان کە دواتر بمانەوێت‌و نەمانەوێت چاپی تریان لەسەر دەکرێتەوە، ئۆباڵی ئەم جیاوازیانە بخەینە ئەستۆی نووسەرو خۆشنووس‌و ڕاستکەرەوەکان، بە تایبەت کە گروپی سێیەم ئاشنایەتیان لەگەڵ شێوازی ڕاستکردنەوەی زانستیدا نەبووە.

### ئیبن خەلدون و نەتەوایەتی عەرەب:.

بابەتێکی گرنگ کە لە پێشەکیەکەدا سەرنجمان ڕادەکێشێت. بریتیە لەوەی کە ئیبن خەلدون لە چەند بەشێکدا نەتەوەی عەرەبی بە بەراورد بە گەل و نەتەوەکانی تر بە دوا کەوتوو داوەتە قەڵەم‌و بەبێ تواناو دوور لە شارستانیەتی زانیون. لە مەسەلەی شارستانیەتیدا بزوتنەوەگەلێکی زۆر لەناو گەلاندا دروست بوون و کاریان لەسەر ئەو بوارە کردووە. هەندێك لە نەتەوەی عەرەب دانەر بە کەسێکی باش دەدەنە قەڵەم‌و پێیان

وایە کە ئیبن ئەبو خەلدون ساتیع و الحسری نوسەری هاوچەرخی میسری لە کتێبی (دراسات عن مقدمە ابن خلدون)دا نوسیویەتی کە مەبەستی دانەر لەوەی کە باسی عەرەبی بە دەشتەکیو دواکەوتوو کردووە تەنها مەبەستی عەرەبە دەشتەکیو دواکەوتووەکان بوەو بە گشتی مەبەستی نەتەوەی عەرەب نیە.[٣] لەبارەی ئەم بابەتەشەوە لە ڕووی زمانەوانیەوە باسی لە جیاوازی نێوان وشەکانی، عەرەب، عەرەبی، اعراب، اعرابی، بە دورو درێژی کردوەو دەنوسێت (ئەو دەرئەنجامە خراپانەی کە لە ماناکردنی بە هەڵەی وشەی(عەرەب)هاتوەتە ئاراوە لە وڵاتی عێراق گەشتووەتە لـــوتکەو کار گەشتووەتە ئەوەی کە وەزیری ڕۆشنبیری ئەو وڵاتە بە ئامادە بوونی مامۆستایانی وڵاتی ناو براو زۆر بە شێوەیەکی کوێرانە هێرش دەکاتە سەر ئیبن خەلدونو، بە دوژمنی عەرەب ناوی دەبات و دەڵێت: پێویستە نوسراوەکانی بسوتێنرێن و گۆڕەکەی بە ناوی نەتەوایەتیەوە هەڵکەنرێتەوە)، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم بەڵگانەشدا کە دانەری ناوبراو هێناویەتی، هەروەك چۆن لەم وەرگێڕانەدا خوێنەران تێبینی دەکەن، کەبە تەواوی ناتوانرێت ئەم مەبەستە پشتڕاست بکرێتەوە. بە تایبەت کە ئەمەویو عەباسیەکان لەگەڵ بوونی ڕاشکاوانەی ئایەتی (ان اکرمکم عند الله اتقاکم)ن، بەڵام هێشتا مەسەلەی لە پێشتری ڕەگەزی عەرەب دەهێننە پێشەوەو نەتەوەکانی تری بێجگە لە عەرەب بە کەم و کورت دەزانن. لەم ڕووەوە ڕاپەڕینی گەورەی نەتەوەکان دەستی پێ کردو نەتەوەکانی بێجگە لە عەرەبی وەك ئێرانی و ڕۆمی و... هتد. ڕقیان لە عەرەب بوەتەوەو بە باوەڕبوون بەو بنەما پیرۆزەی ئیسلام. ئەوەبوو زۆربەی گەلان بەرەو سەربەخۆیی هەنگاویان ناو سەرئەنجام خەلافەتی عەباسیەکان هەرەسی هێنا. هەربۆیە ئیبن خەلدون کە خەڵکی ئەندەلوس بوو، تەنانەت لە ڕەگەزی (حضرم)یەکەیدا گومان دروست بووەو بەو هەموو بلیمەتی و بیرە ڕووناکەوە بە دڵنیاییەوە کەوتوتە ژێر کاریگەری ڕاپەڕینی گەورەی گەلانەوە.

---

[٣] دراسات عن مقدمة ابن خلدون لاپەڕەکانی (١٥١)بۆ (١٦٧).

لە هەمان کاتدا کە باوەڕی بە بنەماو بیرو باوەڕە ئیسلامیەکان هەبووە، تەنانەت (غلات)و شیعەکانی بە بیدعەچی ناوزەد کردووە. لە لایەکی ترەوە دانەر بە تایبەت لە زۆر شوێندا ئێرانیەکانی بە گەورەییەوە ناو بردووە. جاری وا هەیە بیرو باوەڕی تایبەتی دانەر ئیتر لە ڕوانگەی دژایەتی عەرەبەوە بێت، دەشتەکی یان شارستانی بە گوتەی نوسەری ناوبراو، یان لە ڕووی دەمارگیری ئەو لە مەزهەب‌و نەریتەوە بێت لە گرنگی تیۆرە زانستیەکانی کەم ناکاتەوە. هیوادارم خوێنەران بە چاوپۆشی لە بیرو باوەڕە کەسیەکانی دانەر دژایەتی بیرو داهێنانە کۆمەڵایەتی و مێژوییەکانی نەکەن، کە دامەزراوە لەسەر بنەما زانستیە بەهێزەکانی. لە کۆتایدا ئەوە بە بیر دەهێنمەوە کە بەو هەموو وردەکاری و ئاگادار بوونەوە کە بۆ وەرگێڕانی ڕاست و ڕەوانی ئەم کتێبە بە نرخە بەکار هێنراوە، ماوەی دوو ساڵ شەوو ڕۆژ لەم ئامانجە گەورەیەدا ماندوو بووم و هەوڵ و کۆششێکی زۆرم دا، بەڵام وا دەزانم دیسانەوە نەم توانی بێت بە شێوەیەکی ڕەها بانگەشەی ئەوە بکەم کە لە کارەکەمدا هەڵەم نەکردووە، چونکە بۆ وەرگێڕانێکی دڵنیا چەندین ساڵ پێویستە. لەم ڕووەوە وەك وەرگێڕ هەمان بۆچوونی دانەر بەبیر دەهێنمەوە کە دەڵێت: ( **بەڵام من بەو هەموو تێکەڵیەی خەڵکی هێشتا دڵنیام کەم و کورتی لە تێگەشتنمدا هەیە و، دان بە نەتوانی خۆمدا دەنێم لە بە ئەنجامگەیاندنی وەها ئەرکێکداو هیوادارم هەم خوداو هەم زانایانی شارەزای ئەم بوارە بەچاوی ڕەخنەوە لێم نەڕوانن و لەولاشەوە بە چاوێکی تەواو ڕەزامەندەوە سەیری نەکەن، لە چاکسازی کردن لەم بەرهەمەدا چاوپۆشی نەکەن و بەرەو باشتر ئاراستەم بکەن و لە دۆستان هیوای چاکە دەخوازم**). لە کۆتاییدا لە هاوڕێیان و زانایان کە بە چەندین هۆکار وەرگێڕیان لەم کارەیدا خستووەتە ژێر باڵی خۆشەویستی خۆیانەوە پڕ بە دڵ سوپاسیان دەکەم. بە پلەی یەکەم پێویستە ئاماژە بە ڕێنماییەکانی هاوڕێیان و زانایان جەنابی (عباس زریاب خوئی‌و محمد تقی دانش پژوه) کە لە کتێبخانەکانی سناو کۆلیجی مافدا هەموو جۆرە هاوکاریەکیان کردووم. هەروەها سوپاسی مامۆستای بەڕێز دکتۆر (هشترودی)و (سید

احمد خوراسانی)دەکەم کە لە بەشی حیساب و بیرکاریدا هەموو جۆرە یارمەتیەکیان داوم. وە هەروەها هاوکارانی خۆشەویستم لە زمانەوانیدا بە کتێبی (دهخدا)بەڕێزان دکتۆر (معین)و (علی نقی منزوی)و (سید جعفر شهیدی)کە بە پێی توانا لە هاوکاری کردنم درێغیان نەکردووە. هەروەها پێویستە سوپاسی هەموو کارمەندانی بنکەی وەرگێڕان و بڵاو کردنەوەی کتێب بکەم بە تایبەت هاوڕێی خۆشەویست و زانای لاو بەڕێز (غلام رضا تهامی)کە لە کاتی هەڵەبڕیدا ئەرکی بەراوردکردنی وەرگێڕانەکەی لەگەڵ چاپی (دار الکتاب اللبنانی)و هەندێك کاری تر لە چەندین دەقدا گرتە ئەستۆ و بە وردەکاریەکی فراوانەوە هەموو لایەکیان یارمەتیگەلێکی فراوانیان لە پێناو ڕاستکردنەوەی ئەم بەرهەمە پێشکەش کرد.

*محمد پروین گنابادی تاران میهری (١٣٣٦)هەتاوی*

# ١ - بەرهەمەکانی ئیبن خەلدون

"لسان الدینی ختیب" کە سەرەتا لە مەغریبی سەرەوە و ئەو کات لە ئەندەلوس لەگەڵ ئیبن خەلدوندا ئاشنایەتی مەعنەوی پەیدا کردووە، ڕاڤەی ژیانی ئیبن خەلدونی نوسیوە. بەم شێوەیە باس لە بەرهەمەکانی ناوبراو دەکات: نامەیەك لە ژیربێژی (المنطق)، پەرتوکێك لە بیرکاریدا و، کورت کردنەوەی هەندێك لە نوسراوەکانی ابن رشد، ڕاڤەی قەسیدەی بوردیە، کورت کردنەوەی کتێبی فەخری ڕازی، شەرحی رجزی لە ئسوڵی فقهدا. ئاشکرایە ئەم ئەدیبە گەورەیە پێش گواستنەوەی ئیبن خەلدون بۆ قەڵای سەلامە کوژرا و بە دارەوە هەڵواسرا، هەربۆیە لە باسکردنی بەرهەمەکانی ئیبن خەلدوندا باسی لە کتێبی (عیبەر)و (پێشەکیەکەی)نەکردووە، بەڵام سەرسوڕهێنەر ئەوەیە کە هیچکام لەو دانراوانەی کە ئیبن ختیب باسی کردوون لەبەردەستدا نین و لەوەش سەرسوڕهێنەرتر ئەوەیە کە ئیبن خەلدون لە باسی ژیاننامەی خۆیدا ئاماژەی پێ نەکردوون! لێرەدا دەتوانین بەم شێوەیە وەڵام بدەینەوە کە لەوانەیە بەرهەمە ناوبراوەکان بەلای خودی ئیبن خەلدونەوە جێگەی بایەخ نەبوبن. پەیوەندی دۆستانەی بەهێزی نێوان لیسانەدینی خەتیب و ئیبن خەلدون، هیچ شك و گومان لە ڕاستیەتی نوسینەکانی لیسانەدیندا سەبارەت بە بەرهەمەکانی ئیبن خەلدون ناهێڵێتەوە. لەم هەل و مەرجەدا زیاتر گومانی ئەوە دەبرێت کە بەرهەمە ناوبراوەکان زیاتر لەسەر شێوەی دەفتەرچەی بچووکی سەردەمی خوێندنی ئەم زانایەدا نوسرابن و هیچ جۆرە داهێنانێکیان تێدا نەبێت.

هەربۆیە ئیبن خەلدون گرنگیەکی ئەوتۆی پێ نەداون و لە ژیاننامەو بەرهەمەکانیدا ئاماژەی پێ نەکردوون. تەنها کتێبی گرنگ کە لە بەرهەمەکانی ناوبراو بۆ ئێمە مابێتەوە بریتیە لەو مێژووەی کە بە ناوێکی دوورو درێژەوە نوسراوەو بریتیە لە (کتاب العبر و دیوان المبتداء و الخبر فی أیام العرب و العجم و البربر ومن عاصرهم من ذوی السلطان الأکبر)ئەم مێژووە بە پێی دەستەواژەی خودی دانەر لە یەك پێشەکی و سێ کتێبدا کە پێشەکیەکەی سەبارەت بە گەورەیی زانست و مێژووە، هەمان ئەم کتێبەی ئێستەیە کە بە ناوی پێشەکی ئیبن خەلدونەوە ناسراوە. لە ڕاستیدا پێشەکی و کتێبی یەکەمین بریتیە لە(کتاب العبر)کە پێك هاتووە لە حەوت بەرگ، بەرگی دووەم و سێ یەم و چوارەم و پێنجەم ئیبن خەلدون ناوی لێ ناون(کتێبی دووەم)و بابەتەکانی باس لە مێژووی عەرەب و ئیسلام و خۆرهەلأت دەکات، کتێبی شەشەم و حەوتەم کە ئیبن خەلدون ناوی لێ ناون(کتێبی سێ یەم)باس لە مێژووی بەربەر دەکات لە مەغریب. وە هەروەها بەرگی حەوتەم باس لە ژیانی ئیبن خەلدون دەکات و بەمەش کۆتایی دێت.

(کتاب العبر)بە شێوەیەکی تەواو تەنها یەك جار چاپ کراوەو هەمان چاپی کۆنی بولاقە، بەڵام (پێشەکی)چەندین جار چاپ کراوەو (التعریف)کە لە کۆتایی چاپی بولاقدایە بەم دواییانە بە شێوەیەکی جیاواز و سەربەخۆ چاپ کراوە.

## نرخ و بەهای (کتاب العبر):

بەهای لێکۆڵینەوەو هەواڵی مێژوویی (کتاب العبر)بە پێی بەشە جۆراو جۆرەکانی جیاوازنو دەتوانین بڵێین کە گرنگترینو بەنرخترین بەشەکانی ئەو بەشانەن کە پەیوەندیان بە مێژووی وڵاتی (مغریب)ەوە هەیە، چونکە ئەو زانیاریانەی کە ئیبن خەلدون لەم بەشەی (کتاب العبر)دا هێناویەتی، لایەنی داهێنانکاریان هەیەو لە کتێبی ترەوە وەری نەگرتوون و خۆی نوسیونی و داهێنانی کردوون. کەواتە بابەتە ناوبراوەکان بریتین لەو زانیاری و ئەزمونانەی کە ناوبراو لە کاتی هاتووچۆو گەشتەکانی بەناو تیرەو هۆزو ناوچە جۆراو جۆرەکانو مانەوەی لە شارەکانی مەغریبدا بەدەستی هێناون، یان

ڕاڤەی ئەو ڕووداوانەیە کە بەسەر خۆیدا هاتوون یان دەستوەردانی هەبووە تێیاندا. هەربۆیە دوو بەرگی لە(کتاب العبر)بەسەرچاوەی سەرەکی وڵاتی مەغریب دەژمێردرێت، لەسەرەتای فەتحی ئیسلامیەوە تاوەکو سەدەکانی کۆتایی. ئەو مێژوو نووس و خۆرهەڵاتناسانەی کە لێکۆڵینەوەیان لە مێژووی مەغریبدا کردووە دەڵێن: بەبێ (کتاب العبر) هیچ کات زانیاری ڕاست و دروست سەبارەت بە وڵاتی مەغریب و گەل و نەتەوەکانی لە ماوەی هەموو سەردەمەکانی ناوبراودا بە دەست ناکەوێت. لەم ڕووەوە دەبینین ئەم بەشەی مێژووی ئیبن خەلدون وەرگێڕدراوەتە سەر زۆرترین زمانەکانی ئەوروپا، بە جۆرێك ئەم بەشە لە مێژووی ناوبراو لە ساڵەکانی (١٨٥٢ بۆ ١٨٥٦)لە دوو بەرگدا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فەرەنسی. هەروەها لە وڵاتی جەزائیریش بڵاو کراوەتەوەو بۆ جاری دووەم لە پاریس لە نێوان ساڵەکانی (١٩٢٥ بۆ ١٩٢٧)سەر لە نوێ چاپ کراوەتەوە، بەڵام بەشێك لە (کتاب العبر)کە پەیوەستە بە مێژووی خۆرهەڵاتەوەو لە نووسینەکانی خەڵکانی ترەوە وەرگیراون و جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ کتێبە مێژووییەکانی تردا نیە. خاڵێکی جێی سەرنج ئەوەیە کە خودی دانەریش لەوکاتەی کە سەرقاڵی نوسینی(کتاب العبر)بووە لە هەمان کاتدا گرنگیشی بە مێژووی مەغریب داوە، چونکە وەك خۆی دەڵێت: (ئاگاداری بارودۆخی خۆرهەڵات و گەل و نەتەوەکانی نەبووە)و لە پێشەکیەکەیدا ئاماژەی بەم بابەتە کردووە.

## پێشەکی ئیبن خەلدون لە دیدی خەڵکانی ترەوە

پێشەکی ئیبن خەلدون تەنها لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا بووە جێگەی سەرنجی خۆرهەڵاتناسان، لە کۆتاییەکانی هەمان سەدەدا لەم قۆناغە تێپەڕی و زانایانی ئەوروپاش دەستیان کردە لێکۆڵینەوە لەسەری، چونکە لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەیەمدا (دربلو)[4]و لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمیشدا (سیلوستر دساسی)[5]. چەندین

---

[4] D Herbelot: Bibliotheque Orientale

[5] De Sacy

بابەتیان دەربارەی ئیبن خەلدون نووسی[٦] و هەڵبژاردەگەلێکیان لە پێشەکیەکەی بڵاو کردەوە، بەڵام ناوی ئیبن خەلدون لەنێو ناوی هەزاران کەس لە نوسەرو دانەرانی وڵاتانی ئیسلامی کە جێگەی سەرنجی خۆرهەڵاتناسان بوون بەپێی پێویست نەناسرابوو. پێشەکیەکەشی لەنێو هەزاران کتێبی عەرەبیدا کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرا و دەخوێنرانەوە ناوبانگێکی ئەوتۆی نەبوو، چونکە ئەو بابەت و نوسینانەی کە خۆرهەڵاتناسان بڵاویان کردبوویەوە، بۆ گرنگیدان و ئاشکرا کردنی داهێنانە فیکریەکانی ئیبن خەلدون بەس نەبوون. هەر بۆیە دەتوانین بڵێین کاتێك گرنگی ئیبن خەلدون و بەرهەمەکەی کەوتە بەر دیدی خۆرهەڵاتناسانەوە کە (هامر)[٧] و (شولتز)[٨] چەندین لە بارەی ئیبن خەلدونەوە نووسی، هەر بەو شێوەیەی کە(هامر)بابەتێکی بەزمانی ئەڵمانی لەبارەی هەندێك لایەنی مێژووی ئیسلامەوە بڵاو کردەوەو باسی چەند بیرو باوەڕو تیۆرێکی ئیبن خەلدونی کردبوو تێیدا و بە(من تسکیوی عەرەب)ناوزەدی کردبوو، ئەو کات لە گۆڤاری ئاسیایی لە ساڵی (١٨٢٢) لەبارەی پێشەکی ئیبن خەلدونەوە بابەتێکی بڵاو کردەوەو بوە جێگەی سەرنجی خۆرهەڵاتناسان. لەو بابەتەدا نوسیبووی: (لە پێشەکیدا دوو تایبەتمەندی دیار و بەرچاو بوونیان هەیە، ئەوانیش داوەریکردنی دروست و ڕەخنە گرتنە بە دیدێکی دوور لە هەڵەوە بە جۆرێك هەموو خوێنەرێك بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت). وە هەروەها دەڵێت: (لەنێو نوسین و دانراوە خۆرهەڵاتیەکاندا زۆر کەمن ئەو کتێبانەی کە هاوشێوەی پێشەکیەکەی ئیبن خەلدون بن کە بە شێوەیەکی تەواو شیاوی وەرگێڕان بن).

---

[٦] ئەمە لە کاتێکدا ئەوروپاییەکان پێش ناسینی ئیبن خەلدون مێژوو نوسانێکی وەك مەسعودی و ابو الفیدا و ابن عربی و ابن خلکان و ابن عەرەبشایان ناسیوە. مێژووی عەرەبشا (مێژووی تەیمور لە نیوەی سەدەی حەڤدەیەمدا لە ئینگلیز بە هەمان دەقی عەرەبیەوە بڵاو کرایەوە.

[7] Hammer

[8] Schulz

(هامر)لەم کاتەدا سەرقاڵی کۆکردنەوەی بەڵگەو دۆکیۆمێنتەکان بووە بۆ کتێبە مێژوویە گەورەکەی خۆی سەبارەت بە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی، وە هەوڵی دەدا سەرچاوە خۆرهەڵاتیەکان لەگەڵ سەرچاوە خۆرئاواییەکاندا بەراورد بکات، هەربۆیە لەو وڵاتەدا لەگەڵ پیاوانی دەوڵەتی عوسمانیدا دانیشتووەو سەرقاڵی خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە بووە لەسەر بەڵگەنامەو کتێبە دەست نوسەکانی کتێبخانەکانی دەوڵەتی ناوبراو. ئەو ئەوەی بۆ دەرکەوت کە پیاوانی دەوڵەتی عوسمانی دەقی وەرگێڕدراوی تورکی پێشەکی ئیبن خەلدونیان بەباشی دەخوێندەوە، هەر بۆیە لە بابەتی ناوبراودا دەنوسێت: (پێشەکی ئیبن خەلدون لە گرنگترین ئەو دانراوانەیە کە لە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانیدا ناوبانگی هەیە و لەو کتێبانەیە کە زۆربەی پیاوو وەزیرو ئەمیرو پاشاو فەرمانڕەوا و ڕۆشنبیران و کارمەندانی دەزگا جۆراو جۆرەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەیخوێننەوە). بۆ پشتڕاستکردنەوەی قسەکانی لە بارەی گرنگی کتێبی ناوبراو، ناونیشانی بابەتی هەر پێنج بەشی پێشەکیەکەی بڵاو کردەوەو داوای لێبوردنی کرد کە بەشی شەشەمی دەست نەکەوتوە.[٩] چونکە ئەو نەیدەزانی کە ئەم بەشە لە گرنگترین ئەو سەرچاوانە بووە کە(حاجی خەلیفە)لە دانانی (کشف الظنون)دا سودێکی زۆری لێوەرگرتووە. پاش بڵاوبونەوەی ئەم بابەتە هێندەی نەبردو دوابەدوای (هامر)خۆرهەڵاتناسێکی تر بەناوی(گارسن دوتاسی)[١٠] بابەتێکی بڵاو کردەوە، تێیدا باسی ئەوەی کردبوو کە لە کتێبخانەی دەوڵەتی پاریسدا پەرتووکی تەواوی پێشەکی ئیبن خەلدونی دەست کەوتووە، ئەوەبوو سەرباس و ناونیشانەکانی بەشی شەشەمی بڵاو کردەوەو بەم شێوەیە بابەتەکەی هامری کامڵ کرد. ئەو کات لە ساڵی (١٨٢٥)دا "شورتز" بە لۆژیکێکی بەهێزەوە دەستی دایە بانگەشەکردن بۆ پێشەکیەکەی ئیبن خەلدون و لەم بارەیەوە

---

[٩] هەروەك بڵێی پیری زادە تەنها هەوڵی وەرگێڕانی هەر پێنج بەشی بابەتەکانی پێشەکی بە تورکی داوەو گوێی نەداوە بە وەرگێڕانی بەشی شەشەم.

[10] Garcin de Tassy

بابەتێکی نووسی بە ناونیشانی (لەبارەی دانانی گەورەی مێژوویی رەخنەییەوە)و لە گۆڤاری ئاسیاییدا بلأوی کردەوە، هۆشیاری ئەوەیدا کە پێویستە دەقی تەواوی ئەم کتێبە وەر بگێردرێتە سەر زمانی فەرەنسی.

ناوبراو ئەو شێوازەی کە خۆرهەلأتناسان لەو سەردەمەدا دەیانگرتەبەر بەم شێوەیە رەخنەی لێ دەگرێت: (ئەوان واتە (خۆرهەلأتناسان)بە تایبەت گرنگی بە شاعیرەکان دەدەن و مێژوو نووسان و بیرمەندانیان فەرامۆش کردووە. بەم شێوەیە لە لایەکەوە لێکۆلّینەوەی پەستترین بەرهەم دەکەن و لە لایەکی تریشەوە گرنگترین مێژووەکان دەخەنە پێش چاویان و، گرنگی ئەوان لە هەردوو بوارەکەدا یەکسانە، هەربۆیە گەلێکجار زۆربەی بابەتە هیچ و بێ سوودەکان، هەر لە فەلسەفەوە بیگرە کە هەموو ئارەزوومەندو بیرمەندان گرنگی پێ دەدەن، ناناسرێن و خوێندنەوەیان بۆ ناکرێت). ئەو کات باسی گرنگیدانی ئەوروپاییەکان بە ئەدەبیاتی لاتینی لەسەردەمی بێداری ئەوروپیەکان (رێنیسانس)دەکات و دەلّێت: گومانی تێدا نیە ئەگەر پێشینانمان تەنها گرنگیان بە غەزەلیات و ئەدەبیاتی لاتینی بدایەو ئێمەیان لەگەلّ نووسین و بەرهەمی بیرمەندو مێژوو نووسان ئاشنا نەکردایە، ئەمرۆکە زانیاری ئێمە لەبارەی ئەدەبیاتی ناوبراوەوە کەمو کورت دەبوو، وە بیرێکی زۆر هەلّەمان لەبارەیانەوە دەبوو، هەروەك چۆن ئێستە ئێمە لەبەرامبەر ئەدەبیاتی عەرەبیدا لە وەها بارودۆخێکداین.

بۆ ئەوەی خەلّکی بگەیەنینە قۆناغێك کە بتوانن لە هەلّکەوتوویی جاویدانی عەرەب (شارستانیەتی ئیسلامی)تێبگەن‌و لە شێوازی بیرکردنەوەی ئەو گەلەی کە جیهانیان خستە ژێر رکێفی خۆیانەوەو زانستەکانیان پاراست ئاشنابن، بە بروای من پێویستە شێوازێك بگرینە بەر کە ئیتر (ئیتلال)ی موعەلەقاتی سەبعەو موبالەغەکانی موتەنەبی ئەوەندە دووبارە نەکەینەوە. لەپاشان دەنوسێت (من ئەم تێبینیانەم لە پەراوێزی کتێبێکی دەستنوسدا کە بەم دواییانە دەستم کەوتووە نوسیوە، زۆر داوای لێبوردون دەکەم کە ئەم پەرتوکە چاپ نەکراوەو بە تەواوی وەرگێرانی بۆ نەکراوە. ئەم بابەتەی

"شولتز" لەنێو خودی خۆرهەڵاتناساندا کاردانەوەیەکی قوڵی هەبووە و وای لێ کردوون کە هەوڵی وەرگێڕانی هەندێك بەشی پێشەکی بدەن، بەڵام پەرتووکی دەستنووسی پێشەکی لەو ڕۆژگارەدا چەند دانەیەك بوون. هەربۆیە ئەم بزوتنەوەیە کاتێك پێشکەوت کە(کاترمر)لە ساڵی (١٨٥٨)ئەم پێشەکیەی لە سێ بەرگدا بە چاپ گەیاند. خۆرهەڵاتناسی ناوبراو پاش ئەوەی پێشەکی بە چاپ گەیاند دەستی کردە وەرگێڕانی، بەڵام پێش ئەوەی هەمووی تەواو بکات دونیای بەجێهێشت. ئەوەبوو دواتر (باروندسلان)ئەم ئەرکە مەترسیدارەی گرتە ئەستۆو بەخێرایی تەواوی کرد. لە ئەنجامدا پێشەکیەکەی ئەم بەدەستپێکێکی دوورو درێژوو ڕاڤەی تەعلیقاتەکانەوە لە سێ بەرگدا چاپ کرا. بەرگی یەکەمی لە ساڵی (١٨٦٢)و ئەوانی تریش لە ساڵی (١٨٧٨)بڵاو کرانەوە. وەرگێڕانی ناوبراو وای کرد کە پێشەکی ئیبن خەلدون لە بازنەی خۆرهەڵاتناسانەوە بێتە دەرەوەو بگاتە دەستی زانایانو بیرمەندانی ئەورووپایی. پاش بڵاو بوونەوەی ئەم وەرگێڕان و لێکۆڵینەوانەی کە لە بارەیەوە کراون، نرخ و بەهای ئەم پێشەکیە بە تەواوەتی ڕوون بوویەوە، چونکە تاوەکو ئەو سەردەمەش بازنەی ناوبانگی پێشەکی تەنها لەنێو خۆرهەڵاتناساندابوو کە گرنگیەکی زۆریان بە زمانی عەرەبی دەدا. ئەم گرووپە لە بارودۆخێکدا بوون کە نەیاندەتوانی پەی بە بەهای ڕاستەقینەی پێشەکی ببەن، بە تایبەت کە گرنگترین و داهێنەرترین بەشەکانی پێشەکی لەبارەی مەسەلە کۆمەڵناسیەکانەوە بوو، ئەم زانستەش لەو ڕۆژگارەدا لە قۆناغەکانی سەرەتایدا بوو. باس و بابەت و مەسەلەکانی دوور بوون لە دەستی خۆرهەڵاتناسان و لە دەرەوەی بازنەی زانیاریەکانی ئەواندا بوو.

هەر بۆیە دەتوانین بڵێین کە (دسلان)بەم وەرگێڕانەی خزمەتێکی گەورەو گرانبەهای بۆ ناساندنی ئەم پێشەکیە پێشکەش کرد. بڵاو بوونەوەی دەقی وەرگێڕدراوی پێشەکی لەنێوان ئەو زاناو بیرمەندانەی کە لێی بە ئاگا بونەوە کاریگەریەکی قوڵی هەبوو، چونکە زانا بەناو بانگەکانی ئەوروپا لە هەڵکەوتوویی ئەم بیرمەندە گەورەیەی عەرەب زۆر

سەرسام بوون و لەوە تێگەشتن کە ئەو پێش زۆرێك لە لێکۆڵەرەوانی ئەوروپایی کەوتووە لە بیرو بۆچوونی بە نرخ و گرنگدا. لەوە بە دواوە زانایانی ئابووری و مێژوو و کۆمەڵناسی بیرو باوەڕو تیۆرەکانی ئیبن خەلدونیان خستە بەر لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەیان بۆ کرد و ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە هەندێك لە زانیارییە نەگۆڕەکان لەبارەی مێژووی زانستەکانەوە، پێویستە لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیانەی کە لە پێشەکیدا بوونیان هەیە بگۆڕدرێن، چونکە ئەوان پێش ئەوەی پێشەکی ببینن و ئاشنایەتی لەگەڵ پەیدا بکەن، پێیان وابوو یەکەمین کەس کە لە فەلسەفەی مێژوودا باس و لێکۆڵینەوەی کردووە (ڤیکۆ)[11]یە، بەڵام دواتر بۆیان دەرکەوت کە ئیبن خەلدون لە پێشەکیەکەیدا نزیکەی سێ سەدە لەوەوبەر پێش ڤیکۆ باسی فەلسەفەی مێژووی کردووە. هەروەها پێیان وابوو کە یەکەمین کەس (ئۆگۆست کانت)بنیاتنەری کۆمەڵناسی بووەو بنەماکانی زانستی ناوبراوی لەسەر بناغەیەکی زانستی بنیات ناوە، بەڵام پاش بڵاو بوونەوەی پێشەکی، لەوە تێگەشتن کە ئیبن خەلدون پێش چوار سەدەو نیو بەر لە کانت ئەم زانستەی بنیات ناوە. هەروەها ئەوەیان بینی کە زۆرێك لە بنەماو بیرو باوەڕی داهێنانکاری زانایانی ئابووری و کۆمەڵناسی وەك (جان پاتیست سای)و (کارل مارکس)و (باکونین)لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا ئاشکرایان کردوون، لە پێشەکیداو لە سەدەی چواردەیەمدا ئیبن خەلدون ئاماژەی پێ کردووە، بەڵام ئەم بیرو باوەڕانە هەندێك جار لەسەر شێوەی تۆوی بچوك و قەڵەمی تازەی درەخت کە بە باشی گەشەیان کردبێت لە دانانەکەیدا دەستیان کەوت. هەر بۆیە دەبینین کە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی پێشەکی ئیبن خەلدون بۆ بیرمەندو خاوەن بۆچوون و تێڕوانینەکانی ئەوروپا مایەی سەرسامی و سەرسوڕمان بووە، هەر ئەم سەرسامیەش وای کردووە کە باس و بابەت لەبارەی بیرو بۆچونەکانی ئیبن

---

[11] ڤیکۆ لە ساڵی (١٦٦٧)لە (ناپل)لە دایك بووەو لە هەمان شاردا و لە ساڵی (١٧٤٤)ماڵئاوایی لە دونیا کردووە. ئەو لەناو ئەوروپیەکاندا بە بنیاتنەری فەلسەفەی مێژوو ناسراوەو دواتریش بە بناغەدانەری کۆمەڵناسی ناوزەد کراوە.

خەلدونەوە بنوسن. لێرەدا دەتوانین نوسینی ئەوروپییەکان لەبارەی ئیبن خەلدون و پێشەکیەکەیەوە بەم شێوەیە پۆلێن بکەین:

١ – ئەو خوێندنەوانەی کە بە شێوەیەکی سەربەخۆ بە مەبەستی شیکاریو لێکۆڵینەوەی بیرو باوەڕەکانی ئیبن خەلدون ئەنجامدراون. لەسەر شێوەی کتێبێکی سەربەخۆ یان بابەتێکی تایبەت لە گۆڤارە زانستیەکاندا بڵاو بووەتەوە.

٢ – ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە بارەی ئیبن خەلدون و پێشەکیەکەیەوە لە دوو توێی کتێبگەلێکی تایبەت بە فەلسەفەی ئیسلامی یان مێژووی مەملەکەتە ئیسلامیەکان یان مێژووی زانستەکانی عەرەب و موسوڵمانان بڵاو کراونەتەوە.

٣ – ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەبارەی ئیبن خەلدون و پێشەکیەکەی و تیۆرەکانیەوەلە کتێبە گشتیەکانی زانستدا کە پەیوەستن بە مێژووی ئابووری و کۆمەڵناسی، یان مێژوو زانستە ناوبراوەکان بڵاو کراونەتەوە. دیارو ئاشکرایە کە لێکۆڵینەوەکانی سەرەتا خاوەن گرنگیەکی زیاترن، چونکە بمانەوێت و نەمانەوێت لە ڕووی چەندیەتی زیاترو لێکۆڵینەوەی قوڵترو لە ڕووی باس و بابەتەوە وردترن. ئیتر چ کتێب و نوسراوە ناوبراوەکان یان خوێندنەوەو قوڵ بوونەوەکان بن، کە تایبەتن بە بەشەکانی پێشەکیەکەوە، یان تایبەتن بە هەندێك لە بەشە جۆراو جۆرەکانیەوە، بەڵام ئەو بەرهەمانەی کە لە جۆری سێ یەم کە لە بارەی پێشەکیەوە نوسراون لە هەموو ئەو جۆرانەی کە باس کران بەنرخ ترن، چونکە لەم جۆرە کتێب و بابەتانەدا پێگەی ئیبن خەلدون لە زانست و مێژووی زانستدا بە گشتگیر ترو کامڵتر دیاری کراوە، دەتوانرێت بگوترێت کە ئیبن خەلدون نەگەشتە ئەو پلە شیاوەی خۆی لە مێژووی زانست و ئەندێشە مرۆڤایەتیەکاندا، تاوەکو ئەو کاتەی کە ئەم جۆرە کتێبانەو ئەم جۆرە خوێندنەوە گشتیانە بڵاو کرانەوە، چونکە دانراوەکانی جۆری سەرەتا بە زۆری لە هەمان بازنەی تایبەتی خۆرهەڵاتناساندا دەسوڕانەوە و زۆر سنوردار بوون، بەڵام لێکۆڵینەوەکانی بەشی سێ یەم بە شێوەیەکی گشتی لەنێو هەموو بیرمەندو ڕۆشنبیراندا بڵاو بویەوەو بویە هۆی ئەم ناوبانگەی ئێستەی ئیبن خەلدون. گرنگترین

نمونەی دانراوەکانی جۆری یەکەم لەبارەی ئیبن خەلدونەوە بریتین لەو خوێندنەوە تایبەتانەی کە خۆرهەلآتناسێکی وەك (شمیت)[12](روزنتال)[13] (ڤن کر مر)[14] (لوین)[15] (بول)[16] (گابریلی)[17] ئەنجامیان داون. دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان بە زمانەکانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و ڕووسی و فەرەنسی و ئیتالی بلآو کردوەتەوە. هەروەها بابەتگەلێکی تایبەت کە بە خامەی (رنەمونیە)[18] (کونوزیو)[19] (فریرو)[20] (گومپلڤیچ)[21] لەم بوارەدا نوسراون. گرنگترین نمونەکانی جۆری دووەم لەبارەی ئیبن خەلدونەوە بابەتگەلێکن کە (کارادوڤ)[22] لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (بیرمەندانی ئیسلام)و، (دوبوێر)[23] لە دانانەکیدا بەناوی (مێژوو فەلسەفەی ئیسلام)و (ریختر)[24] لە کتێبەکەیدا بە ناوی (مێژوو نووسانی عەرەب)(کلمان ئوئار)[25]لە کتێبی (ئەدەبیاتی عەرەبی)و، (نیکلسون)[26] لە کتێبی (مێژووی ئەدەبیاتی عەرەب)و، (گوتیە)[27] لە کتێبەکەیدا بەناوی (سەردەمە تاریکەکانی مەغریب)(فوربیگە)[28] لە کتێبی (مێژووی ئەفریقای خۆرهەلآت لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا)نوسیویانە. وە هەروەها لە گرنگترین نمونەکانی

---

[12] N. Schmidt
[13] Rosenthal
[14] A. von Kremer
[15] Lewine
[16] G. Bouthoul
[17] Gabrieli
[18] R. Maunier
[19] Colosio
[20] Ferreiro
[21] Gumplovitz
[22] Carra de Vaux
[23] De Boer
[24] G. Richter
[25] Cl. Huart
[26] R. Nicholson
[27] Gautier
[28] Faure – Biguet

جۆری سێیەم بابەتگەلێکن کە (فلینت)[29] بەناوی (مێژووی فەلسەفەی مێژوو) نوسیویەتی. وە هەروەها ئەو بابەتانەی کە زانایانێکی وەك (ڤارد)[30] کە لە دانراوەکەیدا بەناوی کۆمەڵناسی تیۆریەوە نوسیویەتی و (ڕاپاپور)[31] لە کتێبی (فەلسەفەی مێژوو وەك زانستی کامڵ بوون وایە)و (رنەموتیە)[32] لە کتێبی (دەروازەیەك بۆ زانستی کۆمەڵناسی)و (توینبی)[33] لە دانراوی گەورەی خۆیدا بەناوی (خوێندنەوەیەك لە مێژوو)بە زنجیرەیەکی یەك لە دوای یەك هێناویانە.

لێرەدا کورت کردنەوەی ئەو هەموو نوسینانەو نیشاندانیان سەبارەت بە ئیبن خەلدون کە بلاّو کراونەتەوە لێرەدا گوتنیان لەتوانا بەدەرە، هەر بۆیە لێرەدا ئاماژە بە چەند نمونەیەکی کورت لە گرنگترین ئە گوتانەی کە دەربارەی ئیبن خەلدون بەسەر زارو بە پێنووسی زانایان هاتون و نوسراون، بەسن بۆ ئەوەی پلەو پایەی ناوبراو لە هەردوو زانستی مێژوو کۆمەڵناسیدا زیاتر ئاشکرا ببێت:

زانای کۆمەڵناس (لود ڤیك گومپلڤیچ)لەژێر ناوی (بیرمەندی کۆمەڵناسی عەرەبی لە سەدەی چواردەیەمدا)لەبارەی ئیبن خەلدونەوە باسێکی گرنگی کردووە، پاش ئاماژە بەوەی کە پلەو پایەی ئیبن خەلدون بەو شێوەیەی کە پێویستە نەناسراوە دەڵێت: (زۆر ڕەوایە کە ئیبن خەلدون بە بیرمەندێکی سەردەم بە تەواوی مانای ئەم وشەو لە هەموو ڕوانگەیەکەوە بزانین. ئەو لە باسی ئەو جیاوازیانەی کە لە نێوان گەلاندا دەبینرێت توشی هەمان هەڵەی بیرمەندانی سەدەی هەژدەیەم نەبووە، ئەو ڕووداوە کۆمەلآیەتیەکان بە شێوەیەکی پایەدارانە دەخاتە بەر خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەوە. لەم بابەتەشدا نەك تەنها پێش لە (ئوگوست کانت)بەڵکو پێشتر لە (ڤیکۆ)ش بیرو باوەڕو بۆچوونی قوڵتری لە هەردوو بواردا خستوەتە ڕوو. لە ڕاستیدا نوسینەکانی ئیبن خەلدون لەم بارەیەوە بریتین

---

[29] R. Flint
[30] F. L. Vard
[31] Ch. Rappapott
[32] Rene Maunier
[33] A. Toynbee

لە هەمان ئەو مەسەلانەی کە ئێمە لەم سەردەمەدا بەناوی کۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆجی)وە دەیانخوێنین. (ئیستیفان و کولوزیو)لە گۆڤاری (جیهانی ئیسلامدا)کە لە فەرەنسا دەردەچێت، دەقێکی بە دوادا چوونی لە بارەی ئیبن خەلدونەوە لە ساڵی (١٩١٤)دا نووسی[٣٤]کە دەڵێت: (هیچ کەسێك ناتوانێت ئینکاری ئەوە بکات کە ئیبن خەلدون ناوچەگەلێکی نادیاری لەبارەی زانستی کۆمەڵایەتیەوە دۆزیوەتەوە کە پێش (ماکیا ڤیلی و منتسکیو و ڤیکۆ)کەوتووە لە دۆزینەوەی دانانی زانستێکی نوێ کە بریتیە لە ڕەخنەی مێژوویی). شانازی دامەزرێنەری تیۆری جەبری کۆمەڵایەتی[٣٥] دەبێتە بەشی ئەم کە چەندین سەدە لەمەوبەر لە پەیڕەوانی فەلسەفەی سەلماندن [٣٦] بوەو، زانایانی دەروونزان لەم بارەیەوە باسیان کردووە. ئەم مێژوونوسە مەغریبیە گەورەیەی بنەماو تیۆرەکانی دادگەری کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی پێنج سەدە بەر لە (کونسیدران و مارکس و باکونین)دۆزیویەتیەوە.

هەربەو شێوەیەی کە تیۆرەکانی ئیبن خەلدون لەبارەی کۆمەڵناسیەوە جۆراوجۆرن، ئەو دەخاتە ڕیزی فەیلەسوفانی مێژووەوەو بیروباوەڕەکانی لەبارەی ڕۆڵی کارو خاوەنداریەتی و حەق دەست ئەو بە پێشەواو پێشڕەوی زانایانی ئابووری ئەم سەردەمە نیشان دەدات. (کولوزیو)لەناو لێکۆڵینەوەکانیدا لە گوتەی (ئەماری)خۆرهەڵاتناس و مێژوونووسی گەورەی (ئیتالیا)کە بە تایبەت لە مێژووی سەردەمی عەرەبی و ئیسلامی (صقلیە)(سیسیل)دا زۆر بە ناوبانگە، بەڵگە دەهێنێتەوەو پێی وایە کە ئیبن خەلدون

---

[٣٤] ئەم بابەتە مامۆستا عمر فاخوری کردوویەتی بە عەرەبی و لەنێو کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (آراء غربیە فی مسائل شرقیە)لە ساڵی (١٩٢٥)لە دیمەشق چاپ کراوە باسی کردووە .

[٣٥] بنەماو بیرو باوەڕگەلێك کە کاریگەری و ڕووداوەکان تەنها بە هۆکارەکان ڕاڤە دەکات، یان شێوازێکی فەلسەفیە کە دیاری کردنی هەموو بوونەوەران بە هۆکاری جەبری و ئامادە دەزانێت .

[٣٦] ڕێڕەوێکی فەلسەفیە کە بە هۆی کانتەوە بنیاتنراوەو بنەماکەی لەسەر ئەوە دامەزراوە کە ناتوانرێت ڕاستەقینەی شتەکان بناسرێت، مەگەر لە ڕێگەی ڕاستەقینە نەگۆڕو ئەرێنیەکان کە لە ڕێگەی بینین و ئەزمونەوە بەدەست هاتبن .

یەکەمین نوسەرێکە لە جیهاندا دەستی کردووە بە لێکۆڵینەوە و باسی فەلسەفەی مێژوو. (ناتانیل ئیشمیت)مامۆستای زانکۆی (کورنیل)ی ئەمریکا لە ساڵی (١٩٣٠)بابەتێکی بەناوی (ئیبن خەلدون مێژوو نووس و کۆمەڵناس و فەیلەسوف)[٣٧] بڵاو کردەوە کە تێیدا بیرو باوەڕەکانی ئیبن خەلدونی بە دوورو درێژی لێکۆڵینەوەو شیکارکردووە و دەڵێت (بە ڕاستی مافی خۆیەتی کە ئیبن خەلدون بە بنیاتنەری فەلسەفەی مێژوو زانستی کۆمەڵناسی بناسێنرێت). لەو قسانەی کە لەم بارەیەوە کردوویەتی دەڵێت: (ئیبن خەلدون گۆڕەپانی مێژوو ڕاستەقینەو سروشت و چیەتیەکەی دۆزیەوە، ئەو فەیلەسوفێکە وەك ئۆگۆست کانت و تۆماس بکل و[٣٨]هربرت سپنسر[٣٩]. وە فەلسەفەی مێژووی ئەو وەك فەلسەفەی هیگڵ[٤٠]شیکارێك نیە لە قەزاو قەدەر، مەبەستی ئەو لە هێنانی ئایەتەکانی قورئان لەناو لێکۆڵینەوەکانیدا ئەوەیە کە خوێنەر تێبگەیەنێت کە فەلسەفەی ئەو گونجاوە لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا. ئەو لە زانستی کۆمەڵناسیدا پلەیەکی بە دەست هێناوە کە تەنانەت ئۆگۆست کانت لە نیوەی سەدەی نۆزدەیەمدا پێی نەگەشتووە). وە هەروەها دەڵێت: (بیرمەندانێك کە لەم سەدانەی کۆتایدا زانستی کۆمەڵناسیان بنیات نابێت، ئەگەر پێشەکیەکەی ئیبن خەلدونیان دەست بکەوتایە و لەو ڕاستیانەی کە لە پێش ئەمانەوە دۆزیویەتیەوە و ئەو شێوازانەی کە ئەم هەڵکەوتووەی عەرەب ساڵانێکی دورو درێژ پێش ئەمان دایهێنابوون، ئەوەندە سودمەند دەبوون کە دەیانتوانی لەم زانستە نوێیەدا خێراترو باشتر پێش بکەون). کارادوڤ یەکێکە لە خۆرهەڵاتناسان لە کتێبەکەیدا بە ناوی (بیرمەندانی ئیسلام)لە باسێکی دورو درێژدا سەبارەت بە ئیبن

---

[37] N. Schmidt: Lbn Khaldun Historian Sociologist and philosopher .

[٣٨] نوسەرو مێژوو نوسی کۆمەلآیەتی ئینگلیزی خاوەن بەرهەمی بەناوبانگی (لە مێژووی شارستانیەتی ئینگلیزدا لە ساڵی (١٨٢١-١٨٦٢).

[٣٩] فەیلەسوفی ئینگلیزی دامەزرێنەری فەلسەفەی کامڵ بوون (١٨٢٠-١٩٠٣).

[٤٠] فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمانی کە لە فەلسەفەی ئایین و مەسەلە ڕۆحانیەکان و ئیلاهیەکاندا سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بووە (١٧٧٠-١٨٣١).

خەلدون دەڵێت: (ئیبن خەلدون نووسەری سەدەی چواردەهەم لە ڕووی گرنگی پێدان و حەز کردن بە لێکۆڵینەوە لە مێژووی کامڵ بوون و هۆکارەکانی نویێ گەری و پێشکەوتن لە گۆڕەپانێکدا هەنگاوی هەڵهێناوە کە لەگەڵ پێشکەوتوترین بۆچوونی زانایانی ئەم سەردەمەی ئەورووپادا دەگونجێت). گووتیە مامۆستای زانکۆی جەزائر لە کتێبەکەیدا بەناوی (سەردەمە تاریکەکانی مەغریب)بەشێکی دورو درێژی تایبەت کردووە بە ئیبن خەلدونەوەو لەگەڵ ئەوەی کە تا ئەندازەیەك لە بیێ لایەنی زانستی دوور کەوتووەتەوەو لە ئەنجامدا

بوەتە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە بەشەکانی پێشەکی بە دەستەواژەی خراپ بگوترێن، لەهەمان کاتدا بە دیدێکی سەرسام و سەرسوڕهێنەرەوە سەیری ئیبن خەلدون دەکاتو دەڵێت: (هەرچەندە سەرزەوی مەغریب کەمتر پیاوانی گەورەی تێدا هەڵکەوتون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند ناوێك دێنە بەردەممان کە دەتوانین لە ڕیزی ئیبن خەلدوندا دایان بنێین وەك (ئانی باڵ)[41] یان (قدیس ئۆگوستین)[42]. لە ڕاستیدا ئەو پلە شیاوەی کە ئیبن خەلدون پێویستە لە بیرەوەری خەڵکیدا هەیبێت ئەوەیە کە لە ڕیزی ئەو پیاوە گەورانەدا دابنرێت، بەڵام جێگەی داخە کە هێشتا ئیبن خەلدون لە بیرو هزری مرۆڤدا نەگەشتووەتە ئەم پلەوپایەیە، چونکە ئەوانەی کە بە ڕاستی ئەو دەناسن زۆر کەمن. ئەم پێگە گەورەو بەڕێزە کە ئەمڕۆ مردووە، بە لایەنی کەمەوە بەلای ئێمەو گەلی فەرەنسیەوە پێویستە هەمیشە زیندوو بێت. مامۆستا (ڤارد)[43]ی ئەمریکایی لە کتێبەکەیدا بە ناوی (زانستی کۆمەڵناسی تیۆری)لە باسی بنەما جەبریەکانی ژیانی کۆمەلایەتی[44] بەم شێوەیە دەنوسێت: (وایان دەزانی کە یەکەمین کەس کە بنەمای بیرو باوەڕی جەبری کۆمەلایەتی باس کردووە (منتسکیو یان ڤیکۆ)بووە، ئەمە لە کاتێکدا یەکەمین جار ئیبن

---

[41] Annibal
[42] Augustin
[43] Ward
[44] Determinisme social

خەلدون لە سەدەی چواردەهەمداو ماوەیەکی زۆر لە پێش ئەوانەوە باسی کردووە و پێی وا بووە کە کۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکان پەیڕەوی لە یاساو ڕێسای نەگۆڕ دەکەن). مامۆستا (فلینت)ی ئینگلیزی لە کتێبەکەیدا بەناوی (مێژوو فەلسەفەی مێژوو)دەڵێت: (لە بواری زانستی مێژوو و فەلسەفەکەیدا ڕۆشنبیری عەرەب بەناوی زانایەکەوە جوانە کە لە درەوشاوەترین ناوەکانە، چونکە نە لە دونیای کلاسیکی سەدە کۆنەکان و نە لە دونیای مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاستدا ناتوانرێت وەها ناوێك بەدەست بهێنین کە لە گەشاوەییدا وەك ئەو بێت، بەڵێ یەکەمین نوسەرێك کە مێژووی وەك زانستێکی سەربەخۆ هەژمار کردوو لێکۆڵینەوەی تێدا کرد ئیبن خەلدون بوو). (دوبویر)[45] مامۆستای زانکۆی (ئەمستردام)لە کتێبەکەیدا بەناوی (مێژووی فەلسەفە لە ئیسلامدا)[46] باسێکی تایبەت کردووە بە ئیبن خەلدونەوەو دەڵێت: (لە پێشەکی فەلسەفەی ئیبن خەلدوندا دەتوانرێت زۆر تێبینی دەرونزانی سیاسی ورد بدۆزرێتەوەو، کتێبی ناوبراو بە هەموویەوە بەرهەمێکی دانسقەو داهێنانکارانەیە). ڕاستیەکەی ئەمەیە کە پێشینان کۆمەڵێك دانراوی مێژوویی زۆریان بۆ ئێمە بەجێ هێشتووە کە لە ڕوانگەی شێوازەوە بەسوودن، بەڵام ئەوان بە هیچ شێوەیەك ئەو مێژووەی کە لەسەر بنەمای فەلسەفی دامەزرابێت و بە زانستێکی سەربەخۆ بژمێردرێت بۆ ئێمەیان نەنوسیوە.

ئەوان هۆکاری نەگەشتنی مرۆڤایەتی بە قۆناغە باڵاکانی شارستانیەت لە ڕۆژگارە کۆنەکاندا بە شێوەیەکی تر ئاراستە دەکەن و دەیبەستنەوە بە ڕووداوە سەرەتاییەکانی وەك (بومەلەرزەو زریان و تۆفانەکان)ەوە. لە لایەکی ترەوە فەلسەفەی مەسیحی هەموو ڕووداوەکانی مێژوو چ ئەوانەی کە ڕوویانداوەو ئەوانەشی کە نزیکە ڕوو بدەن دەیاندایە پاڵ ویست و ئارەزووی خوداوەند. یەکەمین کەسێك کە دەستی کرد بەوەی کە کامڵ

---

[45] De Boer

[46] ئەم کتێبە بە پێنووسی مامۆستا محمد عبدالهادی أبوریدە کراوە بە عەرەبی و لە ساڵی (١٩٣٨)لە قاهیرە چاپ کراوە .

بوونی کۆمەڵایەتی ببەستێتەوە بە هۆکارە نزیکەکانیەوەو بە دەرك و فەراسەتی وردەوە، مەسەلەو بابەتەکانی بە بەڵگە باوەڕ پێکراوەکان باس بکات ئیبن خەلدون بوو. کاتێك ئەو ڕێگەی زانستێکی نوێی ئاسان دەکرد تەنها ئاماژەی بە مەسەلە گرنگەکانی دەکردو بە گشتی دەستی دایە باسکردنی بابەت و شێوازەکانیان، بەڵام هیوادار بوو کە داهاتوانی پاش ئەم بەردەوام بن لەسەر لێکۆڵینەوەکانی ئەم و مەسەلەو بابەتگەلێکی نوێی بۆ زیاد بکەن و پشت بە ئەندێشەی دروست و زانستی سەلمێنراو ببەستن.

ئارەزووەکەی ئیبن خەلدون هاتە دی، بەڵام نەك بە دەستی موسوڵمانان، هەرچەندە ئەو لە داهێنانی ئەم بابەتەدا پێشەنگ بوو، بەڵام بەداخەوە لە خۆرهەڵاتدا جێنشینێك بۆ لێکۆڵینەوەکانی ئەو دەرنەکەوت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا کتێبەکەی ئەو لە ڕۆژگارێکی دوورو درێژ لە خۆرهەڵاتدا کاریگەری هەبوو زۆرێك لە پیاوانی سیاسی موسوڵمانان (عوسمانی)کە لە سەرەتای سەدەی پازدەهەمدا بەپێشەنگی زۆرێك لە پاشاو پیاوە سیاسیەکانی ئەوروپا دەژمێردران کە پێشەکی ئیبن خەلدونیان دەخوێندەوە. لەوانەیە تازەترین و گشتگیر ترین لێکۆڵینەوە کە لە بابەتی فەلسەفەی مێژوودا نوسرابێت ئەو چەند بەرگەیە کە (توینبی)مامۆستای زانکۆی (ئۆکسفۆرد)دایناون بەناوی (خوێندنەوەیەك لە مێژوودا)یە. ئەم نوسینە لە شەش بەرگدایە کە بەرگی شەشەمی لە ساڵی (١٩٣٩)دا بڵاو کراوەتەوە. توینبی لەم بەرگانەدا ناوی ئیبن خەلدون دەبات و ئاماژە بە بیرو باوەڕو تیۆرەکانی دەکات بە جۆرێك لە چەند شوێنێکدا چەندین لاپەڕەی بۆ تەرخان کردووە. ئەو ئیبن خەلدون بە بیرمەندو هەڵکەوتوو ناو دەباتو لە پێشەکیەکەیدا بەڵگەگەلێکی ڕۆشن لەسەر فراوانی تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی قوڵ و هێزی بیرکردنەوەی ئەو دەدۆزێتەوەو هەڵکەوتوویی ئەو لە دیدی توینبی دا دەدرەوشێتەوە. دانەری ناوبراو لە هەمان کاتدا بێ ئاگا نەبووە لە کەم و کورپیەکانی پێشەکیەکە بە تایبەت لە ڕوانگەی جێبەجێ کردنی حوکمەکانیەوە بەسەر کۆمەڵگە خۆرئاوایی و مێژووی گەلانی ئەوروپادا، کە ئیبن خەلدون باسی نەکردووە، بەڵام ئەم کەم و کورتیەکان بە

پەیوەندیدار بە هەل و مەرج و ژینگەی تایبەت و ڕووداوو بەڵگەی مێژوویی دەزانێت، کە ئیبن خەلدون لەو هەلومەرجەدا گەورە بووە و ئاگاداری ڕووداوە ناوبراوەکان بووە. لەپاشان بۆ پشتگیری ئەم بەڵگەیەی خۆی دەڵێت: (ئەگەر فەیلەسوفێکی سیاسی توانای تێگەشتنی تیۆرو بۆچونەکانی ئیبن خەلدونی هەبوایە لەماوەی چوارسەدەی مێژووی مەسیحی و ئەورووپاییەکاندا دەردەکەوت. هەڵکەوتووی خەیاڵی ناوبراو ڕاڤەیەکی پەسەندی بۆ بۆ چون و تیۆرەکانی ئیبن خەلدون دەکرد لە سنوری ئەقڵ و ئەندێشەی ئەورووپاییەکاندا. پاش باسکردنی ئەو ڕووداوانەی کە لەو سەردەمەدا ڕوویان داوە توینبی دەڵێت: (لەناو ئەم قسانەدا پێویستە ئەو یاسایە وە یاد بهێنینەوە کە لەم خویندنەوە مێژووییانەدا وەك سەرەتایی ترین شێوازی کار هەڵمان بژاردووە). ئەم یاسایە بەڕاشکاوانە دەڵێت: کە هەر ئەندێشەیەکی مێژوویی بێ گومان نیسبیەو شوێنکەوتەی هەلومەرجی کات و شوێنی خاوەن ئەندێشەیە، ئەمە یاسای سروشتی مرۆڤایەتیە کە ناکرێت هیچ هەڵکەوتویەکی لێ ئاراوتە بکرێت. توینبی لەناو ئاماژە بەچۆنیەتی نوسینی پێشەکی و ئەوەی کەئیبن خەلدون لەقۆناغی ئیعتیزالی سیاسی وجیهانی تەنیایی‌و لەقەلآی ئیبن سەلامەدا نوسیویەتی دەڵێت: (ئەوپیاوە چالاکەی کە پەنای بردبووە ئەنزوا (گۆشەگیری)سەرئەنجام شێوەی خۆی گۆڕی و لەسەر شێوەی فەیلەسوفێکی نەمردا دەرکەوت کە توانای ئەندێشەی ئەو لەزەینی هەرکەسدا کە پێشەکی بخوێنێتەوە بەردەوام دەمێنێتەوە).

سەرئەنجام توینبی دەست دەکات بە داوەریەکی گرانبەهاو بەم شێوەیە دەڵێت: (ئیبن خەلدون لەو پێشەکیەی کە بۆ مێژووی گشتی خۆی نوسیویەتی دەرك‌و داهێنانێکی بۆ فەلسەفە کردووە کە بێ گومان لە شێوەی خۆیدا بە گەورەترین کار دەژمێردرێت، فەلسەفەیەك کە لەگەڵ هەر ئەقڵ و لە هەر سەردەم و شوێنێکدا جێبەجێ دەبێت). دکتۆر تەها حوسەین کتێبێکی بەناوی (فەلسەفەی کۆمەلآیەتی ئیبن خەلدون)[47] بەزمانی

[47] la phiosophie sociale d ibn khildoun

فەرەنسی نوسی و لەکاتی خوێندن لە زانکۆی (سوربون)وەك نامەی تەواو کردنی خوێندن پێشکەشی کردووە. ئەم کتێبە لەساڵی (١٩١٨)لە پاریس بلاّو کراوەتەوەو لەپاشان مامۆستا عبدالله عەنان کردویەتی بەعەرەبی و لەساڵی (١٩٢٦)دا بلاّوی کردووەتەوە. ئەو لەم نامەیەدا کۆمەڵێك رەخنەی لە ئیبن خەلدون گرتووە و هێرشی کردووەتە سەر ئەو خۆرهەلاّت ناسانەشی کە بە گەورە بیەوە باسی ناوبراویان کردووە، لەو رەخنانەش دەڵێت: (ئیبن خەلدون مێژووی بە زانستێکی سەربەخۆ نەزانیوە و لایەنێکی زانستی نەداوەتێ. ئەو زانا ئەوروپاییانەشی کە وەها داوەریەکی بێهودەیان لەبارەی ئەوەوە کردووە بەهۆی ئەو هەڵەوەیە کە (دسلان)لەراڤەی وشەی زانستدا کردویەتی و بەهاو مانای (scence)زانیوە. ئەمە لە کاتێکدا وشەی زانست لە عەرەبیدا جارێك بە مانای مەعریفەتە کە پێویستە لە فەرەنسادا بەهاو مانای (connaissance)یان (savior) بزانرێت وە عەرەب لە وشەی مەعریفەت یان زاراوەی زانست بە شێوەیەکی رەها، هەرچیەك کە بتوانرێت لەبەر بکرێت (الذی یحفظ)دەیهێنێت هەر وەك چۆن چیرۆك و نەریتی پێغەمبەر بە چیرۆکی رووتی زانست دەزانێت[٤٨].

هەرچەندە خاوەن تایبەتمەندیو یاسای زانستیش نەبن، بەلاّم ئەبوخەلدون ساتیعو لحەسری ئەم بانگەشەیەی دکتۆر تەها حوسەین رەت دەکاتەوە و دەنوسێت: گومانی تێدا نیە کە وشەی زانست بەتەنهایی ناتوانێت ببێتە هۆی ئەوەی کەئیبن خەلدون بەبنیاتنەری زانستی مێژوو بزانین، بەلاّم گومانیش لەوەدا نیە کە ئەو زانایانەی کە دکتۆر تەها حوسەین ئامارەی پێ کردوون تەنها بەو هۆیەوەیە کە ئیبن خەلدون گوتویەتی (مێژوو زانستێکە)ئەم هەموو بیرو بۆچونەیان دەربنەدەبڕی، هەروەك چۆن لە مەسەلەی مامۆستا فیلینت کەپێش نیو سەدە لەوەوبەر دەستی دایە لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی مێژوو زانستی مێژوو، هەموو ئەو کتێبانەی کە لەسەردەمی ئەرستۆو ئەفلاتون تاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم کەبە زمانە جۆراو جۆرەکان نوسراون دەیانخاتە بەر

---

[٤٨] گەڕانەوە بۆ لاپەڕە (٣٤)ی کتێبی (فەلسەفەی ئیبن خەلدون).

ڕەخنەو شیکاریەوە، ئایا دەکرێت وەها بیرمەندێکی مێژوونوس تەنها بەم دەستەواژەیە لەبارەی ئیبن خەلدونەوە بۆچونی خۆی بلێتو بەگوتەی دکتۆرتەها حوسەین بەوشەی هەڵەیە خەڵەتابێت کەدەسلان ڕاڤەی کردووە و خودی ئەویش پەی بە مانای وشەی زانست نەبردبێت؟ من گومانم لەوەدانیە کەهەرکەسێك دانراوەکانی فلینت هەرلە مێژووی فەلسەفەی مێژووەوە لەفەرەنساو ئەڵمانیاوە بیگرە تاوەکو مێژووی فەلسەفەی مێژووی گشتی بخوێنێتەوەو ئاگاداری ڕەخنەکانی ئەوبێت، بێگومان باوەڕ بەوەدەکات ئەوەی کەئەو لەبارەی ئیبن خەلدونەوە نوسیویەتی ناکرێت تەنهاپشت بەوشەی (زانست)ببەستێت. بەڵکو پێویستە بەبێ وەستان بگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی ئیبن خەلدون و هەموو ئەو مەسەلانەی کەلەپێشەکیە بەناو بانگەکەیدا هاتوون پشتیان پێ ببەستێت، لێرەدا واز لە فلینت دەهێنین و بابەتەکە لەڕوانگەی زانستیەوە لێکۆڵینەوە دەکەین: جیاوازی نێوان زانستو مەعریفە چیە؟ بەمانایە کی تر جیاوازی نێوان (مەعریفەی زانستی)و (مەعریفەی ئاسایی)کامەیە؟ دیارە کەزانست لەزانستگەلێکی ڕیك پێکهاتووە کەهۆکارەکانیان پەیوەست بن بەهۆیەکانیەوە یاسا هاوکات و پاشهاتەکان[49] کەلەڕووداوەکاندا دەردەکەون ئاشکرابکات، تێڕوانینی زانستی بۆ ڕووداوەکان ئەوە یەکە تەنها ڕودانی ڕووداوەکان بەس نەبێت بەلایەوە بەڵکو هەوڵ بدات تاوەکو یاسای پەیوەست بەم ڕووداوانە ئاشکرا بکاتو، بەشوین ئەو هۆکارانەدا بگەڕێت کەبونەتە هۆی ئەم ڕووداوانە.

ئێستە ئەگەر بیرو باوەڕی ئیبن خەلدون لەبارەی مێژووەوە لەم ڕوانگەیەوە لێکۆڵینەوە بکەین دەبینین ئەویش بەدوای ئەو هۆکارانەدا گەڕاوە کەبونەتەهۆی ڕوودانی ڕووداوەکان وباوەڕی پێیان هەبووە، هەروەك چۆن باوەڕی بەبوونی یاساگەلێکی گشتیە کەبەسەر هەموو گەلە جۆراوجۆرەکانداو لەهەمووسەردەمەکاندا جێبەجێ دەبێت. دەبینین ئەو هەوڵدەدات لەبەشە جیاوازەکانی پێشەکیدا ئەم یاسا گشتیانە باس بکاتو

[49] lois de succession et de coexistence .

هۆکاری ڕووداوەکان ڕوون بکاتەوە. گومانی تێدا نیە کەهەموو ئەمانە لەو سیفەتە بنەڕەتیە سەلمێنراوانەیە کە (لێکۆڵینەوە زانستیەکان) لەزانیاریە ئاساییەکان جیادەکاتەوە. هەندیك جار ئەبوخەلدون ساتیعولحەسری لەڕەت دانەوەی بانگەشەی دکتۆر تەهاحوسەین بەدوورودرێژی باس لە بەڵگە گەلێکی تردەکات، بەڵام بۆدورکەوتنەوە لەدرێژ دادڕی باسیان ناکەمو خوێنەر ڕێنمایی دەکەم کە لاپەڕە (٥٦٥)ی (دراسات عن مقدمه ابن خولدون)بخوێنێتەوە.

# ٢- میژووی ژیانی ئیبن خەلدون

ئیبن خەلدون لەناوەڕاستی ڕەمەزانی ساڵی (٧٣٢)ی (کۆچی (٢٢مەی (١٣٣٢)ی زاینی لەتونس هاتەدونیاوە. ئەو لەخێزانێکی ئەندەلوسیدا هاتووەتە دونیاوە کەلەناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی کۆچیدا لەئەندەلوسەوە کۆچیان کردووە بۆتونس. ناوونەسەبی بەم شێوەیە: وەلیەدینی عبدالرحمانی کوڕی محمدی کوڕی محمدی کوڕی محمدی حەسەنی کوڕی جابیری کوڕی محمدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عبدالرحمان کوڕی خەلدونە. ئەو بنەڕەتی خۆی دەگێڕێتەوە بۆسەر عەرەبی یەمانی حەزرەمەوتو دەیگەیەنێتەوە سەر وائیلی کوڕی حیجر[٥٠]. لەم زنجیرە یەی وەچەدا، پشت بە گێڕانەوەکانی وەچەناسی ئەندەلوسی ئیبن حەزم دەبەستێت، بەڵام لەڕاستیەتی ئەم وەچەیەدا گومان دەکات و پێی وایە چەندناوێکی لێ لابراوە، چونکە ئەگەرخەلدون باپیری ئەو هەمان ئەوکەسەبێت کەلەکاتی داگیرکردنی ئەندەلوسدا چووەتە ئەو وولاتەوە، ئەوکات دەپشت بۆتێپەڕبوونی شەش سەدەو نیو بەس نیە. بەبیروباوەڕی ئەو بۆ تێپەڕبوونی وە ماماوەیەك پێویستە نزیکەی بیست پشت لەزنجیرەی وەچەی ئەوداهەبێت، بەڵام وەچەی باپیری ئەو کە هاتووەتە ئەندە لوسەوە بەپێی گێڕانەوەی ئیبن حەزم بەم شێوەیە: خالد کەناسراوە بە خەلدونی کوڕی عوسمانی کوڕی هانی کوڕی خەتتابی کوڕی کریبی کوڕی کریبی کوڕی مەعد یەکریبی کوڕی حاریسی کوڕی وائیلی

---

[٥٠] وائیلی کوڕی حیجر لەچاکانی ئەسحابەبووەو لەیەمەندا فێرکردنی قورئانو ئیسلامی پێ سپێردراوە .

کوڕی حیجر. بەپێی ئەم نیسبەتە ئیبن خەلدون دەگەڕێتەوە سەر بنەڕەتیترین بنەماڵەکانی عەرەبی یەمانی، بەڵام ئەوەی کەلێرەدا گومان دروستدەکات ئەوەیە کە ئیبن حەزم لەسەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ئەم وەچە دوورەی داناوە، سەرەڕای ئەمەش ئەوزانیاریانەی کەدەربارەی کێشەی نێوان عەرەب بەر بەر لەئەندەلوسدا هەیە ئەم گومانە پشڕاست دەکاتەوە، چونکە بەر بەرەکان لەداگیر کردنی ئەندەلوسدا بەشدارییان کرد و لێپرسراویەتی گرنگترین بەلاگانیان هەلگرت، بەلام عەرەب سەرۆکایەتیو فەرمانڕەوایی ئەندەلوسیان تایبەت کرد بەخۆیانەوە، هەربۆیە کێشەو ئالۆزی نێوان ئەم دوو نەتەوەیە چەندین سەدەی خایاند و تاوەکو سەرئەنجام عەصەبیەتی عەرەب لەناو چوو، لەسەرەتای سەدەی پێنجەمەوە دەسەلاتی بەر بەر دەستی پێکرد. خۆدانەپاڵ عەرەب لەئەندەلوسدا مایەی شەرەف و گەورەیی بوو هەموو کەسێ حەزی دەکرد وە چەی بگەڕێتەوە سەر عەرەب، چونکە دەسەلات پەیوەست بوو بەو نەتەوەوە، بەڵام نەسەبی زۆرێك لەخانەدانەکان هەڵگری گومان بوو، ئەم گومانەش گەشتبووە سەرۆكو فەرمانڕەواکانی فەتحی ئەندەلوس، هەر وەك دەڵێن تاریقی کوڕی زیاد بە کەسێکی بەر بەر ناسراوە و هەندێکیش بە یەکێکی ئێرانی لە مەوالیەکانی عەرەبی دەزانن. لێرەدا خاڵێکی تری گرنگ کەوامان لێدەکات بیر بکەینەوە بریتیە لەوابەستە بوونی ئیبن خەلدون بەم وەچە عەرەبیەوە، ئەویش ئەوەیە کەلەپێشەکیەکەیدا زۆر بەتوندی هێرش دەکاتە سەر عەرەب ئەمەلەکاتێکدا لەمێژووەکەی خۆیدا ستایشی بەر بەر دەکات و بەسیفەت جوان و پایەداریان دەداتە قەڵەم.

## پەروەردەبوونی خانەوادەی خەلدون لەئەندەلوسدا

بەهەرحاڵ ئیبن خەلدون سەربەیەکێك لە خێزانە خانەدانەکانی ئەندەلوسە کەلەسەرەتای فەتحی ئەندەلوس بەدواوە زۆرترین کات، دەبوونە سەرۆك و بەرپرس. باپیرەگەورەی ئەو خالیدی ناسراو بەخەلدون لەگەڵ لەشکری یەمانیدا هاتە ئەندەلوس‌و سەرەتا لەشاری قرمونەدا جێگیر بوو. خانەوادەکەی لەوشارەدا پەروەردە بوون. دواتر

منداڵەکانی چونەئیشبیلیە (سویل) تاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی سێیەم واتەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمیرعبدالله ی کوڕی محمدی ئەمەوی (٢٧٤-٣٠٠ك)، کەهێشتا منداڵانی خەلدون لەناو ڕووداوەکاندا دەرنەکەوتوون. لەم سەردەمەدا پزیسکی ئاژاوەو فیتنە لەسەرتاسەری ئەندەلوسدا کڵپەی سەندبوو لەزۆربەی ناوچەکانیدا کودەتا ڕوویدابوو. ئیشبیلیە لەیەکەمین ئەو شارانە بوو کەخەڵکەکەی دەستیان دابووە کودەتا. لەم شارەدا ئومەییە عبدالغافرو عبداللەی کوڕی حەجاج و کریب[٥١] وخالد، نەوەکانی خەلدون، کودەتایان کرد. ئەم گرووپە لەو ڕۆژگارەدا سەرۆك و خانەدانەکانی ئیشبیلیەیان پێك دەهێنا. ئومەییە لەلایەن ئەمیر محمدەوە فەرمانڕەوای شاربوو، بەڵام ئەم لەفەرمانی ئەمیر دەرچوو سەربەخۆیی ئیشبیلیەی ڕاگەیاندو ئیبن حەجاجی کوشت. لەئەنجامدا خانەدانی حەجاج و خانەدانی خەلدون کەوتنە دژایەتی ئەم و ئەوەندە کێشەو ئاژاوەکانیان بەردەوام بوو تاوەکو سەرئەنجام ئومەییە کوژرا. ئەوکات کریب بن خەلدون جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست و سەربەخۆیی ئیشبیلیەی ڕاگەیاند، بەڵام خانەوادەی حەجاج دەستیان دایە دژایەتی کردنیانو پێشەواکەیان ئیبراهیم لەگەڵ ئیبن حەفسەوی بویە هاوپەیمان، لەبەرئەوەی کەئیبن حەفسەوی لەگەورەترین سەرکردەکانی کودەتای ئەو کاتەی ئەندەلوس دەژمێردراو دەسەڵاتی بەسەر باشوری وڵاتدا واتە نێوان مالیقەو ڕەندەدا هەبوو، کریب وازی لەئیبراهیم هێناو ئەوی کردە هاوبەشی خۆی لەفەرمانڕەوایی کردنی ئیشبیلیەدا، بەڵام کریب سەختگیرو توندو تیژبوو لەکارەکانیدا، هەربۆیە خەڵکی ئیشبیلیە پشتیان تێکردو ڕوویان کردە ئیبراهیم، چونکە کەسێکی نەرم ونیان بوو لەگەڵ خەڵکیدا. ئیبراهیم لەکۆتاییدا پەیوەندی کرد بەئەمیر عبدالله و بوویە هاوپەیمانی و لەڕێگەی ئەوەوە فەرمانڕەوایی ئیشبیلیەی بەدەستهێنا، لەپاشان خەڵکی ئیشبیلیەی لەدژی کریب هانداو لەئەنجامدا کریبی کوشت و بەشێوەیەکی سەربەخۆ فەرمانڕەوایی ئیشبیلیەی گرتەدەستو لەوماوەیەدا ئە وڵاتە پێشکەو تنێکی زۆری بەخۆوە بینی. لەوە

---

[٥١] لە التعریفدا (کریت)ە (کتاب العبر-ب٧-ل ٣٨٠)، بەڵام (کریب)ڕاسترە .

بەدواوە خانەدانی خەلدون لەئیشبیلیە ژیانیان بردەسەرو لەهەموو سەردەمەکانی فەرمانڕەوایی ئەمەویەکاندا لەتەواوی ماوەی فەرمانڕەوایی ئەمەویەکاندا هیچ جۆرە پۆستێکیان پێ نەسپێردرا. تاوەکو ئەوەبوو ڕۆژگاری تایف [52] هاتەپێشەوە و ئیبن عەباد دەسەلاتی ئیشبیلیەی گرتەدەست. لەم کاتەدا ئەستێرەی بەختی خانەدانی خەلدون هەلهات و جارێکی تر لەدەسەلاتی بەنی عەباددا پلەو پۆستیان بەدەستهێنا. ئەوکات وولاتانی تەوایف زۆربەخێرایی گۆڕانکاریان بەسەرداده هات و مورابیتان چاویان بڕییە ئەندەلوس و نەتەوەی مووەحیدان لەمەغریبدا دەسەلاتیان پەیدا کردو لەشاروشارۆچکەکانی ئەو وولاتەدا بونە فەرمانڕوا و ئەبوحەفس سەرۆک هۆزی هنتانە بویە فەرمانڕەوای ئیشبیلیەو خۆرهەلاتی ئەندەلوس و نەوەکانی بەشێوەیەکی بۆماوەیی دەبوونە فەرمانڕەوای ناوچەکەو خانەدانی خەلدون پەیوەندیان بەم سەرکردانەوەکردو جارێکی تر پلەو پۆستیان بەدەستهێنایەوە.

## کۆچی خانەوادەی خەلدون بۆمەغریب

کاتێك دەولەتی مووەحیدان لەناو چوو بارودۆخی ئەندەلوس ئالۆزی بەخۆوە بینی و شارەگەورەو سنورەکانی ئالۆز بوون یەك لەدوای یەك پاشای قشتالە (کاستیل)داگیری دەکردن.

ئەمیر ئەبوزەکەریای حەفسی نەوەی ئەبوحەفس کۆچی کرد بۆ ئەفریقا (٦٢٠ك-١٢٢٣ز)ولە ژێر فەرمانی مووەحیدان یان عبدالمومن هەلگەڕایەوەو خەلکی بۆلای جێنشینیەکەی خۆی بانگهێشت دەکرد. خانەوادەی خەلدونیش لە بارودۆخی خراپی خۆیان بێزار بوبون و پێش ئەوەی کەئیشبیلیە بکەوێتەدەستی مەسیحیەکانەوە لەوشارەکۆچیان کرد وبۆماوەیەك لەسبتە مانەوە. فەرمانڕەوای ئەم شارە کەلەخانەدانی

[52] قۆناغی تەوایف یان پاشاکانی تەوایف لەمێژووی ئەندەلوسدا بریتیە لەو کاتەی کەئەمەویەکان لەناوچون و لەهەرناوچەیەکدا فەرمانڕەوایەك گەشتەدەسەلات .

حەفسیان بوو زۆر ڕێزی لێ گرتن، ئەو کات سەرۆکی خانەدانەکانی خەلدون حەسەنی کوڕی محمدی خەلدون بوو، واتە چوارەم پشتی بنەماڵەی خەلدون پەیوەندی کرد بەئەمیر ئەبو زەکەریا وە و ئەمیریش زۆر ڕێزی گرت و دڵی دایەوە. لەپاش ماوەیەك ئەمیر ئەبوزەکەریا مردو کوڕەکەی موستەنسیر بویە جێنشینی ئەو، دواتریش یەحیا کوڕی موستەنسیرو دوای ئەویش براکەی موستەنسیر ئەبوئیسحاق گەشتنە فەرمانڕەوایی. خانەدانی خەلدون لەم ماوەیەدا لەنازو نیعمەت و پلەو پایەدابوون، وەلەسەردەمی ئەبوئیسحاق ئەبوبەکر محمد پشتی دووەم گەشتە پلەو پایەی باڵای دەوڵەتی، و کوڕی ئەو محمد باپیرەی گەشتەپلەی (حاجبی)، ئەبوفارسی کوڕو وەلی عەهد ئەبوئیسحاق سەدری ئەعزەمی بەدەستهێناو بۆماوەیەك ئەم ئەرکەی لەئەستۆدا بوو. ئەبوفارس بەتایبەت (بجایە)ی بەڕێوە دەبرد، تاوەکو ئەوەبوو فەرمانڕەوایی حەفسیەکان کێشەو ئاڵۆزی تێکەوتو یەکێك لەسەرکردەکان بەناوی ئیبن ئەبی عەمارەوە دەستی دایە کودەتاو دەسەلاتی بەسەرتونسدا پەیدا کردو دواتر ئەبوبەکری کوڕی خەلدونی دەستگیر کردو کوشتی و ماڵ وسامانەکەی داگیرکرد.

محمدی کوڕی ئەبوبەکر هەرلە فەرمانڕەوایی بجایەدا مایەوە و خۆی تێکەڵ بەوکێشەو گرفتانە نەکردبوو کەلەناو سەرهەڵداواندا هەبوون،و لەدەسەلاتدا مایەوە، تاوەکو پێشەوای مووەحیدان ئەمیر ئەبو یەحیای لحیانی چاوی بڕییە تونس (٧١١ك)وبۆماوەیەك کردیە سەدری ئەعزەم (حاجب). پاش ماوەیەك ئەو لەژیانی سیاسی دورکەوتەوە، بەڵام پلەوپایە دەوڵەتیەکەی هەرمابوو تاوەکو لەساڵی (٧٣٧)ی کۆچیدا لەدونیا دەرچوو، بەڵام کوڕی ئەو محمد وازی لەژیانی سیاسی هیناو دەستی دایە خوێندنەوە وبەدەستهێنانی زانست و زانیاریو لەفیقهو زمانەوانی وشیعر گوتندا شارەزاییەکی باشی پەیداکردو لەکاتی بڵاوبوونەوەی پەتای گەورەدا (٧٤٩ ك-١٣٤٩ن)ماڵئاوایی لەژیان کرد.[٥٣] ئەومنداڵانەی کەلەدوای خۆی بەجێیهێشتن بریتی بوون لە: ئەبوزەید وەلیەدین

---

[٥٣] دایکی ئیبن خەلدون لەم پەتایەدا دونیای بەجێهێشت .

کەلەوکاتەدا لاوێکی هەژدە ساڵان بووە، و عومەرو موساو یەحیاو محمد، کەلەهەموو براکان گەورەتربوو[54]. لەم برایانەش یەحیایان گەشتەپلەی وەزیری.

## چۆنیەتی پەروەردە بوونی ئیبن خەلدون

ئیبن خەلدون لەوەها خانەدانێکدا گەورە بوو هەرلەسەرەتای منداڵیەوە لەکۆڕو کۆبوونەوەی باوانیدا بەشداری دەکردو باسی پیاوەتی‌و چاکەی پێشینانی خۆی دەبیست‌و گوێی بۆمیوانانی باوکی دەگرت. پەروەردە بوون لەوەها خێزانێکدا پێویستە لەڕۆحی ئەودا دووهەستی بەهێز دروست ببن: حەز لەپلەو پایەو دڵبەند بوون بەخوێندنەوەو زانست، هەریەکە لەم دوانە کاریگەری قوڵیان کردبووە سەر بونیادی ئەو و لەدێرزەمانەوە لەگەڵ ڕۆحیەتیدا لە کێشە و ململانێدا بوون‌و هەندێك جار یەکێکیان بەسەر ئەویتریاندا زاڵ دەبوو، بەڵام لەسەردەمی ژیانی ئەودا هیچ یەکە لەم دوو هەستە نەیانتوانی دەربکەون. لەم ڕووەوە دەبینین ئیبن خەلدون لەسەرەتای کارەکەدا بەهەوڵێکی تەواوەوە دەستی دایە بەدەستهێنانی زانست و هێندەی نەخایاند کەخۆشەویستی پلەو پایە ئەوی ڕاکێشایە ناو گۆڕەپانی سیاسەتەوەو نزیکەی چارەکەسەدە یەك ڕووبەڕووی چەندین ڕووداوی ترسناك بوویەوە، بەڵام لەم ماوە یەشدا دیسانەوە وازی لەزانست وئەدەب نەهێناو هەرکات هەلێکی بۆ بڕەخسایە زانست‌و زانیاری خۆی زیاد دەکرد. سەرەڕای ئەمەش زۆرترینی کاتەکان هەستی دەکرد پێویستە خۆی لەم ژیانە جەنجاڵە سیاسیە ڕزگاربکات تاوەکو بتوانێت کاتی هەبێت بۆ خویندنەوەو لێکۆڵینەوە لەزانستەکاندا. ئەم هەستە بەرۆکی بەر نەداو تاوەکو سەرئەنجام لەکاری سیاسی دوور کەوتەوەو پەنای بردە بەر گۆشە گیری. دیارە کەئەو پێشەکیەکەی لەم ماوەی گۆشە گیریەدا نوسیوە، چونکە بواری بیرکردنەوەی زیاتری هەبووە، بەڵام ئەوەش لەیاد نەکەین کە کێشەو ئاڵۆزیە سیاسیەکان ئەزموونێکی زۆری بۆ ئەم تێدا بوو

---

[54] ئیبن خەلدون لە التعریف دا لەچەندین شوێندا ناوی براکانی دەهێنێت.

لە نوسینی پێشەکیدا ڕۆڵێکی بەرچاویان گێڕا، چونکە ئەو ئەزمونە کۆکراوەکانی لەپاش ئەنزوا (گۆشەگیری)لە پێشەکیدا نوسی و دەتوانین ئەوە بڵێین کەهەردوو هەستی ناوبراو ڕۆڵو کاریگەریەکی زۆریان هەبوو چ حەزکردن لە پلە و پایەو چ دڵخوازیەکەی بۆ زانست و زانیاری کەوایان لێ کرد ڕاپەڕێتو لە گۆڕەپانی ئەو ژیانەدا بیر بکاتەوە ولەڕووی تیۆریەوە ڕێکیان بخات و بۆئەوەی لەئەزمونە ناوبراوەکان یاساو ڕێسای کاری فەرمانڕەوایی دابنێت و بیانخاتە سەر خەرمانی زانستی کۆمەڵناسی.

## تێڕوانینێکی گشتی بۆ ژیانی خێزانی ئیبن خەلدون

دانەر لەتەمەنی پێنجساڵیدا باپیرەی لەدەستداو لەحەڤدە ساڵیشدا باوکو دایکی لەکاتی بڵاو بوونەوەی پەتایەکی گەورە کەلە سەرانسەری مەشریق و مەغریبی جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بوویەوە کۆچی دواییان کرد، بەم شێوەیە ئیبن خەلدون لەیەك کاتدا لە سۆزی دایكو باوکی بێبەش بوو، هەرئەم بێبەش بوونەی لەسۆزی دایك و باوك وایکرد کەئیبن خەلدون زۆر وابەستەی زێدەکەی نەبێت و وای لێبکات لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر کۆچ بکات و یارمەتی بدات تاوەکو لە گێژاوی دونیای ئاڵۆزی سیاسەتدا ڕۆ بچێت. ئەو کاتێك کەلە مەغریبی ناوە ڕاست بوو هاوسەرگیری ئەنجامداو بوویە خاوەنی چەند منداڵێكو ئەرکی خێزانداری کەوتە ئەستۆ، بەڵام هەرلە سەردەمی لاویدا خوی گرتبوو بە گەشتو گەڕانەوە. هەر بۆیە خێزانداری لەم ڕەوتەی ژیانی نەگۆڕیو هەرکات کە سەفەری بکردایە بۆهەرشارێك پێشتر خۆی دە ڕۆشت و دوای ئەوەی کەجێگیر دە بوو خیزانەکەشی دەبرد بۆلای خۆی. ئەم بارودۆخەش چەندین جارلە ژیانی ناو براودا دووبارە بووەتەوە، کاتێك کۆچی کرد بۆ ئەندەلوس ژن و منداڵەکەی دایە دەستی خاڵەکانی بۆئەوەی لەقوستەنتینیە بمێننەوە و نەیانهێننە غەرناتە بۆلای ئەو، مەگەر تا ئەو کاتەنەبێت کە بەتەواوی جێگیر بێت، دیارە پاش گەشتنی خێزانەکەی بۆ ئەندەلوس یەکساڵ زیاتر لەوێیش نەمایەوەو بەرەو بجایە کۆچی کرد و جارێکی تر کەوتەوە ناو

گۆماوی سیاسەتەوە. هەروەها کاتێك لە تونسەوە چویە میسر خێزانەکەی هەرلە ماڵەکەی خۆیدا بەجێهێشت و بانگهێشتی نەکردن بۆ قاهیرە، مەگەرکاتێك نەبێت کە لەویدا جێگیر ببێتو ببێتە وانە بێژ، بەڵام ئەمجارەیان دیداری خانەوادەکەی نەبووە نسیبی‌و لەکاتی گەشتنی ئەوکەشتیەی کەماڵ و خێزانەکەدی هەڵگرتبوو ژێر ئاو دەکەوێت و هەمووسەرنشینەکانی دەمرن و بۆ یەکجاری بێبەش دەبێت لە دیداریان.

# ٣- سەردەمی ئیبن خەلدون

ئەو سەردەمەی کەئیبن خەلدون تێیدا دەژیا، واتە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی کۆچی بەرامبەرە لەگەڵ سەدەی چواردەیەمی زایینیدا، بەسەردەمی لافاوو زریانی ئاڵۆزیەکان ناسراوە لەسەردەمی شارستانیەتی ئەوکاتەدا هێڵی ڕێڕەوی ئەم گۆڕانکاریانەش بەم شێوەیە بوو کەجیهانی ئیسلامی و عەرەبی بەرەو پارچە بوون دوڕۆشتو جیهانی ئەوروپا (مغرب)بەرەو بێداری هەنگاوی دەنا، لەم ڕووە جێی خۆیەتی کەهەردوو جیهان بە شێوەیەکی جیاواز شرۆڤە بکەین:

## ١- دونیای عەرەب:

جیهانی عەرەبی لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا دەبوو بە دوو بەشی سەرەکیەوە: مەغریب و مەشریق. ئەو وولاتانەی کەدەکەوتنە نێوان میسرو ئۆقیانوسی ئەتڵەسیەوە پێیان دەگوتن مەغریب، میسرو مەملەکەتە عەرەبی زمانەکانی دوای ئەو وەك عێراقو شام و حیجازو... هتد بە مەشریق بەناوبانگ بوون. ئەندەلوس هەرچەندە لە ڕووی جوگرافیاییەوە سەربە وولاتی مەغریب بوو بە لام جیاش بوو لەو وولاتانەی کەبەتەواوی پێیان دەگوتن مەغریب.

## ئەلیف – ئەندەلوس

زۆربەی شارەعەرەبیەکان لەو ڕۆژگارەدا لەژێر کۆنترۆڵی عەرەب دەرچو بوون‌و کەتبوونە ژێر فەرمانڕەوایی ئیسپانیەکانەوە، لەوانەش گرنگترین ناوەندی شارستانیەتی

ئەندەلوس وەك تەلیتلە (تولدو)و قورتبە (كوردو)تاوەكو ئیشبیلیە لەژێر دەسەڵاتی عەرەبدا نەمابوو. زۆرێك لەدانیشتوانەكانیشیان بەرەو مەغریب و ئەفریقا كۆچیان كردبوو (مەراكیش و تونس). تەنها ڕووبەرێكی كەم لەئەندەلوس لەژێر دەستی عەرەبەكاندا مابوویەوە، واتە باشوری خۆرئاوای ئەو وولاتە لەنێوان غەرناتەو ئەلمریەو جبل فەتح كە بەنوئەلئەحمەرەكان فەرمان ڕەوابوون تێیدا، بەڵام فەرمانڕەوایانی ئەم خانەدانانە بەردەوام لەكێشە وململانێدا بوون لەسەر دەسەڵات وهەندێك جاریش لەگەڵ سوڵتانەكانی مەغریبدا دەكەوتنە كێشەوە. لەزۆربەی كاتەكاندا شازادەكان ئەگەر ئەندەلوسی بوونایە دەستیان بدایاتە كودەتاو سەرنەكەوتنایە دەچونە مەغریبو ئەگەر لە فەرمانڕەواكانی مەغریب بوونایە ئەواپەنایان دەبردە ئەندەلوس، ئەگەر بهاتبایەو كێشە لەنێوان ئەم دوو دەسەڵاتەدا دروستبوایە ئەوا هەریەكەو پەناهەندەكانیان لەدژی یەكتری بەكار دەهێنا بەمەبەستی ئاژاوەنانەوە لە وولاتی بەرامبەردا. ئیبن خەلدون دووبارە بەرەو ئەندەلوس كۆچی كردەوە. لەقۆناغی یەكەمدا سێ ساڵ لەوێدا مایەوەو لەپاشان بەشێوەیەكی ئازادانە ئەو وولاتەی بە جێهێشتو جاری دووەم بێجگە لەچەند مانگێك لە ئەندەلوس نەمایەوەو بەناچاری ئەوشارەی بەجێهێشت.

## ب - مەغریبی عەرەبی

وولاتی مەغریب لەسەرەتای دەستپێكردنی دەوڵەتی مووەحیدانەوە بوویە سێ پارچە كەسێ خانەدان فەرمانڕەواییان دەكرد: خانەدانی مەرینی لە مەغریب دور (اقصی)و خانەدانی عبدالواد لە مەغریبی ناوە ڕاست و خانەدانی حەفس لەمەغریبی نزیك (ادنی) كەپێیان دەگوت ئەفریقا.

١ – دەوڵەتی خانەدانی عبدالواحید لەهەردوو دەوڵەتی تر لاواز تربوو هەمیشە دەكەوتە بەر كێشەو گرفتی دەوڵەتانی دراوسێیەوە، چونكە بەدوو دەوڵەتی بەهێزتر لە خۆی دەورە درابوو، ناچاربوو هەمیشە هێزەكانی خۆی لەهەر دوولاوە جێگیر بكاتو

لەهەردوو بەرەوە بەکاریان بهێنێت. سەرە ڕای ئەمەش شاری تلمسان کەپێتەختی ئەم وڵاتە بوو لەشاری فاس کەپێتەختی مەرینییان کەلەمان بەهێز تر بوون هێندە دوور نەبوو، هەر بۆیە سنورەکانی ئەم دەوڵەتە بەردەوام لەگۆڕانکاری جوگرافیدا بوو، واتە هەندێك جار گەورە دبوو هەندێك جاریش سنورەکەی کەم دەبوویەوە. یان جاری واهەبوو بەتەواوی ئەو دەوڵەتە دەڕووخا، چونکە چەندین جار مەرینییەکان هێرشیان بۆ دەهێنان و وڵاتەکەیان داگیردەکردو سەرکردە و ئەمیرە کانیان ئاوارەی شاخ و دەشتو وڵاتەعەرەبیەکانی دراوسێ دەبوون و چاوەڕێیان دەکرد تاوەکو هەلی گونجاویان بۆ بڕەخسێت و وڵاتەکەیان ڕزگار بکەنەوە. بارودۆخی هەردوو دەوڵەتی مەرینی و حەفسی بەبەراورد لەگەڵ دەوڵەتی عبدالواد دا خۆڕاگر تربوو، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئارامیەکەی ئەوانیش ڕێژەیی بوو، چونکە خەڵکانی ئەو دوو فەرمانڕەواییەش بێدەنگ دانەدەنیشتن و هەندێك جار لەدژی فەرمان ڕەواکانیان کودەتایان دەکرد، هەربۆیە لە زۆربەی کاتەکاندا سوڵتان و دەسەلاتدارەکان وڵاتەکەی خۆیان بەسەر منداڵە کانیاندا دابەشدەکردو ئەوکات ئەوان بەدرێژایی ژیانیان لەدەسەلاتدا دەبوون و لەپاش مەرگیشیان منداڵەکانیان دەچونە دەسەلاتەوە. ئەم شازادانەش سەرەڕای خزمایەتی نزیکیان بۆ فراوانخوازی دەکەوتنە شەڕەوە لە گەڵ یەکتریدا. مێژووش باسی لە جەنگی نێوان باوکان و کوڕان کردووە لەسەر دەسەلات، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کەفەرمان ڕەوایانی ناوچە بچوکەکان چاوبڕنە ناوچەکانیان (واتەناوچەی جەنگ و ئاڵۆزیەکان)و سەربەخۆییان ڕادەگەیاندو دەوڵەتی نیمچە سەربەخۆ تەنها بەناو پەیوەندی بەدەوڵەتی ناوەندەوە هەبوو. چەندین جاریش ئەوە بینراوە کە هەندێك لەوەزیران پلانیان دادەناو سوڵتانیان لادەبردو بۆئەوەی دەسەلاتی خۆیان بسەپێنن، کەسێکی لاوازیان لەجێگەکەیدا دادەنا. ئەم کەسانەش بۆ ماوەیەکی دورو درێژ نەیاندەتوانی لەدەسەلاتدا بمێننەوە، چونکە ئەم جۆرە کودەتایانە تەماعی خەڵکانی تری دەجوولاند و ڕێگە خۆشکەر دەبوو بۆ کودەتای زیاتر و ماوەیەکی بۆ هێمنی و ئارامی نەدە هێشتەوە، و کودەتای یەك لەدوای یەك بەرۆکی دەوڵەتانی

دەگرت. ئیبن خەلدون لەوەهاسەردەمێکی پڕ جۆش و خرۆشدا کەئاگری جۆرە ها شەڕوو ئاشوب بڵێسەی دەهات و نزیکەی یەك چارەکە سەدە دیسانەوە کەوتەوە ناو گۆماوی سیاسەتەوە. ئەو زۆرترینی ساڵەکانی ژیانی سیاسی لە وولاتی مەغریبدا بەسەربرد کەبە بنەڕەتی هەموو کێشەو ئاژاوەکان دەژمێردرا.

٢ — بۆڕۆشن بوونەوەی ئەو کودەتا سیاسیانەی کەپەیاپەی لە وولاتی مەغریبدا ڕوویان دەدا، باشتروایە هەندێك لەو ڕووداوانەی کەلە سەردەمی ژیانی ئیبن خەلدوندا هاتوونەتە ئاراوە وەیاد بهێنینەوە:

أ — سوڵتانی مەرینی ئەبولحەسەن، کاتێك گەشتەدەسەلات هەوڵی دەدا کە سنورەکانی وولاتەکەی فراوان بکات. لەم ڕووەوە تەلمسانی داگیر کردو دەوڵەتی خانەدانی عبدالوادی لەناو برد و بەردەوام بوو لەسەر جەنگ و فراوانخوازیەکانی. ئەوەبوو بەرەو مەشریق ڕۆشت و بجایە کەلە شارەکانی ئەفریقا بو داگیری کردو شازادەی حەفسیو شازادەکانی تر کەلەو ێدا فەرمان ڕەوا بوون ناردنی بۆ تلمسان و ناچاری کردن کەدوور لەوولاتی خۆیان بژین. لەپاشان قوستەنتینییەی داگیر کردو شازادەی حەفسی فەرمان ڕەوای دوور خستەوە بۆ فاسو بەردەوام بوو لەسەر لەشکر کێشیەکانی بەرەو خۆرهەلات (مشرق)و تاوەکو تونسی داگیر کرد. بەم سەرکەوتنە توانی هەموو وولاتی خۆرئاوا (مغرب)ی نزیكو ناوەڕاست هەرلە دورگەی قابسەوە تاوەکو ئۆقیا نوسی ئەتڵەسی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. ئیبن خەلدون لەم کاتەدا شازدە ساڵان بوو.

ب — بەڵام فەرمان ڕەوایی ئەم سوڵتانەی مەرینی بەسەرتونسدا دوو ساڵ زیاتری نەخایاند، چونکە ئەو هۆزانەی کەلە فەتحی ئەندەلوسدا هاوکاری ئەمیان کردبوو پاش ساڵێك لەدژی وەستانەوەو ئەویان لەقەیرەوان گەمارۆداو کاتێك هەواڵی ڕووداوی قەیرەوان گەشتەوە تونس ڕاپەڕینی خەڵکی تونس زیاتر پەرەی سەندو لەدژی دەسەلاتدارانی مەرینی شۆڕشیان کردو لە پایتەختدا گەمارۆیان دان و پشتگیری خۆیان بۆ حەفسییەکان دەربڕی. لەپاش ماوەیەکی کەم خەڵکی قوستەنتینیەچاویان لە خەڵکی تونس کردو

لەدژی فەرمانڕەوایی مەرینییەکان کودەتایان ئەنجامدا. سولتان ئەبولحەسەن پاش ئەوەی کە بۆ ماوەیەك لەقەیرەوان لەگەمارۆدا بوو توانی دۆستایەتی هەندێك لەهۆزەکان بەدەست بهێنێتو گەمارۆکەی شکاندو بەرەو شاری سوسە ڕۆیشت و لەوێشەوە بەرێگەی دەریا بەرەو تونس کەوتەڕێ و لەتونس سەرکەوت بەسەر شۆڕش گێڕانداو گەمارۆ دراوانی قەلاکەی ڕزگار کرد. بەم شێوەیە دوبارە جارێکی تر فەرمان ڕەوایی ئەو ناوچەیەی گرتەوە دەست، بەلام هێشتا ئاگری ئەم شۆڕشە نەکوژابویەوە کەهەواڵیان بۆهێنا کوڕەکەی ئەبوعەنان لەژێر فەرمانی ئەم دەرچووە و دەستی داوەتە کودەتاو سەربەخۆیی شاری فاسی ڕاگەیاندووە و خۆی بەسولتانی مەغریب ناساندووە. لەم ڕووەوە سولتان ئەبولحەسەن بۆ کپ کردنەوەی شۆڕشی کوڕەکەی بەپەلە تونسی بەجێهێشتو بەرێگەی دەریا بەرەو شاری فاس بەرێکەوتو کوڕەکەی تری لەتونس بەجێنشینی خۆی دانا بەفەرمان ڕەوای ئەفریقا.

ج – بەلام گروپە حەفسییەکان بۆ ڕەها بونیان لەژێر دەستی حوکمی مەرینیەکان بێ وەستان سودیان لەم ڕووداوانە وەرگرت. هەربۆیە ئیبن تافراکین ئەو وەزیرە ناوبراوەی کەرێبەری شۆڕشی تونسیەکانی دەکرد لەدژی سولتان ئەبولحەسەن و لەپاش داگیر کردنی تونس لەلایەن سولتانەوە بەرەو ئەسکەندەریە هەلهاتبو، بەبێ وەستان بەرەو تونس ڕۆشت و سەرکەوت بەسەر نایب سولتانداو لەئەفریقا کردیە دەرەوە. ئەبوئیسحاقی حەفسی لەسەر دەسەلات داناو خۆی بەکەفالەت کاروباری دەولەتی بەڕێوەدەبرد. ئیبن خەلدون لەم سەردەمەدا چویە ناوژیانی کۆمەلایەتیەوە و ئیبن تافراکین بەجێگری خۆی دیاری کرد و پلەی (توغرا نوسی)پێبەخشی.

د – بەلام سەلتەنەتی ئەبو ئیسحاق لەژێر چاودێری ئیبن تافراکیندا بۆ فەرمان ڕەوای قوستەنتینە قورس بوو، چونکە ئەو یەکێك بوو لەشازادە حەفسییەکان و خۆی بەشایستە تردەزانی بۆ سولتانی، هەربۆیە دەستی کردە کودەتاو بەرەو تونس لەشکرکێشی کردو گەمارۆی دا، بەلام لەماوەی ئەم گەمارۆیەدا هەواڵەکانی مەغریبی

ناوەڕاستی زۆربە کەمی و ئالۆزی پێدەگەیشت و ئاگاداربوویەوە کەسوڵتانی مەرینی بەرەو خۆرهەلاَت لەشکرکێشی کردووە و جارێکی تر تلمسان وبجایەی داگیر کردووەتەوەو سوپاکەی گەشتونەتە نزیك قوستەنتینە، هەربۆیە شازادەی حەفسی وازی لە گەمارۆی تونس هێناو ویستی بەرەو بارەگای سەرەکی خۆی بگەڕێتەوە بۆئەوەی بەرگری بکاتو ڕێگە لەداگیر کاری مەرینییەکان بگرێت. ئیبن خەلدون لەیەکەمین پێکدادان کەلە نێوان چەکدارانی شازادەی قوستەنتینەو سوپای سوڵتانی تونسدا ڕوویدا، ئامادە بوو، بەلاَم پاش ئەم پێکدادانە ئەفریقای بەجێهێشت و بەرەو تونس بەڕێکەوت.

هـ — بەلاَم سوڵتان ئەبولحەسەنی مەرینی کەتونسی لەڕێگەی دەریاوە بەجێهێشتبو بۆئەوەی بتوانێت شۆڕشی کوڕەکەی کپ بکاتەوە، هەروەك باسمان کرد، بەوهەموو ئازارەی کەلەم ڕێگایەدا بینی، بەلاَم نەیتوانی تاج و تەخت لەکوڕەکەی بسەنێتەوە، چونکە هێزە دەریا ییەکەی ڕووبەڕووی تۆفانێکی بەهێز بوویەوە و هەموو کەشتیەکانیان نغرۆ بوون، بەلاَم سوڵتان بەهەرشێوەیەك بوو ڕزگاری بوو خۆی گەیاندە کەنارو بەرەو جەزائیر ڕۆیشت و ژمارە یەك خەڵکی لەدەور کۆبونەوە و توانی لەڕێگەی بیابانەوە خۆی بگەیەنێتە مەراکیش، بەلاَم لە ڕێگەدا بەهۆی ئەو پێکدادانەی کەلەنێوان سوپاکەی ئەم و لەشکری کوڕەکەیدا ڕوویدا هێزەکەی شکان و پاش چەند ڕۆژێك ماڵئاوایی لەژیان کرد. بەم شێوەیە ئەبو عەنان بەبێ هیچ ڕەقیبێك سەڵتەنەتی مەغریبی گرتەدەست.

و — ئەبوعەنان کاتێك لەسەردەمی ژیانی باوکیدا خۆی بەسوڵتانی مەغریب دابوویە قەڵەمو لەدژی ئەو شۆڕشی بەرپا کرد چەندین پلانی چارەسەری دانا بۆئەوەی ڕێگری لەگەڕانەوەی باوکی بکات بۆبارەگای سەڵتەنەت، لەوانەش هەردوو شازادەی حەفسی کە لەفاسو تلمسان دەژیان گێڕانیەوە بۆ ناوەندی سەرەکیان لە بجایەو قوستەنتینەو مەرجی لەگەڵداکردن کەلەبەرامبەری سوڵتان ئەبولحەسەندا بەرگری بکەنو ڕێگەی نەدەن کەلەڕێگەی مەغریبی سەرەوە بەم دوو شارەدا تێپەڕ بکات. دیارە کە ئەم پلانەبوویە هۆی ئەوەی هەردوو ناوچەی میرنشینی کەلەپێش باوکیەوە داگیری کرد بوون لەدەست

بدات. گومانیش لەوەدا نەبو خانەدانی عبدالواد کەچاوەڕێی هەلێك بوون بۆ بەدەستهێنانی فەرمان ڕەوایی بەبێ وەستان لەم ڕووداوانە زۆرترین سودیان وەرگرتو بەبێ ڕەنج و زەحمەت گەڕانەوە پایتەختی خۆیانو ئەوسنورانەی کەلەپێشدا هەیان بوون کەبەر لەداگیرکاریەکانی سوڵتان ئەبولحەسەن لەدەستیاندا بووبەدەستیان هێنایەوە، بەڵام سوڵتان ئەبو عەنان کەبێ باك بوو لەوەی کە دەستی باوکی پێ ناگاتو بەدڵێکی بێ خەمەوە فەرمان ڕەوایی دەکرد، بڕیاری دا ئەو وولاّتانەی کەلە ڕووداوەکانی ئەم دواییەدا لەژێر فەرمان ڕەوایی مەرینیەکاندا نەمابوون بەدەستیان بهێنێتەوە، هەربۆیە بڕیاری دا سوپاکەی بۆ ئەم مەبەستە تەیار بکات و هەرئەوەندە کەسوپاکەی ئامادە بوو بێ وەستان هێرشی کردە سەر تلمسانو داگیری کردو بەرەو بجایەش ڕۆشتو خستیە ژێرکۆنترۆڵی خۆیەوە وجارێکی تر شازادەی حەفسی ئەو ناوچەیەی بەرەو فاس دوورخستەوە. ئیبن خەلدون لەماوەی ئەم لەشکر کێشییەدا پەیوەندی کرد بە ئەبوعەنانەوە و لەکۆشکەکەیدا ئەرکی پێ سپێردرا. لەم کاتەدا تەمەنی بیست و سێ ساڵ بوو.

ز – پاش ئەو ڕووداوانەی کەڕوویاندا هێندەی نەبرد کەژیانی سوڵتان ئەبوعەنان کۆتایی هاتو لەماوەی نەخۆشیەکەیدا چەندین ئاڵۆزی و کودەتا ڕوویانداو هەموو ناوچەکانی مەغریبی ناوەڕاستی گرتەوە. لەوکاتەی کەسوڵتان لەگیانەلاّ دابوو وە زیرێکی بەناوی حەسەنی کوڕی عومەر کاروو باری وولاّتی گرتە دەست و کوڕە بچوکی سوڵتان ئەبولحەسەنی ناسراو بەسوڵتان سەعیدی کردە جێنشینو خۆی کردە کەفیلی و کاروو بارەکانی بۆ بەڕێوە دە برد، بەڵام شازادە کانی تری مەرینی ئەم کارەیان بەلاوە پەسەند نەبوو سەعیدیان بە فەڕمی نەناسیو لەدەوری شازادە مەنسور کۆبوونەوەو وەزیرو سوڵتانەبچکۆلەکەیان لەشاری فاسدا گەمارۆدا. لەکاتی ئەو کێشەو گرفتەی نێوان ئەم دوو گرووپە لەسەرتاج و تەختی شاهانە لەپڕ بانگەشە کاری سێیەم هاتە گۆڕەپانەکەوەو بەیەکجاری کارەکەی دژوار ترو ئاڵۆز تر کرد. ئەم بانگەشە کارەش ئەبو سالمی کوڕی

سوڵتان ئەبولحەسەن بوو. لەو کاتەی کەسوڵتان ئەبو عەنان دەستی دایە دژایەتی باوکی براکانی دەستگیر کردو دوری خستنەوە بۆ ئەندەلوس. ئەبو سالمیش لەدورخراوەکان بوو، هەربۆیە لەوکاتەی هەواڵی مەرگی براکەی بیست بەپەلە لەئەندەلوس گەڕایەوەو بەهەموو شێوازێك دەستی کردە بانگەشە بۆ خۆی کەشیاوی سەڵتەنەتە، سەرئەنجام گروپێکی زۆری لەدەور کۆ بویەوەو زاڵ بوو بەسەر هێزی هەردوو لادا، واتە هەم سوپاکەی سەعیدو هەم شوینکەوتووەکانی مەنسور. بەم شێوەیە سوڵتان ئەبو سالم گەشتە سەڵتەنەتی مەغریبی سەرەوە. ئیبن خەلدون لەکاتی ڕوودانی ئەم ڕووداوە ئاڵۆزانەدا لە شاری فاس نیشتەجێ بوو، هاوکاری سوڵتانی دەکردو بۆ ماوەیەك لە دەربارەکەیدا مایەوە. پێویستە ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە هەرلاپەڕەیەك لەو ڕووداوانەی کە کورتمان کردەوە، هاوکات بووە لەگەڵ کۆمەڵێك ڕووداو هەورازو نشێوی سیاسی ناوچەییو لاوەکیدا کەلێرەدا پێویست ناکات بەدرێژی باسیان بکەین.

هەروەها پێویستە ئاگاداری ئەوەبین هەموو ئەم کێشەو ئاڵۆزیانە لەماوەیەکی کەمدا سەریان هەڵداوە، هەروەك چۆن مێژووی دەست بەسەرداگرتنی مەرینییەکان بەسەرتونسدا لەساڵی (٧٤٨ ك –١٣٤٧ ز)و مێژووی گەشتنی ئەبوسالم بەسەڵتەنەتی فاس لەساڵی (٧٦٠ ك – ١٣٥٨ ز)دابووە، واتە هەموو ئەو ڕووداوانەی کەباسمان کرد لە ماوەی بیستویەك ساڵدا ڕوویانداوە. ساڵەکانی ناوبراو لەو ڕۆژگارانەیە کەپڕیەتی لە ڕووداوو کودەتای سەرسوڕ هێنەرو نائاسایی. بەڵگە مێژووییە کان هیچ شك و گومانێك ناهێڵنەوە کەبڵێین بارودۆخی سیاسی مەغریبی عەرەبی و بەتایبەت مەغریبی ناوەڕاست دوچاری چەندین کێشە بووەتەوە. گرنگترین ئەو هۆکارانەی کەلەم کودەتایانەدا بەکارهێنراون عەشایەرە دەشتەکیەکان و بەر بەرەکان بوون کەلەسەرانسەری ناوچەکانی مەغریبدا بڵاوەیان کردووە. ئیتر وەك یارمەتی سەربازی بوبێت یان وەك خزمەتو هاوکاری. سەرەڕای ئەمەش هەندێك لەعەشایەرەکان لەسەرشێوەی دەوڵەتی بچوك بچوك کە بەبیانوی پارێزگاریەوە باجیان لە خەڵکەکەی خۆیان کۆدەکردەو هەشیان بوو یەك

دینار باجی نەدەداو بەپێی بارودۆخ‌و بەرژەوەندیان هاوکاری ئەم سوڵتان‌و ئەوپاشایان دەکرد. گومانیش لەوەدا نیە کە چەکدارانی ئەم هۆزانە پشتیوانیان لە هەر لایەنێك کردبێت ئەوا جەنگ لەبەرژەوەندی ئەودا کۆتایی هاتووە. ئیبن خەلدون بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەگەڵ عەشایەرە دەشتەکیەکاندا ژیاوەو ئەزمونێکی زۆری لە لێهاتوویی‌و ژیری‌و بیر تیژی بەدەستهێناوە. گومانیش لەوەدا نیە کە نوسینەکانی ئیبن خەلدون لەبارەی مێژووی دەشتەکیەکانەوە ئیلهامی لەو ژیانە وەرگرتووە کە ئەو ماوەیە لەگەڵیاندا ژیاوە و ئەزمونی وەرگرتووە. زۆر بەسودە ئەگەر باس لەژیانی یەکێك لە شازادەکان کە هاوچەرخی ئیبن خەلدون بووە و پەیوەندی بەهێزی لەگەڵیدا هەبووە بکەین، تاوەکو یارمەتی دەربێت بۆ زیاتر ناسینی ژیانی مێژو و کاریگەریەکانی ئەم گۆڕانکاریە سیاسیانە لەسەر ژیانی ئیبن خەلدون ڕوون ببێتەوە:

أ- شازادەی حەفسی محمدی کوڕی عبدالله لەلایەن سوڵتانی ئەفریقاوە کرابویە فەرمانڕەوای بجایە.

ب- ئەو کاتێك سوڵتان ئەبولحەسەنی مەرینی لەدژی هەستا دەسەڵاتی لەدەست دابوو.

ج – بەڵام کاتێك سوڵتان ئەبو عەنان لەدژی باوکی کودەتای کردو گەشتە دەسەڵات گەڕایەوە بۆ بارەگای سەرەکی خۆی‌و، بڕیاری دا شازادە حەفسیەکان هان بدات بۆ ئەوەی لەدژی باوکی بەرگری بکەن و ڕێگە نەدەن بگەڕێتەوە بۆ نیشتیمانەکەی.

د – کاتێك سوڵتان ئەبو عەنان گەشتە دەسەڵات و پاش مردنی باوکی بجایەی گرتەدەست‌و دیسانەوە ئەو دەسەڵاتەی لەدەست داو دوور لە بارەگای سەرەکی خۆی ژیانی بەسەر برد.

ه – کاتێك سوڵتان ئەبو عەنان نەخۆش کەوت ئەمیرمحمد بڕیاری دا لەفاس بچێتە دەرەوە تاوەکو جارێکی تر فەرمانڕەوایی بەدەست بهێنێتەوە، بەڵام سوڵتان بە پلانەکەی زانی و نەخشەکەی تێك دا.

و – لەگەڵ ئەمەشدا شازادەی ناوبراو توانی لەپاش مەرگی سوڵتانی ناوبراوی فاس وازلێ بهێنێتو بەرەو بارەگای سەرەکی خۆی بڕوات، بەڵام مامی ئەو ئەبو ئیسحاقی حەفسی لەپێش ئەمەوە دەستی بەسەر بجایەدا گرت و ئەو ناچاربوو شارەکە گەمارۆ بدات و لەپێناو ڕزگار کردنی شارەکەدا لەژێر دەستی مامی هەوڵ و کۆششێکی زۆری دا.

ز – بەڵام شازادەی ناوبراو کاتێك دەستی بەسەر بجایەدا گرت بە هێمنیەوە دەستی کردە فەرمانڕەوایی کردن و کتوپڕ ڕووبەڕووی دوژمنێکی سەرسەخت بویەوە. کوڕە مامەکەی کەفەرمان ڕەوای قوستەنتینە بو هەوڵی فراوان خوازی وولاتەکەی دەدا بەرەو بجایە هێرشی کردو لەو ڕووبە ڕوو بونەوەی نێوان هەردو سوپادا ئەمیر محمد کوژرا. ئیبن خەلدون لەوکاتەی کەئەم شازادە حەفسییە دوور خرابوویەوە بۆفاس هاوڕێی بوو بەجۆرێك کاتێك کە وویستی لەبجایە بڕوات زیندانی کراو لەپاشان کرایەوە بە سەدری ئەعزەم.

## ج – خۆرهەڵاتی عەرەبی ( مشرق العربی )

بەمیسرو مەمالیکەکانی شامیان دەگوت و لەو ڕۆژگارەدا، کەبارو دۆخی سیاسی لەم وولاتانەدا بەبەراورد لەگەڵ مەغریبدا بەچەند پلەیەك هێمن و ئارام تر بوو. ئەوە ڕاستە کەمردنی سوڵتانەکان بارودۆخێکی نەخوازراوی دەهێنایە ئاراوە، بەڵام ئەم کێشانە بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان خودی مەمالیکەکاندا دروست دەبوو گروپو تاقمی ناوچەکان کەمتر بەشداریان تێدا دەکرد. ئیبن خەلدون بیست وچوارساڵی کۆتایی تەمەنی خۆی لە مەشریق (میسر)بردە سەر، بەڵام ڕۆشتنی ئەو بۆئەم وولاتە کاتێ بوو کە پێشەکی گەیاندبووە کۆتایی و لەوێدا سەرقاڵی وانە ووتنەوەو داوەری کردن بوو هیچ دەستوەردانێکی لەکاری سیاسیدا نەدەکرد. عێراق لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا لەژێر فەرمانی جەلایریەکاندا بوو تائەوکاتەی کەتەیمور داگیری کرد، بەڵام فەرمانڕەوایی جەلایریەکان تەنها هەرلە عێراق و ناوچەی عەرەبدا نەبوو بەڵکو لەبەشی خۆرئاوای ئێران

بەتایبەت ویلایەتی ئازەربایجانیشیان بەدەستەوە بوو. سولتانەکانیان بەغدایان کردبووە پێتەختی زستانەو تەبریزیشیان کردبووە پێتەختی هاوینەی خۆیان‌و دەسەلاتیان بەسەر هەردو ناچەی ئێرانی و عەرەبیدا هەبوو، بەلام ئیبن خەلدون نەچویە عێراق و پەیوەندی بەهیچ کام لەم سولتانانەوە نەکرد.

## یەکیەتی ئەدەبی و ڕۆشنبیری جیهانی عەرەبی

لەو خالانەی کەجێی سەرنجە ئەوە یە کەجیهانی عەرەبی لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا سەرەڕای ئەو کەرت بوونە سیاسیەی کەباسمان کرد، خاوەن یەکیەتیەکی ئەدەبی‌و فەرهەنگی تەواو بوو، هەر وەك چۆن یەکیەتی زمان ناوچە جۆراو جۆرو وولاتە عەرەبیە جیاوازەکانی پەیوەست دەکرد بەیەکەوەو پەیوەندی گەلێکی مەعنەوی لەنێوانیاندا بەدی دەهات‌و بیرو ڕۆحیەتیانی لەیەکتر نزیك دەکردەوە. وەهەروەها هاتووچۆی بازرگانەکان لە لایەك‌و ئەنجامدانی فەریزەی حەج لەلایەکی ترەوە زەمینەیەکی هەمیشەیی و پایەداری دەهێنایە ئاراوە کەدانیشتوانی ناوچە جیاوازەکان بەئاسانی دەیانتوانی یەکتری بناسن و لەبارودۆخی یەکتری تێبگەن. ئەم حالەتەش یارمەتیدەربوو بۆ گۆڕینەوەی بیرو بۆچونەکان لەنێوان گەلانی ناوبراوداو هەوالی ژیان و گوزەرانیان لەناوچە جیاوازەکان بلاو دەکردەوە. ئەدیب و فەقیهو زاناکان لە ڕێگەی دانیشتن و گوفتوگۆو نوسینەوە پەیوەندیان بە یەکترەوە دەکرد و بیرو ئەندێشەکانیان لە سەرزەمینێکەوە بۆسەر زەمینێکی تر دەگوازرایەوە. هەلکەوتووە کانیان ناوبانگیان لەسەرتاسەری وولاتە عەرەبیەکاندا پەیدا دەکرد. لەوانەیە لەژیانی خودی ئیبن خەلدون بتوانین باشترین نمونە بۆ ئەم مەبەستە بهێنینەوە. یەکبونێك کەلەگەل ئەهەموو کێشەو هەرا سیاسیانەی وولاتانی ناوبراو لەسەرتاسەری دەلەتانی عەرەبیدا پەلی دەهاویشت، وەهەروەها ئاسانی کۆچی ئیبن خەلدون لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی ترو خێرایی بلاو بوونەوەی ناوبانگەکەی لەسەرانسەری مەم لەکەتە عەرەبیەکاندا بەنمونەیەکی دیاری ئەم یەکیەتیە ئەدەبیە

دەژمێردرێت. هەروەك چۆن دەبینین جارێك لە مزگەوتی گەورەی غەرناتەو جارێکیش لە مزگەوتی گورەی قەرەویەکانی فاس و ماوەیەك لەشاری بجایە و مزگەوتی گەورەی زەیتونیەی تونسدا سەرقاڵی ووتار بێژی وانە ووتنەوە بووە. لەولاشەوە دەبینین پاش ئەوەی لەقاهیرە نیشتەجێ دەبێت لەزانکۆی ئەلئەزهەر دەبێتە وانە بێژو سەرئەنجام لە مەدرەسەی عادلییەی دیمەشق لەگەڵ زانایانی شامدا دەست دەکات بەلێکۆڵینەوە. وەهەروەها هەندێك نوسین کەلەبارەی ژیانی ئیبن خەلدونەوە نوسراون نمونە گەلێکی ئاشکرا دەدەن بەدەستمانەوە، کەسەلمێنەری یەکیەتی فیکریو ئەدەبی جیهانی عەرەبن. کاتێك ئیبن خەلدون لەبیسکەرە دەژیا کە کەوتووەتە مەغریبی ناوەڕاستەوە، نامەیەکی لەوەزیر لیسانەدینی خەتیبەوە کەلەغەرناتە دەژیا پێدەگات کەتێیدا زانای ناوبراو باس لە نوسینەکانی خۆی و ئەورووداوە سیاسیانەی کەلە ئەندەلوس ڕوویانداوە دەکات. لەبەرامبەردا ئیبن خەلدونیش نامەیەکی دوورو درێژی بۆ دەنوسێتو تێیدا باسی ڕووداوەکانی مەغریبی ناوەڕاستی بۆ دەکاتو لەهەواڵە کانی میسریش لیسانەدین ئاگادار دەکاتەوە. کاتێك کەئیبن خەلدون بەمەبەستی بەئەنجام گەیاندنی فەریزەی حەج گەشت دەکات و لەیەنبع دەمێنێتەوە نامەیەکی لە ئیبن زمرکەوە[55] کەسکرتێر (كاتب السر)ی سوڵتان ئیبن ئەحمەربووە لەغەرناتەوەپێدەگات، کە هەندێك هەواڵی تێدایە بۆیو هەندێك قەسیدەی بۆ ناردووەو داوای هەندێك کتێب و زانیاری لە ئیبن خەلدون کردووە.

هەرلەم کاتەدانامەیەکی تری لەعەلی کوڕی حەسەنی نەبیەوە پێگەیشت، کەدادوەری غەرناتەبوو، نیشا ندەری بەئاگایی ئەو دووانەیە لە هەواڵ و زانیار یەکانی وولاتەکانیانو

---

[55] زاناو شاعیرو خەتیبی ناموری ئەندەلوسی کەژیاننامەو هەندێك لە شیعرەکانی لەکتێبی (الاحاطە فی احوال غرناتەدا) هاتوون کەلیسانەدینی خەتیب نوسیویەتی. کەلەساڵی (٧٧٥)لەماڵەکەی خۆیدا بەدەستی ژنەکەی کوژرا. گەڕانەوە بۆ لوغەتنامەی (دهخدا).

وولآتانی تریش[٥٦]. بەکورتی دەتوانین لەوە دڵنیابین کەجیهانی عەرەبی لەو ڕۆژگارەدا لەڕوانگەی ئەدەب و فەرهەنگەوە یەکیەتیەکی بەهێزی هەبووە، هەرچەندە لەڕوی کارو باری سیاسیەوە پڕ بووە لە پارچە پارچەیی و جیاوازی زۆر توند.

## د – جیهانی ئیسلامی

جیهانی عەرەبی لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا پەیوەندی لەگەڵ وولآتانی تری ئیسلامیدا هەبوو، سەرتاسەری ئەم وولآتە لەقۆناغی گۆڕانکاری گرنگدا بووە. لەناوچونی دەوڵەتی سەلجوقی (لەئاسیای بچوک)لەلایەکو دەوڵەتی مەغۆل لەلایەکی ترەوە لە (عێراق و ئێران) بوویە هۆی لێك هەڵوەشانی ئەم دەوڵەتانەو دەوڵەتۆکەو ئەمارەتی بچوکیان لێ دروستبو، بەلآم پاش ئەم قۆناغە دوو بزووتنەوەی بەهێز دروستبون کەئامانجیان یەکیەتی ومەرکەزیەتی ئەم وولآتانە و دژایەتی پارچە پارچە بوونی وولآتانی ناوبراو بوو: یەکێکیان داگیر کاریەکانی تەیمور لەنگ و ئەویتریشیان دامەزراندنی ئالی عوسمان بوو. تەیمور داگیر کاریەکی زۆری کرد و هەموو وولآتە ئاسیاییەکانی هەرلەچینەوە تاوەکو عێراق دا گیرکردو زۆر بەخێرایی لەلایەکەوە بەرەو وولآتی شام و لەلایەکی تریشەوە بەرەو ئاناتولی لەپێشڕە ویدا بوو، بەلآم ئەو دەوڵەتەی کەتەیمور لەسایەی ئەم داگیر کاریانەدا دروستی کرد ماوەیەکی زۆر بەردەوام نەبوو، چونکە دەوڵەتی نابراو بەمردنی ئە پارچەپارچە بوو وولآتەکەی لەنێوان کوڕەکانیو نەوەکانیدا دابەش کرا، بەلآم ئەو دەوڵەتەی کەئالی عوسمان دروستیان کرد بەبەراورد بە دەوڵەتەکەی تەیمور زۆر بەشێوەیەکی لەسەرخۆ دەستی کردبووە فراوان خوازی. هەربۆیە داگیر کاریەکانی ئەم پایە دارتر بوون و سەرئەنجام بارودۆخێکی سیاسی وەهای خولقاند کە بۆ چەندین سەدە

---

[٥٦] دەقی ئەم نامەیە لە کتێبی (التعریف بابن خلدون ورحلتە شرقا وغربا)کەبەگرنگی محمدی کوڕی تاویتی تەنجی بلآو بووەتەوە هاتووە .کەلە لاپەڕەکانی ١١٥ –١٢٨ – ٢٦٢ – ٢٧٧ – بەتایبەت لاپەڕەکانی ١١٨– ١٢٦– ٢٣٧–ی کتێبی ناوبراوی بۆ تەرخان کراوە.

تەمەنی کرد. لەڕاستیدا کاتێك تەیمور بۆ داگیرکردنی ئەنقەرە لەگەڵ دەوڵەتی ئالی عوسماندا کەوتە جەنگەوە، زیانێکی زۆر بەر دەوڵەتی ساوای عوسمانی کەوتو ڕووبەڕووی گرفت گەلێکی زۆر بویەوە، چونکە زیانی ئەو جەنگە بەشکستی سوپای عوسمانی و کوژرانی سوڵتانەکەیان بایەزیدی یەکەم کۆتایی هات.

ئەم ڕووداوەش بویە هۆی دابەشبونی وولات بەسەر هەرچوار کوڕەکەی سوڵتانی ناوبراودا، بەڵام سوڵتان محمدی یەکەم پاش هەوڵ و ماندوو بونێکی زۆر توانی بەسەر بەرامبەرەکانیدا زاڵ ببێت و یەکیەتی ڕابوردووی سەڵتەنەتی عوسمانی نوێبکاتەوە. سەڵتەنەتی ناوبراو پاش تێپەڕاندنی ئەم کێشەو گرفتانە توانی بەشێوەیەکی خێرا گەشە بکات و دەست بکات بەفراوان خوازی بەتایبەت لە کیشوەری ئەورووپادا. ئیبن خەلدون کاتێك تەیمور دیمەشقی گەمارۆ دابوو چاوی بەسوڵتان کەوت و ئەم دیدارە کەپێش شەش ساڵ لەمەرگی ئەو ڕوویدا دەتوانرێت بەکۆتایی چالاکی سیاسی ئەو بژمێردرێت، بەڵام لەگەڵ هیچکام لەسوڵتانە عوسمانیەکاندا کۆنەبوویەوە. ئیبن خەلدون گەشتی بۆ هیچکام لەمەملەکەتە ئیسلامیەکانی دەرەوەی جیهانی عەرەبی نەکرد، بەڵام کتێبی مێژووی ئەو بەوهەموو ناوبانگەوەلەهەموو ئەم مەملەکەتانەدا بڵاوبویەوەو کاریگەریەکی مەعنەوی زۆری هەبوو، چونکە زمانی عەرەبی هاوشان لەگەڵ زمانی زانستیدا بەکاردەهێنرا زانا عوسمانیەکان بەشێوەیەکی گشتی فەرهەنگ و زانیاریەکانیان لەکتێبە عەرەبیەکانەوە وەردەگرت. هەربۆیە گرنگیەکی زۆریان بەفێربوونی دەدا، تەنانەت هەندێك لەکتێبەکانیان بەزمانی عەرەبی دەنوسی. هەربۆیە لەم هەل و مەرجەدا شتێکی ئاساییە کە زاناکانیان شارەزاییان لە پێشەکی هەبێتو بەشێوەیەکی قوڵ بکەونە ژێر کاریگەری پێشەکیەوە. خاڵی جێگەی سەرنج ئەمەیە کەداگیرکاریە یەك لەدوای یەکەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەت لەکیشوەری ئەورووپادا بەشێوەیەکی ئاسایی دەبێتە هۆی دروستبونی کۆمەڵێك مێژوونوسی گەڕۆك، کە بگەڕێن بەشوین چۆنیەتی ڕووداوەکانی ئەم فتوحاتانەدا. ئەم زانایانە مێژووی دەوڵەتی عوسمانیان بە کۆتاو تەواوکەری مێژووی ئیسلام دەزانی،

هەربۆیە گرنگیەکی زۆریان بە خوێندنەوەی کتێبە کۆنە مێژووییەکان دەدا. بمانەوێت و نەمانەوێت مێژووی ئیبن خەلدونیان دەخوێندەوەو لێکۆڵینەوەیان دەکردو مەسەلە گەلێکی زۆریان لێوە دەرهێنا، لەم ڕووەوە دەبینین مێژوو نوسانی عوسمانی یەکەمین کەسانێك بوون کەلەدونیای دەرەوەی جیهانی عەرەبیدا پێشەکی ئیبن خەلدونیان لێکۆڵینەوە کردووەو خوێندویانەتەوە. هەروەك چۆن دەتوانین گرنگیدانی ئەوان بەپێشەکی ئیبن خەلدون بەتەنها هۆکار دابنێین کەسەرنجی خۆرهەڵاتناسانی ئەوروپایان لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدە یەمدا بەلای کتێبی ناوبراودا ڕاکێشا.

## ٢ – ئەوروپا:

ئەوروپا لەو سەردەمەی کەئیبن خەلدون تێیدا دەژیا، نزیك بەکۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەدە نوێکان بوو. ئیبن خەلدون هاو چەرخ بووە لەگەڵ مێژوونوسی فەرەنسی (فرواسار)[٥٧] و شاعیری ئینگلیزی (چوسەر). ئەو پێش پێنج ساڵ لەفرواسار و هەشت ساڵ لەچو سەر لەدایك بووە چوارساڵیش بەرلە یەکەمین و شەش ساڵیش بەرلە دووەمین کۆچی دوایی کردووە. هەروەها ئەو لەنیوەی ژیانیدا هاوچەرخی پترارك و پوکاچیۆی ئیتالی بووە، چونکە ئەو لەکاتی مردنی ئەم دوو ئەدیبەدا نزیکەی چل و پێنج ساڵ بووە، بەڵام هیچکامیان یەکتریان نەناسی و لەبارەی یەکترەوە هیچ زانیاریەکیان پێ نەگەیشت، چونکە دونیای ئەوروپا هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ جیهانی عەرەبیو ئیسلامیدا نەبوو، بەتایبەت لەدوای جەنگە خاچ پەرستیەکانو پێکدادانە خوێناویەکان و بردنی زانستەکان لە جیهانی عەرە بی و ئیسلامیەوە بەتەواوەتی ئەو پەیوەندیە پچڕابوو. بەرلەسەردەمی ئیبن خەلدون لەپێتەختی وڵاتانی ئەوروپایدا زانکۆ گەلێکی زۆر لەسەر شێوەی زانکۆکانی وڵاتانی ئیسلامی درووست کران و زۆرێك

[57] la vie intense

لەنوسینە عەرە بیەکان وەرگێڕدران بۆ سەرزمانی لاتینی و لەم ڕووە وە ئەورووپیەکان بێ نیاز بوبون لەسەرچاوە عەرە بیەکان.

بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم بارودۆخە پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگرین کەئیبن خەلدون یانزە ساڵ دوای مردنی دانتەی شاعیری بەناوبانگی ئیتالی لەتونس هاتووەتە دونیاوە. وەهەروەها تەنها نزیکەی یەك چارەکە سەدە لەپاش مەرگی ئیبن خەلدون لەمیسر، پیشەسازی چاپ لەئەورووپا داهێنراوە. هەرلەم مێژووەدا بوو کەقۆناغی هەستانەوە و گۆڕانکاری فیکری لە ئەورووپا دەستی پێکردو یەکەمین تیشکی خۆری هونەرو پێشکەوتن بەسەر ئەورووپادا درەوشایەوەو دیدو بیری خەڵکی ئەورووپا لایدا بەلای بابەت و چەند لایەنێکی تازەدا. بەکورتی ئەورووپیەکان لەم مێژووەدا وازیان لە گرنگیدان بەڕووداوەکانی جیهانی عەرەبی و بەتایبەت ئەودانراوانەی کەلەو سەرزەمینەدا بلاّو دەبوونەوە هێنا بوو. ئەم بارووددۆخە مێژووییە لە دیاری کردنی بەهای پێشەکی ئیبن خەلدون سەبارەت بە دونیای ئەورووپا کاریگەریەکی گەورەی هەبوو. ئەم پێشەکیە بەهەموو بیروڕا سەرسوڕ هێنەرو نوێکانیەوە لای ئەورووپاییەکان بەنادیاری مایەوە، تا وەکو بەهۆی ئەو هەلومەرجە مێژووییانەی کەباسمان کرد سەردەمی لێکۆڵینەوەی خۆرهەڵاتناسانی ئەورووپایی لە سەدەی نۆزدە یەمدا دەستی پێکردو ئەوکات خەڵکی ئەورووپا لەگرنگی پێشەکیەکەی ئیبن خەلدون تێگەیشتن.

# ٤ - گرنگترین ڕووداوەکانی ژیانی ئیبن خەلدون

ژیانی ئیبن خەلدون بەجۆرێك بوو کە (تئۆدۆر ڕوزفلت)بە (ژیانێکی پڕلەبەسەرهات)[58] ناوی دەبات یان لەو جۆرە بوو کە (موسولینی)بە (ژیانی مەترسی ئامێز)[59] ناو زەدی دەکات، ئەم ژیانە پڕلە بەسەرهات و مەترسیدارە خاوەن لاپەڕەگەلێکی جۆراو جۆرو دیمەنگەلێکی چەند شێوە بوو کەلە خوارەوە بەپێی ڕێکخستنی کاتی ڕاڤەیان دەکەین:

**لەتونس دا:**

ئیبن خەلدون تاوەکو تەمەنی بیست ساڵی لەتونس ژیانی بردەسەرو لەبەرئەوەی کەباوکی لەپیاوانی زانست و ئەدەب بوو زۆر گرنگی بە پەروەردەی ئەو دەدا، واتە خۆی پەروەردەی ناوبراوی گرتەئەستۆو هەندێك لەزانستە سەرەتاییەکانی فێر کردو زانستەکانی تریشی لای مامۆستا گەورەکانی تونس فێر بوو. ئیبن خەلدون بەجۆرێك پەروەردە بوو کەزۆر حەزی لەزانست و زانیاری بوو هەمیشە بەدوای ڕێز و گەورەیدا دەگەڕا. خوێندنەوەی قورئان فێر بوو لەگەڵ هەر دە بنەماکەی تەجویدیدا. بەدوور و درێژی زانستی قەواعیدی عەرەبی (نحو)فێر بوو زۆرێك لە کتێبەکانی ئەدەب و دیوانی شاعیرەکانی بەباشی دەخوێندەوە و شیعرێکی زۆری لەبەر کردو زانستی فیقهو حەدیس بەباشی فێر بوو دواتریش زانستە ئەقڵییەکانیشی وەرگرت. ئەو ڕووداوە سیاسیانەی کەلەساڵی (٧٤٨-ك ١٣٤٧ ز)ڕوویان دا ئاسۆیەکی نوێی بەڕووی ئیبن خەلدوندا بۆ فێر

---

[58] la vie intense
[59] vivre dangereusement

بوونی زانست و زانیاری کردەوە، چونکە سوڵتان ئەبولحەسەنی مەرینی کەلەو ساڵەدا تونسی داگیر کرد بوو پیاوێك بوو زۆر گرنگی بەزانست و زانیاری دەدا و گەورەکانی زانست و ئەدەبی لەدەرباری خۆیدا کۆ کردبویەوەو (ئامادەبوونی ئەمی بەپێویست دەزانی لەدەربارەکەیداو دانیشتنەکانی خۆی بەوان دەڕازاندەوە).[٦٠] کاتێك هاتە تونسەوە کۆمەڵێك لە زاناکان هاوڕێی بوون. شتێکی سروشتیە کەباوکی ئیبن خەلدون لەگەڵ ئەم پیاوەگەورانەدا هاونشین بێت بەهۆی ئەو پلەو پایە زانستییەی کەهەیبوو، هەربۆیە هەمیشە کوڕەکەی هان دەدا کەلە کۆڕوکۆبوونەوەی زاناو پیاوە گەورەکاندا بەشداری بکات و زانستی خۆی زیاد بکات. ئیبن خەلدون لەباسی ژیاننامەی خۆیدا ناوی ئەو زاناو ئەدیبانەی کەلەگەڵ سوڵتاندا هاتبونە تونسەوە هێناوەو باسی ژیاننامەکەی کردون و باسی فراوانی زانست و زانیاریان دەکات. ئەوەی کەلەبارەی ئەمانەوە نوسیویەتی ئەوە ئاشکرا دەکات کەئەو بەتایبەت کەوتووەتە ژێر کاریگەری دووکەسەوەو بێ سنور وەسفیان دەکات. یەکێکیان عبدالمهیمن بووە و ئەوی تریشیان محمدی کوڕی ئیبراهیمی ئابلی بووە، یەکەمیان پێشەوای فەرمودە زانەکان و نەحویەکانی مەغریب و سکرتێری سوڵتان و خاوەن نازناوی (توغرانوس)و سەرۆکی تەوشیحی ئەو بووە.

ئەم زانایەش وەك خانەدانی خەلدون پەیوەست بووە بە حەزرەمەوتەوە بەحەزرەمی ناسراوە. بەم هۆیەوە پەیوەندیەکی بەهێز لەنێوان ئەم و خانەدانی خەلدوندا هەبوو، تەنانەت کاتێك خەڵکی تونس لەدژی سوڵتان عبدالمهیمن ڕاپەڕین ناوبراو پەنای بردە لای خانەدانی خەلدون‌و بۆ ماوەی سێ مانگ بەنهێنی لەوێدا مایەوە. ئیبن خەلدون دانیشتنی لە کۆڕو کۆبونەوەی ئەم زانایەی بەپێویست دەزانی‌و حەدیسی لێوە فێر بوو مۆڵەتی لێ وەرگرت و (امهات — سیحاح)ی شەش لایەنەو کتێبی موتائی ئیبن مالیك و کتاب السیری ئیبن ئیسحاق‌و کتێبی حەدیسی ئیبن سەلاحی لای ئەو وەرگرت، بەڵام ئابلی کە بە (شێخ و مامۆستای زانستە ئەقڵییەکان)دادەنرا و ئیبن خەلدون بۆ چەندین ساڵ لەخزمەتی ئەودا

---

[٦٠] دەستەواژەکان لەناو پەراوێزی تەرجەمەی (التعریف)دایە کەبەپێنوسی خودی ئیبن خەلدون نوسراوە.

زانیاری وەرگرتو لەم ماوەیەدا زانستە ئەقڵیەکانی لێوە فێربوو، سەرەتا لەزانستە بیرکاریەکانەوە دەستی پێکردو دواتر مەنتیق و لەپاشانیش هونەرەکانی تری حیکمەت و فەلسەفە فێر بوو. ئیبن خەلدون زۆر بەگەورەیی و زیرەکیەوە باسی ئابلی دەکرد و مافی مامۆستایەتی ئەوی بەسەر خۆیەوە لەهەموان بەزیاتر دەزانیو دەڵێت: (ئەو شاهێدی شارەزاییو زیرەکی من بوو لەم زانستانەدا بەبراورد بەخەڵکانی تر). گومانیشی تێدا نیە کەئەم گەواهیە ئەوە دەردەخات کەئیبن خەلدون حەزی لەشێوازی بیرکردنەوەی مەنتیقی بووە و ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو لەزانستە ئەقڵیەکاندا (بیرکاری و فەلسەفەو مەنتیق) لەخزمەت ئابلیدا خزمەتێکی گەورەی بە فراوان بوونی فیکری ئەو کردووە و شوێنەواری ئەم حەزو خولیایە لە باس و بابەتەکانی پێشەکیدا بەجوانی ڕەنگی داوەتەوە، بەڵام ئیبن خەلدون کاتێك گەشتە حەڤدە ساڵی دوچاری بەڵایەکی گەورە بوویەوەو خوێندنەکەی زیانێکی زۆری بەرکەوت. ئەو پەتاگەورەیەی کە خەڵکی دەستە دەستە لەناو دەبردو زیانێکی زۆریشی بەم گەیاندو دایك و باوك و زۆرێك لە مامۆستایانی گەورەی خۆی لەدەستدا. ئەوکات خەڵکی لە دژی سوڵتانی مەرینی ڕاپەڕین و خانەدانی ناوبراو لە ئەفریقا ڕووخا و ئەو زانایانەش کەلەوێدا بوون بۆ پاراستنی ژیانیان ئەوێیان بەجێهێشت. ئیبن خەلدون لەم ڕووداوە قورس و ترسناکانە زۆر ماتەم زەدە بو بو. ئەو سەرەڕای ئەوەی کە دایك و باوك و مامۆستا بلیمەتەکانی لەدەست دابوو، هەمیشە دڵی خۆی دەدایەوە بەوەی کە هێشتا هەندێك مامۆستا لەژیاندا ماون کە ئەم بتوانێت زانستیان لێوە فێر ببێت، بەڵام گەڕانەوەی ئەم گروپەلە زانایان ئیبن خەلدونی بەتەواوەتی لە بەدەستهێنانی زانست بێ بەش کرد. لەئەنجامی ئەم ڕووداوانەدا بەشێوەیەکی ترسناك بەتەنیا مایەوەو هەربۆیە بڕیاری دا بەرەو زێدی مامۆستاکانی بڕوات واتە بەرەو مەغریب، بەڵام برا گەورەکە ئەوی لەم بڕیارە پەشیمان کردەوە. هێندەی نەخایاند کە بوارێکی گونجاو بۆ چونەناو ژیانی کۆمەڵایەتیەوە ڕەخساو ئەبومحمد ئیبن تافراکین وەزیری بەناوبانگ کەلەتونسدا کودەتای کردبوو بەشێوەیەکی سەربەخۆ بەسەر هەموو

بارودۆخەکانی وولاتەکەیدا زاڵبوو ئیبن خەلدونی لەلایەن سولتانی تونس ئەبو ئیسحاقەوە بەرەو لای خۆی بانگی کردو کردیە (کاتب علامە). ئەم ئەرکەش بریتی بوو لەوەی کەلەنامەو فەرمانە دەوڵەتیەکاندا و پاش ناوهێنانی خودا (بسم الله الرحمن الرحیم) ستایش‌و سوپاسگوزاری خودا بەخەتێکی گەورە بنوسێت و لەلایەن سوڵتانەوە نامەکە واژوو بکات. کاتێك ئیبن خەلدون ئەم ئەرکە گرنگەی گرتە ئەستۆ گەنجێکی بیست ساڵان بوو. لەم کاتەدا شازادەی حەفسی کەفەرمانڕەوای قوستەنتینە بوو بەرەو تونس هێرشی هێناو ئیبن تا فراکینیش(لەسەرەتای ساڵی ٧٥٣ ك) بۆ بەرگریکردن لە وولاتەکەی و وەستاندنی هێرشی ئەو بەرەو ئەفریقا، سوپاو هۆزەکانی ناوچەکەی تەیار کرد و لەتونس چونە دەرەوە. ئیبن خەلدونیش بێ گومان لەناو سوپاکەی تافراکیندا بوو شەڕو پێکدادانێکی زۆر لەنێوان هەردوو سوپادا ڕوویداو سەرئەنجام هێزەکانی ئیبن تافراکین شکان و ئیبن خەلدون خۆی لەگێرەپانی جەنگەکە ڕزگار کردو پەنای بردە بەر شاری (ئابە)و ئیتر نەگەڕایەوە تونس.

## لەنێوان ( تونس و فاس )دا :

چونی ئیبن خەلدون لە مەیدانی جەنگەوە بۆ (ئابە)لەڕاستیدا وەك پشت کردن بوو لە هەردوو لایەنی بەشەڕ هاتوو. ئیبن خەلدون لەباسی ژیانی خۆیدا بەڕاشکاوانە دەڵێت: مەبەستی لە وەرگرتنی سکرتێری بەدەستهێنانی هەلێك بوو بۆ ئەوەی بتوانێت تونس بەجێ بهێڵێت و بڕواتە مەغریبەوە، لەگەڵ ئەوەی کە ئەم بەباشی ئەوەی دەزانی کە خانەدانی ئەم هاوسەفەری سوڵتانیان پێ باش نەبووە، بەڵام ئەو دەیزانی ئەم هاوسەفەریە هۆکارێکە بۆ ئەوەی کە بتوانێت بۆ هەرکوێیەك بڕوات کەبیەوێت و ئەم مەبەستەشی هاتەدی. لەپاش شەڕی ناوبراو ئیبن خەلدون چویە شاری فاسەوە، بەڵام دوو ساڵی خایاند تاوەکو گەشتە مەبەستی خۆی و لەم ماوەیەدا سەفەری بۆ چەندین شاری ترکردو لەناوچە دەشتەکیەکاندا دەستی دایە گەشت و لەگەڵ ژمارەیەك لەزانایان و حەکیماندا ئاشنایەتی پەیدا کردوو سەرئەنجام چاوی بەسوڵتانی مەغریب و وەزیرەکەی

کەوت. پاش ئەوەی کەخۆی لە ئاگری شەڕ ڕزگار کردو چویە شاری ئابەوەو لەوێشەوە بەرەو تبسە و دواتریش دەچێتە قفسە و لەوێدا فەرمانڕەوای زابی بینی و لەگەڵیدا گەشتی کرد بەرەو بیسکەرە و لەوێ تاوەکو کۆتایی زستان مایەوە، دواتر لەوێوە بەرەو تلمسان ڕۆشت و لەو ساڵەدا سوڵتان ئەبو عەنان و وەزیرەکەی حەسەنی کوڕی عومەری بینی و لەگەڵ وەزیری ناوبراودا بەرەو بجایە بەرێکەوتو وەرزی زستانی لەوێدا بردە سەر، ئەبوعەنان پاش دەست بەسەردا گرتنی تلمسان و بجایە بەرەو بارەگای سەرەکی خۆی گەڕایەوە و دەستی کردە کۆکردنەوەی ئەهلی زانست و ئەدەب بۆ ئەوەی کۆڕو کۆبونەوەکانی خۆی بەوان بڕازێنێتەوە. زانستخوازانی بۆ باس و لێکۆڵینەوەی زانستی لەو کۆڕانەدا هەڵدە بژارد. هەرلەم کاتەدا لەسەر پێشنیاری هەندێك لەزانایانی کۆڕەکانیو ئەوانەی کەلەتونسدا ئیبن خەلدونیان دەناسی و تواناکانیان بینی بوو بانگهێشت کرا بۆ شاری فاس و ئەویش بانگهێشتەکەی قبوڵ کرد و ڕۆشت بۆ شاری فاس.

## لەشاری فاس دا:

ئیبن خەلدون بۆماوەی هەشت ساڵ لەشاری فاس دا مایەوە و لەم ماوەیەدا هەروەك چۆن ئارەزووی دەکرد، هەلێکی زۆری بۆ خوێندنەوە و بەدەستهێنانی زانست بۆ هەڵکەوت. لەم شارەدا کەپایتەختی مەغریب بوو دیداری لەگەڵ زۆرێك لە زاناو ڕۆشنبیرو ئەدیباندا کردووە سودی لێ وەردەگرتن و هەندێك لەو زانایانە هەمان ئەو کەسانە بوون کەلەڕابوردوودا لەشاری فاس ئاشنابوبو پێیانو، هەندێك لەزانایانی تریش کەلەناوچەکانی تری ئەندەلوسەوە هاتبونە مەغریب. ئیبن خەلدون لەماوەی ئەم هەشت ساڵەدا بەتایبەت لەداڕشتن و شیعر و هونەری ووتاربێژی دا ڕاهێنانی کرد، بەکورتی ئەو لە شاری فاس دا ژیانێکی مەعنەوی و ئەدەبی لێوان لێو لەچالاکی زۆرو زەوەندی بەسەر برد و، لەگۆماوی سیاسەتدا ڕۆچوو لەگەڵ گۆڕانکاریە جۆراوجۆرەکاندا دەست و پەنجەی نەرم کرد. ئەو لەسەردەمی چوار سوڵتانو دوو وەزیر کەسەبارەت بە سوڵتانەکانی خۆیان شێوازێکی

سەربەخۆ و ڕەهایان پەیڕەو دەکرد چەندین ئەرکی جۆراو جۆری پێ سپێردرا و کودەتا گەلێکی جۆراو جۆراو جۆر ڕوویاندا، کەلە هەندێکیاندا ڕۆڵێکی بەرچاوی بینیوەو لە پلانێکدا بەشداری کرد شکستی هێناو خرایە زیندانەوە. لەپاش هاتنی ئیبن خەلدون بۆ فاس سوڵتان ئەبو عەنان کردیە یەکێك لەو زانایانەی کەلە هۆڵی زانستی ئەودا کۆبونەوەیان دەکردو، پێی ڕاگەیاند پێویستە لەسەری لەکاتی چونی سوڵتان بۆ نوێژی هەینی هاوڕێیەتی سوڵتان بکاتو لەپاشان ئەوی کردە واژوو کاری نامەکانی سوڵتان، بەڵام ئیبن خەلدون ئەم ئەرکەی بەویستو ئارەزووی خۆی پەسەند نەکردو ناچار بوو ئەو کارە بکات، چونکە ئیبن خەلدون ئەم پلەیەی بەشیاوی خۆی نەدەزانی و خۆی بە شیاوی پلەو پۆستە باڵاکان دەزانی، هەربۆیە حەزکردنەشی لەپلەو پایە وایکرد کە هاوکاری ئەمیری حەفسی محمدی کوڕی عبدالله بکات لەپیلان گێڕان دژی سوڵتان، چونکە ئەم شازادە لەهەلێك دەگەڕا بۆ ئەوەی بجایە لەدەستی سوڵتان دەربهێنێتو بەنهێنی بۆ دەرچون لەشاری فاس سەرقاڵی چالاکی بوو.

ئەوە دەزانین کاتێك سوڵتان ئەبو عەنان دووبارە بجایەی خستەوە ژێر کۆنترۆڵی مەرینیەکانەوە ئەمیری ئەو ناوچەیەی گواستەوە بۆ فاس و بەناچاری لەوێدا نیشتەجێی کرد. وەکاتێك سوڵتان نەخۆش کەوت شازادەی ناوبراو بڕیاریدا سود لەم هەلە وەربگرێتو لە ئامادەباشدا بوو بۆ دەرچون لەفاسو چونەناو شاری بجایەوە. لەم پێناوەشدا هەموو هۆکارەکانی گرتەبەر و ئیبن خەلدونیش بەهۆی ئەو پەیوەندیە دۆستانەیەی کەبۆماوەی چەندین وەچە لە نێوان خانەدانی ئەم و خانەدانی حەفسیەکاندا هەبوو هەرلە سەرەتای چونیەوە بۆ ناوشاری فاس پەیوەندیەکی دۆستانەی باشی لەگەڵ شازادەی ناوبراودا دروست کرد، شتێکی سروشتییە کەشازادەی ناوبراو هەموو ڕازو نیازە نهێنیو ئاشکراکانی لای ئیبن خەلدون باس دەکاتو لەبەدیهێنانی خەونەکانیدا ڕاوێژی پێدەکرد.

هەربۆیە ئیبن خەلدون پەیمانی پێدا بوو کە هەلومەرجی ڕاکردنی بۆ فەراهەم بکات و شازادەش پەیمانی بەئیبن خەلدون دابوو کەبیکاتە سەرەك وەزیرانی خۆی پاش ئەوەی دەبێتە سوڵتان، بەڵام لەولاوە بە بێ ئاگاداری ئیبن خەلدون‌و شازادە سوڵتان بە پلانەکەیانی زانی بوو، هەربۆیە زۆر بەتوندی ئیبن خەلدونی زیندانی کرد. ئیبن خەلدون بۆماوە دوو ساڵ زیندانی بوو تەنها لەپاش مەرگی ئەبو عەنان ئازاد کرا. لەم کاتەشدا وەزیری سوڵتان حەسەنی کوڕی عومەر کوڕە بچوکی سوڵتانی بەجێگرەوەی باوکی ناساند بوو کاروبارەکانی بۆ بەڕێوەدەبردو خۆی بە فەرمانڕەوای ڕەها دەزانی. ئەم وەزیرە ئیبن خەلدونی خستەوە سەر ئەو پۆستەی کەلەپێش زیندانی کردنەکەیەوە هەیبو، بەڵام فەرمان ڕەوایی وەزیری ناوبراوو سوڵتانی بچوك هێندەی نەخایاند، چونکە گروپێك لە شازادەکانی مەرینی دانیان پێدا نەدەناو لەدەوری ئەمیر مەنسوری سولەیمان کۆبونەوەو لە دژی ڕاپەڕین. لەپاشان بانگەشە کاری سێیەم ئەمیر ئەبو سالم دەرکەوت‌و خۆی بەشیاوتر لەهەردوو ئەمیر دەزانی. لەم نێوەندەشدا ئیبن خەلدون هاتە سەر ئەو باوەڕەی کەپەیوەندی بکات بەدارو دەستەی ئەمیری سێیەمەوەو دەستی دایە بانگەشە کردن بۆیان‌و چویە لای ئەمیر ئەبو سالم و هانیدا کەبەرەو پایتەخت هێرش بکات، سەرئەنجام ئەبوسالم ئەوی کردە یەکێك لە هاوڕێیانی خۆی لەکاتی چونیدا بەرەو پایتەخت. سوڵتان ئەبو سالم پاش ئەوەی چویە سەر تەخت خزمەتەکانی ئیبن خەلدونی بەرز نرخاندو ئەوی کردە سکرتێری خۆی و کاروباری نامەکانی سوڵتان و پلەی داوەری و پێ ڕاگەشتنی بە سکالاکانی پێ سپارد.

لە سەردەمی ئەم سوڵتانەدا ئیبن خەلدون بەخۆشی‌و شادیەوە ژیانی دەگوزەراندو، دواتر دەستی کردە چڕینی شیعرو بەگوتەی خۆی دەریا گەلێك لەشیعری باش‌و ناباش هێرشیان دەهێنا بۆ بیرو زەینی‌و نەیدەزانی کامیان هەڵبژێرێت، بەڵام سوڵتان ئەبو سالم لەپاش دوو ساڵ بەدەستی کۆمەڵێك جەنگاوەر بەسەرۆکایەتی وەزیری خۆی عومەری کوڕی عبدالله کوژراو لە بریدا ئیبن تاشفین کرا بەسوڵتان، بۆ ئەوەی خۆی بەناوی

کەفالەتەوە کاروبارەکان بەڕێوە بەرێتو بەفەرمانڕەوای ڕەها بمێنێتەوە. کاتێك وەزیری ناوبراو بەم شێوەیە بوویە فەرمان ڕەوای ڕەها، ئیبن خەلدونی لەسەر هەمان ئەو پۆستانەی کەپێشتر هەیبو هێشتەوەو موچەو هەق دەستیشی بۆ زیاد کرد، بەڵام ئیبن خەلدون وەك ئارەزوی سەرکەشی لاویەتی حەزی لە پلەی بالاَ تر دەکرد و چاوەڕێی لەم وەزیرە ئەوەبوو کەپلەو پایەی بالاَتری پیّ بسپێرێت، چونکە لە دێر زەمانەوە بوو کە دۆستایەتیەکی قولّ لەنێوانیاندا هەبوو، ئەم دۆستیەش بەتایبەت لەو کاتانەدا بوو کەلە کوڕەکانی ئەمیر محمدی فەرمانڕەوای بجایەدا دادەنیشت توندو تۆلّتر بوبو، دوای ئەوەش ناساندنی عومەری کوڕی عبداللە بەسولّتان ئەبو سالم بەهۆی دۆستی ئیبن خەلدونەوە بووە، هەربۆیە ئەم وەزیرەی بەبیّ وەفا بەڕابوردو دایە قەڵەم و بەتوڕەییەوە بەرەو لای سولّتان ڕۆیشت، بەڵام وەزیر هێندە گرنگی بەم مەسەلەیە نەداو گوتی با بەهیچ شێوەیەك لێمان نزیك نەکەوێتەوە. ئیبن خەلدونیش بڕیاریدا بەرەو زێدی خۆی ئەفریقا بگەڕێتەوەو داوای مۆڵەتی لەوەزیر خواست. هەرلەم کاتەدا ئەبو حەمو لە تلمسان و مەغریبی ناوەڕاست لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە دەسەلاَتی خانەدانی عبدالواد بگێڕێتەوە. سولّتان ئەبوسالم ترسا لەوەی کەئیبن خەلدون پەیوەندی پێوە بکات هەربۆیە وەزیر بەداواکە ڕازی نەبوو، بەڵام پاش نێوەندگیری هەندێك لەپیاوانی دەربار بۆ ڕازی کردنی سولّتان سەرئەنجام ڕازی بوو بەو سەفەرە، بەڵام بەو مەرجە نەچێتە تلمسان، ئەوەبو ئیبن خەلدون بەرەو تونس ڕۆیشت و خێزانەکەی بەرەو قوستەنتینە بردو بۆ ئەوەی لای خاڵەکانی بمێننەوە (کوڕەکانی محمدی کوڕی حەکیمی)سەرکردەی سوپاو خۆیشی بەرەو ئەندەلوس (سبتە)بەڕێکەوت.

## لەئەندەلوس:

ئیبن خەلدون لەڕێگەی سیبتە و جەبەل، کەئێستە بەجەبەل تاریق ناسراوە، گەشتی کرد بۆ ئەندەلوس. هۆی هەڵبژاردنی شاری ناوبراو ئەوە بوو لەکاتی مانەوەی لەشاری

(فاس)دا ئاشنایەتی لەگەڵ سوڵتانی غەرناتەدا پەیدا کرد بەتایبەت پەیوەندی نێوان ئەوو وەزیر لیسانەدینی خەتیب، بەتایبەت لە فاس پەیوەندیەکی دۆستایەتی بەهێزیان لەنێواندا دروست بوبو. سوڵتانی ئەندەلوس ئەبو عبداللە سێیەمین پاشای بەنی ئەحمەر بوو. ئەو لەماوەی ئەو کودەتایەی کەلە دژی کرابوو لەگەڵ وەزیرەکەیدا لیسانەدینی خەتیب پەنای بردبووە مەغریب، بەڵام پاش ماوەیەك توانی بگەڕێتەوە بۆ ئەندەلوس‌و تاج و تەختەکەی لەشۆڕشگێڕان وەربگرێتەوە. ئیبن خەلدون لەماوەی مانەوەی ئەم سوڵتانەو وەزیرەکەیدا لەشاری فاس لەگەڵ هەردوکیان ئاشنایەتی پەیدا کردبوو لەسایەی ئەو دەست ڕۆشتنەی کەلەناو پیاوانی دەوڵەتدا هەیبوو هاوکاریەکی فراوانی کردبوون، لەوانەش سەرپەرشتی خانەوادەی لیسانەدین کاتێك ناوبراو چوبویە ئەندەلوس بەباشی ئاگاداری دەکردن بەتایبەت لەکاتی کێشەو هەراکاندا. سەرەڕای ئەمەش دۆستایەتیەکەی لەگەڵ لیسانەدیندا ڕەگ‌و ڕیشەی قوڵی هەبوو، چونکە لەزیرەکی و لێهاتنی یەکتری زۆربەباشی شارەزا بوبون‌و مافی یەکتریان بەڕێزەوە جێبەجێ دەکرد و جۆرێك لەهاوبیری‌و هاو جۆری لەنێوانیاندا هەبوو. ئەم پەیوەندیە لە ڕووی مەعنەویەوە هێندە بەهێز بوو نەدەکرا نەبینرێت. بەهۆی هەموو ئەمانەوە ئیبن خەلدون بیری لەوە دەکردەوە کاتێك بچێتە ئەندەلوسەوە سوڵتان‌و وەزیرەکەی بەخێر هاتنێکی گەرمی لێدەکەن. ئەم خولیایەی بویە ڕاستی و لەلایەن سوڵتان و وەزیرە کەیەوە زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکراو بەخۆشەویستیەکی زۆرەوە باوەشیان بۆ کردەوەو خانویەکی زۆر ئامادەو تۆکمەیان پێبەخشی. ئیبن خەلدون لەژیاننامەی خۆیدا دەڵێت:

(ئەمیان کردووەتە یەکێك لەنزیکانی خۆی‌و بووەتە ئەمینی نهێنیەکانیان و لەهەموو گەشت‌و گەڕانەکانیدا یەکێك بووە لە هاوڕێ و هاو سەفەرەکانی و لەکاتی نان خواردن و بەزم خۆشیە خێزانیەکانیاندا هاونشینیان بووە). ساڵێك دواتر سوڵتان ئەوی کردە سەفیرو بەپاشای قشتالەی ناساند بۆئەوەی پەیماننامەیەکی ئاشتەوایی لەنێوان ئەم و پاشای ناوبراودا واژوو بکەن، ئەو پاشایەش ئیشبیلیەی داگیر کردبوو کردبوویە پێتەختی

وولآتەکەی. کاتێك ئیبن خەلدون چویە ئیشبیلیە شوێنەواری خۆی بینیو پاشای قشتالەش لەپلەو پایەی زانستی و ئەدەبی ئیبن خەلدون شارەزابو بو داوای لێکرد کەلای ئەو بمێنێتەوە و پێی گوت ئەگەر بێتو بەپێشنیارەکەی ڕازی بێت و لە ئیشبیلیە بمێنێتەوە ئەوا هەموو ماڵ و سامانەکە بۆ دەگێڕێتەوە، ئەمیش پێشنیارەکەی پەسەند نەکردوو پاش تەواوکردنی ئەرکەکەی بەشێوەیەکی زۆر سەرکەوتووانە، گەڕایەوە غەرناتەو سوڵتانیش بەم پەیمانە ئاشتیەو سەرکەوتنەی ئیبن خەلدون لەکارەکەیدا زۆر شادمان بوو گوندێك لەگوندەکانی دەوروبەری غەرناتەی بەناونیشانی کەرتی (تیول)پێ بەخشی. لەم کاتەدا ئەندامانی خێزانەکەی لەقوستەنتینەوە هاتنە ئەندەلوسو کەوتنە خۆشگوزەرانیەکی بێ وێنەوە، بەڵام ئەم خۆشی و ئارامیەش هێندەی نەخایاندو ئیبن خەلدون بڕیاریدا سەفەر بکات بۆ بجایە، سەرچاوەی ئەم بڕیارەش دەگەڕایەوە بۆ دوو هۆکار:

١ – ئیبن خەلدون لەوە تێگەشتبو کەلیسانەدینی خەتیب لەو پلەوپایەیەی کەئەم لای سوڵتان هەیبو زۆرنیگەران بوو، هۆکارەکەشی ئەوکەسانە بوون کەلەنێوان ئەم دوو کەسەدا قسەیان دروستدەکرد. هەربۆیە لەپێناو پاراستنی دۆستایەتیەکەیاندا بڕیاری دابوو ئەندەلوس جێ بهێڵێت.

٢ – ئەو ڕووداوانەی کەلە مەغریبی ناوەڕاستدا ڕوویاندا بوو زەمینەیەکی بۆ ئیبن خەلدون فەراهەم کردبوو، کەبەردەوام بەدوایدا دەگەڕا، چونکە ئەمیر محمد ئەبو عبدالله دەستی بەسەر بجایەدا گرتبوو دەسەلآتی خۆی گرتبوەوە دەست. بەپێی ئەو پەیمانە دێرینەی کە لەنێوانیاندا هەبوو لەنامەیەکدا داوای لە ئیبن خەلدون کردبوو کەبگەڕێتەوە بۆ بارەگای سەرەکی ئەوو پلەی حاجبی لەدەربارە کەیداوەربگرێت. ئیبن خەلدون ئەم داوەتنامەیەی نیشانی پاشای غەرناتە داو مۆڵەتی لێ خواست بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەبارەی لیسانەدینی خەتیبەوە بدرکێنێت. لەپاشان بەمۆڵەتی سوڵتان ئەندەلوسی پاش ئەوەی کە بۆ ماوەی سێ ساڵ تێیدا ژیا بەجێ هێشت.

## لەشاری بجایە

کاتێك ئیبن خەلدون لە ڕێگەی دەریاوە هاتە ناوبجایەوە، سوڵتان ئەبو عبدالله پێشوازیەکی گەرمی لێکردو بالآترین پلەی دەوڵت کەحاجبی بوو پێی سپارد، مانای حاجبیش بەپێی ڕاڤەی ئیبن خەلدون بریتی بوو: (لەبەڕێوە بردنی دەوڵەت بەشێوەیەکی سەربەخۆو نێوەندگیری نێوان سوڵتان و ئەندامانی تری دەوڵەت بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك بەشداربێت لەگەڵیدا). لەم پێناسەیەوە دەتوانین لەوە تێبگەین کەحاجبی وەك سەدری ئەعزەمو سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتە ئیسلامیەکانی ئەم دواییە بووە پێش ئەوەی دەستەی وەزیران و پەرلەمان دروست ببێت. ئیبن خەلدون لەژیاننامەکەیدا لەبارەی شێوازی کارکردنی خۆیەوە لەبجایە دەڵێت: (سوڵتان فەرمانیدا کە دەبێت ڕۆژانە هەموو ئەندامانی دەوڵەت لەلای من ئامادە بن، منیش بەوپەڕی سەربەخۆیی و بەشێوەیەکی زۆر سەرکەوتوانە و هەوڵی فراوانەوە هەموو کاتەکانی خۆمم بۆ خزمەتکردنی دەوڵەت تەرخان کردبوو). سوڵتان لەکاتی ووتاری هەینیدا لە مزگەوتی گەورەی شار بەگەورەییە وە باسی لەمن کردو بەڕێزەوە ناوی هێنام، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەکاتی تەواو بوونی کاروباری مەملەکەتداریدا وانەم دەگوتەوەو هەرگیز وازم لەم ئەرکە نەهێنا). لەم دەستەواژانە ئەوە دەردەکەوێت کە ئیبن خەلدون زۆر لەم کارەی ڕازی بووەو دڵخوش بووە، بەڵام ئەم خۆشیانەش زۆریان نەخایاندو لەپاش ساڵێك پاشا لەگۆڕەپانێکی جەنگدا دەکوژرێت و لەپاش مردنیشی بەپێی ڕووداوەکان دەوڵەتەکەیشی ڕووخا.

کوڕە مامی ئەم سوڵتانەی بجایە سوڵتان ئەبولعەباس کە فەرمانڕەوای قوستەنتینە بوو سەرەڕای خزمایەتی نێوانیان لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەت و دەسەڵات هەمیشە لەکێشەو ململانێدا بوون‌و چەندین جاریش جەنگ لەنێوانیاندا ڕوویدەدا، ئەوە بوو لە هێرشێکی کتوپڕدا سوڵتانی بجایە دەکوژێت‌و ڕاستەو خۆ سوپاکەی بەرەو بجایە دەبات، کاتێك ئەم هەواڵە دەگاتەوە بجایە دانیشتوانەکەی دەبن

بەدوو بەشەوە هەندێکیان پێیان وایە کەپێویستە پەیمان لەگەڵ کوڕەکانی سوڵتانی کوژراودا ببەستن‌و هەندێکی تریشیان لەو باوەڕەدان بەبێ خوێن ڕشتن بجایە بدەن بەدەست سوڵتانی قوستەنتینەوە، ئیبن خەلدونیش هاوڕابوو لەگەڵ گرووپی دووەمدا لەشاری بجایە چویە دەرەوە بۆ پێشوازی لەسوڵتان ئەبولعەباس و لەکۆتایدا شاری بجایە بەبێ خوێن ڕشتن کەوتە ژێر کۆنترۆڵی شای قوستەنتینەوەو، ئیبن خەلدونی لەسەر پۆست و پلەی پێشوی هێشتەوە، بەڵام ئیبن خەلدون بینی کەدوژمنەکانی لەڕادەبەدەر دژایەتی دەکەن‌و لای سوڵتان ئەم بەمەترسیدار دەیدەنە قەڵەم، هەربۆیە بڕیاریدا کۆتایی بەو بارودۆخە بهێنێت‌و دەست لەکار بکێشێتەوە و واز لەبەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بهێنێت و مۆڵەتی ڕۆشتن و بەجێهێشتنی بجایەی لە سوڵتان خواست.

## لەبیسکرە

ئیبن خەلدون پاش بەجێهێشتنی بجایە چویە لای هەندێك لەهۆزەکان و لەگەڵیاندا دەستی کردە سەفەر. تاوەکو سەرئەنجام گەیشتە بیسکرە و ئەو ناوچەیەی بۆ ژیانی خۆی و خێزانی هەڵبژارد، چونکە لەنێوان ئەم و فەرمانڕەوای ئەم ناوچەیەدا ئیبن موزنی هەر لەسەرەتای چونی ئیبن خەلدون بۆ ناوچەی ناوبراو پەیوەندی دۆستانەیان لەنێواندا دروست بو بو.ئیبن خەلدون بۆ ماوەی شەش ساڵ لەبیسکرە مایەوە. ئەوە ڕاستە کەئەو بۆ ئەنجامدانی چەند کارێك لەناو دەشتەکیەکاندا چەند جارێك ئەم شارەی بەجێ هێشتووە، بەڵام هەرجارە و پاش ماوەیەك دەگەڕایەوە بیسکرە. هەربۆیە دەتوانین بڵێین ئەو لەم ماوەی شەش ساڵەدا لەبیسکرە بووە. شێوازی ژیانی ئیبن خەلدون لەم شارەدا شێوازێکی نوێی بە خۆوە بینی، چونکە ئەو لەپایتەخت و ئاشوب و پلەو پایە بێزار بو بو ئیتر بەپلەو پایە هەڵنەدەخەڵەتا،و کاتێك ئەبو حەمو پاشای تلمسان پێشنیاری حاجبی بۆ کرد بەبێ دودڵی ڕەتی کردەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا وازی لەکاری سیاسی نەهێنا بوو بەردەوامبوو لەسەری‌و بەشێوازێکی نوێ و کاریگەرەوە ڕۆڵی لە دەوڵەتانی مەغریبدا هەبوو. ئەو بەکۆکردنەوەی هۆزەکان و هەرجارە و هاندانیان بۆ

هاوکاری فلان دەوڵەت و فلان سەڵتەنەت خزمەتی دەکرد بەبێ ئەوەی هیچ پلەوپایەیەکی فەرمی هەبێت‌و سەربە هیچ دەوڵەتێك بێت. ئیبن خەلدون لەکاروبارو ژیانی دەشتەکیەکاندا ئەزموونێکی زۆری وەرگرتبو، چونکە مانەوە لە بیسکرە و هاتووچۆ لەنێوان دەشتەکی و هۆزو عەشیرەتەکاندا کاریگەری لەزیادکردنی ئەزموونەکانی ناوبراو هەبوو. ئەو بەلێزانیەکی زۆرەوە هۆزەکانی رادەپەڕاندو ئەوانی دەکردە یەك و دەیکردنە پەیرەوی یەك ئامانج. زیادەڕەوی نیە ئەگەر بلێین ئەو جڵەوی ئەم هێزە چەکدارانەی لە دەستدابوو هەرجۆرێك بیویستایە بەکاری دەهێنان، هەروەك چۆن سەرەتا خزمەتی سوڵتانی تلمسان ئەبو حەمو لەپاشان بەسوڵتانی مەغریبی سەرەوە عبدالعزیزی کرد.

لەم ڕۆژگارەدا دەوڵەتانی مەغریب چوار پایەختیی سەرەکیان هەبوو: فاس و تلمسان و قوستەنتینە و تونس. لەنیوان سوڵتانی قوستەنتینە و سوڵتانی تلمساندا بەتایبەت کێشەو گرفت هەبوو، چونکە خانەدانی سوڵتانی تلمسان ئەبو حەمو لەگەڵ سوڵتانی بجایە ئەبو عبداللەدا پەیوەندیەکی توندو تۆڵی هەبوو، کاتێك سوڵتانی تلمسان ئەبو حەمو بەوەی زانی کە سوڵتانی قوستەنتینە باوکی خێزانەکەی کوشتووەو دەستی بەسەر بجایەدا گرتووە، بەتوندی توڕە بوو بەرەو بجایە هێرشی کرد بەمەبەستی ئازاد کردنی لەژێر دەستی بکوژی مامیدا.

لەم کاتەدا سوڵتانی مەغریب سودی لەم هەلە وەرگرت، چونکە بینی سوڵتانی تلمسان سەرقاڵی هێرشە بۆ سەربجایە. هێرشی کردە سەر پایتەختی ئەم و بەم هۆیەوە ئەبو حەمو ناچار بوو دەست لە هێرش هەڵبگرێت بۆ بجایەو بۆ بەرگری لەپایتەختەکەی بگەڕێتەوە. بەم شێوەیە سوڵتانی مەغریب بەشێوەیەکی سروشتی یارمەتی سوڵتانی تونسی دا. لەبەرامبەر ئەم بارودۆخەدا سوڵتانی تلمسان بڕیاریدا پەیوەندی گەلێکی دۆستانە دروست بکات تاوەکو لەکاتی پێویستدا هەڕەشە بێت بۆسەر سوڵتانی قوستەنتینە. بەهۆی ئەم ڕووداوانەوە بارودۆخێکی ئاڵۆزو ناڕون هاتە ئاراوە: دو دوژمن ڕووبەڕوی یەکتر ریزیان بەستبو. لەمەلەکاتێکدا دو دوژمنی سروشتی لە پشت سەر

هەردوکیانەوە هەبوو کەپەیمانی دۆستایەتیان لەنێواندا هەبوو، ئەمەش دیارو ئاشکرایە کە دەبێتە هۆی زۆربوونی ئاژاوەو پشێویەکان. ئەم دوژمن کاریانە بۆ چەندین ساڵ بەردەوام بوو. ئیبن خەلدونیش لەم نێوەندەدا بەو شێوازەی کەباسمان کرد کاریگەریەکی زۆری هەبوو. ئەو لەسەرە تادا هاوکاری ئەبو حەموی کرد و هۆزەکانی بەکارهێنا بۆ یارمەتی ئەو. سەرەڕای ئەمەش پەیوەندی نێوان تلمسان و تونس زامن کرابوو تاوەکو بەم شێوەیە لەڕێگەی بیابانەوە بەتێپەڕ کردن لە بیسکرە هەردو شاری ناوبراو پەیوەست دەکات بەیەکەوە، بەڵام پاش ماوەیەك کاتێك سوڵتانی مەغریب دەستی بەسەر تلمساندا گرت بۆ بەرقەرار کردنی ئاشتی و ئاسایش داوای هاوکاری لە ئیبن خەلدون کرد، ئەوە بوو وازی لەهاوکاری کردنی ئەبو حەمو هێناو دەستی کردە هاوکاری کردنی عبدالعزیز، بەم شێوەیە خزمەتێکی بێ وێنەی بەناوبراو کرد. ئیبن خەلدون لەم گۆڕەپانە سیاسیانەدا بەهۆی ئەو ئەزمونەی کە لەناو دەشتەکیە کاندا بەدەستی هێنابوو بە کاراکتەرێکی گرنگی گۆڕەپانی سیاسەت دەژمێردرا، بەڵام ناوو ناوبانگی ئیبن خەلدون لەناو دەشتەکیەکاندا سوڵتانی بیسکرەی کەپێشەوای ناوچەی زاب بوو ترساندو، پێی وابوو ئەگەر وابڕوات هێزو دەسەلاتی ئەو لەناو دەشتەکیەکاندا نامێنێت.

هەربۆیە لەپلاندا بوو کەئیبن خەلدون لەبیسکرە دووربخاتەوە، هەربۆیە هەندێك لەدارو دەستەکەی نارده لای سوڵتانی مەغریب و تاوەك سوڵتان والێبکات داوای ئیبن خەلدون بکات بۆ فاس، ئەوەبوو ئیبن خەلدون ناچاربوولەگەڵ خێزانەکەیدا بڕوات بۆ شاری فاس.

## قۆناغی کۆتایی ژیانی سیاسی ئیبن خەلدون

ئیبن خەلدون پاش ئەوەی کەبیسکرەی بەجێهێشت بۆ ماوەی دوو ساڵ لەژیانێکی پڕ کێشەو گرفتدا ژیانی بردە سەرو ئەم ماوەیەش بەمەترسیدارترین ماوەی ژیانی ناوبراو دەژمێردرێت، واتە (قۆناغی گیانەلای ژیانی سیاسی)ئیبن خەلدون بوو، چونکە دەبینین لەپاش ئەم ماوەیە وازی لە ژیانی سیاسی هێنا. ئیبن خەلدون پێش ئەوەی بگاتە شاری

فاس ڕووبەڕوی چەندین مەترسی بویەوە و لەوکاتەی کەگەشتە مەلیانە هەواڵی مردنی سوڵتان عبدالعزیزی پێگەیشت و کوڕەکە بەکەفالەتی ئیبن خازی کراوەتە جێنشین. سوڵتان ئەبو حەموش ئەم هەلەی لەدەست نەداو لەکاتی سەرقاڵی پیاوانی دەرباری سوڵتان عبدالعزیز بەهۆی مردنی ناوبراوو دانانی جێنشینەوە، لە شوێنی دوور خستنەکەیەوە گەڕایەوە تلمسان و دەستی بەسەرپایتەخت و کۆمەڵێك ناوچەی تردا گرت. لەبەر ئەوەی ئیبن خەلدون لەماوەی ڕووداوەکانی کۆتایدا دژایەتی ئەوی کردبوو پشتیوانی لە سوڵتانی مەغریب کردبوو، ئەبو حەمو ڕقی لەئیبن خەلدون دەبوویەوە و فەرمانی کرد بەهۆزە هاوپەیمانەکانی لەهەر جێگەیەك ئیبن خەلدونیان بینی ڕووبەڕووی ببنەوە. ئیبن خەلدون خۆی باسی ئەم بەسەر هاتەبەم شێوە یە دەکات: (لەوێدا ڕێگەیان لێ گرتین‌و ئەوانەی کەئەسپیان پێبوو بەرەو شاخی دبدو ڕۆشتن‌و ڕزگاریان بوو وەئەوانەشیان کەلەگەڵ ئێمەدا مانەوە تالآن کران، بەتایبەت ئەسپەکانیان لێ سەندن‌و منیش یەکێك بووم لەوانە و دوو ڕۆژم بەپێخاوس تێپەڕاند تاوە کو گەشتمەئاوەدانی‌و سەرئەنجام گەشتمەوەلای هاوڕێکانم لەکێوی دبدو).

کاتێك ئیبن خەلدون پاش ئەم سەختی و ناڕەحەتیانە گەشتەشاری فاس و وەزیر ئیبن غازی کەدەسەلآتداری ناوچەکە بوو بەگەرمی ئەوی قبوڵ کردو بەهۆی ڕابردوی پڕ لەشارەزاییەوە لەبواری بەڕێوەبردن‌و، زانستدا زۆر ڕێزی لێ گرت، بەلآم بارودۆخی سیاسی لەگۆڕانێکی خێرادا بوو لەئەنجامدا جموجوڵەکانی سوڵتانی غەرناتە لەلایەك و زۆری ژمارەی خوازیارانی تاج تەخت لەلایەکی ترەوە ئیبن غازی ڕووخا. سوڵتان ئیبن ئەحمەر زۆر لەسوڵتان عبد العزیزو ئیبن غازی وەزیر کەلەپاش ئەو جڵەوی دەسەلآتی گرتبووە دەست توڕە بوو. هۆی ئەم توڕەبونەش ئەوەبوو کەلیسانەدینی خەتیب پەنای بردبووە مەغریب و سەرەڕای ئەوەی ئیبن ئەحمەر بانگهێشتی کردبوو زۆر سور بو بو لەسەری‌و نەسوڵتان‌و نە وەزیرەکەشی داواکەی ئەویان پەسەند نەکردبوو بانگهێشتی لیسانەدینیان نەکردبوو. لەم ڕووەوە ئیبن ئەحمەر ئەمیر عبدالرحمانی مەرینی کە پەنای

هێنابوویە پایتەختەکەی ئەو ئازادی کردو ڕێگەی دا بچێتە مەغریبەوە بۆ ئەوەی بتوانێت سەڵتەنەت بەدەست بهێنێتو ئیبن غازی لەدەسەلاَت دوربخاتەوە.

شازادەی ناوبراو لەگەڵ گەشتنی بۆ مەغریب خەڵکی بانگهێشت کرد بۆلای خۆیو سەرئەنجام کۆمەڵێکی زۆری بەدە وری خۆیدا کۆ کردەوە بەو بیانووەی کە ناکرێت منداڵێکی بێ توانا ببێتەپاشا. وەزیر ئیبن غازی کاتێك لەم بەسەرهاتە ئاگادار بوویەوە سوپاکەی ئامادەکردو هۆزو عەشیرەتگەلێکی زۆری بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی ئەو شازادەیەی کەکودەتای کردبوو ئامادەکرد و چەندین ڕووبەڕوو بونەوە لەنێوان سوپای هەردوو لادا ڕوویدا. لەم کاتەدا گروپێکی تر لە (تەنجە)شازادەی مەرینی ئەحمەدیان ئازاد کردو پەیمانیان پێدا بۆ ئەوەی داوای سەڵتەنەت بکات بۆ خۆی، بەم شێوەیە ئیبن غازی ناچار بوو کەلە بەرامبەر کودەتای هەردوو شازادەوە بوەستێتەوە. هێندەی نەبرد هەردوو شازادەی ناوبراو بڕیاریاندا کەپاش ئەوەی سەرکەوتنیان بەدەستهێنا وولاَت لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن، بەپێی ئەو ڕێککەوتنە دەبێت سەڵتەنەت و پایتەخت بۆ ئەحمەد بێت و بەشێکی تری فەرمانڕەواییەکەش لەژێر دەستی عبدالرحماندا بێت. ئەم یەکیەتیو پەیمان بەستنە بمانەوێت و نەمانەوێت سەرکەوتنی شازادە کودەتاچیەکانی ئاسانتر کردو ئیبن غازی پاش ئەوەی کەبۆماوەی سێ مانگ لەگەمارۆدابوو بەناچاری خۆیدا بەدەستەوە. بەم شێوەیە فەرمانڕەوایی ناوبراو کۆتایی هاتو سوڵتان ئەبولعەباس ئەحمەد بویە سوڵتانی مەغریب، بەلاَم سوڵتان و شازادەی تر لەکێشە ڕزگاریان بوو بەسەر دوژمندا زاڵ بوون، بەلاَم لەسەر سنوری دەسەلاَتیان کەتنە کێشەوە بەم شێوەیە مەغریبی سەرەوە کەوتە کێشەو ئاشوبی بەردەوامەوە، بەلاَم ئیبن خەلدونیش لەم کێشەو ئاڵۆ زیانەبێزار بوبو بەدوای ژیانێکی بێ کێشەدا دەگەڕا، هەربۆیە کاتێك بۆی ڕوون بویەوە بەهۆی ڕاپەڕین و ئاژاوە یەك لە دوای یەکەکانەوە ناکرێت لە وولاَتی مەغریبدا ئەم مەبەستەی بێتەدی، ئەوەبوو بڕیاریدا دیسانەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەندەلوس، بەو هیوایەی ژیانێکی ئارام بەدەست بهێنێت. هەرچەندە لەڕێگەی بەدەستهێنانی ئەم ئامانجەیدا

ڕووبەڕووی کێشەو گرفتی زۆربوویەوە، بەڵام لەکۆتایدا دەیویست بەسەر هەموو گرفتەکاندا زاڵ بێت. کاتێك گەیشتە ئەندەلوس لەغەرناتە چاوی بەسوڵتان کەوت‌و لەسەرەتادا زۆر بەڕێزەوە پێشوازی کرا، بەڵام ئەم گەرم و گوڕیە هێندەی نەبرد، چونکە فەرمان ڕەوایانی مەغریب لەم سەفەرەی ئیبن خەلدون بۆ ئەندەلوس هێندە خۆشحاڵ نەبوون، چونکە لەوە دەترسان کەئیبن خەلدون دەست بداتە کارانێك کەپەیوەندی ئەمان لەگەڵ بنی ئەحمەردا ئاڵۆز بکات. هەربۆیە داوایان لە سوڵتانی ناوبراو کرد کە بیگەڕێنێتەوە بۆ مەغریب. سوڵتانیش لەسەرەتادا ئەم پێشنیارەی ڕەت کردەوە، بەڵام پیاوانی سوڵتانی مەغریب بۆ ڕازی کردنی ئەو هۆکارێکی باوەڕ پێهێنەریان دۆزیەوەو باسی پەیوەندی باشی نێوان ئیبن خەلدون‌و لیسانەدینیان بۆ سوڵتان کردو ئەوەیان بەسوڵتان گوت کە ئیبن خەلدون بووەتە هۆی ئەوەی کەلیسانەدینی خەتیب بەرامبەر سوڵتان بێ مەیل بێت لەگەڵ سوڵتاندا جۆر نیە.

ئەوەبو لەکۆتاییدا سوڵتان بڕیاری دا کەئیبن خەلدون دوور بخرێتەوە بۆ مەغریب‌و، بەپێی ئەم فەرمانەش ئیبن خەلدون لەڕێگەی دەریاوە ڕۆشتە بەندەری هەنین. ئەم بەندەرەش لەژێر دەسەڵاتی سوڵتانی تلمساندا بوو لەو کاتەدا ئەبو حەمو دەسەڵاتی تلمسانی بەدەستەوە بوو. ڕابوردوی ئیبن خەلدون لەگەڵ ئەم سوڵتانەدا ژیانی ئیبن خەلدونی دەخستە مەترسیەوە، بەڵام ئەبوحەمو لەبەر ئەوەی کەبەنیاز بوو دەست بەسەر بجایەدا بگرێت‌و پێی وابوو لەم کارەیدا پێویستە یارمەتی لە ئیبن خەلدون وەربگرێت، هەربۆیە بۆ ماوەیەك ڕابوردوی لەبیری خۆی بردەوە و داوای لێکرد کەبڕوات بۆ لای هۆزەکانی (دەواودە)و هۆزەکانی ناوبراو بکاتەپشتیوانی‌و یەکیەتیان لەنێواندا دروستبکات. ئیبن خەلدون بەم پێشنیارە زۆر بێتاقەت بوو، چونکە بڕیاری دابوو بۆ هەمیشە واز لە ژیانی سیاسی بهێنێت‌و سەرقاڵی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە بێت، بەڵام بەباشی نەزانی مەبەستی شاراوەی خۆی بەسوڵتان بڵێت‌و بەشێوەیەکی ڕووکەش پێشنیارەکەی سوڵتانی قبوڵ کردوو دواتر بەناوی ڕۆشتن بۆ لای هۆزەکانی ناوبراو و

هەرکە لەشارچویە دەرەوە و گەیشتە نزیکی مەنداس، کەلەژێر دەسەلاتی نەوەکانی عەریفدا بوو، خێرا پەنای بردەلای ئەوان وئەوانیش پەنایان داو شاردیانەوە و دواتر بونە نێوەندگیری نێوان ئیبن خەلدون و سوڵتان، بۆ ئەوەی سوڵتان ڕازی ببێت کەمنداڵەکانیشی لەتلمسانەوە بچنەئەو ناوچەیەی کەئەوی لێیە، ئەوە بوو سەرئەنجام سوڵتان ڕازی بوو ئیبن خەلدون لەگەڵ خێزانەکەیدا لەقەلای سەلامە نیشتەجێ بوون.

## لەقەلای ئیبن سەلامەدا

گواستنەوەی ئیبن خەلدون بۆ ئەم قەلایە مانا کۆتایهاتنی ژیانی سیاسی ئیبن خەلدون بوو. قەلای ناوبراو لە جێگەیەکی گرنگ بەناوی سوق الجیش بوو. واتە لەسەر لوتکەی شاخێکی بەرزدا بنیات نرابوو کە بەسەر هەموو سەرزەمینەکانی دەوروبەریدا دەیڕوانی. ئەم قەلایە بەپەناگەی شێخ و پیاوە گەورەکانی نەوەکانی عەریف ناسرابوو زۆر لەشارو ناوچەکانەوە دوور بوو. ئیبن خەلدون کاتێك هاتە ناو ئەم قەلایەوە چل ودووساڵ تەمەنی بوو. ماوەیەکی زۆر لەژیانی پڕلە دەردەسەری بەسەر بردبوو. ئەو لەماوەی ئەم ژیانە سیاسیە دژوارەیدا وازی لە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە نەهێنا بوو، بەڵام واهەستی دەکرد کەسیاسەت لەزانست و زانیاری دووری دەخاتەوە، هەربۆیە زۆر حەزی دەکرد بەیەکجاری دەست لەکاری سیاسی هەڵبگرێتو تەنها سەرقاڵی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە بێت. ئەم قەلایە کە کۆشکێکی گەورەو جوانی تێدا بوو کەبۆ ئیبن خەلدون زۆر گونجاو بوو بۆ هاتنەدی ئاواتەکانی. هەربۆیە ئیبن خەلدون بۆ ماوەی چوار ساڵ لەوێدامایەوە و لەم ماوەیەشدا بەشێوەیەکی زۆرچالاك سەرقاڵی خوێندنەوە و بیر کردنەوە و نوسین بوو. ئەو لەم قەلایەدا دەستی کردە نوسینی مێژوو پێشەکی لەم قەلایەدا دەست پێکرد. ئەو لە باسی ژیاننامەکەیدا بەم دەستەواژانە باس لەشێوازی کارکردنی خۆی دەکات: (لەم قەلایەدا ژیام کەخاڵی بوو لە هەموو سەرقاڵی و کارێك و لەکاتی مانەوەمدا لەوێ دەستم کردە نوسینی ئەم کتێبەو پێشەکیەکەیم بەم شێوە سەرسوڕهێنەرە نوسیو تەنها

ڕێبەریشم ئەو دونیا تەنهاییە بوو کەبۆم هاتبووە پێشەوە). لەپاش تەواو کردنی پێشەکی دەستی کردە نوسینی (مێژووی عەرەب و بەر بەر و زناتە)و بمانەوێت و نەمانەوێت لە وەها هەلومەرجێکدا بابەتەکانی بەپشتیوانی ئەوزانیاریانە دەنوسی کەلەبەری کردبوون، بەلام کاتێك گەیشتە نوسینی مێژووەکان، بۆی دەرکەوت کەناتوانێت لێرەدا ئەم کارە بەکۆتا بگەیەنێت‌و بەناچاریەوە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك سەرچاوە کەتەنها لەشارە گەورەکاندا نەبێت دەست ناکەون. ئەو نەیدەویست بگەڕێتەوە بۆ هیچکام لەو شارانەی مەغریبی ناوەڕاست‌و سەرەوە، چونکە لانکەی کاری سیاسی ئەو بوون هەربۆیە بڕیاریدا بەرەو تونس بڕوات و بۆ ئەم مەبەستەش نامەیەکی بۆ سوڵتانی تونس نوسی و داوای مۆڵەتی گەڕانەوەی لێ خواست.

ئیبن خەلدون ئەم بڕیارەی خۆی بەم شێوەیە باس دەکات: (لەناخمدا گەڕانەوە بۆ تونس و چونەوە لای سوڵتان ئەبولعەباس، و ئەوشارەی کەناوەندی ژیانی باو باپیرانم و گۆڕەکانیانە گەلاڵە بوو. لەم بارەیەوە نامەیەکم بۆ سوڵتان نوسی لەبارەی گەڕانەوەم و ئارەزووم بۆ خزمەتکردنی وولات لەخزمەت ئەوداو چاوەڕێی وەلامی ئەو بووم. ئەوە بوو پاش ماوەیەك وەلامی بەئەرێنی دامەوە هەربۆیە باڵندەی دڵ ئارەزووی فڕین و سەفەری کردو هەڵ فڕی). بەم شێوەیە ئیبن خەلدون قەلای سەلامەی لەپاش چوارساڵ گۆشەگیری‌و خەڵوەت بەرەوتونس بەجێ هێشت.

## لەتونس دا

ئیبن خەلدون لەپاش ئەوەی کەنزیکەی بیست و دووساڵی لەدەرەوەی تونسدا بەسەر بردبوو، جارێکی تر گەڕایەوە ئەوشارە و بمانەوێت و نەمانەوێت ماوەیەك پێش ئەوەی کەبێتە تونسەوە هاتنەوەی لەناو خەڵکیدا بلاو بوبویەوە، هەربۆیەلەکاتی گەشتنیدا بۆ تونس هەم لەلایەن سوڵتانەوە و هەم لەلایەن دانیشتوانی تونسەوە بەشێوەیەکی جیا پێشوازیەکی گەرم وبێ وێنەی لێکرا. ئەولەباسی ژیاننامەکەیدا بەم شێوەیە باسی

پێشوازی سوڵتان وخەڵکی تونس دەکات: (لەدەرەوەی سوسە سوڵتانم بینیو، بەگەرمیەوە بەخێرهاتنی کردم وبەڕێزە وە پێشوازی لێکردم و لەهاودەمی و هاوڕێیەتی لەگەڵ مندا زۆر خۆشحاڵی خۆی دەر بڕی و لەکارە گرنگەکانی خۆیدا دەستی کردە ڕاوێژ کردن لەگەڵمدا، لەپاشان گەڕاینەوە ناوشاری تونس و بەفاریحی خزمەتگوزاری فەرمانیدا خانویەکی پڕلە هۆکارەکانی خۆشگوزەرانیم بۆ فەراهەم بکاتو بەئەوپەڕی چاکەوە لەگەڵمدا بجوڵێتەوە. من لەشەعبانی هەمانساڵدا گەڕامەوە بۆ تونس و لەپەنای سۆزو چاودێری و ڕێزی سوڵتاندا دەژیام و ژن ومنداڵەکانیشم هێنایە ئەو شارەوە تاوەکو لەدوری و جیایی ڕزگاریان ببێت لەپەنای سوڵتاندا بەخۆشیەوە ژیان بگوزەرێنن، چونکە ئیتر لەکۆچ کردن بەتەواوی بێزار بو بوم و لەو شارەدا کۆڵ و باری مانەوەم دانا. ئەم دەستەواژانە ئەوە نیشان دەدەن کەسوڵتانی ناوبراو بۆ ئەو مێژوونوسە هەموو جۆرە کەرەستەو پێداویستیەکی ژیانی بەشێوەیەکی فراوان بۆ فەراهەم کردبوو.

ئیبن خەلدون لەوە بەدواوە لەلایەك لەتونس دەستی کردە وانە ووتنەوە و لەلایەکی تریشەوە بۆ تەواو کردن و بەکۆتا گەیاندنی کتێبە مێژووییەکەی خۆی دەگەڕا بەشوێن سەرچاوە پێویستەکاندا. وانەکانی لەگەڵ ئەوەی بو بویە جێگەی سەرسامیو سەرسوڕمانی قوتابیەکانی و زۆر بەگەورەیی و ڕێزەوە باسیان دەکرد، هەستی ئیرەیی مامۆستا بلیمەت و کۆنەکانی جولاندبوو بەتایبەت ئەوەی کە ئەم لە سوڵتانیشەوە نزیك بوو ڕێزێکی زۆری لێدەگیرا و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش ئەم ڕێزو ئیحتیرامە زیاتر دەبوو. هەروەك بڵێی سوڵتان خۆشەویستیەکی بێ وێنەی بۆ مێژوو هەبوبێت. هەربۆیە گرنگیەکی زۆری بە نوسین و لێکۆلینەوەکانی ئیبن خەلدون دەدا و هەمیشە هانی دەدا کە ئەم ئەرکە قورسە تەواو بکات. سەرئەنجام ئیبن خەلدون لەماوەی مانەوەیدا لەتونس دانراوەکەی خۆی تەواو کردو نوسخەیەکی بەدیاری برد بۆ سوڵتان. ئەو خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: (مێژووی بەربەر و زناتەم تەواو کردو لەو هەواڵ و مێژووەی کەلە بارەی

ئەمەوی و عەباسیەکان و پێش هاتنی ئیسلامەوە کۆم کردبویەوە نوسیمەوە و بەدیاری بردم بۆ کتێبخانەکەی سوڵتان).

ئەو ڕۆژەی کەئەم کتێبەی دابە سوڵتان و قەسیدەیەکی گوت و بەسوڵتاندا هەڵیدا. قەسیدەی ناوبراو زۆر دوورودرێژەو لەسەد بەیت زیاتر دەبێت و لەژیاننامەکەیدا هەموی هێناوە[٦١] بەم شێوەیە ئیبن خەلدون کارە گەورەکەی خۆی تەواو کرد، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا ئیبن خەلدون لەکێشەو گرفتەکانی ژیان ڕزگاری نەبوبو، چونکە ئەوانەی ئیرەییان پێ دەبرد لەلای سوڵتان قسەیان بۆ هەڵدەبەست، بەڵام دیسانەوە بەردەوام جێگەی ڕێزی سوڵتان بوو تەنانەت لەگەڵ خۆیشیدا دەیبرد بەئەم لاو ئەو لادا. ئیبن خەلدون لەم کاتەدا گەشتبووە تەمەنی پەنجا ساڵی و کەوتە بیری ئەنجامدانی فەریزەی حەج، هەرلەو ڕۆژانەدا وەك ڕێککەوت کەشتیەکی تایبەت بە بازرگانانی ئەسکەندەرییە لەنگەری گرتو پاش داگرتنی بارەکەیان دەیانویست بەرەو ئەسکەندەرییە بڕۆن، ئیبن خەلدونیش ئەمەی بەهەل زانی و بەپەلە چویە لای سوڵتان و داوای لێکرد مۆڵەتی بدات بۆ سەفەری ئەنجامدانی فەریزەی حەج، لەبەرامبەریشدا سوڵتان داواکەی قبوڵ کرد. ئیبن خەلدون لەپاش چوارساڵ مانەوە لەتونس ئەو شارەی بەجێهێشت و بەرەو مەککە کەوتەڕێ.

## لەمیسردا

ئیبن خەلدون لەڕێگەی حەجەوە گەیشتە میسر و لەوە بەدواوە واتە بۆماوەی بیست و چوارساڵی تر لەوێدا مایەوە. چونی ئەو بۆ ئەسکەندەرییە هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆژی فیترو دەرۆژ بەسەر دانیشتنی مەلیك زاهیر لەسەر تاج و تەختی پاشایەتی تێپەڕیبوو، ئیبن خەلدون بۆ ماوەی یەك ساڵ بۆ دابین کردن و خۆ ئامادەکردن بۆ سەفەری حەج لەئەسکەندەرییە مایەوە، بەڵام سەفەرەکەی سەری نەگرت و گوازرایەوە بۆ قاهیرە.

---

[٦١] کتاب (التعریف بابن خلدون ورحلته شرقا وغربا)لاپەڕەکانی ٢٢٣ – ٢٤٤

لەبەر ئەوەی کەلەدێر زەمانەوە ناوبانگی گەشتبووە میسر، هەر ئەوەندەی کە لە زانکۆی ئەزهەر دەستی کردە وانە ووتنەوە، زانستخوازانێکی زۆری لە دەورکۆبوویەوەو ئەو توانی بە زیرەکی و زمانی پاراو سەرنجی قوتابیەکانی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. بەم شێوەیە ناوبانگی لە میسردا بلاّو بویەوە. لەپاشان سولّتانی بینی و ڕێزێکی زۆری لێ گیرا، چونکە سولّتان بە گوتەی ئیبن خەلدون (زۆر ڕێزی لێ گرتووە و دلّی داوەتەوە و ئەو دیاری و بەخشیشانەی کەبە ئەهلی زانستی دەبەخشی ئەمیشی لێ بێبەش نەکردووە). هەربۆیە ئیبن خەلدون بڕیاریدا خێزان و مالّ و مندالّی لە تونسەوە بهێنێتە میسرو لەوێدا نیشتەجێیان بکات، بەلاّم سولّتانی تونس ڕێگری لێکردن، چونکە زۆر حەزی دەکرد کەبگەڕێتەوە بۆلایان واتە بۆ تونس. هەربۆیە ئیبن خەلدون داوای لەسولّتانی میسر کرد کەلەلای سولّتانی تونس تکای بۆ بکات، سولّتانی میسریش داواکەی قبولّ کردوو نامەیەکی کاریگەری نارد بۆ سولّتانی تونس و لەئەنجامدا مالّ و مندالەکەی ئیبن خەلدون بەکەشتی و لەڕێگەی دەریاوە بەرەو میسر کەوتنەڕێ، بەلاّم کەشتی ناوبراو لە دەریادا نوقم بوو دیداری ئیبن خەلدون و مندالّەکانی کەوتە قیامەت.

ئیبن خەلدون لەمیسر دا بێجگە لەکاری وانە ووتنەوە سەرقالّی هیچ کارێکی تر نەبوو. ئەوەبوو چەندین جار پلەو پایەی وانە ووتنەوە و دادوەری کردنی بەدەستهێنا. سەرەتا لەقوتابخانەی قەمحییە[٦٢] کرایە وانە بێژ و لەپاشان کرایە (دادوەری دادوەرانی مالیکیە کان). ئەم پلەیە لەو ڕۆژگارەدا مایەی گۆڕانکاری گەورە بوو. هەربۆیە چەندین جار لەسەر ئەو کارەی لابراو دیسانەوە دادەنرا یەوە. ئەو لەپاش لێپرسراویەتی وانە ووتنەوە لەقوتابخانەی قەمحیە کرایە مامۆستای قوتابخانەی زاهیریەو لەپاشانیش کرایە مودەریسی قوتابخانەی سرغتمش و دواتر بەپلەی شێخی خانەقا دیاری کرا، بەلاّم لەپاش گەشتن بە پلەی دادوەری دادوەرانی مالیکیەکان لەپاش ماوەیەك لابرا، بەلاّم دواتر نزیکەی پێنج جار لابراوە و لەجێگەی خۆی دانراوەتەوە. لەوکاتەی کەلەلایەك ئەو

---

[٦٢] (قمح)بەمانای گەنم دێت و قمحیە دراوەتە پالّی.

کاروباری دادوەری لەئەستۆدابوو بەبڕشتەوە کاری بۆ دەکرد دەوروبەرەکەی سەرسام کردبوو، لەلایەکی تریشەوە خەڵکانێکی زۆر ڕقیان لێی دەبویەوە. هەربۆیە هاوچەرخانی ئەو لەمیسردا دەبوون بەدوو دەستەوە: گروپێك کە زۆر بەویاندا هەڵدەدا و گروپێکیش زۆر بەتوندی دژایەتیان دەکرد. لێرەدا جێگەی خۆیەتی کە کورتەیەك لەچۆنیەتی کاری دادوەری ئیبن خەلدون کەخۆی دەیگێڕێتەوە لەکتێبی التعریف دا نوسراوە و گەندەڵی ژینگەی میسر لەو ڕۆژگارەدا کەباسی دەکات بخەینەڕوو وەك خۆی تەرجەمەی بکەینەوە[٦٣]:

(لەپاش ئەوەی کەسوڵتان لەدەرباری خۆیدا ڕێزی لەمن گرت و یەکێك لەکەسە تایبەتەکانی خۆی خستە خزمەتمەوە بۆئەوەی لەمەسنەدی دادگا لەقوتابخانەی ساڵحیە بمناسێنێت، هەستام بەو ئەرکانەی کەپێم سپێردرابوو هەوڵی تەواوم دا بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوداو، لەم ڕێگەیەشدا نەلە سەرزەنشتی بەدکاران دەترسام و نەلە خاوەن دەسەلاتەکانیش سڵم دەکردەوە. بەشێوەی یەکسان سەیری هەردو لای دەعوام دەکرد و فەزڵی کەسم بەسەر کەسی تردا نەدەدا و مافی لاوازم دەگێڕایەوە و هەرجۆرە واسیتەو واسیتە کاریەکم ڕەت دەکردەوەو، زۆر خولیای بیستنی ووتەی هەردولای کێشەکە دەبووم‌و، بەباشی گوێم لە شاهیدەکان دەگرت و هەوڵم دەدا زۆربەباشی باش و ناباش لەیەکتری جیا بکەمەوە، چونکەلەو سەردەمەدا خراپە کاران و فێڵبازان بەهەمو شێوەیەك هەوڵی خەڵتاندنی بەندەکانی خودا و دادگاکانیان دەداو هەق و ناهەقیان تێکەڵ بەیەکتری دەکرد. کەزۆربەیان لەقوتابیانی زانستی قورئان بوون و خۆیان لای بەرپرسان و گەورەکان دەبردە پێشەوەو دەسەلاتدارانیان فریودەدا و بەهەڵەیاندا دەبردن‌و، کۆڵو باری خەڵکی هەژارونەداریان قورستر دەکردو گەندەڵی لەناو خەڵکیی و دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا بلاو دەبویەوە. منیش لەکۆمەڵێك لەو گەندەڵی و فێڵبازیانەم ئاشکرا دەکردو لێپرسینەوەم لەگەڵ ڕیاکاراندا دەکردو بەسزای خۆیانم دەگەیاندن.

---

[٦٣] التعریف بابن خلدون لاپەڕەی ٢٥٤ .

هەروەك چۆن هەڵەو پەڵەی هەندێکم بۆ دەرکەوت و لە شاهێدی دان بێ بەشم کردن کەنوسەرانی نوسینگەکانی دادوەریو ئەوکەسانەشیان تێدابوو کەئەرکی نوسینی مەحزەری کۆڕو کۆبونەوەکانیان لە ئەستۆ دابوو.

ئەم گروپە زۆر شارەزای نوسینی دەعواو شێوازی تومار کردنی حوکمەکان بوون، هەربۆیە لەلایەن شازادەو ئەمیرەکانەوە بانگهێشت دەکران و ئەرك و کاریان پێ دەسپێردرا و بەکاریان دەهێنان بۆ سودو بەرژەوەندی خۆیان لەکێشە گرفتەکانیانو، لە مەسەلەکانی موڵك داری و کێشەکانی تردا و هەمیشە لەبەرژەوەندی دەسەڵاتداران کاریان دەکرد. هەربۆیە هەمیشە لەناو چینی خۆیاندا خاوەن پلەوپایەو ئیمتیازی ئەوتۆ و لەڕادە بەدەر بوون. بەهۆی ئەم دەسەڵاتەشەوە دەستیان دەدایە هەمو کارێکی ساختەکاری و تەزویرێك و بەهەرشێوەیەك بیان ویستایە فەرمانیان دەردەکرد. ئەم گروپە لەزۆربەی کاتەکاندا بەفرتوفێڵ عەقدومامەڵە ڕاستەکانیشیان بەتەزویرو فێڵ لەشایستەییان دەخستنو ڕێگەی ساختەکاریان ئیتر لەڕووی فیقهیەوەبێت یان لە ڕوی شێوازی نوسینەوەبێت بەدەست دەهێنا. بەم شێوەیە یان لای دەسەڵاتدارێك دەچونە پێشەوەو یان بەرتیلێکی باشیان وەردەگرت بەتایبەت لەمەسەلەکانی وەقفو بەخشینەکاندا کەلەقاهیرەدا چەندین جۆری دەبینرا. لەئەنجامدا کارە ڕوکەشەکانیان بەپێی تێڕوانینی دادوەرانی هەرچوار مەزهەب (حەنبەلی، حەنەفی، مالیکی، شافیعی)کەلەشاردا سەرقاڵی ئەرکی دادوەری بوون لەئەوقافی ناوبراودا گرفتیان دروست دەکردو لەهەوڵی بەتاڵ کردنەوەی وەقف نامەکاندا بوون. هەربۆیە هەرکەسێك بیویستایە موڵکێکی وەقف بکڕێت ئەم گروپە لە مەجلیسەکاندا هەلو مەرجی مامەڵەو سەوداکەیان فەراهەم دەکرد و ئەو فتواو حوکمەدادوەریەی کە وەك بوکەڵەیەك وابوو بەدەستیانەوەو موڵکداریەتی وەقفیان بەسەریەکدا شکاندبوو بۆکەسی داواکاریان بەدەست دەهێنا. لەئەنجامی ئەم کردارانەدا زەرەرو زیانێکی زۆری بەئەوقاف گەیاند و عەقدو مامەڵەکانی هەژاند. من لەبەر خودا ئەم شێوازەی تەزویرو گەندەڵیەم بنەبڕ کرد، هەربۆیە زۆر ڕقیان لێم دەبویەوە. دواتریش

دەستم کردە لێکۆڵینەوە لەکاروبارەکانی دادوەری و موفتیەکان و بینیم زۆر دورن لە بەسیرەت و بیناییەوەو فەرمانی ناسیخ و مەنسوخیان زۆر دەردەکرد و بەویستی ئەوان حوکمەکان دەردەکران، و دواتریش زۆر بەئاسانی نەسخیان دەکردەوە. لەنێو ئەمانەشدا خەڵکانێکی سەرمایە دار دەبینران کەنەهیچ زانیاریەکیان هەبو نەخاوەن هیچ سیفەتێکی عەدالەت بوون‌و، بەبێ هیچ ڕەنج و ماندوبونێك دەگەیشتنە پلەکانی فتواو وانە وتنەوە و لەسەرکورسی دادگا دادەنیشتن و بەلاف و گەزاف ئەم پلەیان بەدەست دەهێنا، بەبێ ئەوەی کەسێك سەرزەنشتیان بکات‌و یان شاهێدی شیاویان بۆ بدات و باشیان لەخراپ جیا بکاتەوە، چونکە لەگەڵ زۆر بونی دانیشتواندا ئەم کەسانەش زۆر دەبون و لەوەها هەلومەرجێکدا فتوا دەرەکانیش ئازاد دەبون و پێیان لێ ڕادەکێشاو پابەندی هیچ کۆت و بەندێك نەدەبون.

داخوازی کارانی جۆراو جۆر هەریەکەو پابەندی یەکێك لەم دادوەریانە دەبون و بەدڵی خۆیان حوکمیان بۆ دەردەکرا. بۆئەوەی لە زاڵ بون بەسەر بەرامبەرە کانیاندا سودی لێ وەربگرن. ئەم دادوەرانە هیچ کەسێکیان بەناڕەزامەندیەوە نەدەکردە دەرەوە. بەم شێوەیەش ناسیخ و مەنسوخ ڕەواجی پەیدا دەکردو هەردولای کێشەکە هەمیشە لەگرفتدابون. لەهەرچوار مەزهەبەکەدا جیاوازی بێ سنور دەهاتە ئاراوە و ویژدان زۆر دژوار دەبو. دیاری کردنی موفتی باش و فتوای ڕاست بۆ خەڵکی شتێکی ئاستەم بوو. شەپۆلی ئەم خراپە کاریانە بەڕۆژی ڕۆشنا شەپۆلە کەی بەردەوام لە بەرز بونەوەدا بو. من بومە ڕێگر بووم لەبەردەم ئەو تەزویرچی و هەوەس بازانەداو ڕێگەی هەقم کردەوە و ئەوانەم لە پلەوپایەخست‌و، لەنێوانیشیاندا گروپێکی ساختەچیم دۆزیەوە کەلە مەغریبەوە هاتبونە میسرو زانستیان لێرەو لەوێ دەردەهێناو پەیوەندیشیان بەهیچ مامۆستایەکی بەناو بانگەوە نەبو، بۆ بەتاڵان بردنی سەروەت و سامانی خەڵکی دادگا گەلێکیان پێکهێنابو). ئیبن خەلدون لەم ماوەیەشدا بێ ئاگا نەبو لەپێدا چونەوە بەدانراوەکەیدا. چەندین بەشی تری بۆ زیاد کرد بەتایبەت باس و بابەت گەلێکی

سەبارەت بەمێژووی خۆرهەلاتی بەشێوەیەکی بەرچاو فراوان کرد. هەندێك لەبەش و بابەتەکانی بۆپێشەکی زیاد کردو هەندێك بەشیشی بەتەواوی گۆڕی و لەپاشان نوسخەیەکی بەدیاری دابەمەلیك زاهیرو بەتەمای ئەوەبوو نوێنەری سوڵتانی ناوبراو بچنەلای سوڵتانی مەغریب بۆئەوەی پەرتوکێکیش بۆ ئەو بکاتەدیاری. ئەوەبو ئەم هەلەش هەڵکەوتو نوسخەیەکی نارد بۆ سوڵتانی مەغریبو دانەیەکیشی نارد بۆ کتێبخانەی سوڵتانی فاس لەمزگەوتی قەرەوییینو کردیە دیاری بۆ سوڵتان ئەبولفارس عبدالعزیز. هەروەك بڵێی چاپی بولاق و چاپەکانی ترلەسەر ئەم بلاّو کرابنەوە و پشتیان بەم پەرتوکە بەستبێت کەبەناوی نوسخەی (فارسیە)وە بەناوبانگەو بەموڵکی سوڵتان ئەبوفارس عبدالعزیز دەژمێردرێت.

سەرەڕای ئەمەش چەندین جار ئیبن خەلدون لەقاهیرەوە گەشتی کردووە بۆ شارەکانی تر کەگوایە بۆ کۆکردنەوەی گەنم و بەروبوم بووە بۆ قوتابخانەی قەمحیە، کە لەوکاتەی مودەڕیسی ئەو مەدرەسەیە بووە. ئەو لەساڵی ٧٨٩ ك ١٣٨٧ز، لەڕێگەی تور و یەنبوعەوە گەشتی دەکرد بۆ حیجازو، لەڕێگەی قەسیرو قوسەوە دەگەڕایەوە قاهیرە. لەساڵی ٨٠٢ ك ١٣٩٩ ز، گەشتی کرد بۆ قودسو چوە زیارەتی بەیت لەحم وخەلیل و دەستی کردە سەیرکردنی مەقاماتی ئەو شارە. سەرئەنجام لەساڵی ٨٠٣ ك ١٤٠٠ ز، چو بۆ دیمەشق ئەم سە فەرەشی هاوکات بو لەگەڵ ئەوسەردەمەی کەتەیمور لەنگ بەنیازی هێرش کردنە سەر ئەو شارە بوو لەو ناوچەیەدا. سەفەری ناوبراو هاوکات بووە لەگەڵ کۆمەڵێك ڕووداو دا کەئیبن خەلدون بەشێوەیەکی گشتگیرو دوورودرێژ باسی کردون. کاتێك تەیمورلەنگ حەلەبی داگیر کرد (ئەوەندە کاری زیان بارو تالاّن ودزی و دژی شەرع ڕوویاندا کەخەڵکی هاوشێوەی ئەوانەیان هەرگیز نەدیبو). کاتێك هەواڵی ئەم ڕووداوانە گەشتەوە میسر سوڵتان کوڕی مەلیك زاهیر خۆی ئامادەکرد بۆ بەرگری و لەمیسر چویەدەرەوە و هەرسێ دادوەری حەنەفی و شافیعی و مالیکی لەگەڵدابون و هەرچەندە ئەو کاتەئیبن خەلدون لەپلەی دادوەری لادرابو، داوای لێکرد هاوڕێیەتیان بکات.

لەوکاتەی کەتەیمور بەرەو دیمەشق ڕۆیشت سوڵتان چویە ناودیمەشقەوەو، فریای ئەوە کەوت کەهێزەکانی دیمەشقیش ئامادەبکات بۆ بەرگری و بۆماوەی یەك مانگ لەبەرامبەر یەکتریدا وەستان، بەڵام لەم ماوەیەدا هەواڵ درابەسوڵتان و شازادەکان کەهەندێك ئەمیری فیتنەچی دەیانەوێت بەرەو میسر هەڵبێنو کودەتابکەن. هەربۆیە سوڵتان بۆئەوەی دەوڵەتەکەی نەڕوخێت بەناچاری بەرەو میسر گەڕایەوە.

خەڵکی دیمەشقیش لەم کارەی سوڵتان سەریان سوڕماو قازی و فەقیهەکان بەئامادە بونی ئیبن خەلدون لەقوتابخانەی عادلیەکۆ بونەوەو بڕیاری ئەوەیاندا کەداوا لەتەیمور بکەن بەمەرجی پاراستنی گیان و شەرەف وماڵیان دیمەشق دەدەن بەدەستەوە، ئەم گەلاڵەیان خستە بەردەم سەرپەرشتی قەلاکە، بەڵام قبوڵی نەکرد. ئەوەبوو ئەوان لەسەر قەلاکەوەهاتنە خوارەوەو چونەلای تەیمورو لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کەبەیانی لەگەڵ سوپاکەیدا بچنە ناو قەلاکەوە و خەڵکیش وەك جاران سەرقاڵی ژیانی ئاسایی خۆیان بن و ئەمیریش بچێتە بارەگای فەرمان ڕەواییەوە و دەسەلات بگرێتەدەست، بەڵام دژایەتی کردنی سەرۆکی قەلا لەگەڵ بیرۆکەی قازی و فەقیهەکاندا کێشەکەی ئاڵۆز کردو وای لەئیبن خەلدون کرد بەتەنها بچێتە لای تەیمورو بۆماوەیەکی زۆر بەیەکەوە قسەیان کرد. ئیبن خەلدون لەپاش ئەم ڕووداوانە گەڕایەوە میسر و ئەمەش کۆتاچالاکی سیاسی ئەو بوو. ئەو بەدورو درێژی وردەکاریەکانی گفتوگۆکانی لەگەڵ تەیمور لەژیاننامەکەیدا باس کردووەو ژیاننامەی خۆی تاوەکو ساڵی ٨٠٨ ك ١٤٠٥ز، بەشێوەیەکی بەردەوام نوسیوە. هەر لە هەمان ساڵدا چرای ژیانی دەکوژێتەوەو بەگوتەی نوسەرو مێژوو نوسانی هاوچەرخ لەگۆڕستانی سوفیە بەخاك سپێردراوە.

## بەکورتی

لەو وردەکاریانەی کەباسمان کرد ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ژیانی کرداری و فیکری ئیبن خەلدون لەپاش قۆناغی خوێندن و لەمێژووی چونیەوە بۆناو ژیانی کۆمەلایەتی دابەش دەبێت بۆ سێ قۆناغ:

قۆناغی یەکەم: قۆناغی چالاکیە سیاسیەکانی لەوولاتی مەغریبدا کەبۆ ماوەی زیاتر لە بیست ساڵ بەردەوام بوو (١٣٥٢ – ١٣٧٤ز). قۆناغی دووەم: ڕۆژگاری گۆشەنشینی ئەندێشەو نوسینی لەقەلاَی سەلامە لەلای نەوەکانی بەنی عەریف کەبۆ ماوەی چوارساڵ بووە (١٣٧٤ – ١٣٧٨). قۆناغی سێیەم: سەردەمی سەرقاڵی ئەو بەوانە ووتنەوەو کارو باری دادوەری و گەڕانەوە و پێدا چوونەوە بە دانراوەکانیدا کەماوەکەی هەژدە ساڵ بووە (١٣٧٨ – ١٤٠٦). هەرچەندە قۆناغی گۆشەنشینیەکەی ئەو بەبەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی تردا زۆر کورت بووە، بەلاّم هەر ئەم چەندساڵە بەخاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ دادەنرێت لەمێژووی ژیانی ئەودا، چونکە ئەو بەر لەم قۆناغە زۆر بەخەستی سەرقاڵی دونیای سیاسەت بووە و بۆساتێکیش بێ ئاگانەبووە لەکاری سیاسی، بەلاّم لەپاش گۆشە نشینی لەقەلاَی سەلامەدا جارێکی تر نەگەڕایەوە ناو گۆڕەپانی سیاسەتەوەو تەنها سەرقاڵی وانە ووتنەوە و دادوەری و دانان و نوسین بووە. بەرلە قۆناغی گۆشەنشینی لەقەلاَی ناوبراودا بویە پیاوی زانست و جارێکی تر نەگەڕایەوە گۆڕەپانی سیاسەتو بویە پیاوی فیکرو زانست.

## ئیبن خەلدون لەبیرەوەری گەلی تونس دا

لەبیرەوەری گەلی میسردا زۆر نەماوەتەوەو تائێستەش گۆڕەکەی لە قاهیرە دیارنیە، بەلاّم ئەو لەبیرەوەری گەلی تونسدا هێشتا زیندووە و لەبیر نەکراوە. لەوێدا خەڵکی ئەو ماڵەی کەزێدی لەدایك بونی ئەوە و لەوێدا دەستی کردووە بەکارو چالاکی هێشتا دەیناسن. ئەم ماڵە کەوتوەتە یەکێك لە شەقامەگرنگە کۆنەکانی شارەوەو کەناویان لێ ناوە شەقامی (تربەبای). چەندین ساڵە ئەم خانووە تایبەتە بە مەدرەسەی عولیاوەو، لەلایەکی ئەو خانوەوە بەردی مەڕمەڕ دانراوە و لێی نوسراوە (هەمان ئەو جێگەیە کەبیرمەندی گەورەی تێدا لەدایك بووە)، وەلە کۆتایی هەمان شەقامەوە مەکتەبخانەیەك (مزگەوت)ێکی بچوك هەیە کەلە ژێر گومەزیەکی جواندایە کەبە (مسیدالقبە)ناسراوە (١)و،

دەڵێن ئیبن خەلدون لەم مزگەوتەدا وانەی خوێندووە، بەڵام قەڵای ئیبن سەلامە کەئیبن خەلدون لەوێدا پێشەکی نوسیوە کەلای خەلکی ناسراوە و قەلای ناوبراو کەوتووەتە دوری پێنج کیلۆمەتر لەشاری (فرندا)ی ئێستا کەسەربە ویلایەتی ویهرانی ئەلجەزایرەو شوێنەواری کۆنی قەلاکە هێشتا هەرماوە. (١)وشەی (مسید)هەڵەی وشەی (مسجد)و لەتونسدا نوسەران بە (مەکتەبخانە)بە (مسید)(مزگەوت)دەڵێن.

لەنوسینی ئەم ڕاڤەیەدا سود لە (التعریف بابن خلدون ورحلتە شرقا وغربا)و (دراسات عن ابن خلدون)و (ابن خلدون وتراثة الفکری )و (فلسەفەابن خلدون الاجتماعیە)و (ابن خلدون وتیمورلنك)وەرگێڕانی بەڕێز سعیدی نەفیسی وەرگیراوە.

***

# پێشەکی وەرگێڕ ( چاپی دووەم )

ئێستە نزیکەی یانزە ساڵ بەسەر وەرگێڕانی پێشەکی ئیبن خەلدوندا تێپەڕدەبێت‌و پێش سێ ساڵ لەم ماوەیە، واتە سەرەتای ئورد یبەهەشت تاوەکو ناوەڕاستی ساڵی ۱۳۳۷ی هەتاوی، کەبەرگی دووەمیش بلاّو بویەوە بەشێکی زۆری کاتی وەرگێڕ لەتەرجەمەی ئەم کتێبە گرنگەدا سەرف کرا. لێرەدا ئەوهەموو دژواری و ناڕەحەتیانەی کەبەهۆی هەڵەو پەڵەی چاپە عەرەبیە کانەوە دەهاتنە ڕێگەم، وەك مشتێ لەنمونەی خەروارێك لەچاپی یەکەمدا باسم کردون و، بەبێهودەم زانی لێرەدا دووبارەیان بکەمەوە و توانیم نوسخەیەکی زۆر باش و دڵنیا ڕێك بخەم بەهۆی ئەو بەراوردەی کەلەنێو چاپەکاندا دەمکرد. ئەگەر بهاتبایەو زانای بەڕێز جەنابی موجتەبا مینەوی کەلەتورکیا وێنەیان بۆ بلاّوکەرەوە نەگرتبایە و نوسخەی (ینی جامع)یان بۆمن نەهێنابایە ئێستە لێرەدا نەم دەتوانی ئەوە وەیاد بهێنمەوە، کەئەم شاکارەی جیهانی ئیسلام کەبەندە وەرم گێڕاوە لەهەموو چاپەکان کەلە نێو خەڵکیدان باشترو بێ هەڵە و پەڵە ترە. بێگومان هەوڵ و ماندوبونی بەڕێز جەنابی مینەوی خزمەتێکی گەورەو بێ وێنەی بەم دەقە کردوە کەوەك دائیرە المعاریفی فەرهەنگی ئیسلام‌و بنەماکانی زانستی مێژوو کۆمەڵناسی‌و ئابوری دەژمێردرێت.

بەڕێزیان لەو نامەیەی کەبۆ بلاّو کەرەوەی نوسیوە لەبارەی تایبەتمەندیەکانی ئەم نوسخەیەوە بەم شێوەیە دەنوسێت: (دانەر ئەم نوسخەیەی (ینی جامع)خوێندوەتەوە و ناوونیشانەکانی نوسیوە و نوسخەی پاکنوس کراوی خودی خۆی بووە لەهەندێك شوێندا

چاکسازی و پاڵفتە کردن و جەرح و تەعدیل و زیادەو کەمو کورتیەکانی بەخەتی خۆی تێدا نو سیوە). ئەم نوسخە یەکێکە لەو سێ نوسخەیەی کەلێرەدا (تورکیا) بەتایبەتمەندیانەوە هەیە سەربە (ینی جامیعە). لەماوەی بڵاو بونەوەی هەردوبەرگی ئەم تەرجەمەیەدا زانایان و قەڵەم بەدەستانو دۆستو هاوڕێیان لەگۆڤارو ڕۆژنامە جۆراو جۆرەکانی وولآتدا منیان خستە بەر ڕێزو گەورەیی خۆیانەوە، کەناتوانم بەهیچ جۆرێك پاداشتیان بدەمەوە. بەڵام زۆرسوپاسیان دەکەم، لەنێو ئەو نوسین و بابەتا نەشدا بەڕێز جەنابی دکتۆر محمدی مامۆستای پێشوی زانکۆی تاران و مامۆستای ئێستەی کۆرسی ئەدەبیاتی زانکۆی لوبنان بابەتێکی نوسیوەلەم بارەیەوە کەبەشیاوی دەزانم[٦٤] لێرەدا دایبەزێنم، چونکە زۆر بەووردیەوە باسی لەماندوبوونی وەرگێڕ کردووە بەوردیەوە هەڵوەستەی لەسەر کردووە.

(وەرگێڕ بەرلە وەرگێڕان نوسخەیەکی ڕاستکراوەی بەدەست هێناوەو دواتر دەستی داوەتە وەرگێڕان. لەم بابەتە ٤٥ لاپەڕەییەدا دەرئەنجامی بەراورد کردنی نوسخەی ڕاستکراوە لەچاپە جیاوازەکانی میسر و بەیروت لەگەڵ نوسخەی دەست خەتی تورکی (ینی جامع)بەتێبینی و ڕونکردنەوەی وەرگێڕ دراوەتە قەڵەم. کەتاوەکو ئێستەش لەم چاپەدا هەمو دەرئەنجامە ناوبراوەکان سەرەڕای یاداشتە ڕەخنەئامێزەکانی هەندێك خاوەن بۆچون کەلەچاپی یەکەمدا ئاماژەی پێکرا، لەگەڵ دولاپەڕەی هەڵەنامەی بەرگی

---

[٦٤] وقد قدم الاستاذ كنابادى ترجمة بدراسة وافية للمقدمة وعصرصاحبها وسيرتة ، معددا النسخ التى رجع اليها وقارن بينها من نسخة نصر هورينى المطبوعةفى القرن الماضى سنة ١٢٧٤ الهجرية الى اخرطبعة لة فى وقتنا الحاضر ، كبعة دارالكتاب البنانى ومـوردا نماذج لهذة النسخ ومافى معظمها من اخطاء وقد سعى المترجم سعياحثيثا فى تصحيح الاخطاء التى وجدها فى تلك النسخ على ضوء المقارنة بينها واستخلاص نسخةمصححة منها اولا ثم ترجمتهاالى الفارسية. وقد عرض فى مقدمتها موضوعات هامة طقيمة كتاب العبروديوان المبتداء والخبر ...واراء المستشريقين والمؤرخين وعلماء الاجتماع والاقتصاد والنقاد المعاصرين فى مقدمةابن خلدون وهوهنا يورد عرضاتاريخيا لاهم الافكار حول هذاالكتاب وللعديد من الا شخاص الذين درسوة ونقدوة ، يبظهر فية مدى سعة اطلاع المترجم ودقتة ، .....الخ لە گۆڤاری الدراسات الادبیەی زانکۆی لوبنان ساڵی ٤ لاپەڕە ٩٣.

یەکەم گوازراوەتەوە بۆ دەقەکەو لەپەراوێزدا باسی جیاوازی نێوان چاپەکان لەگەڵ نوسخە بنەڕەتیەکەدا کەلە چاپی یەکەمدا ناساندمان ئاماژەی پێکراوە. ئەم کارەش بەرەچاو کردنی زۆرێك لەهەڵەچاپییەکان کەلە هەڵە نامەکەشدا لابراون و لەئەنجامدا دوبارە گەڕانەوە بۆ نوسخەجۆراوجۆرەکان کەخۆی وەك ڕاستکردنەوەیەکی تازە وایەو لەگرنگی ئەم چاپە زیاد دەکات.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی کەهۆکاری نایاب بونی دوهەزار نوسخەی ئەم کتێبە لەماوەی حەوت ساڵ لەپاش بڵاو بونەوەی سەرەڕای هاندەرانی زانست و ئەدەب بۆ دووهۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە: کەیەکێکیان ناوبانگی ئیبن خەلدون دانەری کتێب لەزانستە ئیسلامیەکاندا بەتایبەت داهێنانەکانی لەوسەردەمەدا واتە لەسەدەی هەشتەمی کۆچیدا. لەزانستەکانی کۆمەڵناسی و ئابوری و فەلسەفەی مێژوو سیاسەتو شیکاریو لێکۆڵینەوەی مەسەلە مێژووییەکان بەشێوەیەکی زانستی. هۆکاری دووەمیش بەرز بونەوەی ئاستی فیکری لاوانمان لەچوارچێوەی پێشکەوتنی خێراو هەمەلایەنەی فەرهەنگ بەتایبەت لەزانکۆو پەیمانگاکانی ئێرانو هاندان و گفتوگۆی خاوەن بیروبۆچونەکانو ڕۆشنبیران بەتایبەت بابەتەکەی گۆڤاری (دراسات)کەبەڕاستی تەرجەمەکەی بەندە شیاوی ئەم هەمووە پیاهەڵدانە نیەو، هیچ کات بانگەشەی ئەوەناکەم کەسەرەڕای ئەوهەمو ووردەکاریە بێ هەڵەو پەڵەبم، چونکە وەها سیفەتێك لەمرۆڤێکدا کەبەردەوام لەئامادە باشیدایە بۆ هەڵە زۆر ئەستەمە، هەربۆیە لەخاوەن قەڵەمان و گەورەیی وئەدەب داواکارم وچاوەڕێشیان لێدەکەم کە هەرهەڵەیەکیان بینی بەوپەڕی ئازادیو ڕاشکاوی ودڵسۆزی و دۆستایەتیەوە ڕەخنەکانیان بۆمان بنوسن بۆئەوەی ئەگەر خوداویستی لەچاپەکانی دواتردا ڕەچاویان بکە ین و هەڵەکان ڕاست بکەینەوە.

لەکۆتایدا ڕێزو پێزانینم بۆ هەموو دۆستان و برادەران و هاوڕێیان هەیە بۆ هەموو ئەو یارمەتیو ڕێنماییانەی کەپێشکەشیان کردووەو، لەسود گەیاندن بەبەندە دریغیان

نەکردووە، هەروەك بەڕێزان دکتۆر عەباسی زەریاب و محمدتقی دانش پژوه و دکتۆر هەشت ڕودی و بەتایبەت لە بەڕێز جەنابی محمد فرزان سوپاس دەکەم.

محمد پروین گنابادی

فروردینی ۱۳٤٥ ی هەتاوی

# موقەدیمەی ئیبن خەلدون

**کەهەریەکە لە پێشەکی و یەکەمین کتێب لە :**

**کتاب العبر وديوان المبتداء والخبر**
**فى ايام العرب والعجم والبربر ومن**
**عاصرهم من ذوى ا لسلطا ن الاكبر**

# بەناوی خودای گەورەو میهرەبان[65]

بەندە نیازمەند بەبەخشندەیی پەروەردگارو، پشت بەستو بەمیهری ئەو، عبدالرحمانی کوڕی محمدی کوڕی خەلدونی حەزرەمی، کەخودای مەزن هاوکاری بێت، دەڵێت: سوپاسو ستایش شایەنی خودایەکە کەسەربەرزی و دەسەلآت تایبەتی ئەوە و موڵك و مەلەکوت[66] لە دەستی ئەودایەو، خاوەن سیفەت وناوی چاکەیە[67]. دانایەك ئەوەی کەبەنهێنی دەگوترێتو لەتاریکی دایە لەوپەنهان نیە.[68] بە توانایەك کەهیچ شتێك لەئاسمان و زەویدا بێزاری ناکات و لەوشاراوەنیە.[69] ئیمەی لەخاك و لەسەرشێوەی مرۆڤ دروستکردو، زەوی بەوەچەیەك لەدوای یەکەکانی مرۆڤ ئاوەدان کردەوەو[70]. ڕۆزی ئێمەی لەو فەراهەکردو، هەموانی لەدەوری خزم و دۆستاندا کۆکردەوە و ڕۆزی و خۆراکمانی

---

[65] اللهم صلی علی سیدنا محمد وعلی ال سیدن محمد (یقنی)

[66] ئاماژەیە بەئایەتی ۹۰ ی س ئەلمونمینون (قُل مَنْ بِیَدِهِ مَلَکُوتُ کُلِّ شَیء ) و ئا ۷۲ ی س یاسین .

[67] (وَلِله الأسماءُ الحُسنی) س الاعراف ئا ۱۷۹ .

[68] ئاماژەیە بەئایەت گەلێکی زۆری وەك: (عالِمِ الغَیبِ لایَعزُبُ عَنهُ ...)الخ س السبا ئا ۳ و کە لەچاپی پ و ب دا لەبریدا (فلایغرب)یان هێناوە، وەئاماژەیشە بە (وَماکَانَ اللهُ لِیُعجِزَهُ مِن شَیءٍ فِی السَّموات وَلافِی الأرض) س فاطر ئا ٤٤ زۆرێك لەئایەتە کانی ترلەسورەتە کانی تردا .

[69] ئاماژەیە بەئایەت گەلێکی زۆری وەك: عالِمِ الغَیبِ لایَعزُبُ عَنهُ ...الخ س السبا ئا ۳ و کەلەچاپی پ و ب دا لەبریدا (فلایغرب)یان هێناوە ، وەئاماژەیشە بە وماکان اللقلیعجزة من شیْ فی السموات ولافی الارض س فاطر ئا ۳٤ زۆرێك لەئایەتە کانی ترلەسورەتە کانی تردا .

[70] ئاماژە بە ئا ٦٤ س الهود: (هُوَالَّذی أنشَأکُم مِنَ الأرضِ وَاستَعمَرَکُم فِیها) .

فەراهەم فەرموو، تێپەڕبوونی ڕۆژو ڕۆژگارەکانی کردەهۆکار بۆلەناوچونی ئێمەو چارەنوسمانی دایەدەست مەرگ. هەرئەوە پایەدارەو زیندووە و هەرگیز نامرێت[٧١]. درودو سلاو بۆگەورەو سەروەرمان محمدی پێغەمبەری نەخوێندەواری عەرەبی، ئەوەی کەسیفەتەکانی لەتەورات و ئینجیلدا نوسراوە[٧٢]، وەئەوەی کە بەرلە سوڕانەوەی سال و مانگ و جیایی نێوان کەیوان وماسی[٧٣]، کەسی لێ نەبووەو [٧٤]ڕاستیەتی بانگەوازەکەی کۆترو جالجالۆکە شاهێدی بۆدەدەن [٧٥]وسلاو درود بۆسەر خانەدان و یارانی، ئەوانەی کەلەدۆستی و پەیڕەوی کردنیدا بلند ئاوازن و لەهاوکاری کردنیدا یەك بەسەرهاتن و یەك دەستن بەرامبەر بەدوژمنەکانی.

وە ئائەوکاتەی بەخت یاری ئیسلامە و پەتی بێ باوەڕی پزیوە درودو سلاوی بێ پایانی خودا لەسەر پێغەمبەرو یارانی بێت. لەپاشان، مێژوو بریتیە لە هونەری باوی نێوان هەموو گەل و نەتەوەکانو، گەشت و سەفەری بۆ دەکەنو، هەم خەلکی نەخویندەوارو بێ ناونیشان حەزیان لێیەتیو، هەم پاشاو گەورەکانیش ئارەزومەندن بۆزانینی و لەتێگەشتنیدا زاناو نەزان یەکسانن، لەڕوالەتدا لەکۆمەلێك هەوال زیاتر نیە لەبارەی ڕۆژگارو دەولەتانی پێشینو سەرگوزەشتەی سەدە کۆنەکان، کەووتەکانیان پێ دەڕازێنرێتەوەو نمونەیان پێ دەهێننەوە و کۆڕو کۆبونەوە قەرەبالغەکانی پێ گەرم

---

[٧١] ئاماژە بە ئا: (وَتَوَكَّلْ عَلَى الحَيِّ الَّذي لايَمُوت) س الفرقان ئا٦٠. ئاماژە بە ئا ١٥٦.

[٧٢] ئاماژە بە ئا: (وَتَوَكَّلْ عَلَى الحَيِّ الَّذي لايَمُوت) س الفرقان ئا٦٠ ئاماژە بە ئا ١٥٦.

[٧٣] ماسی تەرجەمەی (یهموتە)یان (حوتە)کەبەلوتیا ش ناوی دەبەن مەبەست ئەو ماسیەیە کە زەوی حەوتەمی بەبیروباوەڕی پێشینان هەلگرتووە دیارە لەنێوان زوحەل (کەیوان)لە ئاسمانی حەوتەم و یەهموت لە زەوی حەوتەمدا ماوەیەکی زۆرە (لەپەراوێزی نەسری هۆرێنی).

[٧٤] ئاماژەیە بە فەرمودە گەلێکی وەك: (کنت نبیا وادم بین الما والطین) یان ،(اول ماخلق الله نوری و) لەم شێوەیە (ینی).

[٧٥] ئاماژە بە (ئا)(إلّاتَنصُرُوهُ فَقَد نَصَرَهُ الله) س توبة ئا ٤٠ و چیرۆکی ڕۆیشتنی حەزرەتی پێغەمبەر بۆ ئەشکەوتی سەورو مانەوەیان بۆ ماوەی سێ شەوڕۆژ و هاتنی کافران بۆ بەردەم ئەشکەوتەکەو هێلکەی کۆترو چنراوی جالجالۆکە ....هتد. (حبیب السیر بەشی سی یەم بەرگی یەکو کتێبەکانی تری ژیاننامەی پێغەمبەر.

دەکەن. ئێمە ئاشنادەکات بەژیانی دروستکراوەکان کەبەچ شێوەیەك ژیانیان دەگۆڕێت‌و دەوڵەتانێك دێن‌و هەلی فراوانخوازیان بۆ هەڵدەکەوێت‌و دەست دەکەن بەئاوەدان کردنەوەی زەوی و، تائەو کاتەی کەبانگەوازی لەناو چونیان بۆ دەکرێت، بەڵام لەناخدا بریتیەلە بیرو ئەندێشەو لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕووداو بنەماکان‌و گەڕانی وردە بۆ دۆزینەوەی هۆکارەکان و، زانستێکە لەبارەی چۆنیەتی ڕووداو هۆکارە ڕاستەقینەکان دەدوێت، هەربۆیە مێژوو لە داناییەوە سەرچاوە دەگرێت و شیاوی ئەوەیە کەلە زانستەکانی ئەو بژمێردرێت.

وەمێژوو نوسانی گەورەی ئیسلام بەشێوەیەکی گشتگیر مێژووی ڕۆژگارەکانی ڕابوردویان کۆکردووەتەوەو لەلاپەڕەکانی مێژوودا تۆماریان کردووە، بەڵام گەندەڵکاران بەشێوەیەکی تر ڕەنگ ڕێژیان کردون پڕیان کردووە لەشتی ناڕەواو بەشێوەیەکی بێسەروبەرو بەبێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکانیان‌و هۆکارەکانیان بزانن ڕوداوەکانیان بەکەم و کورتی و زیادەڕەوییەوە گێڕاوەتەوە. بەبێ ئەوەی بەشوێن باشدا بگەڕێن و ناباش فڕێدەن. هەربۆیە شێوازی لێکۆڵینەوەی کەم و تێڕوانینی پاڵفتەکردنی زۆر لەسەر خۆ وایان لێهاتووە هێندە هەڵەیان تێکەڵ بەمێژوو کردووە هەروەك بڵێی خزم‌و دۆستی مێژوون. چاولێکەری و شوێنکەوتەیی زۆر باوەو ڕەگ و ڕیشەی لەناو مرۆڤایەتیدا داکوتاوە و نەزانی بەشێوەیەکی ترسناك لەناو خەڵکیدا بڵاوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەبەرامبەر دەسەڵاتی هەقەوە ناتوانێت خۆی ڕابگرێت و بەسیرەت وەك نەیزەکێك [٧٦] وایە کەئەهریمەنی بەتاڵ ڕادەماڵێت.

هەرچەندە گێڕەرەوەی هەواڵ تەنها گێڕانەوەکە بەبەس دەزانێت، بەڵام هەرکات سەیری بکرێت دیدەی بەسیرەت دەتوانێت ڕەخنە لەهەواڵەکان بگرێت‌و ڕاست هەڵبژێرێت و بەهێزی زانست دەتوانرێت لاپەڕەکانی ڕاستیەتی ڕووناك بکاتەوە. دیارە کەخەڵکی

---

[٧٦] شتێکە وەك ئەستێرە وتیشکی یاری ئاگرینە و لەئاسماندا دەبینرێت و بەڕەجمی شەیتانەکان ناسراوە (غیاث)

هەواڵەکانیان کۆکردووەتەوە و بەرهەمێکی زۆریان بەیادگار بەجێهێشتووە و مێژووی گەلان و دەوڵەتانیان لەسەرانسەری جیهاندا کۆ کردووەتەوە، بەڵام ئەوان بەهۆی گەورەیی‌و پێشەوایەتیەوە ناوبانگیان دەرکردووەو شوێن کتێبی پێشینان کەوتون و لەبەرهەمەکانی خۆیاندا هێناویانە. ئەمانەش وەك دەڵێن لەنیشانەکانی زەمەو فەتحەو کەسرە تێپەڕناکەن وەك: ئیبن ئیسحاق و تەبەری و محمدی کوڕی عومەرو واقیدی و سەیفی کوڕی عومەرو ئەسەدی و مەسعودی و هەمو ئەوناودارانەی کەلەنێو ناوداراندا دیارن. وە هەرچەندە بەوشێوەیەی کە لەلای متمانە پێکراوەکان‌و حافیزانی خاوەن ئیعتیباری فەرمودە بەناوبانگە لەکتێبی مەسعودی و واقیدیدا بابەتەکانی ڕەخنەو گەڕان بەدوای کەم و کورتیدا هەیە، بەڵام لەگەڵ هەمو ئەمانەشدا زۆربەی مێژوو نوسان هەواڵەکانی ئەوانیان قبوڵەو بەرهەمەکانی ئەوانیان لەدانانەکانیاندا پەیڕەوی کردووە. ڕەخنەگر دەتوانێت بەپێوەری هۆشی خۆی باشی و خراپی ئەو گێڕانەوانە هەڵبسەنگێنێت، چونکە شارستانیەت و ئاوەدانی (عمران)[٧٧] خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی کەدەتوانین هەواڵەکانیان بۆ بگێڕینەوە.

سەرەڕای ئەمەش زۆربەی ئەو مێژووانەی کەلەم مێژوو نوسانە بەجێ ماون بەپێی ئەم شێوازە ڕێکخراوەو بابەتەکەیان مێژووی گشتی گەلانەو، پێویستە ئەم بارودۆخە بدەینەپاڵ ئەو مەملەکەت و پایتەختە زۆرانەی کەلەلایەن هەردوو دەوڵەتی گەورەی

---

[٧٧] ئیبن خەلدون ووشەی (عمران)ی لەزۆربەی بەش و بابەتەکانی ئەم کتێبەدا بەناوی زانستێکی سەربەخۆوە ناوزەدی کردوە (زانستی عمران ،ئاوەدانی)و خۆی بەداهێنەرو دامەزرێنەری ئەم زانستە داوەتە قەڵەم .ئەم ووشەیە لە دەستەواژەی ئەودا هاومانایەلەگەڵ (شارستانیەت)و (کۆمەڵگە بەمانا گشتیەکەی. ئێمەش بێجگە لەهەندێك شوێندا کەبەمانای ئاوەدانی بەکارمان هێناوە ووشەی کۆمەڵگە یان شارستانیەمان هەڵبژاردووە. (فلسفه ابن خلدون الاجتماعیه)دانراوی دکتۆر تەهاحوسەین و (دراسات عن مقدمه ابن خلدون)دانرا وی ساتیع الحصری)

سەرەتای ئیسلام[78]دا فراوان بوبون. ئەم زنجیرانە داگیرکاریو کۆنترۆڵکردنیان گەیاندبویە ئەوپەڕی. هەندێکیشیان بەشێوەیەکی کۆو تەواو لەبارەی ئیسلام و گەلانی پێش لەئیسلامەوە قسەیان کردووە، وەك مەسعودیو ئەوکەسانەش کەپەیڕەویان لەم کردووە. بەشێکی تریش لەدوای ئەمانەوە لەشێوازی گشتی لایان داوەو سەرقاڵی لایەنە تایبەتەکان بوون، ئامانجە دوورودرێژەکانیان وازلێهێناوە و ئەوشتە تایبەت و نایابانەی کەلەدەستی داهاتوان بەدەر بووە ئاسانیان کردووە، هەواڵی ناوچەو شاری خۆیان بەتەواوی بەدەستهێناوە و تەنها بەمێژووی وڵات وشارەکەی خۆیانەوە سەرقاڵ بوون. هەروەك چۆن ئیبن حەییان [79]نوسەری مێژووی ئەندەلوس و دەوڵەتی ئەمەوی و ئیبن الرقیق مێژوو نوسی ئەفریقا[80]و ئەودەوڵەتەی کەلەقەیرەوان بووە، ئەم شێوازەیان هەڵبژاردووە.

ئەوکات لەپاش ئەم دوو گروپەی کەباسمان کردن کەسانێك دروست بون کەلەمشتێك چاولێکەرو گەمژە زیاتر نەبونو، کەبەهەمان شێوە چاولێکەریان لەگروپی یەکەم کردووەو بەسەرقافڵەی خۆیانیان زانیون و بەگشتی لەو گۆڕانکایانەی کەڕۆژگار بەدی هێناون و ئەگۆڕانکاریانەی کەبەهۆی داب و نەریت و ڕێوڕەسمی گەلانەوە ڕوویانداوە بێ ئاگابون. هەربۆیە مێژووی گەلانیان بەجۆرێك نوسیوەتەوە کەهەروەك بڵێی شێواز گەلێکن لەمادەو [81]شمشێری بێ کێلان و زانیاری گەلێکن کەتازەو کۆنەیان نادیارەو بەڵکو

---

[78] مەبەست هەردودەوڵەتی بەنی ئومەیەو بەنی عەباسە، چونکە ئەوکات ئەو دودەوڵەتە لای موسوڵمانان وەك دو دەوڵەتی جیهانی بون و کاتێك مێژووەکەیانیان نوسیوەتەوە بەلایانەوە وەك نوسینەوەی مێژووی جیهان وابووە. ئیبن ئەبی حەیان ئەبو حەیان لەچاپەجیاوازەکاندا هەڵەیە. لەیەنی جامیعیشدا ئیبن حەیانە .

[79]-80 وشەی ئەفریقا لەبەکارهێنانی مێژوو نوسانی ئیسلامیدا بەمۆریتانیای خۆرهەلآت گوتراوە کەتاوەکو ئیستەش بەشارو ناوچەکانی تونس و تەرابلس و قوستەنتین دەگوترێت، بەلآم ئەلجەزیرەو مەراکیشی پێك هێناوە (پەراوێزی دسلان).

[81] صورەت و مادە لەدەستەواژەکانی حیکمەتی کۆنەلەکتێبەکانی (کشاف اصطلاحات الفنون)و (تعریفات جرجانی)و(غیاث اللغات). دا هاتووە .

تەنها ڕووداوگەلێکن کەبنەڕەتەکەیان نادیارەو بەجۆرێك دەنوێنن کە ڕەگەزو بەشەکەیان[٨٢] نادیاربێت. ئەم گروپە مێژوو لەوکەسانەی کەبەپێشینانی خۆیانیان دەزانن دەق بەدەق دەگێڕنەوە و ڕووداوەمێژووییەکان دوبارەدەکەنەوەو بێئاگان لەمێژووی نەوەکانی سەردەمی خۆیان، چونکەڕاڤەی ئەوان بۆ ئەمان دژوارەو لەئەنجامدا دەبینین لەم جۆرە مەسەلانە بێدەنگ دەبن. بۆنمونە: ئەگەرلەبارەی دەوڵەتێکەوە بکەونە گفتوگۆوە هەواڵەکانی پەیوەست بەودەوڵەتە بەوجۆرەی کەبیستویانە وەك خۆی دەگێڕنەوە ئیتر ڕاست بێت یان درۆ، بەهیچ شێوەیەك باس لە هۆکارەکانی دروست بونی ئەو ڕووداوە ناکەن و هۆکاری گەشتنی ئەودەوڵەتە بەتاج وتەخت و هۆکاری وەستان و مانەوەی لەقۆناغی کۆتاییدا لە بیر دەکەن، هەربۆیە دەبینین خوێنەر هەمیشە پرسیار لەبارەی پێشەکی و بنەمای پێکهاتنی دەوڵەتان و، قۆناغەکانیان دەکات و بەدوای هۆکاری یەك بەدوای یەك داهاتن[٨٣]و، زۆربونی جەماوەرەکانیان دەگەڕێت و بەڵگەی باوەڕپێکراوی دەوێت سەبارەت بەسازش کاری و جیاوازیەکانیان، هەربەو جۆرەی کەئێمەلەپێشەکی ئەم کتێبەدا هەموو ئەم مەسەلانە وەیاد دەهێنینەوە.

لەوەبە دواوە گروپێکی تر لەمێژوونوسان دەرکەوتن کەبەکورتی ڕێگەی زیادەڕەویان بڕی و تەنها ناوی پاشاکانیان نوسیوە و هیچ باسێکیان لەڕەگەزی ئەوان نەکردووە، پیتەکانی تەپوتۆزیان (غبار)[٨٤] لەبری ژمارەکانی ڕۆژگاری دەسەڵاتی ئەوان بەکارهێناوە، وەك شێوازە کەی ئیبن ڕەشیق لەمیزانولعەمەل‌و بێ مایەکانی تریش کەپەیڕەویان لەو

---

[٨٢] جۆرو ڕەگەزو بەشیش لەدەستەواژەکانی مەنتیقە لەکتێبەناوبراوەکاندا هاتووە .

[٨٣] تەرجەمەی (هۆکارەکان و یەك بەدوای یەکداهاتنە)کانەکەبەبڕوای ساتیعولحەسری مەبەستی ئیبن خەلدون یاساکانی یەك بەدوای یەکداهاتنی هاوکاتیە ( lois de succession et de coexistence)یەکەلەڕووداوەکاندا دەردەکەوێت .لەکتێبەکانی (دراسات عن ابن خلدون)لاپەرە ٥٦٥ و پێشەکی وەرگێڕلەم کتێبەدا ، لاپەڕەی ٣٢ .

[٨٤] (غبار)بەزەمەی غەینەکە ناونیشانەی ژمارەکانە. دانەر (اقرب الموارد)بەکاردەهێنێت مەبەستی زیادەڕەویەلەکورتکردنەوەدا

کردووە. ئەم گروپە نەگوتارێکی گرنگیان هەیەو نەبابەتێکیان بەئەنجام گەیاندووە کەشیاوی تێبینی بێت، چونکە بابەتەبەسودەکانیان لەدەست داوە و شێوازی بەناوبانگو نەریت و ڕێو ڕەسمی مێژوو نوسانیان خستووەتەلاوە. لەبەرئەوەی کەکتێبی ئەم گروپەم خوێندەوەو حەقیقەتی ڕابوردوو ئێستەیانم زانی، دیدەی نوستوم لەخەوی غەفلەت بێدارکردەوەو لەبەرئەوەی کەهیچ زانیاریەکم نەبو، دەستم کردە نوسینێکی مندالأنەو کتێبێکم لەبارەی مێژووەوە نوسی و پەردەم لەسەر مێژووی وەچەیەك لەدوای یەکەکان هەلّدایەوەو لەڕوی هەواڵ و تیۆرەکانەوە دابەشم کرد بەچەند بەش و بابەتێکەوەو، هۆکارو سەبەبی پێکهاتنی دەوڵەتو شارستانیەتەکانم ئاشکرا کردو دەستم کردەباسی ئەوگەلانەی کەلەسەدەکانی کۆتاییدا وولاّتی مەغریبیان[85] ئاوەدان کردەوەو لەسەرتاسەری شارو ناوچەکانیدا جێگیر بون. وە باسی هەموو دەوڵەتەکانم کردووە ئیتر گەورەو بەردەوام بوبن یان بچوك و کەم تەمەن. وەباسی ژیاننامەی پاشاکانیشیانم کەبەرلەئەوان ژیاون بەجوانی کردووە. ئەوگەلانەش بریتین لەعەرەب و بەربەر، چونکە ئەمانە دووڕەگەزن کەلە دێر زەمانەوە لەمەغریبدا ژیاون، هەروەك بڵێی بیجگەلەوان هیچ گەلێکی تر لەو ناوچەیەدا نەژیا بێت، خەڵکیش بێجگە لەوان هیچ نەتەوەیەکی تریناناسن، مەبەستەکانی مێژووەکەی خۆمم بەتەواوی وپاکییەوە کامڵکردوو وام لێکرد کەخەڵکانی تایبەت و گشتیش لێی تێبگەن و لەڕێکخستن و دابەش کردنیدا

ڕێگەیەکی سەرسوڕهێنەرم گرتەبەرو لەنێوان مەبەستە جۆربەجۆرەکاندا شێوازێکی داهێنانکارانەم داهێناو چونیەتی کۆمەڵگەو شارستانیەتو عەواریزە خودیەکانیان کەلە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا ڕودەدات ڕاڤەکردووە. هەروەك چۆن خوێنەر شارەزاو

---

[85] لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا جیهانی عەرەب دەبو بەدوبەشەوە (مشرق و مغرب) ئەووولاّتانەی کەدەکەوتنەنێوان میسرو ئۆقیانوسەوەپێیان دەگوتن مەغریب و، ئەوانەشی کەدەکەوتنەوە میسرو مەملەکەتەعەرەبیەکانی ترەوە بەمەشریق بەناوبانگ بوون. دانیشتوانی مەغریبیان بەمەغاریبەو دانیشتوانی مەشریقیشیان بەمەشاریقە ناوزەد کردووە.

ئاشنادەکات بەهۆکارەکان، بەهەمان شێوە ئاگاداری دەکاتەوە کەبەچ شێوەیەك دامەزرێنەران و خاوەنی دەوڵەتان بۆدامەزراندنی دەوڵەتەکانیان لەودەرگایانەی کەپێویست بووە چونەتە ژورەوە، بەم شێوەیە خوێنەر واز لەچاولێکەری دەهێنێت و ئاگاداری هەواڵی نەوەکانی ئێستەو ڕابوردوش دەبێتەوە. ئەم دانراوەم دابەش کردووە بۆ یەك پێشەکی و سێ کتێب:

پێشەکی: لەباسی گەورەیی زانست و لێکۆڵینەوە لەشێوازەکانی و ئاماژەبەهەڵەی مێژوو نوسان[٨٦].

کتێبی یەکەم: لەبارەی کۆمەڵگە و شارستانیەت و باسکردنی عەواریزە خودیەکانی، وەك: دەوڵەتمەداری و پاشایەتی و بەدەستهێنانی بژێوی ژیان و هونەرو زانستەکان و باسکردنی هۆکاری هەریەکەیان.

کتێبی دووەم: لەبارەی مێژووی عەرەبو هۆزو دەوڵەتەکانی هەرلەسەرەتای بونەوەرەوە تاوەکو ئەمڕۆ. وە ئاماژەشی تێدایە بەهەندێك گەل و نەتەوەودەوڵەتی بەناوبانگی وەك: نەبەتی و سریان و ئێرانیەکان و بەنی ئیسرائیل و قیبتی و یۆنانی و ڕۆمی و تورك و فەرەنگەکان[٨٧].

کتێبی سێیەم: لەبارەی مێژووی بەربەر و مەوالیە[٨٨] کانیان وەك زناتە[٨٩] و باسکردنی سەرەتای ژیانی هۆزو ئەو وولآتانەی کەبەتایبەت لەنزیك دیاری مەغریبدا دروستیان

---

[٨٦] مێژووی عەرەبستان لەسەردەم دەرکەوتنی ئیسلام و بەرلەویش ووتاری حەوتەمی بەڕێز تەقی زادە لەکۆلیجدا .

[٨٧] فەرەنگەکان (الافرنجە)لە (یەنی)دانیە .

[٨٨] مەوالی کۆی مەولایەو، لەلای عەرەب ماوەی مامناوەندی نێوا بەندەو کەسی ئازادە و وەك ئەومانایە وایە کەلەدەوڵەتی ڕۆمدا بەبەندەئازاد کراوەکان دەگوترێت. هەربەندەیەك کەگەورەکەی ئازادی دەکرد پێیان دەگوت مەولا و دەچویەوە ناو هۆزو تیرەی خۆی وەهەندێك جار دەیاندایە پاڵ ئەو شارەی کە تێیدا ئازاد دەبوو، وەك مەولای مەدینە یان مەولای مەککە، بەڵام خزمایەتی مەولا ڕاشکاوانە نیە و بەدۆست ونزیك و کورەمام و دراوسێ و میوان و هاوپەیمانیش دەگوترێت. ئەبولبەقا دەڵێت مەولابەعەجەم گوتراوە، چونکە زۆربەی وولآتەکانیان بەزۆر داگیر دەکران و خەڵکی ئەو شارانە حەقیقەتەن یان حوکمەن ئازاد دەکران (کلیات).

کردوون. ئەوەبوو توانیم بەرەو خۆرهەڵات بچم و لەخەرمانی مەعریفەی ئەو سەرزەمینە سودێك وەرگرم و شوێنە پیرۆزەکانی (مککەومەدینە)ببینم و فەرزو سوننەتەکانی تێدا ئەنجام بدەم و لەسەرکتێبو بەرهەمەکان سەبارەت بەمێژووی ئەو ناوچەیە هەڵوەستەبکەمو، لەم وولاتەدا کەم و کورتی نوسینەکەم لەبارەی پاشاکانی بێجگەلە عەرەبو ئەودەستکەوتانەی کەدەوڵەتانی تورك بەدەستیان هێناون پڕ بکەمەوەو زانیاری زیاتربەدەست بهێنم. وەهەروەها سودم لەشێوازێکی کورت وەرگرتووە لەباسکردنی هاوچەرخەکانی عەرەبو بەر بەر وەك: گەلە موسوڵمان و شارو ناوچەو پاشاو ئەمیرەکانیانو، لەبری شێوازی ئاڵۆز شێوازێکی ئاسانم پەیڕەو کردووە، وە بۆ باسکردنی مێژوو ڕووداوە تایبەتەکان و نەوەگشتیەکانم وەك دەروازەیەك باس کردووە[90]. هەربۆیە لەم ڕووەوە مێژووی پەیوەست بەجۆری مرۆڤ بەشێوەیەکی کۆو تەواو فەراهەم بوو زۆرێك لەحیکمەتە ئاڵۆزەکان ئاسان بون و، ڕاڤەی ڕووداو دەوڵەتەکان بەباسکردنی هۆکارەکانیان ڕاڤە کران و ئەم دانانەش بەجۆرێك فەراهەم بوو بویە گەنجینەیەك لەحیکمەت و کۆگایەك لەمێژوو.

لەبەرئەوەی ئەم کتێبە باس لە مێژووی عەرەب و بەربەر دەکات ئیتر شارستانی بن یان دەشتەکی، لەهەمان کاتدا بارودۆخی دەوڵەتە گەورەکانی هاچەرخی ئەوانیشی تێداڕوون کراوەتەوەو، لەسەرەتاو کۆتایی هەرهەواڵێکدا باسی پەندو ئامۆژگاریەکان کراوە. هوربۆیە ناوم ناوە:

(کتاب العبرو[91]دیوان المبتداء والخبر فی ایام العرب والعجم والبربر ومن عاصرهم من ذوی السلطان الاکبر).

---

[89] شارێکە لەئەفریقا – ناوچەیەکە لەساراگۆستی ئیسپانیا (فەهرەستی نخبەت ئەلدەهر). لێرەدا مەبەست هۆز گەلێکە لە بەربەر .

[90] لە(ینی جامیع)دا اسباب و لەپەرتوکەکانی تردا انساب.

[91] کتاب عنوان ئەلعیبەر (ینی).

لەبارەی سەرەتای ڕەگەزو دەوڵەت و هاوکاتی گەلان و هۆکارەکانی گۆڕانیان و لەناوچونی نەتەوەکان لەسەدەکانی ڕابوردوداو، ئەوەی کەلەکۆمەڵگەدا بەدی دێت وەك: دەوڵەتو میلەت و شارو شوێنی کۆبونەوەی چادرنشینەکان و ڕێزو گەورەیی و زۆری و کەمی کۆمەڵەکانو زانست و کەسابەتو بەدەستهێنانی سەروەتو سامان و لەدەستدانیو چۆنیەتی لەناوچونی ئەوانەی کەباسکران و ئەوەی کەڕوویداوەو ئەوەش کەلەوانەیە ڕوبدات، هیچم لێ لانەبردووە، بەڵکو بەگشتی و تەواوی هەموویم باس کردووە و بەڵگەو هۆکارەکانیانم ئاشکرا کردووە. لەم ڕووەوە ئەم کتێبە دانانێکی بێ وێنەو هاوتایە، چ لەزانستە غەریبەکان[٩٢] و حیکمەتەشاراوەکانو ئەو ڕاستیانەی کەپەردەی بێئاگاییان بەسەردا دراوەو وون بون لەبەرچاوان وەك: (ستەمکاری کەسەرچاوەی ڕووداوەکانی دواترە)گونجاندومە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەنێو خەڵکی سەردەمی خۆمدا بێ کەم و کورتی نیم و، لەوەها گۆڕەپانێکی فراواندا دان بەناتەواوی خۆمدا دەنێمو حەزدەکەم زانایان و داناکان بەدیدێکی ڕەخنەگرانەی بنیاتنەرەوە سەیری بکەنو زۆرلێی ڕازی نەبن بۆئەوەی بەرەو باشتر بڕوات و، ئەوەی کەشیاوی چاککردنە چاکی بکەن و ئەوەشی شیاونیەهەوڵی چاککردنی بدەن، چونکەبیزاعەتەکەی (توێشوەکەی من لەنێو خاوەن زانستەکاندا موزجاتە (کەمە)و دان نان بەکەم و کرتیەکاندا ڕزگارم دەکاتو لەدۆستان هیوای چاکەهەیە.

وەلەخودای گەورە داواکارم کەکارەکانمان لەدەریای بەڕێزی خۆیدابەپاك وەربگرێتو تەنها ئەوم بەسەو باشترین بریکارە[٩٣]. وەدوای ئەوە هەوڵەکانم لەتەواوکردنی ئەم کتێبەدا بەکۆتاگەیاند و وەك مۆمێکی ڕووناك خستمەسەر ڕێگەی بینەران و لەنێوان زانستەکاندا شێوازی ئەوم ئاشکرا کردو بازنەکەیم لەنێو زانستەکاندا فراوان کردو بەچواردەوریدا

---

[٩٢] مەبەست کیمیاو بەشەکانیەتی .

[٩٣] (وهوحسبی الله ونعم الوکیل). ئاماژەیەبە (حسبنا الله ونعم الوکیل). س ئالی عیمران ئا ١٦٧ .

دیوارم کرد (واتە لەزانستەکانی تر جیام کردەوە)[٩٤] و بناغەکەیم داناو، ئەم نوسخەی کتێبەم بۆ کتێبخانە گەورەو پێشەواو موجاهید و سەرکەوتوو دامەزرێنەری تاج و تەخت[٩٥] کردە دیاری[٩٦]. ئەمیری باوەڕداران ئەبوفارس عبدالعزیز کوڕی گەورەی بەناوبانگی شەهید ئەبوسالم ئیبراهیم کوڕی گەورەمان سوڵتانی پیرۆز ئەمیری باوەڕداران ئەبوئەلحەسەن کوڕی گەورەکانی نامور لەپاشاکانی بەنی مەرین، ئەوانەی کەپایەی ئاینیان بەهێز کردوو ڕێگەی ڕێنمایی کراوەکانیان ئاسان کردو شوێنەواری ستەمکارو خراپەکارانیان نەهێشت. سێبەری ئەو بەسەر گەلەوە بەردەوام بێت و هێواکانی لەڕێگەی بانگەوازی ئیسلامدا سەرکەوتو بن.

کتێبەکەم ناردبۆ کتێبخانەکەی کەوەقفی زانستخوازانە، کتێبخانەی ناوبراویش کەوتووەتەجامیع القروییني[٩٧] شاری فاسەوە، کەناوەندی پاشایەتی و سەڵتەنەتی ئەوان بووە، ئەوێ کەئارامگەی ڕاستی و باخو بێستانە سەوزەکانی مەعریفەو فەزای نهێنیە

---

[٩٤] ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کەئیبن خەلدون مێژووی بەزانستێکی سەربەخۆ زانیوە. لەدێڕی دواییەوە تاوەکو لاپەڕەی ١١ بابەتەکانی مەتن و حاشیە هیچکامیان لەدەق و حاشیە کەدا بونیان نیە .

[٩٥] لەتەرجەمەی لەقەبە دوورودرێژەکان کەنزیکەی ١٠ دێڕی تایبەت کردوە بەستایشی ئەبوفارسەوە و منیش تەنهاباسی بەدیاری ناردنی کتێبەکەم کردوە (م).

[٩٦] بێجگەلەچاپی پاریس کەنزیکەی یەك لاپەڕەو نیو لەبابەتی دیاریەکە تاوەکو پێشەکی تێیدا لابراوە لەچاپەکانی تردا بەم شێوەیە: لەنوسخەیەکدا بەدەست خەتی هەندێك لەگەورەکانی مەغریب (لەپێش هەموویانەوە نوسخەیەکم کردەدیاری)و لەپاش ڕستەی (لەبنەڕەتدا بناغەکەیم دامەزراند)زیادەگەلێکی لەم شێوەیە (ئەوم بەشیاو زانی کەلە هونەرەکانیدا بە دیدەیەکی ووردو تیژەوە سەیری بکات و پێوەری ڕاست و بنەماکانی بەتێگەشتنی شەریفیەوە هەڵبسەنگێنێت و پلەو پایەی لەنێو زانستەکانی تردا دوبارە بناسێنێتەوە، دواتر بەشەونخونی و بێخەوی لەشەوە درێژەکانی زستان و چونەخزمەت زانایان و مامۆستایانی گەورە و خەلیفە بەخشندە کان و بڕینی چەندین هەورازو نشێو لەوڕێگەیەدا ئەوەبو دواتر بەرهەمەکەم گەیشتە کەماڵ و ......هتد .

[٩٧] - جامیع ئەلقەرەوییین مزگەوتێکی زۆرکۆن و گرنگەو کەوتوەتەشاری فاسەوەو بەجوانترین هونەری شێوەکاری بیناسازی ڕازێنراوەتەوە و چەندین مەدرەسەو کتێبخانەی جۆراوجۆری تێدابووە، لەم کتێبخانانەدا کتێبی بەنرخ و ئامێری چاودێری زەوی و ئەستێرەکان بونیان هەبوە. (قاموس الاعلامی تورکی).

خواییەکان لەئەوپەڕی فراوانیدایە. وەئینشائەلله پلەی ئیمامەت و فاریسیەتی[98] بەڕێز بە دیدەی شەریف و گەورەیی بێ نیاز لەپیاهەڵدانی خۆی، سەیری دەکات و دەیخاتەبەرگرنگی پێدانی خۆیەوە و قبوڵی دەکات و، ئەم وەرگرتنەی ئەویش بەڵگەیە لەسەرقوڵی کتێبەکەی من، چونکە سەرمایەی نوسەران لەبازاڕی مەعریفەی ئەودا ڕەواجیان هەیە و، کاروانی زانست و ئادابەکان لە بەردەم بارەگای ئەودا لەنگەردەگرن و بەیارمەتی بەسیرەتی ڕۆشنی ئەو دەرئەنجامی گەورەو چاك دێنەئاراوە. وە هیوادارم خودای گەورە وامان لێبکات کەسوپاسگوزاری بەخششەکانی بین و لێیان بەهرەمەندبین و هاوکارمان بێت بۆجێبەجێ کردنی ئەومافانەی کەوامان لێدەکەن خزمەتگوزاری ئەوبین و، لەنزیکانی ئەو بێینە هەژمارو، لەوانەبین کە بەڕێزن لای بارەگای ئەو. لەیەزدانی مەزن داواکارم شوێنکەوتوانیو ئەوانەی کەلەحەرەمی حوکومەتی ئەودان بپارێزێت و، لەخواداواکارم کردەوەکانمان بەبەندایەتی تەواو هەژماربکات و لەهەڵەو پەڵەی گومان پاك بکاتەوە، چونکە تەنهاخۆی پەسەندیدەی کاری باشی چاکە کارانە.

# پێشەكی

## لەبارەی گەورەیی زانستی مێژوولێكۆڵینەوەی شێوازەكانی و ئاماژە بەوهەڵەو وەهمانەی كەمێژوو نوسان دەیكەن و باسكردنی هەندێك لە هۆكارەكانی

پێویستە ئەوەبزانین كەهونەری مێژوو شێوازێكە هەموو كەسێك ناتوانێت بەدەستی بهێنێت‌و، سودو ئامانج گەلێكی بەرێزو گەورەی هەیە، چونكە ئەم هونەرە سەبارەت بە سەرگوزەشتەی نەتەوەكان و ژیاننامەی پێغەمبەران و دەوڵەت‌و سیاسەتی پاشا كانی رابوردو ئاگادارمان دەكاتەوە، بۆئەوەی كەخوازیار سودی تەواو لەئەزمون وژیانی دین‌و دونیا وەربگرێت، پێویستی بەسەرچاوە گەلێكی جۆراو جۆرهەیەو پێویستی بەوە هەیە كەتێڕوانینەكانی باش بن‌و خاوەن پێداگریەكی بەهێز بێت (لەڕاستیەتی سەنەدو چۆنیەتی گێڕانەوەدا). كەئەم دوانە بەیەكەوە ئەو دەگەیەننە حەقیقەت‌و ڕزگاری دەكات لەخلیسكان و هەڵە، چونكە ئەگەرتەنها پشت بە گواستنەوەی هەواڵەكان ببەستێت بەبێ ئەوەی دادوەری بكات لەنێوان داب‌و نەریت و یاسای سیاسەتەكان‌و سروشتی شارستانیەت‌و چۆنیەتی كۆمەڵگە مرۆڤایەتیەكان بكات‌و ڕوداوەشاراوەكان تێكەڵ بەئاشكراو ئێستە بەڕابوردو ڕاڤە بكات، ئەوكات لەمەترسیەكانی بەلاڕێدا چون و لادان لەشارێی ڕاستەقینە ڕزگاری نابێت. چەندین جار ئەوەڕوویداوە كەمێژوو نوسان‌و ڕاڤە كاران پێشەوایانی ڕیوایەت، بەچاوپۆشی لە گێڕەرەوە ئیتر ڕاست بن یان نا بەبێ كەم و

زیاد گێڕاویانەتەوە توشی لەخشان بوون، چونکە ئەوان ڕووداوەکانیان بەپێی بنەماکان هەڵنەسەنگاندووەو، بەپێوەری حیکمەت و ئاگایی و بەسیرەتەوە نەچونەتە قوڵاییانەوە و بەرلەوەی بگەنەحەقیقەت لەشیوی هەڵەدا گومڕابوون. ئەم جۆرە هەڵانە بەتایبەت لە زۆرێك لە چیرۆکەکان لەکاتی دیاری کردنی ئەندازەی سەروەت‌و سامان یان ژمارەی سوپاکاندا ڕوویداوە، چونکە ئەم باسە (واتە مەسەلەی سەرژمێری)دەکەونە گۆڕەپانی درۆو هەڵەوە، هەربۆیە دەبێت بەناچاریەوە بیانگە ڕێنینەوە بۆ بنەماکان و بەپێی یاساکان ڕاڤەیان بکەین.

یەکێك لەنمونەکانی ئەم جۆرە هەڵانە ژمارەی لەشکریەکانی بەنی ئیسرائیلە هەروەك چۆن مەسعودی و مێژوونوسانی ترباسیان کردووە و دەڵێن پاش ئەوەی کەموسا(ع) لەکاتی ئاوارەبونیدا لە (تیە)[99] ڕێگەیدا هەرکەسێك لەتوانایدا هەیەبەتایبەت لەتەمەنی بیست ساڵان بەرەوسەر چەك هەڵبگرێت‌و، دواتردەستی کردە ژماردنی سوپای بەنی ئیسرائیل‌و، بینی نزیکەی شەش سەدهەزارکەس یان زیاتر دەبن. ئەمەلەکاتێکدا ئەگەر فراوانی میسرو شام لەبەرامبەرئەم سوپایەوە هەڵبسەنگێنین، سەرسام دەبین، چونکە هەرووڵاتێك لەتوانایدایە لەشکری پێویست بەخۆی ڕێك بخات لەهەموو بوارەکاندا و ئەگەربێت و لەمەبەدەربێت دەبێتە بارگرانی‌و کێشە بۆ ووڵاتەکە دروستدەکات. هەروەك چۆن بارودۆخی پاشاو نەریتەئاساییەکانیان گەواهی دەری ئەم ڕاستیەیە. سەرەڕای ئەمەش ئەگەرسوپایەك بەم ژمارە زۆرەی کەچاو لەدوو بەرابەرو سێ بەرابەری بینینی ڕیزەکانیاندا بڕناکات، ئەوا زۆر دورە کەسەرکردە بتوانێت لەکاتی پلانە سەربازیەکانیدا کۆنترۆڵیان بکات سودیان لێ وەربگرێت، چونکە شتێکی گونجاونیە وەها سوپایەك لەگۆڕەپانێکدا بواری جەنگی هەبێت و بەسەر دوژمندا زاڵ بێت، ئەمەلەکاتێکدا ئەم

---

[99] (تیـە)بەکەسـرەی (ت)وسـکونی (ە)لەدەربڕینـدا بـەبیابانێك دەگوترێـت کەڕەوەنـدەکانی تێـدا لەناوبچـن. وەلەدەستەواژەدا بەو بیابانەدەگوترێت کەحەزرەتی موسا نزیکە چل ساڵ لەگەڵ دوازدە سیبتی بەنی ئیسرائیل کەهەر سیبتێك پەنجاهەزارکەسی لەگەڵدا بووە سەرگەردان بوون. (غیاث)

سەری هەر ڕیزێك ئاگاداری ئەوسەرەكەی تری نیە و ڕۆژگاری ئەمڕۆكەش[100] گەواهی دەری ئەم ڕاستییە. لێكچونی ڕابوردو بەئێستا لەلێكچونی ئاولەئاو زیاترە. وولآتی ئێران بە بەراورد بەوولآتی بەنی ئیسرائیل گەورە ترو فراوان تربوو، بەبەڵگەی ئەوەی كە بختنصر[101] سەركەوت بەسەر بەنی ئیسرائیلداو وولآتەكەی قوت دانو، فەرمان ڕەواییەكەی لێ وەرگرتنەوەو بەیتولموقەدەسی پایتەختی مەزهەبی و پاشایەتیانی وێران كرد، ئەمە لە كاتێكدابختنصر یەكێك بووە لە فەرماندەكانی ئێران و، دەڵێن كە گوایە فەرماندەیەكی پاسەوانی سنورەكانی خۆرئاوای ئێران بووە. مەملەكەتەكانی ئێران و عێراق و عەجەمو عەرەب و خوراسان و ماوراء النهرو ئەبواب [102] بەچەندین هێندەی مەملەكەتەكانی بەنی ئیسرائیل فراوانتر بوون، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ژمارەی لەشكری ئێران هیچ كات نەگەشتووەتە ئەو ئەندازەی لەشكری بەنی ئیسرائیلو، گەورەترین لەشكرێ كەلە قادسیەدا كۆیان كردەوە لە سەدو بیست هەزاركەس تێنەپەڕیوە كەبەپێی گێڕانەوەی سەیف [103] هەموویان چەكیان پێبووە.

ئەو دەڵێت ئەگەرچەكدارەكانیان لەگەڵ ژمارەی ئەوانی تردا بخەینەسەریەك ئەوا دەبنە دوسەد كەس، لەعائیشە و زوهریەوە دەگێڕنەوە كە سوپاكەی ڕۆستەم لەبەرامبەر سوپاكەی سەعدەوە شەش سەدهەزاركەس بووە و هەموویان چەكداربوون [104]. وەئەگەر سوپای بەنی ئیسرائیل دەگەشتنەوەها ژمارەیەك ئەوا دەسەلآتو فەرمان ڕەواییەكەشیان فراوان دەبو دەوڵەتەكەیان لەناچەیەكی فراوانی تردا حوكومەتی دەكرد، چونكە ناوچەو مەملەكەتی دەوڵەتان بەپێی كەمی و زۆری لەشكرەكانیان و ژمارەی ئەوانەیە كەخزمەتی

---

[100] مەبەستی نوسەر سەردەمەكەی خۆیەتی .

[101] nabuchodosor .

[102] ابواب یان باب شاری ناسراوی دەربەندە كەلەكەنار دەریای خەزەردابووە.

[103] مەبەست سەیفی كوڕی عومەری ئەسەدیە .

[104] تەرجەمەی (متبوع)ە، چونكە سەربازانی ئێرانی هەریەكە خاوەن وولآخی خۆیان بون كەچەك و پێداویستیەكانی بۆهەڵگرتووە.

سەربازی دەکەن، وەئێمە لەبەشی مەملەکەتەکاندا (دەوڵەتەکان)لەم کتێبەدا سەرەتا ئەم بابەتە ئاشکرا دەکەین، بەڵام بەپێی ئەوەی کەبەناوبانگە مەملەکەتەکانی بەنی ئیسرائیل لەئەردەن و فەلەستین لەشامو، ووڵاتی یەسریب و خەیبەرلەحیجاز تێپەڕناکات. وەهەروەها بەپێی ئەوەی کە لێکۆڵەرەوان باسیان کردووە ماوەی نێوان موساو بەنی ئیسرائیل لەچوارپشت زیاتر نیە، هەروەك چۆن لەتەوراتدا هاتووە بەم شێوەیە: موسای کوڕی عیمرانی کوڕی یصهربن قاهت (بەفەتحەو کەسرەی هاکە)کوڕی لاوی (بەکەسرەو فەتحەی واو)کوڕی یەعقوب. وەیەعقوبی ئیسرائیل خودایە. ماوەی نێوانیان هەروەك چۆن مەسعودی گێڕاویەتیەوەبەم شێوەیە: کاتێك ئیسرائیل لەگەڵ نەوەکانیدا، اسباط[١٠٥] و مندڵەکانیدا هاتنەمیسر بۆ دیداری یوسف حەفتا کەس بوون، ماوەی مانەوەیان لەمیسر تائەوکاتەی لەگەڵ موسادا چونە (تیە)[١٠٦]دوسەدو بیست ساڵ بووە لەم ماوەیەدا پاشاکانی بەنی ئیسرائیل یان قیبتیەکانیان دەستاو دەست دەکرد،[١٠٧] وە زۆر دوورە کەنەوەیەك لەماوەی چوارپشتدا بگەنە وەها ژمارەیەك، وەئەگەر واگومان ببەن کەئەم سوپایە لەسەردەمی سولەیمان و دوای ئەو بوە دیسانەوە وەها فراوان بونێك باوەڕپێکراو نیە، چونکە لەنێوان ئیسرائیل و سولەیماندا یازدە پشت زیاتر نەبووە، چونکە وەچەکەی ئەو بەم شێوەیە: سولەیمانی کوڕی داودی کوڕی ئیشا[١٠٨]ی کوڕی عوفید[١٠٩] بەگوتەیەکیش کوڕی عوفیدی کوڕی باعیز یان بوعیزی کوڕی سەلمونی کوڕی نەحشونی کوڕی

---

[١٠٥] جمعی سبت بەکەسرەی سین کوڕەزا دەگەیەنێت کوڕبێت یان کچ، گروپێك لەنەوەکانی یەعقوب (ع)(غیاث).

[١٠٦] عەتاردەڵێت: لەبەرئەوەی کەگەلی موسیم لەتیە ماونەتەوە – هەم لە تەعتیل لەچواندن ماونەتەوە .

[١٠٧] واتە گروپێك بەم لاداو گروپێکی تریشیان بەولادا نارد بەبیانوی دانەمەزرانی نوتفەی موسا و لەخەوتنیان بەیەکەوە ڕێگریان دەکرد.

[١٠٨] جەمعی تەبەعە بەزەمەی تاکەو فەتحەی باکە لەزنجیرەکانی پاشاکانی یەمەنن و بەکەسێکیان دەگوت کەحەزرەمەوت و حەمیرو سەبەئی لەژێردەستدا بوایە (منتهی الارب).

[١٠٩] - بەکەسرەی حاکەو فەتحەی یاکە ناوچەیەکە لە لای خۆرئاوای صەنعاوە لەیەمەن.

عەمینوزب یان حمینازابی کوڕی ڕمی کوڕی حەزرون یان حسرونی کوڕی ئیبن بارس یان بیرسی کوڕی یەهوزای کوڕی یەعقوب. نەوەیەك لەیازدەپشتدا ناگاتە وەها ژمارەیەك بەوجۆرەی کەگومانیان کردووە، چونکە لەوانەیە بەسەدان هەزارکەس جیاببنەوە، بەڵام تێپەڕ بون لەم قۆناغەو گەشتن بە(عقود)[110]ی ئەوژمارانەی کەمێژوو نوسان باسیان کردووە، زۆر دورە لە ئەقڵەوەو بەڕەچاوکردنی بارودۆخی ئێستا و بینین لەنزیکەوە، لەوەتێدەگەین کەگومانی مێژوو نوسانی باسکراو لەم بارەیەوە بەتاڵە و گێڕانەوەکانیان درۆیە. وەئەوەی کەلە مێژووی ئیسرائیلیاتدا هاتووە بریتیە لەوەی کەسوپای تایبەتی سولەیمان دوازدە هەزارکەس بووەو، نزیکەی هەزارو چوارسەد ئەسپیان هەبووەو هەمیشە لەحاڵەتی ئامادەباشیدا بون. هەواڵی ڕاستەقینە لەبارەی بەنی ئیسرائیلەوە ئەمەیەو نابێت باوەڕ بەخورافاتی خەڵکی نەخوێندەواریان باوەڕبکەین.

لەسەردەمی پاشایەتی سولەیماندا (ع)دەوڵەتەکەیان لەهەرەتی لاویەتیو فراوان بوندا بووە. سەرەڕای ئەمەش ئێستەدەبینین کەزۆربەی خەڵکی ژمارەی زۆرو هەڵە و سەیرو سەمەرە لەبارەی ژمارەی سوپاو پارەو سامان و دارایی سەرکردەو دەسەڵاتدارانی موسوڵمانان یان مەسیحیەکان و خەرجی پاشاو خەڵکی خۆشگوزەرانەوە دەخەنە ڕوو، لەسنوری ئاسایی تێدەپەڕن و تەسلیمی خەون و خەیاڵات دەبن وبەسەرسامیەوە باسیان دەکەن، ئەمەلەکاتێکدایە ئەگەربێت و لەلێکۆڵینەوەی ئەو ژمارانەدا هەریەکەو بگێڕینەوە بۆسەرچاوە یان لایەنی پەیوەندیدار دەبینین لەهەزارا یەکی ئەو ژمارانە بەڕاست دەردەچن. ئەم نەریتەی زیادەڕەویە لەوەوە سەرچاوەدەگرێت کەڕۆحی مرۆڤ هەمیشەحەزی لەشتەسەیرو سەمەرەکانەو لەبەرئەوەی کە باسکردنی درۆو شتی ناڕاست زۆرئاسانەوخەڵکی لەڕەخنەی ڕەخنەگران ناترسن و سەرقاڵی قسە هەڵبەستن و شتی ناڕاستن.

---

ئەم کەسانە تەنانەت هەموو قسەیەکی خۆشیان بەڕاست دەزانن و لەگوواستنەوەی هەواڵدا لێکۆڵینەوەلەڕاست و ناڕاستی ناکەن و بەدوای گێڕەرەوەی ڕاستگۆو ناڕاستگۆدا ناگەڕێن و خۆیان بەنیازمەندی لێکۆڵینەوە نازانن و زمانیان بەم لاوئەولادا دەگێڕن و، هەموو ئایەتەکانی خودا بەگاڵتەڕاڤە دەکەن و، خوازیاری بانگەشەو بلاوکردنەوەی هەواڵی ناڕاست دەبن و لەگومڕایدا ڕۆدەچن، ئایاوەها مامەڵەیەکی زیانبار بەس نیە بۆ ئەوان؟ ئەوەی تر کەمێژوونوسان لەبارەی سەرگوزەشتەی تبابعەو، پاشاکانی یەمەن و جەزیرەتولعەرەب گێڕاویانەتەوە، بریتیە لەوەی کە پاشاکانی یەمەن لەناوچەی خۆیانەوە بەرەو سەرزەمینی ئەفریقاو بەربەرلەمەملەکەتەعەرەبیەکان هێرشیان بردووەو دەستیان داوەتە جەنگ لەگەڵیاندا ئەفریقشی کوڕی صەیفی لەپادشا گەورە یەکەمینەکانی ئەوانە کەهاوکات لەگەڵ موسا یان کەمێك پێش ئەو ژیاوە، بەرەو ئەفریقا هێرشی کردو تاوەکو ناوەڕاستی بەربەرەکان ڕۆیشت و چەندین شەڕی خوێناوی لەگەڵ کردن، وەهەروەها ئەو کەسێکە کەئەم گەلەی بەم ناوە وەبانگ کردووە، چونکەکاتێك ئەوانی دەبینی کەبەزمانی عەجەمی قسەدەکەن دەیگوت: ئەم بەربەرانەچین؟ لەوڕۆژەوە دەستەواژەی بەربەر بەسەریاندا سەپێنراو کاتێك لەمەغریب دەگەڕێتەوە چەندین هۆزی (حەمیر)[111]ی بۆپاسوانی کردن لە وێدا داناوە و ئەوانی لەوسەرزەمینەی کۆچەریەکاندا نیشتەجێ کردووەو لەگەڵ خەڵکی ئەوناوچەیەدا تێکەڵیان دروس کردووە و صەنهاجەو کەتامە لە و گروپەن.

لێرەدا کەتەبەری و جورجانی و مەسعودیو ئیبن کەلبی بەیهەقی[112] پێیان وایە کەصەنهاجەو کەتامە لەهۆزی حەمیرن، بەڵام نەتەوەناسانی بەربەر ئەمە ڕەت دەکەنەوە و هەربەوجۆرەشە کەئەوان دەیڵێن. مەسعودیش دەڵێت زولئیزعار کەلەپاشاکانی یەمەنە بەرلە ئەفریقش فەرمان ڕەوابووەو لەسەردەمی سولەیمان (ع)لەگەڵ خەڵکی مەغریب

---

[111] حەمیری کوڕی سەبەئی کوڕی یەشحیب باوکی هۆزێکە لەیەمەن (منتهی الارب).

[112] ئەم ناوە لەچاپی پاریس و (یەنی)دایە و لەچاپەکانی میسرو بەیروتدا (بیلی)یە .

بەشەڕ هاتووە و داگیری کردووە، هاوشێوەی ئەم ڕووداوەلەژیانی یاسر کەکوڕی ئەو بووە باسی کردووە و دەڵێت: گەشتووەتە ناوچەیەك بەناوی وادی ئەلرمل و پاش هەوڵ و ماندوبونێکی زۆر ڕێگەیەکی نەدۆزیوەتەوەو گەڕاوەتەوە. وەهەروەها لەبارەی تەبەعەکانی تری یەمەن ئەسعەد ئەبوکەرب، مێژوو نوسان دەڵێن ئەو هاوچەرخی گشتاسب پاشای زنجیرەی کیانی ئێرانی بووە و موصڵ و ئازەربایجانی داگیر کردووەو ڕوبەڕوی تورکەکان بووەتەوەو شەڕێکی خوێناوی لەگەڵ کردون و زاڵ بووە بەسەریاندا، دواتریش چەندجارێك لەگەڵیان بەشەڕ هاتووەو لەپاش ئەم ڕوداوانەشەوە ئەو سێ لەکوڕەکانی خۆی بۆ داگیرکاری بەرەو وولاتانی ئێران و، وولاتی سەغد لە مەملەکەتەکانی تورکستان و ماوەرائەنەهر بانگ کردووە. کوڕی یەکەمی ناوچەکانی سەمەرقەندی داگیر کردوە و لەفلات تێپەڕیوەو بەرەو چین ڕۆشتووە، لەوێدا گەشتووە بەبراکەی تری کەلەپاش جەنگ لەگەڵ خەڵکی سەمەرقەنددا پێش ئەو کەوتووە و گەشتووەتە چین، ئەم دوبرایە لەوولاتی چین چەندین شەڕی خوێناوی ئەنجام دەدەنو دەستکەوتی زۆر بەدەست دەهێنن و بەیەکەوە دەگەڕێنەوە یەمەن و لەکاتی گەڕانەوەیاندا کۆمەڵێك هۆزی حەمیریان ناچار کرد کەلەچین بمێننەوە کەتاوەکو ئەم ڕۆژگارەش هەرلەوێ دەژین. برای سێیەمیان دەگاتە قوستەنتینەو ئەو شارە وێران دەکات و چاودەبڕێتە وولاتی ڕۆمو لەپاشان گەڕایەوە.

هەموو ئەم هەواڵانە دورن لەڕاستییەوە و زیاتر لەچیرۆکی ئەفسانەیی دەچێت، چونکە تەبابیعە لەجەزیرەتولعەرەبدا دەسەلاتیان هەبووەو پایتەختی فەرمانڕەواییەکەیان لە صەنعای یەمەن بووە و جەزیرەتولعەرەبی لەلەسێ لاوە دەورەداوە: لەباشورەوە دەریای هیندو لەخۆرهەلاتەوە دەریای فارس کەلە دەریای هیندەوە بەرەو بەصرە دابەش دەبێتو لەخۆرئاواوە دەریای سوئێزکەهەم لە دەریای هیندەوە بەرەو سوئێز دەڕوات بۆ ناوچەکانی میسر، هەروەك چۆن لەنەخشەی جوگرافیدا دەبینرێت. وەتەنها ڕێگەیەك کە لەیەمەنەوە دەچێتە وولاتی مەغریب تەنها ڕێگەی نێوان دەریای سوئێزو دەریای شامە،

کەماوەکەی نزیکەی دووڕۆژ یان کەمتر دەبێت. وەزۆر بەدوردەزانرێت کەپاشایەك لەگەڵ سوپاکەیدا لەم ناوچانەوە تێپەڕ بکات بەبێ ئەوەی ئەم ناوچانە داگیر بکات. وەها پێشهاتێك بەپێی نەریت گونجاو نیە، چونکە لەسەررێگەی تێپەڕینی ئەودا زەبەلاحەکانی کەنعان لەشام و قیبتیەکان لەمیسردا ژیاون. دەسەڵاتدارانی بەنی ئیسرائیل و میسر شامیان خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، ئەمە لەکاتێکدا هەرگیز مێژوونوسان هەواڵێکیان نەگێڕاوەتەوە کەتەبابیعەی یەمەن لەگەڵ هیچ یەك لەم گەلانەدا جەنگابن، یان یەکێك لەم ناوچانەیان داگیر کردبێت. سەرەڕای ئەمەش ئەو ماوەیەی کەپێویستە لەنێوان یەمەن و مەغریبدا ببڕدرێت زۆر دوورەو سوپاپێویستیان بەئازوقەو خۆراکی زۆر دەبێت، هەربۆیە ئەگەرئەو مەملەکەت و ناوچەکانی سەر ڕێگەی خۆی داگیرنەکردبێتو بیەوێت لێیانەوە تێپەڕببێت ئەوا ناچارە ئەو ناوچانەو داگیر بکات و کشتو کاڵ و زەوی‌و زارەکانیان دەست بەسەرا بگرێت، چونکە ئەم شێوازەش بۆ فەراهەم کردنی پێداویستی سوپایەکی گەورە بەس نیە. بائەوەش بڵێین ئەگەرهاتو ئەم ئازوقەو کەرەستەیەش فەراهەم کرا، بەڵام وولآخی پێویست لەکوێ بوو بۆگواستنەوەیان، یان ئەگەربلێین ئەم سوپایە بەبێ شەڕ لەم ناوچانەوە تێپەڕیوەو خۆراکو پێداویستیان لەخەڵکی ئەو ناوچانەوە دەست کەوتووە، دیسانەوە ئەم گریمانەش زۆردورە لەڕاستیەوە، کەواتە زۆر ڕوونە کەئەم هەواڵانە سستو بێ بنەمایەو هەڵبەستراون، بەڵام شیوی لم (وادی الرمل)یان ئەو سەرزەمینەی کەلەبەر زۆری تۆزولم ناتوانن بەئاسانی پێیدا تێپەڕبکەن، سەرەڕای هەڵبەستراوە، چونکە وەها ناوێك لەو سەرزەمینەدا بەهیچ شێوەیەك نەبیستراوەو سەرەڕای ئەوەی کەگەشتیارێکی زۆر سەردانی دەکەن هیچ کامیان وەها ناوێکیان نەبیستووە.

ئەوکاروان چیانەی کەلەهەموو ناوچەکانەوە چونەتە یەمەن و شارو شارۆچکەو گوندەکانی ئەو ناوچانەیان بینیوە باسی وەها ناوچەو شوێنێکیان نەکردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی شتێکی سەرنج ڕاکێشەو (بابەتی سەیر زۆرتردەگێڕدرێنەوە)هەربۆیە خەڵکی زۆر

دەیگێڕنەوە، بەڵام بەشەڕهاتنی تەبابیعە لەگەڵ مەملەکەتەکانی شەرق وسەرزەمینی تورکەکان، هەرچەندە ڕێگەی ئەو ناوچەیە لەڕێگە سوئیز فراوانترە، بەڵام لەیەمەنەوە تاوەکو ناوچەکانی ناوبراو ماوەیەکی دورترەو گەلانی ئێران و ڕۆم لەڕێگەی گەشتنیان بەسەرزەوی تورکان ڕووبەڕوی هێرش دەبنەوە. هەرکەسیش بیەوێت بگاتە سەرزەوی تورکان پێش ئەوەی زەویەکان داگیربکات دەبێت لەگەڵ ئێرانی و ڕۆمیەکاندا بجەنگێت. ئەمە لەکاتێکدا هیچ مێژوو نوسێك باسی ئەوەیان نەکردووە کەتەبابیعە مەملەکەتەکانی ئێران و ڕۆمیان داگیر کردبێت. بەڵکو ئەوەی لەمێژوودا هاتووە ئەوەیە کە ئەم گەلە لەسنورەکانی عێراق و لەنێوان بەحرەین و حیرەو جەزیرەو ناوچەکانی دەوروبەری دیجلەو فورات لەگەڵ ئێرانیەکاندا جەنگاون. ئەم جەنگە لەنێوان زولئەزعار پاشای یەمەن‌و کەیکاوس پاشای کیانی ڕویداوە. وەهەروەها دەڵێن تەبەعی کوڕی ئەسفەری ئەبو کەربیش لەگەڵ گشتاسبدا بەشەڕ هاتووە، بەڵام لەگەڵ بوونی پاشای تەوایفەکان لەپاش کیانیان و لەدوای ئەوانیش ساسانیەکان لەسەرزەمینی ئێران، تێپەڕبون بەم وولاتەدا بۆجەنگ لەگەڵ تورکەکان‌و گەشتن بەتبت‌و چین شتێکە وەك مەحاڵ و نەگونجاو دێتە بەرچاو، چونکە شەڕکردن لەگەڵ ئەو گەلانەی کەدەکەونە سەر ڕێگەی چین زۆر سەختەو پێویستی بەخۆراك ئازۆقەی زۆرە.

بەدوری ئەو ماوەیەی کەباسمان کرد وەها سەفەرێك دژوارو نەگونجاوە. هەربۆیە هەواڵەکانی پەیوەست بە مەسەلەیەوە نادروست‌و هەڵبەستراون.باوادابنێین کەسەرچاوەی ئەم هەواڵانەش ڕاست بێت دیسانەوە ئەم ڕەخنانەیان لێ دەگیرێت، چونکە چۆن دەگونجێت ڕاست بن، لەکاتێکدا هەواڵی ناوبراو لەسەرچاوەگەلێکی ڕاستەوە نەگێڕدرابنەوەو، لەقسەکانی ئیبن ئیسحاقیشدا لەبارەی یەسریب و ئەوس و خەزرەج کەتەبەعێکی ترەو زۆربە سەختیەوە بەرەو خۆرهەلآت چووە مەبەستی عێراق و ئێرانە، بەڵام شەڕی ئەوان لەگەڵ تورك و تبتیەکاندا بەهیچ شێوەیەك دروست نیە، هەروەك چۆن پێشترسەلماندمان. هەربۆیە لەم بارەیەوە هەرچییەك دێتە بەردەممان نابێت باوەڕی

پێبکەین‌و پێویستە لەهەواڵەکان وورد ببینەوە و بەپێی یاسا ڕاست‌و دروستەکان لێکۆڵینەوەیان بکەین بۆ ئەوەی بەباشترین شێوە بیانناسین و تەندروست لەناتەندروست جیابکەینەوە. خوداش ڕێنیشاندەری ڕاستەقینەی مرۆڤە.

# بەشێك

لەوهەوالآنە ناڕاسترو هەڵبەستراوتر کەباسمان کردن، ئەو چیرۆکەیەکەڕاڤەکاران لەبارەی ڕاڤەی سورەتی (والفجرەوە)، دەربارەی ئەو فە ر مودەی خودا کەدەفەرمێت: (الم ترکیف فعل ربك بعاد ارم ذات العماد)[١١٣] باسیان کردووەو، بەناوی شاریکەوەناویان هێناوە کەبەبونی کۆلەکەی گەورەو بەرزەوە ناسراوە ودەڵێن کەعادی کوڕی عەوصی کوڕی ئیرەم دووکوڕی هەبووە: بەناوەکانی شەدید و شەداد، کەلەپاش مەرگی عادی باوکیان بونەتە جێنشینی ناوبراو. شەدید دەمرێتو مەملەکەتەکەی باوکی دەکەوێتە دەست شەدادو باسی بەهەشت دەبیستێتو بڕیاردەدات کەبەهەشتێکی لەو جۆرە دروستبکات، هەربۆیە شەداد بڕیاریدا شاری ئیرەم لەبیابانی عەدەن دروست بکات و بۆماوەی سێسەد ساڵی خایاند و شەداد خۆی نزیکەی نۆسەد ساڵ ژیاو، دەڵێن شاری ئیرەم زۆرگەورە بووەو، کۆشکی لەزێڕ تێدا بووە و کۆلەکەکانی لەزبرجەدو یاقوت بون‌و پڕ بووە لەدارو درەختی زۆرو کانی و ڕووباری زولاڵ و ڕوون، لەپاش تەواو بونی شارەکە شەدادلەگەڵ هەموو خەڵکی وولآتەکەیدا بەرەو ئەو شارە ڕۆشتو، پێش ئەوەی بگەنە ناوشار خودا بەهاوارێکی گەورە شارەکەی خاپورکردو هەموخەڵکەکەی لەناوچون. تەبەری و زەمەخشەری وسەعالیبی و ڕاڤەکارانی تر ئەم بەسەرهاتەیان لەعبداللەی کوڕی

---

[١١٣] ئایا ئەوەت نەبینی کەخودا چی بەسەر نەتەوەی عاد دا (ارم) هێنا کەخودا لەشێوەی ئەوانی لەشارەکاندا دروست نەکردبو (تەفسیری ئەبو الفتح).

قەلابەکەیەکێك بووە لەهاوەلآنی پێغەمبەر(ص)گێڕاوەتەوە، کەگوایە ڕۆژێکیان بۆ دۆزینەوەی حوشترەکەی دەچێتەدەرەوە، گەشتوەتە ئەوشارەو بەپێی توانای خۆی هەندێك شتی هێناوە. دواتر هەواڵ دەگاتەوە بەمعاویەو بانگی کردووە و ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوەتەوە، لەپاشان کەعبولئەحباری دۆزیوەتەوەو لەم بارەیەوە پرسیاری لێ کردووەو، ئەویش گوتویەتی: ئەوەشاری ئیرەمی خاوەن کۆڵەکەیەو پیاوێك لەموسوڵمانان لەسەردەمی تۆدا، کەخاوەن کوڵمی سورو باڵاکورت کەخاڵێك بە برۆیەوەو خاڵێك بە ملیەوە بووە لەکاتی گەڕانی بەشوێن حوشترەکەیدا دەچێتە ئەو شارەوەو، لەوکاتەی کەقسەکەدەگێڕێتەوە ئیبن قەلابە دەبینێتو یەکسەر دەڵێت سوێند بەخودا ئەم کەسەیە سوێندبێ، بەڵام لەو ڕۆژە بەدواوە لەهیچ ناوچەیەکی زەویدا لەبارەی ئەم شارەوە هەواڵێك بەدەست نەهاتوە بیابانەکانی عەدەن کەواگومانیان دەکرد شاری ناوبراو لەوبیابانەدا بنیات نرابێت، لەنێو یەمەندایەو یەمەن بەردەوام ئاوەدانەو ڕێگەناسان لەهەمولایەکەوە ئەوڕێگەیان بڕیوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك باسیان لەم شارە نەکردووە. خۆ ئەگەر بیانگوتایە وەك شارەکانی تر لەناوچووە ئەوا لەپەسەندەوە نزیکتر بوو، بەڵام قسەکەی ئەوان ئەوە دەگەیەنێت کەئەم شارە ئێستەش بونی هەیە هەندێك دەڵێن ئەوشارە دیمەشقە. بەوپێیەی کەگەلی عاد داگیریان کردبوو.

قسەی بێ مانای ئەوان بەوەکۆتایی دێت کەدەڵێن: شاری ناوبراو لەئێمە شاراوەیەو خەڵوەت کێشان و جادووگەران پێی دەزانن. هەموو ئەمانە کۆمەڵێك گومانن کەلە خورافات دەچن. ئەوەی ڕاڤەکارانی والێکردوە کەوەهاڕاڤەیەك بکەن داخوازی کاری ئیعراب لەزمانی عەرەبیدا[١١٤] بەوەی کەوشەی زات العماد سیفەتی ئیرەم بێت و عیمادیان بەمانای کۆڵەکەڕاڤە کردووە، وەلەئەنجامدا ئەوەسەلمێنراوە کە ئیرەم باڵەخانە یان شارێك بێت. وەخوێندنەوەی ئیبن زوبەیر (عاد)و (ارم)ی بەشێوەی ئیزافەو بێ تەنوین

---

[١١٤] واتە حەرەکاتەکانی ڕفع و نەصب و جەڕ و، بەزانستی (نەحو)یش واتە ڕێزمانی عەربی دەڵێن زانستی ئیعراب .

بەبۆچونی ئەوان باشترو پەسەندتربووە. هەربۆیە سەرنجیان بەلای ئەم مانایەدا ڕاکێشراوە. لەپاشان بۆ ئاراستەکرنی بۆ ئەم چیرۆکانە وەستاون کەزیاتر لەچیرۆکی ئەفسانەو پێکەنیناوی دەچن. وەگەرنا (عماد)بریتیە لەکۆڵەکەی نێوان چادرەکان (خێوەت)[115]. وەهێشتا ئەگەر بێت و بەکۆڵەکەش مانابکرێن لەبەرئەوەی کەگەلی عاد زۆربەهێزبون‌و بەگشتی لەدروستکردنی باڵەخانەو کۆڵەکە گەورەکاندا شارەزاییە کی زۆریان هەبووە گونجاوترە. ئەوەك ئەوەی کەبینایەك بێت لە شارێکی دیاری کراویان نادیاردا. وەئەگەر بەپێی خوێندنەوەکەی ئیبن الزوبەیرئیرەم ئیزافە بکرێت بۆلای زاتوالعیماد وەك ئیزافەی فەصیلە[116] بێت ئەوا ماناکەی دەبێتە هۆز یان تیرە، هەروەك دەڵێن: قورەیش کنانە، الیاس موزەڕ، ڕەبیعەو نزار، چونکە پێویست بووە پەنا بەرنە بەرگریمانێکی وەها دور، گریمانێك کە بۆ دروست کردنی دەستیان داوەتە هەڵبەستنی ئەم جۆرە چیرۆکانەو، بەهۆی دوریان لەڕاستییەوە، کتێبەکەی خودا دوروپاکە لەو نمونانە.

یەکێکی تر لەوچیرۆکە دروست کراوانە بریتیە لەو چیرۆکەی کەهەموو مێژوو نوسان هۆکاری چارەنوسی شومی (برامکە)، بەدەستی ڕەشید دەیگێڕنەوەو دەیدەنە پاڵ ئەفسانەی عەباسەی خوشکی ئەو لەگەڵ جەعفەری کوڕی یەحیای کوڕی خالد غولامی خەلیفە. دەڵێن لەبەر ئەوەی کەهارون حەزی کردووە کەجەعفەرو عەباسە لەکۆڕی مەی نۆشینی ئەودا ئامادەبن، هەربۆیە ڕێگەیدا کەخوشکەکەی لەجەعفەر مارە بکرێت، ئەمەش تەنها بەمەبەستی مەحرەم بونی ئەوان و ئامادەبونیان لەدانیشتنەکەی خەلیفەدا. لەبەرئەوەی کەعەباسە عاشقی جەعفەر بووە، بەمەکرو فێڵ بەتەنهایی خۆی دەگەیەنێتە جەعفەرو لەئەنجامدا سەرجێیان بەیەکەوە کردو دەڵێن کەجەعفەرلەحاڵی مەستیدا بووەو عەباسە بەم هۆیەوە سکپڕ بووە. ئەم بەسەرهاتەش ئاژاوەچیان و گێرەشێوێنان بۆ

---

[115] ئەم بەشە لە(یەنی)و (چاپی پاریس)دانیە .

[116] فصیلە: عەشیرەت و گروپێك لەمرۆڤ (اقرب الموارد).

ڕەشیدی دەگێڕنەوەو ئەویش لە بەرامکە توڕەدەبێت. ئەم تۆمەتەش لەپلەو پایەو حەسەب و نەسەبو بنەماڵەی ئاین پەروەری عەباسەوە دورە، چونکە ئەو کچی عبداللەی کوڕی عەباس بووەو لەنێوان عەباسە و عبداللەدا تەنهاچوارکەس هەبوون. ئەو کچی محمدالمهدی کوڕی عبدالله ئەبوجوعفەری مەنصوری کوڕی محمدسەجادی کوڕی عەلی ئەبوالخلفای کوڕی عبدالله تەرجومانی قورئانو کوڕی عەباس مامی پێغەمبەر (ص)بووە. کچی خەلیفەیەكو خوشکی خەلیفەیەكو، لەهەموو لایەکەوە باپیرانی هاوەڵایەتی پێغەمبەر (ص)یان کردووەو لەخانەدانی مامی پێغەمبەر کەبنیاتنەری ئاین و نوری وەحیو لانکەی دابەزینی فریشتەکان بون.

وەهەروەها نزیك بووە لە سەردەمی بادیەنشینی عەرەبو سادەییەوە و لەنەریتی خۆشگوزەرانیو دونیا پەرستیەوە دوربون.

هەربۆیە ئەگەر وابزانین پاکی و پاك داوێنی لەعەباسەدا ڕوینەداوە. ئەی کەواتە ئەم سیفەتانە لەچ کەسێکی تردا بدۆزینەوە؟ یان ئەگەر پاکیو[117] ئەسڵ وفەسڵی لەخانەدانی ئەو دابڕنین ئەوکات لەکام خانەداندا دەتوانین ئەم تایبەتمەندیانە بدۆزینەوە؟ یان دەبێت بیر لەوەبکەینەوە کەچۆن عەباسە ڕازی دەبێت شەرەفی خۆی لەکەداربکات لەگەڵ کەسێکدا کەلە مەوالیەکانی بێجگەلەعەرەب بووەو، خەڵکی وولاتی ئێرانی ئەوسەردەمە بووە و خزمەتکاری دەرباری باپیری عەباسە بووە؟ خاوەن باپیرەیەك بووە کە وەچەی دەگەڕێتەوە سەرمامی پێغەمبەرو شەریف ترین کەسی قورەیش. شەرەفمەندیەکەشی لەوەدایە کەدەوڵەتی عەباسیەکان دەست و باڵی جەعفەرو باوکیان گرتووە و گەشتونەتە ئەو دەسەڵاتە. سەرەڕای ئەمەش چۆن ڕەشید بەو هەمو پلەوپایەوە چۆن بەڕەوای دەزانێت کەیەکێك لەمەوالیە کان بکاتە هاوسەری کچەکەی؟ ئەگەربێت خوێنەر بەدیدەیەکی بەویژدانەوە سەیربکاتو عەباسە بچوێنێت بەکچی یەکێك لەپاشاکانی سەردەمی خۆیەوە لەوە دڵنیا دەبێتەوە کەکچێك بەو هەمو گەورەیی شەرافەتەوە

---

[117] ذکاء بقذال لەچاپی بولاقدا هەڵەیە.

بێگومان نابێتە هاوسەری یەکێك لەمەوالیو، ئەم قسانە بەدرۆ دەخاتەوە، چونکە پلەوپایەی عەباسەو ڕەشید بەبەراورد لەگەڵ خەڵکیدا بەهیچ شێوەیەك بەراورد ناکرێت، بەڵام برامکە دوچاری ئەو چارەنوسە شومە نەبون، مەگەربەوهۆیەوە نەبێت کەجڵەوی هەموو کاروبارەکانی فەرمان ڕەواییان گرتبێتە دەستو باج و خەرجیەکانیان تایبەت کردبێت بەخۆیانەوە، بەجۆرێك کارگەشتبووە ئەوەی کەئەگەر ڕەشید هەندێك پارەی بویستایە بەئاسانی دەستی نەدەکەوت. کەواتە ئەوخانەدانە بەجۆرێك جڵەوی دەسەڵاتیان گرتبوە دەست و زاڵبون بەسەرئەمدا کەبەهیچ شێوەیەك ڕەشید نەیدەتوانی لەبچوکترین کاروباری دەوڵەتدا دەست وەردانی هەبێت، هەربۆیە بەرهەمی گرنگو گەورەیان لێ بەجێ ماوەو، ناوو ناوبانگی ئەوان سەرتاسەری وڵاتی گرتەوە. ئەوان هەمووکاروبارەکانی دەوڵەت هەرلەحاجیبیەوە تادەگاتە فەرماندەکانی سوپا خستبویانە ژێردەستی خۆیانەوە، بەجۆرێك دەڵێن لەکوڕانی یەحیای کوڕی خالیدبیست و پێنج کەسیان لەدەرباری ڕەشیددا خاوەن پلە و پۆستی باڵا بوونو، سوپاو وڵاتیان بەڕێوەبردووە.

ئەوان بواری بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتیان بۆخەڵکانی تر تەسكو بگرە نەهێشتەوە و وەدەریان نان، چونکە یەحیا باوە گەورەی ئەو خانەدانە پلەیەکی باڵای هەبووە و کەفالەتی هارونی هەم لەسەردەمی ویلایەت و هەم لەسەردەمی جێنشینیدا لەئەستۆی ئەو دابووە. تاوەکو هارون لەژێر چاودێری ئەودا گەورەبوو جڵەوی دەسەڵاتی گرتەدەست و بەباوك بانگی دەکرد. لەئەنجامدا فەزڵی ئەوخانەدانەی بەسەرهەمواندا دەدا و بوێری چاونەترسیان زۆربوو ئارەزوی دەسەڵات بەسەریاندا زاڵ بوو هەموو گەورەکان چاویان تێ برین و هەموو بلیمەت و کەسە ئازاکان لەبەردەمیاندا سەری ڕێزو نەوازشیان دادەنەواندو، بونە خانەدان و خزمەتکاری کەعبە، لەم پەڕ بۆئەوپەڕی سنورەوە لەلایەن ئەمیرو[118] دەسەڵاتدارانەوە دیاریان بۆ دەهات. پارەدارو بازرگانانیش

---

[118] ئەمیر لێرەدا هاومانای پارێزگار یان والیە .

بۆخۆنزیك كەوتنەوە لێیان بەلێشاو دیاری گرانبەهایان بۆ دەناردن و هەموو باج‌و ماڵیاتێكی دەوڵەتیان دەدایە دەست ئەوان. ئەم خانەدانە پیاوانی شیعەو[119] خزمان‌و نزیكانی عەباسیەكانیان بەشیاوی خزمەتكردن دەزانی و لەهەموو بوارەكاندا ڕێزیان دەگرتن و خزمەت دەكران. خانەدانە بنەڕەتیە هەژارەكانیان كردە داراو گیراوەكانیان لەنارەحەتی و ئەسیری و دیلی ڕزگاركرد. شاعیرانی ئەو خانەدانەیان بەشێوەیەكی بێ شومار خەلأت دەكرد بەبێ ئەوەی بەشێوەیەكی ئەوتۆ بەخەلیفەدا هەڵیان دابێت، تاوەكو وایان لێهات كەهەموو گوندو زەویی و زارو ماڵ و سامانی ناچەكەیان گرتەدەست. ئەمەش بووە هۆی نیگەرانی و توڕەیی خەلیفەو دارو دەستەكەی وئەم ڕێزو گرنگی پێدانە گۆڕا بۆدوژمنایەتی و خاوەن پلەو پایە دەوڵەتیەكانیان لەخۆیان توڕە كرد. كەم كەم دوژمنان‌و دژەكانیان پەردەیان لەسەر دەم و چاویان هەڵماڵی و ئەوانە كەدەركرابون كەوتنە ئاژاوەگێڕی. تەنانەت كوڕانی قەحتوبەو خاڵەكانی جەعفەر لەگەورەترین ئاژاوەچیە كان بوون لەدژی ئەوان و خزمایەتی‌و نزیكی لەدژایەتی كردن دوری نەدەخستنەوە. ئەم بارودۆخە هاوكات بوو لەگەڵ ڕۆژگارێكدا كەگەورەی ئەوان واتە خەلیفەش لەدەرونیدا ڕق وكینە كڵپەی دەدا و لەوبارودۆخە نیمچە دەست بەسەریە زۆر بێزار بوبو، دەسەلأتی خۆی بەبەرتەسك دەزانی. سەرئەنجام بوبوە هۆی دروست بونی دژایەتی گەورەو لەدڵیدا پەنگی خواردبویەوە.

نمونەی ئەمەش یەحیای كوڕی عبداللەی حەسەنی كوڕی حەسەنی كوڕی عەلی كوڕی ئەبی تالیب (ع)برای محمدمهدی ناسراو بەنەفسی زەكیەیە، كەدژی مەنسور كودەتای كرد. چیرۆكەكەشی بەم شێوەیە: كەفەزڵی كوڕی یەحیا ئەوی لەووڵاتی دەیرەم بانگ كرد بۆ دەربارەكەی و بەدەست خەتی ڕەشید ئەمان نامەیەكی پێداو هەروەك چۆن تەبەری

---

[119] مەبەست پەیڕەوانی شیعەی عەباسیە كەبەیارمەتی ئەوان خاندانی ناوبراو گەشتنە دەسەلأت (نەوەك شیعەكانی عەلی)(ع).

باسی کردووە، دەڵێت هەزارهەزار (یەك ملیۆن)دیرهەمی بەخشیبووە دیلمیان[١٢٠] و ڕەشید ئەوی دایە دەست جەعفەرو بڕیاری دابو لەماڵەکەیدا زیندانی بێت و لەژێر چاودێری خۆیدا بێت.

جەعفەرماوەیەك ئەوی زیندانی کرد[١٢١]، بەڵام دواتر هاتەسەرئەوەی کەڕێگەی بۆ بکاتەوە و بەندکردنەکەی لەسەرلاببات. بەو بیانووەی کەڕێگە لەڕژانی خوێنی یەکێك لەخانەدانی پێغەمبەر بگرێت، بەڵام ئەو ئەمکارەی بەهۆی متمانەبونیەوەبوو بەحوکمی سوڵتان. ئەم مەسەلەیەشیان بۆ ڕەشید گێڕایەوەو ڕەشیدیش لەبارەی یەحیاوەپرسیاری لەجەعفەرکرد، جەعفەریش لەوەڵامدا گوتی ئەوم ئازاد کردووە. خەلیفە لەڕواڵەتدا کارەکەی ئەوی بەباش دایە قەڵەم، بەڵام لەناخدابێی ناخۆش بوو ڕقی لێی دەبویەوەو لەئەنجامدا ئەم کارە بویە هۆی کردنەوەی دەرگای دوژمنایەتی لەنێوان جەعفەرو خانەدانەکەی لەگەڵ خەلیفەدا. تاوەکو ئەوەبو لەئەنجامی ئەوکێشە و گرفت و هەرایانەدا سەربەرزی ئەوخانەدانە لەناوچوو بونەپەندو نمونەبۆ کەسانی ترو بەیەکجاری لەناو چون و توانەوە. ئەوەی لەمێژووی ئەو خانەدانە وردببێتەوە شێوەو شێوازی دەوڵەتداری و بەڕێوەبردنیان بەوردیەوە سەیربکات، ئەم چارەنوسە بەمسە و گە ر دەزانێت بۆیان و هۆکارەکانی بەئاشکرا دەبینێت.

خوێندنەوەی ئەوبابەتانەی کەئیبن عبدڕەبە لەبارەی گفتوگۆی ڕەشید لەگەڵ مامی باپیرەی داودی کوڕی عەلی لەبارەی برمکیەکانەوە باسی کردووە. بەشێك کە لەبەشی شاعیرەکان لەعەقدولفەریددا لەبارەی گفتوگۆی ئەصمەعی لەگەڵ ڕەشیدو فەزڵی کوڕی یەحیا لەکاتی باسکردنی ئەفسانەدا هێناویەتی، ئەوەمان تێدەگەیەنێت کەتەنها هۆکاری کوشتنی برامکە ئیرەیی خەلیفەو کەسانی دەوروبەری بووە. کەلەئەنجامدا خۆپەسەندی و

---

[١٢٠] کامیلی ئیبن ئەسیرو حبیب السیر و کتێبە مێژووییەکانی ترسەیربکرێن .

[١٢١] ئیبن ئەسیردەڵێت: یەحیا لەگەڵ فەزڵدا هاتە بەغداو ڕەشید ڕێزێکی زۆری لێگرت و فەرمانیدا سەروەت و سامانێکی زۆری پێ ببەخشن، بەڵام دواترخستیە زیندانەوەو مرد .

خۆویستی ئەوخانەدانە سەبارەت بەخەلیفە ڕوویداوە. ئەوەش تێدەگەین کەچۆن دوژمنانیان کێشەو ئاژاوەیان دروست کردووە بەجۆرێك کەتەنانەت خزمانو نزیکانی خەلیفەش کەوتبونە ئەو بارودۆخەوە و دەستیان دابویە فیتنەیی و قسەهەڵبەستن. تەنانەت نزیکانی خەلیفەپەنایان بردە بەرخوێنەران ئەوانەی کەبەخەلیفەداهەڵیان دەدا. بۆئەوەی لەڕێگەی شیعرەوە قسەو باسە نهێنیەکانیان بەخەلیفە بگەیەنن بەومەبەستەی لەدڵی خەلیفەدا دژی برامکە ڕقوکینەدروست ببێت، شیعرەناوبراوەکانیش بەم شێوەیەن:

خۆزگەئەوەی کەهیند پەیمانی پێ دابوین دەیبردەسەر.

بەوەش ڕۆحی پڕئازارمانی چارە دەکرد.

وەبۆ تەنها جارێکیش فەرمانی بە سەربەخۆیی دەدا.

چونکە نەتوان کەسێکە کە لەبۆچون و فەرمانەکانیدا سەربەخۆ نیە.

کاتێك ڕەشید ئەمانەی بیست ووتی: (ئەریێ وەلا من بێ توانام). خراپەکاران تەنانەت بەم شێوەیەش ڕق و کینەی خەلیفەیان لەدژی برامکە دەورووژاند. پەنادەگرم بەخودا لەزاڵبونی پیاوانو پێچەوانەبونەوەی کاروبارەکان. وەئەو بابەتانەی کەباسی مەیخواردنو لەگەڵ سەرخۆشاندا مەی نۆشیوە، هاوار لەوەها بوختانێك، خودا دەزانێت کەئێمە لەخراپەکاریەکانی ئەو ئاگادارنین. ڕەشید لەکوێ و ئەم جۆرە تۆمەتانەش لەکوێ؟ چونکە ئەو کەسێك بووە بەتەواوی مانا باوەڕدارو دادپەروەربووە و بەردەوام لەگەڵ زاناو ناودارەاندا هاونشین بووە. ووتووێژەکانی لەگەڵ فوزەیلی کوڕی عیازو ئیبن سەماكو عومەری و نوسینەکانی لەگەڵ سوفیانی سەوریدا زۆربەناو بانگن. ئایاگریانەکانی ئەو لەووتارەکانی ئەم گروپەلەمەککەداو لەکاتی تەوافی ماڵی خوداو، خوگرتنی بەبەندایەتیو پارێزگاری لەکاتەکانی چ نوێژوو ئامادەبون بۆنوێژی بەیانی لەکاتی خۆیدا، ئایا هەموو ئەمانە لەگەڵ ئەم بوختان و درۆیانەدا دەگونجێن؟ تەبەری و زانایانی تر باسیان کردووە کە گوایە ڕۆژانە نزیکەی سەد ڕکات نوێژی سوننەتی کردووە و ساڵێك چووەتەحەج و ساڵێکیش جیهادی کردووە. ئەولەکاتی نوێژکردنی ئیبن ئەبی مەریەمدا کەهەندێك

بێئاگابووە لەنوێژەکەی لۆمەی کردووە. چیرۆکەکەشی بەم شێوەیە کەگوایە ئیبن ئەبی مەریەم گوێی لێ دەبێت کەئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (وَمالِيَ لا أعبُدُالّذي فَطَرَني) [١٢٢] یەکسەرگوتی بەخوا نازانم بۆچی؟!

ڕەشید بێئاگا پێکەنی. لەپاشان بەشێوەیەکی تورەوە بەئیبن ئەبی مەریەمی گوت لەنوێژیشدا گاڵتە دەکەیت!! وازلەگاڵتە کردن لەکاتی قورئان و نوێژدا بهێنە. ئەرێ وازبهێنە! لەپاش ئەم دوانە هەرچی دەتەوێت بیڵێ. سەرەڕای ئەمەش ڕەشید لەزانست و سادەیدا پلەو پایەیەکی بەرزی هەبووە، چونکە سەردەمی ئەو لەپێشینانیەوە کە ئەو سیفەتانەیان هەبووە زۆرنزیك بووە و لەنێوان ئەوو ئەبوجەعفەری مەنصوری باپیرەیدا هێندە ماوەیەکی زۆر نەبووە. ئەو لەسەردەمی منداڵی ڕەشیددا کۆچی دوایی کرد، وەئەبوجەعفەر ئیتر لەپێش خەلافەتدابێت یان لەدوای خەلافەتەوەبێت لەزانست و ئایندا پلەیەکی باڵای هەبووە. ئەو کەسێکەمالیکی والێکرد کەکتێبی موتئ بنوسێت‌و پێی گوت: ئەی ئەبو عبداللە، لەسەر زەویدا زاناتر لەمن‌و تۆ کەس نەماوەتەوە، لەبەرئەوەی کاروباری خەلافەت بوارم نادات و کاتم لێ دەگرێت، تۆپێویستە کتێبێك لەپاش خۆت بۆ خەڵکی بەجێبهێڵی کە [١٢٣] سود بەهەمووان بگەیەنێت.

لەئاسانکاری ئیبن عەباس و سەختگیری ئیبن عومەر دووربکەوەرەوەو، بەباشترین شێوە ئامادەی بکە بۆخەڵکی. سوێند بەخودا ئەو لەو ڕۆژەدا شێوازی نوسینی فێری من کرد وەکوڕەکەی مەهدی، واتەباوکی ڕەشید ئەوەی تێبینی کردبو کەئەو فەراهەم کردنی جل و بەرگی جوان بۆخێزانەکەی لەبەیتولماڵ بەپێچەوانەی لەخواترسانی دەزانی. ڕۆژێکیان مەهدی چووەلای ئەبو جەعفەروبینی ئەو لەگەڵ بەرگدورەکاندا سەرقاڵی پینە کردنەوەی جل و بەرگی خانەدانەکەیەتی. مەهدی ئەم کارەی پەسەند نەکردو گوتی: ئەی

---

[١٢٢] ئەوکەسە تێکرشەرە کەهاتبو گوتی بۆچی کەسێك نەپەرستم کەدروستی کردووم. س ٣٦ تا ٢١.

[١٢٣] بۆزانیاری زیاتر لەبارەی ئەم داستانەوە سەردانی عیون الانبا ی ئیبن ئەبی ئوصەیبوعە بەرگی ١ ل ١٢٩ بکرێت .

ئەمیری ئیمانداران بهێڵە هەقدەستی چاککردنەوەی ئەم پۆشاکە لەسەر من بێتو لەمووچەکەی خۆم بیدەم، باشە بالەسەر تۆبێت، بەلام خۆی بۆخەرج کردنی پارەو سامانی بەیتولماڵ ئامادەنەبو. ئەی کەواتە چۆن دەگونجێت ڕەشید بەنزیکی لەوەها خەلیفەیەك و لەگەڵ ئەوپلەو پایەیەی کەباوکی هەیبووەو، لەوەها خانەدانێکدا پەروەردەبوبێتو فێری ئاینداری و ئاین پەروەری کرابێت، دەبێتە مەی نۆش و هاوڕێی مەی نۆشان!! ئەوە دیارە کە گەورە پیاوانی عەرەب لەسەردەمی نەفامیدا لەخواردنەوەی شەراب خۆیان دەپاراستو، ئەمەش تەنها کۆمەڵێکیان نەبون بەڵکو زۆرێکیان خواردنەوەی شەرابیان بەخراپ زانیوە. ڕەشیدو باو باپیرانیشی لەدورکەوتنەوە لەخراپەی پەیوەست بەدینو دونیاوەو، خاوەنداریەتی لەسیفەتە جوانەکانی ئاینو نەریتی عەرەب بەناوبانگ بوون. ئێستەبابزانین تەبەری و مەسعودی چیرۆکی (جبریلی کوڕی بختیشوع)[١٢٤]ی پزیشك چۆن دەگێڕنەوە: لەو کاتەی کەماسی برژاویان هێنایە سەرسفرەی خەلیفەوە نەیهێشت خەلیفە بیخوات و لەپاشان فەرمانیدا کەماسیە کەببەن بۆماڵی ئەوان.

ڕەشید کەوتە گومانەوە و بەخزمەتکارەکەی خۆی گوت کەچاودێری بەختیشوع بکاتو بینی کەماسیەکە دەخوات. ئیبن بەختیشوع بەمەبەستی داوای لێبوردن سێ پارچەماسی کردە ناوسێ دەفرەوە: یەکێکیانی بەدەرمان و سەوزەو مادەی فێنك کەرەوە وشیرینی ڕازاندەوە ودووەمیشی پڕ کرد لەسەهۆڵ و سێیەمیشیانی تێکەڵ کرد لەگەڵ شەرابی زۆر باشداو، گوتی خواردنی ئەمیر ئەلموئمینین بەشی یەکەم و دووەمە، ئەگەربیەوێت ماسیەکە بەتەنها بخوات ئەوە دەفری دووەمە، وەگەرنا باماسیەکە لەگەڵ ئەو مادانەدا بخوات کەلەدەفری دووەمدان، دەفری سێیەمیشیان تایبەتە بەئیبن بەختیشوع، لەپاشان دایە دەستی خان سالار. کاتێك ڕەشید هەستا لەخەوو ئەوی بۆ سەرزەنشت کردن بانگکردەلای خۆی هەرسێ دەفریان هێنایە لای خەلیفەو بینی ئەو

---

[١٢٤] گەورەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر (ص)لەبارەی حەرامی نەبیزەوە بۆچونی جیاوازیان هەبووە.

دەفرەی کەشەرابی تیایە لەگەڵ گۆشتەکەدا تێکەڵ بووە و زۆرنەرم بوە تەوە، بەڵام پێکهاتەکانی هەردو دەفرەکەی تر خراپ بوون و بۆنێکی ناخۆشیان لێوە دێت. ئەم بارودۆخە بۆ ئیبن بەختیشوع وەك داوای لێبوردن وایە. لەم چیرۆکەوە ئەوە دەسەلمێت کەڕەشید لای نزیکان و کەسەتایبەتیەکانیو ئەوانەی کەهاوخوانی بون بەدور کە وتنەوە لەشەراب ناسراوبووە. ئەوەش سەلمێنراوە کەئەبو نەواسی بەهۆی زیادەڕەوی لەمەیخواردنەوەدا زیندانی کردو تاوەکو وازی هێناو تەوبەی کرد. ڕەشید تەنها نەبیزی خورمای نۆشیوەو ئەمەش بەپێی مەزهەبی ئەهلی عێراق خواردنەوەی نەبیز حەرام نەبووەو فتواکانیان لەم بارەیەوە بەناوبانگن، بەڵام هیچ ڕێگەیەك نیە کەڕەشید بەمەی نۆشی تاوانباربکاتو چاولێکەری لەهەواڵی بێ بنەماو درۆ کارێکی ناڕەوایە، چونکە ئەوکەسێك نەبووە کەوەها گوناهێکی گەورە کەمەیخواردنەوەیە ئەنجام بدات. هەمو ئەم دارو دەستە یە لەزیا دەڕەوی لەهۆکارەکانی ژیان جوانکاریەکانیدا خۆیان بەدور دەگرت، چونکە ئەوان لەسەر ئەوسروشتە ڕەقەی دەشتەکیەتیو سادەیی لەئایندا ڕاهاتبونو هەرئەو سیفەتەشیان لەدەست نەدابوو. ئەی کەواتە کەی ویژدانە واگومان بکرێت کەئەوان لەشتی ڕەواوە بۆناڕەواو لە حەڵاڵەوە بۆحەرام بچن!! مێژوو نوسانی وەك تەبەریو مەسعودیو زۆرێکی تر لەوان هاوڕان لەسەرئەوەی کەهەمو خەلیفەپێشینەکانی ڕابوردو تەنانەت سواری وولآخگەلێك دەبون کەزینەکانیان لەسیم گەلێکی زۆرباریكو کەمەربەندو کیلانی شمشێرەکانیشیان سیمیان پێوەبووە.

یەکەمین خەلیفەیەك کەزینی زێڕینی بەکارهێنا موعتەزی کوڕی موتەوەکیل بووە. ئەوان لەپۆشینی جلو بەرگدا زۆر سادە بوون، ئیتر چۆن دەگونجێت لە کۆمەڵی مەیخۆران بن؟ ئەگەرپەی بەسروشت و چیەتی دەوڵەتان لەسەرەتای دروست بونیانەوە بەرین، کەبەدەشتەکیەتی و خۆڕاگری لەبەرامبەر ناڕەحەتیەکانەوە ناسراون، ئەوکات ئەم بابەتە بەباشترین شێوە ڕوون دەبێتەوە و لەمەسەلەکانی کتێبی یەکەمدا ئەم بابەتەبەیارمەتی خودا ڕاڤە دەکەین. خوداش باشترین یارمەتی دەری ئادەمیانە. یەکێکی

تر لەوخالآنەی کەلەبارەیەوە یەو گونجاوە لەگەڵ ئەم باسەدا، لەبارەی یەحیای کوڕی ئەکسەمەوەیە، قازیو هاونشینی خەلیفە مەئمون، دەگێڕنەوە و دەڵێن: ئەو بادەنۆشی کردووە و شەوێك لەگەڵ هاوپیاڵەکانیدا مەست دەبێت و لەناوڕێحاندا دەپێچنەوە تاوەکو بێتەوە هۆش، و ئەم شیعرانەیان لەسەرزمانی ئەوەوە گێڕاوەتەوە:

ئەی خودا من و ئەمیرو هەموخەڵکی.

ئەوەی کەبادەی بەمن دەدا لەدادوەریەکەیدا جەفای لەگەڵدا کردم.

من بێئاگا بوم لەساقی.

وەك دەیبینن ئەو پیاوەتی و ئاینی لەمن ستاند[١٢٥].

دەڵێن کەگوایە خوی ئیبن ئەکسەم و خوی ڕەشید لەمەیخواردنەوەدا وەك یەك بووەو شەرابی هەموویان هەمان نەبیز بووە کەلەمەزهەبی ئەواندا حەرام نەبووە، بەڵام پێگەی ئەوان لەگەڵ مەستیدا بەهیچ شێوەیەك گونجاو نیەو، هاونشینی ئیبن ئەکسەم لەگەڵ مەئموندا تەنها لەسەرمەسەلەی دینداری بووە و ئەوەش سەلماوە کەئەو لەگەڵ مەئموندا لەیەك ژووردا نوستوونو، لەبارەی هەڵسوکەوتی جوانی مەئمونەوە دەگێڕنەوە کەشەوێکیان بەهۆی تینویەتیەوە لەخەوهەڵدەستێتو، لەبەرئەوەی کەمەبادا یەحیای ئیبن ئەکسەم خەبەری ببێتەوە، زۆر بەهێمنیەوە دەست بەم لاولادا دەبات تاوەکو دەفری ئاوەکە بدۆزێتەوەو، ئەوەش سەلمێنراوە کەئەو دوکەسە هەموو بەیانیەك لەکاتی نوێژی بەیانیدا بەیەکەوە هەستاون بۆ نوێژ. ئایائەم جۆرە حاڵەتانەلەگەڵ مەیخواردندا دەگەنجێت؟ وەسەرەڕای ئەمەش، یەحیای کوڕی ئەکسەم لەگەورەکانی زانستی فەرمودە بووە. ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەمبەل و قازی ئیسماعیل وەسفی ئەویانداوە. تیرموزی کتێبی (جامع)ی لەوەوە دەرهێناوە.

مورنیش دەڵێت بوخاری بێجگەلەجامیع فەرمودەی لەئیبن ئەکسەمەوە گێڕاوەتەوە. کەواتە بەخراپەباسکردنی وەك بەخراپ زانینی ئەم پێشەوا گەورانەیەو، ئەوەشی

---

[١٢٥] بۆزانیاری زیاتر (عقدالفرید بەرگی هەشتەم بخوێنرێتەوە).

کەدەگوترێت کەزۆر حەزی لەکوڕبوە ئەمەش وەك بوختانێکی گەورەوایە کەپشتیان بەکۆمەڵێك هەواڵی بێ بنەمابەستووە، کەلەوانەیە لەتۆمەتەکانی دوژمنانی ئەو بێت، چونکە ئەو بەهۆی کەمالات و هاوڕێیەتی بێ پەڵەی لەگەڵ خەلیفەدا هەمیشە لەبەردیدەی حەسودان و بەد بێژاندا بووە و ئەوپلەو پایەی کەلەزانست و ئایندا هەیبوە دورە لەمجۆرە بوختانانەوە، چونکە لەوکاتەی کەتۆمەتیان دەدایەپاڵ بۆ ئیبن حەمبەلیان گێڕایەوە، ئەویش لەوەڵامدا گوتی: پاکو بێگەردی بۆخودا ئەوە کێن ئەم قسانە بۆئەو هەڵدەبەستن؟ بەتوندی ئەوتۆمەتانەی ڕەت کردەوەو گوتی ئەم تۆمەتانە ناجوامێرانەن‌و باوەڕ پێنەکراون. وەهەروەها ئیسماعیلی قازی بەباشە باسی کردووەو کاتێك تۆمەتە ناڕەواکانی بیست، گوتی پەنادەگرم بەخودا کەوەها دادپەروەرێك بەدرۆی ستەمکارو حەسودان لەناوبچێت‌و، گوتی یەحیا ئیبن ئەکسەم لەبارەگای خودا پاکترو بێتاوانترە لەوەی کەتۆمەتی خۆش ویستنی کوڕ زیاتر لەکچان دەدەنە پاڵی! ئەمە شتێکی باوەڕپێکراونیە.

من لەگەڵیدا زۆر ژیاوم و لەنهێنیەکانی دەزانم و پیاوێکی تەواو لەخواترسەو لەهەمان کاتدا خۆش خوو ڕوخۆش بووە و حەزی لەگاڵتەوگەپی جوان کردووە و دەکرێت لەم ڕێگەیەوە کەوتبێتە بەرتیری خراپ گۆیان و بوختان چیانەوە. وەهەروەها ئیبن حەییان ئەوی خستووەتە ڕیزی پیاوانی متمانە پێکراوی فەرمودەوە. نابێت باوەڕپەوەبکرێت کەدوژمنان لەبارەیەوە دەیڵێن و هەموو ئەوانە بەدرۆ بزانرێن. لەڕوانگەی ئەم جۆرە بەسەرهاتە درۆو ئەفسانانەوەیە کەئیبن عبد ڕەبە، خاوەنی (عقدالفرید)[١٢٦]، لەبابەتی زەنبیلدا گێڕاویەتیەوەو بەهۆکاری داخوازی مەئمون لەپوران، کچی حەسەنی کوڕی سەهلی زانیوە. هەروەك دەگێڕنەوە مەئمون شەوێکیان لەکاتی گەڕان بەکۆڵانەکانی بەغداد دا زەمبیلەیەك دەدۆزێتەوە کەبەپەتی ئاوریشمی بەسراوەو، لەبەر ئەوەی

---

[١٢٦] گەڕانەوە بۆ عقدالفرید بەرگی هەشتەم (هاوسەرگیری مەئمون لەگەڵ بوراندا)و هەزارو یەك شەو ل ٢٧٩ تاوەکو ٢٨٢ .

کەوایزانی پەتەکان توندو بەهێزن هەربۆیە لەسەر زەمبیلە کە دانیشت، بەهێزێکی زۆرەوە پەتەکانی ڕاکێشاو کەدەمی زەمبیلەکەی کردەوەو یەکسەر بەرەو سەرەوە ڕۆشتو لەشوێنێکدا نیشتەوە بەپێی وەسفی ئیبن عبد ڕەبە زۆر سەرسوڕ هێنەر بوو. فەرشی جوان و دەفری ڕازاوەو [١٢٧] دیمەنە جوانەکانی بەئەندازەیەك دڵ ڕفێن بوون بینەری ئەبلەق دەکرد. لەم کاتەدا کتوپڕ ژنێکی زۆر جوان لەپشتی پەردەکانەوە دەردەکەوێت و سلاوی لێدەکات و بانگی دەکات بۆلای خۆی و تاوەکو بەیانی سەرقاڵی مەی نۆشین دەبن، لەو کاتەی کە هاوەڵانی خەلیفە چاوەڕێن کەخەلیفە بڕوات بۆلایان، دواتر دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەوەندە دڵبەستەی ئەو ژنە دەبێت یەکسەرخوازبێنی کچەکە لەباوکی دەکات. ئەم ئەفسانانە لەکوێدا دەگونجێن لەگەڵ سیفەتی مەئموندا کەلەئاین پەروەری و پەیڕەوی لەخولەفای ڕاشیدەو جێبەجێ کردنی دابو نەریتی باو باپیرانیو دانیشتنی لەگەڵ زانایانو گفتوگۆلەگەڵیانداو پاراستنی سنورەکانی خودا؟ ئەم خوو سیفەتانەی پیاو خراپان و شەوگەڕان و ئارەزوپەرستانی عەرەب و....هتد چۆن دەکرێت بدرێنە پاڵ خەلیفەی موسوڵمانانو ئەم جۆرە ئەفسا نانەلەبارەیەوە بەڕاست بزانرێن؟ سەرەڕای ئەمەش، ئەم پڕوپاگەندەیە لەکوێ و پلەو پایەی بەرزو بەڕێزی کچی حەسەنی کوڕی سەهل، کچێك کەلەماڵی باوکیدا لەوپەڕی پاکیزەیی و پاك داوێنیدا گەورە بوە؟!

نمونەی ئەم جۆرە حەکایەت و بەسەر هاتانە لەکتێبی مێژوو نوساندا زۆرو زەوەندن. ئەوەی لەپشت هەڵبەستنی ئەم جۆرە حەکایەتانەوەن ئەوانەن کەبەناو حەرامدا ڕۆچوونو سەرقاڵی ڕابواردنن لەگەڵ ژنانی هەوەسبازداو بەم قسانە دەیانەوێت بڵێن ئەم کارانەی کەئێمە دەیانکەین چاولێکەریە لەوان، بۆ ئەوەی نەکەونە بەر لۆمەو تانەی خەڵکەوە. هەربۆیە دەبینین بەزۆری ئەم جۆرە هەواڵانە باس دەکەن و لەکاتی خویندنەوە و لێکۆڵینەوەدا هەمیشە بەدوای ئەم جۆرە ئەفسانانەدا دەگەڕێن. ئەگەر

---

[١٢٧] لە (ینی)جامیع دا (اوانی)یە ئەوەك (ابنیە)

ئەمانە خەڵکانێکی ژیرو دانا بونایە هەوڵی هاونشینیان دەدا لەگەڵ ئەوبەڕیزانەداو شوێن سیفەتە جوانەکانیان دەکەوتن.

من ڕۆژێکیان سەرزەنشتی یەکێك لەئەمیرە کانم کردوپێم گوت جوان نیە بۆتۆ کەهێندە حەزت لە ئامێری مۆزیك و گوێگرتنە لەگۆرانی و لەئاستی پلەو پایەی تۆدا نیە. لەوەڵامدا گوتی مەگەر نەتبیستووە کەئیبراهیمی کوڕی مەهدی چۆن لەپێشەوایانی ئەم هونەرە دەژمێردرا و سەرۆکی ئاواز خوێنانی سەردەمی خۆی بووە؟ گوتم سوبحانەالله! نەکەی! بۆچی ناچیت ژیاننامەی باوك یان براکەی بخوێنیتەوە؟ ئەی نەتبیستووە ئەم کارە چۆن ئیبراهیمی لەپلەو پایەی بڵندی خێزانی خۆی هێنایە خوارەوە؟ گوێی بەقسەکانی من نەداو سەرزەنشتەکەمی بەهەند وەرنەگرت و لێم دورکەوتەوەو خودا هەرکەس کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات[١٢٨]. یەکێی تر لەو هەواڵە بێ بنەمایانەی کەمێژوو نوسان باسیان کردووە ئەوەیە کەدەڵێن عەبیدیان، خەلیفەکانی شیعە لەقەیرەوان و قاهیرە، لەخانەدانی پێغەمبەرایەتی نین و دەڵێت کەلەنەوەی ئیمام ئیسماعیلی کوڕی ئیمام جەعفەری صادق نین و تانە لەوەچەی دەدەن.

ئەوان لەم شێوازەداپشت بەکۆمەڵێك هەواڵ دەبەستن کەبۆخۆ هەڵواسین و نزیکبونەوە لەخەلیفە بێ تواناکانی بەنی عەباس نوسراون. هەواڵانێك کەدوژمنان بەمەبەستی خراپەگوتنی خەلیفەو جنێو پێدانیان هەڵبەستراون. هەروەك چۆن ئێمە هەندێك لەو هەواڵانە لەناو مێژووی ئەواندا باس دەکەین، بەڵام بێ ئاگاین لەهەستکردن بەو ڕوداو بەڵگانەی کەپێچەوانەی بۆچونی ئەوانەو دژی ئەم بەسەرهاتە هەڵبەستراوانەیە، چونکە ئەوان هاوڕان لەسەر ئەوەی کەلەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی شیعەکەئەبو عبداللەی موحتەسەب کاتێك دەستی کردە بانگەشە، بۆ شیاوترین کەسی خانەدانی محمد لەهۆزی کەتامە و ناوبانگی بڵاوبویەوە و زانیان کە لەگەڵ عوبەیدوالله مەهدی و ئەبولقاسمی کوڕیدا هاتوچۆیان هەیەو، باوکو کوڕ لەترسی گیانی خۆیان لەمەشریق کە

---

[١٢٨] (وَاللهُ يَهدِي مَن يَشاء ) ئا ٢٧٤ س بقرة.

بنکەی سەرەکی خەلافەت بوو هەڵهاتن و لەمیسریش دەرچون وبەجل و بەرگی بازرگانەکانەوە لەئەسکەندەریەش چونە دەرەوە. هەواڵیان گەشتە عیسا نوشری کاربەدەستی میسرو ئەسکەندەریە و بەکۆمەڵێك سوارەوە دەگەڕان بەدوایاندا، بەڵام ئەوان بەهۆی گۆڕینی جل و بەرگەکانیانەوە ئەوانیان فریو داو چونە مەغریب و، موعتەزیدیش فەرمانی بە ئەغالیبە و ئەمیرەکانی ئەفریقا لەقەیرەوان‌و، بەنی مەدارو، ئەمیرەکانی سجلماسەکرد کەهەموو ڕێگەکانیان لێ بگرن‌و شۆڤارەکان دەست بکەن بەگەڕان بەدوایاندا، ئەوە بوو سەرئەنجام یەسع گەورەی سجلماسە هەواڵی پێگەشت کەلەشارەکەی ئەودا خۆیان حەشارداوە، ئەمیش بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئافەرینی خەلیفە دەستگیری کردن. ئەمەش بەرلەوەبووە کەشیعە زاڵ بن بەسەر ئەغلەبیەکانی قەیرەواندا. ئەوکات دوای ئەم ڕووداوانە بانگەوازەکەیان لەمەغریب و ئەفریقاو یەمەن و ئەسکەندەریە و میسرو شام و حیجازدا دەرکەوت. ئەمان بەسەر نیوەی مەملەکەتەکانی بەنی عەباسدا زاڵبوبون و نزیك بوو بچنەناو زێدی خۆیانەوە (بەغداد)و فەرمانڕەوایی بەنی عەباس لەناوبەرن، چونکە بانگەوازەکەیان لەلایەن کەسێکەوە بەناوی ئەمیری بساسیری[129] کەلەمەوالیەکانی دیلمە لەبەغداو عێراق کەبەسەر خەلیفەکانی بەنی عەباسدا زاڵ بوبو ئاشکرا کراو، لەئەنجامی ئەودەمەقاڵێیەی کەلەنێوان ئەوو ئەمیرەکانی ئێراندا ڕوویدابو بۆماوەی یەك ساڵ بەناوی عبیدییانەوە (فاتیمیەکان) ووتاری هەینی دەخوێندەوە.

گۆڕەپانی سیاسەت لەبەنی عەباس تەسك بوبو یەوەو دەوڵەتەکەیان لەبەردەم هەڕەشەدا بوو. هەم پاشاکانی بەنی ئومەییە لەوسەری دەریاوە لەگەڕاندابون بەدوای هەلێکدا بۆ لەناوبردنی ئەمان. چۆن دەگونجێت هەموو ئەم سەرکەوتنانە بۆکەسێك ڕوویدات کەلە نەسەب و خاندا نە کەیدا تاوانباربێت و لە دانەپاڵی ویلایەت بۆخۆی

---

[129] بساسیری دانەپاڵی بسا یان فسا یە. گەڕانەوە بۆ راحەالصدور ل ٩٧ چاپی لیدن و کەمێژووی بۆ پێرستەکانیش داناوە چاپی دکتۆر نەوایی و لوغەتنامە دیهخودا.

درۆبکات؟. دەکرێت کاری قورموتی کەلەنەسەب و وەچەی خۆیدا درۆیکرد و چۆن و بەچ شێوەیەك بانگەوازەکەی لەناوچوو شوێنکەوتووانی پەراگەندە بون و درۆکانیان بەخێرایی ئاشکرابون، ببێتە پەندو ئامۆژگاری، چونکە ئەگەرکاری عەبیدیەکانیش وەها بوایە ئەوا هەرچەندە ماوەیەکیشی پێ بچووایە هەرلەکۆتایدا ئاشکرا دەبوو ئەم سەرئەنجامەیان بەسەردەهات. مرۆڤ لەسەر هەرخوو خدەیەك بێت هەرچەندە وابزانێت لەخەڵی دەشارێتەوە، بەڵام پاش ماوەیەك هەرئاشکرا دەبێت[١٣٠]. دەوڵەتی عەبیدیان نزیکەی دوسەدوحەفتاساڵ تەمەنی کردو پەرستگای حەزرەتی ئیبراهیم (ع)شوێن و گۆڕی پێغەمبەر(ص)و جێگەی حاجیان و شوێنگەی دابەزینی فریشتەکانیان کۆنترۆڵ کردبوو. لەپاشان فەرمانڕەواییەکەیان لەناوچو ئەمەلەکاتێکدا شیعەکانو پەیڕەوەکانیان هەرلەسەر بیرو باوەڕەکانیان بەردەوام بون و بەتەواوی گوێڕایەڵییان دەکردن و، بەدڵ خۆشیان دەویستنو باوەڕێکی تەواو پتەویان بەنەسەبی ئەمان بۆ ئیمام ئیسماعیلی کوڕی ئیمام جەعفەری صادق (ع)هەبوو.

شیعەکانی شوێنکەوتەیان لەپاش لەناو چونی دەوڵەت و نەمانی شوێنەواری چەندین جار دەستیان دایە شۆڕش و بانگەواز. ناوی ئەو منداڵانەی کەلەپاشماوەی ئەو خانەدانە بوون و وایان دەزانی کەشیاوی خەلافەتن بەناوی خەلافەتەوە دەیانگوت و پێیان وابوو کەپێشەوایانی ڕابوردوو ئەو منداڵانەیان لەوەسیەتنامەکانی خۆیاندا وەك پێشەوا (ئیمامەت)دیاری کردووە. ئەگەر لەنەسەبی پێشەواکانی خۆیاندا گومانیان هەبووایە ئەوا لەپێناو سەرکەوتنیاندا خۆیان نەدەخستە هیلاکەت و لەناوچونەوە، چونکە خوداوەند داهێنانی خۆی لەکارەکانیدا ئاڵۆز ناکات و لەداهێنانەکانیدا هەڵەناکات ئەوەی دەیداتە پاڵ خۆی درۆنیە. جێی سەرنجە کەقازی ئەبوبەکری باقلانی لەخاوەن بۆچونەکانی زانستی کەلام بەتوندی باوەڕی بەم مەسەلەیە کردووە و ئەم بۆچونەلاوازەی پەسەند

---

١٣٠ شەستەمین شیعری قەصیدەی زوهەیری کوڕی باوکی سەلما لەقەصیدەکانی حەوت هەڵواسراوەکە (معلقات السبعە).

کردووە. ئەگەربەهۆی ئەوەوەیە کەئەوان لەئایندا لەسەر بێباوەڕی بوون و لەڕافیزە گەرایدا تەعەصوبیان هەبووە، ئەوا دیارە لەسەرەتای بانگەوازەکەیاندا وەها نیەتێکیان نەبووەو جوڵێنەریشیان ئەم مەبەستە نەبووە. سەلماندنی نەسەبیان شتێك نیە کەلەدەرگانەی خودا سودێکی بۆئەوان هەبێت، هەروەك چۆن خودای گەورە سەبارەت بەکوڕەکەی بەحەزرەتی نوح (ع)ی فەرموو (ئەولەنزیکانی تۆنیە، چونکە کردەوەی ناباش بوو، کەواتەلەبارەی شتێکەوە پرسیارم لێ مەکە کەزانیاریت لەبارەیەوەنیە)[١٣١].

وەهەروەها پێغەمبەر (ص)لەڕێگەی ئامۆژگاریەوە بەفاتیمەی فەرموو: (ئەی فاتیمە کاری چاکەبکە، چونکە بەهۆی منەوە ناکەویتە بەر بەزەیی خوداوە و سودێکی نابێت بۆت). وەهەرکات مرۆڤ شتێك بزانێت یان لەشتێك دڵنیا بێت، پێویستەبە ئاشکرابیڵێت، چونکەخودا تەنها هەق دەڵێتو، هەرئەو ڕێنماکاری ئادەمیانە. ئەو گەلە بەم لاوئەولادا دەچون، هەربۆیە دەکەوتنەبەر گومانی خراپی دەوڵەتان و هەمیشە لەژێر چاودێری ستەمکاراندا بوون. بەهۆی زۆری پەیڕەوانی شیعەو بڵاو بونەوەی بانگخوازانیان لەناوچە دورەکانداو، پیاوانی دیاریان خۆیان حەشاردابو دەرکەوتنیان بەشێوەیەکی بەردەوام و دوبارە دیسانەوە خۆحەشاردان کەم تازۆر نەدەناسران. هەربۆیە قسەی ئەم شاعیرە لەبارەی ئەوانەوە زۆر ڕاستە کەدەڵێت: (ئەگەرناوم لەڕۆژگار بپرسی، نایزانێت، و وەئەگەر لەبارەی شوێنمەوە پرسیاری لێ بکەیت ئەوا شوێنیشم نازانێت). تەنانەت ئیمام محمدی کوڕی ئیسماعیل باوەگەورەی عوبەیدوالله مەهدی، ناونرابوو مەکتوم (شاراوە)، لەبەرئەوەی دوژمنان زەفەری پێ نەبەن، ئەم نازناوەش هەمو شیعەکانی ئەو سەردەمە بەکاریان دەهێناو بەکرداریش شاردبویانەوە.

پەیڕەوانی بەنی عەباس ئەم مەسەلەیان بۆ تانەدان لەنەسەبی ئەوان بەکاردەهێناو لەڕێگەی ئەم تانەیەوە لای خەلیفە بێتواناکانیان خۆیان دەبردە پێشەوە. وەهەم فەرمانڕەوایان و کاربەدەستانیان کەسەرقاڵی شەڕ بوون لەگەڵ دژەکانیاندا بەمایەی

---

[١٣١] (إِنَّهُ لَيسَ مِن أَهلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غيرُ صالحٍ فَلا تَسئَلنِ مَالَيسَ لَكَ بِهِ عِلمٌ). س. ئا ٤٨.

دڵخۆشی خۆیان دەیاندایە قەڵەم، تاوەکو بەم شێوەیە بەرگری لەگیان و دەسەلاتیان بکەن و بێتوانایی زیانبەخشی خۆیان لەبەرگری و پێداگری لەبەرامبەر هێرشی ئارەزو پەرستانی عوبەیدییان قەرەبوو بکەنەوە، چونکە بەربەرەکانی کەتامیەکان کەلەشیعەو موبەلیغە کانیان بون لەشام و میسرو حیجازدا سەرکەوتبون بەسەر بەنی عەباسدا. تا کارگەشتە ئەوەی کەتەنانەت دادوەرەکانی بەغداد باوەڕیان بەوەهێنا کەڕەگەزیان ناگاتەوە سەر پێغەمبەر. لەوانەش کۆمەڵێك بەناوبانگی ئەوسەردەمەوەك: شەریف ڕەزاو مورتەزای برای و ئیبن بەتحاوی[132] و زانایانێکی وەك ئەبوحامیدی ئەسفراینیو قودوەریو صەیمەری و ئیبن ئەکفانی و ئەبی وەردی و ئەبو عبداللەی کوڕی نیعمانی زانای شیعەو زاناو دانایانی تری گەل لەڕۆژێکی دیاری کراودا بۆگەواهی دان ئامادەبوون و شاهێدییاندا. ئەم ڕووداوەش لەساڵی ٤٠٢[133] لەسەردەمی خەلافەتی ئەلقادردا ڕویداوەو شاهێدیەکەی ئەوان لەم بارەیەوە لەسەر بیستن دامەزراوە، چونکە بابەتی ناوبراو لەنێوخەڵکی بەغدادا زۆربە ناوبانگ بووە. زۆربەی ئەو کەسانەی کەڕەخنەیان لە نەسەبی عەبیدیەکان دەگرت شیعە یان پەیڕەوانی بەنی عەباس بوون. زانایانی مێژووش هەربەو شێوەیەی کە بیستویانە شتەکەیان گێڕاوەتەوە. ئەمە لەکاتێکدا ڕاستەقینەکە شتێکی ترە. هەروەك چۆن باشترین شاهێد و ئاشکراترین بەڵگە لەسەر ڕاستیەتی نەسەبی ئەوان دەتوانرێت لەنامەکەی موعتەزیددا بدۆزینەوە کەلەبارەی عوبەیدوالله بۆ ئیبن ئەلئەغلەب لەقەیرەوانو ئیبن مدرارلەسجلماسەی نوسیوە، چونکە موعتوزید لەهەرکەسێك زیاتر لەخانەدانی پێغەمبەرەوە نزیکترو بەئاگاترە.

دەوڵەت و پاشایەتی وەك بازاڕی جیهان وایە کەسەرمایەو زانست و هونەرەکانی تێدا کۆدەبنەوە وبەدوای داناییە وون بووەکاندا دەگەڕێن تێیدا کەوەك کاروان بەرەو ئەو لەجوڵەدان. وەئەوەی کەلەو بازاڕەدا بەکاردەهێنرێت لەلای زۆربەی خەڵکی بەها پەیدا

---

[132] لەهەندێك لەچاپەکاندا (تەحاوییە)نەك بەتحاوی.

[133] لەچاپەکانی میسرو بەیروتدا ٤٦٠ باسکراوە، بەلام ڕاست هەمان چاپی پاریسە.

دەکات. کەواتە ئەگەر دەزگای دەوڵەت لەگومڕایی و ستەمکاری و گەندەڵی پاك ببێتەوەو بەڕێگەی ڕاست و ڕەواندا بڕوات و لەسنوری میانەڕەوی لانەدات لەو بازارە جوانەدا نۆبەی بایەخ دەگر ێت بۆخۆی، بەڵام ئەگەر بڕوات بەدوای کینە و بەرژەوەندی کۆمەڵێکدا و لەڕێگەی ڕاست لابدات‌و ئەوا ناداد گەری ڕەونەق پەیدا دەکات، ئەوکات پێویستەلەتێڕوانین و دادوەری کردندا بیناو بەئاگابین. هاوشێوەی ئەم هەڵەیە و بگرە کەمێك دورتریش بریتیە لەوتۆمەتانەی کە عەیب دۆزەرەوەکان لەبارەی ئیدریسی کوڕی ئیدریسی کوڕی عبداللەی کوڕی حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەسەر هەموویان بێت داویانەتەپاڵی‌و، گوتوویانە کەگوایە لەپاش مردنی باوکی لەمەغریبی سەرەوە بووەتە ئیمام و پێشەوای گەل و لەڕوی ئیرەییەوە گومانی خراپیان لەئیدریسی گەورەهەبووە و گوتویانەکەئەو لەمەولای ئەمانە بەناوی ڕاشید. خودا لەچاکەی خۆی بەدووریان بگرێت چەندەنەزانن! ! مەگەرنازانن کەئیدریسی گەورە لەکاتی مانەوەی لەنێوان بەربەرەکاندا هاوسەرگیری کردووەو لەکاتی هاتنی بۆمەغریب تاوەکو ئەوکاتەی کەدونیای بەجێهێشتووە بەردەوام لەسەر خوڕەوشتی بادیە نشینی خۆی بووە لەدەستی نەداوە؟ دەشتە کیەکانیش بەهیچ شێوەیەك نهێنی‌و خەڵەتاندن لەکاروبارەکانیاندانیەو، لەحەرەم سەراکاندا بەهۆی نزیکی ژنان و پیاوان لەیەکترەوە هەمو قسەو گفتوگۆکانی یەکتری دەبیستن و خانووەکانیشیان بەهەمان شێوەن. ڕاشید لەپاش مردنی گەورەکەی خزمەتگوزاری هەموو حەرەم سەرای لەئەستۆدابووە و لەژێردەستی دۆستان و شیعەو پەیڕەوەکانیاندا سەرقاڵی خزمەتکردن بووە. ئەوەش دەزانین کەزۆربەی بەربەرەکانی مەغریبی سەرەوە بەکۆی هەموو بۆچونەکان لەپاش مردنی باوکی بەیعەتیان داوە بە ئیدریسی بچوك‌و، لەڕووی ڕەزامەندی‌و هاوڕایی و ملکەچیان بۆئەم لەئەستۆ گرتووە تاوەکو ئاستی مەرگ و گیان بەختکردن ئەویان بەپێشەوای خۆیان زانیوە و لەپێناو سەرکەوتن و سەربەرزی ئەو داچەندین شەڕی خوێناویان کردووەو بەمەرگی سەدان کەسیان کۆتایی هاتووە.

ئەگەربهاتبایەو وەهاگومانێکیان ببیستایە، هەرچەندە هەواڵ دەرەکە دوژمنێکی گوماناوی و درۆزن بوو بێت، خۆبەلایەنی کەمەوە هەندێکیان هەردەکەوتنە سەرپێچی کردن. ئەمەلەکاتێکدا سوێند بێت بەخودا شتی واڕووی نەداوە، بەڵکو ئەم ووشانە تەنها بەنی عەباس و بەکرێ گیراوان و دوژمنانیان بەزۆری کەدەست نەمامی ئەمان بوون، بڵاویان دەکردەوە.

هۆکارەکەشی ئەوەیە لەبەر ئەوەی ئیدریسی گەورە لەپاش ڕووداوی فەخ[١٣٤] بەرەو مەغریب هەڵهات، ئەلهادی ئاماژەی بەئەغلەبیەکان کرد کەبیخەنە ژێر چاودێریەوەو لەهەموو شوێنەکاندا شۆڤاری بۆدابنێن. ئەوەبو نەیانتوانی بیگرن و بەبێ گرفت گەشتە مەغریب و لەوێدا بانگەوازەکەی ئاشکرا بوو پێشکەوتنێکی زۆری بەدەستهێنا. لەپاش ئەم ڕووداوە ڕەشید ئاگاری ئەم مەسەلەیەبویەوە کەوازیح مەولاو کارمەندی ئەو لەئەسکەندەریە بەنهێنی لەشیعە عەلەویەکانەو، بۆ ڕزگاربوونی ئیدریس لەکوشتن و لەناوچون دەستی هەبووە لەئاوارە بونیدا بۆمەغریب، هەربۆیە لەناوی بردو کوشتی. شوماخ کە لەمەوالیەکانی مەهدی باوکی بوو بەفڕوفێڵ هانیدا بۆکوشتنەکەی. شوماخ پەیوەندی کرد بەئیدریسەوە و بەشوین مەوالیەکانی خۆی واتە بەنی عەباسدا گەڕا. ئیدریس زۆر ڕێزی لێگرتو لەخۆی نزیکی کردەوە، تائەوەبوو جارێکیان شوماخ هەلی بۆهەڵکەوتوو ژەهری کردە ناو خواردنەکەیەوە و کوشتی.

---

[١٣٤] لەچاپە جیاوازەکاندا (بخ و بلخ)هاتووە ، بەڵام ڕاستەکەی (فخ)ە کەلەچاپی پاریسیشدا هەریەم جۆرەیە(بەفەتحەی فاکەو بەگوتەی خاوەنی مونتەها ئەلئەرەب شوێنێکەلەمەککە کەگۆڕی ئیبن عومەری لێیە. ڕووداوی فەخ لەزولقەعیدەی ساڵی ١٦٩ ی ك مانگی مەی ٧٨٦ ز دا ڕوویداوەو کەحەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ع)لەدژی خەلیفەی عەباسی ئەلهادی ڕاپەڕی و هێرشی کردەسەرمەککەو لەوێدا هەندێك لەئەندامانی خاندانەکەی لەدەوری خۆی کۆکردەوە کەلەنێوانیاندا مامەکانی ئەو ئیدریس و یەحیا دەبینران و حەسەن لەناوچەیەك لەدووری سێ میل لەمەدینەوە بەهۆی شەڕێکەوە لەگەڵ گروپێك لەلەشکریەکانی خەلیفەدا کوژراو ئیدریسیش لەمەیدانی جەنگەکە هەڵهات و توانی لەمیسر تێپەڕ بکات و بگاتە مەغریبی سەرەوە (مەراکیش)حاشیەی دسلان ب ١.

کاتێك هەواڵی مردنی ئیدریسی گەورە بەبەنی عەباس گەیشت زۆریان پێ خۆش بوو، چونکەهیواداربوون کوژرانی ئەو زنجیرەی بانگەوازی عەلەویەکان لەمەغریبدا دەبڕێت و میکرۆبی ئەم بانگەوازە ڕیشەکەن دەبێت، بەڵام دواتر هەواڵی سکپڕبوونی دایکی ئیدریسی بچوك دەبیستن، بەڵام هێندە گرنگ نابێت بەلایانەوە. گومانیان لەوە هەبوو ئەم لەدایك بونە کاریگەری هەبێت، بەم ڕووداوە دیسانەوە مەزهەبی شیعە لەمەغریب دەرکەوتەوە و دەوڵەتەکەیان بەهۆی ئیدریسی بچوکەوە نوێ بویەوە. ئەم پێشهاتە بۆئەوان لەبرینی تیر دەردناکتربوو، چونکە دەوڵەتی عەرەب لاواز بوبوو نەیدەتوانی کۆنترۆڵی ناوچە دوردەستەکانی خۆی بکات. ئەوپەڕی هێزی ڕەشید بەسەر ئیدریسی گەورەدا کەلەسەر زەمینێکی دورو بەوپەڕی فیزو هەواوە حکومەتی دەکردو بەربەرە کانی لەدەورکۆ بوبونەوە، ئەوەبوو کەبۆ کوشتنی ئەو دەست بکات بەپلان داڕشتن و ژەهراوی بکات. هەربۆیە عەباسیەکان بۆجێبەجێ کردنی ئەم مەبەستەیان ناچاربون پەیوەندی بەدۆستەکانیانەوە بکەن لەئەفریقا (واتەئەغلەبیەکان)و داوای وەها کارێکیان لێبکەن و ئەم گرێ کوێرەیە لەناو چەکە یاندابکەنەوە و ڕێگری لێبکەن و ئەومەترسیەی کەلەلایەن عەلەویەکانەوە لەناوچەی ئەغلەبیەکاندا لەسەر خەلافەت هەیە لەناوی بەرن و نەهێڵن ڕەگوڕیشەی لە بەردەم میسردا دەربهێنن. بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك ئەم فەرمانانە لەلایەن مەئمون و خەلیفەکانی دوای ئەوەوە بۆ ئەغلەبیەکان دەردەچوو، بەڵام ئەغلەبیەکان خۆیان زۆرپێویستیان بەهاوکاری بەربەرەکان هەبوو لەدژی سوڵتانەکانی پێشویان واتەعەباسیەکان. وە خۆیان زیاتر پێویستیان بەبەرگری هەبوو، چونکە مەوالیە ناعەرەبەکان خۆیان گەیاندبووە هەموو کونج و قوژبنێکی خەلافەتەوەو بەپێی خواستی خۆیان فەرمانەکانیان دەردەکردو ڕێڕەوی کاروباری دەوڵەتیان دەگۆڕی، هەروەك شاعیردەڵێت:

## خەلیفەیەکە لەقەفەسدا لەنێوان وەصیف و بەبەغا[١٣٥]
## هەرشتێك ئەوان پێی بڵێن وەك توتی دووبارەی دەکاتەوە

هەربۆیە ئەمیرەکانی ئەغلەبیەکان لەدروستکردنی دوژمنایەتی بێزار بوبون وبەردەوام بەهانەیان دەهێنایەوە. جارێك مەغریب و خەڵکە کەیان بەبچوك دەدایە قەڵەمو جارێکیش خەلیفەو داروەستەکەیان لەجەنگ کردن لەگەڵ ئیدریس دەترساندودەیان گوت کەگوایە ئیدریس هێرش دەکاتەسەرمانو سنورەکانمان دەبەزێنێت. وەهەروەها دراوەکانی ئیدریسیان دەخستەناو دیاریو پارەکانی باجەوە بەمەبەستی دروستکردنی ترسی ئیدریس لەدڵی خەلیفەداو، بەناڕاستەوخۆ ئەوەیان بەخەلیفەدەگوت ئەگەربێت و ناچاریان بکات کەدژا یەتی ئیدریس بکەن ئەوا لەفەرمانی هەڵدەگەڕێنەوە. لەلایەکی تریشەوە ناوو ناوبانگی ئیدریسیان لەکەدار دەکردو درۆو بوختانیان لەدژی بڵاودەکردەوەو هیچ گرنگیەکیشیان بەڕاستی و درۆی ئەوهەواڵانە نەدەدا. لەدوری نێوان خەلیفەوئەوانو منداڵانی نورس خەلیفەکانی بەنی عەباس و مەملەکەتە ناعەرەبیەکان[١٣٦] کەلەخزمەت ئەواندابوونو، هەرکەس هەرچیەکی بگوتایە وەریان دەگرت و بەهەرئاوازێکی باشو نباش سەمایان دەکردو سودیان لێ وەردەگرت. بەم شێوەیەبەردەوام بون تاوەکو زنجیرەی دەسەڵاتی ئەغلەبیەکان پساو لێکهەڵوە شایەوە.

کەواتە ئەم قسە ناشیرینانە دەگەشتنە گوێی خەڵکی و هەندێك لەوانەی کەبەدوای عەیبدا دەگەڕان گوێیان بەتیژیەوە بۆ دەگرتو دەبوونە هۆکارێك بۆ خراپە گوتنی خەلیفەکانی فاتیمی. خودا ئەوانە لەناوبەرێت کەلەشەریعەتی خودا لادەدەنو، لەم جۆرە شوێنانەدا جیاوازیەك لەنێوان شتی ڕاست وحاشا هەڵنەگرو شتی درۆو گوماناویدا نیە.

---

[١٣٥] وەصیف و بەغا دولەسەرکردەکانی تورك بون کەلەبارەگای خەلیفەدا خزمەتیان کردووە و دەسەڵاتی تەواویان بەسەر دەزگای خەلافەتدا هەبووە.

[١٣٦] (ممالك)لەچاپەکانی میسردا هەڵەیەو (ممالیك)ڕاستەکەیەتی .

ئەمەلەکاتێکدا ئیدریس لەسەر ڕاخەری باوکی خۆی گەورە بووە و بەوحوکمەی کەکوڕ لەوپێخەفەیە[١٣٧] گومانێك نامێنێتەوە، بەتایبەت کە بەپاك وبێگەرد زانینی خانەدانی پەیامی خودا لەم جۆرە تۆمەتانە لەبیروباوەڕەکانی ئیماندارانە، چونکەخودای پاکو بێگەرد ناپاکی لەخانەدانی پێغەمبەر دوورخستووەتەوەو بە کامڵ و بێگەردوپاك باسی کردون.[١٣٨] کەواتە پێخەفەکەی ئیدریس بەپێی قورئان لەهەموو پیسی و خراپەیەك بەدورە و ئەوەی بەپێچەوانەی ئەم بیرو باوەڕەوە بیربکاتەوە ئەوا باری تاوان دەخاتە سەرشانی و چووەتەناو کوفرو بیٚ باوەڕیەوە. من لەڕەتکردنەوەی ئەم تۆمەتەداقسەکەم درێژ کردەوە بۆئەوەی دەرگای هەموو گومانەکان دابخەمو، ئەوەم ویست کەبڵێم ئەوەی کەمێك هۆش و فامی هەبێت باوەڕ بەم جۆرە قسانە ناکات. هەرچەندە لەهەندێك مێژوو نوسی مەغریبەوە گێڕاویانەتەوە، بەتایبەت نەوەی ئەوانەی کەلەڕابوردودا لەخانەدانی پێغەمبەر هەڵگەڕابونەوە، وەگەرنا داوێنی ئەوانە لەم تۆمەتانە بەدورە. ڕەتکردنەوەی عەیب لەجێگەیەکدا کەعەیب مەحاڵ بێت خۆی بۆخۆی دەبێتە عەیبە، بەڵام من لەژیانی دونیادا بەرگریم لەوان کردو هیوادارم لەڕۆژی دوایدا ئەوانیش بەرگری لەمن بکەن. دەبێت ئەوەبزانین کەزۆربەی عەیب دۆزەرەوەکان لەنەسەبی ئەوخانەدانەدا، ئەوانە بون کەئیرەییان بەجێنشینی ئیدریس دەبرد، ئیتر ئەوانەی کەلەخانەدانی پێغەمبەربون یان دەخیل[١٣٩] بون، واتە ئەوکەسانەی بەڕاست یان بەدرۆ خۆیان دەگێڕنەوەسەرئەوخانەدانە، چونکە بانگەشەی ئەم نەسەبە وەك بانگەشەی بەڕێزتربونیانە بەسەرهەموو خەڵکی دونیادا و ڕێزو گەورەیی ئیدریس و خانەدانەکەی ڕێگرێکی گەورەیە لەبەردەم ناوبانگی ئەواندابەتایبەت لەفاس و شوێنەکانی تردا، چونکە گەشتبووە قۆناغێکی باڵا لەناوبانگدا بەجۆرێك بەشێوەیەکی پشتاو پشت لەپێشینانیانەوە تاوەکو ئەمان هاتووە و ماڵەکەی

---

[١٣٧] الولد للفراش.

[١٣٨] ئاماژەیە بە ئا (إنَّمایُریدُ اللهُ لِیُذهِبَ عَنکُمُ الرِّجسَ أهلَ البَیتِ وَیُطَهِّرَکُم تَطهیراً) س ٣٣ ئا ٣٣.

[١٣٩] (دخیل)کەسێکە کەدەچێتە ناو هۆزێکەوە و خۆی بداتەپاڵیان و لەوانیش نەبێت .

ئیدریسی باپیرە گەورەیان یەکەمین ماڵ بووە لەفاسداو، لەناو ماڵەکاندا دیارەو مزگەوتەکەی لەناودڵی خەڵکیدا بەیادگارماوەتەوەو لەکوچەکانیدا دیارە[١٤٠] و شمشێرەکەی لەفولکەی ناوەڕاستی گەورەی شاردا دەدرەوشێتەوە و شوێنەوارەکانی تریان کەچەندین جار گەشتونەتە ئەندازەی تەواتور[١٤١]و، لەوەش تێپەڕیان کردووە و کەم تازۆرێکیش گەشتونەتە ئاستی بینین.

کاتێك ئەوانی تریش کەخۆیان بەخانەدانی پێغەمبەر دەزانن ئەم نەسەبە ڕاست و ڕەوانە دەبینن و شان و شکۆی مەملەکەتداریان دەبینی کەلەپێشینانیانەوە لەمەغریب بۆیان بەجێ ماوە و شەرەفی خانەدانی پێغەمبەریان زیاد دەکات، لەوەدڵنیا دەبونەوە کە خۆیان لەوەها پلەو پایەیەکەوە دورن و ناگەنە کەمترین پلەی هیچکام لەوان[١٤٢]. ئەوکات هەستی ئیرەییان زۆردەبو. مەبەستی ئەمانەش لەم بانگەشەبەتاڵانە خەڵەتاندن و خۆڵ کردنەچاوی کەسانی ناشارەزایە، چونکە بەئاسانی تەسلیمی بانگەشەکانیان دەبن، ئەمە لەکاتێکدا جیاوازیەکی زۆر لەنێوان زانست[١٤٣] و گومان [١٤٤] و دڵنیایی [١٤٥]و تەسلیم بوون [١٤٦] دا هەیە. هەربۆیە هەرخانەدانێك بیانویستایە وەك ئەوان بن و خۆیان بدەنەپاڵ خانەدانی پێغەمبەر نەیاندەتوانی و ئاواتیان دەخواست کە بتوانن ئەوان لەو پلەو پایەیە بهێننە خوارەوەو بۆ ئەم مەبەستەش دەستیان دەدایە دوژمنکاری وقسە هەڵبەستن

---

[١٤٠] تەرجەمەی وشەی (دروب)کەکۆی درب و وەك دسلان دەڵێت ئێستاکەش لەبەشی ئەفریقای باشوردا بەو کۆڵانانەدەگوترێت کەبەدەرگا دادەخرێن. (تەرجەمەی دسلان)

[١٤١] خەبەری موتەواتیر ئەوفەرمودەیەکە ڕاویەکانی متمانە پێکراون وفەرمودەکە بەشێوەیەکی پوخت و بێ هەڵەو پەڵە گەشتووەتەلامان .

[١٤٢] تەرجەمەی ئەم ووتەیە (لایبلغ مداحهم ولانصیفه)

[١٤٣]-زانست چەندین پێناسەی هەیە وەك باوەڕبونی تەواو دەستکەوتنی هەرشتێك وەك خۆی ...هتد (تعریفات جرجانی)

[١٤٥] یەقین لەزاراوەی زانستدا بەوشتەدەگوترێت کەهیچ گومانێکی تێدا نەبێت و لەبیروباوەڕیشدا بێجگە لەوشتەهیچ شتێك ڕاست نیە .

[١٤٦] باوەڕبون بەفەرمانی خوداو وازهێنان لەوەی کەگونجاونیە

بۆیان و تۆمەتی نایەکسانیان [147] و دروستکردنی شوبهەو [148]لەڕا ڤەکردنەکانیاندا بۆئەوەی بەخەڵکی بڵێن کەوەك ئەوانن و بەرابەرن لەگەڵیان.

چەندە ئەم گروپە لەقۆناغی حەقیقەتەوە دوربوون، چونکە وەك دەزانین لەسەرانسەری مەغریبدا بێجگە لەخانەدانی ئیدریس هیچ خانەدانێك وەك ئەوان ڕاست و ڕۆشن نیە. گەورەکانی ئەم خانەدانە لەم سەردەمەدا لەفاسدا بەنو عیمرانن کەلەنەوەی یەحیای جوتی [149]ن کوڕی محمدی کوڕی یەحیای ئەلعەوام[150]ی کوڕی قسمی کوڕی ئیدریسی کوڕی ئیدریسن و لەگەورەکان و سەرکردەکانی خانەدانی پێغەمبەر لەقەڵەم دەدرێن و لەماڵی باپیرە گەورەیان ئیدریسدا نیشتەجێن و سەرۆکایەتیان بەسەرهەموو خەڵکی مەغریبدا شتێکی ئاشکرایە. کەبەیارمەتی خودا لەباسی ئیدریسیەکان یان ئەداریسە دا بەدورودرێژی باسی دەکەین. یەکێکی ترلەوجۆرە قسەبەتاڵانە بریتیە لەبۆچونی هەندێك زانای بیرتەسکی مەغریب سەبارەت بەئیمامی مەهدی سوڵتانو دامەزرێنەری دەوڵەتی مووەحیدان، کەلەبەئەنجام گەیاندنی یەکتاپەرستی ڕاستەقینەدا بەسیحرو جادوو تەردەستی [151] لەرووبەڕوبونەوەی (موشەبیهیان و موجەسەمیان)دا تاوانباری دەکەنو بانگەشەکانی بەدرۆدەخەنەوە. تەنانەت ئەونەسەبەشی کەمووەحیدان بەڕاستیان دەزانی دەبو بەوهۆیەوە پەیرەوی لێبکەن بەدرۆیان دخستەوە و جوڵێنەری زاناوشارەزایان لەم درۆیانەدا ئیرەیی بردنە بەپلەو پایەی ئەو، چونکە ئەوان بەگومانی

---

[147] -موساوات و موشابەهەت لەزارا وە کانی زانستی ئوصوڵی فیقهن، چونکەئیبن خەلدون لەوسەردەمەدا زۆرشارەزای زانستە ئیسلامیەکان بووە و بەدەستەواژەی فیقهی ئوصوڵی قسەی کردووە.

[149] لەچاپەکانی میسردا حوتیەو لەیەنی دا یەحیای جوتی کوڕی محمدی کوڕی یەحیای العدامە .

[150] عدام چاپی پاریس دسلان ئەم شێوازەی هەڵبژاردووە ودەنوسێت: ئیملای ڕاستەقینەی دیارنیەو لەو وەسفەیدا کەلە تەرجەمەی فەرەنسی مێژووی بکریدا کەسەبارەت بەئەفریقای باکور دەبینرێت عدامە .

[151] شعوذة، شعبذة: بەمانای تەردەستی دێت وەك سیحرو جادو کەچاوەکان دەخەڵەتێنێت (اقرب الموارد)و (غیاث)موحدان خەڵکی ئیسپانیا بە almohades ناویان دەبردن ئەوگروپەی کەبەناوی ڕەخنەگرتن لەبیرو باوەڕی موسوڵمانان بەموشەبیهی و موجەسەمیەوە ناسرابون، شۆڕشیان کرد بەپێچەوانەی ئەمانەوە نەرێیان لەچواندنو بەرجەستە بون دەکردلەزاتی خودادا (مێژووی چینەکانی ئیسلام)لین پوڵ .

خۆیان لەزانست و فتواو ئایندا‌خۆیان بەهاوشانی ئەو دەزانی و لەپاشان ئەو لەوان زیاتر پێشکەوتو، لەورووەوەی کەخەڵکی پەیڕەویان لێدەکرد و قسەکانیان پەسەند دەکرد و خەڵکێکی زۆری لێ کۆدەبویەوە و بەمەرجەع دەدرایە قەڵەم.

بەم شێوەیە ئەم بارودۆخە بۆئەوان زۆر قورس تەواو دەبوو هەربۆیە دەستیان دەکردە دژایەتی کردنی بیرو بۆچونەکانی و بەدرۆیان دەخستەوە. وە هەروەها زۆر ڕێزیان لەلای پاشاکانی لمتونە[152] (مورابیتان)هەبوو تەنها لەبەرئەوەی کەدژی ئیمامی مەهدی بوون، چونکە پاشایانی ناوبراو زۆر سادەبون و زۆریش پابەندی ئاین بون ڕێزێکی زۆریان لە زانایان دەگرت. لەم ڕووەوەپەیڕەویان لەوپاشایانە دەکردو لەدژی دوژمنەکانیان دەوەستانەوە دەمەقاڵێو موناقەشەیان لەگەڵ دەکردن. لەبەرئەوەی کەمەهدی ڕاسپاردە گەلێکی بەپێچەوانەی ئەوپاشایانەوە هێنابوو ناشیرینی دەکردن و ڕوبەڕویان دەبویەوە. زانایانیش بۆپەیڕەوی کردن لەپاشاکانی لمتونەو پشتگیری کردنیان بەشێوەیەکی بێ وێنە دژایەتی مەهدیان دەکردو لەپلەو پایەکەیان دەداو زۆر ڕقیان لێی دەبویەوە، بەڵام پلەو پایەی مەهدی لەگەڵ پلەوپایەی ئەواندا زۆرجیاواز بوو. ئەو کۆمەڵێك بارودۆخی هەبو کەلەگەڵ بۆچونەکانی ئەماندایەکی نەدەگرتەوە. چۆن دەکرێت ئەو لەگەڵ خەڵکانی تردا بەراورد بکەین؟ چونکەئەوکەسێك بوو بەڕەخنەو ئینکارکردن، ڕەفتاری گەورەکانو سەرانی دەوڵەتی لێکۆڵینەوە دەکرد و بەئیجتیهادو قوڵبونەوە لەگەڵ زاناو فەقیهەکانیاندا دەکەوتە موناقەشەوە و بانگی هەقی بەرز دەکردەوە و، بانگی دەکردن بۆئەوەی کەلەم تێکۆشانەدا هاوڕایی بکەن، ئەوەبوو لەئەنجامدا دەوڵەتی لەڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنا. ئەو دەوڵەتەی کەلە ڕوانگەی چەکو چۆڵەو سەربازەوە چەند بەرابەری شوێنکەوتووانی ئەم دەبوون، لەم نێوەندەشدا کۆمەڵێکی زۆر لەشوێنکەوتوان و یارانی مەهدی کوژران و لەناوچون، کەمەگەر تەنها خودا ژمارەکەیان بزانێت، بەتایبەت

---

[152] لە(اعلامی نوخبەالدهر).

ئەوانەیان کەبەشێوەیەکی یەکجارەکی پەیمانیان تاوەکو مردن پێدابوو ئەویان ڕزگار کردو بەم دڵسۆزی و فیداکاریەیان نزیکبونەوە لەخودایان کرایە خەڵات.

تائەوەبوو که بانگەوازەکەی مەهدی سەرکەوت بەسەرهەموو مەزهەبەکانداو بیروباوەڕەکانی ئەو لەمەغریب و ئەندەلوسدا (ئیسپانیا)بڵاوبویەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا لەڕەوشی خۆ دورخستنەوە لەخۆشیەکانی دونیای پەیڕەوی دەکردو بەئەندازەی پێویستیش گرنگی بەژیانی دونیاش دەدا، تائەوکاتەی کەدونیای بەجێهێشت. تەنانەت تاوەکو لەدونیاشدابوو منداڵەکەی خۆی نەدی کەبینینی منداڵ یەکێکە لەئاواتەکانی دایكو باوك و چاوپۆشی لەهەموو ئاوات و ئارەزووەکانی دەکرد. لێرەدا ئەوەندە دەڵێم ئەگەر ئەم هەموو خۆدورگرتن و وازهێنانەی لەدونیا لەبەر خودا نەبووایەئەی دەبێت لەبەر چی بوبێتو چ مەبەستێکی هەبوبێت؟ ئەولەهەموو خۆشیەکانی دونیا وازی هێنابوو، ئەگەریهاتبایەو بەئاوازێکی تر بیچڕیایە ئەوابانگەوازەکەی هێندە پەرەی نەدەسەند. نەریتی خودایە کەلەنێو بەندەکانیدا پێشتر ڕابوردووە [153]، بەڵام ئینکاری ئەوان سەبارەت بەنەسەبی ئەو بۆخانەدانی پێغەمبەر هیچ بەڵگەیەك نیەلەسەرئەوەی کەئەولە بانگەشەیدا بۆ وەها نەسەبێك بەدرۆ بخرێتەوە، چونکە خەڵکی ناچارنین لەنەسەبی خۆیاندا درۆبکەن. لەوانەشە زۆر ووردی بکەنەوە و بڵێن کەسەرۆکایەتی کەسێك بەسەر خەڵکانێکەوە کەلەوان نیە شتێکی نەسەلمێنراوە و ئەمەش شتێکی زۆر ڕاستە، هەروەك چۆن لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی دەکەین. ئەم پیاوە بووەتە سەرۆکی موصامیدەکانی [154] تریش و ئەوگەلە پەیڕەویان لەوو شوێنکەوتووەکانی کردووە وەك

---

[153] (سنەاللە التی قدخلت فی عبادە) س٠٤ تا ٤٨ و س ٤٨ تا ٢٣ .

[154] خاوەنی تاج العروس هێناویەتی: مصامد ، جەلاد و لێدەر لەصامیدە واتـە لێـدەر. وە (مصـمودە)هـۆزێکی بەربـەرە لەمـەغریب و پێیـان دەڵـێن مەصـامیدە کـەزۆر لەسـام هەیبـەت و ژمـارەدا زۆرن. یـاقوت لەموعجـەم ئەلبولداندا دەڵێت: موصامیدە نیسبەتەبۆ مەصمودە و ئەوهۆزە یەلەمەغریب کەبەمان ناسراون. محمدی کـوڕی تومرت خاوەنی دەعوەتی بەنی عبدالمومین لەناویاندا بووە تاوەکە مەغریب زاڵ بـووە بەسـەرزۆرێك لەووڵاتانـدا

هۆزی هرغە [155] تاوەکو سەرئەنجام فەرمانی خودای لەبانگەوازەکەیدا بەکۆتا گەیاند. لەوەلأمی ئەم ڕەخنەیەدا پێویستە ئەوە بزانین کەکاری مەهدی تەنها لەسەر نەسەبی فاتمیەکان نەبووە و خەڵکی بەهۆی ئەونەسەبەوە پە یڕەویان لێنەکردووە، بەڵکو بەهۆی عەصەبیەتی هرغیەو مەصمودیەوە بووەو درەختی نەسەبنامەکەی ناوبانگی پەیدا کردووە. ئەم نەسەبە فاتیمیەشی لای خەڵکی لەناوچووە و تەنها لای خۆیی و هۆزەکەی ناسرابوو، چونکە بۆیەکتریان دەگێڕایەوە.

کەواتە یەکەمین نەسەب زیانێك بەڕەگەزی ئەو ناگەیەنێت، چونکە پەیڕەوەکانو دۆستانی ئەوەیان نەدەزانی. هاوشێوەی ئەمەش کەیەکەمین نەسەبی کە سێك وون ببێت زۆر ڕووی داوە. هەروەك چۆن بەسەرهاتی عەرفجەو جریر لەبارەی سەرۆکایەتی بەسەربجیلەدا هەروەك ئەم مەسەلەیە وا بووە. کەچۆن عەرفەجە لەگەڵ ئەوەی کەلەبنە ڕەتدا لەهۆزی ئیزد بووە، بەڵام دراوەتە پاڵ هۆزی بجیلە. تاوەکو ڕۆژێکیان لەسەر سەرۆکایەتی لەگەڵ جەریردا دەبێتە دەمەقاڵێیان و کێشەکەیان دەبەنەلای عومەر (ڕەزای خودای لێبێت). لەم داستانەوە مرۆڤ دەتوانرێت بەڕا ستی ڕێنمایی بکرێت، چونکە خودا ڕێنمای ڕاستەقینەی مرۆڤەکانە. نزیك بوو بەهۆی درێژە پێدانی بابەتەکەوە لەمەبەستی سەرەکی دەربچین، چونکە زۆرێك لەمتمانە پێکراوان و مێژوو نوسان لەمجۆرە بابەتانەدا توشی هەڵخلیسکان بونەتەوە و بیرو فیکریان بەرەو لادان چووە. لەوسەردەمەدا هەندێك لەمێژوو نوسان دوچاری لاوازی تێڕوانین و بێئاگایی لەپێوانە کردندا بونەتەوەو هەواڵەکانیان وەك خۆیان بەبێ لێکۆڵینەوە گێڕاوەتەوەو، لەبەرهەمەکانیاندا تۆماریان کردووە بەبێ ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر بکەنو بەووردیەوە بیانگێڕنەوە،

---

تاوەکو دەعوەت و بانگەوازەکەی گەشتە کامڵبون لە (مێژووی چینەکانی سوڵتانەموسوڵمانەکان (ی ئین پول داهاتووە.

[155] ناوی یەکێك لەهۆزەکانی موصامیدەیە. صاحیب والاعلام لەپەراوێزی ((ئیبن تومرت)دا هێناویەتی و وەئەو لەهۆزی (هرغە)و (موصامیدە)بووە ئەم هۆزەش دەگەنەوە حەسەنی کوڕی سیبت (ایعلامی زرکلی).

لەئەنجامدا هونەری مێژوو سست و ئاڵۆزبووە و خوێنەرپەرێشان دەکات و وەك ئەفسانەیەکی نەخوێندەوارانە دەردەکوێت.

لەوەها هەلومەرجێکدا مێژوو نوسی بینا پێویستی بە زانینی یاساو ڕێسای نەریتی بونەوەران و جیاوازی نێوان گەلان و ناوچەکان لەڕوانگەی ژیاننامەو ڕێڕەوو شێوازە جیاوازەکان هەیە. وەهەروەها پێویستی بەزانینی ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی هەیە و پێویستە هەڵیان بسەنگێنێت گونجان و نەگونجانیان بدۆزێتەوە و لێکۆڵینەوەیان بکاتو، لەهۆکارەکانی سەرهەڵدان و لەناوچونیان بکۆڵێتەوە و شارەزاییەکی گەورەی لە ژیاننامەی سەرکردەو پێشەواکانیاندا هەبێت. لەم کاتەدا دەتوانێت هەرهەواڵێك بەویاساو ڕێسایانەی کەفێریان بووە هەڵبسەنگێنێت، ئەگەر لەگەڵ ئەویاساو ڕێسایانەدا بگونجێت ئەوا ڕاست دەردەچن و ئەگەریش نەگونجێن ئەوا پێچەوانەکەی دەردەچێت و خۆی لێیان بەدوردەگرێت. پێشینان زانستی مێژوویان بەگەررەو گرنگ وەرنەگرتووە، مەگەربەو پێوەرانە نەبێت کەباسمان کردن. بەوئەندازەیەی تەنانەت تەبەری و بوخاری و بەرلەو دوانەش ئیبن ئیسحاق و هاوشێوەکانیان لەزانایانی گەرەی نەتەوەی ئیسلام داویانە تەپاڵ خۆیان، بەڵام بێئاگابون لەزۆرێك لەنهێنیەکانی مێژوو، تاکارگەشتووەتە ئەوەی کەمێژوو زانان بەنەزان بدرێنە قەڵەم و ئەوانەشی کەزۆر شارەزای مێژوو نین و ڕۆنەچون بەناویداو تەنها شتەلاوەکیەکانیان باسکردووە بەزاناوشارەزا ئەژماربکرێن. ئەمەش وەك تێکەڵبونی گوڵەلەگەڵ دڕك و ناوەڕۆکەلەگەڵ توێکوڵ و ڕاستە لەگەڵ درۆ. سەرئەنجامی هەموو کارێکیش بۆلای خودایە[١٥٦]. یەکێکی ترلە هەڵەشاراوەکانی مێژوو ئەوەیە کەبارودۆخی گەل و نەتەوەکان بەهۆی گۆڕانی سەردەم و ڕۆژگارەوە دەگۆڕدرێن، ئەمەش وەك نەخۆشیەکی درێژخایەنە کەزۆر شاراوەو نهێنیەو تەنها بەتێپەڕبونی سەردەمە دورو درێژەکان نەبێت ڕوونادات.

---

[١٥٦] (وَإلی اللهِ عاقِبَةُ الأُمُور) س ٣١ تا ٣١.

تەنها ئەوکەسانەش نەبێت کەشارەزای گۆڕانە سروشتیەکانن و بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن هەست بەم حاڵەتە دەکەن. وەهۆکارەکەشی ئەوەیە کەچۆنیەتی دونیاو دابو نەریتی گەل و نەتەوەکان و شێوەو مەزهەبەکانیان لەسەریەك شێوازی بەردەوام نامێنێتەوە و بەپێی گوزەری سەردەم و ڕۆژگارو چەرخەکان دەگۆڕێت ولەدۆخێکەوە دەچێتەدۆخێکی ترەوە، هەروەك چۆن مرۆڤەکان و شارو سەرزەمین و وولاتان وسەر دەمە دورو درێژەکانیش بەوشێوەیە دەگۆڕدرێن. ئەوەهەرخودایە کەلەبەندەکانی خۆش دەبێت. سەردەمانێك لەجیهاندا گەلانێك دەژیان وەك: ئێرانیەکۆنەکان[157] و سریانی و نەبەتیەکان و تەبابیعەو بەنی ئیسرائیل و قیبتیەکان کەلەبارودۆخی دەوڵەت و وولات و پیشەسازی و زاراوەو، تایبەتمەندیە هاوبەشەکان لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیاندا، هەریەکەو تایبەتمەندی و چونیەتی خۆیان هەبووە و چۆنیەتی ئاوەدانیەکانیان لەجیهاندا دەدرەوشێتەوە و شوێنەوارەکانیشیان گەواهی دەری ئەم ڕاستیەیە. ئەوکات لەپاش گەلەناوبراوەکان ئێرانیانی سەردەمی دووەم و ڕۆمیو عەرەبەکان دەرکەوتنو ئەوچۆنیەتی و شێوازانەی پێشوو گۆڕان. لەپاشان ئیسلام دەرکەوت و دەوڵەتی مەزهەبی دروستکردو هەموو ئەوبارودۆخەی گۆڕی و گەشتەقۆناغێك کەتاوەکو ئەم ڕۆژگارەش داب و نەریتەکانی هێشتا لەناو خەڵکیدا هەرباون و دوایینان لەپێشینانی وەردەگرن. دواتر دەوڵەتی عەرەب و ڕۆژگاری فەرمانڕەواییان کۆتایی هات و دەسەلات کەوتە دەست شو ێنکە و تووە کانیان لەتورکەکان لەمەشریق و بەربەرەکان لەمەغریب و فەرەنگیەکان لەباکور. بەڕۆشتنی ئەوانیش گەلانێك لەناوچون و داب و نەریتەکان گۆڕان. بەشێوەیەکی گشتی شێوازی کاری هەریەکەیان لەیادەوەریەکاندا نەمایەوە. هۆکاری گشتی لە گۆڕانی داب و نەریتەکاندا ئەوەیە کەنەریتی هەر نەوەیەك شوێنکەوتەی پاشاکەیانە، هەروەك چۆن لەنمونەو پەندەکاندا هاتووە: (خەڵکی لە سە ر ئاینی پاشاکانیانن).

---

[157] مەبەست ئێرانیەکانی سەردەمی هاخامەنشیەکان و مادەکان یان قۆناغی ئەفسانەکانە.

فەرمان ڕەواو پاشاکان هەرکات بەسەردەوڵەتێکدا زاڵ بىن و کارو بارەکانیان بگرنە دەست ئەوا ناچارن داب و نەریتی ڕۆژگاری بەرلە فەرمان ڕەوایی خۆیان قبوڵ بکەن و لەکاروباری ڕۆژانەیاندا بەکاریان بهێنن، لەگەڵ ئەوەشدا نەریتی خۆشیان لەبیر نەچێت. هەربۆیە لەداب و نەریتی دەوڵەتی ئەواندا هەندێك لەجیاوازی لەگەڵ ئەوەی پێشودا دروست دەبن. دیسانەوە کاتێکیش لەپاش ئەم دەوڵەتە دەوڵەتێکی تر دێتە سەر دەسەلاَت ونەریتەکانی خۆی لەگەڵ نەریتی دەوڵەتەکەی تردا ئاوێتەبکات، بەلاَم دیسانەوە کۆمەڵێك جیاوازی ڕوودەدەن کەلەجیاوازیەکانی پێشو توندترن. ئەوکات بەم جۆرە ئەم جیاوازیانە لەدەوڵەتەکانی تردا بەردەوام بونیان دەبێتو دەبێتە هۆی دوبەرەکی و جیاوازی.

کەواتە لەگەڵ ئەوەی بەردەوام دەوڵەتو نەتەوەکان لەدەوڵەتداری و دەسەلاَتدا دەگۆڕێن داب ئەوا نەریتەکانیش دەگۆڕێن وخۆلادان لێیان شتێکی نەگونجاوە. پێوانەکردن وچاولێکەری لەسروشتە بەناوبانگەکانی مرۆڤن و بەدورنیەلەهەڵەوپەڵە و بەهۆی لەبیرچونەوەوە مرۆڤ لەئامانج و مەبەستەکەی لادەدات، چونکە بیسەر ڕوداوەکان دەبیستێت، بەلاَم بێئاگایە لەهۆکارەکانی ئەوڕوو داوانە، هەربۆیە لەیەکەمین هەلدا ئەوەی کەبیستویەتی پشت بەو ڕووداوو بەسەرهاتانەدەبەستێت و لەگەڵ بینینەکانیدا هەڵیان دەسەنگێنێت، ئەمەلەکاتێکدا وەها هەڵسەنگاندنێك لەمێژوو گۆڕانکاریەکانیدا جیاوازیەکی زۆرهەیە، هەربۆیەکەسێکی لەمشێوەیە دەکەوێتە هەڵەوە. لەشێوەی ئەم هەلاَنە ئەو بابەتەیە کەمێژوو نوسان لەبارەی حەجاجەوە گێڕاویانەتەوەو دەڵێن کەگوایە باوکی لەمامۆستاکان بووە، لەگەڵ ئەوەی کە فێرکاری لەو ڕۆژگارەدا یەکێك بووە لەهۆکارەکانی پەیداکردنی بژێوی ژیان و لەکەسانی پلەبالاَو خاندانەوە بەدورە و مامۆستا بە کەسێکی بێتواناو بێنەواو بێ ئەصلو نەسەب دەژمێردرێت[١٥٨]. دیسانەوە زۆرێك لەکەسەبێتواناکان

---

[١٥٨] ئەم تیۆرە پشتی بەنەریتی سەردەمی نەفامی عەرەب بەستوە کەلەنێوانیاندا فێکردن و فێرکاری بونی نەبووە و مامۆستایان بەکەسێکی لاواز زانیوە و، بەلاَم لەناوئێرانیەکاندا کەئیبن خەلدون خۆی باسی دەکات

کەبەپیشەوەرناسراون و لەڕێگەی پیشەوە ڕۆزی بەدەست دەهێنن (بەتەسەوری ئەوەی کەباوکی حەجاج مامۆستا بووە) پلەوپایەیەك وەردەگرێت کەشایستەی نیە، چونکە ئەوان نەوەنازانن ئەگەرهاتو مامۆستایەتی وهونەر کرایە هۆکارێك بۆ بەدەستهێنانی ژیان و گوزەران ئەوا هیچکات گەشتن بەپلەوپایەی بەرز ڕوونادات و لەتوانای کەسی ناوبراودا نیە. ئەوانە نازانن کەهونەری زانست لەسەردەمی سەرەتای ئیسلام و سەردەمەکانی هەردوو خەلافەتی بەنی ئومەییەو بەنی عەباسدا بەم شێوەیە نەبووە، بەڵکو دەبوایە زانست لەخوداوە وەربگیرێت و پیشەیەك نەبووە و ڕوانگەیەکی ڕاگەیاندنی هەبووەو ئاینیان لەڕێگەیەوە بەخەڵکی ڕاگەیاندووە، چونکە بەپێی ئەرکی ئاینی پێویست بوو ئاینەکە بەهەموو خەڵکی ڕابگەیەنرێت.

هەربۆیە زاناوبانگخوازانی ئیسلام دەستیانکردووەتە گەیاندن و فێرکردنی ئیسلام و سونەتی پێغەمبەر(ص)بەخەڵکی بەپێی بنەڕەتی پێڕاگەیاندن نەوەك لەڕێگەی فێرکردنی پیشەییەوە، چونکە قورئان کتێبی خۆیان بوو کەبۆ پێغەمبەرهاتبو هەربەو کتێبە ڕێنمایی کرابوون. ئیسلام بەئاینێك ناسرابوو بۆ ئەوان کەلەپێناویدا بجەنگن و لەناوهەموو گەلاندا ببنە خاوەن ڕێزو گەورەیی. هەربۆیە لەپێنا ویدا هەوڵ و کۆششێکی زۆریانداوە، بەجۆرێك لەلۆمەی لۆمەکەران نەترساون و لەئامانجەکەیان دوری نەخستونەتەوە. بەڵگەش لەسەرئەمە ئەو نێردراوو بانگخوازانەن لەهاوەڵان کەپێغەمبەر(ص)ڕەوانەی کردوون بەهەموو ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا بۆئەوەی ئیسلام بەخەڵکی بناسێنن و فێریان بکەن. بەم شێوەیەو دوای ئەوەی بانگەوازەکەی بلاّو بویەوە و بەتێپەڕبونی کات بارودۆخەکان گۆڕان ودەرهێنانی حوکمەشەرعیەکان لەدەقەکانەوە[159] بەهۆی زۆری و یەك

---

پیشەیەکی بەڕێز بووەو، لەپاش هاتنی ئیسلامیش شەرافەتی هەبووە بەپێی ئەم فەرمودە ناسراوە (من علمنی حرفا سیرنی عبدا)مامۆستا پلەوپایەیەکی بالاّی هەبووە.

[159] کۆی (نص)شتێکە کەتەنها یەك مانای نەبێت، بەگوتەی هەندێك نص بریتیە لەوەی کەگریمانە تەئویل هەڵنەگرێت (تعریفات جرجانی).

لەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان زۆربوون و، لەم ڕووەوە پێویستی بە یاسایەك دەکرد کەئەم بنەماو حوکمانەلەهەڵە بپارێزێت. زانست بویە مەلەکەیەك[١٦٠] کەپێویستی بە فێربون هەبووە ولەم نێوەندەشداوەك پیشەی لێهات. هەروەك چۆن لەبەشی زانست زوفێرکردندا باسی دەکەین. خاوەنانی نەژاد بونە دەوڵەت مەدارو بەناچاری دەبوایە کەسانی ترئەم ئەرکە لەئەستۆ بگرن وسەرقاڵی فێر کردنی خەڵی بن. بەم شێوەیە فێرکاری بویەپیشەیەك بۆبەدەستهێنانی ژیانی ڕۆژانە.

دەسەلاّتداران پلەوپایەو دەسەلاّتیان لەزانست بەگەورەتردەزانی و مامۆستایەتیان بەپلەیەکی نزم دەزانی و مامۆستایەتی بویە پیشەی کەسەبێتواناکان و هەرکەسێك ئەو پیشەیەی هەبووایە بەکەم سەیردەکرا، بەلاّم یوسفی باوکی حەجاج لەگەورەو سەردارانی سەقیف بووە و پلەو پایەیان لەناوعەرەبدا زۆردیارو ئاشکرایە. ئەوەی کەئەو قورئان و زانستە ئیسلامیەکانی فێری خەڵکی کردووە مەبەستی بەدەستهێنانی بژێوی ژیانی ڕۆژانە نەبووە، بەڵکو وەك جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا بۆگەیاندنی ئیسلام ئەوکارەی کردووە. یەکێکی تر لەوهەلاّنەی کەتوشی خوێنەرانی کتێبی مێژوو دەبێت لەوکاتەی کەمێژووی دادوەرەکان دەخوێننەوە بۆیان دەردەکەوێت کەئەوان سەرەڕای ئەم پلەوپایانەش لەجەنگەکانیشدا وەك لێپرسراو بەشدار بوون بەوهیوایەی کە لەم ڕێگەیەوە واتەلەڕێگەی پلەی دادوەریەوە بەبۆچونی ئەوان پلە و پۆستی بالاّ و گەورە بەدەست بهێنن و، پێیان وایە لەبەرئەوەی باوکی کوڕی ئەبی عامیری وەزیر[١٦١] هیشام[١٦٢] کەلەدژی

---

[١٦٠] سیفەتێکی ڕۆچووە بەناو دەروندا هەروەك چۆن بەهۆی کردارێکەوە بۆدەرون شێوازێك کەبەدەرونی ناوی دەبەن دێتەدی تاوەکو ئەوکاتەی کەبەخێرایی لەناوبچێت بەحاڵەت ناوی دەبەن، بەلاّم هەرکات دووبارەببێتەوەو دەرون مومارەسەی بکات و بەدەروندا بچێتەخوارەوە درەنگ لەناودەچێت و پێی دەڵێن مەلەکە و نەریت و هەڵسوکەوتیش دەتوانین بەم شێوەیە هەڵبسەنگێنین (تعریفات جر جانی).

[١٦١] ئیبن ئەبی عامیر وەزیری حوکمی ئیبنی ناصر لەسەردەمی هیشامی کوڕی حەکەمدا لەکۆتاییەکانی سەدەی چوارەمی کۆچیدا لەدژی هیشام ڕاپەڕی و بەفروفێڵ فەرمان ڕەوایی گرتەدەست ئەندەلوسی لەژێردەسەلاّتی ئەمەویەکان دەرهێنا و مەلیکو گروپەکانی ئەندەلوسیان دامەزراند .

خانەدانی خۆیان ڕاپەڕیبوو باوکی ئیبن عەباد لەپاشاکانی تەوایف ئیشبیلیە سەرقاڵی ئیشی دادوەری بون و، وەك دادوەرەکانی ئەم سەردەمە بون و نازانن کەلە ئەنجامی جیاوازی نەریتەکانەوە لەپلەی دادوەریدا چ گۆڕانکاریەك ڕویداوە (هەروەك چۆن لەبابەتی دادوەریدا لەکتێبی یەکەمدا باسی دەکەین).

ئیبن عەباد و ئیبن ئەبی عامر لەهۆزەکانی عەرەب دەژمێردران لەدەسەڵاتدارانی دەوڵەتی ئەمەوی ئەندەلوس بون و لەخاندانەکانی ئەودەوڵەتە دێنەئەژمارو پلەوپایەیان لەودەوڵەتەدا دیاربوو. ئەوان لەڕێگەی ئەودادوەریەی کەئێستە هەیە نەگەشتونەتەپلەو پایە، بەڵکو لەنەریتی فەرمانڕەوایی کۆندا کاری دادوەری تایبەت بووە بە خانەدانی ڕەگەزی کەلەهۆزو مەوالی و دەوڵەت بون. هەروەها لەوسەردەمەشدا لەمەغریب وەزارەت تایبەت بوە بەخانەدانی ڕەگەزەوە. ئەگەرسەیری لەشکرکێشی و شەڕە هاوینەکانیان[١٦٣] بکەین و ئەو پۆست و پلانەی کەبەدەستیان هێناون لەبەرچاوبگرین، ئەوە دەسەلمێت کەئەم جۆرە کارانەتەنها بۆئەو کەسانەگونجاوە کەبەئەندازەی پێویست هێزو خانەدانیان هەیەو دەتوانن بەدەستی بهێنن‌و، خەڵکی ترناتوانن وەها چانسێکیان هەبێت، بەلام بیسەر کاتێ ژیاننامەیان دەخوێنێتەوە لەم بارەیەوە دەکەوێتەهەڵەوە و سەرقاڵی ئاراستەکردنی پێچەوانەی ئەوداب ونەریتانەدەبێت. وە زۆرترئەوکەسانەش توشی ئەم هەڵانەدەبن کورتبینانی خەڵکی ئەوسەردەمەی ئەندەلوسن کەساڵانێکی دوورودرێژە عەصەبیەت ڕەگو ڕیشەی داکوتاوە، چونکە دەوڵەتی عەرەب لەناوچون و لەژیان ونەریتی عەصەبیەتی[١٦٤] دەسەلآتدارانی بەربەریش دەرچوون. هەربۆیە نەسەبی عەرەبی ئەوان بەم

---

[١٦٢] هیشامی کوڕی حەکەمی کوڕی عبدالرحمان ناصری ئەبوئەلوەلیدی موئەیدی ئەمەوی لەخەلیفەکانی دەوڵەتی ئەمەوی ٣٥٥ –٤٠٣ ك ٩٦١ – ١٠١٢ ز (ئیعلامی زرکلی ب ٣).

[١٦٣] طوایف (چاپەکانی میسرو بەیروت)هەڵە ڕاستی صەوایفی (چاپی پاریس و (ینی)یە .

[١٦٤] عەصەبیەت لەزمانەوانیدا مانای ڕە گەز پەرستی دەگەیەنێت واتە تەعەصوبی کەسێك بۆگەل و هۆزەکەی و وولآتەکەی تاوەکو دەگاتە ئاستی جەنگان لەپێناویداو گیان بەخت کردن بۆی. هەروەها بەنزیکان و خزمانی باوکیش دەگوترێت وەك باوك کوڕ باپیرە کوڕی کوڕ برای باوکودایکی کوڕوکچیان بەرەوخوار، بەلام ئیبن

شێوە یە ماوەتەوە وپارێزراوە، بەڵام هۆکاری زاڵبون و بەرژیان لەدەست داوە کە دەکاتەوە هەمان عەصەبیەت و هاوکاری کردنی یەکتری، بەڵکو ئەم گروپە وەك ژێردەستەی بێناویان لێهات و گیرۆدەی ژێردەستەیی و بەندایەتی خەڵکی بونەوەو وادەزانن ئەگەرکاروباری دەوڵەت بگر نەدەست دەتوانن لەورێگەیەوە فەرمان ڕەوایی بەدەست بهێننەوە. هەربۆیە دەبینین پیشەوەران و صەنعەتکارانیان ڕوو دەکەنە ئەم ئامانجەو هەوڵ بۆبەدەستهێنانی دەدەن، بەڵام ئەگەرکەسێك دەستبکات بەخوێندنەوەی داب و نەریت و مێژوو عەصەبیەتی ئەو هۆزو دەوڵەتانەی کەلەمەغریبدا هەبوون و شارەزای شێوازی زاڵبونیان ببێت، کەمتر لەم بارەیەوە دەکەوێتە هەڵەوە و دوچاری تیۆری ناباش دەبێت.

وەهەروەها هاو شێوەی ئەو هەڵە مێژووییانەی کەباسکران ئەو شێوازەیە کەمێژوو نوسان لەکاتی باسکرنی دەوڵەتانو ڕیزبەندی ناوی پاشاو زنجیرەی دەوڵەتەکان دەیگرنەبەرو، ناوو نەسەبی خودی پاشا ودایك و باوك و ژنەکانی و هاولەقەب وخاتیم و دادوەروحاجیب و وەزیرەکەی دەهێنن. هەموو ئەمانە چاولێکەریە لەمێژوو نوسانی بەنی ئومەییەو بەونی عەباس بەبێ ئەوەی کەلەمەبەستیان تێبگەن. لەو سەردەمەدا مێژوو نوسان مێژووەکەیان لەبەر گەورەکانیان دەنوسییەوە و منداڵەکانیشیان ئارەزومەندی زانینی سەرگوزەشتەی پێشینانی خۆیان بوون. بۆئەوەی چاویان لێبکەن و بیانکەنە

---

خەلدون بەمانایەکی فراوانتربەکاری دەهێنێت: بریتیە لەهاوکاری و یارمەتیدانی یەکتری ، ئەمەش لەنێوان کەسانێکدا ڕوو دەدات کەیەکێك لەپەیوەندەکانی ژیان بەیەکیانەوەببەستێتەوە وەك خزمایەتی نزیکو دور یان هاوئاینی وهاوڕێڕەوی لەبیروباوەڕی سیاسیدا .....هتد. کەواتە دەتوانین بڵێین کەعصەبیەت یەکێکەلەمەسەلە سروشتیەکانی دونیای بونەو پەیوەست نیە بەهیچ هۆزو گەل وڕەگەزو سەردەم و نەتەوەیەکی تایبەتەوە. (کتێبی عصرالمامون)بەرگی ١ لا ٧٦ دانراوی دکتۆراحمدفرید رفاعی و (فلسفه ابن خلدون الاجتماعیه لا ٨٣ تاوەکو ٩٦ و (تاریخ تمدن اسلامی)دکتۆرجورجی زەیدان ب ٤ چاپی میسر ل ٥٨.

سەرمەشقی خۆیان وتەنانەت لەهەڵبژاردنی پیاوانی دەوڵەت وپێدانی پلەوپۆست پێیان بەتایبەت بەمنداڵە دروستکراوەکان[165] نزیکانیشیان چاویان لێبکەن.

هەروەك چۆن لەپێشەوە ئاماژەمان پێکرد لەبەرئەوەی کەدادوەری وابەستەی دەوڵەت بووە و تایبەت بووە بەوەزیرەکانەوە، ناویان دەهێنان بەوشێوەیەی کەهەڵیان بژاردبو، دەبوایە ناوی هەموو ئەوانە و پلەو پایەکانیان دەبوولەمێژووەکەیاندا تۆمار بکردایە، بەڵام کاتێك دەزانین بارودۆخی دەوڵەتان دەگۆڕێت و لەهەر سەردەمێکدا جیاوازی گەلێکی زۆر بەبەراورد بەسەردەمەکانی ڕابوردو دێنە ئاراوە، وەئێستاکەش مەبەست لەمێژوو تایبەتکراوە بەکوڕانەوە بۆ ئەوەی کەتەنها خودی پادشاکان بناسین و لەڕوانگەی سەرکەوتن و بەهێزیانەوە دەوڵەتەکان هەڵبسەنگێنین و لەوەتێبگەین کەکام دەوڵەت و گەل زۆر بەهێزو خۆڕاگربووە و بەپێچەوانەشەوە، لێرە باسکردنی کوڕو ژن و نەخشی جوانی سەرئەنگوستیلە (مۆر)و لەقەبی قازی و وەزیرو حا جیبی سوڵتانی دەوڵەتێکی کۆن کەی پێویست دەکات؟ ئەمەلەکاتێکدایە هیچ زانیاریەکیان لەبارەی ئەصڵ و نەسەب پلەوپایەی دەوڵەتی ئەوانیان نیە، بەڵکو تەنها چاولەڕابوردوان دەکەن بەبێ ئەوەی بزانن کەمەبەستی دانەرانی ڕابوردو بزانن و لەئامانجی مێژوو هیچ زانیاریەکیان نەبێت.

ئەوەی لەم بارەیەوە دەتوانین بەگونجاوی بزانین ئەوەیە کەلەوانەیە باسکردنی ناوی ئەو وەزیرانەی کەبەرهەمی گەورەیان هەبووە و لەمێژووی پاشاکانیش بەناوبانگتر بووە لە و یاسایە ئاراوتەبکرێن، وەك: حەجاج و بەنی مەهلەب و برامکە و بەنی سەهلی کوڕی نەوبەخت و کافوری ئەخشیدی و ئیبن ئەبی عامیرو نمونەی ئەمانە. هەربۆیە ڕونکردنەوە و ئاماژە بە باپیران و مێژووی خودی ئەوان خراپ نابێت، چونکە ئەم جۆرە وەزیرانە لەڕیزی پاشاکاندان. لێرەدا بەباسکردنی خاڵێکی گرنگ قسەکەی خۆم لەم بەشەدا

---

[165] تەرجەمەی صنایع کەدسلان بە دروستکراو ناوی دەبات و دەڵێت: ئەم ووشەیان بەمانای ئەکەسانە بەکارهێناوە کەلەلایەن سوڵتان و داورودەستەکەیەوە گرنگیان پێدراوە وپارێزراون و، سوڵتان لەبێ ناویەوە ئەوانی گەیاندووەتە پلەو پایەی دەوڵەتی هەربۆیە ووشەی درو ستکراوان.

کۆتایی پێدەهێنم کەبریتیە لە: باسکردنی هەواڵی تایبەتی سەردەمێك یان گروپێك، بەڵام باسکردنی چۆنیەتیە گشتیەکانی سەرزەمین و نەژادو ڕەگەزەکان بۆمێژوو نوس وەك بناغەیەك وایە، کەزۆربەی ئامانجەکانی خۆی لەسەربنیات دەنێت و مێژووی خۆی بەهۆیانەوە ڕۆشن دەکاتەوە، مێژوو نوسانیك بوون کەئەم بابەتەیان لەدانراوەکانیاندا بەشێوەیەکی جیاو سەربەخۆ باسکردووە، هەروەك چۆن مەسعودی لەکتێبی مورووج ئەلزەهەبدا ئەم شێوازەی هەلبژاردووە.

لەوکتێبەدا بارودۆخی گەل ونەتەوەکانی لەسەردەمی خۆیدا واتەساڵی سێسەدو سی، ئیتر ناوچەکانی مەغریب یان مەشریق بن بەشێوەیەکی جوان باسی کردوون و مەزهەب و نەریتەکانیانی باسکردووە و دەستی داوەتە پیاهەڵدان بەدەشت و کێوو شارو دەریاکان و مەملەکەت و دەوڵەتەکان و تایفەکانی عەرەب و عەجەمی یەك بەیەك هێناون. هەربۆیە بەرهەمەکانی ئەو بۆمێژوو نوسان وەك ئامانجێك وەهایەکەپەیرەوی لێدەکەن‌و سەرچاوەیەکە کەلەلێکۆڵینەوەی زۆرێك لە هەواڵەکاندا پشتی پیَ دەبەستن. ئەوکات دوای مەسعودی بیکری هاتەئاراوە و ئەوشێوازەی تەنها لە (المسالك و الممالك) دا هەڵبژاردو چاوپۆشی لەداب و نەریت و مێژووی گەلان کرد، چونکە لەسەردەمی مەسعودیەوە تاوەکو سەردەمی بیکری گۆڕانکاری ئەوتۆ لەبارودۆخی گەل و نەتەوەکاندا ڕوویندا، بەڵام لەم سەردەمەدا کەکۆتایی سەدەی هەشتەمە، ئەو بارودۆخەی مەغریب کەبینیومانە بووەتە هۆی گۆڕانکاری گەلێکی گەورە و بەگشتی گۆڕاوە. لەسەرەتای سەدەی پێنجەمە وە هۆزە عەرەبەکان هێرشیان هێناو زاڵبون بەسەردانیشتوانە ڕەسەنەکەیدا، واتە بەربەرەکان داگیریان کردو لەفەرمان ڕەوایی باقی شارەکانی تردا کەلەدەستی بەربەرەکاندا مابون بونەهاوبەش.سەرەڕای ئەمەش لەنیوەی ئەم سەدەیەدا پەتایەکی کوشندە بەناوی تاعون[١٦٦] بلاّو بویەوەو خەڵکێکی زۆری لەگەل و نەتەوە و دەوڵەتانی

---

[١٦٦] پەتای ناوبراولەساڵی ١٣٤٨ ز، سەری هەڵداو یەکێك بولەترسناکترین پەتاکانی جیهان کەسەرتاسەری ئاسیاو ئەورووپاو ئەفریقای گرتەوە ودانەریش بەهۆی ئەم پەتایەوە لەناوچون .

شەرق و غەرب لەناوبردو شارستانیەتی نابوت کردو، ڕۆژگاری پیری دەوڵەتان و قۆناغی کۆتاییانی هێنایە پێشەوە. لەم ڕووەوە پاریزگاری دەوڵەتانی کەم کردەوە و سنورەکانی لەناوبردو لاوازی کردن و داب ونەریتەکانی لەناوبرد.

لەئەنجامی لەناوچونی هەزاران کەس شارستانیەت و ئاوەدانی سەرزەویان وێران کردو شارو باڵەخانە و کاروان سەراو مزگەوت...هتد وێران بون، بەکورتی تەنها خاوەنی ئاسمانەکان وزەوی دەمێنێتەوەو لەناو ناچێت[١٦٧]. وەکاتێك بارودۆخی مرۆڤ بەشێوەیەکی یەکسەرلەناوبچێت هەروەك بڵێی دروستکراوان لەبنەڕەتدا لەناوچوبن و سەرتاسەری جیهان گۆڕانی بەسەردا هاتووەو، دووبارە بونەوەران ودونیایەکی نوێ دروست بووە. هەربۆیە سەردەمی ئێمەی پێویستی بەکەسێك بوو تاوەکە چۆنیەتی وسروشتی وولآتان و ڕەگەزە جۆراوجۆرەکان بنوسێتەوە و ئەو بارودۆخ و داب و نەریتانە تۆماربکات کەبەهۆی گۆڕانی بارودۆخی خەڵکەوە گۆڕاون، ئەوشێوازەی کەمەسعودی لەسەردەمی خۆیدا هەڵبژاردووە پەیڕەوی بکات بۆئەوەی ببێتە بنەڕەت و سەرچاوەیەك کەمێژوو نوسانی داهاتوو بیکەنە سەرچاوەوپێشەنگی خۆیان. وەمن لەم کتێبەی خۆمدا تائەوجێیەی کەبتوانم ئەم ڕووداوانە لەم بەشەی مەغریبدا ئیتر بەڕاشکاوانە یان بەئاماژە لەباسکردنی هەواڵەکاندا ئاماژەی پێدەکەین. ئەمەوێت ئەم نوسینە تایبەت بکەم بەمێژووی ڕەگەزو نەژادو گەل و نەتەوە کانی مەغریب مەملەکەتەکانیەوە، بەبێ ئەوەی باس لەناوچەکانی تربکەم، چونکە شارەزای مەشریق و نەتەوەکانی نیم ولەناوکرۆکی ڕوداوەکانی نازانم. ئەو هەواڵانەشی کەگێڕدراونەتەوە بەس نین بۆچونەناو ناوەڕۆکی ئەوەی کەمن دەمەوێت. مەسعودی ئەم بەشەی کامڵ کردووە، چونکە ئەوهەروەك چۆن لەکتێبەکەیدا باسی کردووە ئاماژەشی بەگەشتە دورو درێژەکان داوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کاتێك لەمەغریب ووتاری داوە بەشێوەیەکی تەواو مافی بابەتەکەی نەداوە لەکاتێکدا لەپێش

[١٦٧] ئاماژەیە بەئایەتی (إِنَّانَحنُ نَرِثُ الأرضَ وَمَن عَلَيها).س١٩ تا ٤١.

هەموو زاناو داناکانەوە بووە[١٦٨]. سەرچاوەی هەموو زانستەکانیش خودایەو، مرۆڤ بێتواناولاوازە و ئەم دان پێدانانەش زۆرپێویستە، چونکەهەرکات خودا هاوکاری مرۆڤ بێت هەموو کاروبارەکانی ئاسان دەبن و لەهەوڵ و ماندو بونەکانی بەخت یاوەری دەبێت. ئێمەش بەیارمەتی خودا دەست دەکەین بەباسکردنی باس و بابەتەکانی ئەم نوسینەولەم کارەشدا پشت بەخودا دەبەستین.

لێرەدا پێویستە پێشەکیەك لەبارەی ئەو پیتانەوەباس بکەین کەلەزمانی عەرەبیدا بونیان نیەولەوانەیە ئەم جۆرەپیتانە لەم کتێبەدا بەکاربهێنرێن. پێویستە ئەوەبزانین کەپیتەکان لەکاتی گوتندا هەروەك چۆن دواترباسی دەکەین لەگەرووەوە دێنەدەرەوەو ئەم چۆنیەتیەش لەیەکتربڕینی ئاوازەکاندا لەگەڵ زمانە بچکۆلەدا تێدەپەڕن و، لەکاتی ئەم تێپەڕبوونەشدا ئاوازەکان دەگۆڕێن وبەجۆراوجۆر دێنە بەرچاو[١٦٩] وشەکان پەیدادەبن‌و لەیەکتر تێدەگەین. هەموو گەلان لەگوتنی ئەم پیتانەدا یەکسان نین، چونکە لەوانەیەگەلێك خاوەنی کۆمەڵێك پیت بێت کەگەلانی تر نەیانبێت هەروەکچۆن دەزانین ئەوپیتانەی کەعەرەب قسەیان پێدەکات بیست و هەشت پیتن و، عیبرانیەکانیش پیت گەلێکن کەلەزاراوەی ئێمەدا بونیان نیە. هەروەك چۆن لەزمانی ئێمەشدا کۆمەڵێك پیت هەن کەلەزمانی ئەواندا دەست ناکەون. هەریەکە لەفەرەنگی و بەربەرو تورك و گەلانی تری بێجگەلەعەرەب پیتی تایبەت بەخۆیان هەیە. ئەوکات پێویستە ئەوەبزانرێت کە ئەهلی کتێب لەعەرەبیدا بۆما نا بەخشینی پیتەبیسراو نوسراوەکان دیاریان کردوون و زاراوەیان بۆ داناوە بۆئەوەی لەبیستن و نوسیندا لەیەکتری جیابکرێنەوە، وەك دانانی ئەلیف و باو جیم و ڕاو کاف تاوەکو کۆتایی هەربیست وهەشت پیتەکەی زمانی عەرەبی. ئەگەرپیتێك بێتەبەردەمیان کەلەزمانی ئەواندا نەبێت ئەوا هەم لەنوسین و هەم لەخوێندنەوەشدا وەلا دەخرێت. هەرچەندە هەندێك لەنوسەران ئەم جۆرەپیتانە

---

[١٦٨] (وَفَوقَ كُلِّ ذِى عِلمٍ عَليم) س ١٢ ئا ٧٦.

[١٦٩] لەکتێبی (مخارج الحروف)دانراوی ئیبن سینا. وەرگێڕانی دکتۆرخانلەری.

بەشێوەیەکی پیتی لەزاراوەی ئێمەدا کە کەوتووەتەپێش یان پاش ئەوەوە وێنای دەکەن، بەڵام ئەم کارە بۆمانابەخشین بۆگوتنی پیتەکان بەس نیە، بەڵکو دەبێتە هۆی گۆڕانی بنەڕەتی پیتەکە.

لەبەرئەوەی ئەم کتێبە باسی نەتەوەی بەربەرو هەندێك لەنەتەوەکانی بێجگە لەعەرەبی تێدایە، هەربۆیە لەکاتی باسکردنیاندا هەندێك ناو یان وشە دێنە بەردەممان کەلەزمانی نوسین وزاراوەی ئێمەدا بونیان نیە، هەربۆیە ناچارین باسیان بکەین، بەڵام بۆ وێناکردنی ئەم پیتەهاوڕەگەزانەیان، هەروەك باسمان کرد بەبەسمان نەزانیوە، چونکە بەبڕوای ئێمە ئەم شێوازە بۆ گەیاندنی لەهجەی پیتەکان بەس نیە. بەڵکو شێوازێکم لەم کتێبەدا هەڵبژاردووە کەبریتیە لەوەی پیتەناعەرەبیەکان بەجۆرێك دابنێم کەلەڕووی لەهجەوە (واتە بەشی دەنگیەکەی)کەلەزمانی عەرەبیدا کەوتونەتەپێش یان پاشەوە مانابدات بۆئەوەی کەخوێنەر شێوەی مامناوەندی مەخرەجی ئەودوپیتە بتوانێت بڵێت‌و، لەهجەکەی بەباشی ئەدابکرێت. ئەم شێوازە لەشێوەی وێناکردنی پیتەکانی ئیشمام[١٧٠] لەبەرهەمەکانی قورئان خوێنان وتەجوید زانان دەرم هێناوە. وەك: (صراط) لەخوێندنەوەی خەلەفدا، چونکە ووتنی صادەکەی هاوشێوەی (ص)ی موفەخەمە[١٧١] دەبێتە ئاستی مامناوەندی صادو ظا. ئەوان لەنوسینی ئەم (ص)دا دەنوسن لەناویدا شێوەی چاد وێنادەکەن ئەمەش ئەوەدەردەخات کەزاراوەی ئەم (ص) نێوەندی نێوان صادو زایە. لەم ڕووەوە من هەرپیتێك کەگوتنەکەی دەکەوێتە نێوان دوپیتی عەرەبیەوە بەم شێوەیە وێنام کردووە، وەك کافێکی تایبەت کەلەزاراوەی بەربەرەکاندا ووتنەکەی دەکەوێتەنێوان کافی صەریح و جیم یان قافە، هەروەك چۆن ناوی تایبەتی بلکینم وەك

---

[١٧٠] اشمام بەکەسرەی هەمزەکەلەزارەوەدا وەك زمان لارکردنەوە وایە (غیاس)وەلەزاراوەی قاریئان و نەحوزاناندا مانای ئاماژەی بێ جوڵە دەگەیەنێت (اقرب الموارد)

[١٧١] لەچاپەجۆراوجۆرەکاندا مقحم یان معجم ، بەڵام دسلان لەنوسخەیC کەلەدەستی ئەودابووە مفخم ی بەباش زانیوە تفخیم لەزارلوەی قاریئاندا بەمانای فەتحەیەو دەڵێن بەپێی حەدیسەکەی حاکم (قورئان بەتفخیم دابەزیوە)و خوێندنەوەشی بەوشێوەیە خێری هەیە.

کاف نوسیوەو لەخوارەوەی یەك نوقتەی (ج)یان لەسەرەوەی یەك یان دوو نوقتەی (ق)م داناوە[١٧٢] بۆ ئەوەی ووتنەکەی لەنێوان کاف و جیم یان کاف و قاف نیشان بدەم. ئەم پیتەزیاتر لەزمانی بەربەرەکاندا بەکاردەهێنرێت و بەکارهێنانی ئەوانەلەپیتەکانی بێگانە بێجگە لەکافی ناوبراو پێویستە لەسەر ئەم پێوانەیە بێت، وەك دوو پیت لەپیتەکانی زمانی عەرەبی خۆمان کە ووتنەکەیان لەنێوان پیتی ناوبراو دایە دەنوسین. بۆئەوەی خوێنەر بزانێت لەنێوانیاندا دوپیت هەیە وەك ئەوشێوەیە بیخوێنێتەوە. بەم شێوەیە بۆ ووتنی ئەم پیتانە رێنمای راستم هەڵبژاردووە. ئەگەر بەوێناکردنی یەکێك لەهەردو سەری پیتەکەوە بەباشمان بزانیایە بەتەواوی لەمەخرەجەکەی دوردەکەوتینەوە و بەرەو مەخرەجی پیتەکەی خۆمان دەچوین و زمانی ئەوگەلەمان لەناو دەبرد، کەواتە زانینی ئەم خاڵەپێویست بوو، خوداش یارمەتیدەرمان بێت.

---

[١٧٢] لەرەسمی خەتی مەشریق و میسردا دوخاڵ لەسەردادەنێین، بەڵام لە رەسمی خەتی مەغریبدا (موریتانیا)تەنها یەك خاڵ دادەنێن (پەراوێزی دسلان لا ٧٠ ب ١.

# کتێبی یەکەم[١٧٣]

## لەبارەی سروشتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و ئەو دیاردانەی کەتێیدا دەردەکەون وەك: دەشتەکیەتی و شارنشینی[١٧٤] جیهانگیری و ژیان و گوزەران و[١٧٥] هونەرو زانستەکان و نمونەکانیان و باسکردنی هۆکارەکانیان

پێویستە ئەوەبزانین کەحەقیقەتی مێژوو هەواڵدانە لەبارەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیەوە، واتە کۆمەڵگەی جیهانی و چۆنیەتیەکانیەتی کەلە سروشتی ئەم کۆمەڵگەیەدا ڕوودەدات، وەك ترس و پێکەوەژیان و عەصەبیەتەکان و هەموو جۆرە جیهانگیریەکانی مرۆڤ و چاو بڕینی گروپێك لەگروپێکی ترو ئەوەی کەلەم عەصەبیەت و چاوتێ بڕینانەوە دروست دەبێت وەك: پێکهێنانی سەڵتەنەت و دەوڵەت و پلە و قۆناغەکانی و ئەوەی کەمرۆڤ لەهەوڵ و کۆششەکانیدا بەدەستیان دەهێنێت وەك پیشەو گوزەران و زانست و هونەرو نەریتەکانی ترکە بە هۆی سروشتی ئەم کۆمەڵگەیەوەڕوودەدات. کەتێکەڵ بونی درۆ لەگەڵ ڕاستیدا لەشتە سروشتیەکانیەتی[١٧٦] کەبەهۆی چەند هۆکارو سەبەبێکەوەیە

---

[١٧٣] لەیەنیدا بەرلەکتێبی یەکەم بەم شێوەیە: بسم اللە‌الرحمن الرحیم صلی اللە علی سیدنا محمدوعلی الەوصحبەوسلم .

[١٧٤] شارنشینی لێرەدا هاومانای ووشەی sedentaire واتەجێگیربوون و کۆچ نەکردنە.

[١٧٥] معاش ئیبن خەلدون بەو مانا گشتیەی ووشەی (اقتصاد)ی ئەمڕۆکە بەکاری هێناوە .

[١٧٦] ئاماژەیە بە (الخبر یحتمل الصدق والکذب).

لەوانەش:[177] پەیڕەوی کردن لەبۆچون و بیروباوەڕو مەزهەبەکانە، چونکە ئەگەر ڕۆحی مرۆڤ لەکاتی وەرگرتنی هەواڵدا لەسەر ڕێڕەوێکی مام ناوەندبێت لەڕوانگەی ڕاستی و ناڕاستی و وردەکاریەوە مافی خۆی پێدەدات، تاوەکو ڕاستیەکانی لەدرۆ جیا بکاتەوەو ئاشکرای بکات، بەڵام ئەگەر بیرو زەینی ئەو لای مەزهەب یان بیرو باوەڕێك بێت، ئەوا بێ وەستان هەرهەواڵێك کەدەیبیستێت ئەگەر لەگەڵ بیرو باوەڕەکەیدا گونجاوبێت قبوڵی دەکات. ئەم حەزو ئارەزو پەرستیە وەك پەردەیەك وایەکە دیدەی بەصیرەتی ئەودادەپۆشێت و لەڕەخنەو پاڵفتەکردنی هەواڵ دوری دەخاتەوەو سەرئەنجام لە گێژاوی قبوڵکردن و، گواستنەوەی هەواڵدا ڕۆدەچێت. یەکێکی ترلەو شتانەی کە لە هەواڵ دەکۆڵێتەوە بریتیە لەجرح و تعدیل[178] کەوای لێدەکات متمانەی بە گێڕەرەوەکانی هەواڵەدرۆکان هەبێت. هۆکارێکی تر بێئاگاییە لەماناو مەبەست، چونکە زۆرێك لەگێڕەرەوەکان بنجو بناغەی هەواڵەکان نازانن و بەپێی لێکدانەوەی خۆیان دەیانگێڕنەوەو دەکەونە درۆوە. یەکێکی ترلەگێڕانەوە درۆکانی هەواڵ بریتیە لە بەڕاست زانینی هەواڵ کەئەمەش زۆر باوە و زیاتر بەهۆی باوەڕبوون بە گێڕەرەوەکانەوە ڕوودەدات.

یەکێکی تریش نەزانینی چۆنیەتی جێبەجێ کردنی حاڵەتەکانە بەسەر ڕووداوەکاندا، بەهۆی ئەوەی کەهەواڵەکە بەفرۆفێڵ بەڕاست نیشان دەدەن لەگەڵ ئەوەشدا کەئەوهەواڵە درۆیەو دورەلەڕاستییەوە. یەکێکی تریش لەهۆکارەکانی گێڕانەوەی هەواڵی درۆ نزیك بونەوەی زۆرێك لەخەڵکیە لەخاوەن دەسەڵات و پلەو پایەکان لەڕێگەی پیاهەڵدان و

---

[177] دکتۆرتەهاحوسەین ئەم بەشەی وەك میتۆد یان شێوازێکی ئیبن خەلدونی لەمێژوودا داوەتەقەڵەم و، ئەوحەوت هۆکارەی کەباسی کردون لەناوسێ خاڵدا کۆی کردونەتەوە: ١-پەیڕەوی لەیەك بیروباوەڕ ٢- جرح و تعدیل ٣- نەزانینی خووخدەی کۆمەڵگا. ل ٣٧ ٤٩ ی کتێبی (فەلسەفە ابن خلدون الاجتماعیە)و (دراسات عن ابن خلدون)ل ٢٦٤ تاوەکو ٢٦٨.

[178] جرح و تعدیل شێوازێکە کەگێڕەوەکانی سوننەتی پێغەمبەر دایانهێناوەی دەبێتەهۆی لێکۆڵینەوەیەکی وورد کەپێویستەبۆبەدیهێنانی ئەمانەتی موحەدیسەکەو ڕاستیەتی لە هەواڵەکانیدا جێبەجێی بکەن.

ستایش کردنیان و بەچاکەباس کردنیان. دیارە کەوەها هەواڵگەلێك بەپێچەوانەی ڕاستیەوە بلاّو دەبێتەوە، چونکە دەرونی مرۆڤ عاشقی پیاهەڵدانەو حەزی لەئاکارە بەرزو جوانەکان نیە. یەکێکی تریش لەهۆکارەکانی بلاّوبونەوەی هەواڵی درۆ کەلەهەموویان لەپێشترەوەیە بێئاگاییە لەداب و نەریت و هەڵسوکەوتی کۆمەڵگا، چونکە هەر ڕووداوێك ئیتر خودی بێت یان ناخودی، بەناچاریەوەپێویستەخاوەنی چیەتی و شێوازی تایبەت بەخۆی بێت کەدێنە سەرڕێگەی. لەم ڕووەوە هەرکات بیسەری هەواڵ ئاگاداری چۆنیەتیو شێوازەجۆراوجۆرەکانی جیهان بێت، ئەم ئاگادار بوونەهاوکاری دەکات لەپاڵفتەکردن ودوبارە ناسینەوەی ڕاست لەدرۆ. ئەمەش ئاسانترین ڕێگایەلەم بوارەدا، چونکە بیسەران ئەوەی کەدەیبیستن دەیگێڕنەوەو خەڵکی تریش لەوانەوە ڕیوایەتی دەکەن. هەروەك چۆن مەسعودی لەبارەی ئەسکەندەرەوە هێناویەتیو دەڵێت لەبەرئەوەی کەگیانلەبەرانی دەریایی ئەویان لەدروستکردنی ئەسکەندەریە وەستاند، دارەمەیتێکی لەدار دروستکردو[179] سندوقێك لەشوشەدروستکراوی لەناویداجێگیرکردو خۆی تێدادانیشت و چووە ناو قولاّیی دەریاوەو ئەوگیانەوەرو شەیتانانەی کەلەوێدابینی وێنەی کێشان و، لەئاسن دروستی کردن و لەبەرامبەرئەوباڵەخانەیەوە دانان و کاتێك ئەو گیانەوەرانە هاتنەدەرەوەوپەیکەرەکانیان بینی ڕایان کردو بەم شێوەیە خانوەکانی شار کۆتاییان پێهات.

لەم بارەیەوە ئەفسانەیەکی دورو درێژو پڕ لە هەواڵی درۆو هەڵبەستراوو خورافی و مەحاڵ دەگێڕێتەوە، چونکەسندوقێکی شوشە چۆن دەگونجێت لەبەرامبەر شەپۆلەکانی دەریاوە خۆی ڕابگرێت؟ سەرەڕای ئەمەش پاشاکان هیچ کات کارێکی وەها ترسناك ناکەن و هەرپاشایەکیش ئەم کارەبکات خۆی دەخا تەلێواری لەناوچونەوەو خەڵکی لەدەوری دوور دەکەونەوە، چونکە دەزانن بەهۆی لەخۆبایی بوونەوە توشی

---

[179] بەشی ناوەوەی پرانتز لەچاپی پاریسە. لە(ینی)شدابەم شێوەیە(تابوت الخشب وفی باطنةصندوق).

ئەوچارەنوسەبووەتەوە و بۆتەنها ساتێکیش چاوەڕێ ناکات و لەو لەخۆبایی بوونەی پاشگەزدەبێتەوە. هۆکارێکی تری مەحاڵ بوونی ئەم بەسەرهاتەئەوەیەکە: شێوازو پەیکەری شەیتانەکان هێشتاخەڵکی نەیبینیون و ئەباسکردنەناشیرینەی کەبۆئەوان دەکرێت مەبەست بەناشیرین باسکردنیانە نەوەك ئەوەی کەبینرابن. ئەمانە هەموو ئەوڕەخنانەن کەلەم داستانە دەگیرێت، بەڵام ئەو کەموو کورتیە گەورەیەی کەلەم بەسەرهاتەدا هەیە ئەوەیە کەمرۆڤێك لەقوڵایی دەریادا بەچ شێوەیەك هەناسەدەدات، چونکە هەوای ساردلەناوسیەکانیداکەڕێککەرەوەی میزاجی سی و ڕۆحی دڵیەتی[١٨٠] نامێنێت و سەرئەنجام دەمرێت. هەرئەمەشە کە دە بێتەهۆی مردنی خەڵکانێك لەناو گەرماوەکاندا (مەبەستی گەرما وە کۆنەکانە)کاتێك دەرگاو شوێنی هەواکەی بگیرێت و، لەهەوای سارد بێبەش بێت هەم ناترو هەم ئەوکەسانەی کەلەچاڵەقوڵەکاندان بەهۆی نەمانی هەواوە لەناودەچن.

هەربۆیە کاتێك ماسی لەدەریا دەهێننە دەرەوە دەمرێت، چونکەسروشتی ئەوزۆرگەرمەو هەوای دەرەوەی دەریا بۆ ئەوڕێککردنەوەی سیەکانی بەس نیەو ئەوڕێژە ئاوەساردەی کەپێویستەبۆڕێککردنەوەی سیەکانی زۆرگەرمە. هەربۆیە هەوای گەرمی دەرەوەی ئاوەکەزاڵ دەبێت بەسەر ڕۆحی حەیوانی[١٨١] ئەوداو یەکسەردەمرێت. ئەوانەشی کەبەهۆی بورانەوە یان سەکتەوە دەمرن هەربەم هۆیەوەیە. وە لەو هەواڵە مەحاڵانەی کەمەسعودی گێڕاو یە تەوە پەیکەرەی ساریە کەلەڕومەدا[١٨٢] بووە و ساریەکان لەڕۆژێکی دیاری کراودا بەدەوریدا کۆدەبونەوەو زەیتونیان دەگرت بەدەستیانەوەو هەرلەو

---

[١٨٠] روح لەدەستەواژەی پزیشکاندا بریتیە لەهەڵمێکی نەرم کەلەدڵدا دروست دەبێت (کشاف). و هەربۆیە ناویان ناوە ڕۆحی ناودڵ .

[١٨١] ڕۆحی حەیوانی تەنێکی ناسکە هەڵگری هێزی جوڵەو هەستەوجێگەکەشی دڵە .

[١٨٢] (رومە المکرمە)لەکۆنترین و بەناوبانگترین شارەکانی جیهانەو پلەی جێنشینیەکەشی پێی گوتراوە (پترسیە)(اقرب الموارد).

زەیتونانە ڕۆنی پێویستی خۆیان دروست دەکرد. خوێنەریش دەتوانێت لەوە تێبگات کەبەدەستهێنانی ڕۆن بەم شێوەیە چەندەدورە لەڕاستی سروشتەوە. بابەتێکی تر بریتیە لەومەسەلەیەی کە بکری لەبارەی خانوو باڵەخانەکانی شاری ناوبراوەوە باسی دەکات و دەڵێت: ذات الابواب، شارێك کەچواردەورەکەی زیاترلەسی قۆناغ و دەهەزار دەروازەی هەبووە. هەروەك چۆن لەداهاتودا باسی ئەوەدەکەین کەمرۆڤەکانی ئەوشارانەی بەمەبەستی خۆحەشاردان و بەهێزکردنی قەلاّکانیان بەکاریان هێناوە. ئەم شارە لەبارودۆخێکدا بووە کەبتوانرێت بەئاسانی پاسەوانی بکرێت، چونکە بۆپارێزگاری کردنی زۆرشیاونەبووە. وەهەروەها لەوجۆرە هەوالآنەبریتین لەوهەواڵەی کەمەسعودی گێڕاویەتەوە لەبارەی شاری (مەسین)وە: لەدەشتی سجلماسەدا شاریکە کەهەموو خانووەکانی لەمس دروستکراون، کەموسای کوڕی نەسیرلەوگەشتەی کەبۆشەڕکردن لەگەڵ مەغریبدا کردویەتی بەوێدا تێپەڕیوە[١٨٣]. شاریکە کەهەموو دەروازەکانی گیراون‌و هەرکەسێك بچێتەناویەوە هاتنەدەرەوەی مەحاڵە. ئەم گوتەیە قسەی خورافە چیەکان‌و چیرۆك هەڵبەستەکانە، چونکەچەندین ڕێبوارو کاروانچی ئەم ڕێگەیان بڕیوەو چونەتەئەوشارەو شتێکی ئەوتۆی لەوشێوەشیان نەبینیوە. سەرەڕای ئەمەش هەموو ئەچۆنیەتیانەی کەلەبارەی ئەم شارەوە باسکراون مەحاڵن و بەپێی سروشتی بنیاتنانی شارەکان هەموویان ڕەت دەکرێنەوە، چونکەدروستکردنی شارێك لەئاسن وکانزاکان کەبەشێوەیەکی ڕێژەیی دەگمەنن شتێکی دورە لەڕاستیەوەو ئەقڵ گرنیە. نمونەی ئەم هەولآنەش زۆرن، هەربۆیە باشترین شێواز بۆناسینەوەو جیاکردنەوەی ڕاست لەدرۆ ئەم شێوازەی گەڕان و پاڵفتە کردنەیە، چونکە دەکەوێتەپێش زانستی جەرح و تەعدیلی گێڕەرەوەکانەوە و پشتیشی پێ نابەستێت بۆئەوەی بزانن هەواڵەکە بەشێوە یە کی

---

[١٨٣] لەهەمووںوسخەکاندا: زەفەریەها واتەدەستی بەوان گەشتووە و لە(بنی)ڕێگەکانەو ئێمەش شێوەی یەنیمان هەڵبژاردووە .

خودی گونجاوە یان نا، چونکە ئەگەربێت و هەواڵەکە مەحاڵ بێت ئەوکات گەڕانەوە بۆجەرح و تەعدیل سودێکی نابێت.

خاوەن تێڕوانینەکان یەکێك لەکەموکورتیەکانی هەواڵیان بەوە زانیوە ئەگەربێت و مانای زاراوەکە مەحاڵ بێت و بەجۆرێك ڕاڤەی بکەن کەئەقڵ و ژیری قبوڵی نەکات. هەربۆیە جەرح و تەعدیل لەڕاستیەتی هەواڵە شەرعیەکاندا خاوەن ئیعتیبارە، چونکە زۆرێك لەهەواڵە شەرعیەکان تەکلیفی ئینشائیە کەخوداکارپێکردنیانی بەواجب زانیوە. هەرئەوەی کەزانیاری لەبارەی ڕاستیانەوە بەدی بێتو، ڕێگەی زانینی ڕاستیەتیان باوەڕبونە بەگێڕەرەوەکان و عەدالەت و زەبتیان[١٨٤]، بەڵام لەڕاستیەتی هەواڵەکانی پەیوەست بەڕوداوەکان، بەناچاری دەبێت لەگەڵ ئیعتیباردا یەکبگرێتەوە، واتە هاوڕێك بێت لەگەڵ واقیعدا، لەم ڕووەوە پێویستەلەکاتی ڕوودانی ئەم جۆرە هەواڵانەدا بیربکرێتەوەو هەڵبسەنگێنرێت وئەم کارە لەم جۆرە هەواڵانەدا لەتەعدیل گرنگترو لەپێشترە، چونکەسودی ئینشا تەنها لەئینشاوە وەردەگیرێت، بەڵام سودی هەواڵیش لەخودی ئەو وەهەمەوە لەدەرەوە واتە بەبەرامبەر لەگەڵ واقیعدا دەردەهێنرێت. وەهەرکات شتەکەبەم جۆرەبێت، ئەوکات یاسای دووبارە ناسینەوەی حەق لەبەتاڵ لەبارەی گونجان یان نەگونجانی هەواڵەکانەوە بەوجۆرەدەبێت کەسەیری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و ئاوەدانی بکەین وئەم مەسەلانە لەیەکترجیابکەینەوە وبیانناسین: چونیەتی خودی و سروشتی کۆمەڵگەو ئەوەی داهاتەو بێ نرخەو ئەوەشی کەناگونجێت بۆئەو ڕوویدات. وە هەرکاتێك ئەم شێوازە بەکاربهێنین، لەجیاکردنەوەی حەق لەبەتاڵ و ڕاست لەدرۆ وەك یاسایەکی بەڵگەیی و لۆژیکی وایە کە هیچ گومانێك هەڵناگرێت، لەم کاتەدا ئەگەرلەبارەی ئەوچۆنیەتیانەی کەلە کۆمەڵگەدا ڕوودەدەن شتێك ببیستین ئەوکات

---

[١٨٤] زەبت لەدەستاودەستکردنی حەدیسدا بیستنی قسەیە بەشێوەیەکی شایستەولەپاشان تێگەشتنەلەماناکەیەکەلەوەوە وەرگیرابێت، ئەوکات هەو ڵدان بۆلەبەرکردنی و مانەوە لەسەرئەوحاڵەتە لەڕێگەی گفتوگۆوە تاوە کو ئەدای ئەوقسەیە بکەن (تعریفاتی جرجانی).

دەتوانین بەهۆی ئەوەوە باش، و، ناباش لەیەکتر جیا بکەینەوە وئەم شێوازەش دەبێتەپێوەرێکی ڕاست کەمێژوو نوسان دەتوانن لەگواستنەوەی بابەتەکاندا بەشوێن ڕێگەی ڕاست ودروستدا بگەڕێن.

ئامانجی ئێمەش لەدانانی کتێبی یەکەمی ئەم مێژووەدا هەرئەوەیە، و هەروەك بڵێی ئەم شێوازە خۆی بۆخۆی زانستێکی سەربەخۆیە، چونکەخاوەنی[١٨٥] بابەتێکە کە دەکاتە هەمان کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و ئاوەدانی. وەهەروەها خاوەن مەسەلەگەلێکە کە پێکهاتوون لەباسی چۆنیەتی و ئەوداهاتوانەی کەیەك لەدوای یەك پەیوەستن بەخودو چیەتی ئاوەدانیەوە. ئەم کارەش واتە هەبونی بابەت ومەسەلە تایبەتەکان لەتایبەتمەندی هەر زانستێکە، مانای زانستیش هەرئەمەیە ئیتر دانراوبێت یان ئەقڵی. پێویستە ئەوەش بزانین قسەکردن لەم بارەیەوە، زۆر بەسودو سەرسوڕهێنەرە و ئاگاداربون لەومەسەلانە لەدەرئەنجامی ووردەکاری و لێکۆڵینەوەی من بووە و ناکرێت لەزانستی گوتاربێژی ئەژماری بکەین[١٨٦]، چونکە بابەتی گوتاربێژی بریتین لەو گوتارە باوەڕ پێهێنەرە بەسودانە کەبۆ کەمەندکێش کردنی زۆربەی خەڵکی لەسەریەك بیرو باوەڕ یاخود پەشیمان کردنەوەیان لەهەرمەسەلەیەك بەکار دەهێنرێن، و، لەڕیزی مەسەلەی سیاسەتی مەدەنیدا نیە، چونکەسیاسەتی مەدەنی، زانستی تەگبیرو دۆزینەوەی ڕێگەچارەی ماڵ یاخود شارە بەوپێیەی کەئەخلاق و ژیری دەیخوازێت. تاوەکوخەڵکی ناچاربەپەیڕەوکردن

---

[١٨٥] بابەتی هەرزانستێك بریتیەلەومەسەلانەی کەباس لە عەواریزەکانی ئەوزانستە دەکات وەك جەستەی مرۆڤ کەبابەتی زانستی پزیشکیەو لەبارەی تەندروستی و نەخۆشیەوە دەدوێت هەروەك ووشە کەبابەتی زانستی قەواعیدی عەرەبیە، ، چونکە زانستی نەحو باس لە چۆنیەتی ئیعراب و بینای ئەوان دەکات (تعریفات جرجانی).

[١٨٦] وەناتوانرێت ئەو لەمەسەلەکانی زانستی گوتاربێژی ئەژماربکرێت لەکاتێکدا یەکێکە لەکتێبەکانی لۆژیك (ینی).

لەشێوازێك بكات كەپارێزگاری جۆرو مانەوەی دەكات، چونكە بابەتی ئەم زانستە لەگەڵ بابەتەكانی ئەم دوهونەرەدا ئیتر لەوبچن یان بەپێچەوانەوەبێت دژە.

هەربۆیە بابەتی ئەم ئامانجە زانستێكی تازە بنیات نراوە. وە سوێن دەخۆم كە ئاگاداری ئەوەنەبووم كەهیچ یەك لەزانایان لەم بارەیەوە قسەی كردبێت نازانم لەوە بێئاگابوون. ئەمەلەكاتێكدا ناتوانرێت وەهاگومانێكیان لێ بكرێت، چونكەزانستەكان فراوانن و زاناكانیش كەلەنێو گەلاندا دەركەوتون بێشومارن‌و ئەوزانستانەشی كەبەئێمەگەشتون زۆركەمترن لەوانەی كەپێمان نەگەشتوون.

كوان ئەوهەموو زانستانەی كلدانی و سریانی وخەڵكی بابل كەهیچ دەرئەنجام و شوێنەوارێكیان نەماوە. وەهەروەها زانستی قیبتیەكان و ئەوخەڵكانەشی كەلەپێش ئەوانەوە بوون چیان لێ بەسەرهاتووە؟ لەپێشینان تەنها مێژووی یۆنانیەكانمان پێگەشتووە، چونكە مەئمون خوازیاری ئەوەبووە كەزانستەكانیان وەربگێڕێتەسەرزمانی عەرەبی. هەربۆیە پارەوسامانێكی زۆری لەوپێناوەدا خەرج كرد. وەلەوانەشە نەبونی زانیاری گرنگینەدان بەمێژوو زانستی گەلانی تر بەو هۆیەوەبوبێت كەزاناكان پاش لێكۆڵینەوەیان بەشتێكی بێ سودیان زانیون و وەلایان خستبن. خوداش زاناترەوتەنها كەمێك زانست بەئێوەدراوە.[۱۸۷] لەم هونەرانەش كەبەهۆی بیركردنەوەوە بۆمان دەركەوتون، مەسەلەگەلێك دەدۆزینەوە كەزاناكانی زانستە جۆر بەجۆرەكان لەباس و بابەت و بەڵگەهێنانەوەكانیاندا لێكۆڵینەوەیان دەكەن كەلەڕووی مەبەست و بابەتەوە لەڕەگەزی مەسەلەكانی ئەم هونەرەن. هەروەك چۆن دانایان و زانایان لەسەلماندنی مەسەلەی پێغەمبەرایەتیدا باسی دەكەن و دەڵێن: مرۆڤ لەبونەوەردا بەیەكەوە هەڵسوكەوت دەكەن و پێویستیان بەحاكم و ڕێگرهەیە.

---

۱۸۷ (وَماأُوتِيتُم مِّنَ العِلمِ إِلَّاقَليلاً) س ۱۷ تا ۸۷ .

وەهەروەك چۆن زانایانی ئوصوڵی فیقە لەسەلماندنی زاراوەکاندا باسیدەکەن و دەڵێن: خەڵکی بەهۆی سروشت و هاوکاری کردنی یەکترەوە پێویستیان بەیەکتری دەبێتو قسەکردنیش ئاسانترینی ئەورێگایانەیە. هەروەك گوتەی فەقیهەکان لەشیکاری مەبەستەشەرعیەکاندا کەدەڵێن زینا هۆکاری تێکچونی نەسەب و لەناوبەری جۆری مرۆڤە. کوشتنیش بەهەمان شێوە و ستەمگەریش دەبێتەهۆی وێرانی و هەموو مەبەستەکانی شەرع کەبۆ پارێزگاری کردنی کۆمەڵگە هاتوون. کەواتە لەزانستەکانی ناوبراودا گرنگیان بەچۆنیەتی و بارودۆخی خەڵکی داوە هەروەك لەنمونانەی کەباسمان کردن دەردەکەوێت. لێرەدا هەندێك لەمەسەلەکانی زانستی کۆمەڵناسی باسدەکەین کەحەکیمەکان گرنگیەکی ئەوتۆیان پێنەداون، لەوانەش لەگوفتاری موبدان[١٨٨] بەبەهرامی کوڕی بەهرام لەچیرۆکی کوندەپەپودا کەمەسعودی گێڕاویەتیەوە ئەوەدەبینین کە: ئەی ئەوپاشا بەدەستەلآتەی کە وولآت بێجگە بەفەرمانڕەوایی ئەوو پشت بەستن بەئاین و ئەمرونەهی ئەووهێزی سوپاو سەروەت و سامان نەبێت بەهێزنابێت بەسەروەت و سامانەکەی ئەونەبێت ئاوەدانی بەدی نایەت و ئاوەدانیش نایەتەدی مەگەر بەدادگەری کەترازویەکەپەروەردگار لەناوخەڵکیدا داناوەو پاشاکان ئەو ئەرکەیان لەئەستۆدایە. لەقسەکانی ئەنەوشیرواندا بەهەمان شێوە هاتووە و دەڵێت: کەوولآت پشتی بەسوپاو سوپاش بەدارایی وخەراج و خەراج بەئاوەدانیو ئاوەدانی بەدادگەری و دادگەریش بەکردەوەجوانی کارمەندانو کردەوەجوانیش بە ڕاستکرداری وەزیران بەستووە. سەرەڕای ئەمەش لێکۆڵینەوەی پاشاکان لە کاروباری خەڵکی بەبەراورد لەگەڵ خۆیاندا بۆئەوەی دادگەری بەدی بێت و خەڵکی لێی هەڵنەگەڕێنەوە. لەوکتێبەی ئەرستۆ کەلەبارەی سیاسەتەوە لەنێوخەڵکیدا بەناوبانگە بەشێکی شیاو تایبەتکراوە بەکۆمەڵگاوە، بەڵام کامڵ نیەو لەڕوی بەڵگەوە

---

[١٨٨] نیزامی شاعیری نامور ئەم بەسەرهاتەدەباتەوە سەر ئەنەوشیروان. لا ٥٧١ ی ئەم بەرگە.

مافی بابەتەکان نەدراوە و تێکەڵ بە بابەتی تربووە. ئەولەم کتێبەدا کەئێمە لەئەنوشیروان و موبدانەوە گێڕامانەوە ئاماژەی کردووە وخستویەتیە ناویەك بارنەوە کە چە ندین بنەما لەخۆی دەگرێت: جیهان بێستانیکە کەدیوارەکەی دەوڵەتە دەوڵەتیش هێزێکە کەدەستورو نەریتی پێ زیندودەبێتەوە ودەستوریش سیاسەتێکە کەدەسەلآت جێبەجێی دەکاتو دەسەلآتیش شتێکەکەسوپا هاوکاریەتیو پێویستەسوپا کەسانێك بن، کەسەروەت و سامان زامنیان دەکات سەروەتیش ڕۆزیەکە کە ڕەعیەت فەراهەمی دەکاتو ئەمانیش دادگەری دەیانپارێزێت و پێویستەلەناوخەڵکیشدا جێبە جێ بکرێت کەواتەجیهان بێستانێکە....[189] لەپاشان بارنەدروست دەبێت کەهەشت دەستوری بەحیکمەت و سیاسین کەهەریەکەیان پەیوەستە بەوی تریانەوە و کۆتاییان دەگەڕێتەوە سەرەتایان و، لەیەك بارنەشدا پەیوەست دەبن بەیەکەوە کەکۆتاییەکەی دیارنیە. ئەرستۆ بەدۆزینەوەوداهێنان شانازی دەکات وسودەکانیان بەگەرە دەژمێرێت. ئەگەر خوێنەر قسەکانمان لەبەشی پاشاو دەوڵەتەکاندا بەووردیەوە بخوێنێتەوە ئەوادەگاتە ڕاڤەی ڕاستەقینەی ئەم یاساو دەستورانەو هەموو شتەکانی بۆ ڕوون دەبێتەوەو، خوداش ئێمەی لەوانەئاگادارکردووەتەوە بەبێ ئەوەی کەسودمان لەقسەکانی ئەرستۆ یان موبدان وەرگرتبێت. وەهەروەها لەقسەکانی ئیبن موقەفەعدا کەلەنێو پەیامەکانیدا دەیهێنان خەڵکی خاڵگەلێکی زۆرو مەسەلەسیاسیەکانی کتێبەکەی ئێمەدەتوانن بدۆز نەوە، بەڵام نەوەك وەك ئێمە بەبەڵگەو دەلیلەوە، بەڵکو ئەوقسەکانی خۆی بەشێوەی گوتار ڕازاندوەتەوە و شێوازی نامەنوسین و ڕەوانبێژی پێداون.

هەروەها قازی ئەبوبەکری تەرتوشی لەکتێبی سیراج الملوك دا بەدەور ئەم ئامانجەدا دەسوڕێتەوەو کتێبەکەی کردووە بەچەند بەشێکەوە، کەنزیکن لەبەش و بابەتەکانی ئەم

---

[189] لە(ینی)دا بابەتەکانی جیهان بێستانێکە لەلاپەڕەی ١٩ تاوەکو ٧٢ بەشێوەیەکی بارنەیی هاتووە

کتێبەی ئێمەوە، بەڵام ئەو حەقیقەتێکی بەدەست نەکەوتووە شێوازێکی ڕاستەقینەی بەکارنەهێناوە، مەسەلەکانی بەپێی پێویست نەهێناوەو بەڵگەکانی ڕۆشن نەکردووەتەوە. بەشێك بۆ مەسەلەکان دەکاتەوە، بەڵام ناچێتەناویانەوە. لەپاشان ڕووداوویەسەرهاتی زۆر دەهێنێتەوەو قسـەکانی داناو حەکیمانی ئێرانی وەك بوزورگ میهرو موبدان و داناکانی هیند و گێڕانەوەکان لەدانیال و هیرموس و گـــەورەکانی ئەخلاق دەگێڕێتەوە،



بەڵام پەردە لەسەر ڕاستیەکان لانادات و بابەتەکانی زیاتر لەئامۆژگاری دەچن هەروەك بڵێی بەرەوئامانجێك هەنگاوی ناوە، بەڵام نەچووەتە ناویەوەو بەمەبەستی خۆی نەگەشتووەو، بەشێوەیەکی گشتگیر ڕافەی نەکردون. خودای میهرەبان ئیلهامی بەمن بەخشی کەبتوانم بەم ئامانجەبگەم بەزانستێك کەچیەتی ئەم هونەرە ئەزمون بکەم و هەواڵی دڵنیاکەرەوە بەدەست بهێنم. کەواتە ئەگەر بتوانم مەسەلەکانی بگەیەنمە کەماڵ و هاوشێوەکانی لەهونەرەکانی تر جیا بکەمەوە ئەوە ڕێنمایی و سەرکەوتنێکە لەلایەن خوداوە بەمن دراوە. وە ئەگەر هەڵەیەکیش لەژماردنی مەسەلەکانیدا بکەم ئەوا پێویستە خوێنەر بەلێکۆڵینەوە ڕاستیان بکاتەوە، خوداش بۆ هەرکەس کەبیەوێت ڕێگا ڕووناك دەکاتەوە[١٩٠]. ئێمەش ئێستا لەم کتێبەدا ئەوەی لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا ڕوودەدات وەك نەریت و ڕسومی کۆمەڵگە لەووڵات و پیشەو زانست و هونەرەکان بەبەڵگەوە ئاشکرادەکەین، هەرئەوەندەی کە شێوەی لێکۆڵینەوە لەمەعریفەتایبەت و گشتیەکاندا ڕۆشن ببێتەوە و بەهۆی ئەو وەهم و خەیاڵاتانەوە لابچێت‌و گومان و دوودڵیەکان برەوێنەوە بەم شێوەیەگوتارەکەمان دەست پێدەکەین: مرۆڤ لەگیانەوەرانی تر جیاوازە بەهۆی ئەوتایبەتمەندیانەی کەهەیەتی وەك زانست‌و هونەر کەدەرئەنجامی ئەندێشەی ئەون و لەگیانەوەرانی تر جیا دەبێتەوە، هەروەك چۆن فەرمانڕەوایی کردن بەنەبونی وەهاهێزێك (ژیری)بەدی نایەت، وەئەوەی کەلەبارەی هەنگو مێروولەوە دەگوترێت ئەم تایبەتمەندیە مرۆییە هەڵناوەشێنێتەوە، چونکە ئەم گیانەوەرانە هەرچەندە لەم بوارەدا لەمرۆڤ بچن، بەڵام کارەکانیان لەڕێگەی ئیلهامەوەیە نەوەك لەڕێگەی بیرو ئەندێشەوە بێت.

یەکێکی ترلەجیاوازیەکانی مرۆڤ کەلەگیانەوەرانی تر جیای دەکاتەوە هەوڵدانیەتی لەپێناو ژیان و گوزەرانیدا و دۆزینەوەی ڕێگاکانی ئەو ئامانجە، چونکە خودا بەجۆرێك مرۆڤی دروستکردووە کەلەژیان و مانەوەدا پێویستی بەخۆراك هەیەو خوداش بۆ ئەو

---

[١٩٠] ئاماژەیە بە: (يَهدِي اللهُ بِنُورِهِ مَن يَشاء ) س النور ئا ٣٥ .

مەبەستە ڕێنمایی کردووە.هەروەك چۆن خودای گەورەدەفەرمێت: پاك و بێگەردی بۆخودایەك هەموو شتەکانی دروستکردولەپاشان ڕێنمایشی کردن[١٩١]. یەکێکی ترلەتایبەتمەندیەکانی مرۆڤ کۆمەڵگەیە واتە بەیەکەوە ژیان و کۆبوونەوە لە جێگەیەکی دیاری کراودا وەك شارو لادێ و گروپ و کۆمەڵەکان. ئەمەش بۆ هاونشینی کردنی یەکتریو جێبەجێ کردنی نیازەکانی یەکترو هاوکارییو بەدەستهێنانی ژیانی ڕۆژانەدروستکراوە، هەروەك چۆن دواتر باسی دەکەین. کۆمەڵگەجارێك لەسەرشێوەی بادیەنشینیە هەروەك چۆن لەدەشت و بیابان و شاخ وکێوەکان و کەنارەکاندادەژین. وەهەروەها جارێکیش لەسەرشێوەی شاردا دەژین و لە گوندو[١٩٢] ماڵەکاندا جێگیر دەبن، وبەهۆی دیوارو حەصارەکانەوە خۆیان لەمەترسی دەپارێزن. هەرکۆمەڵگەیەکیش بەتایبەتمەند یەکانیەوە چەندین گۆڕانکاری و پێشهاتی خودی تێیدا ڕوودەدەن. هەربۆیە بەناچار لەم کتێبەدا ئەم بابەتە دەکەین بە شەش بەشەوە:

یەکەم: لەبارەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیەوە بەگشتی و جۆرەکانی کۆمەڵگەو سەرزەمینە ئاوەدانەکان، کەئەم کۆمەڵگایانەیان تێدا دروستبون.

دووەم: لەبارەی کۆمەڵگەی دەشتەکی و باسکردنی هۆزو گەلە وەحشیەکان.

سێیەم: لەبارەی دەوڵەت و خەلافەت و پاشایی و باسکردنی پلەو پایەو پێگە دەوڵەتیەکان.

چوارەم: لەبارەی کۆمەڵگەو شارنشینی و شارەبچوك و گەورەکانەوە.

پێنجەم: لەبارەی هونەرو بژێوی و کەسابەت و پیشەو ڕێگەکانیان.

شەشەم: لەبارەی زانستەکان و چۆنیەتی بەدەستهێنانیان و فێربونیان. لەبەرئەوەی باسی کۆمەڵگەی دەشتەکیەتیم خستەپێشەوە لە بەرئەوەی ئەم شێوازەی ژیان لەهەموو

---

[١٩١] (ربَّنا الّذي أعطى كُلَّ شَيءٍ خَلَقَهُ ثُمَّ هَدى) س طة ئا ٥٢ .

[١٩٢] تەرجەمەی (مداشر)کەلەزۆربەی چاپەکاندا بە (مداسر)هاتووە ، بەڵام دسلان مەداشر ی بە باشتر زانیوە و دەڵێت ئەم ووشەیە ئێستەش لە ئەلجەزیرەدا باوە و کۆی ووشەی دشرەیە وەك مواجد کەکۆی وجدە یە (پەراوێزی دسلان لا ٨٤ ب ١). لەبنی شدا بەمداشر هاتووە.

شێوازەکانی تر لەپێشترە، هەروەك چۆن لەداهاتوودا ئاشکرایان دەکەین. وەهەروەها دروستکردنی دەوڵەت و دەسەلأتم خستەپێش دروستبونی شارە بچوك و گەورەکانەوە، بەڵام لەپێشدا باسکردنی ژیان و گوزەران بەو هۆیەوەیە کەئەم کارە لەپێویستیە سروشتیەکانە، بەڵام فێربون و زانست لایەنی کامڵ و هونەری تێدایەو، باسی هونەرەکانم لەگەڵ کەسابەت و پیشەداکرد بەوهۆیەوەبوو کەلەهەندێك شوێندا لەڕووی کۆمەڵأیەتیەوە لەپێزی ئەواندایە (هەروەك دواتر باسی لێوە دەکەین). خوداش هاوکاری ڕاستەقینەی مرۆڤەو ڕێنماکاریەتی.

# بابی یەکەم لەکتێبی یەکەم

## لەبارەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی گشتی کەلەچەند پێشەکیەك پێکهاتووە

**پێشەکی یەکەم:** لەبارەی ئەوەی کە جۆرایەتی لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا پێویستە داناکان بەم جۆرە باسیان کردووە: مرۆڤ خاوەن سروشتێکی مەدەنیە، واتە ناچارە کەکۆمەڵگەدروستبکات کەلەدەستەواژەی ئەواندا بە شارنشینی و شارستانیەت ناوزەدی دەکەن کەئاوەدانیش هەرئەمەیە. باسەکەی بەو جۆرەیە کەخودای پەروەردگار مرۆڤی دروستکرد و بەجۆرێك ڕێکی خست کەمانەوەو ژیانی پەیوەستەبەخۆراکەوە. بەشێوەیەکی سروشتی ئەوی والێکردووە بەدوای خۆراکدا بگەڕێت ولەپێکهاتەی جەستەی ئەودا توانای بەدەست خستنی خۆراکی بەدیهێناوە، بەڵام وەها دەسەڵاتێك کە یەك مرۆڤ بەتەنهایی نەتوانێت پێویستیەکانی خۆی لەخواردن فەراهەم بکات و هەموو ئەومادانەی کەبۆمانەوەی ژیانی ئەوپێویستن بەدەست بهێنێت، هەروەك چۆن ئەگەر وادابنێین کەسێك ئەو ئەندازە گەنمەی کە بۆخۆراکی یەك ڕۆژی ئەو پێویستە بیەوێت بەدەستی بهێنێت نەگونجاوە، مەگەر ئەوەی کە کۆمەڵێك کاری وەك هاڕین و بەئارد کردنو بەهەویرکردنی بۆ ئەنجام بدات و بیبرژێنێت، هەریەکەلەم سێ کردارە پێویستیان بەدەفرو

ئەشت و شتی جۆراو جۆر هەیە کەکاملْ کردن و فەراهەم کردنیان بەهاوکاری چەندین پیشەوەری وەك ئاسنگەرو دارتاش و گۆزەکەر بەئەنجام دەگەیەنرێت.

باوادابنێین ئەو دانە گەنمێك بەبیّ ئەوەی کەبیکات بەئارد بیەوێت بیخوات دیسانەوە پێویستی بە چەندین شتی تری وەك چاندن و دروێنەکردن و خەرمان کوتان دەبێت. بۆ هەریەکە لەم کارانەش پێویستی بە چەندین ئامێری پیشەسازی هەیە کەشتی بنەڕەتی و سەرەتاین و بەبیّ ئەوان کارەکەمەحاڵە و توانای کەسێك بۆ ئەنجامدانی هەموو یان هەندێك لەو کارانە بەس نیە. هەربۆیە ناچارە کۆمەڵێك هێز لەهاوشێوەکانی کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی ڕۆزی خۆیشی و ئەوانیش فەراهەم بکات. ئەوکات بەکەمێك هەرەوەزی و هاوکاری دەتوانێت زۆرترین پێداویستی ژیانی ئەوگروپەو چەندین بەرابەری ئەوانیش بەدەست بهێنێت. هەروەك چۆن هەرتاکێکی مرۆڤ بۆ بەرگریکردن لەخۆی پێویستی بەهاوکاری هاوشێوەکانی خۆی هەیە.

لەبەر ئەوەی کەخودای میهرەبان تەبعە جۆراو جۆرەکانی لەمرۆڤ و گیانلەبەراندا دروستکردووە و تواناوهێزی لەنێوانیاندا دابەشکردووە. هەروەك چۆن ئەسپی بەچەندین ئەندازە لەمرۆڤ بەهێزتر دروستکردووە و لەئەندازەی هێزدا زۆرێك لەگیانەوەرانی لەمرۆڤ بەهێزو بەتواناتر خولقاندووە وەك گاو گوێدرێژو شێرو فیل کەلەتوانادا چەندین بەرامبەری مرۆڤن. لەبەرئەوەی دەستدرێژی کردن لەناو گیانەوەراندا ئاساییە، چونکە هەریەکەیان شێوازێکی تایبەتی پیّ بەخشیوە بۆ بەرگریکردن لەخۆی، ئەمەش بەوەی کە هەریەکە ئەندامێکی تایبەتی بۆبەرگریکردن لەخۆیان پێبەخشیون بۆئەوەی بەرگری لەخۆیان بکەن. دەست و ئەندێشەی مرۆڤی لەبەرامبەر هەموو ئەمانەوە داناوە، چونکە دەست لەخزمەتی ئەندێشەدایە و ئامادەی پیشەسازیەو پیشەسازیش بۆ مرۆڤ شتانێك بەرهەم دەهێنێت کە جێگرەوەی شتەکانی بەرگری کردنی گیانەوەرانە، وەك نەیزە کەلەبری شاخی گیانلەبەرانی شاخدارو شمشێر بەکاردەهێنێت لەبری چڕنوکی گیاندارانی دڕندەو

قەڵغان کەلەبری پێستی جەستەی گیانەوەرانەو، نمونەی ئەمانە کە جالینوس کەلەکتێبی سودەکانی ئەندامەکاندا باسی کردون.

کەواتە مرۆڤ خۆی بەتەنهاو بەپشت بەستن تەنها بەهێزی جەستەیی خۆی ناتوانێت لەبەرامبەر گیانەوەرانی دڕندەوە بەرگری لەخۆی بکات، هەربۆیە پێویستی بەوە هەیە کەلەگەڵ هاوشێوەکانیدا هاوکاری بکات. تاوەکو ئەوکاتەی هاوکاریەکە بەدی نەیەت ناتوانێت نەڕۆزی پەیدابکات و نەبەرگریش لەخۆی بکات و ژیانی ئاسان نابێت، چونکە خودای بەرزو بەتوانا پێکهاتەی ئەوی بەجۆرێك دروستکردووە کەبۆ بەردەوامیدان بەژیانی پێویستی بەخۆراك هەیە. بەهۆی نەبونی چەکیشەوە ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات و دەبێتە نێچیری گیانەوەرانی ترو بەخێرایی لەناودەچێت، بەڵام ئەگەر هاوکاری هەبێت لەنێوانیاندا ئەوکات خۆراكو چەکی بەرگریەکەی فەراهەم دەبێت و حیکمەتی خودا لەمانەوەو پارێزگاری لەجۆری ئەودا دەگاتە کەماڵ. هەربۆیە کۆمەڵگا بۆ مرۆڤ زۆر پێویستە، وەگەرنا هەستی و مرۆڤ و ویستی خودا لە ئاوەدانی جیهان بەهۆی مرۆڤەوە ناگاتە کەماڵ[193].

ئەمەشە مانای کۆمەڵگە کەکردومانەتە بابەتی ئەم زانستەو ئەوقسانەشی کەلەم بارەیەوە کردومانە خۆی وەك سەلماندنی بابەتێکی ئەم هونەرە وایە کەبەسەربەخۆ باسمان کردو هەرچەندە سەلماندن لەسەرخاوەن زانستەکە پێویست نیە، چونکە لەهونەری مەنتیقدا بڕیار وایە کەداهێنەری هەرزانستێك واجب نیە لەسەری کەبابەتەکانی بسەلمێنێت، بەڵام ئەم کارەش لای ئەوان ڕێگری لێنەکراوە، کەواتە سەلماندنی شتێکی بەباش زانراوە وخوداش بەچاکەی خۆی ڕێنیشاندەرە. لەپاشان هەروەك چۆن گوتمان هەرکات ئەم کۆمەڵگەیە بۆمرۆڤ وەدی بێتو جیهان ئاوەدان ببێتەوە ئەوا بەناچاری پێویستە فەرمان ڕەوایەك لەناویاندا هەبێت کەلەستەم کردنی کۆمەڵێك لەکۆمەڵێکی تریان

---

[193] ئامازە یە بەئایەتی (إنّي جاعِلٌ فِي الأرضِ خَلِيفَة)س بقره ئا ٢٨ (هُوَالّذي جَعَلَكُم خَلائِفَ فِي الأرض )س الاعراف ئا ١٦٥

ڕێگری بکات، چونکە ئەو چەکەی کەمرۆڤ خۆی لەگیانەوەران پێ دەپارێزێت بەس نیە بۆ بەرگریکردن لەخۆی لەبەرامبەر ستەمی هاوشێوە کانیەوە. لەبەرئەوەی ئەم هۆکارانە دەست هەموان دەکەون، کەواتە دەبێت هۆکارێك بدۆزنەوە کەڕێگربێت لە دەستدرێژی بۆسەر یەکتری کەناگونجێت ئەوهۆکارە بێجگە لەئادەمیزادەکان خۆیان بن، چونکە بونەوەرانی ترلە هەست و نەستی مرۆڤەکان تێناگەن و ئەوفەرمان ڕەوایە دەبێت هەرلەخۆیان بێت بۆئەوەی کەس نەتوانێت دەستی بۆکەسانی تر درێژ بکات ئەمەش مانای پاشایە. بەم ڕاڤەیە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کەمرۆڤ خاوەن سروشتێکی تایبەتە کەهەندێك لەم تایبەتمەندیانە لەگیانەوەرانی تریشدا هەیە. هەروەك حەکیمەکان ئاماژەیان پێداوە، وەك مێش هەنگ کەلەدەرئەنجامی گەڕان و لێکۆڵینەوە دەرکەوتوە کەلەنێوان ئەوانیشدا فەرمان ڕەواو فەرمان بەرداریش هەیە و گوێڕایەڵی کردنی سەرۆکیان لەسەرپێویست کراوە کەلەبونیادی جەستەو تایبەتمەندیدا لەوان زیاترە، بەڵام ئەم تایبەتمەندیە لەغەیری مرۆڤدا بەپێی سروشت و ڕێنمایی خودایە، نەوەك بەئەندێشەو سیاسەت. ئەوبونەوەرانی دروستکردن و ڕێنمایشی کردن.

فەیلەسوفەکان کاتێك دەیانەوێت پێغەمبەرایەتی بسەلمێنن دەست دەکەن بەبەڵگە هێنانەوەی لۆژیکی و بەتایبە تمەندیەکی سروشتی مرۆڤی دەزانن. ئەم بەڵگەیەش تاوەکو کۆتاییەکەی بەم شێوەیە دەسەلمێنن کەبەناچاری مرۆڤ پێویستە لەژێر فەرمانی فەرمان ڕەوایەکدا بێت و لەپاشان دەڵێن پێویستە ئەو فەرمان ڕەوایە خاوەن شەریعەتێك بێت لەلایەن خوداوە و، مرۆڤێك هێنابێتی و ئەوکەسەش دەبێت بەهۆی بەخششە تایبەتەکانی خوداوە لەخەڵکی جیاواز بێت، بۆئەوەی کەخەڵکی شوێنی بکەونو شەریعەتو بەرنامەکەی قبوڵ بکەنو، بچنە ژێر فەرمان ڕەواییە کەیەوە تاوەکو بەتەواوەتی وەری دەگرن و کامڵ دەبێت، بەڵام ئەم بابەتە وەك ئەوەی کەدەیبینن حەکیمەکان ناتوانن بەبەڵگە بیسەلمێنن، چونکە بونی مرۆڤایەتی بەبێ هاتنی پێغەمبەرانیش شتێکی گونجاوە کەبێتەدی.

ئەکارەش لەڕێگەی کۆمەڵێك یاساو ڕێساوە کەبەهۆی بەهێزیانەوە بەسەرمرۆڤدا زاڵ دەبێت و وایان لێدەکات کەپەیڕەوی لێبکەن. خاوەنی کتێبەئاسمانیەکان و پەیڕەوانی پێغەمبەران بەبەراورد لەگەڵ ئاگرپەرستەکاندا کەپەیامی ئاسمانیان نیە زۆر کەمن، چونکە ئەوان زۆربەی خەڵکی سەرزەوی پێك دەهێنن و خاوەن دەوڵەت و کەلتوری تایبەت بەخۆیان بون و تاهەنوکەش بەوشێوەیە ژیان دەگوزەرێنن و لەهەرێمە نامام ناوەندەکانی باکورو باشور دا ژیان دەگوزەرێنن. ئەمەئەگەربێ فەرمان ڕەواو بێ یاسا بوایە نەیاندەتوانی لەژیان بەردەوام بن. بەم شێوەیە ناڕاستی تیۆری دانایان لەوەی کە (ئەگەر پێغەمبەران نەهاتنایە ژیان لەسەرزەویدا تێکدەچوو) ئاشکرا دەکات و ئەوە دەردەکەوێت کەئەم مەسەلەیە پەیوەست نیە لەگەڵ شتە لۆژیکی و ئەقڵیەکاندا و، پێویستە لەڕێگەی شەرع و پێغەمبەرایەتیەوە ڕوون ببێتەوە و بسەلمێنرێت، هەروەك چۆن شێوازی پێشینانی ئیسلام بەم شێوەیە بووە، خوداش هاوکارو ڕێنماکارە.

# پیشەکی دووەم

## لەبارەی بەشی ئاوەدان و نیشتەجێی زەوی و ئاماژە بەهەندێك لەو شتانەی کەتێیدایە: وەك دەریاکان و ڕووبارو هەرێمەکان

لەکتێبی ئەو حەکیمانەی کەلەکاروبارەکانی ژیان وورد دەبنەوە هاتووەکە: شێوەی زەوی خڕەو ئاو زۆربەی داپۆشیوە هەروەك بلێی بۆڵی ترێیەکە لەسەرئاوی دەریا، ئەوکات ئاوەکە لەتەنیشتەکانیەوە نەماوەو بەو هۆیەوە خودا ویستی کرد کەگیانەوەرانی لەسەرزەوەیدا دروستکردو، زەوی بەهۆی جۆری مرۆڤەوە کەلەجێنشینی خودا بەسەرگیانەوەرانی تردا خاوەن فەزڵە ئاوەدانی بکاتەوە. لەوانەشە واگومان ببرێت کەئاو لەژێر زەویدایە، بەڵام بەم شێوەیە نیە، بەڵکو ژێرەوەی واقیعی و سروشتی زەوی، لەناوەڕاستی تۆپەخڕەکەیدایە کەناوەندەکەیەتی بەهۆی قورسی شتەکانەوە هەموو شتەکان بەرەو ناوەڕاست ڕادەکێشرێن. شوێنەکانی تر بەکەنارەکانی زەوی دێنە ئەژمار، بەڵام ئەوئاوەی کەزەوی داپۆشیوە لەسەرەوەیەتی و ئەگەریش بگوترێت بەشێکی لەژێر زەویدایە ئەوا بەئیعتیبارو نیسبەتی لاکانی تریەتی، بەڵام ئەو بەشە لەزەوی کەئاوی پێوە نەماوە نیوەی لەسەر تۆپە خڕەکەدایەو لەسەر شێوەی بازنە کەئاولەهەموولایەکەوە دەورەی داوە.

ئەم ئاوانە کەدەریایەکی گەورەیە پێی دەڵێن زەریا و (لبلایه)بەقەڵەو کردنی لامی دووەمو، ئۆقیانوسیشی پێدەڵێن ئەم دوناوە عەجەمین بەدەریای سەوزوڕەشیش

دەگوترێت. لەپاشان پێویستە بزانین کەلەم بەشە ووشکو ئاودارەی زەویدا کەبۆ ئاوەدانیە، بیابان گەلێکی زۆر هەن کەڕوبەریان لە زەوی ئاوەدان زیاترە. وە دیسانەوە ناوچە چۆڵەکان لەلای باشوری گۆی زەویەوە زیاترەلەبەشی باکورەکەی. بەشی ئاوەدانی پارچەیەکەبەلای لایەنی باکوردا دەڕوانێت و لەسەرشێوەی ڕوبەرێکی خڕدایە لەلای باشورەوە بەهێڵی ئیستیواولەلای باکوریشەوە بە هێڵێکی خڕ کۆتایی دێت. لەپشت ئەو هێلآنەوە کۆمەڵێك کێو هەن کەوتونەتەنێوان ئاوو ئەوبەشەوە و لەنێوان ئەو دوانەشدا سەدی یەئجوجو مەئجوج هەیە، ئەم کێوانەش بەلای خۆرهەلآتدا لار بونەتەوە لەخۆرهەلآتو خۆرئاواوە بەهۆی دوو پارچە لەو بازنەی زەریاکەوە دەگاتە ئاوەکە. وەهەروەها دەڵێن بەشێك لەئاوی دەرهاتوی زەوی یان نیوە وەیان کەمتر لەنیوەی گۆی زەویە. لەم بەشەشیدا یەك لەسەر چواری ئاوەدانە. ئەمەش دەبێت بەحەوت بەشی نیشتەجێیەوە کەپێیان دەڵێن هەرێمەحەوت لایەنەکان و هێڵی ئیستیوا کەلە خۆرهەلآتەوە بۆ خۆر ئاوا درێژ بووەتەوە و زەوی کردووە بەدوبەشەوە و بەدرێژایی زەویەو گەورەترین هێڵە لەسەرزەویدا.

هەروەك چۆن ناوچەی فەلەك ئەلبوروج وبازنەی موعەدەل ئەلنەهار گەورەترین هێڵن لەفەلەکدا وناوچەی البروج دابەشدەبێت بەسەر سێسەدو شەست پلەدا و هەرپلەیەکیش لەزەویەوە پێنج فەرسەخەو هەرفەرسەخێکیش دوانزەهەزار زیراعە لەسێ میلدا، چونکە هەرمیلێك چوارهەزار زیراعەو هەر زیراعێکیش بیست و چوار پەنجەو شەش دەنکەجۆیە کەلەپاڵ یەکدا دابنرێن بەجۆرێك پشتی هەریەکەیان بلکێت بەسکی ئەوی تریانەوە. بازنەی موعەدەل ئەلنەهار کەفەلەك دابەشدەکات بەسەر دووبەشدا بەرابەرە لەگەڵ هێڵی ئیستیوای گۆی زەویدا لەگەڵ هەریە کە لە جەمسەرەکاندا نەوەد پلە نێوانیانە، بەلآم ئاوەدانی لەلای باکوری هێڵی ئیستیواوە شەست و چوار دەرەجەیە. ئەوی تریش بەهۆی زۆری سەهۆڵبەندان و سەرماوە کەسی تێدا ناژی. هەروەك چۆن بەهۆی گەرماوە زۆربەی ناوچەکانی باشور خاڵیە لەدانیشتوان، کەلەداهاتوودا بەیارمەتی خودا بەدرێژی باسیان

دەکەین. ئەوکات دەبێت ئەوە بزانین ئەوانەی کەباسی ئەو بەشە ئاوەدانەی زەویان کردووە باسی سنورو ناوچەو شارو کێوو ڕووبارو دەشت و ڕێگوزارەکانیان کردووە. وەك بتلیموس لەکتێبی جوگرافیاو خاوەنی کتێبی ڕیجر لەپاش ئەو کردویانە بەحەو ت بەشەوە کەبە هەرێمەحەوتەوانەکان ناسراون. ئەم دابەشکردنە بەسنورێکی خەیاڵی لەنێوان خۆر هەلآت و خۆر ئاوا دایە و هەرێمەناوبراوەکان لەپانیدا وەك یەکن و لەدرێژیدا جیاوازن، لەم ڕووەوە هەرێمی یەکەم لەهەرێمی دوای خۆی درێژترە و ئەوانی تریش هەربەوشێوەیە. کەوابوو هەرێمی کۆتایی لەهەموویان بچوکترە، چونکەبارودۆخی ئەو بازنەیەی کەبەهۆی نەمانی ئاوەوە لەسەرزەویدا دروستبووە ئەمەدەخوازێت. هەریەکەلەم هەرێمانە لەلای ئەوان کراوەبەدەبەشەوە لەخۆرهەلآتەوە بۆ خۆرئاوا بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك. هەربەشێکیش هەواڵی تایبەت بەخۆی هەیە لەبارەی چۆنیەتی ئەو سەرزەمینەوئاوەدانیەکەیەوە.

وەدەڵێن لەدەریای موحیتەوە لەلای خۆرئاواوە لەهەرێمی چوارەمدا دەریای ناسراوی ڕۆم جیا دەبێتەوە. بەم شێوەیە لەخەلیجەوە تەنگیەك بە پانی نزیکەی دوانزەمیل لەنێوان تەنجەو تەریفدا دەست پێدەکات و پێی دەڵێن زقاق، لەپاشان دەڕوات بەرەو خۆرهەلآت و بەئەندازەی شەش سەد میل پان دەبێت. کۆتاییەکەشی لەکۆتایی بەشی هەرێمی چوارەمدایە کەلەوێوە تاوەکو سەرەتا هەزارو شەش سەد فەرسەخەو لەکەنارەکانی شامدایەو لەلای باشوریشەوە کەوتوەتە کەنارەکانی مەغریبەوە کەیەکەمیان کەوتووەتە تەنجەی نزیکی خەلیج و ئەفریقا و بیرقە و ئەسکەندەریەوە. وەلەلای باکورەوە قوستەنتینیەی نزیکی خەلیج و لەپاشان بەشێوەی یەك لەدوای یەك وولآتەکانی بەلادیقە(ونین)و ڕۆم وفەرەنگیەکان و ئەندەلوس تاوەکو تەریف دەگرێتەوە کەنزیکەلەزوقاق و لەبەرامبەر تەنجەوەیە.

بەم دەریایەش دەڵێن ڕۆم و شام (گەدورگەگەلێکی ئاوەدانی زۆری لەخۆگرتووە) کەبریتین: ئوقریتش، قوبرص، صەقەلیە، و میورقەو سردانیە و دانیە. دەڵێن جوگرافی

زانان لەدەریای ڕۆمی هەردوو دەریای (پرلەشەپۆل و ئاوزۆر) لەهەردوو تەنگەکەوە لەلای باکورەوەجیا دەبنەوە. یەکێکیان ڕوبەڕوی قوستەنتینیەیە کەلەدەریای مەدیتەرانەوە هەروەك تەنگەیەك دەست پێدەکات و پانیەکەی بەئەندازەیەکە دەتوانی لەکەنارێکەوە بەرەو کەنارێکی تر تیرێك بهاوێژرێت. وەئەوکات کەبۆ ماوەی سێ ڕۆژ ڕێگەی دەریاوانان لەدەریای ڕۆمیەوە دوردەبێتەوەو لەدەریای مەرمەڕەوە بەرەوپێش دەڕوات دەگاتە قوستەنتینیەو، لەپاشان پانیەکەی بەئەندازەی چوارمیل فراوان دەبێت و نزیکەی شەش سەد میل درێژدەبێتەوە، لەم بارەشدا ناوی دەنێن کەنداوی قوستەنتینیە. ئەوکات لەو مەدخەلانەی کەپانیەکەیان شەش میلە درێژ دەبێتەوە بۆ دەریای نیتش کەدەریایەکە لەوێوە بۆناوچەی خۆرهەڵات لاردەبێتەوەو بەسەرزەوی هیرقیلیەدا دەڕواتو لەمەملەکەتەکانی خەزەردا کۆتایی پێدێت. لەدەمەکەیەوە تاوەکو مەملەکەتەکانی ناوبراو هەزارو سێسەدمیلە و لەهەردوو کەنارەکەیەوە گەلەکانی ڕۆم و تورك و برجان و ڕوس دەژین. دەریای دووەمیش لەهەردو کەنداوی دەریای ڕۆم و دەریای ونیزە کەلەووڵاتی ڕۆمەوە بەرەو لای باکور دەردەچێت و، هەرکاتیش بەشنتی ئنجل کۆتایی بێت لەلای خۆرئاواوە بەرەو ووڵاتی ونیز لاردەبێتەوەو لەووڵاتی ئەنکلایەدا کۆتایی دێت. لەسەرەتاکەیەوە تاوەکو ووڵاتی ناوبراو هەزارو سەدمیلە، وەبەهەردوو کەناری گەلانی وەك: ونیزیان و ڕۆمیان گەلانی تردایەو پێشی دەڵێن کەنداوی بنادیقە(ونیز). وەدەڵێن لەم دەریاکەناریەوە لەخۆرهەڵاتەوە بە سیانزە دەرەجە لە باکوری هێڵی ئیستیوا دەریایەکی گەورەو، پارچە پارچەی لێدەبێتەوە کەکەمێك بە باشوردا دەگوزەرێتو تاوەکو دەگاتە هەرێمی یەکەم.

لەپاشان بەناوئەو هەرێمەدا بەرەو خۆرئاوا دەڕواتو لەبەشی پێنجەمیدا بەحەبەشەو زنگبارو ووڵاتی باب المندب کۆتایی دێت. ماوەی ئەم ووڵاتەش لەسەرەتاکەیەوە چوارهەزارو پێنج سەد فەرسەخ دەبێت بەم دەریایەش دەڵێن دەریای چین و حەبەشەو هیند. لەلای باشوریشەوە ووڵاتی زنگبارو ووڵاتی بەڕ بەڕ لەکەنارەکانیدایە

کەئیمروئولقەیس لەشیعرەکانیدا ناوی هێناوە. ئەم بەربەرانە لەهۆزەکانی بەربەری مەغریب نین. لەپاشان شاری مەقدیشۆو شاری سفالە و سەرزەوی واق واق و چەندین گەل و نەتەوەی تر لەکەنارەکانیدا دەژین. کەواتە لەناوچەناوبراوەکاندا بێجگە دەشتە بێ ئاوەکان و ناوچەچۆڵەکان هیچی ترنیەو لەکەنارەکانی باکوری ئەم دەریایەدا لەسەرەتایدا وولاّتی چین و دواتریش وولاّتی هیند و سیند هەن. لەپاش ئەوانیش کەنارەکانی یەمەن وەك ئەحقاف و زوبەیدو نمونەی ئەمانە بوونیان هەیەو وولاّتی زنگبار لەکۆتاییە کەیدایەو دوای ئەویش حەبەشەدێت. دەڵێن لەم دەریای حەبەشیەوە دودەریای تر جیادەبنەوە: دەریای یەکەم لەبەشی کۆتایی نزیکی بابالمندبەو سەرەتا وەك تەنگەیەك دەست پێدەکات و دواتر فراوان دەبێت و بەرەو باکورو کەمێکیش بەرەوخۆرئاوادەڕوات تاوەکو دەگاتە شاری قلزم لەبەشی پێنجەمی هەرێمی دووەمدا کۆتایی دێت و، بۆماوەی هەزارو چوارسەد میل لەسەرەتای ئەوەوە دورەو پێی دەڵێن دەریای قەلزەم و دەریای سویس. وەلەوێدا لەنێوان قەلزەم و فستاتی میسردا سێ قۆناغ ڕێگەیە. وەلەلای خۆرهەلاّتەوە کەنارەکانی یەمەن و لەپاشان حیجازو جیددە بونیان هەیە و ئەوکات مەدیەن و ئایلەو فاران کەوتونەتە کۆتاییەکەیەوە.

وەلەلای خۆرئاواوە کەنارەکانی صەعیدو عیزاب و دانیشتوانی زیلع و وولاّتی حەبەشە نزیك سەرەتاکەیەتی و کۆتاییەکەشی نزیکە لەقەلزەم کەبەرامبەرە لەگەڵ دەریای ڕۆمدا لەنزیك عەریش. لەنێوان هەردوو خاڵی ناوبراودا شەش قۆناغ ماوە هەیە کەسوڵتانەکانی ئیسلام و پاشایانی پێشووی ئەوناوچەیە لەهەلدا بوون کە ئەو ماوەیە ببڕن، بەلاّم ئەم کارە نەگەشتەکۆتایی. وەهەروەها دەریای دووەم کەلەدەریای حەبەشە جیا دەبێتەوە بەکەنداوی سەوز ناسراوە[١٩٤]. ئەم دەریایە لەنێوان کیشوەری سیندوئەحقافی یەمەنەوە جیادەبێتەوە بەرەولای باکور بەکەمێك لاربوونەوە بەمەغریبدا تێدەپەڕێت و تاوەکو دەگاتە ئەبلە لەکەنارەکانی بەصرە کە کەوتووەتە بەشی شەشەمی هەرێمی دووەم و

---

[١٩٤] مەبەستی دورگەی عەرەبیە.

ماوەی چوارسەدو چل فەرسەخە. لەسەرەتاکەیەوە و پێی دەڵێن دەریای فارس. وەلەلای خۆرهەڵاتەوە، کەنارەکانی سیندو مەکران و کرمان و فارس لەوێدان. ئەبلە لەکۆتاییەکەیانەوەیە. وەلەلای خۆرئاواوە کەنارەکانی بەحرەین و یەمامەو عومان و شەحرو ئەحقاف کەوتونەتە سەرەتاکەیەوە. لەنێوان دەریای فارس و قەلزەم و دورگەی عەرەبیدایە هەروەك پێشکەوتنی ووشکانیەلەدەریادا کەلەباشوری دەریای حەبەشەداو لەخۆرئاواوە دەریای قلزم و لەخۆرهەڵاتەوە دەریای فارس دەورەیان داوە و ئەوبەشە ووشکەی کەبەئەندازەی هەزارو پێنج سەدمیلەو کەوتووەتە نێوان شام وبەصرەوەو بەعێراق کۆتایی دێت و لەم نێوەندەشدا کوفەوقادسیەوبەغدادو ئیوان و مەدائین و حیرە بونیان هەیە لەکۆتاییەکەشیدا گەلە عەجەمەکانی وەك: تورکەکان و خەزەرانو چەندگەلێکی ترهەن. وەلەلای خۆرئاواوە دورگەی عەرەبی وولاتی حیجازو لەلای خۆرهەڵاتیشەوە یەمامەو بەحرەینو عومانو لەباشوریشدا وولاتی یەمەنەو کەنارەکانیشی کەوتونەتە سەردەریای حەبەشە.

وەدەڵێن لەم بەشە ئاوەدانەدا دەریایەکی ترهەیە کەلەدەریاکانی تر جیاوازەو کەوتوەتە ناوچەی دیلمان لەباکور و پێی دەڵێن دەریای گورگان و تەبەرستان. درێژیەکەی هەزارمیلەو پانیەکەشی شەش سەد میلە لەلای خۆرئاواشیەوە ئازەربایجان و دیلم و لەخۆر هەلا تیشەوە سەرزەوی تورکەکان و خوارەزمیەکان، و لەباشورەوە وولاتی تەبەرستان و لەباکوریشەوە سەر زەوی خەزەران و لانەکانی تێدایە. ئەمانە تەواوی ئەو دەریا بەناوبانگانەن کەجوگرافی زانان باسیان کردووە. دەڵێن لەبەشی ئاوەدانی جیهاندا ڕووبارگەلێکی زۆرهەن کەگەورەترینیان چهار ڕوودە بەم شێوەیە: نیل، فورات، دیجلەو، ڕووباری بەلَخ کەناسراوە بەجەیحون، بەلام سەرەتای ڕووباری نیل لەشاخێکی گەورەوە دەست پێدەکات کە شانزە پلە کەوتووەتەپشت هێڵی ئیستیواو، لە ڕووبەڕوی بەشی چوارەمی هەرێمی یەکەمدایە و پێی دەڵێن کێوی قەمەر، کەلەسەر زەویدا شاخی لەو بەرزتر دەر نەکەوتووە. سەرچاوەی ئاوی زۆری لێوە دەردەچێت کەهەندێکیان دەڕژێنە

دەریاچەیەکەوە لەو ناوچەیەدا و هەندێکی تریشیان دەڕژێنە دەریاچەیەکی ترەوە. لەپاشان ڕووبارگەلێك لەهەردو دەریاچەوە دەردەچن کەهەموویان لەیەك دەریاچەی نزیك هێڵی ئیستیوا بەئەندازەی دەجێگەی کۆڵ و بار لەشاخی ناوبراوەوە دەڕژێن و لەم دەریاچەشەوە دوو ڕووبار دەردەچن، کەیەکێکیان بەرەولای باکور دەڕوات و بەکێوی نەویەدا تێدەپەڕێت و دەگاتە وولاتی میسر.کاتێکیش لەمیسر واتە قاهیرەی کۆن تێپەڕ دەبێت، دەبێتە چەند لقێکی نزیك لەیەکترەوە کەهەریەکەیان پێی دەڵێن کەنداوی نەهر و هەمووشیان لەنزیك ئەسکەندەریەوە دەڕژێنە ناو دەریای ڕۆمەوە و پێی دەڵێن نیلی میسر. وەلەناوچەی خۆرهەڵاتیەوە صەعید و لەبەشەکانی خۆرئاواشەوە واحەکانن. ڕووبارێکی تریش کە لەدەریاچەی ناوبراوەوە دەردەچێت و بەرەو خۆرئاوادەڕواتو بەلایدا بەردەوام دەڕوات تاوەکو دەڕژێتەناو دەریای موحیتەوە، کەپێی دەڵێن نیلی سودان، کەزۆربەی گەلە ڕەش پێستەکان لەهەردوو کەناریەوە دەژین، بەڵام فورات لە وولاتی ئەرمەنستان لەبەشی شەشەمی هەرێمی پێنجەمەوە سەرچاوەدەگرێت و بەرەو باشور دەڕوات و لە وولاتی ڕۆم و ملَتیە تاوەکو مەنبەج تێپەڕ دەکات، لەپاشان بەشێوەیەکی ڕێك لەصەفەین و ڕیقەو کوفەوە تێپەڕدەکات و دەگاتەگۆماوێ لەنێوان بەصرە و واسیتدا و کۆتایی دێت و لەوێدا دەڕژێتە ناو دەریای حەبەشەوە، لەڕێگەدا چەندین ڕووباری زۆری تێکەڵ دەبن و ڕووبار گەلێکی تری لێ جیادەبێتەوەو دەڕژێنە ناو دیجلەوە. وەسەرچاوەی ڕووباری دیجلەش لەسەرچاوەیەکەوەیە کەکەوتووەتە وولاتی خەلاتی ئەرمەنستانەوە کەلەلای باشورەوە بە موصڵ وئازەربایجان و بەغداد تاوەکو واسیت دەڕوات و لەپاشان دەبێتە چەند لقێکەوە کەهەموویان دەڕژێنە دەریاچەی بەصرەوە. سەرئەنجام لەدەریای فارسدا کۆتایی دێت.

ڕووباری دیجلەش کەوتووەتەلای خۆرهەڵاتی ڕووباری فوراتەوە کە چەندین ڕووبار دەچنەوە سەری. وەلەنێوان فورات و دیجلەدا لەسەرەتاکەیەوە دورگەی موصڵ هەیەکەلەهەردووکەناری فوراتی ڕوبەڕوی شام لەکەناری دیجلەدا بەرامبەر ئازەربایجانە.

وە سەرەتای ڕووباری جەیحون لەبەڵخ، کەوتوەتە بەشی هەشتەمی هەرێمی سێیەمەوە. لەوسەرچاوانەیە کەلەوێدان سەرچاوەدەگرێت و ڕووبار گەلێکی زۆری دێنەسەر. لەباشورەوە بەرەو باکور دەڕوات و بەناوچەکانی خوراساندا تێدەپەڕێت و لەپاشان دەردەچێت و دەگاتە وولآتی خوارەزم کەلە بەشی هەشتەمی هەرێمی پێنجەمدایەو دەڕژێتەدەریاچەی جورجانیە کە کەوتووەتە خواروی شارێکەوە بەهەمان ناوەوە. درێژیو پانی ئەم دەریاچەیە بەئەندازەی یەك مانگ ڕێگەیە. وە ڕووبارەکانی فەرغانەوچاچ (سیحون)کەلەوولآتی تورکەوە دێن دەڕژێنە ناویەوە. وەهەروەها وولآتەکانی خوراسان و خوارەزم لەلای خۆرئاواو شارەکانی بوخاراو ترمزو سەمەرقەند لەلای خۆرهەلآتی جەیحونەوەیە. وەلەوێوە تاوەکو ماوەرای جەیحون وولآتی تورکو فرغانەو خزلجی و ناوچەکانی تری نەتەوە عەجەمەکانە. هەموو ئەم بابەتانەش بەتلیموس لەکتێبەکەیدا باسیکردوون‌و وە هەم شەریفیش لەکتێبی ڕوجردا هێناویەتی. لە جوگرافیادا نەخشەگەلێکیان وێناکردووە کەهەمووکێوو دەریاو ڕووبارو ناوچەنیشتەجێکان نیشان دەدەن کە بەشێوەیەکی تەواو باسی ئەم مەسەلانەیان کردووە، هەربۆیە پێویست ناکات ئێمە لێرەدادرێژەی پێبدەین. بەڵکولەم کتێبەدا زیاتر باسی مەغریب کەشوێنی بەرپەرەکانەو باسی بەشێك لەخۆرهەلآت کەزێدی عەرەبەکانە دەکەین. خوداش پشت و پەنای چاکە خوازانە.

# گوتەیەك بۆ تەواو كاری پێشەكی دووەم

## سەبارەت بەوەی كەچارەكی باكوری زەوی ئاوەدانترو پڕ دانیشتوانترە لە چارەكی باشورەكەی و باسكردنی هۆكارەكەی

هەركەسێك كەهەواڵی دڵنیاكەرەوەی پێدەگات كەئاوەدانی هەرێمی یەكەم و دووەم لەهەرێمەكانی دواتریان كەمترن. ئەم دوو هەرێمەش سەرزەویە فراوان و چۆڵ و ڕێگوزەرو دەشتە بێ ئاوو گیاكان و دەریای هیند كەلەخۆرهەڵاتیانەوەیەدەگرێتەوە. هەردوو هەرێمی ناوبراو لەڕوانگەی دانیشتوان و نەتەوە جۆراوجۆرەكانەوە زۆر گرنگ نین. هەربۆیە ناوچە ئاوەدان و شارەكانیشیان بەهەمان شێوە زۆر ئاوەدان نین، بەڵام هەرێمی سێیەم و چوارەم و پاش ئەوانیش بەپێچەوانەی ئەمەوەیە، دەشتە گەرم و سوتێنەرە بێ ئاوو گیاكانیان تێدا كەمەو ڕێگوزەرەكانیان زۆركەم یان دەگمەنن. ژمارەی گەلو نەتەوەكانیان بێ سنورە و ناوچە ئاوەدان و، شارەكانیان لەئەندازەی ژمارە بەدەرەو ئاوەدانی هەرێمەناوبراوەكان لەماوەی نێوان هەرێمی سێیەم تاوەكو شەشەمە، بەڵام بەشی باشوری هەمووی چۆڵ و بیابانە. زۆرێك لەزانا كان ئەوەیان وەیاد هێناوەتەوە كەهۆكاری ئەو گەرما توندە ئەوكەمەلاربونەوەی خۆرە لەوناوچەیەدا لەلای ڕێوسەوەیە(واتە ناوەڕاستی ئاسمان)ئەم بەشەش بەبەڵگەوە ڕوون دەكەینەوە تاوەكو هۆكاری ئاوەدانی لەنێوان هەرێمی سێیەم و چوارەم و لەلای باكورەوە تاوەكو هەرێمی پێنجەم و حەوتەم بزانین چیە. هەربۆیەدەڵێین: هەركات هەردوو جەمسەری باكورو

باشوری فەلەك بسەپێن بەسەر ئاسۆدا ئەوكات بازنەیەكی گەورە دروست دەبێت[195] كەزەوی دەكات بەدوو بەشەوە، ئەمەش گەورەترین بازنەیە كەلەخۆرهەلاّتەوە بۆخۆرئاوا تێدەپەڕێت و پێی دەڵێن بازنە معدل النهار[196]. كەلەجێگەی خۆیداو لەزانستی شێوازدا باسكراوەو دەڵێت فەلەكی سەرو لەخۆرهەلاّتەوە بۆخۆرئاوا دەجولێت و ئەم جولەیەش ڕۆژانەبێتو بەهۆی ئەوەوە فەلەكەكانی تركەلەناویدان بمانەوێت و نەمانەوێت بەزۆر دێنەجولەو ئەم جولەیەش هەست پێكراوە.

وەلەبەرامبەر هێڵی ڕۆشتنی هەموو ئەم ئەستێرانەوە لەفەلەكەكانیاندا بازنەیەكی گەورە لەفەلەكی سەرەوە دروست دەبێت و دەیكات بەدوو بەشەوە كەپێی دەڵێن بازنەی فەلەكی البروج و دابەشدەبێت بۆدوازدە بورج هەروەك چۆن لەشوێنی خۆیدا باسكراوە. ئەم بازنەیە لەدوو خاڵی بەرامبەری بوروج كەبریتین لەیەكەمی حەمل و یەكەمی میزان لەگەڵ بازنەی معدل النهار یەكتر دەبڕن. لەئەنجامدا بازنەی معدل النهار ئەو دەكات بەدوو بەشەوە، كەنیوەی نیسبەت بە معدل النهار بەرەو لای باكور لاربووەتەوەو وەئەو لەسەرەتای حەملەوە تاوەكو كۆتایی سونبولەیەو نیوەكەی تریشی بەرەو لای باشور لار دەبێتەوە، وەئەوەش لەسەرەتای میزانەوەیە تاوەكو كۆتایی حوتە. هەركات هەردوو جەمسەر لەهەموو ناوچەكانی زەویدا كەوتنە سەر ئاسۆ ئەوا لەسەر ڕووی زەویەوە هێڵێك لەبەرامبەربازنەی معدل النهارەوە دروست دەبێت، كەلە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەلاّت دەڕوات و پێی دەڵێن هێڵی ئیستیوا. ئەم هێڵەش بەپێی ئەو زانیاریانەی كەلە كەشناسیەوە بەدەست هاتوون، لەسەرەتای هەرێمی یەكەمی حەوت هەرێمەكەدایەو هەموو ئاوەدانیەكان لەلای باكوری ئەو هێڵەوەیە.

وەجەمسەری باكور لەئاسۆكانی ئەم ناوچەئاوەدانەوە بەشێوەیەكی یەك لەدوای یەك بەرز دەبێتەوەو دەگاتە نزیكەی شەست و چوار پلە. لێرەدا ئاوەدانی كۆتایی دێت و

---

[195] واتە ئەوبازنەیەی كەزەوی دەكات بەدوویەشەوە.

[196] كەبازنەیەكە لەكاتی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا دروست دەبێت.

ئەوكۆتاییەش هەرێمی حەوتەمە. وەهەركات بەرزیەكەی بەسەر ئاسۆدا بگاتە نەوەد پلە، ئەمەئەوبەرزیەیە كەلەنێوان جەمسەرو بازنەی معدل النهار دایە، ئەوكات جەمسەر دەكەوێتە لای ڕونوس و بازنەی معدل النهارو شەش بورجی باكور لەسەر ئوفوقەوەو شەش بورجی باشوریش لەژێر ئاسۆدا دەمێننەوە. ئاوەدانیش لەنێوان شەست و چوار تاوەكو نەوەد پلە نەگونجاوە، چونكە گەرماو سەرما بەهۆی دوری ئەوماوەیەی كەلەنێوانیاندا هەیە لەم هەلو مەرجەدا ئاوێتەنابێت و لەئەنجامدا تەكوین بەدی نایەت، چونكە خۆر لەهێڵی ئیستیواكەوتووەتە لای سەری حەمل و میزان و ڕئوسەوەو لەپاشان لاردەبێتەوە بەلای سەری سەرەتان و سەری جەدیدا. وەكۆتایی میلەكەشی لەبازنەی معدل النهار بیستو چوار پلەیە. ئەوكات هەركاتێك جەمسەری باكور لەئاسۆوە بەرز ببێتەوە بازنەی معدل النهار لەلای ڕئوسەوە بەئەندازەی بەرز بونەوەی ئەو دور دەكەوێتەوە. جەمسەری باشوریش لەم گۆڕانكاریەدا بەهەمان ئەندازە دێتە خوارەوە كەلەلای كات ناسان (زانایانی شێوان)پێی دەڵێن پانی بەلەد.

وەهەركات بازنەی معدل النهار لەلای ڕئوسەوە دوربكەوێتەوە بوروجی باكوری ناوەوەی بەئەندازەی بەرز بونەوەكەی تاوەكو سەری سەرەتان بەرز دەبنەوە. بورجەكانی باشوریش بەهەمان شێوە لەئاسۆوە تاوەكو سەری جەدی دێنە خوارەوە، چونكەهەروەك ئەوەی كەگوتمان بوروجی ناوبراو لەئاسۆی ئیستیواوە بەرەو دووشوێن لاردەبنەوە. هەربۆیە ئاسۆی باكور ئەوەندە بەرزدەبێتەوە تاوەكو دەگاتە ئاسۆكانی باكور كەبریتین لەسەری سەرەتان لەلای ڕئوسەوە، كەجێگەیەكە پانی بەلەد لەحیجازو خاڵی نزیك بەو بیست و چوار پلە دەبێت. ئەمەش هەمان ئەو میلەیە كەهەركات سەری سەرەتان لەمعدل النهار لەئاسۆی ئیستیوا دادوربكەوێتەوە بەئەندازەی بەرزبونەوەی جەمسەری باكور بەرز دەبێتەوە تاوەكو لەبەرامبەریەوە دەوەستێت. ئەگەر جەمسەر زیاتر لەبیست و چوارپلە بەرزببێتەوە خۆرلەبەرامبەردا دادەبەزێت و لە دابەزینەكەشی بەردەوام دەبێت تاوەكو بەرزایی جەمسەر بگاتە شەست و چوارپلە. هاتنەخوارەوەی

خۆر لەبەرامبەرو وەدابەزینی جەمسەری باشور لەئاسۆوە بەهەمان ئەندازەیە. لەئەنجامدا بەهۆی توندی سەرماو سەهۆڵ بەندانو درێژی کاتەکەیەوە کەلەگەڵ گەرمادا تێکەڵ نابێت تەکوین بەدی نایەت. سەرەڕای ئەمەش لەکاتی بەیەك گەیشتنی خۆرو نزیك بونەوەلێی، ئەو تیشکەی کەلەوەوە دەگاتە سەرزەوی لەگۆشەی وەستاودایەو لەناویشەوە لەبەرامبەر گۆشە کراوەو تیژەکاندایەوهەرکات گۆشەکانی تیشك وەستاوبن نور دەردەکەوێت، بەپێچەوانەشەوە لەگۆشە کراوەو تیژەکاندا بلاو دەبێتەوە. هەربۆیە گەرما لەکاتی نزیك بونەوەلێی زیاترە لەوەی کە لەپاش بەیەکگەشتنەکەوەیە، چونکەتیشکی خۆر هۆکاری گەرماو حەرارەتە.

سەرەڕای ئەمەش بەیەکگەیشتن لەهێڵی ئیستیوادا لەساڵێکدا دووجار لەهەردووخاڵی حەمل و میزاندایە. هەرکات لاربێتەوە ئەوەندە دورناکەوێتەوە، هەربۆیە هێشتا گەرما لەکۆتایی میلی خۆردا واتە لەسەر سەری سەرەتان و سەری جەدیدا نەگاتە ناوەڕاست، کەدیسانەوە بەرزببێتەوە بۆبەرامبەر بەم شێوەیەئەو تیشکەی کەبەشێوەی گۆشەی وەستاو دەدات و لەم ئاسۆیەوە دەمێنێتەوە و ماوەیەکی دورودرێژی دەوێت لەئەنجامدا هەوا بەهۆی گەرماوە زۆرتوندو سوتێنەر دەبێت. وەهەروەها مادەم خۆر لەلای هێڵی ئیستیواوە بەپانی بیست وچوار پلە دوجار لەبەرامبەر یەکەوە دەوەستێت وتیشکەکانی بەتوندیەکی نزیك لەتوندی ئەوەوە لەهێڵی ئیستیوادا دەدات لەئاسۆ و توندی گەرما لەهەوایەکی ووشکی تونددا دروست دەبێت کەرێگرە لەتەکوین، چونکەهەرکات گەرما بگاتە ئاستی لەڕادەبەدەر ئاو شێکان ووشك دەبنەوە و کاری تەکوین لە کانزای دروستبون وبەرهەم هاتنی گیانەوەرو ڕووەك لەناو دەچێت، چونکەتەکوین تەنها بەهۆی شێ وە بەدی دێت و بەس. ئەوکات ئەگەر سەری سەرەتان لەلای ڕێوسەوە بەپانی بیست و پێنج یان زیاتر دوربکەوێتەوە خۆر لەبەرامبەرەوە دێتەخوارەوە بەشێوەیەکی مام ناوەند گەرما دەبێت یان کەمێك لەمامناوەند دەردەچێت، لەئەنجامدا تەکوین دەست پێدەکات و کەم کەم زۆر دەبێت و تاوەکوبەهۆی کەمی تیشك و ڕوناکیەوەلەگۆشە

کراوەکاندا سەرما لەڕادەبەدەر زۆردەبێت لەم کاتەشدا تەکوین ناتەواو دەردەچێت ولەناو دەچێت، بەڵام لەناوچونی تەکوین بەهۆی گەرمای زۆرەوەیە تاوەکوبەهۆی سەرماوە، چونکە کاریگەری گەرما لەووشککردنەوەدا لەکاریگەری سەرمالەبەستندا خێراترە هەر بۆیە ئاوەدانی لەهەرێمی یەکەم و دووەمدا کەمەو لەسێیەم و چوارەم و پێنجەمدا مام ناوەندە. لەم ڕووەوە کە گەرما بەهۆی کەمکردنی ڕووناکیەوە کەدەدات لەناوەند و لەهەرێمی شەشەم و حەوتەمدا ئاوەدانی بەهۆی کەمی گەرماوە زۆرە. هەمان چۆنیەتی سەرما لەسەرەتایەوە لەلەناوچونی تەکویندا کاریگەری نابێت. هەروەك چۆن گەرما لەم بارەیەوە کاریگەر دەبێت، چونکە ووشکی لەسەرمادا بەدی نایەت مەگەر تەواوتوندو لەڕادەبەدەر بێت. لەم کاتەدا ووشکی بەدی دێت، هەروەك چۆن لەپاش هەرێمی حەوتەم بارودۆخ بەم شێوەیە، هەربۆیە ئاوەدانی لەچارەکی باکوردا زیاترە. خوداش داناترە. بەم هۆیەوەیە کەدانایان هێڵی ئیستیواو پشتەوەی بەچۆڵ و خاڵی لەدانیشتوان داوەتە قەڵەمو ئێستەش ڕەخنەیان لێ دەگیرێت بەحوکمی بینین و هەواڵە دڵنیاکەرەوەکان، ئاوەدانە، ئەی کەواتە چۆن ئەم بانگەشەیەی خۆیان دەسەلمێنن؟ ڕووی دەرەوەی کارەکە ئەمەیە کە مەبەستی ئەوان ئەوەنیە کەبەتەواوەتی ئاوەدانی تێدا نیە، بەڵکو بەڵگەکەی ئەوان بەمەکۆتایی هاتووە کەلەناو چونی تەکوین بەهۆی گەرماوە لەو ناوچەیەدا زیاترەو ئاوەدانی یان نەگونجاوە یان بەشێوەیەکی ڕێژەیی هەیە، بەڵام بەبەراوورد بە ناوچەکانی تر زۆر کەمترە.

ڕاستەقینەش هەربەم شێوەیە، چونکە لەهێڵی ئیستیواو ناوچەکانی پشتەوەی هەرچەندە بەو شێوەیەی کەگێڕدراوەتەوە ئاوەدانی هەیە، بەڵام زۆر کەمە. ئیبن ڕوشد واگومانی بردووە کەهێڵی ئیستیوا مام ناوەندە وپشتەوەی هێڵی ناوبراو لەباشوردا هەروەك پشتەوەیەتی لەباکوردا و هەمان ئاوەدانی کەلەباکوردا هەیە لەباشوریشدا بونی هەیە. قسەکەی ئەو لەڕوانگەی لەوناوچونی تەکوینەوە نەگونجاونیە بەڵکو نەگونجانەکەی لەباشوری هێڵی ئیستیوا بەهۆی ئەوەوەیە کەئەو زەویانەی کەلەباکوردا گونجاون

بۆتەکوین لەم ناوچەیەدا ئاو داپۆشیوە. لەبەرئەوەی بەهۆی زۆری ئاوەوە لەناوچەی مام ناوەندا ئاوەدانی نەگونجاوە و ناوچەکانی تریش وەك ئەون، چونکە ئاوەدانی کۆمەڵگا شتێکی پلە بەپلەیە دەست پێکردنی ئەم قۆناغ بەقۆناغەش لەڕووی بونەوەیە نەوەك لەڕوانگەی نەگونجانەوە. گێڕانەوەی بەسەرهاتەدڵنیا کەرەوەکان لەبارەی ژیان لەهێڵی ئیستیوادا، قسەی کەسانێك کەدەڵێن لەم ناوچەیەدا ئاوەدانی نیە ڕەتی دەکاتەوە. خوداش داناترە. وەپێویستە لەپاش ئەم گوتارەوە شێوەی نەخشەی جوگرافیا هەربەو جۆرەی خاوەنی کتێبی ڕوجر وێنای کردووە بهێنین، لەپاشان بەدورو درێژی لەبارەی جوگرافیاوە گفتوگۆ بکەین.

## گفتوگۆیەکی دورودرێژ لەبارەی جوگرافیاوە

ئەم ووتارە دابەش دەبێت بۆ دووبەش: دورودرێژ، کورت. لەبەشە درێژەکەیدا لەبارەی یەك بەیەکی شارەکان و دەریاو ڕووبارو ناوچە ئاوەدان و نیشتەجێیەکانی زەوی باسدەکەین. کەلەبەشی دووەمدا لەپاش ئەم بابەتەوەدێت، بەڵام لەبەشە کورتەکەدا باس لەدابەشکردنی بەشی ئاوەدانی زەوی لەگەڵ هەرحەوت هەرێمەکەو باسکردنی پانی بەلەدەکان و نیوەی ڕۆژ (نصف النهار)ی شارەکان دەکرێت، هەربۆیە ئەم بەشە تایبەت دەکەین بەم جۆرە بابەتانەوە: لەبەشەکانی پێشودا باسی ئەوەمان کرد کەگۆی زەوی لەهەرلایەکەوە بەئاو دەورەدراوە هەروەك بۆڵەترێیەك لەئاوێکی زۆردا بەجۆرێك چەند بەشێکی بەدانایی خودا لەدەرەوەی ئاوەکەدان تاوەکو ببێتە سەرچاوەی ئاوەدانی و دروست بونی توخمەکان. هەندێك دەڵێن ئەم بەشە لەو ئاوە دەرهاتووە نیوەی لەسەر ڕووی زەویەوەیە کەچارەکێکی ئاوەدان و نیشتەجێیە ئەوی تریشی وێران و بایرە. بەگوتەی هەندێك ناوچە ئاوەدانەکانی زەوی تەنها یەك لەسەر شەشیەتی وەهەردوولای باشورو باکوری ئەم بەشەلەوئاوەی سەرەوە چۆڵ و بایرە و ئاوەدانیەکەی پەیوەستە بە نێوانی هەردوولا لەخۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات و نێوان ئەم ناوچە ئاوەدانە و دەریا لەهەردوو

سەریەوە وێرانی بونی هەیە. وەدەڵێن هێڵی وەهمی ئیستیوا لەم ناوچەیەدا لەخۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات دەڕوات ئەمەش هێڵی ڕووبەڕووی معدل النهارە، ئەوجێیەی کەهەردوو جەمسەری فەلەك بەسەر ئەم ئاسۆیەوە سەرەتای ئاوەدانی نیشان دەدەن و تاوەکو ناوچەکانی دوای ئەو لەباکور بەردەوام دەبێت. بەتلیموس دەڵێت بەڵکو لەوهێڵەشەوە لەلای باشورەوە ئاوەدانی هەیە. ئەمەشی بەپانی بەلەد پێوانەکردووە هەروەك لەداهاتودا باسی دەکەین. لەپاشان پێویستە ئەوەبزانین کەحەکیمەکان سەرەڕای ئەمە ناوچەی ئاوەدانیان لەلای باکورەوە کردووە بەحەوت هەرێمەوە هەروەك چۆن پێشتر ئاماژەمان پێدا، ئەم دابەشکردنەش لەسەر هێڵە وەهمیەکان کەلەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات تێدەپەڕن، پانی هەریەکەیان بەبۆچونی دانایانی ناوبراو جیاوازەو کەلەئایندەدا بەدورودرێژی باسی ئەم بابەتەدەکەین.

هەریۆیەهەرێمی یەکەم لەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات دەڕوات و سنوری باشورەکەشی هێڵی ئیستیوایە لەباشوریەوە بێجگەهەمان ئاوەدانی کەبەتلیموس ئاماژەی پێکردووە شتێکی ترنیە. لەپاش ئەویش بێجگە لەدەشت و بیابانی بێ ئاوو گیا هیچی تر نابینرێت، هەروەك بڵێی سەرانسەری ئەم هەرێمە وێرانەو بەدوای هەرێمی یەکەمدا لەڕوی باکورەوە هەرێمەکانی دووەم و سێیەم دێن تاوەکو دەگاتە حەوتەم کەکۆتایی ئاوەدانیە. لە ڕوی باکورەوە و لەپشت ئەوەوە تەنها بیابانەبێ ئاوو گیاکان دەبینرێن و بەدەریا کۆتایی نایەت. هەروەك چۆن چۆنیەتی پشتەوەی هەرێمی یەکەم لەباشورەوە هەربەم شێوەیە، بەڵام ناوچەچۆڵەکان لەلای باکورەوە بەچەند پلەیەك لەلایەنی باشور کەمترە. هوریۆیە لەبارەی پانیەکان و نصف النهاری ئەم هەرێمانەوە پێویستە ئەوەبزانین کەهەردوو جەمسەری گۆی زەوی لەهێڵی ئیستیوادا بەسەر ئاسۆوە لەخۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات دەبێت و خۆریش لەبەرامبەر ڕێوسی ئەهلە دایە. هەروەك چۆن ئەگەر ئاوەدانی لەلای باکورەوە دورببێتەوە ئەوا جەمسەری باکور بەرز دەبێتەوە جەمسەری باشوریش بەهەمان ئەندازە دێتە خوارەوە خۆریش لەبازنەی معدل النهارەوە بەرەولای خۆی

بەهەمان ئەندازە دووردەکەوێتەوە ئەم چەمکە سێ لایەنیانە خڕن و، بە هەریەکەیان دەڵێن پانی بەلەد هەروەك چۆن لەلای ئەستێرەناسان بەناوبانگە.

زانایان لەئەندازەی ئەم پانیانەو ئەندازەیان لەهەرێمەکاندا بۆچوونی جیاوازیان هەیە، هەروەك چۆن بەتلیموس پێی وایە کەپانی هەموو ناوچە ئاوەدانەکان حەفتاو حەوت دەرەجەونیوە کەواتە پانی بەشی ئاوەدانی پشتەوەی هێڵی ئیستیوا تاوەکو باشورەکەی پانزە پلەیە، وەپانی هەرێمەکانی باکور تاوەکو کۆتاییان شەست و شەش دەرەجەونیوە هەربۆیە پانی هەرێمی یەکەم بەبیرو باوەڕی ئەوشانزەپلەیەو، پانی هەرێمی دووەمیش بیست و سێیەمیش بیست و حەوت و چوارەم سیوسێ و پێنجەم سیوهەشت و شەشەم چل وسێ و حەوتەم چل وهەشت پلەیە. لەپاشان دەرەجە لەگۆی زەویەوە شەست و شەش میل دوولەسەرسێی میلێك لەزەویەوە ئەندازەگیری کردووە. هەربۆیە میلەکانی هەرێمی یەکەم لەنێوان باشورو باکوردا هەزارو سێ سەدو شەست وحەوت میلە. کۆی میلەکانی هەرێمی دووەم لەگەڵ یەکەمدا سی و سێ میلە و کۆی میلەکانی هەرێمی سێیەم لەگەڵ هەردوو هەرێمی پێشودا یەکەم و دووەم هەزارو حەت سەد و نەوەد میلە. وەلەو هەرێمی چوارەمەوە لەگەڵ سێ هەرێمەکەی تردا دووهەزارو سەدوهەشتاوپێنج میلە. لەپێنجەمەوە دووهەزارو پێنج سەدو بیستە و لەشەشەمیشەوە دووهەزاروهەشت سەد و چلە و لەحەوتەمیشەوە سێ هەزاروسەدو پەنجا میلە.

ئەوکات دەبێت ئەوەبزانین کە کاتەکانی شەوو ڕۆژ لەم هەرێمانەدا بەهۆی لاربونەوەی خۆر لەبازنەی معدل النهارو بەرزی جەمسەری باکورەوە لەئاسۆکانی ئەو جیاوازە، هەربۆیە قەوسی ڕۆژ یان شەو بەهۆیەوە جیاوازن. وەدرێژترین شەوو ڕۆژ لەکۆتایی هەرێمی یەکەمدا لەکاتی کەوتنی خۆر بەسەری جەدی و سەرەتاندا بەباوەڕی بەتلیموس دەگاتە دوانزە کاتژمێرو نیو. وەلەکۆتایی هەرێمی دووەمدا سیانزە سەعات و لەکۆتایی هەرێمی سێیەمیشدا سیانزە سەعات و نیوو لەکۆتایی هەرێمی چوارەمیشدا چواردە سەعاتەو لەکۆتایی هەرێمی پێنجەمیشدا چواردەسەعات و نیو دەبێت. وەلە کۆتایی

هەرێمی شەشەمیشدا دەگاتە پانزە سەعات و لەکۆتایی حەوتەمیشدا دەگاتە پانزە سەعات و نیوو کۆتایی دێت. بۆ کورتترین ڕۆژو شەو پێویستە ئەندازەیەك لەبەرچاو بگرین کەلەپاش ئەم ژمارانەوە لەکۆی بیست و چوار سەعاتەکەی کەلەکاتی شەوو ڕۆژ دەمێنێتەوە، ئەوکاتە کەدەکاتەسوڕانەوەی تەواوی گۆی زەوی. کەواتەجیاوازی ئەم هەرێمانە لەگەڵ یەکتردا لەدرێژترین شەوو ڕۆژەکاندا نیو سەعاتە کەلەسەرەتای هەر هەرێمێکەوە لەناوچەی باشوردا تاوەکو کۆتاییەکەی لە ناوچەی باکور کەم کەم بەرەو زۆر بون دەچێت و، دواتر دابەش دەبێت بەسەر بەشەکانی ئەو چەمکەدا. ئیسحاقی کوڕی حەسەنی خازینی پێی وایە کەپانی ئەو ناوچەئاوەدانانە کەلەپشتەوەی هێڵی ئیستیوادان شانزە سەعات وبیستو پێنج دەقەیەو درێژترین شەوو ڕۆژیشی سیانزە سەعاتەوپانی هەرێمی یەکەم وسەعاتەکانی ڕۆژو شەوەکەی بەرابەرن بە پانی سەعاتەکانی هەمان ناوچەکانی پشتەوەی هێڵی ئیستیوا. وەپانی هەرێمی دووەم بیست و چوار پلەیە و درێژترین شەوو ڕۆژیشی لەکۆتایی هەرێمەکەدا سیانزە سەعات و نیوە. پانی هەرێمی سێیەم سی دەرەجەیەو شەوو ڕۆژیشی چواردە سەعاتە. پانی هەرێمی چوارەمیش سی و شەشە پلەیەو شەوو ڕۆژیشی چواردە سەعات و نیوە. پانی هەرێمی پێنجەمیش چل و یەك پلەیەو شەوو ڕۆژی پانزە سەعاتە. پانی هەرێمی شەشەمیش چلو پێنج پلەیەو شەوو ڕۆژیشی پانزە سەعات و نیوە. پانی هەرێمی حەوتەمیش چلو هەشت پلەونیوە و شەوو ڕۆژیشی شانزە سەعاتە.

لەپاشان پانی بەشی کۆتایی ناوچەی ئاوەدانی پشتەوەی هەرێمی حەوتەم بەشەست و سێ پلە کۆتایی دێت ودرێژترین شەوو ڕۆژیشی دەگاتەبیست سەعات. گەورەکانی تری زانستی شێواز بێجگە لەئیسحاق خازینی پێیان وایە کەپانی پشتەوەی هێڵی ئیستیوا شانزەدەرەجەو بیست و حەوت دەقەیەو، پانی هەرێمی یەکەم بیست دەرەجەو پانزە دەقەو، پانی هەرێمی دووەم بیست حەوت دەرەجەو سیانزە دەقەیە. لەسێیەمیشەوە سی و سێ دەرەجەو، لەچوارەمەوە سی و هەشت دەرەجەو نیو، لەپێنجەمیشەوە چل و

سێ دەرەجە، و لەشەشەمەوە چل و حەوت دەرەجە، پەنجاو سێ دەقەیەو، بەگوتەی هەندێکیش چل و شەش دەرەجەو پەنجادەقەیەو، لەحەوتەمیشەوە پەنجاو یەك دەرەجەو پەنجاو سێ دەقەیە. وەپلەی ئاوەدانی لەپشتەوەی هەرێمی حەوتەم حەفتاو حەوت پلەیە. بەبیرو باوەڕی ئەبو جەعفەری خازینی کەخۆیشی لەپێشەوایانی زانستی شێوازە دەڵێت: پانی هەرێمی یەکەم بیست دەرەجەو سیانزە دەقەیەو، هەرێمی دووەم بیست و حەوت دەرەجەو سیانزە دەقەیەو هەرێمی سێیەم سی و سێ دەرەجەو سی و نۆدەقەیەو، هەرێمی چوارەم سی وهەشت دەرەجەو بیست و سێ دەقەیەو، پێنجەم چلو دوو دەرەجەو پەنجاو هەشت دەقە، و شەشەم چل و حەوت دەرەجەو دوو دەقەیەو، حەوتەم پەنجاوپێنج دەرەجەو چل دەقەدەبێت. ئەمەبوو بابەتەکانی جیاوازی ئەمان لەبارەی پانی و سەعاتەکان و میلەکانی هەرێمەکان کەبەدەستم هێناون.

خوا هەموو شتێکی دروستکردو ڕێکی خستن و ئەندازەگیری کردن. لەپاشان دەبێت ئەوەبزانین کاتەکانی شەوو ڕۆژ لەم هەرێمانە بەهۆی میلی خۆرەوە لەبازنەی معدل النهار بەرزی جەمسەری باکور لەئاسۆکانیداجیاوازە. لەئەنجامدا قەوسی شەوو ڕۆژ بەهۆی ئەوەوە جیاوازی تێدەکەوێت و کۆتایی درێژی شەوو ڕۆژ لەکۆتایی هەرێمی یەکەمدا لەکاتی دابەزینی خۆردا بۆ سەری جەدی لەشەوودو سەری سەرەتان لەڕۆژدا، دەگاتە سیانزە سەعات. هەروەها لەکۆتایی هەرێمی دووەمدا لەلای باکورەوە درێژی ڕۆژ لە کاتی دابەزینی خۆردا بۆسەری سەرەتان کەگۆڕانی هاوینەیەتی دەبێتە سیانزەسەعات و نیو، وە لەکاتی گۆڕانی زستانەدا لەسەری جەدیەوە درێژترین شەوە بەهەمان ئەندازە دێتە ئاراوە کەدەکاتەکورتترین شەوو ڕۆژی، کەلەپاش سیانزە سەعات و نیو لەبیست و چوار سەعاتەکە (کاتێك سوڕانەوەی تەواوی گۆی زەویە)و کۆی شەوو ڕۆژ دەمێنێتەوە. وەهەروەها لەکۆتایی هەرێمی سێیەمدا لەلای باکورەوە بەلایەنی زۆرەوە درێژایی ڕۆژ و شەو دەگاتە چواردە سەعات، ولەکۆتایی هەرێمی چوارەمدا دەگاتەچواردەسەعات و نیوو، لەکۆتایی پێنجەمیشدا پانزە سەعات، ولەکۆتایی شەشەمیشدا پانزەسەعات و

نیوو، لەکۆتایی حەوتەمیشدا دەگاتەشانزە سەعات و نیوو. لێرەدا ئاوەدانی نامێنێت. هەربۆیە جیاوازی نێوان هەریەکەلەم هەرێمانەلەگەڵ ئەوی تردا لەڕووی درێژترین شەوو ڕۆژەوە نیو سەعاتە، کە لەسەرەتای دەستپێکردنیەوە لەلای باشورەوە تاوەکو کۆتاییەکەی لەلای باکور زۆردەبێت و دابەش دەبێت بەسەر بەشەکانی ئەم لایەنەدا، بەڵام پانی بەلەدەکانی ئەم هەرێمانە بریتیە لەدووری نێوان لای چەپی سەری بەلەدو بازنەی معدل النهار، کەئەوسەری سەری هێڵی ئیستیوایە. ئیتر جەمسەری باشور لەئاسۆی ئەم مانگەدا دابەزێت یان جەمسەری باکور لەوزیاتر بەرز ببێتەوە. ئەوسێ چەمکەش یەکسان و بەرامبەرن کەناونراون پانی بەلەد هەروەك پێشتر باسکران. جوگرافی زانان هەریەکە لەم حەوت هەرێمە بەدرێژاییان لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات دابەشیان کردون بۆ دە بەشی یەکسان و ئەوشتانەی کەلەگەڵیاندایە: وەك شارو پایتەختو کێوو ڕووبارو دەریاکان و ماوەی نێوان هەریەکەیانیان باسکردووە. ئێمەش لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەین و باسی شارە ناسراو دەریاو ڕووبارەکان لەبەشێکیدا باس دەکەین و لەم بارەیەوە سود لەکتێبی نزهەالمشتاق کەدانراوی عەلەوی ئیدریسی حەمودیە وەردەگرین، کەبۆ پاشای ئەجنەبی صەقەلیەی نوسیوە کەپاشای ناوبراو ناوی ڕوجری کوڕی ڕووجر بوە. ئیدریسیش لەکاتی چونەلای ئەو لەپاش هاتنەدەرەوە لەصەقەلیە کەئەوکات لەژێر فەرمانڕەوایی مالیقەکاندا بووە ئەم کتێبەی لەنیوەی سەدەی شەشەمدا نوسیوە و، لەدانانەکەیدا سودی لەسەرچاوەگەلێکی زۆر وەرگرتووە وەك کتێبەکانی مەسعودی و ئیبن خردادبەو حوقلی و قەدوەری و ئیبن ئیسحاقی مەنجەم و بەتلیموس و.....هتد.

ئێمە لەهەرێمی یەکەمەوە دەست پێدەکەین، و خوداش لەهەڵە بمانپارێزێت. هەرێمی یەکەم: لەبەشی خۆرئاوای ئەم هەرێمەدا دورگەکانی خالیدات هەن، هەمان ئەو جێگەیەی کەبەتلیموس ئەندازەگیری درێژی شارەکانی لێیەوە دەست پێکردووە. وەلەم دورگانەوە لەبەشی ووشکایی ئەم هەرێمی ناوبراوەوە نین، بەڵکو لەدەریای موحیتدایە و بریتیەلە

كۆمەڵێك دورگەی فراوان كەگەورەترین و فراوانترینیان سێ دورگەن و دەڵێن ئەم دورگانە ئاوەدانن. ئێمەش هەواڵمان زانی كەكەشتیەكانی فەرەنگیەكان لەناوەڕاستی ئەم سەدەیەدا لەدورگە ناوبراوەكانەوە تێپەڕیون و جەنگیان لەگەڵ خەڵكەكەیاندا كردووە و تالآنو دەستكەوتیشیان هەبووە و هەندێك لەخەڵكەكانیشیان بەدیل گرتون و هەندێكیشیا وەك بەردە و خزمەتكار فرۆشتون، و لەمەغریبی سەرەوە (مراكش)كراونەتە خزمەتكاری پاشاكان و لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی فێربون باسی چۆنیەتی دورگەكانی خۆیانیان كردووە، لەوانەش گوتویانە: لەودورگانەدا بۆ كشتوكاڵ سودیان لەشاخی حەیوان وەرگرتووە بەمەبەستی زەوی كێڵان، چونكە ئاسن لەوێدا نیەوژیانیان لەسەر جۆیەو، ئەوحەیوانەی كەسودی لێ وەردەگرن بزنەو، بەبەرد شەڕ دەكەن لەگەڵ دوژمنەكانیدا و خۆر دەپەرستن و لەكاتی هەڵهاتنیدا كڕنۆشی بۆدەبەن و هیچ ئاینێكیان نیەو هیچ بانگەوازێكیان پێنەگەشتووە. ئەوانەشی كەزانیاریان لەبارەی ئەم دورگانەوە هەیە بەرێككەوت بووە نەوەك بەمەبەستی سەفەركردن چوبنە ئەوجێگانە، چونكە گەشتكردن بەكەشتی پەیوەستە بەناسینی بارودۆخی كەش و هەواوە (كەشناسی)، واتەدەیانزانی ئەگەر كەشتیەكە ڕاست بڕوات بەرەوكام شاروناوچەدەڕوات و هەركاتێكیش ئاراستەی هەواكەبگۆڕێت بەرەوكوێ دەڕوات.

پێویستە ئەوەش بزانرێت كەئەگەر كەشتیەكە بەئاراستەیەكی ڕاست بڕوات دەگاتە كام شوێن و چارۆكەكان بەجۆرێك لەبەرامبەر هەواكەوە دادەنێن كەكەشتی بەهەمان ئاراستەبجولێت، كەهاوڕێك بێت لەگەڵ ئەویاساگەلەی كەبۆ دەریاوانان و كاپیتانی كەشتیەكان دیاروئاشكرایە. وەنەخشەی وولآتی كەناری دەریای ڕۆم هەربەوجۆرەی كەلەدەرەوە هەیە. ئەوبارودۆخەی كەلەكەناردەریاكاندا هەیە لەلاپەڕەیەكی تایبەتدا نوسراوە وئاراستەی هەواو ڕێڕەوە جۆراوجۆرەكانیان لەهەمان لاپەڕەدا وێنا كراوە و پێی دەڵێن: كنباص (ڕێبەری دەریاوانان)و لەگەشتەكاندا پشتی پێدەبەستن، بەڵام ئەم ڕێنمایانە لەدەریای موحیتدا بونی نیە، هەربۆیە كەشتیەكان ناچنە ناویەوە، چونكە

ئەگەر کەشتی لەکەنارەوە نەبینرێت گریمانی گەڕانەوەی کەمترە و ڕێنمایش ناکرێت، چونکە لەکەش و هەواو سەر ڕووی ئاوەکەدا مانگ و هەڵمگەلێکی فراوان هەیە کەڕێگرن لەرۆشتنی کەشتیەکانو، بەهۆی دووری ئەوهەڵمانەوە رووناکی خۆر لەسەر ڕووی زەویەوە ناگاتەئەوان. بۆئەوەی ئەوهەڵمەپەراکەندە بکات و حەلی بکات هەربۆیەڕێنمایی کرنی و ئاگاداربوون لەبارودۆخی دژوارە، بەڵام لەبەشی سەرەتای ئەم هەرێمەدا کەڕژێنگەی ڕووباری نیلە کەلەسەرچاوەی نزیك کێوی مانگەوە(القمر)، هەروەك باسمان کرد دەڕوات و پێی دەڵێن نیلی سودان بەرەو دەریای موحیت دەڕوات وکەوتووەتە نزیك دورگەیەکەوە بەناوی ئولیل کەلەوێدایە. هەمووئەم شارانە لەوڕۆژگارەدا لەناوچەکانی ژێردەسەلآتی فەرمانڕەوایی پاشای مالیدان کەخەڵکەکەی لەنەتەوەکانی سودانن و بازرگانانی مەغریبی سەرەوە (مراکش)گەشت دەکەن بۆ وولآتەکەیان و لەنزیك بەشی باکوری ئەو ولآتە هۆزەکانی لمتونەوە هۆزە دەمامکدارەکان و کۆمەڵێك دەشت هەن کەشوێنی هاتوچۆی ئەم گەلانەیە. لەناوچەی باشوری ئەم نیلەوە هۆزێکی ڕەش پێست دەژین کەپێیان دەڵێن لم لم، ئەم گەلەبێ باوەڕن و سەروچاوی خۆیان داخ دەکەن. خەڵکی دانەو تەکرور تالآنیان دەکەن و خەڵکەکەی بەدیل دەگرن و دەیانفرۆشن بەبازرگانەکان و ئەوانیش دەیانبەن بۆ مەغریب و خەڵکی دەیانکڕن و دەبنە بەندەیان. لەپشتەوەی سەرزەوی ئەوان واتەلە باشوریەوە ئاوەدانی نیە و تەنها کەسانێك لەوێدا دەژین کەزیاتر لەگەڵ حەیواناتدان تاوەکو مرۆڤی گۆیاو، لەئەشکەوتەکانی ئەوناوچەیەدا ژیانیان دەگوزەرێننو، خۆراکیان لەسەر دانەوێڵەو گژوگیای خۆڕسك و ڕاوکردن وەستاوەو، هەندێك جاریش گۆشتی مردوی یەکتری دەخۆنەوە، ئەمانە لەڕیزی مرۆڤەکان نین. وە هەموو میوەی وولآتی ڕەش پێستان لەشارە گرنگ و ناوچەدەشتاییەکانی مەغریبن وەك: توات و تیگوراربن و ڤرگلان، هەروەك دەڵێن لەغانادا پادشاو دەوڵەتێك فەرمان ڕەوایی کردووە کەبەبەنی صالح ناسراون.

خاوەنی کتێبی ڕوجر دەڵێت: ئەوصاڵحی کوڕی عبداللەی کوڕی حەسەنی کوڕی حەسەن بووە، بەڵام وەها صالح ناوێك لەخانەوادەی عبداللەی کوڕی حەسەندا ناسراو نیەو ئێستەش ئەودەوڵەتە لەناوچووە و غانا لەژێر فەرمان ڕەوایی پاشای مالی دایە. وەلەناوچەی خۆرهەڵاتی غانا لەبەشی سێیەمی ئەم هەرێمەدا شاری گوگو[197] لەکەناری ڕووبارێکەوەیەو لەهەندێك لەکێوەکانی ئەو ناوچەیەوە سەرچاوە دەگرێت و بەرەو مەغریب دەڕوات و دەڕژێتە زۆنگاوەکانی بەشی دووەمەوە. پاشای گوگو سەرەتا سەربەخۆ بووەو، دواتر پاشای مالی زاڵبووە بەسەریداو ئەوشارەی بەیەکێك لەدەستکەوتەکانی خۆی زانیوە. لەم ڕۆژگارەدا شاری گوگو بەهۆی ئەو فیتنەیەی کەلەوێدا ڕوویداوە وێران بوە، هەربۆیە لەکاتی باسکردنی دەوڵەتی مالیدا لەشوێنی خۆی باسی دەکەین. لەبەشی باشوری شاری گوگو وولاتی کانم[198] هەیە کەنەتەوە ڕەش پێستەکانی تێدا دەژین و لەپاش ئەویش ڤنغارەیە کەلەکەناری باکوری نیلەوەیە و لەلای خۆرهەلاتی وولاتەکانی ڤنغارەو کانم شارەکانی زغاوەو تاجوە بونیان هەیە. کەپەیوەستن بەسەرزەوی نوبی یەوە لەبەشی چوارەمی ئەم هەرێمەدا. وەنیلی میسریش کەلەسەرچاوەکەیەوە بەلای هێڵی ئیستیوادا دەڕوات لەوناوچەیەوە تاوەکو دەریای ڕۆم لەبەشی باکورەوە تێپەڕدەکات. وەسەرچاوەی ئەم نیلەش لەکێوی قەمەرەوەیە کەشانزە دەرەجە لەسەرو هێڵی ئیستیواوەیە. لەنوسینی ئەم وشەیەدا جیاوازی هەیە، هەندێك بەفەتحەی قاف و میم دەیخوێننەوە و دەیدەنەپاڵی قەمەری ئاسمان بەهۆی سپیەتی و درەخشانیەکەیەوە. وەلەکتێبی هاوبەشی یاقوتدا بەزەمەی قافەکەو سکونی میمەکە هاتووە و مانای گەلێك دەگەیەنێت لەدانیشتوانی هیند و ئیبن سەعیدیش بەم شێوەی خوێندوویانەتەوە.

---

[197] شارێکی ڕەش پێستانە لەنەیجیریا.

[198] شارێکەلەکەناری نیل.

لەم کێوەوە دە سەرچاوە هەڵدەقوڵێن کەهەرپێنج دانەیان لەیەك دەریاچەدا کۆدەبنەوە و لەنێوان دوو دەریاچەی ناوبراودا شەش میل ماوەیە.

لەهەریەکەلەوان سێ ڕووبار دێتەدەرەوە کەهەموویان لەیەك شوێنەوە سەرچاوە دەگرن. لەبەشی خوارەوەیدا دەدات لەکێوێك و دەریاچەکەلەلای باکورەوە لەت دەکات و دەیکات بەدوو بەشەوە. بەشی خۆرئاوای لەلای مەغریبەوە لەووڵاتی سودان تێپەڕدەبێتو دەڕژێتە دەریای موحیتەوە. بەشی خۆرهەڵاتی بەرەو لای باکوردەڕوات و ناوچەکانی مەمالیکی حەبەشەو نوبی و ناوچەکانی نێوانیان کەلەکەناری ئەودان. لەسەرو سەرزەوی میسرەوە دەبێت بەچەند بەشێکەوە کە بەشێکی نزیکی ئەسکەندەریە و دووەمیان نزیکی ڕەشید و سێیەمیشیان لەنزیك دمیات دەڕژێتە دەریای ڕۆمەوە. بەشەکەی تری بەرلەوەی کەبگاتە دەریای ڕۆم لەناوەڕاستی ئەم هەرێمەدا نوقم دەبێت. ئەوناوچەو شارانەی کەکەوتونەتەسەرکەناری ئەم نیلەبریتین لە: مەمالیکی نوبەو حەبەشەو هەندێك لەشارەکانی واحەکان تاوەکو ئەسوان. پایتەختی ووڵاتی نوبە شاری دنقلەیە کەلەبەشی خۆرئاوای ئەم نیلەدایە لەپاش ئەویش علوە و بلاق و شاخی جەنادیل دەبینرێت کەکەوتووەتەدووری ماوەیەك کەبەئەندازەی شەش ڕۆژ ڕێکردنی کاروانیەکان دەبێت لەباکوری بلاق دایەو وەلەولای میسرەوە کێوێکی بەرز و لەلای نوبە بەنزم دەبینرێت هەربۆیە نیل دەچێتەناویەوە و، بەناویدا دەڕوات و لەچۆمێکی قوڵدا بەشێوەیەکی سەخت و ترسناك دەڕژێت بەجۆرێك ناگونجێت بەبەلەم بەناویدا گوزەر بکەیت. بەڵکوخەڵکی سودان کاڵا بازرگانیەکانیان بەسەرپشتی ووڵاخەکان دەبردە شاری ئەسوان ناوەندی صەعید.

وەهەروەها کاڵاکانی صەعید تاوەکو تاڤگەکانی جەنادیل بەم شێوەیە دەگوازنەوە. وەلەنێوان کێوی جەنادیل و ئەسوان دوانزە ڕۆژی کاروانیەکان ماوەیە. لەبەشی خۆرئاوای ئەم ناوچەیە واحات لەسەر کەناری ڕووباری نیل دایە. ئەم ناوچەیە ئێستاکە وێرانەیە، بەڵام شوێنەواری کۆنی ئاوەدانی تێدا دەبینرێت. وەلەناوەڕاستی بەشی پێنجەمدا ئەم

هەرێمەی وولآتی حەبەشە لەکەنار ڕوبارێکدایە(نیل)کەلەپشتەوەی هێڵی ئیستیواوە دێتو بەرەو سەرزەوی نوبەدەڕوات و لەوێدا دەڕژێتە ناونیلێك کەدەچێتە ناومیسرەوە. زۆرێك لەخەڵکی گومانیان کردووە ئەم ڕووبارە لەبەشەکانی نیلی قەمەرە، بەلآم بەتلیموس لەکتێبی جوگرافیاکەیدا باسی کردووە وگوتوویەتی کە ڕووباری ناوبراو لقی ئەم نیلە نیە. وەدەریای هیند لەناوەڕاستی بەشی پێنجەمی ئەم هەرێمەدا کۆتایی دێت. ئەم دەریایە لەناوچەی چینەوە دەست پێدەکات و سەرتاسەری ئەم هەرێمە تاوەکو بەشی پێنجەم دەگرێتەوە. هەربۆیە لەم بەشەدا ئاوەدانیەك نامێنێتەوە بێجگە لەوەی کەلەدورگەکانی ئەدەریایەدا بونیان هەیە. ئەم دوورگانەش ژمارەیان زۆرەوهەروەك دەڵێن دەگەنە نزیکەی هەزاردورگە، وەیان ئەو شوێنانەی کەلە کەنارەکانی باشوری ئەودان، کەبەکۆتائاوەدانی باشور دەژمێردرێن، یان هەندێك شوێنی ئاوەدانی ئەم بەشە کەکەوتونەتەکەنارەکانی باکوری ئەودەریایەوە. کەبێجگە هەندێك لەشارەکانی چین نەبێت لەخۆرهەلآت و وولآتی یەمەن ئەوانی تر بەهەرێمی یەکەم ناژمێردرێن. وەلەبەشی شەشەمی ئەم هەرێمەدا لەنێوان دوو دەریا کەلەدەریای هیندەوە جیا دەبنەوە و دەڕژێنەبەشی باکورەوە واتەلەدەریای قەلزەم و دەریای فارس (دورگەی عەرەبی)دایە کەلەسەرو وولآتی یەمەن و شەحەردایە، کەلەبەشی خۆرهەلآتیەوە کەوتونەتەکەناری دەریای هیندەوە، وە وولآتی حیجازو یەمامەو ناوچەکانی دەگرێتەوە هەروەك چۆن لەهەرێمی دووەم وهەرێمەکانی دواتردا باسیان دەکەین.

وەلەکەناری خۆرئاوای ئەم دەریایەوە شاری زالیع لەناوچە سنوریەکانی حەبەشەو چادرگەکانی بجە دایە، ئەم خێوەتگایانە دەکەونە باکوری حەبەشە لەنێوان کێوی عەلاقی لە بەشی سەرەوەی صەعید، و دەریای قەلزەم کەلەدەریای هیند جیادەبێتەوە و لەناوچەکانی ژێرەوەی زالیع لەبەشی باکور لەم بەشەدا تەنگەی باب المندب دەریای ناوبراو لەم ناوچەیەدا تەسك دەکاتەوەو، هۆکارەکەشی کێوی مندبە کەبەناوەڕاستی دەریای هیند دا دەڕوات و لەگەڵ کەناری یەمەن لەباشورەوە بۆباکور بەدرێژایی

دوانزەمیل دەبێت و لەئەنجامدا دەریاکە باریك دەبێتەوە تاوەکو دەگاتە پانی سێ میل یان نزیك لەسێ میل. بەم بەشەش دەڵێن باب المندب. کەشتیەکانی یەمەن تاوەکو کەنارەکانی سویس لەنزیك میسر لەم شوێنەوە تێدەپەڕن. لەبەشی خوارەوەی باب المندب دورگەکانی سەواکین و دهلیك هەن. لەبەرامبەریشیەوە لەڕووی خۆرئاواوە خێوەتگەکانی بجە هەن کەتایبەت بوون بەگەلەڕەش پێستەکانەوە (سودان)هەروەك باسمان کرد. وە لەکەنارەکانی خۆرهەڵاتی دەریای ناوبراو لەم بەشەدا تەهائیمی یەمەنن، لەوانەش شاری عەلی کوڕی یەعقوب ئەوانی تێدا دەژی. وەلەلای باشورەوە شاری زالیع و لەکەناری خۆرئاوای ئەم دەریایەوەگوندەکانی نەتەوەی بەربەر یەك لەدوای یەك دەبێنرێن. هەروك چۆن بەدرێژایی بەشی باشوری دەریاکە لاردەبێتەوە و تاوەکو کۆتایی بەشی شەشەمی ئەم هەرێمە درێژ دەبێتەوە. لەبەرامبەرلای خۆرهەڵاتی هەمان ناوچەدا وولاتی زنگبار هەیە، و لەپاشان شاری مەقدیشۆ هەیەکەزۆر ئاوەدانەو پڕە لەبازرگانی زۆرو لەکەنار دەریای هیندیەوەیە. وەلەپاشان وولاتی سفالە کەوتووەتە کەناری باشوری دەریای هیندلەبەشی حەوتەمی ئەم هەرێمەدا وەلەلای خۆرهەڵاتی سفالەوە لەکەنار خۆرئاواوە وولاتی واقواق هەیە، کەلەدەرگای بەش بەش بوونی ئەم دەریایەوە لەدەریای موحیتەوەپەیوەستە تاوەکو کۆتایی بەشی دەیەمی ئەم هەرێمە، بەڵام دورگەکانی ئەم دەریایە زۆرن، وەك سرندیب (سیلان)کەبەگەورەترینیان دەژمێردرێت و لەشێوەی بازنەدایەو کێوێکی بەناوبانگی تێدایە کەدەڵێن لەسەر زەویدا لەوکێوە بەرزتر نیەو، ئەم دورگەیەش ڕووبەڕووی سفالەیە. لەپاش ئەویش دورگەی قەمەر دەبینرێت کەلاکێشەییەو لەڕووبەڕووی سەرزەمینی سفالەوە دەست پێدەکات بەرەوخۆرهەڵات و بەلاریەکی زۆرەوە بەرەوباکور، درێژ دەبێتەوە تاوەکولە کەنارەکانی سەرەوەی باشوری چین نزیك دەبێتەوە. لەم دەریایەدا دورگەکانی واقواق لەلای باشورو دورگەکانی سیلا و زۆرێك لەدورگەی جۆراوجۆری ترلەلای خۆرهەڵاتەوە هەن. چەندین جۆری بۆن خۆشی و دەرمان

بونیان هەیە و دەڵێن کەکانزای زێڕو زیوو زومڕوت هەیەو زۆربەی خەڵکەکەی مەجوسین (ئاگرپەرست)و پاشاگەلێکی زۆر فەرمان ڕەواییان دەکەن.

جوگرافی زانان، لە چۆنیەتی ئاوەدانی دورگەکانی ناوبراودا شتانێکی سەرسوڕهێنەریان باسکردووە. وەلەکەناری باکوری ئەم دەریایەدا لەبەشی شەشەمی ئەم هەرێمەدا هەموو وولآتی یەمەن هەیە، هەروەك چۆن لەلای دەریای قەلزەم و شاری زوبەیدو موهجەم و توهامەی یەمەن و لەپاشان شاری صەعدە بنکەی پێشەوایەتی زەیدیەکانە. ئەم شارە لەدەریای باشورو دەریای خۆرهەلآتەوە دوورە. لەپاش ئەمانیش شاری عەدەن و لەلای باکوریەوە صەنعا یەو بەشوێن هەردووشاری ناوبراودا لەلای خۆرهەلآتەوە، سەرزەوی ئەحقاف و زەفار و سەرزەوی حەزرەمەوت، و لەپاشان وولآتی شەحر کەوتووەتە نێوان دەریای باشورو دەریای فارسەوە. ئەم پارچەیە لەبەشی شەشەم یەکێکەلەو خالآنەی کەدەریا داینەپۆشیوە و هەروەك بەشەکانی تری ناوەندی ئەم هەرێمە نەبوەبەژێر ئاوەوە. لەپاش ئەویش هەندێکی کەم لەبەشی نۆیەمی ئەم هەرێمەو بەشێکی زیاترلەبەشی دەیەم لەئاوەکەدا دەرکەوتوە کەبەشەکانی سەرەوەی (باشور)ی چین هەیە کەشارە بەناوبانگەکانی بریتین لە: خانکو لەلای خۆرهەلآت کەلەبەرامبەریەوە دورگەکانی سیلا هەن کەپێشتر باسمان کردن. ئەمەش قسەی کۆتایی ئێمەیە لەبارەی هەرێمی یەکەمەوە، و خوداش پشت و پەنای چاکەخوازانە.

**هەرێمی دووەم:** ئەمەش لەڕووی باکورەوە پەیوەستە بەهەرێمی یەکەمەوە و لەڕووبەڕوی خۆرئاوایەوە لەدەریای موحیتەوە دوودورگە لەدورگەکانی خالیدات کەپێشتر باسمان کردن بوونیان هەیە. وەلەبەشی باشوری بەشی یەکەم و دووەمدا سەرزەمینی قنوریە هەیەو ئەوکات لەلای خۆرهەلآتەوە باشوری سەرزەمینی غانایەو لەپاشان خێوەتگەکانی زغاوە دەبینرێت کەڕەش پێستەکانی تێدا دەژین. وەلەلای خوارەوە(باکور)ی ئەودووبەشەوە، بیابانی نیسەر لەخۆرئاواوە بۆ خۆرهەلآت پەیوەستە بەوانەوە و خاوەن بیابان گەلێکە کەبازرگانەکان ماوەی نێوان وولآتی مەغریب و

سەرزەوی ڕەش پێستەکان (سودان)لەوانەوە تەی دەکەن و خێوەتگەکانی دەمامك دارانی صەنهاجە لەم چۆڵەوانیەدایە. ئەمانەش گروپ گەلێکی زۆری دەشتەکی پێك دەهێنن وەك نەتەوەکانی بوداله و لمتونە مەسوفە و لمتەو تریگە. وەلەلای خۆرهەلاتی ئەم دەشتەچۆڵەوە سەرزەوی فزان و لەپاشان خێوەتگەکانی ئازگار لەهۆزەکانی بەربەرن کەتاوەکو بەشەکانی سەرەوەی (باشور)ناوچەکانی خۆرهەلاتی بەشی سێیەمی ئەم هەرێمە درێژ دەبێتەوە. ئەوکات لەم بەشەدا وولاتی کواری ڕەش پێستان دەبینرێت. لەپاشان بەشێك لەزەویەکانی تاجوە لەوێداهەڵکەوتووە.

وەلەبەشەکانی خوارەوەی ئەم بەشی سێیەمەدا واتە لەلای باکوریەوە پاشماوەی سەرزەوی ویدان هەیە و لەلای خۆرهەلاتیشیەوە سەرزەوی سنتریە دەبینرێت و پێیان دەڵێن واحەی ناوەوە. لەباشوری بەشی چوارەمدا پاشماوەی زەویەکانی تاجوە بونیان هەیە. ئەوکات لەناوەندی ئەم بەشەداوولاتی صەعید لەهەردوو کەناری ڕووباری نیلەوەیە کەلەسەرچاوەکەیەوە لە هەرێمی یەکەمەوە دەڕوات تاوەکو سەرئەنجام دەڕژێتە دەریاوە. لەم بەشەدا ڕووباری نیل بەنێوان دوو کێودا گوزەر دەکات: یەکێکیان کێوی واحاتە لەمەغریب و ئەوی تریان کێوی مەقتەمە. لەخۆرهەلات و کەناری باکوریەوە هەردوو شاری ئەسنەو ئەرمنت هەن، وەهەروەها بەدرێژایی هەردوو کەنارەکەی شارەکانی ئەسیوت و قەوس و لەپاشان صەول دەبینرێن. لەوێدا نیل دەبێت بەدوو بەشەوە کەلقەڕاستەکەی لەم بەشەدا بەلاهون و لقەچەپەکەیشی بەدلاص کۆتاییان دێت و لەنێوان هەردوو لقی ناوبراودا ناوچەکانی باشوری وولاتی میسر بونیان هەیە. وەلەخۆرهەلاتی کێوی مەقتەم بیابانەکانی عیزابە کەلەبەشی پێنجەمی ئەم هەرێمەدا درێژ دەبێتەوە تاوەکو سەرئەنجام دەڕژێتە دەریای سویسەوە و کۆتایی دێت. ئەمەش هەمان ئەو دەریایە کەبەقەلزەم ناسراوە و لەدەریای هیند جیا دەبێتەوە لەباشورەوە بەرەوباکور درێژ دەبێتەوە. وەلەکەناری خۆرهەلاتیەوە لەم بەشەدا سەرزەمینی حیجازە کەلەکێوی یلملم تاوەکو وولاتی یەسریب (مەدینە)درێژ دەبێتەوە و کەوتوەتە ناوەندی

حیجاز لەمەککەدایە کەخودا ڕێزی لێناوە. لەکەناریشیەوە شاری جەدە هەیە، کەلەبەرامبەر شاری عیزاب لەکەناری خۆرئاوای ئەم دەریایەدایە. وەلەبەشی شەشەمی ئەم هەرێمەدا وولاتی نەجد لەلای خۆرئاواوە دەبینرێت کەبەشی سەرەوەی لەباشوری تبالەو جریش تاوەکو عوکاز کەلەباکوردایە دەگرێتەبەرو لەم بەشەدا پاشماوەی سەرزەمینی حیجاز لەژێر نەجدەوەیە و لەلای خۆرهەلاتیەوە وولاتی نەجران و خەیبەر ولەژێر ئەوانیشەوە سەرزەوی یەمامەیەو لەلای خۆرهەلاتی نەجرانەوە سەبەئو مەئرەب و زەویەکانی شەحر هەن. ئەم بەشە بەدەریای فارس کۆتایی دێت کەدووەمین دەریای جیابوەیەلە دەریای هیند و بەرەو باکوردەڕوات هەروەك پێشتر باسمان کرد، بەلام لەم بەشەدا بەرەو مەغریب لاردەبێتەوە و ئەوکات لەنێوان باکور و خۆرهەلاتی ئەو پارچە سێگۆشەیەدا تێدەپەڕێت. لەبەشی سەرەوەیدا قەلهات هەیە و بەکەنارەکانی شەحر دەژمێردرێت. ئەوکات لەژێر قەلهاتەوە لەکەناری هەمان دەریاوە وولاتی عوممان هەیەو لەپاشان سەرزەوی بەحرەین و هەجەر لەکۆتایی بەشەکەوەیە. لەبەشی سەرەوەی لاکانی خۆرئاوای بەشی حەوتەم بەشێك لەدەریای فارس دەبینرێت کەپەیوەستە بەبەشێکی تری بەشی شەشەمەوە و دەریای هیند سەرتاسەری باشوری ئەم بەشەی گرتوەتەوە. لەکەنارەکانی ئەم بەشەدا وولاتی سیند تاوەکو مەکران بونیان هەیە و لەبەرامبەریەوە وولاتی توبران هەیە کەلە ناوچەکانی سیند دەژمێردرێت. کەواتە هەموو سیند لەلای خۆرئاوای ئەم بەشەوە پەیوەستن بەیەکەوە و لەنێوان سیندو هیندا دەشتێکی چۆلی فراوان هەیە. ڕووباری سیند کەلە ناوچەکانی کیشوەری هیندەوە دێت بەو سەرزەمینەدا دەڕوات و لەباشوردا دەڕژێتە دەریای هیندەوە. وەلەسەرەتای وولاتی هیندو لەکەناری دەریای هیند و لەخۆرهەلاتی سیند وولاتی بلهرا لەژێرەوەی (باکور)ملتان هەیە کەناوەندی بتی جێگەی ڕێزی خەلکی ئەوناوچەیە. ئەم بەشەش لەناوچەکانی خوارەوەی (باکوری)سیند تاوەکو بەشەکانی باشوری سیستان درێژ دەبێتەوە. لەبەشی خۆرئاوای بەشی هەشتەمی ئەم هەرێمەدا پاشماوەی وولاتی بلهرا لەناوچەکانی هیند هەیە، لەلای

خۆرهەڵاتیشیەوە وولاّتی قەندەهارو منیبار دەبینرێن و لەسەرەوەش (باشور)لەکەنار دەریای هیندو ژێرەوەی ئەو بەشەدا لەلای خوارەوە (باکور)کابولّ هەیە. لەپاشان و لەناوچەی خۆرهەڵاتی کابولّ و منیبار وولاّتی قنوج هەیەو کەتاوەکو دەریای موحیت درێژ دەبێتەوە و کەوتوەتە نێوان کشمیری دەرەکی و ناوەکیدا لەکۆتایی ئەم هەرێمەوە. لەلای خۆرئاوای بەشی نۆیەمی ئەم هەرێمەدا وولاّتی هیندی سەرەوە هەیەکەتاوەکو ناوچەی خۆرهەڵاتی ئەم بەشە پەیوەستن بەیەکەوە.

لەئەنجامدا بەشی سەرەوەی (باشور)ی دەلکێت بەبەشی دەیەمەوە و لەبەشی خوارەوەشدا (باکور)ی ئەم ناوچەیە بەشێك لەوولاّتی چین هەیە کەشاری خیفونی تێدایە، لەپاشان وولاّتی چین لەهەموو بەشی دەیەمدا درێژ دەبێتەوە تادەگاتە دەریای موحیت. خوداو پێغەمبەرەکەی زاناوداناترن و تەواوی هەرشایەنی ئەوە هەرئەوە بەخشندەو میهرەبان و خاوەن رێز.

**هەرێمی سێیەم:** ئەمەش لەلای باکورەوە لکاوە بەهەرێمی دووەمەوە و نزیکەی یەك لەسەر سێی بەشی سەرەوەی (باشور)کێوی درن دەبینرێت کەلەلای خۆرئاواوە لەکەنار دەریای موحیتەوە بۆ خۆرهەڵات لەنزیك کۆتایی ئەوبەشەدا درێژەی هەیە. لەم کێوەشدا هۆزە جۆراو جۆرەکانی بەربەر دەژین کەبێجگە لەخودا هیچ کەس ژمارەیان نازانێت، دواترباسیان دەکەین. وەلەکەناری دەریای موحیت لەوبەشەی کەئەم کێوە لەهەرێمی دووەم جیادەکاتەوە ریباتی ماسە بونی هەیە. وە وولاّتەکانی سوس و نول لەلای خۆرهەڵاتەوە پەیوەستە بەریباتی ماسەوە و شارەکانی سجلماسەو دەرعەدەبینرێن و بەشێکیش لەبیابانی نیسر بەرچاو دەکەوێت، واتە هەمان ئەودەشتەچۆلّ و بیابانەی کەلەباسی هەرێمی دووەمدا خرایە بەرباس. وە کێوی درن سەرتاسەری وولاّتی ئەم بەشەی دەورە داوە. لەم ناوچەیەشدا کەل و مل و رێگەگەلێکی کەمی هەیە ئەم بارودۆخەش هەروا بەردەوامە تائەوەی کەکێوی ناوبراو دەکەوێتە بەرامبەر رودملویە و ئەوکات رێگەو کەلو ملەکانی زۆردەبن و تاوەکو کۆتاییەکەی بەردەوام دەبن، لەم

ناوچەیەشدا گروپێك لەهۆزەکانی مەصمودە و سکسیوە دەژین لەنزیك دەریای موحیت. ئەوکات کومەڵێك هۆزی تر دەژین وەك: هنتانە تین ملل گودمیوە ئانگاهسکورە ئەم هۆزە ئاخرین گروپی موصامیدەیە لەوناوچەیەدا. لەپاشان دەگەینەناوچەی هۆزی صەنهاجە و لەکۆتایی ئەم بەشەدا هەندێك لەهۆزی زناتە دەژین. بەشی

باکوری کێوی ئوراس کەهەمان کێوی کتامەیە پەیوەستەبەم بەشەوە. لەم ناوچەیەدا گەلانێکی وەك بەربەر دەژین کەلەشوێنی خۆیدا باسی دەکەین. وەکێوی درن لەلای خۆرئاواوە دەڕوانێت بەسەر وولاتی مەغریبی سەرەوەدا و ئەم وولاتە لەلای باکورەوە وولاتەکانی مەراکیش و ئیغمات و تادلە دەبینرێن، وەلەکەناری دەریای موحیت لەوناوچەیەدا ریباتی ئەسفی و شاری سلاست هەن کەبەبەشێك لەوولاتی مەغریبی سەرەوە دەژمێردرێن. وەلە باکوری وولاتی مەراکیشدا شارەکانی فاس و میکناسەو تازاو کۆشکی کەتامە هەن. ئەم ناوچانەیە کەلەنەریتی خەڵکی ئەوسەرزەویەدا بەمەغریبی سەرەوە ناسراوە لەوانەش هەردوو شاری ئەصیلەو عەریش لەکەناری دەریای موحیتدان. لەبەشی خۆرهەلاتی ئەم وولاتەش مەمالیکی مەغریبی مەرکەزی (مەغریبی ناوەڕاست)هەن کەپایتەختەکەیان تلمسانە. لەکەنارەکانی دەریای ڕۆم لەوناوچەیەدا شاری هەنین و وەهران و ئەلجەزایر بونیان هەیە، چونکە ئەم دەریای ڕۆمە لەدورگەی تەنجە لەناوچەی خۆرئاوای هەرێمی چوارەمدا لەدەریای موحیت جیادەبێتەوە بەرەو خۆرهەلات دەڕوات تاوەکو لەوولاتی شامدا کۆتایی دێت و، هەرئەوەندەی کەکەمێك لەم تەنگەیە تێدەپەڕێت لەلای باشورو باکورەوە فراوان دەبێت و دەچێتە هەرێمی سێیەم وپێنجەمەوە، هەربۆیە لەکەناری زۆرێك لەوولاتەکانی ئەم هەرێمە (سێیەم)دایە، کەیەکەمیان تەنجەو قەصری بجوك و سیبتەو بادیس و غەسەیە.

لەپاشان لەلای خۆرهەلاتی وولاتی ئەلجەزیرە شاری بجایە لەکەناری دەریاوە پێوەی لکاوە و قوستەنتینیەش لەخۆرهەلاتی بجایەدا لەکەناردەریاوەیە بەئەندازەی ماوەی ڕۆشتنی یەك شەوو ڕۆژی کاروانێك لەدەریاوە دوورە. لەیەکەمین بەشی هەرێمی

سێیەمداو لەباشوری ئەم ناوچەیە ئەگەر بەرەو باشوری خۆرئاوای ناوەندەوە بەرەوپێشەوە بچین ئەم شارانەدەبینین: یەکەم ئەشیر کەلە کوێستانی تیتریدایە ودواتر مسیلە زاب کەبسکرەی پایتەختەکەی لەبەردەم کێوی ئوراسدایە هەروەك گوتمان ئەم کوێستانە بەسراوە بە ناوچەی ئەتڵەسەوە. کەئەویش لەکۆتایی بەشی یەکەم لەلای خۆرهەلاتەوەیە. وەبەشی دووەمی ئەم هەرێمە وەك بەشی یەکەم وایە لەو ڕووەوەی کە نزیکەی یەك لەسەرسێی باشورەکەی کێوی درن داپۆشیوە و لەخۆرئاواوە بۆ خۆرهەلات درێژ دەبێتەوە و دەیکات بەدوو بەشەوە. دەریای ڕۆم بەشی باکوری داپۆشیوە و بەشی خۆرئاوای بەشی باشوری کێوی درن هەمووی بیابانە. لەخۆرهەلاتیشیەوە شاری غدامس دەبینرێت و لەلای خۆرهەلاتیشەوە سەرزەوی ویدان هەیە، کەپاشماوەکەیمان لەهەرێمی دووەمدا باسکرد. وە ئەوبەشەی کەلەباکوری کێوی درن دایە لەنێوان ئەوکێوەو دەریای ڕۆمدا، و لەناوچەی خۆرئاوایدا کێوی ئوراس و تبسە و لربس هەن. لەکەنار ئەم دەریاشەوە شاری بونە دەبینرێت. لەپاشان لەبەشی خۆرهەلاتی ئەم وولاتە ئەفریقا هەیەو لەکەنار دەریاشەوە بەشێوەیەکی ڕێك شاری تونس هەیە کەلەنزیك دەریاوەیە، ئەوکات سوسەو مەهدیە دەبینین لەباشوری ئەم شارانە لەبەردەم کێوی درن بوونیان هەیەوەك: وولاتی جەرید وەك توزەر قفصە نفزاوە. لەنێوان ئەم ناوچەیەو بەشەکانی کەناریدا شارەکانی قەیرەوان و کوێستان و شەلات و سبیتلە دەبینرێن. لەلای خۆرهەلاتی هەموو ئەم شارانەوە وویلایەتی تەرابلوس لەکەنار دەریای ڕۆمەوە دەبینرێت لەبەرامبەریشیەوە لەلای باشور کێوی دمرهەیە کەمەگارە بەشێك لە هۆزەکانی هەوارەی تێدا دەژین و خانووەکانیان پەیوەستن بەکێوی درنەوە.

لەبەرامبەر ئەم کوێستانەوەو لەکۆتایی بەشی باشوری ئەم بەشەدا شاری غدامس دەبینرێت کەپێشتر ناومان هێنا. وەلەکۆتایی خۆرهەلاتی ئەم بەشەوە سویقەی ئیبن مەشکورە لەکەنار دەریاکەوە دەبینرێت. لەباشوری ئەم ناوچەیەدا خێوەتگەکانی عەرەب لەسەرزەویدان. وە کێوی درن لەبەشی سێیەمی ئەم هەرێمەدا دەڕوات و، بەلام

لەکۆتاییەکەیدا بەرەو لای باکور لار دەبێتەوەو بەهەمان ئاراستە دەڕوات‌و تاوەکو دەڕژێتە دەریای ڕۆمەوە کەبەدەماغەی ئەوسان ناسراوە. وەدەریای ڕۆم لەلای باکورەوە بەشێك لەم بەشەی گرتوەتەوە تاوەکو لەنێوان ئەوناچەیەو کێوی درن تەنگەبەریەك دروست بووە ئەوەشی لەپشت ئەم کێوەوە بەرەو باشورو خۆرئاوا درێژ دەبێتەوە و پاشماوەی سەرزەوی ویدانە کەخێوەتگەکانی عەرەبی لێیە. ئەوکات ناوچەی زویلەی بن خەتابە و لەپاش ئەویش تاوەکو کۆتایی خۆرهەلاتی ئەم بەشە سەرزەویەکانی قەفر بوونیان هەیە. وەلەنێوان کێوو دەریا لەلای خۆرئاواوە شاری کەناری سیرت هەیە. لەپاشان ناوچە چۆڵەکانن کەعەرەبەکان هاتوچۆی تێدا دەکەن، ئەوکات ئەجدابیاو بیرقە لەنزیك لاری کێوەکەدان. لەپاش ئەویش تلمسە لەکەنار دەریاوە لەو ناوچەیەدا دەبینرێت. لەپاشان لەخۆرهەلاتی لاری کێوەکەدا خێوەتگەکانی هیب و رواحە هەن کەتاوەکو کۆتایی ئەم بەشە درێژ دەبێتەوە. وەلەبەشی چوارەمی ئەم هەرێمەدا لەلای باشوری خۆرئاوایەوە بیابانەکانی برنیس بونیان هەیە، لەلای باکوریشیەوە وولاتەکانی هیب و رواحە دەبینرێن، لەپاشان دەریای ڕۆم لەم بەشەدا بەرەو پێشەوە دەچێت و بەشێکی تاوەکو باشور دەگرێتەوە نزیکی سنوری باشوری دەبێتەوە. لەنێوان دەریاو کۆتایی ئەم بەشەدا دەشتە بێ ئاوو گیاکان دەمێننەوە کەعەرەبەکان هاتوچۆی تێدا دەکەن. لەلای خۆرهەلاتیەوە وولاتی فیوم کەوتووەتە ڕژێنگەی یەکێك لەلقەکانی نیلەوە، وە ئەم لقە بەلاهون کە یەکێکە لەناوچەکانی صەعید ولەبەشی چوارەمی هەرێمی دووەمدایە تێدەپەڕێت‌و دەڕژێتە دەریاچەی فیومەوە. لەلای خۆرهەلاتی هەمان بەشدا سەرزەوی میسر هەیە و شارە بەناوبانگەکەی لەدووەمین لقدایە کەلەدلاص کەیەکێکە لە ناوچەکانی صەعید و لەنزیك کۆتایی بەشی دووەمی ئەم هەرێمەوە دەگوزەرێت. ئەم لقە جارێکی تر لەخوار میسرەوە (قاهیرەی کۆن)لەشەتنوف و زفتی یەوەدەبێت بەدوو لقی ترەوەو هەموویان دەڕژێنەدەریای ڕۆمەوە. لەڕژێنگەی لقی خۆرئاوای شاری

ئەسکەندەریەو لەڕژینگەی لقی ناوەڕاستی شاری ڕەشیدو لەڕژینگەی لقی خۆرهەڵاتیانەوە شاری دمیات هەیە.

وەلەنێوان میسرو قاهیرەو ئەم کەنار دەریایانەدا بەشی خوارەوە (باشور)ی میسر سەرانسەر ئاوەدانەو زەویەکانی پڕ لەکشتوکاڵن. وەلەبەشی پێنجەمی ئەم هەرێمەدا وولاتی شام یان بەشی هەرە زۆری ئەو هەیە بەم شێوەیەکە: دەریای قەلزەم لەباشوری خۆرئاوای ئەم بەشە لەنزیك سویس کۆتایی دێت، چونکەهێڵی ڕۆشتنی دەریای ناوبراو کەسەرەتاکەی لەدەریای هیندەوە بەرەو باکور دەستپێدەکات و بەلاریەوە بەرەو خۆرئاوا دەڕوات، هەربۆیە پارچەیەکی درێژ لەولاریە لەم بەشەدا دروست دەبێت لەناوچەی خۆرئاوایەوە بەرەو سویس کۆتایی دێت و لەم بەشەدا لەپاش سویس فاران و کێوی تورو ئیلەی مەدیەن لەدوای ئەویش لەکۆتایدا حەورا هەیە، لێرەوە کەنارەکەی بەرەو باشور لەسەر زەوی حیجازدا لاری پەیدا دەکات هەر وەك لەبەشی پێنجەمی هەرێمی دووەمدا باسکرا. وەلە ناوچەی باکوری ئەم بەشەدا بەشێك لەدەریای ڕۆمو ناوچەیەکی گەورەی خۆرئاوا دەگرێتەوە و فەرماو عەریش لەوێدان کەنارەکەی نزیکە لەشاری قەلزەمەوە لێرەوە، ماوەی نێوان هەردوو دەریای ناوبراو تەسك دەبێتەوەو بەشێك کەلەشێوەی دەرگا دایە دەمێنێتەوەو لەسەر زەوی فارسدا کۆتایی دێت. وەلەلای خۆرئاوای ئەم دەرگایەوە فەحص ئەلتیە هەیە کەسەرزەویەکی ڕووتە لەگژوگیاو سەوزایی. وەماوەی چل ساڵ خێوەتگەی بەنی ئیسرائیل بووە، واتە(لەدوای دەرچونیانەوە لەمیسرو بەر لەچونیان بۆشام)، هەروەك قورئان باسی کردووە. لەم بەشەی دەریای ڕۆمدا بەشێك لەزەویەکانی دورگەی قوبرس دەبینرێن کەلقێکی ئەم بەشەن و پاشماوەکەی لەهەرێمی چوارەمدایە، هەروەك باسی دەکەین. وەلەکەناری ئەم بەشەدا لەشوێنەی کە دەریای مەدیتەرانە لەدەریای سویسەوە نزیك دەبێتەوە شاری عەریش و عەسقەلانی لێیە، بەجۆرێك عەریش کۆتایی میسرە و لەنێوانیدا دوو کەنار لەم دەریایە هەیە. لەپاشان لاری ئەم بەشە لێرەوە تاوەکو هەرێمی چوارەم تاوەکو نزیك

تەرابلس و غەزە درێژ دەبێتەوە و لێرەدایە کەدەریای ڕۆم لەلای خۆرهەڵاتەوە کۆتایی دێت. کە زۆربەی کەنارەکانی شام کەوتونەتە سەر ئەم بەشەوە، هەروەك چۆن لەخۆرهەڵاتیەوە غەزە و عەسقەلان بونیان هەیە و بەکەمێك لاربونەوە بەرەو باکور شاری قیساریە و عەکا و صور و صەیدا هەیە، ئەوکات لای ئەم دەریایە بەرەو باکور و هەرێمی چوارەم لاربونەوە پەیدادەکات. وەلەبەرامبەر ئەم شارە کەناریەی بەشی ناوبراودا، لەم بەشەدا شاخێکی گەورە هەیە کەلەکەنار ئیلە لەدەریای قەلزەمەوە دەسپێدەکات بەرەو ناوچەی باکور بەلاری بەرەو خۆرهەڵات دەڕوات و، تاوەکو لەم بەشە تێپەڕ دەکات و پێی دەڵێن کێوی لکام کەوەك بەربەست و جیاکەرەوەیەکە لەنێوان زەویەکانی شام و میسردایە، لەکۆتاییەکەیدا لەنزیك ئیلەوە عەقەبەیەك هەیە کەحاجیەکانی میسر لەکاتی گەشتیان بەرەو شاری مەککە بەوێدا تێپەڕدەبن، ئەوکات لەپاش ئەو لەناوچەی باکورەوە ئارامگای ئیبراهیمی خەلیل (ع) لەنزیك شاخی سوراتەوەیە کەلەنزیك کێوی لکامی ناوبراو لەعەقەبەدا بەیەك دەگات و بەرەو خۆرهەڵات دەڕوات و، لەپاشان کەمێك لاردەبێتەوە و لەخۆرهەڵاتیەوە لەم خاڵەدا شاری حیجرو سەرزەوی سەمود و تیما و دەومەت الجندل بوونیان هەیە، کەناوچەکانی باکوری حیجاز پێك دەهێنن‌و لەناوچەی باشوری ئەو کێوەدا ڕەزەوی و قیلاع و خەیبەر هەن. وەلەنێوان کێوی سورات و دەریای قەلزەمدا بیابانی تەبوك دەبینرێت و لەباکوری کێوی سورات لەنزیك کێوی لکام شاری قودس و ئەردەن و لەپاشان تەبەریە دەبینرێن لەلای خۆرهەڵاتی ئەو وولاتەوە غور هەیە، کەتاوەکو ناوچەکانی ئەزروعات و (حوران)درێژ دەبێتەوە. لەلای خۆرهەڵاتی هەمان سەرزەویەوە دەومەت الجندل هەیە کەدەبێتە کۆتایی ئەم بەشە. کۆتایی حیجازیش و لەنزیك لاری کێوی لکام بەرەو باکور لەکۆتایی ئەم بەشەدا شاری دیمەشق و کەوتووەتە بەرامبەر صەیداو بەیروتەوە و ئەم شارانە لەخاڵە کەناریەکان دێنە ئەژمار و کێوی لکام بە ماوەی نێوان شارەکانی ناوبراوو دیمەشقدا تێپەڕدەکات. وەلەلای خۆرهەڵاتی دیمەشقەوە شاری بەعلەبەك و شاری حیمص و لەلای باکوری ئەم بەشەوە شوێنێك هەیە کەکێوی لکامی

تێدا تەواو دەبێتو لەلای خۆرهەڵاتی شاری بەعلەبەك و حیمصدا شاری تدمرو خێوەتگەگەلێك کەشوێنی هاتوو چۆی دەشتەکیەکانە تاوەکو کۆتایی ئەم بەشە درێژ بووەتەوە.

وەلەناوچەکانی باشوری بەشی شەشەمدا ئەم هەرێمە خێوەتگەی عەرەبەکان بووە لە ژێر وولاتی نەجدو یەمامە لەنێوان کێوی عەرج و وولاتی زەماردایە و کەتاوەکو بەحرەین‌و هەجەر لەکەنار دەریای فارسەوە درێژ دەبێتەوە. وەلەبەشەکانی باکوری ئەم بەشەدا لەژێر خێوەتگەی دەشتەکیەکانی شاری حیرەو قادسیە و گۆماوەکانی فورات دەبینرێن، لەپاش ئەوانیش لەناوچەی خۆرهەڵاتی شاری بەصرە هەیە. وەلەبەشەکانی باکوری ئەم بەشەدا دەریای فارسی نزیك لەئەبەدان و ئەبلەوە کۆتایی دێت و ڕووباری دیجلەش لەپاش ئەوەی کەدەبێت بەچەند بەشێکەوە و ڕووبار گەلێکی تر لەفوراتەوە دێنەسەری و لەپاشان هەموویان لەنزیك ئەبەدانەوە دەبنە یەك ڕووبارو دەڕژێنە دەریای فارسەوە. ئەم دەریایە لەبەشە فراوانەکانی باشوری ئەم بەشەدایە لەکۆتایی لای خۆرهەڵات و ئاستی باکوریدا تەنگ دەبێتەوە و لەکەناری خۆرئاوای ئەوبەشانەی باکوردا بەحرەین و هەجەر و ئەحسا و لەبەشی خۆرئاوای ئەم وولاتەدا سەر زەویەکانی خەت‌و زەمارو باقی زەویەکانی یەمامەیە. کە لەکەناری خۆرهەڵاتی ئەوکەنارانەی باشوری فارسدا دەبینرێن و لەم بەشەدا شاخەکانی قەفص و کرمان لەڕووی باکوری دەریای فارسەوەن لەلای کۆتایی ئەم بەشەدا شاخەکانی ناوبراو بەشێك لەم دەریایەیان دەورە داوە کەبەرەو خۆرهەڵات درێژ بووەتەوەو، کۆتا بەشی بەبێ ئەوەی لەم بەشە دووربکەوێتەوە بەرەو باشور درێژ دەبێتەوە و، لەباکوری هورموزدا شاری سیراف و نەجیرم لەکەنار ئەم دەریایەدان لەکەناری خۆرهەڵاتیەوە تاوەکو کۆتایی ئەم بەشەو لەژێر هورموزدا چەند شارێك لەویلایەتی فارس وەك: صابور (شاپور)و دارابگرد و فسا و ئیستەخر و شاهجان و شیراز بوونیان هەیە، شاری کۆتایی ناوەندی هەموویانە لەژێر شارەکانی فارسدا لەلای باکورەوە لەنزیك کەنار دەریاوە وولاتی خوزستانە وەك: ئەهوازو شوشتەرو جوندیشاپور و شوش و

رامهورموز و نمونەی ئەمانە وەك: ئەرجان کەشارێکی سنوری نێوان فارس و خوزستانە. وەلەلای خۆرهەلاتی وولاتی خوزستانەوە کێوەکانی کوردەکانی لێیە کەپەیوەستن بەناوچەکانی ئەصفەهانەوە، نشینگەکانی کوردەکان لەو ناوچانەیە و خێوەتگەکانیان لەپشت ئەوناوچەیەوە لەسەرزەوی فارسدایە کەپێیان دەلێن زموم.

وەکێوەکانی تری قەفەص لەبەشی باشوری خۆرئاوای بەشی حەوتەمدایە لەنزیك ئەوانیشەوە لەلای باشور و باکور وولاتی کرمان و مەکران دەبینرێن نمونەی شارەکانی ئەو ناوچەیەش وەك: ڕودان و سیرجان و جیرفت و بەردەسیر و فەهرەج.. هتد. لەسەرزەوی کرمان لەڕووی باکورەوە بەشەکەی تری وولاتی فارسە کەتاوەکو ئەصفەهان درێژ بووەتەوە، شاری ئەصفەهان لەکەنار ئەم بەشەدا لەنێوان خۆرئاوا باکوریدایە. ئەوکات لەخۆرهەلاتدا وولاتی کرمان و وولاتی فارس و سەرزەوی سیستان و (کوێستان) لەباشورو سەرزەوی کوێستان لەباکوری خۆرئاوادایە وە لەنێوان کوێستانو کرمانو فارسو سیستان لەناوەڕاستی ئەم بەشەدا دەشتاییەکی گەورەیە کەبەهۆی سەختی گوزەر کردن بەناویدا ڕێگەلێکی کەمی هەیە.

شارەکانی سیستانیش وەك: بەست و تاق، بەلام کوێستان لەوولاتی خوراسان دەژمێردرێت و لەشارە بەناوبانگەکانی سەرخەس قهستان کەلەکۆتایی ئەم بەشەدایە. وەلەلای خۆرئاواو خۆرهەلاتەوە بەشی هەشتەمی خێوەتگەکانی خەلخ هەن کەلەنەتەوە خێوەت نشینە تورکەکانن. ئەم خێوەتگایانە لەخۆرئاواوە بە سەرزەوی سیستان و لەباشورەوە بەناوچەی کابولی هیندەوە پەیوەستن لەباکوری ئەم خێوەتگایانە ناوچە کوێستانیەکانی غور هەن و ناوەندەکەشیان غەزنەیە کەوەك بەندەری هیند دەژمێردرێت لەکۆتایی غوریشەوە لەلای باکور وولاتی ئستر ئاباد هەیە و لەپاشان لەباکوری خۆرئاوایدا تاوەکو کۆتایی ئەم بەشە شاری هەرات هەیە کەلە ناوەڕاستی خۆراساندا دەبینرێتو، شارەکانی ئیسفراین و کاشان و بوشنگ و مەرو الرود تالەقان و گوزگان بونیان هەیە و لێرەدا خوراسان بە ڕووباری جەیحون کۆتایی دێت و لەسەر ئەم ڕووبارەش شارەکانی

خۆراسان لەکەنارەکانی خۆرئاوایدا شاری بەڵخ و لەکەنارە کانی خۆرهەڵاتیدا شاری تورموز هەیە.

شاری بەڵخ پایتەختی تورکەکان بووە و ئەم ڕووبارە واتە ڕووباری جەیحون لەشاری ڤیخاب لەسنوری بدخشان لەوبەشەی کەهاوسنوری هیندە، دێتە دەرەوە و لەکۆتایی خۆرهەلاتی بەشی باشوری ئەم بەشەدا دەڕوات و لەپاش کەمێك ڕێڕەوەکەی دەگۆڕێت و بەرەو لای مەغریب لار دەبێتەوە و تاوەکو ناوەڕاستی ئەم بەشە درێژ دەبێتەوە و لەم ناوچەیەدا پێی دەڵێن ڕووباری جریاب. لەپاشان بەرەو باکور لار دەبێتەوە و بەخۆراساندا دەگوزەرێت و ئەم ماوەیە تەی دەکات و تاوەکو دەڕژێتە دەریاچەی خوارەزمەوە کەلە هەرێمی پێنجەمدایە، هەروەك دواتر باسی دەکەین.

لەناوەندی ئەم بەشەدا لەباشورەوە بۆ باکور لار دەبێتەوە پێنج ڕووباری گەورە لەشاری ختل و خشەوە دێن و لەلای خۆرهەلاتەوە دەبنەوە بەیەك. ڕووبار گەلێکی تریش لەکێوەکانی بتم کەلە خۆرهەلاتی ڕووبارەکەو باکوری خەتل دایە دێتەسەری و جەیحونیش بەشێوەیەکی سەر سوڕهێنەر فراوان دەبێت لەئەنجامدا بەجۆرێك فراوان و گەورە دەبێت کەهاوشێوەی نیە لەو ڕووبارە پێنج لایانەی کەپەیوەست دەبن پێیەوە یەکێکیان ڕووباری خەشابە. ئەم ڕووبارە لەوولاتی تبتەوە کەلەباشوری خۆرهەلاتی ئەم بەشەدایە دەر دەچێت و بەلاری بەرەو باکور و خۆرئاوا دەڕوات و تاوەکو سەرئەنجام لەنزیك باکوری ئەم بەشەدا کەدەچێتە بەشی نۆیەمەوە کێوێکی گەورە لەڕێگەیدا دروست دەبێت. ئەم کێوەش لەناوەڕاستی باشوری ئەم بەشەدا دەڕوات و بەلاریەوە بەرەو باکور و خۆرئاوا دەڕوات تاوەکو لەنزیك باکوری ئەم بەشەدا دەگاتەوە بەشی نۆیەم و ئەو کات لەشاری تبت درێژ دەبێتەوەو، تاوەکو دەگاتە بەشی باشوری خۆرهەلاتی ئەم بەشەدا کۆتایی دێت لەنێوان تورکەکان و وولاتی ختل دا جیاکەرەوەیەك دروست دەبێت و بێجگە تەنها ڕێڕەوێك نەبێت کەلە ناوەڕاستی خۆرهەلاتی ئەم بەشەدا دەبینرێتو، ڕێگەیەك لەم

ناوچەیەدا نابینرێت. فەزلی کوڕی یەحیا (برمکی)لەم سەرزەویەی سدادا وەك بەربەستی یەئجوج و مەئجوج بنیاتی ناوە و دەرگایەکیشی بۆ دروستکردووە.

هەربۆیە کە ڕووباری خەشاب لەووڵاتی تبتەوە دەردەچێت و دەدات لەم کێوە و لەژێریەوە دەڕوات لەپاش ئەوەی ماوەیەکی دور دەبڕێت و دەگاتە ووڵاتی وخش و لەنزیك بەڵخدا دەڕژێتە ناو ڕووباری جەیحونەوەو لێرەوە ڕووباری ناوبراو بەرەو باکور دەڕوات، بەلای تورموزدا دەڕوات و دەچێتە ووڵاتی گوزەگانەوە. ووڵاتی بامیان کە بە خۆراسان دەژمێردرێت لەلای خۆرهەلاتی ووڵاتی غورەوە، کەلەنێوان ئەم ناوچەیەو ڕووباری جەیحوندایە و ووڵاتی خەتل کەزۆربەی کوێستانیەو هەروەها ووڵاتی وخش لەکەنار خۆرهەلاتی جەیحوندایە. وە ووڵاتی ناوبراو لەباکورەوە سنورەکەی کێوەکانی بەتمە کێوە ناوبراوەکان لەسنورەکانی خۆراسان لەلای خۆرئاوای ڕووباری جەیحونەوە درێژ دەبێتەوەو، بەرەو خۆرهەلات دەڕوات تاوەکو کەنارەکەی دەگات بەکێوێکی گەورە کەلەپشتیەوە ووڵاتی تبت هەیە، هەروەك باسمان کرد ڕووباری خەشاب بەژێریدا دەڕواتو کێوی بتم لەنزیك دەرگای فەزڵی کوڕی یەحیاوە دەگات بەم شاخە. ڕووباری جەیحون لەنێوان ئەم کێوانەوە دەڕوات و چەند ڕووبارێکی تر دەچنەوە سەری، لەوانەش ڕووباری وخش کەلەباکوری تورموزەوە دەگات بەکەناری خۆرهەلاتی جەیحون و دەڕژێتە ناویەوەو، ڕووباری بەڵخ کەلەنزیك گوزەگان کەلەکێوەکانی بتمەوە سەرچاوە دەگرێت و دەگاتەکەناری خۆرئاوای جەیحونو دەگاتەوە پێی.

وەلەکەناری خۆرئاوای ئەم ڕووبارەوە ووڵاتی ئامول هەیە کەبەناوچەکانی خۆراسان دەژمێردرێت. وەلەکەناری خۆرئاوای ڕووبارەکەدا سەر زەوی سەغد و ئەسروشنە لە ووڵاتی تورکانەوە دەبینرێت و لەخۆرهەلاتیەوە سەر زەوی فەرغانە هەیە کەتاوەکو کۆتایی خۆرهەلاتی ئەم بەشە درێژ دەبێتەوە. کێوی بەتم سەرتاسەری ووڵاتی تورکانی دەورە داوە. لەلای خۆرئاوای بەشی نۆیەمی ئەم هەرێمەدا سەرزەوی تبت هەیە کەتاوەکو ناوەڕاستی بەشەکە درێژ دەبێتەوە و ووڵاتی هیند لەلای باشورو چین لەلای

خۆرهەلاتیەوەیەکەتاوەکو کۆتایی بەردەوامی هەیە و لەبەشی خوارەوەی ئەم بەشەو باکوری تبتی وولاتی خەزەلجیە لەمەملەکەتی تورکان دەبینرێت، کەتا کۆتایی ناوچەی خۆرهەلات و باکوری ئەم بەشە درێژ دەبێتەوە.

وە وولاتی خەزەلجیە لەلای خۆرئاواوە بەسراوە بەفەرغانەوە کەتاوەکو کۆتایی خۆرهەلاتی ئەم بەشە دەبینرێت. وەلەلای خۆرهەلاتەوە پەیوەستە بە سەرزەوی تغزغزەوە بۆ تورکەکان دەگەڕێتەوە و تاوەکو کۆتایی ئەم بەشە لەلای خۆرهەلات و باکورەوە درێژ دەبێتەوە. وەسەرتاسەری بەشی باشوری بەشی دەیەم ناوچەکانی باکوری وولاتی چین پێکی دەهێنن و لەباکوری ئەم بەشەشدا پاشماوەی وولاتی تغزغز هەیە. ئەو کات لەلای خۆرهەلانی تغزغزەوە وولاتی خەرخیرە و دانیشتوانەکەی تورکن سەرزەویەکەیان بەشی خۆرهەلاتی ئەم بەشەی داگیر کردووە. وەلە باکوری سەرزەوی وولاتی خەرخیردا وولاتی کیماکە کەخەڵکەکەی تورکن‌و لەبەرامبەریشیەوە دەریای موحیتی دورگەی یاقوتەو لەناوەڕاستیدا کێوێکی درێژ دەبینرێت کەهیچ ڕێگەیەکی دەرچون لەوکێوەوە نیە بۆ دورگەکەو سەرکەوتن بەوکێوەدا لەتەنیشتەوە زۆردژوارە. لەم دورگەیەشدا مارگەلێکی کوشندە و یاقوتی زۆر هەیە و خەڵکی دراوسێی ئەم دورگەیە لەدەرهێنانی ئەم یاقەتەدا بەپێی ئەو ڕاسپاردانەی کەخودا بەئیلهام دەیخاتە دڵیانەوە دەری دەهێنن. خەڵکی ئەم وولاتەش لەبەشی نۆیەم و دەیەمدا لەپشت خۆراسان و ئەو کێوانەی کەهەموویان خێوەتگەی تورکانن گۆمەڵێك نەتەوەی زۆر هەن کەخێوەت نشین‌و کۆچەرین و سەرقاڵی شوانی و مالات بەخێو کردنن وەك مەڕ و حوشترو ئەسپ و مانگاو لەسەر ئەم گیان لەبەرانە دەژین و کەسیش ژمارەی تەواویان نازانێت و موسوڵمانیشیان تێدایە لەنزیك بەشە نزیکەکانی ڕووباری جەیحونەوە دەژین‌و، لەگەڵ بێ باوەڕەکان کەئاگر پەرستن دەجەنگن و ئەودیلانەی کەدەیانگرن دەیانفرۆشن بەنەتەوەنزیکەکانی خۆیان و هەندێك جاریش دەچنە وولاتەکانی خۆراسان و هیند و عێراقەوە.

**هەرێمی چوارەم:** ئەم هەرێمە لەلای باکورەوە پەیوەستە بەهەرێمی سێیەمەوە و خۆرئاوای بەشی یەکەمی پارچەیەکی لاکێشەیە لەدەریای موحیتەوە لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی گرتووەتەوە. لەباشورەوەدرێژ بووەتەوە بەرەو باکور لەسەر کەناری باشوری ئەم بەشەشدا شاری تەنجە هەیە ئەم بەشەی دەریا لەباکوری تەنجەدا بەهۆی کەنداوێکی تەنگەوە کەپانیەکەی دوانزە میلە لەنێوان تەریف و جەزیرەدا لەباکورو، قەصر و مەجازو سیبتە لەباشوردایە لەدەریای رۆمەوە پەیوەستەبەدەریای موحیتەوەو بەوشێوەیە بەرەو خۆرهەلات درێژ دەبێتەوە تاوەکو لەناوەڕاستی بەشی پێنجەمی ئەم هەرێمەدا کۆتایی دێت. کەمکەم لەڕێڕەوەکەیدا فراوان دەبێت و تائەوەی کە چوار بەشی ئەم هەرێمەو زۆرتری بەشی پێنجەمی داگیر دەکات وەلەهەردوو لاکەیەوە هەردوو لای هەرێمی سێیەم و هەرێمی پێنجەم دەکەوێتە ژێر ئاوەوە، کەدواتر باسی دەکەین. بەم دەریایەش دەڵێن دەریای شام کە دورگەگەلێکی زۆری لێیە و زۆربەیان لەلای مەغریبەوەن و بریتین: یابسە مایرقە منورقە سردانیە صقلیە کەلەهەموویان گەورەترە و لەپاش ئەوانیش بلبوس‌و ئەقریتش و قوبرص هەن ئێمەش ئەمانە لەو بەشانەیدا کەهەن باسیان دەکەین. لەنزیك کۆتایی بەشی سێیەمی ئەم هەرێمە و لەبەشی سێیەمی هەرێمی پێنجەمیشدا کەنداوی ڤنیز لەم دەریایە جیا دەبێتەوە و بەرەو باکور درێژ دەبێتەوە تاوەکو دەگاتەئەم بەشە، ئەوکات بەرەولای مەغریب لار دەبێتەوە تا دەگاتە بەشی دووەمی هەرێمی پێنجەم‌و کۆتایی دێت. وەهەروەها لەبەشی خۆرهەلاتی بەشی چوارەمی هەرێمی پێنجەمی کەنداوی قوستەنتینیە لەوجیادەبێتەوە و تاوەکو کۆتایی هەرێمەکە لەتەنگەیەکەوە بەپانی تیرس بەرەو باکوردەڕوات‌و لەپاشان لەبەشی چوارەمی هەرێمی شەشەمدا کۆتایی دێت‌و، لەڕێڕەوی خۆیدا بەرەو دەریای نیتش لەسەرانسەری بەشی پێنجەم و نیوەی بەشی شەشەمی هەرێمی شەشەمدا بەرەو خۆرهەلات لار دەبێتەوە، هەروەك چۆن ئەم بەشانە لەجێگەی خۆیاندا باس دەکەین. لەو کاتەی کەدەریای رۆم لەدەریای موحیت لەکەنداوی تەنجەدا جیا دەبێتەوە و تاوەکو هەرێمی سێیەم فراوان دەبێت، لەباشوری

کەنداوەکەدا پارچەیەکی بچوك لەم بەشە دەمێنێتەوە کەتێیدا شاری تەنجە لەکەناری کۆمەڵگەی بەحرەیندا (شوێنی بەیەکگەشتنی هەردوو دەریا)دەبینرێت، لەوە بەدواش شاری سیبتە لەکەنار دەریای ڕۆمدا دەبینین و لەپاشانیش وولاّتەکانی تیتاوین و بادیس هەن، ئەو کات ئەم دەریایە بەشەکەی تری خۆرهەلاّتی ئەم بەشە داگیر دەکات و بەرەو هەرێمی سێیەم دەردەچێتو، زۆربەی ئاوەدانیەکانی ئەم بەشە لەبەشی باکوریداو هەم لەبەشی کەنداوەکەیدایە.

وەهەموو ئەم ناوچانە لەووڵاتی ئەندەلوسی خۆرئاوا دێنە ئەژمار. یەکەمینیشیان لەنێوان دەریای موحیت و دەریای ڕۆمی شاری تەریفدایە کەلەنزیك شوێنی بەیەکگەشتنی هەردوو دەریادایە. وە لەخۆرهەلاّتیەوە و لەسەر کەناری دەریای ڕۆم دورگەکانی خەزراو مالیقەو منقب و مریە دەبینرێن. لەژێر ئەمانیشەوەیە بەرەو باشورو لەتەنیشت دەریای موحیتەوە شاری شریش و لبلەیە. لەبەرامبەریشیانەوە لەدەریای موحیتدا دورگەی قادیس هەیەو لەخۆرهەلاّتی شریش لە لبلەشدا شارەکانی: ئیشبیلیە و ئەسیجە و قورتوبەو مرتلە و غەرناتەو جیان و وابیدە و وادیش و بستە بونیان هەیە لەخوار ناوچەی مەغریبو لەنزیك دەریای موحیتدا شارەکانی شنتمریە و شلب دەبینرێن. لەلای خۆرهەلاّتی ئەم دووشارە شەوە بتلیموس و ماردە و یابرە و غافیق و ترجالە قەلاّی ڕیباح هەن. لەژێر ئەمانەشەوە لەلای خۆرئاواو لەتەنیشت دەریای موحیتەوە شاری ئیشبونە دەبینرێت کەلەکەنار ڕووباری تاجەدایەو، لەخۆرهەلاّتی ئەو شارەشدا شنترین و قوریە لەکەنار هەمان ڕووبارن و دواتریش قنتەرەت السیف دەبینرێت. وەلەخۆرهەلاّتی ئیشبونەدا زنجیرە چیاکانی شارات دەبینین کەلەوێوە و لەمەغریبەوە دەست پێدەکەنو لەدرێژایی سنوری باکوری ئەم بەشەدا بەرەو خۆرهەلاّت پێشڕەوی دەکات، سەرئەنجام دەگاتە شاری سالم کۆتایی دێت ئەم شارە لەولای ناوەڕاستی ئەم بەشەوەیە. لەقەت پاڵی ئەم کێوەدا تەلبیرە کەوتووەتە خۆرهەلاّتی قوریەوەو دواتر شارەکانی: تەلیتە وادی الحجارە شاری سالم دەبینرێن، لەسەرەتای دەستپێکی زنجیرە چیاکانی شاراتەوە شاری

قلمریه دەبینرێت کەلەنێوان ئیشبون (لیسبن)و کێوی ناوبراودایە. ئەو شارانەی کەتاوەکو ئێستا ناومان هێنان لەناوچەکانی خۆرئاوای ئەندەلوس دەژمێردران، بەلآم ناوچەکانی خۆرهەلآتی ئەو وولآتە، ئەوانەی کە کەوتونەتە کەنار دەریای مەدیتەرانەوە لەپاش المریە بریتین لە: قرتاجنە و لقنت و دانیە و بلنسیە و تاترگونە کەلەکۆتایی خۆرهەلآتی ئەم بەشەدایە. وەلەژێر ئەم شارەداو لەلای باکورەوە شارەکانی لرقەو شەقورە هەن. دووشاری ناوبراو هەم سنوری بستەو قەلآی ڕیباحن کەلەناوچەی خۆرئاوای ئەندەلوسدان، ئەوکات لەناوچەی خۆرئاوای مرسیە و شاتیبە لەژێر بلنسیە، لەباکوردا دەبینرێن. ئەوکات شەقرو لەپاشان تەرتوشە و تەرگونە دەبینین کەتاوەکو کوتایی ئەم بەشە درێژ دەبێتەوە. ئەوکات لەژێر هەمان ناوچەدا بەرەو باکور شارەکانی جەنجالە و وابدە هەن کەلەلای خۆرئاواوە هاوسنوری شەقورەو تەلیتلەن، ئەوکات لەخۆرهەلآت لەژێر تەرتوشەو باکوریدا شاری ئەفراغە دەبینرێت.

ئەوکات لەخۆرهەلآتی شاری سالمدا هەریەکە لەقەلآگانی ئەیوب و سەرقستە و لاردەبینرێن کەلەکۆتایی ئەم بەشەدا لەباکوری خۆرهەلآتدان. بێجگە لەگۆشەیەکی لەباکوری خۆرئاوای بەشی دووەمی ئەم هەرێمە ئەوی تری سەراپا ئاو دایپۆشیوە لەوبەشەی دەرەوەی ئاوەکەدا کێوی برتات (پیرنە) ماوەتەوە کەمانای قەت پالّ و کەل و ملەکان دەگەیەنێت. ئەم کێوە لەکۆتایی بەشی یەکەمی هەرێمی پێنجەمدا بەم بەشەدا درێژ بووەتەوەو لەنزیك باکوری خۆرهەلآتی ئەم بەشەدا لەو کەنارەی کەبەدەریای موحیت کۆتایی دێت دەست پێدەکاتو، بەرەو باشوری خۆرهەلآت دەڕوات و تادەگاتە هەرێمی چوارەم و لەبەشی یەکەمیش لادەدات و دەچێتە بەشی دووەمەوە بەشێکی لەم بەشەدایەو کەقەت پالّە لارەکانی پەیوەست دەبن بە ووشکانیەوە بەم بەشەدا درێژ دەبێتەوە و پێی دەلّێن سەرزەوی غشطونیة (طاسطن)و شارەکانی جرندە و قرقشونە لەم ناوچەیەدان. لەم بەشەدا لەکەنار دەریای ڕۆمدا شاری بەرشەلۆنە (بارسلن)و ئەربونەو دەبینرێن. وەلەو دەریایەی کەئەم بەشەی داگیر کردووە دورگە گەلێکی زۆر

هەن کەزۆربەیان بەهۆی بچوکیەوە کەسیان تێدا ناژی، بەڵام دورگەی سەردانیە (ساردینی)لەخۆرئاوای ئەم دەریاوە دورگە صەقەلیە (سیسیل)لەخۆرهەڵاتیەوە لەڕووی ڕووبەرەوە زۆر فراوانەو، دەڵێن چوار دەورەکەی حەوت سەد میلە و شارگەلێکی زۆری لێیە کەبەناوبانگترینیان سەرقوسەیە (سیراکوز)و بلرم و تەرابنەو مازر و مسینی یە. ئەم دورگەیە ڕوویە ڕووی سەرزەوی ئەفریقایەو، دوو دورگەی غزش و ماڵتا کەوتوونەتە نێوان هەردووکیانەوە.

بەشی سێیەمی ئەم هەرێمە بێجگە لەسێ بەشی لەباکورەوە ئاو دایپۆشیوە. بەشی خۆرئاواکەی بریتیە لەحەوزەی قولوریەو بەشی ناوەڕاستی ئەوسەرزەمینە ئەترانت کەسەربە ئنکبردیەکانە و بەشی خۆرهەڵاتیشی ئەلبانیایە لە وولآتی بەنادیقە (فنیز)یە. وەبەشی چوارەمی ئەم هەرێمە هەروەك باسمان کرد ئاو دایپۆشیوەو دورگە گەلێکی زۆری لێیە کەزۆربەیان وەك دورگەکانی بەشی سێیەم کەسیان تێدا ناژی. دورگە ئاوەدانەکانی بریتین لە: دورگەی بلبوس (پلوپونز)کەلەناوچەی باکوری خۆرئاوادایە و دورگەی ئەقریتش (کرت)کەلەناوەڕاستی ئەم بەشەوە تاوەکو گۆشەی باشوری درێژ دەبێتەوە، سێگۆشەیەکی گەورە کەلەنێوان باشورو خۆئاوای بەشی پێنجەمی ئەم هەرێمەدایە ئاودایپۆشیوە کەگۆشەی خۆرئاواکەی بەکۆتایی بەشەکەوە لەباکور گۆشەی باشوری نزیکەی دوولەسەر سێی بەشەکەدا کۆتایی دێت لەلای خۆرهەڵاتی ئەم بەشەدا، بەشێکی نزیك لەیەك لەسەر سێی دەمێنێتەوە کەبەشی باکورەکەی هەروەك باسمان کرد لەدرێژی لاربوونەوەی دەریا بەرەو خۆرهەڵات دەڕوات. وەلە نیوەی باشوریدا بەشەکانی خوارەوەی شامە کەلەناوەڕاستیدا کێوی لکام هەیە کەلەباکوردا بەکۆتایی شام کۆتایی دێت لەوێشەوە بەرەو ناوچەی باکوری خۆرهەڵات لار دەبێتەوە و لەپاش ئەم لاربونەوەیە پێی دەڵێن کێوی سیلسیلە کەلەوێوە بەرەو هەرێمی پێنجەم دەڕوات و بەرەو خۆرهەڵات لار دەبێتەوەو، بەشێك لە وولآتی جەزیرە دەبڕێت ولەلای خۆرئاوای ئەولار بوونەوەی ئەو زنجیرەیەدا درێژ دەبێتەوەو دەگاتە دورگەیەك کەلەدەریای ڕۆمەوە دەردەچێتو

بەکۆتایی باکوری ئەم بەشەکۆتایی دێت. وەلەنێوان ئەم کێوانەدا چەندین لارو خێچی هەیە کەپێیان دەڵێن چۆمەکان کەتاوەکو وولآتی ئەرمەنستان درێژ بووەتەوەو لەم بەشەدا بەشێك لەو وولآتە لەنێوان کێوە ناوبراوەکانو کێوی سلسلەدایە، بەڵام لای باشور کە پێشتر باسمان کرد بەشەکانی خوارەوەی شام دەگرێتەوەو کێوی لکام لەنێوان دەریای ڕۆم و کۆتایی بەشەکە لەباشور بەرەو باکور تێدەپەڕێت، لەکەنار دەریای هەمان بەشدا شاری ئەنترسوس لەسەرەتای باشوری ئەم بەشەدایەو هاوسنوری عێراقەو تەرابلوسە لەکەناری هەمان دەریادایە لەهەرێمی سێیەم. لەباکوری ئەنترسوس شارەکانی: جبلە لازیقیە ئسکەندەرونە و سلوقیە هەن لەپاش ئەویش لەبەشی باکوری وولآتی ڕۆمدایە (ئاسیای بچوك).

وەلەباشوری بەشەکەو خۆرئاوای کێوی لکام کەلاکانی کەوتونەتە نێوان دەریاو کۆتایی ئەم بەشەوەو قەڵای خوابی لە وولآتی شامدایەو تایبەتە بەحەشیشیەکان (ئیسماعیلیەکان)وە کەلەم سەردەمەدا پێیان دەڵێن فداویە واتە (گیان بەختکارەکان)بەم قەڵایەش دەڵێن مصیات کەلەبەرامبەر ئەنترسوسەوەیە و، ڕووبەڕووی قەڵای ناوبراو لەخۆرهەڵاتی کێوەکەوە شاری سەلامیە لەباکوری حیمصدایە. وەلەباکوری مصیاتدا لەنێوان کێوو دەریاکەدا شاری ئەنتاکیە هەیە و لەبەرامبەریشیەوەو لەلای خۆرهەڵاتی کێوەکەوە مەعەرەیە و، لەخۆرهەڵاتیشیدا شاری مەراغەیە و لەباکوری ئەنتاکیەش شارەکانی مەصیصەو ئوزنەو تەرتوس کەبەکۆتایی شام دادەنرێن بونیان هەیە، لەبەرامبەریشیانەوە لەلای خۆرئاوای کێوەکەوە قنسرین و عەین زوربە هەیەو قنسرین لەلای خۆرئاوای کێوەکەوە شاری حەلەب هەیە لەبەرامبەر عەین زوربەی منبجدا کەبەکۆتایی شام دەژمێردرێت، بەڵام چۆمەکان (ئەوانە کەوەك ڕێڕەون)لەلای ڕاستەوە لەنێوان ئەوان و دەریای ڕۆمدا مەملەکەتەکانی ڕۆم (ئاناتولی و ئاسیای بچوك)هەیە کەلەم ڕۆژگارەدا لەژێر کۆنترۆڵی تورکەکاندایەو، پاشاکەی ئیبن عوسمانەو لەکەنار ئەم ناوچەیەش شاری ئەنتالیاو عەلایا هەیە. وەلەو بەشەی وولآتی ئەرمەندا کەلەنێوان کێوی

دوروب و کێوی سلسلەدایە شارەکانی مرعش ماتیەو ئەنقەرە هەن کەشاری کۆتاییان تاوەکو کۆتایی بەشەکە درێژ دەبێتەوە. وەڕووباری جەیحان لە ناوچەکانی ئەرمەن لەبەشی پێنجەمی ئەم هەرێمەوە دەردەچێتو ڕووباری سەیحان دەکەوێتە خۆرهەڵاتیەوە. ڕووباری جەیحان لە وولآتی ئەرمەنەوە دێت و لەلای باشورەوە دەڕوات و لەکێوی دوروبەوە تێدەپەڕێت و لەپاشان بەتەرتوس مەصیصەدا گوزەر دەکات و بەلای باکوری خۆرئاوادا لار دەبێتەوە و دەڕژێتە دەریای ڕۆم لەباشوری سلوقیە.

وەڕووباری سیحان لەتەنیشت جەیحانەوە دەڕوات و لەبەرامبەر ئەنقەرە و مەرعشدا گوزەر دەکاتو بەکێوەکانی دوروبدا دەڕوات و تاوەکو سەرزەوی شام درێژ دەبێتەوەو لەعەین زوربەوە دەڕوات و لەڕووباری جەیحان دوور دەکەوێتەوە و لەپاشان بەرەو باکوری خۆرئاوا لار دەبێتەوەو لەئەنجامدا لەنزیك مەصیصەو لەخۆرئاوادا دەڕژێتە ڕووباری جەیحانەوەو بەشێك لەو شارانەی جەزیرە لەباشوردا کەلار بونەوەی کێوی لکامو سلسلە دەورەیان داون چەندشارێك دەبینرێن وەك: ڕافقە و ڕقە و حڕان سروج و ڕیهاو نصیبین سمیسات و ئامەد، ئەم شارانە لەدامێنی کێوی سلسلەدا و لەلای کۆتایی باکوری خۆرهەڵاتی ئەم بەشەوەن‌و، لەناوەڕاستی ئەم بەشەدا ڕووباری فوراتو دیجلە دەگوزەرێن کەلەهەرێمی پێنجەمەوە دەردەچن و وولآتی ئەرمەنستان بەرەو باشور تەی دەکەن تاوەکو لەکێوی سلسلە تێپەڕدەکەن و ئەوکات فورات لەلای خۆرئاوای سمیات و سروجەوە دەگوزەرێت و بەرەو خۆرهەلات لار دەبێتەوە و لەنزیك ڕافقە و ڕقەدا دەڕوات و دەچێتە بەشی شەشەمەوە.

ڕووباری دیجلە لەخۆرهەڵاتی ئامەدەوە دەڕوات و لەپاش کەمێك بەرەو خۆرهەلات لار دەبێتەوەو دەچێتە بەشی شەشەمەوە و لەلای خۆرئاوای بەشی شەشەمی ئەم هەرێمەدا وولآتی جەزیرە و لەلای خۆرهەڵاتی جەزیرەوە عێراق هەیەو، پەیوەستە بە جەزیرەوە و بەرەو خۆرهەلات درێژ دەبێتەوە تاوەکو دەگاتە نزیك کۆتایی ئەم بەشەو کۆتایی دێت. لەکۆتایی عێراقیشدا کێوی ئەصفەهان دەردەکەوێت کەلە باشوری ئەم بەشەدا دێتە

خوارەوە بەرەو خۆرئاوا لار دەبێتەوەو هەرکە گەیشتە ناوەڕاستی ئەم بەشە لەکۆتایی سنوری باکوردا بەرەو خۆرئاوا دەڕوات، تاوەکو لەبەشی شەشەمەوە دەردەچێت لەولایەدا پەیوەست دەبێت بەکێوی سلسلەوە لەبەشی پێنجەم. بەشی شەشەمیش دەکات بەدوو بەشی خۆرهەڵات و خۆرئاواوە هەروەك چۆن شوێنی دەرچونی فورات لەبەشی پێنجەم لەباشوری بەشی خۆرئاوادایە.

وەجێگەی دەرچونی دیجلە لەهەمان بەش لە باکوردایە، بەڵام فورات هەرئەوەندەی کەدەگاتە بەشی شەشەم سەرەتا بەقرقیسیادا دەڕواتو لەم ناوچەیەشدا ڕووبارێك لەوڕووەوە بەرەو شیمال جیا دەبێتەوەو، بەسەرزەوی جەزیرەدا دەڕواتو لەکەنارەکانیەوە دەڕژێتە سەرزەوی. لەبەر ئەوەی کە فورات لەقرقیساوەماوەیەك دەبڕێت بەرەو باشور لار دەبێتەوە و لەنزیك خابورەوە تاوەکو خۆرئاوای ڕحبە دەڕوات و ڕووبارێکی لێ جیادەبێتەوە کەبەرەو باشور دەڕوات. صەفەین لەبەشی خۆرئاوایدا دەمێنێتەوەو بەرەو خۆرهەڵات لاردەبێتەوەو دەبێت بەچەندین بەشەوەو کەهەندێکیان لەکوفەو کۆشکی ئیبن هەبیرەو جامیعاندا دەڕۆن و هەموویان لەباشوری ئەم بەشەدا بەرەو هەرێمی سێیەم دەڕواتو لەخۆرهەڵاتی حیرە و قادسیەدا دەڕژێتە سەرزەوی. ڕووباری فورات لەلای ڕحبەوە بەرەو خۆرهەڵات لەباکوری هیت و لەباشوری زاب ئەنبار دا تێپەڕ دەکات و لەنزیك بەغدا دەڕژێتە ناودیجلەوە، بەڵام ڕووباری دیجلە لەبەر ئەوەی لەبەشی پێنجەمەوە دێتە ئەم بەشەوە بەرەو خۆرهەڵات لەبەرامبەر کێوی سلسلەوە کەبەسراوەتەوە بەکێوی عێراقەوە دەڕواتو لەباکوری دورگەی ئیبن عومەردا موصڵو تکریتدا دەڕوات و لەحەدیسە کۆتایی دێت و بەرەو باشور و حەدیسە لار دەبێتەوەو، هەروەها زابی گەورە و زابی بچوك لەخۆرهەڵاتیدا دەمێنێتەوە و بەرەو باشور ڕووبە قادسیە دەڕوات و دەگاتە بەغداو تێکەڵی فورات دەبێت. لەپاشان لەلای باشوری خۆرئاوای جرجرا یاوە دەڕوات تاوەکو لەم بەشە دەردەچێت و دەگاتە هەرێمی سێیەم و چەند چۆم و جۆگەلەیەکی لێ دەبێتەوەو لەپاشان پەیوەست دەبن بەیەکترەوەو لەنزیك

عەبادان دەڕژێنە دەریای فارسەوەو ئەوسەرزەویەی کەلەنێوان هەردوو ڕووبار دیجلەو فوراتدا هەیە پێش ئەوەی بگاتە بەغداد پێیان دەگوت وولآتی جەزیرەو، لەپاش دوور کەوتنەوەی دیجلە لەبەغداد ڕووبارێکی تری دەچێتە سەر کەلە باکوری خۆرهەلآتی دیجلەوە دێت و لەبەرامبەر خۆرئاوای بەغدادەوە لە وولآتی نەهرەوان کۆتایی دێت و بەرەو باشور لار دەبێتەوە بەر لەوەی دیجلە بەرەو هەرێمی سێیەم درێژ ببێتەوە دەچێتە ناویەوە.

لەنێوان ئەم ڕووبارەو کێوەکانی نێوان عێراق و ئێران شاری جەلەولا لەلای خۆرهەلآتەوە لەنزیك کێوەکانی شارەکانی حلوان و صیمرە دەبینرێن، بەلآم لەبەشی خۆرئاوای ئەم بەشەدا کێوێك دەردەکەوێت کەلەئێرانەوە دەست پێدەکاتو بەرەو خۆرهەلآت درێژ دەبێتەوە تاوەکو دەگاتە کۆتایی ئەم بەشە، بەکێوی ناوبراویش دەلێن شارەزور کەبەشی ناوبراو دەکات بەدوو بەشەوە. وەلەباشوری یەکێك لەدوو بەشەبچوکەدا شاری خونجان هەیە کەلەباکوری خۆرئاوای ئەصفەهاندایە و پێی دەلێن وویلایەتی بهلوس و لەناوەڕاستیدا شاری نەهاوەند و لەباکوریشیدا شاری شارەزور هەیە، کەلەبەشی باکوری خۆرئاوای نزیك بەیەکگەشتنی هەردوو کێودایە. وەدینەوەر لەخۆرهەلآتدا لەنزیك کۆتایی ئەم بەشەدایە. وەلە بەشێکی بچوکی تردا بەشێك لە وولآتی ئەرمەنستان هەیە کەمەلبەندەکەی مەراغەیەو بەشێك لەکێوی عێراق کەلە بەرامبەریەوەیەتی پێی دەلێن کێوی برمەو شوێنی نیشتەجێ بونی کوردەکانەو زابی گەورە و زابی بچوك کەلەسەر دیجلەن لەپشت ئەم کێوەوەن. لەکۆتایی ئەم بەشەدا لەلای خۆرهەلآتەوە وولآتی ئازەر بایجانە و شارەکانیشی وەك تەبریز و بیلقانن لەگۆشەی باکور ئەم بەشەدا بەشێك لەدەریای نیتش هەیە کەهەمان دەریای خوزەرە لەبەشی باشور و خۆرئاوای بەشی حەوتەمی ئەم هەرێمەدا، بەشێکی زۆری وویلایەتی بهلوس هەیە وەك شارەکانی هەمەدان قەزوین لەو ناوچەیەدان و بەشەکەی تری وولآتی بهلوس لەوانەش شاری ئەصفەهان لەهەرێمی سێیەمدایە کەدەوری باشوری کێوەکەی داوەو

لەخۆرئاوایەوە دەردەچێتو بەرەو هەرێمی سێیەم درێژ دەبێتەوەو ئەوکات کێوی ناوبراو لەبەشی شەشەمدا لار دەبێتەوە و دەگاتە هەرێمی چوارەم و پەیوەستدەبێت بەبەشی خۆرهەڵاتی کێوی عێراقەوە هەروەك باسمان کرد. وەبەشی خۆرهەڵاتی بهلوسی دەورە داوە و ئەو کێوەی کەدەوری ئەصفەهانی داوە لەهەرێمی چوارەمەوە بەرەو باکور دێتەخوارەوە و تاوەکو بەشی حەوتەم درێژ دەبێتەوەو سەرئەنجامداخۆرهەڵاتی وولاتی بەهلوس دەور دەداتو لێرەدا شارەکانی کاشان و قوم لەدامێنی ئەو کێوەدان، وەلەنیوەی رێگەی درێژ بونەوەکەیدا کەمێك بەرەو خۆرئاوا لار دەبێتەوەو لەپاشان بەشێوەیەکی بازنەیی دەگەڕێتەوە و بەرەو باکوری خۆرهەڵات دەڕواتو تاوەکو لەهەرێمی پێنجەمدا دەردەکەوێت. لەشوێنی دەوردانەوەکەیدا شارێك دەبینرێت. لەلای ناوچەی لار بونەوەکەیەوە کێوێکی تر دەست پێدەکات کەلەلای خۆرئاواوە تاوەکو کۆتایی ئەم بەشە درێژ دەبێتەوە، لەباشوری کێوەکەدا شاری قەزوین دەبینرێت و لەلای باکوری کێوی ناوبراو و کێوی ڕیەوە کەهێڵەکەیان بووەتەوە یەك. هەردووکیان بەرەوباکوری خۆرهەڵات تاوەکو ناوەڕاستی بەشەکە درێژ دەبنەوە وەلەوێدا کەبەهەرێمی پێنجەم کۆتاییان دێت پارێزگای تەبەرستان دەست پێدەکات.

ئەم پارێزگایە لەنێوان کێوەکانی ناوبراو بەشێك لەدەریای تەبەرستاندایە. بەشی ناوبراو لەهەرێمی پێنجەمەوە دێتە ناوئەم بەشەوە نزیکەی نیوە لەخۆرئاواوە تاوەکو خۆرهەڵات دەگرێتەوە. لەنزیك کێوی ڕەیی ولەجێگەی لار بونەوەی بەرەو خۆرئاوا کێوێکی تر کەپەیوەستە بەوەوە دەردەکەوێت کەبەرەو خۆرهەڵات درێژ دەبێتەوە ئەمە لەکاتێکدا کەمێك بەرەو باشوریش لار بونەوەی هەیە، سەرئەنجام دەچێتە ناو بەشی خۆرئاوای بەشی هەشتەمەوە، لەنێوان ئەم کێوە و کێوی ڕەیدا لەنزیك سەرەتاکەیان ناوچەکانی گورگان دەمێنێتەوە کەلەنێوان هەردوو کێوەکەدان لەوانەش شاری بستامە لەپشت ئەم کێوەوە پارچەیەك لەم بەشە هەیە کەپاشماوەی دەشتە چۆڵەکانی نێوان فارس و خۆراسانی تێدا دەبینرێت و، لەخۆرهەڵاتی کاشاندایە لەکۆتاییەکەشیدا و لەنزیك

کێوی ناوبراوەوە شاری ئستر ئاوا هەیە قەت پاڵەکانی ئەو کێوە لەلای خۆرهەڵاتەوە تاوەکو کۆتایی ئەم بەشە ناوچەکانی نەیشابور پێك دەهێنێت کەپەیوەستە بەخۆراسانەوەو شاری نەیشابور لەباشوری کێوەکەو بەشی خۆرهەڵاتی دەشتە چۆلەکەدایە، کەئەو کات مروشاهجان لەکۆتایی ئەم بەشەدایە لەباکوری کێوەکەو بەشی خۆرهەڵاتی گورگان میهرگانو خازرون و توس هەن، کەبەکۆتایی خۆرهەڵاتی ئەم بەشەدەژمێردرێن و هەموویان لەدامێنی ئەو کێوەدان و لەباکوریانەوە وولاتی نسا هەیە لەنزیك گۆشەی باکوری خۆرهەڵاتی بەشەکەدا بیابانە چۆڵەکان وولاتی ناوبراویان دەورەداوە. وەلەبەشی هەشتەمی ئەم هەرێمەدا لەلای خۆرئاوای ڕووباری جەیحون دەبینرێت کەلەباشورەوە بەرەو باکور دەڕوات.

وە لە کەناری خۆرئاوای ئەوەوە شاری زم و ئامول بونیان هەیە و بەشی باشوری خۆرئاوای ئەم بەشە بەکێوی ئستر ئاباد کەلەبەشی حەتەمدایە دەورە دراوە، و کێوی ناوبراو لەناوچەی خۆرئاوای ئەم بەشەدا دەردەکەوێت و دەوری ئەم گۆشەیە دەدات و لەهەمان ئەم گۆشەیەدا پاشماوەی وولاتی هرات هەیە و ئەم کێوە لەهەرێمی سێیەمەوە لەنێوان هرات و گوزەگانەو گوزەر دەکات تاوەکو دەگاتە کێوی بتم، هەروەك لەو هەرێمەدا باسمان کرد. وەلەبەشی خۆرهەڵاتی ڕووباری جەیحون و باشوری ئەم بەشەدا ناوچەکانی بوخاراو سەغد هەیە کەفەرمان ڕەواییان لەسەمەرقەندە، لەپاشان ناوچەکانی ئسروشنە دەبینرێن وەك شارەکانی خجند کەبە کۆتا بەشی خۆرهەڵاتی ئەم بەشە دەژمێردرێت لەباکوری سەمەرقەند و ئسروشنەدا شاری ئیلاق هەیە و لەباکوری ئیلاقیش سەر زەوی چاچ دەبینرێت کەتاوەکو کۆتایی خۆرهەڵاتی ئەم بەشە درێژەی هەیەو، پارچەیەکیش لەبەشی نۆیەم دەگرێتەوەو، لەباشوری ئەم پارچەیەشدا پاشماوەی سەرزەوی فەرغانە دەبینرێت لەم پارچەیەی کەلەبەشی نۆیەمدایە ڕووباری چاچ دەردەچێت و بەبەشی هەشتەمدا تێپەڕ دەبێت و، تاوەکو دەگاتە نزیك شوێنی دەرچونی لەباکوری بەشی هەشتەم لەگەڵ هەرێمی پێنجەمدا، دەڕژێتە ڕووباری جەیحونەوە و

لەسەرزەوی ئیلاقدا ڕووبارێك لەبەشی نۆیەمی هەرێمی سێیەم لەسنورەکانی وولأتی تبتەوە دێتو لەگەڵ ئەمدا تێکەڵ دەبێت و بەرلەوەی لەبەشی نۆیەم دەربچێت ڕووباری فەرغانەش دێتە سەری. لەبەرامبەر ڕووباری چاچەوە کێوی جبراغون دەبینرێت کەلەهەرێمی پێنجەمەوە دەست پێدەکات و بەرەو باشوری خۆرهەلأت دەڕواتو تاوەکو لەلای بەشی نۆیەمەوە دەردەچێت و، بەدەوری سەرزەوی چاچدا دێتەوە و لەپاشان لەبەشی نۆیەمدا لاربەنەوە پەیدا دەکات و تاوەکو باشوری ئەوبەشە بەدەور چاچ و فەرغانە کەلەو بەشەدان دەسوڕێتەوە ودەچێتە هەرێمی سێیەمەوەو، لەنێوان ڕووباری چاچ و کەناری ئەم کێوەدا و لەناوەڕاستی ئەم بەشەدا ناوچەکانی فارابە و لەنێوان ئەو شارەو سەرزەوی بوخارا و خوارەزم بیابانێکی چۆڵە لەگوشەی ئەم بەشەوە لەلای باکورو خۆرهەلأتەوە سەرزەوی خنجد دەبینرێت کەشارەکانی ئیسفیجاب و تیرازی تێدایە. لەناوچەی خۆرئاوای بەشی نۆیەمی ئەم هەرێمەدا لەپاش سەرزەوی فەرغانە و چاچ لەباشوری ناوچەی خرلخ و لەباکوری سەرزەوی خەلخە و ناوچەی کیماك سەرتاسەری خۆرهەلأتی ئەم بەشەی گرتووەتەوە بەسراوە بە بەشی دەیەمەوە تاوەکو کێوی قوقیا کەتاوەکو کۆتایی خۆرهەلأتی ئەم بەشە درێژ دەبێتەوەو، لەسەر پارچەیەکە لەکەناری دەریای موحیت و ئەو کێوەش یەئجوجو مەئجوجە و هەموو گەلانی دانیشتوانی ئەم ناوچانە لەهۆزە تورکەکانن.

**هەرێمی پێنجەم:** زۆرترین بەشی سەرەتای ئەم هەرێمە، بیجگە لەبەشێکی کەم لەباشورو خۆرهەلأتی ئاو داگیری کردووە، چونکە دەریای موحیت چووەتەناو ئەم بەشەی خۆرئاوا لەهەرێمەکانی پێنجەم و شەشەم وحەوتەمەوە و لەوبازنەیەی کەبەدەور گۆی زەویدایە دەرچووەو، چووەتەناخیەوە.وەئەوەی لەباشوری ئەم بەشە لەدەریای موحیت کەلەدەرەوەی ئاودایە پارچەیەکی سێگۆشەیە کەپەیوەستە بەئەندەلوسەوە و بەشەکەی تری وولأتی ناوبراو لەوبەشەدایە و دەریا لەدوولاوە دەورەی داوە وەك دوو

پارچە دەوری گۆشەی سێگۆشەی داوە وەلەو بەشەی تری خۆرئاوای ئەندەلوسدا منت میور هەیە کەلەنزیك سەرەتای ئەم بەشەدا لەباشوری خۆرئاواوە لەکەناری دەریاوە دەبینرێت شلمنکەی ئەبلە هەیەو کەلەکۆتایی باشوری بەشەکە دەژمێردرێت و، سەرزەوی قستالیە لەلای خۆرهەلآتیدایە کەشارەکانی شقوبیەیە و لەباکوریشیدا قلمرو لیون شاری برغشت هەیە، ئەو کات لەپشت ئەم ناوچانەوە لەلای باکورەوە سەرزەوی جلیقیە بونی هەیە کەتاوەکو گۆشەی پارچەی باسکراو درێژ دەبێتەوە لەم ناوچەیەدا لەسەر کەناری دەریای موحیت لەکۆتایی بەشی خۆرئاوای سێگۆشەی ناوبراو شاری شنتیاقوب دەبینرێت. ئەم ناوە وەك وشەی یعقوب وایە و لەوپارچەیەدا لەخۆرهەلآتی ئەندەلوسدا شاری تتیلەیە کەلەنزیك کۆتایی باشوری ئەم بەشەدا لەخۆرهەلآتی قستالیەدایەو لەخۆرهەلآت و باکوری ئەم ناوچانە شاری وشقە دەبینرێت و، دیسانەوە لەلای باکوری خۆرهەلآتیەوە شاری بنبلونە هەیە لەخۆرئاوای شاری بنبلونەدا قستالە دەبینرێت. دواتریش ناجرە لەنێوان ئەم شارە و برغش (بورگو)دایە. لەناوەڕاستی ئەم بەشەدا زنجیرە چیایەکی گەورە بەرامبەر دەریا و بەشی باکوری خۆرهەلآت دەردەکەوێت لەنزیك بنبلونە لەلای خۆرهەلآتەوە پێش ئەوەی لەباشور و لەهەرێمی چوارەمدا دەچێتەوە سەر دەریای ڕۆم دەلکێت بەکەنار ئەم دەریاوە.

وەلەلای خۆرهەلآتەوە وەك ڕێگرێکە بۆ وولآتی ئەندەلوس. لارو لەوێریەکانی وەك دەروازەگەلێکن بۆ وولآت کەبەناوچەکانی غشکونیە (گاسکن)کۆتایی دێتو ناوچە ناوبراوەکان پەیوەستن بەبێگانە و فەرەنگەکانەوە. لەو شارانەش کەبەهەرێمی چوارەم دەژمێردرێن دەتوانین بەرشەلۆنەو ئربونە بەنمونەبهێنینەوە کەلەکەناری دەریای ڕۆمەوەن و جرندە (ژیرن)و قرقوشنە (کارکاسن)لەلای باکوریانەوەیە ئەوەی لەم ناوچەیەدا پەیوەندی بەم بەشی پێنجەمەوە هەیە بریتین لە: تەلوشە (تولون)کەلەباکوری جرندەوەن، بەلآم بەشی ووشکی ئەم بەشی یەکەمە لەلای خۆرهەلآتەوە پارچەیەکە وەك سێگۆشەیەکی درێژ وایە و گۆشەتیژەکەی لەلای خۆرهەلآتەوە لەپشت کێوی برنات

(پیرنە)دایە. وەلەم پارچە لەسەر کەناری دەریای موحیت برنوك ئەوپارچەیەی کەکێوی پیرنەی پێوە بەسراوەتەوە شاری بیونە دەبینرێت. وەلە کۆتایی ئەم بەشەدا لەلای باکوری خۆرهەلاتی ئەم بەشەوە سەرزەوی (بیتو) هەیە، کەپەیوەستە بەنەتەوە بیانیەکانەوەو تاوەکو کۆتایی ئەم بەشەش درێژ دەبێتەوە و لەلای خۆرئاوای بەشی دووەمەوە سەرزەوی غشکونیە هەیە. وەلەلای باکوریەوە بیتو (پواتو)و برغشت (بورگو)دەبینرێت هەروەك باسمان کردن. وەلە باکوری خۆرهەلاتی ناوچەکانی غشکونیەوە (گاسکن)کەنداوێك لەدەریای رۆمەوە دەبینرێت کەلەسەر شێوەی ددانەیەك لەم بەشەدا بەرەو پێشەوە رۆشتووە، (کەنداوی لیون)و کەمێك بەرەو خۆرهەلات لاربووەتەوە و ناوچەکانی گاسکن لەخۆرئاوای ئەم کەنداوەدان.

وەلە نوکی باکوری ئەم بەشەدا وولاتی جنوە دەبینرێت لەهەمان هێلی رۆشتن لەلای باکورەوە کێوی منتجو (ئالپ)هەیە. هەروەها لەلای باکوری کێوەکەو لەسەر هەمان هێلّ سەرزەوی برغونە هەیە لەخۆرهەلاتی کەنداوی جنوە (ژنە)کە لەدەریای رۆمەوە دەردەچێتو، کەنداوێکی تریش لەهەمان دەریاوە دەردەچێت و لەنێوان ئەو دوانەدا بۆشاییەك دەمێنێتەوە کەلە ووشکیەوە بەرەو دەریا دەڕوات، لەلای خۆرئاوایەوە بیشو لەخۆرهەلاتیشەوە رۆمی گەورە هەیە کەپایتەختی پاشای فەرەنگ و نشینگەی پاپی گەورەیانە. لەوشارەدا بالەخانەی بەرزو گەورە و بەشکۆ دەبینرێنو، کلێساگەلێکی گەورە هەن کەناوبانگیان دیارە لەشتە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەو ڕووبارەیە کەلە ناوەڕاستی شاردا لەخۆرهەلاتەوە بەرەو خۆرئاوا دەڕوات. ناو ڕووبارەکە بەخشت و تەختەی مسین داپۆشراوە. وەکەنیسەی پتروس و پۆلس لەحەواریەکان لەو شارەدایە ئارامگایان لەو کەنیسەدایە و لەباکوری وولاتی رۆم مەملەکەتی ئەنبرزیە (لمباردی)هەیە کەتاوەکو کۆتایی ئەم بەشە درێژ دەبێتەوەو لەکەناری هەمان کەنداودا کەلەباشوریەوە رۆم هەیە. ناوچەکانی ناپل لەلای خۆرهەلاتیەوە دەبینرێت کەپەیوەستە بەشاری قلوریەوە لەمەملەکەتی فەرەنگەکان. لەباکوریەوە بەشێك لەدورگەی بەنادیقە لەبەشی

سێیەمەوە دەردەچێتو دێتە ناوئەم بەشەوەو ئەم کەنداوە لەلای خۆرئاواوە و لەبەرامبەر کەناری باکوری بەشی دووەم درێژ دەبێتەوەو، تاوەکو یەك لەسەر سێی دەڕوات و زۆرێك لە وولاتی بەنادیقە لەکەنار ئەم کەنداوەدایە. شارەناوبراوەکان لەباشوریەوە لەنێوان کەنداوو دەریای موحیتدا (دەریای ڕۆم)هاتونەتە ناوئەم بەشەوەو لەلای باکوری ناوچەکانی ئنکلایەوە دەبینرێت کەلەهەرێمی شەشەمدایە. وەلەبەشی سێیەمی ئەم هەرێمەدا، لەلای خۆرئاواوە ناوچەکانی قلوریە (کالابر)هەن کەلەنێوان کەنداوی ونیزو دەریای ڕۆمدا درێژ بونەتەوە بەشێك لەناوچەکەی دەچێتە ناوهەرێمی چوارەمەوە لەوێدا وەك دەلاقەیەك لەنێوان هەردوو کەنداودا، کەلەدەریای ڕۆمەوە بەرەو باکور جیابووەتەوەو چووەنەتە ناوئەم بەشەوە بەرەو پێشەوە دەڕوات و لەخۆرهەلاتی کالابر ئنکبردە هەیەو، کەنیمچە دورگەیەکە لەنێوان کەنداوی ونیزو دەریای ڕۆمدا درێژ دەبێتەوە. دەلاقەیەکی ئەم بەشە کەدەچێتە هەرێمی چوارەم و دەریای ڕۆمەوە لەلای خۆرهەلاتەوە بەکەنداوی ونیز سنوردار دەبێت ئەم کەنداوەش بەرەو باکور دەڕواتو لەپاشان لەبەرامبەر کۆتایی باکوری ئەم بەشەوە بەرەو خۆرئاوا لار دەبێتەوە. وەلەبەرامبەریەوە کێوێکی گەورە لەهەرێمی چوارەمەوە دێتە دەرەوە و لەبەرامبەریەوە بەرەو باکور درێژ دەبێتەوە، لەپاشان لەهەرێمی شەشەمدا بەیەکەوە بەرەو خۆرئاوا لار دەبنەوە تاوەکو دەگەنە بەرامبەر دورگەیەك کەلەلای باکوری ئەوانەوە لەناوچەی ئنکلایە (ئاکیلە)کۆتایی دێت و ئەم ناوچەیە تایبەتە بەگەلانی ئەلمانیاوە (لمانیە)، هەروەك دواتر باسی دەکەین.

لەسەرانسەری ئەو ماوەیەی کە ئەم کەنداوە و زنجیرە کێوەی کەبەرە و باکور درێژ دەبنەوە، دەتوانرێت ناوچەکانی ونیز ببینین، بەلام هەرئەوەندەی کە هێلی ڕۆشتنی کەنداوەکەو کێوەکە بەرەو خۆرئاوا بڕوات ئەوکات لەنێوانیاندا ناوچەکانی جرواسیاو لەپاشان ناوچەکانی ئەلمانیا لەکۆتایی کەنداوەکەدا دەبینرێت. وەلەبەشی چوارەمی ئەم هەرێمەدا پارچەیەك لەدەریای ڕۆم هەیە کەلە هەرێمی چوارەمەوە هاتووەتە ناویەوەو

لەسەر شێوەی نۆکەندێکی بچوکدایە و، بەرەو باکور درێژ بووەتەوە و کەوتووەتە نێوان هەردوو نۆکەندی بچوکی کەنداوی ئەودەریادایە. وەلەکۆتایی لای خۆرهەڵاتی ئەم بەشەوە بەشگەلێك لەدەریا هەن کەکەنداوی قوستە نتینیە لەوێوە بەرەو باکور دێتە دەرەوە، هەرکە لەم کەنداوەی باشورەوە دەردەچێت و بەرەو باکور دەڕوات تاوەکو سەرئەنجام دەگاتە هەرێمی شەشەم، لەوێشەوە پاش کەمێك بەرەو خۆرهەڵات دەڕوات و تاوەکو دەگاتە دەریای نیتش (ڕەش)لەبەشی پێنجەم و پارچەیەك لەبەشی چوارەم، کەلەپێش بەشی پێنجەمەوەیەو، هەندێکیش لەبەشی شەشەمی هەرێمی شەشەم، کەدواترباسی دەکەین. وەشاری قوستەنتینیە لەلای خۆرهەڵاتی ئەم کەنداوە لەنزیك کۆتایی باکوری ئەم بەشەدایە. ئەوەش هەمان ئەو شارە گەورەیە کەپایتەختی قەیاصیرە (پاشاکانی ڕۆم)بووە کەتێیدا شوێنەواری گەورەو پرشکۆی بیناو باڵەخانەی تێدا دەبینرێت کەلەزۆریەی مێژووەکاندا باس کراون.

ئەو بەشەی کەلەنێوان دەریای ڕۆم و کەنداوی قوستەنتینیەدایە لەم بەشەیەو وولاَتی مەقدۆنیای تێدایە کەیۆنانیەکانی تێدا ژیاون و یەکەمین دەوڵەتداریان لەوێوە دەستپێدەکات. وەلەلای خۆرهەڵاتی ئەم کەنداوە تاوەکو کۆتایی ئەم بەشە پارچەیەك لەسەرزەوی ناتوس هەیە، کەپێم وایە لەژێر دەسەلاَتی تورکومانەکاندایە و ئیبن عوسمان فەرمانڕەوایەتیان دەکاتو پایتەختەکەی لەوێدا شاری برصەیە بەرلەدەسەلاَتی تورکەکان لەژێر دەسەلاَتی ڕۆمەکاندا بووە تائەو کاتەی کەگەلانی تر بەسەر ڕۆمەکاندا زاڵ بوون و سەرئەنجام ئەو ناوچەیە کەوتە ژێر کۆنترۆڵی تورکەکانەوە. وەلەبەشی خۆرئاواو باشوری بەشی پێنجەمی ئەم هەرێمەدا سەرزەوی ناتوس هەیە، لەباکوریشەوە تاوەکو کۆتایی بەشەکە وولاَتی عموریە هەیە لەلای خۆرهەڵاتی ئەم ناوچەیەوە ڕووباری قباقب هەیە کەدەڕژێتە ڕووباری فوراتەوە و لەوکێوەی کەلەوێدایە سەرچاوە دەگرێت و، بەرەو باشور دەڕوات و سەرئەنجام بەرلەوەی کە لەم بەشەوە بگاتە هەرێمی چوارەم تێکەڵ بەڕووباری ناوبراو دەبێت. وەلەوێدا و لەلای خۆرئاواوە ڕووباری فورات کەسەرچاوەی ڕووباری

سەیحانە دەبینرێت، ئەوکات ڕووباری جەیحان لەخۆرئاوای ئەودایە و هەردوو ڕووبارەکە لەبەرامبەریەوە دەڕۆن هەروەك پێشتر باسمان کرد. وەلەخۆرهەڵاتی ئەم جێگەیەوە سەرەتای ڕووباری دیجلەیە کەلەبەرامبەر ڕووباری فوراتەوە دەڕوات تاوەکو لەنزیك بەغداد تێکەڵ بەیەکتر دەبن و لەگۆشەیەکی نێوان باشورو خۆرهەڵاتی ئەم بەشەداو، لەپشت ئەوکێوەی کەڕووباری دیجلەی لێوە سەرچاوە دەگرێت شاری میافارقین هەیە. وە ڕووباری قباقب کەباسمان کرد ئەم بەشە دەکات بەدووپارچەوە: یەکەمیان لەلای ناوچەی باشوری خۆرئاوادایە کەسەرزەوی ناتوسی تێدایە، هەروەك باسمان کردو، بەشەکانی خوارەوەیەتی کەتاوەکو کۆتایی باکوری ئەم بەشە درێژ دەبێتەوەو لەپشت ئەوکێوەی کەڕووباری قباقب لێوەی سەرچاوە دەگرێت سەرزەوی عەموریە هەیە هەروەك باسمان کرد.

پارچەی دووەم: لەلای باکوری خۆرهەڵاتەوەیەو لەیەك لەسەرسێی بەشی باشورەکەیدایە کەسەرچاوەی هەردوو ڕووباری دیجلە و فوراتە و لەباکوریدا وڵاتی بەڵقانە کەلەپشت کێوی قباقب پەیوەستە بەسەرزەوی عموریەوەو، ئەم پارچەیەش زۆر فراوانە و لەکۆتاییەکەشیدا و لەنزیك سەرچاوەی فوراتەوە وڵاتی خرشنە هەیە لەگۆشەی باکوری خۆرهەڵات بەشێکە لەدەریای نیتش. کەکونداوی قوستەنتینیە بەو کۆتایی دێت لەباشورو خۆرئاوای بەشی شەشەمی ئەم هەرێمە وڵاتی ئەرمەنستان هەیە. لەتەواوی نیوەی خۆرئاوای ئەم بەشە و تاوەکو ئەولای نیوەی خۆرهەڵات پەیوەستن بەیەکەوە لەباشوری خۆرئاوایدا شاری ئرزن هەیە و لەباکوریشیەوە تفلیس و دبیل بونیان هەیە، و لەخۆرهەڵاتی ئرزنیشدا شارەکانی خەلات و بردعە و لەباشوریشیدا، بەلار بونەوە بەرەو خۆرهەڵات شاری ئەرمەنیە هەیە. وەلێرەدا ناوچەکانی ئەرمەنستان بەرەو هەرێمی چوارەم درێژ دەبنەوە کەشاری مەراغە دەبینرێت کەلەناوچەی خۆرهەڵاتی کێوی کوردەکاندایە کەپێی دەڵێن برمە، کەلەبەشی شەشەمی هەرێمی چوارەمدا باسکرا. وەناوچەکانی ئەرمەنستان لەم بەشەدا و لەهەرێمی چوارەمدا کەلەپێش ئەم هەرێمەوەیە

لەلای خۆرهەلاتەوە هاوسنوری ئازەربایجانە کۆتایی خۆرهەلاتی ئازەربایجان لەم بەشەدا ناوچەکانی ئەردەبیلە کەلەپارچەیەکی دەریای تەبەرستاندایە، ئەم پارچە لەبەشی حەوتەم لەناوچەی خۆرهەلاتی ئەم بەشەدا پێشکەوتنی پەیدا کردووە و پێی دەڵێن دەریای تەبەرستان. لەلای باکوری ئەو دەریایەشەوە لەم بەشەدا پارچەیەك لە وولاتی خەزەر هەیە کەدانیشتوانەکەی تورکومانن وەلەکۆتایی ئەم بەشەی دەریادا لەباکوری کێوانێکەوە دەستپێدەکات کەپەیوەستن بەیەکەوە ئەم کێوانە بەرەو خۆرئاوا تاوەکو بەشی پێنجەم درێژ دەبنەوە و لەوبەشە تێدەپەڕن و، لەوکاتەی کەبەرەو شاری میافارقین دەڕۆن و دەورەیان داوە، سەرئەنجام دەچنە نزیك ئامەد لەهەرێمی چوارەم و پەیوەست دەبن بەکێوی سیلسیلەوە لەبەشەکانی باکوری شام و دەلکێن بەکێوی لکامەوە. وە لەنێوان ئەم کێوانەی باکور لەم بەشەدا کەل وملانێك هەن کەوەك دەرگایانێکن کەبەرەو نوولا کۆتاییان دێت لەلای باشوری ئەوناوچانەش دەربەندەکان هەن کەلەخۆرهەلاتەوە پەیوەستە بەدەریای تەبەرستانەوە و، لەکەنار ئەم دەریاشەوە لەوشارانەی کەباسکران شاری دەرگای دەرگاکان (باب الابواب)هەیە.

وولاتی ئەبواب لەلای باشوری خۆرئاواوە پەیوەستن بەشاری ئەرمینیەوە لەنێوان ئەوان و شارەکانی باشوری ئازەربایجان لەخۆرهەلاتەوە، ناوچەکانی ئاران هەیە کەپەیوەستن بەدەریای تەبەر ستانەوە. وە لە باکوری ئەم کێوانەوە پارچەیەك دەبینرێت کەلەخۆرئاوایەوە مەملەکەتی سەریر هەیە ئەم مەملەکەتەش لەگۆشەی باکوری خۆرئاوای کێوەکانی ناوبراودایە وەلەسەرانسەری گۆشەی ئەم بەشەشدا بەهەمان شێوە پارچەیەك لەدەریای نیتش دەبینرێت کە کەنداوی قوستەنتینیەی تێدا کۆتایی دێت، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد. وەئەم پارچەی دەریای نیتش وولاتی سەریر دەورەی داوەو شارەکانیشی کەلەکەنار دەریای ناوبراودان (تەرابزندە)لەنێویاندا دەبینرێت. وە ناوچەکانی سەریرلە نێوان کێوی ئەبواب و کۆتایی باکوری ئەم بەشەدا پەیوەستن بەیەکەوە تاوەکو سەرئەنجام لەخۆرهەلات بەکێوێك کۆتاییان دێت کەناوچەکانی

ناوبراویان لەسەرزەوی خەزەر جیا دەکاتەوە، لەنزیك كۆتایی ئەو وولاّتەشدا شاری صول هەیە لەپشت ئەم کێوە شێوە سەد ئاسایەوە بەشێك لەسەرزەوی خەزەر دەبینرێت، کەبەگۆشەی باکوری خۆرهەلاّتی ئەم بەشە لەنێوان کۆتایی باکوری ئەوو دەریای تەبەرستان کۆتایی دێت. وەسەرانسەری لای خۆرئاوای بەشی حەوتەمی ئەم هەرێمە دەریای تەبەرستان گرتویەتیەوە و بەشێك لەباشوری ئەم دەریایە دەچێتە هەرێمی چوارەمەوە، هەروەك لەوهەرێمەدا باسمان کرد، کەوولاّتی تەبەرستان و کێوەکانی دیلم تاوەکو قەزوین لەکەنار ئەم پارچەیەدایە لەلای خۆرئاوای ئەم پارچەی دەریاشەوە پارچەیەکی بچوکی تری پێوەپەیوەستە کەلەبەشی شەشەمی هەرێمی چوارەمدایە لەباکوری ئەم پارچەیەشدا پارچەیەکی تر دەچێتەوە سەری. کە کەوتووەتە خۆرهەلاّتی بەشی شەشەمەوەو لەم بەشەش پارچەیەك لەنزیك باکوری خۆرئاوای ئەم دەریایە لەدەرەوەی ئاوەکە دەمێنێتەوە کەڕووباری ئتل تێیدا دەڕژێتە دەریاوە، وەلەم بەشەوە لەلای خۆرهەلاّتەوە پارچەیەك لەدەرەوەی ئاوەکەوە دەمێنێتەوە، کەخێوەتگەکانی بەشێك لەتورکەکان کەبە غز ناسراون دەبینرێن و پێشیان دەلّێن خەزەر، ئەم ناوەش بەپێی بیروباوەڕی ئەوکەسانەی کە پێیان وایە وشەی خزر لەبەعەرەبی کردندا گۆڕدراوە پیتی (خ) بوەتە (غ) و پیتی (ڕ) ی لێ لابراوە.

کێوێك لەلای باشورەوە دەوری داوەو کەلەبەشی هەشتەمەوە دێت و بەرەو خۆرئاوا تاوەکو نزیك ناوەڕاستی ئەم بەشە درێژ دەبێتەوە و لەپاشان بەرەو باکور لار دەبێتەوە و تاوەکو دەگاتە دەریای تەبەرستان و، دەوری دەریای ناوبراو دەدات، و لەکەلّیدا درێژ دەبێتەوە و تاوەکو دەگات بەو بەشەکەی تری دەریاکە کەلەهەرێمی شەشەمدایە، لەپاشان کەنار دەریاکە لار دەبێتەوەو کێوەکەش پێچی تێدەکەوێت و لەدەریا جیا دەبێتەوەو، لێرەدا پێی دەلّێن کێوی ڕەش ئاراستەکەشی بەرەو خۆرئاوا دەگۆڕێت و بەوشێوەیە درێژ دەبێتەوە تاوەکو دەگاتە بەشی شەشەمی هەرێمی شەشەم. ئەو کات بەرەو باشور دەگەڕێتەوە و تاوەکو لەبەشی شەشەمی هەرێمی پێنجەمدا کۆتایی دێت

ئەم بەشەش هەمان ئەو زنجیرەیە کەلەم بەشەدا وولآتی سەریر لەسەرزەوی خزران جیا دەکاتەوە و سەرزەوی خزران لەبەشی شەشەم و حەوتەمدا پەیوەستە بەکەنار کێوی ڕەشەوە، هەروەك باسی دەکەین. وەسەرتاسەری بەشی هەشتەمی ئەم هەرێمە (پێنجەم)خێوەتگەکانی غزەکان پێك دەهێنێت کەلەهۆزە دەشتەکیە تورکەکانن و لەلای باشوری خۆرئاوای ئەم بەشەوە دەریاچەی خوارەزم (ئارال)هەیە کەڕووباری جەیحون دەڕژێتە ناویەوە و چواردەوری دەریاچەی ناوبراو سێصەدمیلە ڕووبارگەلێکی زۆر لەو سەرزەمینەی کە خێوەتگەکانی غزەکانی لێیە دەڕژێنە ناویەوە، لەلای باکوری خۆرهەلآتیشیەوە دەریاچەی غرگون هەیە کەچواردەورەکەی چوارصەد میلەو ئاوێکی شیرین و زولآلی هەیە. وەلەناوچەی باکوری ئەم بەشەدا کێوی مرغار دەبینرێت کەبەمانای کێوی بەفردێت، چونکە بەردەوام بەفر دایپۆشیوە و هیچ کات ئەوبەفرەی ناتوێتەوە و کێوی ناوبراو پەیوەستە بەکۆتایی ئەم بەشەوە. وەلەباشوری دەریاچە غرگوندا کێوێکی پڕ لە تاشەبەرد بەناوی غرگونەوە دەبینرێت کەهیچ گیایەکی تێدا ناڕوێت و دەریاچەی غرگونیشیان بەناوی ئەم دەریایەوە ناوناوە. وەڕووبار گەلێکی بێشومار لەکێوی غرگون و کێوی مرغار کەلەباکوری دەریاچەکەدایە بەرەو ئەو دەچن ولەدوو لاوە دەڕژێنە ناویەوە.

لە بەشی نۆیەمی ئەم ناوچانەدا ئزکش هەیە کەسەربەتورکەکانە. وولآتی ناوبراو لەخۆرئاوای وولآتی غزو خۆرهەلآتی ناوچەکانی کیماکدا دەبینرێت. وەلەلای خۆرهەلآتەوە لەکۆتایی بەشەکەدا کێوی قوقیا کەدەوری مەملەکەتەکانی یەئجوجو مەئجوجی داوە بەهەمان شێوە دەوری ئەم ناوچەیەشی داوە. ئەم کێوە لێرەدا لەباشورەوە بۆ باکور درێژ دەبێتەوە و تاوەکو لەسەرەتای شوێنی دەرچون لەبەشی دەیەمدا لار دەبێتەوە و بەرلەکۆتایی بەشی دەیەمی هەرێمی چوارەم لار دەبێتەوەو، دەچێتەناو بەشی دەیەمەوەو دەڕوانێت یەسەر دەریای موحیتدا و تاوەکو کۆتایی بەشی باکور درێژ دەبێتەوە. لەپاشان بەرەوخۆرئاوای بەشی دەیەمی هەرێمی چوارەم لار دەبێتەوە و

کەمتر لەنیوەی داگیر دەکات و لەدەستپێکی ئەم هەرێمەوە تاوەکو ئێرە دەوری وولاَتی کیماکی داوە. ئەوکات دەچێتە بەشی دەیەمی هەرێمی پێنجەمەوە و تاوەکو کۆتایی خۆرئاوای ئەم بەشە درێژ دەبێتەوە. وەلەلای باشوری کێوەکە لەم بەشەدا پارچەیەکی درێژ ماوەتەوە کەبەرەو خۆرئاوا درێژەی هەیە ولەپێشەوەی کۆتایی هاتنی ناوچەکانی کیماکدایە لەپاشان بەرەو خۆرهەلاَت و ئاراستەی سەرەوە(باشور)ی بەشی نۆیەم دەڕواتو لەپاش ئەوەی کەمێك لار دەبێتەوە بەرەولای باکورلاری بەخۆیەوە دەبینێت. وەبەهەمان ئاراستە تاوەکو بەشی نۆیەمی هەرێمی شەشەم درێژ دەبێتەوە و لێرەدا سەدێك هەیە کەدواتر باسی دەکەین. وەلەوبەشەوە پارچەیەك دەمێنێتەوە کەکێوی قوقیا لەنزیك گۆشەی باکوری بەشەکەدا دەورەی داوە و بەرەو باشور درێژ بووەتەوە و پارچەی ناوبراو بەشێك لە وولاَتی یەئجوجو مەئجوج پێکدەهێنێت و لەبەشی دەیەمی ئەم هەرێمەدا سەرزەوی یەئجوجو مەئجوج هەیە کەلەسەرانسەری ئەم بەشەداپەیوەستن بەیەکەوە بێجگە پارچەیەك لەدەریای موحیت، کەپارچەیەك لەناوچەکانی خۆرهەلاَتی بەشەکە لەباشورەوە تاوەکو باکوری گرتووەتەوە بێجگە پارچەیەك کەکاتێك قوقیا لێوەی تێپەڕدەکات لەلای باشورو خۆرئاواوە جیای دەکاتەوە، پاشماوەی ئەو بەشە سەر زەوی یەئجوجو مەئجوج پێکدەهێنێت، خوداش زاناوداناترە.

**هەرێمی شەشەم:** زیاتر لەنیوەی بەشی یەکەمی دەریایە و بەهۆی گەشتنی ئاو بەبەشی خۆرهەلاَتی لەکاتی دەورکردنەوەی دەریاکەدا لاریەك بەئاراستەی باکور دروستدەبێت و، لەپاشان لەدرێژی ناوچەی خۆرهەلاَتەوە بەرەو باشور پێشڕەوی دەکات. لەپاش ئەوەی کەکەمێك درێژ دەبێتەوە لەنزیك ناوچەی باشوردا کۆتایی دێت. وەبەم شێوەیە پارچەیەك لەووشکانی لەم بەشەدا دەردەکەوێت کەوەك لوتکەیەك وایە کەلە نێوان دوو کەنداو لەدەریای موحیت لەگۆشەی باشوری خۆرهەلاَتەوە بەرەو پێش چووە. سەرزەوی ناوبراو لەدرێژیو پانیدا فراوان دەبێت سەرانسەری ناوچەی برتانی

پێکدەهێنێت لەدەرگای ئەم لوتکەیەوە لەنێوان هەردوو کەنداودا لەگۆشەی باشوری خۆرهەلأتی ئەم بەشەدایە کەپەیوەستە بەوولأتی (بیتو) وە و لەبەشی یەکەم و دوەمی ئەم هەرێمی پێنجەمەدا. وەلەبەشی دووەمی ئەم هەرێمەدا دەریای موحیت لەخۆرئاواو باکوریە بەرەو پێش چووە. بەشی خۆرئاواکەی پارچەیەکی لاکێشەپێکدەهێنێت کەزۆربەی نیوەی باکورەکەی لەخۆرهەلأتی سەرزەوی بەریتانیایەکەلەبەشی یەکەمدایەو پارچەیەکی تریش لەباکورە پێوەی دەبەسترێتەوە و لەخۆرئاواوە بۆ خۆرهەلأتی بەشەکە درێژ بووەتەوە لەنیوەی خۆرئاوای بەشی ئەم کەنداوەدا کەمێك فراوان دەبێت و لەهەمان شوێندا پارچەیەك لەدورگەی ئینگلتەرا هەیە و، زۆر فراوانە و شارگەلێکی زۆری تێدایە و وولأتێکی بەتواناایان پێکهێناوە پاشماوەی دورگەی ناوبراو لەهەرێمی حەوتەمدایەو، لەباشوری ئەم کەنداوەو دورگەکەیدا لەنیوەی خۆرئاوای ئەم بەشەدا ناوچەکانی نۆرماندی و وولأتی ئەفلاندس دەبینرێن کەپەیوەستن پێیەوە، لەپاشان وولأتی فەرەنسا لەباشوری خۆرئاوای ئەم بەشەداو وولأتی برغوینە لەخۆرهەلأتیدا هەیە هەموو ئەم وولأتانە فەرەنگیەکانی تێدا دەژین ولأتی ئەلمانیا لەنیوەی خۆرهەلأتی ئەم بەشەدایە، هەروەك چۆن لەباشورەکەیدا ناوچەکانی ئنکلایە لەباکوری وولأتی برغونیە ئەوکات سەرزەوی (لهرنکە)شەزونیە دەبینرێن.

لەسەر کەناری پارچەیەك لەدەریای موحیت کەگۆشەی باکوری خۆرهەلأتی ئەم بەشەی گرتووەتەوە سەرزەوی ئەفریزە هەیە کەسەربەنەتەوەکانی ئەلمانیایە لەباشوری بەشی خۆرئاوای، بەشی سێیەمی ئەم هەرێمەدا ناوچەی بوامیە لەباکوری شزونیەدایە.لەبەشی خۆرهەلأتی بەشەکەدا وولأتی ئەنکریە لەباشورو ناوچەکانی پۆلۆنیا لەباکوردایە کەزنجیرە چیاکانی بلوات (کارپات)دەکەوێتە نێوان هەردوو وولأتی ناوبراوەوە، ئەم کێوە لەبەشی چوارەمەوە دێتەناوئەم بەشەوە بەرەو خۆرئاوا بەلاریەوە بەئاراستەی باکور دەڕوات تاوەکو دەگاتە ناوچەکانی شزونیە واتە کۆتایی خۆرئاوای بەشی سێیەم و لەوێدا کۆتایی دێت و تەواودەبێت. لەناوچەی باشوری بەشی چوارەمدا

سەرزەوی جسولیە دەبینرێت لەژێر ئەو ناوچەیەوە بەرەو باکور وولاتی ڕووسیا هەیەو، کێوی بلوات ناوچەکانی ناوبراو لەسەرەتای خۆرئاواوە بەشەکە لەیەکتر جیا دەکاتەوە تائەوەی کەلەنیوەی خۆرهەلاتدا دەوەستێتو، لەخۆرئاوای وولاتی جسولیەدا ناوچەکانی جرمان (ژرمن)دەبینرێت. وەلەگۆشەی باشوری خۆرهەلاتیەوە، سەرزەوی قوستەنتینیە ناوەندەکەی لەکۆتایی کەنداوێکدایە کەلەدەریای ڕۆمەوە دەردەچێت لەنزیك ڕژێنگەکەی کەلەدەریای نیتشدایە، هەربۆیە وەك پارچەیەکی بچوك لەدەریای نیتش لەبەشەکانی باشوری خۆرهەلاتی ئەم بەشە دەژمێردرێت کەدەبەسترێت بەکەنداوەکەوە و لەنێوان ئەو دوانەو لەهەمان گۆشەدا شاری مسنات هەیە. لەبەشی پێنجەمی هەرێمی شەشەمدا لەناوچەی باشوری نزیك دەریای نیتش پارچەی ناوبراو لەکۆتایی بەشی چوارەمدا پەیوەست دەبێت بەکەنداوەکەوە لەهەمان لای کەنداوەکەوە بەرەو خۆرهەلات درێژ دەبێتەوە، لەهەموو ئەم بەشەو بەشێك لەبەشی شەشەم بەدرێژی هەزارو سێسەدمیل لەسەرەتاوە بەپانی شەشسەدمیل دەڕوات. لەپشت ئەم دەریاوە لەناوچەی باشوری ئەم بەشە دەشتێکی لاکێشەهەیە کەلەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەلات دەڕواتو لەخۆرئاوایەوە شاری هرقلیە لەکەناری دەریای نیتشدا دەبینرێت کەپەیوەستە بەسەرزەوی بیلقان لەهەرێمی پێنجەمداو، لەخۆرهەلاتیەوە ناوچەکانی لانیە هەن کەپایتەختەکەی سینوبلیە لەکەناردەریای نیتش، لەباکوری دەریای نیتش لەبەشی خۆرئاوای ئەم بەشەدا سەرزەوی برجان (بولغار)و لەلای خۆرهەلاتیەوە وولاتی ڕووسیا هەیە و هەموویان لەکەناری ئەم دەریادان، وولاتی ڕووسیا لەم بەشەدا لەلای خۆرهەلاتی وولاتی برجان (بلغار)و لەبەشی پێنجەمی هەرێمی حەوتەم لەلای باکوریەوە و لەبەشی چوارەمی ئەم هەرێمەدا دەورەی لای خۆرئاوای داوە.

لەبەشی خۆرئاوای بەشی شەشەمدا پاشماوەی دەریای نیتشە کەکەمێك بەرەو باکور لار دەبێتەوە. وەلەنێوان ئەم دەریاو کۆتایی باکوری ئەم بەشە وولاتی قومانی هەیە و لەباشوری دەریای ناوبراودا لەکاتێکدا بەئەندازەی لار بونەوەی دەریا بەرەو باکور فراوان

دەبێتو ناوچەکانی تری لانیە دەبینرێن کەکۆتایی باشورەکەی لەبەشی پێنجەمدایە لەلای خۆرهەڵاتی ئەم بەشەوە ناوچەی بەیەکگەیشتنی سەرزەوی خەزەر هەیە و، لەخۆرهەڵاتی ئەو سەرزەمینەشدا سەرزەوی برتاس هەیە و لەگۆشەی باکوری خۆرهەڵاتی ئەم بەشەشدا سەرزەوی بلغار و لەگۆشەی باشوری خۆرهەڵاتیشیەوە سەرزەوی بلجر هەیە و، لێرەدا زنجیرەیەك لەکێوە ڕەش بەوێدا تێدەپەڕێت ئەم زنجیرەیە لەپاش ئەو لەگەڵ دەریای خەزەردار بەرەو بەشی حەوتەم لار دەبێتەوە لەپاش جیابونەوەش لەدەریا بەرەو خۆرئاوا دەڕوات کەواتە لەم بەشەوە دەگوزەرێت و دەچێتە بەشی شەشەمی هەرێمی پێنجەمەوە و لەوێدا دەگات بەکێوی ئەبواب و لەوێدا ناوچەی وولاتی خەزەر لەدامێنیدا دەبینرێت. وەلەناوچەی باشوری بەشی حەوتەمی ئەم هەرێمەدا ناوچەیەکە کە کێوەڕەش لەپاش جیابوونەوەی لەدەریای تەبەرستان لەو تێپەڕدەکات و بەشێکە لەسەرزەوی خەزەر کەتاوەکو کۆتایی ئەم بەشە لەلای خۆرئاواوە درێژ دەبێتەوەو، لەخۆرهەڵاتیشیەوە پارچەیەکە لە دەریای تەبەرستان کەئەم کێوە لەخۆرهەڵات و باکوریەوە دەگوزەرێت. وەلەپشت کێوی ڕەشەوە لەناوچەی باکوری خۆرئاوای سەرزەوی برتاسدایە و لەناوچەی خۆرهەڵاتی ئەم بەشەدا سەرزەوی بسجرت و بجناك بونیان هەیەو، دانیشتوا نەکەشی لەنەتەوەی تورکن.

سەرتاسەری ناوچەی باشوری بەشی هەشتەم سەرزەوی خلخ پێکدەهێنێت کەسەربە تورکەکانە و لەناوچەی باکوری خۆرئاوا سەرزەوی منتنتە هەیەو، لەخۆرهەڵاتیشدا ئەوسەرزەویەی کەپێی دەڵێن یەئجوجو مەئجوج شارەکانی بەر لەدروستکردنی سەدەکە وێران کردووە، سەرچاوەی ڕوداتل لەم شوێنەدایە. ئەم ڕووبارە بەگەورەترین ڕووبارەکانی جیهان دەژمێردرێت و ڕێڕەوەکە لەوولاتی تورك و ڕژێنگەکەی لەدەریای تەبەرستاندایە کەکەوتووەتەبەشی حەوتەمی هەرێمی پێنجەمەوە. ڕووباری ناوبراو لارولەوێری زۆری تێدایە و ئەوەی کەلەکێوی منتنەوە دێتە دەرەوە بریتیە لەسێ سەرچاوە کەهەرسێکیان لەیەك ڕووباردا کۆدەبنەوە، ئەوکات ڕووباری ناوبراو بەرەو

خۆرئاوا تاوەکو کۆتایی بەشی حەوتەمی ئەم هەرێمە دەڕوات و لەپاشان بەرەو باکور لار دەبێتەوە و تاوەکو دەگاتە بەشی حەوتەمی هەرێمی حەوتەم لەکەناریدا ولەنێوان باشورو خۆرئاوادا دەڕوات و، لەپاشان لەبەشی شەشەمی هەرێمی حەوتەمدا دەردەکەوێت. ئەندازەیەك بەرەو خۆرئاوا دەڕوات و دیسانەوە بەرەو باشورلار دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بەشی شەشەمی هەرێمی شەشەم و ڕووبارێکی لێدەبێتەوە کەبەرەو خۆرئاوا دەڕوات و دەڕژێتە دەریای نیتشەوە، بەڵام ڕووبارەکە لەوەبەدواوە لەپارچەیەك لەنێوان باکورو خۆرهەڵات لەناوچەکانی بولغار تێدەپەڕێت دەگاتە بەشی حەوتەمی هەرێمی شەشەم. لەپاشان بۆسێیەم جار بەرەو باشور لاردەبێتەوە و دەچێتەکێوی ڕەشەوە و بەووڵاتی خەزەردا تێدەپەڕێت و لەبەشی حەوتەمی هەرێمی پێنجەمدا دەردەکەوێت. لێرەداو لەپارچەیەك لەم بەشەدا لەنزیك گۆشەی باشوری خۆرئاواوە دەڕژێتەناو دەریای تەبەرستانەوە. لەلای خۆرئاوای بەشی نۆیەمی ئەم هەرێمەدا ووڵاتی خفشاخ هەیە کەسەر زەوی تورکەکانە پێیان دەڵێن قفچاق (قبچاق)یشیان پێدەڵێن و ناوچەکانی (تورکیش)، لەوێدایە وەلەلای خۆرهەڵاتی ئەوناوچەیەدا ووڵاتی یەئجوج هەیە کەکێوی قوقیای موحیت کەوتووەتە نێوان ئەوان و تورکەکانەوە، هەروەك باسمان کرد. ئەم کێوە لەدەریای موحیتەوە لەخۆرهەڵاتی هەرێمی چوارەمەوە دەستپێدەکات و هەرلەو دەریایەدا تاوەکو کۆتایی ئەو هەرێمە درێژەی دەبێت لەوکاتەی کەبەرەو باکوری خۆرئاوادەڕوات لەو جیادەبێتەوە و دەچێتەبەشی نۆیەمی هەرێمی پێنجەمەوە، ئەوکات بەئاراستەی یەکەمین لاریونەوەی دەگەڕێتەوە تاوەکو لەلای باشورەوە بەرەو باکور و بەلاریەوە بەرەو خۆرئاوا دەچێتە ناوبەشی نۆیەمی ئەم هەرێمەوە لەناوەڕاستەکەشیدا سەدێك هەیە کە ئەسکەندەری مەقدۆنی دروستی کردووە.

ئەوکات بەهەمان ئاراستەدەچێتە هەرێمی حەوتەمەوە و دەگاتە بەشی نۆیەمی. لەپاشان بەرەو باشور دەڕوات و تاوەکو لەبا کوری دەریای موحیتدا دەردەکەوێت لەوێشەوە بەدرێژایی ئەودەریایەبەرەو خۆرئاوا لار دەبێتەوە، تاوەکو دەگاتە بەشی

پێنجەمی هەرێمی حەوتەم و دەگات بەپارچەیەك لەبەشی خۆرئاوای دەریای موحیت. لەناوەڕاستی ئەم بەشی نۆیەمەدا هەروەك گوتمان سەدێك هەیە كەئەسكەندەر بنیاتی ناوە و لەقورئانیشدا پشتڕاست كراوەتەوە (ئایەتەكانی ٩٢ ٩٣ ٩٤ ٩٥ س كهف)باسی دەكەن، عبداللەی كوڕی خردادبە لەكتێبە جوگرافیەكەیدا باسی كردووە، كەواسیق لەخەوندا بینیویەتی كەئەو سەدە كراوەتەوە وبەترسێكی زۆرەوە لەخەوەكەی ڕاپەڕیوەو سەلامی تەرجومان دەنێرێت بۆئەویێ و، لەپاش كۆكردنەوەی زانیاری سەبارەت بەسەدی ناوبراو لەچیرۆكی كتێبەكەیدا باسی ئەوسەدە دەكات، كەهێنانی دەقەكەی لەمەبەست لامان دەدات وەلەبەشی دەیەمی ئەم هەرێمەدا سەرزەوی مەئجوج هەیە كەتاوەكو كۆتایی ئەم بەشە درێژەی هەیە. ئەم وولاتە لەم بەشەدا لەكەنارپارچەیەكی دەریای موحیتدایە كەلەخۆرهەلات و باكورەوە دەورەی داوە پارچەی ناوبراو لەلای باكورەوە لاكێشەییە و لەلای خۆرهەلاتیشەوە كەمێك فراوانە.

**هەرێمی حەوتەم:** دەریای موحیت لەلای باكورەوە تاوەكو ناوەڕاستی بەشی پێنجەم كەپەیوەستە بەكێوی قوقیاوە سەرانسەری ئەم هەرێمەی گرتووەتەوە، كێوی قوقیا هەرئەوكێوەیە كەگوتمان دەوری ناوچەكانی یەئجوج مەئجوجی داوە. كەواتە بێجگە لەبەشێكی دورگەی ئینگلتەرا نەبێت كەلەدەرەوەی ئاوە بەشی یەكەم و دووەمی ئەم هەرێمە لەژێر ئاودایە زۆرترینی ئەو بەشەش لەبەشی دووەمدایە. وەلەبەشی یەكەمدا تەنها كەنارەیەكی لێوە دەبینرێت كەبەرەو باكور لار بووەتەوە ئەوی تریشی لەگەڵ پارچەیەك لەدەریا كەلەشێوەی بازنەدایە، لەبەشی دووەمی هەرێمی شەشەمدایە كەلەێدا باسمانكرد. لەنێوان ئەم دورگەیەو ووشكانیەكەیدا گوزەرگەیەك هەیە كەپانیەكەی دوانزەمیلە، لەپشت ئەم دورگەیە و لەناوچەی باكوری بەشی دووەمدا دورگەی رسلاندە هەیە. كەلەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەلات درێژ بووەتەوە. وەزۆرتری بەشی سێیەمی ئەم هەرێمە چووە بەناو ئاودا بێجگە لەپارچەیەكی لاكێشەیی لەباشورەكەیدا كەلە بەشی

خۆرهەلاتیدا پان دەبێتو دەبێتەهێلێ پەیوەندی لەنێوان ئەم بەشەو سەرزەوی فلونیە(پولونی)دا هەروەك لەبەشی سێیەمی هەرێمی شەشەمدا باسكرا و ئەوەمان گوت كە ئەو سەرزەمینە لەباكورەكەیدایە، وەلەوبەشەی دەریا كەئەم بەشەی گرتووەتەوە، بەتایبەت لەناوچەی خۆرئاوایەوە بەشیكی فراوانە ئەم بەشەپەیوەستە بەودەریایەی كەلەباشوریەوەیەتیو بە وولاتی پۆلۆنیا كۆتایی دێت.

دورگە یان نیمچە دورگەی (برقاغە (نەرویج)لەباكوریدایە كەلەلای باكورەوە بەرەو خۆرئاوا كشاوە وسەرانسەری بەشی باكوری بەشی چوارەمی ئەم هەرێمە دەریا دایپۆشیوە، بەلام باشورەكەی لەدەرەوەی ئاودایە. وەسەرزەوی فیمازكی توركەكان لەخۆرئاوایدایە و لەخۆرهەلاتیشیەوە وولاتی تبست و سەرزەوی رسلاندە هەیە كەتاوەكو خۆرهەلاتی بەشەكە درێژەی هەیە ئەم ناوچەیە بەفراویو سەهۆلبەندانە و ئاوەدانی تێیدا دەگمەنە. وەسەرزەوی ناوبراو لەبەشی چوارەم و پێنجەمی هەرێمی شەشەمدا پەیوەستە بەرووسیاوە و وولاتی ناوبراو لەناوچەی خۆرئاوای بەشی پێنجەمی ئەم هەرێمەدایە هەروەك پێشتر باسمانكرد لەباكورەوە بەپارچەیەكی دەریای موحیت كۆتایی دێت كەپەیوەستە بەكێوی قوقیاوە. وەناوچەی خۆرهەلاتی ئەم بەشە شوێنی بەیەككەشتنی سەرزەوی قومانیە كەلەسەر پارچەیەكی كەنار دەریای نیتشەوەیە لەبەشی شەشەمی هەرێمی شەشەمداو بەدەریاچەی تەرمی كۆتایی دێت كەبەم بەشە دەژمێردرێت. ئاوی ئەم دەریایە شیرینەو رووبارگەلیكی زۆر لەكێوەكانی باشورو باكورەوە دێنەسەری. لەباكوری ناوچەی خۆرهەلاتی ئەم بەشەدا سەرزەوی بناریە هەیە كەنەتەوەی توركی تێدا دەژین و تاوەكو كۆتایی ئەم بەشە درێژەی هەیە.

ناوچەی باشوری خۆرئاوای بەشی شەشەم شوێنی بەیەككەشتنی ئەوە لەگەڵ وولاتی قومانیدا و لەناوەراستی ئەم ناوچەیەدا دەریاچەی غنون دەبینرێت كەئاوەكەی شیرینە و لەكێوەكانی ناوچەی خۆرهەلاتەوە دەرژێتە ناویەوە، بەلام دەریاچەی ناوبراو بەهۆی زۆری سەرماوە بێجگە لەماوەیەكی كەم لەوەرزی هاویندا نەبێت بەردەوام بەستەڵەكە.

لەخۆرهەلآتی وولآتی قومانیدا وولآتی ڕووسیا دەبینرێت کەسەرەتاکەی لەناوچەی باکوری خۆرهەلآتی بەشی پێنجەمی هەرێمی شەشەمدایە. وەلەگۆشەی باشوری خۆرهەلآتی ئەم بەشەدا سەرزەوی بولغار هەیە کەسەرەتاکەی لە ناوچەی باکوری خۆرهەلآتی بەشی شەشەمی هەرێمی شەشەمدایە لەناوەڕاستی ئەم بەشەشدا کەبە وولآتی بولغار دەژمێردرێت شوێنی لار بونەوەی ڕووباری ئتل دەبینرێت کەیەکەمین لار بونەوەی بەرەو باشورە، هەروەك پێشتر باسمان کرد، وەلەکۆتایی ناوچەی باکوری ئەم بەشەدا قوقیا هەیە کەلەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەلآت پەیوەستە بەم بەشەوە. وەلەخۆرئاوای بەشی حەوتەمی ئەم هەرێمەدا پاشماوەی سەرزەوی بجناك دەبینرێت کەتورکەکانی تێدا دەژین و سەرەتاکەی لەناوچەی باکوری خۆرهەلآتی بەشی شەشەمی ئەم هەرێمەو، ناوچەی باشوری خۆرئاوای ئەم بەشە بووە کەلەسەرەوەی هەرێمی شەشەمەوە دێتەناویەوە. وەلەناوچەی خۆرهەلآتی بەشەکەدا ناوچەکانی تری بسجرت (باشگیر)و سەرزەوی منتنەهەیە کەتاوەکو کۆتایی خۆرهەلآتی بەشەکە درێژەی هەیە لەکۆتایی بەشەکەشدا لەلای باکورەوە کێوی قوقیای موحیت هەیە کەلەخۆرئاواوە بۆ خۆرهەلآت بەسراوە پێیەوە. وەلەباشوری خۆرهەلآتی بەشی هەشتەمی ئەم هەرێمە شوێنی بەیەکگەشتنی سەرزەوی منتنەیەو لەخۆرهەلآتیشیەوە سەرزەوی محفور هەیە کەلەشتە سەرسوڕ هێنەرەکانی جیهان دەژمێردرێت، چونکە چۆمێکی جوان و پڕ لەدارو درەختەو هێندە قوڵە کەناتوانرێت قولآیی ببینرێت.

نیشانەی ئاوەدانی لەڕۆژدا ئەودوکەڵانەیە کەلێیەوە بەرز دەبێتەوەو لەشەویشدا ئەوڕووناکیە جوان و درەخشانەیە کەئاسمانەکەی نورانی دەکاتو دەڵێن کەگوایە ڕووبارێکیان تێدابینیوە کەلەباشورەوە بۆ باکور دەیکات بە دوو بەشەوە و لەناوچەی خۆرهەلآتی ئەم بەشەدا ناوچەگەلێکی وێرانن کەهاوسنوری سەدەکەن وەلەکۆتایی باکوریەوە کێوی قوقیا هەیە کەلەخۆرهەلآتەوە بۆ خۆرئاوا درێژ دەبێتەوە. وەلەلای خۆرئاوای بەشی نۆیەمی ئەم هەرێمەوە وولآتی خفشاخ یان قفجق (قبجاق)هەیە کەکێوی

قوقیا کاتێك لەباکوریەوە و لەنزیك دەریای موحیت لار بونەوە پەیدادەکات ئەو دەگرێتەبەرو لەناوەڕاستی بەشەکەوە بەرەو باشور بەلاریەوە بەئاراستەی خۆرهەلآت درێژ دەبێتەوە ئەوکات لەبەشی نۆیەمی هەرێمی شەشەمدا دەردەکەوێت و لەویش تێپەڕدەکاتو لەناوەڕاستی ئەوناوچەیەشەوە سەدی یەئجوجومەئجوج دەبینرێت کەباسمانکرد. وەلەناوچەی خۆرهەلآتی ئەم بەشەدا سەرزەوی یەئجوج هەیە کەلەپشت کێوی قوقیاوە دەبینرێت و دەڕوانێت بەسەر دەریادا، سەرزەویەکی تەسك و درێژەو لەلای خۆرهەلآت و باکورەوە کێوەکان دەورەیان داوە. وەسەرانسەری بەشی دەیەمی ئەم هەرێمە ئاو داپۆشیوە. ئەمەش کۆتایی قسەکەمانە لەبارەی جوگرافیاو حەوت هەرێمەکە، (دروستکردنی ئاسمان و زەوی و جیاوازی نێوان شەوو ڕۆژ بەڵگە و نیشانەن بۆ جیهانیان).[199]

---

[199] (إِنَّ فِی خَلقِ السَّماواتِ وَالأَرضِ وَاختِلافِ اللَّيلِ وَالنَّهارِ لَآياتٍ لِلعالَمِين) س ال عمران ئا ١٨٧ .

# پێشەکی سێیەم

## لەبارەی هەرێمە ڕاست و لارەکان و کاریگەری هەوا لە ڕەنگەکانی مرۆڤ و زۆرێك لەچۆنیەتی و حاڵەتەکانیان

لەڕابوردودا ئەوەمان باسکرد کەبەشی ئاوەدانی ناوچەکانی گۆی زەوی لەناوەڕاستیدایە، چونکە توندی گەرما لەباشور و توندی سەرماش لە باکور ڕێگرە لەبەردەم ئاوەدانیدا و لەبەرئەوەی هەردوولای باکور و باشور لەڕوانگەی گەرماو سەرماوە پێچەوانەی یەکترن، پێویستە لەم دوو چۆنیەتیە بەشێوەیەکی قۆناغ بەقۆناغ کەم ببێتەوە بۆئەوەی لەناوەندی زەویدا کەش و هەوای مام ناوەند دروست ببێت، هەربۆیە هەرێمی چوارەم بۆ ئاوەدانی زۆرگونجاوە ئەوەی لەتەنیشتیەوەیەتی واتە هەرێمەکانی سێیەم و پێنجەم لەهەرێمی ناوبراوەوە لەهەرێمەکانی تر نزیکترن لەمامناوەندیەوە، بەڵام هەرێمەکانی دووەم و شەشەم لەمامناوەندیەوە دورن. هەرێمەکانی یەکەم و حەوتەم بەپێی پلە دورترن. هەربۆیە زانست و هونەرو خانوو پۆشاك و خواردنەکان و میوەو تەنانەت گیانەوەران و هەموو ئەوشتانەی کەلەم سێ هەرێمەناوەندیەدا هاتونەتەئاراوە تایبەت کراون بەمامناوەندیەوە. ئەو مرۆڤانەی کەدانیشتوی ئەم سێ هەرێمەن لەڕوانگەی جەستەو ڕەنگ و ئەخلاق و ئاینەکانەوە ڕاست ڕەو ترن و تەنانەت پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەرانیش زیاتر لەم هەرێمانەدا بوون.

لەهەرێمەکانی باشور و باکوردا هەواڵێك لەپێغەمبەرایەتی نیە، چونکە پێغەمبەران‌و نێردراوانی خودا تایبەتن بەکامڵترین جۆری مرۆڤەکانەوە لەڕوانگە هەڵسوکەوت‌و خولقاندنیانەوە. خودای گەورە دەفەرمێت ئێوە باشترین گەلانن لەناو خەڵکیدا[200]. ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەوەی کەپێغەمبەران لەلای خوداوە دەیهێنن قبوڵ بکرێت‌و بانگەوازەکەیان بڵاو ببێتەوە و ڕەواج پەیدا بکات و دانیشتوانی ئەم هەرێمانە بەهۆی ژیانیانەوە لەم ژینگە مامناوەندەدا کامڵترن، چونکە دەبینین ئەم خەڵکە لەڕوانگەی خانوو پۆشاك و خۆراك و پیشەسازیەوە ئەوپەڕی میانەڕەوی بەکار دەهێنن، خانوگەلێك دروستدەکەن بەبەردی جوان و قەشەنگ کەبەشێوەیەکی زۆرجوان‌و هونەری دروستکراون‌و، لەڕزاندنەوە و جوانکردنی ژیانیاندا لەهەموو کەسێك لەپێشترن‌و لەم ڕێگەیەشدا دەگەنە ئەوپەڕی کامڵبوون و لای ئەوان کانزای سروشتی وەك ئاسن و مس و ئەریز و زر و سیم و سیرب هەیە و، لەسەوداو مامەڵەکانیاندا دینارو دیرهەم بەکار دەهێنن. لەزۆربەی کاتەکاندا دوورن لەلارو لەوێری لەهەڵسوکەوت و ژیانیاندا ئەمانەش بریتین لەخەڵکی شام و یەمەن و مەغریب و حیجاز عێراق و ئێران و هیندستان و سیند چین و ئەندەلوس و نەتەوەکانی دراوسێیان.. وەك فەرەنگیەکان وجلاقە و ڕۆمی و یۆنانی و ئەونەتەوانەشی کەنزیکن لەم گەلانەوە و لەهەرێمە مامناوەندەکاندا دەژین. هەربۆیە عێراق و شام لەهەموو ئەم ناوچانە مامناوەند ترن، چونکە وڵاتانی ناوبراو لەناوەڕاستی ئەم لایەنانەوەن، بەڵام دانیشتوانی هەرێمەدوورەکان لەمامناوەندەوە وەك هەرێمەکانی یەکەم دووەم شەشەم حەوتەم لەهەموو بارودۆخێکدا لەمامناوەندەوە دوورن، هەروەك چۆن خانووەکانیان لەگڵ و قامیش و خۆراکیان لەگەنمەشامی و ئالیك و پۆشاکیان لەبەرگی درەختان کەدەیانلکێنن بەیەکەوە بۆئەوەی جەستەیان دەرنەکەوێت وەیان سود لەپێستی حەیوانات وەردەگرن بەمەبەستی دروستکردنی پۆشاك و زۆربەیان بەشێك لەجەستەیان ڕووتە و میوە و خۆراکەکانیان بەشێوەیەکی زۆر سەیر

---

[200] (کُنتُم خَیرَ أُمَّةٍ أُخرِجَت لِلنَّاس) س ال عمران ئا١٠٦.

دروستدەکەن و، سەوداو مامەڵەیان بەزەر، وسیم[201] نیەبەڵکو زیاتر بەمس و ئاسن سەوداو مامەڵەکانیان ڕایی دەکەن و زۆربەی کڕین و فرۆشتنەکانیان بەپێستە و کەرەستەی بێکەڵکی ترە کەدەیگۆڕنەوە بەکاڵاو کەرەستەی ترو هەرخۆشیان نرخیان لەسەر دادەنێن و بەکورتی لەزۆربەی هەڵسوکەوتەکانیاندا لەگیانەوەرە بێزمانەکان دەچن، تەنانەت لەبارەی خەڵکی سودان واتە دانیشتوانی هەرێمی یەکەم دەڵێن کەزۆربەیان لەئەشکەوتەکاندا ژیان دەگوزەرێنن و وەك وەحشیەکان سۆزو بەزەییان لەگەڵ یەکدانیە تەنانەت هەندێك جار یەکتری دەخۆن (صقالیبە)ش بەم شێوەیەن، هۆکاری ئەمەش دووری ئەمانەیە لەناوچەی مام ناوەندەوە هەربۆیە لەزۆربەی داب و نەریتەکانیاندا لەگیانەوەرانەوە نزیکن و لەمرۆڤایەتیەوە دوورن.

هەروەها لەبواری ئاینداریشدا بەهەمان شێوەی ژیانیانە و ئاشنایەتیان لەگەڵ هیچ پێغەمبەرایەتیەکدا نیەو هیچ شەریعەتێك ناناسن مەگەر کەمێکیان نەبێت کەلەنزیك ناوچەی مام ناوەند دا دەژین، وەك حەبەشیەکان کەلەنزیك یەمەنەوەن و بەرلەهاتنی ئیسلام لەسەر ئاینی مەسیح بوون و تائێستەش لەسەر هەمان ئاین ماونەتە وە وەك دانیشتوانی مالی و گوگو و تکرور کەدراوسێی سەرزەوی مەغریبن و لەم سەردەمەدا پەیڕەوی ئاینی ئیسلامن و دەڵێن ئەوان لەسەدەی حەوتەمدا وازیان لەئیسلام هێناوە، چونکەبەشێك لەگەلانی صەقالیبە و فەرەنگی و تورکەکان لەناوچەی باکوربوون و لەسەرئاینی مەسیح بوون. بێجگە لە گەلە ناوبراوەکان خەڵکانی تری هەرێمە لارەکانی باشورو باکور بێئاگان لەئاین و هیچ زانستێك نازانن و لەهەموو نەریتێکی مرۆڤانە بەدوورن و هەڵسوکەوتی حەیوانات دەکەن، (دەخولقێنێت بونەوەرانێك کەئێوە نایانزانن)[202] هەربۆیە نابێت بەکەم وەری بگرین کەبۆچی خەڵکی حەزرەمەوت و ئەحقاف و یەمامە و یەمەن و حیجاز و شارەکانی تری نزیك لەوانەوە لەدورگەی عەرەبیدا لەهەرێمی

---

[201] بریتین لەدوو بەردی گرانبەهاو بەنرخ.

[202] (وَيَخْلُقُ مالا تَعلَمُون) ئا ٨ س النحل .

یەکەم و دووەم بەم شێوەیە نین، چونکە دورگەی عەرەبی لەسێ لاوە هەروەك باسمانکرد دەریا دەورەی داوە و شێی دەریا کاریگەرەلەباروذۆخی هەوای ئەو ناوچەیەدا هەریۆیە لەووشك بوون و نەبونی مامناوەندی کەهۆکاری گەرمایە لەوسەرزەمینەدا کەمە و بەهۆی شێی دەریاوە کەمێك مامناوەندیەتی وەدیهاتووە. هەندێك لەوەچە ناسان کەلەبارەی زانستی هەڵسوکەوتی بونەوەرانەوە بێئاگان گومانیان بردووە کەڕەش پێستەکان لەنەوەکانی حامی کوڕی نوحن هەریۆیە ڕەش پێستن لەبەرئەوە باوکیان نەفرەتی لێکردون و ڕوویان ڕەش بووەو خودا بەشی نەوەکانی حامی تایبەت کردووە بەبەندایەتیەوە. لەم بارەشەوە بەسەرهاتێکی خورافی دەگێڕنەوە. ئەمە لەکاتێکدا لەنەفرینی نوحدا لەبارەی حامی کوڕیەوە لەتەوراتدا هاتووە و هیچ باسێکی ڕەشی و ڕووڕەشبون نەکراوە، بەڵکو نەفرینی ئەو تەنها دەربارەی ئەوەبووە کەنەوەکانی ئەم بباتە ڕیزی بەندەکانی نەوەکانی کوڕەکانی تریەوە و، بیجگەلەمە شتێك لەو نەفرەتەدانیەو دیارە کەدانەپاڵی سیفەتی ڕوو ڕەشی بەرامبەر بەحام تەنها بەهۆی بێئاگایی ئەوکەسانەوەیە لەسروشتی گەرماو سەرمای ئەو ناوچەیە وکاریگەری هەردووکیان لەپێکهاتەی گیانەوەران و ئەم جۆرە ژینگانەیە، چونکە خەڵکی هەرێمی یەکەم و دووەم بەهۆی گەرمای باشورەوە سەبارەت بەناوچەی مامناوەندی دووەم ڕەش پێست بوون، چونکە زۆر گەرمە و لەساڵێکدا دووجار خۆر لەلای سەریانەوە دەدات لەزەوی و ماوەی نێوان ئەم دووجارە زۆرکورتەو، لەئەنجامدا ئەم بەرابەر بونە درێژە دەکێشێت و بەوهۆیەوە ڕووناکی زۆر دەبێت و گەرمایەکی توند لێیان دەدات و بەهۆی توندی گەرماکەوە پێستیان ڕەش دەبێتەوە.

خاڵی بەرامبەری ئەم دوو هەرێمە لە باکوری هەرێمی شەشەم و حەوتەمدایە کە بەپێچەوانەوە بەهۆی سەرمای توندی ناوچەکەوە دانیشتوانەکەی سپی پێستن، چونکە خۆر هەمیشە لەئاسۆی ئەمانەوەیەو هەمیشە لەبازنەی بینینی چاویان نزیك بەقۆناغی بەرانبەرەوە نزیکە و ناگات بەو، لەئەنجامدا گەرماکەی کەم دەبێتەوە. لەهەموو

وەرزەکاندا سەرمایەکی توندی هەیە، هەربۆیە دانیشتوانەکەیشی پێستیان سپیەو ئەمەش دەبێتە هۆی کەمی موو لەجەستەیاندا و سەرەڕای ئەمەش سەرمای توندی ئەوناوچانە ئەوە دەخوازێت کەخەڵکەکەی چاویان سەوز و پێستیان خاڵخاڵ وموی‌ەکی زەرد یان ئاڵتونیان هەبێت، سنوری مامناوەندی نێوان ئەم دوو ناوچەیە هەرسێ هەرێمی سێیەم و چوارەم و پێنجەمە. خەڵکی ئەم هەرێمانە لەومامناوەندیەی کەتایبەتمەندی حەدی وەسەتە بەکاملی بەهرەمەندن و هەرێمی چوارەم لەهەموو هەرێمەکان سازگارترە، چونکە هەروەك لەپێشە وەباسمانکرد لەپێش هەموو هەرێمەکانەوە کەوتووەتە ناوەندەوە لەم ڕووەوە دانیشتوانەکەی بەپێی شێوەی کەش و هەواکەی لەڕووی جەستەیی و هەڵسوکەوتەوە باردێن بەشوێن ئەویشدا لەهەردوو لاوە هەرێمی سێیەم وپێنجەمە. ئەم دوو هەرێمە هەرچوندە لەڕووی شوێنەوە بەتەواوی نەکەوتونەتە ناوەندەوە، چونکە یەکێکیان بەرەوباشوری گەرم و ئەویتریشیان بەرەو باکوری سارد لار بوونەتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا هەردوو هەرێمی ناوبراو نەگەشتونەتە لاری و چوار هەرێمەکەی تر لەبەر ئەوەی لاریان تێدایە دانیشتوانەکەشیان لارو لەوێری لەهەڵسوکەوتیاندا هەیە. هەروەك چۆن خەڵکی هەرێمی یەکەم و دووەم بەهۆی گەرماوە ڕەش پێستن و، خەڵکی هەرێمی شەشەم‌و حەوتەم بەهۆی سەرماوە سپی پێستن و دانیشتوانی باشور واتە هەرێمی یەکەم‌و دووەم پێیان دەڵێن حەبەشی و زنگی و سودانی ناو زەد کراون.

ئەم ناوانەش بەگەلانێك دەڵێن کەڕەنگیان بەڕەشی گۆڕابێت، هەرچەندە ناوی حەبەشی تایبەتە بەگەلێکەوە لەلەبەرامبەر مەکەو یەمەنەوە دەژین و زەنگیش تایبەتی گەلانێکە کەلەبەرامبەر دەریای هیندەوە دەژین. ئەم ناوانەیان بەو هۆیەوە لێنەناون کە مرۆڤی ڕەش پێست یان نەوەی حامی کوڕی پێغەمبەر نوحن، چونکە بەشیکاری سەلمێنراوە کەکەسانێك لەڕەش پێستانی باشور لەهەرێمی سازگاری چوارەم یان هەرێمی لاری حەوتەمدا واتە لەژینگەی سپی پێستەکاندا ژیاون بەتێپەڕ بوونی کات ڕەنگیان

بەرەو سپیەتی ڕۆشتووە و، بەپێچەوانەی ئەوکەسانە کەدانیشتوانی باکور یان هەرێمی چوارەمن چونەتەباشور و لەوێدا ژیاون و لەئەنجامدا بەتێپەڕ بوونی کات ڕەنگی نەوەکانی داهاتویان گۆڕاوە بۆ ڕەش و، ئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەڕەنگی جەستە شوێنکەوتەی چۆنیەتی هەوایە.

ئیبن سینا لەئورجوزە پزیشکیەکەیدا دەڵێت: (لەزنگباردا گەرمایەك هەیە کەڕەنگی جەستەی خەڵکی گۆڕیوە و بەشێك لەجەستەیانی ڕەش کردووەتەوەو خەڵکی صقلب پێستیان سپی بوەتەوە بەشێوەیەك پێستی جەستەیان نەرم ونۆڵ بووە)، بەڵام دانیشتوانی ناوچەی باکوری گۆی زەوی بەهۆی ڕەنگی جەستەیانەوە ناونەنراون، چونکە سپی پێستی هی ئەو زمانەبوو کەدانەری ئەم ناوانە بوون هەربۆیە هیچ نامۆییەك لەئارادا نەبووە. هەروەك دەبینین دانیشتوانی ئەوسەرزەویە وەك: تورکەکان و صقالبە و تغرغرو خزرولان و زۆرێك لەفەرەنگیەکان و یەئجوجومەئجوج کەهەریەکەیان خاوەنی ناوگەلێکی جیاوازن و نەوەیەکی بێئەندازەیان لێکەوتووەتەوە و ئەمانیش بەچەندین ناوونیشان ناوزەد کراون، بەڵام خەڵکی هەرسێ هەرێمەکەی ناوەڕاست کەلەناوچە سازگارە ناوەندیەکاندا دەژین لەڕوانگەی هەڵسوکەوت و ژیانەوە زۆر مامناوەندن و بەهەمووهەل مەرجە سروشتیەکان بۆ دروستکردنی ئاوەدانی شارستانیەت وەك: ژیان و گوزەران و شوێنی نیشتەجێبون و هونەرو زانست و فەرمان ڕەوایی و دەوڵەتمەداریدا پسپۆڕیان وەرگرتووە و کارو کردەوەکانیان بەشێوەیەکی مام ناوەند بووە هەروەك چۆن بانگەوازی پێغەمبەرانیان تێدا دەرکەوتووە و وولاتیان دامەزراندووە و، یاسایان داناوە و زانستی جۆراوجۆریان دوای خۆیان بەجێهێشتووەو، شارەبچوك و گەورەکانیان بنیات ناوە و بیناو باڵەخانەی بەرزو جوانیان دروستکردووە وگرنگیان بەکشتوکاڵ و هونەرە جوانەکان و ئەوشێوازانەی کەنمونەن بۆژیانی سازگارو مامناوەند داوە.

گەلانی ئەوهەرێمە مامناوەندانەی کەئێمە ئاگاداری مێژووی ڕابوردی ئەوانین بریتین لە: عەرەب و ڕۆم و ئێران و بەنی ئیسرائیل و یۆنان و خەڵکی سیند و هیند و چین. لەبەر

ئەوەی وەچەناسان لەڕووی بەژن وبالآو نیشانە تایبەتەکانی ترەوە ئەم گەلانەیان بەجیاواز زانیوە گومانیان بردووە کەهەموو ئەم جیاوازیانە هۆکارەکەی نەتەوەو ڕەگەزەکەیانە، لەم ڕووەوە هەموو دانیشتوانی باشوری گۆی زەویان بەسودانی یان ڕەش پێست ناوزەد کردووە و بەنەوەی حامیان زانیون. لەبەرئەوەی کەنەیانتوانیوە جیاوازی ڕەنگەکانیان ئاراستە بکەن و لەهۆکاری ڕاستەقینەیاندا گومانیان هەبووە بەناچاریەوە زۆریان لەخۆیان کردووە و چەکایەتی گوماناویان گێڕاوەتەوە هەموو یان زۆربەی دانیشتوانی باکوریان بەنەوەی یافسیان زانیوە و زۆربەی ئەوگەلانەی کە لەهەرێمە مامناوەندو ناوچە ناوەڕاستەکاندا دەژین خاوەنی زانست و هونەرو مەزهەب و شەرع و سیاسەت و دەوڵەتمەدارین، بەنەوەی سامیان زانیون. ئەم بۆچونەش هەرچەندە لەڕوی ڕەچەڵەکی گەلانی ناوبراودا ڕاست دەردەچن، بەڵام ناتوانین بەیاسایەکی ڕاست و گشتگیر و لۆژیکی بزانین بەڵکو پێویستە وەك باسکردنی هەواڵ لەواقیعێکداسەیری بکەین نەوەك هۆکاری ناونانی دانیشتوانی باشوری گۆی زەوی بەسودانی و حەبەشی بەهۆی ئەوەوە بێت کەنەوەی حامی ڕەش پێست بوون.

گروپی ناوبراو بەوهۆیەوە کەوتونەتە ئەم هەڵەزەقەوە کەپێیان وایە بۆ دووبارە ناسینەوەی گەلان تەنها لەڕوی ڕەگەزو نەژادەوە دەبێت، لەکاتێکدا بەم شێوەیە نیە، چونکە جیاکردنەوە و ناسینەوەی هەندێك لەنەتەوەکان لەوانەیە بەم ڕێگەیەدروست بێت وەك: تازیەکان و بەنی ئیسرائیل و ئێرانیەکان، بەڵام گەلانی تر بەهۆی نیشانەو هێڵی نێوچاوان یان بەهۆی ئەوناوچەیەی کەتێیدادەژین دەیانناسنەوە وەك: زنگی و حەبەشیو صقالبە و سودانیەکان (ڕەشەکان). تازیەکان تەنها لەڕێگەی وەچەوە دەناسرێنەوە، بەڵکو دەتوانرێت لەڕێگەی داب و نەریت وبانگە شە کا نە وە لەگەلانی ترجیابکرێنەوە. سەرەڕای ئەمەش بەشێوازەکانی تری وەك ئەخلاق و سیفەت و ناوونیشانە ڕۆحیەکانیش دەتوانین گەلەجۆراوجۆرەکان لەیەکتر جیابکەینەوە هەربۆیە دروست نیە تیۆری کەسانێك قبوڵبکەین کەدەڵێن خەڵکی فلأن ناوچەی دیاری کراو ئیتر باکوربێت یان باشور،

لەبەرئەوەی کە لەڕەگەزی فلان کەسەوە دەردەکەوێت کەخاوەن تایبەتمەندی گەلێکن کەلەو داهەیە وەک: ڕەنگ یان مەزهەب یان هێڵەکانی نێوچاوان. وەها بیرو باوەڕێکیش ناتوانرێت گشتاندنی بۆ بکرێت، چونکە ئەم بۆچونە هەڵەی گروپانێکە کەلەخوی بونەوەران‌و ناوچەکان بێئاگان وەهەموو ئەوتایبەتمەندیانەی کەئەوان بەبەڵگە دەیانهێننەوە، بەهیچ شێوەیەك لەپاشماوەی نەوەکاندا نامێنێتەوە و ناتوانرێت بەنەگۆڕ بدرێنە قەڵەم. (نەریتی خودایە لەنێو بەندەکانیدا و هیچ کات ئەو نەریتەش گۆڕانکاری بەسەردانایەت).[٢٠٣]

[٢٠٣] (سُنَّةَاللهِ الَّتی قَد خَلَت فِی عِبادِةِ) س مونمینون نا ٤٨ .

# پیشەکی چوارەم

## لەبارەی کاریگەری هەوا لەسەر ڕەوشتی مرۆڤ

لەش سوکی و گورج و گۆڵی و شادی وگۆرانی ووتن و گەشی بێئەندازە، هەموو کەسێك لەڕەش پێستەکاندا بینیویەتی. ئەوانە عاشقی ڕەقس و هەڵپەڕکێن وهەرسازو ئاهەنگێك دەیانخاتەهەڵپەڕکێ و سەماکردن و لەهەموو جیهاندا بەبێ ئەقڵی ونەفامی باسدەکرێن. هەروەك چۆن لەشوێنی خۆیداو لەزانستی حیکمەتدا سەلمێنراوە هۆکاری ڕاستەقینەی ئەم شتە ئەوەیەکە سروشتی شادی و گۆرانی ووتنی لەڕادەبەدەر بریتیە لەبلاو بوونەوەی ڕۆحی حەیوانی و پێچەوانەکەشی تەبیعەت و خوی نتم وخۆگریە. دیارە کەگەرما هەواو هەڵم بلاو دەکاتەوە و گرفتی بۆدروستدەکات و ڕێژەکەی زۆر دەکات و والەکەسی سەرخۆش دەکات کەبەڕێژەیەك شادو دڵخۆشبێت کەوەسف ناکرێت، چونکە هەڵمی ڕۆح بەهۆی گەرمای غەریزیەوە دەچێتە ناودڵەوە و تایبەتمەندیەکی توند شەرابەکەی لەڕۆحدا ڕادەپەڕێنێت و لەئەنجامدا ڕۆح بلاو دەبێتەوە و سروشتی شادی دەگۆڕێت بۆ مەستی. هەروەك ئەوانەی کە دەچنە گەرماوەکانەوە (حەمام)کاتێك لەهەواکەیدا هەناسەبدەن و گەرمای هەوا بچێتە ناوڕۆحیانەوە و ئەو ڕۆحە گەرما وەردەگرێت و شادی خۆشی ڕوویان تێدەکات و هەندێکیشیان وایان لێدێت لەخۆشی شادیدا دەست دەکەن بەگۆرانی ووتن و زۆرجاریش مەست دەبن. لەبەر ئەوەی کەڕەشپێستەکان لەهەرێمی ڕەشدا دەژین وگەرما کاریگەرە لەمیزاج و پێکهاتەی جەستەیان و زاڵە بەسەریدا، ڕۆحیان بەراورد بەجەستە و هەرێمەکەیان پڕدەبێت لەگەرما هەربۆیە جەستەیان بەبەراورد بەجەستەی دانیشتوانی هەرێمی چوارەم گەرمترە

وگەرمایەکی زیاتر لەناوڕۆحیاندا بلاو بووەتەوە هەربۆیە خۆشی و شادی زوتر دەیانگرێت و زۆر خۆشحالّ و کراوەن و هەمیشە سەریان سوکەو وەك سەرخۆشانن. هەروەها خەلّکی ئەو وولاّتانەی لەناوو هەوای دەریادا ژیان بەسەر دەبەن کەمێك هەلّسوکەوتیان وەك ڕەش پێستەکانە، چونکەهەوای ئەم جۆرە ناوچانە بەهۆی تیشك دانەوەی ڕووناکی سەر ڕووی دەریاوە گەرمایەکی زۆری هەیە و پشکی ئەمان لەڕووی شادی و گەشیەوە لەو خەلّکانەی کە لە ناوچەکوێستانیەساردەکاندا دەژین زیاترە، ئەم حالّەتەش بەکەمی لەناو خەلّکی (جەرید)[٢٠٤] بەکەمی دەبینرێت، چونکە گەرما لەو ناوچانەدا فراوانە و هەوای گەرمە و ئەوناوچەیە لەجلگە و یلاقات و ناوچەکوێستانیەکانەوە زۆر دوورە بەتەواوەتی لەباشوریە و ئەم چۆنیەتیەش لەناو خەلّکی میسدا دەبینرێت، چونکە ئەوسەرزەویەش لەپانی وولاّتی جەریر یان نزیکە لێیە وە، هەروەك دەبینین بێئاگایی لەپاشهاتی شتەکان و بەجۆرێکن کەتەنانەت بیریش لەوە ناکەنەوە خۆراك ئازوقەی تەنها سالێکیش بۆخۆیان ڕێکبخەن. بەلّکو بەزۆری مادەخۆراکیەکان بەشێوەیەکی ڕۆژانە لەبازار دەکڕن.

لەبەر ئەوەی کەخەلّکی فاس لەوولاّتی مەغریبن و بەپێچەوانەی ئەوانەوە لەناوچە کوێستانیەکاندا دەژین و دەبینین چەندە زۆرو بێئەندازە دەچنە قولاّیی بیرکردنەوەوە زیادەڕەوی تێدا دەکەن، بەجۆرێك تەنانەت هەندێك لەخەلّکی ئەو شارە ئازوقە و خۆراکی دووساڵ لەگەنم پاشەکەوت دەکەن و، بۆ کرینی پێداویستیەکانیان بەیانیان زوو دەچنە بازار و لەبەر ئەوە دەترسن نەوەك لەخۆراکە هەلّگیراوەکەیان کەم ببێتەوە ئەگەر ئەم تایبەتمەندیە لەشارو هەرێمەکاندا لێکۆلّینەوە بکەین چۆنیەتی کاریگەری هەوامان لەئەخلاقی مرۆڤەکاندا بۆ دەردەکەوێت، خوداش باشتر دەزانێت. مەسعودیش لەم بارەیەوە لێکۆلّینەوەی لەبارەی شادمانی سەرخۆشی ڕەش پێستاندا کردووەو هەولّیداوە هۆکارەکەی بزانێت، بەلاّم بێجگە لەوەی کەلەجالینوس و یەعقوبی وەرگرتووە هیچ هۆکارێکی تری دەست نەکەوتووە وکورتەی ئەوەی کەلەوانەوە گێڕاویەتیە وە ئەمەیە کە ئەم شتە پەیوەستە بەلاوازی مێشکیانەوە کەدەبێتە هۆی لاوازی ئەقلّیان، بەلاّم ئەم بۆچونەپشتی بەبەلّگەو دەلیل نەبەستووە، خوداش هەرکەسێك دەبیەوێت ڕێنمایی دەکات بۆسەر ڕێکەی ڕاست.

---

[٢٠٤] وویلایەتێکە لەباشوری تونسدا.

# پێشەکی پێنجەم

## لەبارەی جیاوازیەکانی ئاوەدانی و شارستانیەت لەڕوانگەی فراوانی ڕۆزی وبرسیەتی و ئەوشوێنەوارانەی کەبەهۆیەوە لەجەستەو ئەخلاقی مرۆڤدا دەردەکەون

پێویستەئەوەبزانین کەلەهەموو هەرێمە مامناوەندو سازگارە باسکراوەکاندا فراوانی ڕۆزی بونی نیەو، هەموودانیشتوانەکەی لەخۆ شگوزەرانیدا ناژین، بەڵکو لەهەرێمە ناوبراوەکانیشدا سەرزەوی گەلێك هەن کەبەهۆی بەپیتو بەرەکەتی زەویەکانیان‌و ئاوەدانی و شارستانیەت بۆ دانیشتوانەکەی فەراهەمەو فراوانی نیعمەت وەك دانەوێڵە و خۆرشت و گەنم و میوەکان زۆر فراوان و، فەراهەمە و لەبەرامبەریشدا ناوچەگەلێك هەن کەهیچ گژوگیاو کشتوکاڵێکیان تێدا ناکرێت، هەربۆیە دانیشتوانەکەیان زۆر بەسەختیەوەژیان دەگوزەرێنن وەك خەڵکی حیجازو باشوری یەمەن و، هەروەها دەمامك دارانی صەنهاجەکەلەبیابانی مەغریب و ناوچەڕێگوزەرەکانی نێوان بەربەر و ڕەش پێستەکاندا دەژین، چونکە ئەم گروپە هیچ جۆرە دانەوێڵەو گەنم و مادەیەکی خۆراکیان نیەو خۆراکیان زیاتر لەسەر شیرەمەنیەکان و جۆرەکانی گۆشتە.

هەروەك ئەو عەرەبانەی کەخێوەت نشینن و لەبیاباندان و هەمیشە لەجوڵەدان. ئەمانە هەرچەندە دانەوێڵەو خۆرشتەکانیان لەبەرزایی تەپۆڵکەکانی مەغریبدا بەدەست دەهێنن، بەڵام ئەم کارە هەندێك جار زۆر دژواردەبێت بۆ ئەمان، چونکە لەلایەکەوە دەبێت

پێداویستیەکانیان لەژێر چاودێری پاسەوانانی سنوردا بکڕن ولەلایەکی تریشەوە هەژاری و نەداری ڕێگەی ئەوەیان پێنادات کەڕێژەیەکی زۆر بکڕن هەربۆیە ئەومادەخۆراکیو دانەوێڵانەی کەلەم ڕێگەیەوە بەدەستی دەهێنن پێویستیە هەنوکەییەکانیان دابین ناکات چ بگات بەوەی کە ژیانێکی خۆشگوزەرانی بەسەر بەرن. هەربۆیە دەبینین زۆربەی کاتەکان بەو شیرەمەنیە قەناعەت دەکەن و بەباشترین شێوە لەبری گەنم بەکاریان دەهێنن لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبینین ئەم گروپە کەلەبیابانەکاندا لەخێوەتەکاندا دەژین و دانەوێڵە و خۆرشیان نیە لەڕووی ئەخلاق و جەستەوە لەوانەی کەبەشێوەیەکی جێگیردەژین لەپێشترن و لەوان باشترن و، بەبەراورد بەخەڵکی شار ڕەنگ و ڕوویان جوانترە و قەد و قیافەو لەش و لاریان جوانترەو ڕەوشتیان لەلاریەوە دورەو سەرەڕای ئەمەش بیرو هۆشیان بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری و مەعریفەکان ئامادەتر و ڕوونترە. ئەم بارو دۆخەش لەهەموو نەتەوە کانی ئەواندا دەبینرێت و ئەزموونیش گەواهی دەری ئەم حاڵەتەیە، چونکە زۆرێك لەعەرەب و بەربەرەکان و دەمامك داران و دانیشتوانی تەپۆڵکەکان بەم شێوەیەن کەباسمانکرد ئەم مانایەش ئەوانە بەباشی لێی تێدەگەن کەهاتووچۆی لەگەڵیاندا هەیەو هۆکارەکەشی ئەوەیە کەخواردنی خۆراکە زۆرو جۆراوجۆرەکان و، ئەو کێشانەی کەبەهۆی زۆرخۆریەوە دروستدەبن و جەستە شتی زیادە دروستدەکات و ئەم زیادە زیانبەخشانە پاش ئەوەی ئاوێتەی یەکتر دەبن دەبنەهۆی فرێدانی تێکەڵە بۆگەنەکان.

هەروەك گوتمان لەئەنجامدا ئەم چۆنیەتیە زیادە ڕەویە دروستدەبێت ودەبێتەهۆی زەردی و ڕەنگ پەڕیوی پێست و ناتەواوی ئەندامەکان بەهۆی هاتنەدەرەوەی هەڵم و دزەکردنی شێ بۆناودەماغ بێگەردی زەینی مرۆڤ لەناو دەبات و دەبێتە هۆی بیر کوڵی و بێئاگایی و لادان دێتە ئاراوە و خوداش باشتر دەزانێت. ئەم بابەتەش لەگیانەوەرانی بیابانە ووشك و بێ ئاوەکاندا دەتوانین هەست پێبکەین وەك ئاسك و نەعامەو بزنەکێوی و زەڕافەو کەرەکێوی و گای بیابانی کەلەگەڵ هاوشێوەی ئەم گیانەوەرانەلەشیوو

تەپۆلکەکاندا هەن زۆر جیاوازن وەك جوانی و ڕەنگی پێست و گەشاوەیی و لەش و لاری جوان و بیرتیژی و هەستیاری و.....هتد بەڕونی دەبینرێت. هەروەك چۆن ئاسك بەبرای بزنەکێوی و زەڕافە بەبرای حوشتر و کەرو گای وەحشی بەبرای کەرو گای ماڵی دەژمێردرێن و جیاوازی نێوانیشیان زۆرئاشکراو دیارە ئەم جیاوازیە تەنها لەوڕووەوەیە کەزۆری خۆراك و ئالیك زەویە سەرسەوزو فراوانەکان کاریگەرە لەجەستەی گروپی یەکەمدا و شتی خراپ و، زیانبەخش لەگروپی دووەمدا دروستدەکات هەروەك چۆن شوێنەوارەکانی لەگیانەوەراندا ئاشکراو دیارە، بەڵام برسیەتی بۆگیانەوەرە دەشتەکیەکان کاریگەری ئەرێنی هەبووە شێوەیانی لەڕادەبەدەر جوان کردووە. ئەم شتەش لەمرۆڤەکاندا بەڕوونی دەبینرێت، چونکە دەبینین دانیشتوانی هەرێمە پڕ لە نازو نیعمەتەکان کەخاوەنی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و بەرهەمی زۆر و میوە جۆراوجۆرەکانن بەزۆری بیر کۆڵن و جەستەگەلێکی زبریان هەیە ئەم حاڵەتەش دەتوانین لەبەر بەرەکاندا بەڕوونی ببینین، چونکە گروپێکیان لەڕووی جۆری خۆرشت و گەنمەوە خۆشگوزەرانن بەبەراورد لەگەڵ ئەوانەی لەبارو دۆخێکی ناهەمواردا دەژین و تەنها جۆو زەڕاتیان هەیە وەك مصامدە و خەڵکی غەمارەو سوسدا زۆر جیاوازن، ئەم گروپەی کۆتایی لەڕووی جەستەیی و ئەقڵیەوە بەتواناترن و حاڵیان زۆرباشترە.

هەروەها دانیشتوانی وڵاتی مەغریب کەبەشێوەیەکی گشتی هەموو جۆرەخۆراکو گەنمێکیان هەیە لەگەڵ خەڵکی ئەندەلوسدا کەهیچ جۆرە کەرەو ڕۆنێکی تێدانیەو خواردنی سەرەکیان زەڕاتە جیاوازن، چونکە ئەوزیرەکی و بیرتیژی و بەخێرایی وەرگرتنی زانستەی کەلەخەڵکی ئەندەلوسدا هەیە لەخەڵکی تردا نابینرێت. هەروەها خەڵکی گوندنشینی مەغریب بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ شارنشینەکاندا جیاوازن، چونکە شارنشینان هەرچەندە لەنازو نیعمەتدا دەژین و هەمووجۆرە مادەیەکی خۆراکیان لادەستدەکەوێت لەبەرئەوەی کەئەم گروپە هەمان ئەوخۆراکانە لەدروستکردن و، لێنانیان لەگەڵ مادەخۆراکیەکانی تردا بەکاریان دەهێنن لەتوندیو چڕیان کەم دەبێتەوە

لەئەنجامدا خۆراکەکانیان ناسکترو سوکترن و هەموو خۆراکەکانیان گۆشتی مەڕوو مریشکن و لەبەرئەوەی کەڕۆن تامێکی تایبەتی وەك شیرینی و ترشیان نیە، ئەوەندە بەکاری ناهێنن و بەخۆراکێکی سەربەخۆی نادەنە قەڵەم، بەوهۆیەوە لەخۆراکەکانیاندا شێ کەمەو ئەو زیانانەی کەبەهۆی شێوە لەجەستەداو لەڕێگەی خۆراکەکانەوە دروستدەبن بەبوونی ئەو کەمتر ڕوودەدات. هەربۆیە دەبینین جەستەی خەڵکی شار ناسکترە لەجەستەی دەشتەکیەکان. وەهەروەها ئەوەش دەبینین ئەدەشتەکیانەی کەلەسەر برسیەتی ڕاهاتوون لەجەستەیاندا مادەی زیادە و زیانبەخش بوونی نیە. پێویستە ئەوەش بزانرێت کە خۆشگوزەرانی لەسەر جەستەو تەنانەت ئایندارى و بەندایەتیشدا کاریگەری دەبێت، هەروەك دەبینین دەشتەکیەکان و هەم شارنشینەکانیش لەتەنگی گوزەراندا دەژین و لەسەر برسیەتی ڕادێن و لەهەواو ئارەزوو خۆشگوزەرانی دوور دەکەونەوەو بەبەراورد بەوانەی کەلەنازو نیعمەتدا دەژین ئاینپەروەرترن و پەرستشی زیاتر ئەنجام دەدەن، هەربۆیە دەبینین ئاین پەروەران لەشارەکاندا بەبەراورد بەگوندەکان کەمترن، چونکە لەنێو ئەو گروپانە کەزۆرخۆری و گۆشتخواردن و بەکارهێنانی گەنم زۆرباوی هەیە، توندو تیژی و زبری و بێئاگایی زۆرتر هەیە، بەوهۆیەوە پارساکان بەتایبەت لەنێو ئەودەشتەکیانەی کەشۆڕش دەکەن، لەڕووی خۆراکەوە لەتەنگدەستیدان و لەنازو نیعمەتەکان بێبەشن.

هەروەها دەبینین حاڵەتی خەڵکی شارێکیش لەم بوارەدا یەکسان نیەو لەڕووی خۆشگوزەرانی و تەنگدە ستیەوە جیاوازیان هەیە. وەهەروەها دەبینین ئەو گروپەی کەلەئارامی و خۆشگوزەرانیدا دەژین و نوقمی خۆشی و لەزەتەکانن ئیتر دەشتەکی بن یان شاری هەرکات دووچاری نەبونی و نەداری ببنەوە لەخەڵکانی تر خێراتر دەمرن، وەك بەربەرەکانی مەغریب و دانیشتوانی شاری فاس ومیسر، بەپێی ئەوزانیاریانەی کەئێمە بەدەستمان هێناون بەپێچەوانەی ئەوگەلانەی کەبەم شێوەیەنین وەك عەرەبە بیابان گەڕەکان، یان ئەوخەڵکانەی کەلەووڵاتە دارستانە خورماکاندا دەژین قوتی سەرەکیان

خورمایە. یان دانیشتوانی ئەفریقا لەم سەردەمەدا کەخواردنی سەرەکیان دانەوێڵەو زەیتە وەخەڵکی ئەندەلوس کەخواردنی سەرەکیان زەڕات و زەیتونە. ئەگەربێت و نەبونی و قات و قڕی و برسیەتیش بڵاو ببێتەوە ئەواکەسیان وەکو گروپی یەکەمیان بەسەرنایەت و برسیەتی لەناویان نابات، خوداش داناترە. هەرلەبەر ئەمەیکە ڕیخۆڵەی ئەوکەسانەی کەلەنازو نیعمەتدا ڕۆچوون بەتایبەت لەسەر خۆرشتە جۆراوجۆرەکانو ڕۆن ڕاهاتوون، لەئەنجامی ئەم ڕاهاتنە شێیەکی زیاد لەشێی ئاسایی تێکەڵ دەبێتو، لەئەندازە دەردەچێت، ئەوەش دیارە هەرکات لەبەر کەمی خۆراك و نەمانی خۆرشتەکانو بەکارهێنانی خۆراکە زبرەکان بەپێچەوانەی نەریتەوە هەڵسوکەوت بکرێت پاش ماوەیەك ڕیخۆڵەکان ووشك وتەسك دەبنەوە لەبەرئەوەی ڕیخۆڵەکانیش لاوازن لەپاش ماوەیەکی کەم نەخۆشەکەدەمرێت! چونکە ڕیخۆڵە ئەندامێکە کەزیاتر لەئەندامەکانی تر دەبێتە هۆی مردنی مرۆڤ. دەتوانین ئەوەبڵێن ئەوکەسانەی کەبەهۆی قات وقڕی و برسیەتیەوە دەمرن ڕاهاتنیان لەسەر تێری و زۆر خواردنی پێشتریانە دەیانکوژێت نەوەك برسیەتی کاتی قات و قڕیەکە، بەڵام ئەوانەی کەلەسەر کەمی خۆرشت و ڕۆن ڕاهاتوون شێی ئاسایی میزاجیان لەئاستی ئاسایی خۆیدا بەبێ کەم کردن دەمێنێتەوەو ئەو ئەندازەیەش بۆ وەرگرتنی هەموو جۆرەخۆراکەکان بەس دەبێتو، بەهۆی گۆرانکاری لەجۆری خواردنەکاندا توشی کێشەنابن و بەزۆری لەمردن ڕزگاریان دەبێت، ئەمەلەکاتێکدا ئەوانی تر بەتایبەت ئەوانەی کەلەسەر خواردنی چەوری و خۆرشتەکان ڕاهاتوون بەزویی ڕووبەڕووی مردن دەبنەوە.

ئەمانە هەموو لەسەر ئەوەدامەزراون کەبزانین گونجان لەگەڵ خۆراك یان وازهێنان لێی پەیوەستە بەنەریتەوەو، هەرکەس خۆی لەسەر جۆرێکی دیاری کراوی خواردن ڕابهێنێتو لەگەڵیدا بگونجێت ئەوا خواردنی بۆ ئەو ئاساییە. هەروەك چۆن ئەگەر لەو ڕەوشە دەربچێت و جۆری خواردنەکەی بگۆڕێت ئەوا زۆر پڕلەئێش وەمەترسیدار دەبێت بۆی بەو

مەرجەی لەمەبەستی خۆراکی بەگشتی دەرنەچوبێت وەك: گوڵەكان و یەتوعات[٢٠٥]، بەڵام هەرخۆراكێك بۆ خواردن گونجاو بێت و بەپێی نەریت وەك خۆراكێكی ئاسایی لێدێت، هەروەك چۆن ئەگەربێت و، مرۆڤ لەبری گەنم شیرو سەوزە بەكار بهێنێت تاوەكو لەسەری ڕابێت ئەوكات خۆراكێكی گونجاو دەبێت بۆی و پێویستی بەگەنم و دانەوێڵە نابێت. هەروەها ئەگەركەسێك خۆی لەسەر برسیەتی خۆگرتنەوە لەزۆر خواردن ڕاهێنابێت بەهەمان شێوەیە، هەروەك لەڕیازەت كێشانەوە دەگێڕنەوەو ئێمەش هەواڵی سەیر لەبارەیانەوە دەبیستین كەدەكرێت ئەوەی كەلەگەڵ حاڵی ئەواندا نەیەتەوە ئینكاریان دەكات ئەمە لەكاتێكدا سەرچاوەی ئەم سەیرو سەمەرانە بریتیە لەنەریت، چونكە نەفسی مرۆڤ لەسەر هەرشتێك ڕاهات دەبێتە سروشت و خوی ئەو كەسە، چونكە نەفس ڕەنگاوڕەنگە، هەروەك چۆن كاتێك كەسێك بەخۆڕاهێنان خۆی لەسەر برسیەتی ڕادەهێنێت ئەم شتە دەبێتەنەریتێكی سروشتی.

گومانی پزیشكان لەبارەی ئەوەی كە برسیەتی كوشندەیە ڕاست نیە مەگەر كاتێك نەبێت كەنەفس ناچاربكەن و بەیەكجاری خواردنی لێبگرنەوە. لەم كاتەدا ڕیخۆڵەكان لەت دەبن و مەترسی مردنی لێدەكرێت، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەكی لەسەر خۆو قۆناغ بەقۆناغ ڕوو بدات و بەخۆڕاهێنانی كەم كەم خواردن كەم بكرێتەوە هەروەك چۆن سۆفیەكان ئەم كارە دەكەن زیاتر لەمەترسی لەناوچون دوور دەكەونەوە ئەم شێوازە پلەبەپلەیە پێویستە ئەگەرتەنانەت بیانەوێت واز لەڕیازەتیش بهێنن، چونكە ئەگەر پاش ماوەیەك بیانەوێت بگەڕێنەوە سەرخواردنی ئاسایی ئەوا ئەم كارەش دیسانەوە مەترسی مردنی لێدەكرێت. بەڵكو دەبێت بەهەمان شێوەی كەوازی لەخواردن هێناوە بەشێوەیەكی پلەبەپلە بەهەمان شێوەش پێویستە بەشێوەیەكی قۆناغبەقۆناغ بگەڕێتەوە سەر باری ئاسایی نانخواردن. ئێمەش كەسانێكمان بینیوە كەچل ڕۆژ وازیان لەبرسیەتی هێناوەو

---

[٢٠٥] واتە ئەوگیایانەی كەئەگەر قەدەكەیان ببڕیت شیریان لێ دێتە دەرەوە یان ئەو خۆراكانەی كەلەخواردنیاندا زۆر زیادەڕەوی بكرێت.

لەسەر نەریتی ناوبراو ڕاهاتوون. هەروەها شێخەکانمان لەمەجلیسی سوڵتان (ئەبوالحسن)دا ئامادەبوون کەدوو ژن لەخەڵکی دورگەی خەزراو ڕەندە بەئامادەبوونی ئەو مارەبکەن، کەبۆماوەی چەندساڵێك نانیان نەخواردووەو بەسەرهاتەکەیان لەناو خەڵکیدا ناوبانگی پەیدا کردووە و کاتێکیش لێکۆڵینەوەی هەردوو ئافرەتەکە کرا دەرکەوت کەڕاستیان کردووە و، هەردوو ژنی ناوبراو لەسەر ئەم ڕیازەتەیان بەردەوام بوون تاوەکو مردن. ئیمەش زۆرێك لەهاوڕێیانی خۆمانمان بینیوە کەشیری بزنیان لەبری ژەمی خۆراك بەکارهێناوە و، لەهەندێك کات یان لەکاتی بەربانگدا دەمیان ناوەبەگوانی بزنەکانەوە و ئەمەش خۆراکی ڕۆژانەیان بووە و یەکێکیان بۆماوەی پانزەساڵ لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بووە. خەڵکانێکی زۆری وەك ئەمانە هەن‌و نا توانرێت ئەم شتە ئینکاری بکرێت. وەپێویستە ئەوەبزانین کەبرسیەتی لەڕووی تەندروستی جەستەوە بۆ کەسێك کەتوانای هەبێت یان بتوانێت لەگەڵ خواردنی کەمدا هەڵبکات لەهەرلایەکەوە لەزۆرخۆری باشترە، هەروەك چۆن باسمانکرد کەبرسیەتی کاریگەری باشی دەبێت بۆ سەرئەقڵ و جەستە هاوکاری بێگەردی دەرون و تەندروستی جەستە دەکات.

دەبێت ئەوەبزانین کەخۆراکەجۆراو جۆرەکان هەریەکەیان کاریگەریەکی تایبەت دەکەنە سەر جەستەو بیرو هۆشی مرۆڤ، هەروەك بینیومانە ئەوانەی کەگۆشتی حەیوانات دەخۆن، زۆربەهێز و بەتوانان و نەوەکانیشیان بەهەمان شێوەن.

ڕاستیەتی ئەم بانگەشەیەش لەبەرابەرکردنی دەشتەکیەکان لەگەڵ شارستانیەکاندا سەلمێنراوە. هەروەها ئەوکەسانە کەشیرو گۆشتی حوشتر دەخۆن ئەم جۆرەخواردنە کاریگەرە لەسەر ئەخلاق و ڕەوشتیان و بەخۆڕاگری و توانایی هەڵگرتنی بارە قورسەکان کەسیفەتی حوشترەکانە بەناوبانگن ڕیخۆڵەیان وەك ڕیخۆڵەی حوشتر بەهێز دەبێت‌و بێتوانا نابێت و لەوزیانانە بەدوور دەبێت کەخەڵکی بەهۆی خۆراکەوە توشیان دەبێت. هەروەك چۆن گوشراوی یەتوعات (گیاشیردارەکان)وەك ئاسانکاری هەرس دەخۆنەوە بەبێ ئەوەی نێوچاوان بهێننەوە یەك وەك حەنزەلی نەکولاّو دەریاس و فربیون، کەبەهۆی

ئەم گیایانەوە هیچ زیانێك بەڕیخۆڵەكانیان ناگەیەنن، ئەمە لەكاتێكدا خەڵكی شارستان كە ڕیخۆڵەكانیان ناسكن و لەسەر خواردنە نەرمەكان ڕاهاتون ئەگەربێت و گوشراوی ناوبراو بخۆنەوە لەچاو تروكانێكدا گیان لەدەست دەدەن، چونكە گیا ناوبراوەكان مادەی ژەهراویان تێدایە.

یەكێكی تر لەكاریگەریەكانی خۆراك لەجەستەدا بابەتێكە كەجوتیاران باسی دەكەن ئەهلی ئەزمون بەچاوبینیویانە كەهەركات مریشكەكان كەلەو دانانەی كەلەپشقلی حوشتردا كولێنراون (واتە ئەو دانەوێڵانەی كەلەپاشەڕۆی حوشتردان)بخۆن و دانەوێڵەی ناوبراو كۆبكەنەوەو مریشكەكەلەسەری بنیشێت جوجكەكانی گەورەترن و هێلكەكانیان لەهێلكەی مریشكەكانی تر گەورەترن و هەندێك جاریش هێلكەكان لەگەڵ ئەو دانەوێڵەیەدا لەیەك جێگەدا دادەنێن و ئەجوجكەیەی كەلەوهێلكانە دێتە دەرەوە زۆر گەورەن.

نمونەی ئەم جۆرە ئەزمونانە زۆرن، كەواتە هەركاتێك كە وەها كاریگەریەك لەجەستەدا بەهۆی خۆراكەوە دەبینین لەبەرامبەریشدا برسیەتی هەمان كاریگەری لەجەستەدا دەبێت، چونكە كاریگەر بوون و كاریگەر نەبوون دووشتی دژن لەیەك مەسەلەدا هەروەك چۆن كەبرسیەتی لەپاڵفتەكردنی جەستەلەشتە زیانبەخشو زیادەو شێ تێكەڵ و زیانبەخشەكان كاریگەرە لەسەر جەستەو ڕۆح بەهەمان شێوە خۆراكیش كاریگەرە لەسەر ژیان و جەستە (خوداش ئاگاداری هەمووشتێكە[٢٠٦]

---

[٢٠٦] (ألا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيءٍ مُحِيط) (س فصلت ئا ٥٤).

# پێشەکی شەشەم

## لەبارەی ئەوانەی کەلەرێگەی ڕیازەت یان بەفیترەت شتەغەیبیەکان دەڵێن و بەرلەوانەش لەبارەی سروش ( وەحی )وخەون بینینەوە گفتوگۆ دەکەین

پێویستە بزانین کەخودای گەورەلەنێو مرۆڤایەتیدا کەسانێکی هەڵبژارد و بەگوتەی خۆی ڕێزو فەزڵی پێبەخشینو، بەم شێوەیە پلەو پایەی مەعنەوی پێبەخشین لەناوخەڵکیدا و خواناسی لەپێکهاتەیاندا ئافراند، و ئەوانی کردە نێوەند لەنێوان خۆی و، بەندەکانیدا بۆئەوەی ئاشنایان بکات لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیاندا بۆئەوەی ڕێگەی ڕاستیان نیشان بدەن و، لەئاگری دۆزەخ بیانپارێزن و ڕێنماییان بکەن بۆسەر ڕێگەی ڕاست. ئەوزانستانەی کەخودا دەیبەخشێت بەم کەسانە و ئەوهەواڵ و بەسەرهاتانەی کەلەلای مرۆڤ نهێنی بون بەسەر زاری ئەواندا دەیهێنێت. هەربۆیە دەبێت باوەڕبەوە بهێنین کەبۆزانینی ئەو ڕاستیانە لەهەرکات و ساتێکدا پێویستە لەڕێگەی ئەوکەسانەوە لەخودا وەریان بگرین، چونکەئەوان زانست مەعریفە تەنها لەخوداوە وەردەگرن. پێغەمبەر (ص)فەرمویەتی: (ئەی خەڵکینە بزانن کەمن هیچ زانستێك نازانم مەگەرخوداپێی بەخشیبم)وەپێویستە ئەوە بزانین کەڕستی لەتایبەتمەندیو پێویستیەکانی گوتەی پێغەمبەرانە، هەروەك چۆن لەباسی حەقیقەتی پێغەمبەرایەتیدا لەم بارەیەوە گفتوگۆ دەکەین. نیشانەی پێغەمبەریش ئەوەیەکە لەحاڵی وەحیدا جۆرێك

ونبون لەنێو ئامادەبوان لەگەڵ حاڵەتێکی وەك بانگکردنی کەسی خەوتو بەسەر پێغەمبەراندا دێت، کەبینەر لەڕواڵەتدا وادەزانێت کەئەوکەسە بوراوەتەوە یان بێهۆش بووە ئەمە لەکاتێکدا هیچ کام لەم شتانەنیە بەڵکو لەڕاستیدا بەونورە ئیدراکیەی کەلەناخی ئەم کەسانەدایە دەچنە قوڵایی دیداری مەلائیکەی ڕۆحانی، ئەم ئیدراکەش بەدەرە لەهەستەکانی مرۆڤ و لەپاشان دابەزنەخوارەوە بۆئاستی ئیدراکاتی مرۆڤ. یان بەبیستنی بانگێکە کەلەویانگەوە بابەتەکان وەردەگرن، یان دەم و چاوی کەسێك کەلەبەرامبەر پێغەمبەرەکەوە لەشێوەی مرۆڤێکدا دەوەستێتو ئەوکەسە ئەوەی کەلەلای خوداوەهێناویەتی بەپێغەمبەری ڕادەگەیاند، ئەوکات ئەم حاڵەتە دەڕەوێتەوەو ئەوشتەی کەلەکاتی ئەو بێهۆشیەدا پێیان گوتراوە بەجوانی لەبیرو هۆشیاندا چەسپیوە.

کەلەبارەی چۆنیەتی دابەزینی وەحیەوە پرسیاری لەپێغەمبەر کرد ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: (هەندێك جاروەك دەنگی جەرەس دێتە بەرگوێم ئەمەش توند ترین حاڵەتە کە بەسەرمدادێت دواتر ئەم حاڵەتە دەپچڕێت و ئەوەی کەپێم گوتراوە لەبەری دەکەم، هەندێك جاریش فریشتەیەك لەشێوەی پیاوێکدا بەرجەستە دەبێتو قسەم لەگەڵدا دەکاتو ئەوەی کەدەیڵێت لەبەری دەکەم). لەم کاتەشدا هێندە فشاری بۆدێت کەباسناکرێت هەروەك لەفەرمودەدا هاتووە کەپێغەمبەر بەهۆی دابەزینی وەحیەوە هەستی بەفشارێکی توندکردلەسەر جەستەیی، حەزرەتی عائیشە دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: لەڕۆژێکی ساردا وەحی هات بۆ پێغەمبەر و کاتێك کەوەحیەکە تەواو بوو لەنێوچاوانیەوە ئارەق دەهاتە خوارەوە و خوداش پێی فەرمووە: (لەداهاتودا پەیامێکی قورس دەخەینە سەرشانت).[٢٠٧] هەربۆیە بێباوەڕان پێغەمبەرانیان بەشێتی تۆمەتبار کردووە بەشوێنکەوتەی جنۆکەیان زانیون و پێیان وابووە لەوانەوە ڕێنمایی وەردەگرن.

---

[٢٠٧] (إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيكَ قَولاًثَقِيلًا) (ئا ٥ س مزمل).

ئەوان لەبینینی ڕواڵەتی ئەو حاڵەتە بەهەڵەدا چوبون. (ئەوەی کەخودا گومڕای بکات هیدایەت نادرێت).[٢٠٨]

یەکێکی تر لەنیشانەکانی پێغەمبەران ئەوەیە کە بەرلەهاتنی وەحی خاوەن خوڕەوشتی بەرزو جوانن و بەپاکی و پاکداوێنی ناسراون و دوورن لەهەموو خراپەو تاوانێك، ئەمەش هەمان مانای عیصمەتە هەروەك بڵێی ئەمانەبەپاکی و بێگەردیەوە خولقێنرابن‌و هەروەك بڵێی خراپەلەخوی ئەمان بەدوورە. لەصەحیحدا هاتووە کەپێغەمبەری ئیسلام لەمنداڵیدا لەگەڵ عەباسی مامیدا بەردی دەهێنا بۆ دروستکردنەوەی کەعبە، لەبەرئەوەی کەبەردەکانی بەعاباکەی خۆی دەهێنا جەستەی دەرکەت و یەکسەر بورایەوە تاوەکو دایانپۆشی.

جارێکیان پێغەمبەر بانگهێشت کرا بۆئاهەنگێکە ژن هێنان و کەدەگاتە ئەوێ خەو دەیباتەوەو بەهیچ شێوەیەك ئاگای لەئامادەبوان نەماوە و بەشداری ئەوئاهەنگەی نەکردووە. بەڵکە خودائەوی لەهەموو ئەم شتانەپاراستووە و تەنانەت لەخواردنە بۆن ناخۆشەکانیش دوور کەوتووە تەوە و نەیخواردوون وەك پیازو سیرو....هتد.لەم بارەیەوە پرسیاریان لێکردووە و لەوەڵامدا گوتویەتی: (من لەگەڵ کەسیکدا ڕاز و نیاو دەکەم کەئێوە نایکەن). ئەوەبوو کاتێك بۆ یەکەم جار پێغەمبەر کەوەحی بۆهات چووە لای خەدیجەو گوتی دام پۆشە و خەدیجەش وویستی تاقیبکاتەوە هەربۆیەگوتی برۆرە ژێر پێخەفەکەوە، ئەویش ئەم کارەی کردو ئەوحاڵەتەی نەما و خەدیجەگوتی ئەوە فریشتە بووە نەوەك جنۆکە. واتە نزیکی ژنان ناکەوێتەوە. وەهەروەها خەدیجە لێی پرسی ئایا ئەو کەسە ڕەنگی جل و بەرگەکەی چۆن بوو؟ پێغەمبەریش گوتی: سپی و سەوز. خەدیجە گوتی: کەواتە فریشتەیە. واتە سپی و سەوز لەڕەنگی خێرو چاکەن و ڕەنگی ڕەشیش لەڕەنگەکانی خراپە و شەیتانەکانە. لەنیشانەکانی تری بانگەوازەکەی بانگکردنی خەڵکیە بۆلای شتەئاینیەکان وەك نوێژو خێر کردن و پاکداوێنی. خەدیجەو

---

[٢٠٨] (وَمَن يُضلِلِ اللهُ فَمَا لَهُ مِن هاد) س الرعد ئا ٣٣.

ئەبوبەکر ڕاستیەتی ئەویان لەڕێگەی ئەم نیشانانەوە بۆ دەرکەوت و پێویستیان بەبەڵگەیەك لەدەرەوەی حاڵەت و خەلقی خۆیدا نەبوو.

دەگێڕنەوە لەوکاتەی کەپێغەمبەر نامەدەنێرێت بۆ هیرەقل و داوای لێدەکات کەموسوڵمان ببێت، ئەویش ئەبوسوفیان بانگدەکات و لەبارەی ئەخلاقی پێغەمبەرەوە پرسیاری لێدەکات. لەپرسیارەکانیشی بریتی بوون لەوەی کە: ئەوفەرمانتان بەچ شتێك پێدەکات؟ ئەبوسوفیانیش گوتی: بەنوێژ و زەکات و بەجێهێنانی صیلەی ڕەحم و پاك داوێنی و تاوەکو کۆتایی پرسیارەکان ئەبوسوفیان وەلآمی دایەوە. هیرەقل گووتی: ئەگەر ئەوەی کەدەیلێیت ڕاست بێت، ئەو پێغەمبەرەو بەم زوانەش لەسەرزەویەکەی منیشدا دەسەلآت پەیدا دەکات. ئەوداوێن پاکیەی کەهیرەقل ئامازەی پێدا هەمان ئەو عیصمەتەیەو دەتوانین ئەوە تێبگەین کەهیرەقل بەچ شێوەیەك ڕاستیەتی بانگەوازی پێغەمبەری بەستووەتەوە بەخوداپەرستی و ئاین پەروەریەوەو وەك بەڵگەلەسەر ڕاستیەتی پێغەمبەرایەتیەکەی دەزانێت و پێویستی بە پەرجو (معجزە)نەبوو، ئاشکرای کرد کەئەم شتانە نیشانەی پێغەمبەرایەتین.

نیشانەکانی تری ئەمان (پێغەمبەران)ئەمەیە کەدەبێت لەنێو گەل و هۆزەکەیاندا خاوەن حەسەب و نەسەب بن. هەروەك لەصەحیحدا هاتووە کە: خودا کەسانێك بەپێغەمبەری هەڵدەبژێرێت کەلەناو نەتەوەکەیاندا بەرز و بەڕێز و پلەو پایەیان بەرزبێت. لەگێڕانەوەیەکی تردا بەم شێوەیە: دەبێت لەناو هۆزەکەیدا خاوەن عێل و عەشیرەتی گەورەبێت. ئەم ڕیوایەتەش حاکم لەصەحیحەیندا وەری گرتووە. هیرەقل لەناوپرسیارەکانیدا هەروەك لەصەحیحدا هاتووە بەئەبوسوفیان دەڵێت: ئەو لەناوئێوەدا چ حەسەب و نەسەبێکی هەیە؟ ئەبوسوفیانیش لەوەلآمدا دەڵێت: ئەو لەناوئێمەدا خاوەن حەسەب و نەسەبێکی گەورەیەو باوباپیرانی سەرۆك عەشیرەت و فەرمان ڕەوان. هیرەقل گووتی: پێغەمبەران لەنێوخانەدانەکاندا هەڵدەبژێردرێن. بەواتایەکی تر پێغەمبەران پێویستە خاوەن عەصەبیەت و هێزبن بۆئەوەی لەم ڕێگەیەوە نەهێڵن کافران ئازاریان

بدەن و، بتوانن پەیامەکەی خودا بگەیەنن ویستی خودا لەکامڵ کردنی ئاین و مەزهەبدا بەئەنجام بگەیەنن.

لەنیشانەکانی پێغەمبەران ڕوودانی ئەوکارانەیە کەلەتوانای خەڵکی بەدەرن و وەك موعجیزە وان، بۆئەوەی گەواهی دەری ڕاستیەتی ئەوان بێت ئەم شتانە لەوکارانەنین خەڵکی بتوانن ئەنجامیان بدەن و لەدیاری کردنی جۆرو چۆنیەتی موعجیزەکاندا لەنێوان گروپە ئیسلامیەکاندا جیاوازی هەیە. هەروەك چۆن زانایانی زانستی کەلام (متکلمان)بەوپێیەی کەدەڵێن مرۆڤ بکەرێکی خاوەن ئیختیارە پێیان وایە ئەم جۆرە شتانە بەتوانای خودا ڕوودەدەن نەوەك بەکردای پێغەمبەران. وەهەرچەندە بەبیرو باوەڕی موعتەزیلە کرداری بەندەکان لەخودی خۆیانەوە دەردەچێت، بەڵام موعجیزە لەوکارانە نیەو بۆ پێغەمبەر بەبیرو باوەڕی موتەکەلیمەکانی تر لەم کارەدا هەمان ئەوتەحەدای تێدایە کەبەرێگەپێدانی خودا ڕوودەداتو، هیچ زۆرلێکردنێك لەخۆیانی تێدانیە، مانای تەحەداش ئەوەیە کەپێغەمبەر (ص)بەرلەڕوودانی هەرموعجیزەیەك باسی ڕوودانی بکەن بەمەبەستی سەلماندنی ڕاستیەتی بانگەشەکەی، لەم کاتەدا ڕوودانی موعجیزە وەك ئەوەوایە کەخودابەشێوەیەکی ڕاشکاوانە بڵێت پێغەمبەر ڕاست دەکات و کەواتە مانی موعجیزە ڕاستیەتی بەبڕشت دەگەیەنێت.

کەواتە پەرجو(موعجیزە)بەکۆی خەواریق و نەریت و تەحەداو مانای ڕاستیەتی پێغەمبەر دەگەیەنێت. هەربۆیە تەحەدی لاوەکی لەموعجیزەیەو ئەوەی کە موتەکەلیمەکان دەڵێن، تەحەدی سیفەتی موعجیزەیە، لەگەڵ ئەوەی کەگوترا، تەحەدی بەشێکە لەموعجیزە. ئەم دووقسەیە لەمانادا یەکن، چونکە لای ئەوان سیفەتی نەفس بەهەمان مانای خودیەو تەحەدی جیاکەرەوەی نێوان موعجیزەو کەرامەت و سیحرەو پێویستی بە تەصدیق نیە هەربۆیە پێویست بەوە ناکات کەتەحەدی تێدابێت مەگەر ئەوەی کەبەپێی ڕێکەوت بدۆزرێتەوە، ئەگەر لەکەرامەتدا لەلای ئەوانەی کە بەئاسایی و گونجاوی دەزانن تەحەدی هەبێتو، بەڵگەیەکی هەبێت. لێرەدایە کەمامۆستا ئەبو

ئیسحاقی ئیسفراینی و ئەوانی تریش ڕوودانی (ئەوشتانەی کەلەتوانابەدەرن)(خوارق)، یان وەك کەرامەت ڕێگری لێکردوە تاوەکو نەوەك لەکاتی ڕوودانی تەحەدی بەپیاو چاکی لەگەڵ پێغەمبەرایەتیدا تێکەڵ ببێت، بەڵام جیاوازی نێوان خارق و کەرامەتمان نیشان داو گوتمان کەتەحەدی وەلی لەگەڵ تەحەدی پێغەمبەردا جیاوازە ئەوا لەم کاتە هیچ تێکەڵیەك ڕوونادات.

سەرەڕای ئەمەش ئەوەی کەلەئەبو ئیسحاقەوە گێڕامانەوە ڕاشکاوانە نیە ئیتر چۆن دەکرێت قسەکەی بەم شێوەیە ئاراستەبکرێت کەئەو ڕوودانی خەواریقی پێغەمبەرانی لەئەولیاکاندا ئینکار کردووە، هەربۆیە دەتوانین بڵێین هەردوو گروپ خاوەن خەواریقی تایبەت بەخۆیانن، بەڵام لەلای موعتەزیلە ڕێگری ڕوودانی کەرامەت ئەوەیە کەخەواریق بەکردەوەی مرۆڤەکان ناژمێردرێن، چونکە کارو کردەوەی بەندەکان شتانێکی ئاساین، هەربۆیە بەلای ئەمانەوە جیاوازیەکی ئەوتۆ نیە لەنێوان خەواریقی پێغەمبەران و ئەولیاکاندا، بەڵام ڕوودانی کەرامەت بەدەستی درۆزن شتێکی مەحاڵە. ئەشعەریەکان ئەم مەحاڵە بەم شێوەیە ئاراستەدەکەن کەسیفەتی نەفسی موعجیزە تەصدیق و هیدایەتە وەئەگەر بەپێچەوانەی ئەمەوە بێت ئەوا بەڵگە دەبێتە شوبهەو هیدایەت، دەبێتە گومڕایی‌و تەصدیق، دەبێتە درۆ ڕاستیەکان ئاوەژو دەبنەوە و صیفەتەکانی نەفس تێکدەچن و، ئەوەی کەڕوودانی هەرمەحاڵێك پێویست بێت ڕوونادات، بەڵام ئەو ئاراستەیەی کەموعتەزیلە لەمەحاڵ بوونی موعجیزەدا بەدەست بەدرۆدەخەنەوە ئەوەیەکەڕوودانی بەڵگە شوبهەو هیدایەت لەبری گومڕایی ناشیرین و لەخوداوە دەرناچێت، بەڵام بەبیروباوەڕی حەکیمەکان شتی خاریق لەکرداری پێغەمبەرە و هەرچەندە لەجێگەی هێزی توانای مرۆڤدا نەبێت، بەپێی بیروباوەڕی ئەوان پێویستکردنی خودی بەوپێیەی ڕوودانی هەندێك ڕوودواو لەسەرهۆکار (سبب)وەستاوە ئەوهەلومەرجەی کەشتەکان بەهۆیانەوە ڕوودەدەن.. سەرئەنجام پشت بەواجبی خودی دەبەستن کەخۆی لەخۆیدا بکەرە نەوەك بەویستی خۆی، نەفسی نەبەوی لەلای ئەوان لەتایبەتمەندیە

خودیەکانە لەوانەش ئەنجامدانی ئەم جۆرە خەواریقانە بەتوانای ئەوو فەرمانبەرداری توخمەکان لەجیهانی تەکویندا لەوەوەیە.

بەبیرو باوەڕی ئەمان پێغەمبەر بەشێوەیەکی سروشتی توانای بەسەر گۆڕان و کارکردن لەبونەوەراندا هەیە واتەبۆئەوەبەستەخولقاوە، هەرکات گرنگی بەوانە بدات ئەوابەپێی خواستی ئەودەبن بەهۆی ئەوەی کەخودا بۆی موسەخەرو ڕام کردووە بەبیرو باوەڕی ئەوان شتی خاریق بەدەستی پێغەمبەر ڕوودەدات ئیتر تەحەدی لەگەڵدابێت یان نەبێت، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستیەتی ئەو لەوڕووەوەی کەبەڵگەیە لەسەر هەڵسوکەوتی پێغەمبەران لەبونەوەراندا ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەش لەتایبەتمەندی نەفسی پێغەمبەرایەتیە نەوەك لەوڕووانگەیەوەی کە شتی خاریق جێگرەوەی گوفتاری صەریح بێت بە باوەڕهێنان بەپێغەمبەر. لەم ڕووەوە دەلالەتەکانی موعجیزە لای ئەمان قەتعی نیە هەروەك ئەوەی کەموتە کە لیمان باوەڕیان پێیەتی. وەتەحەدیش بەبەشیك لەموعجیزە نازانن و بەباشی نازانن کەتەحەدی وەك جیاکەرەوەیەك بێت لەنێوان موعجیزەوجادوگەری وکەرامەتدا. بەڵکو جیاکەرەوەی نێوان جادوو گەری و کەرامەت و موعجیزە بەبیرو باوەڕی ئەمان ئەوەیە کەپێغەمبەر لەسەر سروشتێکی تایبەت دروستبووە و وای لێدەکات کەکاری چاکە بکات و دوور بکەوێتەوە لە خراپە لەم ڕووەوە خراپە نایەتە ناوخەواریقەکانەوە، بەڵام جادووگەر لەبەرامبەرو بەپێچەوانەوەیەتی و هەموو کارەکانی خراپن و مەبەستیش لێیان هەرخراپەیە. ئەوەی کەئەم لەکەرامەت جیادەکاتەوە بریتیە لەوەی کەخەواریقی پێغەمبەر جۆرێکی تایبەتە بەرزبونەوە بۆئاسمان و، چونە ناوجەستەکانەوە و زیندو کردنەوەی مردوان و قسەکردن لەگەڵ فریشتەکان و فرین بەناوهەوادا، بەڵام خەواریق قوڵترن لەمان وەك زۆرکردنی شتەکەمەکان و قسەکردن و باسکردنی داهاتوو تەنها لەسیفەتی پێغەمبەرانە.

پێغەمبەر دەتوانێت هەموو خەواریقەکانی ئەولیاکان ئەنجام بدات، بەڵام ئەولیکان ناتوانن موعجیزەی پێغەمبەران ئەنجام بدەن.صۆفیەکان لەوکتێب و بەرهەمانەی

کەلەبارەی تەریقەتی خۆیانەوە نوسیویانە ئەم مانایان باسکردووە کەلەگەورەکانی خۆیانەوە گێڕاویانەتەوە. لەبەرئەوەی کەئەم شتەباسکرا پێویستە ئەوەبزانین گەورەترینی موعجیزەکان و شەریف ترین و ڕۆشنترینیان لەڕووی دەلالەتەوە قورئانی پیرۆزە کەبۆپێغەمبەرمان دابەزیوە، چونکە خەواریق شتێکی جیاوازە لەوەحی کەبەپێغەمبەر دەگوترێت نەرێی موعجیزەو خەواریقەکان بەبەڵگەی ڕاستیەتی وەحی دەزانن، بەڵام قورئان بەتەنها بەوەحی دەزانرێت و بەخاریقی موعجیزەکانیش دادەنرێت کەواتە هەرخۆی بەڵگەیە و پێویست بەهیچی ترناکات واتە پێویست بەموعجیزەکان ناکات، لەبەرئەوەی کەقورئان لەڕووی بەڵگەوە ڕوونترینی بەڵگەکانە، چونکە یەکبونی دەلیلو مەدلولی تێدا دەبینرێت ئەمەش ئەومانایەکەپێغەمبەر دەفەرمێت: هەر پێغەمبەرێك هاتبێت موعجیزەی هاوشێوەی پێغەمبەرەکەی پێش خۆی هێناوە کەمرۆڤ باوەڕی پێیان هەیە، بەڵام ئەوەی کەمن هێناومە وەحیە، لەم ڕووەوە هیوادارم لەڕۆژی قیامەتدا لەهەموویان شوێنکەوتەم زیاتر بێت، ئاماژەبەم مانایەکەکاتێك موعجیزە لەڕونیو هێزی بەڵگەیدا لەپلەو پایەدابێت، کەلەڕاستیدا خودی وەحیە، ئەوکات بەهۆی ئەم ڕوونیەوە حەقیقەت و ڕاستیەکەی زیاتردەبێت و شوێنکەوتوانیشی زۆرترو زیاتر دەبن. خوداش داناترە. ئێستە ڕاڤەی پێغەمبەرایەتی هەروەك ئەوەی کە لێکۆڵەرەوان ڕاڤەیان کردووە باسدەکەین و دواتر باس لەڕاستیەتی کاهینی و خەون بینین و دواتریش باسی ئەستێرەناسان و غەیب بێژەکان و مەسەلەکانی تایبەت بەغەیب گووتن دەکەین:

پێویستە ئەوە بزانین کەئەم جیهانە بەهەموو دروستکراوەکانیەوە هەروەك دەیانبینین بەشێوەیەکی زۆر جوان ڕێکسازی کراون وەك وابەستەبوونی هۆو هۆکارەکان بەیەکترەوەو پەیوەست بوونی بونی بونەوەران و گونجان و نەگونجانی هەندێك لەگیانەوەران لەگەڵ یەکتردا.

هەروەك چۆن شتە سەرسوڕهێنەرەکانی لەم بارەیەوە کۆتاییان نیە، هەربۆیە لەدونیای هەستپێکراوی جەستەییە وە دەستپێدەکەین سەرەتا جیهانی توخمەکان بەچاو

دەبینین و نمونەیان بۆدەهێنینەوە کەچۆن پلە بەپلە لەزەویەوە بەرز دەبنەوە و، سەرەتا دەگاتە ئاوو لەپاشان دەگاتە هەواو دواتریش دەگاتە ئاگر هەربەوشێوەیەی هەریەکە پەیوەستە بەوی ترەوە و، هەریەکەشیان توانای ئەوەی تێدایە کەبگۆڕێت بەتوخمی نزیك لەخۆی واتە بگاتە پلەکەی ئەو یاخود بگاتە قۆناغی خوارەوەی هەروەك چۆن هەندێك جاریش دەگۆڕێن بەیەکتر. یەکەمین توخم ناسکترە لە تو خمەکەی پێش خۆی و تاوەکو دەگاتە جیهانی فەلەك و کۆتایی دێت کەلەهەموویان ناسکترە و، بەشێوەیەکی چین چین بەیەکەوە پەیوەستن بەجۆرێك هەست تەنها دەتوانێت جوڵەیان هەست پێبکات. هەندێکیش بەهۆی ئەو جولآنەوە دەتوانن ئەندازەو بارودۆخیان بزانن و ئاگاداری ئەو خودانە (زات)ببنەوە کەخاوەنی ئەم شوێنەوارانەن لەئەفلاکدا. ئەوکات دەبێت وورد ببینەوە لەم جیهانی بەرهەمهێنانەو ببینین چۆن سەرەتا لەکانەکان‌و لەپاشان لەگیاکان و دواتریش گیانەوەرانەوە دەستپێدەکات، ئەمەش بەوشێوە جوان و قۆناغبەقۆناغ و تەواوەی کەهەیە. هەروەك چۆن کۆتایی ئاسۆی کانەکان پەیوەستە بەسەرەتای ئاسۆی ئەو گیا نزمانەی کەتوخمیان نیە، وەك درەختی خورما و تاك بەسەرەتای ئاسۆی گیانەوەرانی وەك کرمەلیقەوصەدە فەوە کەبێجگە لەهێزی دەست لێدان هیچ هێزێکی تریان تێدانیە و مانای پەیوەست بوون لەم بەرهەمهاتوانەدا ئەوەیە کەکۆتایی ئاسۆی هەریەکەیان زۆرئامادەیە کەببێتە سەرەتای ئاسۆی قۆناغی پێش خۆی. جیهانی گیاندارانیش ووردە ووردە فراوان بووەو، بووەتە جۆرەها شت‌و لەتەکوینی پلەپلەشدا بەمرۆڤ کۆتایی هاتووە کەخاوەن بیروهۆش‌و تێڕوانینەو لەوجیهانی هێزەی کەهەست و ئیدراکی تێدا کۆبووەتەوە، بەڵام هێشتا بەکردار نەگەشتووەتە ئەندێشەو تێڕوانین بەرز دەبێتەوە بۆئەوپلەیەو ئەمەش یەکەمین ئاسۆی مرۆڤەلەپاش جیهانی گیانەوەرانەوە، ئەمەیە کۆتایی بینینی ئێمە.

ئەوکات لەجیهانە جیاوازەکاندا شوێنەوارگەلێکی جۆراوجۆر دەدۆزینەوە، هەروەك چۆن لەجیهانی هەستیدا شوێنەوارێك لەئەفلاك و توخمەکان و لەجیهانی پێکهاتنیشدا

شوێنەواری گەشەو ئیدراك دەبینین کەهەموویان گەواهی دەری ئەوەن هەریەکەیان کاریگەرە بەشتێکی جیاوازلەجەستە و تەنەکان، ئەوکاریگەرەش رۆحانیە کەپەیوەست دەبێت بەلەدایك بووەکانەوە، چونکە هەمان ئەوپەیوەندیەی کەلەجیهاندا هەیە لەخودی ئەم لەدایکبوانەشدابوونی هەیە. ئەم کاریگەرەش هەمان نەفسی ئیدراککەرو جوڵێنەرە، هەربۆیە پێویستە بەناچاریەوە باشتر لەو بونەوەرێکی تر هەبێت کەهێزەکانی ئیدراك و جوڵەی بەوان بەخشیوە و هەروەها پەیوەست بن پێیەوە و خودی ئەو ئیدراکی تەواو و تەعەقولی رووت بێت ئەوەش جیهانی فریشتەکانە. لەم رووەوە نەفس پێویستە خاوەن توانای تەجەرود و ئینسیلاخ (تاکبونەوە و دابڕنراوی)بێت و، لەمرۆڤ فریشتەییەوە نزیك بێت تاوەکو لەچرکەساتێکی تایبەت لەساتەکاندا بەکردار ببێتە رەگەزی فریشتەکان ئەمەش کاتێك دەبێت کەخودی (زاتی)رۆحانی ئەو بەکردار بگاتە کەماڵ، هەروەك چۆن دواتر باسی دەکەین. وەهەروەك چۆن باسمان کرد بەناچاریەوە ئەم پلەیە بەپێی چۆنیەتی و ئەوحاڵەتەی کەلە لەدایکبووەکاندا رێکخراوە پێویستە بگەنە ئاسۆی دوای خۆیان هەربۆیە نەفس پەیوەستە بەدوو ئاراستەوە: یەکێکیان فراوان و ئەویتریش قوڵ لەلای قوڵیەکەوە بەستراوە بەجەستەوە و شتە هەست پێکراوەکان بەدەست دەهێنێت کەبەهۆیانەوە بۆ تەعەقولی کرداری ئامادە دەبێت و، لەلا فراوانەکەشیەوە پەیوەستە بەئاسۆی فر یشتەکانەوە و لەڕێگەیەوە هەستپێکراوە زانستی غەیبیەکان بەدەست دەهێنێت، چونکە جیهانی رووداوەکان لەتەعەقولاتی فریشتەکاندا بەبێ کات بوونی هەیە ئەمەش بەپێی ئەوبابەت و مەبەستانەیە کەگوتمان لەجیهانی هەستیدا بەهۆی پەیوەست بونی خودەکان و هێزیانەوە لەگەڵ یەکتردا رێکسازیەکی پایەدار هەیە.

ئەوکات پێویستەئەوەبزانین ئەوکات دەبێت ئەوەبزانین کەنەفسی مرۆڤ نابینرێت، بەڵام شوێنەوارەکانی لەجەستەدا دەردەکەون هەروەك دەتوانین بڵێین جەستەو هەموو بەشەکانی ئیتر هەموویان یان بەشێوەیەکی تاك بنەمایەکن بۆنەفس و هێزەکەی یاخود شوێنی کاریگەریەکەیەتی، وەك وەرگرتن وجوڵەو قسەکردن و رۆشتن وجوڵەکانی جەستە

بەگشتی. وەیان شوێنی دەرکەوتنی ئیدراکاتەکانیەتی، وەهەرچەندە هێزەکانی ئیدراك لەڕووی پلەبەندیەوە بەرەو هێزە فراوانەکانی جەستە بەرز دەبنەوە ولەدەرکەوتنەکانی هێزی بیرکەرەوە دەژمێردرێن کەپێشیان دەگوترێت هێزی گویا، هێزەکانی هەستی ئاشکرا بەهەموویانەوە وەك: بیستن بینین و نمونەی ئەمانەلەوانەن کەبەرەو ناوەوە دەچن، یەکەمینیان هەستی هاوبەشە کەهێزێکە کەهەستپێکراوەکانی وەك: بینینەکان و بیستنەکان و نمونەی ئەمانە لەیەك حاڵەتدا دەرك دەکات هەربۆیە لەهێزی هەستی ئاشکرا جیاکراوەتەوە، چونکە هەست پێکراوەکان لەهەستی ئاشکرادا بەیەکجارو لەیەك کاتدا فەراهەم و جێگیر نابن. ئەوکات هەستی هاوبەش ئەوهەست پێکراوانە دەگە یە نێتە هێزی خەیاڵ ئەمەش هێزێکە کەهەر هەست پێکراوێك لەنەفسدا بەرجەستە دەکات ئەگەربێت ومادە دەرەکیەکانی تێدا نەبێت. بنەمای جوڵەی ئەم دوو هێزە واتە هەستی هاوبەش و خەیاڵ بەپلەی یەکەم مێشکە کەبەشی پێشەوەی ئەو تایبەتی یەکەمین و بەشی دواوەشی لەوهێزەی دووەمە. ئەوکات هێزی خەیاڵ دەگاتە واهیمە و خەیاڵ. کەیەکەمیان بۆتێگەشتنە لەمانا ناسەرەکیەکانی وەك دوژمنایەتی لەگەڵ فلانو دۆستایەتی لەگەڵیدا و بەخشندەیی باوك و دڕندەیی گورگ. حافیزە (بیرگە)بۆڕاسپاردنی هەموو هەست پێ کراوەکانە. ئیتر لەخەیاڵگەدا هاتبن یان نەهاتبن و بیرگە وەك کۆگایەك وایە کەدەرك کراوەکان بۆکاتی پێویستی هەڵدەگرێت.

بنەمای هەڵسوکەوتی ئەم دووهێزە ناخی دواوەی مێشکە کەبەشی یەکەمی بۆ واهیمەو دووەمی تایبەتە بەحافیزەوە. ئەوکات هەموو ئەوهێزانە بەرز دەبنەوە بۆ هێزی بیر کەبنەماکەی ناخی ناوەڕاستی مێشکەو بەهۆی ئەم هێزەوە جوڵەی بینینو بەرەوئاراستەی تەعەقول ڕۆشتن دەست دەدات هەربۆیە نەفس بەوهۆیەوە بەردەوام لەجوڵەدایە، چونکە حەزێك لەناخیایەتی کەدەیەوێت خۆی لەپەستی هێز و توانای بەشەریەت ڕزگاری بێت و لەتەعەقولدا لەقۆناغی بالقوە (ناکردار)وە بچێتە قۆناغی بالفعل (کردار)، تاوەکو لەم ڕێگەیەوە بەشوێن خۆچواندندا بگەڕێت بەجیهانی مەلەئی

ئەعلا لەئیدراکی خۆیدا یارمەتی لەبنەما جەستەییەکان وەرنەگرێت و بکەوێتە یەکەمین قۆناغەکانی ڕۆحانیەتەکانەوە. کەواتە هێزی بیر هاوکات بەرەو ئەم پلەیە لەجولەدایەو بەوئاراستەیە دەڕوات. وەهەندێك جاریش بەشێوەیەکی گشتی لەجیهانی بەشەریەت و ڕۆحانیەت دادەڕنرێت وپەیوەست دەبێت بەجیهانی ئاسۆی ئەعلاوە (کەکۆتاپلەی ڕۆحە)ئەمەش بەدەست هێنانیی نیەبەڵکو بەهۆی یەکەمین سروشت و ئەوفیترەتەوەیە کەتێیدا ئافرێنراوە.

نەفسەکانی مرۆڤ سێ جۆرن: جۆرێکیان بەسروشت توانای گەشتنیان بەئیدراکی ڕۆحانی نیە هەربۆیە جوڵەیان بەئاراستەی دەرك کراوەهەستی و خەیاڵیەکانەو بەس، وەك پێکهاتەی ماناکان لەحافیزەو واهیمەدا بەپێی یاسا دیاری کراوەکان و ئەو ڕێکخستنە تایبەتەی کەلەڕێگەیانەوە سود لەزانستە تەصوری وتەصدیقیەکان وەردەگیرێت، ئەم زانستانەش تایبەتی فیکرن کەپەیوەستن بەجەستەوەو هەموویان خەیاڵین و لەبازنەیەکی دیاری کراودان، چونکە لەڕووی بنەماوە بە مەسەلە سەرەتایی و بەدیهیەکان کۆتاییان دێت و لەوانیش تێپەڕناکەن‌و ئەگەر ئەوبیرە لەناوبچێت ئەوەی کەلەدوای ئەو مەسەلانەوە هەیە لەناودەچێت. ئەم قۆناغەش بەزۆری قۆناغی بازنەی ئیدراکی جەستەیی مرۆڤایەتیە کەدۆزینەوە و هەستەکانی زاناکان بەوان کۆتاییان دێت و بەناویاندا ڕۆدەچن. وەگروپێکی تر لەنەفسی مرۆڤایەتی لەم جوڵە فیکریەی کەبەئاراستەی ئەقڵی ڕۆحانی و ئیدراك دەبنەوە کەپێویستی بەبنەماجەستەییەکان نیە، چونکە ئەوان لەم بارەیەوە لەسەر توانایەکی تایبەت ئافرێنراون و لەئەنجامدا بازنەی دەرکی ئەوان لەمەسەلە سەرەتایی و بەدیهیەکان (بەڵگە نەویست)کەیەکەمین بازنەی ئیدراکی مرۆڤەو تێپەڕ دەبێت و فراوان دەبێت و لەجێگەی دەرکەوتنی بینراوە ناخیەکاندا جێگیر دەبێت و ئەم جۆرە بینینانە سەرانسەری ئیدراك و ویژدانن و سنورو کون و کەلەبەری نیە و سەرەتاو کۆتایی دیار نیە. ئەمەش تایبەتەبەهەست و ئیدراکی ئەولیاکانەوە، گەورەکانی زانستە بەخشراوەکانی بێ

ماندوبون و مەعریفە ڕەبانیەکان و ئەم جۆرە ئیدراکاتە لەپاش مەرگ بۆبەختەوەران لەدۆزەخ دێتەدی.

دەستەی سێیەم ئەو نەفسانەن کەبەفیترەت لەسەر خۆگرتنەوە و خۆ داڕنین لەشتە جەستەیی و ڕۆحیە مرۆییەکان دروستکراون بەرەو فریشتەکانی ئاسۆی فراوان بەرز دەبنەوە تاوەکو لەچرکەساتێکی تایبەتدا بەکردار بچنە ڕیزی فریشتەکانەوە و، بۆ ئەوان بینینی مەلەئی ئەعلا لەو ئاسۆیەی کەتایبەتە بەوەوە و بیستنی قسەی دەروونی و گوتاری ئیلاهی لەوچرکەساتەدا بێتە دی. ئەمانەش پێغەمبەرانن سڵاوی خوایان لەسەربێت، کەخودا لەهەموو جۆرە سیفەتێکی مرۆیی دایان دەڕنێت لەوکاتە تایبەتەدا، واتە کاتی دابەزینی وەحی بۆیان لەڕووی فیترەتەوە بەوانی بەخشیوە و کردویەتی بەبەشێکی دانەبڕاو لێیان و تائەوکاتەی کەلەسەر خیلقەتی بەشەریەتن ئەوانی لەڕێگرو بەربەستە جەستەییەکان بەدوور گرتووە، چونکە لەغەریزەکانی ئەماندا ڕاستیەتی و خۆڕاگریەکی وای دروستکردووە کەدەتوانن بەهەمان ئەوغەریزانە و بەودیمەنە ڕۆحانیانەوە ڕووبەڕووبینەوەو لەسیفەتیاندا حەزکردن بەپەرستشیان تێدا خولقاوە و بەهەمان ڕۆحانیەتەوە ڕێگەکەیان بۆ دەردەکەوێت و بەئاسانیەوە بەرەولای دەڕۆن. ئەمەیە کەپێغەمبەران بەم جۆرە تەجەڕود و داڕنینە هەرکات بیانەوێت بەرەو ئەو ئاسۆیە دەڕۆن، ئەمەش بەهاوکاری ئەو فیترەتەیە کەلەسەری دروست کراون نەوەك لەڕێگەی بەدەست هێنان و فێربوونەوە، چونکە کاتێك بەرەو ئەو ئاسۆیە دەڕۆن لەمرۆڤ بون دوور دەکەونەوەو لەو مەلەئی ئەعلایەدا ئەوەی کەپێویستە فێری دەبن و بەمەبەستی فەلسەفەی پێ ڕاگەیاندن (تبلیغ)بەبەندەکان دەگەڕێنەوە سەرئیدراکە مرۆیی و هێزە مرۆڤیەکانیان. هەروەك چۆن یەکێك لەوان بانگێکی هەورەبروسکە ئاسا دەبیستێت و ئەمەش وەك ئاماژەو نیشانەیەکە کەلەوەوە ئەوەی پێویست بێت وەری دەگرێت و هەرکاتێك ئەو بانگە کۆتایی هات مەبەستەکە دەرك دەکات و لێی تێدەگات و، جارێکی تر ئەو فریشتەیەی کەوەحیەکەی بۆهێناوە لەشێوەی پیاوێکدا دەردەکەوێت و قسەی

لەگەڵدا دەکات و ئەوەی کەفریشتەکە دەیڵێت لەبەری دەکات و وەری دەگرێت و فێربوون لەفریشتەو گەڕانەوە بۆهەستە مرۆییەکان و، تێگەشتن لەو ئیلقایانەی کەنازڵ دەبنە سەری، هەموونەمانە هەروەك بڵێی لەیەك چرکەدایە، چرکەساتێك لەیەك چاو تروکانیش کەمترە، چونکە ئەم حاڵەتانە لەیەك کاتدا ڕوونادات بەڵکو هەموویان بەیەکەوە دەردەکەون، وادیارە کەخێراترینی کاتەکاندا ڕووی داوە هەربۆیە وەها حاڵەتانێك ناوینێین وەحی، چونکە وەحی لەزمانەوانیدا بەمانای خێراکردنە.

وەپێویستە ئەوە بزانین کەبەپێی تێڕوانینی لێکۆڵەرەوان یەکەمین حاڵەت واتە بیستنی دەنگی هەورەبروسکەئاسا پلەی پێغەمبەرانی نەنێردراو و حاڵەتی دووەم واتە بەرجەستە بوونی فریشتە لەشێوەی پیاوێکدا کەقسەدەکات پلەو پایەی پێغەمبەرانی نێردراودایە. هەربۆیە لەحاڵەتی یەکەم کامڵترە ئەمەش مانای ئەو فەرموودەیە کەپێغەمبەر (ص) وەحی تێدا ڕاڤەکردووە لەوکاتەی کە حرسی کوڕی هیشام لێی پرسیوە چۆن وەحیت بۆ هاتووەتە خوارەوە؟ ئەویش لەوەڵامدا گووتویەتی: هەندێك جار وەك کاردانەوەی دەنگ دەگاتە بەرگوێم و ئەمەش توندترین حاڵەتێکە کەبەسەرمدا دێت، ئەوکات ئەوحاڵەتە دەپچڕێت و ئەوەی کەپێی گوتوم لەبەرم کردووە هەندێك جاریش لەشێوەی پیاوێکدا دێتە بەرچاوم و قسەم لەگەڵدا دەکات و ئەوەی کەپێم دەڵێت تێدەگەم.

وەحاڵەتی یەکەمین لەم ڕووە وە توند ترە کەئەوحاڵەتە لەپەیوەندیەی سەرەتای دەرچوون لەقووەوە بۆ کردار دەبێت لەم ڕووەوە کەمێك دژوارە هەربۆیە لەبەر ئەوەی لەوحاڵەدا لەسەر هەستەکانی مرۆڤ دەوەستێت، ئیدراکی وەحی تایبەتە بەهەستی بیستنەوە. ئەرکی هەستەکانی تر دژوار دەبێت، بەڵام کاتێك وەحی دووبارە ببێتەوە و وەرگرتن زۆرببێت ئەم پەیوەندیە ئاسان دەبێت، چونکە دەگەڕێتەوە سەر هەستی مرۆڤانە و لەهەموو هەستە ناوبراوەکان بەتایبەت لەڕوونترینیان بەهرەمەندە کەهەستی بینایییەو لەباسکردنی (وعی)وەرگرتن و لەبەر کردن لەحاڵەتی یەکەمی وەحیدا بەوشە

ڕابوردو (وعیت)وەلەحاڵەتی دووەمدا بەوشەی ڕانەبوردوو (اعی)جوانکاریەك لەڕەوانبێژی گونجێنراوە، واتە قسە لەبری نمونەدا بۆ هەردوو حاڵەتی وەحی هاتووە هەروەك چۆن لەحاڵەتی یەکەمدا بەهەورەبروسکە لەبەکارهێنانی گشتی قسەکەدا نایەتە هەژمار باسی کردووە، گوتویەتی کەتێکەشتن و وەعی لەماوەیەکی کەمدا کەئەوبانگە تێپەڕدەبێت دێتەدی. لەم ڕووەوە لەکاتی وێناکردنی تێپەڕینی بانگەکەدا بڕانی ئاوازەکەی ئەوحاڵەتە گونجاوی ئەوەیە کەوەعی یافەهم بەدەستەواژەی ڕابوردوو بگوترێت تاوەکو بەرابەری تێپەڕین و پچڕان بێت.

وەحاڵەتی دووەم بەفریشتەیەك دەچوێنێت کەلەشێوەی پیاوێکدا قسەی لەگەڵدا دەکات و لەقسەکەیەوە فەهم بەدی دێت و نمونەی هێناوەتەوە و، گونجاو لەگەڵ دەستەواژەکەدا لێرەدا ڕانەبوردووە کەمانای نوێبونەوە و ڕوودان دەگەیەنێت. پێویستە ئەوەبزانین بەشێوەیەکی گشتی لەهەرجۆرە حاڵەتێکی وەحیدا نارەحەتی و توندی هەبووە هەروەك چۆن قورئانیش ئاماژەی پێکردووە وخوداش فەرموویەتی:(ئێمە گوتارێکی قورسمان خستووەتە سەرشانت). حەزرەتی عائیشە گوتویەتی کەپێغەمبەر بەهۆی فشارو قورسی وەحیەوە زۆرماندو دەبوو هەروەها گوتویەتی لەڕۆژێکی سەختی سەرمادا کاتێك وەحی بۆدەهات و کاتێك پێغەمبەر لەوحاڵەتە تەواو دەبوو ئارەق بەدەم و چاویدا دەهاتە خوارەوە. هەربۆیە لەم حاڵەتەدا بێئاگایی لەهەستەکان و پرخەپرخی خەوو کەزۆر بەناوبانگە بەسەریدا دێت و هۆکارەکەشی هەروەك باسمان کرد وەحیە، کەبریتیەلە جیابونەوە لەجیهانی مرۆڤ و بەرز بونەوە بۆ ئیدراك و مەشاعیری فریشتەیی و وەرگرتنی قسەی جیهانی ڕۆحە، لەم ڕووەوە لەدەرئەنجامی جیایی خود لەمرۆڤ و داڕنرانی لەئاسۆکانی مرۆڤایەتی و نزیك بونەوە لەو ئاسۆیەی تر بۆ ئەم توندیەك ڕوودەدات. ئەمەش هەمان مانای ئەو فشارەیەکە پێغەمبەران لەسەرەتای هاتنی وەحیەوە بۆسەریان بەم جۆرەباسیان کردووە: (هێندە دەیگوشیم تاوەکو ئازارم پێگەیشت و دواتر هەستایەوە و پێی گوتم بخوێنەمنیش گوتم خویندەوارنیم).

هەروەها بۆجاری دووەم و سێیەم هەربەوشێوەیەی لەفەرمووده‌کەدا هاتووە. هەندێك جاریش ڕاهاتن لەسەر وەرگرتنی وەحی ووردە ووردە ئەرکەکە ئاسانتر دەکات. هەرلەبەر ئەوەیە نجوم و سور و ئایەتەکانی قورئان کەلەمەککەدا دادەبەزین کورتتر بون لەوانەی کەلەمەد ینەدا دەهاتنەخوارەوە. وەدەبێت ئەوە بزانین لەبارەی سورەتی بەرائەت لەغەزای تەبوکدا گێڕدراوەتەوە کەهەموو سورەتەکە یاخود زۆربەی لەکاتێکدا دابەزیە سەر پێغەمبەر کەبەسواری حوشتر بەڕێگادا دەڕۆیشت، هەربۆیەدەبینین زۆرێك لەسوروتەکورتەکانی کۆتایی قورئان بەیەکەوە و لەیەکجاردا لەمەدینە دادەبەزینە سەری‌و هەندێکی تریشیان لەکاتێکی تردا، بەڵام کۆتا بەشی کەلەمەدینەدا هاتوەتەخوارەوە ئایەتی قەرز (الدین)کەلەدرێژیدا لەگەڵ ئایەتەکانی تردا زۆرجیاوازە، بەتایبەت بەبەراورد بەسورەتەکانی: (الرحمن المدثرالضحی الفلق الذاریات و..) نمونەی ئەمانە دەهاتە خوارەوە لەم بەشەدا دەتوانین یەکێك لەجیاوازیەکانی نێوان سورەت وئایەتە مەدەنی و مەککیەکان کورتی و درێژیانی وەردەگرت خوداش ڕێنماکاری مرۆڤەکانە بۆڕاستی. ئەمەش کورتەی پێغەمبەرایەتی بوو، بەڵام کاهینیش لەتایبەتمەندیەکانی نەفسی مرۆڤە کەپێشتر باسمان کرد دەرکەوت کەنەفسی مرۆڤ خاوەن توانایەکە کە دەتوانرێت لەمرۆڤ بوون دابڕنرێت‌و بەرز بێتەوە بۆ ڕۆحانیەتێك کەبەرز ترە لەپلەی ئەو ئەم حاڵەتە لەهەندێك چرکەساتی تایبەتدا بۆکۆمەڵێك مرۆڤ کەلەڕیزی پێغەمبەراندا بوون، بەهۆی ئەو فیترەتەی کەلەسەری دروستکراون بەدیهاتووە و ئەوەش سەلماوە کەئەم حاڵەتە بۆ ئەمان بەبێ بەدەستهێنان‌و گەڕان و، بەبێ یارمەتی وەرگرتن لەهیچ هەستێك یان تەصەورات و کردارێکی جەستەیی ئیتر قسەکردن بێت یان جوڵەیەکی تایبەت، یاخود هیچ جۆرەکردارێکی تر ڕوو دەدات، بەڵکو ئەم حاڵەتە بەرزبونەوە بۆئاستی فریشتەو داڕنرانە لەمرۆڤ بوون لەچاوتروکا نێکدا بۆ ئەوان ڕوودەدات، هەرکات مەسەلەکە بەم شێوەیە بێت‌و ئەم توانایە لەسروشتی مرۆڤدا هەبێت دابەشکردنی لۆژیکی و پشت بەستو بەئەقڵ حوکم دەکات، کەگروپێکی ترلەمرۆڤ بین کەسەبارەت بەپلەو پایەی بەشی یەکەم

لەقۆناغی کەم و کورتیدا بن، کەم و کورتیەك کەیەکێك لەدژەکان پەیوەندیەکی تەواوی بەدژەکەی خۆیەوە هەیە، چونکەیارمەتی وەرگرتن بەشتێك لەم ئیدراکەدا دژی یارمەتی وەرگرتنەلێی‌و لەنێوان ئەو دوانەشدا جیاوازیەکی زۆر هەیە.

کەواتە بەپێی دابەشکردنی باسکراو هەرکات بەشەدژەکە پێویست بێت. ئەوکات ڕەوایە لێرەدا بەشێکی تر لەمرۆڤ باس بکەین کەهێزی عاقیلەی بەشێوەیەکی سروشتی جوڵەی فیکری ئەو لەڕووی ویستەوە بخاتە جوڵە ئەمەش کاتێك دەبێت کەحەزکردن لێی بخرێتە ڕوو، لەکاتێکدا سروشتی ئەو بۆگەشتن بەو کەم وکورتیە هەیە لەم ڕووەوە کاتێك بەربەستەکانی ئەو والێدەکەن کەنەتوانێت ئەنجامی بدات بەشێوەیەکی سروشتی تێکەڵی شتە هەست پێکراوو وەهمیەکان دەبێت وەك تەنەناسکەکان وئیسقانی حەیوانات و، سەجع وتن لەقسەداو جوڵەی باڵندەکان یان بەفاڵی باش و خراپ باسکردنی گیان لەبەران. ئەو کات ئەم هەستە یان ئەم خەیاڵە درێژە پێدەداتو بۆ تەجەڕودێك کەئاوازەکەی هەیە لەم جۆرە شتانە یارمەتی وەردەگرێت، چونکە کردارە ناو براوەکان وەك هاندەری وایە. ئەوهێزەی کەلەم جۆرە کەسانەدا بنەمای ئەوئیدراکەیە بریتیە لەهەمان ئەوکاهینیە بەهۆی ئەوەی کەئەم جۆرە نەفسانە لەسروشتیاندا لەسەر کەم و کورتی لەگەشتن بەکەماڵ ئافرێنراون ئیدراکی ئەمان لەشتە ناسەرەکیەکاندا زیاترە لەسەرەکیەکان هەربۆیە هێزی خەیاڵی ئەوان لەوپەڕی هێزدایە، چونکە ئەم هێزە کەرەستەی شتەناسەرەکیەکانە هێزی ناوبراو بەتەواوەتی ئیتر لەخەودابێت یان لەبێداریدا بێت شتەناسەرەکیەکان دەچنە ناویەوەو ئامادەو تەیاریان دەکات و خەیاڵیان بانگهێشت دەکات، ئەم خەیاڵانەش بۆ کاهینەکان وەك ئاوێنەیەکە کەبەردەوام سەیری دەکەن، بەڵام کاهین لەئیدراکی مەعقولاتەکاندا توانایەکی تەواوی نیە. چونکەوەحی ئەو جۆرێکە لەئیلهامی شەیتان بەرزترین پلەی ئەم بەشەش ئەوەیەکە قسەی وەزن دارو سەجعاوی دەکەن بۆ ئە وەی هەستەکانیان ئاراستە بکەن بەم پەیوەست بوون و پەیوەندیە ناتەواوەوە کەمێك بەهێز ببێت، هەرچەندە ئەو جوڵەو ئەوشتانەی کەهاندەری ئەون

بێگانەیە بەم پەیوەندیە وەسوەسە گەلێك لەدڵیدا دەگوزەرێت کەبەسەر زمانیاندا دەیهێنن، ئیتر ئەم قسانە ڕاست دەربچن یان درۆ، چونکە ئەو کەمو کورتی خۆی بەیارمەتی شتێکی بێگانە لەدەرەوەی زاتی ئیدراك کەرەوەی خۆیەوە کامڵ دەکات، شتێك کەنەگونجاوە لەگەڵ خودداو جیاوازە لێی.

لەم ڕووەوە ڕاستی و درۆیی هەردوکیان بۆئەو ڕوودەدەن و قسەکانی باوەڕپێکراو نین، چونکە بەهۆی حەزکردنیەوە بۆ بەدەست هێنانی ئیدراك و وەهمی خۆی خەڵەتاندنی پرسیار کەرەکان پەنا دەباتە بەر گومان تەخمین و خاوەنی ئەم جۆرە سەجع گوتنە هەمان ئەو کەسانەن کەبەتایبەتی بەناوی کاهینەوە بەناوبانگن، چونکە ئەوان لەپێشترن لەبەشەکانی تر. پێغەمبەر (ص)لەم بارەیەوە فەرمویەتی: ئەم قسەیە لەسەجع گوتنی کاهینەکانەوە هەیە و بەشێوەیەکی زیادە سەجع گوتنی تایبەت کردووە بەوانەوە. پێغەمبەر بەمەبەستی دەرخستنی حاڵی ئیبن صەیاد لەبارەی ئەو هەواڵانەی کەدەیگوتەوە لێی پرسی چۆن ئەم هەواڵانەت پێدەگات؟ لەوەڵامدا گوتی: هەواڵی ڕاستو درۆشم پێدەگات پێغەمبەریش فەرمووی کەواتە شتەکانت لێ تێکەڵ و ئاڵۆز دەبێت واتە ڕاستیەتی لەتایبەتمەندی پێغەمبەرانە و بەهیچ شێوەیەك درۆی تێدانیە، چونکەمەسەلەی پێغەمبەرایەتی بریتیە لەپەیوەست بوونی پێغەمبەر بەمەلەئی ئەعلاوە (جیهانی بەرین) بەبێ ئەوەی کەهاندەرێك لەئارادابێت و بەبێ ئەوەی یارمەتی لەشتە بێگانەو نامۆ کان وەربگرێت، بەڵام کاهین بەهۆی بێتوانایی خۆیەوە ناچارە پشت بەتەصوراتی بێگانە ببەستێت، ئەم تەسەورانەش دەچنە ناوئیدراکی ئەوەوە لەگەڵ ئەو ئیدراکەی کەگرنگی پێدەدات تێکەڵ دەبێت و لەئەنجامدا ئاوێتەیان دەبێت.

لێرەوە درۆی تێدا دروست دەبێت و ناکرێت پێشبینیەکانی بەپێغەمبەرایەتی بزانین، ئێمەگوتمان بالآترین پلەی کاهینی حاڵەتێکی سەجع گوتنە، چونکە هۆکاری سەجع لە هۆکارە کانی تری وەك بینین و بیستن ئاسانترو سوکترن. سوکی هۆکار ئەوە دەردەخات کەنزیکە لەوپەیوە ندی و ئیدراکەوە و تائاستێك لەحاڵەتی بێتوانایی بەدوورە. هەندێك

لەخەڵکی واگومانیان بردووە کەبەهۆی ڕەجمی شەیتانەکانەوە بەشیهابەکان لەکاتی پێغەمبەرایەتیدا کاهینیش هیچ ڕۆڵێکی نەماوە ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە کەویستویانە ڕێگری لەشەیتانەکان بکەن و نەهێڵن هەواڵی ئاسمانەکان بزانن، هەروەك چۆن لەقورئاندا هاتووە. ئەوان پێیان وایە لەبەر ئەوەی کەکاهینەکان هەواڵی ئاسمانەکانیان لەشەیتانەکانەوە وەرگرتووە هەربۆیە لەوڕۆژەوە کاهینی بەتاڵ بووەتەوە، بەڵام ناتوانین ئەمەوەك بەڵگە لەم بارەیەوە بیهێنینەوە، چونکە کاهینەکان زانیاریەکانیان تەنها لەشەیتانەکانەوە وەرنەگرتووە بەڵکو هەروەك ئەوەی کەباسمان کرد ئەوان لەدەرونی خۆیانەوە هەندێك هەواڵیان بەدەست هێناوە..

ئایەتەکەش باس لەوە دەکات کە شەیتانەکان تەنها یەك ڕێگایان لێگیراوە بۆزانینی هەواڵەکان ئەویش بابەتەکانی تایبەت بووە بەپێغەمبەرایەتی و لەهەواڵی تر ڕێگریان لێنەکراوەو، ئەم پچڕانەش تەنها لەکاتی پێغەمبەرایەتیدا بووە و لەوانەیە دوای ئەوە بارودۆخی ئاسمان گەڕابێتەوە دۆخی جارانی. ئەمەش بەتەواوی بەم شێوەیە هەروەك چۆن لەکاتی هەڵهاتنی خۆردا هەموو چراو ڕووناکیەك ڕۆشناییەکەی نامێنێت، هەربۆیە پێغەمبەرایەتی گەورەترین نورێکە کەهەموو نورو ڕوناکیەك لەلایدا دیارنامێنێت. هەندێك لەحەکیمەکان گومانیان بردووە کەکاهینی لەڕۆژگاری پێغەمبەرایەتیدا سەرهەڵدەدات و دواتر کۆتایی دێت و هەرپێغەمبەرایەتیەکیش ڕوبدابێت هەربەم جۆرە بووە، چونکە دەرکەوتنی پێغەمبەرایەتی دەبێت گونجاوبێت لەگەڵ بارودۆخێکی فەلەکیدا و کاتێکیش ئەم بارودۆخە کامڵ دەبێت ئەوپێغەمبەرایەتیەی کەبارودۆخی فەلەکی گونجاوە لەگەڵیدا دەگاتە کەماڵ و، کامڵ نەبوونی ئەو بارودۆخە فەلەکیەش ئەوە دەخوازێت کەسروشتێك لەجۆری خۆی دەربکەوێت و خوازیاری کەموکورتی بێت و بەپێی ئەو بابەتانەی کەباسمان کردن مانای چەمکی کاهین هەرئەمەیە.

کەوابوو بەرلەکامڵ بوونی ئەو بارودۆخە کامڵ و ناکامڵە ڕوودەدات هۆکاری بوونی کاهینێك یان چەند کاهینێکیشە. هەرکات ئەو بارودۆخە فەلەکیە کامڵ ببێت بوونی ئەوپێغەمبەرەش دەگاتە کەماڵ، ئەوکات ئەو بارودۆخانەشی کەبەڵگەو نیشانەی ئەو سروشتەبوون لەناو دەچوون و، هیچ ناوو نیشانێکی لێ بەجێ نەدەما. ئەم باسەی حەکیمەکانیش پشتی بەوە بەستووە کەبەشێك لەبارودۆخی فەلەکی خوازیاری بەشێك لەنیشانەکانیەتی هەرچەندە ئەم شتەش سەلمێنراونیە، کەواتە لەوانەیە بارودۆخی فەلەکی ئەم شتە بەو شێوە تایبەتەی کەهەیە نیشان نەدات، نەوەك وەك ئەوەی کەگوتویانە پێویستە ئەو شوێنەوارە ناکامڵ بێت. سەرەڕای ئەمەش ئەگەربێت و ئەوکاهینانە هاوکاتی سەردەمی پێغەمبەرایەتی بن ئەوان لەهەموو کەسێك زیاتر ئاگادری ڕاستیەتی پێغەمبەر و موعجیزەکانی دەبن، چونکە کەمێك لەئیدراکی پێغەمبەرایەتیان تێدا دەبینرێت هەروەك چۆن هەموو مرۆڤێك لەمەسەلەی خەو تێدەگات و، هەموو کاهینێکیش دانەپاڵی ژێری بۆلای پێغەمبەران بەگونجاو دەزانێت، ئەم شتەش لای ئەوان لەبابەتی خەو بۆکەسێکی خەوتوو ئاشکراترە.. بەڵام تەنها شتێك وا لە کاهینان دەکات کەپشتگیری پێغەمبەران نەکەن و بەدرۆیان بخەنەوە هەستی ئیرەیی چاوچنۆکیە کە حەزدەکەن ئەمان پێغەمبەر بونایە ! !

هەربۆیە دەست دەکەن بەدژایەتی کردنی پێغەمبەران، هەروەك چۆن ئومەیەی کوڕی باوکی صەڵت کەوتە ئەم کێشەیەوە، چونکە ئەو تەمای ئەوەی گرتبو کەبانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات، هەربەوجۆرەی کەئیبن صەیاد و موسەیلەمە و ئەوانەی تریش کەبانگەشەی پێغەمبەرایەتیان کردووە لەم زۆنگاوەداخلیسکاون، بەڵام ئەگەر بەباوەڕەوە چاوببڕێتە تەماعەکان و وازلەم جۆرە حەزو ئارەزوانە بهێنن ئەوا بەباشترین شێوە باوەڕ بەپێغەمبەران دەهێنن وەك تولەیحەی ئەسەدی و، سەوادی کوڕی قاریب کەشوێنەواری تێکۆشان و باوەڕیان لەفتوحاتی ئیسلامیدا گەواهی دەری باوەڕی بەهێزیانە.

## خەون چییە؟

حەقیقەتی خەون ئەوەیە بۆ نەفسی گۆیا لەزاتی ڕۆحانیەت و لەچرکەساتێکی تایبەت لەکاتدا لەبارەی شێوازی ڕووداوەکان و پێشهاتەکانی خوێندنەوە دەست دەدات، چونکە ئەم نەفسە کاتێك لەپلەی ڕۆحانیەتدایە، شێوازو وێنەی ڕووداوەکان بەکرداری تێدا هەیە. ئەم شتەش تایبەتمەندی هەموو زاتە ڕۆحانیەکانە. پلەی ڕۆحانی نەفسی گۆیا، کاتێکە ڕووت بێتەوە لە مادەی جەستەیی و هەست و ئیدراکاتە ئاشکراکان. ئەم پلەیە هەندێکجار لەچرکەساتێکی دیاری کراودا بەهۆی خەوەوە بۆئەو بەدی دێت (هەروەك باسمان کرد). وە لەو کاتەدا حەزی لەهەر زانستێك هەیە وەری دەگرێت و نەفسی گۆیاش ئەومەعریفەتانە دەسپێرێت بەئیدراکاتەکانی خۆی و وەرگرتنی ئەو زانیاریانە بەهۆی خالص نەبونیانەوە لاوازو نادیارن و پێویستیان بەڕاڤەی خەون دەبێت، بەڵام هەندێك جار وەرگرتنی ئەوزانیاریانە بەهێزە بەجۆرێك بێ نیاز دەبن لەهاوشێوە بوون ئەوکات بەهۆی خالصیانەوە لەنمونەو چواندن پێویست بەڕاڤەی خەون ناکات.

هۆکاری ڕوودانی وەها چرکەساتێکی تایبەت بۆ نەفس ئەمەیکە نەفس بەناکرداری خاوەن زاتێکی ڕۆحانیە کەبەهۆی جەستەو ئیدراکاتەکانیەوە کامڵ دەبێت. هەربەو شێوەیەی کە زاتی ئەودەبێتە تەعەقولی ڕووت و بوونە کرداریەکەی کامڵ دەبێت. لەم حاڵەتەدا زاتێکی ڕۆحانیە کەبەبێ هیچ بنەمایەکی جەستەیی دەرك دەکات، بەڵام جۆری ئەو لەجیهانی ڕۆحانیەتەکاندا لەجۆری فریشتەکان کەلەئاسۆی بەریندا هەن فراوان ترە، گرویێکن کە کامڵ بوونی زاتیان وابەستەی هیچ یەك لەئیدراکاتە جەستەیی و ناجەستەییەکان نیە، بەڵام وەها ئامادەباشیەك بۆنەفسی گۆیا تاکاتێك ئاسانە کەوابەستەی تەنێك بێت ئەمەش دووجۆرە: جۆرێکی تایبەتی وەك ئامادەباشی ئەولیا و جۆری دووەمیش گشتیە و پەیوەندی بەهەموو تاکەکانی مرۆڤەوە هەیە. مەسەلەی خەونیش ئەم ئامادەباشیە گشتیەیە، بەڵام زاتی ڕۆحانی پێغەمبەران خاوەن

ئامادەباشی‌و تەجەڕودو دارنین لەمرۆڤ بوون و پەیوەست بوونە بەدونیای فریشتەیی ڕووتەوە و کەبەلەپێشترین پلەکانی ڕۆحانیەت دەژمێردرێت. ئەم ئامادەباشیە چەندین جار لەماندا لەحاڵەتەکانی وەحیدا دەردەکەون وەکاتێك لەئیدراکات و هەستەکانی جەستەوە بەرەو جیهانێکی لەپێشتر بەرزدەبنەوە جیهانێکیان بۆ دروست دەبێت کەزۆر لەخەودەچێت، هەرچەندە خەو بەچەندپلەیەك لەو قوڵترە.

بەهۆی ئەم لێکچونەوە خودا بەم شێوەیە باسی خەوی کردووە: خەو یەکێکە لە چل و شەش بەشەکەی پێغەمبەرایەتی کەلەڕیوایەتێکدا چل و سێ و لەگێڕانەوەیەکی تریشدا حەفتاو بەش باسکراوە، بەڵام لەهەموو ئەمانەدا مەبەستی بنەڕەتی ژمارە نیە، بەڵکو مەبەست زیادەیەلەجیاوازی پلەکاندا بەبەڵگەی ئەوە لەهەندێك ڕێڕەوی گێڕانەوەدا وشەی (سبعين)واتەحەفتا بەکارهاتووە کەعەرەب بەمەبەستی زۆرکردن و زیادە بەکاری دەهێنن‌و، هەندێك لەگێڕانەوەدا بەچل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی ناویان بردووەو گوتوویانە: وەحی لەسەرەتادا بەهۆی خەوەوە ماوەی شەش مانگ بووە کەنیوەی ساڵێکە هەموو ماوەی پێغەمبەرایەتی لەمەککەو مەدینەدا بیست و سێ ساڵ بووە هەربۆیە نیوەی ساڵ ئەوبەشەیە لەچل و شەشەکە، بەڵام ئەم گوتارە دوورە لەتەحقیقەوە، چونکە ئەم ماوەی پێغەمبەرایەتیە بۆپێغەمبەری ئێمە ڕوویداوە کێ دەزانێت ئەم حاڵەتەش بۆپێغەمبەرانی تر ڕووینەدابێت؟.

سەرەڕای ئەمەش، هەڵسەنگاندنی ناوبراو تەنها کاتی خەونەکە بەنیسبەت کاتی پێغەمبەرایەتیەوە دیاری دەکات، بەڵام حەقیقەتی خەون بەبەراورد بەحەقیقەتی پێغەمبەرایەتی نیشان نادات و هەرکات لەسەرتادا باسی خەونمان کرد ئەم بابەتەڕوون دەبێتەوە ئەوکات دەزانرێت کەمانای ئەم بەشە نیسبەتدانی یەکەمین ئامادەباشی گشتی مرۆڤ لەگەڵ ئامادەباشی نزیکی تایبەتی گوپی پێغەمبەرانە کەلەواندا سڵاوی خوایان لەسەربێت شتێکی فیتریە، چونکە ئامادەباشی ناوبراو هەرچەندە لەمرۆڤدا گشتیە، بەڵام ئامادەباشیەکی دوورە و ڕێگری و بەربەستی زۆری لەگەڵدایە تاوەکو بەکرداری بێتەدی

ودەتوانین گەورەترینی ئەو بەربەستانە بەهەستەئاشکراکان ناوزەد بکەین، بەڵام خودا سروشتی مرۆڤی وەها ئافراندووە کەدەتوانین زاڵ ببێت بەسەر ئەم بەربەستانەدا واتە بەهۆی خەوەوە کەبۆ ئەو شتێکی سروشتیە پەردەی هەستەکان لاببات و، ئەوکات لەکاتی لابردنی ئەم پەردەیەدا نەفس بخاتە شوێنی دەرکەوتنی مەعریفەت بۆ ئەوەی لەڕێگەیەوە شارەزای جیهانی حەقیقەت ببێت. ئەمەیە کەهەندێك کات لەکاتی خەودا چرکەساتێکی تایبەتی هەست پێدەکەین کەتێیدا بەمەبەستی خۆمان دەگەین و هەربۆیەخودا خەونی بەشتە نەمرەکان هەژمار کردووە فەرموویەتی: لەپێغەمبەرایەتی بێجگە لە خەوە ڕاستەکان هیچ شتێك نەماوەتەوە، هاوەڵانیش گوتیان ئەی پێغەمبەر ئەوخەونانەکامانەن؟ لەوەڵامدا فەرمووی: خەوی چاك کەپیاوچاکێك دەیبینێت، بەڵام هۆکاری لابرانی پەردەی هەستەکان لەخەودا بەبۆچونی من بریتیەلەوەی: ئیدراك و کرداری نەفسی گۆیا بەیارمەتی ڕۆحی حەیوانیە کەجەستەییە بریتیە لەهەڵمێکی ناسك کەناوەندەکەی لەبۆشایی بەشی چەپی دڵدایە، هەروەك چۆن لەکتێبەکانی توێکاری جالینوت و ئەوانی تردا هاتووە.

ئەم هەڵمەش لەدەمارەکاندا لەگەڵ خوێندا دەڕواتو لەئەنجامدا هەستو جوڵەو کردارەکانی تری جەستەدرووست دەکات بەشەناسکەکەی دەچێتە مێشکەوە و ساردیەکەی ڕێك دەکاتەوە و کردارە بەهێزەکان کەلەناخیدایە کامڵ دەبن، هەربۆیە ئیدراك و تەعەقولی نەفسی گۆیا بەیارمەتی ئەم ڕۆحە هەڵمێکەو بەوەوە پەیوەستە، چونکە حیکمەتی تەکوین ئەوە دەخوازێت کەناسك و کاریگەر نەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم ڕۆحە حەیوانیە لەنێو مادەکانی جەستەدا ناسك بووەتەوە جێگەی شوێنەوارە زاتیەکان کەدژە لەگەڵ جەستەیی بوونیدا و ئەوەش نەفسی گۆیایە و شوێنەوارەکانی ئەم نەفسە لەجەستەدا بەهۆی ئەو ڕۆحەوە دێتەدی، کەلەلاپەڕەکانی پێشودا باسمان کرد کەئیدراکی نەفسی گۆیا بەدوو شێوەیە: یەکێکیان ئاشکراو دیارە کەپێنج هەستەوەرەکەن و، دووەمیان لەناخدایە و بەهۆی هێزەکانی مێشکەوە دەبێت و ئەم

جۆرە ئیدراکانە هەموویان ئیتر ئاشکرابن یان نا نەفسی گۆیا لەئیدراکی زاتە ڕۆحانیەکانی باشترلەو کە بەفیترەت ئامادەیە بۆئەوان دەیگێڕێتەوە.

لەبەر ئەوەی کەهەستەئاشکراکان جەستەین و ماندو بوون و لەناوچون و خەوتنیان بەسەر دادێت بەهۆی دەرئەنجامی کارو چالاکیەکانەوە ڕۆح زۆر دادەپۆشن. هەربۆیە خودا هەستەکانی بەجۆرێك دروست کردووە کەپێویستی بەحەسانەوە هەبێت و تاوەکو ئیدراك دووبارە بەشێوەیەکی تەواو دابڕنرێت. ئەمەش کاتێك دەبێت کەڕۆحی حەیوانی لەهەموو هەستە ئاشکراکان دوور دەکەوێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر هەستی باتین و ناوەکی. ئەوەشی کەیارمەتی دەدات ئەمەیە کەلەشەودا سەرما دەچێتە ناوجەستەوەو لەئەنجامدا دەگەڕێت بەشوێن گەرمای غەریزی قولایی جەستەداو لەدەرەوە دەچێتە ناوەوە ئەوەی کەسواری دەبێت، واتە ڕۆحەحەیوانیەکە بەرەو ناخ دەیبات هەربۆیە زۆرتر لەشەودا مرۆڤ دەخەوێت، کەواتە هەرکات ڕۆح دوور بکەوێتەوە لەهەستە دیارەکان و بگەڕێتەوە سەر هەستەناوخۆییەکان و، ئاگاداری نەفس لەجیهانی هەستی و ڕێگریەکانی کەم ببێتەوە و نەفسی ئیزو بەو شێوەیەی کەلەبیرگەدا هەیە بگەڕێتەوە، ئەوا بەهۆی تێکەڵ کردن و شیکاریەوە شێوازگەلێکی خەیاڵی لەحافیزە (بیرگە)بەرجەستەدەکات ئەم جۆرانەش زیاتر لەشێوازە دیارو ئاساییەکانن، چونکە لەکۆمەلێك مودریکاتەوە جیادەبنەوە کەکاتی ئیدراکیان نزیك بێت.لەپاشان ئەم شێوازانە دێنە ناوهەستی هاوبەشەوە کەکۆکەرەوەی هەستەدیارو ئاشکراکانە، وەهەستی هاوبەشیان بەهەمان شێوازی پێنج هەستەوەرە دیارەکان دەرك دەکات.

هەرچەندە نەفس لەگەڵ هێزە ناوخۆییەکاندا لەکێشەدایە لەیەك چرکەساتدا ئاگاداری زاتی ڕۆحانی خۆی دەبێت و بەوەرگرتنی ڕۆحانی خۆی دەرك دەکات، چونکە سروشتەکەی بەبەرینی دروستکراوە لەم کاتەدا شێوازگەلی شتانێك کەپەیوەستن بەزاتی ئەوەوە وەردەگرێت، لەپاشان ئەم شێوازە دەرك کراوانە خەیاڵ دیسانەوە وەریان دەگرێتەوە ئەوان بەهەمان شێوەی ڕاستەقینە یان هاوشێوەی لەقاڵب گەلێکی دیاری

کراودا بەرجەستە دەکات. ئەم شێوازە لێکچوانەش لەگەڵ حەقیقەتدا پێویستی بەخەون وڕاڤەکەی هەیە، کاری پێکهاتن و شیکاری نەفس لەشێوازەکانی حافیزەدا بەرلەوەی بگاتە ئیدراکی ڕاستەقینەو گرنگی پێدانی تایبەت هەمان ئەوخەوە پەرێشان و پڕ لەهەلآنەیە، لەفەرموودەدا هاتووەکەپێغەمبەر فەرموویەتی: خەو سێ جۆرە: جۆرێکیان خودایییە، جۆر یێکیشیان فریشتەییە و جۆری سێیەمیشیان شەیتانییە، ئەم دابەشکردنە لەگەڵ ئەوەی کەئێمەباسمانکرد هاوتەریبە، چونکە خەوە نهێنی و ئاشکراکان لەلای خوداوەیە و خەوەلێکچووەکانیان کەپێویستیا بەڕاڤە هەیە لەلای فریشتەکانەوەیە خەوە ناخۆشەکانیش لەلای شەیتانەکانەوەیەو، ئەم جۆرە خەوانە یەکسەر بەتاڵن و سەرچاوەی بەتاڵیش شەیتانە.

ئەمەیە ڕاستەقینەی خەون و ئەوەی کەلەکاتی خەوتندا دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەبەری دەکاتەوە، ئەم چۆنیەتیانە لەتایبەتمەندیەکانی نەفسی مرۆڤە کەلەهەموو تاکەکانی مرۆڤدا دەبینرێن و کەس بێبەش نیە لێیان، بەڵکو هەریەکە لەتاکەکانی مرۆڤ نەوەك یەکجار بەڵکو چەندەها جار لەجیهانی خەوندا ڕووداو گەلێك دەبینێت کەدواتر لەجیهانی ڕاستەقینەدا دێنەدی و دڵنیادەبێتەوە لەوەی کەنەفس لەحاڵەتی خەودا نهێنی غەیب دەرك دەکاتو، ناچاریش کاتێك ئەم شتەلەجیهانی خەودا ڕەوابێت لەخەوو شتەکانی تردا نەگونجاو نەدەبوو، زاتی ئیدراککەر یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی ئەوەیە کە لەهەموو حاڵەتەکاندا گشتگیر دەبێت، خوداش بەڕەحم و بەخشندەیی خۆی ڕێنماکاری مرۆڤەکانە بۆسەر ڕێگەی ڕاست.

## بەشێك

ئەوەی کەبۆمرۆڤ لەم جۆرەحاڵەتانەدا ڕوودەدات بەئیرادەو مەبەستی خۆی نیەو توانایی بەسەریدا ناشکێت، بەڵکو نەفس تەنها لەو چرکەساتە تایبەتەو لەکاتی خەودا ئەم جۆرەحاڵەتانە بەدەست دەهێنێت، لەسەر ئەوشتانەی کەخوازیاری فێربونیانە

هەڵوەستە دەکات، ئەوەك ئەوشتانەی کەنەفس ئاوازی بۆ دەخوێنێت و دەیبینێت. لەکتێبی (الغایە) و کتێبەکانی تری ئەهلی (ڕیازەتدا) وشەو ناوونیشان گەلێك باسکراون کەئەوان لەکاتی خەودا دەخوێننەوە، بەم شێوەیە ئەوەی کەبیانەوێت ئاگاداری دەبن و لەجیهانی خەوندا دەستیان دەکەوێت و پێیان دەڵێن (حالومیە)و موسلمە لەکتێبی (الغایە)دا، جۆرێك لەحالومەی هێناوەو ناوی لێناون حالومەی تەبع تەواو یان سروشتە تەواوەکان. بەوشێوەیە کەکەسێك لەپاش دەستبەتاڵبوون بەشێوەیەکی نهێنی و، بەئاگادارییەکی ڕاستەوە لەکاتی خەودا ئەم وشە ناعەرەبیانە بڵێتەوە: (تماغس، بعدان، یسواد، غداس، نوفنا، غادس).

ئەوکات ئەوەی کەداوای کردبێت لەخەودا بۆی ئاشکرادەبێت و لەجیهانی خەوندا دەیبینێت. دەگێڕنەوە کەسێك پاش ئەوەی لەخواردن و زیکرو ویردی خۆیدا لەڕیازەتدا بووە و ئەم کارەی ئەنجامدا، تاوەکو سەرئەنجام کەسێك هاتە خەوی و پێی گوت: من سروشتە کامڵ و تەواوەکانی تۆم. لەپاشان تکاکەی خۆی لێکردو پیاوەکەش ئەوەی کەئەم کەسە ویستبوی پێی ڕاگەیاند. بۆخودی خۆشم لەڕێگەی ناوو وشەی ناوبراوەوە چەند بینینێکی سەیرم لەخەودا بۆهاتەپێشەوە و ئاگاداری چەند کاروبارێکی ژیانی خۆم بوومەوە، کەلەمێژ بوو عەوداڵ بووم بەدوایاندا، بەڵام ئەم بابەتە بەڵگەنیە لەسەرئەوەی کە هەرکات خەون ببینین ئەم شتە بۆمان دەست بداتن بەڵکو حالومە باسکراوەکان بۆ ڕوودانی خەون ئامادەباشیەك لەنەفسدا دروست دەکەن، کەهەرکات ئەو ئامادەباشیە بەهێزبێت، بەدەستهێنانی ئەوەی کەنەفس دەتوانێت ئەنجامی بدات و ئامادەباشە بۆی ئاسانتر دەبێت. کەسەکەش ئازادە لەهەرجۆرە ئامادەباشیەکدا کەحەزی لێیەتی کاربکات، بەڵام ئەمە نابێتە بەڵگەی ئەوەی کەلەهەرشتێکدا ئامادەباشی هەبێت هەمان شت ڕوودەدات، چونکە توانایی بۆئامادەباشی جیاوازە لەتوانایی بەدەستهێنانی شتێك. پێویستە ئەم خاڵە بزانین و بیری لێبکەینەوە لەگەڵ هاوشێوەکانیدا بەراوردی بکەین، خوداش حەکیم و بەئاگایە.

## بەشێك

سەرەڕای ئەوەی کەباسمان کرد ئێمە لەجۆری مرۆڤەکاندا کەسانێك بدۆزینەوە کەبەهێزی سروشتی خۆیان بەرلەڕوودانی بونەوەران باسیان دەکەن و، بەم سیفەتەوە لەخەڵکی تردەناسرێنەوە و لەم شتانەشدا پشت بەهیچ پیشەیەك نابەستن و یارمەتیش لەشوێنەواری ئەستێرەکان وەرناگرن، بەڵکو ئەم جۆرە هەستانە لەواندا فیترین و هەروەك غەیب بێژان و ئەوکاهینانەی کەبەهۆی تەنە ناسکەکانەوە کەبەهۆی ئاوێنەو تاسەی ئاوەوە پێشبینی دەکەن و، ئەوکاهینانەی کە لەڕێگەی دڵ و جگەرو ئێسقانی حەیواناتەوە غەیب لێدەدەن و ئەوانەی کەبەپەلەوەرو دڕندەکان گەشبینی و ڕەشبینی دەخەنە ڕوو گروپێکیش کەلەڕووی بەردە ووردەکان و دەنکی دانەوێڵەی وەك گەنم غەیب لێدەدەن، هەموو ئەمانە لەجیهانی مرۆڤایەتیدا بوونیان هەیە و هیچ کەس ئینکاریان ناکات، هەروەها لەزمانی شێتەکانیشەوە وشە گەلێکی غەیبی دێتەدەرەوە لەو مەسەلانەی کەهێشتا ڕوویان نەداوە هەواڵ دەدەن‌و، ئەوانەشی کەخەوتوون یان لەسەرەمەرگدان لەیەکەمین چرکەساتی مەرگ یان خەو باس لەجیهانی غەیب دەکەن و ڕیازەت کێشەکانیش لەصۆفیەکان لەڕێگەی کەرامەتەوە خاوەن هەست گەلێکن کەغەیب گۆیی دەکەن.

ئێمەش ئێستەگفتوگۆ لەبارەی هەموو ئەم جۆرە ئیدراکاتانەوە دەکەین و سەرەتاش لەکاهینەکانەوە دەست پێدەکەین، ئەو کات یەکەبەیەکەی ئەم جۆرەکەسانە تاوەکو کۆتایی باس دەکەین و بەرلەوەی دەست پێبکەین پێشەکیەك باس بکەین لەبارەی ئەوەی کەنەفسی مرۆڤ لەهەموو ئەوبەشانەی کەباسمان کرد چۆن ئامادەی وەرگرتنی غەیب دەبێت. باس کردنەکەیشی بەم شێوەیە کەوەك چۆن لەمەوبەر باسمان کرد مرۆڤ لەنێوان ڕۆحیانەتەکانی ترداخاوەنی ڕۆحانیەتێکی هەبوو ئامادەباشی ناکردارە ئەم ڕۆحانیەتەش بەهۆی جەستەو حاڵەتەکانەوە لەقۆناغی ناکردارەوە دەچێتە قۆناغی کردار

ئەمەش هەموو کەسێك لێی تێدەگات، وە ئەوەی ناکرداربێت بریتیە لەمادەو شێوازێکەو شێوازی ئەم نەفسەش کەبونی بەو کامڵ دەبێت هەمان خودی ئەوئیدراك و تەعەقولەیە، چونکە ئەم نەفسە سەرەتا ناکردارەو ئامادەی وەرگرتنی ئیدراك و شێوەگشتیو ناگشتیەکانە ئەوکات لەڕێگەی هاوڕێیەتی لەگەڵ جەستەداو چونەناوەوەی ئیدراکاتە هەست پێکراوەکانی جەستە بۆ ناوئەو پەروەردە دەبن و، ئامادەباشیەکانی لەقۆناغی ناکردارەوە دەچنەقۆناغی کردار، بەوشێوەیەی کەجەستە ئیدراکاتی هەستپێکراوی بۆ دەگێڕێتەوە وهەندێکیش لەوئیدراکاتانە لەمانای گشتی دادەڕێنێتو نەفسی شێوازەکان یەك لەدوای یەك تەعەقول دەکات تاوەکو ئیدراك و تەعەقولی کرداری بۆ دروست ببێت و، لەئەنجامدا زاتی ئەو کامڵ دەبێت و وەك شاشەیەك وایە کەوێنەوشێوازەکان یەك لەدوای یەك نیشاندەدات.

هەربۆیە دەبینین منداڵ لەسەرەتای گەشە کردنیەوەتوانای ئەوئیدراکەی کە لەزاتی نەفسەوە دروست دەبێت ئیتر لەخەودابێت یان بێداری یان لەڕێگەی کەشفەوە بێت نیەتی، چونکە شێوازی نەفسی ئەو کەخودی زاتی ئەوە، واتە ئیدراك و تەعەقول، هێشتا نەگەشتووەتەقۆناغی کامڵ بوون بەڵکو داڕنینی شتەگشتیەکانیش لەودا هێشتا کامڵ نەبوون، بەڵام هەرکات زاتی نەفسی ئەو بەکردار کامڵ ببێت تائەوکاتەی کەلەجەستەدا بێت دووجۆر ئیدراکی بۆدروست دەبێت: یەکێکیان ئیدراکێکە بەبنەما جەستەییەکان کە دەرك پێکراوەکان و هەستە دیارەکانی دەگەیەنێت بەنەفس و دووەمیشیان ئیدراکی زاتی خودە بەبێ هیچ جۆرە نێوەندگیریەك. ئەم جۆرە ئیدراکەش بەهۆی ڕۆچون بەناو پێویستیەکانی جەستەو سەرقاڵ بوونی هەستەکان لەمرۆڤ شاراوەیە، چونکە هەستەکان لەبەرئەوەی بەپێی یەکەمین فیترەت لەگەڵ ئیدراکاتە جەستەییەکاندا دروست کراوە هەمیشە نەفس بەرەو دەرەوە کەمەند کێش دەکات، بەڵام جاری واش هەیە لەدەرەوە دەچێتە ناوەوە و ئەوکات پەردەکانی دەرەوە و جەستە لەیەك چرکەساتی تایبەتدا دەبنە یەك ئاراستە. ئەمەش یان بەهۆی ئەوتایبەتمەندیەیە کەبەشێوەیەکی ڕەها

لەهەموو مرۆڤەکاندا هەیە وەك خەوتن، وەیان بەهۆی ئەوتایبەتمەندیەوەیە کەلەهەندێك مرۆڤدا بوونی هەیە وەك کاهینی و فالّ بینی یان لەڕێگەی ڕیازەتەوە وەك خاوەنانی کەشفو کەرامەت لەصۆفیەکاندا، لەم ساتەدا نەفس ئاگاداری زاتەکانی جیهانی بەرین کەلەو لەپێشترن دەبێتەوە، چونکە لەنێوان ئاسۆی ئەوو ئاسۆ و زاتە ناوبراوەکانی جیهانی بووندا پەیوەستن بەیەکەوە هەروەك لەڕابوردوودا باسمان کرد ئەوانیش زاتە ڕۆحانی و ئیدراکی ڕووت و ئەقلّە کرداریەکانن وەهەروەك باسمان کرد شێوە و حەقیقەتی هەستیەکان لەواندا هەیە. هەربۆیە هەندێك لەو شێوازانە لەنەفسدا دەردەکەونو زانستگەلێکیان لێوە وەردەگرێت و، هەندێك جاریش ئەم شێوازە دەرك کراوانەلەڕێگەی خەیاڵەوە دەجولێنرێن و ئەوکات خەیاڵیش دەیانکاتە قاڵب گەلێکی ئاساییەوە ولەپاشان هەست ئیتر بەشێوەیەکی تاك یان لەقاڵبگەلێکی خەیاڵیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوئیدراکاتانە و باسیان دەکات. ڕاڤەی ئامادەباشی دەروون بۆ ئیدراکی غەیبی بەم جۆرەیە.

ئێستەش دەچینە سەرباسی بەشەکانی غەیب گۆیان کەپێشتر پەیمانمان دا باسیان بکەین: گروپێکیان لەڕێگەی تەنە ناسکەکانەوە وەك ئاوێنەو تەشتی ئاوو دلّ و جگەر و ئیسقانی گیانلەبەرانەوە تەفائول و تەتیر دەکەن و، ئەوانەشی کەبەوورده بەردو دەنکە ووردەکان فالّ دەبینن، هەموویان هاوشێوەی کاهینەکانن، بەلاّم لەبنەڕەتی خیلقەتدا لەپلەیەکی قولّتر لەکاهینەکاندان، چونکە کاهین بۆ لابردنی پەردەی هەستەکان پێویستی بەمومارەسەی فراوان نیە، بەلاّم ئەوگروپە لەوڕووەوەی کە دەبێت هەموو ئیدراکە هەستیەکان لەبەرێزترین جۆریاندا واتەلە بینایدا کورتی بکەنەوە مومارەسەیەکی زۆردەکەن هەربۆیە زۆر درەنگ بەووردەکاریەوە لەشتێك وورد دەبنەوە تاوەکو هێزی ئیدراك یان ئیلهام بەخش کەبەهۆیەوە لەنادیارەکان هەوالّ دەدەن بێتە ئاراوە، هەرچەندەش هەندێك وادەزانن لەبەر ئەوەی کەئەوان سەیری ئاوێنە دەکەن بابەت گەلێکی تێدا دەبینن و بۆ خەلّکی باس دەکەن.. ئەمە لەکاتێکدا بەم شێوەیەنیە بەلّکو ئەوان هێندە سەیری ئاوێنە دەکەن تاوەکو لەچاو وون دەبێت و لەنێوان ئەوان و ڕووی

ئاوێنەکەدا پەردەیەك لەشێوەی هەوردادروست دەبێت و، لەناو ئەوپەردەیەدا وێنەگەلێك کەئیلهام بەخشی ئەوانە بەرجەستە دەبن و بەئامازە مەبەستەکەیان پێدەگەیەنێت ئیتر شتەکەئەرێنی بێت یان نەرێنی ئەوکات بەهەرجۆرێك کەئیدراکی دەکەن باسی دەکەن بۆ خەڵکی.

وە دەبێت ئەوە بزانین کەئەوان لەوحاڵەتەدا لەئاوێنەکەو ئەو شێوازانە کەتێیدا دەردەکەون شتێت نازانن بەڵکو لەرێگەی ئەوجۆرەی تری ئیدراکەوە زانیاریەکان بەدەست دەهێنن کەنەفسانیە و بەچاونابینرێن، بەڵکو هەروەك ئەوەی کەناسراوە بەهۆی ئەو ئیدراکەوە دەرك کراوە نەفسانیەکان بەشێوەیەکی هەستی لەدیدی ئەماندا بەرجەستە دەبێت، هاوشێوەی ئەم حاڵەتەش بۆ ئەوغەیب گۆیانەی کەبەدڵ و جگەری حەیوانات فاڵ دەبینن و ئەوانەشی کەلەئاوی تاسەدا وەك ئەمان وورد دەبنەوە دەست دەدات، بەڵام لەم گروپەش کەسانێکمان بینیوە کەبۆ سەرقاڵ کردنی هەستەکان تەنها بوخورد بەکاردەهێنن لەپاشان بۆ ئامادەباشی بۆنەفسونەکان پشت بە (عزایم)دەبەستن‌و ئەوەی کەبۆیان دەردەکەوێت باسی دەکەن، ئەم گروپە شێوازەکانی ناوبراو لەهەوادا دەبینن و ئەو وێنانەش چۆنیەتی ئەوبابەتانەی کەئەیانەوێت دەرکیان بکەن بەنمونەو ئامازە بۆ ئەمانیان دەگێرنەوە. نادیاری ئەم گروپە لەجیهانی بەرجەستە کەمترە لەدەستەی یەکەمین. سەرانسەری ئەم جیهانەش پرپەتی لەشتە سەرسوڕهێنەرەکان، بەڵام شێوازی ئەو فاڵ گرەوانەی کەلەفرین و جوڵەی باڵندەکان یان گیانلەبەران پێشبینی دەکەن ئەوەیە کەلەکاتی فرینی باڵندە یان جوڵەی گیانەوەرێك بەلای ڕاست یان چەپدا و لەپاش وون بوونی بیری لێدەکەنەوە و تەفائول و تەتیری پێدەکەن بەیارمەتی ئەو هێزە نەفسانەییەی کەئەوان لەسەر هەوڵ و بیرکردنەوە لەبارەی فرین و جوڵەی باڵندەو گیانەوەرانی ترەوە هان دەدات، ئیتر ئەو فرین یان ئەوجوڵەیەبینراو بێت یان بیستراو. لەم جۆرە کەسانەدا هەروەك لەپێشەوە ئامازەمان پێکرد هێزی موتەخەیلە بەهێزەو هەریۆیە ئەوهێزە بەیارمەتی ئەوەی کەبینیویانە و بیستویانە ووردەکاری تێدا دەکەن و

لەئەنجامدا جۆرێك لەئیدراك بەدی دێت. هەروەك چۆن هێزی موتەخەیلە لەکاتی خەوتن و پشووی هەستەکانیشدا خاوەنی هەمان ئەم تایبەتمەندیەیەو دەبێتە نێوەند لەنێوان هەستپێکراوی بینراوی مرۆڤ لەبێداریداو لەگەڵ ئەندێشە گەلێکدا کەلەبارەیەوە کردوویەتی کۆدەکاتەوە و لەئەجامداخەون دروست دەبێت، بەڵام غەیب گۆیی شێتەکان بەو هۆ یە وەیەکەپەیوەست بوونی نەفسە گۆیاکانی ئەوان بەجەستەوە لاوازە ئەمەش بەزۆری بەهۆی خراپی میزاج و لاوازی ڕۆحی حەیوانیەوەیە لەمیزاجەکانی ئەواندا هەربۆیە نەفسی شێت بەهۆی دەردو ئێشی ناتەواوی و نەخۆشی ڕۆحەوە ڕۆچووە لەهەستەکانیدا نیە و چ بگات بەوەی کەڕۆحانیەتی تر لەجۆری شەیتانی لەپەیوەست بوونی نەفسی ئەوداپەستان لەسەرجەستە دروستدەکاتو، ئاوێتەی جەستەی دەبێت و، بە هۆی ئەم ڕێگریەوە نەفسی ئەو لاوازدەبێت و سەرئەنجام دەست وەشاندنی جنۆکەلێی و شێت بوون دێتەناویەوە و کاتێکیش توشی حاڵەتی ناوبراودەبێت ئیتر بەهۆی نەخۆشی ولاوازی جەستەو میزاجەوە بێت یان بەهۆی ئازاری نەفسە شەیتانیەکانەوەبێت کەئاوێتەی ئەم دەبن هاتبێت، بۆماوەیەك لەجیهانی هەستی وون دەبێت و لەچرکەساتێکی تایبەتدا دەچێتە جیهانی ڕۆحەوە و لەوجیهانەوە ئیدراك دەکات و هەندێك لەوێنەکان لەنەفسی ئەودا دەنەخشێت ودیسانەوە خەیاڵ وەریان دەگرێتەوە، چونکە لەم حاڵەتەدا بەبێ ئەوەی کەخۆی بیەوێت کۆمەڵێك قسە بەسەر زاریدادێن، بەڵام ئیدراکی غەیبی هەموو ئەوبەشانەی کەباسمان کردن بەشێوەیەکی ئاڵۆز لەخۆی گرتووە و حەق و بەتاڵی تێدا دەست دەکەوێت، چونکە هەرچەندە دونیای هەستیش لەدەست بدەن ئاسۆی پەیوەندیەکی باشتریان بۆ دەست نادات مەگەر دوای ئەوەنەبێت داوای یارمەتی لەتەصەوراتی بێگانە لەزاتی خۆیان بکەن هەروەك چۆن لەڕابوردوودا باسمان کرد، هەربۆیە ئەم جۆرە ئیدراکات و هەستانە درۆیان تێکەڵ دەبێت، بەڵام فالگرەوەکانیش پەیوەندیان بەئیدراکاتە باسکراوەکانەوە هەیە وهیچ پەیوەندیە کیشیان لەگەڵ جیهانی بەریندا نیە، بەڵام ئەم گروپە ئەندێشە زاڵ دەکەن بەسەر ئەوشتەی کەباوەڕیان پێیەتی و

بەپێی ئەو وەهمانەی کەلەبارەی بنەماکانی ئەوپەیوەندیەوە ئیدراك دەکەن ڕێگەی گومان و خەملاّندن دەبڕن و دەیکەنە هۆکارو ئامێرێك بۆغەیب زانین ئەمەلەکاتێکدا بەڕاستی وەهمەکانی ئەوان لەبازنەی جیهانی غەیب ناسیدا ناسوڕێتەوە.

ئەمەش کورتەی زانیاریەکانی پەیوەست بەشتە غەیبیەکان بوو. وەمەسعودیش لە (مروج الزەهەب)ـدا لەم بارەیەوە گفتوگۆی کردووە، بەلاّم نەلێکۆلّینەوەی کردووە و نەبەڕێگەی ڕاستدا ڕۆشتووە و لەقسەکانیشیدا دەردەکەوێت کەمێژوو نوسی ناوبراو شارەزای زانست و مەعریفەکان نەبووە، چونکە هەم قسەی ئەهلی زاراوەو هەم قسەگەلێکی تری بێجگەلەوان دەگێڕێتەوە. هەموو ئەوئیدراکاتانەی کەباسمان کرد لەجۆری مرۆڤدا بوونیان هەیە، هەروەك چۆن عەرەب بۆئاگاداربوون لەڕووداوەکان پەنا دەبەنە بەرکاهینەکان و تەنانەت لەکاتی کێشەو گرفتەکانیشدا دیسانەوە ئەم کاهینانەیان بەنێبژیوان و یەکلاکەرەوەی کێشەکانیان قبولّە، لەکتێبە ئەدەبیەکانی عەرەبدا شیعرو حەکایەتگەلێکی زۆر لەم بارەیەوە دەبینرێت لەسەردەمی نەفامیدا (پێش هاتنی ئیسلام) شقی کوڕی ئەنماری کوڕی نزار و سەتیحی کوڕی مازینی کوڕی غەسان بەناوبانگ بوون سەتیح ئێسقانیان بەجۆرێك جل و بەرگ دەپێچایەوەو دواتر کەلایان دەبرد هیچ ئێسقانێك بێجگە لەکەلەسەرەکەی تێدا نەمابوو. لەچیرۆکە بەناوبانگەکانی ئەودووکەسە ڕاڤەی خەونی ڕەبیعەی کوڕی موزەڕە کەپێشبینی زالّبونی حەبەشەیان بەسەر یەمەندا کردووە و دواتریش هەوالّی دا مەزراندنی حکومەتی موزەڕیان داوە، هەروەها پێشبینی هاتنی پێغەمبەری ئیسلامیشیان کردووە، هەروەها سەتیح خەونی موبدانیان لێکداوەتەوە، کاتێك ئەنەوشیروان شێوەی خەوەکەی لەڕێگەی عبدالمسیحەوە ناردی بۆلای سەتیح و ئەویش چۆنیەتی وێران بوونی وەك ڕاڤەی خەوەکە باسکرد. ئەمانەش هەموویان بەناوبانگن. وەهەروەها لەنێو عەرەبدا عەڕافەکان زۆر بوون و لەشیعرەکاندا ناویان هاتووە هەروەك چۆن شاعیر دەلّێت: (ماناکەی)

بەعەڕافەکەی یەمامەم گوت چارەسەرم بکە – ئەگەر چارەسەرم بکەیت دەتوانم پێت بڵێم پزیشك

وەیەکێکی تریان دەڵێت:

عەرافەکانی یەمامەو نەجدم لەدیاری کردنی ئەوپاداشتەی کەبەمن دەدرێت سەرپشك کرد تاوەکو من چارەسەر بکەن.

گوتیان: خودا شیفات بدات، سویند بەخودا تواناى چارەسەری ئەونەخۆشیەمان نیە کەلەجەستەی تۆدایە.

عەڕافی یەمامە ڕیباحی کوڕی عەجلە و عەڕافی نەجدیش ئەبلەقی ئەسەدی بوون. جۆرێکی تریش لەئیدراکاتی غەیبی ئەوەیە کە لەحاڵەتی نێوان خەوو بێداریدا بۆ هەندێك لەخەڵکی ڕوودەدات و لەم حاڵەتەشدا کۆمەڵێك قسە بەزاریاندا دێت و ئەم قسانە لەوانەیە مەسەلەی غەیبیو، نهێنی بن کەلەحاڵەتی ئاسایدا بەدوایدا بگەڕێن ئیتر باش بێت یان خراپ ئاشکرابکات و ئەم حاڵەتەش ڕوونادات مەگەر لەسەرەتاکانی خەوو لەکاتی جیابوونەوە لەبێداری و لەدەست دانی کۆنترۆڵ لەقسەکردن و، لەم حاڵەتەشدا بەجۆرێك قسەدەکەن کەهەروەك بڵێیت ئەمان تەنها بۆ ووتاربێژی خولقاون و ئامانجیان بیساندن و تێگەیاندنی خەڵکیەلەوقسانە. وەهەروەها کوژراوەکان لە کاتی جیابوونەوەی سەریان لەلاشەیان یان ئەوکەسانەی کەلەت دەکرێن ئەوانیش ئەم جۆرە قسانە بەسەر زاریاندا دێت وەلەبارەی هەواڵی هەندێك لەزاڵمان وستەمکارانەوە کەبەئێمە گەشتووە ئەوەیە کەناوبراوان لەنێوان زیندانیەکانیاندا کەسانێکیان کوشتووە و، لەقسانەی کەئەم کوژراوانە بەرلەگیان دەرچونیان کردوویانە سودێکی گەورەیان بۆپلانی داهاتوو وەرگرتووە و ئەوسەرە بڕاوانەبەجۆرێکی سەیر بوونەتەهۆی بەئاگابوونەوەیان مسلمە خاوەنی کتێبی الغایە هاوشێوەی ئەم مەسەلەی بەم شێوەیە لەکتێبەکەی خۆیدا هێناویەتی: هەرکات مرۆڤێك لەمەشکەیەکی پڕ لەڕۆنی کونجی بکەن و بۆماوەی چل ڕۆژ تێیدا بمێنێتەوە و تەنها هەنجیروکونجی بخوات تاوەکو گۆشتی پێوەنەمێنێت و تەنها ئیسقان و پێستەکەی

بمێنێتەوە ئەوکات ئەلەو ڕۆنەدەری بهێنی و هەوا جەستەی ووشك بکاتەوە و هەرپرسیارێکی لەبارەی ئەنجامی کارەکانیەوە لێ بپرسن تایبەت یان گشتی وەڵام دەداتەوە. ئەم کارەش لەنێشە ناشیرینەکانی جادوو گەرانە، بەڵام شتەسەیرەکانی دونیای مرۆڤایەتی لێوە فێردەبن. هەندێکیش لەخەڵکی هەوڵ دەدەن ئەم ئیدراکە غەیبیە لەڕێگەی ڕیازەتەوە بەدەست بهێنن و هەوڵدەدەن بەهۆی کوشتنی هەموو تواناکانی جەستەی خۆیانەوە جۆرێك لەمردنی دەستکرد دروست بکەن، لەپاشان هەموو شوێنەوارەکانی هێزی جەستەیان کەنەفس بونی پێبەخشیون لادەدەن و ئەوکات ڕۆح لەڕێگەی وویردو دوعا گە لێکەوە تێر دەکەن و، لەم ڕێگەیەوە هێزو ووزەی زۆر دەکەن و بەبرسی کردن و جێگیر کردنی ئەقڵ و ڕاهاتن لەسەر برسیەتی زۆر دێتە ئاراوە و دیارە کەهەرکات مەرگ دابەزێتە سەر جەستە هەست دەیبەستێت و پەردەی بەسەرەوە لادەبرێت و نەفس بەئاگادەبێتەوە لەزات و، جیهانی خۆی و ئەوان ئەم مردنەی هێزی جەستە بەشێوەیەکی بەدەست هاتوو واتە بەڕیازەت، لەبونی خۆیاندا بەدی دەهێنن بۆئەوەی ئەوەی کەلەدوای مردنەوە بۆئەوان ڕوودەدات بەرلەوەی بمرن بەدەستی بهێنن‌و نەفسیان ئاگاداری شتە غەیبیەکان ببێتەوە.

ئەو ڕیازەت کێشانەشی کەسەرقاڵی سیحروجادوگەرین لەم گروپەئەژمار دەکرێن، چونکە بەم جۆرە ڕیازەتانە هەوڵ دەدەن تاوەکو غەیب بزانن و بتوانن لەجیهانی هەستیدا بەئاسانی هەڵسوکەوت بکەن زۆربەی ئەم کەسانەش لەوهەرێمەناموعتەدیلەکانی باشورو باکور و بەتایبەت لەووڵاتی هینددا دەژین وەلەو ووڵاتەدا ئەوانە بەجوکیە ناسراون‌و چەندین کتێبیان لەم بارەیەوە نوسیوە و بەسەر هاتیان زۆر سەرسوڕ هێنەرە، بەڵام صۆفیەکانیش دەست دەکەن بەڕیازەتە ئاینیەکان و لەمەبەستە خراپەکانی جادوو گەران خۆیان بەدوور دەگرن، بەڵکو ئەوان لەکۆمەڵە ڕۆحانیەکانیاندا تەنها ڕوودەکەنە خودا تاوەکو زەوق و حەزی خاوەن عیرفانەکان و یەکتا پەرستان بەدەست بهێنن. صۆفیەکان سەرەڕای ئەو ڕیازەتانەی وەك کوڕ (پەیوەندی بێناوەندی

بونەوەر)برسیەتی‌و زیکر کردن دەبن تاوەکو لەم ڕێگەیەوە ڕۆحی خۆیان تێربکەن، چونکە بەم شێوەیە ئامانجی ئەوان لەم ڕیازەتەدا کامڵ دەبێت لەبەر ئەوەی کاتێك ڕۆح لەسەر زیکر کردن ڕابهێنرێت ئەوالەخوداناسی زیاتر نزیك دەبنەوەو، هەرکات لەو دور بکەونەوە ڕیازەتەکە لایەنێکی شەیتانی وەردەگرێت. هاتنەدی ئامادەباشی غەیب گۆیی و هەڵسوکەوت لەجیهاندا بۆ ئەم گروپە لەصۆفیەکان شتێکی عەرەزیە و لەسەرەتای کارەکەوە ئاهەنگی بۆناکەن و مەبەستیشیان لەڕیازەت ئەم جۆرە شتانە نیە، چونکە ئەگەر بەمەبەستی ئامادەباشیەوە سەرقاڵی ڕیازەت بن ئەوکات ئامانج و هەدەفیان لەم ڕێگەیەدا بێجگە لەخودا دەبێت، بەڵکو ئەگەر بەمەبەستی ئاگاداربون و زانینی غەیب لەم ڕێگەیەدا هەنگاوهەڵبگرن چەندە مامەڵەیەکی پڕ لەزیان دەبێت بۆیان، چونکە وەها ڕێگەیەك لەڕاستیدا وەك هاوەڵ دانانە بۆخودا و هەندێکیش گوتویانە: هەرکەسێك عیرفان (تەصەوف)ی بۆعیرفان بوێت ئەوا بەئامانجی دووەم دەگات واتە (زانین وناسینی شتەکان)، واتەئەوکەسەی کەعیرفان بۆبەدەست هێنانی زانستە دونیاییەکان هەڵبژێرێت لەمەعریفەی خودا دوور دەکەوێتەوە، چونکەعاریفەکان تەنها ڕوولەخودا دەکەن و هەرکاتێکیش شتێکی وەك غەیب زانیان بۆ دروست ببێت ئەوا شتێکی عەرەزیە و زاتی نیەو مەبەستیان نەبووە، تەنانەت زۆرێك لەصۆفیەکان کاتێك ئەم حاڵەتانەیان بۆدێتە پێشەوە لێی دوور دەکەونەوە، بەڵکو ئەوان لەوڕوانگەیەوە ڕوودەکەنە خودا تەنها بۆئەوەی لەزاتی ئەو نزیك ببنەوە.

ڕوودانی ئەم جۆرە حاڵەتانە بۆصۆفیەکان ناسراوە و هەواڵی غەیبی و گومانە ڕاستەکان کەبەبیری ئەواندادێت پێی دەڵێن فەراسەت و کەشف و کارو کردەوەکانیان لەبونەوەراندا (خەواریقی نەریت)پێی دەڵێن کەرامەت[٢٠٩] کەناتوانرێت ئەم جۆرەحاڵەتانە لەماندا (عاریفەکان)ئینکاری بکەین، بەڵام مامۆستا ئەبو ئیسحاقی ئە سفراینی و ئەبو محمدی کوڕی ئەبو یەزیدی مالیکی و تەنانەت فەقیهەکانی تریش ئینکاری ئەم شتەیان

---

[٢٠٩] کەلەسەر دەستی غەیری پێغەمبەردا ڕوودەدات کەپیاوچاك بێت.

کردووە لەبەر ئەوەی مەبادا ئەم شتە تێکەڵ بەموعجیزە بکرێت و موتەکەلیمانیش لەم بارەیەوە پشت بەستون بەم تیۆرەن کەدەتوانرێت بەهۆی تەحەدیەوە موعجیزە لەشتەکانی تر جیابکەینەوە و ئەمەش بەبەڵگەی پێویست دەزانن، واتە لەموعجیزەدا تەحەدی هەیەو لەشتەکانی تردا تەحەدی بوونی نیە. لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە کەپێغەمبەر (ص)فەرمویەتی: (لەنێو ئێوەدا گومان ڕاست هەن کەعومەر یەکێکە لەوان). لەم جۆرە گومانانەی کەبەڕاست دەرچوون بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر ڕوویان داوە و بەڵگەش قسەکەی حەزرەتی عومەرە خودای لێ ڕازی بێت کە گوتوویەتی: (ئەی ساریە کێوەکە کێوەکە)[٢١٠] کەقسەی لەگەڵ ساریەی کوڕی زەنیم دا کردبوو کەفەرماندەی هەندێك لەسوپای موسوڵمانان بوو لەعێراقدا و، لەکاتی شەڕدا لەگەڵ بێباوەڕان کەوتبووە کێشەوە و ویستی پاشەکشێ بکات و حەزرەتی عومەریش لەمەدینەوە بانگی کرد ئەی ساریەئەی ساریە بڕۆرەسەرئەوشاخەی کەلەنزیکتانەوەیە، ئەمەش لەدوای ئەوەبوو کەساریە لەنوێژی هەینی کەلەگەڵ سەربازەکانیدا ئەنجامی دەدا کتوپڕهاواری کردو داوای یارمەتی لەخەلیفە عومەرکرد و خەلیفەش لەوکاتەی لەسەر مینبەر بوو بانگەکەی بیست و هاواری کرد ئەی ساریە بچنە سەر کێوەکە.. ئەوەبوو ساریەش هاوارەکە خەلیفەی بیستو بەگوێی کردوخۆی و سوپاکەی لەکێشەکە دەرباز بوون!! ئەم چیرۆکەش زۆر بەناوبانگە.

ئەم حاڵەتەش بۆ حەزرەتی ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت ڕووی داوە کاتێك لەوەصیەتەکەی خۆیدا چەند ویسقێك لەخورمای باخەکەی خۆی بەخشیبووە حەزرەتی عائیشەو پێی گوت بڕۆسەردارخورماکان و، بیان چنە. ئەمەش بۆئەوەی ببێتە بەڵگەلەسەر وەصیەتەکە(بۆهەموو میرات بەرەکان)حەزرەتی ئەبوبەکر لەناو قسەکانیدا گوتی: ئەوانە دووبراو دووخوشکی تۆن، حەزرەتی عائیشەش گوتی: خوشکێکیان ئەسمایە و ئەویتریان کێیە؟ خەلیفە ئەبوبەکریش گوتی: کچی خاریجەی کوڕی زەید

---

[٢١٠] یاساریە الجبل الجبل.

سکپڕە گومان دەکەم منداڵەکەی کچ بێت، ئەوەبوو پاش لەدایك بوونی منداڵەکە کچ بوو قسەکەی ناوبراو بەڕاست گەڕا، ئەم بابەتەش لەکتێبی مۆتائی ئیمام مالیکدا لەباسی ئەوەی کە بۆ بەخشین دروست نیە هاتووە. هاوشێوەی ئەم ڕووداوانەش بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (ص)و پیاوچاکان و پەیڕەوانی ئەوان زۆر ڕوویانداوە، بەڵام ئەهلی تەصەووف دەڵێن لەڕۆژگاری پێغەمبەرایەتیدا کەرامەتی هاوەڵان زۆر کەم بووە، چونکە بۆ مورید لەبەردەم پێغەمبەردا حاڵەتێك نامێنێتەوە. تەنانەت ئەمان دەڵێن کەمورید هەرکات بێتە شاری مەدینەوە و تاوەکو لەوشارەدابێت حاڵەتەکانی کەشف و کەرامەتی لێ دەسەندرێتەوە و هەرکە لەوشارە چویە دەرەوە ئەوکات دەتوانێت کەشف و کەرامەت بکات. خوداش ڕێنمایمان بکات و ڕێگەی ڕاستمان نیشان بدات.

## بەشێك

گروپێك لەم موریدانەی ئەهلی تەصەووف خەڵکانێکی باڵوڵ سیفەتن و کەم ئەقڵ دەردەکەون زیاتر لەشێتەکان دەچن تاوەکو لەئاقڵەکان، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، مەقامەکانی وەلی بوون حاڵەتی صدیقەکان لەبارەیانەوە ڕاست دەرچووە کەسانێك لەئەهلی زەوق کەلەوان تێدەگەن ئەم جۆرە حاڵەتانە لەوانەوە فێر دەبن هەرچەندە ئەو گروپە ناچارن و موکەلەف نابن و، لەهەمان کاتیشدا هەر هەواڵێك لەبارەی غەیبەوەبزانن دەیگێڕنەوە، چونکە ئەو گروپە پابەندی هیبچ شتێك نین، هەربۆیە لەم بارەیەوە بەبێ هیچ تەکەلوفێك قسەدەکەن و شتە سەرسوڕهێنەرەکان باس دەکەن و هەرچەندە فەقیهەکان ئینکاری پلەو پایەیان دەکەن، چونکە تەکلیفیان لەسەرنیەو پێیان وایە وەلی بوون تەنها بەپەرستش بەدی دێت، بەڵام ئەم بیر کردنەوەیە هەڵەیە، چونکەخودا چاکەوبەخششەکانی خۆی بەهەرکەسێك کەبیەوێت دەبەخشێت کەواتەهاتنە دی وەلی بوون لەسەر پەرستش و شتی تر نەوەستاوە و هەرکات نەفسی گۆیای ئادەمی بوونی

هەبێت خودا هەربەهرەیەکی کەخۆی پێی باشبێت پێی دەبەخشێت. وەنەفسی گۆیای ئەم گروپە وەك شێتەکان لەناونەچووە و خراپ نابێت، بەڵکو ئەمان ئەو ئەقڵەی کەتەکلیف پەیوەستە پێوەی لەدەستیان داوە کەسیفەتی تایبەتی نەفسە و بریتیەلەزانستە پێویستە کانی مرۆڤ کەدیدو ئەندێشەی پشت بەستووە بەوان و ئاگاداری بارودۆخی ژیان و چاککردنی شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی دەبێت.

وەلەوانەیە ئەگەر کەسێك بارو دۆخی ژیان و گوزەرانی خۆی بناسێت ئەو کات هیچ بیانویەکی بۆ وەرگرتنی تەکلیفەکان کەتایبەتە بەرۆژی دوایی نامێنێتەوە، بەڵام نەبونی ئەم سیفەتە دەبێتە هۆی ئەوەی کەنەفسی خۆیان لەدەست بدەن و نابێتەهۆی ئەوەی کەحەقیقەتی بوونی خۆیان لەبیر بکەن هەربۆیە حەقیقەتی زاتی ئەو هەیە، بەڵام لەئەقڵی تەکلیفی کەهەمان ناسینی بارودۆخی ژیانە بەهرەمەندنیە. ئەم شتەش مەحاڵ نیەو هەڵبژاردنی بەندەکان لەلایەن خوداوە لەسەر ئەمە نەوەستاوە کەئاشنای تەکلیفەکان بن. وەهەرکات ئەم شتە ڕاست بێت دەبێت بزانین کەحاڵەتی ئەم گروپە لەگەڵ شێتەکاندا تێکەڵ دەبێت کەنەفسی گۆیای ئەوان لەناودەچێت و دەچنە ڕیزی چوارپێکانەوە و بۆناسین و جیاکردنەوەی ئەوان لەیەکتر نیشانە گەلێك هەن وەك:

١- ئەم باڵولّ سیفەتانە بەڕێگەیەکی تایبەت دەیانناسینەوە کەهیچ کات خاڵی نین لەوڕێگایانە وەك زیکروپەرستش، بەڵام ئەم زیکرو پەرستشە بەپێی مەرجە شەرعیەکان نیە، چونکە هەروەك گوتمان ئەوان پابەندی مەرجی تەکلیف نین، بەڵام شێتەکان بەهیچ ڕێگەیەك ناناسینەوە

٢- باڵولّ سیفەتان هەرلەسەرەتای منداڵیەوەبەبێئەقڵی دەناسرێن پێکهاتەیان لەسەر ئەم شێوەیەو، بەڵام شێتەکان ئەوکات کەهەندێك لەژیانیان تێپەڕدەکات بەهۆی ئەو هۆکارە سروشتیانەی کەبەسەریاندا دێت شێت دەبن. هەربۆیە دوای ئەوەی کەشێت دەبن و نەفسی گۆیا یان خراپ دەبێت و دەکەونە گێژاوی سەرگەردانی و نائومێدیەوە.

٣- باڵوڵ سیفەتان لەناو خەڵکیدا کاری باش و خراپ دەکەن و شتی سەرسوڕهێنەر ئەنجام دەدەن، چونکە هەڵسوکەوتی ئەم گروپە بەهۆی نەبوونی تەکلیفەوە لەسەریان مۆڵەت لەکەس وەرناگرن، بەڵام شێتەکان هیچ جۆرە دەستوەردانێکیان لەبونەوەردا نیە. ئەمەش بەشێك بوو کەناوەڕۆکی قسەکەی ئێمەی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. خوداش ڕێنماکاری مرۆڤەبۆسەر ڕێگەی ڕاست.[٢١١]

## بەشێك

هەندێك کەس پێیان وایە بۆدەرك کردنی شتە غەیبیەکان بەبێ وون بوونی کەسەکە لەجیهانی هەستی زانیاری و هۆکارگەلێکی تر بوونیان هەیە. ئەستێرەناسان لەودەستەیە دەژمێردرێن کەزانیاری و پێشگۆییەکانیان لەسەر کاریگەری بارودۆخی ئەستێرەکان وەستاوە لەسەر یەکتری، چونکە پێیان وایەئەوەی شوێنی ئەستێرەکان لەئاسمانداو کاریگەریان لەتوخم و ئەودەرئەنجامانەی کەئاوێتەبوونی نێوان تەبعەکانیان بەهۆی بەرابەریەوە دێتەدی دەیخوازێت و کاریگەرە لەپێکهاتەو میزاجی هەوادا و مانای ڕووداوو بارودۆخ گەلێك دەگەیەنێت کەدەتوانرێت ئاشکرا بکرێن. ئەم گروپە بەهیچ شێوەیەك بەهرەیەکیان لەغەیب گۆیی نیە، بەڵکو هەمیشە پێشگۆییەکانیان گومان گەلێك و خەملاندنێکە کەلەسەر کاریگەری ئەستێرەو تایبەتمەندی میزاجێك وەستاوە کەبەهۆیانەوە لەهەوادا بەدی دێن و لەسەرئەم زانیارەیە ئەستێرەییانە گومانەکانیان زۆردەکەن وئەوکات هەواڵدەری ئەم ووردەکاریانە لەبارەی شتەناسەرەکیاکانی ئەم جیهانە ئاگاداردەبنەوە، هەروەك چۆن بەتلیموس لەم بارەیەوە گفتوگۆی کردووە. ئێمەش بەتاڵ بوونەوەی ئەم جۆرە پێشگۆییانە بەویستی خودا ئاشکرادەکەین. ئەم شێوازەی پێشگۆیی بابڵێین سەرکەوتوش بێت، بەڵام کۆتایی و دەرئەنجامەکەی هەر

---

[٢١١] (وَاللهُ يَهدِي إِلى صِراطٍ مُستَقِيم).

خەملێنراو دەبێت و هیچ پەیوە ند یەکی بەو مەسەلە غەیبیانەوە نیە کەباسمانکردن. لەم گروپەش کۆمەڵێك نەخوێندەوار هەن کەبۆ دەرهێنانی غەیب و ناسینی بونەوەرە پیشەییەکان دەریان هێناوە و پێیان گوتووە هێڵی لم، ئەم ناوەش بەمادەیەك دەڵێن کەکاری خۆی دەکات. کورتەی ئەم پیشەیە ئەمەیەکە ئەمان لەچەندین خاڵەوە کێشە دروستدەکەن کەخاوەنی چوار پلەیەو شێوەناوبراوەکان بەپێی جیاوازی و جێگیری پلەکان لەتاك و جوتدا جیاوازیان هەیەوبەشانزەشێوە کۆتاییان دێت، چونکە ئەگەر هەموو ئەو شێوانە تەنها تاك یان جوت بن ئەوکات دەبنە دووشێوە وەئەگەر تاك تێیاندا لەیەك پلەدا بێت چوار شێوە دروستدەبێت وەئەگەر تاك لەدوو پلەدابێت شەش شێوەیەو وەئەگەر لەسێ پلەدابێت چوار شێوەدەبێت. کەکۆی هەموویان دەبێتە شانزە شێوەیەو هەریەکەیان ناوێکی تایبەتیان لێنراوە و بەپێی سەعدو نەحسی ئەستێرەکان دابەشیان دەکەن و بۆهەموویان شانزەخانەیان داناوەوپێیان وایە گونجاوە لەگەڵ بنەمای سروشتەوە، دەڵێن کەگوایە مەبەستیان دوانزە بورجەکەو چوار مێخەکەی بێت وەلەخانەی هەرشێوازێکدا نیشانەی بەخت ئیتر باش بێت یان خراپ دیاریان کردووە و هەریەکێکیشیان مانای یەکێك لەبونەوەرانی جیهان دەگەیەنێت و لەکۆی ئەمانەش یاساگەلێکی هونەریان پێکهێناوە کەبنەڕەتەکەیان لەسەر هونەری ئەستێرەناسیە و لەجۆری داوەری و دەرهێنانی ئەو پەیڕەوی دەکەن، بەڵام هەروەك بتلیموس پێی وایە بریتین لەحوکمەکانی ئەستێرە ناسی پشت بەستو بەدەلالەتە سروشتیەکانە، بەڵام دەلالەتی ئەم هونەرە دانراوو دروستکراوە.

لەو ڕووەوەی کەبەتلیموس لەمەوالیدو یەکجێگە بوونی دوو ئەستێرەدا کەبەبیرو بۆچونی ئەو لەشوێنەواری ئەستێرەکان و بارووژخی فەلەکیە لەجیهانی توخمەکاندا گفتوگۆی کردووە و ئەستێرەناسانی دوای ئەو لەمەسەلەی دەرهێنانی نهێنیەکانی غەیب و بەخت و تالیعە(زەمایرەکان)دا دابەشکردنیان بەپێی خانەکانی فەلەك قسەی لەسەر کردووە ولەحوکمی ئەم خانە ئەستێرەییانە لەبارەی ئاشکراکردنی نهێنیە غەیبیەکان

وبەخت و تالیعەوە حوکمیان کردووە و بەتلیموسیش لەبارەی خانە ئەستێرەییەکانەوە گفتوگۆی کردووە. وەپێویستە ئەوەبزانین کەزەمایرەکان لەشتە نەفسیەکانن و پەیوەست نیە بەجیهانی توخمەکانەوە هەربۆیە نەشوێنەوارێکی ئەستێرەو نەبارودۆخی فەلەکی مانای ئەو دەبەخشن هەرچەندە هونەری مەسەلەکانی غەیب و تالیع لەڕووی بەڵگەهێنانەوە بەئەستێرەکان و بارودۆخی فەلەکیەوە پەیوەست ببێت بەپیشەی ئەستێرەناسیەوە، بەڵام وەها پەیوەندیەك لەمەفهوم ومەدلولی سروشتی ئەودا بوونی نیە هەربۆیە هەرئەوەندەی کەئەهلی خەت (رمالان)دروستبون لەئەستێرەو بارودۆخە فەلەکیەکان لایاندا، چونکەبەکارهێنانی ئامێرو هۆکار و ڕاستکردنەوەی ئەستێرەکان لەڕێگەی حیساباتە ئەستێرەناسیەکانەوە بۆ ئەمان دژوار بووە و لەبری ئەم جۆرە کارو شێوە خەتیە باسکراوانەیان دەرهێناو بەشانزەخانەلەخانەومێخەکانی فەلەکیان داناوە وبەپێی هەسارەکان بەجۆرەکانی سەعد و نەحس ولێك ئاڵاو دابەشکردووە و لەهەموو بەرابەرکان تەنها تەسدیسیان بەپێویست زانیوە حوکمە ئەستێرەییەکانیان لەسەر ئەو هێناوە هەروەك چۆن لەمەسەلە کاندا کاردەکەن، چونکە هەروەك چۆن لەپێشەوە باسمانکرد دەلالەتی هەریەکە لەو دووانە ناسروشتیە.

وەئەم پیشەیە زۆرێك لەخەڵکی لەشارەکاندا کرودیانە بەهۆکارێك بۆبەدەست هێنانی ژیان و گوزەران و کردوویانە بەچەند بەشێکەوە هەروەك چۆن (زناتی)لە خێڵی زناتەلەمەغریب چەندین کەسی تریش لەم بوارەدا کتێبیان داناوە. هەندێك جار کەسانێکی خاوەنی ئەم پیشەیەبەکاری دەهێنن بۆدەرککردنی غەیب و هەستەکان ئەمەش بەوورد بوونەوە لەشێوەی هێڵەکانی ناوبراو و خۆیانی پێوە سەرقاڵ دەکەن و ئەوکات حاڵەتێکی ئامادەباشیان بەسەردا دێت هەروەك ئەوکەسانەی کەبەفیترەت و سروشتیان لەسەر ئیدراکی غەیب ئافرێنراون هەروەك چۆن دواتریباسی دەکەین.

ئەم جۆرەکەسانە لەنێو ئەم خاوەن پیشانەدا لەخەڵکانی ترباشترن. هەندێك جار خاوەنانی ئەم هونەرە پێیان وایە کەبنەڕەتی ڕمل و خەت لەپێغەمبەرایەتیەکۆنەکانی ئەم

جیهانەیە ئەمەسەرەڕای ئەوەی کەوەك هەموو پیشەکانی تر دەیدەنە پاڵ دانیال و ئیدریس و هەندێك جاریش بانگەشەی ڕاستیەتی دەکەن و بەگوتەکەی پێغەمبەر بەڵگە دەهێننەوە کەفەرموویەتی: (پێغەمبەرێك هێڵێکی کێشاوە و ئەوهێڵەش بۆهەرکەسێك سازگاردەبوو ئەوهێڵەش بەم شێوەیەبووە)لەم فەرموودەیەدا بەڵگەیەك لەسەر ڕەوایەتی خەت و ڕمڵ (زیخ یان لم)نیە هەروەك چۆن هەندێك لەبێ خەبەران گومانیان کردووە، چونکە مانای فەرموودەکەئەوەیە کەپێغەمبەر هێڵی کێشاوەو لەکاتی هێڵکێشانەکەشیدا وەحی بۆهاتووە ئەمەش دوور نیە کەلەکاتی هاتنی وەحی بۆپێغەمبەر ئەم کارەی ئەنجام دابێت کەواتە ئەوهێڵە بەلای هەموو کەسێکەوە ڕاست بووە، واتە لەنێوان هەموو هێڵەکاندا ئەو هێڵە ڕاست دەردەچوو.

بەهۆی ئەوەی ئەوپێغەمبەر نەریتی وابوبێت لەکاتی وەحیدا خەت بکێشێت و دابەزینی وەحی هاوکاری بوو، بەڵام ئەگەر تانها خەتی دەکێشاو وەحی بۆنەدەهات وەها خەتێك ڕاست نەبوو، مانای فەرموودەکە بەم شێوەیە، خوداش داناترە، چونکەپێغەمبەران (ص)لەدەرککردنی وەحیدا لەیەکتر جیاواز بوون. خوداش دەفەرێت (هەندێك لەپێغە مبەران لەپێشترن لەهەندێکی تریان)[212] هەروەك چۆن لەهەمان سەرەتای دابەزینی وەحیەوە بۆسەرهەندێك لە پێغە مبەران فریشتە قسەیان لەگەڵدا دەکات بەبێ ئەوەی کەخۆیان ئاگایان لەخۆیان بێت و لەگەڕاندابن بەدوای وەها ڕێگەیەکداو خۆیان بۆوەحی ئامادەبکەن ئاگاداردەبن، هەربۆیە بۆئەوان لەشتەکانی پەیوەست بەمرۆڤەوە پێشهات گەلێك ڕوودەدەن وەك ئەوەی کەیەکێك لەتاکەکانی ئومەتەکەیان لەبارەی کێشەیەك یان تەکلیفێکەوە یان وەك ئەمان پرسیارێك دەکات ئەوکات ئەم جۆرە پێغەمبەرانە ڕوودەکەنەجیهانی ڕەبانی ودەتوانن مەبەستەکانیان ئاشکرابکەن ئەو کێشەیان ئەوتەکلیفە لەخودا داوادەکەن، لێرەدا لەودابەشکردنەی کەکردمان (واتەدووجۆر وەحی)دەتوانین جۆرێکی تریش بەدەست بهێنین ونەگەرێت وجۆری سێیەم پەیدابێت و

---

[212] (وَفَضَّلنا بَعضَهُم عَلى بَعض) س البقرة ئا ٢٥٤.

وەڕاست بگەڕێت، چونکە وەحی هەندێك جاربەوجۆرە ڕوودەدات کەپێغەمبەربەهیچ شێوەیەك ئامادەباشی نیە و چاوەڕێی ناکات هەروەك باسمان کرد و هەندێك جاریش کاتێك ڕوودەدات کەپێغەمبەر بەهۆی هەندێك لەحاڵەتەکانەوە ئامادەباش دەبێت بۆئەو وەحیە، هەروەك چۆن لەکتێبی ئیسرائیلیەکاندا هاتووە کەیەکێك لەپێغەمبەران لەڕێگەی بیستنی هەندێك لەئاوازی خۆشەوە ئامادەی دابەزینی وەحی دەبوو بۆسەری. ئەم گێڕانەوەیەش هەرچەند لەوانەیە ڕاست نەبێت، بەڵام دووریش نیە وابێت، کەواتە خودا هەرکاتێك بیەوێت شتانێك تایبەت دەکات بەپێغەمبەرەکانیەوە. لەبارەی هەندێك لەگەورەکانی ئەهلی تەصەووفەوە گێڕدراوەتەوە کەبۆ چونەناوجیهانی غەیب و کەشف و کەرامە تەوە گوێیان لەموسیقا گرتووە و هەست و ئیدراك و هەستەکانیان لەدەست دەدا و دەچونە جیهانی تەجەڕوودەوە و دەچوە پلەیەکەوە کەمێك لەپلەی پێغەمبەر نزمترە. هەرکەسێك لەئێمە پلەیەکی دیاری کراوی هەیە[٢١٣]. وەهەرکات ئەم شتەبسەلمێت (واتە پشت بەستن بەموسیقابۆ گەڕانەوە بۆ جیهانی کەشف وکەرامەت)ئێمەش لەپێشەوە گوتمان کەسانێك لەنێوان خاوەنانی خەت و ڕمڵ دا هەن بۆئاشکرا کردنی غەیبی بەهەموو هەستی خۆیانەوە دەڕواننە هێڵ و شێوەکان، لەم حاڵەتەشدا بەهۆی لێبونەوە لەهەموهەستەکان، ئیدراکەغەیبی و ناخیەکان بۆیان ڕوودەدات و ئیدراکاتە مرۆییەکانیان دەگوڕدرێت بەهەستی ڕەبانی (باسی ئەم حاڵەتەشمان لەپێشەوە کرد)، لەم شێوەیەدا وەها کارێك جۆرێکەلەکاهینی وەك: ووردبوونەوە و سەیرکردنی ئێسقانەکان وسەیرکردنی ئاوی ناوتاسەو سەیر کردنی ئاوێنە کەپێچەوانەی ڕەوشتی ئەوکەسانەیە کەلەم بارەیەوە کاروبارە پیشەییەکان بەبەس دەزانن و بەپێشبینی و خەملاندن پێشگۆیی دەکەن ئەمە لەکاتێکدا هێشتا هەستە جەستەییەکان لەمان جیا نەبووەتەوە و لەسەر ڕێڕەوی گومان و خەملاندنەکاندا دەسوڕێتەوە. هەندێك جار لەوانەیە حاڵەتی هەندێك لەپێغەمبەران لەپلەو پایەی پێغەمبەریدا بۆتێگەشتن لەگووتاری فریشتەکان بەم جۆرە بێت کەبەهێڵکاری

---

[٢١٣] (وَمَا مِنَّا إِلَّا لَهُ مَقَامٌ مَّعلُوم) س صافات ئا ١٦٤.

ئامادەی ئەوپلەیەبێت، هەروەك چۆن كەسانی تری بێجگە لەپێغەمبەرانیش بۆئیدراكی ڕۆحانی و تەجەڕوود لەهەستە مرۆییەكان خۆیان بەهۆی ئەم شتانەوە ئامادەباش دەكەن، بەڵام جیاوازی ئەمانە ئەوەیەكەئیدراكی وەها كەسێك تەنها ڕۆحانیە، بەڵام ئیدراكی ئەو پێغەمبەرە فریشتەییە كەبەهۆی وەحیەوە لەلای خوداوە بەدی دێت، بەڵام مەبادا واگومان ببرێت كە پلەكانی ئەهلی صەناعەتی خەت كەئیدراكیان لەخەت و خەملاندن تێپەڕناكات دەتوانرێت بەراوردیان بكەین بەمەقاماتی پێغەمبەران، هەرگیز ئەمەگونجاونیە، چونكە پێغەمبەران غەیب گوتن و قوڵبونەوەیان لەم جۆرەمەسەلانەدا مۆڵەتیان بەهیچ تاكێك نەداوە و بەگونجاویان نەزانیوە لەگەڵ شەرعدا وە ئەو فەرموودەیەشی كەدەفەرمێت: (پێغەمبەر خەتی دەكێشا)ئیتر بەپێی تێگەیشتنی ئێمە كەئەو لەوكاتەی كەوەحی بۆهاتووە نەریتی وابووە كەخەت بكێشێت یان هەڵبژاردنی خەت ئاماژەیە بەگەورەیی و پلەی باڵای ئەو دیسانەوە ناتوانین بیكەینە بەڵگە لەسەر مەشروعیەتی ڕەمڵ (زیخ)، بەڵكو ئەگەر فەرموودەكە بەم شێوەیە ڕاڤەبكەین كە پێغەمبەری ناوبراو بەهۆی خەت كێشانەوە ئامادەی وەرگرتنی وەحی دەبوو، ئەوكات هیچ پەیوەندیەك لەنێوان پێغەمبەروكاركردن بەلم و ڕەمڵابوونی نەبوو. كەواتە لەحەدیسەكەدا هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر بەپیشەكردنی خەت و ڕەمڵ بۆغەیب بینی، هەروەك چۆن ڕەماڵەكان كردوویانەتە پیشەی خۆیان.

وەئەگەر هەندێكیشیان ئاوێتەی ئەم هونەرە بوون و پێیان وایە كەكردەوەی پێغەمبەری ناوبراو شەرعە ئەمەش بەبیرو باوەڕی ئەوانەی كەدەڵێن شەریعەتی گەلانی پێش ئێمە دەبێتە شەرعیش بۆئێمە كەواتە كرداری ڕەمڵ مەشروعە، دەبێت ئەوەبڵێین كەئەم بەڵگە هێنانەوە یە نابێتە هۆی مەشروعیەتی ئەو، چونكە یاسادانان و بەدیهێنانی شەریعەتەكان لەتایبەتمەندی پێغەمبەرە نێردراوەكانە كەشەریعەتیان بۆگەلان هێناوە و حەدیسی ناوبراویش نابێتە بەڵگە بۆئەم مانایە، بەڵكو تەنها ئەم مانایەدەگەیەنێت كەوەها حاڵەتێك بۆهەندێك لەپێغەمبەران بەدی دێت گریمانی ئەوەش هەیە كەئەم كارە

نامەشروع بێت. کەواتە خەت و ڕەمڵ نەیاسایەکی تایبەت بووە بۆئومەتەکەی و نەچەمکێکیی گشتگیریش بووە بۆ نەتەوەکەی. بەڵکو فەرموودەکە مانای ئەوە دەگەیەنێت کەخەت کێشان حاڵەتێکی تایبەت بووە و بۆهەندێك لەپێغەمبەران بەتایبەت ڕووی داوە و ئەوحاڵەتە لەمانەوە نەگوازراوەتەوە بۆمرۆڤ، ئەمەبوو کۆتا گوتاری ئێمەلەبارەی لێکۆڵینەوە لەم بابەتە، خوداش ئیلهام بەخشی مرۆڤەبۆ چاکە. کاتێك ئەم ڕمالانە ئەیانەوێت بەگومانی خۆیان پێشگۆیی بکەن کاغەزێك یان کەمێك زیخ یان ئارد هەڵدەگرن و لەشێوەی خاڵدا خەتگەلێك لەسەری دەکێشن و بەپێی ژمارەی هەرچوار قۆناغەکە و ئەم کارە چواردووبارە دەکەنەوە و لەئەنجامدا شانزە دێڕ دروست دەبن، لەپاشان خاڵەکان دوو دوو لادەبەن و، ئەوەی لەهەردێڕێك دەمێنێتەوە ئیتر تاك بێت یان جووت بەشێوەیەکی ڕێك لەپلەی خۆیدا دایدەنێن و لەئەنجامدا چوار شێوەدروست دەبێت کەدەیانخەنە دێڕێکی یەك لەدوای یەکەوە، لەپاشان لەلای پانیەکەیەوە چوار شێوەی تر دروست دەکەن. ئەم شێوانە بەپێی ئەو پلەو شێوازەی کەلەبەرامبەریەوەیەتی و لەڕووی فەراهەم هاتنی جووت یان تاك لەو دوانە دروست دەکەن هەربۆیە لەهەردێڕێکداهەشت شێوە دادەنرێت. ئەوکات لەژێرهەریەکەلەم دوو شێوەیەوە شێوەیەکی تر دروست دەکەن بەوپێیەی لەهەریەکە لەپلەکاندا دووشێوەی جووت یان تاك دروست دەبن و لەئەنجامدا چوار شێوەی تر لەژێریەوە دروست دەبن، لەپاشان لەژێر ئەم چوار شێوەیەشدا دووشێوەی تر دروست دەبن، ئەوکات لەژێر دووشێوەی ناوبراودا شێوەیەك دروست دەکەن و لەپاشان ئەم شێوەی پانزەیەمە لەگەڵ شێوەی یەکەمداشێوەیەك دروست دەکەن کەکۆتایی شانزە شێوەکەیە ئەوکات ئەوخەتانەی کەکێشاویانە ووردەکاری تێدادەکەن و، هەموو شێوەکان بەپێی سەعدو نەحس کەلەڕوانگەی بنەڕەت و شێوازو تەقابول و کاریگەری ئاوێتەبوونەوە مانا دەبەخشێت وەردەگرن و سەرئەنجام داوەریەکی نالۆژیکی دەکەن.

ئەم پیشەیەلەشارە جەنجاڵەکاندا فراوان بووە و کتێبی لەبارەوە دانراوە و پیاوانی گەورە لەپێشینان ناوبانگیان تێدا دەرکردووە، بەڵام هەروەك بینرا پیشەی ناوبراوپشتی بەهیچ لۆژیکێك نەبەستوە و دروستکراوی هەواوئارەزووی تاکەکانە. ئەولێکۆڵینەوەیەی کەپێویستە لێرەدا بیهێنین بریتیە لەوەی کەغەیب بینیەکان لەڕێگەی هونەرو پیشەوە دەرك ناکرێن بێجگەلەکۆمەڵێك خەڵکی تایبەت نەبێت، کەبەسروشت توانای ئەوەیان هەیە لەجیهانی هەستیدا پەنهان ببن و بچنە جیهانی ڕۆحەوە و ناشزانرێت چۆنە. هەربۆیە هەموو ئەستێرە ناسان ئەم بەشە بەزوهرەیی ناوزەد دەکەن، وەك دانەپاڵێك بۆئەستێرەی زوهرە، کەدەڵێن ئەم ئەستێرە لەبنەڕەتی مەوالیدی ئەماندا مانای دەرك کردنی غەیب دەگەیەنێت، هەربۆیە خەت کێشان و شتەکانی تری پەیوەست بەغەیب گوتن ئەگەر بەوجۆرەبێت کەفالٚ بینەکەئەم تایبەتمەندیەی هەیە و ئەم شتانە بەومەبەستەوە هەڵدەبژێرێت کەلەتێروانین بەخاڵەکان یان ئێسقانەکان یان هاوشێوەی ئەمانەهەست سەرقاڵ بکات تاوەکو نەفس لەچرکەساتێکی تایبەتدا بگەڕێتەوە جیهانی ڕۆحانیەت، ئەوکات ئیشی ئەو وەك ووردەبەردبینین و ووردبوونەوە وسەیرکردنی دڵی گیانەوەران و ئاوێنە بینی دەبوو هەروەك لەپێشەوە باسمان کرد، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەو بەم شێوەیە نەبێت، بەڵکو ئاوازی ئەوە دەخوێنێت کەبەم پیشەیە ئاگاداری غەیب ببێت و بەکارێکی بەسودی بزانێت و، لەم هەلومەرجەشدا گوفتارو کرداری بێ سودو بەهادەبێت.خوداش بۆهەرکەسێك کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات.

نیشانەی سروشتی ئەوانەی کەبەفیترەت بۆزانینی شتەشاراوەکان دروست کراون ئەوەیەکەئەم گروپەکاتێك کەئەیانەوێت بوونەوەران بناسن لەحاڵەتی سروشتی خۆیان دەردەچن و وەك شێوەی وەنەوزەکوتەو باوێشك دانیان لێدێت و، هەروەك بڵێی ئاگاداری جیهانی هەستی نین، ئەمەش لەکەسێکەوە بۆکەسێکی تر لەوجۆرە کەسانەدا دەگۆڕێت و کەم و زۆر دەکات. وەهەرکەسێك ئەم نیشانانەی تێدا نەیەتەدی بەهیچ شێوەیەك دەرکی غەیب ناکات و لەوکەسانەیە کەئەیەوێت ڕەواج بەدرۆکەی خۆی بدات.

## بەشێك

گروپێکیش لەپێشگۆیان و غەیب بینان هەن کەبۆدەرهێنانی شتەغەیبیەکان یاسا گەلێکیان داناوە کەنەوەك گروپی یەکەمن کەئیدراکاتی نەفس و ڕۆحانیەتیان هەبێت وەك بەتلیموس دەڵێت: لەڕیزی ئەو گومان کردنانەدان کەلەسەر کاریگەری ئەستێرەکان وەستاون ونەلەوخەملاً ندنانەن کەکاهین و فالگیرەکان سودی لیّ وەردەگرن. بەڵکو کارەکەیان جۆرێکەلەهەڵەکاری و خەڵەتاندن کەخەڵکی سادەو نەخوێندەوار دەکەوێتە داویانەوە. منیش لێرەدا تەنها بابەت گەلێك باس دەکەم کەدانەرو نوسەرەکان لەکتێبەکانی خۆیاندا باسیان کردووە و خەڵکە هەڵکەوتووەکان ئارەزوی زانینیان دەکەن. لەو یاسایانەش جۆرێکە لەبیرکاری کەبە (بیرکاری نیوە)ناساندویانەو لە کۆتایی کتێبی سیاسەتی باسکراوی ئەرستۆداهاتووە، کەدەتوانین بەویاسایانە لەوجەنگانەی کەلەنێو پاشاکاندا ڕوویانداوە سەرکەوت و لەشکست خواردوو جیا بکەینەوە. شێوازی کارەکەش بەم شێوەیە: پێویستە ئەوپیتانەی کەلەناوی یەکێك لەو دوو پادشایەدا هەیە بەپێی ڕستەکان بژمێرن و ئەم هەژمار کردنەش هەمان ئەو حیسابەیە کەلەپیتە ئەبجەدیەکاندا هاتووە لەیەکەوەتاهەزار، یەکان و دەیان و سەدان و هەزاران.

وەکاتێك ناوی یەکێکیان هەژمار بکرێت و ژمارەیەکی لێوە بەدەست بێت، ئەوکات دەبێت ناوی ئەویتریشیان (پاشاکەی تر)بەوشێوەیە بژمێرن. لەپاشان هەردووژمارەی ناوبراوکەلەهەژمارکردنی ناوی هەردوو پاشاجەنگاوەرەکەدا بەدەست هاتووە نۆ نۆ لێیان دەردەکەن و پاشماوەکەیان بەجیا هەڵدەگرن و ئەوکات ئەودووپاش ماوەیە بەیەکەوە هەڵدەسەنگێنن. ئەگەر هەردوو ژمارەی ناوبراو لەچەندیەتیدا جیاواز و هەردووکیان جووت یان تاك بن، ژمارەکەمترەکەیان لەحیسابکردنی ژمارەی پیتەکانی هەرکامیاندابێت ئەوەیان سەردەکەوێت وەئەگەر هەریەکە لەودوانەجووت و ئەویتریان تاك بێت، ئەوکات

ژمارەی گەورەتر پەیوەندی بەهەرکامیانەوەبێت ئەوەیان سەرکەوتوو دەبێت. وەئەگەر هەردوو ژمارەی ناوبراو لەپاش لێدەرکردنی نۆنۆکەدا لەڕێژەدا بەرابەر بن و هەردووکیان جووت بن ئەوکات ئەوپاشایەی کەهێرشی کراوەتەسەر سەردەکەوێت وەئەگەر هەردووکیان تاک بن ئەوا هێرشبەر سەرکەوتوو دەبێت.

هەربۆیە لەم بارەیەوەلەنێو خەڵکیدا زۆرباون بەم شێوەیە: (هەرکات دووژمارە لەتاک و جوتدا بەرابەربن خاوەنی ژمارەی کەمتر سەرکەوتوو دەبێت، وەئەگەریەکێکیان تاک و ئەویتریان جووت بێت خاوەنی ژمارەی گەورەتر سەردەکەوێت، وەهەرکات هەردوو ژمارەکە جووت بن ئەوە سەردەکەوێت کەهێرشی کراوەتەسەر، وەئەگەر هەردووژمارە تاک بن ئەوپاشایەی کەهێرشی کردووە سەردەکەوێت) ئەوکات بۆناسینەوەی پاشماوەی پیتەکان لەپاش نۆنۆلێدەرکردنیان، یاسایەکیان داناوە کەلەلێدەرکردنی نۆدا لەلای ئەوان ناسراوە. بەم شێوەیە کەپیتەکان ئەوەی کەیەك دەگەیەنێت لەهەرچوارقۆناغەکەدا کۆکردووەتەوە و بریتین لە: (الف)کەبەرابەری یەکەو (ی)کەمانای دە دەگەیەنێت و، لەپلەی دەیەکاندا بە (یەك)حیساب دەکرێت و (ق)کەبەرابەرە لەگەڵ سەددا و لەپلەی سەدەکانیشدا (یەك)دەبێت و (ش)کەمانای هەزار دەگەیەنێت لەپلەی هەزارەکاندا (یەك)دەگەیەنێت. وەلەپاش هەزار ژمارەیەکی ترنیە کە بەپیتەکان نیشان بدرێت، چونکە (ش)کۆتای پیتە ئەبجەدیەکانە.

لەپاشان ئەم چوارپیتە بەپێی ئەوپلەیەی کەهەیانەلەگەڵ یەکدا تێکەڵیان کردوون و لەئەنجامدا وشەیەکی چوارپیتی (ایقش)یان دروست کردووە. ئەوکات ئەم شێوازە لەگەڵ ئەوپیتانەی کەمانای دوو دەگەیەنن لەپلەکانی سێیەمدا ئەنجامیان داون و چاوپۆشیان لەپلەی هەزاران کردووە، چونکە هەزار کۆتایی پیتی ئەبجەدیە. وەکۆی دووپیتەکە لەسێ قۆناغدا سێ پیتە: یەکێکیان (ب)یە کەلەپلەی یەکەکاندا بەرابەرە لەگەڵ دوودا و ئەویتریشیان (ك)کەلەپلەی دووەکاندا مانای دوو دەگەیەنێت و بەرابەرەبەبیست و سێیەمیشیان (ر)کەلەپلەی سەدەکاندا (دوو)دەگەیەنێت و بەرابەر بەدوسەد، کەوشەی

سێ پیتی (بکر)یان بەپێی ڕێکخستنی هەرسێ قۆناغەکەیان دروست کردووە. لەپاشان بەهەمان شێوە لەوپیتانەی کەمانای سێ دەگەیەنن وورد بوونەتەوە و وشەی (جلس)یان لێدروست کردووە. وەهەروەها تاوەکو کۆتایی پیتەکانی ئەبجەدی ئەم شێوازەیان بەکار هێناوە تاوەکو نۆ وشەیان دروست کردووە کەکۆتایی ژمارەی یەکەکانەو بریتین لە: ایقش، بکر، جلس، دمت، هنپ، صنخ، زعژ، حفف، تفغ، کەبەشێوەیەکی ڕێك دروستیان کردوون و هەریەکە لەوشەکانی ناوبراو خاوەنی هەمان ئەوژمارەیە کەوشەی ناوبراو خاوەنی هەمان ئەوژمارەیە کەوشەی ناوبراو لەپلەی ئەودایە، هەروەك چۆن وشەی (ایقش)بۆیەك و (بکر)بۆدوو (جلس)بۆسێ و بەوشێوەیە، تاوەکو نۆیەمین وشە (گچغ)کەخاوەنی ژمارەی نۆیە تایبەت کراون.

هەربۆیە هەرکات بیانەوێت ناوێك بەنۆنۆ لێدەرکردنی بۆ بکەن سەیری هەموو ئەوپیتانە دەکەن کەلەوشەی باس کراودا گونجێنراون لەبری ئەوپیتە ژمارەی بەرامبەری وەردەگرن و لەشوێنی پیتەکە دایدەنێن، لەپاشان هەموو ئەوژمارانەی کەلەبری پیتەکانی ناوەکەدا بەدەستی دەهێنن کۆدەکەنەوە، ئەگەر لەنۆ زیاتربێت پاشماوەکەی لادەبەن وەگەرنا هەربەوجۆرەی کەهەیە دەیخەنەلاوە و لەپاشان لەگەڵ ناوێکی تریشدا بەهەمان شێوە کاردەکەن و هەربەو جۆرەی کەباسمان کرد هەردوو پاشماوەکە لەگەڵ یەکدا هەڵدەسەنگێنن. ڕازی نهێنیش لەم یاسایەدا ئاشکرایە، چونکە پاشماوەی هەریەکە لە ژمارەکانی عوقود واتە (بیست، چل، شەست، هەشتا) ژمارەگەلێکن لەپاش لێدەرکردنی نۆ لەپلەی یەکەکانە هەروەك بڵێی ژمارەکانی عوقود بەتایبەت لەهەرپلەیەکەوە کەکۆدەکرێتەوە و لەئەنجامدا هەروەك بڵێی ژمارەکانی عوقود گوڕاون بۆیەکەکان، چونکە هیچ جیاوازیەك لەنێوان دوو بیست و دووسەدو دووهەزاردا نیە، بەڵکو بەهەموویان دەڵێن (دوو)وەهەروەها سێ و سی و سێسەدو سێهەزار بەهەموویان دەڵێن سێ، هەر بۆیە ژمارەکان یەك لەدوای یەك بۆ مانابەخشین لەسەر ژمارەکانی عوقود دانراون نەوەك لەسەر چەمکێکی تر. وەئەوپیتانەی کەمانای بەشەکانی عوقود دەگەیەنێت

لەوشەتایبەتەکاندا لەیەکان ودەیان و سەداندا دایان ناوە و ژمارەی هەر وشەیەک کەلەم پیتانە پێکهاتووە لەهەموو ئەوپیتانەی کەلەودایە جێگەی دەگرنەوە ئیتر مانای یەکان یان دەیان یان سەدان دەگەیەنێت، هەربۆیەژمارەی هەر وشەیەک لەبری ئەوپیتانەی کەلەو وشەدا هەیە وەردەگیرێت هەروەک چۆن باسمان کرد هەموویان تاوەکو کۆتایی کۆدەکەنەوە.

ئەمە ئەم شێوازانەیە کەلەڕۆژگارە کۆنەکاندا لەنێو خەڵکیدا باوبووە، بەڵام یەکێک لەشێخەکان وگەورەکان کەئێمە دیدارمان لەگەڵدا کردوون پێی وایە کەلەم کارەدا وشە گەلێکی نۆ وشەیی، بیجگەلەوانەی باسمان کرد، ئەوە ڕاستە کەئەوانەبەشێوەیەکی یەک لەدوای یەک دروستیان کردوون و بەخودی ئەوانە لەگەڵ نۆدا لێیان دەردەکەن بەهەمان ئەوشێوازەی کە لەنۆ وشەکەی پێشودا باسمان کردن. وشەکانی ناوبراویش بریتین لە:ارب، یسقك، جزلگ، مدوص، هفت، تحژن، غش، خع، پچگ، کەنۆ وشەن و بەژمارە یەک لەدوای یەکەکان ڕێک کراون و هەر وشەیەکیش خاوەنی ژمارەیەکەو کەتایبەتە بەپلەی خۆیەوە، لەوانەش وشە سێ پیتی و چوارپیتی ودووپیتیشیان تێدا دەبینرێت هەروەک دەبینین بەشێوەیەکی باش ڕێك نەکراون، بەڵام شێخەکانی ئێمەلەئەبوالعباسی کوڕی بەناوە کەلەم جۆرە زانستانەی وەک سیمیاو نهێنی پیتەکان و ئەستێرەناسی کەمامۆستای مەغریب بووە لێیەوە دەیگێڕنەوە کەکارکردن بەم ووشانە لەلێدەرکردنی حیسابی نیوەدا بەوشەکانی ایقش ڕاستتر دەبێت و خوداش لەچۆنیەتیەکەیدا داناترە. ئەمانە هەموویان تایبەتی غەیب گوتنن، بەڵام پشتیان بەهیچ بەڵگەیەک نەبەستووە و ئەوکتێبەشی کەتێیدا حیسابی نیو هەیە بەبیروباوەڕی لێکۆڵەرەوان دانراوی ئەرستۆ نیە، چونکەلەکتێبی ناوبراودا بۆچون و تیۆرگەلێکی دوورلەلێکۆڵینەوە و بەڵگە زۆرن و ئەگەر کەسێك کەلەزانستدا قوڵ ببێتەوە وکتێبی ناوبراو بخوێنێتەوە ئەوەی لەلا دەسەلمێت و خوێندنەوەکەیشی دەبێتە باشترین بەڵگە.

یەکێکی تر لەیاسا پیشەییەکان لەدەرهێنانی شتە غەیبیەکاندا بەگومانی خوازیارانی زایچەیە واتە تابلۆی بازنەیی جیهانە کەشاکاری ئەبولعباس ئەحمەد سبتیە ولەکەسە بە ناو بانگە کانی صۆفیەکانی مەغریبە کەلەکۆتاییەکانی سەدەی شەشەمدا لەمەراکیش ژیاوە و هاوچەرخی یەعقوب المنصور لەسوڵتانەکانی زنجیرەی موەحیدان بووە. ئەم تابلۆ بازنەییە یاساگەلێکی زۆری هەیە کەبەکردارگەلێکی سەرسورهێنەرکۆتایی دێت و زۆرێك لەکەسە هەڵکەوتووەکان خوازیاری دەبن بۆ سودوەرگرتن لەشتەغەیبیەکان گرنگی پێدەدەن، چونکە خاوەن کرداری ناسراوی مەتەڵ ئاسایە هەربۆیە بۆ چارەسەری مەتڵ و ئاشکراکردنی نادیارەکان رادەپەڕن.

وە ئەوشێوەیەی کەکردارەکانی خۆیانی تێدا ئەنجام دەدەن بریتیە لەبازنەیەکی گەورە کەلەناویدا بازنە گەلێکی رێکی تێدا نەخشێنراون ئەم بازنانەش تایبەتی ئەفلاك و توخم و بوونەوەرانی گۆی زەوی و رۆحانیات و جۆرەکانی تری بوونەوەران وزانستەمرۆییەکانە وهەربازنەیەك پەیوەستە بەبەشەکانی فەلەکەوە ئیتر بوروج بێت یان توخم یان سەربەم دووانە دابەشکرابێت وهێڵەکانی هەربەشێکیش بەرەو ناوەند دەڕوات و پێیان دەڵێن ئەوتار. لەسەر هەر وەتەرێك پیت گەلێکی پەیاپەی وێناکراوە، لەوانەش وێناکردنی پیتەکانی (زمام)[٢١٤] کەلەلای دیوانیان و ژمێریارانی مەغریب لەم سەردەمەدا بریتیە لەشێوە و ژمارەکان، هەربەم شێوەیە وێناکردنی پیتەکانی غوباری باو لەناو تابلۆ بازنەییەکەدا کەئەوان لەناو بازنەکەدا لەنێوان بازنەو ناوی زانستەکان و بازنەکان ناوی زانست و بابەتەکانی ئەفلاك دەنوسن و لەدەرەوەی بازنەکانیش خشتەیەکە کەخانەگەلێکی زۆری هەیەو لەپانی و درێژیدا یەکتر دەبڕن. ئەم خشتەیە لەپانیدا خاوەنی پەنجاوپێنج خانەیە لەلای درێژیشەوە نزیکەی سەدو سی و یەك خانەیە و هەندێك لەخانەکانی پڕن لەژمارە یان پیت و هەندێکە تریشیان سپی وخاڵین. نیسبەتی

---

[٢١٤] بەخشتەوجەدوەل کەلەلای دیوانیەکان و ژمێریارەکانی مەغریب لەم سەردەمەدا بریتیەلە شێوەی ژمارەکانو مانای ئەو کەسەدەگەیەنێت کەژمێریاری دیوانی لەدەستدایە.

ئەو ژمارانە لەو پلەیەی کەهەیانە ئەو شێوەدابەش کردنەی کە خانە پڕەکان لەخانە خاڵیەکان جیادەکاتەوە دیار نین و لەکەنار بازنەکەوە شیعر گەلێکە کەلەجۆری بەحری درێژوپڕووی لامی مەنصوب کەشێوەی کرداری دەرهێنانی داواکراو لەوبازنەیەدایە، بەڵام شیعرەکانی ناوبراو لەئاڵۆزی و ناڕوونیدا وەك مەتەڵ وایە. وەلەیەکێك لەلایەکانی بازنەکەدا شیعرێکە بەهی یەکێك لەگەورەکانی غەیب بینی مەغریب (مالیکی کوڕی وەهیب)دراوەتەقەڵەم کەلەزاناکانی ئیشبیلیە لەدەرباری دەوڵەتی لمتونیدا بووە، و دەقی شیعرەکەش بەم شێوەیە:

سؤال عظيم الخلق حزت فصن اذن        غرائب شك ضبطه الجد مثلا

ئەم شیعرە لەلای ئەهلی ئەم هونەرە زۆرباوە، بەهۆیەوە لەم بازنەیەو بازنەکانی تریشدا وەڵامەکانی تری پرسیارەکان دەردەهێنن، هەروەك چۆن هەرکات بیانەوێت وەڵامی پرسیارێك بەدەست بهێنن ئەوا پرسیارەکە دەنوسن و بەشێوەی پیتی پچرپچرلەپاشان تالیعی ئەوکاتە لەبوروجەکانی فەلەك و پلەکانی وەردەگرن و، ئەوکات لەبازنەی وەتەرەکە وورد دەبنەوە کەبورجی تالیع لەتەنیشتی دایە لەسەرەتای وەتەرەوە تاوەکو کۆتایی لەسەری نوسراوە وەری دەگرن. هەروەها ئەوژمارانەی کە لەنێوان ئەواندا وێناکراون کۆیاندەکەنەوە و بەحیسابی ڕستە دەیانگۆڕن بەپیت و بەپێی یاسای کارەکە هەندێك جار یەکەکان ئەواندەکەن بەدەو هەندێك جاریش دەکان دەکەن بەسەدو بەپێچەوانەشەوە دەیانگوازنەوە دەیانخەنە کەناری پیتەکانی پرسیارەوە هەموو ئەو پیت و ژمارانەی کەلەسەر وەتەری بورجی سێیەمی تالیعەوە تەرسیم دەکرێت تەنها لەسەرەتای وەتەرەکەوە تاوەکو مەرکەزی بازنەکە زۆر دەبن و لەدەوری بازنەکە تێپەڕناکەن و ژمارەکانی وەك ژمارە یەکەمەکان بەپێی ڕستەکان دەیانگۆڕن بەپیت و دەیانخەنە سەرپیتەکانی تر، لەپاشان پیتەشیعریەکان کەلەلای ئەوان یاساو بنەڕەتی کارەکەیە دەیانبڕن و ئەمەش هەمان شیعری مالیکی کوڕی وەهیبە کەباسمان کردوو

پیتەکانی شیعر لەشوێنێکدا دادەنێنین، ئەوکات ژمارەی پلەکانی تالیع لە(اس)دا بورجەکەلێك دەدەن و (اس)ی بورجیش، چونکە(اس)لەلای حیساب زانان لەدوای یەکەمین پلەکانە. لەپاشان ژمارەی دەرەجەکانی تالیع لەژمارەیەکی تر دەدەن واتە زەربی دەکەن کەپێی دەڵێن (اسی گەورەتر)و(دووری ئەصڵی)ئەنجامی زەربەکەشیان دەخەنە خانەکانی خشتەکەوە ئەمکارەش بەپێی یاساگەلێك کەلای ئەوان ناسراوە ئەوکردارانەی کەباسمان کرد دەورگەلێکی ژمێردراوو دیاری کراو ئەنجام دەدەن و کەلەوانەوە پیت گەلێك دەردەهێنن و پیت گەلێکی تریش لادەبەن بەرابەریان دەکەن لەگەڵ ئەوپیتانەی کەلەوبەیتەدا لەدەستیاندایە و ئەوەی کەلەپیتەکانی پرسیارو پیتەکانی تری هاورای ئەو هەڵدەبژێرن و لەپیتەکانی شیعریش بەهەمان ئەندازە نقڵ دەکەن، و لەپاشان ئەم پیتانە لەگەڵ ژمارەگەلێکی دیاری کراوداکەپێیان دەڵێن (ادوار)لێدەردەکەن و لەهەر دەورێك ئەوپیتەی کەبەو دەورە کۆتایی دێت دەردەهێنن و ئەم کارەش بەژمارەی دەورگەلێکی دیاری کراو کەلەم بارەیەوە جێبەجێیان دەکەن دووبارە دەکەنەوە لەکۆتایی کارەکەدا پیتە یەکتربڕەکان بەدەست دێن و بەتەرتیب بەدی هاتنیان پێك دێن و لەئەنجامدا وشەگەلێکی هۆنراوە لەیەك شیعردا بەدی دێن کەلەسەر وەزن و ڕووی هەمان شیعری بنەڕەتی کارەکەیە، واتە شیعرەکەی مالیکی کوڕی وەهیبە کەلەپێشەوە باسمان کرد. لەداهاتوشدا لەبابی زانستکاندا و لەکاتی باسکردنی چۆنیەتی دەرهێنانی تابلۆی بازنەی ناوبراودا لەم بارەیەوە گفتوگۆدەکەین. ئێمە زۆرێك لەخەڵکی تایبەتمان بینیوە کەبۆ دەرهێنانی شتە غەیبیەکان لەم بازنەیەدا هاوکات کرداری باسکراو ئەنجام دەدەن و واگومان دەبەن کە گونجاوی وەڵام لەگەڵ پرسیاردا لەڕوانگەی تەوافوقیەوە لەزاراوە و کێشی شیعرونمونەی ئەمانە بەڵگەیەلەسەرجێبەجێکردنی بەسەر واقیع و حەقیقەتدا، ئەمەلەکاتێکدا وەها بۆچونێك دروست نیە، چونکە لەبەشەکانی ڕابوردوودا گوتمان کەغەیب بینی و پێشگۆیی بەهۆکارو ئامێرە پیشەیی و هونەریەکان بەهیچ شێوەیەك گونجاونیە. ئەوگونجاویە کەلەنێوان پرسیارو وەڵامدا لەم تابلۆ بازنەییەدا دەبینرێت لەڕوانگەی ڕوونی زاراوەکان و گونجاویان لەگوتاردایەهەروەك چۆن وەڵامی ڕاست و گونجاو دەبێت لەگەڵ پرسیارەکەدا و گونجاوی ناوبراو بەهۆی

ئەوکردارانەوەیە کەهۆکاری بازنەکە ئەنجامی دەدات وەك تەکسیر[٢١٥]. پیتە کۆکراوەکان لەپرسیارو ئەوتارەکان و دانانیان لەخشتەکەدا بەیارمەتی ئەو ژمارەیەی کەلەلێکدانی ژمارەکانی مەبەستدا کۆدەکرێنەوە و دەرهێنانی پیت گەلێك لەخشتەکە بەهۆی ئەوژمارانەو لێدەرکردنی پیت گەلێکی تر و دووبارە بوونەوەی ئەم کارە لەقۆناغە ژمێردراوەکان و، بەرابەرکردنی هەموو ئەمانەبەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك لەگەڵ پیتەکانی شیعردا.

وەکرداری ناوبراو ئینکاری ناکرێت هەندێك جار بەشێك لەخەڵکە هۆشیارەکان پەی بەگونجانی نێوان ئەم شتانە دەبەن و نادیار دەناسن، چونکە هۆکاری بەدەست هێنانی نادیار لەرێگەی ئەوزانیاریانەی کەلەمێشکی مرۆڤدا بەدی دێت هەمان ئەو گونجانەی نێوان شتەکانە، بەتایبەت ئەم شتەبۆنەوکەسانەی کەریازەت دەکەن باشتر پوو دەدات، چونکە ریازەت ئەقڵ لەبەمێزکردنی مێزی بەڵگەهێنانەوە و زۆرکردنی بیرو هۆشدا یارمەتی دەرە هەروەك چۆن لەلاپەرەکانی رابوردوودا هۆکارەکەیمان چەندین جار باسکرد هەربۆیە ئەم جۆرە بازنانە پەیوەستە بەسبتیەوە.

من بازنەیەکی ترم دەست کەوت کەهی سهلی کوڕی عبداللەیە و دانیش بەوەدا دەنێم کەبازنەی ناوبراو و ئەووەڵامەی کەلێیەوە دەردەهێنرێت لەکردارە سەرسورهێنەرو ئاڵۆزو سەرسامکەرەکانە. رازی ئەوەی کەوەڵامی ئەو هۆنراوەیە بەدەست دێت بەبۆچونی من ئەوەیەکەلەگەڵ پیتەکانی ئەو شیعرەی (مالیکی کوڕی وەهیب)دا بەراوورد دەکەن، بەوشێوەیە وەڵامی هۆنراوەکە لەسەر کێش و رووی شیعری ناوبراو دەبێت، چونکە ئێمە کردارێکی ترمان لەم بارەیەوە لەم گروپە بینیومانە و کەتێیاندا لەبەراورد کردن بەشیعر چاوپۆشیان کردووە لەئەنجامیشدا وەڵامەکەش رێك دەرنەهاتووە، هەروەك چۆن لەکاتی لێکۆڵینەوە لەم مەسەلانەلەجێگەی خۆیدا دەیبینین. زۆرێك لەخەڵکی تەسك بیر باوەڕیان بەوەنیە کەبەهۆی ئەم کردارەوە دەتوانین بگەینە دەرئەنجامێکی خوازراو لەم رووەوە راستیەتی کرداری بازنەکان ئینکاری دەکەن و پێیان وایە کەکارەکانی ناوبراو لەشتە خەیاڵی و وەهمیەکانن ئەوکەسەی کەکردارە باسکراوەکان ئەنجام دەدات پیتەکانی

---

[٢١٥] واتە دابەشکردنی ژمارەکانی ناو بەسەر خانەکانی تەعویزدابەجۆرێك لەهەرلاوەژمارەکان بەرابەربن.

شیعرەکە بەدڵی خۆیان لەناوپیتەکانی پرسیارو ئەوتارەکاندا دەهۆنێتەوە و ئەم هونەرانە بەبێ هیچ جۆرە گونجان و یاسایەك ئەنجامی دەدات ئەوکات شیعرەکە بۆ خەڵکی دەخوێنێتەوە و وانیشانی دەدات بۆیان کەکارەکانی ئەو لەسەر شێوەیەکی ڕێك و پێك و ئوصولێ و یاسایە، بەڵام وەها بۆچونێك وەهم کردنێکی بەتاڵ زیاترنیە کەسەرچاوەکەی کورتی فیکرە لەتێگەشتنی گونجانی نێوان هەبون و نەبوونەکان و جیاوازی نێوان ئیدراکات و ژیریەکانە، بەڵام نەریتی هەرتاکێکی خاوەن ئیدراك ئەوەیەکە لەهەرشتێك تێنەگات و هەرشتێك بەلای ئەقڵی ئەوەوە گونجاونەبێت دەست دەکات بەئینکاری کردنیو بۆئێمەش لەوەڵام دانەوەی ئەم کەسە ئینکارانە هێندەبەسە کەکردارەکە بەشێوازی ناوبراوو بەشێوەیەکی ڕێك و لەسەربنەماو یاساڕاستەکان دەگاتە ئەنجام ئەوانەشی ئەم کردەوانە دەردەهێنن هۆش و فەراسەتێکی تەواویان هەیەو هیچ جۆرە گومانێکیان لەکارەکەی خۆیان نیە.

هەرکات وەرگرتنی ژمارەکان کەلەهەموو شتێك ڕوونترە بەهۆی دووری داپۆشراوی پەیوەندی نێوانیان، بۆکەسێك ئاسان نەبێت ئەوکات لەبارەی ئەم جۆرە بازنانەوە کەپەیوەندی نێوان پیتەکانیان داپۆشراوە و دوورە لەزەینەوە زیاتر ئینکاری دەکرێن، ئێستەش ئێمە مەسەلەی ژمارەیەکی ئاڵۆز دەخەینەڕوو تاوەکو نمونەیەکی کەم لەوەی کەباسمان کرد بۆخوێنەر بەم شێوەیە بخەینەڕوو: هەرکات چەند ژمارە لەیەك دەربکەین لەبەرامبەر هەردیرهەمێکەوە سێ فلس (پشین)دابنێین لەپاشان پشیزەکان کۆبکەینەوە و باڵندەیەکی پێ بکڕین و بەگوتەی تەعویزە نوسان ئەوکات بەهەموو دیرهەمەکان چەند باڵندەیەك بکڕین، بەومەرجەی کەنرخی هەریەکەیان وەك نرخی ئەوباڵندەیە بێت کەبەپشیزەکان کڕیومانە، ئەوکات ئەگەر بپرسن چەندباڵندەتان بەدرهەم کڕیوە؟ لەوەڵامدا دەڵێین نۆ دانە، چونکە دەزانین کەژمارەی پشیزەکان لەیەك دیرهەمدا بیستو چوارەو ژمارەی سێ پشیز یەك لەسەر هەشتی ئەوانە ژمارەی هەشت یەکی یەکەی هەشتە، کەواتە هەرکات هەشت یەك دیرهەمیەکان لەگەڵ هەشت یەك دیرهەمەکانی تر کۆبکەینەوە کۆی هەموویان دەکاتە بەهای یەك باڵندە کەبەپێی ژمارەی هەشت یەکەکان یەکەی هەشت باڵندەیە ئەوکات باڵندەیەکی تردەخەینەسەری کەپێشتر لەگەڵ پشیزە

گریمانیەکاندا کرپومانە و بەنرخەکەی باڵندەگەلێکمان بەدیرهەمگەلێك کرپوە، کەواتە کۆیەکەی دەکاتە نۆ باڵندە. ئێستەش دەبێنین کەبەچ شێوەیەك وەڵامی شاراوەو نادیار لەدووتوێی ڕازی تەناسوبی (گونجان)کەلەنێوان ژمارەکانی مەسەلەکەدا هەیە بەدەست دێن، یەکەمین گومانێکیش کەلەبینینی ئەم مەسەلەو هاوشێوەکانیدا لەوانەیە ببرێت ئەوەیە کەئەوانە لەڕیزی مەسەلە غەیبیەکاندا دایابنێین و بڵێین کەپەیبردن پێیان نەگونجاوە، ئەمەلەکاتێکدا ئەوە دەرکەوت کە تەناسوبی نێوان شتەیەکیەکان هۆکارێکە بۆئەوەی نادیارەکانی لەدیارەکانی دەربهێنێت و ئەم جۆرە دەرهێنانەش تەنها لەپێشهاتو ڕووداوەکاندا گونجاوە کەلەجیهانی بوون و زانستدا ڕوودەدات، بەلاّم لەبارەی کائینات (بوونەوەران)و ڕووداوەکانی ئاێندە هەرکات هۆکاری ڕوودانیان دیار نەبێت و هەواڵێکی ڕاست نەبێت کەبیانسەلمێنێت، ئەوادەبێت وەها مەسەلەگەلێك بەشتە غەیبیەکان دابنێین و ناسینیان نەگونجاوە و، هەرکە ئەم بابەتە ڕۆشن بوویەوە ئەوکات دەتوانرێت بگوترێت هەموو ئەوکردارانەی کەلەبازنەکەدا ئەنجام دەدرێن تەنها بەهۆی دەرهێنانی وەلاّم لەدەستەواژەی پرسیارەکاندا بەئەنجام دەگات، چونکە هەروەك بینیمان کرداری بازنەکە بەم شێوەیەکەکۆمەڵێك پیت بەشێوەیەکی تایبەت ڕێك دەخەن و لەپاشان لەهەمان ئەوپیتانە بەتەرتیبێکی تر پیت گەلێکی تر هەڵبژێرن و نهێنیەکەیان دەبێت لەتەناسوبی نێوانیانەوە بگەڕێن، کەلەوانەیە هەندێك ئاگاداری بن و هەرکەسێکیش پەی بەو تەناسوبەبیات دەرهێنانی وەلاّم بەهۆی یاساو ڕێسا ناوبراوەکانەوە بۆ ئەوئاسان دەبێت و وەلاّمەکەلەلایەکی ترەوە، واتەڕوانگەی بابەتی زاراوە وپێکهاتەیانەوە، مانای یەکێك لەلایەنەکانی پرسیارەکە ئیتر ئەرێنی بێت یان نەرێنی دەگەیەنێت نەوەك ئەوەی واگومان ببرێت وەلاّمەکە لەجیهانی غەیبەوە وەردەگرێت، بەڵکو ئەم وەلاّمە تەنها بەهۆی بەرابەر کردنی قسەکە لەگەڵ ئەوەی کەلەدەرەوەیە بەدەست دێت وەگەرنا هیچ ڕێگەیەك بۆناسینی شتە غەیبیەکان بەم کارانە بوونی نیە، بەڵکومرۆڤ لەم جۆرە جیهانانە ڕێگری لێدەکرێت وئەوزانستە تەنها تایبەتە بەخوداوە. (خوداش دانایەو ئێوەنازانن)[٢١٦]

---

[٢١٦] (وَاللهُ يَعلَمُ وأنتُم لاتَعلَمُون) س البقرة ئا ٢١٣.

# بابی دووەم

## لەبارەی ئاوەدانی و دەشتەکی بوون و وەحشی و ئەوانەی کەبەشێوەی هۆز دەژین و ئەو چۆنیەتی و حاڵەتانەی کە لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا ڕوودەدات

## بەشی یەکەم

### لەبارەی ئەوەی کەژیانی خەڵکی دەشتەکی وشارنشین بەشێوەیەکی یەکسان و بە پێی هۆکارە سروشتیەکانە

پێویستەئەوەبزانین کەجیاوازی نەریت و ڕێوڕەسم و کاروباری ژیانی گەلان لەدەرئەنجامی ئەوجیاوازیەیە کەلەشێوازی گوزەراندا (ئابوری)هەیانە، چونکە کۆمەڵگەی ئەمان وەستاوە لەسەر هاوکاری لەنێوان یەکتریدا لەبواری ژیان وگوزەران، ئەڵبەت لەم ئامانجەشدا لەیەکەمین پێداویستیەسادەکانەوە دەست پێدەکەن ئەم جۆرە کۆمەڵگە مرۆییە سەرەتاییانەو، سادەبوون و هەوڵ وکۆشش وچالاکی بەرلە قۆناغی شارنشینی جۆرێکە لەخۆئامادەکردن بۆ گەشتن بەقۆناغی شارستانیەتی تەواو. هەربۆیە کۆمەڵێك سەرقاڵی کاری کشتوکاڵ و باغدارین و دەستەیەکیش بەبەخێوکردنی مەڕومالآت داری و هەنگ و کرمی ئاوریشمەوە خەریکن، بۆئەوەی لەبەروبوم ووەچەکانیان سود وەربگرن.

هەردوو گرووپی ناوبراو کەسەرقاڵی کشتوکاڵ و بەخێکردنی مەڕومالآتن ناچارن کەژیان لەدەشت و بیابانەکاندا بەسەربەرن و ژیانی دەشتەکی وبیابان نشینی هەڵبژێرن، چونکە دەشتگەلێکی فراوان هەن کەخاوەن گژوگیاو زەوی بەپیتی زۆرن و لەوەرگەی فراوانیان تێدایە بۆگیانلەبەران و لەشارەکان باشترن بۆئەم کارە، هەربۆیە تایبەتمەند بوونی خێڵەکان بەدەشتەکی بوونەوە شتی پێویستە و خۆلادان لێی مەحاڵە. لەم هەلومەرجەی کۆمەڵگەو هاوکاری نێوانیان بۆبەدەست هێنانی پێداویستیەکان و هۆکارەکانی ژیان و ئاوەدانی، وەك مادەخۆراکی و شوێنی نیشتەجێبون و سوتەمەنی و گەرما، بەئەندازەیەکە کەتەنها دەتوانن پێی بژین و ژیانیان بپارێزێت، واتە لایەنی کەمی رێگری لەبرسیەتیان لەدەستدابێت بەبێ ئەوەی کە لەهەوڵی بەدەستهێنانی بژێوی زیاتردابن، چونکەناتوانن هەنگاو بەرەو قۆناغێکی تر بنێن، بەڵام کاتێك کەبارودۆخی ژیانی ئەم هۆزانە کەبەم شێوەیە دەژین فراوان ببێتو لەتواناو خۆشگوزەرانیدا بگەنە قۆناغێکی باشتر لەپێداویستی، ئەوکات بارودۆخی نوێ ئەوان هان دەدات کەخوازیاری ئارامی و نیشتەجێبون و هیوادار بەبەدەست هێنانی رێژەیەکی زیاتر لەپێویستیەکان بن، هاوکاری یەکتر دەکەن و لەرێگەی زۆر کردنی خۆراك و پۆشاکە جۆراوجۆرەکاندا هەوڵدەدەنو گرنگی بەباشترکردنیان دەدەنو، هەوڵی فراوان کردنی خانوو بنیاتنانی شارەبچوك و گەورەکان دەدەن، لەپاشان رێورەسم و نەریتی بەتوانایی و ئارامی ژیانیان فراوان دەبێتو، ئەوکات شێوازەکانی جوان خوازی لەهەموو شتەکاندا دەگاتە گەشانەوە و کامڵ دەبێت، وەك بەدەست هێنانی خۆراکە خۆشو بەلەزەتەکانو باشتر کردنی چێشتخانەکانو هەڵبژاردنی جلوبەرگی جوان و گرانبەهای ئاوریشمی رەنگاو رەنگ و نمونەی ئەمانە و، دروست کردنی باڵەخانەو کۆشکو تەلاری بەرزوجوان و... هتد. لەپیشەسازیدا رێگەی کەماڵ دەپێون و لەقۆناغی تیۆریەوە دەیانگەیەنێتە قۆناغی پراکتیك و دەیانگەیەنێتە ئەوپەڕی قۆناغی گەشانەوە، هەروەك چۆن و خانوو کۆشکو باڵەخانەکان بنیات دەنێن کەخاوەن جۆگەی ڕوونی ئاوو دیواری بەرزو جوان بەجۆرێك

لەجوانکاریەکەیاندا زیادە ڕەوی دەکەن بەهەمان شێوە لەباشتر کردنی هۆکارەکانی ژیانو گوزەران، هەر لەپۆشاکەوە بیگرە تاوەکو جێگەی نوستن و کەلوپەلی ناومالْ لەهەولْی بەردەوامدان بەمەبەستی جوانکاری لەشتە ناوبراوەکاندا.

ئەمانەش شارنشینەکانن واتەئەوانەن کەلەشاروو پێتەختەکاندا ژیان بەسەر دەبەن. لەم شارنشینانەش کۆمەلْێکیان بەمەبەستی بەدەست هێنانی بژێوی ژیانیان سەرقالْی پیشەسازین و هەندێکیش بۆئەم مەبەستە بازرگانی دەکەن. کارو پیشەی شارنشینان بەبەراورد لەگەلْ کارو پیشەی گوند نشینانـدا زیاتر هاوشانە لەگەلْ خۆشگوزەرانیدا، چونکە نەریت و ڕێوڕەسمی ژیانیان (شارنشینان)لەئاستی پێویستیەکان تێپەڕدەکات و کاروباری ژیان و گوزەرانیان بەپێی گونجانی ئەوهۆکارانەی کەلەدەستیاندایە پێش دەکەوێت.

کەواتە ئەوەدەرکەوت کەپێکهاتەی ژیانی گەل و نەتەوە بیابانگەڕو شارنشینەکان بەشێوەیەکی یەکسان بەپێی هەلومەرجە سروشتیەکانەو، هەروەك گوتمان هەریەکەو بەپێی پێویستی خۆیان بەجۆرێك دەژین کەناتوانن خۆیانی لێ لابدەن.

# بەشی دووەم

## لەبارەی ئەوەی کەژیانی ڕەگەزی عەرەب لەم جیهانە ئافرێنراوەدا بەتەواوی سروشتیە

لەبەشی ڕابوردودا ئەوەمان وەبیرهێنایەوە کەدەشتەکیەکان گروپێکن لەمرۆڤ کەبۆ بەدەست هێنانی ژیان و گوزەرانی سروشتی سەرقاڵی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتن. وەئەوان لەهۆکارەکانی ژیان لەخۆراکەوەبیگرە تاوەکو پۆشاك و شوێنی نیشتەجێبون‌و نەریتەکانی ترتەنها هەوڵی بەدەست هێنانی بەشی پێویستی خۆیان دەدەن‌و ناتوانن ئەوڕێگایە بگرنە بەر کەلەم ئاستەدا نەیان هێڵێتەوە وبگەنە شارستانیەت‌و مەدەنیەت. ئەم گروپە خانوگەلێك لەپێست و موی حەیوانات و لقی درەخت و خۆڵ و بەردی سروشتی و دروست دەکەن و بێجگە لەوەی کەتەنها بۆشوێنی نیشتەجێبونێکی ئاسایی و پەناگە هیچ مەبەستێکی تریان نیەو هەندێك جاریش پەنادەبەنەبەر ئەشکەوت و کێوەکان، بەڵام خۆراکیان بەوشێوەیە کەهەمان ئەومادە سروشتیانە بەکەمێك گۆڕین کەتێیاندا دەیکەن دەیانخۆن‌و یان بێجگە لەوجۆرانەی کەبەئاگر دەیانکوڵێنن یان دەیان برژێنن، بەدەرلەمە هیچ جۆرە دەستوەردانێکیان تێدا ناکەن. بۆگروپێك لەخەڵکی کەسەرقاڵی کشتوکاڵن مانەوەیان لەیەك شوێندا باشترە بۆیان لەوەی کەکۆچەری و بیابان گەڕ بن، ئەمانە دانیشتوانی کێڵگە بچوك‌و گوندو ناوچەکوێستانیەکانن وەك زۆربەی بەربەرەکان و نەتەوە غەیرە عەرەبەکان. ئەوخەڵکەی کەژیان و گوزەرانیان لەسەر بەخێو کردنی حەیواناتی وەك مانگاو مەڕ بەڕێ دەکەن

ناچارن بۆ پەیداکرنی لەوەڕگەی باش و ئاوی گونجاو بۆیان هەمیشە لەجولە و بیا با نگە ڕیدا بن، چونکە هاتوو چۆ لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر بۆئەمان باشترە بۆئەوەی مانگاو مەڕەکانیان بەباشی بەخێوبکەن. ئەمانەش بەهیچ شێوەیەك ناچنەدەشتە چۆڵو بیابانەکانەوە، چونکە هیچ لەوەڕگەیەکی گونجاوی بۆ ماڵاتەکانی ئەمانی تێدا نیە واتە بەربەڕ و تورکو براکانی ئەمان تورکومانان و ئەسلافەکان، بەڵام ئەوگروپانەی کەژیانیان لەسەر بەخێکردنی حوشتر وەستاوە زیاتر لەهەموو کەسێك بیابان گەڕی دەکەنو دەشتە ووشك و ڕێگە دوور و درێژەکان دەبڕن، چونکە لەوەڕی حوشترەکانیان لەسەر دڕکی بیابانە. بەتایبەت لەوەرزی زستاندا بۆ ڕزگاربوون لەسەرماو دابینکردنی شوێنێکی باشتر بۆ ژیانی حوشترەکانیان بیابانەکان هەڵدەبژێرن، چونکە جیاکردنەوەی کەرێ لەناوشیری حوشتردا لەشوێنە ساردەکاندا زۆر ئەستەمە هەربۆیەلەهەمووگیاندارێك زیاتر پێویستی بەگەرما هەیە.

هەربۆیە حوشتر داران ناچارن ڕێگەدوورەکان بگرنە بەر بەمەبەستی دۆزینەوەی شوێنو لەوەڕگەی باش، چونکە پاسەوانانی سنوری نەتەوەکانی تر ڕێگەنادەن لەلەوەڕگە بەپیتەکانی سنورەکانیاندا بمێننەوە و ئەمانیش ژێردەستەیی قبوڵناکەن هەربۆیە لەترسی پاسەوانانی سنوری ناوبراو پەنادەبەنە بیابانەچۆڵ و دوورەکان. هەربۆیەئەم گروپە بەوەحشی ترین خەڵك دەژمێردرێن و بەبەراورد بەخەڵکی شار وەك گیانەوەرگەلێکی دڕندەن کەبەدەست هێنانیان ئەستەمە و وەك گیانلەبەرە دڕندەکانن. ئەمانەش بریتین لەتازیانەکان و بەربەرو زناتەن لەمەغریب. وەکوردو تورکومان وتورکەکانی خۆرهەلاتیش وەك ئەمانن، بەڵام تازیەکان بۆ بەدەست هێنانی لەوەڕی باشتر دەگەنە دوورترینی بیابانەکان بەکورتی هۆزەکانی ناوبراو زیاتر بیابان گەڕی دەکەن، چونکە تەنها حوشتر بەخێودەکەن ئەمەلەکاتێکدا هۆ زە کانی ترمانگاومەڕیش بەخێو دەکەن، هەربۆیە ئەوە ڕوون بوویەوە کەڕەگەزی عەرەب بمانەوێت و نەمانەوێت بەحوکمی سروشت بەناچاری دەبێت یەك قۆناغ لەژیان بگوزەرێنن و ژیانیان بەگشتی گونجاوەلەگەڵ بنەما سروشتیەکاندا، خوداش داناو زاناترە.

# بەشی سێیەم

## لەبارەی ئەوەی کەژیانی دەشتەکیەتی کۆنترە لەژیانی شارنشینی و دەشتەکیەتی
## وەك لانکەی کۆمەڵگەو شارستانیەت وبناغەی دامەزراندنی شارو کۆمەڵگەکانیان لەدەشتەکیەکانەوە بەدیهاتووە.

لەبەشەکانی پێشتردا ئەوەمان باسکرد کەبارودۆخی ژیانی دەشتەکیەکان بەشێوەیەکە کەقەناعەت بەشتەپێویستیەکانیان (زەروریات)دەکەن و ناتوانن هەنگاو بەرەو قۆناغەکانی تربهاون، بەڵام داب ونەریتی شارنشینەکان بەپێچەوانەی ئەمانەوەیە. شارنشینان گرنگی بەکەمالیات و نازونیعمەتی زیاتر لەپێویستیەکانیان دەدەن کەلەپێویستیەکانەوە سەرچاوەدەگرن. کەواتە دەشتەکیەتی وەك سەرچاوەو لانکەی شارستانیەتە، چونکە یەکەمین خواستەکانی مرۆڤ شتەپێویستەکانیەتیو، ئەم خواستانەش ناگەنە قۆناغی جوانکاری و کامڵبوون وخۆشگوزەرانی مەگەر ئەوکاتەی کەهۆکارە پێویستەکان بەدەست بهێنرێن. کەواتە توندوتیژی دەشتەکیەکان بەرلە هێمنی شارنشینەکان بووە لەبەر ئەوەیە کەدەبینین شارنشینی وەك ئامانجێکە بۆدەشتەکیەکان کەبەرەو لای ئەولەجوڵەدان و بەهەوڵو، ماندوبونیان سەرئەنجام لەدەشتەکیەتدا دەگەنە ئامانجی خوازراوی خۆیان کاتێك کەدەگەنە ئاستی توانا لەم ڕێگەیەوە ڕوودەکەنە داب و

نەریتی جوانخوازی و خۆشگوزەرانی و، ئەوکات حەزلەهێمنی و ئارامی ژیان دەکەن و کۆت و بەندەکانی شارنشینی قبوڵدەکەن.

بارودۆخی هەموو هۆزەدەشتەکیەکان بەم شێوەیە، بەڵام شارنشینان هیچ کات ئارەزوومەندی داب و نەریت و ژیانی دەشتەکیەتی نابن مەگەر کاتێك کەپێویستی ئەوەبخوازێت، یاخود نەتوانن سود لەهۆکارەکانی خۆشگوزەرانی شارەکەیان سود وەربگرن. بەلگەیەکی ترلەسەر ئەوەی کەدەشتەکیەتی ئەصلّ و بناغەی شارنشینیە ئەوەیەکە هەرکاتێك خەڵکی شارێك بخەینە بەر لێکۆڵینەوە وە دەبینین کەزۆربەیان سەرەتا لەدەشتەکی و گوندنشینان بوون ولەپاش قۆناغی تواناو سەروەت و سامان دواتر هاتوونەتە شارەکانەوە و لەوێدا ژیاون و وردە وردە حەزیان لەژیانی جوانخوازی و خۆشگوزەرانی شارکردووە. ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە داب و نەریت و بارودۆخی شارستانیەت لەدەشتە کیە تەوە سەرچاوە دەگرێت و دووەمینیان سەرچاوەو لانکەی یەکەمینیانە. وەدەبێت ئەوەبزانین کەهەریەکەلەژیانی دەشتەکی و شارنشینی لەجۆردا جیاوازو جۆراوجۆرن، چونکە دەبینین هۆزێك لەهۆزێکی تر گەورەتر یان بەهێزترە، وەهەروەها هەندێك لەشارەکان گەورەتر و فراوانترن لەشارەکانی ترو هەندێك ئاوەدانیان لەهەندێکی ترزیاترە. لەوەی کەڕابورد دەرکەوت کەدروست بوونی دەشتەکیەتی لەپێش درووست بوونی شارو شارستانیەتەوەیە و دەشتەکیەتی بنچینەو بناغەی شارستانیەتە، چونکە داب ونەریتی شارو شارستانەکان وەك جوانخوازی و ویستنی ئارامی لەدوای دابو نەریتگەلێکەوەیە کەتایبەتە بەبەدەست هێنانی هۆکارە پێویستەکانی ژیانەوە، خوداش داناترە.

# بەشی چوارەم

## لەبارەی ئەوەی کەدەشتەکیەکان لەخێرو چاکەوە نزیکترن

چونکە هەرکاتێك سروشت و پێکهاتەی ئادەمیزاد لەسەر یەکەمین سروشتی بێت بۆ وەرگرتنی چاکە و خراپە کە بەسەریدادێت هەمیشە ئامادە باشەو تێیدا ڕەنگ دەداتەوە. پێغەمبەر (ص)فەرمویەتی: (مندالْ لەسەر فیترەت لەدایك دەبێت ودێتەجیهانەوە ئەوە دایك و باوکن کەدەیکەنە یەهودی یان نەصرانی یان مەجوسی)[217]. هەربەو ئەندازەیەی کەیەکێك لەدوو خوی چاکە یان خراپە پێش سروشتی مرۆڤ بکەوێت واتە هەرخویەکی گرت لەویتریان دوور دەکەوێتەوەو بەدەست هێنانی بۆئەو دژوار دەبێت. هەربۆیە ئەگەرهاتوو خویەکی چاك بکەوێتە پێش سروشتی کەسێکی چاکەکارەوە ئەوا مەلەکەی چاکەخوازی تێدا دروست دەبێتو، لەخراپە دوور دەکەوێتەوە و بڕینی ئەو ڕێگەیەی بۆ دژواردەبێت. وەهەروەها ئەگەر لەسروشتی مرۆڤدا خوی خراپە پێش بکەوێت ئەوا ڕووکردنە چاکە بۆ ئەو دژوار دەبێت و لێی دوور دەکەوێتەوە، شارنشینانیش کەلەم ڕووەوە بەناو خۆشگوزەرانی و نەریتی جوانکاری و خۆشیەکاندا ڕۆچوون ئەوا ڕوودەکەنە دونیاو، حەزو ئارەزووەکان دەکەنەپیشەو سروشتیان لەزۆرێك لەچاکەکان دوور کەوتونەتەوەو نەریتی خراپ بەناخیاندا ڕۆچووەو بەئەندازەی ئەو ڕۆچونەش لەچاکەدوورکەوتونەتەوە، بەجۆرێك کەلەنێوان ئەمان و شێوازەکانی شەرم و سەنگینیدا

---

[217] (الولد يولد على الفطرة فابواه يهودانه او ينصرانه او يمجسانه).

بەربەستی گەورە دروست بووە و دەبینین کەزۆرێکیان لەکۆڕو کۆبوونەوەو مەجلیسی پیاوانی گەورەدا قسەی ناشیرین و جنێو دەدەن و بەهیچ شێوەیەك شەرم و حەیا و شکۆ نایان گرێت و وازلەکردەوەی خراپ ناهێنن، چونکە نەریتی خراپ بەجۆرێك دایپۆشیون کەتەنانەت لەکردارو گوفتاریشیاندا واز لەقسەو کردە وەی ناپەسەند ناهێنن. هەرچەندە دەشتەکیەکان وەك خەڵکی شار ڕووناکەنە دونیا، بەڵام شەنسی ئەوان لەسنوری ئەندازەی پێویست نایانگەیەنێتە قۆناغەکانی جوان پەرستی و هیچ خویەکی ئارەزوو بازانەو ئەو هۆکارانەی کەمرۆڤ بەرەو لەزەتە نەفسیەکان ڕادەکێشێت نیانە، چونکە بەهەمان ئەو ڕێژەیەی کەسەوداو مامەڵەیان سنوردارە داب و نەریتیشیان لەم بارەیەوە زۆرسادەیە و ئەو ڕەفتارە خراپ و خووە ناپەسە ندانەی کەلەوانەوە ڕوودەدەن بەبەراورد بەو جۆرە ڕەفتارو خووەخراپانەی کەلەخەڵکی شارەوە ڕوودەدەن سنوردارو کەمترە. سەرەڕای ئەمەش دەشتەکیەکان لەفیترەت نزیکترن‌و لەمەلەکەی ڕەفتاری خراپ کەبەهۆی زۆربونی نەریتەناپەسەندەکانەوە لەدەروندا دروست دەبن دورترن و، هەربۆیە بەشێوەیەکی ڕوون دیارە کەچارەسەرو دەرمانیان بەبەراورد بەشارنشینان ئاسانترەو لەداهاتووشدا ئەوەدەسەلمێنین کەشارنشینی کۆتایی شارستانیەت و ئاوەدانی مرۆڤەو کۆتاییەکەشی فەسادو.ئەوپەڕی خراپەو دووریە لەچاکە.

کەواتەدەرکەوت کەفەساد لەنێوان دەشتەکیەکاندا کەمترەلەشارنشینان، خوداش لەخواترسانی خۆش دەوێت[٢١٨] بەپشت بەستن بەو فەرموودەیەی کەلەصەحیحی بوخاریدا هاتووە و ئێمەش سەرەتا باسی دەکەین و ئەوە دەسەلمێنین کەئەم فەرموودەیە دژی قسەکەی ئێمەنیەوتێیداهاتووە: (کاتێك هەواڵ گەشتەحەجاج کەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع گەڕاوەتەوە ناودەشتەکیەکان و لەوێدادەژی، بەسەلەمەی گووت: گەڕاویتەوە سەردۆخی پێشووی خۆت و ژیانی دەشتەکیەتیت هەڵبژاردووە؟ سەلەمەگووتی: نەخێر، بەڵام پێغەمبەر ڕێگەبەمن داوە کەلەگەڵ دەشتەکیەکاندا بژیم. پێویستە ئەوەبزانرێت

---

[٢١٨] (إِنَّ اللهَ يُحِبُّ المُتَّقِين) س التوبة ئا ٤.

کەکوچەریەتی لەسەرەتای ئیسلامەوە لەسەر خەڵکی مەککەواجب بووە تاوەکو پێغەمبەر (ص) بچێتەهەرشوێنێکەوە ئەوانیشی لەگەڵدابێت وهاوکاری بن پشتیوانی لە بانگەوازەکەی بکەن و پاسەوانی بن، بەڵام ئەم تەکلیفە لەسەر عەرەبە دەشتەکیەکان واجب نەبووە، چونکە خەڵکی مەککە لەڕوانگەی ئەوەی کە وابەستەی عەصەبیەتی پێغەمبەر بوون و فەرمانیان پێدەگەیشت کەهاوکارو پاسەوانی پێغەمبەرو پەیامەکەی بن، بەڵام ئەم جۆرە ئەرك و فەرمانانە لەسەر دەشتەکیەکان واجب نەکرابوو کۆچەریەکانیش لەژیانی دەشتەکیەتی کەتێیدا کۆچ واجب نەبوو پەنایان بەخودا دەگرت.

وەپێغەمبەر (ص)لەفەرموودەکەی تایبەت بەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاصدا و لەوکاتەی کەسەعد لەمەککەدا نەخۆش بوو فەرمووی: خودایا کۆچی هاوەڵانم کۆتایی پێ بهێنەو مەیانگێڕەوە سەرحاڵەتی یەکەمیان. مانای ئەم فەرموودەیەئەمەیە کەخودا هاوەڵانی بۆهاوەڵیەتی ئەولەمەدینەدا و وازنەهێنان لێی هاوکاریان بێت بۆئەوەی لەوکۆچەی کەدەستیان پێکردووە نەگەڕێنەوە، مەبەست لەگەڕانەوە لەم فەرموودەیەدا گەڕانەوەیەکی بەپە لەیە بۆسەرئەو ڕێگەیەی کەلێیەوە هاتوون، واتە بەهیچ جۆرێك نەگەڕێنەوە. هەندێکیش گووتویانە کۆچ تایبەتەبە پێش فەتحی مەککەوە، چونکە لەوکاتەدا بەهۆی کەمی ژمارەی موسوڵمانەکانەوە پێویستیان بەکۆچ هەبووە، بەڵام پاش فەتحی مەککە و لەکاتی زۆربوونی ژمارەی موسوڵمانەکانەوە تەکلیفی کۆچ لەسەر موسوڵمانان نەماوە هەربۆیە موسوڵمانان سەرکەوتن و خوداش زەمانەتی پارێز گاری پێغەمبەرو بانگەوازەکەی لەخراپەی خەڵکی کردووە، هەروەك پێغەمبەر خۆی فەرموویەتی: لەپاش فەتحی مەککەوە کۆچ نیە. بەقسەی هەندێکیش: جێبەجێکردنی کۆچ لەپاش فەتحی ئیسلام بەسەر کەسێکدا بەتاڵە.

وەگروپێکی تریێیان وایە واجب بوونی کۆچ لەکەسێکەوە کەلەپێش فەتحی ئیسلامەوە بیهێنێت کۆچ بکات لەسەری واجب نیە، بەڵام هەموویان پێیان وایە کەلەپاش وەفاتی پێغەمبەر (ص)تەکلیفی کۆچ لەسەر موسوڵمانان نەماوە، چونکە هاوەڵان لەوڕۆژەوە

لەیەکتر جیابوونەتەوە و بەهەموو دونیادا بڵاوەیان کردووە بێجگەلە گەورەیی و خێری مانەوە لەمەدینەدا شتێکی ترنەمایەوە کەهەمان ئەوکۆچەبێت. کەواتە قسەکەی حەجاج بەرامبەر بە سەلەمە کاتێك چوبووە ژیانی دەشتەکیەتەوە (بەهەردوو پێی خۆت گەڕاویتەوە و دەشتەکیەتیت هەڵبژاردووە)عەیبی ئەو ئەوەیە کەبۆچی نیشتەجێبوونی لەمەدینەدا وازلێهێناوە ئەمەش ئامازەیە بەودوعا گێڕدراوەی کەلێرەدا هێاومانە (خودایە ئەوان مەگێڕەوە سەر ئەوڕێگایەی کەلێیەوە هاتوون). وەئەوەی کەگوتوویەتی (دەشتەکیەتیت هەڵبژاردووە)ئامازەیە بەوەی کەئەو چووەتەڕیزی ئەو عەرەبانەی کەکۆچ ناکەن. سەلەمەش لەوەڵامدا ئینکاری هەردوو شتەکەی کرد کەحەجاج تۆمەتباری کردبوو (وازهێنان لەژیان لەمەدینەدا و- دەشتەکیەتی)وگووتی کەپێغەمبەر مۆڵەتی داوە کەدەشتەکیەتی هەڵبژێرێت و ئەم مۆڵەتەش تایبەتە بەوەوە وەك شەهیدبوونی خوزەیمەو کاریلەکەی ئەبو بوردە. یان ئەوەی کەحەجاج تەنهائەوی لەسەر وازهێنانی ژیان لەمەدینەدا سەرزەنشت کردووە، چونکە ئەودەیزانی کەلەپاش وەفاتی پێغەمبەر تەکلیفی کۆچ نەماوە سەلەمەش وەڵامی ئەمی داوەتەوەو بەدەستکەوت زانینی مۆڵەتی پێغەمبەر (ص)بەلای ئەوەوە ژیان لەمەدینەدا باشترە، چونکە گرنکیدانی پێغەمبەر بەو لەناوهەموو خەڵکیدا و تایبەتکردنی ئەو بەوجۆرە مۆڵەتە بێگومان بەجوانی ئەوی ناسیوە.

بەهەرشێوەیەك بێت قسەکەی حەجاج کەبە (تعرب)مانای خراپی دەشتەکیەتی ناگەیەنێت، چونکە مەشروع بوونی کۆچ هەروەك چۆن دەرکەوت هۆکارەکەی یارمەتیدانی پێغەمبەر و پاسەوانی کردن بووە لەبانگەوازەکەی نەوەك بەخراپ زانینی بانگەوازەکەی کەواتە سەرزەنشت کردن لەسەر وازهێنان لەم واجبە بەوشەی (تعرب)بەڵگەی خراپەی دەشتەکیەتی و تعرب نیە، خوداش داناترەو خاوەن کەماڵە.

# بەشی پێنجەم

## لەبارەی ئەوەی کەدەشتەکیەکان دلێرترن لەشارنشینەکان

ئەمەش لەبەر ئەوەیە شارنشینەکان لەسەر خۆشگوزەرانی ورۆچون لەناونازو نیعمەتەکان و جوان پەرستی ڕاهاتوون و، بەرگری کردن لەماڵ و گیانیان داوەتە دەست فەرمان ڕەواکان کەسیاسەتی بەڕێوەبردنی کارەکانیان لەئەستۆدایەو، پشت بەستون بە لەشکروسوپا کەلەهەموو هەڕەشەیەك دەیانپارێزن. هەربۆیە بەهیچ شێوەیەك بیرلە هەڵگرتنی چەك ناکەنەوە و، بەوپەڕی لەخۆبایی بوونەوە دەژین و نەوەکانیشیان لەسەر ئەم بارودۆخە ڕاهاتوون و، لەئەنجامدا خوی ژن ومنداڵانیان گرتووە کەخودا بەگەورەیی خۆی بەرگریان لێدەکات و هیچ جۆرە باوەڕێکیان بەخۆیان نیە و ئەم خووەش وردە وردە بەناخیاندا دەچێتەخوارەوە و لەپاش ماوەیەك دەبێتە سروشت تێیاندا، بەڵام دەشتەکیەکان بەهۆی دووریان لەکۆمەڵگە گەورەکانەوەو بەتەنهایی ژیان لەناوچە دوورەکانداو نەبوونی هێزی تایبەتی پارێزگاری و پاسەوان و نەبوونی شورەو قەڵابەرزو گەورەکانو کەسیان پشتی بەکەسیان نەبەستووە هەربۆیە هەمیشە چەکدارن و لەئامادەباشیدان و بەووردیەوە سەیری ئەوڕێگایانە دەکەن کەپێیدا تێدەپەڕن و ئاگاداری خۆیان دەبن لەهەر مەترسیەك.

ئەوان زۆرکەم دەخەون ئەوەش نەوەك لەجێگەی تایبەتدا واتە لەهەرشوێنێك خەویان هات کەمێك دەخەون، تەنانەت ئەگەر بەسەرپشتی حوشترەکانیشەوەبێت و هاوکات

بەووردیەوە گوێ دەگرن لەودەنگ و سەدایانەی کەلەدوورەوە دێتە بەرگوێیان و لەدەشتە ووشك و بیابانە ترسناکەکاندا سەفەردەکەن و پشت بەخۆیان دەبەستن و چاونەترسی و سەرسەختی بووەتەهێمایەکی دیاری ئەوان، هەرکەس داوای یارمەتی و فریاگوزاریان لێبکات یەکسەر بەهانایانەوە دەچن وبێزارنابن. هەرکاتێکیش شارنشینان لەسەفەردا ببنە هاوڕێی دەشتەکیەکان ئەوا بەهەموو شێوەیەك پشتیان پێ دەبەستن بۆئەوەی پارێزگاریان لێبکەن، لەم کاتەشدا شارنشینەکان هیچ هەڵبژاردنێکیان لەبەر دەستدانیە و چارەنوسیان دەدەنە دەستی ئەوان، ئەمەش بەردەوام بەچاوی خۆمان دەیبینین.

تەنانەت لەڕێنمایکردنیاندا بۆناسینی ڕێگەوبان و سەرچاوەو ناوچەکانیش شارنشینان پشت بەدەشتەکیەکان دەبەستن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەمرۆڤ دەبێتە نەوەی ئەوداب و نەریتانەی کەلەسەریان ڕادێت و نابێتە نەوەی سروشت و میزاجی خۆی لەسەر هەرداب و نەریتێك ڕابێت سەرئەنجام ئەوشتانە جێگەی سروشتی ئەوکەسە دەگرنەوە وەئەگەر ئەم بارودۆخە لێکۆڵینەوەبکەین نمونەگەلێکی زۆرمان لەم بارەیەوە دەست دەکەوێت، (خوداش ئەوەی کەبیەوێت دروستی دەکات).[٢١٩]

---

[٢١٩] (كَذالكَ اللهُ يَخلُقُ مَايَشاء) س ال عمران ئا٤٢.

# بەشی شەشەم

## لەبارەی ئەوەی کە هەڵسوکەوتی هەمیشەیی شاریەکان لە پەیڕەوی فەرمانەکاندا دەبێتە هۆی لەناوچونی سەرسەختی و دلاوەرییان و هەستی سەربەرزیان تێداناهێڵێت

ئەمەش لەولایەنەوەیە کەلەشاردا هەموو کەسێك خاوەنی فەرمان ڕەوایی و ئیختیاری کاری خۆی نیە، چونکە ئەوسەرۆکانەی کەکاروباری خەڵکیان لەدەستدایە بەبەراورد بەخەڵکانی تر کۆمەڵێکی کەمن هەربۆیە زۆربەی خەڵکی ناچارن کەفەرمانبەری ئەوانی ترین و لەژێردەسەلاتیاندابن. ئەگەر ئەوفەرمان ڕەوایە دادپەروەربێت و لەگەڵ خەڵکیدا نەرم بێت ئەوا زۆر بەئاسانی خەڵکی ملکەچی فەرمانەکانی دەبن و لەخۆشی و ناخۆشیدا پشتی پێدەبەستن و لەوەدڵنیا دەبنەوە کەفەرمانڕەوایەکی خراپ لەئارادا نیەو سەرئەنجام متمانە بەدەسەلات دەبێتە خویەکی زاتی و نەگۆڕ تێیاندا، بەلام ئەگەر فەرمانڕەواکە زۆرداربێتو هەڕەشەبێت بۆسەریان دەبینین ڕۆحیەتی دلاوەریو سەرسەختی تێیاندا تێك دەشکێت و نەفسیان فێری قبوڵکردنی ستەم و زەبوونی دەبێت، هەروەك دواتر ئەم بابەتە ئاشکرادەکەین. حەزرەتی عومەر ڕەزای خوای لێبێت ڕێگری لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کرد لەم جۆرە فەرمان ڕەواییە لەوکاتەی کەزوهرەی کوڕی حویە چەك و چۆڵەکانی جالینوسیان کەبەهاکەیان حەفتاوپێنج هەزار پارچە زێڕبوو فڕاند. ئەویش لەشەڕی قادسیەدا شوێنی کەوت و کوشتی وماڵ و سامانەکەی بەغەنیمەت

گرت، بەڵام سەعدماڵەکەی لەزوهرە سەندەوە گوتی: بۆچی لەشوێنکەوتنی جالینوسدا مۆڵەتت لەمن وەرنەگرت؟ لەپاشان مەسەلەکەی بۆ حەزرەتی عومەر بەنامەیەك باسکرد و داوای یەکلایی کردنەوەی مەسەلەکەی لێکرد. حەزرەتی عومەریش لەوەڵامدا نوسی: ڕقت لەکەسێکی وەکو زوهرە دەبێتەوە لەکاتێکدا ئەو ئەرکی خۆی بەجێهێناوە و تۆپێویستە سەرقاڵی ئەو جەنگەبیت و بیگەیەنیتە کۆتایی، بەڵام ڕقت لەودەبێتەوەو دڵی دەشکێنی؟ لەکۆتاییدا حەزرەتی عومەر مۆڵەتی دا ئەوەی کەزوهرە لەدوژمنی وەرگرتووە بیگێڕێتەوە بۆخودی خۆی، بەڵام ئەگەر فەرمانەکان ئەشکەنجەو خواستی توندیان لەگەڵدابێت، ئەوا ڕۆحی سەرسەختی و دلاوەری لەمرۆڤدا ناهێڵێت، چونکە ئازاردانی کەسێك کەنەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات هێندە زەلیل و داماوی دەکات کەبێگومان هەستی سەرسەختیو دلاوەری تێدا ناهێڵێت وەهەرکات لایەنی پەروەردە و فێرکردنیشی هەبێتو هەرلەمنداڵیەوە وەری گرتبێت ئەوا تائەندازەیەك کارلەوکەسەدەکات، بەڵام دیسانەوە هەستی دلاوەری تێدا کەمەوپشتی پێنابەستێت.

هەربۆیە دەبینین عەرەبە وەحشی و دەشتەکیەکان بەبەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی کەفەرمان بەردارن سەرسەخت ترو دلاوەرترن، وەهەروەها کەسانێکیش دەبینین کەڕەنجی فەرمانبەری و بەندایەتی مامۆستاکەیان لەکاتژمێرەکانی سەرەتای فێربوونەوە بەسەردا سەپێنراوەوخویان گرتووە بەفەرمانەکانی ڕاهێنەرەکانیانەوەو پەیڕەوی لەدەستورو فەرمانەکان دەبێتەهۆی کەمبوونەوەی ئەندازەی سەرسەختیو دلاوەرییان و، ئیتر بەهیچ شێوەیەك ناتوانن بەرگری لەمافەکانیان بکەن ئەمەش شێوازی قوتابیانی زانستە کەخوێندنەوەو فێربوونی زانستەکان لەشێخ و پێشەواکانەوە فێردەبن، ئەوانەی کەلەمەجلیسەکاندا هەیبەت لەکاری فێرکردندا بەکار دەهێنن، ئەمەش وادەکات کەسەرسەختی و دلاوەری لەفێرخوازەکاندا کەم بێتەوە یاخود هەرنەمێنێت. بەهیچ شێوەیەك نابێت ئینکاری ئەوەبکەین کە هاوەڵانی پێغەمبەر لەوکاتەی کە ئاین و شەریعەتیان وەردەگرت بەهیچ شێوەیەك لەسەرسەختی و دلاوەریان کەم نەدەبوویەوە،

بەڵکو لەهەموو خەڵکی زیاتر سەرسەختتر و دلێر ترو بەهێزتربوون، چونکە کاتێك موسوڵمانان ئاینەکەیان لەپێغەمبەرەوە (ص)وەردەگرت بەهۆی فەرمانە مژدەبەخش و ترسێنەرەکانەوە کەبۆیان دەهاتن بەرپەرچ دەرەوە و فەرمان ڕەوای ئەوان لەدەروونی خۆیان ڕادەپەڕی و ویژدانی ئاینی ئەوان باشترین فەرمان ڕەوابوو، هەربۆیە بەرپەرچ دەرەوەی ئەوان لەڕێگەی پەروەردەوفێرکردنەوە نەبوو، بەڵکو تەنها لەناوفێربوونی فەرمانەکانی ئاین و ئادابەکانیدا بوو بەجۆرێك فێریان دەبوون کەدەروونیان بۆ پەیڕەوی کردن لێیان ئامادە دەکرد ئەمەش بوو هۆکاری بەهێزی و پتەوی باوەڕو تەصدیق لەواندا. هەربۆیە سەرسەختی و بەهێزی و دلێری ئەمان هەر وەك لەپێشتر پایەدار بوو دیمەنی پیاوەتی و دلێریان ناوئاخنی تەئدیب و فەرمانبەریی نەبوو.

حەزرەتی عومەرخوای لیّ ڕازی بێت دەڵێت: هەرکەسێك شەرع تەربیەتی نەکات خوداش تەربیەتی ناکات. ئەم قسەیە لەڕوانگەی حەزوئارەزوی ئەوبۆئەوبنەمایە کەبەرپەرچ دەرەوەی هەرکەسێك پێویستە دەرونی خۆی بێت و هەربۆیە ئەودڵنیابوو کەخودا بەرژەوەندی بەندەکانی باشتر دەزانێت. لەبەرئەوەی کەباوەڕ بەئاین لەناوخەڵکیدا کەم بوویەوە خەڵکی پەیڕەویان لەفەرمانی فەرمان ڕەواکان دەکرد لەبری فەرمانەکانی خودا وورده وورده شەرع ڕوانگەیەکی زانستی و پیشەیی لەخۆگرتوو، وایلێکرا کەدەبێت شەرع لەڕێگەی فێرکاریەوە فێرببن و خەڵکی خویان بەشارنشینیو پەیڕەوی لەفەرمانەکانی دەسەلأتدارانەوە گرت، هەربۆیە توندی و دلاوەریان کەموکورتی تێکەوت. کەواتە ئەوە سەلمێنرا کەفەرمانی دەسەلأتداران و تەعلیماتە عورفیەکان دەبنەهۆی لەناوچونی سەرسەختی ودلێری، چونکە فەرمان ڕەوا شتێکە لەدەرەوەی خودی ئادەمیدایە، ئەمەلەکاتێکدا حوکمە شەرعیەکان لەناوبەرنین، چونکە بەرپەرچ دەرەوەکەیان زاتی نیە.

هەربۆیە ئەم فەرمانی حاکمانە و تەعلیماتە عورفیەکان لەوهۆکارانەن کەکاریگەرن لەلاوازکردنی دەرونەکان و لەناوبردنی دلاوەری شارنشینەکاندا هەیە لەڕووەوەی

کەدەبێتەهۆی ئەزیەت و ئازاری منداڵ و ئەوەو بەساڵاچووەکانیان، ئەمەلەکاتێکدا دەشتەکیەکان لەم بارووذۆخەوە بەدوورن، چونکەئەوان لەفەرمان و تەعلیمەوە بەدوورن. هەربۆیە محمدی کوڕی باوکی یەزید لەکتێبەکەیدا بەناوی (احکام المعلمین والمتعلمین)دادەڵێت: گونجاونیە کەفێرکار بەمەبەستی تەمبیّ کردن لەسیّ قامچی زیاتر لەقوتابی بدات ئەمەشی لەقازی شورەیحەوە وەرگرتووە کەگوتوویەتی تایبەت کردنی ئەوتەمبێیە بەسیّ قامچیەوە بۆئەو فەرموودەیە دەگەڕێتەوە، کەدەڵێت: لەکاتی هاتنی وەحیدا بۆسەر پێغەمبەر سیّ جار حاڵەتی پەستان و بێهۆشی بەسەرپێغەمبەردا هاتووەو بانگی خەو بۆپێغەمبەر ڕوویدا، بەڵام ئەم بەڵگەهێنانەوەیە لاوازە و گونجاونیە کەچۆنیەتی ناوبراو لەوەحیدا بەڵگەبێت لەسەر ئەم شتە، چونکە مەسەلەی وەحی لەوتەعلیماتە ناسراوانەوە دوورە وخوداش حەکیم و بەئاگایە.[220]

---

[220] (وَهُوَالحَكِيم الخَبِير) س الانعام ئا ١٨ و ٧٣ و هتد.

# بەشی حەوتەم

## لەبارەی ئەوەی کەدەشتەکیەتی بێجگەبۆنەوانەی کەخاوەنی عەصەبەن دەست نادات

دەبێت ئەوە بزانین کەخودا، لەتەبعی مرۆڤەکاندا چاکەو خراپەی دروستکردووە، هەروەك دەفەرمێت:(ڕێنماییمان کردووە بۆلای چاکەو خراپە)[221] وەدەفەرمێت: (خودا ئیلهامی خراپەو چاکەی خستە ناونەفسی مرۆڤەوە)[222]. خراپەش لەهەموو صیفەتەکانەوە لەمرۆڤەوە نزیکترە، بەتایبەت ئەگەر سەرەڕۆیانە لەناولەوەرگەی داب و نەریتەکاندا سەرگەردان ببێت و لەئاینداریەکەیدا خەریکی پاککردنەوەی دەرونی نەبێت ئەمە بێجگە لەوکەسانەی کەخودا ڕێنمایی کردوون وەگەرنا زۆرێك لەخەڵکی کۆمەڵگەکان بەم شێوەیەن. لەو کۆمەڵە نەریتەی کەلەناوخەڵکیدا بوونیان هەیە ستەمکردنە، هەروەك چۆن کەسێك چاوببڕێتەشتومەکی براکەی و هەوڵدەدات بیڕفێنێت، مەگەرئەوەی کەبەرپەرچ دەرەوەکەی لەوکارەبیگێڕێتەوە، هەروەك شاعیردەڵێت: ستەمگەری لەسروشتی مرۆڤە ئەگەرهاتوو کەسێکت بینی کەستەم ناکات ئەوابەدڵنیاییەوە لەبەر هۆکارێکە، بەڵام لەشارە بچوك و گەورەکاندا فەرمانداران هەندێك لەستەمکردن لەوانی تر دەگێڕنەوە و لەڕێگەی دانانی یاساو ڕێساوە بەجۆرێك ژێر دەستەکانیان گوێڕایەڵ دەکەن کەناتوانن

---

[221] (وَهَدَيناهُ النَّجدَين) س البلد ئا ١٠.

[222] (فَألهَمَها فجُورَها وَتَقواها) س الشمس ئا ٨.

دەستدرێژی بکەنەسەر یەکتری، ئەمەش لەڕێگە ئەوڕێگریانەوە دەبێت کەپاشاکان لەبەردەم ئەواندا دایانناون، مەگەرئەوەی کەستەمەکە لەلایەن خودی فەرمان ڕەواکەوە بێت. ئەمەلەکاتێکدا ئەگەر لەدەرەوە هێرش بکرێتەسەرشار ئەگەر غافلگیریان بکەن یان بەشەویدەن بەسەریاندا وەیان لەڕۆژدا نەتوانن بەرگری بکەن، ئەوکات دیوارەکانی شورەی دەوری شارەکە ڕێگری لەدەستدرێژی دوژمن دەکەن وەگەرنا لەکاتی بەرگریدابەهۆی هێزو وورەی بەرزی سەربازەکانی دەوڵەتەوە بەرگری لەشارەکە دەکرێتو دووژمن ڕاودەنێن، بەڵام هۆزە دەشتەکیەکان بەشێوەیەکی تر بەرگری لەخۆیان دەکەن. لەنێوان ئەواندا سەرۆك هۆزەکان ڕێگرن لەستەمی هەندێکیان لەهەندێکی تریان، چونکە هەموویان ڕێزێکی تایبەتیان هەیە بۆسەرۆك هۆزەکانیان.

وەئەگەر لەدەرەوە دوژمن بیەوێت هێرش بکاتە سەریان سەرەڕای پاسەوانەکان لاوانی ناوئەوهۆزانەش چەك هەڵدەگرن و بەرگری دەکەن، ئەم یەکبوون و یەك هەڵوێستیەش بەدی نایەت مەگەر ئەوکاتەنەبێت کەئەندامانی ئەوهۆزە لەیەك خانەدان وبنەماڵەی گەورەبن واتە عەصەبەی یەکتربن، چونکەبەم شێوەیە شانو شکۆ پەیدا دەکەن و دەبنە خاوەن هێزێکی لەبن نەهاتوو، ترسیان دەچێتە دڵی خەڵکەوە، چونکەخۆش ویستنی ڕەگەزی لای هەریەکەلە تاکەکانی هەرهۆزێك بۆهۆزەکەی لەهەمووشتێك گرنگترە بەلایانەوە. خوداش خۆشەویستی خزم و دۆستانی لەدڵی بەندەکانیدا دروستکردووە، هاوکاری نێوان خزمو خوێشان لەخۆشی ناخۆشیدا دەرئەنجامێکی ئەوخۆشەویستیەیە و ئەمەش دەبێتەهۆی دروستبونی ترس و بیم لەدڵی دوژمنانیاندا، خوداش لەم بارەیەوە لەچیرۆکی براکانی یوسف پێغەمبەردا (ع)باسی کردووە دەتوانین پەندی لێوەربگرین: کاتێك براکانی یوسف بەباوکیان گوت چۆن گورگ دەیخوات لەکاتێکدا ئێمە هەموو برای یەکین واتە عەصەبەی یەکینو زۆربەتواناین ئەگەر ئەوەڕوویدات ئەوائێمە لەزیانبارانین[٢٢٣]، مانای ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێت کاتێك

---

[٢٢٣] (لَئِن أكَلَهُ الذِّئبُ وَنَحنُ عُصبَةٌ إنّا إذاً لَخاسِرُون) س یوسف ئا ١٤ .

گروپێکی بەهێز پشت و پەنای کەسێك بن ئەواکەس ناتوانێت ستەمی لێبکات ئێمەش دەبینین چ لەناوخزمانی خۆمان و چ لەناوخەڵکی تردا لەکاتی ئاژاوەو کێشەو بەڵاو موصیبەتەکاندا ئەوانەی کەبێکەسن و پشت و پەنایان نیە کەمترشانازی دەکەن بەخزم و کەسەکانیانەوەو زۆر بێزارو خەمبارن‌و هەوڵی خۆپزگارکردن دەدەن و لەگۆشەو پەناگەیەکدا خۆیان مت دەکەن. هەربۆیە ئەم کەسانەناتوانن لەبیابانەکاندا ببنە دەشتەکی و لەوێدا ژیان بگوزەرێنن، چونکە ناتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن و دەبنە نێچیرێکی ئاسان بۆهۆزو نەتەوە دەسەلاّتدارەکان، ئەوەدەرکەوت کەمرۆڤ لەمەسەلەی ژیان و گوزەراندا پێویستی بەپارێزگاری کردنە ئەوا بەشێوەیەکی باشترو زیاتر لەهەرمەسەلەیەکی تردا، پێویستی بەوپارێزگاری کردنە دەبێت وەك پێغەمبەرایەتی و دامەزراندنی هێزو دەسەلاّت یان بانگەشە بۆهەربانگەوازێك، چونکەبەهۆی ئەوسەرکەشیەی کەلەمرۆڤدا هەیە گەشتن بەئامانج لەهەموو ئەمانەدا بێگومان لەرێگەی شەرو خوێن رێژیەوە دەبێت. هەروەك لەدێرەکانی رابوردوودا باسمان کرد عەصەبیەت بەتایبەت لەجەنگ و پێکدادانەکاندا زۆر پێویستە. ئەم خاڵەش لەوبابەتانەی کەدواتر باسیان دەکەین هاوکات دەبێت لەبەرچاوماندابن و وەك رێنیشاندەر بەکاریان بهێنین. خوداش رێنیشاندەری مرۆڤە بۆسەر رێگەی راست.

•

# بەشی هەشتەم

## لەبارەی ئەوەی کە( عەصەبیەت )لەڕێگەی پەیوەندی نەسەبی و وابەستە بوونی خانەدانەکان بەیەکترەوە یان بە چەمکێکی هاوشێوەی نەسەب بەدی دێت

چونکە پەیوەندی خێزانی بێجگە لەهەندێك شوێندا لەناومرۆڤەکاندا شتێکی سروشتیە. لەوانەش نیشاندانی شانازی کردنی نەتەوەیەك بەخزم و دۆست و کەس و کارەوە، لەوکاتانەی کەڕووبەڕووی ستەم و زۆرداری ببنەوە، چونکە ئەندامی هەرخانەدانێك ببینێت یەکێك لە خزم و نزیکانی ستەمێکی لێکرابێت و دوژمنایەتی کرابێت زۆربێزار دەبێت و جەستەی ئارام ناگرێت و بەسوکایەتی دەزانێت و ئارەزوو دەکات، کەخۆزگە ڕۆژێك بێت و بتوانێت تۆڵەی بۆ بکاتەوە، ئەمەش لەمرۆڤدا عاتیفەیەکی سروشتیە هەرلەوکاتەوەی کەدروست کراوە. هەربۆیەهەرکاتێك پەیوەستبونی خێزانی لەنێوان ئەوانەی کە یارمەتی یەکتری دەدەن زۆر نزیك بێت بەجۆرێك یەکبون و پەیوەندی هەبێت ئەوکات خزمایەتیان ئاشکرادەبێتو ئەم جۆرە نەسەبەش بەهۆی ڕوونیو ئاشکرابوونیەوە بێگومان خوازیاری پەیوەندی خێزانی و یارمەتی دانی یەکتریە، بەڵام هەرکات خزمایەتی تائەندازەیەك لەناوخەڵکیدا کەم بێت ئەوا بەشێك لەتایبەتمەندیەکانی ئەوخانەدانە لەبیر دەچێتەوە و تەنها ناووناوبانگێکی بێ ناوەڕۆکی دەمێنێتەوە، بەڵام لەبەر ئەم ناوبانگە

خزمان و نزیکان ناچاردەبن کەیارمەتی یەکتری بدەن بۆئەوەی کە زەبوونی و بێتوانایی لەخانەدانەکەیانەوە بەدوور بگرن، چونکە پێیان وایە یەکێك لەخزم و نزیکانیان ستەمی لێکراوە. وەمەسەلەی هاوپەیمانی (ولاء)و هاوسوێنی (حلف)یش لەم بابەتەیە، چونکە شانازی نەتەوەیی هەرکەسێك سەبارەت بەهاوپەیمان و هاوسوێنەکەی بەهۆی ئەو پەیوەندیەوەیە کەلەناخیدا جێگیر بووە ئەم سۆزەش کاتێك رادەپەڕێت کەیەکێك لەخزمانی ستەمێکی لێبکرێت و مافی بخۆرێت. نیشاندانی شانازی نەتەوەیی بەرامبەر هاوپەیمان بەهۆی ئەو پەیوەندیەوەیە کەلەهاوپەیمانی (ولاء ) وە دروست دەبێت وەك پەیوەندی خێزانی یان هاوشێوەی ئەو. لێرەدا مانای فەرموودەکەی پێغەمبەر دەردەکەوێت کەدەفەرمێت: (لەنەژاد و نەتەوەی خۆتان هێندەبزانن کەپەیوەندی خزمایەتیتان زیاد بکات). مانای ئەم قسەیەش ئەوەیە کەسودی خزمایەتی تەنها لەدروستکردنی پەیوەندی خزمایەتیدایە و دەبێتەهۆی هاوکاری لەنێوانیانداو، نابێت لەمەش زیاتر چاوەڕوان بین، چونکە پەیوەندی خێزانی بێجگەلەوپەیوەندیە خێزانیە هەمووی وەهمە.

ئەوکات هەرکات ئەم پەیوەندیە خێزانیە ئاشکرابێت بەشێوەی تەبع هەروەك گوتمان، لەناخی وابەستەکان و نزیکەکاندا هەستی شانازی رادەپەڕێنێت، بەڵام ئەگەر خزمایەتی کەسێك تەنها پشتی بەگێڕانەوەی دووربێت ئەواهێزی وەهم لەبارەیەوە لاوازەبێت و، سودی نامێنێت و گرنگی پێدانی کارێکی بێسودە وبەلەهو لەعب دێتە ئەژمار کەلەشەرعدا قەدەغەیە. ئەم گوتەیەی خوارەوەش لەوقسەیەکەدەڵێن: نەسەب زانستێکە فێربوونی سوودمان پێناگەیەنێت و نەزانینیشی زیانی نیە بۆمان. واتە نەسەب ناسی هەرکاتێك لەسنوری روونی دەرچوو چووە ڕیزی زانستەکانەوە ئەوسودو وەهمەی کەلەناخی مرۆڤدا بەهۆیەوە جێگیر دەبێت لەناودەچێتو عاتیفەی شانازی نەتەوەیی کەجوڵێنەری ئەوعەصەبیەتەیە لەناودەچێت و لەم کاتەشدا هیچ سودێکی نابێت. خوداش داناترە.

# بەشی نۆیەم

## لەبارەی ئەوەی کەنەسەبی خالص و تەواو لەنێو وەحشیە بیابان گەرمەکاندا دەبینرێت لەهۆزەعەرەبەکان و ئەوهۆزانەی کەوەك ئەوانن

هۆکارەکەشی ژیانی دژوار و دەست کورتی و خراپی شوێنی نیشتەجێبونیانە کەپێویستی ئەوانی دووچاری ئەم چارەنوسە کردووە. دەشتەکیەتی و ئەم ژیانەقورسە، هۆکارەکەی ئەوەیە کەعەرەبەکان ژیانی خۆیان لەحوشتر داریەوە بەدەست دەهێنن و ناچارن کەچاودێری زان و زۆربوونیان و بارودۆخی لەوەڕاندنیان بن. دیارە کەدەشتە بێ ئاوو گیاکان شوێنی سەختی و برسیەتیە، بەڵام ئەوان خویان گرتووە بەوژینگەیەوەو ڕەگەزیان لەوناچەیەدا پەروەردە بوون و لەئەنجامی داب و نەریتی پێشینانیان نەریتیان وەها بەناخیاندا ڕۆچووە کەبووەتە سیفەتێکی زاتی و سروشتی تێیاندا. هەربۆیە هیچ نەتەوەیەك نایەوێك لەژیاندا بەشداربێت لەگەڵیانداو هاوڕێیەتیان ناکەن،و، ئەگەر کەسێکیشیان ڕێگەی ڕاکردن لەوژیانەی بۆهەڵبکەوێت ئەوا بەزوترینی کات ئەوژیانە بەجێ دەهێڵێت و نەوەکانی پارێزراو دەبن لەتێکەڵی و فەساد (وەك مانگاو مەڕەکان). مەسەلەی نەسەبی ڕاشکاوو خالص دەتوانین لەهۆزەکانی موزەڕ لەقورەیش وکینانەو سەقیف و بەنی ئەسەد و هەزیل و دراوسێکانیان، وەك خوزاعە باس بکەین کەوەك هۆزە ناوبراوەکان لەژیانێکی قورسدا دەژین و شوێنی نیشتەجێ بوونیان خاڵیە لەکێڵگەو ماڵاتو گاو مەڕو کێڵگەو شوێنەئاوەدانەکانی شام و عێراق و سەرچاوەی سەوزایی و

خۆراك و دانەو یّلە وە دووربوون و بەچ شێوەیەك نەسەبیان بەڕێك و ڕاستی ماوەتەوە هیچ شتێکی تێکەڵ نەبووە و پارێزراوە، بەڵام عەرەبەکانی حەمیرو کەهلان کەلەناوچە سەرسەوزو پڕ لەگژوگیاکاندا دەژیان وەك لەخم و جزام و غەسان و تەی و خوزاعەو ئەیاد ئەمانە نەیانتوانیوە نە سە بەکانی خۆیان بپارێزن و هۆزەکانیان تێکەڵی یەکتر بوون و جیاوازی زۆر لەنێوان خانەدانەکاندا هەیە بەجۆرێك خوێنەر هەڵوەستەیان لەسەر دەکات و ئەمەش بەهۆی تێکەڵی و هاتووچۆیان لەگەڵ نەتەوەکانی غەیرەعەرەبی تردا ڕوویداوە، چونکە نەتەوەکانی عەجەم هێندە گرنگی بەنەسەب نادەن ئەمەش تەنها تایبەتەبە عەرەبە دەشتەکیەکانەوە.

حەزرەتی عومەرخودای لیّ ڕازیبێت گوتی: نەسەبی خۆتان فێرببن و وەك نەبەتیەکان سەوادتان لێدێت کەئەگەر کەسێك لەیەکێکیان بپرسێت خەڵکی کوێی لەوەلاّمدا دەڵێت: لەفلاّن شار یان فلاّن گوند. قسەکەی حەزرەتی عومەرئاماژە بەو مانایە کەئەم گروپەی کەلەناوچەکانی نزیك بەئاوەدانیەکانی عێراقدا دەژیان لەژیانی ناوچە بەپیت و فەڕو سازگارەکاندا هاوشان بوون نەسەب و تێکەڵیان فراوان بوو خانەدانەکانیان تێکەڵی خانەدانی خەڵکانی تربوون. وەهەروەها لەسەرەتای ئیسلامیشەوەخەڵکی بەناوی ئەو شوێنەی تێیدا دەژیا بانگ دەکردو بۆنمونە دەیانگوت لەشکری کۆچەریەکانی قونسرین (شارێکەلەشام)و لەشکری کۆچەریەکانی دیمەشق و لەشکری کۆچەریەکانی عەواصیم (وولاّتێکە لەلای ئەنتاکیە). ئەم شێوازەش دزەی کردە ئەندەلوسەوە و لەوێشدا بەکاردەهات. عەرەب ئەنەریتەیان بۆدوورخستنەوەی نەسەبنەکربوو لەخۆیان بەڵکو لەپاش فەتحەوە بەم شێوەیە دەدرانەپاڵ شوێنی نیشتەجێبوونیان تاوەکو ئەوان بەفەتحی ئەوشوێنە بناسرێن. ئەم نەسەبەش بۆئەوان ببووە نیشانەیەکی سەروتر لەنەسەب کەلای فەرماندەکانیان بەوە دەناسرانەوە. هەربۆیە نەسەبەکان دوورخرانەوەو لەپاشانیش هۆزەکان لێك هەڵوەشان و سڕانەوە و بەوهۆیەشەوە عەصەبیەتیش لەشارەکاندا لەناوچوو تەنها لەنێو دەشتەکیەکاندا بەوجۆرەی کەهەبوو مایەوە. (خوداش واریسی سەرزەوی و ئەوانەیە کەلەسەری دەژین).[٢٢٤]

---

[٢٢٤] (انا نحن نرث الارض ومن عليها) س مريم ئا ٤١.

# بەشی دەیەم

## لەبارەی ئەوەی کەئاوێتەبوونی نەسەبەکان بەچ شێوەیەك ڕوودەدات

پێویستە ئەوەبزانین کەیەکێك لەشتەسەلمێنراوو ئاشکراکان ئەوەیەکە هەندێك لەخاوەن نەسەبەکان دەچنەناو نەسەبی خانەدانێکی ترەوە، ئەم کارەش لەڕێگەی خزمایەتی یان هاوسوێنی (حلف)یان هاوپەیمانیەوە (ولا)وەیان بەهۆی ڕاکردنەوە لەهۆز ئەویش بەهۆی ئەنجامدانی تاوانێکەوە ڕوودەدات و ئەوکات بەخانەدانی ئەوگروپە دەژمێردرێن و، لەبەرهەمی شانازی و وەرگرتنی تۆڵەی خوێن و داب و نەریتەکانی تر بەهرەمەند دەبن، وەهەرکات کەسێك لەتایبەتمەندیەکانی خانەدانێك بەهرەمەندببێت هەرچەندە لەڕەگەزێکی تریش بێت وەك ئەوەوایە کەلەو خانەدانەدا لەدایك بووبێت و ئەندامی ئەوخانەدانە بێت، چونکە ئەندامیەتی لەم هۆزەو یان درانەپاڵی ئەم نەسەبە بێجگەلەمەهیچ مانایەکی تری نیە کە داب و نەریت و یاساو ڕێساکانی ئەوان لەبارەی ئەوئەندامەوە جێبەجێ بکرێتو وەك ئەندامێکی نزیکی ئەوگروپە یان ئەوهۆزە بژمێردرێت، لەپاشان هەندێك جار ئەوە ڕوودەدات کەکەسانێك لەدەرەوە دێنەناو هۆزێکەوە بەتێپەڕبوونی کات نەسەبی ئەصڵیان لەبیر دەچێتەوە و، ئەوانەشی ئاگاداری ئەونەسەبەن وردە وردە دەمرن و دواتر زۆربەی خەڵکی لێی بێئاگان. شێوازی ئاوێتەبوونی خانەدانێك لەگەڵ خانەدانێکی تردا و پەیوەندی گروپ و هۆزەکان لەگەڵ

یەکتر ئیتر لەنێوان جاهیلیەت‌و ئیسلام یان لەنێوان هۆزەکانی تری غەیرە عەرەبدا هەبووە، سەرەڕای جیاوازی مێژوو نوسان لەسەر نەسەبی مونزیر و نمونەی ئەمانە تائەندازەیەك ئەم بابەتە ڕوون دەبێتەوە. نمونەیەکی تر بابەتی عەرفەجەی کوڕی هەرسەمەیە لەناوخەڵکی هۆزی بەجیلەدایە لەبەرئەوەی کەحەزرەتی عومەر ئەوی کردووەتە فەرمان ڕەوای بجیلە، ئەوەبوو هۆزی ناوبراو داوایان لەخەلیفەکرد کەلەپۆستەکەی لای بباتو گوتیان: ئەو لەناوئێمەدا بێگانەیەو خۆی بەخەڵکی ئێمەدەزانێت و داوایان کرد کەجەریر فەرمان ڕەوایان بێت. خەلیفەش لەم بارەیەوە لە بجیلی پرسی و ئەویش لەوەلامدا گوتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوان ڕاست دەکەن من خەڵکی هۆزی ئزدم (باوکی هۆزێکە لەیەمەن)و لەناوهۆزەکەمدا کەسێکم کوشت و هاتمەبەجیلەوە.

بەم شێوەیە دەزانین کەعەرفەجە بەچ شێوەیەك تێکەڵی بجیلە بووە بەو ناوەوە ناسراوە و تاوەکو گەشتووەتەپلەی سەرۆکایەتی کردنیان و ئەگەر کەسانێکیش چۆنیەتی ئاوێتەبوون وبێگانەییەکەیان لەنێوهۆزەکەیاندا نەزانیبایەو، ڕۆژگارێکی دوور و درێژ تێپەڕی بکردایە ئەوابەگشتی ئەومەسەلەیە فەرامۆش دەکراوخەڵکی بەتەواوی بەنەوەی ئەوهۆزەیان دەزانی. کەواتە دەبێت ئاگاداری ئەم خاڵەبین و لەنهێنی خودا لەم بوونەوەرەدا پەند وەربگرین و نمونەی ئەم مەسەلانە لەم ڕۆژگارەو ڕۆژگارەکانی پێشوودا زۆرن، خوداش بەچاکەو بەخشندەیی خۆی نیشاندەری ڕێگەی ڕاستە بەمرۆڤ.

# بەشی یازدەهەم

## لەبارەی ئەوەی کە سەرۆکایەتی هەمیشە تایبەتە بەگروپێکی فەرمان ڕەوا لەخاوەن عەصەبیەتەکان

دیارو ئاشکرایە کەهەرهۆزو تیرەیەك (بەتن، حی)کەلەهۆز بچوکترن، هەرچەندە لەڕوانگەی خانەدانی گشتی خۆیانەوە لەیەك گروپ و کۆمەڵەبن، دیسانەوە لەنێو ئەمانیشدا عەصەبیەتی ترلەخانەدانە تایبەتەکان بوونیان هەیە کەپەیوەندیان بەخانەدانی خۆیان و نەسەبی گشتیەوە بەهێزترو نزیکترە، وەك عەشیرەتێك یان ئەندامانی یەك خێزان یان برالەیەك باوکەوە، نەوەك ئامۆزا دوور و نزیکەکان. وەها گروپێك لەلایەکەوە نزیکن لە خێزانی خۆیان و سەری هۆزەکەیانەوە و لەلایەکی تریشەوە لەگەڵ هەموو ئەوعەشایەرانەی کەلەنەسەبی گشتی لەگەڵیاندا بەشدارن وابەستەدەبن و لەئەنجامیشدا شانازی خانەدانی تایبەتی خۆیان دەیانگرێتەوەو بەشدارن و هەموو خزم و دۆستو ئەندامانی هۆزەکە شانازی نەتەوەیی خۆیانیان بۆدەردەبڕن، بەڵام شانازی بەنەتەوەوە سەبارەت بەکەسە بنەڕەتیەکانی هۆزەکە بەهێزترو زیاترە ئەوەش بەهۆی نزیکی نەسەبەوەیە. لەنێوان ئەم خانەدانەشداهەموو کەسێك ناتوانێت سەرۆکایەتی بکات، بەڵکوئەم کارەپەیوەستە بەگروپێکی تایبەتەوە. لەبەر ئەوەی کەسەرۆکایەتی تەنها لەڕێگەی هێزو زاڵبوونەوە بەدەست دێت هەربۆیە پێویستە عەصەبیەت و دەسەلاتی ئەم گروپە تایبەتە لەئەندامانی تری هۆزەکە زۆر زیاتربێت، بۆئەوەی بتوانن بەسەر ئەوانی

تردا زاڵبن و سەرۆکایەتیان بکەن هەرکاتێکیش وەها عەصەبیەتێك هەبێت ئەواپێویستە سەرۆکایەتی ئەوهۆزە لەلایەن ئەوکەسە تایبەتانەوە بکرێت، کەبەهێزن و بەسەر ئەوانی تردا زاڵبوون، چونکە ئەگەر سەرۆکایەتی لەم گروپە بسەندرێتەوە و بدرێتە گروپێکی کەم هێزترین لەوان لەخانەدان و دەسەلآتدا بەهیچ شێوەیەك ئەو سەرۆکایەتیەیان سەرکەوتوو نابێت. کەواتە سەرۆکایەتی بەردەوام لەلقێکەوە بۆلقێکی تر دەگوازرێتەوە و بەپێی تایبەتمەندی زاڵبوون و هێز کەباسمان کرد لەلقەبەهێزەکانەوە ناگوازرێتەوە، چونکە عەصەبیەت و کۆمەڵگە وەك میزاج لەلەبوونەوەرێکی زیندوودایە و کاتێك توخمەکانی بوونەوەرێکی زیندو بەرابەرین میزاجی ئەو بوونەوەرە بەرەو باشتر ناچێت و بەناچاری دەبێت یەکێك لەتوخمەکان زاڵ ببێت وەگەرنا تەکوین بەدی نایەت. وەفەلسەفەی ئەوەی کەلەعەصەبیەتدا زاڵبوون و هێزمان بەمەرج دانا هەرئەمەیە و هەروەك گوتیشمان دەرکەوت کەبەهۆی زاڵبونەوە سەرۆکایەتی هەمیشە لەدەستی گروپێکی تایبەتدا دەمێنێتەوە.

# بەشی دوازدەهەم

## لەبارەی ئەوەی کەسەرۆکایەتی لەخانەدانی عەصەبە* یەکدا بۆکەسێك کەلەنەوەی ئەوان نەبێت گونجاونیەو نایەتەدی

چونکە سەرۆکایەتی بێجگەلەڕێگەی هێزو دەسەلاتەوە نەبێت نایەتەدی و زاڵی و دەسەلاتیش هەروەك باسمان کرد، تەنها لەڕێگەی عەصەبیەتەوە بەدی دێت. هەربۆیە پێویستە سەرۆکایەتی لەدەستی عەصەبەیەکدابێت کەلەهەموو ڕوویەکەوە بەسەر عەصەبەکانی تردا زاڵ بێت و ئەوهێزەش لەلایەن خانەدانی عەصەبەکانی ترەوە بەڕوونی هەستی پێبکرێت‌و ملی بۆکەچ بکەن و گوێڕایەڵی کردنی بەئەرکی خۆیان بزانن. کەسێکیش کەلەدەرەوە دێتەناوهۆزێکەوەو لەوان نیە لەنێوانیاندا عەصەبیەتێکی لەڕێگەی نەسەبەوە نیە، چونکە ئەوبێگانەیەکەو خۆی بەوانەوە لکاندووە و ئەوپەڕی مەیلیان بۆئەو بەرگری کردنیان لێی لەسنوری هاوپەیمانی (ولاء )و هاوسوێنی و (حلف)تێپەڕناکات و ئەم کارەش نابێتەهۆی زاڵبوونی ئەم بەسەر ئەواندا. هەرکات وادابنێین کەئەولەگەڵ ئەواندا پەیوەندی نەسەبی کردووەو لەگەڵ خانەدانی ئەواندا تاوێتە بووە و، ئەوسەردەمەی سەرەتاکە خۆی بەوان داوەتە قەڵەم و بەوان ناسراوبووە و لەبیر کراوە پێویستە بگوترێت ئەویاخود هەریەکە لەپێشینانی بەرلەم پەیوەندە نەسەبیە بەچ

---

* عە صە بە، یان عصبیت. بەمانای پەرۆشی و پابەندی لەرادەبەدەر بۆشتێك یان کەسێك یان نەتەوەیەك دێت.

شێوەیەك سەرۆكایەتیان بەدەست هێناوە؟ ئەمەلەكاتێكدا كەسەرۆكایەتی بەدەست عەصەبەیەكی زاڵەوەیەو نەوەكانیان بەشێوەی پشتاوپشت دەسەڵات دەگرنە دەست و گومانیش لەوەدانیە كەخەڵكی سەردەمەكانی زوو وەهابێگانەیەكیان باش دەناسی كەبانگەشەی نەسەبی ئەمانی بكردایە، ئەم بێگانەییەش ڕێگربووە لەوەی كەببێتە سەرۆك، ئەی كەواتە چۆن بووەتە سەرۆك؟ ئەمەلەكاتێكدا بەوشێوەیەی كەباسمانكرد سەرۆكایەتی دەبێت بۆماوەیی بێت كەبەشایستەیی‌و زاڵی عەصەبیەت بەدەستیان هێناوەو گەشتووە بەوانی تر. زۆرێك لەسەركردەی هۆزو نەتەوەكان كاتێك كەمێژووی خانەدانەكانیان دەبیستن كەتایبەت بووە بەگەورەییەك وەك دلاوەری و بەخشندەیی یان بەهەرشێوەیەك ناوبانگیان دەركردووە، ئەوخانەدانەیان خۆش دەوێت و خۆیان بەوان دەدەنە قەڵەم و لەگێژاوێكدا ڕۆدەچن كەبەبانگەشە خۆیان بەخانەدانێك بزانن و نازانن تاج ئەندازەیەكی گەورە سەرۆكایەتیەكەیان بەباش یان خراپ دەزانرێت. لەم ڕۆژگارەشدا ئەم جۆرە بانگەشەكارانە لەناوخەڵكیدا زۆرن. لەوانەش ئەوبانگەشەیە كە هەموو هۆزەكانی زناتە دەیكەن و خۆیان بەعەرەب دەزانن.

یەكێكی تر لەو بانگەشانە بانگەشەی نەوەكانی ڕوبابە كەبەحیجازییەكانی بەنی عامیر ناسراون و بەبەشێكیش لەگروپەكانی زوغبە دەژمێردرێن، بەڵام ئەوان خۆیان بەنەوەی بەنی سەلیم دەزانن و بانگەشەی ئەوەدەكەن كەباپیریان لەشریدە كەپەیوەستە بەبەنی عامیرەوە و دەڵێن ئەو دارتاش بووە و تابوتی مردووەكانی دروستكردووە و، ئەوكاتەی كەچووەتە لای بەنی عامیر و پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵیاندا پەیدا كردووە، سەرئەنجام بووەتە سەرۆكیان و بەنی عامیر بەحیجازیان زانیوە.

یەكێكی تر لەبانگەشەكانی خانەدانی بەنی عبدالقوی كوڕی عەباس لەهۆزی توجینە كەخۆی بەنەوەی عبدالموتەلیب دەزانێت و، بەهۆی ئەو خۆشەویستیەی كەبۆ ئەم خانەدانە بەڕێزە بەهەڵە نوسینی ناوی عەباسی كوڕی عەتیەیان كردووەتە بیانو، ئەمەلەكاتێكدا هیچ كەسێك هەواڵی ئەوەی نەداوە كەیەكێك لەتاكەكانی خانەدانی

عەباسیەکان هاتبێتە مەغریبەوە، چونکە لەسەرەتای دەوڵەتی عەباسیەکانەوە مەغریب لەژێر کۆنترۆڵی عەلەویە دوژمنەکانیاندا بووە وەك ئیدریسی و عبیدیەکان. هەربۆیە ناکرێت یەکێك لەشیعە عەلەویەکان لەکوڕانی عەباس بێت؟. هەروەها بانگەشەی بەنی زیان (پاشاکانی تلمسان)کەلەخانەدانی بەنی عبدالوادن وەك بانگەشە هەڵەکەی بەنی عبدالقویە، چونکە بەپشت بەستن بەوەی کەلەخانەدانەکەیاندا ناوبانگی پەیدا کردووە کەئەمان لەمندالآنی قاسمن و خۆیان بەخانەدانی قاسمی کوڕی ئیدریس دەزانن و بەزمانی زناتی دەڵێن (ایت القاسم)واتە بەنی قاسمو، پێیان وایە کەئەم قاسمە هەمان قاسمی کوڕی ئیدریس یان قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئیدریسە. باوادابنێین کەئەم بانگەشەیە ڕاستیش بێت دەتوانین بڵێین کەئەم قاسمە لەبنکەی سەرەکی دەسەلآتەکەیدا ڕایکردووە وپەنای بۆئەمان هێناوە، بەلآم دەبێت بپرسین چۆن لەوکاتەی کەئەمان لەقۆناغی ژیانی دەشتەکیەتیدا بوون ئەم بووەتە فەرمان ڕەوایان. ئەگەر واگومان بەرین سەرەڕای ئەوەی ناوی قاسم بووە و گوشتووەتە سەرۆکایەتی تەسەووریکی هەڵەیە، چونکە ئەم ناوە لەنێو ئیدریسیەکاندا زۆرە و پێویست ناکات کەبەهەڵە وابزانن لەبەر ئەوەی کەناوی ئەمان لەو ڕەگەزەیە دەسەلآتیان وەرگرتووە، چونکە سەرچاوەی گەشتنی خانەدانی ناوبراو بەدەسەلآت وگەورەیی، بریتی بووە لەعەصەبیەتەکەیان نەوەك بانگەشەی سەربەنەسەبی عەلەوی یان عەباسیەکان یان هیچ جۆرە هۆکارێکی وەك نەسەب.

بەڵکو ئەم جۆرە بانگەشانە ئەوکەسانە دەیکەن کەلەپاشاکانەوە نزیکن و هەوڵی بەدەست هێنانی دڵیان دەدەن ولەپاشان بەجۆرێك ناوبانگ دەردەکەن کەهیچ کەسێك ناتوانێت دژایەتیان بکات. منیش ئەوەم زانی لەوکاتەی کەئەم نەسەبەیان بۆ یەغمراسنی کوڕی زیان[٢٢٥] گێڕایەوە ئینکاری کردوو بەزمانی زناتی وەلآمی دایەوە و ماناکەشی بەم شێوەیە: (شتە دونیایی و پاشایەتیەکان بەشمشێر بەدەست دەهێنین نەوەك بەنەسەب سودی ئەم نەسەبەش لەودونیا لەلای خودایە)بەم قسەیە خۆی لەنزیکی لەوانەوە

---

[٢٢٥] دامەزرێنەری سەڵتەنەتی بەنی زیان.

دوورخستەوە. یەکێکی تر لەنەسەبە دەگمەنەکان بانگەشەی بەنی سەعدە کەسەرۆکایەتی بەنی یەزید دەکەن کەیەکێکن لەبەشەکانی هۆزی زوغبە. ئەوانیش خۆیان لەنەوەی حەزرەتی ئەبوبەکر دەزانن. وەهەروەها بەنی سەلامە سەرۆکانی بەنی یدللتن لەهۆزی توجین (بربر)ن کەبانگەشەی ئەوە دەکەن لەخانەدانی سەلیمن (عرب)و زوواویدە سەرۆکەکانی هۆزی ڕیاح کەخۆیان بەنەوەکانی برامکە دەزانن. هەروەها بەوشێوەیەی کەئاگاداربوینەتەوە بەنی مهنە (لەئەمیرەکانی هۆزی تەی لەخۆرهەلآت)یش خۆیان بەنەوەی برامکە دەزانن نمونەی ئەم جۆرە بانگەشانە زۆرن. هەروەك چۆن باسمانکرد سەرۆکایەتی ئەم هۆزە خۆی بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر ناڕاستی ئەم بانگەشەیە بەڵکو ئەم سەرۆکایەتیە ئەوەدەسەلمێنێت کەخاوەنی بەهێزترین و ڕاسترین عەصەبیەتەکانن. هەربۆیە دەبێت ئەم خاڵە لەبەر چاو بگرین و لەکەوتنە هەڵە لەم بارەیەوە خۆمان بپارێزین، بەڵام نابێت دانەپاڵی نەسەبی مەهدی مووەحیدان بۆ خانەدانی عە لەویەکان نابێت بەهەڵەی بزانین، چونکەمەهدی لەنێوان هۆزەکەیدا (هۆزی هرغە)لەخانەدانێك نەبوو کەسەرۆکایەتیان هەبێت، بەڵکو ئەو لەپاش سەرقاڵبوونی بەزانست و ئاینەوە و مصامیدە شوێنی بانگەوازەکەی کەوتن و بووەسەرۆکیان. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەنێو گەلەکەی خۆیدا لەخانەدانە مام ناوەندەکان بووە. خوداش زانایە بەئاشکراو نهێنیەکان[٢٢٦]

---

[٢٢٦] (عالِمُ الغَيبِ وَالشَّهادَةِ) س زمر تا ٤٧.

# بەشی سیازدە هەم

## لەبارەی ئەوەی کە خانەدانی ڕاستەقینەو ڕیشەدار تایبەتە بەخاوەنانی عەصەبیەت و لەوانەش بەدەر مەجازی و غەیرە حەقیقیە

چونکە گەورەیی حەسەب و نەسەبی مرۆڤ بێگومان لەڕێگەی خەصڵەت و مەلەکەی چاکەوە بەدی دێت و، مانای خێزان ئەوەیە کەکەسێك لەنێو خزمانیدا گروپێك لەخەڵکی پایەبەرزو گەورە و ناودار هەڵبژێرێت. ئەوکات بەهۆی لەدایك بوونیەوە لەو خانەدانەداو گەڕانەوەی نەسەبی بۆسەر ئەوان ئەویش لەنێو هۆزەکەیدا ڕێزی لێدەگیرێت و ناوی ئەوگروپەش دەبێتەمایەی شانازی بۆئەم، چونکە ویقارو گەورەیی وەها کەسێك بەهۆی شەرافەت و گەورەیی خزمەکانیەوە لەدڵی گروپ و هۆزەکەیدا جێگیر دەبێت و ڕێزو گەورەیی ئەوەی نوێ لەناو خانەدان و هۆزەکاندا بەسراوەتەوە بەسیفەتی پێشینانیانەوە. خەڵکیش لەچۆنیەتی پەروەردەکردن و زاوزێدا وەك کانزاکان‌و سەرچاوەگەلێك وان، هەروەك پێغەمبەر(ص)دەفەرموێت: (خەڵکی وەك کانەکان وان کەهەڵبژێردراو ترینیان لەسەردەمی نەفامیدا (جاهلیە)هەڵبژێردراو ترینیانە لەسەر دەمی ئیسلامدا کاتێك زانستی ئاینیان وەرگرت). کەواتە مانای حەسەب بۆ ئەصڵ و نەسەب دەگەڕێتەوە، ئێمەش لەلاپەڕەکانی پێشوودا ئەم ئەصڵەمان ڕوون کردووەتەوە کە سودو دەرئەنجامی خانەدان عەصەبیەتە، چونکە شانازی نەتەوەیی و هاوکاری کردنی یەکتری لەدووتوێی ئەودا دێتەدی. کەواتە هەرکاتێك عەصەبیەتی هۆزێك بوویە مایەی ترسی

دووژمنان و خانەدانەکانیان داوێن پاك بن و پارێزراوبن لەمەترسی ئەوکات سودی نەسەب باشتر ئاشکرادەبێتو دەرئەنجامەکەی بەهێزتر دەبێت و باسکردنی باپیرانی باش و پایەبەرزیش لەسودی ئەو زیاددەکات. هەربۆیە حەسەب و گەورەیی لەنێو خاوەن عەصەبیەتەکاندا ڕیشەدار و حەقیقیە، چونکە ئەوان لەدەرئەنجامی پێشینان و نەسەب بەهرەمەند دەبن. وەئەندازەی سودمەندبوونی خێزان لە بەرهەمە گەورەکان بەجیاوازی عەصەبیەتەکان ئەمانیش جیاوازن، چونکە تەنها ڕازی ئەم جۆرە گەورەییانە لەهەمان عەصەبیەتدایە. وەئەوشارنشینانەی کەخاوەنی نەسەبی ڕاشکاوی خێزان نین، ناکرێت خاوەن خێزانێکی ڕاستەقینەبن، وەگەرنا وەها وەهمێك بانگەشەیەکی بێهودە دەبوو. هەرکات چۆنیەتی حەسەب لەنێوان خەڵکی شارەگەورەکاندا وەربگرین ماناکەی بەمشێوەیەدەبێت کەفلان پیاوی شاری خزمانێکی سیفەت جوانی هەڵبژاردووە، باوباپیرانێك کە ئاوێتەن لەگەڵ خەڵکی باش و لەخۆبوردوو هەمیشە بەشوێن هێمنی و ئارامی و خۆشگوزەرانیدا گەڕاون، بەڵام ئەم مانایە لەگەڵ تایبەتمەندی ئەوعەصەبیەتەی کە بەدەرەنجامی نەسەب و هەڵبژاردنی نزیکانە جیاوازی هەیە و وەها مانایەکیش کەلەوانەیە بەسەر یەك جۆر لەحەسەب و خێزانێکی مەجازیدا بیڵێین و پەیوەندی مەجازیش بەهەمان پشتاوپشت بزانین کەهەموویان خاوەنی سیفەتە جوان و نەجیبەکان بوون، بەڵام ناتوانین بەحەسەبی ڕاستەقینەو ڕەهای بزانین.

باوادابنێین ئەوەش بسەلمێنرێ کەلەڕوانگەی زمانەوانیەوە حەقیقی بێت، ئەوکات دەبێتە حەقیقەتێکی گوماناوی دەبێت کەهەندێك لەبابەتە یەکەمینەکانن، واتە ئەوانەی کەبەفەرز سەلمێنراون. هەندێك جاریش لەسەرەتاوە خێزانەکان خاوەنی عەصەبیەت و خەصڵەتی گەورەیی و شەرافەتن، بەڵام دواتر هەروەك چۆن باسمان کرد لەئەنجامی شارنشینیەوە ئەم سیفەتە لەدەست دەدەن و لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی تردا ئاوێتەدەبن، بەڵام لەناخی ئەندامانی ئەوخێزانەدا هەمیشە وەسوەسەو خەیاڵاتی پوچی ئەو حەسەبەدەمێنێتەوە و بەوهۆیەوە خۆیان بەخێزانێکی شەریف دەزانن کەخاوەن گروپ و

عەشرەتن، ئەمەلەکاتێکدا ئەم جۆرە تایبەتمەندیەیان نیە، چونکە مەرجی سەرەکی ئەوان عەصەبیەتە کەبەهەموو شێوەیەك لەناوچووە. زۆرێك لەدانیشتوانی شارە گەورەکان کەلەسەرەتاوە لەخێزانە عەرەب و عەجەمەکاندا پەروەردە بوون ئەم وەسوەسەو بۆ چونە بێ هودانە لەسەریان ناکەنە دەرەوە، بەتایبەت ئەم جۆرە خەیاڵە خاوانە لەناو بەنی ئیسرائیلدا ڕەواجیان هەیە، چونکە ئەوان لەیەکەمین خێزانە شەریفەکانی دونیابوون و پێغەمبەرانێکی زۆری تێدا ڕەوانە کردوون هەرلەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمەوە (ع)تاوەکو سەردەمی موسا (ع)کەبەدیهێنەری مەزهەب و شەریعەتی ئەوان بووە، بەدی هاتووە یان ئەوەی کە ئەم بنەڕەتی خانەدانە لەڕێگەی عەصەبیتەوە بەهێزبووە بەهۆی هەمان عەصەبیەتەوە خودا پاشایەتی و مەلیکی بەو نەتەوەیەداوە، بەڵام پاش سەردەمانێك ئەم تایبە تمەندی و سیفەتانەیان لەدەستداوە توشی چارەڕەشی بوونەتەوە و ئاوارەی سەرزەوی بوون و بۆماوەی هەزاران ساڵ لەکەسوکاریان دووربوون و گوێڕایەڵی کافران بوون و بوونەتە خزمەتکاریان، بەڵام هێشتا ئەم جۆرە وەسوەسانە لەسەریاندا پەروەردە دەکەن و باس لەحەسەب و نەسەب دەکەن و لەمەسەلدا دەڵێن: فلان هارونیە، ئەوەلەنەوەی یەشوعە، ئەوەش لەنەسەبی کالبە، و فلانیش لەکوڕانی یەهودە.

لەگەڵ ئەوەی کە هێزو عەصەبیەت بەتەواوی لەناویاندا باری کردبوو چەندین سەدەی دوور و درێژ سەرشۆڕی لەناو ئەوهۆزەدا (بەنی ئیسرائیل)ڕەگوڕیشەی داکوتاوە. وەزۆرێك لەشارنشینان و ئەوکەسانەی کەعەصەبیەتیئەژادی خۆیان لەدەست داوە ئەم جۆرە شتە بێ هودانە دەڵێن و لەکتێبی ختابەدا کەکورتەی زانستەکۆنەکانە ئەبوالولید کوڕی ڕوشد لەمەسەلەی حەسەبدا ڕێگەیەکی هەڵەی هەڵبژاردووە و بەم شێوەیە پێناسەی کردووە: خێزانێکی نەجیب و خاوەن حەسەب بەوکەسانە دەگوترێت کەلەسەردەمەکۆنەکاندا لەشارەکاندا ژیاون، بەڵام ئەوباسی هیچ کام لەو حەقیقەتانەی کەئێمە کرددومانە نەکردووە و خۆزگە بمانزانیایە ئەگەر گەلێك خاوەن هێزو عەصەبیەت نەبوونایە بۆئەوەی

خۆیان لەخراپەکاران بپارێزن و خۆیان لەلای خەڵکی بسەلمێنن تەنها ژیانیان لەشاردا چ سودێکی بۆ حەسەبی ئەوان هەیە؟ پێناسەکەی ئیبن ڕوشد ئەوە دەگەیەنێت کەهەروەك بڵێی ئەو حەسەب تەنهابەباوباپیرو پێشینان زانیوە. لەگەڵ ئەوەی لەهونەری ووتاربێژیدا خەڵکی بەقسەی دڵخۆش کەربەشێوەیەکی کاریگەر دەووروژێنن، ئەم کەسانەش ئەوانەن کە کاروبارەکانیان بەدەستەوەیە واتەئەوەی کەهیچ هێزێکی نیە گرنگی پێنادرێت و ناتوانن لەهیچ ڕێگەیەکەوە واله خەڵکی بکەن کەپشتگیریان بکەن ئەمانەش شارنشینەکانن کەخاوەنی هیچ هێزێك نین، بەڵام ئیبن ڕوشد لەنێو کۆمەڵگەو شارێکدا پەروەردە بووە کەهیچ ئەزمونێکی عەصەبیەتی نەکردووە وخوی بە داب و نەریتەکانیەوە نەگرتووە لەم ڕووەوە لەبابەتی خانەوادەو حەسەبدا تەنها لەسەر ئەوشتە بەناوبانگە کەهەژمارکردنی پێشینانی بەبەس زانیوەو، لەم بارەیەوە نەگەڕاوەتەوە بۆحەقیقەتی عەصەبیەت و کاریگەری لەسەر بونەوەر. خوداش دانایە بەهەمووشتەکان.

# بەشی چواردە هەم

## لەبارەی ئەوەی کەخێزانی مەوالیەکان ( عەبدەکان )و پەروەدەکراوانی خانەدان پەیوەستە بەخاوەنەکانیانەوە ئەوەك بە نەسەبەکانیانەوە

هەروەك لەپێشەوە باسمانکرد کە گەورەیی شەرەفی ڕاستەقینەو ڕیشەدار بێگومان لەخاوەنانی عەصەبیەتەوەیە، هەربۆیە کاتێك ئەمان هۆزێك لەنەتەوەیەکی ترەوە هەڵبژێرن و لەپاش پەروەردەکردن بیخەنە خزمەتەوە یان ببنە خاوەن بەندە و غوڵام، هەروەك چۆن لەبەشەکانی ڕابووردوودا گوتمان ئەم بەندانە پەیوەندی لەگەڵ نەسەبی ئەماندا پەیدابکەن، ئەوکات بەندەکان و پەروەردەکراوەکانی باسکراو لەعەصەبیەتی نەتەوەییدا هاوبەشن لەگەڵیاندا و وەك خزمانی تر لەسەر داب و نەریتی نەتەوەکە ژیان دەگوزەرێنن و لەئەنجامدا تێکەڵ بەنەسەبی خاوەنەکانیان دەبن و دەبنە هاوبەشی نەسەبیان. هەروەك چۆن پێغەمبەر فەرموویەتی (مەولای (عەبد)ی هەرگەلێك لەوگەلەیە) ئیتر جیاوازی ناکات ئەومەولایە هی کڕین بێت یان بە هاوسوێنی بێت دەچێتە ڕیزی خانەدانەکان و پەروەردەکراوەکانەوە، نەسەبی لەدایکبوونەکەی لەم عەصەبیەتەدا سودی نابێت، چونکە ئەونەسەب و عەصەبیەتەی پێشوو لەگەڵ ئەمەی ئێستادا زۆر جیاوازیان هەیە و بەهۆی لەناوچونی تایبەتمەندیەکانی لەکاتی پەیوەست بوونیەوە بەنەسەبێکی ترەوە و لەدەستدانی عەصەبیەتەکەی خۆی بمانەوێت و نەمانەوێت لەڕیزی عەصەبەی دووەمدا دێتە ئەژمار و سەربەوان دەبێت. وەهەرکات چەند پشتێکی ئەم

عەصەبیەتەبگوزەریَ ئەوکات نەوەکانی ئەم لەم خانەدانەدا دەست دەکەن بەهاوپەیمانی (ولاء )، بەلآم ناگاتەئاستی شەرەف و گەورەیی خانەدانی خاوەنەبنەڕەتیەکانیان کەواتە لەهەرشێوەیەکدا دەکەونە پلەیەکی خوار ئەوانەوە، بارودۆخی هەموو بەندەکان لەتەواوی دەوڵەتەکاندا بەم جۆرەیە، چونکە ئەوان بەهۆی ڕۆچونیانەوە بەناو وەلائو هەواداری و خزمەتی دەوڵەتو تێپەڕبوونی چەندین نەوە لەخزمەتگوزاری بەندەییدا، دەگەنە گەورەیی و شەرافەت، دەتوانین ئەم حەقیقەتە لەبارەی مەوالیەکانی سەردەمی عەباسیەکان بەدی بکەین و ببینین کەچۆن خزمەتکارانی تورك لەدەوڵەتی بەنی عەباس و خانەدانەکانی برەمکیەکان و، نوبختیەکان کەبەر لەتورکەکان لەدەرباری عەباسیەکاندا بوون خانەدان و شەرەف و گەورەییان بەدەست هێناوە و هاوپەیمانی و دۆستیان لەگەڵیاندا پێکهێناوە.

هەروەك چۆن نەوەکانی جەعفەری کوڕی یەحیای کوڕی خالید بەهۆی هاوپەیمانی و نەسەبەوە پەیوەست بوون بەنەوەکانی ڕەشیدەوە کەلەشەریفترین خانەدانەکان بوون ئەمەش بەهۆی ئەوەوە نەبوو کەئەو پەیوەندی بەئێرانیەکانەوە هەبێت. بەهەمان شێوەش ڕەگ وڕیشەداری و حەسەب ونەسەبی بەندەو خزمەتکارانی هەردەوڵەتێك بەهۆی گرنگیدانی ئەو دەوڵەتەوەدەبێت بەپەروەردەو هاوپەیمانیەتی لەگەڵیاندا بەدی دێت نەسەبی پێشووی ئەوان لەبەرامبەر نەسەبی تازەدا کەبەدەستی دەهێنن بەگشتی لەبیر دەچێتەوە و بەهیچ شێوەیەك کاریگەری لەبنەڕەتی بوونی ئەماندا ناکات. بەڵکو گرنگ ئەو هاوپەیمانیەتی و نەسەبەیەکەبەهۆی خزمەتکاریان بەو دەوڵەتەوە بەدەستی دەهێنن نەسەبی لەدایك بوونەکەی هەرچیەك بێت بۆ ئەم سودێکی نابێت، بەڵکو شادەماری نەسەبی گرنگی ئەم هەمان نەسەبی دەوڵەت و باش پەروەردەبوونیەتی تێیدا.

هەندێك جاریش لەوانەیە کەسێك لەسەرەتاوە بەهۆی پەیوەستبوونی بەعەصەبیەت و دەوڵەتەوە نەژادێکی شەریف و نەسەبێکی ڕەسەنی هەبێت، بەلآم ئەگەر ئەودەوڵەتە لەناوبچێت و ئەمیش لەڕێگەی وەلائو پەروەردە کردنەوە لەدەوڵەتێکی تردا دەست بکات

بەخزمەتگوزاری ئەوکات نەسەبی یەکەمین هیچ سودێکی بۆئەونابێت، چونکە عەصەبیەتەکەی لەناو چووە و سەریەنەسەبی دووەمە کەخاوەنی عەصەبیەتە. بارو دۆخی برەمکیەکانیش بەم شێوەیە بووە، چونکە هەروەك چۆن مێژوونوسان هێناویانە ئەمانە لەئێراندا لەخانەدانێکی بنەڕەتی بوون کەکاری خزمەتکاری ئاگردانە کانیان لەئەستۆدا بووە و لەبەر ئەوەی کەپەیوەست بوون بە هاوپەیمانی (ولاء )ی خانەدانی عەباسیەکانەوە خانەدانی پێشوویان هیچ بەهایەکی نەماوەتەوە، بەڵکو گەورەیی و ڕێزی ئەمان لەوکاتەوە دەست پێدەکات کەلەدەوڵەتی نوێدا دەستبەکاربوون و پەروەردەیان لەئەستۆی خانەدانی عەباسیەکاندا بووە.

بێجگە لەوەی کەباسمانکرد هەرچی لەم بارەیەوە بگوترێت وەهم و خەیاڵات و وەسوەسە زیاتر نیە کەنەفسە سەرکەشەکان لەمێشکیاندا پەروەردەیان دەکەن و هیچ حەقیقەتێکیان نیە، واقیعیش باشترین گەواهیدەری ئەم قسانەمانە. (بەڕێزترینتان لەلای خودا پارێزکارترینتانە. س الحجرات ئا ١٣).

# بەشی پازدەهەم

## لەبارەی ئەوەی کەکۆتایی حەسەب لەکۆتایی نەوەیەکدا چوارپشتە

ئەوجیهانە کەلەهەرچوار توخمەکە پێکهاتووە بەهەموو ئەوشتانەی کەتێیدایە بوونێکە فەساد وەردەگرێت، ئیتر شتە زاتیەکان بن یان شتە عەرەزیەکان، هەربۆیە بەچاو دەیبینین کەمەوالیدەکانی وەك کانەکان و گیاکان‌و هەموو گیانەوەران هەرلەمرۆڤەوە بیگرە تاوەکو حەیوانەکانی تر فەساد وەردەگرن‌و هەروەها هەموو ئەوحاڵەتانەی کەبەسەر ئەواندادێت دەگۆڕێت بەتایبەت بارودۆخ‌و حاڵەتەکانی مرۆڤ کەبەردەوام دەستەمۆی گۆڕانکاریەکانە هەروەك چۆن زانست و هونەرو نمونەی ئەمانە بەدی دێن و دواتر کۆن دەبن و لەناودەچن. حەسەبیش کە لە شتەعاریزیەکانی مرۆڤەکانە لەم یاسایە ئاراوتە نیەو بەناچار لەناودەچێت و ناتوانرێت بۆهیچ کام لەئافرێنراوەکان شەرەفێك بەدەستبهێنرێت کەلەسەردەمی ئادەمەوە تاوەکو زەمانی ئەو لەباوباپیرانیدا پەیوەست‌و پایەدار بێت، جگەلەوەی کەتایبەت بوو بەپێغەمبەرەوە (ص)کەکەرامەتێکی تایبەتی هەبوو پاسەوان و نهێنی پارێزی خاتەمیەتی ئەوبوو. سەرەتای هەر گەورەیی و شەرەفێك هەروەك گوتویانە حاڵەتێکی دەرەکیە، کە بریتیە لەگەیشتن بەسەرۆکایەتی و شەرەف لەپەستی گوم ناوی و نەمانی حەسەبدایە. بەمانایەکی تر هەرگەورەیی و حەسەبێك وەك هەموو شتە حادیسەکان پێشتر نەبووە، ئەوکات بۆگەشتن بەلوتکەی کەماڵ هێندە بەسە کەبگاتە چوار پشت، چونکە دامەزرێنەری گەورەیی و شەرەف خۆی ئاگاداری ئەوەیە کە

لەڕێگەی پاراستنی ئەوەی کەبەناڕەحەتی بەدەستهاتووە بەناچاریەوە دەبێت ئەوسیفەتو خەصڵەتانەی کەهۆکاری مانەوەی ئەون بپارێزن. منداڵەکەشی کەدوای خۆی دەبێتە جێنشین ئەم شتانە لەباوکیەوە دەبیستێت و فێریان دەبێت، بەڵام کەم و کورتی ئەو لەم بارەیەوە بەئەندازەی کەمو کورتی بیسەری شتێکە بەبەراورد لەگەڵ بینەرەکەیداو، ئەوکات کەنۆرەی کەسی سێیەم دێت ئەو تەنها پەیڕەوی و چاولێکەری دەکات و کەم و کورتی ئەو بەبەراورد بەکەسی دووەم وەك موقەلیدە لەبەرامبەر موجتەهیددا، بەڵام جێنشینی چوارەم لەهەموو شێوەی پێشینان کەم و کورتی دەنوێنێت، ئەوسیفەتەی کەپاسەوانی بینای گەورەیی ئەوانە لەدەستی دەدات و بەبچوکیان دەزانێتو پێی وایە کەئەم بناغەی گەورەیی و شەرەفە بەبێ هیچ جۆرە زەحمەت و ڕەنجێك بەدی هاتووە، بەڵکو وادەزانێت ئەم گەورەیی سەرۆکایەتیە دەبێت بەشێوەیەکی پێویست لەسەرەتای پەروەردەبوونەوە بەچاوپۆشی لەنەسەبی پێشینان تایبەتبێت بەوەوەو پێی وانیە گروپ و عەشیرەت و سیفەت و گەورەیی تایبەت کاریگەربێت لەسەری، چونکە ئەوتەنها خۆی لەنێوان خەڵکیدا بەبەڕێزو گەورە دەزانێت بەبێ ئەوەی کەبزانێت سەرچاوەی بەدیهاتنیان بەچ شێوەیەك بووە و وادەزانێت کەتەنها هۆکاری ئەم سەرۆکایەتیە هەمان ئەو نەسەبەی خۆیەتی.

هەربۆیە خۆی لەنێوان خانەدان و عەصەبیەتەکەیدا پلەیەك بەرزترو گەورەتر دەداتەقەڵەم و پێی وایە بەپشت بەستن بەو پەروەردەیەی کەلەنێوان ئەواندا وەری گرتووە و، بەردەوام پەیڕەویان لەوکردووە و خۆی لەهەموویان بەگەورەتر دەزانێت و بێئاگایە لەوەی کە ئەم پەیڕەوی کردنە خوازیاری خەصڵەتگەلێکە کەباپیرانی بەو سیفەتانە گەشتونەتە ئەوپلەو پایەیە، وەك ڕێز و گەورەیی و دڵدانەوەی هەموو تاکەکانی هۆزەکە بەبێ جیاوازی، بەڵام ئەو بەهۆی ئەم بێئاگایی و لەخۆبایی بونەیەوە سوکایەتی بەوان دەکات وئەوانیش دڵیان لەم دەڕەنجێت و بەکەم سەیری ئەم دەکەن و پشتی تێدەکەن، لەبەرامبەریشدا ڕوودەکەنە کەسێکی تری هۆزەکە، هەرچەندە لەبنەڕەتیشدا

لەوان نەبێت، ڕێزی لێدەگرن و دەیکەنە گەورەی خۆیان، چونکە هەروەك گوتمان خەڵکی باوەڕیان بەعەصەبیەتی گشتی ئەونەوەیە هەیە، دیارە کەسەرەتا ئەو تاقیدەکەنەوە و لەپاش پەسەندکردنی سیفەتە جوانەکان تێیدا دەیگەیەننە گەورەیی و کەم کەم لقی دووەم گەشەدەکات و لقی یەکەم دەژاکێت و باڵەخانەی خانەدانی شەریفی ئەو هەرەس دەهێنێت و دەڕووخێت. ئەم چۆنیەتیەش لەزنجیرەی پاشاکانیشدا دەبینرێت، بەڵام چارەنوسی خانەدانە شەریف و پاشا و ئەمیرەکان و هەموو خانەدانەکانی عەصەبیەت هەریەمشێوەیە و لەنەوەی شاریەکانیشدا دەتوانین ئەم یاسایە بدۆزینەوە، هەرکات خانەدانەکان نزیکی لەناوچون ببنەوە ئەوا خانەدانگەلێکی تر لەهەمان نەوە دروستدەبن. *(ئەگەر بیەوێت ئێوە لەناو دەبات و خەڵکی تر لەشوێنتان دادەنێت ئەمەش بەلای خوداوە ئەستەم نیە)*[٢٢٧].

مەرجدارکردنی حەسەبەکان بەچوار پشت شتێکی قەتعی و سەلمێنراو نیە، بەڵکو بەزۆری وایە وەگەرنا لەوانەیە خانەدانێك کەمتر لەچوار پشت لەناو بچێت و هەندێك جاریش ئەم شتە دەگاتە نەوەی پێنجەم و شەشەمیش، بەڵام لەکاتی لەناوچون و فەوتاندا، لەبەرچاوگرتنی ژمارەی چوار لەهەرچوار پشتەکەدا بەوهۆیەوەیە کەیەکەمیان بنیاتنەرو دووەمیان موباشیرو سێیەمیان چاولێکەرو چوارەمیشیان ڕووخێنەرە، ئەوەش کەمترین ژمارەیەکە کەگونجانێکی ئاسایی هەیە. وەهەندێك جاریش ژمارە چوار بەکۆتا قۆناغی کامڵبوونی حەسەب لەڕووی پیاهەڵدانەوە لەبەرچاو دەگرن، هەروەك چۆن پێغەمبەر (ص)فەرمووی: هەرئەوە کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریم، یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە، ئاماژە بەوەی کەئەو بەوپەڕی نەجابەت و گەورەیی گەیشتووە. لەتەوراتیشدا بەم جۆرە هاتووە: (منم خودای گەورەی تۆ خودای بەتواناو لێهاتوو لێپرسەرەوەی گوناهی باوباپیران هەرلەکوڕانەوە تاوەکوپشتی چوارەم). سفری خروج بابی ٢٠ تا ٥. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کەکۆتایی پشتەکان

---

[٢٢٧] (إِن يَشَأ يُذهِبكُم وَيَأتِ بِخَلقٍ جَدِيد وَما ذالِكَ عَلى اللهِ بِعَزِيز) س ابراهيم ئا ٢٢.

لەحەسەبو نەسەبدا چوارە. خاوەنی ئەغانی لەکتێبی هەواڵی عویف القوافی دا هێناویەتی کە ئەنۆشیروان بەنوعمانی گوتووە: ئایا لەناوعەرەبدا هۆزێك هەیە کە لەهۆزێکی تر بەرێزتربێت؟ نوعمان گووتی بەڵێ. ئەنۆشیروان پرسی: بەچ شتێك؟ گووتی: کەسێك کە سێ پشتی باپیرانی سەرۆکایەتیان کربێت و لەپاشان بگاتە پشتی چوارەم، ئەوکات خانەدانی گەورەیی سەرۆکایەتی تایبەت دەبێت بەوانەوە. ئەوکات ئەنۆشیروان لەبارەی ئەم جۆرە هۆزانەوە پرسیاری لێکرد و ئەویش بێجگە لەم خانەدانانە کە ئەو هەل و مەرجانەیان تێدایە زیاتری بەبیردا نەهات، وەك: خانەدانی حوزەیفەی کوڕی بەدری فزاری کەلەخێزانی "بیت قیس"ن، وە خانەدانی "زولجەدەین" لەخێزانی شەیبان، وە خانەدانی "ئەشعەسی کوڕی قەیس" لەکندە، وە خانەدانی کوڕی زەرارە و خانەدانی قەیسی کوڕی عاصیمی منقری لەبەنی تەمیم.

کەواتە ئەم گروپە عەشایەرەی کەپەیڕەوی ئەوان بوون لەمەجلیسێکدا کۆی کردنەوە و وەرگێڕو ناسێنەری بۆ دیاری کردن، دواتر کروپێك لەمان هەستانەوە و وتاریان داو بەشێوەی پەخشان قسەیان کرد، ئەوانیش بریتی بوون لە: یەکەم حوزەیفەی کوڕی بەدرو دووەمیشیان ئەشعەسی کوڕی قەیس کەئەوکات بەهۆی خزمایەتیەوە لەگەڵ نوعماندا و دوای ئەویش بستامی کوڕی قەیسی کوڕی شەیبان و لەپاش ئەویش حاجیبی کوڕی زەرارە و قەیسی کوڕی عاصیم. ئەنۆشیروان گوتی: هەموو سەرۆك و سەردارانێکی شایستەی پلەو پایەی خۆتانن. ئەم خانەدانە شەریفانە لەپاش بەنی هاشم لەناو عەرەبدا ناودار بوون، خانەدانی بەنی زبیان لەبەنی حرسی کوڕی کەعبی یەمەنیش لەڕیزی ئەواندا بوو. هەموو ئەمانەش ئەوە نیشان دەدات کۆتایی حەسەب چوار پشتی باوەڕپێکراوە. خوداش داناترە.

# بەشی شازدەهەم

## لەبارەی ئەوەی کەنەتەوە وەحشیەکان لەزاڵبون ودەسەلاَتدا لەخەلَکی تر بەتوانا ترن

هەروەك چۆن لەپێشەکی سێیەمدا باسمان کرد لەبەرئەوەی کە دەشتەکیەتی یەکێکە لەهۆکارەکانی دلاوەری، بێگومان ڕەگەزێکی وەحشی لەڕەگەزێکی شارنشین دلاوەر ترە هەربۆیە وەها نەتەوەیەك لەداگیرکردنی سەروەت و سامانی خەلَکیدا بەتواناترن، بەلَکو بارودۆخی نەتەوەیەکی وەحشی بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێت، چونکە ئەم جۆرە نەتەوانە هەرچەندە هەرچی زیاتر لەئاوەدانی نزیك ببنەوە و لەشوێنە نیشتەجێیەکاندا بەنازونیعمەتەوە بژین و خوو بەوژیانەوە بگرن، سیفەت و نەریتە دەشتەکیەکانیان کەم دەبێتەوەو بەهەمان ئەندازەش دلاوەریان نامێنێت، ئەم هەلومەرجەش دەتوانرێت لەگیانلەبەرە کێوی و مالَیەکاندا لێکۆلَینەوە بکەین، ئەگەربێت و گیانلەبەرە وەحشی و کێویەکان بگرین و لەمالَەکاندا بەخێویان بکەین و خۆراکیان جۆراوجۆرببێت دەبینین ئەودڕندەییەیان نامێنێت وهێمن دەبنەوە و، تەنانەت شێوەی ڕۆشتن و زۆرجاریش ڕەنگو شێوەیان دەگۆڕێت و بەگشتی بارودۆخیان ئالَوگۆڕی بەسەردا دێت، مرۆڤە وەحشیەکانیش بەهەمان شێوەن و لەهەموو کایەکانی ژیان و گوزەراندا لەوەحشی بوونەوە بەرەو شاری بوون و مەدەنیەت دەچن. هەرکات بزانین زاڵبوونی گەلان تەنها بەدلێری بەدی دێت و دەبێت سیفەتی دەشتەکیەتیان زیاتربێت لەشارنشینیەکەیان،

بەدڵنیاییەوە لەشەڕ و ئاژاوەکاندا بەسەر گەلانی تردا سەرکەوتوو دەبن، هەربۆیە ئەگەربێت و دووکۆمەڵ بەشەڕبێن و لەڕووی ژمارەو هێزەوە یەکسان بن دەبینین ئەوەیان سەرکەوتوو دەبێت کەخەڵکی دەشتەکی زیاتربێت، یان خەڵکەکەی لەدەشتەکی بوونەوە نزیکتربن. لەم بارەیەوە دەتوانین بارودۆخی هۆزی موزەڕ لەگەڵ حەمیرو کەهلاندا کە لەماڵ و ساماندا زیاتر لەموزەڕ بەهرەمەندبوون، وەهەم لەگەڵ هۆزی ڕەبیعەدا بەراوردیان بکەین کە لەئاوەدانیەکانی عیراقدا دەژیان، دەبینین کەبەهۆی مانەوەی موزەڕ لەدەشتەکیەتدا و ڕووکردنی ئەوانی تر بەرەوژیانی شارنشینی و نازو نیعمەتی دونیا، هۆزی ناوبراو واتە موزەڕ بەسەر هەموویاندا زاڵدەبێت و سەرزەوی هەموویان داگیر دەکات. بارودۆخی بەنی عامیری کوڕی صەعصەعەو بەنی سەلیمی کوڕی مەنصور لەپاش ئەمانیش بەم شێوەیە لەبەر ئەوەی درەنگتر لەهۆزەکانی موزەڕو یەمەن دەستیان لەدەشتەکیەتی هەڵگرت، دەرکەوت کەچۆن هێزو دەسەڵاتیان پارێزراوبوو، هێزی عەصەبیەتیان لەناونەچوو جوان پەرستیو خۆشگوزەرانی جێگەی ژیانی دەشتەکیەتی نەگرتەوە، بەجۆرێك زاڵبوون بەسەر هەموو هۆزەکانی تردا.

وەهەروەها هەریەکە لەهۆزەکانی (احیا)واتە بچوکترین هۆزی عەرەب کەبەبەراورد بەهۆزەکانی تر زوتر بچێتە ناو نازونیعمەتی دونیاوە بێگومان هۆزە دەشتەکیەکان زیاتر چاوی تێدەبڕنو بۆ داگیرکاری لەویش بەتواناترن، هەرچەندە لەچەندایەتی و چۆنایەتیدا یەکسانیش بن. ئەمەش سوننەتی خودایە لەنێو دروستکراوانیدا[228]

---

[228] (سُنَّةَ اللهِ فِي خَلقِهِ) س المؤمنون ئا ٨٥.

# بەشی حەڤدەیەم

## ئەوئاما نجەی کەعەصەبیەت بەئاراستەی دەروات بەدەستهێنانی فەرمانڕەوایی و دەوڵەتداریە

چونکە لەبەشەکانی پێشوودا باسمان کرد کەپارێزگاری و بەرگری و فراوان خوازی کەلەسەری کۆدەبنەوە و لەڕێگەی عەصەبیەتەوە بەدی دێت و، باسی ئەوەشمان کرد کەئادەمیزاد بەسروشتی مرۆڤانەی خۆی لەهەرکۆمەڵگەیەکدا پێویستی بەفەرمانڕەواو بەرپەرچ دەرەوە هەیە کەلەدەستدرێژی کردنە سەر یەکتری بیانگێڕێتەوە. ئەوهێزە فەرمانڕەوایەش دەبێت بەناچاری لەڕێگەی هێزی عەصەبیەتەوە بەسەر خەڵکیدا زاڵببێت وەگەرنا لەکاری فەرمانڕەوایدا توانای نابێت و وەها هێزێکیش پێك نایەت، بەم جۆرە زاڵبون و هێزەش دەڵێن پاشایەتی و دەوڵەتداری کەلەسەرۆکایەتی لەپێشترە، چونکە سەرۆکایەتی جۆرێکە لەگەورەیی‌و کاربەدەستی لەناوخەڵکێکدا کەپەیرەوی لەسەرۆکەکەیان دەکەن بەبێ ئەوەی کەئەوسەرۆکەلەفەرمانەکانیدا ستەم بکات، بەڵام پاشایی بریتیەلەزاڵبوون و فەرمانڕەوایی بەتوپزی. وەهەرکات خاوەنی عەصەبیەتێك بگاتە پلەو پایەیەك ئەوا بێدرەنگ و زۆرخێرا بەدوایدا دەگەڕێت هەروەك چۆن ئەگەر سەرۆکی‌و گەرەیی خەڵکی بەدەست بهێنێت‌و ڕێگەیەکی زیاتر بۆدەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی بدۆزێتەوە ئەوهەلە لەدەست نادات، چونکە گەیشتن بەو بۆمرۆڤ پێویستەو لەخواست و

ئارەزووەکانیەتی ووەها ئامانجێك بەدەست ناهێنێت مەگەر لەڕێگەی عەصەبیەتێکەوە کەبەهۆیەوە خەڵکی پەیڕەوی لێدەکەن. کەواتە ئامانجی عەصەبیەت، هەروەك چۆن ئاشکرابوو، زاڵبوون و دەسەڵات بۆگەشتنە بە پاشایەتی. وەهەروەها دەبێت ئەوەبزانین کەلەهۆزێکدا هەرچەند خێزانی شەریف وبڵاوە کردوو عەصەبیەتە جۆراو جۆرەکان هەبن بەناچار دەبێت لەناویاندا عەصەبیەتێك دروست ببێت کەلەهەموویان بەهێزتربێت و چاوبڕێتە ئەوان و، هەموویان والێبکات کەپەیڕەوی لێبکەن و عەصەبیەتەکانی تر بەجۆرێك پەیوەست بن پێیەوە. هەروەك بڵێی یەك عەصەبەی گەورەن، وەگەرنا لەنێوانیاندا جیایی دروست دەبێت و بەکێشەو پێکدادان کۆتایی دێت.

ئەگەر خوداش ڕێگری لەگروپێك بەگروپێکی ترنەکردایە ئەوا زەوی تێك دەچوو[٢٢٩]. ئەوکات کەسەرۆك هۆزێك بەهێزی عەصەبیەت بەسەرهۆزەکەیدا زاڵدەبێت بەدڵنیاییەوە حەزدەکات بەسەرسەرۆکی هۆزە دوورە کانیشدا زاڵ ببێت لەم کاتەشدا ئەگەر سەرۆك هۆزەکەی تر لەڕووی هێز و عەصەبیەتەوە لەگەڵ ئەمدا یەکسان بێت وبەرگری بکات واتە هاو هێزبن ئەوکات هەریەکەیان فەرمانڕەوایی ناوچەی هۆزەکەی خۆی دەکات وەك هۆزو نەتەوە جیاو دوور لەیەکەکان کەلەدونیادا دەژین. ئەگەر یەکێکیان بەسەر ئەویتردا زاڵبێت و ئەوناچاربکات کەفەرمانبەرداری هۆزەکەی ئەم بێت، ئەوکات پەیوەندی خزمایەتیش لەگەڵ ئەو هۆزەشدا دروست دەبێت وهێزی ئەویش دەخاتە سەرهێزەکەی خۆی بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر خەڵکیدا لەڕێگەی بەدەست هێنانی ئەوپەڕی زاڵبوون و فەرمانڕەوایدا هەنگاو هەڵدەگرێت، هەرچەندە لەئامانجی یەکەم و سەرەکیەوە دووربێت بەهەمان ڕێژە هەوڵی فراوان خوازی دەدات و بەردەوام دەبێت تاوەکوهێزەکەی دەگاتە ئاستی هێزی دەوڵەت و بەرابەردەبێت لەگەڵیدا.

ئەوکات ئەگەر دەوڵەت گەیشتبێتە قۆناغی پیری و لەناوچوون و لەلایەن خاوەنانی دەوڵەت و کاربەدەستانەوە هیچ بەرگریەك نیشان نەدرێت، ئەوا زووبەزوو بەسەر

---

[٢٢٩] (وَلَولا دَفعُ اللهِ النَّاسَ بَعضَهُم بِبَعضٍ لَفَسَدَتِ الأرض) س البقرة ئا ٢٥٢.

ئەودەوڵەتەدا زاڵ دەبێت و فەرمان ڕەواییەکەلەوان دەسەنێت و هەموو وولآت دەخاتە ژێر دەسەلآتی خۆیەوە، بەلآم ئەگەر وەها سەرۆك هۆزێك لەوپەڕی هێزدابێت، بەلآم هاوکات نەبێت لەگەڵ پیری و لاوازبوونی دەوڵەتدا بەڵکو هاوکات بێت لەگەڵ ئەوکاتەدا کەدەوڵەت پێویستی بەپشتیوانی خاوەنانی عەصەبیەت هەیە لەم کاتەی دەوڵەتدا سەرکردەکانی ئەو هۆزو عەصەبیەتە دەیانکاتە پشتیوانی حکومەتەکەی خۆی و لەکاتی پێویستدا پشت بەهێزی ئەوان دەبەستێت و ئەوهۆزە دەگاتە قۆناغێکی دەسەلآت کە لەپلەو پایەی پاشایەتی و دەوڵەت فراوانترو لەپێشترە، وەك تورکەکان لەدەوڵەتی بەنی عەباس و صەنهاجەو زناتە لە دەوڵەتی کتامەو خانەدانی حەمدان لەگەڵ پاشاکانی شیعەی عەلەوی و عەباسیەکاندا. کەواتە ئەوەئاشکرابوو کەئامانجی عەصەبیەتی هۆزەکان پاشایەتی و دەوڵەت داریە کەهەرکات بگاتەکۆتا قۆناغی دەسەلآتی خۆی، بەپێی هەلومەرجو خواستەکان کەگونجاوبن لەگەڵیدا بۆهۆزی ناوبراو پاشیەتی و دەوڵەتداری یان لەڕێگەی سەربەخۆیی و تاك ڕەویەوە یان لەڕێگەی هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتو پشتیوانی لێکردنیەوە بەدی دێت. وەئەگەر ڕێگرگەلێك هۆزەکە لەگەیشتن بەئامانجەکەی بگێڕێتەوە، هەروەك چۆن لەداهاتوودا باسی دەکەین، لەهەمان ئەوپلەو پایەیدا دەمێنێتەوە تاوەکو ئەوکاتەی خودا چارەنوسی دیاری دەکات.

# بەشی هەژدەهەم

## لەبارەی ئەوەی کەخۆشگوزەرانی و جوان خوازی و ڕۆچوون لەنازو نیعمەتدا لەڕێگریەکانی پاشایەتی و دەوڵەتدارین

چونکەهەرکات هۆزێك بەهۆی هێزی عەصەبیەتیەوە هەندێك سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، بەهەمان ئەندازەش هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی بەدەست دەهێنێت و لەگەڵ داراکان و هەبووە کانو خاوەن هێزەکاندا هاوبەشی دەکەنو لەئاسایشو خوشگوزەرانیدا دەژین و، بەئەندازەی سەرکەوتنو ئەودەستکەوتانەی کەبەدەستی دەهێنن، بەو ئەندازەیەشی کەدەوڵەت پشت بەهۆزەکە دەبەستێت هۆزەکەش بەهەمان ئەندازە لەتواناو نیعمەتەکانی بەهرەمەند دەبێت، وەئەگەر دەوڵەت ئەوەندە بەهێزبێت کەهیچ وولآت و نەتەوەیەك لەبرامبەریدا نەتوانێت هاوتایی بکات ئەوا بەهەمان ئەندازەش هۆزەکە دەبێتە خاوەنی شان و شکۆو هێز لەچاوی ئەوانی تردا، چونکە ئەندامانی هۆزی ناوبراو لەکاروبارەکانی دەوڵەتدا بەشداریان پێدەکرێت و ئیتر ئارەزوی بالآ بەبیریاندا نایەت لەوەرگرتنی پلەوپۆستی بالآی دەوڵەتدا بەڵکو تەنها خولیای ئەندامانی ئەوهۆزە ئەوەیە کە هۆکارەکانی ژیان و خۆشگوزەرانی هۆزەکەفەراهەم بکەن و، لەژیانێکی هێمن و ئارامدا بژین وداب و نەریتەکانی پاشایەتی لەشێوازی ژیان و پۆشاك و شوێنی نیشتەجێبووندا فێربن و، لەهەموو داب و نەریت و کارەچاکەکاندا بەشداربن بێگومان ئەمەش کەم کەم لەداب و نەریتی دەشتەکیەتی دووریان دەخاتەوە و دلێری و ئازایەتیان لەناودەبات و توندی و عەصەبیەتی خێڵەکیان ناهێڵێت و زەبوون و بێدەسەلآت دەبن و دەکەونە نازو

نیعمەتەوەو، نەوەکانی دواتریشیان لەسەر ئەم ڕێڕەوە دەچن و هێندە سەرقاڵی بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی دەبن وایان لێدێت هێزو دڵێری عەصەبیەتیان لەبیر دەچێتەوە و لەنەوەکانی دواتریشیاندا عەصەبیەت زۆر لاوازو دەگمەن دەبێت، تاوەکو سەرئەنجام بەیەکجاری لەناودەچێت تابگات بەوەی کە بیرۆکەی پاشایەتی لەسەریاندا پەروەردە بکەن، چونکە سەرقاڵبوون و ڕۆچون بەناو جوان پەرستیدا والەمرۆڤ دەکات کەعەصەبیەتی نەمێنێت و هەرکاتیش عەصەبیەت نەما ئەوا هۆکاری زاڵبوون و بەرگری هۆزیش لەناودەچێت تاوەکو بگات بەوەی کەهەوڵی فراوان خوازی بدەن، چونکە ئەوکات نەتەوەو هۆزەکانی تر ئەمان لەناودەبەن و هەڵیان دەلوشن. هەربۆیە ئەوەئاشکرابوو کەخۆشگوزەرانی و جوانخوازی لەڕێگریەکانی پاشایەتی و دەوڵەتداریە. خوداش موڵکی خۆی بەهەرکەسێك کەبیەوێت دەیبەخشێت.[٢٣٠]

---

[٢٣٠] (وَاللّهُ يُؤتِى مُلكَهُ مَن يَشاء) س البقرة ئا ٢٤٨.

# بەشی نۆزدەهەم

## لەبارەی ئەوەی کە یەکێك لەرێگریەکانی گەشتنی هۆزەکان بە پاشایەتی ودەوڵەتداری بریتیە لەوەی کەستەمیان لێبکرێت وگوێڕایەڵ و ملکەچی خەڵکانی تربن

ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ملکەچی و داماوی جۆش و خرۆشی عەصەبیەت لەناودەبات، چونکە ملکەچی و داماوی هەرهۆزێك نیشانەی لە دەستدانی عەصەبیەتیانەو هێشتا برینی ملکەچی و داماویەکەیان ساڕێژ نابێت، دەبینین لەبەرگریشدا دۆش دادەمێنن و کەسێك نیە لە ناویاندا بیر لەبەرگری و فراوانخوازی بکاتەوە. ئەم مانایەش دەتوانین لەبەنی ئیسرائیلدا بەدی بکەین کاتێك موسا بانگی کردن بۆ وولآتی شام و پێی ڕاگەیاندن کەخودا پاشایەتی و دەسەلآتی ئەو وولآتەی بەوان سپاردووە (بچنە ئەو زەویە پیرۆزەوە کەخودا بۆی دیاری کردوون)[٢٣١]. بەچ شێوەیەك نەیانتوانی ئەم کارە بکەن و گوتیان: (لەو وولآتەدا کۆمەڵێکی ستەمکاری لێیە و ئێمە هەرگیز ناچینە ناویەوە مەگەر ئەوان بێنەدەرەوە کەئەوان هاتنە دەرەوە ئەوکات ئێمە دەچینە ئەوێ)[٢٣٢]. واتە خودا بەجۆرێك لەپەرجووەکانی (معجزە)خۆی بەدەر لەعەصەبیەتی ئێمە ئەوان لەوێدا بکاتە دەرەوە ئەمەش لەپەرجووەکانی تۆیە ئەی موسا، ئەوەبوو کاتێك موسا تورە بوو سوێندی خوارد

---

[٢٣١] (أُدخُلُو الأرضَ المُقَدَّسَةَ الّتى كَتَبَ اللهُ لكم) س المائدة ئا٢١.

[٢٣٢] (إِنَّ فِيها قَومًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لن نَّدخُلَها حَتى يَخرُجوا مِنها) س المائدة ئا ٢٥.

بچێتە ئەوێ و گەلەکەی سەرپێچیان کردو گووتیان: تۆو خوداکەت بچن و شەڕیان لەگەڵدابکەن، هۆکاری ئەمەش تەنها ئەوەبووە کەدەروونیان خاڵی بوو لەبەرگری و فراوان خوازی، هەروەك چۆن مانای ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێت. ئەم حاڵەتەش بەهۆی ئەوەوە بوو کەخوی ملکەچی لەواندا دروست بوبو، چونکە هێشتا زامی ئەو ملکەچی و سەرشۆڕیەی کەبەدەستی قیبتیەکان بەسەریاندا هاتبووسارێژ نەبوبو زۆر بەخێرایی عەصەبیەتیان لەدەستدابوو، سەرەڕای ئەمەش ئەوان بڕوایان بەقسەکەی موسا نەکربووکە فەرموبووی شام هی ئێوەیەو ئەوانە هەرچەندە زاڵم بن بەدەستی ئێوە و بەقەدەری خودا تێك دەشکێن، بەڵام ئەوان بەهۆی ئەو زەلیلی زەبوونیەی کەلەخۆیاندا دەیانبینی بێ توانایيان نیشاندا. لەبەر ئەوەی ئەم بێ توانایی و داماویە بەناخیاندا ڕۆچوبوو هەربۆیە باوەڕیان بەقسەی پێغەمبەرەکەیان نەکرد و دەستیان کردە گاڵتەپێکردنی. هەربۆیە خوداش ئەوانی لە (تیە)کەدەشتێکی ووشك و بێ گژوگیایە بۆ ماوەی چل ساڵ کەلەنێوان میسرو شامدابوو ئاوارە و سەرگەردان کرد. بەوشێوەیە لەوماوەیەدا نەچوونە هیچ شوێنێکی ئاوەدانەوە و هیچ شارو نەتەوەیەکیان نەبینی هەروەك چۆن قورئان باسی کردووە، چونکە لەلایەك دەسەلآتداراتی شام و لەلایەکی ترەوە قیبتیەکان زۆر بەتوندی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردن و هەروەك خۆیان پێیان وابوو توانای بەرەنگاربوونەوەی عەمالیقەو قیبتیەکانیان نیە و، ماناو مەفهومی ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێت کەحیکمەتی تیە و ئەوئاوارە بوونە بریتی بووە لەنابودی و لەناوچونی نەژادێك بووە کەلەچنگی لاوازی و زەبوونیدا گیرۆدە بووە و، خویشی پێوەگرتووە بەجۆرێك کەعەصەبیەتیان لەناوچووە ئەمەش بۆئەوەی لەم ئاوارەیی و دەربەدەریەدا نەوەیەکی تر پەروەردەبێت، کەبەهێزو بەتوانابن و ئاشنایەتیان لەگەڵ ملکەچی و پەیڕەوی کردنی فەرمانەکانی خەڵکیدا نەبێت و زۆر نەناسێت وپەستی نایان ژاکێنێت. ئەوەبوو هەرواش دەرچوو، چونکە لەم ماوەیەدا عەصەبیەتێکی تریان تێدا درووست بوو بەهۆیەوە تواناییان پەیداکردوو دەستیان کردە شەڕکردن و فراوان خوازی و بەسەر

دوژمنەکانیاندا زاڵبوون. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کەماوەی پێویست بۆلەناوچونی نەوەیەك و دروست بوونی نەوەیەکی تر بریتیە لەچل ساڵ، خوداش حەکیم و دانایە. ئەم ڕووداوەش باشترین بەڵگەیە لەسەر گرنگی و گاریگەری عەصەبیەت لەکاروباری بەرگری و پارێزگاری کردن و فراوانخوازیدا ئەوەش دەسەلمێنێت کەهەرهۆزێك عەصەبیەت لەدەست بدات بێبەش دەبێت لەهەموو ئەو سیفەتانەی کەباسکران.

## بەشێك

یەکێکی تر لەهۆکارەکانی داماوی و پەستی هەرهۆزێك کەپەیوەستە بەم بەشەوە، چۆنیەتی باج و خەراجە، چونکە هەرهۆزێك کەملی بۆ باج و خەراج کەچ کرد هەروەك چۆن ملی بۆ داماوی و پەستی کەچ کردووە ئەوا دەبێتە ژێردەستە، چونکە لەدیدی هۆزەکاندا دەرکردنی باج جۆرێکە لەملکەچی و ژێر دەستەیی هەروەك چۆن کەسە گەورەو بەڕێزەکان ئەو شتە بەسەرشۆڕی و زەلیلی دەزانن مەگەر بەزەبری هێز ناچار کرابن بۆ ئەو کارە. لەم بارودۆخەشدا سستی ڕوودەکاتە عەصەبیەتیان و توانای بەرگری کردنیان نابێت و ئەوانەشی کەعەصەبیەتیان بەم جۆرە لاواز بێت و نەتوانن لەبەرامبەر ستەم و زۆرداریەکانەوە بەرگری بکەن و لەخۆیانی دوور بخەنەوە چۆن دەتوانن بەرگری و فراوانخوازی بکەن؟ ئەمانە ملیان کەچ دەکەن و هەروەك پێشتر باسمانکرد. گووتەکەی پێغەمبەریش (ص)لەبارەی کشتوکاڵەوەکەلەصەحیحدا هاتووە بەم مانایە، چونکەکاتێك پێغەمبەر گاسنی لەهەندێك لەماڵەکانی ئەنصارەکاندا بینی فەرمووی: ئەم شتانەئەگەر بچنە هەرماڵێکەوە داماوو تەمبەڵیان دەکات.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باج هۆکاری زەلیلیە. سەرەڕای ئەمەش ئەودەرئەنجامانەی کەلەباج دان و ملکەچیەوە دروست دەبن وەك هەڵخەڵەتاندن کەبەهۆی دەسەلاتی زۆردارەوە دروست دەبێت. هەروەك چۆن لەصەحیصدا پێغەمبەر پەنابەخودا دەگرێت لەباج دانو، لەوبارەیەوە پرسیاری لێدەکەن ئەویش دەفەرمێت: مرۆڤ لەکاتی

دەرکردنی باجدا ئەگەر قسەبکات درۆ دەکات وپەیمان وەعدی درۆینە دەدات. هەربۆیە ئەگەرماتوو هۆزێکمان بینی کەباجدەدەن و زەلیلن بەو هۆیەوە ئەوانابێت بیر لەوەبکەینەوە کەرۆژێك لەرۆژان بگەنە سەرۆکایەتی. لێرەدا قسەی هەڵەی ئەوکەسانەی کە پێیان وایە زناتەی مەغریب مەڕدارو شوان بوون و باجیان داوەتە پاشاکانی سەردەمی خۆیان بەجوانی ئاشکرا دەبێت. ئەم بۆچوونە هەروەك بینیمان هەڵەیەکی زەقە، چونکە ئەگەر ئەم شتە ڕاست بوایە ئەوان نەدەگەیشتنە پاشایەتی نەیاندەتوانی دەوڵەت دروست بکەن.

لەم بارەیەوە لەگوتەی پاشای شاری براز و پاشای دەربەند کەبە عبدالرحمانی کوڕی ڕەبیعەی گووتووە دەتوانین بیری لێبکەینەوە لەبەر ئەوەی کەعبدالرحمان بەسەر شاری برازدا زاڵ بوبو، شاری برازی لێسەندەوە بۆئەوەی کەلەژێر فەرمانی خۆیدا بێت گووتی: (من ئەمرۆ لەئێوەم، دەستم لەناو دەستتاندایەو حەزم حەزی ئێوەیە، بەخێر بێن و خودا پشت و پەناتان بێت. باشترین باجی ئێمە بۆئێوە یارمەتی دانی ئێوەیە و ئەوەی ئێوە حەزی لێبێدەکەن ئەنجامی بدەین و ئێوە ئێمە بەباجدان لاواز دەکەن لەبەرامبەر دووژمنەکانتانەوە.) دەتوانین ئەم قسانە بکەینە بەڵگەیەکی ڕوون لەسەر ئەوقسانەی کەکردمان.

# بەشی بیستەم

## لەبارەی ئەوەی کە حەزکردن لەڕەوشتی پەسەندلەنیشانەکانی دەوڵەتداریە و بە پێچەوانەشەوە

هەروەك چۆن پێشتر باسمانکرد پاشایەتی بۆ مرۆڤ شتێکی پێویست و سروشتیە، چونکە گونجاوەلەگەڵ سروشتی مرۆڤدا، هەربۆیە ئادە میزادبەپێی ئەصڵ و فیترەت و هێزی ئیدراك و چاکە (هێزی گۆیاو عاقڵ)ی خۆی لەڕەوشتی باشەوە نزیکترە تاوەکو ڕەوشتی خراپ، چونکەخراپە لەسیفەتی حەیوانی مرۆڤە کەتێیدایە، بەڵام لەڕوانگە مرۆڤیەکەیەوە ڕووی لەچاکەیەو دەوڵەتداری و سیاسەت لەم ڕووەوە تایبەتە بەوەوە کەئەو مرۆڤەو ئەم دوو شتەش تایبەتن بەمرۆڤەوە نەوەك حەیوان، هەربۆیە ڕەوشتی جوان هەمان ئەو فەزیلەتانەیە کەگونجاوە لەگەڵ پاشایەتی و سیاسەتدا، چونکە تەنها چاکەلەگەڵ سیاسەتدا دەگونجێت. لەبەشەکانی پێشوودا باسمان کرد کەهێزی فەرمانڕەوایی خاوەن ئەصڵ و شادەمارێکە کەلەسەری وەستاوەو حەقیقەتی هێزی ناوبراو هەریەوەدێتەدی. ئەو ئەصڵەش عەصەبیەت و نەژادە و هێزی فەرمانڕەوایی خاوەن لقێکەکەبەهۆیەوە ڕوودەدات و کامڵ دەبێت ئەویش بریتیەلە خەصڵەتە چاکەکان. ئەگەر پاشایەتی و دەوڵەتداری بەئامانجی عەصەبیەت بزانین بێگومان ئەولق و پێداویستیانەی کەپاشایەتی کامڵ دەکەن دەبێت بەئامانجێکی تری عەصەبیەتیان بزانین کەهەمان ئەو ڕەوشتەباشانەن، چونکە هێزی فەرمانڕەوایی بەبێ پێداویستیەکامڵ کەرەکانی وەك بوونەوەرێکی بێدەست و پێ یان وەك مرۆڤێکی ڕووت دەردەکەوێت، کاتێك لەنێوان

خانەدانە نەجیب و بەشەرەفەکاندا عەصەبیەت بەتەنها و بەبێ بەدەستهێنانی ڕەووشتە پەسەندەکان بەکەم و کورت بژمێردرێت ئەوا بەئەولاتر دەسەلآتو دەولەتداری کەئامانجی هەرجۆرە فەرمان ڕە وایی تواناو کەمالی هەرئەصالەت و حەسەبێکە بەبێ خەصلەت و ڕەوشتی جوان و باش بەعەیبدارو کەم و کورت دەژمێردرێت.

سەرەڕای ئەمەش سیاسەت و پاشایەتی و کاربەدەست بوونی خەلك و خەلافەت لەلایەن خوداوە لەناوبەندەکانیایەتی، بۆئەوەی فەرمانەکانی خودایان تێدا جێبەجێ بکەن، فەرمانەکانی خوداش بێجگەلەچاکەو ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی خەلکی شتێکی ترنیە وەهەروەك چۆن شەریعەتەکان ئەم گەواهیە دەدەن، بەلآم حوکمە خراپەکان تەنها لەسەرچاوەی نەزانی و نەفامی ئەهریمەنیەوە سەرچاوەدەگرن بەپێچەوانەی هێزو چارەنوسی خوداوە یە سبحانە، چونکە خودا هەم بکەری چاکەو هەم بکەری خراپەیە و توانای ئەنجامدانی هەردووکیانی هەیە، چونکە تەنها خۆی بکەری ڕەهایە لەم بوونەوەرەدا. کەواتەبۆهەرکەسێك عەصەبیەتێك بەدی دێت کەهێزی ئەو زامن دەکات و خووش بەو سیفەت و خەصلەتەباشانەوە بگرێت کەگونجاون لەگەلّ جێبەجێ کردنی حوکمەکانی ئەودا لەنێو خەلکیدا، وەها کەسێك بۆپلەی خەلافەت لەنێو بەندەکان و لەئەستۆگرتنی کاروبارەکانی خەلکی ئامادەدەبێت و شایستەیی ئەم پلەو پایەیەی تێدا دەبێت. ئەم بەلگەیەش لەبەلگەهێنانەوەکەی پێشوو بەهێزترو ڕاسترە، چونکە ئەوە ڕوون بوویەوە هەرکەسێك خاوەنی عەصەبیەت بێت هەرئەم تایبەتمەندیانە بەلگەیەکی ڕوونن لەسەر شایستەیی ئەو بۆ پاشایەتی..

کەواتە هەرکات خاوەنانی عەصەبیەت وهێز و ئەوکەسانەی کەبەسەر نەتەوە جۆراوجۆرەکاندا زالبوون بەووردیەوە لێکۆلینەوەیان بکەین دەبینین کەئەوان لەڕێگەی ئەنجامدانی کاری چاکەو بەدەستهێنانی خەصلەتە پەسەندەکان حەزێکی زۆر نیشاندەدەن، ئەوسیفەتانەش بریتین لە بەخشین و لێبوردەییو پاوپۆشی لەبێتواناکانو میوانداریو یارمەتی دانی بێنەوایانو ستەمدیدەکانو دەستگرۆیی بێنەواکان و، خۆڕاگری

لەبەرامبەر سەختیەکان و پەیمان بردنەسەرو بەخشینی ماڵ لەڕێگەی ناموس و شەرە فداو ڕێزگرتن لەشەریعەت و ڕێزگرتن لەوزانایانەی کەپارێزەری شەریعەتن‌و پەیڕەوی کردن لەحوکمەکان کاتێك زانایان حوکمەکانیان بۆ دەخوێننەوە و بەکردنی کارێك یان بەڕێگری کردن لەکارێك کە فەرمانیان پێدەکەن و گومانی چاك بردن بەزانایانی شەریعەت‌و باوەڕبوون بەخەڵکی ئاینپەروەرو خواستنی بەرەکەت لەوان و حەزکردن لەوەی کەئەوان دوعایان بۆبکەن بەگەورەسەیرکردنی شێخان و پیرانی ئاین و گوێڕایەڵی کردنیان و بەزەیی هاتنەوە بەبێنەواو پەککەوتەکانداو گوێگرتن لەسکاڵاکانیان و بەندایەتی کردن وئەنجامدانی پەرستشەکان.. دوورکەوتنەوە لەبێوەفایی و فێڵ و پەیمان شکاندن و هاوشێوەی ئەمانە. کەواتەئەوەمان زانی ئەم جۆرە سیفەتانەی دەوڵەتداری لەپیاوانی سیاسەتدا دەبینرێت و هەربۆیە شایستەیی پەیدا دەکەن بۆئەوەی بۆ ژێردەستەکانیان یان بەگشتی سیاسەتمەدار بن و، خوداش بۆ ئەوکارە ڕێنمونی کردوون، چونکە ئەم جۆرە کەسانە بێهودەو بیٚ هۆ ناگەنە سەرۆکایەتی و نەبینراوە کەکەسێك لەڕێگەی بەتاڵەوە بەڕێککەوت گەیشتبێتە دەوڵەتداری، بەڵکو دەوڵەتداری‌و پاشایەتی بۆبەکارهێنانی هێزی عەصەبیەتی ئەمان شیاوترین پێگەو کەماڵات و چاکەکانە.

بەم شێوەیە ئەوەمان بۆدەرکەوت کەخودا پاشایەتی بەمان بەخشیوە. بەپێچەوانەشەوە هەرکات خودابیەوێت ئەم پاشایەتیە لەکەسانێك بسەنێتەوە توشی کردەوەی خراپیان دەکات‌و هەموو سیفەتە باشەکانی دەوڵەتداریان لەبیر دەباتەوەو دەیدات بەکەسانی تر. ئەم کەوتنەش وەك سەرزەنشتی ئەوگەلەیە کەبۆچی دەستیان بەپێداویستیەکانی پاشایەتیەوە نەگرتووە کەخودا پێی بەخشیبوون و سەرقاڵی سیفەتە خراپ و ناپەسەندەکان بوون. (ئەگەر بمانەوێت خەڵکی گوندێك لەناوبەرین فەرمان بەخۆشگوزەرانەکانیان دەکەین ئەوانیش دەست دەکەن بەبێفەرمانی و خراپەودواتر لەناویان دەبەین)[٢٣٣] ئەگەر ئەم شتە لەناوگەلانی پێشوودا لێکۆڵینەوە بکەین

---

[٢٣٣] (وإِذَا أَرَدنا أَن نُهلِكَ قَريَة أَمَرنا مُترَفِيها فَفَسَقوا فِيها فَحَق عَلَيهَا القَولُ فَدَمَّرنَاها تَدمِيرا) س اسرا ئا ١٧.

نمونەگەلێکی زۆرمان دەست دەکەوێت. خوداش هەرچیەك كەبیەوێت دەیئافرێنێت[٣٣٤].
دەبێت ئەوەبزانین لەوسیفەتانەی کەدەبنە مایەی کامڵی مرۆڤ و هۆزەکان کە خاوەنی عەصەبیەتن وحەزیان لێدەکەن وبەنیشانەی دەوڵەتداری دەزانن بریتیە لە بەگەورەزانینی زاناکان و کەسانی شیاو ئەشراف و خاوەنانی حەسەب و بازرگانان و خەڵکەنامۆو بێکەسەکان و، دانانی خەڵکی لەپلەو پایەگەلێك کەشیاویانە، وەگەرنا ڕێزگرتنی هۆزەکانو خاوەنانی عەصەبیەت و عەشایرەکان کەلەشەرەف و گەورەیدا باسی هاوشانی دەکەن هەمیشە لەگەڵیاندا لەکێشەو ململانێدان و لەفراوانخوازی و پلەو پایەدا هاوبەشیان دەکەن، ئەمە شتێکی سرشتیەو زۆرتر جوڵێنەری ئەوان بریتیەلە بەگەورەزانینی ئەم جۆرە کەسانەکەهەستی دەسەلاتخوازی یان ترس لەعەشایری ڕێزدار یان چاوەڕێ کردنی ڕێزی بەرامبەری ئەوانە، بەلام ڕێزگرتن لەکەسانێك کەوەك گروپی یەکەمین نەعەصەبیەتێکیان هەیە و نەپلەو پایەیەك کەهیوایان پێی هەبێت بەهیچ شێوەیەك جێگەی گومان نیەو پاك و بێگەردە، مەبەستیش لەگرنگیدان بەم کەسانە تەنها گەورەیی فەرمانڕەوایی ڕاستەقینەو گەشتنە بەقۆناغی کەماڵی فەزیلەتەکانە ئەو پاشایانەشی کەبەم شێوەیە سۆزیان بەرامبەر بەخەڵکی دەردەبڕن ئەوا گرنگیەکی زۆر بەسیاسەتی خەڵك پەروەری و ڕێزگرتن لەمیوانان و ئەو بێگانانەی کەلەدەرەوە دێن و خاوەنانی فەزیلەتن یاخاوەنی تایبەتمەندی ترن دەدەن، کە دەبێتە هۆی کامڵبوونی فەزیلەتی ئەمان لەسیاسەتی گشتیدا، چونکە ڕێزگرتن لەزانایان و پیاوچاکانی ئاین لەڕوی تەوەسول کردن پێیانەوە لەکاتی ئەنجامدانی مەراسیم و شەریعەتەکاندا پێویستە و ڕێزگرتن لەبازرگانان دەبێتەهۆی هاندانیان و لەئەنجامدا سودی سەرمایەکانیان گشتگیر دەبێت.

ڕەچاوکردنی لایەنی بێگانەکان و غەریبەکان لەڕەووشتە جوانەکان دەژمێردرێت گەیاندنی خەڵکی بەپلەو پایەیەك کەشیاویانە لەویژدان و دادگەریەوەیە. وەئەگەر

---

[٣٣٤] (وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مايشاء وَيَختار)س القصص ئا ٦٨

خاوەنانی عەصەبیەت و هێز ئەم جۆرە سیفەتانەیان تێدابێت دەتوانین پەی بەوەبەرین کەئەوان بەڕاستی سیاسەتی گشتی یان پاشایەتیو دەوڵەتداریان کردووەتە پیشەی خۆیان و خوداش پاشایەتیەکەیانی ڕاگەیاندووە، چونکە بوونی ئەم سیفەتانە نیشانەی بەتوانایی ئەوانە لەسیاسەتی دەوڵەتداریدا هەربۆیەهەرکات خودای گەورە لەناوچونی نەتەوە و دەوڵەتێکی ڕاگەیاند یەکەمین سیفەتێك کەلەواندا نامێنێت بەگەورەزانینی ئەو کۆمەڵە خەلکەیە کەباسمانکردن واتە ڕێزلەوکەسانەناگرن. وەهەرکات ببینین ئەم سیفەتە (واتەبەگەورەزانینی ئەو کەسانەی کەباسمانکردن)لەنێو گەلێکدا نەماوە، ئەوا دەبێت لەوەدڵنیابین کەفەزیلەتەکانیان لەدەستداوە، ئەوکات دەبێت چاوەڕوانی لەناوچونی پاشایەتی و دەوڵەتداریان بین. هەرکاتێکیش خودا خراپەی نەتەوەیەکی بوێت ئەواکەس ناتوانێت ڕێگەی لێبگرێت[٢٣٥]. خودای گەورەش داناترە.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کەنەتەوە وەحشیەکان بەهۆی هێزی بەدەستهێنان و توندو تیژی لەگەڵ گەلانی تردا لەژێر دەستەکردنیاندا بەتوانا ترن، سەرەڕای ئەمەش لەگەڵ نەتەوەکانی تردا وەك گیانەوەرە دڕندەکان کەلەگەڵ حەیواناتی تردا دەجوڵێنەوە ئەمانیش بەهەمان شێوەن لەگەڵ نەتەوەکانی تردا، وەك عەرەب و زناتە و ئەونەتەوانەی کەهاوشێوەی ئەوانن وەك تورکامانەکان و دەمامك دارانی صەنهاجە. ئەم جۆرە نەتەوانە نیشتیمانێکیان نیە تاوەکو لەنازو نیعمەت بێبەشن و سەربەهیچ شارێك نین کەدڵبەندی بن، هەربۆیە هەموو ناوچەکان بەلای ئەوانەوە یەکسانن و تەنها بەفەرمانڕەوایی بەسەر وولآتی خۆیاندا ڕازی نابن و پەلاماری هەرێمەدوورەکان دەدەن و نەتەوە و گەلانی تر دەخەنەژێر دەسەلآتی خۆیانەوە. هەروەك چۆن دەتوانین لەم بارەیەوە گووتەکەی حەزرەتی عومەر خوای لێ ڕازی بێت بەبەڵگە لەسەر ئەم مەسەلەیە بهێنینەوە، لەوکاتەی کەخەڵکی بەیعەت و پەیمانیان دەدایە و هانی دەدان کەعێراق داگیر بکەن گووتی: نابێت

---

[٢٣٥] (وَإِذا أَرادَاللّهُ بِقَومٍ سُوءً فَلا مَرَّدَ لَهُ) س الرعد ئا ١٢.

سەرزەوی حیجازیکەنە ماڵ و شوێنی نیشتەجێبونتان، چونکە ئێوەلێرەدا تەنها دەتوانن گیاو خۆراکی حوشترەکانتان بەدەست بهێنن و تەنها بۆئەم مەبەستە لەم سەرزە مینە دابن. لەکوێن ئەوکۆچەریانەی لەسەرزەوی خۆیاندا کۆچیان کردوو لەشوێنی پەیمانی خودا(مەککە)دوورکەوتنەوە؟ بڕۆن و ئەوسەرزەویانەی کەخودا لەکتێبەکەیدا پەیمانی بەدەستهێنانیانی پێداون داگیر بکەن و خوداش فەرموویەتی: (ئاینی ئیسلام بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا زاڵدەکات هەرچەندە موشریکان پێیان ناخۆش بێت)[٢٣٦]. ئەم بابەتەش لەبارەی عەرەبەکۆنەکانەوە دەتوانین لەبەرچاوی بگرین وەك تەبابیعەو حەمیر کەچۆن بەیەکجار لەیەمەنەوە پەلاماری مەغریبیان دەدا و دواتریش هێرشیان بەرەوعێراقو هیندەبردوو ئەم تایبەتمەندیەش تەنها لەناونەتەوەی عەرب و دەمامك دارانی مەغریبدا (مرابتان)کەدەوڵەتێکی گەورەیان دروستکرد. زەویەکانی ژێردەسەڵاتی خۆیان هەرلەلەوەڕگاکانی خۆیان لەهەرێمی یەکەمدا و لەنزیك سودان تاوەکو هەرێمی چوارەم و پێنجەم لەمەملەکەتەکانی ئەندەلوس فراوانیان کردوو هەمووئەم ناوچانەیان کۆنترۆڵکرد.

بارودۆخی گەلانی وەحشی بەم شێوەیەبوو هەربۆیە دەوڵەتەکەیان فراوان و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان لەناوەندی دەسەڵاتەکانیانەوە زۆر دوور بوون. خوداش ئەندازەی شەو ڕۆژ دادەنێت.[٢٣٧] (هەرئەو تەنهاو زاڵە)[٢٣٨]. هیچ هاوەڵ شەریکێکی نیە[٢٣٩].

---

[٢٣٦] (لِيُظهِرَهُ عَلى الدّينِ كُلِه ولَوكَرِهَ المُشرِكُون) س التوبة ئا ٣٣.

[٢٣٧] (وَاللهُ يُقَدِّرُ اللَّيلَ وَالنَّهار) س المزمل ئا ٢٠.

[٢٣٨] (وَهُوَ الواحِدُ القَهَّار) س الرعد ئا ١٧.

[٢٣٩] (لاشَرِيكَ لَه) س انعام ئا ١٦٣.

# بەشی بیست و دووهەم

## هەرکات پاشایەك لەدەستی هەندێك لەهۆزی گەلێکدا دەربچێت ئەوا بەناچاری دەگەڕێتەوە بۆناوهۆزێك لەوگەلە، وەتاوەکو ئەوکاتەی عەصەبیەت لەناو ئەوگەلەدا هەبێت ئەوا دەسەلآتیان لەدەست دەرناچێت

چونکە پاشایەتی و دەوڵەتداری کاتێك بۆ گەلێك دێتەدی کەلەناو وولآتدا دەستەیەك هەبن، کەلەڕێگەی جۆش و خرۆش و داگیرکاریەوە خەڵکانێکیان ملکەچی خۆیان کردبێتو گەلانی تریش دانیان پێدا بنێن. ئەوکات دەبێت لەناوگروپی زاڵدا خەڵکانێك بۆ تاج و تەخت هەڵبژێرن و ئەوەش ئاشکرایە کەناکرێت هەموو کەسێك بۆئەم مەبەستە دیاری بکرێت، چونکە هەموویان لەوپێناوەدا ماندوو بوون هەربۆیە کۆمەڵێکیان بۆئەم مەبەست دیاری دەکرێن و دوای ئەوەی ئەوگروپە کاروباری دەوڵەتیان گرتەدەست لەنازو نیعمەتدا ڕۆدەچن و، لەدەریای خۆشگوزەرانیدا نغرۆ دەبن و هاوڕێ و دۆستانیان دەکەنە خزمەتکارو لەڕێگەی کاروبارە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتدا لەناویان دەبەن و ناهێڵن هیچ دەستوەردانێکیان لەکاروبارەکانی دەوڵەتدا هەبێت و، بەهرەمەندنابن لەو پلەو پایەو تایبەتمەندیانەی کەدەبوایە بەهۆی نەسەبەوە پێیان بدرایە بێبەش دەبن و هەرلەسەر کاروباری پاراستنی دەوڵەت و نەتەوە بەردەوام دەبن و پیر دەبن، چونکە لە خۆشگوزەرانیدا نەژیاون. هەربۆیە بەهۆی تێپەڕبوونی ڕۆژگارەوە پیری ڕوویان تێدەکاتو خوشگوزەرانیان لەناودەچێت و سەرئەنجام دەبنەخۆراکی ڕۆژگارو لەناو دەچن. هەروەك

کرمی ئاوریشم کەبەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە ولەهەمان کاتی سوڕانەوەدا دەمرێت. لەم کاتەدا ئەوانەی کەهێشتا عەصەبیەت و فراوانخوازی دلێریان ماوە ئەمە بەهەل دەزانن و بەبێ ئەوەی هیچ کیشەو شەڕ و گیرو گرفتێك دەسەلاَت دەگرنە دەست و هەربۆیە بەسەر دژەکانیاندا زالَ دەبن و پاشیەتیان دەستدەکەوێت. ئەم حالَەتەش دیسانەوە و لەپاش تێپەڕبوونی هەمان ماوەی پێشوو کەمێك زیاتر یان کەمتر بەسەر ئەمانیشدا دێت و، ئەوانەی کەلەکاتی دەسەلاَتی ئەمانیشدا بێبەش بوون لەدەسەلاَت و خۆشگوزەرانی لەهەلێکدەگەڕێن بۆئەوەی دەسەلاَت بگرنەدەست.

هەربۆیە لەگلَ بێدەسەلاَت بوون و پیربوونی دەسەلاَتدا هەلَدەگەڕێنەوە وپاشایەتی و دەولَەتداری بۆخۆیان دەبەن. کەواتە پاشیەتی لەنێو هەرگەلێکدا وەك پەناگەیەك وایە کەوولاَت دەیپارێزێت. ئەم بارودۆخەش بەردەوام دەبێت تائەوکاتەی کەئاگری جۆش و خرۆشی عەصەبیەتی ئەمانیش بەتەواوەتی دەکوژێتەوە یان بەتەواوەتی عەشایەری ئەونەتەوەیە لەناودەچن (کورد گوتەنی قەرچۆلَیان دەبڕێتەوە)(وەرگێڕ). (ئەمەش توێشووی ژیانی دونیاو ڕۆژی دواییەوپاشەڕۆژیش هەربۆ لەخوداترسانە)[٢٤٠].ئەم بنەمایەش دەتوانین بەسەر ئەوڕووداوانەی کەبەسەر عەرەبدا هاتوون بەدرێژایی مێژوو جێبەجێ بکەین، چونکەلەپاش لە ناوچونی پاشایەتی عاد، هاونەژادانی ئەمان کەنەتەوەی سەمود بوون دەستیانکردە کاری دەولَەتداری ولەپاش سەمودیش براکانیان عەمالیقەش لەم ڕێگەیەدا ڕاپەڕین و، دوای ئەمانیش هاونەژادەکانیان لەهۆزی حەمیر دەسەلاَتیان گرتە دەست و، دواتریش تەبا بیعە لە هۆزی حەمیرو لەپاشانیش ئەزوا هاتنە سەردەور ئەوکاتیش دەولَەتی عەرەب لەهۆزی موزەڕ دروست بوو.

هەروەها بارودۆخی دەولَەتی ئێرانیەکانیش بەم شێوەیە بوو کەلەپاش لەناوچونی کیانیەکان سیلسیلەی ساسانیەکان گەشتنە دەسەلاَت، تاوەکو خودا لەناوچونی هەموویانی بەنووری ئیسلام ڕاگەیاند. وەهەروەها یۆنانیەکان کەلەپاش ئەمان

---

[٢٤٠] (مَتاعُ الحَيوة وَاللآخِرَةُ عِندَ رَبِكَ لِلمُتَقينِ) س ٤٣ ئا ٣٤.

فەرمانڕەوایی گوازرایەوە بۆ برا ڕۆمیەکانیان. بەریەڕەکانی مەغریبیش لەسەر ئەم ڕەوتەبوون، چونکە لەپاش لەناوچونی یەکەمین پاشایان مغراوە (لەتلمسان)و کتامە(لەقەیرەوان)فەرمانڕەواییەکەیان گەشت بەصەنهاجەو لەپاشان بەدەمامك داران و، دوای ئەوانیش بەمەصامیدە گەیشت کەلەنەتوەکانی زناتە مابوونەوە. (نەریتی خوداش لەنێوان بەندەکانی و دروستکراوانیدا بەم شێوەیە)[٢٤١]. بنەڕەت و بنەمای هەمووئەمانە پەیوەستە بەعەصەبیەتەوەو عەصەبیەتیش لەنێوان نەتەوە و نەژادەکاندا جیاوازی هەیەو پاشایەتی خۆشگوزەرانی و نازونیعمەت دەوڵەتداری هەڵدەوەرێنێت و لەناوی دەبات. هەروەك چۆن دواتر باسی دەکەین. هەربۆیە هەرکاتێك دەوڵەتێك لەناوبچێت ئەوا فەرمانڕەواییەکەیان دەگوازرێتەوە بۆ گروپێکی ترکەلەعەصەبیەتدا شەریك بن، چونکە خەڵکی تەسلیمی عەصەبیەتی ئەوگەلەبوون و ملکەچی بوون و لەمێشکیاندا واجێگیر بووە کەئەوعەصەبیەتە بەسەر هەموو عەصەبیەتەکانی تردا زاڵ بووە وەها عەصەبیەتێکیش لەخانەدانی نزیك بەنەوەی هەمان دەوڵەتی لەناوچوو دەبینرێت، چونکە جیاوازی عەصەبیەتەکانی تر بەپێی نزیکی و دووریانە لەخانەدانێکەوە کەدەوڵەتی تێدا دروست بووە دەگۆڕێت مەگەر ئەوەی کەلەجیهاندا گۆڕانکاری گەلێکی گەورە ڕوویدات، وەك گواستنەوەی گشتی نەتەوەیەك لەجێگەیەکەوە بۆجێگەیەکی یان لەناوچوونی شارستانیەت و ئاوەدانی یان ئەوەی کەخودابەهێزی خۆی ئەنجامی بدات. ئەوکات کاروباری پاشایەتی لەونەژادێکەوە بۆنەژادێکی تر دەگوازرێتەوە کەخودا لەڕێگەی ئەم گۆڕانکاریەوە ڕاپەڕینی ئەونەژادە ڕادەگەیەنێت هەروەك چۆن بۆ هۆزی موزەر ڕوویدا و بەسەر گەل و نەتەوەکاندا زاڵبوون و، فەرمانڕەوانیان لەدەستی خەڵکی وەرگرتەوە لەپاش ئەوەی کەئەونەتەوەیەبۆ چەندین سەدە بێنەوا وبێبەش بوون لەهەموو شتێك.

---

[٢٤١] (سُنَّةَ اللهِ الَّتي قَد خَلَت في عِبادِهِ) س المومنون ئا ٨٥ .

# بەشی بیست وسێیەم

## لەبارەی ئەوەی کەنەتەوەی دۆڕاو هەمیشە حەزی لەچاولێکەری لە شیعارو ئاداب و شێوازی پۆشاك و مەزهەب و داب ونەریتەکانی تری نەتەوەی براوەو سەرکەوتووە

چونکە لەناخی هەرمرۆڤێکدا باوەڕبوون بەکامڵی و لەپێشتر بوون کەگاڵتەبەنەتەوەی شکست خواردوودەکات بەدی دێت، ئەمەش یان بەهۆی ئەوەوەیە کەئەم بیروباوەڕە لەبەگەورەزانین و ئەوڕێزەیە کەنەتەوەی شکست خواردوو لەنەتەوەی سەرکەوتوو دەیگرن، یان بەهۆی ئەوەوەیە کەنەتەوەی یەکەم لەفەرمانبەری لەنەتەوەی دووەمدا هەڵە دەکەن و لەبری ئەوەی کەگوێڕایەڵی بەهۆکاری سروشتی ئەونەتەوەیە بزانێت، بەکامڵی و تەواوی نەتەوەی ناوبراوی دەزانێت، هەرکاتێکیش وەها بیرکردنەوەیەکی هەڵە لەناونەتەوەی شکست خواردوودا درووست ببێت و بۆماوەیەك لەسەری بەردەوام بن سەرئەنجام دەبێتە بیرو باوەڕ، کەواتە چاولێکەری لەهەموو داب و نەریتێکی نەتەوەی سەرکەوتوو دەکات و خۆی وەك ئەولێدەکات و خۆی دەچوێنێت بەوەوە، ئەمەش مانای شوێنکەوتەیی و چاولێکەریە. یان سەرچاوەی چاولێکەری لەنەتەوەی سەرکەتوو ئەوەیەکەسەرکەوتنی سەرکەوتووە کان بەدلێری و هێزی ئەوانی نازانێت بەڵکو وادەزانێت ئەم زاڵبوونە بەهۆی داب و نەریت و شێوەی ژیانی ئەونەتەوەیەوە بەدی هاتووە. دیسانەوە لەهۆکاری سەرکەوتنەکەدا هەڵەدەکات و دەگەڕێتەوە سەربارودۆخی یەکەم.

بەهۆی ئەم جۆرە هەڵانەوە دەبینین نەتەوەی شکست خواردوو ئیتر لەجۆری پۆشاك یان سواری یان چەك یان تەنانەت شێوە و ڕەنگی جل وبەرگدا بەردەوام چاولێکەری لەنەتەوەی سەرکەوتوو دەکات. ئەم چاولێکەریەش دەتوانین لەنێوان باوکان و کوڕەکاندا ببینین، لەبەر ئەوەی کەباوك خاوەن هێزوو دەسەلاتی یەکەمە لەماڵەوە دەبینین کوڕان زیاتر هەوڵی ئەوە دەدەن چاولێکەری باوانیان بکەن، چونکە باوانیان بەکامڵتردەزانن. ئەگەر سەیری هەرووڵاتێکیش بکەین دەبینین کەچۆن گەلەکە چاولێکەری لەسەرۆك و پاشاو لێپرسراوانی وولات دەکەن لەهەڵسوکەوتوو جل و بەرگ و شێوازی ژیاندا. تەنانەت ئەگەر دوودەوڵەتی دراوسێ کەیەکیکیان زاڵتر بێت بەسەر ئەوی تریاندا دەبینین نەتەوەی دۆڕاو بەهەموو شێوەیەك چاولێکەری لەنەتەوەی سەرکەوتوو زاڵ دەکات.

هەروەك چۆن ئەم بارودۆخە ئێستاکەش لەنێو موسوڵمانانی ئەندەلوس لەگەڵ نەتەوەکانی جلاقەدا دەبینرێت، هەربۆیە دەبینین خەڵکی ئەو وولاتە لەچۆنیەتی پۆشینی جلو بەرگ و شێوازی ژیان، وەك ڕازاندنەوەی ماڵ و باڵەخانەکان و ئارایشت و داب و نەریتدا چاولێکەری لەوان دەکەن. کەئەگەربێت و مرۆڤ بەدیدێکی دانایانەوە بڕوانێتە ئەم شتە بۆی دەردەکەوێت ئەمەنیشانەی زاڵبوونە. لێرەشدا دەبێت بیر لەو گووتەیە بکەینەوە کەگووتراوە: (خەڵکی بەگشتی لەسەر ئاینی پاشاکانیانن)مانای ئەم مەسەلەیەش لەم یاسایەدەژمێردرێت، چونکە پاشا زاڵە بەسەر ژێردەستەکانیداو ئەوانیش چاوی لێدەکەن، لەبەر ئەوەی کەبیرو باوەڕی خەڵکی بەپاشاکان وەك بیرو باوەڕی کوڕانە بەباوکەکان و قوتابیان بەمامۆستاکانیانە، خوداش داناو زانا ترە.[٢٤٢]

---

[٢٤٢] (وَهُوَ العَلِيمُ الحَكِيم) س یوسف ئا ٨٣ .

# بەشی بیست و چوارەم

## هەرکاتێك نەتەوەیەك شکست بخوات
## ئەوابەخێرایی بەرەو لەناوچوون دەڕوات

چونکە هەرکاتێك فەرمانڕەوایی گەلێك لەناوبچێت و دووچاری ژێردەستەیی سەرشۆڕی ببنەوە و پشت بەوان ببەستن ئەوکات ئارەزوو هیوا کانیان کورت و سست دەبن، ئەمەلەکاتێکدایە زاوزێ و وەچەخستنەوە و ئاوەدانی بەهۆی ئومێدو هیواوە دەبێت و ئەوشتانەی کەئەمانەی پێ دێتە دی بریتین لەچالاکی و جوڵانەوە و هێزی حەیوانی، هەربۆیە هەرکاتێك سستی و زەبوونی بەسەر گەلێکدا زاڵ ببێت ئەوسیفەت و نەریتانەی کەلەئومێد و هیواوە سەرچاوە دەگرن لەمرۆڤدا نامێنن و عەصەبیەتیش بەهۆی زاڵی دوژمنەوە لەناودەچێت دیارە کەئاوەدانی و، شارستانیەتی وەها نەتەوەیەك کەم و کورت دەردەچێت و هەوڵ و کۆششیان لەڕێگەی پێشکەوتن و شارستانیەتدا بەهەدەر دەڕوات و دەبێتە هۆی شکانی سوپاو لەشکرو یەکیەتیان کەبەهۆی سەرشۆڕیەوە توشیان بووەو ناتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن، لەبەرامبەر هەمووگەلێکدا ئیترگەشتبنە کەماڵ و دەوڵەتداری یان نەگەشتبن. لەم شتەشدا خودا داناترە مەسەلەیەکی ترهەیە. ئەوەش ئەمەیە کەبەهۆی ئەوەی کەخودا مرۆڤی کردووەتە جێنشینی هاوشێوەکانی خۆی لەسەر زەویدا وەك سەرۆکی بوونەوەران ئافراندویەتی و هەرکاتێك سستی زەبوونی ڕووی تێبکات ئەوکات لەبەردەم فەراهەم کردنی پێداویستیەکانی وەك تینویەتی و

برسیەتیشدابێتوانا دەبێت، ئەم حاڵەتەش لەڕەوشتی مرۆڤدا هەیە، هاوشێوەی ئەمەشیان لەنێو گیانلەبەرە درندەکاندا گێڕاوەتەوە و گووتویانە هەتا لەبەندی مرۆڤدا بن زاوزێ ناکەن. هەربۆیە ئەونەتەوە و گەلانەی کەبەم شێوەیە دیلی گەلانی ترین بەردەوام ڕێگەی لەناوچون دەگرنەبەرو جەماوەریان کەم دەبێتەوە و سەرئەنجام لەناودەچن. ئەم بابەتەش دەتوانین لەناوگەلی ئێراندا تێبینی بکەین کەچۆن بەهۆی فراوانی خاك و زۆری خەڵکەوە سەرتاسەری جیهانیان خستبووە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە و لەبەر ئەوەی لەڕۆژگاری عەرەبدا هێزەکانیان شکستی هێنا، گروپێکی زۆرگەورەیان لێ مایەوە، هەروەك دەگێڕنەوە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ژمارەی خەڵکی ئەولای مەدائینی بەدەست هێنا ژمارەیان سەدوسی و حەوت هەزار کەس بوون و، حەوت هەزاریان لەسەرکردەی خێزانی سەرۆکەکان بوون، بەڵام هەرکە ئەو وولاتە کەوتە ژێر دەسەلاتی عەرەبەوە لەپاش ماوەیەکی کەم پوکانەوە و لەناوچوون هەروەك بڵیی لەژیاندا نەبوبن. وەنابێت گومانی ئەوەبکەین کەزوڵم و ستەمیان لێکراوە، چونکە دادگەری ئیسلامی لای هەمووان ئاشکرایە، بەڵام هەرسروشتی مرۆڤ وایەکەهەرکات نەتەوەیەك شکست بخوات و کاروبارەکانی بکەونە ژێر دەستی کەسانی ترەوە چارەنوسی فەوتان و لەناوچون دەبێت. هەربۆیە دەبینین ڕەش پێستەکان زیاتر دەکرێنەکۆیلە و ژێر دەستە، چونکە لەگیانلەبەرانەوە نزیکترن و سروشتی مرۆڤیان کەم وکورتی تێدایە.

یان هەندێك نەتەوەهەن بۆبەرژەوەندی تایبەت دەبنە بەندەو خزمەتکاری گەلانی تر وەك تورکەکان لەخۆرهەلات (خزمەتکارانی بەنی عەباس و فاتمیەکان)و کافرانی جەلالیقەو فەرەنگیەکانی ئەندەلوس کەئەم کارەیان کردووە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەنەتەوەکانی ناوبرا گوێیان لەوەنیە کەببنە ژێردەستە، چونکە پێیان وایە لەم ڕێگەیەوە دەگەنە پلەو پایەی بەرز. خوداش داناترە و بێ هەڵەیی شایانی خۆیەتی.

# بەشی بیست و پێنجەم

## لەبارەی ئەوەی کەنەتەوەی عەرەب تەنها دەتوانن شوێنە تەختەکان (ناکوێستانی) بەدەست بهێنن

چونکە ئەم نەتەوەیە بەهۆی ئەونەریتەی کەهەیانە خوویان بەتالآنکاریەوە گرتووە، بەبێ ئەوەی هیچ خولیاو بەرنامەیەکیان هەبێت کارە مەترسیدارەکان ئەنجام دەدەن و دەستیان بەهەرجێگەیەك بگات تالآنی دەکەن و دەگەڕێنەوە زێدەکانیان لەبیابانە ووشکەکان. زۆربەی کاتەکانیش هێرش نابەن بەڵکو زیاتر بەرگری دەکەن‌و ئەوگوندو ناوچانە داگیر دەکەن کەدەسەلآتێکی ئەوتۆیان نیە. وەڕووبەرووی کارەدژوارەکان نابنەوە و ئەوانەی کەلەناوچە کوێستانیەکاندا بەسەردەبەن لەهێمنی ئارامیدا دەژین و لەهێرشی عەرەبە دەشتەکیەکان بەدوورن و ئەگەر بزانن هەردەوڵەتێك بێ هێزولاوازە هێرشی بۆدەبەن و داگیری دەکەن و، خەڵکەکەی دەکەنە دیلی خۆیان و بەهۆی نەتەوەی داگیر کەرەوە ووردە ووردە داب و نەریتی نەتەوەی داگیر کراو دەگۆڕێت و، بارودۆخی سیاسیان گۆڕانکاری بەسەردا دێت تاوەکو سەرئەنجام شارستانیەتەکەیان لەناودەچێت. خوداش بەتوانایە بەسەر دروستکراوەکانیدا وبێجگەلەوهیچ پەروەردگارێك نیە.

# بەشی بیست وشەشەم

## لەبارەی ئەوەی کەهەرکات نەتەوەی عەرەب وولاتێك داگیر بکات بەخێرایی ئەومەملەکەتانە ویران دەبن

چونکە تازیەکان نەتەوەیەکی وەحشین و داب و نەریتی وەحشی گەری هێندە لەنێوانیاندا باوە، کەوەها خوویەك بووەتە سروشت تێیاندا. ئەم خووەش بۆئەمان لەزەت بەخشەو دژن لەگەڵ کۆت و بەندەکانی فەرمان بەری و فەرمانڕەوایی یاساکاندا. دیارە ئەم جۆرە خوو سروشتەش دژە لەگەڵ ئاوەدانی و شارستانیەتدا، چونکە هەموو ئامانجە ئاساییەکانی ئەوان لەژیاندا کۆچکردنە لەم شوێن بۆئەوشوێن و هێرش و داگیر کاری هەلپەرستین ئەمەلەکاتێکدا ئەم سیفەتە دژی هێمنی و ئارامی و نیشتەجێبوونە کەلەگرنگترین بنەماکانی شارستانیەتن. وەهەروەها یەکێکی تر لەهۆکارەکانی داگیرکاریەکانیان و ڕووخاندن و وێرانکردنی شارو گوندەکان بریتیە لەبردنی بەردەکانیان بەمەبەستی دروستکردنی وەجاق و کورەی ئاگر بەکاریان دەهێنن. وەهەروەها دارو چێوەکانیشیان بۆ هەڵدانی خێمەو دروستکردنی کەپر بەکار دەهێنن. کەواتە سروشتی ئەوان دژەلەگەڵ دروستکردنی ماڵ و باڵەخانەکاندا کەنیشانەی شارستانیەت و ئاوەدانیە. بەشێوەیەکی گشتی هەڵسوکەوتی عەرەب بەم شێوەیە و داگیرکارن و هەرکەهەلیان بۆ هەڵکەوت هەموو شوێن و ناوچەیەك داگیر دەکەن سەروەت و سامانەکەی بەتالان دەبەن. وەهەرکات شوێنیکیان داگیر کرد بەهیچ شێوەیەك سیاسەتی پاراستنی ماڵ و موڵکی خەڵکی پەیڕەوناکەن وزۆردار مافی لاواز پێشیل دەکات و شارستانیەت بەرەو وێرانی

دەچێت. یەکێکی تریش لەوهۆکارانەی کەئەمانە دەبن هۆی وێرانی شارستانیەتو ئاوەدانی بریتیە لەبێ بەهاو بێ نرخ سەیر کردنی هونەرو پیشەو پیشەوەرو هونەرمەندان، هەروەك چۆن لەداهاتوودا باسی دەکەین کەبنەڕەت و بنەمای سەرمایەو ژیان و گوزەرانی خەڵکی صەنعەتگەران و، پیشەوەران پێکی دەهێنن و هەرکاتێکیش ئەم شتانە لەناوبچن‌و هەقدەستیان نەدرێتێ و ڕێزیان لێنەگیرێت ئارەزووەکانی خەڵکی لەکەسابەت و پیشەوەریدا دەگۆڕێن بۆ نائومێدی وواز لەکارو پیشە دەهێنن و لەژیانی شار بێزار دەبن‌و بڵاوەی لێدەکەن و لەئەنجامدا ئاوەدانی و شارستانیەت لەناودەچێت.

وەهەروەها نەتەوەی عەرەب هێندە گوێ نادەنە خراپکاری و ڕێگری کردنی خەڵکی لەشکاندنی یاسکان و تەنها گرنگی بەداگیرکاری و تالآن و وەرگرتنی باج لەخەڵکی دەدەن بۆ ئەوەی بگەنە مەبەست و ئامانجی خۆیان، لەم نێوەندەشدا بەهیچ جۆرێك ڕێنمایی خەڵکی ناکەن‌و ڕێگریش لەخراپەی خراپەکاران ناکەن هەرچاکسازیەکیش بکەن ئیتر مادی بێت یان مەعنەوی ئەوا مەبەستیان بەرژەوەندی گشتی نیەو تەنها سودو قازانجی خۆیان دەوێت هەمیشە لەهەوڵی زیاد کردنی باجدان بەبیروباوەڕی خۆیان ئەیانەوێت بەوشێوەیە ڕێگەلەخراپەکاران بگرن، بەڵام ئەمەش دیسانەوە دەبێتە هۆی زۆربوونی خراپەو خراپەکاری، چونکە ئەوانەی کە خراپەدەکەن هەرچیەك باج هەبێت دەیدەن بۆ ئەوەی بگەن بەئامانجەکانیان‌و، وولآت بەرەو هەرج و مەرج و بێسەرو بەرەیی دەبەن بەجۆرێك وولآت وای لێدێت هەروەك بڵێی هیچ یاساو ڕێسایەك لەوولآتدا نیە. ئەم حاڵەتەش دەبێتەهۆی لەناوچونی شارستانیەت و ئاوەدانی و هەروەك چۆن لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد، بوونی دەسەلآت بۆ مرۆڤ لەتایبەتمەندیەسروشتیەکانی ئەوە و بەبێ ئەو بونەوەرو کۆمەڵگەی شیاوو باش درووست نابێت. ئەم بابەتەشمان لەبەشەکانی پێشوودا باسکرد.

یەکێکی تریش لەسیفەتەکانی نەتەوەی عەرەب ئەوەیە کەدەسەلآت خوازن و زۆر دەگمەنە کەسێکیان بەخواست و ویستی خۆی دەسەلآت ڕادەستی خەڵکانی تربکات،

هەرچەندە برا یان گەورەی هۆزەکەی بێت، مەگەر ئیتر لەبەر شەرم و بەناچاریەوە لەمێژووی ئەونەتەوەیەدا ئەوکارە ڕوویدابێت. هەربۆیە لەناوئەواندا فەرمانڕەواو ئەمیر گەلێك سەرهەڵدەدەن و خەڵکەکەیان ڕووبەڕووی چەندین جۆری وەرگرتنی باج و حوکم و هێزی جۆراو جۆر دەبنەوە و لەئەنجامدا شارستانیەت و ئاوەدانی دەشێوێت و، زنجیرەی کارەکان لێك هەڵدەوەشێتەوە. هەروەك چۆن عەرەبێکی دەشتەکی هاتەلای عبدالملك و لەوکاتەی کەعبدالملك لەبارەی ڕەفتاری حەجاجەوەپرسیاری لێکرد لەوەڵامدا پیاوەعەرەبەکە گوتی: ئەوم بەجێهیشت لەکاتێکدابەتەنها سەرقاڵی ستەمکردن بوو لەخەڵکی، مەبەستی پیاهەڵدانی حەجاج بوو لەڕووی باشی سیاسەت و ئاوەدانیەوە. ئەگەر سەیری مێژوویکەین دەبینین ئەو وولآتانەی کەداگیرکەران داگیریان کردوون بەچ شێوەیەك ئاوەدانی و شارستانیەتیان لەناوچوون و کەسیان تێدا نەماوە. لەوانەش یەمەن کەناوەندی تازیەکانە کەوێرانەیەکی تەواوە و بێجگە لەچەند ناوچەیەك نەبێت ئاوەدانی نابینرێت.

هەروەها هەموو شارستانیەت و ئەوئاوەدانیەی کەئێرانیەکان لەعێراقدا دروستیان کردبوو بەچ شێوەیەکی دڕندانەهێرش بەرانی عەرەب لەناویان برد و کردیانە ناوچەیەکی بایرو بێ ئاوەدانی شامیش تاوەکو ئەم ڕۆژگارەگیرۆدەی ئەم چارەنوسەیە. لەسەرەتای سەدەی پێنجەمەوە کاتێك هۆزەکانی بەنی سەلیم و هیلال بەرەو ئەفریقا هێرشیان برد و بۆماوەی سێسەد و پەنجاساڵ لەوێدامانەوە و سەرانسەری ئەو وولآتەیان بێ ڕەنگ و بۆ کردوو وێرانیان کرد، ئەمەلەکاتێکدا بەرلەکۆچی ئەوان هەموو سەرزەمینەکانی نێوان سودان و دەریای ڕۆم ئاوەدان بوون، چونکە شوێنەواری شارستانیەت بەر لەوان وەك نیشانەکانی ڕێگەو بان ودیوارو بناغەی خانوو نیشانەی شارو گوندەکان گەواهیدەری ئاوەدانی ئەوناوچەیەبەرلەچونی ئەوان. خوداش باشترین میرات گرو خاوەنی سەرزەوی و دانیشتوانەکەیەتی.[٢٤٣]

---

[٢٤٣] (والله یرث الارض ومن علیها وهو خیرالوارثین) س انبیا ئا ٨٩. س مریم ئا ٤١.

# بەشی بیست و حەوتەم

## لەبارەی ئەوەی کە پاشایەتی و دەوڵەتداری بۆ داگیرکەران بەدی نایەت مەگەر بەشێوەیەکی ئاینی وەك پێغەمبەرایەتی یان ویلایەتیان بەشێوەیەکی گشتی لەڕێگەی شوێنەواری گەورەی ئاینیەوە

لەبەرئەوەی ئەم نەتەوەیە لەسەر خووی وەحشی گەرین و ملکەچ کردنی گروپێك بۆ گروپێکی تر زۆر ئاستەمە، هەربۆیە دەبینین هیچ کات لەسەر یەك شت یەك دەنگ نین و یەك ناگرن، بەڵام ئەگەر لەڕێگەی پێغەمبەرایەتیەوە بۆ کارێك بانگ بکرێن ئەوکات نەفسیان بەهۆی فەرمانەکانی ئاینەوە ملکەچ دەبێت و ڕام کردنیان ئاسان دەبێت، چونکە ئاین لەدڵیاندا جێگیر دەبێت و لەخۆ بایی بوونیان تێدا نامێنێت. هەرکاتێك لەنێوان ئەواندا پێغەمبەرێك یان وەلیەك سەرهەڵبدات ملکەچی دەبن و گوێڕایەڵی دەکەن و ڕەوشتەجوانەکانیان تێدا بڵاو دەبێتەوە ڕاستی ئاشکرادەکەن و کۆمەڵگەکەیان کامڵ دەبێت و زاڵ دەبن و فراوانخوازی زاڵبونی دەوڵەتداری تێیاندا سەر هەڵدەدات. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا داگیرکەران زووتر هەق و ڕاستی قبوڵ دەکەن لەبەر ئەوەی کە تەبعیان لەسستیو درۆو خوی ناپەسەندەوە دوورە بێجگە لەهەندێك خوی وەحشیگەری کەهێندەش گومڕاکەر نیە. وەبۆ قبوڵ کردنی باشەئامادەن و ئیتر خراپەیان تێدا دەرناکەوێتو، لەو سروشتەی کە کردارو گوفتاری ناپەسەندی دەکردە مەلەکە تێیاندا نەفسیان دادەماڵرێت و دوور دەکەوێتەوە، هەروەك چۆن لەفەرموودەکەدا هاتووە و پێشتریش باسمان کرد: (هەرکۆرپەیەك لەسەر فیترەت دێتە دونیاوە).[٢٤٤]

---

[٢٤٤] (الولد یولد علی الفطرة) .

# بەشی بیست و هەشتەم

## لەبارەی ئەوەی کەداگیر کەران بەبەراورد بەهەموو نەتەوەکانی تر لەسیاسەت و دەوڵەتداریەوە دوور ترن

چونکە ئەمان زیاتر لەهەموو نەتەوەکانی تر لەدەشتەکیەتەوە نزیکترن و لەدوورترین دەشتەووشکەکاندا هاتووچۆدەکەن و بێ نیازترین نەتەوەن لەپێویستیەکانی دەشتەکیەکانی وەك (گەنم و دانەوێڵە)، چونکە لەسەر نەبوونی و تەنگ دەستی ژیان ڕاهاتوون هەربۆیە لە نەتەوەکانی تر بێ نیاز دەبن. هەربۆیە فەرمانرەوایی لەنێوان ئەمانەداو ڕام کردنیان بەهۆی گروپێك لەخۆیانەوە زۆر ئاستەمە، چونکە ئەوان لەسەر وەحشی گەری ڕاهاتوون و ماونەتەوە و سەرۆکەکەیان بەزۆری پێویستی بەژێردەستەکانی هەیە بۆئەوەی لەکاتی بەرگریکردندا لەعەصەبیەتەکەیان سود وەربگرێت، هەربۆیە دەبێت هێمنیەوە و بەدڵی ئەوان بکات و خۆی ڕابهێنێت لەگەڵیاندا و بەتۆپزیەوە ڕەفتاریان لەگەڵدا نەکات نەوەك کەم وکورتی لەعەصەبیەتیاندا ڕوویدات، چونکە ئەگەر عەصەبیەتیان کێشەی تێبکەوێت ئەوانەوانیش و ئەمیش بەرەو لەناوچوون هەنگاو هەڵدەگرن. ئەمەلەکاتێکدا سیاسەتی پاشاو سوڵتان ئەوە دەخوازێت کەسیاسەتمەدار بەزۆرو هێز دەوڵەتداری بکات و، فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەبکات وەگەرنا سیاسەتەکەی بەرەو پێشەوە ناچێت.

وەهەروەها هەروەك چۆن لەبەشەكانی پێشتردا باسمانكرد یەكێك لەتەبعەكانی داگیركەران ئەوەیەكە لەكاتی زاڵبووندا ئەوەی كەلەدەستی خەڵكیەوە دەستیان دەكەوێت دەیرفێنن و، چاوپۆشی لەهەموو شتەكانی تر دەكەن و كاریان بەسەر دەوڵەتداریەوە نیە و هیچ باسێك لەبارەی مافی كۆمەڵێك لەبەرامبەر كۆمەڵێكی ترەوەنیە. هەربۆیە هەركاتێك بەسەر نەتەوەو دەوڵەتێكدا زاڵ بىن تەنها ئامانجیان بەتاڵان بردنی ماڵ و سامانی خەڵكەكەیەتی و هیچ باسێك لەیاساو رێساناكەن وەك فەرمان بەچاكەو رێگری لەخراپەو یاسادانان. هەرچەندەبەهۆی زۆر كردنی باجەكان و بەدەست هێنانی دەستكەوتی زیاتر باجی ماڵی بۆ خراپەكاریەكان دیاری دەكەن، بەڵام دیارە كەدانانی ئەم جۆرە بریارانە بەهێزی فەرمانڕەوایی بزانرێن، بەڵكو بەزۆری بەپێی ئەومەبەستانەی كەپاڵنەری باج دەرەكانە دەبێتە هۆی خراپەش، چونكە خەڵكی ئەوبڕە باجەی كەدەیدەن لەبەرامبەر مەبەستەكانی دەستدرێژی و كاری ناڕەوای بچوك دەیژمێرن هەربۆیە خراپەو خراپەكاریەكان ڕوولەزیاد بوونن ئاوەدانی لەناودەچێت و ئەم گەلانە لەحاڵەتێكی بێسەروبەریدا بەسەر دەبەنو هەركەس دەتوانێت دەستدرێژی بكاتە سەر ئەوی تر. دیارە كەوەهائاوەدانیەك بەرەو باشی ناچێت و هەروەك پێشتر باسمانكرد بارودۆخی ئەو وڵاتە بەرە و بێسەرو بەری دەڕوات و وێران دەبێت.

هەربۆیە سروشتی عەرەب بەگشتی لەسیاسەتی دەوڵەتداریەوە دوورە و كاتێك لەم شتە نزیك دەبنەوە كەتەبعیان گۆڕانكاری بەسەردابێت و هێزی فەرمانڕەوایی ئەمان بگۆڕێت بەنەریتێكی ئاینی، ئەوكات ئەم خوانە لەوان دادەڕنرێت هەروەك باسمانكرد حاكمێك بەسەر دەروونیانەوە (ویژدانی ئاینی)دادەنێن كەوا لەوان دەكات كەس دەستدرێژی نەكاتە سەر كەس. ئەم گۆڕانكاریانەی بارودۆخ لەكاتی دەوڵەتی ئەماندا لەناونەتەوەی ئیسلامدا بەنمونە وەربگرین، لەبەرئەوەی كەئاین سیاسەتی بۆ ئەمان بەهۆی شەریعەتەوە و حوكمەكانی ئەو بەرژەوەندیەكانی ئاوەدانی لەناوەوەو دەرەوە

ڕەچاو دەکرد و خەلیفەکانیان یەك لەدوای یەك لەسەر تەختی خەلافەت دادەنیشتن و لەم کاتەدا وولآتەکەیان گەورە بوو دەسەلآتەکەیان هێزی پەیدا کرد.

ڕۆستەم کاتێك دەیبینی موسولمانەکان کۆدەبوونەوە بۆنوێژ دەیگوت: (عومەر جگەرم دەکات بەخوێن کاتێك ئاین و داب و نەریت فێری ئەم سەگانە دەکات). دواتر و لەپاش تێپەڕ بوونی چەند سەردەمێك فەرمانڕەوایی گروپێك لەهۆزە عەرەبەکان کەلەئاین‌و داب و نەریتی جوان دوور کەوتنەوە لێك هەلوەشایەوە و لەکارو باری دەولەت جیا بوونەوە و سیاسەتیان وەلا ناو، ڕوویان کردەوە هەمان ئەو دەشتانەی کەلێیەوە هاتبوون و، ئەوعەصەبیەتەی کەخانەدانەکانیان هەیان بوو نەماو بنەماکانی فەرمانبەری‌و دادگەریان لەبیر چوویەوە و گەڕانەوە سەر ئەو وەحشی گەریەی کەبەر لەئیسلام هەیانبوو، نەدەولەتداری پادشاییان دەناسی و نەئاگاداری سیاسەتیش بوون لەسیاسەت تەنها ئەوەیان بۆ مابوویەوە کەدەیانگوت ئێمە هۆزی فلأن خولەفاین.

لەبەر ئەوەی کەخەلافەت نەماو لەناوچووفەرمانڕەوایی بەگشتی لەهێرشبەران سەندرایەوە نەتەوە ناعەرەبەکان کەلەژێرفەرمانی ئەماندا بوون بەسەریاندا زالبوون، تەنانەت زۆرێکیان ئەوەیان نەدەزانی کەلەڕابووردوودا خاوەنی دەسەلآت و پاشایەتی بوون. ئەمە لەکاتێکدایە ئەودەسەلآت و پاشایەتیەی کەپێشینانی ئەمان هەیانبووە هیچ نەتەوەیەکی تر نەیبووە، هەروەك دەولەتەکانی عادو سەمودو عەمالیقەو حەمیرو تەبابیعەو دەولەتی موزەڕ لەئیسلامدا، واتە بەنی ئومەییەو بەنی عەباس، گەواهی دەری ئەم ڕاستیەن، بەلأم هەروەك گوتمان هەرکە وازیان لەئاین هێناو گەڕانەوە سەر دەشتەکیەتی خۆیان و وایان لێهات کەزۆر بەئاستەم دەیانتوانی بەسەر دەولەتە زۆر لاوازەکانیشدا زالبن، هەروەك چۆن ئێستە لەمەغریبدا بەم جۆرەیە، بەلأم هەریەو شێوەیەی کەلەڕابووردوودا باسمانکرد ئامانجی دەولەتی ئەمان بێجگە لەوێرانکردنی

شارستانیەت و ئاوەدانی لەوناوچانەی کەداگیریان دەکەن شتێکی تر نەبوو. خوداش بۆهەرکەسێك کەبیەوێت موڵکی خۆی پێدەبەخشێت [٢٤٥]

[٢٤٥] (وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء) س البقرة ئا ٢٤٨ .

# بەشی بیست و نۆیەم

## لەبارەی ئەوەی کەشارنشینەکان زاڵن بەسەرهۆزو کۆمەڵە دەشتەکیەکاندا

لەپێشەوە باسی ئەوەمانکرد کەکۆمەڵگەدەشتەکیەکان بەبەراورد بەکۆمەڵگە شار نشینەکان بچوك و گەورە و ناتەواون، چونکە هەموو ئەو پێداویستیانەی کەلەکۆمەڵگەدا پێویستن بۆدەشتەکیەکان فەراهەم نین و لەوانەیە تەنها لەوشوێنانەدا بوونیان هەبێت کەخۆیانی تێدادەژین، بەڵام مادە بنەڕەتیەکانی جوتیاری کەزۆربەیان پەیوەستن بەپیشەسازیەوە و لەناوچەکاندا نایابن، چونکە بەشێوەیەکی گشتی خەیات و ئاسنگەرو هاوشێوەی ئەم جۆرە پیشەگەرانەکەپێویستیەکانی ژیانی ئەوان لەکشتو کاڵ فەراهەم دەکات لەناویاندا بوو نیان نیە. وەهەروەها دینارو درهەمیان نیەو، بەڵکو ئەو شتانەی کەدەکرێن بەپارە وەك بەروبوومە کشتوکاڵی و گیانەوەریەماڵیەکان و بەرهەمەکانیان وەك شیرەمەنی و کوڵکە و خوری و پێستەو موو لەدەستیاندایە کەپێویستی شارنشینەکانە. ئەمانە دەگۆڕنەوە بەدینارو درهەم. لەم ڕووەوە کەدەشتەکیەکان پێویستیان بەشاریەکانەلەشتە پێویستیەکاندا لەولاشەوە شاریەکان لەشتە جوانکاری و کەمالیاتەکاندا پێویستیان بەوانیش دەبێت. هەربۆیە دەشتەکیەکان لەڕوانگەی پارێزگاری لەبونی خۆیانەوە پێویستیان بەشارنشینەکان هەیە، چونکە تائەوکاتەی کەلەژیانی دەشتەکیەتدان و خاوەنی وولات نین و شارەکانیان داگیر نەکردووە بمانەوێت و نەمانەوێت پێویستیان بەخەڵکی شارهەیەو، هەرکاتێك شاریەکان فەرمانێکیان پێبکەن ناچارن کەجێبەجێی بکەن، چونکە بارودۆخی شار لەدووحاڵەت بەدەر نیە: یان خاوەنی

پاشایەتیەکە لەم کاتەشدا دەشتەکیەکان ناچارن تەسلیم و گوێڕایەڵی هێزو دەسەڵاتی پاشابن، وەیان پاشایەکیان نیەو لەم کاتەشدا لەشارەکەدا هەندێك خەڵك جۆرێك لەدەسەڵاتیان بەسەر خەڵکی تردا هەیە وەگەرنا ئەوکۆمەڵگەیەدەگۆڕێت و ئەوکات ئەم سەرۆکە دەشتەکیەکان بۆبەرژەوەندی خۆی بەکار دەهێنێت، ئەم شتەش لەوانەیە بەدوو ڕێگەڕوویدات: یان ئەوان لەڕێگەی حەزکردن بەبەخشینی ماڵ و سامانەوە ملکەچیان دەکاتو ئەوکات ئەوپێداویستیانەی کەلەو شارەدا پێویستیانە دەیانداتێ و کۆمەڵگەکەیان بەرەو باشتر دەچێت. وەیان ئەگەرنەتوانێت لەڕێگەی بەخشینەوە بیانخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە ئەوا بەناچارکردن و زۆر ئەوکارە دەکات هەرچەندە ببێتە هۆی کۆچ پێکردنی هەندێکیان، بەڵام ئەم گوێی پێنادات، چونکە بیەوێت و نەیەوێت بەهۆی ئەو دەستەیەی کەماو نە تەوە بەسەر ئەوانی تردا زاڵ دەبن و دیاریشە ئەو گروپە دەبنە ژێردەستەو ملکەچ دەبن، چونکە چاوەڕێی ئەوەن لەم ڕێگەیەوە ڕێگەلەلە ناوچونی کۆمەڵگەکەیان بگرن.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لەم جۆرە ناوچانەدا توانای کۆچ کردنیان نابێت، چونکە هەموو ناوچەکانی ترلەژێردەستی دەشتەکیەکاندایە و ناهێڵن هیچ کەسێك لێیان نزیك ببێتەوە هەربۆیە ئەوگروپە هیچ پەناگەیەك شك نابەنو بەناچاریەوە ملکەچی فەرمانڕەواکەیان دەبن. هەربۆیە دەشتەکیەکان لێرەو لەوێ هەندێك جار ملکەچی شاریەکان دەبن وشاریەکان داشیان سوارە بەسەریاندا. هەرئەوتەنها زاڵە بەسەر بەندەکانیدا.[٢٤٦]

---

[٢٤٦] (وَهُوَ القاهِرُ فَوقَ عِبادِهِ) س الانعام ئا ٦١ و ١٨ . (وهو الواحد القهار) س الرعد ئا ١٧.

# بابی سێیەم لەکتێبی یەکەم

## لەبارەی زنجیرەی دەوڵەتەکان و چۆنیەتی پاشایەتی و خەلافەت و پلەو پایەی دەزگاکانی دەوڵەت و ئەوچۆنیەتیانەی کەبۆ هەموویان ڕوودەدات کەچەندین یاساو تەواو کەرە

## بەشی یەکەم

### لەبارەی ئەوەی کە دروستکردنی دەوڵەت لەڕێگەی هۆزو عەصەبیەتەوە بەدی دێت

لەبابی یەکەمدا ئەوەمان سەلماند کەزاڵبوون و هێزو بەرگری بێگومان لەڕێگەی عەصەبیەتەوە بەدی دێت، چونکە نەتەوە ویستی و هەستی پارێزگاری و بەرگری هاوبەش و گیان بەختکردنی هەریەکە لەتاکەکان لەڕێگەی یارانیدا لەدەرئەنجامەکانی عەصەبیەتە. سەرەڕای ئەمە پاشایەتی پلەو پایەیەکی شەریف و لەزەت بەخشەو هەموو خۆشیەکانی دونیا دەگرێتەوە، کەلەپێناو بەدەست هێنانیاندا شەڕو پێکدادانەکان ڕوودەدەن. زۆر بەکەمی ڕوویداوە کەسێك بیبەخشێتە کەسێکی تر مەگەرلەڕێگەی داگیرکاریەوەنەبێت. هەربۆیە بەویست و نەویست کێشەو دووبەرەکی ڕوودەدات و سەردەکێشێت بۆشەڕ و لەپاشان زاڵبوونی لایەنێك بەسەرلایەنێکی تردا، هەروەك

لەپێشەوە باسمانکر، ئەمانەش تەنها لەڕێکەی عەصەبیەتەوە پەیدا دەبن. بەکورتی دەرك کردنی کاروباری پاشایەتی لەتێگەشتنی گشتیەوە بەدوورە و لەوەش بێ ئاگان، چونکە سەردەمی بنیات نانی دەوڵەتیان لەبیر چوەتەوە سەرەتاکەی نازانن. سەردەمێکی دوورو درێژ یان لەشارنشینیدا بەسەردەبەن و نەوەیەك لەدوای یەکەکان بەم شێوەیە پەروەردەدەبن، هەربۆیە نازانن خودا لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەوە بەچ شێوەیەك پاشایەتی بەگەلێك سپاردووە، بەڵکو ئەوان خاوەنانی دەوڵەت و پاشایەتی لەوکاتەدا دەبینن کەفەرمان ڕەواییەکەیان بەهێزبووە وخەڵکی تەسلیمیان بوون و بێنیازبوون لەعەصەبیەت. ئەوان نازانن لەسەرەتاوە بارو دۆخی دەوڵەت لەچ حاڵەتێکدا بووە و سەرەتای سیلسیلەکەیان چ سەختی نارەحەتیەکیان لەوپێناوەدا چەشتووە. بەتایبەت خەڵکی ئەندەلوس کەلەهەموو گەلان زیاتر عەصەبیەتیان لەبیر چویەوە. هەربۆیە لەدێرزەمانەوەیە لەعەصەبیەت بێ نیاز بوون، چونکە نیشتیمانەکەیان لێك هەڵوە شاوەتەوە و هۆزو دانیشتوانی تێدا نەماوە. خوداش هەرچیەکی بوێت دەتوانێت بیکات. وەزانایە بەسەر هەمووشتێکدا.[247]

---

[247] (یَخلُقُ مایَشاء وَهُوَ عَلی کُل شَيء قَدیر) س النور ئا ٤٤. (وَاللهُ قادِرٌ عَلی مایَشاْ وَهُوَ بِکُلِ شیئ عليم) س البقرة ئا ٢٧. (وَهُوَ حَسبُنا وَنِعمَ الوَکيل). وەئێمەی خستە ناومەیدانی چاکەکاریەوە.

# بەشی دووەم

## لەبارەی ئەوەی کەهەرکات دەوڵەت جێگیر ببێت و شادەماری بەهێز ببێت ئیتر لەعەصەبیەت بیٚ نیازە

دەوڵەتەگشتیەکان لەسەرەتای دروستبونیانەوە ڕووبەڕووی دژایەتی خەڵکی دەبنەوەو فەرمانبەرداری بەلای خەڵکەوە دژوارە و ملی بۆکەچ ناکەن مەگەر لەبەرامبەر هێزی توانایی کەلەڕێگەی زاڵبونەوە بەدی دێت، چونکە لەنێوان ئەواندا ناسراوی نیە و خەڵکی پاشای ئەو دەوڵەتانە ناناسن و خویان نەگرتووە بەفەرمانبەرداریانەوە، بەڵام کاتێك فەرمانڕەوایی لەلای ئەو دەستەیە جێگیر ببێت و، پشتاوپشت تاکەکانی دەسەڵات بگرنە دەست، ئەوکات خەڵکی چۆنیەتی دەستپێکردنی کارەکە لەبیردەبەنەوەو نەریتی فەرمانڕەوایی بۆ خاوەنی ئەودەستەیە کەتایبەتە بەچینی فەرمانڕەوا بەهێزدەبێت و خوو شێوازی فەرمانبەری و سەرنەوی کردن لەبەرامبەریانەوە، لەبیرو باوەڕی گشتیدا جێگیر دەبێت و، خەڵکی بەهۆی فەرمانڕەوایی ئەمانەوە دەست دەدەنە کاری گەورە هەروەك چۆن لەڕێگەی پێشکەوتنی بیروباوەڕە ئاینیەکاندا دەجەنگن و، شەڕدەکەن هەربۆیە لەفەرمانڕەواییەکەیاندا پێویستیان بەخەڵکێکی زۆر نیە، بەڵکو فەرمانڕەوایی ئەوان بەجۆرێك بەهێزە هەروەك بڵێی فەرمانڕەواییەکەیان بەپێی کتیبێکی ئاسمانیە کەگۆڕانکاری بەسەردا نایەت و هیچ کەسێك ئاگاداری پێچەوانەکەی نیە. هەربۆیە بۆ ئەم ئامانجە لەکۆتایی زانستی کەلامدا کەباس لەبیروباوەڕە ئاینیەکان دەکات و باسی

پێشەوایەتی دەکات بەجۆرێك هەروەك بڵێی پێشەوایەتی یەکێکە لەبەشەکانی. لەم قۆناغەی سەڵتەنەتدا پشت و پەنای سوڵتان یان بەمەوالی و پەروەردەکراوانێکی خانەدانە کەلەکەش و هەوایەکی عەصەبیەت و ڕێزدا گەورەبوون، وەیان بەوردەستەو گروپانەیەکە سەربەخانەدانی ئەوان نین، بەڵام لەڕیزی ئەوگروپانەدا دەژمێردرێن کەلەژێر ویلایەتی ئەماندان، هاوشێوەی ئەم بارودۆخە دەتوانین لەخانەدانی عەباسیەکاندا ببینین، چونکە لەسەردەمی دەوڵەتی موعتەصەم و کوڕەکەی الواسیق عەصەبیەتی عەرەب خراپ بوبو لەوەبەدواوە ئەمان پشتیان بەمەوالی ئێرانی و تورك و دیلم و سلجوقی و نمونەی ئەمانە دەبەست.

ئەوکات ئێرانی فەرمانڕەوایانی ناوچەکان لەوناچانەی کەحوکمیان دەکرد سەربەخۆیی دەسەڵاتیان پەیدا کردوو هێزو دەسەلاتی عەرەبیان لەوناوچانەدا هەڵگرتوو، لەوە بەدواوە ئەوناوچانە لەژێر کۆنترۆڵی بەغدادا نەماو تائەوەبوو دیلمانەکان هێرشیان کردە سەربەغدادو داگیریان کردوو خستیانە ژێردەسەلاتی خۆیانەوە و لەفەرمانڕەواییەکەیاندا جیاوازی و کێشەدرووست بوو. لەپاشان سەردەمی فەرمانڕەوایی دیلمانەکانیش کۆتایی هات و بەدوای ئەوانیشدا سلجوقیەکان پاشایەتیان گرتە دەست و خەڵکە کەوتنە ژێرفەرمانڕەواییانەوە، دوای ئەوەی کەسلجوقیەکانیش لەناوچون سەرئەنجام تەتارەکان هێرشیان هێنا و خەلیفەیان گوشت و نیشانەی دەوڵەتی عەرەبیان نەهێشت. هەروەها عەصەبیەتی هۆزەکانی صەنهاجە لەمەغریب لەسەرەتای سەدەی پێنجەم یان بەرلەو ڕۆژگارە لەناوچوو، دەوڵەتەکەیان لەمەهدیە و بجایە و قەلعە سنورەکانی تری ئەفریقا بەردەوام بوو، بەڵام بەوشێوەیە دەسەلاتی خەلیفە لەوناوچانەوە دوور بووە.

ئەوانەشی کەلەگەڵیاندا کێشەیان هەبووپەنایان دەبردە ئەم سنورانەو لەوێدا خۆیان حەشاردەدا لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پاشایەتی هەربەناوی ئەوانەوەبوو تاوەکو ئەوەی کەخودای گەورە لەناوچونیانی ڕاگەیاند و، مووەحیدان بەهێزێکی عەصەبیەتی زۆرەوە کەلەنێوان هۆزەکانی مەصامیدەدا هەیانبو دەرکەوتن و هەموو شوێنەوارێکی دەوڵەتی

صەنهاجەیان سڕییەوە. دەوڵەتی ئەمەویەکانیش لەئەندەلوسدا دووچاری ئەم چارەنوسە بوویەوە لەبەر ئەوەی کەعەصەبیەتی عەرەبی ئەوانیش بەرەولاوازی چوو مەلیك و پاشاکان دەستیان بەسەر ناوچەکاندا گرت و سەرانسەری وولآت دابەشکراو دەستیانکردە کێشەو ململانێ لەناویەکتردا و هەریەکەلەئەمیرەکان ناوچەیەکی بۆخۆی دابڕی و تایبەتی کرد بەفەرمانڕەوایی خۆیەوە بەشێوەیەکی سەربەخۆ حکومەتی دەکرد و، وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ ڕەفتاریان دەکرد وئەندەلوسیەکانیش بەبەراورد بەعەباسیەکان هەمان ڕێگەیان گرتەبەرکەئێرانیەکان گرتبویانەبەر.

هەربۆیە ئەمیرو فەرمانڕەواکانی ئەوناوچانە خۆیان بەپاشادەدایە قەڵەم و داب و نەریتو ڕێوڕەسمی پاشاکانیان ئەنجام دەداو لەوە دڵنیابوون کەهیچ کەسێك لەدژی ئەمکارەیان نارازی نابێت و ڕاناپەڕێت و نایگۆڕێت، چونکە ئەندەلوس شوێنێکی شیاونیە بۆعەصەبیەتی هۆزەکان هەروەك چۆن لەداهاتوودا باسی دەکەین، ڕۆژگارێك درێژەیان بەم بارو دۆخەدا هەروەك چۆن ئیبن شەرف دەڵێت: ئەوەی کەمن لەسەرزەوی بێزار دەکات ناوەکانی موعتەصەم و موعتەزید و ئەو لەقەبەشاهانەیانەن کە نابەجێ بەکار هێنراون. هەروەك پشیلەیەك بیەوێت لەکاتی نەڕاندندا چاولێکەری لەشێربکات. ئەم پاشاو هۆزانە لەفەرمانڕەوایدا وەك دەوڵەتی ئەمەوی لەکۆتایی کارو لەوکاتەی کەعەصەبیەتی عەرەبی بەرەو لاوازی ڕۆشت و ئیبن ئەبی عامیر سەربەخۆیی ڕاگەیاندبوو دەسەلاتی گرتبووە دەست و پشتی بەمەوالی و هەوەس بازان و، دەست پەروەردەکراوان بەستبوو لەوبێگانانەی کەلەکەنارەکانی ئەفریقاو مەراکیشەوە هاتبوونە ئەو وولآتەوە وەك هۆزەکانی زناتە و بەربەر یارمەتیان لەم دووهۆزە وەردەگرتو، لەئەنجامدا هەریەکە لەئەمیرەکان وولآتێکی سەربەخۆی ڕاگەیاندبوو تاوەکو ئەوەی کەمورابیتەکان لەڕێگەی دەریاوە هێرشیان کردە سەرئەو وولآتەو لەبەر ئەوەی کەهۆزەکانی لمتونە عەصەبیەتێکی بەهێزیان هەبوو تێکیان شکاندن و، بوونە جێ نشینیان لەناوەندی دەسەلآتەکانیان وەدەریان نان و شوێنەوارەکانیان سڕینەوە، مەلیك و پاشان بۆیە

نەیانتوانی بەرگری بکەن، چونکە هیچ عەصەبیە تێکیان نەبوو کەواتەدەتوانین ئەوەبڵێین کەدامەزراندنی دەوڵەت لەسەرەتادا بۆپاراستنی و بەردەوام بوونی پێویستی بەهەبوونی عەصەبیەتێکی بەهێز هەیە. تەرتوشی لەدانراوەکەیدا بەناوی سیراج الملوك پێی وایە کەپاسەوانی دەوڵەت تەنها بەو سەربازو پاسەوانانە دەبێت کە مانگانە لەدەوڵەت مووچەوەردەگرن. ئەمە لەکاتێکدا قسەکەی ئەو سەری سیلسیلەکان و سوڵتانەکانی سەردەمی سەڵتەنەت ناگرێتەوە، بەڵکو پشت بەستن بەپاسەوانانی مووچەخۆر بۆدەوڵەتێك دەبێت کەفەرمانڕەواکانی لەکۆتایی زنجیرەی نەژادی ئەونەتەوەیەدابن. واتە ئەم شێوازە لەکاتێکدا ڕوودەدات کەماوەیەکی زۆر لەدامەزراندنی سەڵتەنەت و پاشایەتی تێپەڕی کردبێت، چونکە نەریتی سەڵتەنەت لەچینێکی تایبەتی فەرمانڕەوادا جێگیر دەبێت ئەوکات لەسەرڕێی خۆی ڕادەوەستێت.

کەواتە تەرتوشی ئەوقۆناغەی دەوڵەتی بینیوە کە دەگاتە سەردەمی پیری و لەناوچون و تازەتوشی هەڵوەرین بووە، چونکەلەم قۆناغەدایە کەدەوڵەت پێویستی بە مەوالی و پەروەردەکراوان و سەرئەنجام بەسوپا هەیە و بەهۆیانەوە بەرگری لەخۆی دەکات. ئەوتەنها دەوڵەتەکانی پاشاو هۆزەکانی دەرك کردووە، فەرمانڕەوایی ئەوان لەسەردەمی تێکچونی کاروباری ئەمەویەکان و نەمانی عەصەبیەتی عەرەبی ئەوان و سەربەخۆبوونی هەرئەمیرێك لەناوچەکەی خۆیدابووە. ئەولەسەردەمی فەرمانڕەوایی موستەعینی کوڕی هود و کوڕەکەی لەگەڵ خەڵکی سەرقستەدا ژیاون و لەم قۆناغەدا هیچ جۆرە عەصەبیەتێکیان بۆ نەمابوویەوە، چونکە لەسێسەدساڵ لەوەو بەر لە خۆشگوزەرانی و جوانخوازی و نەریتەکانی بەتوانایی بەسەر عەرەبدا زاڵ بوبو بوویەهۆی لەناوچوونیان و، ئەوتەنها ئەوشازادانەی بینیوە کەبەشێوەیەکی سەربەخۆو بەبێ یارمەتی عەشایرەکانی خۆی فەرمانڕەواییان کردووە، ئەوشازادانەی کەلەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتدا لەپاشماوەی عەصەبیەتی خۆیان لەدامەزراندنی دەوڵەتدا سودیان

وەرگرتووە و هەرکە سەربەخۆبوونیان بەهێز بووە ئیتر پێویستیان بەعێل و عەشیرەت نەبووە.

لەم ڕووەوە ئەم جۆرە ئەمیرانە هیچ دژێکیان نیەو لەبەرگری پاسەوانیدا سود لەسەربازە مووچەخۆرەکانیان وەردەگرن. ئەمەیەکەتەرتوشی بەشێوە یەکی گشتی باسی کردووە و چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەتی لەسەرەتادا دەرك نەکردووە، ئەمەلەکاتێکدا فەرمانڕەوایی بیجگەبۆ خاوەنانی عەصەبیەت بەدی نایەت. کەواتە خوێنەر دەبێت لەم خاڵە تێبگات و پەی بەحیکمەتی خودایی بەرێت. خوداشی سەرزەوی خۆی بەهەرکەسێك کەبیەوێت دەیبەخشێت.[248]

[248] (وَاللهُ يُؤتِي مُلكَهُ مَن يَشاء) س بقرة ئا ٢٤٨.

# بەشی سێیەم

## لەبارەی ئەوەی کە بۆهەندێك لەخەڵکی لەچینێکی تایبەت (هێزی فەرمانڕەوایی) پاشایەتی و دەوڵەتێك دروست دەبێت کەلەبنیاتنانیدا پێویستیان بەعەصەبیەت نیە

چونکە هەرکات خاوەنانی عەصەبیەت سەرکەوتن بەدەست بهێنن و نەتەوە و هۆزەکان داگیر بکەن و زاڵ بین بەسەر مەملەکەتەگەورەکان و، کۆنترۆڵیان بکەن و لەناخی فەرمانڕەواو کارگوزارەکانیاندا لەناوچەدوور و، سنوریەکانی وولاتدا ڕۆحیەتی فەرمانبەری گوێڕایەڵی هەبێت ئەوکات ئەگەر لەنێوان وەها خانەدانێکدا کەسێك دەربچێت و پەنابباتە بەر ناوچە دووردەستەکان و لەسەرکردایەتی نەتەوەی خۆیەوە دووربکەوێتەوە، ئەوکات کارگوزاران و نەدارانی ئەوناچەیە لەدەوری کۆدەبنەوە و بانگەوازەکەی قبوڵدەکەنو لەومەبەستانەی کەلەبیرو هۆشیدا هەن هاوکاری دەکەن و، لەبنیاتنانی دەوڵەتێك بەناوی ئەوەوە هیمەت دەکەن بەوهیوایەی کەئەو دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بگرێتە دەستو لەدەستی خزمەکانیدا دەری بهێنێت و لەبەرامبەر ئەویارمەتی و پشتگیریەی کەئەمان کردوویانە دوای ئەوەی کەدەسەڵاتی گرتەدەست پلەو پۆستی باڵای دەوڵەتیان پێ ببەخشێت. وەك وەزیری و فەرماندەیەکانی سوپاوپاسەوانی سنوروپلەکانی تری دەوڵەت. ئەمانە بەهیچ شێوەیەك تەماع ناکەنە دەسەڵاتی ئەم، چونکەلەخانەدانی خۆیانی دەزانن لەبەرئەوەی کە ملیان بۆعەصەبیەتی ئەم کەچ کردووە فەرمانبەری ئەوفراوانخوزیەی ئەم و خانەدانەکەی دەکەن کەلەجیهاندا بەهێز بووە و، وەك بیروباوەڕێکی ئاینی سەیری دەکەن کەهەموخەڵکی تەسلیمی بووبن وبەناخیاندا چوبێتەخوارەوە. بەجۆرێك وایان لێهاتووە کەئەگەر نیەتی بەدەستهێنان یان

بەشداری کرنیان لەدەسەلآتی ئەودا هەبێت ئەوا لەوانەیە دونیا بومەلەرزە لێی بدات. واتە هێندە خۆی دەسەلآتەکەی بەپیرۆز سەیردەکەن، ئەم بارودۆخەش لەمەغریبی سەرەوەدا بۆ ئیدریسیەکان و لەئەفریقاومیسردا بۆ فاتیمیەکان ڕوویدا کاتێك تالیبیەکان لەخۆرهەلآتدا ویستیان بەرەو شوێنە دووردەستەکان لەشکرکێشی بکەن و، لەناوەندی خەلافەت دوور کەوتنەوە و بەمەبەستی وەرگرتنەوەی خەلافەت لەخانەدانی عەباسیەکان هیمەتیان کرد. ئەڵبەت ئەمەلەپاش ئەوەبوو نەریتی سەرۆکایەتی لەنەوەی عبدمەنافدا سەرەتا بۆئەمەویەکان و دواتریش بۆبەنی هاشم جێگیر بوبو.

هەربۆیە تالیبیەکان هێرشیان کردووەتە سەر مەغریب و خەڵکیان بەرەو لای خۆیان دەعوەت دەکرد و لەئەنجامدا بەر بەرەکان بانگەوازەکەیان قبوڵکردوو چەندین جار لەڕێگەی فەرمانڕەوایی ئەماندا ڕاپەڕینیان کرد، هەروەك چۆن هۆزەکانی ئوروبەو موغیلە لەڕێگەی ئیدریسیەکان و کەتامەو صەنهاجەو هوارە بۆعەبیدیەکان هیمەتیان کرد و دەوڵەتەکەیان بەهێزکردن. بەهێزی هۆزەکانیان سەرتاسەری مەغریب و ئەفریقایان لەژێردەسەلآتی عەباسیەکان دەرهێنا. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەسەلآتی دەوڵەتی عەباسیەکان لەوسەرزەمینانەدا کەم دەبوویەوە و لەولاشەوە دەسەلآتی فاتیمیەکان دەسەلآتیان فراوان دەبوو.. تائەوەبوو عەبیدیەکان میسرو شام و حیجازیان داگیر کرد و مەمالیکی ئیسلامی لەنێوان ئەمانو عەباسیەکاندا بەشێوەیەکی یەکسان دابەشکرا. هەموو بەربەرەکان دەسەلآتداری دەوڵەت بوون، بەلآم لەژێرفەرمانی عەبیدیەکاندا بوون و دانیان نابوو بەدەسەلآتەکەیاندا و بۆگەشتن بەپلەو پایەی بالآ چاویان لەیەکتری دەکردو خزمەتکاریان دەکرد، چونکە نەریتی دەوڵەتداری بۆ هاشمیەکان بەدیهاتبوو باوەڕیان بەفراوانخوازی و دەسەلآتی قورەیش و موزەڕ بەسەر گەلانی تردا هەبوو. هەربۆیە بەم شێوەیە دەسەلآت لەدەستی جینشینەکانی فاتمیەکاندا بەپایەداری مایەوەو تائەو کاتەی کەیەکسەر دەوڵەتی عەرەب هەڵوەشایەوە. خوداش فەرمانڕەوایی دەکات و کەس ناتوانێت فەرمانی ڕەت بکاتەوە.[٢٤٩]

---

[٢٤٩] (وَاللهُ يَحكُمُ لامُعَقِّبَ لِحُكمِهِ) س الرعد ئا ٤١ .

# بەشی چوارەم

## لەبارەی ئەوەی کەسەرچاوەی ئەودەوڵەتانەی کەدەسەلات پەیدا دەکەن و وولاتگەلێکی گەورەو فراوان دروستدەکەن بنەماو بیرو باوەڕە ئاینیەکانە کەبەهۆی پێغەمبەرایەتی یان بانگەوازێکەوە بەدی دێن

چونکە دروستکردنی دەوڵەت تەنها لەڕێگەی هێزو زاڵبونەوە دەکرێت، یان بەهۆی عەصەبیەت و ڕاکێشانی دڵی خەڵکی بۆلای خۆو بۆفراوانخوازی یان وولات گرتن بەیارمەتی خودا دێتەدی، بۆئەوەی ئاینی ئەو جێگیر بکەن و لەجیهاندا بلاوی بکەنەوە. خودا دەفەرمێت: (ئەگەر ئەوەی لەسەر زەویدا هەیە بیبەخشی بۆئەوەی کەلەنێوان دڵی ئەواندا ئولفەت و خۆشەویستی دروست بکەیت دڵنیابە ناتوانی).[٢٥٠] نهێنی ئەمەش ئەوەیە کە هەرکات دڵی خەڵکی دڵ بدەنە خواستەکان و سەرگەرمی دونیابن، چاولەیەککردن ڕوودەدات و جیاوازی دروستدەبێت و دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەو گرفت، بەلام ئەگەر خەڵکی لابکەن بەلای حەق و ڕاستیدا و دوور بکەونەوە لەبەتاڵ و، ڕوبکەنە پەروەردگار لەو ئامانج و ڕێگایانەی کەهەڵیان بژاردووە یەکبگرن، لەئەنجامدا چاوتێبڕین و کێشەلەناویاندا نامێنێت و یەکبوون لەنێوانیاندا پەیدا دەبێت و، دەوڵەتەکەیان فراوان و بەهێزو گەورەدەبێت هەروەك چۆن لەداهاتوودائاشکرای دەکەین. تەواوی هەرشیاوی ئەوەو بیجگەلەو خودایەکی ترنیە.

---

[٢٥٠] (لَوأنفَقْتَ مافِي الأرضِ جَميعاً مّا ألَّفتَ بَينَ قُلُوبِهِم) س الانفال ئا ٤٦.

# بەشی پێنجەم

## لەبارەی ئەوەی کەبانگەوازی ئاینی هێزێکی بنەڕەتی تر دەخاتە سەر هێزی عەصەبیەتێکی تر کەلەبەرهەم و خۆبەخشەکانی دامەزرا ندنی دەوڵەت دەژمێردرێت

هەروەك چۆن لەپێشەوەئاماژەمان پێکرد نەریتی ئاینی چاوتێبڕین و ئیرەیی لەنێوان خاوەنانی عەصەبیەتدا ئەگەر هەبێت لەناوی دەبات و، تەنها لادەکاتەوە بەلای حەق و ڕاستیدا. هەربۆیەهەرکات ئەم گروپەلەکاری خۆیاندا بینایی بەدی بهێنن ئەوا هیچ هێزێك لەبەرامبەریانەوە خۆی ڕاناگرێت، چونکە یەك بیرو بۆچوونیان هەیە و خواستێکی بەرزو بالآیان هەیە و ئەوەندە دڵبەستەی بوون ئامادەن لەپێناویدا گیانیان بەخت بکەن. خاوەنانی دەوڵەتانی تر هەرچەندە لەڕووی چەندیەتی و چۆنایەتیەوە لەمان زیاتر بن، بەڵام لەبەرامبەر ئەماندا شکست دەهێنن و بەهیچ شێوەیەك ناتوانن لەگەڵ وەها گروپێکدا بجەنگن هەرچەندە لەوانیش زیاترین، بەڵکو بێگومان شکست دەهێنن. هەروەك لەپێشەوە باسمانکرد بەهۆی جوانپەرستی و ڕۆچوون بەناو خۆشگوزەرانیدا بەخێرایی کۆتایی هەرگەل و نەتەوەیەك دێتە پێشەوە. ئەم بابەتەش بەسەر فتوحاتی ئیسلامیدا لەسەرەتای ئیسلامەوە جێبەجێ دەبێت، چونکە سوپای ئیسلام لەهەریەکە لەجەنگەکانی قادسیەو یەرموکدا سی هەزارو ئەوەندە بوون ئەمەلەکاتێکدا سوپای ئێرانیەکان لەقادسیەدا سەدو بیست هەزار کەس بوون، بەگوتەی واقیدیش سوپاکەی هیرقل چوارسەد هەزارکەس بوون، دەبینین هیچ کام لەم دووگروپە لەبەرامبەر سوپای

عەرەبەوە خۆیان پێڕانەگیراو شکان و چاویان بڕیە دەوڵەتەکانیان. دەتوانین ئەم مانایەش لەدەوڵەتەکانی لمتونەو مووەحیداندا لەبەرچاوبگرین، چونکە لەمەغریبدا هۆز گەلێکی زۆرو فراوان هەبوون کەلەڕوانگەی چەك و سەربازو عەصەبیەتەوە لەمان زیاتربوون ئەگەرباسی ئاین نەکەین، بەڵام دەبنین پاڵنەری ئاینی وایلەو گروپە کەمە کرد کەبەسەر گروپێکی چەند سەدهەزارکەسیدا زاڵببێت، خوداش لەقورئاندا ئاماژەی بەم مەسەلەیەداوە. ئەمەلەلایەك لەلایەکی تریشەوە ئەگەربێت و ئاین لەناوخەڵکیدا کاڵببێتەوە دەبینین بەچ شێوەیەك ئەوئازایەتی و سەرکەوتنانە نامێنن و لەناودەچن، چونکە بەدەر لەپاڵنەری ئاینی لەکێشەو شەڕەکاندا تەنها ژمارەو زۆری چەك و چۆڵەی سەربازی و پلانی تۆکمەو تەواو پێوەرە بۆسەرکەوتن.

ئەم بابەتەش دەتوانین بەسەر مووەحیدان و دژەکانیاندا جێبەجێ بکەین لەگەڵ ئەوەی کەزناتە دەشتەکی ترو زۆرتربوون لەموصامیدە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەموصامیدە پەیڕەوی ئاینیان لەمەهدی دەکرد هێزی عەصەبیەتیان چەندبەرابەر بوو هەربۆیە دەبینین لەیەکەم قۆناغدا زناتەیان تێکشکاندهەرچەندە وەك گووتمان زناتە دەشتەکی و وەحشیش بوون، بەڵام دەبینین هەر کەپابەندی ئاینیان لەدەستدا زناتە لەهەرلایەکەوە خەڵکیان لەدژهاندان و لێیان ڕاپەڕین و فەرمانڕەواییان لەمووەحیدان وەرگرتەوە. خوداش زاڵە بەسەر کاروبارەکانیدا[٢٥١]

---

[٢٥١] (وَاللّهُ غالِبٌ عَلى أمرِهِ) س یوسف ئا ٢١ .

# بەشی شەشەم

## لەبارەی ئەوەی کەبانگەوازی ئاینی بەبێ عەصەبیەت ناگاتەئەنجام

هەربانگەوازێك پێویستی بەوەهەیەکەزۆربەی خەڵکی بانگبکرێن بۆئەوەی پەیڕەوی لێبکەن، ئەمەش دەبێت لەڕێگەی عەصەبیەتەوە بکرێت هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد لەفەرموودەدا هاتووە: خودا هیچ پێغەمبەرێك ڕەوانەناکات مەگەر ئەوەی کەلەنێو نەتەوەکەیدا خاوەن خزم و ڕێزو قەدر بێت، هەرکات ئەم شتە بۆپێغەمبەران کەشیاوترینی خەڵکن و لەسەر دەستیان موعجیزە ڕوودەدات پێویست بێت ئەوابۆ ئەوان بەشێوەیەکی لەپێشتر پێویستە، چونکە خەڵکانی تر بێجگە لەڕێگەی عەصەبیەتەوە نەبێت ناتوانن لەزاڵبوون و فراوانخوازیدا کارانێکی بەدەر لەنەریت (خرق العادات)ئەنجام بدەن. ئەم بابەتەش بۆ ئیبن قوسەی شێخی موتەصەویفەو خاوەنی کتێبی (خلع النعلین فی التصوف)پێش هات، کەئەندەلوسی بەناوی بانگەواز بۆلای حەق ووروژاندو بەشوێنکەوتووەکانیان دەگووت مورابیتەکان. ئەو کەمێك بەرلەبانگەوازەکەی مەهدی دەرکەوت و کەمێك کارەکەی چوویەسەرەوە و پێشکەوت، چونکە لمتوونە سەرقاڵی کاری مووەحیدان بوون و لەوێشدا هۆزو نەتەوەی ترنەبوون کەئەو لەوکارەی پەشیمان بکەنەوە، بەڵام کاتێك کەمووەحیدان دەستیان بەسەر مەغریبدا گرت ئەو یەکسەرو بەبێ وەستان بانگەوازەکەیانی قبوڵکردو وەك ئەوان دەجوڵایەوەو لەقەڵای ئەرکش کەپەناگەی ئەوبوو دەستی کردە پەیڕەوی کردنیان و، هەرلەو قەڵایەشەوە هاوکاری دەکردن وبە یەکەمین موبەلیغی مووەحیدان لەئەندەلوس دەژمێردراو کودەتاکەی بەکودەتای

مورابیتەکان دەناسرایەوە. بارودۆخی شۆڕشگێڕانیش لەخەڵکیدا بەگشتی و ئەو فەقیهانەی کە ڕێگری لەخەڵکی دەکەن لەکرداری ناپەسەند (نهی لەمونکەر)دەکەن هەربەم شێوەیە، چونکە زۆرێك لەپیاوچاکان و شوێنکەوتوان و هەڵگرانی ئاین لەدژی پاشا زاڵمەکان خەڵکیان هانداوە و شۆڕشیان کردووە بەوهیوایەی کەڕەزامەندی خودا بەدەست بهێنن هەربۆیە دەبینین خەڵکێکی زۆر شوێنیانکەوتووەو گیانی خۆیان لەوڕێگەیەدا خستووەتە مەترسیەوەو، زۆرجاریش لەو جەنگانەی کەبەوهۆیەوە بەرپادەبوون گیانیان لەدەست دەدا، بەڵام زۆرێك لەم بانگخوازانە لەم ڕێگەیەدا تووشی تاوان بوون بەوەی کەشوێنکەوتووەکانیان خستووەتە مەترسیەوە، چونکە خودا تەنها لەو کاتانەدا فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگری لەخراپە واجبە کەمرۆڤ توانای ئەوکارەی هەبێت.

پێغەمبەر دەفەرمێت: هەرکەسێکتان خراپەیەکی بینی ئەوا پێویستەلەسەری بەدەست بیگۆڕێت وەئەگەر نەیتوانی ئەوا بەزوبانو ئەگەر هەرنەیتوانی ئەوا بابەدڵ ئەوتاوانەی پێناخۆش بێت و بەخراپی بزانێت. دیارە کەنەریتی پاشاو دەوڵەتە بەهێزەکان تەنها لەهەوڵی فراوانخوازیدان بۆئەمەش عەصەبیەت و هێزی عەشایر پشتیوانیانن‌و هیچ هێزێکیش ناتوانێت بیانلەرزێنێت. شێوازی پێغەمبەرانیش لەبانگە وازەکەیاندا پشتیان بەم ئەصڵە بەستووە کەبانگەوازەکەیان بەپشتیوانی عەشایرو کۆمەڵەکان بەرەوپێشەوە دەچێت و هەرچەندە ئەمان ئەگەرخودابیەوێت بەتوانای خۆی‌و بەهەموو جیهان پشتگیریان دەکات و جێگیر دەبن. خوداش داناترە.[٢٥٢] هەربۆیە هەرکەسێك بەم ڕێگایەدا هەنگاو هەڵبگرێت هەرچەندە لەسەر هەقیش بێت بەنەبوونی عەصەبیەت ناگاتە ئامانج و مەبەستی خۆی دەکەوێتە لێواری لەناوچوو نەوە، وەئەگەر لەتەزویرچی فێڵبازەکانیش بێت بیەوێت لەم ڕێگەیەوە بگاتە سەرۆکایەتی ئەوا خراپتر ئەوەیەکە ڕێگرەکان بێنەسەرڕێگەیی و لەناوچوونەکان ئەو لەوڕێگەیە دوابخەن، ئەمەش فەرمانی خودایە،

[٢٥٢] (وَاللَّهُ حَكِيمٌ عَلِيم) س ال عمران ئا ٣١ .

چونکە بەبێ نیەت و مەبەستی پاك خێروچاکەی باوەڕداران ناگاتە قۆناغی کردار.هیچ موسوڵمانیکیش گومانی لەمەدا نیەو هیچ بینایەکیش تەشی شك نابێت تێیدا. یەکەم جار ئەم جۆرە بزوتنەوانە لەنێو موسوڵمانان لەبەغداد سەری هەڵدا کاتێك کەفیتنەی تاهیر ڕوویداو ئەمین کوژراو مەئمون لەهاتنیدا بۆعێراق دواکەوت و لەخۆراسان مایەوە و ئەوکات عەلی کوڕی موسای ڕەزا لەخانەدانی حوسەین (ع)ی کردە وەلی عەهدی خۆی. لەوەبەدواوە خانەدانی عەباسیەکان وەك دوژمنێك سەیریان دەکرد و یەکتریان بۆڕاپەڕین لەدژی مەئمون هاندەدا و هاتنە سەرئەوڕایەی کەکەسێکی تر لەجێگەیدا دابنێن. هەربۆیە پەیمانیان بەئیبراهیمی کوڕی مەهدی داو هەرج و مەرج و بێسەروبەری لەبەغدا سەری هەڵداو خەڵکە خراپ و ناپەسەندەکان دەستیان کردە دەستدرێژی بۆسەر خەڵکی بێتاوانو بەڕێزو ڕێگەیان لەکاروانەکان گرتوو دەستیانکردە تالاْنکردن و سەروەت و سامانێکی زۆریان لەخەڵکی کۆکردەوە و بەئاشکرا لەبازاڕدا دەیانفرۆشت. خەڵکیش هەرچەندە داوای یارمەتیان لەدادوەرانی دادگا دەکرد، بەڵام سودی نەبوو. هەربۆیە ئاینپەروەران و پیاوچاکان لەدەوری یەکتری کۆبوونەوە بەمەبەستی ڕێگری کردن لەخراپەو خراپەکاران وتائەندازەیەك ڕێگەیان لێدەگرتن.

لەسەروبەندی ئەم کێشەوهەرایەدا پیاوێك بەناوی خالد الدریوس شۆڕشی کردوو خەڵکی بانگ دەکرد بۆفەرمانکردن بەچاکەو ڕێگریکردن لەخراپە خەڵکیش بەدەم بانگەوازەکەیەوەچوون و دەستیانکردە شەڕ لەگەڵ خراپەکارانداو ڕاونان و لێدانی ئەم خراپەکارانە بوویە ئەرك و نەریتی خەڵك دەستیان لەدژیان کرایەوە. ئەوکات لەدوای ئەویش پیاوێکی تر لەخەڵکی بەغداد ناسراو بەسەهلی کوڕی سەلامەی ئەنصاری و ناسراو بەئەبوحاتەم ڕاپەڕی و شۆڕشی دەست پێکردوو قورئانێکی کردە ملی و، خەڵکی بانگ کرد بۆفەرمانکردن بەچاکەو ڕێگری کردن لەخراپەو کارکردن بەقورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ص). وەهەمووخەڵکی لە (کهترومهتر)، لەخانەدانی هاشمی پەیڕەویان لێکرد.

ئەوچووە ناوکۆشکی تاهیرەوە و دیوانی نوسینگەیەکی دامەزراند و لەکوچەکۆلانەکانی بەغدادا دەگەڕاو ڕێگری لەوانەدەکرد کەدەبوونە مایەی ترس و تۆقاندنی خەڵکی.

خالد دریوس پێی گووت: من دەسەلاتێك کەبەشوێن عەیبی خەڵکیدا بگەڕێت بەڕەوای نابینم، سەهلیش لەوەلامدا پێی گووت: بەلام من لەگەڵ هەرکەسێك کەبەپێچەوانەی قورئان وسوونەتەوە بجولێتەوە ئیتر هەرکەسێك بێت شەڕی لەگەڵ دەکەم. ئەمەش لەساڵی دووسەدو یەکی کۆچیدا ڕوویداوە. ئەوکات ئیبراهیمی کوڕی مەهدی لەشکرەکەی لەدژی ئەوتەیار کردو زاڵ بوو بەسەریداو بەدیل گرتی و بەخێرایی توایەوە و لەناوچوو هەرجۆرێك بوو خۆی ڕزگار کرد. دواتر خەڵکێکی زۆرلەخەیاڵ پلاوان چاویان لەمان کرد و خۆیان بەپێشەواو ڕێنماکاری خەڵکی دەدایە قەڵەم بەبێ ئەوەی بزانن لەوەها بانگەشەیەکدا پێویستیان بەچی هەیەو، لەکاریگەری عەصەبیەت لەم کارەدا بەهەموو جۆرێك بێخەبەر بوون و چارەنووسی کارەکەی خۆیان نەدەزانی.

هەربۆیە لەبارەی ئەم گروپەوە دەبێت یەکێك لەم ئامادەکاریانە بگرینەبەر: یان پێویستەچارەسەربکرێن ئەگەر لەشێتەکان بن، یان بۆترساندنیان لێیان بدرێت و بکوژرێن ئەگەر هەرج و مەرج و ناهێمنی بخولقێنن، یان پێویستە ژیانێکی نەمرو بژییان بۆدابین بکرێت بۆئەوەی ببنە جێگەی گاڵتەجاڕی خەڵکی. هەندێك جار هەندێك کەس لەم گروپە خۆیان بەنزیکانی مەهدی چاوەڕوانکراو دەدەنە قەڵەم یان خۆیان بەبانگەوازکارانی ئەودەدەنەقەڵەم و، بەهیچ شێوەیەکیش لەفاتیمیەکان و مێژوویان شارەزانین. زۆربەی ئەوکەسانەی کەخۆیان بەم ناوانەوە دەناسێنن دەبینین یان لەجوملەی خەیاڵ پلاوانن و یان شێتن وەیان هەڵخەڵەتێنەرو فێڵبازن و ئەیانەوێت بەم جۆرە بانگەوازو کارانە بگەنەدەسەلات، چونکە لەتواناياندانیە بچوکترین هەنگاو لەوبارە یە وە هەڵبگرن.ئەوان واگومان دەکەن ئەم بانگەشانە ئارەزووەکانیان بەدی دەهێنێت، بەلام بەهیچ شێوەیەك ئەودەرئەنجامە مەرگبارەی کەلەم کارەدا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە پێشبینی ناکەن و هێندەش نابات بەهۆی ئەم فروفێلانەوە بەرەو مەرگ هەنگاودەنێن.

هەروەك چۆن لەسەرەتای ئەم سەدەیەوەلەسوس کەسێکی سۆفی بەناوی تویزری بەرەو مزگەوتی ئەوناوچەیە لەکەنار دەریا ڕۆیشت ولەلای خەڵکی سادە خۆی بەفاتیمی چاوەڕوانکراوکرد دایە قەڵەم، چونکە پێشتر وادەی ئەوەی دابوو کەبانگەوازەکەی لەهەمان مزگەوتەوە سەرهەڵدەدات و دەست پێدەکات. سەرەتا خەڵکێکی زۆر لەبەربەرەکان لەدەوری کۆبوونەوە، بەڵام هێندەی نەبرد سەرکردەکانی ئەوان لەترسی سەرهەڵدانی فیتنە عومەری سکسیوی کەلەو ڕۆژگارەدا مهتری موصامیدەبوو کەسێکی ڕاسپارد کەشەو بەنهێنی ئەولەسەر جێگەکەی بکوژێت و ئەوکارەکەشی بەئەنجام گەیاند. هەروەها لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە کەسێك بەناوی عەباس لەغەمارە دەرکەوت و هەمان ئەوبانگە شەیەی دەکرد. هەندێك خەڵکی نەفام شوێنی کەوتن و هێرشی کردە سەربادیس کەیەکێك بوو لەناوچەکانی ئەوان و بەزۆر چوویە ناوچەکەیانەوە. ئەوکات و لەپاش چل ڕۆژ لەدەرکەوتنی بانگەوازەکەی کوژرا و ناوی لەناوناواندا نەما. هەڵەی ئەمان بەوهۆیەوەیە هیچ حیسابێکیان بۆ عەصەبیەت نەکردووە، بەڵام ئەگەر ئەم بانگەشانە تەنها بۆهەڵخەڵەتاندنی خەڵك بێت ئەوا شیاوی لەناوچونن. خوداش داناترە. (بێجگەلەو هیچ پەروەردگارێك نیەو تەنها هەرئەوشیاوی پەرستنە.)[٢٥٣]

---

[٢٥٣] س المائده ئا ٣٢ .

# بەشی حەوتەم

## لەبارەی ئەوەی کەهەردەوڵەتێك بەهەرمیەکی دیاری کراوی هەیە لەسنورو زەوی و وولآتەکاندا ناگاتە قۆناغێکی فراوانتر

چونکە گروپی بەڕێوەبردن دەبێت بەخێرایی بەناچاری لەهەموو ناوچەکانی شارستانەکان وسنورەکاندا بلآوببنەوەو بەڕێوەبەرێتی ئەوناوچانە بگرنەدەستو دەسەلآتی ئەوسەر زەویانە بگرنەدەست بۆئەوەی سنورەکانی وولآت لەدەستدرێژی دووژمنان بپارێزن و، یاساکانی دەوڵەت لەبارەی باج و ڕێگری کردنی خەڵکی لەخراپەو کرداری دژ بەیاسا جێبەجێ بکەن. وەهەرکاتێك هەمووئەم گروپانە بەسەر ناوچە جیاوازەکاندا دابەش ببن ئەوا بەناچاری ژمارەیان کەم دەبێتەوە. بارودۆخی وولآتەکانیش گەشتونەتە قۆناغێك کەهەریەك سنورێکی تایبەت بەخۆیان هەیەو لەڕووی فراوانیەوە ئەوەی لەسوپاو پاسەوان هەیەتی تەنها بەشی ناوچەکەی خۆی دەکات، ئەگەر بێتو بیەوێت فراوانخوازی بکات ئەواپێویستی بەسوپاو پاسەوانی زیاترەوئەوناوچانەی کەداگیریان دەکات بەبێ پاسەوان وپارێزەر دەمێننەوەو وولآتەکەیان دووژمنی زۆر دەبێتو لەکاتی ناهەمواردا پەلاماری دەدەن و، باری ناهەموار ڕوولەو دەوڵەتە دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی بەوەها بارودۆخێکی چاونەترسانە سنورەکانی وولآتی خۆی فراوان دەکات و ئەویەریەستانەی کەمایەی شکۆی ئەم و ترسی هێرش بەرانەلەناودەچن، بەلآم تائەوکاتەی کە بەرپرسان و شارەزایانی وولآت زۆربن و لەپاش دابەشکردنیشیان بەسەر ناوچەکانی وولآتدا هێشتا کۆتاییان نەیەت ئەوا دەوڵەت هێشتا دەتوانێت

فراوانخوازی بکات و بیگەیەنێتە ئەوپەڕی، هۆکاری سروشتی ئەم شتەش ئەوەیەکە هێزی عەصەبیەت هەروەك هێزە سروشتیەکانی ترەو هەرهێزێکیش کەکردارێکی لێوە دەربچێت هەمان ئەوچۆنیەتیەلەکرداری ئەویشدا بوونی هەیە. توانایی بەهێزی هەردەوڵەتێك لەپایتەختەکەیدا زیاترە لەناوچەکانی تر. وە هەرکاتێك فراوانیەکەی بگاتە لوتکە ئەوا دەسەلأتی ناگاتە ناوچەکانی تری دەرەوەی دەسەلأتی و بێتوانایی و ناتەواوی خۆی دەخزێنێتە ناویەوە. هەروەك ئەوتیشك و نورانەی کەبەهۆی لێدانی شتێك بۆسەرئاو بەرووبەرێکی فراواندا بلأو دەبنەوە.

لەپاشان هەرکات دەوڵەت بگاتە قۆناغی پیری و بێتوانایی ئەوا کەم کەم ئەوبێتواناییە لەسنورەکانیەوە دەست پێدەکات، بەلأم پایتەخت هەربەپارێزراوی دەمێنێتەوە تائەوکاتەی کەبەویستی خودا ئاوابوونیان دێتە پێشەوە، ئەوکات پایتەختیش لەلایەن دووژمنانەوە داگیر دەکرێت. وەهەرکات دەوڵەتێك پایتەختە کەی لەدەست بدات ئەوا مانەوە و داگیر نەکرانی ناوچەکانی تر بۆئەو هیچ سودێکی نابێت و بەخێرایی لەناودەچێت، چونکە پایتەخت وەك دڵ وایە کەرۆحی لێوە دەردەچێت و هەرکە دڵەکە کەوتە دەستی دووژمنەوە ئەوا هەموو سنوورو ناوچەکانی تر هەرەس دەهێنن. هەروەك چۆن ئەم بابەتە لەدەوڵەتی ئێراندا دەتوانین تێبینی بکەین کەناوەندەکەی مەدائین بووەو هەرکەموسوڵمانان شاری ناوبراویان داگیر کرد سەرتاسەری ئێران هەرەسی هێناو ئەوناوچانەی کەبۆ یەزدگورد مابوونەوە سودێکیان پێنەبەخشی. بەپێچەوانەی ئێرانیەکانەوە رۆم شامی لەدەستدا کەیەکێك بوو لەناوچەکانی لەبەر ئەوەی پایتەختی ئەو وولأتە قوستەنتینەبوو هەرکە موسوڵمانەکان شامیان داگیر کرد، رۆمیەکان لەپایتەختەکەیاندا جێگیر بوون و لەدەستدانی شام زیانێکی ئەوتۆی پێ نەگەیاندن و تاوەکو بەویستی خودا لەناوچوونیانی راگەیاند.

وەهەروەها بارودۆخی عەرەبیش لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا جێگەی سەرنجە لەبەر ئەوەی کەخاوەنی کۆمەڵەو گروپگەلێکی فراوان بوون بۆ بەرێوەبردنی کاروباری دەوڵەت

دەبینین چۆن بەخێرایی زاڵبوون بەسەر دەوڵەتە دراوسێکانیاندا وەك عێراق و شام و میسر و دواتریش لەم وولآتانەش فراوانخوازیان زیاتر کردوو مەملەکەتەکانی دوای ئەوانیشیان داگیر کرد وەك سیند و حەبەشەو ئەفریقاو مەغریب و ئەندەلوس، بەڵام هەرکە لەناوچە جۆراوجۆرەکاندا دابەشبوون بەسەر گروپ و بوونە چەندین کۆمەڵەوە لەسنورو مەملەکەتە جۆربەجۆرەکانداو وەك لەشکر لەو وولآتانە مانەوە جیالەیەکتری، ئەوەبوو بەهۆی ئەم پەرش و بڵاویەوە ئەندامانی دەزگای فەرمانڕەواییان کۆتایی هاتوو فتوحاتەکانیان کەمی کردوو دەسەلآتی ئیسلامی کەم کەم بەرەو ئاوابوون ڕۆیشتوو لەم سنوورانەش بەدواوە تێپەڕیان نەکرد. ئەوەبوو سەرئەنجام دەوڵەتی ئیسلامی پوکایەوە و بەویستی خودا لەناوچوو. حاڵی دەوڵەتانی دوای ئیسلامیش هەربەوشێوەیە بووە، هەردەوڵەتە و بەپێی زۆری و کەمی فەرمانبەران و ئەندامانی دەزگای فەرمانڕەوایی پێشکەوتنیان هەبووە و لەکاتی کۆتایی هاتنی ژمارەیانەوە بەهۆی دابەشکردنیان بەسەر ناوچە جۆربەجۆرەکانی تردا سەرکەوتن و فراوانخوازیەکانیان دەوەستێت. دەستووری خودایە لەناو دروستکراوەکانیدا.[٢٥٤]

[٢٥٤] (سُنَّةَ اللهِ فى خَلقةِ) س المؤمنون ئا ٤٨ .

# بەشی هەشتەم

## لەبارەی ئەوەی کە فراوانی دەوڵەت و بەربڵاوی فەرمانڕەوایی و درێژی سەردەمەکانی پەیوەستە بە کەمی و زۆری ئەندامانی دەزگا فەرمانڕەواییەکانیەوە

بەوهۆیەی کەدەوڵەتداری وابەستەیەبەعەصەبیەتەوە خاوەنانی عەصەبیەت هەمان ئەوپاسەوانانەن کەبەناوچەکاندا دابەش دەبن. هەربۆیە هەرچەندە فەرمانبەران و کاربەدەستانی دەوڵەت زۆرترین ئەوا ئەودەوڵەتەش بەهێز دەبێت و ناوچەگەلێکی زیاتر داگیر دەکات و فەرمانڕەواییەکەی فراوانتر دەبێت. ئەم مانایەش دەتوانین لەدەوڵەتی ئیسلامیدا بەدی بکەین، لەوکاتەی کەخودا وشەی ئیسلامی لکاند بەعەرەبەوە، ئەمە لەکاتێکدا ژمارەی موسوڵمانان لەجەنگی تەبوکدا کەکۆتاجەنگی پێغەمبەر بوو (ص)بەسوارو پیادەوە سوپاکەی سەدودەهەزار کەس بوون کەلەموزەڕو قەحتان پێکهاتبوون، ئەمەسەرەڕای ئەوانەشی کەلەپاش ئەو جەنگە و کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە هاتنە ناویانەوە، لەبەر ئەوەی کەلیاقەتیان هەبوو وولآتانێکی زۆریان داگیر کرد کەلەدەستی نەتەوەکانی تردا بوون، لەشکرو چەکیان هەرئەوە بوو کەباسمانکرد، بەڵام سوپاکانی ئێران و ڕۆم کەدوو دەوڵەتی گەورەی ئەوسەردەمەو تورکەکانی خۆرهەڵات و فەرەنگی بەربەرەکانی مەغریب و قوتەکانی ئەندەلوس لەبەرامبەر ئەواندا (واتە سوپای موسوڵمانەکان)لەڕەگ و ڕیشەوە لەبن دەرهاتن و، لەحیجازەوە بۆسوسی سەرەوەو لەیەمەنەوە بۆ ناوچەی تورکەکان لەئەوپەڕی ناوچەی باکوردا هەنگاویان هەڵگرتو

دەستیان بەسەر حەوت هەرێمدا گرت. ئەوکات دەتوانین دەوڵەتی فاتیمی و صەنهاجەو مووەحیدان کەلەپێش ئەوانەوە بوون پێوانە بکەین و ئەوئەنجامە وەربگرین کەلەبەر ئەوەی هێزی کەتامە یان دامەزرێنەرانی دەوڵەتی عەبیدیان زیاتر بوون لە موصامیدەو صەنهاجە دەوڵەتەکەیان گەورەتر بووە و، توانیویانە ئەفریقاو میسرو شام و مەغریب داگیر بکەن، لەپاش ئەمانیش دەتوانین دەوڵەتی زناتە لەبەر چاوبگرین لەبەر ئەوەی ژمارەی بەرگریکارانی دەوڵەتیان لەموصامیدە کەمتر بوون سەردەمی دەوڵەتداریان کورتتر بوو لەفەرمانڕەوایی مووەحیدان، چونکە ئەمان لەسەرەتای فەرمانڕەواییانەوە لەڕووی ژمارەوە لەموصامیدە کەمتر بوون، لەپاشان دەتوانین چۆنیەتی دوودەوڵەتی هاوچەرخ کەیەکێکیان زناتەخانەدانی مەرینی لەمەراکیش و ئەویتریشیان سەربە خانەدانی عبدالواد لەتلمسان بەووردیەوە لێکۆڵینەوە بکەین دەبینین لەبەر ئەوەی کەخانەدانی مەرینی لەسەرەتای دەوڵەتداریەوە زیاتر بوون، لەخانەدانی عبدالواد خانەدانی یەکەم وولاتەکەیان فراوان و بەرین و دەسەلاتدار تربوون.

هەربۆیە خانەدانی مەرینی چەندجارێکی یەك لەدوای یەك بەسەریاندا سەردەکەوتن. دەڵێن گوایە لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەوە خانەدانی مەرینی سێ هەزارکەس بوون لەکاتێکدا خانەدانی عبدالواد هەزارکەس تێنە پەڕیون، بەلام گەورەو بچوکی دەوڵەت پەیوەستەبە زۆری و کەمی شارەکان و دانیشتوانەوە، چونکە زۆری شوێنکەوتوانی دەوڵەت بەندە بەزۆری شارەکان و شوێنی نیشتەجێبوونەکەیانەوە. سەرکەوتنی هەردەوڵەتێکیش لەسەرەتای دامەزراندنیەوە پەیوەستە بەڕێژەی دانیشتوانە کە یەوە و تەمەن درێژیەکەشی بەهەمان شێوەیە، چونکە تەمەن بوونەوەرێکی زیندووە وابەستەیە بەهێزی میزاجی کەسەکەوە و میزاجی دەوڵەتانیش بێگومان هەمان ئەوعەصەبیەتەیە. وەهەرکات عەصەبیەتی هەردەوڵەتێك بەهێزبێت ئەوامیزاجەکەی شوێنکەوتەی عەصەبیەتەکەیەتیو سەردەمی فەرمانڕەوایی و تەمەنەکەی درێژ دەبێت. هێزی عەصەبیەتیش هەروەك پێشتر گوتمان بێگومان پەیوەستە بەزۆری ژمارەی

نەتەوەیەکەوە و هۆکاری ڕاستەقینەی ئەمەش ئەوەیە کەناتەواوی دەوڵەت، بێگومان لەشوێنەدوورو سەرسنورەکانیەوە دەست پێدەکات هەربۆیە هەرکات مەملەکەت و دەوڵەتێك زۆربێت ئەوا سنورەکانی لەپایتەختەوە تائەندازەیەکی زۆر دوورن و ژمارەشیان زۆرە، هەرکەم و کورتیەکیش کەڕوویدات بێگومان پەیوەستە بەکاتەوە، چونکە کەموکورتی هەردەوڵەت و مەملەکەتێك لەکات و شوێنێکی دیاری کراودایە، بمانەوێت و نەمانەوێت کاتەکەمەکانیش زیاد دەکەن وبەم شێوەیە تەمەنی دەوڵەتەکە درێژ دەبێت، وەك دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی کەچۆن سەردەمێکی دوورو درێژی لەفەرمانڕەوایی هەبوو چ ناوەندی دەسەلأت و فەرمانڕەوایی عەباسیەکان، کەلەناوەندی پێتەختی ئیسلامدابوو وەچ فەرمانڕەوایی خانەدانی ئەمەویەکانی ئەندەلوس کەفەرمانڕەواییەکی سەربەخۆیان هەبوو. فەرمانڕەوایی هەموو ئەمانە کەم و کورتی تێنەکەوت مەگەر پاش چوارسەد ساڵ لەکۆچی پێغەمبەر (ص). ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی عبیدیەکانیش نزیکەی دووسەدو هەشتاساڵی خایاند و ماوەی دەسەلأتی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی صەنهاجەلەسەرەتای ڕاسپاردنی معدالمعز کە فەرمانڕەوایی ئەفریقای دایەدەستی بلکین بن زیری لەساڵی سێسەدو پەنجاوهەشت، تاوەکو ئەوکاتەی کەمووەحیدان دەستیان بەسەر قەلعەو بجایەداگرت لەساڵی پێنج سەدو پەنجاوحەوت لەعەبیدیەکان کەمتر بوو.

وەدەوڵەتی مووحیدان تائەم کاتە نزیکەی دووسەدو حەفتا ساڵە فەرمانڕەوایی دەکەن، بەم شێوەیە ئەوە دەرکەوت کەتەمەنی دەوڵەتەکان پەیوەستە بەژمارەی کاریەدەستەکانیەوە. سوننەتی خودایە لەناوبەندەکانیدا بەڕاستی ڕابورد.[٢٥٥]

---

[٢٥٥] (سُنَّةَ اللهِ الَّتی قَدخَلَتْ فی عِبادة)س المومنون ئا ٤٨.

# بەشی نۆیەم

## لەبارەی ئەوەی کەلەسنورو ئەوناوچانەی کەخاوەن هۆزو دانیشتوانی زۆرو جۆراوجۆرن زۆر بەکەمی دەکرێت دەوڵەتێکی بەهێز بمێنێتەوە

چونکەجیاوازی بیروباوەڕو ئارەزووەکان کەبەشوێن هەریەکەیانەوە عەصەبیەتێك هەیە ڕێگرە لەعەصەبیەتێکی تر، هەربۆیە دژایەتی کردنی دەوڵەت و ڕاپەڕین لەدژی بەردەوام زۆر دەبێت هەرچەندە خودی ئەودەوڵەتەش پشتی بەعەصەبیەتێکیش بەستبێت، چونکە هەریەکەلەوعەصەبیەتە ژێردەستانە دەوڵەتی خۆیان بەخاوەن هێز دەزانن، لەم بارەیەوە پێویستە سەیرێکی بارودۆخی ئەفریقاو مەغریب بکەین و ڕووداوەکانی ئەو سەرزەمینە لەسەرەتای هاتنی ئاینی ئیسلامەوە تاوەکو ئێستا لێکۆڵینەوە بکەین، لەبەر ئەوەی بەربەرەکانی ئەم سنورو بوومەخاوەنی هۆزو عەصەبیەتی جۆراو جۆرن یەکەم سەرکەوتن کەئیبن ئەبی سەرح بەدەستی هێناو، بەسەر هۆزەکانی ناوبراوو تائەندازێکیش بەسەر فەرنگیەکانی دانیشتووی ئەوناچانەدا زاڵ بوو بێ ئەنجام بوو، چونکە خەڵکی ئەوسنوورو بوومانە چەندین جار کودەتایان لەدژی کردوو لەلایەن موسوڵمانەکانەوە لەدژی ئەوان خوێنڕێژی کراو، تەنانەت لەپاش جێگیر بوونی ئاینیش لەوناوچانە دیسانەوە لێرەو لەوێ ڕاپەڕین و کودەتا سەری هەڵدەداو لەفەرمان

دەردەچوون. ئیبن ئەبی زید[٢٥٦] دەڵێت: بەربەرەکان لەمەغریبدا دوازدەجار هەڵگەڕاونەتەوە و بانگەوازی ئیسلام لەناویاندا جێگیر نەبوو مەگەر لەسەردەمی فەرمانڕەوایی موسای کوڕی نەصیرو سەردەمەکانی دوای ئەودانەبێت. ئەم بارودۆخەش مانای قسەکەی خەلیفە عومەر ڕوون دەکاتەوە کەگوتوویەتی: (جیاوازی و پارچەپارچەیی ئەفریقا بەهۆی خەڵکەکەیەتی) قسەکەی حەزرەتی عومەر ئاماژەیەبەومانایەی کەزۆری گروپ و هۆزە فراوانەکانی ئەوناوچەیە بوونەتە مایەی دەرچوونیان لەژێرفەرمانی دەوڵەتدا، ئەمەلەکاتێکدا خەڵکی عێراق و شام لەم سەردەمەدا بەم شێوەیەنین، بەڵکو بەرلەهاتنی ئیسلامیش هێزی لەشکری لەو وڵاتانەدا لەئێرانی و ڕۆمیەکان بوون و خەڵکی وڵاتانی ناوبراو یەکسەر بەشارنشینەکان دەدرانە قەڵەم و موسوڵمانەکان چاویان تێبڕین و فەرمانڕەواییان لەئێرانی و ڕۆمیەکان سەندەوە و، لەوەبەدواوە هیچ کێشەوگرفتێك نەهاتە سەر ڕێگەیان، بەڵام ژمارەی هۆزەکانی بەربەر لەمەغریبدا زیاترە لەوەی کەبتوانرێت بژمێردرێن و هەموویان دەشتەکین و خاوەن و هۆزو عەشیرەتی جۆراوجۆرن، هەروەك چۆن هەرکات هۆزێك لەناوبچێت ئەوا هۆزێکی تر شوێنی دەگرێتەوە و هەمان سەرکەشی هەڵگەڕانەوەی هۆزی پێشوو پەیڕەو دەکات.

هەربۆیە کاری دامەزراندنی دەوڵەتی عەرەب لەسنوورو بوومەکانی ئەفریقاو مەغریبدا ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا. هەروەك چۆن ئەم بارووبدۆخە لەشام و لەسەردەمی خانەدانی ئیسرائیلدا دەبینرێت، چونکە لەو وڵاتەدا هۆزو نەتەوەی جۆراوجۆر هەبوون وەك هۆزەکانی فەلەستین و کەنعان و خانەدانەکانی عیصوو مدین و لوت و ادوم و ئەرمن و ئکریش و نەبەت لەناوچەکانی جەزیرە و موصڵدا دەژیان و، لەزۆری و جۆراوجۆری عەصەبیەتدا بێشومار بوون لەم ڕووەوە بنیاتنانی دەوڵەت بۆخانەدانی

---

[٢٥٦] ئەبو محمد عبداللەی کوڕی ئەبی زەیدعبدالرحمانی قەیرەوانی ٣١٠-٣٨٦ فەقیهی مالیکی کەبەهۆی قوڵبوونەوە و شارەزاییەوە لەفیقهی مالیکیدا بەمالیکی بچوك ناوزەد کرابوو، بەڵام ئسلان پێی وایە مەبەست ئەبو محمدی ئەیوبی کوڕی ئەبی یەزیدە کەباوکی یەکێك بووە لەدژەکانی فاتیمیەکان و زۆر بەناوبانگ بووە.

ئیسرائیل و فراوانکردنی فەرمانڕەوایی خۆیان لەو وولاتەدا زۆر دژوار بوو، چەندجارێك ئەو وولاتە تووشی کێشەو گرفت بوویەوە و خەڵکی دژایەتی دەکردن و ئەم کێشانەش تەنانەت ناوخانەدانەکەشی گرتەوە، هەروەك چۆن لەبارەی پاشاکەی خۆیانەوە جیاوازیان تێکەوت و لەدژی ڕاپەڕین و لەوەبەدواوە وولاتەکەیان جێگیری بەخۆیەوە نەبینیوە بەرەو لاوازی هەنگاوی دەنا تائەوەبوو وولاتی ئێران و دواتریش وولاتی یۆنان لەکاتی فەرمانڕەوایی و لەکاتی ئاوارەییدا، ڕۆمیەکان هێرشیان کردەسەریان. خوداش زاڵە بەسەر کارەکانی خۆیدا. بەپێچەوانەوە بارودۆخی باسکراو لەو وولاتانەی کەعەصەبییەتی جۆراوجۆر بوونی نیە بنیاتنانی دەوڵەت کارێکی ئاسانەو سوڵتانی ئەم جۆرە ناوچەوبوومانە بەهۆی کەمی هەرجومەرج و سەرکەشی خەڵکەوە بەهێمنی دەژین‌و، دەوڵەت پێویستی بەعەصەبیەتێکی فراوان نیە، چونکە بارودۆخی میسرو شام لەو ڕۆژگارەدا بەم شێوەیەبووە، چونکە لەوولاتی شامدا هۆزو عەصەبیەت نابینرێن، هەروەك لەڕابووردودا باسمانکرد هەروەك بڵێی شام زادگای هۆزەکان نەبووە. وولاتی میسریش بەهۆی کەمی هۆزەکان و خاوەنانی عەشیرەتەوە لەوپەڕی هێمنی و ئارامیدا ژیان بەسەر دەبەن. بەڵکو ئەو وولاتە تەنها خاوەنی سوڵتان و خەڵکەو دەوڵەتەکەی لەسەر پاشاکانی تورك وەستاوە و پشت بەستووە بەخەڵکی نەتەوەکانی ئەم پاشایانەش یەك لەدوای یەك دەگەنە دەسەلات و فەرمانڕەوای لەنێوان خانەدانەکانی ناوبراودا لەنەوەیەکەوە بۆنەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە و، خەلافەت بەناوی کەسێکەوەیە کەسەر بە عە باسیەکانی پاشماوەی خەلیفەکانی بەغدایە.

بارودۆخی ئەندەلوسیش لەم ڕۆژگارەدا وەك شام و میسر وایە، چونکە ئیبن الاحمر سوڵتانی ئەو وولاتە لەسەرەتای دەوڵەتەکەیەوە عەصەبیەت و گروپگەلێکی بەهێزی نەبوو، بەڵکو ئەو سەربەیەکێك لەخانەدانەکانی عەرەبەکەلەدەوڵەتی ئەمەویدا خزمەتیان کردووە وکۆمەڵێکی کەمیان لەئەندەلوسدا مابوونەوە و لەپاش لەناوچوونی دەوڵەتی عەرەبی ئەندەلوس و فەرمانڕەوایی بەربەرەکانی لمتونە (مورابیتان)و مووەحیدان،

خەڵکی ئەو وولاتە لەدەسەلاتی ئەونەتەوانە بێزار بوون و دەسەلاتەکەیانیان بەسەر خۆیاندا بەناڕەوا دەزانی و زۆر ڕقیان لێیان دەبوویەوە. گەورە زادەکانی نەژادی مووەحیدان لەکۆتایی سەردەمەکانی دەوڵەتدا دەستیان بەسەر قەلا گەلێکی زۆردا گرت کەهی پاشای مەسیحیەکان بوون ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی کەبەهۆیانەوە بتوانن پایتەخت (مراکیش)داگیر بکەن، گروپێك لەپاشماوەکانی خاوەنانی عەصەبیەتی کۆن کەلەبنەماڵە ڕەسەنەکانی عەرەب دەژمێردران و لەپایتەخت و شارەگەورەکان دوور کەوتبوو نەوە و لەسوپادا بەبەهێزیەوە مابوونەوە، لەئەندەلوسدا کۆبوونەوە وەك ئیبن هود و ئیبن ئەحمەر و ئیبن مەردەنیش و ئەوانیتریش. ئیبن هودجلەوی دەسەلاتی گرتە دەست وخەڵکی بۆ پەیڕەوی کردن لەخەلافەتی عەباسیەکان لەخۆرهەلاتدا بانگەوازدەکرد، ولەدژی مووە حیدا نیش هانی دەدان. خەڵکی بانگەوازەکەیان قبوڵکردوو پەیمانی مووەحیدەکانیان شکاندو دەریان کردنە دەرەوە و ئیبن هود بەتەنها فەرمانڕەوایی ئەندەلوسی گرتە دەست وسەربەخۆیی ڕاگەیاند.

دوای ئەویش ئیبن ئەحمەر خولیای دەسەلات کەوتە سەریەوە ودەستی کردە دژایەتی کردنیو ئیبن هوودو خەڵکی بانگ دەکرد بۆشوێنکەوتنی ئیبن ئەبی حەفص کەلە سوڵتانەکانی مووەحیدانی ئەفریقا بوو بەهاوکاری کۆمەڵێکی کەم لەخزمانی کەبەسەرۆکەکان بەناوبانگ بوون گەیشتە دەسەلات و، لەبەر ئەوەی کەلەئەندەلوسدا هۆزو گوپی زۆر بوونیان نیە هێزێکی لەوە زیاتری پێویست نیە، چونکە بارودۆخی دەسەلات ئەندەلوس خاوەن سوڵتان و ژێردەستەبوو هۆزو عەشایری جۆراوجۆری تێدانەبوو. لەپاشان ئیبن ئەحمەر پشتی بەپاشایەکی مەسیحی بەست کەئەو لەڕێگە گروپێك لەشازادەکانی زناتەهاوکاری دەکرا و لەڕێگەی دەریاوە بەرەو لای ئەو بانگی دەکردن و ئەم شازادانەش لەگەڵ خزمەکانی تریدا وەك سوپایەك دەژمێردران کەسنورو دەسەلاتەکانی پاسەوانی دەکرد. ئەوکات پاشای مەغریب کەلەهۆزی زناتە بوو حەزی لەداگیر کردنی ئەندەلوس دەکرد، بەلام ئەم گروپەلەشازادەکانی زناتە کەسەربەگروپی

ئیبن ئەحمەر دەژمێردران ڕێگریان لەخاوەنی مەغریب کرد تائەوەبوو فەرمانڕەواییەکەی بەهێزبوو خەڵکی خوویان پێوەگرت و دووژمنانی توانای دژایەتی کردنی ئەمیان نەبوو، هەربۆیە پاشایەتی لەخانەدانەکەیدا بەمیراتی مایەوە تائەم ڕۆژگارەش دەسەلآت بەدەستی ئەو نەتەوەیە. کەواتە ئەگەر کەسێك گومانی ئەوەبکات ئیبن ئەحمەر عەصەبیەت و هاوەڵی نەبووە شتێکی ڕاست نیە، بەڵکو سەرەتای کارەکەی ئەو بەوهۆزو گروپ و دەستەو تاقمانە دەستی پێکرد و ئەویان دەپاراست، بەڵام گروپێکی کەم بوون، بەڵام بەئەندازەی پێویستی ئەو، لەبەرئەوەی لەسەرزەوی ئەندەلوسدا عەصەبیەت و هۆزگەلێکی زۆر بوونیان نیە داگیر کردنی پێویستی بەهێزو عەصەبیەتی زۆر نابێت. خوداش بێ نیازە لەجیهانیان.[٢٥٧]

---

[٢٥٧] (فإِنَ اللهَ غَنیُ عَنِ العالَمِین) س ال عمران ئا ٢ .

# بەشی دەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە ( حکومەتی ڕەها )[258] لەشتە سروشتیەکانی دەوڵەتداریە[259]

هەروەك چۆن لەڕابووردودا باسمانکرد دەوڵەت لەڕێگەی عەصەبیەتەوە بەدی دێتو عەصەبیەتیش لەڕێگەی هۆزو گروپەکانەوە دروستدەبێت کەبەهێزترینیان کاروباری هەموویان دەگرێتە دەستی خۆی، هەموویان پەیوەست دەکات بەخۆیەوە بەم شێوەیە کۆمەڵگەکان دروستدەبن و زاڵبوون بەسەر خەڵك و کەلاندا ئاسان دەبێت. ڕازی نهێنی ئەمەش ئەوەیە کەعەصەبیەتی گشتی تایبەتی هۆزێك وەك میزاج وایە بۆ بوونەوەرێکی زیندوو میزاج لەتووخمەکان پێکهاتووەو لەشوێنی خۆیدا ئاشکرابوو کەهەرکاتێك تووخمەکان بەرابەرو یەکسان بن بەهیچ شێوەیەك میزاجیان تێدا ڕوونادات بەڵکو دەبێت بەناچاری یەکێکیان بەسەر ئەویتردا زاڵبێت بۆئەوەی ئاوێتەبوون درووست ببێت، وەهەروەها بەناچاریەوە دەبێت یەکێك لەعەصەبیەتەکان بەسەر عەصەبیەتەکانی تردا زاڵ ببێت تاوەکو بتوانێت جیگیریان بکات و بیانکاتە یەك و هەموویان وەك یەك عەصەبیەتی گشتگیر کەهەموو عەصەبیەتەکان بگرێتەوە لێبکات، ئەو عەصەبیەتە

---

[258] مانای الانفراد بالمجد کەئیبن خەلدون بەمانای دەوڵەتی ڕەها هێناویەتی.

[259] لەم بەشەدا ئیبن خەلدون دووەمین جۆری دەوڵەتی لەوپێنج جۆرە دابەشکردنە کەلەبەشی حەڤدەیەمدا کردوویەتی باسدەکات.

گەورەیەش لەو هۆزەدەبێت کەخاوەنی خێزانی بنەڕەت و سەرۆك بن و بەناچاری دەبێت یەکێك لەئەندامانی ئەو خێزانە سەرۆکایەتیەکە بگرێتە دەست و، ئەوانی تر ملکەچی فەرمانی خۆی بکات و ئەم سەرۆکەش زاڵدەبێت بەسەر هەموو عەصەبیەتەکانی تردا، چونکە خانەدانەکەی زاڵن بەسەر هەموو خانەدانەکانی ترداو لەبەر ئەوەی خوی حەیوانی زاڵی و سەرکەشی لەودا بوونی هەیە، ناهێڵێت خەڵکی لەگەڵیدا بەشداربن و خووی خۆ بەخودا زانین کەلەتەبعی مرۆڤەکاندا هەیە لەویشدا درووست دەبێت و لەگەڵ پێدراوەکانی دەوڵەتداریدا هاوشان دەبێت، کەبریتیە لەخۆبەباش و پەسەند زانین (حومەتی ڕەها) ئەمەش بۆئەوەیە نەوەك بەهۆی جیاوازی و کێشەی نێوان فەرمانڕەواکانەوە دەوڵەت تووشی بێسەرو بەری ببێت.

(چونکە ئەگەر بێجگەلەخودا خودایەکی ترهەبایە ئەوا بوونەوەر تێکدەچوو)س ئەنبیا ئا ۲۲. لێرەدایە ڕێگری لەنەتەوە و عەصەبیەتەکانی تردەکرێت کەبەشداری دەسەلآت بکەن و عەصەبیەتیان هەمیشە ژێردەستەیەونەتەوەی زاڵ هەرچییەك کەبیەوێت ئەنجامی دەدات و ڕێگەش بەکەس نادات بچوکترین دەستێوەردانی هەبێت، سەرئەنجام هەمووخەڵکی تر لەدەسەلآت بێبەش دەکات. هەندێك جار لەوانەیە (دەوڵەتی ڕەها)بۆیەکەمین پاشای دەوڵەت دەست بدات، هەندێك جاریش لەوانەیە بۆ کەسی دووەم یان سێیەم سوڵتان دەست بدات، ئەمەش بەپێی ڕێگری و ڕێگەپێدانی عەصەبیەتەکانی تر بەدی دێت، بەلآم بەشێوەیەکی گشتی بابەتی (دەوڵەتی ڕەها)لەدەوڵەتەکاندا خۆلادان لێی ئەستەمە، دەستووری خودایە کەبەڕاستی لەنێوبەندەکانیدا ڕابووردووە. خودای بەرزو بالآ داناترە.

# بەشی یازدەهەم

## لەبارەی ئەوەی کەتواناو جوا نخوازی
## لەشتە سرووشتیەکانی دەوڵەتداریە

چونکەهەرکات نەتەوەیەك زاڵببێت و ئەونازو نیعمەتەی کەدەوڵەتدارانی بەرلەخۆیان هەیانبووە بکەوێتە ژێردەستیان، نیعمەت و توانا کانیان زۆر دەبێت وداب و نەریتیشیان بەهەمان شێوە زۆر دەبێت و ئەوکات لەقۆناغی پێداویستیەکان و سەختی ژیان هەنگاوێك بەرەو پێشەوە هەڵدەگرن‌و، ڕوودەکەنە شتە ناپێویستیەکان‌و لەداب‌و نەریتەکاندا چاو لەپێشینانیان دەکەن و ئەونەریتانەی کەبۆ بەکارهێنانی هۆکارەکانی جوانخوازی‌و کەمالیات پێویستە بەدەستی بهێنن، هەر لە خواردن و پۆشاك و شێوازەکانی ژیان‌و هەموو شتەکانەوە بەسەر یەکتریدا شانازی دەکەن و لەم ڕێگەیەشەوە شانازی بەسەر گەلانی تردا دەکەن و لەپێشینانیان پێشکەوتوو ترن و تاوەکو کۆتایی دەوڵەتەکەیان بەردەوام لەهەوڵی بەرەوپێش بردنی ووڵاتدان‌و، ئەوهەوڵەشیان بەئەندازەی ڕووبەرو فراوانی دەوڵەتەکەیانەو تاوەکو دەیگەیەننە قۆناغی کۆتایی و ئاستێك کەبۆ ئەودەوڵەتە بەپێی بەهێزی و نەریت و ڕێوڕەسمەکانی پێشینانیان ئاسان دەبێت. خوداش باشترینی فەرمانڕەواکانە.

# بەشی دوازدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کەئارامی و سکونەت لەشتە سروشتیەکانی دەوڵەتداریە

چونکە مەملەکەت بۆهەرگەلێك بێجگە بەفراوانخوازی بەدەست نایەت وئامانجو مەبەستیش لێی بەدەستهێنانی زاڵی و هێزو دەوڵەتداریە و هەرکات ئەوئامانجە بێتەدی ئەوا هەوڵدان بەرەوئامانجی ناوبراو دەست پێدەکات. شاعیر دەڵێت: (لەهەوڵ و ماندووبوونی ڕۆژگار بۆجیاکردنەوەی من و دڵدارەکەم سەرسام بووم، چونکە ئەوەی لەنێوانماندا بوو کۆتایی هاتوو ئیتر ڕۆژگار ئارام بوویەوە). هەربۆیە هەرکات نەتەوەیەك دەسەڵات و دارایی بەدەست بهێنن ئەوسەختی نارەحەتیانەی کەلەو پێناوەدا دەیانچەشت، وازیان لێدەهێنن و هێمنی ئارامی هەڵدەبژێرن و دەستدەکەن بەچنینەوەی بەرهەمەکانی دەوڵەتداری وەك دروستکردنی خانوو باڵەخانەی جوانترو باشترو پۆشینی جوانترین و باشترین و ڕازاوەترینی جلوبەرگەکان و ڕووبارو جۆگەکان درووستدەکەن، باخو بێستانەکان ئاوەدان دەکەنەوە و لەباروەدۆخەکانی ئەم جیهانە بەهرەمەند دەبن هێمنی و ئارامییان پێ باشتر دەبێت لەنارەحەتی و نەهامەتیەکانی ژیان و دەست دەکەنە داهێنان و جوانکاری لەهۆکارو ئامێرو پۆشاك و هەمووشتەکانی ژیاندا، ئەمەش وەك میرات بۆنەوەکانی داهاتوویان بەجێ دەهێڵن. ئەم چۆنیەتیەش لەناویاندا ڕوولەزیاد بوون دەکات تائەوکاتەی کەخودا فەرمان دەکات بەکۆتایی هاتنیان. هەرئەو باشترینی فەرمانڕەوایانە. خوداش داناترە.[٢٦٠]

---

[٢٦٠] (وَهُوَخَيرِ الحاكمين) س اعراف ئا ٨٥ و س يونس ئا ١٠٩ و س يوسف ئا ٨٠.

# بەشی سیازدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کەهەرکات کاروباره سرووشتیەکانی دەوڵەتداری وەك ( حکومەتی ڕەها )و نازونیعمەت و جوانخوازی وئارامی بەهێزو جێگیر ببێت ئەوکات دەوڵەت بەرەو پیری و فەتووتی دەچێت

ئەم شتەش لەچەند ڕووەوە باسدەکرێت:

ڕووی یەکەم: هەروەك پێشتر ئامارەمان پێکرد سروشتی دەوڵەتداری ئەوەدەخوازێت کەدەوڵەت بەرەو فەرمانڕەوایی ڕەها بڕوات تائەوکاتەی کەگەورەیی و سەرۆکایەتی لەنێوان گروپی هۆزێکدا هاوبەشە و هەموویان بەیەکسانی لەپێناویدا هەوڵی بۆدەدەن و، لەبەرامبەر هێرشی بێگانەکانەوە وولآت و سنوورەکانی بپارێزن ئەمەش وەك تاکە ڕێنماکاری ئەمان لەسەربەرزی و هێزی پاراستنی ئەوانە، چونکە ئامانج و مەبەستی ئەوان سەربەرزی و گەورەییانە هەروەك چۆن مەرگیان لەدروستکردنی کۆشکی گەورەیی و ڕێزدا زۆرجار هەڵبژاردووەو پێشیان باشترە، تاوەکو لەناوچوونی هەوڵ و کۆششی چەند ساڵەیان ببینن، بەڵام هەرکاتێك یەکێك لەوان ببێتە فەرمانڕەوایەکی ڕەها، عەصەبیەتی ئەوانی تر سەرکوت دەکات و هەموو عەصەبیەتەکانیش ملکەچی خۆی دەکات و هەمووسەروەت‌و سامانەکانیش تایبەت دەکات بەخۆیەوە.لەئەنجامدا خەڵکانی تر لەمەسەلەی گەورەیی و بەرگریدا بێتوانایی نیشان دەدەن، زاڵبوون و ئازایەتیان دەگۆڕێت بۆ سستی و لاوازی و خوو دەگرن بەبەندایەتیەوە، هەربۆیە نەوەی دوای ئەمانیش

بەهەمان شێوە پەروەردە دەبن و پێیان وایە بەردەوامی و ئەومافانەی کەلەسوڵتانەوە وەری دەگرن، وەك هەقدەستیانە لەبەرامبەر ئەو پارێزگاری و هاوکاری کردنەی ئەوەوەیە بێجگەلەمەش هیچی تر بەمێشکیاندا نایەت و زۆربەکەمی دەگونجێت کەسێکیان لەکارەکانی خۆی ڕووبەڕووی مەرگ بکاتەوە. لەئەنجامی ئەم بارودۆخەشدا سستی و لاوازی ڕوولەدەوڵەت دەکات و لەهێزوو شکۆی کەم دەبێتەوەو، عەصەبیەتیش بەهۆی نەمانی دلاوەریەوە لەناودەچێت وسەرئەنجام دەوڵەت پیر دەبێت و بەرەو مرگ هەنگاو دەنێت.

ڕووی دووەم: ئەوەیەکە هەروەك باسمانکرد یەکێك لەپێداویستیەکانی دەوڵەتداری نازونیعمەت و جوانخوازیەو بەوهۆیەشەوە داب و نەریتێکی زۆر لەناوئەندامانی دەوڵەتدا ڕەواج پەیدا دەکاتو، خەرجیان لەبەرامبەر شتەبەردەوامەکاندا زۆر دەبێت و دەرامەتیان بەبەراورد بەخەرجەکەیان یەکسان نیە. هەربۆیە نەدارەکان لەنێویاندا لەنەبوونیدا دەمرنو ئەوانەش کەلەنازو نیعمەتدان هەموو دەرامەتێکیان لەخۆشگوزەرانی خۆیاندا خەرج دەکەن و، ئەم بارودۆخەش لەنەوەکانی داهاتووشدا ڕەنگ دەداتەوە ودەگاتە قۆناغێك کەهەموو هەقدەست و مووچەی فەرمانبەرانی دەوڵەت لەبەرامبەر ئەوخەرجە زۆرو زەوەندەو خۆشگوزەرانیەوە بەش ناکات و گیرۆدەی نەداری دەبن و، پاشاکانیشیان فەرمان دەدەن کەتەنها خەرجیەکان تایبەت بکرێن بەسوپاوە، بەڵام دیسانەوە ڕێگەیەکی ڕزگاربوون نادۆزنەوە.ئەوکات گیرۆدەی سزاکاندەبن و ئەو سامانەمرۆیی و مادیەی کەزۆرێکیان تایبەتیان کردووە بەخۆیانەوەو دەوڵەتیان پێ بەوهێزکردووە لێیان دەسەننەوە و لەئەنجامدا گروپێك گیرۆدەی بێسەرو سامانی و بێتوانایی دەبنەوەو، لاوازی ئەمانیش ڕوولەپاشاکەیان دەکات.

وەهەروەها کاتێك نازونیعمەت و جوانخوازی لەدەزگای دەوڵەتدا زۆرببێت و ماف و پێداویستیە بەردەوامەکانی فەرمانبەرانی دەوڵەت فەراهەم نەکات سەرۆکی دەوڵەت ناچاردەبێت ئەندازەی خەرجیەکان زیاد بکات، بۆئەوەی کەمترین ڕەخنەی لێبگیرێت

وخەڵکەکەی لەناڕەحەتی دوور بخاتەوە. ئەندازەی باجیش دیارو ئاشکرایە، کەم و زیاد ناکات و ئەگەر لەڕێگەی باجی تازەوە زۆرببێت دیسانەوە ئەندازەکەی دوای دیاری کرنی ئەوبڕەش سنوردار دەبێت. هەربۆیە ئەگەر باجەکان دابەشبکرێت بەسەر خەرجیەکاندا و بەئەندازەی قەرەبووی دەرامەتی مووچەخۆران‌و خۆشگوزەرانکردنیان بۆسەر هەر بڕێکیان مەبلەغێك زیادبکرێت، لەم شێوەیەدا ژمارەی سەربازو پاسەوانەکان لەوەی کەلەپێش زیادکردنەکەوە هەبوون کەم دەبێتەوە و دیسانەوە خۆشگوزەرانی نازپەروەری لەناویاندا بڵاودەبێتەوە و دەگاتە قۆناغێکی فراوانتر و دیسانەوە دەبێت بڕی مووچەو دەرامەتەکان زیادبکرێن. کەواتە هەم ژمارەی سەربازەکان کەم دەکات و بەم جۆرە بەردەوام ژمارەیان ڕوولەکەمی دەکات و دەگەنە کەمترین ڕێژە لەڕووی ژمارەوە. ئەمەش دەبێتەهۆی لاوازبوونی سوپاوپاسەوانان و هێزی دەوڵەت.

هەربۆیە لەم کاتەدا دەبنە جێگەی چاوتێبڕینی دەوڵەت و هۆزەکانی دراوسیان و خوداش ئەو لەناوچوونەی کەبۆ دروستکراوەکانی بڕیاریداوە ڕایدەگەیەنێت. سەرەڕای ئەمە جوانخوازی و نازپەروەردەیی مایەی لەناوچوونی خەڵکیە چونکە دەبێتەهۆی درووستکردنی خراپە لەناخی مرۆڤەکاندا، هەروەك چۆن لەبەشی شارستانیەتدا باسی لێوە دەکەین، خەصڵەتە چاکەکان کەنیشانەو ڕێنمای دەوڵەتداریە لەناودەبات و مرۆڤ توشی خووە ناپەسەندەکان دەکات و، هەربۆیە جوانخوازی کەخووی ناپەسەندی لێدەکەوێتەوە نیشانەی بەدبەختی لەناوچوونە کەخودا کۆتایی دروستکراوەکانی تێدا بڕیار داوە. هەربۆیە پێشەکی لەناوچوون و پەرێشانی لەدەوڵەتدا بەدی دێت و گیرۆدەی نەخۆشیەدرێژخایەنەکان دەبێت و پیر دەبێت و سەرئەنجام لەناودەچێت.

ڕووی سێیەم: ئەوەیە هەروەك گوتمان ئارامی لەپێدراوەکانی دەوڵەتداریە و هەرکاتێك سەران و فەرمانڕەوایانی هەردەوڵەتێت خوویان گرت بەخۆشگوزەرانیەوە وورده وورده ئەم خووگرتنە تێیاندا دەبێتە سروشتی و لەناخیانداجێگیر دەبێت، هەروەك چۆن نەوەکانی دوای خۆشیان لەسەر نازونیعمەت و خۆشگوزەرانی پەروەردە دەبن و ڕادێن و،

خووی توندی و دلێری لەدەست دەدەن و نەریتەکانی دەشتەکیەتی کەبەهۆیانەوە گەشتوونەتەدەسەلآت وەك سەرسەختی و دلێری و بێباکی و چاونەترسی و ڕاوکردن و گەڕان بەناوبیابان و، دەشتە دوورە کاندا لەبیریان دەچێتەوە و لەنێوان ئەمان و خەڵکی شارنشین و بازاڕیدا بێجگە لەتواناو نیشانەو پۆستە دەوڵەتیەکان هیچ جیاوازیەك لەنێوانیاندا نابینرێت. لەئەنجامدا هێزی پاسەوانی و سوپایان لاواز دەبێت و دلێریان نامێنێت و شان و شکۆیان تێکدەشکێت و خراپەکەشی دەگاتە دەوڵەت، ئەم بارودۆخەش دەوڵەت بەرەو لاوازی و پیری دەبات. ئەوکات بەجۆرێك ڕوودەکەنە خۆشگوزەرانی و شارنشینی هەموبوارەکانی ژیانیان دەگرێتەوە.

کاتێکیش لەدەشتەکیەتی دوور دەکەونەوە کەم کەم سیفەتەکانیشی لەدەست دەدەن، هەروەك چۆن خووی دلێری کەسەرچاوەی بەرگری و پاسەوانیەتێیاندا نامێنێت و پشت بەسوپای تردەبەستن ئەگەر هەیانبێت ئەم حاڵەتەش دەتوانرێت لەبارودۆخی ئەو وولآتانەی کەمێژوویان لەبەردەستدایە تێبینی بکرێت. ئەوکات ئەوەمان بۆدەردەکەوێت ئەوەی لەم بارەیەوەباسمانکرد بێگومان ڕاست و دروستە بەتایبەت کەئەم پیری و لەناوچونە بەهۆی نازپەروەری و خۆشگوزەرانیەوە بەسەر دەوڵەتدابێت، سەرۆکی وولآتیش بۆبەرگری دۆستان و هاوڕێیانی خۆی لەنەتەوەکانی تر هەڵدەبژێردرێت، ئەوانەی کەلەخانەدان و نەژادی ئەونین و لەسەر توندوتیژی ڕاهاتوون بۆئەوەی سوپایەکیان لێدروستبکات و لەشەڕوناڕەحەتیەکاندا خۆڕاگربن، ئەمکارەش بۆدەوڵەتێك کەپیری و بێتوانایی ڕووی تێکردبێت وەك دەرمان و چارەسەر وەهایە، تاوەکو بەفەرمانی خودا بڕیاری لەناوچوونیان دەدرێت. هەروەك چۆن ئەم ڕاستیەلەدەوڵەتی تورکانی خۆرهەلآتدا ڕوویداوە، چونکە زۆربەی سەربازەکانیان لەخزمەتکارە تورکەکان پێك هاتوون‌و پاشاکانیان لەوعەبدانەی کەدەهێنرێنە وولآتەکانیانەوە سوپادروستدەکەن و ئەوەی ئەمانەش کەباپیرانیان لەخزمەتکاری پاشادا درێغیان نەکردووەو، لەسایەی ڕێزو نازو

نیعمەتی پاشاداژیاون بەردەوام بەدلسۆزیەوە شەڕدەکەن و بەرگری لەو وولاتە دەکەن و لەسەرسەختی و ناڕەحەتیەکاندا خۆڕاگرترن.

وەهەروەها لەدەوڵەتی مووەحیدانی ئەفریقادا ئەم شێوازە باوە و، چونکە سوڵتان زۆربەی سوپاکەی لەنێوهۆزەکانی زناتەو عەرەبدا هەڵدەبژێرێت و ژمارەیان زیاد دەکات. ئەوخزمەتکارانەی کەلەنازونیعمەتداژیاون و خوویان پێوەگرتووە دەبنەهۆی ئەوەی کەگیانێکی تازەبکەنەوە بەبەر دەوڵەتداو سەرلەنوێ گەنج ببێتەوە و پارێزراوبێت لەپیری وپوکانەوە. خوداش میراتگری زەوی و ئەوانەیە کەلەسەرینی.

# بەشی چواردەهەم

## لەبارەی ئەوەی کەدەوڵەتەکان وەك خەڵکی تەمەنی سروشتیان هەیە

دەبێت ئەوەبزانین کەتەمەنی سروشتی مرۆڤ بەوپێیەی کەپزیشك و ئەستێرەناسەکان باسیانکردووە سەدوبیست ساڵە کەبەلای ئەستێرەناسانەوە بریتیەلە ساڵەگەورە مانگیەکان تەمەنی هەرنەوەیەکیش بەپێی قیرانەکان جیاوازەو، بەبەراوردبەتەمەنی سروشتی کەم وزیاد دەکات هەروەك چۆن ساڵەکانی هەندێك لەخاوەنی قیرانەکان سەدساڵی تەواو یان هەشتا یان حەفتا یان پەنجاساڵ دەبێت، بەپێی بەڵگەی قیرانەکان لەلای ئەوانەی کەلێکۆلینەوەیان دەکەن. تەمەنی ئەم نەتەوەی ئیسلامەش لەنێوان شەست بۆحەفتا ساڵیدایە هەروەك چۆن لەحەدیسدا هاتووە. بەئەندازەی تەمەنی سروشتی کەسەدوبیست ساڵە بێجگە لەشوێنەدەگمەنەکان ئەوا بەپێی بارودۆخەنامۆکانی فەلەکی زیادنابێت هەروەك چۆن لەبارەی نوحەوە (ع)وگروپێك لەنەتەوەی عادوسەمود ڕوویداوە، بەڵام تەمەنی دەوڵەتەکانیش هەرچەندە بەپێی قیرانەکان جیاوازە، بەڵام زۆربەی تەمەنی دەوڵەت لەسێ پشت تێپەڕناکات هەرپشتەش بریتیەلە تەمەنی مام ناوەندی کەسێك کەچل ساڵ بێت. کەواتە چل ساڵی کۆتایی قۆناغی گەشەو پێگەشتنە تاوەکو کۆتاییەکەی. خودای گەورەدەفەرمێت: (تاوەکو بگاتە ئاستی بەتوانایی و چل ساڵی)[٢٦١]. هەربۆیە گووتمان کەتەمەنی یەك کەس بەرابەر بەتەمەنی نەوەیەك ئەوەشی

[٢٦١] (حَتى إذا بَلَغَ أشُدَهُ وَبَلَغَ أربَعينَ سَنَة) س ئەحقاف ئا ١٤.

کەلەبارەی حیکمەتی ڕوودانی ئاوارەیی و سەرگەردانی بەنی ئیسرائیلەوە باسمانکرد، ئەم قسەیەپشتڕاستدەکاتەوە[٢٦٢] کەمەبەست لەچل ساڵ لەناوچوونی نەوەیەك و پەیدابوونی نەوە نوێیەکەئاشنایەتیان لەگەڵ خواری و پەستیدانیە، لەم ڕووەوە دانانی چل ساڵ ئەوەنیشان دەدات کەتەمەنی پشتێك بەرابەرە بەتەمەنی کەسێك و ئەوەشی کەگوتمان تەمەنی هەردەوڵەتێك لەسێ پشت زیاتر نیە، بەوهۆیەوەیە کەنەوەی یەکەم لەسەر داب و نەریتەکانی دەشتەکیەتی بەگشتی بەردەوامن و عەصەبیەت لەنێوانیاندا پارێزراوە، هەربۆیە دەمی شمشێریان بڕندەیەو خاوەنی شکۆن و دوژمن لێیان دەترسێت و خەڵکی دەبنە ژێردەستەیان.

نەوەی دووەم بەهۆی دەوڵەتداری وناز و نیعمەتەوە خووی خۆیان دەگۆڕن‌و لەدەشتەکیەتەوە بەرەو شارنشینی دەچن و لەتەنگی ڕۆزیەوە بەرەو فراوانی‌و وافریەکەی دەچن و، لەسەر خۆ هەنگاو بەرەو حکومەتی ڕەها هەڵدەگرن کەیەك نەفەر هەموو دەسەلأتەکانی لەدەستدایەو هەموو ئەندامانی خانەدان و دەوڵەت لەپێناوی بەدەستهێنانی ئەوپلەیەدا بەسستیەوە هەنگاوهەڵدەگرن و، دەبنەژێر دەستەو باوەڕیان بەڕێزو شکۆنیە بۆخۆیان، هەربۆیەجۆش و خرۆشی عەصەبیەتیان تائەندازێك کەم دەبێتەوە، بەلأم هێشتازۆرێك لەسیفەتەکانی نەوەی ڕابووردیان تێداماوە، چونکە ئەم نەوەیە سەردەمی نەوەی یەکەمیان دەرك کردووە، چونکەلەزۆرشتدا هاوکاریان بوون و پاسەوانیان کردوون و لەگەشتن بەپلەوپایەبالأکاندا یارمەتیان داون و هێشتا مەلەکەی زۆرێك لەوشتانەیان تێداماوە کەناتوانن بەیەکجاری لەناویان بەرن هەرچەندە هەندێکیشیان لەدەست دابێت، چونکە ئەمانە هێشتا هیوادارن بگەڕێنەوە سەر ئەو بارودۆخەی کەپێشینانیان هەیانبووە، یان وادەزانن لەناویاندا بەکۆتا نەگەشتووە، بەلأم نەوەی سێیەم سەردەمی توندی و دەشتەکیەتیان بەجۆرێك بیردەچێتەوە هەروەك بڵێی ڕۆژێك لەڕۆژان بوونی نەبووە و شیرینی ڕێزو عەصەبیەت، کەبەهۆیانەوە ئەمان

---

[٢٦٢] (فَإنَّها مُحَرمَةٌ عَلَيكُم أربعِينَ سَنَة يَتيهون فِي الارض) س المائدة ئا ٢٩ .

بوونەتەخاوەن هێزو زاڵبوون بەسەر دووژمنانیاندا لەدەست دەدەن و خۆشگوزەرانی دەگاتە لوتکەوقۆناغی کۆتایی، ژیان و گوزەرانیان بەهۆکارەکانی ژیان ئارایشت دەکەن و دەیرازێننەوە و وەك ئەوانەیان لێدێت کەدەوڵەت بەخێویان دەکات وەك ژنان و منداڵانی بێ سەرپەرشت کەجگەلەدەوڵەت کەسیان نیە بۆئەوەی بیانژێنێت و، هەستی بەرگری لەدەست دەدەن و عەصەبیەتیان بەتەواوەتی لەناودەچێت و بەلەبەرکردنی جلوبەرگی جوان و کەشخەو خۆیان بەخاوەن کەسایەتی دەدەنەقەڵەم و ئەسپ سواری دەکەن و فیزو هەوا بەسەر خەڵکیدا دەکەن و، خۆیان زۆر بەئازا دەدەنە قەڵەم لەکاتێکدا ئازایەتی ژنێکیشیان نیە.

ئەمانە ئەگەر کەسێك لەدژیان شەڕبکات بەهیچ شێوەیەك ناتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن و دەوڵەت بۆبەرگری لەدەسەلاتەکەی پێویستی بەخەڵکی ئازاو دلاوەر دەبێت، هەربۆیە دەوڵەت مەوالیەکانی خۆی زیاد دەکات و کەسانێکیش هەڵدەبژێرێت کەتائەندازێك پێویستیان بەدەوڵەت نەبێت تائەوکاتەی خودا لەناوچوونیان ئاشکرادەکات. ئەوکات دەوڵەت بەهۆی ئەوبارگرانیەی کەدەکەوێتەسەری لەناودەچێت. وەهەروەك بینیمان لە هەرسێ نەوەکەدا پیری و بێتوانایی دەوڵەت بەدی دێت هەربۆیە لەناوچونی حەسەب لەنەوەی چوارەمدایە، هەروەك لەبەشەکانی پێشتردا باسمانکرد وگوتمان گەورەیی و حەسەب لەچوارپشتدایە و بەڵگەی ئاشکراودیارمان بۆهێنایەوە و چەندین پێشەکیان هەبوو باسمانکردن. کەواتەکەسی بەویژدان لەهەق و ڕاستی ڕوو وەرناگێرێت. تەمەنی ئەم سێ نەوەیە هەروەك پێشترباسمانکرد سەدوبیست ساڵەو بەزۆری لەم تەمەنە تێپەڕناکەن و کەمێك پێشتر یان کەمێك پاشتر لەوتەمەنە لەناودەچن مەگەر شتێکی تر ڕوویدات وەك نەبوونی بانگەشەکاری دەوڵەتداری. کەواتە پیری و لەناوچوون بەسەر دەوڵەتدادێت، بەڵام بانگەشەکار نیە، چونکەئەگەرلەم کاتەدا بانگەشەکاری بۆ هەڵبکەوێت هیچ جۆرە بەرگریکارێکی نیە. کەواتە (هەرکات کاتی لەناوچوونیان

هاتەپێشەوە یەك كاتژمێر بەرو دوابكەن)[٢٦٣]. كەواتە تەمەنی ناوبراوبۆدەوڵەت وەك تەمەنی كەسێك وایە كەلەقۆناغی گەشەو زۆربونەوە بگاتە تەمەنی ڕاوەستان و لەپاشان دەگاتە گەڕانەوە وپیری هەربۆیە لەسەر زاری خەڵكیەوە واباوە كەتەمەنی دەوڵەت سەدساڵ دەبێت. مانای ئەمەش هەمان ئەومانایە كەئێمەباسمانكرد. كەواتەلەبارەیەوە دەبێت بیربكەینەوە و یاسایەكی لێوە دەربهێنین كەژمارەی باپیران بۆكەسێك لەكۆڵەكەی نەسەبیدا كەدەمانەوێت بۆناسینی ساڵەكانی ڕابووردوو بەدەست بهێنین ڕاست بكاتەوە، وەهەركاتێك لەژمارەیاندا گومانمان هەبێت و ساڵەكانی ڕابووردوو لەسەرەتای دەستپێكردنیانەوە لەلامان ئاشكرابێت كەواتە بۆ هەر سەد ساڵێك سێ پشت یان سێ باوك دەژمێرین، ئەگەر بەم پێوانەیەبێت كەبەكۆتایی هاتنی ژمارەی ئەمان ساڵەكانیش كۆتاییان بێت ئەوامەسەلەكەڕاستە وەئەگەر یەك پشتی كەم بكات ئەواژمارەیان بەهۆی زۆربوونی یەكێك لەكۆڵەكەكانی نەسەبەوە هەڵەیە وەئەگەر هاوشێوەی ئەو(نەوەی)زیاد بكرێت و یەكێك لەكۆڵەكەكانی نەسەبەكە نەمێنێت.

هەروەها ژمارەی ساڵەكان ئەگەر لەبەردەستدابێت، لەژمارەیان وەردەگرین و لێی وورد دەبینەوە و زۆربەی بەڕاست دەبینین، خوداش شەوو ڕۆژی ئەندازەگیری كردووە[٢٦٤].

---

[٢٦٣] (إذا جاءَ أجَلُهُم لايَستأخِرونَ سَاعةً ولا يَستَقدِمُون) س الاعراف ئا ٣٢.

[٢٦٤] (وَاللهُ يُقَدِّرُ اللَّيلَ وَالنَّهار) س ٧٣ ئا ٢٠ .

# بەشی پازدەیەم

## لەبارەی گواستنەوەی دەوڵەت لەدەشتەکیەتەوە بۆ شارنشینی

پێویستە ئەوەبزانین ئەم گۆڕانکاریانە لەدەوڵەتەکاندا سروشتیە، چونکە زاڵبوون و دەسەلاّت بەسەر خەڵکیدا کەبەهۆیەوە دەوڵەتداری و پاشایەتی بەدی دێت تەنها بەعەصەبیەت و تایبەتمەندیەکانیەتی وەك توندی و سەرسەختی و دلێری خووگرتن بەڕاوەوە، عەصەبیە تیش زیاتر لەحاڵەتی دەشتەکیەتیدا بەدی دێت. کەواتە دەوڵەت لەسەرەتای دروستبوونیەوە لەشێوەی دەشتەکیەتیدایە. لەپاشان هەرکات دەوڵەتداری و دەسەلاّت بەدی بێت، بەدوایدا خۆشگوزەرانی دێت، شارنشینی تەنها بریتیە لەهونەری خۆشگوزەرانی و نازو نیعمەت و بەهێزکردنی پیشەسازیەکانە بەهەمووجۆرەکانیەوە، وەك کاروبارەکانی چێشتخانە خانوو هۆکارەکانی ژیان و داب نەریتەکان و کاروبارەکانی ماڵداری. وەبۆ باشتر کردن و جوانکردنی هەریەکەلەم پیشەسازیە تایبەتانەیە کەهەریەکەوبەدوای یەکتردا دێن و لەگەڵ زۆربوون و جۆراوجۆربوونی نازونیعمەت و حەزوو ئارەزووەکانی مرۆڤدا پیشەسازیەکانیش زۆردەبن. کەواتە قۆناغی دەوڵەتداری پاش قۆناغی دەشتەکیەتی دەست پێدەکات، هەربۆیە گەڕان و بەدەست هێنانی هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی لەژیانی شارنشینیدا شتێکی پێویستە. خاوەنانو دەسەلاّتدارانی دەوڵەت لەقۆناغی شارنشینیدا چاولێکەری لەپێشینانیان دەکەن، چونکە بارودۆخی ئەمان دەبینن وزۆرێك داب و نەریتیان لێوە فێردەبن. هاوشێوەی ئەم مانایە بۆعەرەب ڕوویداوە کاتێك سەرکەوتن و فەتحیان کرد و ئێران و ڕۆمیان داگیر کرد و

کوڕان‌و کچانی ئەم نەتەوانەیان دامەزراند، چونکە ئەوان لەوسەردەمەدا بەهرەیەکی وایان لەشارنشینی نەبوو هەروەك دەگێڕنەوە کەنانێکی ناسك و جوانیان هێنا بۆعەرەبەکان و وایان زانی نامەی پێچراوەیە. وەلەگەنجینەکانی خەسرەودا کافوریان دۆزیەوە و وایان زانی خوێیەو کردیانە ناوهەویری نانەوە ئەم جۆرە نمونانەش زۆرن، بەڵام پاش ئەوەی خەڵکی ئەوناوچانەیان لەبەندی شارنشینیدا داناو لەپیشەکانی ژیان و گوزەراندا بەکاریان هێنان و مامۆستاو وەستای شارەزایان لەم کارانەدا بەکارهێناو چۆنیەتی دروستکردنی شتەکانیان بۆعەرەبەکان لەئەستۆگرت.

سەرەڕای ئەمەش خۆشگوزەرانی یارمەتیدەرێکی زۆری ئەم مەسەلەیەبوو ئەوانی گەیاندەلوتکەو لەهەموو بوارەکانی وەك خۆراك‌و خواردنەوەو پۆشاك و خانوو کەرەستەی جەنگ، کەرەستەو هۆکارەکانی خۆشگوزەرانیدا پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە بینی و گەشتنە قۆناغی شارنشینی جوانخوازی. بارودۆخیان لەشوێنەکانی فیزکردن بەسەر یەکتریدا وەك میوانداری و ئاهەنگەکانی بووك گواستنەوە و کۆڕوکۆبوونەوە تایبەتیەکاندا بەهەمان شێوەبوو بەڵکو لەشارستانیەتی پیش ئیسلامیش تێپەڕیان کرد لەمەسەلەی هەوڵدان بۆخۆشگوزەرانی. پێویستە ئەوەببینین کەمەسعودی و تەبەری و مێژوونوسانی ترلەبارەی هاوسەرگیری مەئمون لەگەڵ پوران، کچی حەسەنی کوڕی سەهل، چ بەسەر هاتێکیان هێناوە، کاتێك مەئمون بۆمەسەلەی داواکاری دەچێتەماڵی حەسەن لە (فم الصلح)[٢٦٥] و بەسەرکەشتیەوە ئەم گەشتەی ئەنجامدا حەسەنی کوڕی سەهل چ سەروەت‌و سامانێکی بەمەئمون و هاوڕێیانی بەخشی و ئەوەی کەئەم بەخشی و مەئمونیش سەرفی کرد زۆر سەرسوڕ هێنەربوو. دەڵێن کەلەڕۆژی مارەکردنەکەدا حەسەنی کوڕی سەهل پارەی هەڵداوە بەسەرریزی یەکەمی دانیشتوانی مەجلیسەکەدا لەشێوەی قەباڵەو لوولەی

---

[٢٦٥] ڕووبارێکی گەورەیە لەسەروی واسیت لەنێوان واسیت و کێوێکدا کەلەکەناری ڕووبارەکەوەیە کەچەندین گوندهەیە و ماڵی حەسەنی کوڕی سەهلی وەزیری مەئمون لەوێدایەو مەئمون پورانی بەبوکی لەوێوە بردە ماڵی خۆی .

پیچراوەدا. کەبەر هەرکەسێك بکەوتایە بارودۆخی ژیانی دەگۆڕا واتە هێندە شتی گرانبەهایان تێدابوو. وەدەڵێن تورەکەپارەشی بەسەر ڕیزی دووەمدا باراندووە، سەرەڕای ئەمەش لەکاتی مانەوەی مەئمون لەماڵەکەیدا چەندین ئەوەندەی بڕی باسکراوی خەرج کرد. وەلەشەوی بووکێنیدا مەئمون هەزارپارچە یاقووتی بەدیاری دایە پوران لەگەڵ شەمعی پڕ لەعەنبەر کەلەهەرسەد مەنێکدا ڕەتڵێك و دوولەسەر سێی ڕەتڵێك عەنبەر بەکارهاتووە و، ئەوفەرشانەشی کەئەوشەوە بۆپوران ڕاخران بەئاڵتوون و زێڕو زیوو مرواری و یاقوت ڕازینرابوونەوە.

کاتێك کەمەئمون ئەوانەی بینی گوتی:خودا ئەبو نەواس بکوژێت کەدەڵێت کاتێك ئەم فەرشانەی بینیوە بەم شێوەیە باسی کردوون: هەردەڵێی حەبابی ووردو گەورەی ئەوبادەیەن، کەووردەبەردی مرواریە و کراون بەسەر زەویەکی پڕ لەزێڕدا). بۆشەوی میوانی و (وەلیمە)بەهۆی سەدو چل هێسترەوە بۆماوەی یەك ساڵ و ڕۆژانە سێ جار داریان دەبرد بۆچێشتخانەو هەرلەوشەوەدا تەواودەبوون و ڕۆنیان دەکرد بەسەر لقی دارخورماکاندا و، بەکاپیتانەکانیان گووت کەکەشتیەکان بۆگواستنەوەی خەڵکی تایبەت لەدیجلەی بەغدادەوە تاوەکو کۆشکەکانی پاشا بۆبەشداری لەووەلیمەیەدا بهێننەوە. ئەوانیش لەڕێگەی کەشتیەجەنگیەکانیانەوە (حەراقە)واتەئەوکەشتیانەی کەئاگریان لێوە دەتەقێنرێت بەرەورووی دوژمن. خەڵکەکەیان گواستەوە. وەهەروەها زاوایەتی مەئمونی کوڕی زەنون لەتولەیتە بەم شێوەیەبووە، کەئیبن بەسام لەکتێبی زەخیرەو ئیبن حەیان گێڕاویانەتەوە. ئەم بارودۆخانەش لەپاش ئەوقۆناغانەبوو کەهەموویان لەقۆناغی سەرەتای دەشتەکی (دەوڵەت)دا دەژیان و بەهۆی نەبوونی هۆکارو خەڵکی پیشەگەرەوە کەئەوان لەوحاڵەتی نەبوونی قورسی ژیانە بهێنێتەدەرەوە نەیاندەتوانی وەها ئاهەنگ گە لێك بگێڕن، هەربۆیە لەم جۆرەکارانەیان دەکرد.

هەروەك دەگێڕنەوە و دەڵێن حەجاج لەکاتی خەتەنەکردنی یەکێك لەکوڕەکانیدا ئاهەنگێکی گێڕا کەهەندێك لەسەرۆك و بازرگانە گەورەکانی بانگهێشت کردبوو، لەبارەی

وەلیمەو ئاهەنگی ئێرانیەکانەوە پرسیاری لێکردو گووتی گەورەترین میوانیەك کەبینیوتە بۆم باسبکە. ئەویش گووتی: یەکێك لەپاسەوانەکانی خەسرەوم بینی کەئاهەنگە میوانی بۆخەڵکی فارس دەگێڕا. لەم میوانیەدا کاسەی زێڕینی لەسەر سفرەکەدانابوو لەسەر هەرخوانێکیش چوار کاسەیان دانابەوو هەریەکەلەم خوانانەش چوارکەنیزەك دەیانخستە بەردەم میوانەکانو دەیاندایە چوارکەسو لەپاش تەواوبوونی نانخواردنەکە چوارکەنیزەکی تر دەهاتن و خوانەکانیان کۆدەکردەوە، واتە هەرچوار کەنیزەکەو خوانێکی تایبەت بەچوار کەس. ئەوکات حەجاج گووتی: ئەی خزمەتکاری حوشتر حوشتر سەرببڕەو خواردن بدە بەمیوانەکان، دەیزانی کەئەو ناتوانێت بەوشێوەیە بکات، واتە لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەوە بەوشێوەیە بووە. بەخشش و دیاریەکانی خانەدانی ئەمەویەکان نمونەی ئەمانەن کەزیاتر دیاریەکانیان حوشتر بووە، کەتاوەکو ئێستەش پابەندی ئەوداب و نەریتەبوون. ئەوکاتیش دیاری دەوڵەتی عەباسیەکان واتەئەوانەی کەلەدوای ئەمانەوەبوون دیاریەکانیان زیاتر باری سیم و زێڕو پارچەتەختەی ڕازاوەو ئەسپی جوانی سواری ئامادەکراو بوون.

بارودۆخی کەتامە بەبەراورد بەئەغلەبیەکان لەئەفریقاو خانەدانی تەعج لەمیسر و لمتونە بەبەراوردلەگەڵ پاشاو هۆزەکانی ئەندەلوس و مووەحیدان و بارودۆخی زناتەو بەبەراوورد بەمووەحیدان وەك ئەو حاڵەت و ڕێژەیە وابوو کەئەمەویەکان لەگەڵ عەباسیەکانداهەیانبوو. واتە شارستانیەت لەدەوڵەتی پێشووەوە بۆدەوڵەتی دوای ئەو دەگوازرێتەوە، هەروەك چۆن شارستانیەتی ئێرانیەکان بۆ دەوڵەتەکانی ئەمەوی و عەباسیەکان گوازرایەوە و شارستانیەتی ئەمەویەکانی ئەندەلوس بۆپاشاکانی مەغریب وەك مووەحیدەکان و زناتەی ئەم ڕۆژگارە گوازراوەتەوە و شارستانیەتی عەباسیەکان گوازراوەتەوە بۆ دەیلەمیەکان و دواتر بۆتورکەسلجوقیەکان و تورکانی مەمالیك لەمیسر تەتارەکان لەعێراق و عەرەبی عێراق و ئێران گوازراوەتەوە. چۆنیەتی شارستانیەتی هەردەوڵەتێك پەیوەستە بە گەورەیی فراوانیەکەیەوە، چونکە کاروبارەکانی شارستانیەت

لەشوێنکەوتەکانی ئاسایش و خۆشگوزەرانیە و ئەمانە ش لەشوێنکەوتەکانی سەروەت و سامان و نیعمەتە و، ئەمانەش لەشوێنکەوتووەکانی دەوڵەتداری و ئەندازەی دەسەلآت و زاڵبوونە و هەمووئەمانەش پەیوەستە بەچاکەو سەرکەوتوویی دەوڵەتەوە. کەواتە دەبێت ئەم جۆرە بابەتانە لەبەرچاوبگرین لەباشەکانیان وورد ببینەوە. ئەوکات جێبەجێ کردنیان لەشارستانیەت و ئاوەدانیدا. خوداش میراتگری زەوی و ئەوانەشیەتی کەلەسەریدان.

# بەشی شانزەیەم

## لەبارەی ئەوەی کەنازو نیعمەت لەسەرەتادا هێزێکی زیاتر دەخاتە سەر هێزی دەوڵەت

چونکە هەرکات هۆزو نەتەوەکان بگەنە دەوڵەتداری ونازو نیعمەت لەنێوانیاندا زاوونێو منداڵ خستنەوە ڕوودەدات و لەئەنجامدا ژمارەی هۆزەکان زۆردەبێتو یەك بەیەکی منداڵانی مام و نەوەکانیان مەوالی و پەروەردەکراوانێك هەڵدەبژێرن و نەوەکانی ئەمانیش لەوژینگە پڕلەنازو نیعمەتەدا پەروەردە دەبن و، بەهۆی ژیانیان لەژینگەیەدا ژمارەیەکی زۆر دەچنەسەر جەماوەری ئەودەوڵەتە و هێزێکی تر پەیوەست دەبێت بەودەوڵەتەوە، بەڵام ئەگەر نەوەی یەکەم و دووەم لەناوبچن ئەوا پیری ڕوولەدەوڵەت دەکات و ئەم مەوالی و پەروەردە کراوانە ناتوانن سەربەخۆیی ئەو دەوڵەتەبپارێزن، چونکە تایبەتمەندی فەرمانڕەواییان تێدانیە. ئەوانە خۆیان باربوون بەسەر خەڵکی دەوڵەتەکەوە و لەژێر چاودێری دەوڵەتدابوون و بەخێوی کردوون، هەربۆیە هەرکات ئەصڵ نەمێنێت فەرعیش ناتوانێت خۆی ڕابگرێت، کەواتە فەرعەکەش لەناودەچێت و دەوڵەتەکەلەسەر هێزی سەرەتای نامێنێتەوە. ئەم مانایەش دەتوانین لەسەر ئەوبارودۆخەی کەلەدەوڵەتی عەرەبدا ڕوویداوە جێبەجێ بکەین. ژمارەی داگیرکەران هەربەوجۆرەی کەگوتمان ئەم مانایەش دەتوانین بەسەر ئەوبارودۆخەی بەسەر دەوڵەتی عەرەبدا هاتووە جێبەجێ بکەین. ژمارەی غەزاکەران لەسەر دەمی پێغەمبەرایەتی خەلافەتدا نزیکەی سەدوپەنجا هەزار کەس بووە لەهۆزەکانی موزەڕ و قەحتان، لەبەر

ئەوەی کەنازونیعمەت گەیشتە ئاستی کامڵبوون و بەهۆی زۆربوونی نیعمەتەوە گەشەی دانیشتوانیان زیادی کردو خەلیفەکان گروپێك لەمەوالی و پەروەردەکراوەکانیان هەڵبژاردو ژمارەیان بوویە چەندهێندە، هەروەك دەگێڕنەوە و دەڵێن موعتەصیم کاتێك عموریەی فراوانکرد نۆسەد هەزارکەسی برد بۆجەنگ لەگەڵیاندا ئەگەر ژمارەی سوپای عەباسیەکان لەسنورە دوورو نزیکەکانی خۆرهەلاتو خۆرئاوا لەبەرچاوبگرینو بیانخەینە سەر ئەو لەشکریانەی کەلەمەوالیەکان پاسەوانی پایتەخت و وولات بوون دوور نیە وەها ژمارەیەك پێك بێت. مەسعودی دەڵێت: لەسەردەمی مەئموندا بۆدابینکردنی خەرجی خانەدانی عباسی کوڕی عبدالموتەلیب کاتێك ژماردنیان نزیکەی سی هەزارکەس بوون.

کەواتە ئەندازەی زۆربوونی ئەم ژمارەیەلەماوەی کەمتر لەدووسەد ساڵدا پێویستە لەبەر چاوبگرین و ئەوەبزانین کەهۆکاری ئەمە فراوانی و زۆری نازونیعمەتە کەدەوڵەتی تێدایە و نەوەکانیان تێیدا پەروەردە بوون، وەگەرنا ژمارەی عەرەب لەسەرەتای فەتحەوە نەگەشتبووە ئەم ژمارەیە و نزیکیشی نەبوو. خوداش ئافرێنی دانایە.[٣٦٦]

---

[٣٦٦] (إِنَّ رَبَّكَ هُوَالْخَلاقُ العَلِيم) س الحجر ئا ٦١ و س یس ئا ٨١ .

# بەشی حەڤدەیەم

## لەبارەی قۆناغەکانی دەوڵەت و ئەوەی کەچۆن حاڵی ئەوو ئەخلاقی خاوەنانی دەوڵەت بە پێی جیاوازی قۆناغە ناوبراوەکان دەگۆڕێت

پێویستە ئەوەبزانین کەدەوڵەت بەرەو حاڵەت و قۆناغەجۆربەجۆرو نوێکان دەچێت و دەگۆڕێت و دەسەلاّتدارانیشی لەهەرقۆناغێکدا خوویەکی تایبەت بەوقۆناغە وەردەگرن کەگونجاوە لەگەڵ داب و نەریتی قۆناغەکەدا کەلەقۆناغێکی تردا بەوجۆرە نیە، چونکە خوو بەسروشتی شوێنکەوتەی میزاج و داب و نەریت و ئەوچۆنیەتیەیە کەتێیدا دەژین و حاڵەتەکانی دەوڵەتیش لەپێنج قۆناغی ئاسایی بەدەرنین:

قۆناغی یەکەم: سەردەمی سەرکەوتن و چاوبڕینە دەوڵەتانی تر و زاڵبوون بەسەر بەرگریکارو دوژمندا و وەرگرتنی دەسەلاّتی وولاّتە لەدەوڵەتی پێشوو. لەم قۆناغەدا خاوەنانی دەوڵەت لەبەدەستهێنانی ڕێزو سەروەری و وەرگرتنی باج و بەرگری لەوولاّت و پاراستنی پێشەوایی و نەتەوەی خۆیانن و کەس فەرمانڕەوای ڕەهانیە، چونکە ئەم کارە لەسەر عەصەبیەتێك ئەوسەرکەوتنەبەدەست هاتووە کەتاەنووکەش لەنێویاندا بەردەوام و پایەدارە.

قۆناغی دووەم: سەردەمی حکومەتی ڕەها و زاڵبوون بەسەر هۆزی خۆدا و ڕاهێنانیان لەهاوکاریکردن لەکاروباری دەوڵەتداریدا. خاوەنانی دەوڵەت لەم قۆناغەدا دەست دەکەن بەهەڵبژاردنی پیاوان و مەوالی و پەروەردەکراوان و لەهەوڵی زۆرکردنی ژمارەیاندان و بۆئەوەی گۆڕەپانەکە لەچاوچنۆکانی دەرەکی وناوەکی بەتایبەت لەعەصەبیەتەکەی

خۆی تەسك بكاتەوە. هەربۆیە ئەوان لەدەسەڵات و فەرمانڕەوایی دوور دەخاتەوە بۆئەوەی بەشێوەیەكی سەربەخۆ تەنها خۆی فەرمانڕەوایی بەدەستەوەبێت و دەسەڵاتی ڕەها تەنها لەدەستی خۆیدا بێت. دامەزرێنەرانی ئەم قۆناغەی دەوڵەتیش بەهۆی ئەوپێكدادان و كێشانەوە توشی هەمان ئەوگرفت وناڕەحەتیانە دەبنەوە كەپێشینانیان لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ناوبراودا توشیان هاتووە. بەڵكو كاری ئەم قورسترە، چونكە دامەزرێنەرانی سەرەتا تەنها كێشەیان لەگەڵ ڕكابەری دەرەكیدا هەبووە، بەڵام ئەم لەگەڵ دوژمن و ڕكابەرە دەرەكی وناخۆییەكانیشدا توشی گرفت و كێشە دەبێتەوە وتەنها پشتیوانیشی لەم كارەیدا پەروەردەكراوان و گروپێكی كەم لەبێگانەكانن. هەربۆیە دەست دەداتە كارێكی زۆر مەترسیدارو دژوار.

قۆناغی سێیەم: سەردەمی هێمنی ئاسودەیی خاوەنانی دەوڵەتە كەبەروبوومەكانی دەسەڵاتداری دەچننەوە و لەسایەیدا دەحەسێنەوە. ئەودەرئەنجامانەی كە تەبعی مرۆڤ وابەستەیە پێوەی وەك بەدەستهێنانی سەروەت و سامان و پاراستنی سەروەریەكان و ناوداری و ناوبانگخوازی. هەربۆیە بەتەواوی خۆی دەخاتە خزمەتی كاروبارەكانی باجەوەو میانەڕەویان تێدا دەكات و كۆشكو تەلارو خانووی جوان و ڕازاوەشارو پەرستگاكان بنیات دەنێت و بەرپرسیاریەتی دەداتە سەرۆك هۆزو پیاوەناودارەكان و چاكەلەناو گەلەكەیدا بلاو دەكاتەوە. هەوڵی خۆشگوزەرانی خەڵكەكەی دەدات و هەمیشە لەبیری باشتر كردنی ژیان و گوزەرانی پاسەوان و سوپاكەیدایە وەك پۆشاك و خۆراك و شوێنی نیشتەجێبوونی شیاوو جوانكاری لەنێوسوپاكەیدا لەهەموو بوارێكدا. ئەوكات دەوڵەتە دۆستەكانی خۆیانی پێوە هەڵدەكێشن و دووژمنانیشی هەراسان دەبن. ئەم قۆناغە كۆتا قۆناغی دەسەڵاتی ڕەهای دەوڵەتە، چونكە خاوەنانی دەوڵەتەكان لەم قۆناغانەدا سەربەخۆن و ڕێزو گەورەییان ئاشكرادەكەن و ڕێگەبۆنەوەكانی دواییان خۆشدەكەن.

قۆناغی چوارەم: سەردەمی ئاشتی خوازیە و سەرۆکی دەوڵەت بەوەی کەپێشینانی کردوویانە ڕازیەولەگەڵ ئەوپاشایانەی کەوەك خۆی وەهان ئاشتی خوازە و لەدەسەلآت و بەڕێوەبردندا چاولێکەری لەپێشینانی خۆی دەکات و، هەنگاوبەهەنگاو کردارەکانیان جێبەجێ دەکات و پێی وایە ئەگەر لەورێگەیەی ئەوان لابدات ئەوا لەناودەچێت، چونکە ئەوان لەسەرکەوتن و سەروەریدا بەدانا تر دەزانێت.

قۆناغی پێنجەم: سەردەمی ئیسراف و زیادەڕەویە و سەرۆکی دەوڵەت لەم قۆناغەدا ئەوەی کەپێشینانی بەدەستیان هێناوە لەرێگەی هەواو ئارەزووەکانیدا بەفیڕۆی دەداتو بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر دەبەخشێتە داوردەستەکانی، بەتایبەت لەکۆڕو ئاهەنگو کۆبوونەوەکاندا هاوڕێ و دۆستانێکی وا هەڵدەبژێرێت کەلەڕواڵەتدا لەڕوومەتی ژنی جوان دەچن کەڕەوشتی ناشیرین بێت و ئەوکارەگرنگانە کەناتوانن ئەنجامیان بدەن پێیان دەسپێرێت و، هیچ شارەزاییەکیشیان لەبارەیانەوە نیەو بەشێوەیەکی نەشیاو لەگەڵ کەسە شیاوو خزمەتکاران و خوازیاران و پارێزەرانی نەریتی کۆنی باپیرانیدا هەڵسوکەوت دەکات و ئەوانیش ڕقیان لێی دەبێتەوە و، بەهەرشێوەیەك بۆیان بکرێت یارمەتی نادەن وەهەروەها بەهۆی بەهەدەردانی ئەوسامانەی کەتایبەتە بەسوپاوە لەحەز و ئارەزوەکانیدا خۆشیان ناوێت وبارودۆخی دەوڵەت بەبەرێوەبردن و سوپاوە لەوان دەشارێتەوە وگوێنادات بەکاروبارە گشتی و تایبەتیەکانیان و لەئەنجامدا ئەوبناغەی گەورەیی و شکۆیەی کەپێشینانی بنیاتیان ناوە هەرەس دەهێنێت. لەم قۆناغەدا پیری و بێتوانایی ڕوولەدەوڵەت دەکات و ئەونەخۆشیە هەمیشەییەی کەزۆربەکەمی دەوڵەتان دەتوانن خۆیانی لێ لابدەن لەم بارودۆخەدا بێ چارەسەردەمێنێتەوەو زاڵدەبێت بەسەریدا و لەناودەچێت. هەروەك چۆن لەباسی چۆنیەتیەکانداهۆکارەکانی باس دەکەین، خوداش باشترینی میراتگرەکانە.

# بەشی بیست و یەکەم

## لەبارەی ئەوەی کەلەدەوڵەتەکاندا هەندێک جار سوڵتان حیجری دەخرێتەسەرو توانای ئەنجامدانی کارەکانی نامێنێت

هەرکات دەسەلأت لەبەشی دیاری کراوی چینی فەرمانڕەواو یەك خانەدان لەهۆزێکدا کەچانسی پێکهێنانی دەوڵەتی بووە بەنسیب جێگیر ببێت و، تەنها ئەوخانەدانە تایبەت بن بەم کارەوە و خانەدانەکانی تر بێبەش بکات و نەوەکانی ئەمان یەك لەدوای یەك ببنە وەلی عەهد و پایەی دەسەلأت بگرنە دەست ئەوکات دەبینین لەقۆناغێك لەقۆناغەکاندا ئەگەرهاتوو وەلی عەهدەکە تەمەنی منداڵ بوو ئەوادەبینین یەکێکی تر لەدەسەلأتدارانی دەوڵەت کاروبارەکانی دەگرێتەدەست و، بەناوی ئەوەوەبەڕێوەیان دەبات ئەم کەسەش پێی دەگوترێت (نائب الصلتنە)و لەکەسەنزیکەکانی باوکی کۆچکردوی وەلی عەهدی منداڵە، بەردەوام بوونی ئەم باروو دۆخەش وادەکات خەڵکی وورده وورده بەرەو سەربەخۆیی لەبڕیارداندا بچن و منداڵی ناوبراو لەبەردیدی خەڵکی وون دەبێت و خوو دەگرێت بەکۆمەڵێك خۆشی و لەزەتەوە، کەلەئەنجامی ڕۆچوونی مرۆڤدا دەبێت بەناونازو نیعمەت و خۆشیەکانی ژیاندا و تا ئەوجێگەیەی بۆی دەکرێت واله وەلی عەهد دەکات بەناو خۆشگوزەرانیو لەزەتی ژیاندا ڕۆیدەکاتو چاودێریو پێداگەشتنی بەکاروبارەکانی دەوڵەتی لەبیر دەباتەوە و وەك کەسێکی لێدێت کەحیجر خرابێتە سەری.

بەم شێوەیە دەسەلأتی لەدەست دەردەچێت. لەپاش ماوەیەك سوڵتانی منداڵ وای لێدێت و باوەڕ بەوە دەهێنێت کەسەڵتەنەت و دەسەلأت واتای خۆشگوزەرانی و دانیشتنە لەسەر تەختی نەرم و گەرمی پاشایەتی وبەیعەت پێدانی و بانگکردنی پاشا بەگەورەم و خاوەنم و ئەم جۆرە ووشانەوهاونشینی لەگەڵ ژنان لەپشتی پەردەوە و هیچی تر. حەل و

عەقدی مەسەلەکانی وولآت و ئەمرو نەهی و ڕاگەشتن بەکاروبارەکانی پاشایەتی وەك چاودێری کردنی سوپاو کاروبارەدارایی و کاروباری سنورەکان بەکاری وەزیرەکان دەزانێت و لەبارەیەوە تەسلیمی ئەودەبێت و، تاوەکو ئەوەی کەدەوڵەتی ڕەها دەکەوێتە دەستی نائب الصلتەنە و دەسەلآتی وولآتی دەکەوێتە دەست و لەپاش ئەویش ئەندامانی عەشیرەتی کەسی ناوبراو یەك لەدوای یەك دەسەلآت دەگرنە دەست، هەروەك چۆن ئەم حاڵەتە بۆخانەدانەکانی بویە و تورکەکان و کافور ئەخشیدی و نمونەی ئەمانە لەخۆرهەلآتیشدا بۆمەنصوری کوڕی ئەبی عامیر لەئەندەلوسدا ڕوویداوە.

هەندێك جاریش پاشای منداڵ واتە ئەوکەسەی کەحیجر خراوەتە سەری هۆشیار دەبێتەوە و سەرلەنوێ بەماف و دەسەلآتەکانی ئاشنادەبێت و بڕیار دەدات کاروبارەکان بخاتەوە سەر ڕێچکەی ئەصڵی خۆیان دەبینین پەنادەباتە بەرپلان دانان بۆ کوشتنی نائبی ناوبراوو بەرکەنار کردنی لەکارەکەی، بەڵام ئەمەزۆربەکەمی ڕوودەدات، چونکە هەرکات دەوڵەت بکەوێتە دەستی هەوەس بازان بۆماوەیەکی دوورو درێژ بەردەوام دەبێت، چونکە بەهۆی نغرۆبوونی شازادەکان لەخۆشی لەزەتەکانی ژیاندا زۆربەکەمی دەبینرێت هەوڵی بەدەستهێنانەوەی دەسەلآتی لەدەست چوویان بدەن، چونکە سەردەمی دلێری و پیاوەتی لای ئەوان بەسەر چووە و خوویان بەهەڵسوکەوتی ناز پەروەردەییەوە گرتووە و پەروەردەبوون. هەربۆیە حەزو ئارەزووی سەرۆکایەتی لەدڵیاندا نامێنێت و، خۆپەسەندی لەدەوڵەتی ڕەهای کەسانی تر دەرك ناکەن. ئەم جۆرە زاڵبوونەش بۆمەوالی و پەروەردەکراوانی دەرباری پاشا لەزۆربەی کاتدا ڕوودەدات وعەصەبیەت و خانەدانەکەی ئەولەسەرکارەکانیان لادەبەن وهەموو کاروبارەکان دەگرنە دەست، ئەم پێشهاتەش بۆ دەوڵەت خۆلادان لێی مەحاڵە، هەروەك چۆن لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد چاوتێبڕینی خانەدانی پاشابۆنەتەوەی خۆیان و زاڵبوونی هەڵبژێردراوان و پەروەردەکراوان نوونەخۆشین کەدەوڵەتەکان بەدەگمەن لەونەخۆشیانە ڕزگاریان دەبێت. خوداشی سەرزەوی خۆی بەهەرکەسێك کەبیەوێت دەبەخشێت و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.[٢٦٧]

---

[٢٦٧] (وَاللهُ يُؤتِي مُلكَهُ مَن يَشاء) س البقرة ئا ٢٤٨ (وَهُوَ عَلى كُلِ شَيئٍ قَدير) س بقرة ئا ٢٥ (وَأنَّ اللهَ عَلى كُلِ شَيئٍ قَدير) س الطلاق ئا ١٢ .

# بەشی بیست و دووهەم

## لەبارەی ئەوەی کەسانێك زاڵدەبن بەسەر سوڵتانداو هێزەکەی دەگرنە دەست لەنازناوی تایبەتی پاشایەتی ئەوداهیچ پشکێکیان نیە

چونکە دروستکردن و دامەزراندنی دەوڵەت بۆیەکەمین دامەزرێنەر لەڕێگەی عەصەبیەتی نەتەوەکەیەوە دەبێت، لەگەڵ ئەوعەصەبیەتانەی تر کەخوازیاری سەرکەوتنی ئەمانن. هەروەك چۆن وورده وورده دەسەڵاتی پاشایەتی هێزی خۆیو خانەدانەکەی جێگیر دەبێت و بەم شێوەیە داب و نەریتەکانی بەردەوام دەمێننەوە، بەڵام ئەوکەسەی کە دەسەڵات دەگرێتە دەست، هەرچەندە خاوەن عەصەبیەتیش بێت، لەهۆزی پاشا یان مەوالی و پەروەردەکراوەکان بێت، ئەوا عەصەبیەتەکەی پلەدوو دەبێت، هەردەم شوێنکەوتەی عەصەبیەتی پاشادەبێت و ڕەنگ و شکۆی نەریتی پاشایەتی نیە. ئەو لەم شێوەی دەوڵەتی ڕەهایەدا ناتوانێت بەئاشکرا دەسەڵات لەپاشا وەربگرێت، بەڵکو لەهەوڵی لەدەست گرتنی کاروبارەکانی ئەمر و نەهی و حەل و عەقد و واژۆ کردنی ڕێککەوتننامەکان و هەڵوەشاندنەوەیانە بۆئەوەی تایبەتیان بکات بەخۆیەوە و لای کاربەدەستانی دەوڵەت وانیشاندەدات کەلەپشتی پەردەوە هەموو فەرمانەکان لەپاشاوە وەردەگرێت و جێبەجێیان دەکات و ئەوتۆمەتانەی کەدەدرێنەپاڵی گوایە لەهەوڵی بەدەستهێنانی تاج و تەختدایەبەتوندی ڕەتدەکاتەوە، هەرچەندە دەسەڵاتی ڕەهایشی بەدەستەوە بێت، چونکە ئەم ئەو دەوڵەتداریە ڕەهایەی کەسوڵتان و داروودەستەی کەلەپشتی پەردەوە لەنێوان خۆیاندا دابەشیان کردووە لەناوخۆیاندا دەیشارێتەوەو بەکارەهەڵەکانی وانیشاندەدات کەلەلایەن سوڵتانەوە بۆڕاپەڕاندنی

کارەکان ڕاسپێردراوە، وەئەگەربێت و هەندێك جار دەست وەربداتە کاروبارە تایبەتەکانی پاشاوە، ئەوکات پیاوانی دەوڵەت بەشیاوی نازانن و هەوڵدەدەن دەسەلآتی لێوەر بگرنەوە و خۆیان بیگرنە دەست، چونکە بەهیچ شێوەیەك بۆئەو فەرمانڕەوایی جێگیر نەبووە تاوەکو ئەمان ناچاربکات تەسلیمی فەرمانە کانی بن و ئەم لەیەکەمین گەڕی کێشەکاندا لەناودەچێت. هاوشێوەی ئەم مانایە بۆعبدالرحمانی کوڕی ناصری کوڕی مەنصور ی کوڕی عامیر ڕوویداوە کاتێك هەولّیدا لەگەڵ هیشام و خانەدانەکەیدا بەشداری دەسەلآت بکاتو، لەدەوڵەتی ڕەهادا کەباوك و براکەی قەناعەتیان پێی هەبووە و بەدەستیانەوە بووە وەك حەل و عەقد و داب و نەریتەکانی تری بەشیاوبۆخۆی نەزانی و داوای لەخەلیفەی سەردەمی خۆی هیشام کرد کەلەپلەی خەلافەتدا بیکاتە جێنشینی خۆی، بەلآم ئەم شتەبەلای خانەدانی مەروان و قورەیش گەراکانەوە قبولّکراو نەبوو ئەویان بەشیاو نەدەزانی بۆ وەها پلەو پایەیەك، هەربۆیە لەگەڵ کوڕە مامی خەلیفەهیشام محمدی کوڕی عبدالجباری کوڕی ناصر بەیعەتیان کردو دەستیان کردە دژایەتی کردنی عبدالرحمان و خانەدانەکەیی‌و ئەمەش بوویەهۆی ڕووخانی دەوڵەتی عامریان و کوژرانی موئەیدی خەلیفەیان وەلەکۆتاییدا ئەوەبوو دەوڵەتەکە دووچاری ڕووخان بوویەوە، لەبری ئەو کەسانێکی تر لەوابەستەکان و شازادەکان دەزگای دەوڵەتیان بەڕێوە دەبرد. خوداش باشترینی میراتگرەکانە.

# بەشی بیست و سێیەم

## لەبارەی حەقیقەتی دەسەلآت و جۆرەکانیەوە

پاشایەتی و دامەزراندنی دەوڵەت پلەو پایەیەکی سروشتیە بۆمرۆڤ، چونکە لەبەشەکانی پێشوودا ئەوەمان سەلماند کەمرۆڤ بەبێ کۆمەڵگەو هاوکاری بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی و پێداویستیە پێویستەکانی ناتوانێت بژی. وەهەرکاتێك کۆمەڵگەکان بۆمرۆڤ بێنەدی واپێویست دەکات کەپەیوەندی جۆراوجۆریان لەگەڵ یەکتردا هەبێت و پێویستیەکانی یەکتری فەراهەم بکەن و هەروەها بەوپێیەی لەسروشتی حەیوانی مرۆڤدا ستەمگەری هەیە، دەبینین هەندێك دەستدرێژی دەکەنە سەر هەندێکی تر بۆ ئەوەی پێویستیەکانیان بەزۆر لەوانی تر وەربگرن و هەندێکیش بەسروشتی خۆیان دژی ئەم حاڵەتەن هەربۆیە دەبینین ئەم دوو گروپە لەکێشەیەکی بەردەوامدان لەگەڵ یەکتریداو دەبێتە هۆی بێ سەرو بەری و مردنی خەڵکانێکی زۆرو لەکۆتایدا دەبێت هۆی کۆتایی هاتنی نەژادی مرۆڤ، ئەمەلەکاتێکدایە مانەوەی نەژاد بەکۆمەڵێك شتەوە پەیوەستە کەخودا خۆی پاراستوونی. کەواتە مانەوەی جۆری مرۆڤ لەحاڵەتەکانی هەرج و مەرج و بێسەروبەریدا و نەبوونی فەرمانڕەوا کەڕێگربێت لەبەردەم دەستدرێژی هەندێك بۆسەر هەندێکی تر شتێکی مەحاڵە. کەواتە مرۆڤ پێویستی بەفەرمان ڕەواو بەرپەرچ دەرەوەیەك هەیە کەڕێگربێت لەبەردەم دەستدرێژی هەندێك بۆسەر هەندێکی تر، ئەم فەرمانڕەوایەش هەمان ئەوپاشا بەهێزەیە کەوەك پێشتر باسمانکرد دەبێت خاوەنی عەصەبیەتێکی نەتەوەیی بەهێزبێت، چونکە هەموو فراوانخوازی و بەرگریکاریەکان

لەڕێگەی عەصەبیەتەوەنەبێت ئەنجام نادرێن، پاشایەتیش وەك دەبینین پلەوپایەیەکی بالآو بەڕێزە کەفراوانخوازی و پێکدادانەکان ڕوویان لەوەوپێویستیان بەبەرگریکردنە، هیچ کام لەم مانایانەش بیجگە لەڕێگەی عەصەبیەتەکانەوە نەبێت بەدی نایەن و نابنەکرداری. سەرەڕای ئەمەش عەصەبیەتەکانیش جۆراوجۆرو جیاوازن و هەرعەصەبیەتێکیش خاوەنی فەرمانڕەوایی و زاڵیە بەسەر ژێر دەستەکانی هۆزو عەشرەتەکەیدا، بەڵام پاشایەتی لەهەموو عەصەبیەتەکاندا دروست نابێت بەڵکو لەڕاستیدا دەسەلآت پەیوەستو تایبەتە بەعەصەبیەتێکەوەکەهەموو خەڵکی بخاتەژێر فەرمانی خۆیەوەو، باجو دەرامەت لەخەڵی وەربگرێت و سوپا دروستبکات وسنورەکانی بپارێزێتو، لەوبەهێزتر لەوناچەیەدا بوونی نەبێت، ئەمەیەحەقیقەتی پاشایەتی بەپێی ئەومانایەی کەبەناوبانگ و بلآوە.

هەربۆیە ئەگەربێت و عەصەبیەتی کەسێك ئەومەرجانەی تێدانەبێت کەباسمانکردن ئەوا پاشایەتیەکەی ناتەواو دەردەچێت و ناتوانین ناوی بنێین پاشایەکی ڕاستەقینە، هەروەك چۆن ئەم مانایە بۆ زۆرێك لەپاشاکانی بەربەر لەدەوڵەتی ئەغلەبیانی قەیرەوان و پاشاکانی ئێران لەسەرەتای دەوڵەتی عەباسیەکانەوە ڕوویداوە، وەهەروەها ئەگەر بێت و عەصەبیەتی کەسێك نەگاتە قۆناغێك کەبتوانێت باشتربێت لەهەموو عەصەبیەتەکانی تر دەسەلآتەکانی تر لەناوبەرێت و، لەسەرو فەرمانی ئەوەوە فەرمانی تر نەبێت دیسانەوە نابێتە پاشایەکی تەواوو لەڕیزی پاشا کەم و کورتەکاندا دەژمێردرێت و نەگەشتووەتە مانای ڕاستەقینەی پاشایەتی، وەك ئەمیری ئەوناوچەو شوێنانەی کەبەهەموویانەوە دەوڵەتێك دروستدەکەن و لەژێر بەیداخی یەك پاشادا فەرمانڕەوایی دەکەن. بەشێوەیەکی ئاسایی دەتوانین ئەم جۆرە بارودۆخەلەدەوڵەتە فراوانەکاندا کەدەسەلآتیان بەسەر سنورو ناوچەگەلێکی زۆردا هەیە تێبینی بکەین، بەدەستەواژەیەکی تر ئەو سەرۆك هۆزو سوڵتانانەی کەلەناوچە دوردەستەکاندا فەرمانڕەوایی دەکەن بەسەر خەڵکی خۆیانداو لەژێر فەرمانی ئەودەوڵەتەدان کەئەوانی لەدەوری یەکتری کۆکردووەتەوە پەیڕەوی

دەکەن، وەك دەوڵەتی صەنهاجەی شوێنکەوتەی عەبیدیەکان (فاتمیەکان)و زناتە کەجارێك پەیڕەوی ئەمەویەکان (ئەندەلوس)و جارێکش گوێڕایەڵی عەبیدیەکانیان دەکرد، وەهەروەها وەك ئەو شازادەو ئەمیرە ئێرانیانەی لەدەوڵەتی عەباسیەکان و ئەمیرو پاشاکانی بەربەر لەبەرامبەر فەرەنگیەکانی پێش ئیسلام و وەك مەلیك و نەتەوەکانی ئێران لەسەردەمی ئەسکەندەرو نەتەوە یۆنانیەکان‌و زۆرێك لەدەوڵەتەکانی تر کەهاوشێوەی ئەوان بوون، کەواتە دەبێت بەدیدەیەکی پەند وەرگرەوە تێبڕوانین بۆئەوەی حەقیقەت بدۆزینەوە، (خوداش زاڵەو لەسەروو بەندەکانیەوە یەتی).[٢٦٨]

---

[٢٦٨] (وَهُوَ القَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ) س الانعام ئا ١٨ .

# بەشی بیست و چوارەم

## لەبارەی ئەوەی کەتوندوتیژی بۆپاشایەتی زیانبەخشەو بەزۆری دەبێتە مایەی لەناوچوونی

پێویستە ئەوەبزانین کەبەرژەوەندی ڕەعیەت لەگەڵ سوڵتاندا پەیوەست نیە بەزات و جەستەو ڕوومەت جوانی و پێکەوتەیی و زانستی زۆرو خەت خۆشی وڕۆشنبیریەکەیەوە، بەڵکو بەرژەوەندی خەڵکی لەڕووی دانەپاڵی ئەوەوەیە ئیتر پاشابێت یان سوڵتان لەشتە نیسبیەکانە، واتە ئەونیسبەتەیە کەلەنێوان هەردوولادا دروستدەبێت. لەم ڕووەوە حەقیقەتی مانای سوڵتان ئەوەیەکەئەو خاوەنی ڕەعیەت و کاربەدەستی ئەوانە کەواتە سوڵتان کەسێکەکە ڕەعیەتێکی هەبێت و ڕەعیەتیش بەگروپێك دەگوترێت کەلەژێر فەرمانی سوڵتانیکدا بژین و سیفەتێکی لەڕووی نیسبەتدانی ئەو بەوانەوەهەیە، کەپێی دەڵێن مەملەکەت. ئەوەش مانای مالیك بوونی سوڵتانە بۆڕەعیەتەکانی. کەواتە هەرکات ئەم مەملەکەت و شوێنکەوتووەکانی لەڕووی چاکەو باشەوە بگاتە پلەیەکی شیاوی خۆی، ئەوکات مەبەست و مانای سوڵتان بەکامڵترین شێوە بەدی دێت، هەروەك چۆن ئەگەر بارودۆخی وڵات باش و شیاوبێت ئەوالەبەرژەوەندی ڕەعیەت دەبێت وەئەگەر بەپێچەوانەکەشیەوە بێت ئەوا خەڵکی زەرەری تێدا دەکەن و، دەبێتە مایەی نابودی ڕەعیەت. چاکەکاری هاوکاتە لەگەڵ نەرم و نیانیدا هەروەك چۆن ئەگەربێت و سوڵتان لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا سەختگیربێت و لەکاروبارە نهێنیەکانیاندا زیرەك بێتو

تاوانەکانیان بژمێرێت ئەوکات ترس‌و خواری خەڵکی دادەگرێت و خراپە ڕەوشتی جوانیان دادەپۆشێت و لەناوی دەبات. سەرەڕای ئەمەش لەکاتی کێشەوگرفتەکاندا پشتی سوڵتان ناگرن و بەهۆی خراپی نیەت و مەبەستەکان کاروباری پاسەوانی دەوڵەت لەناودەچێت و بەم هۆیەوە بێسەروبەری دروستدەبێت و سوڵتان دەکوژن‌و لەئەنجامدا دەوڵەتیش دەڕووخێت و قەڵاوشورەی وولات دەڕووخێن‌و، ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت و بەوهۆیەوە عەصەبیەتیش نامێنێت و وولات وێران دەبێت، بەڵام ئەگەرسوڵتان لەگەڵ خەڵکەکەیدا بەنەرمونیانیەوە هەڵسوکەوت بکات و چاوپۆشی لەخراپەکانیان بکات هەروەك خەڵکی خەوتوو لەبەرامبەریدا ئارام دەبنەوە و، ئەودەکەنە پەناگەیەك بۆخۆیان‌و خۆشیان دەوێت و لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی دووژمناندا ئامادەی گیانبەخت کردنن‌و، لەئەنجامدا وولات بەرەو ئارامی پێشڤەچوون دەڕوات، بەڵام پاشهاتەکانی هەڵسوکەوتی جوان بریتیە لەبەخشینی نیعمەت بەخەڵکی و بەرگری کردن لەمافەکانیان، چونکە حەقیقەتی پاشایەتی کاتێك کامڵ دەبێت کەسوڵتان بەرگری لەڕەعیەت بکات بەخشینی نیعمەت و چاکەی سوڵتان لەگەڵ رەعیەتەکاندا لەمەرجەکانی نەرم و نیانێن لەگەڵیان‌و، چاودێری کردنی کاروباری ئابوری خەڵکیە ئەمەش یەکێکەلەبنەما گرنگەکانی ڕەعیەت نەوازی و دڵدانەوەیان.

پێویستە ئەوەبزانێن کەنەرم و نیانی و هەڵکردن لەکەسە زیرەکەکاندا کەمتر بەدی دەکرێت، بەڵکو زیاتر ئەم سیفەتە لەخەڵکە کەم ئەزموون و ئەوکەسانەدا هەیە کەخۆیان لەنەزانێن دەدەن و لەکەسە هۆشمەندەکاندا کەمتر دەبینرێت، چونکە کەسە هۆشمەندەکان بەهۆی بیر تیژیەکەیانەوە ئاستی بیرکردنەوەیان چەند پلەیەك لەپێشترە لەدەرکی خەڵکی بەگشتی و کۆمە لێك ئەرك دەدەن بەسەر ڕەعیەتدا کەزیاترە لەئەندازەی توانایان، ئەمەش بەوهۆیەوەیە کەبەهۆشمەندی ودووربینی خۆیان هەرلەسەرەتاوە ئەنجامەکان دەبینن و خەڵکی بەجۆرێك دووچاری دژواری دەکەنەوە کەدەبێتە مایەی لەناوچوونیان. هەربۆیە پێغەمبەر دەفەرمێت: ڕێگەڕۆشتنی خۆتان

بەپێی جووڵەی بێتواناترینی هاوڕێیانتان دابڕێژن. هەربۆیە شاریع (خودا)لەفەرمانڕەوادا کەمێك زیادەڕەوی لەبیرو هۆشدا بەمەرج گرتووەو، سەرچاوەکەشی بۆچیرۆکی زیادی کوڕی ئیبن ئەبی سوفیان دەگەڕێتەوە لەوکاتەی حەزرەتی عومەر ئەوی لەوالیەتی لەعێراق لابرد، لەبەرامبەردا گووتی ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی منت بەرکەنارکرد؟ ئایابەهۆی بێتوانایی یان بەهۆی ناپاکیەوەبوو؟ خەلیفەگووتی: لەبەرهیچ کام لەمانە تۆم لەسەر کارەکەت لانەداوە بەڵکو حەزم لەوەنەبوو زیرەکی بێ ئەندازەی تۆ بەسەر خەڵکیدا بسەپێنم.

لەمەوە گەشتوونەتە ئەودەرئەنجامەی کەفەرمانڕەوا نابێت زۆر زیرەك وخاوەن هۆشێکی لەڕادەبەدەر بێت وەك زیادی کوڕی ئیبن ئەبی سوفیان و عەمری کوڕی عاص چونکە فەرمانڕەوایی ئەم جۆرەکەسانە حکومەت بەرەو ستەم و بەدڕەفتاری دەبات و، خەڵکی ناچار بەئەنجامدانی کارانێك دەکات کەگونجاونیە لەگەڵ سروشتیاندا هەروەك چۆن لەم بارەیەوە لەکۆتایی کتێبەکەدا باسێك دەکەین، خوداباشترینی مالیکەکانە. لەوەی کەباسمانکرد ئەوەسەلمێنرا کەزیرەکی و هۆشمەندی لەڕادەبەدەر لەدەسەڵاتداران‌و سیاسەتمەداراندا ناتەواویەو وەك زیادەڕەوی لەئەندێشە دەژمێردرێت، هەروەك چۆن نەفامی و کەم ئەقڵی زیادەڕەویە لەچەقبەستنداو هەریەکە لەئیفرات و تەفریت نەشیاون بۆمرۆڤ، بەڵکو سیفەتی پەسەند ئاستی مام ناوەندیە، هەروەك چۆن بەخشین بەئیسراف و ڕەزیلی و دلێری لەگەڵ بێباکی و ترسداو هەروەها لەهەموو سیفەتەکانی تری مرۆڤیشدا. هەربۆیە خەڵکی زۆر زیرەك بەشەیتان سیفەتی و نمونەی ئەمانە وەسف دەکەن و پێیان دەڵێن شەیتان. خودا ئەوەی کەئەیەوێت دروستی دەکات.[٢٦٩] وەئەو داناو بەتوانایە.

---

[٢٦٩] (يَخلُقُ مايَشاء وَهُوَالعَلِيمُ القَدِير) س الروم ئا ٥٣.

# بەشی بیست و پێنجەم

## لەبارەی مانای ئیمامەت و خەلافەت

لەبەر ئەوەی کەحەقیقەتی پاشایەتی بەجۆرێك لەکۆمەڵگەی پێویست دادەنرێت بۆ مرۆڤ و پێویست بەزاڵبوون و هێز دەکات کەلەشوێنەوارەکانی توڕەیی و توندوتیژیە، هەربۆیە زۆربەی پاشاکان لەحەق و ڕاستی لادەدەن ولەشتەدونیاییەکاندا ستەمکردن لەژێردەستەکانیان بەڕەوا دەزانن، چونکە لەزۆربەی کاتەکاندا کارانێکیان پێدەسپێرن کەتوانای ئەنجامدانیان نیە کارانێك کەلەهەواو ئارەزووەکانیانەوە سەرچاوە دەگرن، ئەم ئەرك و تەکلیفانەش لەپاشایەکەوە بۆپاشایەکی تر کەدێنەسەرتەختی پاشایەتی جیاوازە هەربۆیە فەرمانبەری خەڵکی لەفەرمانەکانی ئەوان دژوار دەبوو عەصەبیەتێك بەدی دەهات کەسەری دەکێشا بۆهەرجومەرج و کوشتار. ئەمەش وادەکات لەبەڕێوەبردنی کاروباری وولاتداپەنا بۆ یاساو ڕێساگەلێك ببەن‌و زۆربەی خەڵکی ملکەچی ئەم جۆرە یاسایانەبن، هەروەك چۆن ئەم بارودۆخە لەنێو نەتەوەکانی ئێران و نەتەوەپێشووەکانی تردا بوونی هەبووە. هەرکات دەوڵەتێك خاوەنی وەها سیاسەتێك نەبێت کاروبارەکانی سەروسامان ناگرن. دەستوری خودایە لەنێو ڕابردواندا.[٢٧٠] هەربۆیە ئەگەرئەم یاسایانە لەلایەن خەڵکە ژیرو داناکانەوە دابنرێن ئەوا پێیان دەڵێن سیاسەتێکی ئەقڵی و هەرکاتێکیش لەلایەن شاریعەوە (خودا)بەسەر خەڵکیدا فەرزبکرێن پێیان دەڵێن

---

[٢٧٠] (سُنَّةَ اللهِ فِی الَّذِینَ خَلَوا مِن قَبل) س الاحزاب ئا ٦٢.

سیاسەتی دینی و ئەم جۆرەی دووەمیشیان سودی دونیاو دوارۆژی خەڵکی تێدایە، چونکە مەبەست لەئافراندنی ئافرێنراوەکان تەنها بۆ ژیانی دونیا نەبووە کەبەتاڵ و بێسودە، خوداش دەفەرمێت (ئایاوادەزانن ئێوەمان بەهەوانتە ئافراندووە)[٢٧١]. بەڵکو مەبەستی تەکلیفەئاینیەکان ئەوەبووە کەبیانگەیەنێتە سەر ڕێگەی خوداو ژیانێکی خۆشی نەبڕاوە کەلەو دونیادا هەیە بۆ باوەڕداران. ئەمەیە کەشەریعەتەکان بەدیهاتن بۆئەوەی هەرلەپەرستشەکانەوە (عبادات)بیگرە تاوەکو کاروباری ڕۆژانەو سەوداو مامەڵەکان (معاملات)و تەنانەت لەبورای بەڕێوە بردنی وڵات لەناوکۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا شتێکی سروشتیەو بۆ ئەو ڕێگە ڕێنماییان بکەن.

بەجۆرێکیش کاروباری دەوڵەتداریان خستەسەر ڕێگەو ڕەوشی ئاین بۆئەوەی کاری دینی و دونیایی هەموویان لەژێر چاودێری شەرعدا بن. کەواتە هەردەوڵەتێك بەپێی زاڵی دەسەلآت و فەرمانڕەوایی بکات لەدیدیدی ئاینەوەی بەستەمکار دەژمێردرێت هەروەك چۆن حیکمەتی سیاسەتیش ئەمەدەخوازێت و پشتگیری لێدەکات. وەئەوەی کەلەپاشاوە وەك یاساکانی سیاسەتی دوور لەشەرع دەردەچێت، دیسانەوە قبوڵنەکراوە، و ئەوەشی بەوشێوەیەبێت، چونکە بەبێ نوری خودا فەرمانڕەوایی دەکاتو هیچ نورێکی نیە،[٢٧٢] چونکە شاریع داناترە لەوان بەوشتانەی کەلەوان پەنهان و شاراوەیە. وەهەموو کردارەکانی مرۆڤ هەرلەدەوڵەتداریەوە بیگرە تاوەکو کارەکانی تر لەودونیادا بۆخۆیان دەگەڕێتەوە. هەروەك چۆن پێغەمبەر (ص)فەرموویەتی: ئەوە کردەوەکانی خۆتانە کەدەگەڕێتەوە بۆتان، ئەمەلەکاتێکدا حوکمەکانی سیاسەت تەنها چاودێری بەرژەوەندیەکانی ئەم جیهانەیە کە (ڕواڵەتێك لەژیانی دونیا دەزانن)[٢٧٣]، بەڵام مەبەستی شاریع سەرکەوتن و سەرفەرازی خەڵکیە لەودونیادا.

---

[٢٧١] (أفَحَسِبتُم أنّما خَلَقناكُم عَبَثًا وَأنّكُم إلَينا لاتُرجَعون) س المونمینون ئا ١١٥.

[٢٧٢] (وَمَن لَم يَجعَلَ اللهُ لَهُ نُوراً فَما لَهُ مَن نُور) س نور ئا ٤٠ .

[٢٧٣] (يَعلَمُون ظاهِرا مِنَّ الحَياة الدُنيا) س رووم ئا ٦.

لەم ڕووەوە بەپێی خواستی شەریعەتەکان ناچارکردنی خەڵکی بەپەیڕەوی کردن لەحوکمە شەرعیەکان لەبارەی ژیانی دونیاو قیامەتیانەوە شتێکی واجبە و ئەم فەرمانڕەواییەش تایبەتە بە دامەزرێنەران و خاوەنانی شەریعەتەوە کەپێغەمبەران و خەلیفەکانن. کەواتە لەوەی کەباسمانکرد مانای خەلافەت ڕوون بوویەوە. وەئەوەش ڕوون بوویەوە کەدەوڵەتداری و حکومەتی سروشتی ناچارکردنی خەڵکیە بۆکاروبارەکانی ژیان بەپێی هەواو ئارەزوەکان، مەملەکەتداری سیاسیش بریتیە لەناچارکردنی خەڵکی بەپێی خواستی تێڕوانینی ئەقڵی لەبەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانی دونیاو دوورخستنەوەی خراپەو زیان لێیان، بەڵام خەلافەت ناچارکردنی خەڵکیە بەپێویستی تێڕوانینی شەرع بۆ ژیانی دونیاو دوارۆژ کەدیسانەوە دەگەڕێتەوە سەر بەرژەوەندی ئەودونیای خەڵکی، چونکە هەمووکاروبارەکانی ئەم دونیایە لەدیدی شاریعدا بەپێی بەرژەوەندیەکانی ئەودونیا هەڵدەسەنگێنرێت. کەواتە خەلافەت لەڕاستیدا جێنشینیە لەخاوەنی شەریعەت بەمەبەستی پاسەوانی ئاین‌و سیاسەت‌و ئەوشتەدونیاییانەیە کەوابەستەن بەئاینەوە کەواتە دەبێت ئەم مانایە بەباشی تێبگەین‌و لەوبابەتانەی کەدواتر باسیان دەکەین لەبەرچاوی بگرین و خوداش حەکیم و دانایە.

# بەشی بیست و شەشەم

## لەبارەی جیاوازی تێڕوانینی ئومەت لەبارەی حوکم و مەرجەکانی پلەی خەلافەتەوە

لەبەر ئەوەی کەحەقیقەتی پلەی خەلافەتمان ڕوونکردەوە و گوتمان کەخەلافەت جێنشینیە لەخاوەنی شەریعەت، لەپاراستنی دین و سیاسەتی دونیایە لەڕێگەی ئاینەوە ئێستە دەبێت ئەوەبزانین کەبەم پلەیەدەڵێن خەلافەت و ئیمامەت. ئەوانەی دوایی لەوکاتەی کەکاروباری خەلافەت بێسەروبەری تێکەوت و بەهۆی دووری لەپلەی خەلافەتو نەمانی هەلومەرجەکانی ناچاربوون بەزۆر بەیعەت لەخەڵکی وەربگرن و خاوەنی ئەم پلەیەش پێیان دەگووت سوڵتان. هۆکاری ناونانیشی بەئیمام وەك چواندنێك وایە بەپێشنوێژو ئیمامی جەماعەتەوە کەخەڵکی لەپشتیەوە نوێژ دەکەن پەیڕەوی کردنی بەواجب دەزانن هەربۆیە پلەی ناوبراو بەئیمامەتی گەورەناوزەد کراوە. هۆکاری ناو نانیشی بەخەلافەت بەوهۆیەوەیە کەخاوەنی ئەوپلەیە لەنێوخەڵکیدا دەبێتە جێنشینی پێغەمبەر هەربۆیە بەشێوەیەکی ڕەها پێیان گووتوون خەلیفەی پێغەمبەر و هەندێك جاریش بەخەلیفەی خودا ناوزەد کراون کەلەدووەمیاندا جیاوازی بۆچوون هەیە هەروەك چۆن هەندێك بەپێی ئەوخەلافەتە گشتیەی کەبۆخەڵکی هەیەبەجایزیان داوەتەقەڵەم و بەڵگەشیان بەم ئایەتانەهێناوەتەوە: (من لەزەویدا خەلیفەیەك دادەنێم)[٢٧٤].

---

[٢٧٤] (إِنِّي جاعِلٌ فِي الأَرضِ خَلِيفَةً) س البقرة ئا ٢٨.

(هەرئەوەکەئێوەی کردووەتە خەلیفەی سەرزەوی)[٢٧٥]، بەڵام جمهوری زانایان ڕێگریان لەوەکردووە کەئەم ئایەتانە بەم شێوەیە مانابکرێن، چونکە ئەم مانایە ناگەیەنن. ئەوەبوو کاتێك خەلیفە ئەبوبەکریان بەم ناوەوە بانگکرد پێی ناخۆش بوو بەخەڵکی گووت کەئەوناوە بەکار نەهێنن و گووتی من خەلیفەی خودانیم بەڵکو خەلیفەی پێغەمبەرم. سەرەڕای ئەمەش جێنشینی خەلافەت لەکەسێك دەکرێت کەنادیار بێت و کەسی ئامادە پێویستی بەخەلیفە نابێت. وەدیاری کردنی ئیمام واجبە، هەروەك چۆن لەشەرعدا بەئیجماعی صەحابەو تابیعین ئاشکراو دیارە، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر (ص)ڕاستەوخۆ لەدوای وەفاتی بەیعەتیان بەحەزرەتی ئەبوبەکر درودی خوای لەسەربێت داو لەکاروبارە دینی و دونیاییەکاندا تەسلیمی دیدو بۆچوونی ئەوبوون و، لەسەردەمەکانی دوای ئەویشدا ئەم شێوازە بەم جۆرە بەردەوام بوو لەهیچ یەکێك لەوسەردەمانەدا بێسەروبەریەکی ئەوتۆ ڕووینەدا جێگیر بوونی ئەم شتەش لەهەموو سەردەمەکاندا وەك کۆمەڵگەیەکە کەمانای واجبی دیاری کردنی ئیمام دەگەیەنێت. هەندێکیش پێیان وایە کەچاوگی واجب بوونەکەی ئەقڵەو ئەوئیجماعەیشی کەلەم بارەیەوە ڕوویداوە قەزاوەتێکە بەحوکمی ئەقڵ تێیداو گوتوویانە واجب بوونی ئەقڵیەکەی بەوهۆیەوەیە کەکۆمەڵگە بۆ مرۆڤ پێویست و زەروریە و ژیانی مرۆڤ بەتەنهایی شتێکی مەحاڵەو بەهۆی مەبەستەکانی تاکەکانەوە لەگەڵ یەکتریداخۆ دوور گرتن لە کێشەو ململانێی کۆمەڵایەتی شتێکی مەحاڵە، هەروەك چۆن ئەگەر لەنێوانیاندا حاکمێك نەبێت تاوەکو ڕێگر بێت لەدەستدرێژی هەندێکیان بۆسەر هەندێکی تریان ئەوا کاروباریان بەجۆرێك گێروگرفتی تێدەکەوێت کەلەناو چوونی مرۆڤ بەدوای خۆیدا دەهێنێت، ئەمە لەکاتێك پاراستنی جۆر لەمەبەستەزەروریەکانی شەریعەتە.

ئەم مانایە وەك ئەو بەڵگەهێنانەوەیە کەحەکیمەکان لەبارەی واجب بوونی پێغەمبەرایەتیەوە لەنێو مرۆڤەکاندا هێناویانەتەوەو، ئێمەش ئاماژەمان کرد بۆ هەڵە

---

[٢٧٥] (هُوالَّذی جَعَلکُم خَلائِفَ الأرض) س انعام ئا ١٦٥.

بوونەکەی و ئەوەمان وەیاد هێنایەوە کەیەکێك لەپێشەکیەکانی ئەم مەسەلەیە سەلمێنراو نیە، کەبریتیە لەوەی کەدەڵێن کەسی ڕێگر (رادع)دەبێت شەرعی و لەلایەن خوداوەبێت و زۆربەی خەڵکی لەڕووی بیروباوەڕەوە بەرەو پیریەوە بچن و تەسلیمی ببن، ئەمەلەکاتێکدا لەوانەیە هەندێك جار فەرمانڕەوای خەڵکی لەڕێگەی زۆرو هێزەوە بگاتە ئەوپلەیە هەرچەندە هیچ شەرعێکیشیان نەبێت، هەروەك چۆن لەناو نەتەوەئاگرپەرست و ئەوانەی کەهیچ بانگەوازێکیان پێنەگەشتووە کتێبی ئاسمانیشیان نەبووە ئەم مانایە جێگیربووە. لەگەڵ ئەوەی کەدەڵێین بۆلابردنی کێشە تەنها ئەوەندە بەسە هەرکەسێك ئاگاداری حەرامبوونی ستەمگەری بێتو بەحوکمی ئەقڵ زەرەرە کەی بدۆزێتەوە.

کەواتە بانگەشەی حەکیمەکان ئەوەیەکە: لابردنی کێشە تەنها لەڕێگەی بوونی شەرع لەوێداو دانانی ئیمام لێرەدا، ڕاست نیە، بەڵکو ئەم کارە هەروەك چۆن لەڕێگەی دانانی ئیمامەوە دەکرێت هەربەوشێوەیەش دەکرێت لەڕێگەی کۆمەڵێك سەرۆکی خاوەن خانەدانەوە ئەنجام بدرێت یان هەرخەڵکی خۆیان ڕێگری بکەن لەستەمکردن لەیەکتری. کەواتە بەڵگەئەقڵیەکەی ئەمان کەلەسەر وەهاپێشەکیەك دامەزراوە لەناوناچێت، هەربۆیە دەرکەوت هەوەك ئەوەی کەباسمانکرد بەڵگەی دانانی ئیمام تەنها شەرعە کەبەهۆی ئیجماعەوە دەسەلمێنرێت و هەندێك لەخەڵکیش بەهیچ شێوەیەك باوەڕیان بەدانانی ئیمام نەبووە و بەواجب نەبوونی دانانی، ئیتر بەپشت بەستن بەئەقڵ بێت یان شەرع قایل بوون. لەوانەش (ئەصەم)ی موعتەزیلی و هەندێك لەخەواریج لەپەیڕەوانی ئەم بیروباوەڕەن. ئەم گروپە پێیان وایە کەواجب تەنهالەجێبەجێکردنی ئەحکامەکانی شەرعدایە هەروەك چۆن هەرکات ئومەت لەسەر عەدالەت و جێبە جێکردنی حوکمەکانی خودا ڕێکبکەون ئەوا پێویستیان بەئیمام نابێت و دانانەکەشی واجب نابێت. ئەمانەش بەبەڵگەی ئیجماع بۆچوونە کەیان ڕەت دەکرێتەوە.

ئەوەی کەئەمانی والێکردووە کەپەیڕەوی ئەم مەزهەبەبن بریتی بوو لەڕاکردنی ئەوان لەپاشایەتی و شێوەکانی: وەك دەستدرێژی و زاڵبوون بەسەر خەڵکیدا و کامەرانیی

لەشتەدونیاییەکاندا، چونکە پێیان وایە کەبنەماکانی شەریعەت لەشوێنگەلێکی زۆردا سەرزەنشتی ئەم شتانەی کردووە و خاوەنانی وولاتی لۆمەکردووە و خەڵکی لەسەر وازهێنان لێی هانداوە، بەڵام دەبێت ئەوەبزانین کەشەرع کاروباری پاشایەتی لەزاتدا بەناباش لەقەڵەم نەداوە وڕێگری نەکردووەلە وەرگرتنی، بەڵکو ئەوخراپانەی کەلەدەسەلاتەوە سەرهەڵدەدەن وەك ستەمگەری و ڕۆچون بەناوخۆشگوزەرانی و هەواوئارەزووە خراپەکاندا بەلاوە ناباش و خراپە. گومانیش لەوەدا نیە کەئەم جۆرە خراپانە لەدەرئەنجامەکانی ئەون و حەرام و قەدەغەن هەروەك چۆن شەرع عەدلو ئینساف و بەرپاکردنی مەراسیمە ئاینیەکان و بەرگری کردن لێیان بەباش دەزانێتو پاداشی بۆدیاری کردوون و ئەمانەش بەشێکن لەحکومەتداری و لەشەرعدا تەنها لەبەر یەك شت پاشایەتی بەخراپ دانراوە ئەویش ئەگەر ستەمکاربێت، وەگەرنا لەشەرعدا پاشایەتی بەگشتی بەخراپ دانەنراوە و خوازیاری لەناوبردنیشی نیە.

هەروەك چۆن لەشەرعدا هەواوئارەزوو توڕەیی لەکەسە موکەلەفەکاندا شتێکی نەشیاوە، بەڵام لەهەمان کاتدا مەبەستیشی ئەوەنیە کەنابێت کەس هیچ جۆرە هەواو ئارەزوو توڕەییەکی تێدانەبێت، چونکە لەهەندێك کاتدا پێویستی والەمرۆڤ دەکات کەئەوشتانەی تێدابێت، بەڵکو لەکاتێکدا کەدەگوترێت ئەمانە ناپەسەندو نەشیاون واتەئەوکاتەی ناپەسەندو نەشیاون کەلەڕێگەی ناڕەوادا بەکاربهێنرێن و لەکاروبارە باشەکاندا دەستیان بۆببرێت، هەربۆیە دەبینین کەداوود و سولەیمان کەدوو پێغەمبەری خودان و لەهەمان کاتدا پاشاش بوون، بەڵام بەلایەنەباشەکەیدا و خوداش بەچاکە باسی کردوون و بەرێزن لای خودا. ئەوکات لەگەڵ ئەوانەی کەباوەڕیان بەدامەزراندنی دەوڵەت نیەو ئەوانەشی باوەڕیان بەدانانی ئیمام نیە دەڵێن: ئەم بیرو باوەڕە سودێکی بۆئێوە نیە، چونکەباوەڕتان بەجێبەجێکردنی حوکمەشەرعیەکان هەیە و ئەمەش بێجگەلەڕێگەی عەصەبیەتەوەنەبێت بەدی نایەت و پێویستی بە پاشایەتی هەیە، هەرچەندە ئیمامیش دیاری نەکرێت، ئەم بارودۆخەش وەك ئەوشتەوایە کەئێوە لێی ڕادەکەن، ئێستە کە

دامەزراندنی ئیمام بەئیجماع واجبە باوادابنێین لەفەرزە کیفایەکان بێت و پەیوەست بێت بەوکەسانەی کەخاوەنانی حەل و عەقدن واتەئەوانەی کەئیمام هەڵدەبژێرن، بەڵام لەسەر هەمووخەڵکی گوێڕایەڵیەکەی واجبە هەروەك خودا دەفەرمێت: گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەر و خاوەن فەرمانەکانتان بکەن[٢٧٦]. پەیوەست بوونی پلەی خەلافەت و ئیمامەت بۆدوو کەس لەیەك کاتدا شتێکی ڕەوانیە بەپێی فەرموودەکانی پێغەمبەر کەلەصەحیحی موسلیم و کتاب الامارەدا هاتوون. هەندێکیش گوتوویانە مەبەست لەجایز نەبوونی دانانی دوو خەلیفە ئەوەیەکە لەیەك وولآت یان لەچەند وولآتێکی دراوسێی یەکتردا خەلافەت بکەن، بەڵام ئەگەر وولآتانی ئیسلامی لەیەکترەوە دووربن و ئیمام یان خەلیفە نەتوانێت بەکاروبارەکانیان ڕابگات، ئەوکات دروستە ئیمام یان خەلیفەیەکی تر بۆئەوشوێنانە دابنرێت بۆئەوەی بەرژەوەندی ئەوانیش لەبەرچاوبگیرێت، لەوانەش وەك مامۆستا ئەبوئیسحاقی ئیسفراینی شێخی موتەکەلیمەکان و ئیمام الحرمین لەکتێبی الارشاددا ئەم بۆچوونەی هەبووە لەبۆچوونەکانی زانایانی ئەندەلوس و مەغریبیشدا پشتگیری کردنێك لەم بۆچوونە دەبینرێت، چونکە زانایانی ئەندەلوس گروپێکی زۆربوون و بەیعەتیان بەئەمەویەکان دابوو ناصر عبدالرحمان و منداڵەکانی کەلەخەلیفەکانی ئەوزنجیرەیەبوون بەناوی امیرالمومنون کەنیشانەی تایبەتی خەلافەتە ناوزەد دەکران، هەروەك چۆن لەبارەی ئەم نیشانەتایبەتەوە گفتوگۆدەکەین.

وەهەروەها مووەحیدان لەپاش ئەمەویە کاندا لەمەغریبدا گەشتنە خەلافەت. هەندێکیش ئەم بۆچوونەیان بەبەڵگەی ئیجماع ڕەتکردووەتەوە، بەڵام بەڵگەکەیان ڕۆشن نیە، چونکەئەگەرلەمبارەیەوە ئیجماعێك هەبوایە ئەوا مامۆستا ئەبو ئیسحاق و امام الحرمین کەلەمەعریفەی ئیجماعدا ئاگادارترن دژایەتیان نەدەکرد. ئەوەی کەلەم بارەیەوە دەتوانین بیڵێن کەمازری و نەوەوی هەروەك گوتمان بەپێی مانای ئاشکرای حەدیسەکان بۆچوونی امام الحرمین یان ڕەتکردووەتەوە. هەرچەندە هەندێك لەدوایینان ئەم ئایەتەی

---

[٢٧٦] (وَأَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمرِ مِنكُم) س النساء ئا ٦٢.

قورئانیان کردووەتەبەڵگەی ڕێگری کردن لەوزانیوە کە دەفەرمێت: (ئەگەر لەئاسمانەکانو زەویدا خودا گەلێك بێجگەلەخودای تاقانە هەبوایە ئەوا هەردوو جیهان تێکدەچوون)[٢٧٧]، بەڵام ناتوانین لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەپیرۆزە بکەینە بەڵگە، چونکە دەلالەتەکانی ئەقڵیو ئێمەی لەوڕووەوە کەمەندکێشی خۆی کردووە تاوەکو مەسەلەی تەوحید کەفەرمانی بەئێمەکردووە باوەڕمان پێی هەبێت، ئاشکرابێت بۆمانو بەبەڵگەیەکی ئەقڵی بزانین و لەبیروهۆشماندا ماناکەی سەختتر دەبێت، بەڵام مەبەستی ئێمەلەبارەی ئیمامەتەوە ئەوەیە کەبزانین دانانی دووئیمام قەدەغەیە یان نا؟ ئەوەش ئەمرێکی شەرعی و تەکلیفێکی ئاینیە و بەڵگەهێنانەوەکە لەم بارەیەوە کامڵ نابێت بێجگەلەوەی کەبەشێوەیەکی شەرعی قەدەغەبوونەکەی بسەلمێنرێت و پێشەکیەکی تر لەبارەی سەلماندنیەوە بهێنرێتەوە بەوشێوەیە کەبڵێین: فرە ئیمامی دەبێتەهۆی خراپە و هەرچیەکیش ببێتەهۆی فەساد لەئێمە قەدەغەکراوە.

لەم کاتەدا بەڵگەهێنانەوەکە چەمکێکی شەرعی وەردەگرێت، وخوداش داناترە، بەڵام مەرجەکانی ئەم پلەیە چوارشتە: زانست و عەدالەت و کیفایەت و سەلامەتی هەستەکان و ئەوئەندامانەیە کەلەبۆچون و کرداردا بەکاردەهێنرێن، لەمەرجی پێنجەمدا کەنەسەبی قورەیشە جیاوازی هەیە و مەرجی زانستەکەیشی ڕوونە، چونکەئیمام یان خەلیفە کاتێك دەتوانێت فەرمانەکانی خودا جێبەجێ بکات کەزانیاری لەبارەیانەوە هەبێت و ئەگەربێتو زانا نەبێت لەوبوارەدا ئەوا دروست نیە ئەوئەرکەی پێ بسپێردرێت. زانستەکەشی پێویستە بگاتە قۆناغی ئیجتیهاد، چونکە ئەگەربێت و موجتەهید نەبێت ئەوا بەناچاریەوە دەبێت تەقلید بکاتو ئەم کارەش لەئیمامدا کەموکورتیەو پێوستی ئیمامەت بریتیەلەوەی کەلەهەموو سیفەتەکاندا بگاتە کەماڵ، بەڵام مەرجی عەدالەت لەوەوەیەکەئیمامەت پلەیەکی ئاینیەو چاودێری هەموونەو پلەوپایانەدەکات کەعەدالەت تێیاندابە مەرج گیراوە. کەواتە بەمەرجگرتنی کردنی ئیمامەت بەوەوە ئەولاترە لەوەی کەعەدالەت بەهۆی خراپەو

---

[٢٧٧] (لوكانَ فيهِما آلِهَةٌ إلّا الله لَفَسَدَتا) س انبياء ئا ٢٢.

تاوانی ئەندامانی جەستەو ئەنجامدانی حەرامەکانەوە لەناودەچێت هیچ جیاوازیەك نیە، بەلام لەناوچوونی بەهۆی بیدعەتە بیروباوەڕیەکانەوە جیاوازی بۆچوونی تێداهەیە. مەرجی کیفایەتیش بەوهۆیەوەیە کەئەودەبێت لەجێبەجێ کردنی حەدەکانی شەرعدا و سزادانی تاوانباران و لەکاتی جەنگەکاندا ئازاو دلێربێت و بەبەصیرەتەوە کاروبارەکانی جەنگ بەڕێوە ببات وخەڵکی بۆئەو مەبەستە ڕاپەڕێنێت‌و، ئاشنایەتی لەگەڵ عەصەبیەت‌و حاڵی نەتەوە و هۆزەکاندا هەبێت و لەکاروبارەکانی سیاسەتدا بەهێزو بەتوانابێت بۆئەوەی هەرچی لەئەستۆدایە وەك پارێزگاری لەئاین و جیهاد لەگەڵ دووژمنانداو جێبەجێکردنی حوکمەکان و ڕێکخستنی بەرژەوەندیە گشتیەکان، بەڕاستی پاکیەوە ئەنجام بدات، بەلام مەرجی سەلامەتی ئەندامانی جەستە کەخەلیفە نابێت کەم و کورتی تێدا نەبێت و هیچ ئەندامێك لەئەندامەکانی لەکار نەکەوتبێت وەك شێتی و کوێری و کەڕی‌و نەبوونی قاچ و دەست و بەکورتی نەبوون یان کەم و کورتی لەهەرئەندامێکی جەستەیدا کەببێتە ڕێگر لەبەردەم ئەنجامدانی کارەکانیدا، ئەوکات سەلامەتی ئەو ئەندامانە بەمەرجی کەماڵ دادەنێین.

ڕێگری کردنی کەسێکیش لەئەنجامدانی کارەکان وەك لەدەستدانی یەکێك لەئەندامانی جەستەی کەلەسەر دووشێوەیە: جۆرێکیان وەك مەرجی واجب بوون دەبەسترێتەوە بەمەرجی سەلامەتەوە، ئەوەش بریتیە لەڕێگری لەئەنجامدانی کارەکان بەشێوەیەکی گشتی کەبەهۆی دیلی و هاوشێوەکانیەوە دێتەدی. جۆری دووەمیش پەیوەست نابێت بەمەرجی یەکەمەوە ئەویش مەحجوریەتە کەبەهۆی زاڵبوونی هەندێك لەهاودەستانی بۆئەم ڕوویدات بەبێ ئەوەی کەنافەرمانی و سەرپێچیەك بەدی بێت. لەم کاتەدا ڕەفتاری ئەودەستبەسەرداگرە (مستولی)لەبەرچاو دەگرن، ئەگەر فەرمانەکانی بەپێی حوکمەکانی دین و عەدالەت و سیاسەتی باش و پەسەند هەبێت مانەوەکەی بەڕەوا دەزانن، وەگەرنا موسوڵمانان یارمەتی ئەوکەسەدەدەن کەدەستی ئەو لەکاری خەلافەتدا کورتە و بێزار کردنی دەستدرێژی کار لەناودەبەن، بۆئەوەی کەخەلیفە خۆی بتوانێت بەجێبەجێ کردنی

حوکمەکان ڕابگات، بەڵام مەرجی نەسەب بەو هۆیەوەیە کەصەحابەکان لەڕۆژی سەقیفەدا ئیجماعیان لەسەر کردو لەوکاتەدا ئەنصارەکان هاتنە سەرئەوەی کەبەیعەت بدەنە سەعدی کوڕی عوبادە و، بەقورەیشیان گوت ئەمیرێك لەئێمە و ئەمیرێکیش لەئێوە، قورەیشیش بەڵگەیان بەفەرموودەکەی پێغەمبەر دەهێننەوە کەفەرموویەتی: ئیمامەکان لەقورەیش دەبن. وەهەروەها وەصیەتی بۆئێمەکردووە کەچاك بین لەگەڵ چاکەکارتانداو لەخراپە کارانیشتان خۆش ببین، وئەگەر ئەمیری لەناوئێوەدا بوایە ئەوا لەبارەی ئێوەوە وەصیەتی بۆئێمە نەدەکرد. ئەنصار لەبەرامبەر بەڵگەکە یاندا بێدەنگ بوون و داواکردنی ئەمیریەکەیان لەبیر کردو لەوبڕیارەی کەدابوویان بەبەیعەتکردن لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەدا پاشگەز بوونەوە.

لەصەحیحیشدا هاتووە کەخەلافەت هەمیشەدەبێت لەقورەیش بێت و هاوشێوەی ئەم بەڵگانە زۆرن، بەڵام لەبەر ئەوەی کەکاروباری قورەیش بەرەو لاوازی چوو عەصەبیەتیان لەیەك ترازا بەهۆی ئەوەی کەلەخۆشگوزەرانیدا گەشتبوونە لوتکەو لەناوچەکاندا بلاو بوبونەوە و نەیانتوانی باری قورسی خەلافەت بەباشی هەڵبگرن، لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا بێتوانا بوون و لەئەنجامدا نەتەوەی غەیرەعەرەب بەسەریاندا زاڵ بوون و حەلو عەقدیان گرتە دەست و، ئەم بارودۆخەش بەوشێوەیە لەلای هەندێك لەلێکۆڵەرەوان ئاڵۆزبوو باوەڕیان بەلابردنی مەرجی قورەیشی بوون لەخەلافەتدا نەماولەم بارەیەشەوە پشتیان بەڕواڵەتی هەندێك لەفەرمووده دەبەست، وەك ئەوگوتەیەی پێغەمبەر (ص) کەدەفەرمێت گوێڕایەڵ بن فەرمانبەردارین هەرچەندە عەبدێکی حەبەشیش فەرمانڕەواتان بێت. ئەم قسەیەش نابێت لەم بارەیەوە وەك بەڵگە بهێنینەوە، چونکە قسەکەوەك نمونە باسکراوە و مەبەست لێی زیادەڕەوی کردنە لەگوێ ڕایەڵیدا، وەهەروەك گوتەکەی حەزرەتی عومەر کەدەڵێت: ئەگەرسالمی غولامی حوزەیفە زیندوو بوایە هەرئەوم دەکردە والی و لەبارەیەوە هیچ گومانێکی خراپم نەدەبرد. ئەم قسەیەش لەم بارەیەوە سودێکی نیە، چونکە ئەوەمان زانی کەمەزهەبی صەحابی نابێتە بەڵگە.

وەهەروەها سالم مەولای قەومەکەبووەو لەرێگەی وەلائەوە بووتە خاوەنی عەصەبیەت لەناوقورەیشدا سودی عەصەبیەتیش لەبەمەرجگرتنی خەلافەت بەنەسەبەوە هەرئەمەیە. وەلەبەرئەوەی کەخەلیفە عومەر خەلافەتی بەگرنگ زانیوە و مەرجەکانیشی زۆرگوێ پێنەداوە، هەربۆیە گەڕاوەتەوە لای سالم، چونکە بەبیرو باوەڕی خەلیفە عومەر مەرجەکانی خەلیفەلەسالمدا زۆربوون (کەدواتریش باسیان دەکەین)، تەنانەت نەسەبی بەسود بۆعەصەبیەت و تەنها مەرجێك کەلەودانەبووە نەسەبی صەریح و خالص بووە کەخەلیفە عومەر بەپێویستی نەزانیوە، چونکە سودی نەسەب هەمان ئەوعەصەبیەتەیە کەئەویش بەهۆی وەلائەوە بوونی هەبووە، هەربۆیە مەبەستی خەلیفە عومەر خوای لێ ڕازی بێت لەم قسەیە بریتیە لەوپەیوەندیە بەهێزەی کە ئەو لەبەرامبەر بارودۆخی موسوڵمانانەوە هەیبووە، خوازیاری ئەوەبووە کەکاربەدەستی موسوڵمانان کەسێك بێت کەسەرزەنشتکاران نەتوانن بەرامبەری هیچ شتێك بڵێن و، لەوانەش نەکەوێتە بەر ڕەخنەی ئەوانەی کەلەخەلافەتدا قورەیشی بوون بەمەرج دادەنێن، قازی ئەبوبەکری باقلانی لەبەر ئەوەی کەلەوەگەیشتبو کەعەصەبیەتی قورەیش بەرەو نەمان دەڕوات و لەلایەن پاشاو دەسەڵاتدارانی ناوچەکانی تری خەلافەتەوە سەرپێچی دەکرێت، هەربۆیە ئەم مەرجەی لابردووە، هەرچەندە بۆچوونەکەی لەگەڵ (شوراتەکان)خەواریجدا یەکە، چونکە ئەو باروو دۆخی لاوازی خەلیفەکانی لەسەردەمی خۆیدا بینی بوو، بەڵام جومهوری زانایان لەسەر بوونی مەرجی قورەیشی بوون هەرمانەوە، دەیانگووت هەرچەندە ئەو خانەدانە بێتوانابن لەبەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵماناندا، بەڵام دیسانەوە ئیمامەت تایبەتە بەوانەوە، بەڵام بۆچوونی ئەویان لەبەرئەوە ڕەت کردووەتەوە کەئەگەر مەرجی نەسەبی قورەیشی لانەبرێت ئەوکات مەرجی کیفایەت کەلەڕێگەیەوە خەلیفە بەهێزێکی زۆرەوە کاروباری حەل و عەقد ڕاپەڕێنێت بمانەوێت و نمانەوێت لەناودەچێت، چونکە ئەگەر شان و شکۆی خەلیفە بەهۆی نەمانی عەصەبیەتەوە لەناوبچێت، دیارە کەکیفایەتەکەیشی لەناودەچێت وەهەرکات گرفتیش بکەوێتە ناومەرجی کیفایەتەوە

ئەوکات مەرجەکانی زانست و ئاینیش گرفتیان تێدەکەوێت و، مەرجەکانی ئەم پلەوپایەیە گرنگی خۆیان لەدەست دەدەن و ئەمەش بەپێچەوانەی ئیجماعەوەیە.

ئیستەش جێی خۆیەتی کەباسی حیکمەتی مەرجی نەسەب بکەین بۆئەوەی بۆچوونی ڕاست لەناوهەموو مەزهەبەکاندا دەر بکەوێت. هەربۆیە دەڵێن: هەمووحوکمەشەرعیەکان خاوەنی مەبەست و حیکمەتگەلێکن کەشاریع (خودا)بەلەبەرچاو گرتنیان حوکمە ناوبراوەکانی داناوە و، هەرکاتێکیش ئێمە بەشوێن حیکمەتی مەرجی نەسەبی قورەیشیو ئامانجی شاریع لەوەدا بگەڕێن دەبینین کەبۆچوونی شاریع تێڕوانینی شاریع بەئاراستەی بەپیرۆز سەیرکردنی پەیوەستی بەپێغەمبەرەوە (ص)نەبووە، هەروەك بەناویانگیشە، وەهەرچەندە ئەم پەیوەستبونەی کەهەیە دەبێتەهۆی ڕێزو گەورەیی، بەڵام ڕێزو گەورەیی وپیرۆزکردن لەمەقاصیدی شەرعی نیە، هەروەك زانیمان.

کەواتە بەناچاریەوە دەبێت لەم بارەیەوە بەشوێن بەرژەوەندیەکی تردا بگەڕێین، کەئەو مەبەستی شاریع بووە و هەرکات بابەتەکەمان لەڕێگەی شیکاری تاقیکردنەوەوە خستە بەرباس هیچ هۆکارێك بێجگە لەعەصەبیەت نادۆزینەوە بۆدانانی ئەم مەرجی قورەیشی بوونە لەخەلیفەدا، چونکە بەهۆی مەرجی ناوبراوەوە پاسەوانی پارێزگاری و فراوانخوازی بەدی دێت جیاوازی بۆچوونی خەڵکیش لەبارەی خاوەنی ئەم پلەیەوە بەهۆی بوونی عەصەبیەتەوە لەناودەچێت و، خەڵکی شاد دەبن و برایەتی و خۆشەویستی لەنێویاندا پەرەدەگرێت و بەهێزدەبێت، چونکە قورەیش گروپێکی گرنگی هۆزی موزەڕن و ڕیشەی ئەوهۆزەیشن و خاوەنانی دەسەڵاتیش هەر لەوان بوون زۆری و بەهێزی موزەڕ لەناوهۆزەکانی تردا شتێکی دیارو ئاشکرابووە و، هەربۆیەوانەی کەعەزایان دەکرد باوەڕیان بەم پلەو پایەیە هەبوو ئەگەر خەلافەتیش بدرایە بەغەیری قورەیش لەلایەن موسوڵمانەوە ئەوا کێشەو گرفت دروست دەبوو.

بێجگەلەقورەیشیش هۆزەکانی تری موزەڕ توانای ئەوەیان نەبوو عەرەب لەکاری خەلافەت بەرکەناریکەن یان ناچاریان بکەن، بەئەنجامدانی هیچ کارێك ئەگەر بەوشێوەیە

بوایا ئەوابێگومان کێشەو گرفت دروستدەبوو بەلای خودا(شاریع)شەوە پەسەند نەبوو، ئەمەش بۆئەوەبوو کەبەهۆی عەصەبیەتی بەهێزی ناوقورەیشەوە کاروباری خەلافەت بەباشترین شێوە بەڕێوە بچێت، چونکە قورەشیەکان دەیانتوانی خەڵکی لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە و هەرکارێك کەبیانەوێت ئەنجامی بدەن‌و، کەسیش نەیدەتوانی جیاوازی بخاتە نێوانیانەوەو تۆوی دووبەرەکیان تێدابچێنێت. ئەمەبوو لەوکاتەدا نەسەبی قورەیش بۆ خەلیفە بەمەرج گیراوە بۆئەوەی بەهۆی ئەوانەوە موسوڵمانان یەك بن و وشەیان یەك بێت و بەردەوام لەسەر کەوتندابن و یەکڕەنگ و یەك ئاراستە بن، ئەمەشە کەبووە هۆی ئەوەی کە دەسەڵاتی موسوڵمانان بگاتە ئەوپەڕی دونیای ئەو سەردەمە، هەروەك لەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا ئەم شتە بەتەواوەتی بەرجەستە بوو تاوەکو سەردەمی عەباسی و ئەمەویەکان بەردەوام بوو وەکاتێکیش ئەو عەصەبیەتە بەهێزەی کەباسمانکرد لەناوچوو دەبینین خەلافەتی عەرببیش پوکایەوە.

هەرکەسێکیش لێکۆڵینەوەلەم بوارەدا بکات دەزانێت پلەو پایەو توانای قورەیش لەناوموزەڕدا چەندەبەهێزو مەحکەم بووە چەندەش دەسەڵاتداربوون. هەروەك چۆن ئیبن ئیسحاق و خەڵکانێکی تریش ئەم مەسەلەیان لەکتێبەکانیاندا هێناوەو ئاماژەیان پێکردووە کەواتە ئەوەمان بۆدەرکەوتوو سەلمێنرا کەدانانی مەرجی قورەیشی بوون تەنها مەبەست لێی ڕێگری کردن بووە لەکێشە گرفتەکان، چونکە ئەمان خاوەنی عەصەبیەت و دەسەڵات بوون. وەهەروەها ئەوەشمان زانی کەشاریع حوکمەکانی تایبەت نەکردووە بەسەردەم یان نەتەوەیەکەوە و لەوەتێدەگەین کەئەم مەرجە تەنها بۆ وەدیهاتنی مەرجی کیفایەتە، هەربۆیە لەم ڕووە وە دەیگێڕینەوە بۆمەرجی ناوبراو هۆکارێك لادەبەین کەباس لەنەسەبی قورەیش دەکات، کەئەویش مەسەلەی عەصەبیەتە. ئەوکات ئێمەش بەمەرجی دەگرین دەبێت ئیمام یان خەلیفە دەبێت لەنەتەوەیەك بێت کەخاوەنی عەصەبیەتێکی بەهێزبن، بەجۆرێك لەناوعەصەبیەتەکانی تردا قسەڕۆشتوو بێت و هەموولایەك گوێڕایەڵی بکەن و هیچ عەصەبیەتێك نەبێت کەشان بدات لەشانی، هەربۆیە دەبینین وەها عەصەبیەتێك لەوسەردەمەدا بێجگەلەقورەیش بوونی نەبووەو،

بانگەوازی ئیسلامیش پێویستی بەوەها عەصەبیەتێك هەبووە بۆئەوەی لەلایەن هەموو کەسێکەوە ڕێزی لێبگیرێت و بەناوخەڵکیدا بڵاوببێتەوە، چونکە بانگەوازی ناوبراو لایەنێکی گشتی هەبوو واتە بانگوازێکی تایبەت نەبوو بەخەڵکێکی دیاری کراوەوەو عەصەبیەتی نەتەوەی عەرەبیش بەس بوو بۆئەم مەبەستە، هەربۆیە دەبینین سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام ئێستە وەها هەلومەرجێك بوونی نیە هەربۆیە مەسەلەی خەلافەت و ئیمامەت لەهەرشوێنێکدا پەیوەستە بەکەسێکەوە کەلە وولاتەکەی خۆیدا خاوەنی عەصەبیەتێکی بەهێزبێت و عەصەبیەتەکانی تری خستبێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. وەئەگەرلەمەسەلەی خەلافەتدا سەیری حیکمەت و نهێنی خودابکەین لەمەش باشترمان دەستدەکەوێت چونکە خودا خەلیفە وەك جێنشینی خۆی دەزانێت تاوەکو چاودێری کاروباری بەندەکانی بکاتو ڕێنماییان بکات بۆئەبەرژەوەندیانەی کەهەیانە و لەخراپەو زیانەکان بیانگێڕێتەوە کەدێتە ڕێگەیان، دیارە کەخوداش بۆئەم ئەرکەگرنگە بەکەسێك ڕادەسپێرێت کە ئەو مەرجەی تێدابێت واتە خاوەنی عەصەبیەتێکی بەهێزبێتو هیچ کەسێك نەتوانێت زاڵبێت بەسەریدا، هەروەك دەبینین ئیمام ئیبن خەتیب لەبارەی ژنانەوە گوتوویەتی کەئەوانیان لەزۆرێك لەحوکمەشەرعیەکاندا کردووەتە شوێنکەوتەی پیاو. ژنان بەدانان نەکەوتوونەتە بەرهیچ فەرمان و بانگەوازێك و بەڵکو وەك پیاوان حیسابیان بۆکردوون چونکە هیچ کات فەرمانێکی تایبەت بەخۆیان نەدراوە بەسەریاندا و پیاوان لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا توانایەکی زیاتریان تێدایە.[٢٧٨]

مەگەر لەپەرستش و چاکەکردندا نەبێت کە ژن و پیاو بەجیا لەیەکتر ڕووبەڕووی تەکلیفی خودایی بوونەتەوە. سەرەڕای ئەمەش جیهانی واقیعیەت و بوون گەواهی دەری ئەم بانگەشەیەن، چونکە هیچ کات کەسێك نابێتە فەرمانڕەوای نەتەوەیەك یان گەلێك مەگەر ئەوەی کە زاڵو بەهێزبێت بەسەریاندا. کەمتریش دەگونجێت کاروباری شەرعی پێچەوانەی کاروباری بوون بێت، خوداش داناترە.

---

[٢٧٨] (الرِّجالُ قَوَّامُونَ عَلى النِّساء)س النساء ئا ٣٨.

# بەشی بیست وحەوتەم

## لەمەزهەبە شیعەکاندا لەبارەی حوکمی ئیمامەتەوە ( پێشەوایەتی )

پێویستە ئەوەبزانین کەدەستەواژەی شیعە لەزمانەوانیدا بەمانای یاران و پەیڕەوان دێتو لەعورفی فەقیهو موتەکەلیمەکانی خەلەفو سەلەفیشدابەپەیڕەوانو شوێنکەوتوانی عەلی و کوڕەکانی خوایان لێڕازی بێت گوتراوە و، لەمەزهەبی ئەماندا هەموو گروپەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ئیمامەت لەوبەرژەوەندیە گشتیانە نیە کەلەڕێگەی خەڵکەوە هەڵبژێردرێت و، دیاری کردنی بەدەستی ئەمان نیە بەڵکو ئەم پلەیە پایە و بنەڕەتێکی ئاینە و بۆپێغەمبەر ڕەوا نیە کە بێئاگابێت لێی وە یان بیسپێرێت بەخەڵکی، بەڵکو لەسەری واجبە کەئیمامی ئومەت دیاری بکات کەلەگوناهە گەورەو بچوکەکان بەدوور بێت، هەربۆیە حەزرەتی عەلی ئەوکەسەیەکە پێغەمبەر بۆئەم مەبەستە دیاری کردوە و لەم بارەیەوە کۆمەڵێك دەق دەگێڕنەوە و بەپێی مەزهەبەکەی خۆیان ڕاڤەو مانایان دەکەن، کەڕەخنەگرانی عاریفی ئەهلی سوننەت و ڕاویەکانی شەریعەت لەبارەیانەوە ئاگادارنین، بەڵکو زۆربەی ڕیوایەتە ناوبراوەکان لەڕێگەی گێڕانەوەی هەڵبەستراو (موضوع)یان تانە لێدرا و (مطعون)وەیان دوورلەتەئویلاتی فاسیدی ئەوانە، ئەم دەقانەش لای ئەوان دەبن بەدوو بەشی دیارو نادیارەوە (خفی جلی)جلی وەك ئەوفەرموودەیەی دەفەرمێت ئەوەی من بەمەولای خۆی بزانێت ئەواعەلیش مەولای ئەوە. دەڵێن گوایا ئەم ویلایەتە بیجگەلەعەلی لەکەسیتردا بوونی نیە، هەربۆیە حەزرەتی عومەر پێی گوتوە: تۆبویتە مەولای هەرژن و پیاوێکی موسوڵمان. یەکێکی تریش فەرموودەکەی

پێغەمبەرە (ص)کەفەرموویەتی: عەلی لەدادگەریدا لەپێش هەمووتانەوەیە. مانای ئیمامەتیش بێجگەلەقەزاوەتو حوکم کردن بەئەحکامەکانی خودا شتێکی ترنیە، مەبەستیش لەخاوەن ئەمرەکان (الوالامر)کەگوێڕایەڵیان لەلایەن خوداوە بەواجب دانراوە ئەمەیە کەدەفەرمێت: گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەیی و ئەوکەسانەبکەن کەکاروبارەکانی ئێوەیان بەدەستەوەیە[٢٧٩].

مەبەستیش لەخاوەن ئەمر بوون بریتیەلەداوەری کردن لەکاروبارەکانی خەڵکیدا هەربۆیە لەمەسەلەی ئیمامەت لەڕۆژی سەقیفەدا حەکەمیەت و قەزاوەت تە نها بەعەلی سپێردراوە نەوەك بەکەسانی تر. یەکێکی ترلەدەقەجەلی وئاشکراکانیان ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە کە فەرموویەتی: ئەوەکێیە کەبەڕۆحی خۆی بەیعەت بەمن دەدات و دەبێتە وەصیو وەلی ئەمر لەپاش من؟ بێجگەلەحەزرەتی عەلی هیچ کەسێك ئەو بەیعەتەی لەگەڵدا نەکرد. وەهەروەها لەودەقە شاراوانە (خفی)بەبیرو باوەڕی ئەمان ئەوەیە کەپێغەمبەر (ص)لەپاش دابەزینی سورەتی (برائەت)بۆخوێندنەوەی لەمەوسیمدا عەلی بۆئەوکارەڕاسپارد. پێغەمبەر یەکەم جار لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکردا سورەتەکەی خوێندبوەوە، بەڵام دواتر وەحی بۆهات کەپێویستە بۆ تەبلیغ کردن و ڕاگەیاندنی بەخەڵکی یەکێك لەخزمانی خۆت هەڵبژێری بۆئەومەبەستە، هەربۆیە حەزرەتی عەلی بۆئەومەبەستە ڕاسپارد. شیعەکان دەڵێن ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەعەلی فەزڵی لەم بوارەدا بەسەر هەموو صەحابەکاندا هەیە و ئەوەش دەڵێن کەهیچ کات ئاشکرا نەبووە کە پێغەمبەر هاوەڵێکی تری لەعەلی بەلەپێشتر زانیبێت.

ئەمەلەکاتێکدا ئەو لەدووغەزادا خەڵکانی تری بەلەپێشتر لەئەبوبەکرو خەلیفە عومەر زانیوە وەك ئوسامەی کوڕی زەیدو عەمری کوڕی عاص، هەموو ئەمانە بەڵگەی عەینین لەسەر دیاری کردنی حەزرەتی عەلی بەخەلیفەونەوەك کەسی تر، بەڵام هەندێك لەم بەڵگانە نەناسراوو هەندێکیشیان دوورن لەتەئویلی ئەمانەوە. سەرەڕای ئەمەش گرووپێك

---

[٢٧٩] (أطِيعوا اللهَ وَأطِيعوا الرَّسُولَ وَأُولي الأمرِ منكُم) س النساء ئا ٦٢.

لەشیعەکان پێیان وایە ئەم دەقانە بەڵگەن لەسەر خەلافەتی عەلی و ئەوانەشی کەلەدوای ئەوەوە دێن، دەگوازرێتەوە بۆیان، ئەمانەش بەئیمامیەکان ناسراون و ڕقیان لەهەردوو خەلیفە عومەرو ئەبوبەکر دەبێتەوە، چونکە پێیان وایە ستەمیان لەعەلی کردووە و نەیانهێشتووە ببێتە خەلیفەو بەیعەتیشیان پێنەکردووە. هەربۆیە نابێت گوێ بدەینە ئەوڕەخنەو عەیبانەی کەئەم گروپەتوندڕەوەی شیعە کەلەهەردوو خەلیفەی دەیانگرن، چونکە ئەم شتەلای ئێمەو زۆربەی شیعەکانیش ڕەتکراوەیە. هەندێك لەشیعەکانیش پێیان وایە کەبەڵگەکانی ناوبراو بەڵگەن لەسەر شیاوی عەلی بۆخەلافەت لەڕوی سیفەتەکانیەوە نەوەك لەبەر کەسی ئەوهاوەڵە بەڕێزە.

هاوەڵانیش لەبەرئەوەی کەوەصفەکەیان نەخستووەتە سەرمەوصوفەکە کەمو کورتیان کردووە و ئەمانەش پێیان دەڵێن زەیدیە، ئەمانە لەهەردوو خەلیفە بێزارنین و ئیمامەتیان ڕەت ناکەنەوە لەگەڵ ئەوەی کەباوەڕیان وابووە عەلی لەهەردووکیان لەپێشتر بووە بۆئەوکارە، بەڵام ئەوان ئیمامەتی باشیان بەلاوە دروستە هەرچەندە باشتریش هەبێت. لەپاشان دەبێت ئەوەبزانین کەئەخبارو ڕیوایەتی شیعەکان لەگواستنەوەی ئیمامەت و خەلافەتدا لەدوای ئەوەوە (عەلی)وەك یەك نیە و لەم بارەیەوە جیاوازی بۆچونیان هەیە، هەوەك چۆن دەڵێن ئیمامەت لەدوای عەلی دەگوازرێتەوە بۆ کوڕەکانی فاتیمە بەپێی دەق یەك لەدوای یەك دەبنە ئیمام، هەروەك دواتر باسی دەکەین، بەمانەش دەڵێن ئیمامی ئەمەش وەك شێوازی بیروباوەڕو بۆچونیان لەبارەی ئەوەی کەمەرجی ئیمانە بریتیەلە ناسینی ئیمام و دیاری کردنیەتی، ئەم ناسین و مەعریفەیەش لای ئەوان بەیەکێك لەبنەماکانی ئاین دەژمێردرێت. وەگروپێکی تر دەڵێن ئیمامەت دەگاتە کوڕەکانی فاتیمە، بەڵام نابێت شێخ و گەورەکان هەڵیانبژێرن‌و بەومەرجەش کەدەبێت ئەوئیمامە هەڵبژێردراوەی ئەمان زاناو زاهیدو بەخشندەو ئازابێت و بانگەوازی خەڵکی بکات بۆلای ئیمامەتەکەی خۆی ئەمانەش پێیان دەڵێن زەیدیە، ئەمەش وەك دانەپاڵێك بۆ خاوەنی ئەم مەزهەبە کەزەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی سیبت بووە.

وە زەید لەگەڵ براکەی خۆیدا محمدباقر لەبارەی مەرجی ئیمام بۆئەوەی بانگەشەی ئیمامەتیەکەی بکات گفتوگۆیەك ڕێکدەخەن و باقر وەڵامی دەدایەوە و دەیگوت ئەگەربەم شێوەیەبێت کەتۆ دەیڵێیت کەواتە باوکمان زین العابدین نابێتە ئیمام لەبەرئەوە ئەو دەرنەچووە بانگەواز بۆخۆی بکات و توانای ئەوەشی نەبووە و، سەرەڕای ئەمەش ڕەخنەی لەزەید دەگرت لەبارەی بیروباوەڕی موعتەزیلەو لەوبارەیەوە کە بیروباوەڕەکانیان لەواصیلی کوڕی عەتاوە وەرگرتووە لەبەر ئەوەی کە زەید لەگەڵ ئیمامیە لەبارەی شەیخەینەوە (عومەرو ئەبوبەکر)موناقەشەیان کردووە و بینیان کەئەو بەئیمامەتی ئەوان ڕازیە و ڕقی لێیان نابێتەوە ئەویان بەجێهێشت و، لەئیمامەکان هەژماریان نەکرد و هەربۆیە بەڕافیزی ناوزەد کران.

هەندێك لەشیعەکانیش لەبارەی ئیمامەت لەپاش عەلی هەردوو کوڕەکەیەوە (سیبتەین) (حسن و حوسەین)جیاوازیان هەبووە و، لەوباوەڕەدا بوون کەلەپاش سیبتەینەوە ئیمامەت بۆ محمدی کوڕی حەنەفیە و دوای ئەویش دەگات بەکوڕەکانی. بەم گروپەش دەڵێن کیسانیە وەك دانەپاڵێکی کیسان مەولای محمدی کوڕی حەنفیە. لەنێو گروپەکاندا جیاوازیەکی زۆری بۆچوونەکان هەیەو کەئێمە بەکورتی خستمانە ڕوو. هەندێك لەشیعەکانیش بەغالیەکان (غلات)بەناویانگن کەلەسنوری ئەقڵ و ئیمان دەرچوون، لەولایەنەی کەباوەڕیان بەخوایەتی ئیمامەکان هەیە، یان پێیان وایە ئەمانە مرۆڤن و سیفەتی خودایان تێدایە وەیان دەڵێن خودا لەسیفەتی مرۆڤیاندا تێکەڵبووە واتەباوەڕیان بەتێکەڵبوون (حلول)هەیە، هەروەك مەسیحیەکان کەلەبارەی حەزرەتی عیساوە (ع)لەسەر ئەوباوەڕەن. وەعەلیش خوای لێ ڕازی بێت، ئەوکەسانەی کەبیروباوەڕیان لەبارەیەوە بەوشێوەیە بووبەدەستی خۆی خستنیە ئاگرە وە و سوتاندنی. وەدەڵێن کەمحمدی کوڕی حەنفیە، لەبەر دیدەی خەڵك وون بووە بۆسەلماندنی ئەمەش بەڵگە بەحەزرەتی خزر دەهێننەوە. وەها بیروباوەڕێکیشیان لەبارەی حەزرەتی عەلیەوە گوتووە و شوێنکەوتوەکانی پێیان وایە کەعەلی لەنێو هەوردایە، هەورەگرمە دەنگیەتی و

بروسکەکەی قامچیەکەیەتی. ئەوان لەبارەی محمدی کوڕی حەنفیەوە باوەڕیان وایە عەلی لەکێوی ڕەزەوی لەسەرزەوی حیجازدا شاراوەتەوە و کەسیری شاعیر دەڵێت: ئاگاداربە کەئیمامانی قورەیش و فەرمانڕەوایانی قورەیش چوارکەسن و هەمووشیان یەکسانن، واتە عەلی و سێ لەکوڕەکانی، کەئەسباتن، و شاراوەیی لەکاروباری ئەماندانیە. یەکێکیان سیبتی باوەڕو چاکەیە، و سیبتی تر لەکەربەلا دفن کراوەو، سیبتێك مەرگ ناچەژێت تاوەکو ئەوکاتەی دەبێتە سەرکردەی سوپایەك ئەمەلەکاتێکدا لیوا لەپێشیەوە بجولێتو، ئەولەناوخەڵکدا نابینرێت و لەڕەزەوی شاردراوەتەوە و هەنگوین و ئاوی لایە.

هاوشێوەی ئەم بیروباوەڕە غالیەکانی ئیمامی و بەتایبەت دوانزەئیمامیەکان باوەڕیان پێیەتی و پێیان وایە ئیمامی دوانزەیەمی ئەمان محمدی کوڕی حەسەنی عەسکەری (ع)کەبەمەهدی ناسراوە لەسەرداوێکدا کەپەیوەستە بەخانەی خانەدانی ئەوەوە کەلەحیللەیە و لەوکاتەی کەلەگەڵ دایکیدا پەنای بردە ئەوێ لەبەرچاو وون بوو. وەئەولەئاخیر زەماندا دەردەکەوێت و زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری و، ئەم بیروباوەڕەی ئەمانیش پشت بەستوە بەوفەرموودەیەی کەلەکتێبی ترمزیدا لەبارەی مەهدیەوە هاتووە. ئەمانیش تاوەکو ئێستەش چاوەڕێی دەرکەوتنی مەهدین و ناویان لێناوە (مونتظر)واتەچاوەڕوانکراو هەموشەوێك لەپاش نوێژی مەغریبەوە لەبەردەم دەرگای ئەم سەرداوەدا دەوەستن و، تێکەڵەیەك دەهێنن و بەدەنگی بەرز بەکۆمەڵ ناوی مەهدی دەهێنن و داوای لێدەکەن کەخۆی ئاشکرابکات و تاوەکو تاریکی شەودادێت و ئەستێرەکان بەباشی دەردەکەونو، دواتر بڵاو دەبنەوە و ئەوکارە دەخەنەوە شەوی داهاتوو، ئەمانە تاوەکو ئەم سەردەمەش ئەم کارە دەکەن.

هەندێك لەگروپی واقیفیە باوەڕیان وایە ئەوئیمامەی کەچاوەڕێی دەکەن وەفاتی کردووە و جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەردونیاو بەڵگەش بەقورئان دەهێننەوە کەچیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوتە. (وەئەوکەسەی کەبەلای گوندێکی وێرانەدا دەڕوات و دەڵێت ئەمە

چۆن زیندوو دەبێتەوە پاش ئەم مردنەی)[280]. یان ئەوەی دەفەرمێت (پێمان گوتن بەهەندێك لەومانگا سەربڕاوە لێی بدەن خودا بەوجۆرە مردووە کان زیندوو دەکاتوە)[281]. ئەمانەو چەندین شتی تر لەم بابەتە بەبەڵگە دەهێننەوە کەلەجێگەی خۆیدا نیە. سەید حەمیری لەم گروپە بووە و لەم بارەیەوە دەڵێت: (کاتێك موی سەری مرۆڤ سپی دەبێت و ڕەنگکەران ڕەنگی بکەن لەوکاتە دا شادابی مرۆڤ لەناوچووە، کەواتە ئەی یار هەستە بابۆ لەدەستدانی گەنجیمان بگرین، بەڵێ بگرین تاوەکو ئەوڕۆژەی کە بەرلەڕەستاخێز مرۆڤەکان جارێکی تر دەگەڕێنەوە بۆئەم دونیایە، کەتا ئەوڕۆژە هەرکەس هەرچیەکی لەدەستدابێت دەستی ناکەوێتەوە، بیروباوەڕی من بەم جۆرەیەو بەحەقیشی دەزانم و هیچ گومانێکم لەزیندوبوونەوەی لەپاش مردن نیە و، بەم شێوەیە کەخودا باسی خەڵکانێکی کردووە کەلەپاش مردن و ڕزینی لاشەکانیان لەژێرخاکداجارێکی تر زیندوو دەکرێنەوە. لەبارەی ئەم غولاتانە هیندە بەسە کەتەنانەت بۆچوونە کانیشیان لای زانایانی شیعەش جێگەی پەسەندنین وباوەڕیان بەم جۆرە تێڕوانینانەیان نیەو بەڵگە بۆ ناڕاستبوونیان دەهێننەوە، بەڵام کیسانیە پێیان وایە کەئیمامەت لەپاش محمدی کوڕی حنفیە دەگاتە کوڕەکەی ئەبوهاشم و ئەمانەن کەبەبەنی هاشم ناسراون لەپاش ئەم لەنێو ئەماندا جیاوازی ڕوویداوە و گروپێك لەپاش ئەبو هاشمەوە براکەی عەلی و لەپاش ئەویش کوڕەکەی حسن کوڕی عەلی یان بەئیمام دەزانن و، هەندێکی تریش پێیان وایە لەبەر ئەوەی کەئەبو هاشم لەکاتی گەڕانەوەیدا لەشام لەسەرزەوی شراتدا[282] دەمرێتو وەسیەت دەکات کەجێگرەوەی محمدی کوڕی علی کوڕی عبداللەی کوڕی عەباس بێتو، محمدیش وەسیەتی کرد لەپاش خۆی ئیبراهیمی کوڕی کەبەئیمام ناسرابوو جێگرەوەی ئەوبێتو، ئیبراهیمیش ئیمامەتی دایە براکەی عبداللەی کوڕی حارسیە کەبەسەفاح

---

[280] (أو كالّذي مرَّ على قريَةٍ وَهِيَ خاوِيةٌ عَلى عُرُوشِها قالَ إنّى يُحيِ هذه اللهُ بَعدَ مَوتِها) س البقرة ئا ٢٥٩.

[281] (وَقُلنا اضرِبُوهُ بِبَعضِها كَذلِكَ يُحيِ اللهُ المَوتى) س البقرة ئا ٧٣.

[282] شوێنێکە لەنێوان مەدینە و دیمەشقدا کەخێزانی علی کوڕی عبداللەی کوڕی عباس لەوێدا دەژیان.

ناسرابوو سەفاحیش وەسیەتی کرد کەبراکەی خۆی عبدالله ئەبوجەعفەر کەبەمەنصور ناسرابوو بەئیمام قبولّ بکرێتو ئەوکات ئیمامەت لەنێو نەوەکانیدا بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك دەگەیشت بەهەموویان. ئەمەش مەزهەبی هەندێك لەهاشمیەکانە کەدامەزرێنەرانی دەولّەتی بەنی عەباس بوون ئەبو موسلیم و سولەیمانی ئیبنی کەسیرو ئەبو سەلەمەی خەلال و نمونەی ئەمانە لەشیعە عەباسیەکان دەژمێردرێن کەدەیانگوت مافی ئیمامەت بۆئەوان لەلایەن عەباسەوە بەمان گەیشتووە، چونکە ئەولەکاتی مردنی پێغەمبەردا لەژیاندا بووە و لەبەرئەوەی کەمامی پێغەمبەر بووە لەڕوانگەی عەصەبیەتی نەتەوەییەوە شیاوتربووە بۆخەلافەت.

وەهەروەها زەیدیەکان لەبارەی ئیمامەتەوە پێیان وایە کەئەم شتە لەلایەن خاوەنانی حەل و عەقدەوە دیاری دەکرێت نەوەك لەڕێگەی دەقەوە (نص)، هەربۆیە باوەڕیان بەئیمامەتی علی و لەپاش ئەویش کوڕەکانی هەیە واتە حەسەنی کوڕی علی و دوای ئەویش حوسەین و لەپاش ئەویش علی زین العابدینی کوڕی حوسەین و زەیدی کوڕی علی کەکوڕی ئەوە بەئیمامی دەزانن و بەدامەزرێنەری ئەم مەزهەبەی دەزانن کەلەکوفەدا شۆڕشی کردوو خەڵکی بانگدەکرد بۆلای ئیمامەتی خۆی و، تاوەکو سەرئەنجام لەکەناسە لەسێدارە درا.[٢٨٣] زەیدیەکان لەپاش کوشتنی زەید باوەڕیان بەئیمامەتی کوڕەکەی واتەیەحیا هەیە کەدەچێتە خوراسان و لەگوزەگان دەکوژرێت، وەسیەتیشی کردبوو کەلەپاش خۆی ئیمامەت بەمحمدی کوڕی عبداللەی کوڕی حەسەنی کوڕی حەسەنی سیبت کەبەنەفسی زەکیەناسراوە بسپێردرێت. هەربۆیە ئەو لەحیجازدا شۆڕشی کردو ناوزەد کرابەمەهدی، بەلاّم مەنصور بەسوپایەکەوە بەرەوڕووی هات و تێکی شکاندو کوژرا. نەفسی زەکیەش براکەی خۆی ئیبراهیمی کردە جێگرە وەی خۆی ئیبراهیمیش لەبەصرەدا بەهاوەڵی عیسای کوڕی زەیدی کوڕی عەلی شۆڕشی کرد، بەلاّم مەنصور سوپاکەی بەرەولای ئەوناردو تێکی شکاندن و ئیبراهیم و عیسای کوشت و جەعفەری

---

[٢٨٣] (جێگەیەکەلەشاری کوفە).

صادیق هەموو ئەم ڕووداوانەی بۆئەم گێڕاوەتەوە، ئەم پێشبینیەش بەکەرامەتەکانی ئەودەژمێردرێت. هەندێکی تر لەزەیدیەکان ڕێگەیەکی تریان گرتووەتەبەر باوەڕیان وابووە کەئیمام لەپاش محمدی کوڕی عبدالله نەفسی زەکیە، بریتیە لەمحمدی کوڕی قاسمی کوڕی علی کوڕی عومەرە ئەم عومەرەش برای زەیدی کوڕی عەلی بووە. محمدی کوڕی قاسم لەتالەقان دەرکەوت، بەڵام بەکرێگیراوانی خەلیفە دەستگیریان کردو بردیانە لای موعتەصەم و موعتەصەمیش زیندانی کرد هەتا مردن.

هەندێکی تریش لەزەیدیەکان گوتویانە ئیمامەت لەپاش یەحیای کوڕی زەیدەوە دەگاتە براکەی ئەوعیسا کەلەشۆڕشی ئیبراهیمی کوڕی عبدالله لەدژی مەنصور هاوڕێیەتی کردبوو. ئەم گروپەش ئیمامەت لەدوای عیساوە تایبەت دەکەن بەوکەسانەی کەلەپاش ئەودێن و داعی الزنج دەدرێتە پاڵ ئەو، هەروەك چۆن لەباسی تایبەت بەماندا باسیان دەکەین. کۆمەڵێکی تر لەزەیدیەکان لەسەر ئەوباوەڕەن کەئیمامەت لەپاش محمدی کوڕی عبدالله دەگات بەبراکە ئیدریس کەبەرەو مەغریب هەڵهاتووە و لەوێدا کۆچی دوایی کردووە و، ئیدریسی کوڕی بووەتە جێگرەوەی و شاری فاسی بنیات ناوە و لەپاش ئەویش نەوەکانی لەمەغریبدا گەشتوونەتە دەسەلأت تاوەکو ئەوسەردەمەی کەلەناوچوون، هەروەك لەباسی خۆیاندا گفتوگۆی لەبارەوە دەکەین و لەوەبەدواوە بانگەوازی زەیدیەکان ناڕێکی تێدەکەوێت. لەناو زەیدیەکاندا هەیەکەلەتەبەرستاندا دەتوانین فەرمانڕەوایەك بدۆزینەوە کەئەویش حەسەنی کوڕی زەیدی کوڕی محمدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی زەیدی و کوڕی حوسەینی سیبتە و باوکی زەیدی کوڕی محمدە. ئەوکات ناصری ئەتروش لەدەیلەم بەم بانگەوازە ڕاپەڕی کەئەمیش لەزەیدیەکان بوو خەڵکی بانگەوازەکەیان قبوڵکردوو لەدەوری ئیسلام کۆبوونەوە، نەسەبی ئەویش بەم شێوەیە دەگاتەوە بەزەید: حەسەنی کوڕی علی کوڕی حەسەن کوڕی علی کوڕی عومەر، ئەم عومەرەش برای زەیدی کوڕی عەلی بووە، لەبەرئەوەی خەڵکی بانگەوازە کەی ئەمیان قبوڵکردبوو نەوەکانی لەتەبەرستاندا دەوڵەتێکیان دامەزراند و دیلمان بەنەسەبی ئەم

خانەدانە گەشتنە پاشایەتی و دەستیان دایە سەربەخۆ خوازی و، لەژێر فەرمانی خەلیفەکانی بەغداد چوونە دەرەوە، هەروەك لەمێژووە کەیاندا باسیان دەکەین. وە بەڵام گروپی ئیمامیە باوەڕیان وایە کەئیمامەت لەعەلی وەصی (پێغەمبەر)بەپێی وەسیەتی ئیمامەت بۆحەسەنی کوڕی و لەپاشان بۆبراکەی حوسەین بووەو، دواتریش علی زەین العابدین کوڕی حوسەین و کوڕی ئەو محمد باقر و کوڕی محمدباقرجەعفەری صادق ئیمام بوون و، لێرەوە دەبن بەدوو گروپەوە.

هەندێکیان ئیمامەت دەدەنە پاڵ کوڕی جەعفەری صادق ئیسماعیل و لەنێوان خۆیاند بەئیمامی دەزانن و پێیان دەگوترێت ئیسماعیلیەکان، وەهەندێکی تریشیان موسای کازم کوڕەکەی تری جەعفەری صادق بەئیمام دەزانن‌و، ئەمانەن دوانزە ئیمامیەکان، لەوڕووەوەی کەلەدوانزەیەمین ئیمامدا دەوەستێت و پێیان وایە ئەو خۆی غەیب کردووە و تاوەکو ئاخیر زەمان نەیەت دەرناکەوێت، هەروەك پێشتر باسمانکرد، بەڵام ئیسماعیلیەکان باوەڕیان وایە کەئیمامەت بەدەق و ڕاشکاوانە لەجەعفەری صادقەوە بۆ ئیسماعیلی کوڕی ماوەتەوە. هەرچەندە ئیسماعیل بەرلەباوکی کۆچی دوایی کرد، بەڵام ئەوان لەم دەق و ڕاشکاویە سود وەردەگرن کەدەڵێن ئیمامەت لەپاشینەکانیدا هەربەردەوامە، وەك چیرۆکی موساو هارون (ع)لەم ڕووەوە باوەڕیان وایەکەئیمامەتی ئیسماعیل بۆکوڕەکەی محمدی مەکتوم گوازراوەتەوە و، محمدی مەکتوم بەیەکەم ئیمامی شاردراوە دادەنرێت، چونکە ئەوان پێیان وایە لەوانەیە هەندێك جار ئیمام هێزو شکۆی نەبێت، هەربۆیە خۆی وون دەکات و، شوێنکەوتەکانیشی بۆبەڵگەهێنانەوە لەسەر ڕاستیەتی ئیمامەتەکەی باسی ئەم وونبوونەبۆ خەڵی دەکەن. وەهەرکات هێزو شکۆی پەیداکرد ئەوکات دەردەکەوێت و بانگەوازەکەی ئاشکرادەکات.

وەهەروەها دەڵێن لەپاش محمدی مەکتوم کوڕەکەی جەعفەری موصەدیق و لەدوای ئەویش کوڕەکەی محمدی حەبیب کەکۆتا ئیمامی شاردراوەیە گەشتوونەتەئیمامەت و لەپاش محمدی حەبیب کوڕەکەی عوبەیدوالله مەهدی ئیمامی ئەمانە کەئەبو عبداللەی

شیعی بانگخوازی ئەو بانگەوازەکەی لەکەتامەدا ئاشکراکرد و، خەڵکی پەیڕەویان لێکرد. ئەوکات ئەبوعبدالله مەهدی لەزیندانی سجلماسە هێنایە دەرەوە و دواتر لەقەیرەوان و مەغریب دەسەڵاتی گرتە دەست و نەوەکانیشی لەدوای ئەو لەمیسردا گەیشتنە دەسەڵات (فاتیمیەکان)هەروەك چۆن لەمێژووەکەیاندا بەناوبانگە. ئەم گروپەش بەهۆی ئەوەی کەباوەڕیان بەئیمامەتی ئیسماعیل هەیە پێیان دەڵێن ئیسماعیلی، وەئەوانەشی کەباوەڕیان بەئیمامی باتین یان پەنهان هەیە پێیان دەڵێن (باتینی).

وەگروپێکی تر بەهۆی ئەوەی لەگوتارو بۆچوونە کانیاندا بابەتی بێباوەڕی دەبینرێت بە(ملاحدە)واتە بێباوەڕەکان ناوزەد کراوون. ئەمانە گوتاری کۆن و نوێیان هەیە کەحەسەنی کوڕی محمدی صەباح لەکۆتایی سەدەی پێنجەمدا خەڵکی بۆلای ئەم بیروباوەڕانە بانگهێشت دەکرد و، لەشام عێراقدا کۆمەڵێك شوێنکەوتەی پەیداکردو بانگەوازەکەی لەوشوێنەدا بەردەوام بوو تائەوکاتەی پاشاکانی تورك لەمیسرو پاشاکانی تەتار لەلەعێراق بەهاوکاری یەکتری لەناویان بردن و دەسەڵاتەکەیان لەناوخۆیاندا دابەش کرد وپوکانەوە. گوتەو بیروباوەڕەکانی صەباح لەکتێبی میلەل و نەحلی شەهرستانیدا هاتوون، بەڵام شیعەی (اپناعشری)واتە دوانزەئیمامی کەتەنانەت پاشینەکانیشیان خۆیان بەوناوەوە ناوزەد کردووە، باوەڕیان بەئیمامەتی موسای کازم کوڕی جەعفەری صادق کردووە، چونکە براگەورەکەی ئیسماعیلی ئیمام لەژیانی ئیمام جەعفەری باوکیاندا مردووە، هەربۆیە جەعفەر دانی بەئیمامەتی موسادا ناوە، لەپاش ئەویش کوڕەکەی علی الرزایە کەمەئمون کردیە وەلی عەهدی خۆی، بەڵام ئەو بەرلەمەئمون مرد و وەلی عەهدیەکەی نەگەشتە ئەنجام، لەپاش ئەویش کوڕەکەی محمد تەقی و دواتریش کوڕی ئەو علی الهادی و لەپاش ئەویش کوڕی ئەو حەسەنی عەسکەری و بەشوێن ئەویشدا کوڕەکەی محمد مەهدی چاوەڕوانکراو (منتظر)گەشتنە ئیمامەت، هەمان ئەو مونتەزەرەی کەپێشتر ناومان هێنا.

شیعەکان لەهەریەکە لەم گوفتارو بیروباوەڕانەدا جیاوازیەکی زۆریان هەیەو باسمان لەمەزهەبە بەناوبانگەکانیان کرد و هەرکەسیش کەبیەوێت بەشێوەیەکی چڕوپڕ لەبارەیانەوە شارەزابیێت، ئەوا دەتوانێت کتێبی (ملل ونحل)ی ئیبن حەزم و شهرستانیو کتێبەکانی تر کەلەم بارەیەوە نوسراون بخوێنێتەوە، چونکە بەشێوەیەکی زۆر دوورو درێژ باسیان لێوە کراوە. خوداش هەرکەسێك کەبیەوێت گومڕای دەکات و ئەوەشی کەبیەوێت دەیخاتەسەر ڕێگەی ڕاست و ڕێنمایی دەکات و هەرئەوە خاوەنی پلەی باڵاو گەورەیی.[٢٨٤]

[٢٨٤] (يُضِلُ مَن يَشاءُ وَيَهدِي مَن يَشاء) س النحل ئا ٩٥ ، (وَيهدِي مَن يَشاءُ إِلى صِراطٍ مُستَقِيم) س يونس ئا ٢٦ ، (وَهُوَالعَليُّ الكَبِير) س لقمان ئا ٢٩ ، وەچەندین ئایەتی تری وەك (وَاللهُ يُضِلُ مَن يَشاءُ وَيَهدِي مَن يَشاء).

# بەشی بیست وهەشتەم

## لەبارەی گۆڕان و بوونی خەلافەت بە پاشایەتی

پێویستە ئەوەبزانین کەپاشایەتی بۆعەصەبیەت ئامانجێکی سروشتیە و ڕوودانی لەڕێگەی عەصەبیەتەوە شتێکی ئیختیاری نیە، بەڵکو ڕێکخستن و ڕێکسازی جیهانی بوون ئەوەدەخوازێت‌و شتێکی پێویستەوخۆلادانیش لێی مەحاڵە هەروەك لەبەشەکانی پێشووتردا باسمان کرد. وەلەشەریعەت و ئاینەکانیشدا ئەگەربیانەوێت خەڵکی بکەنە شوێنکەوتەی هەربیرو باوەڕێك ئەوا دەبێت ئەوانەی کە ئەوکارە دەکەن خاوەن عەصەبیەتێکی بەهێزو فراوان بن، هەرچەندە بەدەست هێنانی هەموو خواست‌و ئەنجامدانی هەرکارێکیش پێویستی بەبوونی عەصەبیەت نابێت واتە لەهەندێك شتی بچووك و لاوەکیدا هەروەك پێشتر باسمانکرد. کەواتە عەصەبیەت بۆهەر نەتەوە و مەزهەبێکی (کۆمەڵگە)شتێکی پێویستە و بەهێزی ئەو فەرمانی خودا جێبەجێ دەکرێت و لەنێو خەڵکیدا بلاّو دەبێتەوە، لەصەحیحدا هاتووەکە: (خودا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت ئەوا لەناوهۆز و نەتەوەکەیدا بەڕێزبووە و خەڵکانێك پارێزگارو پشتیوانی بوون.) لەلایەکی ترەوە دەبینین کەشاریع (خودا)عەصەبیەتی بەخراپ باسکردووە و خەڵکی لەسەر وازهێنان لێی هانداوە، هەروەك فەرموویەتی: (خودا خۆبەگەورەزانین و فیزکردنی بەباوباپیرانی سەردەمی جاهیلیەتی لەنێو ئێوەدا نەهێشتووە و ئێوە هەمووتان نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لەخاکە). وەخوداگەورە دەفەرمێت بەڕێزترینتان لەلای خودا

لەخواترسترین و پارێزکار ترینتانە)[٢٨٥]. وەهەروەها ئەوەش دەزانین کەشاریع (خودا)پاشایەتی بەناباش داناوە و لۆمەی خاوەنانی ئەوپلەیەی کردووە و فەرموویەتی بارودۆخی ژیان و گوزەرانی دەوڵەتمەردان و سەرۆکەکان کەبەهۆی خۆشگوزەرانی رابواردنەوەجیاوازیان تێدەکەوێت‌و، لەرێگەی خودا لادەدەن و پەرستشی خودایان لەبیر دەچێتەوەجێگەی پەسەندنیە).

بەڵکو خودای گەورە خەڵکی بانگکردووە بۆلای دۆستی و برایەتی و پێکەوەژیان و لەدووژمنایەتی رق بوونەوە لەیەکتری بەدووریان دەگرێت و، ئاگاداری کردوونەتەوە لەپاشهاتە خراپەکانی تەفرەقە و جیاوازی. وەپێویستە ئەوەش بزانین کەسەرانسەری ئەم جیهانەو ئەحواڵ و چۆنیەتیەکانی لەدیدی شاریعدا وەك ئەسپێك یان شتێکی سواری وایە بۆسەفەری ئەودونیا و هەرکەسیش ئەو ئەسپەیان ئەو شتی سواریە لەدەست بدات چۆن دەتوانێت بگاتە شوێنی مەبەست و مەنزڵی کۆتایی؟. وەمەبەستی شاریع (خودا)لەوەی کەفەرمان بەخەڵکی دەکات کەواز لەهەندێك کردەوە بێنن یان لۆمەیان دەکات لەسەر هەندێك کردەوە، مەبەستی ئەوەنیە ئەوهێزەی ئەوان کەلەئەنجامدانی ئەوکارانەدا بەکاری دەهێنن وایان لێبکات لەناوی بەرن بەڵکو مەبەست ئەوەیە کەهێزی ناوبراو لەکاری چاکە و خزمەت بەمرۆڤایەتیدا بەکاری بهێنن بۆئەوەی هەمووئامانج و مەبەستەکان بەرەو رێگەی حەق هەنگاو هەڵبگرن و، ئامانجی هەمووان یەکێك بێت هەروەك پێغەمبەر(ص)دەفەرمێت: هەرکەسێك رووبکاتە خوداوپێغەمبەرەکەی ئەوا بەوان دەگات، وەهەرکەسێکیش رووبکاتە دونیا ئەویش بەهەمان شێوە دەست دەکەوێت، وەهەرکەسێکیش حەزی لەهەرژنێك بێت پێی دەگات.

کەواتە هەرکەس رووبکاتە هەرشتێك بەدەستی دەکەوێت.خوداش بەوجۆرەی تورەیی بەخراپ نەزانیوە کەبەگشتی لەمرۆڤدا نەمێنێت، چونکە ئەگەربێت و بەوشێوەیە بێت ئەوا سەرکەوتنی هەق و راستی و گەیاندنی بەخەڵك و لەناوبردنی ئەوانەی کەدژی

---

[٢٨٥] (إِنَّ أكرَمَكُم عِندَاللهِ أتقاكُم) س الحجرات ئا ١٣.

دەوەستنەوە و ئومێدی باشبوونیان لێناکرێت هیچ مانایەکی نابێت. بەڵکو توڕەییەك بەخراپ دەزانێت کەلەڕێگە شەیتانیەکاندا بەکاربێت و زیانی دونیاو دواڕۆژی خەڵکی تێدابێت، بەڵام ئەگەر ئەوتوڕەییە لەوشتانەدا کەڕەزامەندی خوداو چاکەی مرۆڤەکانی تێدابێت بەکاربهێنرێت، ئەوا لای خودا پەسەندەو لەسیفەتی پێغەمبەریشە (ص). وەهەروەها بەخراپ زانینی هەواوئارەزووش بەوجۆرەنیە کەبەیەکجاری خودا بەخەڵکی بڵێت ئەوسیفەتە لەخۆیاندا داماڵن، چونکە نەبوونی ئەوغەریزەیە لەمرۆڤدا وەك ناتەواوی لەمرۆڤدا دەژمێردرێت، بەڵکو بەکارهێنانی غەریزە و هەواوئارەزوەکان لەوشتانەی کەخودا بەدروستیان دەزانێت و لەبەرژەوەندی مرۆڤدایە ڕێگە پێدراوە ئەمەش بۆئەوەیە کەبەردەوام مرۆڤ لەڕیزی ئەکەسانەدابێت کەهەڵسوکەوتیان بەپێی ڕێنماییەکانی خودان. دەتوانین عەصەبیەتیش بەم شێوەیە هەڵبسەنگێنین لەوشوێنەی کەشاریع بەناباشی زانیوە و فەرموویەتی: (پەیوەندیە خزمایەتی و منداڵ و نەوەکانتان هیچ سودێکیان بۆئێوە نابێت)[٢٨٦] لێرەدا مەبەست ئەوعەصەبیەتەیە کەلەسەر خراپەو لەڕێگەی خراپەدا سودی لێوەربگیرێت، واتە بەپێی داب و نەریتە خراپ و ناپەسەندەکان بێت هەروەك چۆن لەسەردەمی نەفامیدا (جاهیلی)شانازی و خۆهەڵکێشان بەماڵ و سامان و نەوە و وەچەی زۆرەوە کراوە و ئەوەی خاوەنی وەها شتێك بوبێت شانازی بەسەر ئەوی دیدا کردووە و، ئەمەش ئەوجۆرە عەصەبیەتەیە کەبەلای خوداوە ناپەسەندە و لەبەرژەوەندی دواڕۆژی مرۆڤەکاندانیە، بەڵام ئەگەر عەصەبیەت لەڕێگەی حەق و بەرقەرارکردنی فەرمانی خودادا بێت کارێکی جوان و پەسەندە و، ئەگەر لەناویش بچێت ئەوا هەق وشەریعەتیش لەناو دەچێت، لەبەر ئەوەی هەروەك لەڕابووردودا باسمانکرد پایەو کۆڵەکەی شەریعەتەکان تەنها لەڕێگەی عەصەبیەتەوە مەحکەم و بەهێز دەبن.

وەهەروەها شاریع ئەودەسەڵاتەی کەلەسەر یاساو ڕێساکانی خوەدا دامەزرابێت و ڕەچاوی بەرژەوەندیەکانی خەڵکی بکات بەناباشی نەزانیوە، بەڵکو دەسەڵات و دەوڵەتێك

---

[٢٨٦] (لَن تَنفَعَكُم أرحامُكُم وَلَا أولادُكُم) س الممتحنة ئا ٣ .

بەخراپ دەزانێت کەلەرێگەی یاساو رێسا ناپەسەندەکانەوە دامەزرابێت و، سەرۆکەکەی بەپێی هەواو ئارەزووی خۆی و بەپێچەوانەی فەرمانی خوداوە فەرمان بکات، بەڵام ئەگەر فەرمان ودەسەلاتی پاشا بەپێی یاساکانی خوداو فەرمانەکانی ئەوبێت ئەوا خودا بەگەورەییەوە باسی دەکات، هەروەك چۆن خودا لەچیرۆکی سولەیمان پێغەمبەردا دەفەرمێت: خودا دەسەلاتێکم پێ ببەخشە کەلەپاش من بەکەسی تری نەدەی.[287] چونکە ئەو خۆی دەناسی و دەیزانی لەخراپەوە بەدوورە. وەهەروەها کاتێك خەلیفە عومەرهات بۆ شام و موعاویە بەشێوەیەکی پاشایانەو شان و شکۆیەکی زۆرەوە چوە پێشوازی کردنی خەلیفە، حەزرەتی عومەرئەم بارودۆخەی بەلاوە ناپەسەندبوو پێی گووت: ئەی موعاویە ئایاخۆت وەکو پاشاکانی فارس لێکردووەو بەکیسرەویەت دەجولێیتەوە؟ موعاویەش لەوەلامدا گووتی گەورەم من هاوسنورم لەگەڵ دووژمنەکانماندا و ئەمە پێویستە بۆئەوەی لەبەرامبەر فێزو هەوای ئەوانەوە ئێمەش خۆمان هەڵبکێشین. عومەر بێدەنگ بوو کارەکەی موعاویەی بەناپەسەند نەدایە قەڵەم، چونکەئەوبەڵگەی بەیەکێك لەمەقصەدو مەبەستەکانی شەریعەت هێنایەوە. ئەمەئەگەر لێرەدا مەبەستی خەلیفە بەخراپ باسکردنی پاشایەتی بوایا بەشێوەیەکی رەها ئەوا لەبەرامبەر قسەکانی موعاویەدا بێدەنگ نەدەبوو.

مەبەستی حەزرەتی عومەریش لەکیسرەویەت پاشایەتی کردنی خراپ بووە کەئێرانیەکان لەدەوڵەتداریدا بەکاریان هێناوە وەك خراپە و ستەمکردن و دووری و بێئاگایی لەخودا مەعاویەش وەلامی دایەوە مەبەست لەم پلەوپایەو شکۆیە، خۆچواندن بەپاشاکانی ئێران و کردارەکانیانەوەنیە، بەڵکو مەبەست و ئامانجی ئەو لەرێگەی خودادا بووە. هەربۆیە عومەر بێدەنگ بوو. بارودۆخی صەحابەش بەم شێوەیە بووە. ئەوان دەوڵەتداری چۆنیە تیەکەیان وازلێ هێنابوو نەوەك بکەونە هەڵەو تاوانەوە و لەوکاتەی کەپێغەمبەری خودا لەکاتی گیانەلادا بوو ئەبوبەکری بۆپێشنوێژی دیاری کرد، چونکە

---

[287] (ربِّ اغفِرلِي وَهَب لِي مُلكاً لايَنبَغِي لأحَدٍ مِن بَعدِي) س ص ئا ٣٤ .

نوێژ لەگرنگترین پایەکانی ئاین دەژمێردرێت. ئەبوبەکریش بەشێوەیەکی باش بەوکارە هەستاو فەرمانەکانی خودای بەجێ گەیاندو لەگەڵ هەڵگەڕاوە و بێباوەڕاند جەنگاو بوویە هۆی ئەوەی کەنەتەوەی ئیسلام لەدەوری ئاینەکەیان کۆببنەوە و یەکگرتووبن. لەپاش ئەویش حەزرەتی عومەر ئەوئەرکەی گرتە ئەستۆو لەگەڵ گەلانی تردا دەستی کردە جەنگ و زاڵبوو بەسەر یاندا و، داگیرکردنی ماڵ سامان و دارایی ئەو نەتەوانەی کەبەجەنگ داگیریان دەکردن بەڕەوا دایە قەڵەم بۆیان. لەپاش ئەویش خەلافەت کەوتە دەستی عوسمانی کوڕی عەفان و لەدوای ئەویش عەلی و بوویە خەلیفە و هەموویان لەپاشایەتی دوور دەکەوتنەوە و بەهۆی تازەیی ئیسلام لەنێو عەرەبدا خووی دەشتەکیەتیان بەبەهێزی تێدا مابوویەوە.

هەربۆیە بەگشتی لەخۆشگوزەرانیەوە دوور بوون ئیتر لەبەر فەرمانی ئاینەکەیان بێت یان بەهۆی خووی دەشتەکیەتەوەبێت. هەروەك چۆن هۆزی موزەر لەهەموو هۆزەکانی دونیا بەسەختی ژیانیان دەگوزەراند، چونکە ئەوان لەحیجازدا دەژیان زەویەکی خاڵی بووە لەئاوەدانی و سەوزایی زۆر کەهۆکارێك بووە بۆ ماڵاتداریەکی باش. سەرەڕای ئەمەش شوێنەبەپیتەکانی ئەم ناوچەیە لەژێردەستی هۆزەکانی ڕەبیعەو یەمەندابووە و هیچ سودێکی بۆئەمان نەبووە نەیاندەتوانی بگەنە ئەوناوچانە. وەبەزۆریش قالۆنچەو جۆرێك لەخواردن کەلەکاتی قاتوقڕیدا دەخورێت و شانازیان بەخواردنی (علهزەوە)[٢٨٨] کەبریتیە لەخوری و پێستەی حوشتر و لەگەڵ خوێندا تێکەڵ دەکرێت و، لەسەر بەردێك بەیەکەوە دەکوترێن‌و، دواتر لێدەنرێت و دەخورێت. بارودۆخی عەرەبیش وەك موزەڕ وابوو تاوەکو ئەوکاتەی کەلەژێرئاڵای ئایندا عەصەبیەتی عەرەب زاڵبوو بەسەر عەصەبیەتەکانی تردا، ئەمەش بەهۆی فەزڵ و گەورەیی پێغەمبەرەوە (ص)بوو کەلەنێویاندا خودا ئەرکی بانگەوازی پێ سپارد.

---

[٢٨٨] دەکرد کە لەخوێن و خوری دروستدەکرێت و لەتەنگدەستی زۆردا بەکار دەهێنرێت.

هەربۆیە بەپێی ئەو بەڵێنەی کەخودا پێی دابوون دەسەلآتیان پەیدا کردوو هێرشیان کردە سەر ئیمپراتۆریەتەکانی ئێران و ڕۆم و داگیریان کردن و بوونە خاوەنی نزیکەی سی هەزار دیناری ئاڵتون و، بارو دۆخی ژیانیان بەرەوباشتر چوو، بەڵام دیسانەوە سەرکردەو زۆربەی خەڵکەکەشیان لەسەر ئەو ژیانە زبرە مانەوە هەروەك چۆن عومەر پۆشاکەکەی لەپێستی حەیوانات بووعلی پێی دەگووت بۆشتێکی ترلەبەرناکەیت. ئەبوموسا مریشکی نەدەخواردچونکەخواردنی مریش لەنێوعەرەبدا شتێکی باونەبوو بەهۆی نایابیەکەیەوە. لەگەڵ ئەوەی کەنانی ئاردی گەنمیان دەخوارد، بەڵام بەبەراورد بەوسامانەی کەبەدەستیان هێنابوو خۆشگوزەرانیان نەبوو. مەسعودی دەڵێت: لەسەردەمی عوسماندا هاوەڵانی پێغەمبەرماڵ وسامانێکی زۆریان بەدەست هێنا هەروەك چۆن لەو ڕۆژەی عوسمان کوژرا لای خەزێنەدارەکەی سەدوپەنجاهەزاردینارو، یەك ملیۆن دیرهەم هەبوو بەهای سامانەکەی لەوادی القری‌و[289] حونەین‌و[290] ناوچەکانی تردا دووسەدهەزار دیناربووە، حوشترو ئەسپگەلێکی زۆرو زەوەندی هەبووە، یەك لەسەر هەشتی یەکێك لەبەشە موڵکەکانی زوبەیر لەپاش مردنی پەنجاهەزار دیناربووە نزیکەی هەزار ئەسپ و هەزار کەنیزەکیشی لەپاش خۆی بەجێهێشتووە، دەرامەتی تەلحەش لەعێراق لەهەر ڕۆژێکدا هەزاردینارو لەناوچەی شراتیش لەم برە زیاتر بووە.

لەگەوری عبدالرحمانی کوڕی عەوفدا هەزارئەسپ و حوشتری تێدابووە و خاوەنی نزیکەی دەهەزار سەرمەڕ و، وە یەك لەسەر چواری ئەوەی کەلەپاش مەرگی بەجێی هێشت نزیکەی هەشتاوچوار هەزار دیناری ئاڵتوون بووە، زەیدی کوڕی سابیتیش هەندێك شمشی ئاڵتوونی لەپاش خۆی بەجێ هێشت کەبەتەور دەیانشکاندن ئەمەش سەرەڕای ئەوماڵ و سامانەی کەبەهاکەی دەگەیشتە سەدهەزرار دیناری ئاڵتوون، زوبەیر خانوویەکی لەبەصرەو یەکێکی لەکوفەو یەکێکی تریشی لەمیسرو دانەیەکیشی

---

[289] شوێنێکە لەنزیك مەدینە.

[290] شوێنێکە لەنێوان تائیف و مەککەدا.

لەئەسکەندەریە هەبوو، هەروەها تەلحەش خانوویەکی لەکوفەو دانەیەکیشی لەلەمەدینەلە گەچ و خشتوو داری ساج دروست کردبوو.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەعەقیق[٢٩١] دا خانوویەکی بۆخۆی دروستکرد کەسەقفێکی بەرزو ڕووبەرێکی زۆر فراوانی هەبوو. میقدادیش خانوویەکی بۆخۆی لەمەدینەدا دروستکردبووکەلەناوە و دەرەوە گەچ کاری کرابوو، وە یعلی کوڕی مونەبیە پەنجا هەزاردیناری ئاڵتوون و هەندێك زەوی و زاری بەرئاوی لەپاش خۆی بەجێهێشت و ماڵ و سامانەکەی تریشی سێ سەد هەزرا دیرهەم بوو، ئەمەش کۆتایی قسەکەی مەسعودی بوو. کەواتە هەروەك بینیمان ئەوماڵ و سامانەی کەنەتەوەی عەرەب بەدەستیان هێنابوو بەم شێوەیە بوو کەباسمانکرد و ناتوانین ئەوان لەڕوانگەی ئاینەوە سەرزەنشت بکەین، چونکە سەروەتەکەیان ماڵ و سامانێکی حەڵاڵ بوو کەوەك غەنیمەت دەستیان کەوتبوو بازرگانیشیان پێوە کردووە و لەبەکارهێنانی ئەم سامانەشدا ئیسراف‌و زیادەڕۆییان نەکردووە، بەڵکو هەروەك گوتمان لەژیانی ڕۆژانەیاندا مام ناوەند بوون. هەربۆیە خاوەنداریەتی ماڵ و سامان بۆئەمان ناپەسەند نەبووەو ئەگەر ماڵ و سامانی دونیا بەناباش وەصف کرابێت هەروەك باسمانکرد بەهۆی بەکارهێنانیەوە بووە لەشتانێکدا کە لەجێگەی ڕەزامەندی خوداو لەبەرژەوەندی بەندەکانیدا نەبووە، وەگەرنا ماڵ و دارایی بەهێزترین هاوکارو هۆکارە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی هەق و دادگەری کۆمەڵایەتی لەنێوخەڵکیدا، هاوەڵان دەسەڵات و زاڵبوون و هێزەکەیان بەسەر نەتەوەکانی تردا لەڕێگەی باش و حەق و ڕاستیدا بەکار هێنا هەربۆیە دەرووی خێریان لێکرایەوە و ژیانیان بەرەو خۆشگوزەرانی هەنگاوی هەڵگرت و، بوونە سەروەرو سەرداری جیهانی سەردەمی خۆیان. هەربۆیە دەبینین لەوکاتەی کەلەنێوان علی و موعاویەدا کێشە دروستدەبێت و دەگاتە کوشت و کوشتار لەسەر شتی دونیایی و بەتاڵ نەبوو، بەڵکو ئەوان واتە علی و موعاویە لەڕوانگەی ئیجتیهاد لەڕێگەی حەقدا بووەو مەبەستی خراپیان

---

[٢٩١] ناوی چەند شوێنێکە لەمەدینەو یەمامە توهامە تائیف و نەجد و ...هتد.

نەبووە، بەڵکو ئەو ئاوازی حەقی بەرز کردەوە، بەڵام لەپێکانی حەقدا هەڵەی کرد، بەڵام مەبەستەکانی هەموویان حەق بوون، چونکە ئەوکات سروشتی دەوڵەتداری خوازیاری دەسەڵاتی ڕەهابووە و دەبوایە یەك کەس فەرمانڕەوایی لەدەستدا بوایە و نەدەکرا موعاویە ئەم پلەوپایەیە لەخۆیو هۆزەکەی دووربکاتەوە چونکە ئەمە لەشتە سروشتیەکانی دەسەڵاتداری بووە و، تایبەتمەندی و سروشتی عەصەبیەتیش ئەوی بەرەو لای ئەومەبەستە کەمەندکێش دەکرد و خانەدانی ئەمەویەکان ئەم ئەرکەیان بەوسپارد، بەجۆرێك هەرکەس لەومەسەلەیەدا دژبوایە یاخود پشتگیری موعاویە نەبوایە ئەوا لەهۆزەکە دەریان دەکرد و، لەم پێناوەشدا ئامادەی گیان بەخت کردن بوون و ئەگەر موعاویەش بەدەر لەمکارەی بکردایە، واتە پێداگری لەسەر حکومەتی ڕەها نەکردایە ئەوا باوەڕدارانی شوێنکەوتەی توشی لێکترازان و، پارچە پارچەیی دەبوون ئەمەلە کاتێکدا پاراستنی یەکپارچەیی و یەکگرتوویی گرنکتر بوو لەوکارەی کەمێندە دژایەتیشی نەدەکرا.

عومەری کوڕی عبدالعزیز خودای لێ ڕازی بێت کاتێك قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبی بەکری دەبینی دەیگوت: (ئەگەر بمتوانیایە ئەواخەلافەتم بەودەسپارد) وەئەگە ناچاربکرایە کەئەو لەجێگەی خۆی دابنێت ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەوکارەی دەکرد، بەڵام عومەر لەخانەدانی ئەمەویەکان دەترسا بەهۆی ئەوەی کەکاروباری حەل و عەقد لەدەستی ئەواندابوو، هەربۆیە موعاویەش نەیتوانیوە خەلافەت لەئەمەویەکان بسەنێتەوەو بیداتە کەسێکی تر نەوەك جیاوازی دروست ببێت. پابەندبوونی ئەوبەهەموو ئەمانەوە دڵبەندیە بەئامانجەکانی پاشایەتیەوە کەپێویستیەکی عەصەبیەتە هەربۆیە هەر کات گەلێك بگەنە پاشایەتی ودەوڵەتداری و وادابنێین کەیەك کەس فەرمانڕەواییەکەی تایبەت بکات بەخۆیە وە و، دەوڵەتی ڕەها بچەسپێنێتو لەڕێگەی حەق و ڕاستیدا هەنگاو هەڵبگرێت، ناتوانین بەم پاشایە بڵێین خراپ و ناپەسەند، هەروەك چۆن سولەیمان و باوکی داوود (ص)بەپێی داخوازیەکانی سروشتو پێداویستیەکانی پاشایەتی کەوا

دەخوازێت پاشا لەقۆناغێکی تایبەتدا بگاتە فەرمانڕە وایی ڕەهاو، لەوولاتی بەنی ئیسرائیلدا سەڵتەنەتی ڕەهایان بنیات ناو هەروەك دەزانین پلەی پێغەمبەرایەتیشیان هەبوو لەسەر ڕێگەی ڕاستیش دەڕۆشتن.

هەروەها موعاویەش یەزیدی لەجێگەی خۆی دانا نەوەك جیاوازی پارچە پارچەیی لەنێو موسوڵما ناندا ڕووبدات، چونکە خانەدانی ئەمەویەکان تەنها ئەیانویست خۆیان لەخەلافەتدابن، هەربۆیە ئەگەر موعاویە کەسێکی تری بۆئەو شوێنە بێجگەلە یەزید دیاری بکردایە ئەوا دژایەتیان دەکرد و ئەمەش لەکاتێکدا هەموویان گومانی باشیان بەرامبەر بەیەزید هەبووکە سیش لەم بارەیەوە هیچ گومانێکی نەبوو، موعاویەش یەزیدی بەباش دەزانی بۆئەم پۆستەو ئەگەربیزانیایە کەسێکی گوناهبارە هیچ کات ئەم کارەی نەدەکردو، هەربۆیە ناتوانین لەبارەی موعاویەوە غەیری ئەم گومانەبەرین وبیرێکی لەوشێوەیە بکەینەوە. هەروەها مەروانی کوڕی حەکەم و کوڕەکەیشی هەرچەندەپاشایش بوون، بەڵام لەکارەکەیاندا بەهەواوئارەزووهەڵسوکەوتیان نەکردووە و لەستەمکاران نەبوون، بەڵکولەدۆزینەوەی ڕێگەی حەقدا ئەوپەڕی هەڵیان داوە و بێجگەلە هەندێك شوێن نەبێت ئەویش لەترسی دووڕوویی و دروستبوونی جیاوازی لەم ڕێڕەوەلایان نەداوە چونکە پاراستنی یەکیەتی لەنێو موسوڵماناندا بەلایانەوە لەهەمووشتێك گرنگتربووە، بەڵگەش لەسەر ئەمەشێوازی هەڵسووکەتیان بووە لەپەیڕەوی کردنی بنەما شەرعیەکانداو ئەوچاکەو گەورەییەی کەسەلەف لەبارەیانەوە گێڕاویانەتەوە، هەروەك مالیك کەلەمۆتائدا بەڵگەی بەهەڵسووکەوتەکانی عبدالملك هێناوەتەوە.

بەڵام مەروان کەسێك بوو کەلەچینی یەکەمی تابیعین دەژمێردرا و، دادپەروەری تابیعینیش بەناوبانگە. لەپاشان بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك پاشایەتی گەشتەهەموو نەوەکانی عبدالملك و هەمووشیان لەئاین پەروەریدا لەسەر ڕێڕەوی باوباپیرانیان بوون. تاوەکو نۆبەی عومەری کوڕی عبدالعزیزهات کەدەکەوێتە ناوەڕاستی ئەم زنجیرەیەوە واتە حەوت کەس لەپێش ئەوەوە خەلافەتی ئەمەویەکانیان کردبوو شەش کەسیش

لەدوای ئەوگەشتنە کورسی خەلافەت. ئەویش ئەوپەڕی هەوڵ و کۆششی کرد تاوەکو لەسەر ڕێڕەوی چوارخەلیفەکەی پێغەمبەر هەنگاو هەڵبگرێت و لەپەیرەوی کردنیاندا هیچ موساوەمەیەکی نەدەکرد، بەڵام لەدوای ئەوانەوە نەوەکانی ئەمان بوون کەخەلافەتیان لەگەڵ پاشایەتیدا تێکەڵ کرد و ئەوهەڵسووکەوتەجوانەی کەپێشینانیان لەسەری بوون وەك: لەزۆربەی کاتەکاندا گومانی باش بردن و میانەڕەوی و پشت بەستن بەحەق لەشێوازەکانیدا، لەبیریان چوویەوە و ئەم شێوازەی هەڵسووکەوتیان بوویە هۆی ئەوەی کەخەڵکی سەرزەنشتی هەڵسووکەوتەکانیان بکەن و سەرئەنجام خەلافەت کەوتە دەستی پیاوانی عەباسیەکان. ئەوان لەدادگەریدا لەپلەیەکدابوون کەهەمووان دەیزانین و هەرچەندە لە توانایاندا هەبوبێت پاشایەتیان لەڕێگەی حەقدا بەکارهێناوە، تاوەکو نۆبەی مندالآنی ڕەشید (هارون)هات کەلەنێویاندا باش و خراپ هەبوون و، لەپاش ئەوانیش خەلافەت کەوتە دەستی کوڕەکانیان و پاشایەتی و نازو نیعمەتیان گەیاندە لوتکە و لەکاری بەتاڵی دونیایدا ڕۆچوون و ئاینیان خستەلاوە و تاوەکو خودا دەسەڵاتی لێ سەندنەوە هێزو دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بەخشیە کەسانێکی تر.

(خودا مسقالە زەڕەیەك ستەم لەکەس ناکات).[٢٩٢] هەرکەسێکیش لەژیاننامەی ئەو خەلیفانە وورد ببێتەوە ڕاستیەتی ئەوەی کەئێمە باسمانکرد بۆی دەردەکەوێت، مەسعودی هاوشێوەی ئەم بابەتەیشی لەبارەی بارودۆخی ئەمەویەکانەوە لەئەبوجەعفەری مەنصورە وە گێڕاوە تەوە: کاتێك کەمامەکانی ئەبوجەعفەر ئامادەبوون‌و باسی ئەمەویەکانیان کردووە ئەوگوتویەتی: عبدالملك زاڵم بووە و لەکارەکانیدا هیچ ترس و باکێکی نەبووە، بەڵام سولەیمان هەموو خەمێکی ووزگی و عەورەتی بوو، وەعومەریش کەپیاوێکی یەك چاوبوو لەنێوکوێرەکاندا پیاوی گەورەی ئەوهۆزەی هیشام بوو. گووتی: ئەمەویەکان ئەودەسەڵاتەی کەبۆیان بنیات نرابوو بەباشی پارێزگاریان لێدەکردو ئەوەی کەخودا لەبەخششەکانی فەرمانڕەوایی بەوانی

---

[٢٩٢] (إنَّ اللهَ لايَظلِمُ مِثقالَ ذَرَةٍ) س النساء ئا ٤٠.

دابوو پاراستیان و کاری باش و پەسەندیان ئەنجام دەداو، تاگەشتە ئەوکاتەی کەنەوە هەواوئارەزوو پەرستەکانیان گەشتنە خەلافەت و لەنازو نیعمەتداغرق بوون. ئەمانە تەنها سەرقاڵی هەواو ئارەزووەکانیان بوون و بەردەوام نافەرمانی خودایان دەکرد و بێ خەبەر بوون لەوەی کەغەزەبی خودایان بەسەردا دەبارێت و، وازیان لەڕێزی پلەوپایەی خەلافەت هێنابوو بەکەم سەیریان دەکردوو لەسیاسەتی دەوڵەتداریدا سستی و زەبوونیان دەنواند. هەربۆیە خودا ڕێزو گەورەیی لێوەرگرتنەوەوبەرگی سەرشۆڕی و زەلیلی بەبەردا کردن و لەنیعمەت بێبەشی کردن.[293] ئەوکات ئەبوجەعفەر عبداللەی کوڕی مەروان کەکۆتا خەلیفەی ئەمەویەکانە بانگکردو ئەوداستانی چاوپێکەوتنەکەی خۆی لەگەڵ پاشای نوبە لەوکاتەی کەلەترسی عەباسیەکان پەنای هێنابووە وولاتەکەی ئەو، بەم شێوەیە گێڕایەوە: بۆماوەیەك چاوەڕوانم کرد ئەوکات پاشای ئەو وولاتە هاتەلای من و لەسەر زەویەکەدانیشت، ئەمەلەکاتێکدا فەرشی گرانبەها بۆمن ڕاخرابوو.

پرسیم بۆچی لەسەر فەرشەکان دانەنیشتی؟ گووتی من پاشام و باش نیە کەپاشا لەبەرامبەر گەورەیی خوداوە کەئەوی گەیاندووەتە ئەوپلەیە بێشەرمی بکات، ئەوکات بەمنی گووت بۆچی ئێوە بادە دەنۆشن لەکاتێکدا مەی نۆشین لەئاینەکەتاندا حەرام و قەدەغەکراوە؟ منیش گووتم بەندەو خزمەتکارەکانمان بەهۆی نەفامیانەوە ئەم شتانەمان بۆ ئامادەدەکەن. ئەویش پرسی: ئەی کەواتە بۆچی جلوبەرگ و مێزەری ڕازاوەبەزێڕو زیو دەپۆشن و لەسەر دەکەن لەگەڵ ئەوەی کەبەپێی کتێبەکەتان حەرام کراوە؟

لەوەڵامدا گووتم پاشایی لەدەست دەرچوو ئێمەلەگروپێکی غەیرە عەرەبەوە یارمەتیمان خواست و ئەوانیش بەپێچەوانەی حەزی ئێمەوە پۆشاکیاکیان لەبەردەکرد. ئەوکات پاشای نوبە سەری داخستو بەدەستی لەسەر زەوی خەتی دەکێشا وبەخۆی دەگووت بەندەو خزمەتکارەکانمان؟ وەئەوبێگانانەی کەهاتوونەتە سەرئاینی ئێمە؟

---

[293] (سَنَستَدرِجُهُم مِنْ حَيثُ لايَعلَمُون) س اعراف ئا ١٨١ و ١٨٢. (وَأُملِي لَهُم إِنَّ كَيدى مَتِين) س القلم ئا ٤٤-٤٥.

لەپاشان سەری بەرزکردەوە سەیرێکی منی کردوو لەپاشان گووتی: ئەوەی کەگووتت وانیە، بەڵکو ئێوە نەتەوەیەکن ئەوەی خودا لێی حەرام کردوون ئێوە حەلاڵتان کردووە بۆخۆ تان و کاروکردەوەیەك دەکەن کەبەلای خوداوە ناپەسەندە و، لەو وولاتانەی کەداگیرتان کردووە ستەمدەکەن، هەربۆیە خودا گەورەیی پاشا یەتی و سەروەری لەئێوە سەندوەتەوە و سەرشۆڕو زەلیلی کردوون و هێشتا تۆڵەی خوداماوەلێتانی بکاتەوە و لەوەدەترسم لەوکاتەی کەلە وولاتی مندان تۆڵەی خودا بەسەرتاندا دابارێت و بەهۆی ئێوەشەوە ئەوسزایە بەرۆکی منیش بگرێت. ئەڵبەت میوانی لەسێ ڕۆژ زیاتر نیە، هەرچیەکت دەوێت بیبەو لەوولاتی من برۆرە دەرەوە. مەنصور لەم بەسەرهاتە سەری سوڕماو چووە ناوبیرکردنەوەوە. لەوەی کەڕابورد ئەوە دەرکەوت کەچۆن خەلافەت دەگۆڕێت بەپاشایەتیو ئەوەشمان زانی کەحاکمیەت لەسەرەتادا هەمان ئەوخەلافەتە بووەو حاکیم و بەرپەرچ دەرەوەی هەرکەسێك بریتی بووە لەوەی کەلەوویژدانی خۆیاندا هەڵقوڵاوە ئەویش بریتیە لەئاین کەلەکاروبارە دونیاییەکان زیاتر گرنگیان پێدەدا، هەرچەندە لەبەر بەرژەوەندی گشتی دەبووە هۆی لەناوچوونی یەکێکیان. بۆنمونە باسی خەلیفە عوسمان دەکەین کەچۆن لەماڵەکەیدا گەمارۆ دراو حەسەن و حوسەینو، عبداللەی کوڕی عومەر و ئیبن جەعفەر هەرچەندە تکایان لێکرد کەبابەرگری لێ بکەن، بەڵام ئەو ڕێگەی نەدان و نەهێشت شمشێر لەناوموسوڵماناندا هەڵبکێشرێت، ئەمەش لەترسی ئەوەبوو نەوەك ببێتە هۆی دووبەرەکی و فیتنە لەنێویاندا بۆپاراستنی یەکبوونو یەکیەتی نێوانیان، هەرچەندە دەیزانی ئەم کارەشی لەکۆتایدا دەبێتە هۆی شەهیدبوونی. وەهەروەهائەگەر عەلی خوای لێ ڕازی بێت بگرین کەلەسەرەتای خەلافەتەکەیەوە موغەیرە پێی گووت کەدەبێت زوبێرو موعاویەو تەلحە لەسەر پۆستەکانیان بهێڵێتەوە، بۆئەوەی هەموویان بەیعەتی پێبکەن و یەکرێزی موسوڵمانان پارێزراوبێت، بۆئەوەی لەپاش بەیعەت هەرچیەکی بیەوێت بیکات ئەم پێشنیارەش بەتەواوەتی شتێکی

پاشایانەبوو، بەڵام علی خوای لێ ڕازی بێت بەمە ڕازی نەبوو هەوڵی ڕاکردنیدا لەساختەکاری کەلەگەڵ ئیسلامدادەداو بە نەگونجاوی دەزانی.

ئەوەبوو دواتر موغەیرە بەخۆیی و شوێنکەوتووەکانیەوە هاتەلای علی و پێی گووت دوێنێ پێشنیارێکم بۆکردی، بەڵام دواتر زانیم من لەهەڵەدابووم و تۆ لەسەرحەق بووی. عەلیش گووتی: نەبەخودا من دوێنی دڵنیابووم تۆ مەبەستت چاکەبوو، بەڵام ئێستەدەبینم هانی من لەسەر پێچەوانەی ئەوشتەی کە لەدڵتدایە دەدەی، بەڵام بەرگری وپارێزگاری لەحەقیقەت منی والێکرد لەپرس و ڕای تۆ بەدووربم. ئەحواڵی ئەو گەورانە بەم شێوەیە بووە کەلەبەر بەرژەوەندی ئاین دونیایان لەدەستدەدا، بەڵام ئێمە: دونیامان دەبەستینەوە بەلەت کردنی ئاینەکەمانەوە، هەربۆیە نەدینمان دەمێنێتەوەو نەئەوەیشی کەدەیبەستینەوە. (دووبەیت لەشیعرەکانی جاحیزی شاعیری عەرەبە)بەم شێوەیە بینیمان چۆن خەلافەت بەرەوپاشایەتی ڕۆشتوە، بەڵام لەهەمان گاتدا ماناو مەبەستەباڵاکانی خەلافەت لەجێی خۆیاندا ماونەتەوە هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نەهاتووە، بێجگە لەحاکیم و بەرپەرچ دەرەوە کەئەوکات ئاین بوو، بەڵام دواتر عەصەبیەت و شمشێر شوێنی گرتەوە و بارودۆخی خەلافەت لەسەردەمی موعاویەو عبدالملکی کوڕیدا هەرلەسەرەتای خەلافەتی عەباسیەکانەوە تاوەکو سەردەمی هارونەڕەشیدو، هەندێك لەنەوەکانی گۆڕا بەوشێوەیە و دواتر ماناکانی خەلافەت بەتەواوەتی لەناوچوون و تەنها ناوەکەی مایەوە و، خەلافەت بەگشتی گۆڕا بۆ سەڵتەنەتو سروشتی هێزخوازی و فراوانخوازی گەشتە ئەوپەڕی و ئامانجەکان تایبەتکران بەهەواوئارەزوو دەسەڵاتەوە و، بارودۆخی نەوەکانی عبدالملك و ڕەشیدیش کەلەخانەدانی عەباسیەکان بوون و ئەوانەشی کەلەپاشانەوان هاتن هەربەم شێوەیە بوو تەنها ناوی خەلافەت ئەویش بەهۆی عەصەبیەتی عەرەبەوەلەنێویاندا مابوویەوە و دووقۆناغی پاشایەتی بەتەواوی لەیەك دەچوون.

ئەوکات ڕەسمی خەلافەتیش بەهۆی لەناوچوونی عەصەبیەت و نابووت بوونی نەژادی عەرەب و پەرش و بڵاوبوونی داب و نەریتەکانیانەوە بەتەواوەتی خەلافەت وەك سەڵتەنەتی ڕەهای لێهات. هەروەك چۆن بارودۆخی پاشکانی ئێران لەخۆرهەلاتدا بەم شێوەیەبوو تەنها لەبەر پیرۆزی باوەڕیان بەگوێڕایەڵی خەلیفە هەبوو، بەلام کاروبارە گشتی و تایبەتیەکان هەمووی پەیوەست بوون بەخۆیانەوە و خەلیفەهیچ دەسەلاتێکی نەبوو. بارودۆخی پاشاکانی زناتەی مەغریب وەك صەنهاجە لەبەرامبەر خەلیفەکانی عبیدیەکانەوە (فاتیمیەکان). وە مغراوە و بەنی یفرن و لەگەڵ خەلیفەکانی بەنی ئومەییەی ئەندەلوس و عبیدیەکان و قەیرەوان لەسەر هەمان شێوەبوو. کەواتە ئەوەئاشکرابوو کەسەرەتا خەلافەت بووە و دواتر پاشایەتی دروست بووە و مەبەست و ئامانجەکانیان لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ و ئاوێتەی یەکتری بوون. لەپاشان کاتێك عەصەبیەتی پاشایەتی لەعەصەبیەتی خەلافەت جیابوویەوە گۆڕا بۆسەڵتەنەتی ڕەها. خوداش ئەندازەگیری شەوو ڕۆژە هەرئەوە تەنها خاوەن هێز.

# بەشی بیست و نۆیەم

## لەبارەی مانای بەیعەت ( عەهد و پەیمان )

دەبێت ئەوەبزانین کەبەیعەت بریتیە لەپەیمانبەستن بەفەرمانبەری و گوێڕایەڵیی کەبەیعەت کار لەگەڵ ئەمیری خۆیدا دەیبەستێت و، لەبارەی کاروبارەکانی پەیوەست بەخۆی و موسوڵمانانەوە تەسلیمی دیدی خەلیفە دەبێت و لەهیچ کاروبارێکدا دژایەتی ناوبراو نەکات و ئەوئەرکانەی کەدیخاتەسەرشانی بەباشی گوێڕایەڵی بکات و ئەنجامیان بدات، ئیتر ئەوتەکلیفە بەدڵی بێت یان بەپێچەوانەوەبێت. وەباویش بووکەهەرکاتێك بەیعەتیان لەگەڵ ئەمیردا بکردایە دەستیان دەخستەناودەستیەوە و وەك کاری فرۆشیارو کڕیار وابووە پێیان گووتووە (بیعت)کەمەصدەرو چاوگی (باع)یە لەزمانی عەرەبیدا کەمانای کڕین و فرۆشتن دەکات و، تەوقەکردن بەدەست دەبوویە بەیعەت لەومەراسیمە تایبەتەدا و مانای لەزمانەوانی و بەکارهێنانی شەرعدا هەرئەمەیە. وەلەبارەی حەدیسی بەیعەتی پێغەمبەرەوە (ص)لەشەوی عەقەب[٢٩٤] نزیك درەختەکەوە[٢٩٥] هەربۆیە هەرکاتێك دەستەواژەی بەیعەت بەکاربهێنرێت یەکسەر مرۆڤ بیری دەچێت بۆلای ئەوبەیعەتەی کەهاوەڵان بەپێغەمبەری (ص)ئیسلامیان دابوو، خەلیفەکانیش لەبەیعەتی موسوڵماناندا

---

[٢٩٤] بەیعەتی عەقەبەی یەکەم دوانزە کەس بەیعەتیان بەپێغەمبەر کردو بۆ ساڵی دووەمیش حەفتا کەس بەیعەتیاندا و حەدیسەکەش بەم شێوەیە (لقدشهدت ليلةالعقبة وما احب بدرا بدلها لان هذةالبيعةكانت اول الالسلام) (فهرست سيرەت ابن هيشام بەرگی دووە).

[٢٩٥] (إِذ يُبايِعُونَك تَحتَ الشَّجَرَة) س فتح ئا ١٨٥.

بۆئەوان هەمان ڕێڕەویان گرتووەتەبەر، کاتێك مالیك خوای لێ ڕازی بێت فتوای ئەوەی دا کەسوێندێك لەڕووی ئیکراهەوەبێت بەتاڵەو فەرمانڕەواو والیەکان دژایەتیان کردو وەك ڕووشاندن لەسوێنەکانی بەیعەتدا داویانەتە قەڵەم، ئەوەبوو ڕووداوی (میحنەت)[٢٩٦]ی ئیمام ڕوویدا. بەڵام ئەوبەیعەتەی کەئەمڕۆکە باوە بریتیە لەجۆرێك ستایش و پیاهەڵدان کەبۆپاشکانی ساسانی کراوە وەك ماچ کردنی زەوی و شان و داوێن و پێی و....هتد. ئەم جۆرە لەستایشگەریە لەنێو ساسانیەکاندا بەبەیعەتێك ووتراوە کەتایبەت بووە بەعەهدو فەرمانبەری خەلیفەوە، چونکە ئەم جۆرە ڕێوڕەسمە لەداب و نەریتەکانی فەرمانبەریە هەروەك چۆن لەمانای بەیعەتدا بلاّوە و وەك حەقیقەتێکی عورفی لیهاتووە و لەبری تەوقە دەست لەناودەستی یەکتری دەدەن کەئەصڵی بەیعەتە.

چونکە لەتەوقەکردندا بۆهەرکەسێك جۆرێك لەتەنەزول و ملکەچی تێدایە کەدژە لەگەڵ پلەوپایەی پاشایەتی دەسەلاّتدا، بەداب و نەریتی دەستتدان لەدەستی یەکتری هێشتا لەناوهەندێك لەپاشاو شازادەکاندا هەرباوی ماوە و لەگەڵ کەسەتایبەت و بەناوبانگەکانیاندا ئەم ڕێوڕەسمە پەیڕەودەکەن. کەواتە پێویستە مانای بەیعەت لەعورفدا بزانین، چونکە بێگومان مرۆڤ دەبێت ئەم جۆرە نەریتانە بزانێت بۆئەوەی لەکاتی پێویستدا بەباشی ئەرکەکانی لەبەرامبەر سوڵتان و گەورەکەیدا جێبەجێ بکات و کردارەکانی بیهودە نەبن. خوداش بەتوانای زاڵە بەسەر هەمووواندا.[٢٩٧]

---

[٢٩٦] ئەوتاقیکاریە بیروباوەڕیانەی کەلە سەردەمی خەلیفەکانی عەباسیدا لەبارەی مەخلوق بوونی قورئانەوە دەکران بەمیحنەت ناوزەد کرابوو.

[٢٩٧] (وَهُوالقَوِیُّ العَزِیز) س الشوری ئا ١٨.

# بەشی سی هەم

## لەبارەی وویلایەتی عەهدەوە

لەبەشەکانی پێشوودا لەبارەی ئیمامەت و گونجانی لەگەڵ بنەما شەرعیەکاندا گفتوگۆمانکرد. لەوڕووەوەی کەبەرژەوەندی لەوەدایە، ئەڵبەت حەقیقەتی ئیمامەت لەوەدایە کەئیمام لەبەرژەوەندیەکانی دین و دونیای خەڵکی بڕوانێت، چونکە ئەو وەلی و ئەمینی ئەوانە، لەبەرئەوەی کەلەقۆناغەکانی ژیاندا بەرژەوەندیەکانی ئەوان لەبەر چاو دەگرێت ئەواپێویستە لەپاش مردنیشی ئاگاری حاڵیشیان بێت و پێش ئەوەی بمرێت بۆپاش خۆی کەسێکی باش و شیاو بۆ جێگرەوەی خۆی هەڵبژێرێت، بۆئەوەی هەروەك چۆن خۆی ئەمێنو دڵسۆزی خەڵکەکەی بوو لەژیاندا ئەوکەسەش ئەوجۆرە ئەرکە لەئەستۆ بگرێتو کەسێکی خاوەن متمانەبێت لەناو خەڵکیدا بەتایبەت لەبواری پێشەوایی کردندا. ئەم کارەش بەئیجماعی زانایانی ئومەت پەسەند کراوە چونکەعەهدی ئەبوبەکر بۆعومەرو بەئامادەبوونی گروپێك لەهاوەڵان ئەنجامدراوەو پەیمانبەستنەکەی ئەبوبەکریان لەگەڵ عومەردا گوێڕایەڵی کردو لەکاتی خەلیفەبوونی عومەردا چوونە ژێر فەرمانیەوە. وەهەروەها سەردەمی کۆتایی خەلافەتی حەزرەتی عومەریش بەوشێوەیەبوو کاتێك لەگەڵ شەش کەس لەوانەی مژدەی بەهەشتیان پێدرابوو لەدەکەسەکە کۆبوویەوە بۆئەوەی لەپاش خۆی خەلافەت بدرێتە کەسێکی شیاو بۆئەوکارە و خەلیفەیەك هەڵبژێرنو ئەوئەرکە بەشێوەی یەك لەدوای یەك بەکەسانی تریان سپارد، تاوەکو

سەرئەنجام ئەم کارە بەعبدالرحمانی کوڕی عەوف سپێردرا و ئەویش لەپاش پرس و ڕاوێژ بەموسوڵمانن ئیجتیهادو لێکۆڵینەوەی کرد و گەشتەئەوئەنجامەی کەموسوڵمانان لەسەر خەلافەتی عەسمانی کوڕی عەفان و علی ڕازین و ئەویش پێشتر عوسمانی بۆئەوکارە دیاری کرد، چونکە عوسمان بەشێوەیەکی بەردەوام لەبارەی پێویستبوونی شوێنکەوتنی شەیخەین لەهەرکارێکدا لەگەڵ عبدالرحمانی کوڕی عەوفدا هاوڕابووە. کەواتە خەلافەت بەم شێوەیە بووە و پەیمانیان بەعوسمان دا لەپاش ئەوەی هەموو گرووپەکانی صەحابە پرس و ڕاوێژیان کردو لەشورای یەکەم و دووەمدا ئامادەبوون و هیچ کەسێکیان ئینکاری ئەو کارەی نەکرد، ئەم ڕووداوە ئەوەنیشاندەدات کەهەموو صەحابەلەسەر ڕاستیەتی ئەوپەیمانە هاوڕابوون و ئاگاداری مەشروعیەتەکەی بوون و هەروەك دەزانرێت ئیجماعی صەحابەو زانایانی ئیسلامیش دەبێتە یەکێك لەبەڵگە شەرعیەکان.

وەئەگەرئیمام لەژیانی خۆیدا یەکێك لەکوڕەکانی بۆجێگرەوەی خۆی دانا ئەوابەهیچ شێوەیەك سەرزەنشت ناکرێت چونکە مافی ئەوەی هەیە کەتێڕوانینی هەبێت لەکاروباری موسوڵماناندا کەواتە ئەولاترە کەلەپاش مەرگی خۆی لێپرسراویەتی گیرو گرفتەکان لەئەستۆیدا نەبێت، بەڵام ئەم بۆچوونە پێچەوانەی تێڕوانین و بیروباوەڕی ئەوکەسانەیە کەلەجێنشین کردنی باوك و کوڕدا هەردووکیان ئەو تاوانبار دەکەن یان تیۆری ئەوکەسانەی کەتەنها لەبارەی وە لی عەهدی کوڕەکەیەوە تۆمەتباری دەکەن و دژی خەلافەتی باوك نین، بەڵام بەپێچەوانەی ئەم تیۆرەوە دەبێت ئەوەبڵێین کەئیمام بەشێوەیەکی ڕەها لەدیاری کردنی جێنشینی خۆیدا دوورە لەتۆمەت و شك و گومانەوە بەتایبەت کاتێك پێویست بکات کەتێیدا بەرژەوەندیەك یان ترس لەخراپە هەبێت ئەوکات تۆمەتەکەلەم بارەیەوە بەگشتی نامێنێت، هەروەك چۆن موعاویە لەبارەی دانانی کوڕەکەیەوە یەزید بەوەلیعەهد بەرژەوەندی یەکیەتیی موسوڵمانانی لەبەر چاوگرت، ئەم کارەی موعاویە هەرچەندە ڕەزامەندی خەڵکی لەگەڵدابوو هەرئەم ڕەزامەندیە بۆ وەلیعەهدی دەبێتەبەڵگە، بەڵام ئەوشتەی وای لەموعاویە کرد کەکوڕەکەی بۆ وەلی

عەهدی هەڵبژێرێت و کەسی تری لەبەرچاونەگرت بۆئەوپۆستە بێگومان لەبەر بەرژەوەندی خەڵکی و هاوئاهەنگکردنی حەزەکانی ئەوان بوو، لەومەسەلەیەدا چونکە ئەهلی حەل و عەقد کەلەم کاتەدا لەخانەدانی ئەمەویەکان بوون هاوڕابوون لەگەڵ موعاویەدا لەسەر وەلیعە هدی یەزید و ڕازی نەدەبوون بەخەلافەتیکی تر ئەمەلەکاتێکدا ئەوان دەستەی هەڵبژێردراوی قورەیش و هەمووپەیڕەوانی مەزهەب بوون و لەنێو نەتەوەی عەرەبدا بەخاوەنانی هێزو فراوانخوازی دەژمێردران.

لەم ڕووەوە موعاویە یەزیدی پێ باشتربوو لەوکەسانەی کەگومانی دەکرد لەوباشترو شایستەترن لەباشتر وازی هێناو ڕووی کردە باش بەوهۆیەی کە هەمیشە جەختی لەسەر یەکڕیزی موسوڵمانان دەکردەوە و دەیگوت بەڕای من ئەمە گرنگترین شتە بەلای شاریع (خودا)وە. هەرچەندە بێجگەلەعەدالەت هیچ شتێکی تر لەموعاویە چاوەڕوان نەدەکرا چونکەهاوەڵبوونی ئەو لەگەڵ پێغەمبەردا (ص)ڕێگربوولەشێوازێکی بەدەرلەمە و ئامادەبوونی گەورەکانی هاوەڵان و بێدەنگ بوونیان لەم مەسەلەیەدا دیسانەوە بەڵگەیەلەسەر نەبوونی هەرجۆرە شك و گومانێك لەموعاویەدا، چونکەهەم ئەوو هەم یەزیدی کوڕی لەوکەسانە نەبوون کەلە ڕێگەی حەقدا سازش بکەن لەوەرگرتنیدا نەتەوە و خێزان لێك بدەنەوەو، ئەوانە زۆر لەوە گەورەتربوون کەبتوانین لەبارەیانەوە ئەم جۆرە تەسەووڕانە بکەین، چونکە بیگومان دادگەریەکەیان ڕێگربوو لەمە.

ڕێگری کردنی عبداللەی کوڕی عومەر لەم مەسەلەیە دەبێت بەپارێزکاری ئەو حیساب بکرێت کەدەستوەردانی لەم جۆرە کارانەدا چ حلاڵ و چ حەرام، خۆی لێوە بەدوور دەگرت و هەربەم شێوەیەش ناسرابوو. لەوکەسانەیشی کەلەدژی وەلیعەهدی یەزید بوون بێجگەلەئیبن الزوبیر و ئەودژەکەمانەی کەناسراون کەسێکی وا نەمایەوە. سەرەڕای ئەمەش هاوشێوەی ئەم پێشهاتانەی کەخەلیفەکان کوڕەکانیان کردووەتە جێنشینی خۆیان لەپاش موعاویەش ڕووی داوەو، ئەوخەلیفانەی کەعەودال بوون بەدوای حەقداو کاریان پێدەکرد وەك عبدالملیك و سولەیمان لەخانەدانی ئەمەویەکان و سەفاح و

مەنصورو مەهدی و ڕەشید لەعەباسیەکان و، نمونەی ئەمانە لەوکەسانەی کەعەدالەتو بۆچوونی باشیان هەبووە موسوڵمانان بەچاوی ڕێزەوە سەیریان دەکەن‌و لەبەرگرنگیدانیان بەموسوڵمانان کوڕەکانیان دەکردە جێنشینی خۆیان، ناتوانین ڕەخنەیان لێبگرین، چونکە ئەوان لەسەردەمێکدا ژیاون کەهێشتا تایبەتمەندی وسروشتی دەوڵەتداری نەهاتبووە ئاراوە و حاکم و بەرپەرچ دەرەوەی خەڵکی تەنها ئاین بووە، هەرکەسێك لەبوونیدا حاکمێکی ویژدانی و ئاینی هەیە کەلەکاری خراپ و دژی ئاین دووری دەخاتەوە. هەربۆیە خەلیفەکانی ناوبراو کەسانێکیان بۆ جێنشینی خۆیان دەستنیشان دەکرد کەتەنها لەڕوانگەی ئاینیەوە بەلای خەڵکەوەپەسەندن و ئەم جۆرەکەسانەیان لەخەڵکی تر پێ باشتر بووە، کەشیاوی ئەم پلەوپایەیەبوون و تەسلیمی هەمان بەرپەرچ دەرەوەی ئاینیان بوون، بەڵام لەپاش چوار خەلیفەکە و لەسەرەتای خەلافەتی موعاویەوە عەصەبیەت گەیشتە کۆتا قۆناغەکانی کەپاشایەتی و دەوڵەتداریە و حاکم و بەرپەرچ دەرەوەی ئاینی لاواز بوو پێویستیان بەحاکم و بەرپەرچ دەرەوەیەك هەبوو کەلەڕێگەی پاشایەتی‌و عەصەبیەتەوە بەسەر ئەواندا زاڵ ببێت.

هەربۆیە ئەگەر کەسێکیان بۆ وەلیعەهدی هەڵبژاردایەکەعەصەبیەتی نەتەوەیی ئەوانی ڕازی نەدەکردوعەصەبیەتەکەیان ڕەت دەکردەوەو وەلیعەهدیەکەی بەزوویی هەڵدەوەشایەوە و جیاوازی دەکەوتە نێوان ئومەت و کۆمەڵگەوە. پیاوێك لەحەزرەتی علی پرسی: بۆچی موسوڵمانان لەبارەی خەلافەتی تۆوە جیاوازیان تێکەوت؟، بەڵام بۆ ئەبوبەکرو عومەر ئەو کێشەیەدرووست نەبوو؟ فەرمووی: چونکە ئەبوبەکرو عومەر فەرمانڕەوایی کەسانێکی وەکو منیان دەکرد و منیش ئەمڕۆ فەرمانڕەوایی کەسانێکی وەکو تۆ دەکەم. ئەمەش ئاماژەیە بە بەرپەرچ دەرەوەو حاکمی وویژدانی و ئاینی. سەرەڕای ئەمەش ئەی چیرۆکی مەئمونتان نەبیستووە لەبەر ئەوەی علی کوڕی موسای کوڕی جەعفەری کردە وەلیعەهد و، ناوی لێنا ڕەزا بەچ شێوەیەك عەباسیەکان ئینکاری ئەم کارەیان کردو بەیعەتەکەیان هەڵوەشاندەوە و لەگەڵ مامی مەئموندا ئیبراهیمی کوڕی

مەهدی بەیعەتیان کرد و ئەوەمەموو کێشەو هەراو هۆریاو کودەتایانە لەوولاتدا سەریان هەڵداو، زۆرێك خەڵکی کودەتاچی سەریان هەڵداو هێندەی نەمابوو کەدەوڵەتەکەی بڕووخێت تائەوەبوو بەخێرایی مەئمون لەخۆراسانەوە هاتەبەغداو کاروباری خەلافەتی خستەوە سەر ڕێڕەوەکەی جارانی.

کەواتە لەدیاری کردنی وەلیعەهددا لەبەرچا وگرتنی بۆچوون و خواستە نەتەوەییەکان شتێکی پێویستە و خۆلادان لێی نەگونجاوە، چونکە پێداویستیەکانی سەردەمە جۆراو جۆرەکان لەبەرامبەر ئەو ڕووداوە جۆراوجۆرانەی کەتێیدا ڕوودەدەن و، ئەو هۆزو عەصەبیەتانەی کەلەوێدا بەدی دێن جیاوازن و هەروەها سەبارەت بەبەرژەوەندیەکانیش بەهەمان شێوەجیاوازیان دەبێت و بەهۆی سۆزو میهرەبانی خوداوە بەرامبەربەندەکانی بۆ هەریەکەیان حاکمێکی تایبەت هەیە، بەڵام ئەگەر مەبەست لەدیاریکردنی وەلیعەهد پاراستنی میراتی ئیمامەت بێت کەبەشێوەیەکی بۆماوەیی گەشتبێت بەکوڕە کانی. ئەم جۆرە بابەتانە لەگەڵ ئایندا ناگونجێن، چونکە خەلافەت و ئیمامەت ئەگەر خودا بیبەخشێت بەکەسێك ناگونجێت ترسی ڕوودانی هەڵسووکەوتی خراپ لەپلەو پایە ئاینیەکاندا هەبێت. پاشایەتیش تایبەتی خودایەو بەهەرکەسێك کەبیەوێت دەیبەخشێت. لەناو ئەم گووتارەدا هەندێك مەسەلەمان هاتە بەردەم کەناچاربووین باسی حەقیقەتەکەیان بکەین. یەکەمین ئەوەی کەیەزید لەسەردە می خەلافەتی خۆیدا کاری خراپی کردووە، بەڵام نابێت بەهیچ شێوەیەك گومانی ئەوەبەرین کەموعاویە لەم کارانەی ئاگادار بووە، چونکە تاوەکو موعاویەمابوو تەنانەت یەزیدی لەگوێگرتن لەمۆسیقا بەدوور دەگرت و لۆمەی دەکرد، هەرچەندە لەوسەردەمە و تاوەکو ئێستەش زاناکان لەسەر حەڵاڵ و حەرامی مۆسیقا هاوڕانین.

لەبەر ئەوەی کەیەزید خراپەو تاوانی ئەنجام دەدا هەربۆیە صەحابە لەبارەیەوە جیاوازی بۆچوونیان تێکەوتوو هەندێکیان پێیان وابوو پێویستە موسوڵمانان لەدژی ڕاپەڕن، هەربۆیە بەیعەتەکەیان هەڵوە شاندەوە وەك حەزرەتی حوسەین و عبداللەی

کوڕی زوبەیرو ئەوانە کەپەیڕەویان لێدەکردن. هەندێکی تریش لەصەحابە ڕێگریان لەم کارە دەکرد وپێیان وابوو دەرئەنجامەکەی دەبێتەهۆی خوێن ڕێژی و فیتنە و لەهەمان کاتیشدا پێیان وابوو کەتوانای ڕووبەڕو بونەوەی یەزیدیان نیە، چونکە هێزی ئەولەوڕۆژگارەدا بریتی بوو لەهێزی هۆزی خانەدانی ئەمەویەکان و ئەندامانی حەل و عەقد لەخانەدانی قورەیش بوون و هەموو عەصەبیەتی موزەڕ پەیڕەویان لێدەکرد، هەربۆیە بە گەورەترین شکۆو هێز دەژمێردرا و کەسیش توانای ڕووبەڕوو بونەوەی وەها هێزێکی نەبوو، هەربۆیە خۆیان لەدژایەتی کردنی بەدوور دەگرت و دەستیان کردە دوعاکردن کەبەڵکو خودا ڕێنمایی بکات و بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست.

حاڵی زۆربەی موسوڵمانان بەم شێوەیە بوو هەموویان موجتەهید بوون و نابێت ئینکاری شێوازی هیچ گروپێکیان بکەین چونکە هەموویان مەبەستی باشیان هەبوو لەڕێگەی خێردا هەنگاویان هەڵدەگرت و گەڕان و پشکنینیان بۆ حەق و ڕاستی بەناوبانگە، خوداش هاوکاریمان بکات کەپەیڕەویان لێبکەین. بابەتی دووەم کاری جێنشینی پێغەمبەر (ص)و بانگەشەی شیعەکانە کەدەڵێن پێغەمبەر وەسیەتی کردووە کە علی خواری لێ ڕازی بێت ببێتە جێنشینی ئەو، ئەمە لەکاتێکدا ڕاستیەتی ئەم شتە نەسەلمێنراوە و هیچ ئیمامێك ئەمەی نەگێڕاوەتەوە ئەوەی کەلەصەحیحدا هاتووە ئەوەیەکە پێغەمبەر کاغەزو مرەکەبی داواکردووە بۆئەوەی وەسیەت بنوسێت، بەڵام تەمەن ڕێگەی ئەم کارەی پێنەدا، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کەهیچ وەسیەتێك نەکراوە.[298]

وەهەروەها قسەکەی حەزرەتی عومەر کاتێك کەوتە بەر مەبەستی خراپەوە[299] و داوایان لێکرد بۆئەوەی جێنشینێك بۆخۆی هەڵبژێرێت و ئەم مانایە دەبەخشێت کاتێك

---

[298] شیعەکان ئەم کارەی عومەر بەبەڵگەی ئەوە دەدەنەقەڵەم کەپێغەمبەر ویستویەتی مەسەلەی غەدیر جارێکی تر دووبارە بکاتەوە ، بەڵام عومەر بەهۆی دژایەتی کردنی علی یەوە ڕێگری لەم کارە کرد .

[299] واتە ئەبو لوئلوئەکەبەخەنجەر حەزرەتی عومەری کوشت.

لەوەلآمدا گووتی: ئەگەر جێنشین دیاری بکەم وەك ئەوکەسەی کەلەمن باشتر بوو جێنشینی دیاری کرد (مەبەستی ئەبوبەکرە)، وەئەگەر وازیش لەم کارە بهێنم کەسێکیش لەمن باشتر وازی لەومەسەلەیە هێناوە (واتە پێغەمبەر (ص)جێنشینی دیاری نەکرد[300] و ئەوصەحابانەش کەئامادەبوون هاوڕابوون لەگەڵیدا کەپێغەمبەر (ص)وەسییەتی نەکردووە و کەسی وەك وەلیعەهد هەڵنەبژاردووە. وەهەروەها گووتەکەی علی بەعەباس لەوکاتەی کەعەباس ئەوی بانگکرد بۆئەوەی بچنە خزمەتی پێغەمبەر و تەکلیفی لێبکەن بۆدانانی جێنشین، علی ئەم کارەی نەکردو گووتی: کاتێك بەتەواوەتی ئەم شتەمان تاکۆتایی ژیان لێ قەدەغەکراوە نابێت تەماعمان پێی هەبێت چونکە پێغەمبەر ئەم شتەی قەدەغەکردووە و، هیچ کەسێکی بۆجێنشینی خۆی هەڵنەبژاردووە. شویەەی فیرقەی ئیمامیەکان لەم بارەیەوە بەوهۆیەوەیە کەئەوان ئیمامەت بەیەکێك لەپایەکانی دین دەزانن ئەمەلەکاتێکدا بەم شێوەیەنیە، بەڵکو ئەم شتە لەبەرژەوەندی گشتیە کەخراوەتە بەردیدی خەڵکەوە، ئەگەر لەپایەکانی ئاین بوایە ئەوکات وەك نوێژ گرنگی پێدەدرا و پێغەمبەریش جێنشینی بۆخۆی دیاری دەکرد، هەروەك چۆن ئەبوبەکری بۆ پێش نوێژی کردن لەبری خۆی دیاری کردوئەم مەسەلەیە ناوبانگی دەرکرد، هاوشێوەی ئەمەش مەسەلەی دیاری کردنی جێنشینیش ناوبانگی دەردەکرد.

بەڵگەی صەحابە لەسەر خەلافەتی ئەبوبەکر قیاسێکە لەسەر پێش نوێژیەکەی بۆموسوڵمانان چونکە دیانگووت کاتێك پێغەمبەر ڕەزامەندبووە کەئەبوبەکر پێشنوێژی موسوڵمانان بێت ئەی بۆنابێت پێشەوایەتی موسوڵمانانیش بکات، ئەمەش دیاسەنەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەلەسەردەمی دوای پێغەمبەردا گرنگیەکی ئەوتۆی پێ نەدراوە و هیچ وەسیەتێك لەم بارەیەوە نەکراوە. چونکە لەسەرەتای ئیسلامدا مەسەلەی عەصەبیەتو حیسابکردن بۆخانەدانو دەسەلآت گرنگیەکی ئەوتۆی نەبووەو مەسەلەئاینیەکان لەڕێگە موعجیزەوە یەکلایی دەکرانەوە وەك یەکخستنی دڵو

---

[300] بەپێی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەت .

دەرونەکانو گیانبەخت کردن لەپێناوبلاوکردنەوە گەیاندنی ئایندا. ئەم هەمووە فیداکاریەش بەهۆی ئەوهەمووە چۆنیەتیانەوەبوو کەڕۆژانە دەیانبینی وەك ئامادەبوونی فریشتەکان لەجەنگەکاندا بۆسەرکەوتنیانو، هاتووچۆی هەواڵی ئاسمان لەنێوانیانداو هاتنی ئایەتەکانی قورئان لەزۆر بەی هەرەزۆری مەسەلە گرنگەکاندا کەبۆیان دەخوێنرانەوە. لەم هەلومەرجەشدا هیچکات پێویستیان بەعەصەبیەت نەبووە چونکە (صبغت)ی ئاین و ملکەچ بوون بۆی هەموو خەڵکی گرتبویەوە و ئەوپەیوەندیەگەرمەی نێوان ئاسمان و زەوی و ڕوودانی ئەوهەموو موعجیزەیە وای لەخەڵکی کردبوو، بەهیچ شێوەیەك بیرلەدانانی خەلیفەو جێگر نەکەنەوە و عەصەبیەتیش لەم هەلومەرجەدا هیچ ناوێکی نەبوو هەروەك چۆن چۆنیەتی ڕوودانی موعجیزەکان دەزانین، بەڵام هەرئەوەندەی کەسەدەیەك تێپەڕی کردو ئەو یارمەتیەئاسمانیە کۆتایی هات و موعجیزەکان وەستان کەخەڵکی بەچاوی خۆیان بینی بوویان لەدەست چوونو، ئەوملکەچیەش وردە وردە بەرەو لاوازی ڕۆشت و فەرمان ڕەوایی لەعیبادەتەوە گۆڕا بۆعادەت و نەریت هەروەك بەرلەهاتنی ئیسلامی لێهاتەوە.

کەواتە دەبێت پەند لەوە وەربگرین کەمەسەلەی عەصەبیەت و داب و نەریتەکان و ئەوەی لێیانەوە سەرچاوە دەگرێت چاکەو خراپەی تێدایە هەروەك چۆن پێیان وابوو کەپاشایەتی و خەلافەتەکەیان لەگرنگترینی مەسەلەکانە، ئەمەلەکاتێکدا لەسەرەتای ئیسلامەوە بەم شێوەیە نەبووە پێویستە لەوە وردبینەوە کەبەچ شێوەیەك خەلافەت لەسەردەمی پێغەمبەر (ص)دا گرنگیەکی ئەوتۆی نەبوو، هیچ کەسێك بۆئەو شتە دیاری نەکرا، بەڵام لەسەردەمی خەلیفەکاندا کەم کەم گرنگی پەیدا کرد، بەتایبەت لەو ڕووەوەی کەمەملەکەتە ئیسلامیەکان لەمەسەلەی پاسەوانی و پاراستن و جیهاد و ڕووبەڕوو بونەوەی هەڵگەڕانەوەکان لەئاین و، فراوانبوونی ڕووبەریان پێویستی بەدانانی خەلیفەو جێنشین دەکرد، هەربۆیە لەدانان و دانەنانی وەلیعەهددا ئازاد بوون هەروەك باسی قسەکەی حەزرەتی عومەرمان کرد، بەڵام ئەمرۆکە مەسەلەی خەلافەت و جێنشینی

لەڕوی پەیوەنیان بەپاراستنی وولآت و گرنگیدان بەبەرژەوەندیەبالآگانی خەڵکی بەگرنگترینی شتەکان دادەنرێت و لەم سەردەمەشدا مەسەلەی عەصەبیەتی تێدا بەباشی تێبینی دەکرێت کەلەڕاستیدا ڕازی مانەوەو پێشکەوتنی کۆمەڵگەکانەو، هۆکارێکی گەورەیە بۆڕێگری کردن لەجیاوازی و دووبەرەکی ودەوڵەتان لە شکست دوور دەخاتەوەو دەبێتە سەرچاوەی کۆمەڵگەو گونجان و هاوکاری کەزامنی مەبەست و ماناکانی شەریعەتە. کەواتە لەم خاڵانەتێبگەو حیکمەتی خودا لەئافەرینش و بوونەوەراندا ببینە.

بابەتی سێیەم بریتیە لەو جەنگانەی کەلەسەرەتای ئیسلامەوە لەنێوان صەحابەو تابیعینەکاندا ڕوویان داوە. پێویستە ئەوە بزانرێت کەجیاوازی ئەوان لەسەر مەسەلە ئاینیەکان بووە و لەئیجتیهاد لەناوبەڵگەڕاست و مەدرەکە موعتەبەرەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە. هەرکاتێك لەبابەتێکدا جیاوازی بۆچوون لەناوموجتەهیدەکانداڕوویدات، ئەگەربڵێین لەمەسەلەئیجتیهادیەکاندا حەق بەلایەکیانەو ئەوەشی کەپێی نەگەشتووە هەڵەیە، لەبەر ئەوەی لایەنەکەی بەئیجماع دیاری ناکرێت.

هەربۆیە هەموولایەك گریمانی ڕاستبوونیان هەیە و هەڵەکار دیاری ناکرێتو بەهەڵەزانینی ئیجماع بەگشتی ڕەتدەکرێتەوە. وەئەگەربڵێین بۆچوونی هەموویان هەقەو هەر موجتەهیدێکیش پێکاویەتی ئەوا خراپتر ئەوەیە کەئینکاری هەڵە و پەڵە بکەین لەشتەکاندا کەئەمەش نەگونجاوە، ئەوپەڕی ئەوجیاوازیەش کەلەنێوان صەحابەو تابیعیندا هەبووە بریتی بووە لەجیاوازیەکی ئیجتیهادی لەبارەی ئەومەسەلە ئاینیانەی کەلەسەر گومان و حوکمی (فقهی ئوصولی)بووە کەباسمانکردو، ئەو جیاوازیانەشی کەلەم جۆرە ئیجتیهادە لەئیسلامدا ڕووی داوە بریتیەلە: ڕووداوی علی لەگەڵ موعاویەو زوبەیرو تەلحەو عائیشەو، ڕووداوی حسەین لەگەڵ یەزید، و ڕووداوی ئیبن الزبیر لەگەڵ عبدالملك دا، بەلآم ڕووداوەکەی علی بەوهۆیەوەبوو کەخەڵکی لەپاش کوژرانی حەزرەتی عوسمانەوە بلآو بوبونەوە بەناوچەکاندا و ئامادەی مەراسیمی بەیعەتدان بەعەلی نەبوون و ئەوانەشی کەئامادەبوون هەندێك بەیعەتیان بەعلی داوهەندێکی تریشیان ئەوکارەیان

نەکرد بەوبیانووەی کەپێویستە هەموو موسوڵمانان کۆببنەوە هاوڕابن لەسەر کەسێك بۆئەوپلەیە، ئەمانەش بریتی بوون لە: سەعد و سەعید و ئیبن عومەر و ئوسامەی کوڕی زەید و موغەیرەی کوڕی شوعبەو عبداللەی کوڕی سەلام و قودامەی کوڕی مەزعون و مەسلەمەی کوڕی مەخلەدو فوزالەی کوڕی عوبەیدوئەبو سەعیدی خودری و کەعبی کوڕی عەجرە و کەعبی کوڕی مالیك و نوعمانی کوڕی بەشیر و حەسانی کوڕی سابیت و، نمونەی ئەمانە لەگەورەکانی صەحابە. وەئەوانەشی کەلەناوچەکانی تربوون لەبەیعەتدان بەعلی پاشگەزبوونەوە و داوای سزادانی تاوانبارانی ڕشتنی خوێنی عوسمانیان دەکرد و مەسەلەی خەلافەت بێسەروبەری تێکەوت تاوەکو شورایەك لەنێو موسوڵماناندا دروست ببێتو، کەسێك بکەنەخەلیفەو بێدەنگی علی یان لەبەرامبەر بکوژانی عوسمانەوە بەجۆرێك نەرمی دەزانی لەبەرامبەر ئەوتاوانبارانەوە نەوەك یارمەتی دانی عوسمان، پەنابەخودا، چونکە ناتوانین بەهیچ شێوەیەك وەها تەسەووڕێك بکەین، وەهەروەها موعاویە کەلەوکاتەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لۆمەی علی دەکرد تەنها بۆئەوبێدەنگیە بوو کەعلی لەبەرامبەر کوشتنی عوسمانەوە هەڵبیژاردبوو.

لەوەش بەدواوە جیاوازیەکی تر ڕوویدا چونکە علی پێی وابوو خەڵکی ئەمیان بۆخەلافەت هەڵبژاردووە و بەیعەتیان بەم داوە پێویستەلەسەر ئەوانەیشی کەدواکەوتوون بەیعەت بدەن، بەهۆی کۆبوونەوەی ئەوکەسانەی کەلەماڵی پێغەمبەر (ص)لەمەدینە کۆبوبونەوە و بەیعەتەکە بەم درابوو. مەسەلە خوێنڕشتنەکەی عوسمانی دواخست و دایەدەستی کۆبوونەوەی خەڵکی وچۆنیەتی ڕێککەوتن و بڕیار دانیان لەوبارەیەوە بۆئەوەی ئەمیش بتوانێت لەوبارەیەوە بگاتە بڕیارێکی دروست. هەندێکیش پێیان وابوو کەبەیعەت بەعەلی نەدراوە چونکە ئەوصەحابانەی کەحەل و عەقدیان بەدەستەوە بوو بڵاوەیان کردبوو بێجگەلە کۆمەڵێکی کەمیان نەبێت بەیعەتیان بەعلی نەدابوو، ئەمەلەکاتێکدا بەیعەت بێجگەلەڕێگەی خاوەنانی حەل و عەقدەوە نەبێت ئەنجام نادرێت چونکە بەیعەتکردنی کۆمەڵێك لەگەڵ ناوبراودا داوێنگیری کەسانی ترنابێت و نابێتە

بەیعەتێکی تەواو، بەتایبەت لەوکاتەدا موسوڵمانان دووچاری بێسەروبەرەیی و نەبوونی خەلیفە ببونەوە وخواستی تایبەتیان بێجگەلەدۆزینەوەی بکوژانی عوسمان زیاتر نەبوو ئەیانویست دوای ئەوە خەلیفە هەڵبژێرن.

پەیڕەوانی ئەم بیروباوەڕە بریتی بوون لەموعاویە و عەمری کوڕی عاص و عائیشە و زوبەیرو عبداللەی کوڕی زوبەیر و تەلحەو محمدی کوڕی تەلحەو سەعدو سەعیدو نوعمانی کوڕی بەشیرو موعویەی کوڕی حدیج و ئەو هاوەڵانەی کە هاوڕابوون لەگەڵیاندا، هەروەك باسمانکرد لەمەدینەدا بەیعەتیان لەگەڵ علی دا نەکرد، بەڵام خەڵکی سەردەمی دجووەم لەپاش گروپی ناوبراو هەموویان باوەڕیان وابوو کەبەیعەت بەعلی دراوە و لەسەر هەموو موسوڵمانان واجبە کەگوێڕایەڵی بکەن و، بۆچوونی علی یان لەم بارەیەوە بەلاوە پەسەندتر بوو واتە لەبارەی ئەوەی کەسەرەتا بەیعەت بەوبدرێت و لەپاشان بکوژانی عوسمان سزابدرێن وبۆچوونی موعاویەیان بەهەڵەدەزانی بەتایبەت تەلحەو زوبەیر وەك ئەوەی کەدەیگێڕنەوە لەپاش بەیعەتکردن لەگەڵ علی دا هەڵیان وەشاندبوویەوە، ئەمە لەکاتێکدا خەڵکی هیچ لایەکیان بەگوناهبار نەدەزانی و، وەك موجتەهیدانی ئاین سەیریان دەکردن کەبەهۆی جیاوازی بۆچوونەوە لەدەرهێنانی مەسەلەشەرعیەکاندا ناتوانرێت بەگوناهباریان بزانین هەروەك بەناوبانگە خەڵکی سەردەمی دووەم یەکێك لەبیروباوەڕو بۆچوونی سەردەمی یەکەمیان کەهەمان بیروباوەڕی پەیڕەوانی علی یە بەئیجماعیان دەزانی.

هەربۆیە کاتێك لەبارەی کوژراوانی هەردوو جەنگی جمل و صفینەوە لەعلی یان پرسی فەرمووی: سوێندم بەوکەسەی کەگیانی منی بە دەستە هەرکەسێك لەو دوو گروپە کەبەدڵێکی پاك و دڵسۆزی بۆئاینەوە گیانیان لەدەستدابێت دەچنە بەهەشتەوە. ئەو لەم قسەیەشیدا ئاماژەی بەهەردوو گروپەکەکردووە. ئەم بەسەرهاتەش تەبەری و هەندێکی تریش گێڕاویانەتەوە. هەربۆیە نابێت لەدادپەروەری هیچ صەحابەیەکی ئەوسەردەمەدا شوبهە و گومان بکەین و لەهیچ کام لەم مەسەلانەدا لۆمەیان بکەین، چونکەئەمانە هەمان

ئەوکەسانەن کەبەباشی ناسیومانن و قسەو کردەوەکانیان وەك بەڵگەیەبۆمان‌و دادپەروەریان بەرهەمیانەلای ئەهلی سوننەت، هەرچەندە موعتەزیلە باوەڕیان بەعەدالەتی ئەوکەسانە نیە کەلەگەڵ حەزرەتی علی دا جەنگاون، بەڵام هیچ کەسێك لەشوێنکەوتوانی حەق و ڕاستی گوێیان بە قسەکانی ئەوان نەداوە، ئەگەر بەدیدەی ویژدانەوە تێبڕوانین دەبێت هەموو خەڵکی لەومەسەلە ئیختیلافیەی کەلەبارەی عەسمانەوە بەدیهاتووە و هەم ئەوبۆچوونەجیاوازانەی کەلەپاش ئەویش ڕوویانداوە خۆمانی لێ بەدوور بگرین. ئەوەش دەزانین کەئەو کێشەو جیاواز یانە وەك فیتنەو بەلایەك بوون کەئومەتیان پێوە گیرۆدە بووە، لەکاتێکدا لەهەمان ڕۆژگاردا خودا دووژمنانی ئیسلامی سەرکوت کردووە و موسوڵمانانی زاڵکردووە بەسەر ووڵات و سەر زەمینەکانیاندا و گروپێك لەغەزاکەران بەرەو شارو ووڵات و سنورەکانی ووڵاتی موسوڵمانان وەك بەصرە و کوفەو شام ڕۆشتبوون و هەرلەوێشدا مابوونەوەو، زۆربەی ئەم گروپانە بەخەڵکی توندخوو ڕەق دەژمێردران کەهەندێکیان صەحابەی پێغەمبەر بوون، بەڵام ژیان و خوڕەووشتەکانی پێغەمبەر کاری تێنەکردبوون و ڕەنگی نەدابوویەوە تێیاندا و سیفەتەباشەکانی ئەویان تێدانەبوو، سەرەڕای ئەمەش خووە خراپەکانی سەردەمی نەفامیان تێدامابوو وەك خووە خراپەکان‌و شانازی و فیزکردن بەسەر خەڵکیدا و، بەباش زانینی عەصەبیەتی خۆیان بەقوڵایی بیرو بۆچوون و ژیانیاندا چووبویە خوارەوە و بێ بەهرەبوون لەئارامشی ویژدان بەتەواوەتی بێ بەهرەبوون‌و کاتێکیان زانی لەکاتی فراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامیدا لەژێر فەرمانڕەوایی موهاجیرین و ئەنصاری مەدینە لەهۆزەکان سەقیف و هەزیل و خەڵکی حیجازو یەسریبدا کەلەسابیقن وسەرەتاییەکانی باوەڕداران بوون،[301] خۆیان بینیەوە بەلایانەوە زۆرقورس بوو دەرچوون لەژێر فەرمانی ناوبراواندا چونکە خۆیان لەوان بەزیاتر دەزانی چ لەڕووی ژمارەی نەسەب و شەڕکردنەوە لەگەڵ ئێرانی و ڕۆمیەکاندا خۆیان

---

[301] (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلونَ مِنَ المُهاجِرِينَ وَالأنصار) س التوبة ئا ١٠١ ، (والسَّـابِقُون السَّـابِقُون أُولئـكَ المُقَرَّبـون) س الواقعه ئا ١٠.

بەلەپێشتر دەزانی، ئەوانەش لەهۆزەکانی بیکری کوڕی وائیل و عبدالقیس بوون کەسەریە هۆزی ڕەبیعەو کندەو ئیزدی یەمەن و تەمیم و قەیس لەموزەڕ بوون.

لەپلەو پایەی قورەیشیان کەم دەکردەوە و بەبیانوی بێهودەوە لەگوێڕایەڵی کردنیان خۆیان دەبوارد و هەمیشە ڕەخنەیان لێدەگرتن و، تانەیان لێدەدان و لۆمەیان دەکردن و دەیانگووت لەمەسەلەی سریەکان و لەشکردا توانایان نیە و لەدابەشکردنی دەستکەوت و غەنیمەکاندا دادگەری ناکەن، تائەوەبوو ئەم جۆرە گلەیی و گازەندانەش ووردە ووردە گەشتنە مەدینەش کەئەوانمان بەباشی ناسیون، ئەوان بەبێ وەستان مەسەلەکەیان زیاد لەپێویست گەورەکردو گەیاندیانە حەزرەتی عوسمان. عوسمانیش خەڵکانێکی تایبەتی بۆئەم مەسەلەیە بەرەو ناوچەجیاوازەکان نارد بۆئەوەی لەحەقیقەتی مەسەلەکە تێبگات. هەربۆیە ئیبن عومەر و محمدی کوڕی مەسلەمەو ئوسامەی کوڕی زەیدو هاوشێوەی ئەمانەی ناردن بۆناوچەکانی ناوبراو.

ئەم بەڕێزانە لەپاش ئەوەی زۆربەووردیەوە لەمەسەلەکەیان کۆڵیەوە هیچ کەم و کورتی و عەیبێکیان لەفەرمانڕەوایانی ئەوناوچانەدا نەدۆزیەوە کەشیاوی ئەو ڕەخنەولۆمەکردنە زۆرو زەوەندانەبن، هەمووئەم شتانەیان بۆ عوسمان گێڕایەوە، بەڵام ئەم لۆمەو سەرزەنشانەی ناوچەجیاوازەکان بەردەوام بوو پڕوپاگەندەی ناڕەوا بڵاو دەکرانەوەو خراپەکان لەهەڵکشانێکی بەردەوامدا بوون، تاکارگەیشتەئەوەی کەوەلیدی کوڕی عقبە تۆمەتبار کرا بەشەراب خواردنەوە و هەندێك ماستاوچیش ئەم شاهێدیە ناڕەوایەیاندا. عوسمان حەدی شەرعی لەناوبراو داو لەسەر کارەکەی لای برد. لەپاشان گروپێك لەخەڵکی شارو ناوچەناوبراوەکان[٣٠٢] هاتن وداوای لابردنی فەرمانڕەواکانیان کرد. شکاتیان بردە لای عائیشەو علی و تەلحەو عوسمانی لەبەر ئەوان هەندێك لەو فەرمانڕەوایانەی لەسەر کارەکانیان لابرد، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا زمانی خراپکۆیان لەلۆمە کردن بەکۆتا نەهات بەڵکوسەعیدی کوڕی عاصی کەحاکمی کوفەبوو کاتێك هات

---

[٣٠٢] مەبەست شارەکانی میسر و بەصرە و کوفەیە.

بۆمەدینە لەکاتی گەڕانەوەیدا ڕێگەیان لێگرت و لەسەر کارەکەی لایان بردو عەزلیان کردو ڕەوانەیان کردەوە.

لەپاشان لەنێوان عوسمان و گروپێك لەصەحابە کەلەمەدینەدا بوون جیاوازی و موناقەشە ڕوویداو لەسەر ئەوەی کەئەو لەلابردنی فەرمانڕەواکاندا خەمسارد بوو لێپرسینەوە و سەرزەنشتیان دەکرد، بەڵام عوسمان لەمکارە خۆی لادەدا وجەرح و تەعدیلی کردبویە مەرجی لابردنی فەرمانڕەوایان و گووتی بیجگەلەم ڕێگەیەوە هیچ کەس لەسەر کارەکەی لاتابات. ئەوکات صەحابە بەردەوام بوون لەڕەخنەکانیان لەکردەوەکانی تری عوسمان، بەڵام ئەوپشت بەستوبوو بەئیجتیهاد و ئەوانیش لەسەر ڕەخنەگرتنی خۆیان بەردەوام بوون. لەپاشان گروپێك لەخەڵکی ئاژاوەچی کۆبوونەوە و بەرەومەدینە بەڕێ کەوتن و وایان نیشاندەدا کەخوازیاری عەدلەت و ئینصافی عوسمانن، ئەمەلەکاتێکدا لەناخەوە مەبەستێکی تریان هەبوو ئەیانویست عوسمان بکوژن، لەنێویشیاندا خەڵکی میسرو کوفەو بەصرە هەبوون و علی و عائیشە و زوبەیرو تەلحە لەنیەتە باشە کەیاندا کەعەدالەت خوازی بوو بەشداری ئەو گروپەبوون و، هەوڵیاندەدا هێمنی و ئارامی دۆخەکەبپارێزن و عوسمان بهێننە سەر بۆچوونە کەی خۆیان، هەربۆیە عوسمان لەبەر خاتری ئەوان حاکمی میسری لەسەر کارەکەی لابرد و خەڵکەکە کەمێك لەهەڵویستەکانیان گەڕانە دواوە، بەڵام دیسانەوە هاتنەوە و نامەیەکیان ساختەکرد کەگوایە خەلیفەعوسمان لەبری ئەوەی لەنامەکەیدا فەرمانی لەسەر کارلابردنی حاکمەکەی میسری نوسیبێت بەحاکمەکەی گوتووە خوازیارانی لەسەر کارلابردنەکەی بکوژێت.

عوسمان سوێندی خوار کەبەهیچ شێوەیك شتی لەوجۆرەی لەنامەکەدا نەنوسیوە. لەوەڵامدا گووتیان بهێڵە بامەروان ببینین کەنوسەری تۆیە. مەروانیش بەهەمان شێوە سوێندی خوارد، عوسمانیش گووتی لەدادگەریدا زیاتر لەمەنیە، بەڵام ئەوان عوسمانیان لەماڵەکەیدا گەمارۆدا، شەوەکەی پلانی کوشتنی ناوبراویان داناو دواتر کوشتیانو، دەرگای ئاشوب و فیتنەیان بەڕووی خەڵکیدا کردەوە، بەڵام هەمووئەوکەسانەی کەلەم

ڕووداوانەدا بەشداریان کردووە خاوەن عوزرن. هەموویان گرنگیان بەمەسەلەی ئاین داوەو شتێکیان لەمەسەلە ئاینیەکان بەفیڕۆنەداوە. ئەوکات لەپاش ئەم ڕووداوە بیریان لێکردەوە و ئیجتیهادیان کردو خوداش ئەمەبەباشی دەزانێت و ئێمەش بێجگەلەگومانی باش هیچ شتێکی تر لەبارەیانەوە نالێین لەلایەکەوە ئەحوالی خۆیان و، لەلایەکی تریشەوە فەرموودەکانی پێغەمبەری ڕاستگۆو ئەمین کەگەواهیدەرە لەسەریان بەچاکە و بەلگەشن بۆقسەکانی ئێمە، بەلام لەبارەی حوسەینەوە سلاوی خودای لەسەر بێت و ئەو جیاوازیەی کەڕوویدا دەبێت ئەوەبلێین لەبەر ئەوەی کەتاوانباری و خراپەی یەزید لەلای خەلکی سەردەمی خۆی دیارو ئاشکرابوو پەیڕەوان و شیعەکانی خانەدانی پێغەمبەر لەکوفە شاندێکیان ناردە لای حەزرەتی حسەین بۆئەوەی بەفەرمانی ئەو لەدژی یەزید ڕاپەڕن. حسەینیش بینی کەڕاپەڕین لەدژی یەزید واجبەبەتایبەت بۆئەوانەی کەتوانای ئەم کارەیان هەیە لەبەر ئەوەی کەئەو بەئاشکرا تاوان و خراپە ئەنجام دەدات بەناوی ئاینەوە، هەربۆیە پێی وابوو واتەحەزرەتی حسەین کەخۆی لەبەر خانەدان و ناوبانگەکەی بۆئەوکارە گونجاوە، واتە سەرۆکایەتی کردنی ڕاپەڕین لەدژی تاوانەکانی یەزید. ئەوشایستەییەی کەحەزرەتی حسەین بۆخۆیی و خانەدانەکەی کەباسی کردبوو هەروابوو بگرە زیاتریش بوو، بەلام لەبارەی شان و شکۆی هێزەوە بەهەلەدا چوبوو خودا لێی خۆش بێت، چونکە عەصەبیەتی موزەڕ لەهۆزی قورەیشدا و عەصەبیەتی قورەیش لەهۆزی عبدمناف و عەصەبیەتی عبدالمناف تەنها لەهۆزی ئومەییەدا بووە، ئەم تایبەتمەندیەش لەبارەی ئومەییەو قورەیش و هۆزەکانی تریشەوە دەیانزانی و ئاشکرایان نەدەکرد، بەلام ئەم بابەتە لەسەرەتای ئیسلامدا بەهۆی سەرقالبوونی بیروهۆشی خەلکیەوە بەموعجیزەو خەواریقەکانی مەسەلەی وەحیو هاتوو چۆی فریشتەکان لەنێوان ئاسمانو زەویو، پەیوەندی زەوی بەمەلەکوتی ئەعلاوە بۆ هاوکاری ئیسلام و موسولمانان مەسەلەی عەصەبیەت لەبیرو هۆشی خەلکیدا نەمابوو خەلکی لەمەسەلە ئاساییەکانی ژیانیان بێ ئاگابوون و هیچ شوێنەوارێك لەعەصەبیەتی جاهیلیەت و شوێنەوارەکانی نەبوو بەتەواوی لەبیریان چووبویەوە تەنها عەصەبیەتی سروشتی

مابوویەوە، کەتایبەت بوو بەمەسەلەی بەرگری لەمەسەلەی گەیاندن و بلاْوکردنەوەی ئاین‌و جیهاد لەگەلْ موشریکەکاندا و، ئاین لەعەصەبیەتی سروشتیدا زۆر پایەداربوو هەواو هەوەس و ئارەزووە خراپەکان بەتەواوی وازیان لێهێنرابوو.

ئائەوکاتەی کەپێغەمبەرایە تی و موعجیزەو خەواریقەکان لەنێو خەلْکدا کۆتاییان هات لەوەبەدواوە بارودۆخی فەرمانڕەوایی تائەندازەیەك پەیوەست بوو بەنەریتە کانەوە و عەصەبیەت وەك پێش هاتنی ئیسلامی لێهاتەوە و، گەڕایەوە دەستی ئەوکەسانەی کەپێشتر گرتبوویان بەدەستەوە و قۆرخیان کرد بوو کەواتە هۆزی موزەڕ لەهۆزی ئومەییە زیاتر فەرمانبەری دەکرد تاوەکو هۆزەکانی تر، لەبەر ئەوتایبەتمەندیانەی کەبەرلەهاتنی ئیسلام لەخانەدانەدا هەبوون. کەواتە هەلْەی حسەین ئاشکرابوو، ئەمەش لەشتێکی دونیایدابوو، کەهیچ زیانێکی بۆئەو دونیای نیە، بەلاْم لەڕووی قەزاوەتی شەرعیەوە هیچ کات هەلْەی نەکردووە چونکە ئەم مەسەلەیە پەیوەستە بەگومان و تێگەشتنی ئەوەوە، ئەوگومانی دەکرد کەبۆئەنجامدانی وەهاکارێك توانایی هەیە ئەمەلەکاتێکدا ئیبن عباس و ئیبن عومەر و ئیبن الحنفیە و چەندانی تریش لۆمەیان کرد کەنەچێتە کوفەوە چونکەدەیانزانی لەم بڕیارەیدا هەلْەیە، بەلاْم حسەین ئەورێگەی هەلْیبژاردبوو لێی پاشگەز نەبویەوە، چونکە ئیرادەو ویستی خودابوو، بەلاْم صەحابەکانی تری بێجگەلەحوسەین ئیتر ئەوانەی لەعێراق و شامدا بوون یان ئەوانەی کەلە خاکی حیجازدابوون یان تابیعینەکان کە هاوکاری یەزید بوون، بڕوایان وابوو هەرچەندە یەزید گوناهبارو تاوانبارە، بەلاْم ڕاپەڕین لە دژی ڕەوانیەچونکە لەوەها ڕاپەڕینێکدا بێسەرو بەری و خوێنرێژی و کێشە دروستدەبێت هەربۆیە خۆیان لەم مەسەلەیە بەدوور دەگرت و پەیڕەویان لەحوسەین نەکرد و لەهەمان کاتیشدا ڕەخنەشیان لێدەگرت، بەلاْم بەگوناهباریان نەزانیوە چونکە حوسوین خۆی موجتەهیدو بگرە پێشەوای موجتەهیدانیش بووە نابێت تەسەوری هەلْەی کەسانێك کەهاوڕانەبوون لەگەلْ ئیجتیهادەکەی حوسەینداو هاوکاریان نەکرد بەتاوان، چونکە زۆربەیان لەصەحابە هەژماردەکران و لەگەلْ یەزید دابوون و باوەڕیان بەشۆڕش و ڕاپەڕین نەبوو لەدژی یەزید.

هەروەك چۆن حسەین لەحاڵێکدا لەکەربەلا شەڕی دەکرد و لەبارەی گەورەیی و حەقانیەتی خۆیەوە بەڵگەی بەقسەکانی ئەوان دەهێنایەوە ودەیفەرموو: لەجابری کوڕی عبداللە و ئەبو سعیدی خودری و ئەنەسی کوڕی مالیك و سەهلی کوڕی سەعد و زەیدی کوڕی ئەرقەم و نمونەی ئەمانەبپرسن.

بەهۆی ئەوەی کەهاوکاری ئەمیان نەکردبوو ڕەخنەی لێنەدەگرتن چونکە دەیزانی ئەم شێوازەی ئەوان لەسەر ئیجتیهاد بنیات نراوە هەروەك چۆن خۆیشی بەئیجتیهاد ئەو بڕیارەی دابوو. وەهەروەها نابێت خوێنەر ئەم بیرە هەڵەیەی هەبێت و وابزانێت کوشتنی حوسەین کارێکی باش بووە لەڕووەوەی کەلایەنی بەرامبەری ئەو ئیجتیهادی کردووە و بەفتوای ڕاستی موجتەهید کوژراوە. وەها قیاسێك هاوشێوەی ئەوەیە کەقازی شافیعی و مالیکی پەیڕەوانی حەنەفی لەسەر خواردنەوە نەبیز داری حەدی لێبدەن.[303] بەڵکو دەبێت بزانین کەبابەتەکەبەوشێوەیە نیە جەنگ لەگەڵ حوسەیندا و کوشتنی بەهۆی ئیجتیهادی صەحابەی ناوبراوەوە نەبوە هەرچەندە ئەمان لەگەڵ حوسەیندا لەبارەی ڕاپەڕینەوە لەدژی یەزید لەڕووی ئیجتیهادەوە دژایەتیان کردووەو، تەنها یەزیدو هاوڕێیانی شەڕیان لەگەڵ حوسەیندا کردووە.

وەهەروەها نابێت تەسەووری ئەوە بکەین لەبەر ئەوەی کەیەزید فاسیق بووە، بەڵام گروپێك لەصەحابەی پێغەمبەر ڕاپەڕینیان لەدژی ئەو بەدروست نەزانیوە کەواتە کارەکانی ئەو لەلای ئەمان ڕاست بوون، بەڵکو دەبێت ئەوە بزانین کەفەقیهەکان بەشێك لەکردەوەکانی خەلیفەی فاسیقیان بەشەرعی دەزانی و یەکێك لەمەرجەکانی ڕاپەڕینیان لەدژی خەلیفەی فاسیق لەلای ئەوان بوونی ئیمامێکی دادگەر بووەو، لەومەسەلەی کەمەبەستی ئێمەیە ئیمامی دادگەر بوونی نەبووە، کەواتەنەشەڕی حوسەین لەگەڵ یەزیدو نەشەڕی یەزیدیش لەگەڵ حوسەیندا کارێکی دروست نەبووە. بەڵکو دەتوانین بڵێین ئەم کارەی یەزید یەکێکەلەوکارانەی کەفاسیق بوونی ئەو جەخت و پشت ڕاست

---

[303] چونکە لەمەزهەبی حەنەفیدا نەبیزێك کە سەرخۆشکەرنێت حەڵاڵە هەروەك ئیمامی ئەبو حەنیفە دەڵێت: خواردنەوەی نەبیزی سەرخۆشکەر حەڵاڵی ڕەهایە(لغتنامەی دهخدا).

دەکاتەوە حوسەین لەم ڕووداوەدا شەهیدەو لەلای خودا پاداشتی هەیەو کارەکەی ئەو لەسەر حەق و بەپێی ئیجتیهاد بووە و، ئەوصەحابانەشی کەلەگەڵ یەزیددا بوون لەسەر ڕێگەی حەق و ئیجتیهاد بوون.

قازی ئەبو بەکری بن عەرەبی مالیکی لەم بارەیەوە هەڵەی کردووە ڕێگەی هەڵەی هەڵبژاردووە کەلەکتێبەکەیدا بەناوی القواصم والعواصم دا بابەت گەلێکی بەم مانایە هێناوە:(حوسەین بەپێی یاسای شەریعەتی باپیرەی خۆی کوژراوە). ئەوەی کەبووەتەهۆی ئەوەی کەبێژەری ئەم قسەیە بەهەڵەدا بڕوات بێئاگایی ئەوبووە لەمەرجەکانی ئیمامی دادگەر بۆجەنگ لەگەڵ خاوەن بیرو باوەڕەکاندایە، چونکە لەوکاتەدا چ کەسێك دەتوانێ دادگەرتر لەئیمام حوسەین بدۆزینەوە؟ بەڵام لەبارەی ئیبن الزبیرەوە دەتوانین ئەوەبڵێین ئەویش هەمان بیروبۆچوونی حوسەینی هەبووە، لەبارەی شۆڕشەوە لەدژی یەزید و هەمان گومانی هەبوو، بەڵام هەڵەی ئیبن زوبەیر لەبارەی دەسەڵاتی خانەدانەوە زۆرگەورەتربووە، چونکە هۆزی بەنی ئەسەد چ لەسەردەمی جاهیلیەت و چ لەسەردەمی ئیسلامدا هیچ کات نەیانتوانیوە بەرەنگاری ئەمەویەکان ببنەوە. وەڕێگەیەکمان نیە بۆئەوەی گفتوگۆ لەبارەی هەڵەی لایەنی بەرامبەرەوە بکەین، بەوشێوەیەی کەلەلایەن موعاویەوە لەگەڵ علی دا هەبووە. چونکە لەوێدا ئیجماع بۆئێمە حوکمی دەکرد، بەڵام لێرەدا حوکم ناکات، واتە لەوێدا هەڵەکەیان خستە ئەستۆی موعاویە، بەڵام لێرەدا و لەڕاپەڕینە کەی ئیبن الزبیردا ئیجماعێك بوونی نیە، بەڵام لەبارەی یەزیدەوە پێویستە بڵێین فیسق و خراپەی ئەم هۆکارێك بوو کەهەڵەی ئەوی دیاری دەکرد، بەڵام عبدالملك کەلایەنی ئیبن الزبیر بوو بەگەورەترینی دادگەرەکان دەژمێردرا لەناوخەڵکیدا هێندە بەسەکەلەبارەی عەدالەتیەوە بڵێین ئیمام مالیك بەڵگەی بەکردارەکانی ئەو هێناوەتەوە.

وەئیبن عباس و ئیبن عومەر و ئیبن الزبیر لەحیجازدا بوون و سەرەڕای ئەمەش زۆربەی صەحابە لەسەر ئەوباوەڕە بوون کەخەڵکی بەیعەتیان بەئیبن الزبیر نەداوە، چونکە خاوەنانی حەل و عەقد وەك مەسەلەی بەیعەتەکەی مەروان لەکاتی بەیعەتەکەی

ئەمیشدا ئامادە نەبوون، بەڵام بارودۆخی ئیبن زوبەیر بەپێچەوانەی ئەمەوەبوو، بەڵام هەموویان موجتەهید بوون و دەبێت بەڕواڵەت کارەکانیان بەحەق بزانین هەرچەندە هەڵەسەر هیچ لایەکیان ساغ نەبوبێتەوە و کوشتنی ئیبن الزبیر کەبەهۆی ئەم جیاوازیەوە ڕوویداوە لەپاش ئەوەی کەئێمە سەلماندمان کەلەڕوانگەی شەرعیەوە گونجاوە لەگەڵ یاساو ڕێساکانی ئوصوڵی فیقهدا، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئیبن الزبیر بەپێی نیەت و مەبەست و لێکۆڵینەوە وەك شەهیدێك لەلای خودا پاداشتی هەیە. ئەمەیە ئەوشێوازەی کەناکرێت کرداری صەحابەو تابیعینی پێشوو قیاس بکەینەسەری چونکە ئەمان باشترینو گەورەترینی ئومەتن و ئەگەر بیانخەینە بەر ڕەخنەو عەیب لێگرتنەوە، ئەوکات دەبێت بەکێ بڵێین دادگەرو عادیل. پێغەمبەر (ص)دەفەرمێت: (باشترینی خەڵکی ئەوانەن کەلەم چەرخەی مندا دەژین و دوای ئەوانیش ئەوانەن کەدووسێ نەوە لەدوای ئەوانەوە دێن و دوای ئەمانیش خراپە بڵاو دەبێتەوە).

کەواتە پێغەمبەر چاکەو دادگەری تایبەت کردووە بەسەدەی یەکەمی ئیسلام و سەدەکەی دواتریەوە، هەربۆیە نابێت خوێنەر بەهیچ شێوەیەك دەم بداتە ڕەخنەگرتن لەوبەڕیزانە و لەدڵیدا گومان پەروەردە بکات سەبارەت بەوان، بەڵکو پێویستە ئەوەی لەتوانایدا هەیە ڕێگەی بەدوادا چوون و لێکۆڵینەوە لەبارەی ژیانیانەوە بگرێتەبەر، چونکە ئەوان شیاوترینی خەڵکەکانو هەرچیەکیشیان کردبێت لەجەنگ هەرا بەدڵنیاییەوە لەسەر بنەمای ئیجتیهادو بەڵگەبووەو تەنها لەسەر ڕێگەی حەق و ڕاستیش گیانیان لەدەست داوە. لەگەڵ هەموونەمانەشدا پێویستە باوەڕ بەوەبکەین کەکێشەو جیاوازی ئەوان خۆشەویستی ڕێزبووە بۆ داهاتوانیان بۆ ئەوەی هەرکەسێك هەرکامێك لەوانی بەلاوە پەسەند ترە شوێنی بۆچوون و ئیجتیهادەکانی بکەوێت و بیکاتە پێشەواو ڕابەری خۆی، کەواتە پێویستە پەی بەم خاڵانەببەین و فەرمانی خودا لە ئافرێنراوەکانیدا ئاشکرابکەینو، بزانین کەخودا بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا و هەربۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە و هەرئەویش داناترە.

# بەشی سی و یەکەم

## لەبارەی پۆست و پلە ئاینیەکانی پەیوەست بەدەزگای خەلافەتەوە

لەبەرئەوەی بۆمان دەرکەوت کەحەقیقەتی خەلافەت بریتی بوو لەجێنشینی خاوەنی شەرع بۆپارێزگاری کردنی ئاین‌و سیاسەتی کاروباری دونیاییە، کەواتە پێویستە ئەوە بزانین کەخاوەنی شەرع دووکاری گرنگ لەئەستۆیدایە: یەکێکیان جێبەجێ کردنی کاروبارەکانی ئاین بەپێی تەکلیفە شەرعیەکان کە پێویستە لەسەری بەخەڵکیان ڕابگەیەنێت و خەڵکی بکاتە شوێنکەوتەیان، وە دووەمیشیان بریتیە لەجێبەجێ کردنی سیاسەت بەپێی بەرژەوەندی گشتی لەئاوەدانی و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا.

لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کەئاوەدانی شارستانیەت بۆمرۆڤ پێویستەو دەبێت بەرژەوەندیەکانی ڕەچاوبکرێت نەوەك بەهۆی چاوپۆشیەوە بەرەو لەناوچوون بڕوات. وەهەروەها باسی ئەوەشمان کرد کەدروستکردنی دەوڵەت و هێزو دەسەلأتی پاشایەتی بۆگەیشتن بەم ئامانجە بەسە، بەڵام گومان لەوەدا نیە کەئەگەر ئەرکی پاشایەتی لەگەڵ حوکمەشەرعیەکاندا بگونجێت ئەوکات بەرژەوەندی شارو وولأتەکان بەشێوەیەکی کامڵتر ڕەچاو دەکرێت، چونکە دامەزرێنەری شەرع زاناترین کەسە لەم جۆرە بەرژەوەندیانەدا. وەئەگەر مەملەکەتی ئیسلامی بێت ئەوا کاروباری پاشایەتی دەچێتە ژێر کارەکانی خەلافەتەوەو ئەگەر لەنەتەوەیەکی غەیرە موسوڵمانیشدابێت ئەولێی جیادەبێتەوە. بەرهەرحاڵ وولأت بەهەرشێوەیەك بەڕێوەببرێت دەبێت خاوەنی ڕێکخستنێك بێت بۆ کارەکانی دەوڵەتداری خزمەتگوزاریەکانی دەوڵەت دەبێت ئەرك و

کارەکان دیاری بکرێن و پلەو پایەی هەریەکە لەخزمەتکاران دیاری کراوبێت و، لەنێو پیاوانی دەوڵەتدا دابەش بکرێت ئەم کارەش بەهۆی پاشایەکەوە دەکرێت کەلەهەموو کەسێك هێزی زیاتری هەبێت و بەسەر هەموو کاروبارەکاندا زاڵبێت، بەم شێوەیە فەرمانڕەوایی پاشایەتی ڕوودەدات و دەسەڵاتی خۆی بەباشی بەڕێوە دەبات، بەڵام پلەی خەلافەتی ئیسلامی هەرچەندە لەوتێڕوانینەوەی کەباسمانکرد کاروباری پاشایەتیو ئەرکەکانی دەوڵەتداری پێوەبەندە، بەڵام هەڵسووکەتەئاینیەکانی پەیوەستن بەپلەو پایەگەلێکەوە کەتەنها لەدەزگای خەلیفەکانی ئیسلامدا هەیە و، لەهیچ شوێنێکی تر نەبینراوە. هەربۆیە ئێستە پلەئاینیە تایبەتەکانی خەلافەت باسدەکەین و دواتر باسی پلەوپایەکانی پاشایەتی دەکەین. دەبێت ئەوەبزانین کەهەموو پلەشەرعیە ئاینیەکان، وەك نوێژ (پێشنوێژی)و فتواو قەزاو دادگەری و جیهاد و موحتەسیبی لەژێر ناوی ئیمامەتی گەورە یان خەلافەتدا جێگەی دەبێتەوە، هەروەك بڵێی خەلافەت وەك دەزگایەکی ڕابەری گەورە و ڕیشەدار و کۆو تەواوەو هەموونەمانەش واتە ئەوپلەو پایانەی کەباسمانکردن لەوەوە سەرچاوە دەگرن و چوون بەناویەکدا.

**پێشنوێژی:** ئەم پلەیە باڵاترین پلەکانی دەزگای خەلافەت و لەپێشترە لەهەمووپلەو پایەکانی تر بەتایبەت بەرزترە لەپلەی پاشایەتی کەهەردووکیان لەژێر مانای خەلافەتدا کۆدەبنەوە بەڵگەی ئەمەش بەڵگەهێنانەوە صەحابەیە لەبارەی ئەبوبەکرەوە خوای لێ ڕازی بێت، لەبەر ئەوەی لەمەسەلەی نوێژدا کرایە جێنشینی پێغەمبەر دەبینین لەسیاسەتیشدا کرایەجێنشین و گوتیان مادەم پێغەمبەر ڕازی بووە لەسەر پێشنوێژی کردنەکەی ئەوا بەدڵنیاییەوە شیاوە بۆخەلافەتیش، کەواتە ئەگەر نوێژ پلەوپایەی لەخەلافەت بەرزتر نەبوایە وەها قیاسێك ڕاست دەرنەدەچوو، لەبەر ئەوەی گرنگی نوێژو پێشەوایەتی سەلمێنرا دەبێت ئەوەبزانین کەمزگەوتەکان لەشارە گەورەکاندا لەسەر دووشێوەن: یەکەم مزگەوتە گەورەکان کەخەڵکانێکی زۆر ڕوویان تێدەکەن و نوێژی هەینی تێدا دەکەن، و دووەمیش مزگەوتە بچووکەکانن کەتایبەتن بەهۆزێکی بچووك یان

گەڕەك و ناوچەیەكی سنورداری بچوكەوە و نوێژی هەینیان تێدا ناكرێت، بەڵام كاروباری مزگەوتەگەورەكان لەدەستی خەلیفە یان كەسێكدایە كەئەودیاری دەكات وەك سوڵتان یان وەزیر یان قازی، خەلیفەش بۆ بەجێگەیاندنی هەرپێنج نوێژەكەو نوێژی جەژنەكان قوربان و ڕەمەزان و خۆرگیران و مانگگیران و نوێژەبارانە كەسێك بۆئیمامەت دیاری دەكات و، ئەم كارەش بەتێروانین لەباشترینەكان ئەنجام دەدرێت بۆئەم كارە و بەرەچاوكردنی بەرژەوەندی گشتی و پێشێل نەكردنی مافی هیچ كەسێك دەبێت. هەندێك لەفەقیهەكان كەباوەڕیان بەواجب بوونی نوێژی هەینی هەیە و هەموو نوێژەكانی تریش بەواجب دەزانن، بەڵام كاروباری مزگوت تایبەتە بەخەڵكانێكی دیاری كراو كەلەنزیك مزگەوتەكاندا دەژین و پێویستیان بەچاودێری كردنی خەلیفەیان سوڵتان نیە. حوكمەكانی موتەوەلی بوونی مزگەوتەكان و هەلو مەرجەكانیان ناسراوە و لەكتێبە فیقهیەكان و هەروەها لەكتێبی (احكام السولتانیە)ی دانراوی ماوەردیدا باسكراوەو، خەڵكانی تریش بەهەمان شێوە ئەم كارەیان ئەنجام داوە و ئێمەلێرەدا درێژەی پێنادەین‌و باسی هەموویان ناكەین.

خەلیفەكانی ئیسلام ئەم ئەركەیان بەیەكتر نەدەسپارد و بەگەڕانەوە بۆمێژووی ژیانیان بۆمان دەردەكەوێت كەچۆن هەندێكیان لەكاتی بانگی نوێژدا لەمزگەوت خەنجەریان لێدراوە وەك حەزرەتی عومەرو حەزرەتی علی خوایان لێ ڕازی بێت چاوەڕوانی هاتنی نوێژەكان بوون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەئەوان خۆیان ئەم ئەركەیان لەئەستۆدا بووە و كەسیان لەشوێنی خۆیاندا بۆئەم كارە دیاری نەكردووە. وەهەروەها پیاوانی دەوڵەتی ئەمەوی بەهۆی گەورەیی و ڕێز پلەو پایەی بەرزی پێشنوێژی و ئیمامەتەوە ئەم كارەیان تایبەت كردبوو بەخۆیانەوە. هەروەك دەگێڕنەوە كەعبدالملك ی كوڕی مەروان بەحاجیبەكەی خۆی گوتووە: من حاجیبی دەرباری خۆمم بەتۆ سپاردووە بێجگە لەسێ شت نەبێت و، ڕێگەبەكەس نەدەیت كەبەبێ فەرمانی من ئەوكارانە ئەنجام بدەن ئەوانەش بریتین لە: خان سالاری (خاوەن خواردنی

خەلیفە)چونکە دواکەوتنی دەبێتەهۆی خراپ بوونی خواردنەکە، وەهەروەها بانگبێژ کەدێت بۆلای من چونکە ئەو مرۆڤ بۆلای خودا بانگدەکاتو، بەرید یان پۆستەچی چونکە دواکەوتنی کاری ئەو دەبێتەهۆی تێکچوونی کاروباری سنورەکانو ناوچەکانی دوور لەپایتەخت. لەبەر ئەوەی کەکاروباری دەوڵەتداری سەڵتەنەت گەڕایەوە سەردۆخ و تایبەتمەندیەکانی جارانی و کەوتەوەسەر ڕێگەی ئاسایی خۆی سەردەمی توندی کارەکان و دوورکەوتنەوە لەبەرابەری لەگەڵ خەڵکیدا لەکاروباری دینی و دونیاییان، دەبینین لەنوێژیشداواتە بۆهەرپێنج فەرزەکە ئیمامیان داناوو تەنها لەنوێژە کانی هەینی جەژن و نوێژەبارانەو خۆرگیران و مانگ گیراندا نەبێت خەلیفە ئیمامەت و پێشنوێژی بۆخەڵکی نەدەکرد و زۆرێك لەخەلیفەکانی عەباسی و عەبیدیەکان لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵە تەکەیانەوە بەم جۆرەی ڕەفتاریان دەکرد.

**فتوادەرکردن:** ئەمەش ئەرکێك بوو کەلەژێر چاودێری ڕاستەو خۆی خەلیفەدا بوو دەبوایە ئەو لەبارەی زانایانی ئاین و مودەڕیسەکانەوە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ووردی بکردایە، ئەم ئەرکانەیشی بەکەسانێك دەسپارد کەشایستەی بن و لەکارەکانیاندا هاوکاری دەکردن و ئەوانەی کەدەردەکەوت شیاوی ئەو پلەو پایەیەنین دووری دەخستنەوە، چونکە مەسەلەی فتوا پەیوەستە بە بەرژەوەندی گشتی موسوڵما نانەوە و واجبە خەلیفە ڕەچاوی بکات نەوەك کەسێکی نەشیاو ئەوئەرکە بگرێتەدەست و ببێتە هۆی گومرایی خەڵك. وەئەرکی مودەڕیسەکان ئەوەیە کەلەمزگەوتەکاندا دابنیشن و سەرقاڵی وانە ووتنەوەبن. ئەگەربێت و مودەڕیسەکان لەمزگەوتە گەورەکاندا کەخەلیفە کاری تەولیەتی گرتونەتە ئەستۆ سەرقاڵی ووتنەوەی وانەبن ئەوادەبێت مۆڵەت لەخەلیفە وەربگرن، بەڵام ئەگەر لەمزگەوتە کانی تردا ئەم کارەبکەن ئەوا پێویستی بەمۆڵەت نابێت، بەڵام پێویستە هەریەکەلەمودەڕیس و موفتیەکان خاوەنی بەرپەرچ دەرەوەی ویژدانی بن و لەکاری قەزاوەت و فتوادان کەتوانایان نیە بگێڕێتەوە تاوەکو ئەوانەی کەبەدوای ڕێنمایدا دەگەڕێن نەکەونە گومراییەوە.

لەسونتەتیشدا هاتووە کەبوێرترینتان بۆ فتوادان بوێرترینتانە بەکورەئاگرەکانی دۆزەخ. هەربۆیە سوڵتان دەبێت چاودێری کاری ئەم گروپەبکات و بەرژەوەندی خەڵکی لەبەر چاوبگرێت و لەمۆڵەت پێدان و ڕەتکردنەوەیاندا وردەکاری بکات، بەڵام پلەی قەزاوەت یەکێکە لەوپلەو پایانەی کەدەچنەخانەی ئەرکەکانی خەلیفەوە، چونکە پلەی قەزاوەت و داوەری بۆ نەهێشتنی کێشەو گرفتەکانی خەڵکیە، چونکە بەم شێوەیە گیروگرفتەکانی خەڵکی چارەسەر دەبن و بنەبڕدەکرێن، بەڵام ئەم داوەریە دەبێت بەپێی بنەماکانی شەرع بێت کەلەکتاب (القران)و سوننەت (حەدیسەکان)نەوە وەردەگیرێت هەربۆیە بەیەکێك لەئەرکەکانی خەلیفە دەژمێردرێت و سەر بەکارە گشتیەکانی ئەوان بووە و، خەلیفەکان لەسەرەتای فەرمانڕەوایی ئیسلامدا ئەم ئەرکەیان لەئەستۆدابووە و هیچ شتێکیان لەکاروباری دادوەری و قەزایان بەهیچ کەسێك نەسپاردووە. یەکەمین خەلیفەیەك کەئەم کارەی بەکەسانی ترسپارد خەلیفەعومەر بوو کەئەبو دەردائی لەمەدینەدا کردە یاریدەدەری خۆی لەکاروباری قەزاوەتدا و، شورەیحی لەبەصرە و ئەبوموسای ئەشعەری لەکوفە کردنیە قازی ئەوشوێنانەو لەم بارەیەوە نامەیەکی بۆئەبو موسا نارد کەزۆربەناوبانگە و حوکمەکانی دادگەری تێدابوو بەشێوەیەکی تێرو تەواو. خەلیفە عومەر لەونامەیەدا دەڵێت: (لەپاشان (امابعد) داوەری فەریزەیەکی بەهێزو دامەزراوە و سوننەت و نەریتێکە کەدەبێت پەیڕەوی لێبکەین و هەرکات هەردوو لایەنی دەعواکە هاتنەلای تۆ بۆکێشەیەك، بەوردیەوە مەسەلەکەتێبگەو لێکۆڵینەوەی بکە بۆئەوەی حەقیقەت بەدەست بهێنی چونکە قسەکردنی حەق و ڕاست سودی نابێت کاتێك کەبێژەرەکەیان زانیاری تەواوی لەوبارەیەوە نەبێت. لەبۆچوون و تێڕوانینی هەردوولای کێشەکە وورد بەرەوە و دادگەری بکەبەپیشەو بۆئەوەی هیچ زیردەستێك سەبارەت بەخۆی تەماع نەکاتە گیانی تۆ و هیچ بێتوانایەکیش لەعەدالەت و دادگەری تۆ بێئومێد نەبێت. بەڵگەو دەلیل لەسەر بانگەشەکارو سوێندیش لەسەر ئەوکەسەیە کەئینکاری دەکات، ئاشتەوایی کردن لەنێوان موسوڵمانان لەکێشەکانیاندا شتێکی ڕەوایە و مەگەر

صولحێك كەحەلاڵێك حەرام بكات و حەرامێكیش حەلاڵ بكات. ئەگەر هاتووئەمڕۆ داوەریەکت کردوو بۆسبەی بیرت کردەوە و بۆت دەرکەوت کەداوەریەکەی دوێنێت نادادگەرانەبووە ئەوا بەبێ وەستان ڕاستی بکەرەوە و نەکەی کەدادگەری یەکەمت ڕێگەی ئەوکارەت لێبگرێت و عەدالەت جێبەجێ نەکەیت. چونکە حەق لەپێش هەموو شتێکەوەیەو گەڕانەوەبۆی باشترە لەسووربوون لەسەر حەق و بەتاڵ. ئاگاداربە دیسانەوە ئاگاداربە، لەبارەی ئەوەی کەبەبیرتدادێت و لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەردا دەقێك لەوبارەیەوە نەهاتبێت ئەوکات هاوشێوە و هەڵەکان بناسەو شتەکان لەگەڵ هاوشێوەکانیاندا هەڵبسەنگێنە.

کەسێك کەبانگەشەی ئەوە دەکات بەڵگەی سەلماندنی ڕاستی لەدەستدانیە تۆش ماوەی بدەرێ و کاتێکی بۆدیاری بکە ئەگەرهات و لەوماوەیەدا بەڵگەکانی هێنا ئەوا لەسەر حەق بوونی ئەو حوکم دەکەیت و، وەگەرنا مەسەلەکەی بەحەلاڵ دەژمێریت چونکە بەم شێوەیە زیاتر گومان لەناودەبرێت و شاراوەیی ناڕوونی مەسەلەکە ئاشکرادەبێت. موسوڵمانان گەواهیدەری ڕاستین بۆیەکتری مەگەرکە سێك حەدی شەرعی لەبارەیەوە جێبەجێ کرابێت یان کەوتبێتە ناوجێبەجێ کردنی شاهێدی دانی درۆوە یان لەنەسەب و وەلائدا تۆمەتبار بێت چونکە خودا تەنها داوەرێکە کەلەسوێندو بەڵگەکان دەگوزەرێت وپێویستیان پێی نیە. ووریابە لەکاتی داوەری کردندا بێسەبری نیشان نەدەیت و بەهۆی ماندوبوونەوە ئۆف بەهیچ کەسێك نەڵێیت، چونکە پایەدارکردنی حەق و ڕاستی و لەلای خودا زۆرگەورەیەو دەبێتەهۆی ناوبانگی باشەو خێر (والسلام)کۆتایی نامەکەی خەلیفە عومەر. خەلیفەکان پلەی داوەری لەگەڵ ئەوەی کەلەئەرکەکانی خۆیان بوو دەیاندایە دەست کەسانی تر چونکە ئەوان سەرقاڵی مەسەلەی حەل و عەقد و سیاسەتی گشتی وولات بوونو، ئەمەش ئەرکێکی قورسی دەخستە سەرشانیان وەك جیهاد و فتوحات و پارێزگاری کردن لەسنورەکانی وولات و پارێزگاری لەدەسەلاتی ئیسلامی. ئەم ئەرکانە کەزۆر جێی گرنگی ئەوان بوون بەخەڵکی تریان نەدەسپاردن.

هەربۆیە چارەسەری کێشەکان و داوەری کردن لەنێوان خەڵکیدا هێندەی کارەکانی تر گرنگ نەبوو بەلایانەوە هەربۆیە لەبەر قورسی ئەرکەکانی سەرشانیان ئەوکارەیان بەخەڵکی تر دەسپارد، بەڵام لەگەڵ هەمووئەمانەشدا ئەوکارەیان بەکەسێك دەسپارد کەلەخزم و نزیکەکان و نەسەب و عەصەبیەتی خۆیان بوایە و بەکەسانێکیان نەدەسپارد کەلەخۆیانەوە دووربونایە، بەڵام حوکم و هەلومەرجەکانی ئەم پلەو پایەیە لەکتێبەکانی فیقهو بەتایبەت لەکتێبەکانی ئەحکامی سوڵتانیدا ناسراوە. چونکە ئەرك و ئیشی قازی لەسەردەمی خەلیفەکاندا تەنها تایبەت بووە بەچارەسەر کردنی کێشەکانی نێوان خەڵکیەوە، لەپاشان ووردە ووردە بەهۆی زۆربوونی سەرقاڵیەکانی خەلیفەو سوڵتانەکانەوە بەکاری سیاسەتی گشتی،و، کۆمەڵێك کاری گرنگی تری وەك دەوڵەتداریەوە سەرەرای کاروباری قەزاوەت کۆمەڵێك کاری گرنگی تریشیان دایە دەست کەسانی تر. سەرئەنجام سەرەرای پلەو پایەی قەزاوەت و پێ ڕاگەیشتن بەکێشەو گرفتەکانی خەڵکی و چارەسەرکردنیان کۆمەڵێك کاری تریش کەوتە سەرشانیان وەك چاودێری کردنی ماڵی ئەوانەی کەلەبەرهۆکارێکی تایبەت حیجریان خراوەتە سەرو قازیەکان سەرپەرشتی ماڵ و سامان و ژیانیان دەکەن لەخەرجی ڕۆژانە و پێداویستیەکانیاندا، وەك شێتەکان و هەتیوان و سەفیهان و ئەوانە کەلەکاری بازرگانیدا شکستیان خواردووە و پێڕاگەیشتن بەوەصیەتی موسوڵمانان و کاروبارەکانی وەقف و هاوسەرگیری بێوەژنان [٣٠٤] لەکاتی لەدەستدانی سەرپەرشتەکانیاندا بەپێی بیروباوەڕی ئەوانەی کەلەم بارەیەوە بۆچوونیان داوە.

وەهەروەها چاودێری کردنی بەرژەوەندی شەقام و خانووەکان، و لێکۆڵینەوە لەمەسەلەی شاهێدو ئەمینەکان و ئەوانەی کەدەبنەجێگری یەکتری و بەدەستهێنانی زانست و ئاگاداری ئەوان سەبارەت بەوان لەڕێگەی عەدالەت و جەرح و تەعدیل، بۆئەوەی

---

[٣٠٤] (وَأنكِحُوا الأيامى مِنكُم) س ئا ٢٤ و ٣٢ (١)فەقیهێکی ناسراوبووە لەسەردەمی موعاویەدا کەلەتەمەنی ٨٠ ساڵیدا وەفاتی کرد .

لەبارەیانەوە دڵنیایی پەیدا بکەن، ئەمانە هەموونەوشتانەبوون کەپەیوەست بوون بەدادگاو قەزاوە. خەلیفەکانی پێشویش کاروباری دادگاکانیان بەکەسانی تر دەسپارد کەئەرکێکی پێکهاتوو بوو لەدەسەلات و سەڵتەنەت و عەدالەت و ئینصاف و قەزاوەت‌و پێویستی بەتوانایی هێزێك هەبووکەمرۆڤ ناڕەحەت دەکات تاوەکو بتوانێت ستەمگەر سەرکوت بکات و دەستدرێژی کاران لەکارەکەیان بووەستێنێت و شتانێکی جێبەجێ دەکرد کەقەزاوەت و ئەوانی تر نەیاندەتوانی جێبەجێی بکەن. وەئەو سەرقاڵی پێڕاگەیشتن بەبەڵگەو سەنەدەکان و تەئدیب و پشت بەستن بەبەڵگە و قەرینەکان و دواخستنی حوکمەکان تاوەکو ڕاستیەکان ڕوون دەبنەوە و ناچارکردنی هەردوو لایەنی کێشەکە بەئاشتی کردن و سوێنددانی شاهێدەکانەوە دەبوو ئەم جۆرە کارو ئەرکانە لەسنوری کارەکانی قازی فراوانتر بوون. خەلیفەکانی ڕابوردو تاوەکو سەردەمی موهتەدی لەبەنی عباس هەموو ئەم ئەرکانەیان تەنهابەخۆیان ئەنجام دەدا و، زۆرێك لەکاتەکانی تایبەت بەوکارانەیان بە قازیەکانیان دەدا، هەروەك علی ڕەزای خودای لێبێت ئەم جۆرەکارانەی بەقازی ئەوسەردەمە ئەبو ئیدریسی خولانی (١)سپاردو مەئمون کاری قەزای دایەدەستی یەحیای کوڕی ئەکسەم و معتەصەمیش ئەم ئەرکەی بەئەحمەدی کوڕی ئەبی داود سپارد.

هەرچەندە خەلیفەکان کاروباری قەزاوەتیا دەدایە دەستی قازیەکان، بەڵام هەندێك جاریش کاروباری لەشکریشیان پێدەسپاردن و وەك سەرلەشکر دیاریان دەکردن بەتایبەت لەجەنگە هاوینەکاندا، هەروەك چۆن یەحیای کوڕی ئەکسەم لەکاتی هاویندا دەچووە جەنگی ڕۆمەکان، وە هەروەها مونزیری کوڕی سەعیدقازی عبدالرحمان الناصر لەبەنی ئومەییەی ئەندەلوس کاروباری سوپاو جیهاد و لەشکری لەژێردەستدا بوو. هەربۆیە ئەم جۆرەکارانە تایبەت بوون بەخەلیفەکانەوە یان دەیانسپاردن بەوەزیرو سوڵتانەکان. وەهەروەها چاودێری کردنی تاوانەکان و جێبەجێ کردنی حەددە شەرعیەکان لەدەوڵەتی عباسی ئەمەویەکانی ئەندەلوس و عبیدیەکانی میسرو مەغریبدا

بەدەستی خاوەنانی پۆلیس بووە کە سەرۆکی شارەوانی بووە. ئەم پلەیە لەدەوڵەتەکانی ناوبراودا بەتایبەت وەك یەکێك لەئەرکە ئاینی وتەکلیفە شەرعیەکان دەژمێردرا و دائیرەی چاودێری (ئەزارەت)لەوەدا و لەحوکمەکانی قەزاوەتدا کەمێك فراوانتر بوو، هەروەك چۆن لەحوکمی تۆمەتدا ماوەیەکیان دانابوو بەرلەوەی تاوانبار بەتەواوەتی تۆمەتەکەی بەسەردا بسەپێت، واتە لەقۆناغی تاوانبار بوونەکەیدا هەندێك حەددی شەرعیان وەك تەئدیب بەسەر داجێبەجیێ دەکرد و لەبارەی قیصاص و بەهاکانی خوێنەوە (فیدیە) حوکمیان دەداو، ئەوانەی کەبەتەواوەتی تاوانەکەیان بەسەرداساغ نەدەبوویەوە سزاگەلێکیان بەسەردا جێبەجیێ دەکردن بەمەبەستی وازهێنانی یەکجارەکی لەو تاوانانەو ئەدەب کردنیان. ئەوکات چۆنیەتی ئەم دووپلەیە لەو دەوڵەتانەی کەمەسەلەی خەلافەت تێیاندا لەبیر کرابوو پلەی ڕاگەیشتن بەتاوانباران لەدەستی سوڵتاندا بوو ئیتر لەلایەن خەلیفەوە پێی سپێردرابێت یان نا.

ئەرکی پۆلیس (شارەوانی)دەبێت بەدووبەشەوە: یەکێکیان ئەرکی پێڕاگەیشتن بەتاوان‌و تاوانباران و جێبەجیێ کردنی حەددەکان و سزادانی دزو جەردە و مەسەلەی خوێن وقیصاص، ئەوەی کەلەلایەن قازیەوە دیاری دەکرا، لەدەوڵەتانی ناوبراودا بۆ ئەم لایەنە حاکمێکیان هەڵدەبژارد کەبەپێی پێداویستی سیاسەت و بیێ گەڕانەوە بۆ حوکمە شەرعیەکان فەرمانڕەوایی دەکردو، هەندێك جار پێیان دەگووت والی و هەندێکجاریش پێیان دەگووت پۆلیس (شورتە). ئەوکات بەشی سزادان و جێبەجیێ کردنی حەددە شەرعیەکان لەوتاوانانەی کەلەڕوانگەی شەرعەوە دەسەلمێنرا دەیانسپارد بەقازی‌و ئەویش ئەم ئەرکەی لەگەڵ ئەوئەرك و تەکلیفانەی کەپێشتر باسمانکردن لەئەستۆی دەگرت و بەشی کۆتایی لەپاشکۆی ئەرکەکانی دادەنران و ئەم بارودۆخەش تاوەکو ئێستە بەم شێوەیە و بەردەوامە و، پلەی ناوبراو تاوەکو ئێستەش تایبەت نیە بەخزمانی عەصەبیەتی دەوڵەتەوە، چونکە چۆنیەتی فەرمانڕەوایی تائەوکاتەی بەشێوەی خەلافەتی دینی بوو ئەم پلەوپایانەش وەك مەراسیمەئاینیەکان حیسابیان بۆدەکرا و

ناچاربوون پلەکانی ناوبراو بێجگەبەخانەدانی عەصەبیەتی خۆیان بەکەسی تری نەسپێرن، ئەوانەش لەغەزاکاران و مەوالی و هاوسوێنانی ئەمان بوون یان لەڕیزی بەندەکان و هەوابازانی پەروەردەکراوو نمەک کردووی ئەوان دەژمێردران و لەوانەبوون کەلەوئەرکانەی کەپێیان دەسپێردرا بۆ ڕاپەڕاندنیان پێویستیان بەمان نەبوو بەباشی بەڕێوەیان دەبردن‌و باوەڕپێشیان پێیان هەبوو. بەڵام لەوسەردەمەی کەخەلافەت پوکایەوە و ئەوشێوازەی حکومەت نەما و هەمووشتەکان بوونە پاشایەتی و سەڵتەنەت ئەم جۆرەکاروو پیشەو پلەوپایە ئاینیانەش تائەندازێك لەدەزگای دەوڵەتەوە دوورکەوتنەوە، چونکە پلە ناوبراوەکان لەڕیزی نازناوو مەراسیمە پاشایەتیەکاندا نین.

سەرەڕای لەناوچوونی خەلافەتیش پاش ماوەیەك کاروبارەکان لەدەستی عەرەب دەرچوو پاشایی دەوڵەتداری و کەوتەدەستی نەتەوەکانی وەك تورك بەربەروکان و لەئەنجامدا دەسەلاتدارانی پێشووی خەلافەت لەدەسەلات دوورکەوتنەوە و کەوتنە دەستی نزیکانی خەلافەت و عەصەبیەت، چونکە عەرەب باوەڕیان وابوو کەشەریعەت و ئاین و پێغەمبەر (ص)لەوانەو حوکم و شەریعەتەکانی داب و نەریتی ئەمانە لەناو میللەتاندا، بەڵام نەتەوەکانی تر وەها بیرو باوەڕێکیان نەبوو بەڵکو پلەوپایە ئاینیەکانیان تەنها لەڕوانگەی گەورەیی ئاینەوە دەگرتەدەست بۆئەوەی لەم ڕێگەیەوە لەخەڵکی نزیك ببنەوە. هەربۆیە ئەوان کەسانێکیان بۆپۆست و پلەو پایەکانی دەوڵەت هەڵبژاردووە کەلەخانەدان و عەصەبیەتی خۆیان نەبوون، بەڵام بەهۆی لێهاتوویانەوە شایستەی ئەو ئەرکانە بوون دادەنا و لەماوەیەکی دوور و درێژدا لەناوخۆشگوزەرانیدا دەژیان و تاڵی‌و ناخۆشیەکانی دەشتەکیەتیان لەبیر دەچوویەوە و لەسەرژیانی شارنشینی‌و خۆشگوزەرانی ڕادەهاتن و، بەم هۆیەشەوە خووی بەرگری کردن لەخۆیان تێدا نەدەماو پلەو پایەی دەوڵەت لەپاش خەلیفەکانەوە دەدرایەدەستی ئەم کەسە بێتوانا شارنشینانەو وورده وورده خاوەن پلەکانی ناوبراو ڕێزیان لەدەست دەدا، چونکە لەڕوانگەی خانەدان و نەسەبەوە شایستە نەبوون و، ئەوانیش وەك شارنشینەکان بۆ

بەرگری لەخۆیان و دەوڵەتەکەیان پشتیان بەسوپاو لەشکر بەستووە، هەربۆیەبەسوک سەیردەکران و ئیعتیباو ڕێزیان لەدەزگای دەوڵەتدا تەنها لەبەر ئەوەبووە کەدەوڵەتەکان بەکاری گەلەکەیانەوە ڕادەپەڕین و حوکمەشەرعیەکانیان جێبەجێ دەکردو، لەبەر ئەوەی ئەوگروپە شارەزاییان لەشەریعەت هەبووە لەوبارەیەشەوە فتوایان دەرکردووە هەربۆیە لەلایەن دەوڵەتەوە گرنگیان پێدراوە هەربۆیە ئەوگروپە لەوسەردەمەدا لەبەر خۆیان نەبوونەتە جێگەی ڕێز بەڵکو ئەگەر باسی گەورەیی و بڵندی پلەو پایەیان بکرایە ئەوا بەهۆی بەگەورەڕاگرتنی پلەو قۆناغە شەرعیەکانەوە بووە و حەلو عەقد بەهیچ شێوەیەك لەدەستیاندا نەبووەو، ئەگەریش سەرۆکی دەوڵەتیش لەگەڵیاندا ئامادەبوایە تەنها لایەنێکی فەرمی هەبووە و حەقیقەتی تێدانەبووە، چونکە حەقیقەتی دەستێوەردانی فەرمانڕەوایی بۆئەوکەسانەیە کەتوانایان هەیە و ئەوانەشی کەتوانای ئەوئەرك و کارانەیان نیە، هیچ کاریگەریەکیان لەحەل عەقد و کاروبارەکانی تردا نابێت.

مەگەر ئەوەی کەبڵێن حوکمەشەرعی و فتوا کانیان لێ وەربگیرێتەوە، کەدەبێت وابکرێت. خوداش بێنیازکەرە.هەرچەندە هەندێك لەخەڵکی پێیان وایە ئەم شێوازە لەسەر داخوازی حەقیقەت نیە و کاری پاشاکان لەدەرکردنی فەقیهو قازیەکان لەکاروبارەکانی دەوڵەتو، ڕاوێژ نەکردن پێیان لەکارەکانداشتێکی شەرعی و پەسەندە، چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی: زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن.[٣٠٥] بەلام دەبێت ئەوە بزانین کەئەم بۆچوونە هەڵەیە، بەڵکو پاشایەتی و سەڵتەنەت لەسەر ئەوبنەمایانەیە کەسروشتی ئاوەدانی کۆمەڵگا حوکم دەکات وەئەگەر لەمە بەدەربوایە ئەوا دەزگای پاشایەتی لەقۆناغی سیاسەت دوور دەکەوتەوە سروشت و ئاوەدانی و کۆمەڵگا لەبارەی ئەوگروپەوە هیچ کات بەڕاست نەدەهاتەوەو، پێویست ناکات هیچ جۆرە دەستوەردانێکیان هەبێت لەمەسەلەکانی حەل و عەقددا و، هیچ پلەیەکیشیان نەبێت چونکە ڕاوێژ لەکاروبارە کانی

٣٠٥ (العلماء ورثة الانبياء).

دەوڵەت و حەل و عەقدی کارەکان تەنها ئەوکەسانە دەتوانن بیانگرنە دەست کەخاوەنی عەصەبیەت بن.

بۆئەوەی بەهۆیەوە بتوانن کاروبارەکانی ئەمرو نەهی بەباشی بەڕێوەبەرن، کەسێکیش هیچ عەصەبیەتێکی نەبێت و توانای نەبێت خۆی لەدەستدرێژی کاران بپارێزێت و لەم بارەیەوە پشتی بەخەڵکی تر بەستبێت بەدڵنیاییەوە ناتوانێت هیچ دەستوەردانێکی لەکاروبارەکانی ڕاوێژکردندا هەبێت و هیچ مانایەك نابێتە نمونەی ئیعتیباری ئەو لەکاری مەشوەرەت و ڕاوێژدا. بەڵێ مەگەر ئەوەبڵێین ڕاویژ لەگەڵ ئەم کەسانەدا لەبارەی هەمان مەسەلەی حوکمەکانی ئاینەوەیە کەزانیاریان هەیە لەبارەیانەوە بەتایبەت لەبارەی ڕاپرسیەوە، بەڵام ئەوان لەقۆناغی ڕاوێژ کردنەوە دوورن چونکە عەصەبیەتیان نیە و شارەزای سیاسەت نین و ڕێزگرتنیان لەلایەن پاشاو ئەمیرەکانەوە بەهۆی چاکەی خۆیانەوەیەو ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەباوەڕێکی باشیان بەئاین هەیە و هەرکەس‌و، هەرشتێك دوور و نزیك پەیوەندی بەئاینەوە هەبێت ڕێزی لێدەگرن، بەڵام لەبارەی گووتارەکەی پێغەمبەرەوە (ص)کەفەرموویەتی زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن، دەبێت بزانین کەفەقیهەکان لەم سەردەمە و ڕۆژگارەکانی نزیك لەوەوە تەنها لەقسەدا زاناو دانای بنەماکانی شەرعن و ئەوان لەچۆنیەتی کردارەکانی پەیوەست بەپەرستشەکان‌و، چۆنیەتی داوەری کردن لەسەوداوامەڵەکاندا (العبادات والمعاملات) بۆ ئەوکەسانەی لەبواری کرداردا پێویستیان پێیەتی بەپێی دەقەکان دەگێڕنەوە و، لایەنی زۆری ئەوەی کەلەبارەی گەورەکانیانەوە دەتوانین بیگێڕینەوە هەرئەمەیە، بەڵام ئەوان بێجگەلەکەمێکی لەوەی کەدەیگێڕنەوە و ئەویش لەهەندێك حاڵەتدا کاری پێناکەن و سیفەتە باسکراوەکانیان تێدانیە.

ئەمەلەکاتێکدا گەورەکانی سەلەفی صالح ڕەزای خودایان لێبێت و موسوڵمانانی ئاین پەروەر و لەخواترس لەڕێگەی لێکۆڵینەوە بەپێی بنەماو شێوازەکانی شەریعەت ئاشناییان هەبووە و بەوبنەمایانەش ناسراون. هەربۆیە هەرکەسێك وەصفدارکرابێت

بەشارەزایی لەبنەمانی شەرع و ئاین و لەرێگەی لێکۆڵینەوەوە بیانزانێت، نەوەك لەرێگەی گێڕانەوەوە، ئەوابەمیراتگر دەژمێردرێت هەروەك ئەوکەسانەی کەلەکتێبی قشیریەدا سیفەتەکانیان باسکراون. وەهەرکەسیش ئەم دووشتە واتە زانستی شەریعەت و تایبەت بوونی بەگێڕانەوەیەوە لەهەرکەسێکدا هەبێت ئەوا ئەوکەسە زاناو میراتگری ڕاستەقینەیە، وەئەو فەقیهانەی کە لەزومرەو ڕیزی تابیعیندا بوون و سەلەفی صالح و هەرچوار ئیمام و پێشەواکەی دین (مالکی حنفی شافیعی حنبلی)و، ئەوانەی تریش کەلەسەر ڕێچکەی ئەمان بوون و هەنگاو بەهەنگاو شوێن خەصڵەت و سیفەتەجوانەکانیان کەوتوون و پەیڕەویان لێکردوون. وەهەرکات یەکێك تایبەت بێت بەیەکێك لەم شتانەوە لەوکاتەدا ناوزەد کردنی عابید بەواریس شایستەترە تاوەکو فەقیهێك کەعابیدێکی تەواونیە، چونکە شارەزا سیفەتێکی واریسی پێگەشتووە ئەمەلەکاتێکدا فەقیهی ناشارەزا شتێکی وای بەمیرات نەبردووە و، تەنها خاوەنی کۆمەڵێك گوتارە و کەدەقەکەیان لەچۆنیەتی کرداردا بۆئێمە دەگوازێتەوە ئەمانەش زۆرتر فەقیهەکانی سەردەمی ئێمەن و ژمارەیان زۆر کەمە.

**عەدالەت:** ئەمەش بریتیە لەئەرکێکی ئاینی کەلەشوێنکەوتەکانی داوەری و قەزاو بوارە کرداریەکانیەتی، حەقیقەتەکەی هەستانە بە فەرمانی قازی بۆ گەواهی دان لەنێوان خەڵکیدا لەبارەی ئەوەی کەزیانبارەو سودبەخشە بۆیان بەشێوەی گێڕانەوەی گەواهیەوە لەکەسێ ترەوەو، بوون بەجێنشینی لەدانانی ئەو لەکاتی ئامادەبوونی شاهێدەکان و ئەدای شاهێدیەکەلەکاتی کێشەو نوسینیەوە لەتۆمارەکاندا کەماف و موڵك و قەرزو مامەڵەکانی تری خەڵکی دەپارێزرێت.

ئەوەی کەگوتمان بەمۆڵەتی قازی، بەهۆی ئەوەوەیە کەخەڵکی ڕوویان کردووەتەخراپەو کاری جەرح و تەعدیل بێجگەلەقازی بۆخەڵکی تر شاراوەیە. هەربۆیە قازی ڕێگە بەوکەسانەدەدات کەعەدالەتیان تێدایە شاهێدی بدەن بۆئەوەی بەم شێوەیە بتوانێت کاروبارو موعامەلاتەکانی خەڵکی بپارێزێت. مەرجی بوون بەعادل پابەندبوونە بەعەدالەتی شەرعی و دووربوونە لەجەرح. خاوەنانی ئەم ئەرکە دەبێت کاربەدەستی

نوسینی دەفتەری تۆمارو عەقدەکان بن لەڕووی دەستەواژە وڕێکخستنی بەشەکانیان و، بەهێزی مەرجی شەرعی عەقدەکانەوە ووردەکاربن،و هەربۆیە وەها کەسێك کەمێك پێویستی بەشارەزا یی لەفیقهدا دەبێت. بەهۆی هەل ومەرجەناوبراوەکان و پێویستبوونی خۆڕاهێنان و لێهاتووییەوە تێیاندا ئێستە عەدالەت تایبەت بووە بەکەسانێکی عادیلەوە هەروەك بڵێی ئەم حەقیقەتە تەنها تایبەتە بەبەشێکەوە کەئەم کاروبارەیان بەدەستەوەیە، ئەمەلەکاتێکدا ڕاستیەکەی بەم شێوەیەنیە بەڵکو عەدالەت لەمەرجە تایبەتیەکانی ئەوانە بۆئەم ئەرکە. پێویستە قازیش لەڕوانگەی ڕەچاوکردنی مەرجی عەدالەتەوە لەبارەی ڕەفتارو خووی ئەمانەوە لێکۆڵینەوەبکات و چاوپۆشی نەکات چونکە پێویستە لەسەری مافی خەڵکی پێشێل نەکات، هەربۆیە هەموو ئەو دەرئەنجامانەی کەبەم هۆیەوە بەدی دێن لەسەر شانی قازیە و هەرئەویش زامنی زیانەکانیەتی و، هەرکاتێکیش وەها گروپێکی تایبەت بۆ وەها کارێك دیاری بکرێن بوونیان لەلای قازی لەدەرخستنی عەدالەتی ئەوانەی کەعەدالەتیان لەلای قازی شاراوەیە بەسودە، چونکە بەهۆی فراوانبوونی شارەکان و تێکەڵ بوونی کاروبارەکانی خەڵکی و ئاڵۆز بوونیان کەبۆقازیەکان دژواربووە ئەمەلەکاتێکدا پێویستە لەسەر ناوبراوان دەعواو کێشەکانی خەڵکی لەڕێگەی بەڵگەو دەلیلی دڵنیاکەرەوەوە چارەسەر بکەن، هەربۆیە بمانەوێت‌و نەمانەوێت لەزۆربەی کاتەکاندا بۆدڵنیایی زیاتر پشت بەگروپی ناوبراو دەبەستن.

تەعدیل کەران لەهەمووشارو دووکان و شوێنە تایبەتەکاندا دادەنیشن و خاوەن موعامەلەکان کاتیان بۆدادەنێن و بۆشاهێدی تۆمارکردنی هەرکێشەیەك لەدەفتەرو سجیلەکاندا سود لەبوونیان وەردەگرن. مانای وشەی ناوبراو (عدالت)لەنێو ئەوئەرکەی کەماناکەی ئاشکرابوو عەدالەتی شەرعی کەخوشکی جەرحە و هاوبەشە، هەندێك جار هەردووکیان بەیەکەوەن و هەندێك جاریش لەیەکتر جیان، خوداش داناترە.

**موحتەسیبی**[٣٠٦] **وسككە(دراو):** بەڵام موحتەسیبی ئەرکێکی ئاینیە و دەچێتە ڕیزی فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەیە، کەلەسەر دەسەڵاتدارانی موسوڵمانان واجبە کەئەم پلەیە بەکەسێك بسپێرن بەکەسی شیاوو پابەندی بکەن بەواجب بوونەکەیەوە. ئەوکات موحتەسیب بەمەبەستی ئەنجام دانی ئەم کارە هاوکارو هاوڕێ بۆخۆی دیاری دەکاتو لەبارەی خراپە و کارەناپەسەندەکانەوە لێکۆڵینەوە دەکات و تاوانباران سزا دەداتو خەڵکی ناچاردەکات کەسامانی گشتی شار بپارێزن، وەك گرتن و تەسك کردنەوەی کۆڵانو ڕێڕەوەکانو ڕێگری کردن لەبەزۆر پێهەڵگرتنی باری قورس بەکرێکارانی ناوکەشتیەکان و، فەرمانکردن بەوکەسانەی کەخانووە کانیان خەریکە دەڕووخێن کە بیانڕووخێننو، سەرلەنوێ بنیاتیان بنێنەوە چونکە زەرەو زیانی بۆ خانەوادەکەو ڕێبوارانیش دەبێتو، ڕێگری کردن لەمامۆستاو فێرکاران لەبەکارهێنانی توندو تیژی لەکاتی لێدانی منداڵانی تازە فێرخوازدا.

کاری موحتەسیب تەنها لەکێشەو گرفتەکانی خەڵکیدا ناوەستێت بەڵکو لەبارەی ئەوکارانەی کەپەیوەندیان بەوەوە هەیە دەبێت حوکم و بۆچوونی هەبێت تێیاندا بەهیچ شێوەیەك نابێت ئەوحوکمە تێپەڕێنێت و لەتێکدانی ژیانی خەڵکی لەلایەن یەکتریەوە شتەکانی تر کەڕوودەدەن و، هەروەها لەکێشانەو پێوانەنادروستەکاندا دەبێت حوکمی دادگەرانەی هەبێت. وەهەروەها ئەوانەشی کە لەبواری دیندا ساردو سڕن وەك ئەوان ناچاریان دەکات کەووێژدانیان هەبێت، و هاوشێوەی ئەم جۆرەکارانە لەئەستۆی ئەوەو کەپێویست بەبیستنی شاهێدی و بەڵگە و جێبەجێ کردنی حوکم نیە. لەڕاستیدا موحتەسیب کارانێك ئەنجامدەدات کەلەڕووی گشتگیری و ئاسانی مەبەستەکانیەوە قازی

---

[٣٠٦] لەووشەی حیسبە بەکەسرەی حائەکە وەرگیراوە و احتساب لەزمانەوانیدا بەمانی ژماردن و لەزاراوەشدا بەمانای تەدبیرو سیاسەت دێت و، لەشەرعیشدا بەمانای فەرمان بەچاکە و ڕێگری لەخراپە دێت و، لەنەریتیشدا بەکۆمەڵێك شتی سنورداری وەك ڕژاندنی سەرخۆشکەرەکان و شکاندنی ئامێرەکانی گۆرانی و چاککردنی ڕێگەوبانەکان دەگوترێت. ئەرکی ناوبراو هاوشێوەی شارەوانی ئەمڕۆکە بووە (معالم القریە فی احکام الحسبە).

خۆی لێیان بەدوور دەگرێت هەربۆیە ئەم جۆرەکارانەی پێدەسپێرن تاوەکو لەم ڕێگەیەوە خزمەت بەپلەی قەزاوەت بکات. ئەم ئەرکەلەزۆرێك لەدەوڵەتانی ئیسلامیدا وەك عبیدیەکانی میسر و مەغریب و ئەمەویەکانی ئەندەلوس کەلەناوکارە گشتیەکانی پلەی قەزاوەتدابووە بەئەرکی قازی زانراوەو هەرئەویش خۆی کەسێکی بۆئەم کارە دیاری کردووە، دواتر کاتێك ئەرکی سوڵتان لەخەلافەت جیابوویەوە و بەشێوەیەکی گشتی چاودێری کاروبارەکانی سیاسەت و وولاتی دەکرد ئەم ئەرکەش بەئەرکەکانی تری پاشا دەژمێردرا و وەك پلەوپایەیەکی سەر بەخۆی لێهات.

**دراو (سككه):** ئەرکێکە کەخاوەنەکەی لەکاروباری ئەودراوو نەختینانەی کەخەڵکی سەوداو مامەڵە بازرگانیەکانیانی پێوە دەکەن کاردەکات وڕێگرە لە غەش کردن لەدیرهەمو، دراوەکاندا وەك قرتاندن لێیان و کەمکردنەوە مادەگرانبەهاکانی ناویان و نمونەی ئەمانە. بەتایبەت کەئەم جۆرەسکانە لەڕووی ژمارەوە لەسەوداومامەڵەو کاروبارەکانی تایبەت بەبازرگانیەوە ڕەواجی هەبێت و لەئیعتیباردا وابەستەبێت پێوەی. سەرەڕای ئەمەش خاوەنی ئەم ئەرکە دەبێت لەباش دانانی نیشانەکانی سوڵتان لەسەر دراوەکان چاودێر بێت، نەوەك سکەکان غەشیان تێدا بکرێت. نیشانەی ناوبراویش بریتیە لەمۆرێکی ئاسنین کەتایبەتەبەم کارەوە ونەخش و نیگاری تایبەتی لەسەرەو لەسەر سکەکەدایدەنێن وبەچەکوش لەدیرهەم و دینارەکەی دەدەن بۆئەوەی مۆرو نەخش و نیگارەکانی تایبەت بەدەوڵەتی ناوبراو لەسەری دەرکەوێت و، بناسرێتەوە کەتایبەتە بەو دەوڵەتەوە. نرخ و بەهای سکەکانیش بەپێی ڕێژەی کانزا گرانبەهاکان تێیاندا جیاوازبووە و لەکاتی دروستکردن و قاڵب ڕێژیەکەیدا ڕەچاوی ئەم کارە کراوە. هەرچەندە ئەو زێروسیمەی کەلەسکەکاندا هەیە بەتەواوەتی نرخەکەیان دیاری ناکات و، ئەوکارە لەکۆتایدا پەیوەستە بەبۆچوونی سیاسەتمەدارو ئابووری زانانی ئەو دەوڵەتەوە واتەئەوان ئەونرخ و بەهایە دیاری دەکەن.

واتە هەرکاتێك خەڵکی ناوچەو سەرزەمینێك لەسەر ئەندازەیەکی دیاری کراوی زێڕو زیوی ناوسکەکان رێککەوتن ئەوا لەوئاستەدا دەوەستێت و ئەوسکەیە دەکەنە نمونە و پێوەرو سکەکانی خۆیان بەو دەپێون و ئەگەر بێت و وەکو ئەوبێت ئەوا کێشەیەکیان نیەو ئەگەریش لەوکەمتر بێت ئەوا بەسککەیەکی کەم بەهای دەزانن. چاودێری هەموئەم کارانەش لەئەستۆی خاوەنانی ئەم کارانەدایە. هەربۆیە ئەرکی ناوبراو لەم سۆنگەیەوە بەئەرکێکی ئاینی دادەنرێت و بەیەکێك لەئەرك و کارەکانی خەلافەت دەژمێردرێت. لەسەرەتادا لەناوکاروبارەگشتیەکانی پلەی قەزادا بووە و دواتر لێی جیابووەتەوە. ئێستەش هەروەك وەزیفەی موحتەسیبی بەشێوەیەکی سەربەخۆ بەڕێوە دەبرێت. ئەمەیە کۆتایی قسەکانی ئێمەلەبارەی ئەرك پلەکانی تایبەت بەخەلافەتەوە. هەندێك لەپلەو ئەرکەکانی خەلافەتیشمان باس نەکرد چونکە ئەرکەکانی ناوبراو بەهۆی لەناوچوونی هۆکارەکانی دامەزراندنیان خراونەتەلاوە. کۆمەڵێك پلەو ئەرکی تریش خراونەتە ریزی پلەو پایەو ئەرکەکانی پاشاو سوڵتانەوە هەروەك چۆن وەزارەت و چاودێری و ئەمارەت و باج و خەراج و، پلەکانی سوڵتانی کەلەپاش باسی جیهاد بەووردی هەموویان باسدەکەین. ئەرکی جیهادیش بەهۆی لەناوچوونی ئەوئەرکەوە وازی لیّ هێنراوە و بیجگەلەهەندێك دەوڵەتی کەمدانەبێت کەبەرجەستەی دەکەن و بنەمانی بەزۆری سەربە بەشەکانی سوڵتان و پاشایەتی دەزانن.

وەهەروەها پلەی نەقیبی واتە ناسینەوەی نەسەبی خانەدانەکان ئەمەش بەهۆی لەناوچوون و پوکانەوەی نیشانەکانی وێرانەی خەلافەتەوە وازی لیّ هێنراوە کەپلەیەك بوو پارێزگاری کردنی وەچە و تۆماری پشتاوپشتی خانەدانی خەلافەتی بەتایبەت لەئەستۆدابوو، فەرمانبەرەکانی ئەوخانەدانە هەمیشە لەبیت المال وەزیفەو مووچەیەکی بەردەوامیان هەبوو ئەمەش بەهۆی پەیوەندیان بەخانەدانی پێغەمبەرەوە. بەکورتی رێورسم و پلەو پایەکانی خەلافەت تائێستەش لەزۆرێك لەوولاّتانی ئیسلامیدا بەشێوەی داب و نەریتی سیاسەت و دەوڵەتداری لێهاتووە. خوداش بەفەرمانی خۆی هەڵسورێنەری کاروبارەکانە.

# بەشی سی و دووەم

## لەبارەی نازناوی ( امیرالمومنین )و ئەوەی کەئەو نازناوە لەنیشانەکانی خەلافەتە ولەسەرەتای سەردەمی خەلیفەکانەوە کاری پێکراوە

هۆکاری دەرکەوتنی ئەم نازناوە ئەوەیەکە لەبەر ئەوەی بەیعەتی خەڵکی بەخەلیفە ئەبوبەکر بڕیاری لەسەر درا صەحابە خوایان لێ ڕازی بێت و، موسوڵمانانی تر ئەویان ناونا خەلیفەو جێنشینی پێغەمبەر (ص)و، ئەم شتە بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاوەکو ئەبوبەکر وەفاتی کردوو لەبەر ئەوەی لەپاش ئەوو بەپێی وەسیەتی ئەبوبەکر بەیعەت بەخەلیفە عومەردراو بەخەلیفەی خەلیفەی پێغەمبەری خودایان ناوزەد کرد. واتە جێنشینی جێنشینی پێغەمبەری خودا (ص)، ئەمەش لەسەر زاری خەڵکیەوە قورس بوو واتە دووجار گووتنی ناوی خەلیفە بەسەر یەکەوەو ئەودووبارە کردنەوەیەبەلایانەوە جوان نەبوو، لەوەش دەترسان لەئایندەدا خەڵکی سەری لێ بشێوێت و نەزانێت کامیان خەلیفەی یەکەمەو هەندێك جاریش خەڵکی لەم ناوەلایان دەدا و خەلیفەیان بەنازناوێکی هاوشێوەی ئەو بانگ دەکرد. هەرلەو ڕۆژگارەدا خەڵکی فەرماندەکانی سوپایان بەناوی ئەمیرەوە بانگ دەکرد وئەم سیفەتەش لەئەمارەتەوە وەرگیراوە. وەهەروەها خەڵکیش لەسەردەمی جاهیلیەتدا پێغەمبەریان (ص)بەئەمیری مەککە ناوبردووەو، صەحابەش سەعدی ئیبنی وەقاصیان بەئەمیرالمسلمین بانگ دەکرد، چونکە ئەوئەمیری لەشکری قادسیەبووە کەلەزۆربەی موسوڵمانان پێك هاتبوو. ئەوەبوو جارێکیان بەشێوەیەکی بێ ئاگاو لەپڕ یەکێك لەصەحابە حەزرەتی عومەری بە(ئەی ئەمیرالمومنین) بانگکرد و

خەڵکیش ئەم نازناوەیان بەلاوە پەسەند بوو، لەوەبەدواوە خەلیفە عومەریان بەئەمیر المومینین بانگکرد. دەڵێن یەکەمین کەسێك کەخەلیفە عومەری بەم ناوەوە بانگکرد عبداللەی کوڕی جەحش بوو هەندێکیش دەڵێن عەمری کوڕی عاص بووە و هەندێکیش پێیان وایە موغەیرەی کوڕی شوعبەبووە ئەوی بەم نازناوەوە بانگکردووە. قسەیەکیش هەیەکەدەڵێت یەکێك لەنێردراوەکان کاتێك دێتەمەدینەو هەواڵی فتوحاتەکان بەخەلیفە ڕادەگەیەنێت لەوکاتەی کەلەشوێنی خەلیفە دەپرسێت دەڵێت ئەمیر المومینین لەکوێیە؟ هاوەڵانی عومەریش کاتێك ئەم ڕستە تەرکیبیەیان بیست بەباشیان زانی و، گووتیان ڕاستت ووت و سوێند بەخوا بەڕاستی ئەمیر المومینین شیاوی خۆیەتی. لەوەبەدواوە ئەویان بەو ناوەوە بانگکردو خەلیفەکانی دوای ئەویش بەونازناوەوە بانگ دەکران و ئەو نازناوە تایبەت کرابەخەلیفەکانەوە و لەسەردەمی ئەمەویەکاندا بێجگەلەخەلیفە کەس بەوناوەوە بانگ نەکراوە.

ئەوکات شیعەکان نازناوی ئیمامیان تایبەت کرد بەحەزرەتی علی یەوە خوای لیّ ڕازی بێت بۆئەوەی پلەی ئیمامەت کەدەستەخوشك و هاومانای خەلافەتە، بۆئەوەی ببێتە سیفەتی تایبەتی ئەو لەمەزهەبی ئەواندا (شیعەکان)، ئەمە کینایەی ئەوەبوو کەعلی بۆپێشنوێژی کردن لەئەبوبەکر شیاو ترە هەروەك چۆن لەمەزهەب و بیدعەتی ئەماندا هەیە. کەواتە وشەی ئیمامیان بەعلی و ئەوکەسانە گوتووەکە لەپاش ئەو لەمەزهەبی ئەواندا پاڵێوراو بوون بۆخەلافەت و، بەهەموویانیان دەگووت ئیمام و ئەم شێوازە تائەوکاتەی کەبەنهێنی خەڵکیان بۆ شیعەگەری بانگ دەکرد بەردەوام بوو، بەڵام هەرئەوەندە کەدەسەڵاتیان گرتەدەست لەوەبەدواوە ئیمامی خۆیان بەئەمیر المومنین ناوزەد دەکرد. هەروەك چۆن شیعەکانی بەنی عەباس بەم شێوەیان کردووە چونکە ئەوان پێشەواکانیان تاوەکو سەردەمی ئیبراهیم کەبانگەوازەکەیان ئاشکراکرد و بۆجەنگ لەژێر بەیداخی ئەودا کۆبوونەوە پێیان دەگووت ئیمام، وەکاتێکیش کەئیبراهیم کوژرا بەسەفاحی برای ئیبراهیمیان دەگووت ئەمیرالمومنین. وەهەروەها ڕافیزیەکانی ئەفریقا

پێشەوایانی خۆیان کەلەنەوەکانی ئیسماعیل بوون پێیان دەگووت ئیمام تاوەکو سەرە گەیشتەسەر عوبەیدوالڵەی مهدی و ئەوو کوڕەکەشیان بەئیمام بانگ دەکرد، بەڵام هەرکە بنەڕەتی دەوڵەتەکەیان بەهێزبوو جێنشینەکانی لەپاش ئەوانیان بەئەمیرالمومنین بان دەکرد. ئەداریسەکانی مەغریبیش ئیدریس و کوڕەکەی ئیدریسی بچوکیان بەئیمام ناوزەد دەکرد ئەمەش وەك چاولێکەری فاتمیەکان بوو.

خەلیفەکان ئەم لەقەبەیان بەمیراتی بۆدەمایەوە و کردبوویانە نیشانە بۆئەوکەسەی کە فەرمانڕەوایی حیجاز و شام و عێراق و ئەو مەلەکەتانە بێت کەلەناوسەرزەویەکانی دەسەلاتی موسوڵمانانداین و، لەسەرەتای لاوی دەوڵەتدا لەقەبێکی تریان بۆزیاد کرد کەخەلیفەکانیان بەونازناوە لەیەکتری جیادەکردەوە، هەربۆیە عەباسیەکان بەگومانی خۆیان بەمەبەستی بەرز ڕاگرتنی ناوشۆرەتی خەلیفەکانیان بۆهەرخەلیفەیەك و نازناوێکی تایبەتیان دادەنا وەك سەفاح و مەنصور و مەهدی و هادی و ڕەشید و... هتد بۆئەوەی خەڵکی بەناوەکانیان بانگیان نەکەن و بەونازناوە نوێیەوە بانگیان بکەن عەبیدیەکانی ئەفریقاو میسریش بەهەمان شێوە چاولێکەری ئەمانیان دەکردو، لەخۆرهەلاتداو بەرلەعباسیەکان کەبەزبری سادەییەوە دەژیان لەم جۆرە لەقەبو نازناوانە دوور کەوتنەوە، چونکە ئەوان لەوڕۆژگارەدا هێشتا مەیل و ئارەزوی نەتەوە و عەرەبیەتیان لەدەست نەدابوو، داب و نەریتی دەشتەکیەتیان نەگۆڕابوو بەنەریتەکانی شارنشینی، بەڵام ئەمەویەکانی ئەندەلوس وەك پێشینانیان نازناوەکانی (خەلیفە و ئەمیرالمومنین)یان تایبەت کردبوو بەخۆیانەوە، لەگەڵ ئەوەی کەدەشیان زانی بەهۆی ڕێگری لێکردنیان لەنازناوی ئەمیری المومینان کەعەباسیەکان تایبەتکرابوون پێوەی لەنازناوەکانی خەلافەت بێبەشن، چونکەئەوان دەسەلاتیان بەسەر ناوچەی سەرەکی و دار الخلافەتدا نەبوو تەنها لەڕێگەی ئەمارەتی ئەندەلوسەوە خۆیان لەهێرش و هەڕەشەکانی عباسیەکان دەپاراست. تائەوەبوو عبدالرحمانی داخل (سێیەم)کۆتایی ئەمانە واتەناصر (محمدی کوڕی ئەمیر عبداللەی کوڕی محمدی کوڕی عبدالرحمانی ئەوسەت لەسەرەتای سەدەی

چوارەمەوە دەرکەوت بەهۆی بارودۆخی خەلافەت و، ئەوگۆڕانکاریانەی کەلەخۆرهەلاتدا ئەنجامی دابوون ناوبانگی دەرکردبوو وەك مەحجوریەتی خەلیفە و ئەمرو نەهی و سەربەخۆیی دەوڵەتی ڕەها و خراپەکاریان لەکاروبارەکانی خەلیفەکاندا و گۆڕین و بەرکەنار کردنی فەرمانڕەواکان و کوشتارو چاوهەڵکۆڵینی خەڵکی و، ئەم عبدالرحمانەش چاولێکەری لەخەلیفەکانی خۆرهەلات و ئەفریقا دەکرد ناونرابوو ئەمیرالمومنین ناسراو بەالناصر لدین الله. ئەم شێوازەش لەپاش ئەو وەك نەریتێك مایەوە جێنشینەکانی فێری بوون ئەمەلەکاتێکدا باوباپیرانی لەسەر ئەو ڕێوڕەسمەنەبوون.

بارودۆخ بەم شێوەیە بەردەوام بوو تائەوەی کەعەصەبیەتی عەرەب بەتەواوەتی لەناوچوو داب و نەریتەکانی خەلافەت لەدونیادا پێچرانەوە مەوالیە غەیرەعەرەبەکان بەسەر عەباسیەکاندا زاڵ بوونو، پەروەردەکراوەکانیش زاڵبوون بەسەر عەبیدیەکاندا لەمیسرو صەنهاجەش بەسەر ئەمیرەکانی ئەفریقاو زناتەدا لەمەغریب و مولوك و تایفەکان بەسەر ئەمەویەکان لەئەندەلوسداو وولاتەکەیان دابەش کردو، فەرمانڕەوایی ئیسلام دووچاری لێکترازانو تەفرەقە بوویەوەو لەوەبەدواوە پاشاکانی خۆرهەلاتو خۆرئاوا نازناو گەلێکی نوێیان بۆخۆیان دانا و، بەناوی سوڵتانەوە بانگ دەکران، بەلام خەلیفەکان لەنێو پاشاکانی مەغریبدا سوڵتانەکانی ئێرانیان تایبەت کردبوو بەنازناو گەلێکەوە کەلایەنی گەورەیی ڕێزیان تێدابوو کەوای دەگەیاند کەملکەچ و فەرمانبەرداری خەلیفەن و، وەلائی باشیان هەیە بۆی وەك: شرف الدولە عەزدوالدولە رکن الدولە معزالدولە و نصیر الدولە و نیزام الملك و بها الملك و زەخیرەالملك و نمونەی ئەمانە.عەبیدیەکانیش ئەمیرەکانی صەنهاجەیان تایبەتکردبوو بەم جۆرە نازناوانەوە و کاتێکیش ئەمیرانی ناوبراو زاڵبوون بەسەر خەلیفەدا، سەربەخۆیی و دەوڵەتی ڕەهایان ڕاگەیاند. وەك زاڵبووەکان قەناعەتیان بەهەمان ئەو نازناوانەکرد و لەڕوانگەی ئەدەبەوە لەبەرامبەر خەلافەتدا نازناوی خەلیفەیان لەخۆیان نەنا.

ئەوانەی کەدواترهاتن لەغەیرە عەرەبەکانی خۆرهەلات ئێرانیەکان و هاوشێوەکانیان لەبەر ئەوەی سەربەخۆیی دەسەلاتیان لەپاشایەتیدا بەهێز بوو ڕێزو گەورەییان زیادی

کردوو عەصەبیەتی خەلافەت بەگشتی پوکایەوە، حەزیان لەوەکرد کەنازناوگەلێکی تایبەت بەپاشاکانیان هەبێت وەك ناصر منصور و نازناوگەلێکی زیاتریان لەوانەی پێشوو بۆپاشاکانیان دیاری کرد بۆئەوەی پشتیوانی کردنی هەمووچین و توێژەکان لەخەلیفە مسەوگەربێت و وشە ناوبراوەکانیش وشەی (دین)یان بۆزیاد دەکرد وەك صلاح الدین اسد الدین نور الدین، بەڵام پاشاو تایفەکانی ئەندەلوس بەهۆی بەهێزیانەوە لەناوخەلافەتدا کەبەهۆزو عەصەبیەتەکانی خەلافەتی ناوبراو ناسراون نازناوەکانی خەلافەتیان تایبەتکردبوو بەخۆیانەوە و، لەنێوخۆیاندا دابەشیان کرد، هەروەك چۆن خۆیان بەالناصر و منصور و موزەفەر و موعتەمید ناوزەد کرد، هەربۆیە ئیبن شەرەف لەرەخنەکانیدا لەوان گوتویەتی: ئەوەی من لەسەرزەوی ئەندەلوس بێزار دەکات.

ناوەکانی موعتەمید و موعتەزیدە.

کەنازناوگەلێکی پاشایانەی بەرێزن بەنابەجێ بەکار هاتوون.

هەروەك ئەوپشیلەیەی کەلەفیزو هەوابازیدا چاولێکەری شێربکات.

بەڵام صەنهاجە هەمان ئەونازناوانەیان بەبەس دەزانی کەخەلیفەکانی عەبیدیەکان بەمەبەستی بەگەورە زانینیان ناوزەد دەکران، وەك نصیر الدولە و سیف الدولە و موعیزوالدولە. لەبەر ئەوەی گوێڕایەڵی بانگەوازی عبیدیەکان نەبوون و شوێن عەباسیەکان کەوتن، بەڵام هێشتا ئەم نازناوانەیان تێدا مابوو. ئەوکات ماوەی نێوان ئەوان و خەلافەت فراوان بوو پەیمان و عەهدی ئەوانیان لەبیر چوویەوە و ئەم نازناوانەشیان لەبیرکرد و تەنها (سوڵتان)یان بەکار دەهێنا. وەهەروەها پاشای مغراوەش بێجگەلەنازناوی سوڵتان هیچکام لەم نازناوانەی هەڵنەبژاردووە، چونکە شێوەی دەشتەکیەتی و سادەییان لەدەست نەدابوو. لەبەرئەوەی خەلافەت لەناوچوو دەسەڵاتەکانی سنوردار بوون و یوسفی کوڕی تاشفین پاشای لمتونە لەهۆزی بەربەر لەمەغریب ڕاپەڕی و زاڵبوو بەسەر هەردوو ناوچەکانی عەدوەی ئەندەلوس و قەیرەواندا[٣٠٧] زاڵبوو پیاوێکی چاك و پەیڕەوی

---

[٣٠٧] عدوە سەرەتا لەزمانەوانیدا بەمانای کەناری ڕووبار بەکار هاتووە، لەزاراوەی جوگرافیای مێژوودا مەبەست لێی عدوەی ئەندەلوس و عدوەی قەیرەوانە، کەبەبەشێك لەفاس دەژمێردرێت، دیمەشپی دەنوسێت:فاس

سەلەفی صالح بوو بڕیاریدا کەگوێڕایەڵی خەلیفە بێت بۆئەوەی لەم ڕێگەیەوە بۆنە ئاینیە کان تەواوبکات.

هەربۆیە لەگەڵ المستظهری عەباسیدا دەستی کردە ووتو وێژو، بۆ بەیعەتکردنی خۆی عبداللەی کوڕی عەرەبی و کوڕەکەی قازی ئەبوبەکر لەشێخەکانی ئشبیلیەی ناردەلای ئەوو ئەوانیش داوایان لەخەلیفە کرد کەیوسفی کوڕی تاشفین لەمەغریب وەك خەلیفە بناسێنێت و، ئەم ئەرکەلەلایەن ئەوەوە لەئەستۆ بگرێت، ئەوەبوو بەوەرگرتنی مۆڵەتی نازناوی خەلافەت بۆ یوسف لەمەغریبدا گەڕانەوە بۆلای ئەو. وەبڕیار وابوو کەیوسف بەپۆشاکی خەلیفەلەبەر بکات و شیعارەکانی ئەوانی هەبێت. هەربۆیە خەلیفە یوسفی بۆئەوپلەیە هەڵبژاردو لەڕوی ڕێزەوە نازناوی (ئەمیر المسلمین)ی پێبەخشی و ئەویش قبوڵی کرد. دەڵێن خەلیفە بەرلەوەی کەئەم نازناوە بداتە یوسف ئەوی هەربەوناوەوە (ئەمیرالمسلمین)بانگ کردووە وەك ڕێزگرتن لەپلەو پایەی ناوبراو(یوسف)، چونکە ئەوو هۆزەکەی واتە مورابیتەکان پابەندبوون بەداب و نەریتە ئاینیەکانەوە و پەیڕەویان لەسوننەت دەکرد.

لەپاش مورابیتانیش مەهدی دەرکەوت و خەڵکی بۆلای بانگەوازی حەق بانگ دەکردو مەزهەبەکانی ئەشعەری ڕەواج پێدەدا و، لۆمەی خەڵکی مەغریبی دەکرد کەبۆچی لەئەشعەریەکان لایان داوە و چاولێکەری سەلەفیان لەتەرك کردنی تەئویل و ڕواڵەتی شەریعەتو ئەومەسەلانەی کەدەبێتەهۆی ئەو شتانە کردووە وەك بیروباوەڕی بەرجەستەییەکان (تجسیم)[٣٠٨] هەروەك لەمەزهەبی ئەشعەریەکاندا ناسراوە. پەیڕەوانی خۆی بەمووەحیدان ناوزەد کرد تاوەکو ئینکاریەکی تەعریزی بێت لەمەدا بۆچوونی

---

دووشارە:عدوەی ئەندەلوس کەلەساڵی ١٩٢ ك بنیات نراوە و عدوەی قەیرەوان کەلەساڵی ١٩٣ ك بنیات نـراوە، ئەم عدوەیەش لەسەردەمی ئیدریسی کوڕی ئیدریسدا دروستکراوە و لەنێوان هەردوو عدوەی ناوبراودا شارێکە کەدەبێت بزانین بریتیە لەفاس کەهەمان یوسفی کوڕی تاشفینی صەنهاجی دروستی کردووە و، لەسەردەمی عبدالمومندا بوویە ناوەندی خەلافەت .(نخبە الدهر).

[٣٠٨] مەبەست بیروباوەڕی موجەسەمیەکانە (بەرجەستەییەکان).

خانەدانی پێغەمبەرایەتیان لەئیمامی مەعصومدا دەزانی و، بەناچار وەها ئیمامێك لەهەرسەر دەمێكدا دەبێت بوونی هەبێت بۆئەوەی بەهۆی بوونی ئەوەوە سیستەمی ئەم جیهانە بپارێزرێت. وەلەبەر ئەوەی ئەو بەئیمام ناودەبەن وەئەوەی کەئەویەئیمام ناوزەد دەکەن بەهۆیەوەیە کەپێشتر باسمانکرد کەلەمەزهەبی شیعەدا خەلیفەکانی خۆیان بەم نازناوە بانگ دەکەن و، لەگەڵ وشەی ئیمامدا دەستەواژەی (معصوم)یان بەکار هێناوە تاوەکو ئاماژەبێت بەمەزهەبی شیعە لەعیصمەتی ئیمامەتدا. وەئەو لەلای شوێنکەوتوانی رێگری کرد لەنازناوی ئەمیر المومنین ئەمەش لەڕووی پەیڕەوی لەپێشینانی شیعەوەو لەبەر ئەوەش کەلەوسەر دەمەدا خەڵکانێکی گێژو داماوو گێل لەخانەدانی خەلافەت لەمەغریب بەوناوەوە بانگ دەکران.

ئەوکات لەدوای ئەو وەلی عەهدەکەی عبد المومن ناوزەدکرا بەنازناوی ئەمیر المومنین لەپاش ئەویش خەلیفەکانی بەنی عبدالمومن و، خانەدانی ئەبو حفص لەپاش ئەوان لەئەفریقا بەم نازناوەوە بانگ دەکران و تایبەتیان کردبوو بەخۆیانەوە. چونکە شێخەکەیان مەهدی بەوناوەوە ناوزەد دەکرا و ئەو خاوەن ئەمر بووە و هەروەها جێنشینەکانی لەپاش ئەویش ئەم نازناوەیان لەخۆیان نابوو بەڕەوایان نەدەزانی کەسی تر هەڵگری ئەم نازناوە بێت، لەبەر ئەوەی عەصەبیەتی قورەیش لەناوچووبو هەربۆیە ئەمانیش ئەم شێوازەیان هەڵبژاردبوو. لەبەر ئەوەی لەمەغریبدا خەلافەت تێك چوبو هێز کەوتبوە دەستی زناتە، یەکەمین پاشاکانی ئەو نەتەوەیە شێوازی دەشتەکیەتی و سادەییان هەڵبژاردبوو وەك پاشاکانی لمتونە تەنها لەقەبی ئەمیر المسلمینیان لەخۆیان نابوو، ئەمەش بۆئەوەی ڕەچاوی پلەو پایەی خەلافەتی بەنی عبدالمومن جێنشینەکانیان بکەن و، چونکە زنجیرەی ناوبراو فەرمانبەری خەلافەتیان بەواجب دەزانی لەسەر خۆیان‌و دواتر پاشماوەکانیان نازناوی ئەمیر المومنینیان لەخۆیان ناو تاوەکو ئەم ڕۆژگارەش ئەولەقەبەیان پێوەیە ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی کەهەموو داب و، نەریتەکانی پاشایەتی و شیعارەکانی بگەیەننە کەماڵ، خوداش زاڵ بەسەر کاروبارەکانیدا.

# بەشی سی و سێیەم

## لەبارەی ڕاڤەی ناوی ( پاپ )[٣٠٩] و پترۆك لەنێو مەسیحیەكاندا و ناوە كۆنەكان لای ( جومكان )یەهود

دەبێت ئەوەبزانین كەهەرنەتەوە یان مەزهەبێك دەبێت لەنەبوونی پێغەمبەری خۆیدا كەسێكیان هەبێت كەحوكم و شەریعەتەكانی ئەو پێغەمبەرەیان بۆڕوونبكاتەوەو، ئەم كەسەش لەنێو ئەماندا وەك خەلیفەی پێغەمبەرە كەئەرك و تەكلیفەكان بۆخەڵكی باس بكات. وەهەروەها بەپێی ئەوەی كەلەبەشەكانی پێشوودا باسمانكرد پێویستی سیاسەت لەنێوان مرۆڤەكاندا ئەوە دەخوازێت كەبۆ پێكهێنانی كۆمەڵگای مرۆڤایەتی كەسێك هەبێت، كەبەهێزو زۆرەملێ ئەوان ناچاربەبەرژەوەندیە گشتیەكان بكات و لەخراپەكاری دووریان بخاتەوە و بەم كەسەش دەڵێن پاشا. لەبەر ئەوەی بانگەوزازی ئیسلامی لایەنێكی گشتگیری هەیەو، دەبێت هەموو خەڵكی بەزۆرو بەویستی خۆیان بێت ناچار بەگوێڕایەڵی و ملكەچی بكات، هەربۆیە مەسەلەی جیهاد لەنێو موسوڵماناندا بەواجب و فەرز دانراوە، هەربۆیە لەوڵاتە ئیسلامیەكاندا خەلافەت و پاشایەتی بەرجەستە بووە چونكە هێزو شكۆ لەخەلافەت و پاشایەتیدا ڕوودەكرێتە هەردووكیان بۆپاراستنی هەردووپلەی ناوبراو بەكار دەهێنرێت، بەڵام بانگەوازی مەزهەبەكانی تر لایەنی گشتی

---

[٣٠٩] سەرۆكی خواپەرستەكانی نەصرانیەكان و جێنشینی پێغەمبەر پترۆسە، وەلەهەندێك شوێنیشدا بەسەرۆكی ڕۆحانی كاتۆلیكەكان دەگوترێت .

نەبووە و جیهادیش لەئەرکەشەرعیەکانیان نەبووە مەگەر تەنها لەکاتی بەرگری کردندا. هەربۆیە دەسەلاتدارانی ئاینی لەنێو ئەواندا بەهیچ شێوەیەك لەمەسەلەی سیاسەتدا دەستوەردانیان نیە، بەڵکو پاشایەتی بۆکەسێکە لەخودی ئەوان واتە بەدەر لەپیاوانی ئاینی کەلەدونیا شارەزایی هەبێت و بۆکاروباری دونیاییە کان ڕووی تێبکرێت. ئەوەش هەمان ئەوعەصەبیەتەیە کەبەتەبع وادەخوازێت کەخاوەنانی لە بیری بەدەستهێنانی دەوڵەتداری وپاشایەتیدا بن هەروەك چۆن بەڵگەکانیمان لەبەشەکانی پێشوودا باسکرد.

هۆکاری ئەوەش کەخاوەنانی ئاین لەڕێگەی ئاینەوە هەوڵی بەدەست هێنانی پاشایەتی و دەوڵەتداری نادەن ئەوەیە کەمەزهەبەکەیان وەك مەزهەبی ئیسلام هانیان نادات بۆ زاڵبوون بەسەر گەلانی ترداو داگیر کردنی خاکەکەیان، بەڵکو لەوان داواکراوە کەئاینەکەیان لەنێو خەڵکانێکدا پایەدار بکەن کەتایبەتن پێیەوە هەربۆیە بەنی ئیسرائیل لەپاش موساو یەشوع (ص)نزیکەی چوارسەد ساڵ لەحاڵەتێکدابوون کەگوێیان بەهیچ شتێکی دەوڵەتداری نەدەدا، بەڵکو تەواوی هەم و خەمیان تەنها بەرپاکردنی ئاینەکەیان بووە، ئەوکەسانەیشی کەخاوەنی ئەومەسەلەیە بوون پێیان دەڵێن (کاهین)هەروەك بڵێی خەلیفەی موسابووە سڵاوی خودای لەسەر بێت کەنوێژو پەرستشەکانی بۆبەرپا دەکردن مەرجی کاهینیش ئەوەبووە کەلەنەوەی هارون بێت و، چونکە بەپێی وەحی نەوەکانی دەبنە جێگرەوەی ناوبراو.

ئەوکات بۆبەرپاکردنی سیاسەتێك کەبەسروشت کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێویستی پێیەتی حەفتا شێخیان هەڵبژارد کەحوکمە گشتیەکانی ئەمانیان دەخوێندەوە و کاهین لەڕوانگەی ئاینیەوە بەرزترین پلەبووەو دوور بووە لەهەراو هۆریای فەرمانڕەوایانەوە لەگەڵ خەڵکیدا، ئەم بارودۆخەش لەنێویاندا بەردەوام بوو تاوەکو سروشتی عەصەبیەت لەنێویاندا بەهێز بوو شان و شکۆی دەوڵەتداری واتە سوپا لەنێویاندا دروستبوو دواتر زاڵبوون بەسەر کەنعانیەکاندا و ئەوسەرزەمینەی کەخودا دابووی بەمان بەدەستیان هێنا، واتە بیت المقدس و ناوچەکانی دەوروبەریان داگیر کرد، هەروەك چۆن لەسەر زمانی

حەزرەتی موساوە (ص)ئەم شتە ووترابوو، هەربۆیە نەتەوەکانی فەلەستین و کەنعان و ئەرمەن و واردن و عومان و مەئرەب شەڕیان لەگەڵ ئەماندا کرد.

سەرۆکایەتی جەنگەکانیان بەدەستی شێخەکانیان بووە و نزیکەی چوارسەد ساڵ ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو بەبێ ئەوەی هیچ بنەمایەکی دەوڵەتداری وپاشایەتیان هەبێت و لەئەنجامدا بەنی ئیسرائیل بەهۆی فراوانخوازی نەتەوەو هۆزەکانی دراوسێیانەوە تەنگەتاو بوون و، داوایان لەیەکێك لەپێغەمبەرانی خۆیان کرد بەناوی شەموئیلەوە بۆئەوەی لەخودا بپاڕێتەوە بەمەبەستی ئەوەی پاشایەکیان بۆ دیاری بکات و، ئەوەبوو تالوت بوویە پاشایان و بەسەر هەموو نەتەوەکاندا زاڵبوو جالوتی پاشای فەلەستینی کوشت.[٣١٠] دوای ئەویش داوود و لەپاشان سولەیمان (ص)بوونە پاشاو وولاتی سولەیمان گەشتە لوتکەی گەورەیی و هێز و تاوەکو حیجازو ناوچەکانی یەمەنی لەلایەکەوە داگیر کردو لەلایەکی تریشەوە تاوەکو ناوچەکانی وولاتی ڕۆم چوون و فراوانخوازیان کرد. ئەوکات لەدوای سولەیمان هەردوانزە ئەسباتەکە بەپێی خواستی عەصەبیەت کەلەدەوڵەتاندا ڕوودەدات، هەروەك لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد، لەیەکتری جیابوونەوە و دابەشبوون بەسەر دوو دەوڵەتدا کەیەکێکیان لەناوچەکانی نابلوس بوو تایبەت بوو بەدە ئەسباتەکەوەو پایتەختەکەشیان صبصتیە[٣١١]کەلەسەردەمی بخت نصردا وێرانبوو، ئەویتریشیان لەقودس و شامدا فەرمانڕەوایی دەکرد و پەیوەست بوو بەبەنی یەهودا و بەنی یامینەوە.

ئەوکات بخت نصر پاشای بابل زاڵبوو بەسەریاندا و سەرەتا هەموو ئەوناوچانەی کەلەژێر دەسەڵاتی دەئەسباتەکەدابوو (سامرە)داگیری کردوو، جارێکی تریش ناوچەکانی

---

[٣١٠] لەئایەتەکانی ٢٤٨ تاوەکو ٢٥١ی قورئاندا باسی ئەم بەسەرهاتەکراوە.

[٣١١] شارێکی کۆنە بەناوی سامیرەوە لەفەلەستین بوو.

ژێر دەسەلاتی بەنی یەهودا لەبیت المقدس کەهەزاران ساڵ بوو لەژێر دەستیاندا بوو[٣١٢] داگیری کردو مزگەوتەکەی کاول کردن و تەوراتی سوتاندو ئاینەکەیانی لەناوبردو، ڕایگواستن بۆ ناوچەکانی ئەسفەهان و وولاتی عێراق و، تاوەکو ئەوەی کەپاشاکانی کیانی[٣١٣] ئێرانیەکان لەپاش حەفتاساڵ لەئاوارەیی بەنی ئیسرائیل نەتەوەی ناوبراویان گێڕایەوە سەرزەوی باوباپیریان و مزگەوتەکەیان بۆچاك کردنەوە و داب و نەریتە ئاینیەکانیان وەك خۆی لێهاتەوە، بەڵام پاشایەتی تەنها لەدەستی ئێرانیەکاندا بووە، ئەوەبوو دواتر ئەسکەندەر و یۆنانیەکان بەسەر ئێرانیەکاندا سەرکەوتن و یەهودیەکان کەوتنە ژێر دەسەلاتی ئەوانەوە.

لەپاشان فەرمانڕەوایی یۆنانیەکان لاوازبوو یەهودیەکان بەهێزی عەصەبیەت سەرکەوتن بەسەر یۆنانیەکانداو کاروباری دەوڵەت کەوتە دەستی کاهینەکانی خانەدانی حشمنای و دەستیانکردە جەنگ لەگەڵ یۆنانیەکاندا تاوەکو ئەونەتەوەیە (یۆنانیەکان) لەناوچون و، ڕۆمیەکان زاڵبوون بەسەر یا ندا وکەوتنە ژێر فەرمانڕەواییانەوە و دواتر هێرشیانکردە سەر بیت المقدس کەخانەدانی هیرودوس واتە خزمانی خانەدانی حشمنایو پاشماوەی دەوڵەتەکەیان لەژێردەستیاندابوو، بەڵام پاش ماوەیەك ڕۆمیەکان بۆماوەیەکی دوور و درێژ ئەوشارەیان گەمارۆداو، لەپاشان بیت المقدسیان بەزەبری هێز گرتو دەستیاندایە کوشتارو وێرانکاری و سوتاندن و شارەکەیان کاول کرد و دانیشتوانەکەیان ئاوارەکردو لەڕوومەو پشتەوەی بڵاو بوونەوە و، ئەمەش بوویە دووەمین ڕووخاندنی مزگەوتەکە و یەهودیان ئەم ئاوارەیی دەربەدەریە بەکۆمەڵە ناودەنێن (دەرکردنی گەروە). لەمە بەدواوە ئیتر نەیانتوانی وولات دروست بکەن چونکە عەصەبیەتیان لەدەست دابوو لەوەبەدواوە لەژێر دەسەلاتی ڕۆمیەکاندا مانەوە و کاروبارە ئاینیەکانیان

---

[٣١٢] سەردەمی فەرمانڕەوایی و دەسەلاتی یەهودیەکان ٣٧٦ ساڵ بووە بێگومـان لێرەدا دانـەر ئەیـەوێت بڵێـت کەنەتەوەی یەهود نزیکەی هەزار ساڵ ماوەتەوە (دسلان).

[٣١٣] مەبەست زنجیرەی هاخامەنشیە، چونکە کورشی گەورە ئەم کارەی ئەنجامداوە .

لەدەستی سەرۆکێکدا بوو کەپێیان دەگووت کاهین. لەپاشان مەسیح (ع)دەرکەوت و ئاینێکی تازەی هێناو هەندێك لەحوکمەکانی تەوراتی نەسخ کردەوەو خەواریق گەلێك لەسەر دەستی دەرکەوتن وەك چاککردنەوەی کوێر[٣١٤] و بەڵەك و زیندوو کردنەوەی مردووەکان. هەربۆیە کۆمەڵێك خەڵکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە و ئیمانیان پێ هێنا کەزۆربەیان لەحەواریەکان بوون واتە هاوەڵەکانی عیساخۆی، کەژمارەیان دوازدە کەس بووە و لەنێویاندا نێردراوگەلێکی ناردە ئافاق کەخەڵکی بانگ بکەن بۆلای مەزهەبەکەی خۆی، ئەم شتەش لەسەر دەمی ئوگوستس کەیەکەمین پاشای قەیصەریەکان[٣١٥] بوو، سەردەمێك بوو کەهیرودوس پاشای یەهودیەکان دەسەڵات و پاشایەتی لە خانەدانی حشمنای و خزمەکانی سەندبوویەوە.

هەربۆیە یەهودیەکان ئیرەییان بەمەسیح بردو بەدرۆیان دەخستەوە و هیرودوس پاشاکەیان نامەی نارد بۆ پاشای قەیصەریەکان (ئوگوستس)و هانی دا تاوەکو ڕێگەبدات مەسیح بکوژن، ئەوشتانەی کەلەوێدا ڕوویاند قورئان باسی کردوون. حەواریەکانی[٣١٦] دەربەدەر بوون و بڵاوەیان کردو زۆربەیان چوونە وولاتی ڕۆم و بانگەوازیان بۆئاینی نەصرانی دەکرد و، پتروس کەگەورەترینی حەواریەکان بوو چوویە ڕومە واتە پایتەختی قەیاصیرەکان و دواتر ئینجیل دابەزی بۆعیسا (ع)و لەدووتوێی چوار نوسخەدا بەپێی ئەو جیاوازی بۆچوونەی کەلەم بارەیەوە هەیە، کەگوایە (مەتا)ئینجیلەکەی خۆی بەعیبرانی لەبیت المقدسدا نوسیەوە و یوحەننا بن، زوبدی یەکێکی تریانی بەلاتینی نوسیەوە و لوکیش کەیەکێك بوو لەحەواریەکان ئینجیلەکەی خۆی بەلاتینی بۆهەندێك لەگەورەکانی ڕۆم نوسیەوە. وە یوحەنا بن زوبدی ئینجیلەتایبەتەکەی خۆی لەڕومە نوسیەوە و پتروسیش ئینجیلەکەی خۆی بەلاتینی ژمارەی بۆداناو دایەپاڵ مرقاصی شاگردی ئەم

---

[٣١٤] (وَأُبرِئُ الأكمَهَ وَالأبرَصَ وَأُحيِ المَوتَى بِإذنِ الله) س آل عمران ٤٩.

[٣١٥] مەبەست سیزارەکانە.

[٣١٦] (قالَ مَن أنصارِي إلى الله قالَ الحَوارِيّونَ نَحنُ أنصارُ الله) س ال عمران ئا ٤٠ و ئایەتەکانی دواتریش .

چوار نوسخەیەی ئینجیلیش لەگەڵ یەکتردا جیاوازبوون، لەگەڵ ئەوەی هەموویان وەحی تەواو نەبوون، بەڵکو قسەکانی عیساو حەواریەکانیشیان تێدا بوو زۆربەی بابەتە کانی ئامۆژگاری و چیرۆك بوون و حوکمەکانیان تێدا زۆر کەم بوو.

لەوسەردەمەدا حەواریەکان کەپەیامبەرانی ئینجیل بوون لەڕومە کۆبوونەوە یاساکانی مەزهەبی نەصرانیەتیان دانا و ئیقلیمنتس قوتابیەکەی پتروس نوسینەوەکەی گرتە ئەستۆو تێیدا ژمارەی ئەوکتێبا نەی کەدەبێت کاریان پێبکەن تۆمارکراو لەشەریعەتی کۆنی یەهود ئەم کتێبانەیان هەڵبژارد وەك: تەورات کە(پێنج سفر)بوو کتێبی یەشوع و کتێبی قازیەکان و کتێبی ڕاعوس و کتێبی یەهودا ئەسفاری مولوك (چوار سفرەکە)و سفری بنیامین و کتێبەکانی مقابیین لە(یوسف)ئیبن کریون (سێ نەفەر)و، کتێبی عەزرای ئیمام و کتێبی ئەرشیر و چیرۆکەکانی هامان و کتێبی ئەیوب صدیق و مەزامیری داوود (ع)کتێبی کوڕەکەی سولەیمان (پێنج سفر)کتێبی ئیلهامات و، هەواڵی غەیبی پێغەمبەرانی بچووك و گەورە (شانزەسفر)کتێبی یەشوعی کوڕی شاریخ و وەزیری سولەیمان کەڕێکیانخستن و نوسینیانەوە، لەشەریعەتی عیسا (ع)هەرچوار نوسخەکەی ئینجیل کەلەحەواریەکان وەریان گرتبوو کتێبی پۆڵس (چواردە پەیامە)کتێبەکانی قتالیقون (حەوت پەیامە)هەشتەمیان ئەبرکسیس لەچیرۆکی پێغەمبەران و کتێبی پۆڵس (چواردەپەیامە)کتێبی ئقلیمنتس کەحوکمەکانی تێدابوو، کتێبی ئەبوغالبیس کەتێیدا خەونەکانی یوحەنای کوڕی زوبدی تێدابوو نوسیانەوە.

قەیاصیرە پاشاکانی ڕۆم لەمامەڵەیان لەگەڵ ئەم ئاینەدا یەکسان نەبوون، هەندێك قبوڵیان دەکرد و خاوەنانی ئەویان بەگەورەدەزانی و هەندێك وازیان لێدەهێناو زاڵدەبوون بەسەر ئەهلی ئەودینەداو دەیانکوشتن و دووریان دەخستنەوە تاوەکو ئەو کاتەی کونستانتین گەشتە پاشایەتی و دەسەڵات قبوڵی کردو بەردەوام بوون لەسەر پەیڕەوی کردنی. کاربەدەستانی کاروباری ئەم ئاینەو ئەوەی کەتەشریفاتەکانی ئەنجام دەدا پێیان دەگووت (پوتروك)و ئەم کەسەبەلای ئەمانەوە بەسەرۆکی مەزهەب و، خەلیفەی مەسیح دادەنرا نوێنەرو خەلیفەکانی خۆی دەنارده شوێنە دوورەکان و نێردراوەکانیش پێیان

دەگووتن (ئوسقوف)واتە جێگری پوتروك)و، ئەوئیمامەیشی کەنوێژی بۆ بەرپا دەکردن و لەدیندا فتوای دەدا بە (قەسیس)قەشە ناوزەد کرابوو. وەکەسێك کەلەخەڵکی جیادەبوویەوە و خەڵوەتی دەکرد پێیان دەگووت ڕاهیب و زیاتر لەصەومەعەکاندا خەڵوەتیان دەکرد. وەپتروسی نێردراوو سەرۆکی حەواریەکان و گەورە قوتابی مەسیح لەڕومە بوو سەرقاڵی بەرپاکردنی مەراسیمەکانی ئاینی نەصرانیەت بوو تائەوە بوو نرز پێنجەمین پاشای ڕۆم قەیاصیرەکان ئەویان لەگەڵ ژمارەیەك لەئوسقوف و پتروکەکاندا کوشتی. لەپاشان ئاریوس لەسەر کورسی ئوسقوفی ڕۆم دانیشت وەك جێنشین. وەمرقاصی ئینجیلی بۆماوەی حەوت ساڵ لەئەسکەندەریەو میسر و مەغریبدا بانگەوازی خەڵکی دەکرد لەپاش ئەویش حەنانیا ئەوئەرکەی لەبری ئەو گرتە ئەستۆ و بەپتروك بانگیان دەکرد و، ئەو یەکەمین پتروك بوو لەو ناوچانەو دوازدە قەشەی[٣١٧] دامەزراند بەومەبەستەی کەئەگەر پتروك بمرێت یەکێك لەو دوازدەکەسە جێگەی بگرنەوە و، دواتر بۆپڕکردنەوەی جێگەی ئەوەی کەدەبێتە جێنشینی پتروك کەسێکی باوەڕدار دیاری دەکەن و کەواتە کاروباری پتروکوکان دەچوویە لای قەشەکان و، لەبەر ئەوەی لەنێویاندا لەبارەی یاساو ڕێساکانی بیروباوەڕەکەیانەوە جیاوازیان هەبوو لەنیقیە و لەسەردەمی کنستانتینیدا بۆڕزگارکردن و بەتەنها هێشتنەوەی ئاین کۆبوونەوەیەکیان کردو سێسەد و هەژدە نەفەر لەئوسقوفەکان لەسەر یەك بۆچوون بوون لەمەسەلە ئاینیەکانداو، هاوڕابوون و بەنوسراوێك ئەوەیان نوسی و بەناوی پێشەواو ڕێنماوە خوێندیانەوەو وەك سەرچاوەیەك دایاننا کەبۆی بگەڕێنەوە لەکاروبارو بیرو باوەڕەکاندا لەو دەستورانەشی کەنوسیبویان بریتی بوون لەوەی لەدیاری کردنی پترکی بەرپرسیار لەئایندا نەگەڕێنەوە بۆ ئیجتیهادی قەشەکان و، هەروەك چۆن حەنانیا قوتابی میرقاص بڕیاری دابوو، ئەم شێوەیان بەتاڵ کردەوە بەڵکو بڕیارینداو لەدیاری کردنی جێنشینی خۆیاندا دەبێت، لەگەڵ گروپێك لەهەڵبژێردراوانی ئیمامی باوەڕداران و سەرۆکەکانیاندا ڕاوێژ بکرێت. لەوکاتە بەدواوە ئەم مەسەلەیە بەم شێوەیە مایەوە.

---

[٣١٧] کەسێکە کەپلەکەی لەنێوان ئوسقوف و شوماسدا بێت.

ئەوکات و لەپاش ئەم ڕووداوە لەبنەماو یاساکانی ئاینەکەیاندا جیاوازی دروست بوو بۆ بڕیاردانی یاسکانی ئەو کۆبوونەوانە ئەنجومەن گەلێکیان هەبوو، بەڵام لەبارەی یاسای ناوبراوەوە جیاوازیەك ڕووی نەداو ئەو شێوازە بەهەمان شێوە مایەوە نائیب (جێگر)بوونی ئوسقوفەکان لەجێی پترۆکەکان لەنێویاندا بەردەوام بوو. ئوسقوفەکان بەپترۆکەکانیان دەگووت باوك هەربۆیە قەشەکان لەکاتی ئامادەنەبوونی پترۆکەکاندا ئوسقوفیان لەڕوانگەی ڕێزەوە بەباب واتە باوك بانگ دەکرد هەربۆیە لەدرێژایی سەردەمانێکی دوورو درێژدا ناویان تێکەڵ بەیەکتری دەبوو، دەڵێن کۆتا پترۆك کەناوی لەگەڵ ئوسقوفەکاندا تێکەڵ دەبوو پترۆکی هیرقل بووە لەئەسکەندەریە. هەربۆیە لەوکاتە دا بڕیاریاندا لەڕووی ڕێزو گەورەییەوەپلەی پترۆك لەگەڵ ئوسقوفدا جیاوازیەکی بۆ دروست بکەن هەربۆیە لەوەبەدواوە پترۆکیان بەبابا دەناساند کەبەمانای باوکی باوکان بوو ئەم ناوەش بەگومانی جرجیسی کوڕی عبید کەلەمێژووەکەی خۆیدا هێناویەتی بۆیەکەمجار لەمیسردا بەکار هاتووە، لەپاشان ئەوناوەیان لەخاوەنی کورسی گەورە ناوە کەبەبیروباوەڕی ئەوان کورسی پتروس نێردراوی گەورەبووە هەروەك باسمانکرد، کەتاهەنوکەش وەك پلەو نیشانەیەکە بۆ ئەو.

ئەوکات مەسیحیەکان لەئاینی خۆیاندا لەبارەی ئەوبیروباوەڕانەی کەبەمەسیح هەیانبوو ڕێگە جیاوازییان گرتەبەر و بوونە چەندین گروپ و تاقمەوە و هەرتاقمێکیش بۆ پاراستنی خۆی داوای یارمەتی لەپاشایانی مەسیحی دەکردو، سەردەمانێکی زۆر گروپ لەدوای گروپ دروست دەبوون و بارودۆخ بەم شێوەی جیاوازیەوە بەردەوام بوو، تاوەکو سێ گروپی جیاواز لەیەکتری لەنێویاندا سەریان هەڵدا کەوەك گروپی بنەڕەتی دەژمێردران و گرنگیەکی ئەوتۆ بەگروپەکانی تر بێجگەلەم سێ گروپە نەدەدرا کەبریتی بون لە: (ملکیە)[٣١٨] (یعقوبیە)[٣١٩]، (نستوریە)[٣٢٠] ئێمەش باوەڕمان وەها نیە کەلاپەڕەی

---

[٣١٨] گروپێکن لەنەصارا گاورەکان کەبەناوی پاشاکەیان ملکی یەوە ناوبانگیان دەرکردوەو، بەزۆریش بەشوێنکەوتوانی کڵێسای پترۆسی دەگوترێت (اقرب الموارد).

[٣١٩] گروپێکن لەخەواریجی نەصارا (گاورەکان)و شوێنکەوتەی یعقوبی بەرادیعین کەلەسەدەی شەشەمدا سەری هەڵداوە و گوتویەتی لەمەسیحدا یەك سروشت هەیە .

کتێبەکەمان بەباسکردنی مەزهەبەکانی کوفری ئەوان ڕەش بکەینەوە. ئەوانە هەموویان ناسراون هەروەك چۆن قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکردووە و پێویست بەهێنانەوەی هیچ جۆرە بەڵگەیەك ناکات لەوبارەیەوە. هەریەکە لەم گروپانەش پەیڕەوی لەپترۆکێك دەکەن هەروەك چۆن پترۆکی ڕۆم ڕومە کەئێستە ناوی بابایە بەپێی بۆچوونی گروپی ملکیە بۆچوون دەدات و ڕۆم لەژێردەستی فەرەنگیەکاندایە پاشایەتیان لەوناوچەیەدایە. پترۆکی موعاهیدان کەلەسەر بۆچوونی یەعقوبیەکانن لەمیسرەو ئەو لەنێو ئەو گروپەدا دەژی و خەڵکی حەبەشە پەیڕەوی لەیەعقوبیە دەکەن و، ئەو پترۆکەیان بەپترۆکی خۆیان زانیوەو پترۆکی میسر لەنێو ئەماندا ئوسقوف گەلێکی هەیە کەلەبەئەنجام گەیاندنی ئەرکە ئاینیەکاندا جێنشینی پترۆکەو وشەی بابا لەم سەردەمەدا تایبەتکراوە بەپترۆکی ڕۆمەوە یەعقوبیەکان پترۆکی خۆیان بەم ناوەوە بانگ ناکەن.

ئەم وشەیەش لەدووبای وەك یەك پێکهاتوە کەبەشێوەیەکی قەڵەو بەسەر زاردا دێتو بای دووەم شەدەدارە. لەشێوازەکان پاپالەلای فەرەنگەکان ئەوەیەکە ئەوان هان دەدەن کەگوێڕایەڵی و ملکەچی یەك پاشابن کەلەکێشەو مەسەلەکانی تردا بگەڕێنەوە، بۆئەو لەترسی ئەوەی نەوەك لەنێوانیاندا جیاوازی ڕووبدات ئەوعەصەبیەتەی کەبەلای ئەوانەوە هیچ شتێك لەو لەپێشتر نیە لەودا داوای دەکەن و، هەوڵدەدەن بۆئەوەی ئەو بکاتە هێزێکی بالاترو بەم پاشایەش دەڵێن ئیمپراتۆر. پاپیش تاجەکە بۆپیرۆزی دەخاتە سەرپاشاو پێی دەڵێن تاجدار کەلەوانەیە مانای وشەی ئیمپراتۆر هەرئەمەبێت. ئەمەیە کورتەی ئەوبابەتانەی کەلەبارەی ڕاڤەی پاپاو کاهینیەوە کەباسمانکرد و خوداش هەرکەسێك کەبیەوێت گومڕای دەکات و هەرکەسێکیش کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات.[321]

---

[320] مەزهەبی نستور هی ئەو پیاوەیە کەناوی نستور بووە و، بیدعەتی لەمەئاین مەسیحدا داهێناوە. (اقرب الموارد)

[321] (وَاللَّهُ يُضِلُّ مَن يَشاء وَيَهدِي مَن يَشاء) س النحل ئا ٩٥ .

# بەشی سی و چوارەم

## لەبارەی پلەو پایەی دەربارى پاشاو سوڵتانەکان[٣٢٢] و نازناوەکانیانەوە (القاب)

دەبێت ئەوەبزانین کەسوڵتان خۆی بۆخۆی لەبارەی لەئەستۆ گرتنی وەها ئەرکێکی قورسەوە بێتوانایە، هەربۆیە بەناچاریەوە دەبێت لە نەژادو نەوەی ڕەگەزی خۆی یارمەتی وەربگرێت و کاتێك لەپێویستیەکانی ژیان و گوزەران و هۆکارو پێویستیەکانی خۆیدا پێویستی بەیارمەتی ئەوانی تر هەبێت، ئەوا ناچارە یارمەتی لەخەڵکانی تر وەربگرێتو ئەوکات لەسیاسەتو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی هاوشێوەکانیدا کەخودا پارێزگاری کردنیانی بەم سپاردووە زیاتر پێویستی بەیارمەتی کەسانی دەورووبەری دەبێت و، چونکە ئەودەبێت هەموان لەدەستدرێژی دوژمنان بپارێزێت و لەڕێگەی حوکمەکانی ڕێگری لەخراپەبکات و، نەهێڵێت گروپێك ستەم لەگروپێکی تربکەن و بەرژەوەندیە گشتیەکانیان ڕەچاوبکات وەك کاروباری ژیان و مامەڵەی ڕۆژانەو بواری خۆراك و خواردنەوەیان و عەقد و مامەڵەکانیان و، لەگیرو گرفتەکان ڕزگاریان بکات نەوەك لەوبوارەدا فێڵ وگزی لەیەکتری بکەن و لەکڕین و فرۆشتنندا کەم و کورتیان هەبێت.

---

[٣٢٢] ئەوەی کەلە ناویابەتەکانی ئیبن خەلدون تێدەگەین ملك یان پاشا بەبۆچوونی ئەو گشتی ترە لەسوڵتان بەهەموو پاشاکان دەگوترێت، بەڵام سوڵتان لەدەستەواژەکانی ئەودا مەبەستی پاشایانی ئیسلامە .

وەهەروەها لەلێدانی دراویشدا و ڕەواجدان بەودراوانەی کەڕەواجدارن یان بەپێچەوانەوەن ئاگادارو شارەزابێت ئەمەش بۆئەوەیە دیرهەم و دیناری خراپ و کەم نرخ لەناوخەڵکیدا بلاّو نەبێتەوە و بەوهۆیەوە زیانیان بەرنەکەوێت. وەهەروەها دەبێت لەسیاسەت و بەڕێوەبردنی کارەکانی خەڵکیدا شێوازێك بگرێتەبەر بۆئەوەی کەبەچ شێوەیك دەیەوێت فەرمانبەرداری بکەن و بەپێی خواستی ئەو هەڵسوکەوت بکەن و، لەپێش چاوی خەڵکەکەیدا بەفەرمانڕەوای حکومەتی ڕەها بناسرێت و تەنها ئەو وەك گەورەو سەرۆك ناوبانگ دەربکات.

هەربۆیە لەم ڕێگایەدا بەهۆی ڕەنجانی دڵەکانەوە دەبێت دژواری گەلێکی زۆر تەحەمول بکات. یەکێك لەحەکیمەگەورەکان دەڵێت: (ناڕەحەتی گواستنەوە و لەبن هەڵکەندنی کێوەکانم بەلاوە ئاسانترە لەدڵدانەوەی دڵ ڕەنجاوان و دڵ شکاوان). کەواتە لەم مەسەلەیەدا هەرچی زیاتر یارمەتی لەخانەدان و خزمان و پەروەردە کراوانی دەوڵەت وەربگرێت شایستەترو کامڵتر دەبێت، چونکە لەئەنجامدا هاو ڕەگەزی ئەخلاقی لەنێوان ئەم و هاوڕێیانیدا بەدی دێت و لەمەسەلەی هاو کاری یارمەتیدانی یەکتریدا گونجان و سازش کردن بۆ یەکتری ڕوودەدات. خودا دەفەرمێت: وەزیرێکم لەخانەدانەکەم بۆ دیاری بکە، باهارونی برام بێت و پشتم بەو بەهێز بکەو لەکارەکەمدا بیکەرە هاوکارم[٣٢٣]. وە یارانی پاشایان بەشمشێر یان بەقەڵەم وەیان لەڕێگەی زانستەوە یارمەتی دەدەن و لەڕێگەی حیجابەتەوە لەبەر چاوەکان دەیپارێزن بۆئەوەی خەڵکی دەوری قەرەباڵغ نەکەن و لەبیرکردنەوە لەکاروبارەگرنگەکانی وولاّت دووری نەخەنەوە. یان وەها کەسێك خۆی بەتەنها لەمەسەلەکانی دەوڵەتداری دەکۆڵێتەوە و لەمبارەیەوە پشت بەتواناکانی خۆی دەبەستێت. هەربۆیە هەندێك جار هەموو ئەم لێهاتنانە لەیەك کەسدا دەبینرێن، هەندێ جاریش هەریەکەیان لەکەسێکدا دەبینین و هەندێك جاریش هەندێکیان بەجۆرێك لەجۆرەکان دابەش دەبن، هەروەك چۆن لەنمونەی وەزیفەی پەیوەست بەقەڵەمەوە

[٣٢٣] (وَاجعَل لِي وَزِيراً مِن أهلِي هارون أخي أُشدُد بِهِ أزرِي وَأشرِكهُ فِي أمرِي) س تەها ئا ٣٠ بۆ ٣٢.

دەبێت بەم بەشانەوە: دیوانی نامەو ئەحکامەکان، دیوانی کەرتەکان، دیوانی موحاسەبات، کەئەمەیان لەئەستۆی خاوەنانی خەراج وەرگرتن و خەرجیەکان و مافەکانی دیوانی سوپایە. وەهەروەها وەزیفەکانی پەیوەست بەشمشێرەوە دەبن بەم چەند بەشەوە: خاوەنانی جەنگ، خاوەنانی ئینتیزامات (پۆلیس)گواستنەوە و گەیاندن، پاسەوانانی سنور. ئەوکات دەبێت ئەوە بزانین کەوەزیفەو پلەکانی دەسەلآت لەناو نەتەوەی ئیسلامدا دەچێتە ژێر ناوی خەلافەتەوە چونکە پلەی خەلافەت فەرمانڕەوای دین‌و دونیای خەڵکە هەروەك پێشتر باسمانکرد، لەو ڕووەی کەحوکمە شەرعیەکان پەیوەستن بەهەموو ئەرکەکانی پاشاوە وەبۆ هەریەکەلەو ئەرکانە لەهەموو کاروبارەکانی پەیوەندیدار بەشەرعەوە وەزیفەیەك دەدۆزرێتەوە، چونکە حوکمی شەرعی گشتگیری تێدایەو پەیوەست دەبێت بەهەموو کاروباری عەبدەکانی خوداوە.

فەقیهیش هێندە لەپلەو پایەی سوڵتان و پاشا وورد دەبێتەوە کەخۆی بەتەنها و سەربەخۆ لەلایەن دەزگای خەلافەتەوە فەرمانڕەوایی دەکات‌و ئەمەش مانای سوڵتانە، وەیان لەبری پلەی خەلافەت کۆمەڵێك وەزیفە لەئەستۆ دەگرێت ئەمەش مانای وەزیرە، لەلای فەقیهەکان هەروەك باسی دەکەین. فەقیهیش بەناچاری دەبێت لەهەموو حوکم و ماڵ و سامان و هەموو سیاسەتە گشتی یان لاوەکیەکان و هۆکارەکانی بەرکەنار کردن ئەگەر ڕوویدات مەبەستەکانی تری پاشاو سوڵتان و، هەموو ئەو ئەرکانەی کەلە ژێر فەرمانی پاشاو سوڵتاندایە وەك وەزارەت و وەرگرتنی باج بەشداری بکات و وەك فەرمانڕەوایەك لەبەرامبەر دیدی سوڵتانەوە بتوانێت بۆچوونی هەبێت، هەروەك لەبەشەکانی پێشوودا لەبارەی سەرکێشانی خەلافەتی شەرعی لەئیسلامدا بەرەو پاشایەتی و سەڵتەنەت گفتوگۆمان کرد.

چونکە قسەکانی ئێمە تایبەت بوون بە ئەرکەکانی پاشاو سوڵتان و پلەو پایەی ئەو بەپێی خواستە کۆمەڵایەتیەکان و، بوونی مرۆڤە نەوەك ئەوەی تایبەتە بەحوکمە شەرعیەکانەوە هەروەك ئەوەت بۆ دەرکەوتووە مەبەستی ئێمە لەم کتێبەدا ئەم بابەتە

نیە، هەربۆیە پێویست ناکات کەحوکمە شەرعیەکان لەم بارەیەوە بەدورو درێژی باس بکەین. بەتایبەت ئەم جۆرە مەسەلانە بەشێوەیەکی گشتی لەکتێبی احکام سولتانی وەك کتێبەکەی قازی ئەبوالحسنی ماوەردی[٣٢٤] و فەقیهە بەناوبانگەکانی تردا هاتووە. وەئەگەر بتەوێت بەشێوەیەکی گشتی ئەم بابەتە وەربگریت بۆنمونە ئەگەر سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەم جۆرە کتێبانە بیت، چونکە ئێمەلەبارەی ئەرکە پەیوەستەکان بەخەلافەتەوە تەنها لەم دیدەوە گفتوگۆمان کردووە، بۆئەوەی ئەوانە دووبارە لەئەرکەکانی پاشایەتی و سەڵتەنەتدا بناسینەوە نەوەك بمانەوێت حوکمە شەرعیەکانی پەیوەست بەو مەسەلەیە لێکۆڵینەوە بکەین.

چونکە ئەم بابەتە لەمەبەستەکانی ئێمەنیە لەم کتێبەدا، بەڵکو لەم بارەیەوە بەپێی ئەوەی کەسروشتی کۆمەڵگا لەبوونی مرۆڤدا دەیخوازێت قسەدەکەین، خوداش یارمەتی دەرە.

وەزارەت: لەگرنگترین پلەو بنکەکانی دەسەلاٚت و پاشایەتی وبنەڕەتی هەموو پێگەکانی پاشایەتیە، چونکە ناوەکەی مانای ڕەهایی کار کردن دەگەیەنێت، چونکە ئەم وشەیە یان لە(موازرت)واتە هاوکاری کردن یان لە (وزر)وە بەمانای قورسی وەرگیراوە هەروەك بڵێی وەزیر بەکارەکانی خۆی کارەقورسەکانی سەڵتەنەت دەگرێتە ئەستۆی، ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا ئەوەمان باسکرد کە پێویستیەکان و کارەکانی سوڵتان لەچوار شت بەدەر نیە، چونکە ئەو یان پێویستی بەپارێزگاری گشتی و پێداویستیەکانی نیازمەندە وەك چاودێری کردنی کاروباری سوپاو چەك و جەنگەکان و شتەکانی تری پەیوەست بەپاسەوانی و فراوانکردنی وولاٚتەوە، هەڵسوڕێنەری ئەم کارانە هەمان وەزیری ناسراوە لەدەوڵەتە کۆنەکانی خۆرهەلاٚتدا و ئەم ڕۆژگارەشە لەمەغریبدا. وەیان

---

[٣٢٤] ابوالحسنی ماوردی لەساڵی ٤٥٠ ك کەبەرابەرە بە١٠٥٨ ز کۆچی دوایی کردووە و، فەقیهێکی مەزهەبی شافیعی بووە کەکتێبی (احکام السلتانیە)کەی زۆرجێگەی بایەخەو لەساڵی ١٨٥٣ز دالەلایەن انرژەوە چاپ و بلاٚو کراوەتەوە.

بۆگەیاندنی نامە و پەیامەکانی خۆی(سوڵتان)بەوکە سانەی کەدوور دەستن و لەهەواڵیان بێخەبەرە پێویستی بەکەسێکەبۆئەومەسەلەیە ئەویش بەکاتیب ناسراوە. وەیان لەکاروباری وەرگرتنی باج و خەرجیەکان و پارێزگاری کردنیان پێویستی بەکەسێکە کەلەهەموو لایەنەکانەوە پارێزگاریان لێبکات ونەهێلێت لەناوبچن. ئەم ئەرکەش لەدەستی خاوەنانی باج خەراجەوەیە کەتاوەکو ئێستەش لەخۆرهەلاتدا بەوەزیر بانگی دەکەن. یان پێویستی بەکەسێکە کەدوور خەرەوەی خاوەن پێداویستیەکان بێت بۆئەوەی لەدەرباری سوڵتاندا قەرەباڵغی دروست نەبێت و سەرقاڵی نەکەن و بەباشی ئاگای لەبەڕێوەبردنی کارەکانی بێت، ئەمەش پلەی خاوەنانی دەربارە کەسوڵتان لەپشتی پەردەوە دەپارێزن. هەربۆیە پێویستیەکانی پاشاو سوڵتان بەهیچ شێوەیەك لەم چوار شتە تێپەڕناکات و هەموو پلەو پۆستەکانی تر دێنەوە ژێر ئەم چوار پۆست و پلەیە، بێجگەلەوەی بەرزترین پلەی ناوبراو لەهەموو پلەو پایەکان ئەوەیە کەیارمەتی وەرگرتن تێیدا بەشێوەیەکی گشتی لەسوڵتان و وەزیرەکەیەوە بێت و لەژێرچاودێری ئەودا بێت، بەجۆرێك واپێویست بکات کەوەزیر بەردەوام لەپەیوەندیدا بێت لەگەڵ سوڵتاندا و لەهەموو کاروبارەکانی وولاتدا بەشداربێت لەگەڵیدا، بەڵام ئەو پلەو پایانەی کەتایبەتن بەهەندێك خەڵك یان هەندێك لایەنی ترەوە وەك (کاتیبی و حاجیبی)بەشێوەیەکی قوڵتر لەوپلانەیە کەلایەنێکی گشتگیر تری هەیە و وەك پاسەوانی سنورو باج وەرگرتنی تایبەت یان سەرپەرشتی کردنی کارێکی تایبەت وەك وەزیفەی شارەوانی (محتسبی)لەمەسەلەی خۆراکدا، وەیان گرتنە ئەستۆی مەسەلەی لێدانی دراوەکان کەهەموو ئەم جۆرە کارانە تێڕوانینە لەحاڵەتە تایبەتەکانە و، لەئەنجامدا خاوەنانی دەبێت پەیڕەوی کەسانێك بن کەخاوەنی بۆچوون و تێڕوانینن لەمەسەلەگشتیەکاندا لەڕووی پلەو پایەوەسەرۆکی بێت.

لەدەوڵەتەکانی بەرلەئیسلامدا بەڕێوەچوونی کاروبارە کانی پاشایەتی پەیوەست بوو بەم شێوازەوە تائەوەبوو ئیسلام هاتوو فەرمانڕەوایی بەرگی خەلافەتی پۆشی و لەوەبەدوا هەموو ئەم پلەو پۆستانە بەهۆی لەناوچوونی داب و نەریتی پاشایەتیەوە

گۆڕان بۆشتانێك كەسروشتی بوون، وەك یارمەتی وەرگرتن لەبۆچوون و بەشداری كردن تێیاندا. چونكە لەناوچوونی نەگونجاو بوو وەك شتە پێویستیەكانیان لێهاتبوو، هەروەك پێغەمبەر (ص)مەشوەرەت و پرس و ڕاوێژی لەگەڵ صەحابەكانیدا دەكردو، ئەوانی لەهەموو شتە گرنگە تایبەت و گشتیەكاندا بەشداری پێدەكرد و لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەبوبەكر تایبەتمەندیەكی تری هەبوو، بەجۆرێك كەگروپێك لەعەرەبەكان شارەزای بارودۆخی دەوڵەتانی ساسانی و ڕۆمی و نەجاشی بوون بەئەبو بەكریان دەگووت وەزیری پێغەمبەر (ص)بەهۆی لەناوچوونی پایەی پاشایەتی و، سادەیی ئیسلامەوە وشەی وەزیر لەگەڵ چەمكە سادەو باوەكانی بەرلەهاتنی ئیسلامەوە لەنێو موسوڵماناندا ناسراو نەبوو، هەربەم شێوەیە بوو حاڵی عومەر لەگەڵ ئەبو بەكردا و حاڵی عوسمانیش لەگەڵ عومەردا، بەڵام چۆنیەتی تێچوون و خەراجەكان بەلای ئەمانەوە بەپایەیەك دانەدەنرا، چونكە نەتەوەی عەرەبی نەخوێندەوار بوون و نوسین و ژماردنیان بەباشی نەدەزانی و هەربۆیە كاروبارەكانی حیسابداریان دەدایە دەستی پیاوانی متمانە پێكراوی یەهود و گاورەكان (نصارا)و، یان خەڵكانێك لەمەوالیەكانی عەجەم كەشارەزابوون لەوبوارەدا ئەم جۆرە كەسانەش زۆركەم بوون تێیاندا، بەڵام ئەشرافی عەرەب حیسابیان بەباشی نەدەزانی چونكە نەخوێندەواری گرنگترین سیفەتیان بوو.

هەروەها كاروباری نامەتایبەتەكانی سوڵتان مخاطبات[٣٢٥] و جێبەجێ كردنی كاروبارەكان بەهۆی نەخوێندەواریانەوە هێندە گرنگ نەبوو بەلایانەوە و، سیاسەتی ئەمان بۆهەڵبژاردنی ئەم پلەیە ئەوەی نەدەخواست. چونكە خەلافەت تەنها لایەنی ئاینی هەبوو نوسەریش گرنگی پێ نەدەدرا. لەبەر ئەوەی هەموویان مەبەستەكانیان بەپاراوترین زمان دەگەیاند بێجگەلەخەت پێویستیان بەشتێكی تر نەبوو. هەربۆیە كاتێك كەخەلیفە كەسێكی ببینیایە و بەباشی بزانیایە دەیكردە جێنشینی خۆی لەنوسیندا واتە دەیكردە

[٣٢٥] جۆرێك بوولەنامەی تایبەتی سوڵتانی بۆ فەرمانڕەواكان كەتێیاندا فەرمانڕەوایان بەناوێكی تایبەتەوە بانگ دەكرد (بیهقی).

نوسەر و کاتبی خۆی، بەڵام دوور خستنەوەی خاوەن پێداویستیەکان لەدەرباری پاشادا لەڕووی شەرعەوە حەرام بوو هیچ کەسێك ئەم کارەی نەدەکرد، بەڵام هەرمێندەی کەبارودۆخی خەلافەت تێکچوو گۆڕا بۆ پاشایەتی و داب و نەریت و ناوەکانی سوڵتان کەوتنە سەر زاران یەکەمین شتێك کەلەدەوڵەتدا دەستیان پێکرد بارودۆخی دەربارو داخستنی دەرگاکانی بوو بەڕووی خەڵکیدا بەگشتی، چونکەلەگیانی خۆیان ترسیان هەبوو لەوەی کەبەدەستی خەواریج بکوژرێن، هەروەك چۆن عومەرو علی و موعاویە و عەمری کوڕی عاص و چەندانی تریش بەو دەردەچوون، سەرەڕای ئەمەش ئەگەر دەرباریان بەڕوی خەڵکیدا بەگشتی بکردایەتەوە خەڵکی قەرەباڵغی بۆدروست دەکردن و سەرقاڵیان دەکردن لەسەرقاڵبوون بەکاروبارە گرنگەکانەوە. هەربۆیە بۆڕێگری کردن لەهاتنی خەڵکی بەگشتی بۆ دەرباری کەسێك وئەوکەسەی کەئەم ئەرکەی پێدەسپێردرا بە حاجیب ناوزەد کرا.

دەڵێن لەبەر ئەوەی کەعبدالملیك حاجیبەکەی خۆی دیاری کردوو پێی گووت تۆم بۆئەم کارە هەڵبژاردووە، بەڵام ڕێگری لەسێ کەس مەکە کەبێنە لام یەکەم بانگبێژی نوێژ چونکە ئەو بانگەواز کارە بۆلای خودا، دووەم خاوەنی پۆستە و پەیك کەبەناچاری بۆکارێکی گرنگ دێت، سێەمیش پێشکار نەوەك بەچاوەڕێ کردن ئەوخواردنەی بۆمانی دەهێنێت خراپ ببێت. لەپاش ئەوە کاروباری دەوڵەتداری گەورەبوو گرنگی پەیدا کرد. هەروەك چۆن دەبینین بۆکاروباری کۆمەڵەو هۆزەکان و دروستکردنی ئولفەت لەنێوانیاندا ڕاوێژکارو یارمەتیدەریان دیاری کردو ناویان نا وەزیر، بەڵام مەسەلەی حیسابداری لەدەستی مەوالی و زیمیەکاندا مایەوە. وەبۆ نوسینگەی ئەحکام کاتبێکی تایبەتیان دیاری کرد کەهەموو نهێنیەکانی سوڵتانی دەزانی و نەیدەهێشت نهێنیەکانی بڵاو ببنەوە نەوەك بەو هۆیەوە سیاسەت و نەتەوەکەی لەناوبچن.

ئەم خاوەن نهێنیەوەك وەزیر نەبوو، چونکە پێویستیان بەوەهەبوو لەڕووی خەت و نوسینەوە، نەوەك لەڕووی زمان یان قسەکردنەوە، چونکە زمان تائەم ڕۆژگارە

نەگۆڕاوەو خراپە نەچووەتە ناخیەوە. هەربۆیە وەزارەت لەسەردەمی دەوڵەتی بەنی ئومەیەدا بەبەرزترین پلە دەژمێردرا چونکە بەڕێوەبردنی زۆربەی کاروبارەکان و پاسەوانی سنوور و فراوانخوازیەکان وچاودێری دیوان و سوپاو، پێویستی دەرکردنی خەرجیەکان سالانە بەشێوەیەکی شیاو پەیوەست بوون بەوەوە و هەمیشە لەبیریاندا بووەو پلانی بۆ داناون. وەلەبەر ئەوەی کەدەوڵەتی بەنی عباس دروست بوو شان و شکۆی پاشایەتی گەورەتر بوو پلەو پایەکانی گرنگیان پەیدا کردوو پلەو پایەی وەزیریش ڕێزێکی زیاتری بەخۆیەوە بینی و، لەجێبەجێ کردنی کاروبارەکانی حەل و عەقددا بوویە جێنشین و جێگری خەلیفە و پلەی وەزیر لەدەزگای دەوڵەتدا هێندەی تر بەرز بوویەوە و پیاوانی گەورەی دەوڵەت کەوتنە ژێر فەرمانیەوە و لەدیوانی موحاسەباتدا بوویە خاوەن بۆچوون و، چونکە پلەکەی ئەو وای دەخواست کەچاودێری دابەشکردنی خەرجیە بەردەوامە سالانەکانی سوپا بکات، هەربۆیە ناچار بوو چۆنیەتی کۆکردنەوەو خەرجکردنەکەیشیان لەئەستۆ بگرێت و ئەم کارەش زیاد کرا بۆسەر ئەرکەکانی تری، ئەوکات کاروباری قەڵەم و نوسینی نامەکان کەوتە ژێر چاودێری ئەوەوە بۆئەوەی نهێنیەکانی سوڵتان بەزمانێکی پاراو بنوسێتەوە، چونکە زمان لەلای خەڵکی بێسەروبەری تێکەوتبوو هەرکەسەو بەشێوەیەك زاراوە ڕەوانبێژیەکانیان بەکار دەهێنا، هەربۆیە مۆرێکی تایبەتی بۆنوسراوەکانی سوڵتان دروست کرد.

بۆئەوەی لەبلاو بوونەوە لەهەرجێگەیەکدا بیانپارێزێت هەربۆیە ناوی وەزیر دوو پلەو پایەی دەگرتەوە یەکەمیان شمشێرو دووەمیشیان قەڵەم و ماناکانی وەزارەت و جێگربوون، هەروەك چۆن تەنانەت جەعفەری کوڕی یەحیا لەسەر دەمی ڕەشیددا بەسوڵتان بانگ دەکرا ئەمەش ئامازەبوو بەوەی کەئەو کاروبارە تیۆری و گشتی و گشتگیرەکانی بەدەستەوەیەو ئەنجامدانی کارەکانی دەوڵەتیشی لەدەستدایەو، هیچ پلەیەك لەپلەکانی دەوڵەت لەدەستی هێزی ئەو بەدەر نەبوون بێجگە لەحاجیبی واتە وەستان لەبەردەرگای سوڵتاندا. تەنها ئەم وەزیفە لەئەستۆی کەسێکی تردا بوو چونکە

جەعفەر خۆشی لەم کارە نەدەهات. لەپاشان لەسەردەمی دەوڵەتی عباسیدا چۆنیەتی زاڵبوون بەسەر سوڵتان و سەربەخۆ خوازی لەبەرامبەرئەمەوە دەرکەوت و بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك وەزیرەکان دەستیان دەدایە کارکردن لەسەر سەربەخۆبوون لەبەرێوەبردنی دەوڵەتدا بەشێوە یەکی ڕەها، بەجۆرێك جارێك وەزیر زاڵ دەبوو جارێکیش سوڵتان و هەرکاتێك وەزیر زاڵبوایە ناچار لەبری خەلیفەش کارەکان بەڕێوە بەرێت بۆئەوەی حوکمە شەرعیەکان بەباشی جێبەجێ بکرێن، هەروەك لەبابەتەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد. لەم کاتەدا وەزارەت دەبێت بەدوو بەشەوە: یەکێکیان وەزارەتی تەنفیزو جێبەجێ کردن، ئەوەش ئەوکاتەبوو کەسوڵتان پشتی بەخۆی دەبەست و سەربەخۆبوو لەکارەکانیدا و، وەزیر وەك نوێنەری ئەو بوو لەجێبەجێ کردنی کاروفەرمانەکاندا، دووەمیشیان وەزارەتی سپاردن (تەفوین)بوو، ئەوەش لەهەلومەرجێکدا بوو کەوەزیر بەسەر سوڵتاندا زاڵبوو بەشێوەیەکی سەربەخۆ کاری دەکردو خەلیفە هەموو کارەکانی بەو سپاردووەو سەرپشکی کردووە لەبۆچوون و ئیجتیهادەکانیدا. لەم کاتەشدا بەهۆی دروستبوونی وەزرارەتی تەفویزو سپاردنەوە جیاوازی دروست بوبو هەروەك ئەوەی لەبارەی دوو ئیمامەوە ئەو جیاوازیە بەدی هاتبوو لەئەحکامەکانی پەیوەست بەخەلافەتدا باسمانکردن.

ئەوکات مەسەلەی زاڵبوون بەهەمان شێوە بەردەوام بوو تائەوەی کەفەرمانڕەوایی کەوتە دەستی نەتەوەکانی غەیرە عەرەب و وێنەی خەلافەت جوانیەکەی لەدەستدا. ئەم دەسەلاَتخوازانە نازناوەکانی خەلافەتیان بەخۆیانەوە نەدەناو لەنازناوەکانی تایبەت بەوەزیرەکانیشدا خۆیان بەدوور دەگرت، چونکە وەزیرەکان وەك خزمەتکارانی ئەوان وابوون هەربۆیە خۆیان بەناوەکانی ئەمیرو سوڵتانەوە دەناساند. ئەوەیشی کەبەتەنها خۆی دەوڵەتی ڕەهای بەدەستەوە دەگرت و بەڕێوەی دەبرد پێیان دەگووت (امیر الامرا) یان (سوڵتان)سەرەڕای ئەو نازناوانەی کەخەلیفە پێی دەبەخشین و سەرفەرازی دەکردن، هەروەك چۆن لەنازناوەکانیاندا دەیبینین. ناوی وەزیریان لەکەسێك دەنا کەخەلیفە کارە

تایبەتەکانی خۆی پێدەسپاردن ئەم بارودۆخەش بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاوەکو کۆتایی دەوڵەتەکەیان. لەماوەی هەموو ئەم بارودۆخەدا زمان خراپ بوو وەک پیشەیەکی لێهاتو هەندێك لەخەڵکی کردیانە کاری خۆیان هەربۆیە ئەم جۆرەکەسانە خرانە ناوبوارەکانی خزمەتکردنەوە لەدەوڵەتدا و سەرئەنجام وەزیرەکان لەئەرکی ڕەوانبێژی دوورکەوتنەوە و بەهۆی ئەوەی کەئەوان غەیرە عەرەب بوون و، ئەم ڕەوانبێژیە لەزمانەکەیاندا نەبوو هەربۆیە کەسانێکی تریان بۆ مەسەلەی ڕەوانبێژی هەڵبژاردو ئەم پیشەیەش کەوتە خزمەت وەزیرەکانەوە.

ناوی ئەمیریش تایبەتکرا بەسەرلەشکرو سەرکردەی سوپاکانەوەو ئەو بەخاوەنداریەتی ئەم بوارە دەسەلاتی لەهەموو دەرباریانی سەڵتەنەت زیاتر بوو، فەرمانی ئەوو لەبری هەرکامێکیان جێگەی پەسەند بوو جێبەجێ دەکرا. بارودۆخەکە بەم شێوەیە بەردەوام بوو ئەوکات لەکۆتایی دەوڵەتی تورکەکان لەمیسردا هاتە سەرکار. ئەمان لەوە تێگەیشتن کەوەزارەت بێ نرخ بووە و، لەو ڕووەوەی کەپیشەی بەلاغەت هەڵوەشاوەتەوە و تایبەتکراوە بەکەسێك کەلێپرسراوی کاروبارەکانی خەلیفەی مەحجورە لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێت پەیڕەوی قسەی ئەمیر بکەن، لەئەنجامدا وەزارەت دەبێتە سەرۆکایەتیەکی ناتەواو. هەربۆیە خاوەنان و لێپرسراوانی ئەم پلەبڵندە لەدەزگای دەوڵەتدا ڕقیان لەناوی وەزیر دەبوویەوە. فەرمانڕەوای سوپا لەدەوڵەتی ئەماندا بەناوی (نائب)بەوە بانگ دەکرا و تاوەکو ئەم سەردەمەش بەم شێوەیەبەردەوامە، ناوی حاجیبیش هەروەك خۆی مایەوە ووشەی وەزیریش لەدەوڵەتی ئەواندا تایبەتکرا بەکەسێکەوە کەکاروباری وەرگرتنی باجی لەئەستۆدابوو، بەڵام دەوڵەتی بەنی ئومەییەی ئەندەلوس ناوی وەزیریان لەهەمان ماناداا کەلەسەرەتای دەوڵەتی ئیسلامیەوە هەیبوو وەك خۆی هێشتەوە.

ئەوکات پلەی ئەویان دابەشکرد بۆ چەند بەشێك و بۆهەربەشێکیش وەزیرێکی تایبەتیان دانا بەم شێوەیە: وەزیرێك بۆ حیسابداری ماڵ و سامانەکان، وەزیرێك

بۆمەسەلەی نامەو پۆستە، وەزیرێکیش بۆ بەدەمەوە هاتنی شکات وسکالاّکانی ستەم لێکراوان، وەزیرێکیش بۆ چاودێری کردنی کاروبارەکانی سنور (پاسەوانی سنورەکان). خانوویەکی تایبەتیشیان بۆ ئەم وەزیرانە دیاری کردو ئەمان لەوشوێنانەدا لەسەر ئەو کورسیو مێزانەی کەبۆیان دانرابوو دادەنیشتنو فەرمانەکانی سوڵتانیان هەرکەسەوبەپێی پسپۆڕی خۆی جێبەجێ دەکردو، بۆهاتوو چۆو پەیوەندی لەنێوان وەزیران و خەلیفەدا یەکێکیان کەپلەیەکی بەرزتری هەبوو دیاری کرابوو هەرکات بیویستایە دەیتوانی بەبێ گرفت بچێتەلای سوڵتان و ئەم وەزیرەش ناوی لێنرابوو (حاجیب). ئەم بارودۆخەش تاوەکو کۆتایی دەوڵەتی ئەمان بەردەوام بوو پلەو پایەی حاجیب لەهەموو پلەو پۆستەکانی تر گەورەتربوو، بەئەندازەیەك مەلیكو هۆزەکانی ئەندەلوس ئەم نازناوەیان لەخۆیان دەنا. هەروەك چۆن ئێستە گەورەترینی ئەوان بەناوی (حاجب)بانگ دەکرێت، ئێمەش لەکاتی خۆیدا دیسانەوە لەم بارەیەوە گفتوگۆ دەکەین.

ئەوکات دەوڵەتی شیعەلەئەفریقاو قەیرەواندا دروست بوو لەبەر ئەوەی کەدامەزرێنەرانی دەوڵەت لەدەشتەکیەتدا ڕۆچوبوون و، لەسەرەتای کارەکەدا لەگرنگیدان بەم پلەو پۆستانەو پاڵفتەکردنی ناونیشانەکانیان بێ ئاگابوون، تائەوەبوو دەوڵەتەکەیان گەیشتە قۆناغی شارنشینی و ئەوکات لەناونانەکاندا دەستیانکردە چاولێکەری لەهەردوو دەوڵەتی پێشووی خۆیان، هەروەك لەهەواڵەکانی دەوڵەتەکەیاندا باسی دەکەین. وەلەبەر ئەوەی لەپاش دەوڵەتی شیعەوە دەوڵەتی موەحیدان دروست بوو سەرەتا بەهۆی دەشتەکیەتەوە بێئاگابوون لەم جۆرەکارانە، بەلاّم لەپاش ماوەیەك نازناوەکانیان بۆخۆیان هەڵبژارد. لەسەرەتادا ناوی وەزیر بەو جۆرەی کەهەبوو وەك خۆی مایەوە، بەلاّم پاشتر پەیڕەویان لەدەوڵەتی ئەمەویەکان کرد و لەشێوازو داب و نەریتەکانی سوڵتاندا چاویان لێکردنو، ناوی وەزیریان لەکەسێك دەنا کەحاجیبی دەرباری سوڵتان بوایەو ئەوکەسانەی کەدەهاتنە لای سوڵتان لەوشوێنەی کەبۆیان دیاری کرابوو

ڕایدەگرتن‌و ئەوهەڵسوکەوت و نەریتانەی پێ دەگووتن کەپێویست بوو لەوکاتەی کەدەچنە خزمەتی سوڵتان جێبەجێیان بکەن.

مووەحیدان پلەی حاجیبیان لەوەی کەهەبوو تائەوجێگەیەی کەدەیانویست گەشەیان پێدا کەتاوەکو هەنووکەش ئەم بارودۆخە بەردەوامە، بەڵام دەوڵەتی تورک لەخۆرهەڵاتدا بەوکەسەی کەداب و نەریتەکانی چوونە خزمەتی سوڵتان فێری خەڵکی دەکردو بەشان و باڵی سوڵتاندا هەڵیدەدا لەکۆڕو کۆبوونەوەکانیدا دەیانگووت (دەوادار)واتە نوسەری سوڵتان و هەڵگری حیبری نوسین، سەرەڕای ئەمەش سکرتێری تایبەتی سوڵتان خاوەنی پۆستەو گەیاندن کە کاربەڕێکەرانی کاروبارەکانی سوڵتان بوون لەناوچە دووردەستەکان‌و پایتەختدا دەبوایە پەیڕەویان لەوبکردایە. بارودخیان لەم ڕۆژگارەشدا لەسەر هەمان شێوازە و (خوداش هەرکەس کەبیەوێت دەیانکاتە فەرمانڕەوای کارەکان).[٣٢٦]

**حاجیبی:** لەلاپەڕەکانی پێشوودا ئەوەمان باسکرد کەئەم نازناوە لەدەوڵەتی ئەمەوی و عەباسیەکاندا تایبەت بوو بەکەسێکەوە کەسوڵتانی لەبەرچاوانی خەڵکی بەگشتی دادەپۆشێت و، دەرگای لێیان دادەخات یان بەپێی کاتێکی دیاری کراو هەبوونی کاتی سوڵتان دەرگای ناوبراویان بەڕوویاندا دەکردەوە، ئەم پلەیە لەوسەردەمەدا لەپلەکانی تری دەربار بەرزتر بووە ئەوکەسەی کەلەئەستۆی دەگرێت بەژێردەستی پلەکانی تری ژێر چاودێری وەزیرەکان دەژمێردرێت، چونکە وەزیر هەرچیەکی بەباش بزانیایە لەپلەی حاجیبیدا دەستوری دەداو وەهەروەها لەسەردەمی ڕۆژگاری بەنی عەباسدا بارودۆخ بەم شێوەیە بووە، تاوەکو ئەم سەردەمەش لەمیسردا ئەم شێوازە باوی هەیە حاجیبیش لەژێر فەرمانی پلەیەکی بالاتردایە کەدەسەلاتدارەکەی بە (نائیب)ناوزەد دەکەین، بەڵام لەدەوڵەتی ئەمەوی ئەندەلوسدا حاجیبی پەیوەست بوو بەکەسێکەوە کەسوڵتانی لەدیداری هەموو کەسێك بەبێ جیاوازی بەدوور دەگرت و، وەك نێوەندێك وابوو لەنێوان سوڵتان و وەزیرو پلەکانی تری خوارەوەیاندا هەربۆیە ئەم پلەیە لەدەوڵەتی ئەواندا

---

[٣٢٦] (وَاللهُ يُؤتِي مُلكَهُ مَن يَشاء) س البقرة ئا ٢٤٧.

بەپلەی بالآ دەژمێردرا هەروەك لەهەواڵەكانیاندا دەیبینی وەك ئیبن جەدیر[٣٢٧] و حاجیبەكانی تریان.

ئەوكات لەبەر ئەوەی سەردەمی دەولەتی ڕەهاو تاكرەوی دەولەت هات ئەم نازناوە بەهۆی ئەو گرنگیەی كەهەیبوو تایبەت بوو، بەكەسێكەوە كەلەدەزگای دەولەتدا فەرمانرەوای ڕەها بوایە. هەربۆیە منصوری كوری ئیبن ئەبی عامیر و نەوەكانی ئەویان بەحاجیب ناوزەد دەكرد كاتێكیش لەقۆناغەكانی دەولەتداریدا دەگەنە قۆناغی كۆتایی و سەردەمی ملوك التوایف هاتە پێشەوە و، ئەوانیش نازناوی حاجیبیان نەخستەلاوە و بەپلەیەكی بەرز دایان دەنا و ناچاربوون لەپاش ناوونیشانەكانی گەورەترین كەسایەتی وولآت و، لەپاش ناوزەدكردنی بەنازناوە پاشاییەكانەوە هەردوو نازناوی حاجیب و، (ژوالوزارتین)واتە خاوەنی دوو وەزارەتەكە تۆمار بكەن كەنازناوی دووەمیان ناوونیشانی بەرپرسیاریەتی شمشێرو قەڵەم بوو بەیەكەوە.

حاجیب دەیگووت كەرێگەدان و مۆڵەت وەرگرتن بۆخاص و عام بۆ بینینی سوڵتان لەدەستی ئەمدایە و خاوەنی دوو وەزارەتەكەش ئەوەی نیشاندەدا كەهەردوو پلەی قەڵەمو شمشێر تایبەتەبەوەوە. لەوەبەدواوە لەدەولەتەكانی مەغریب و ئەفریقادا باسێك لەم ناوەنەبوو لەو ڕووەوەی كەئەوان هێشتا لەژێر كاریگەری دەشتەكیەتیدا بوون لەوانەیە لەدەولەتی عبیدیەكانی میسردا وشەی حاجیبی بدۆزینەوە، بەلآم زۆربەكەمی چونكە لەپاش گەورەبوونی دەولەت و خووگرتنیان بەداب و نەریتەكانی شارنشینیەوەیە. وەكاتێك دەولەتی مووەحیدان هاتە سەركارو، بێجگە لە كۆتایی سەردەمی فەرمانرەوایی خۆیاندا تاوەكو سەردەمێكی دوورو درێژ شارستانیەتێكی وەهایان نەبووە كەئەوان والێبكات بیرلەنازناوو پلەكانی دەولەتداری‌و ناونانیان بكەنەوە، هەربۆیە لەدەولەتی ئەواندا بێجگەلەپلەی وەزیر هیچ پلەیەكی تر نەبوو. هەروەك چۆن ئەم ناوەیان

---

[٣٢٧] ئیبن جدیر وەزیرو گەورەترین پێشكاری عبدالرحمان ناصر خەلیفەی گەورەی ئەمەویەكانی ئەندەلوس بووە و لەناوەراستی صفری ساڵی ٣٢٠ ك كۆچی دوایی كردووە .

تایبەتکردبوو بەکاتبێك کەلەکاروبارە تایبەتیەکانی سوڵتاندا بەشداریو هاوکاری دەکرد، وەك ئیبن عەتیە و عبدالسلامی کومی ئەو هەموو ئەم کاروبارو موحاسەباتە ماڵیانەی لەژێر دەستدابوو. دواتر ناوی وەزیریان لەبەرپرسان و خانەدانی مووەحیدان دیاری کرد وەك ئیبن جامیع و خەڵکانی تر. لەوسەردەمەدا ناوی حاجیب لەدەوڵەتی ئەماندا کاری پێنەدەکرا، بەڵام لەخانەدانی ئەبو حەفصی ئەفریقادا لەپلەی یەکەمی سەرۆکایەتی پرس‌و ڕاوێژ تایبەت بوو بەووەزیرەوە کەبەناوی شێخ الموحیدینەوەبوو، ئەم کەسە لەدانان و لابردنی فەرمانڕەوایان و فەرماندەکانی سوپاو جەنگەکاندا دەسەڵاتی هەبوو. کاروباری ژمێریاری و دیوان پلەیەکی تربوون خاوەنی ئەوپۆستەش بەبەرپرسانی ئەشغالّ ناسرابوون کەبەئازادیەکی تەواوەوە لەداهاتوو خەرجیەکاندا هەڵسوکەوت‌و چاودێری دەکرد و لەزیادەڕەوی و شتەناباشەکانی تری ئەو بوارە ڕێگری دەکرد، مەرجی وەرگرتنی ئەم پۆستەش ئەوەبوو ئەوکەسەی کەوەری دەگرێت پێویستە لەخانەدانی مووەحیدان بێت. کاروباری قەڵەمیش تایبەت بوو بەکەسێکی ترەوە کەبەباشی نامەنوسین بزانێت و نهێنیەکان بەئەمانەتەوە بپارێزێت، لەبەر ئەوەی خانەدانی ناوبراو خوێندنەوە و نوسین فێر نەدەبوون نامەکانیش بەزمانی ئەمان نەبوون و هەربۆیە ئەم پلەیە ئەومەرجەی لەگەڵدا نەبوو کەبەرپرسەکەی لەخانەدانی ئەوان بێت.

بەهۆی فراوان بوونی وولآت و زۆر بوونی نانخۆران (مووچەخۆران)ی دەربارو سوڵتان ناچار بوو قارەمانێك بۆ کاروبارەکانی دەرباری سوڵتان هەڵبژێرێت و، ئەوکەسەش ئەرکی ئەوەبوو کەچۆنیەتی خەرجیەکانی دەربار بەشێوەیەکی شیاوو باش ڕێك بخات و خەرجە ساڵآنەکان و خۆراك پۆشاك و خەرجیەکانی چێشتخانەو گەورەکان و شتەکانی تریش دیاری بکات و، ئەندازەی کۆگاکان هەڵبسەنگێنێت و ئەندازەی ئەوپێداویستیانەی کەبۆ ئەم شتانە پێویستن دابەشبکات بەسەر ئەو کەسانەدا کەباج دەدەن، بەرپرسی ئەم پۆستەش پێی دەڵێن حاجیب. ئەگەر بهاتایەو وەها حاجیبێك نوسینی بەباشی بزانیایە

ئەوا نوسینی واژۆ کردنیشیان لەسەر دەفتەرو تۆمارەکانی ئەحکامیشیان پێدەسپارد، بەڵام دیسانەوە لەوانەش بوو هەربیدەنە کەسێکی تر.

ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە بەردەوام بوو سوڵتان دیداری لەگەڵ خەڵکیدا نەدەکرد و لەئەنجامدا ئەم حاجیبە نەك تەنها بۆ خەڵکی بەڵکو بوویە نێوەندو پەیوەند لەنێوان سوڵتانو، بەرپرسەکانی تری سەڵتەنەتیشدا. لەپاشان لەکۆتایی دەوڵەتیشدا کاروبارەکانی شمشێرو جەنگیش بەو سپێردران ئەوکات بۆچوون و پرس و ڕاوێژ تایبەت بوو بەمەوە و، تاوەکو سەرئەنجام ئەم پلەیە بوویە بەرزترین پلەی باڵای دەوڵەت. هێندەی نەبرد کەلەدوای سوڵتانی دوازدەیەمی مووەحیدانەوە سەردەمی دەسەڵاتی ڕەهاو گۆشەگیر کردنی سوڵتان دەرکەوت و حاجیب لەزۆربەی کارو بارو بڕیارەکاندا سەر بەخۆیی وەرگرت و لەپاش ئەویش نەوەی سوڵتانی ناوبراو ئەبوالعباس دەستی کردە دەسەڵاتداریەتی ڕەهاو جڵەوی دەسەڵاتی گرتەدەستو، شوێنەوارەکانی گۆشەگیری بەلەناوبردنی حاجیبیەتی کەوەك پەیژەیەك بوو بۆ ئەم کارە لەناوی بردو خۆی هەموو کارەکانی گرتە ئەستۆ بەبێ ئەوەی کەیارمەتی لەهیچ کەسێك وەربگرێت، کەتاوەکو ئێستەش بارودۆخ بەم شێوەیە، بەڵام لەدەوڵەتی زناتەی مەغریبدا کەگەورەترینیان دەوڵەتی مەرینیەکانە بەهیچ شێوەیەك ناوی حاجیب بوونی نیە.

سەرۆکایەتی جەنگ و سوپا لەدەوڵەتی ئەواندا لەدەستی وەزیر دایەو پلەی قەڵەم لەکاروبارەکانی موحاسەباتو نامەنوسینەکاندا بەکەسێك دەسپێردرێت کەبەباشی بیزانێت و ئەهلی ئەم هونەرەبێت، هەرچەندە لەهەندێك حاڵەتدا تایبەتکراوە بەخانەدانی هەوا بازانەوە، بەڵام پلەی موحاسەبات و نامەنیگاری نوسین هەردووکیان بەیەك کەس دەسپێردرێن و هەندێك جاریش هەریەکەیان دەدرایەدەستی کەسێکی تایبەت، بەڵام دەرباری سوڵتان و وون کردنی لەبەر چاوانی خەڵکی بەگشتی لەدەوڵەتی ئەماندا پلەیەکە کەلێپرسراوەکەی بە (مزوار)ناوزەد کراوە. ئەم وشەیەش بەکەسێك دەگووترێت

کەسەرۆکی ئەرکانی گاردی سەڵتەنەتی (جنادره)[٣٢٨] لەئەستۆدابێت و دەبێت فەرمانەکانی سوڵتان جێبەجێ بکاتو، سزادانەکانی لەئەستۆدابێت و توندوتیژیەکانی سوڵتان لەبەرامبەر خەڵکیدا ئەم ئەنجامیان بداتو، ئاگاداری زیندانیەکانی دەرباری ئەو بێت و پاسەوانی سەرۆکی زیندانیش بێت. کەواتە کاروبارەکانی دەربار لەدەستی ئەودایە و ناچارکردنی خەڵکی لەدەرباری گشتی سوڵتاندا بەو فەرمان و سنورانەی کەبۆیان دیاری کراوە پەیوەستە بەمەوە هەروەك چۆن بڵێی ئەم کارە وەزارەتێکی بچوکە، بەڵام لەدەوڵەتی خانەدانی عبدالواد دا، هیچ شوێنەوارێك لەم جۆرە نازناوانە نیە و پلەکانی دەوڵەتداری لەیەکتری جیا ناکەنەوە چونکە دەوڵەتەکەیان لەقۆناغی سەرەتایدا بوو ماوەیەکی کەمیش حوکمی کرد.

تەنها لەهەندێك حاڵەتدا نەبێت کەسێك کەلەدەرباری سوڵتاندا سەرقاڵی کاروبارەکانی ناوبراوبوایە پێیان دەگووت حاجیب، هەروەك چۆن لەدەوڵەتی خانەدانی ئەبو حفصدا باوبووە و هەندێك جاریش وەکو ئەبو حەفصیەکان کاروباری حیسابداریو، دەفتەری حوکمەکانیان پێدەسپارد ئەوەی کەئەمانی والێدەکرد کەچاولێکەری دەوڵەتی خانەدانی ئەبو حفص بکەن، ئەوەبوو کەدەوڵەتی خانەدانی عبدالواد لەسەرەتای فەرمانڕەواییەوە بەیعەتیان بەئەبو حفصیەکان دابوو ملکەچی بانگەوازی ئەوان بوون، بەڵام خەڵکی ئەندەلوس لەم ڕۆژگارەدا ئەوکەسەی کەبەرپرسی کاروباری ژمێریاری موحاسەبات و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی سوڵتان و کاروباری دارایی بوو، پێیان گوتووە وەکیل کەدەکاتە مانا بنەڕەتیەکەی وەزیر بیجگەلەوەی هەندێك جار کاروباری نامەکانیشی پێ دەسپێردرا.

سوڵتانی ئەمان بەخەتی خۆی هەموو دەفەتەرەکان واژوو دەکات و پلەی نیشانەدانان لەدەفتەرەکانی ئەحکامدا لەلای ئەمان وەك دەوڵەتانی تر بوونی نیە، بەڵام دەوڵەتی تورکی میسر، ناوی حاجیب لەلای ئەمان بەفەرمانڕەوایەك دەگوترا کەشانو شکۆداربوایە

---

[٣٢٨] ئەم ووشەیە فارسەکان لەعەرەبەکانەوەریان گرتووە وماناى چەکدارەکان دەگەیەنێت .

کەئەوانیش تورکەکان بوون و حوکمەکان لەشارەکاندا بەسەر خەڵکیدا جێبەجێ دەکەن و ئەمانە ژمارەیان زۆرەو ئەم ئەرکە لەژێر چاودێری (نیابت)نوێنەردا ئەنجام دەدرا و، ئەم نیابەتەش لەئەستۆی کەسانێکدایە کەهەم فەرمانڕەوان بەسەر خاوەن پلەکانی دەوڵەت و هەم بەشێوەیەکی گشتی و ڕەها فەرمانڕەوایی خەڵکی دەکەن. لەهەندێك کاتیشدا دانانو بەرکەنار کردنی هەندێك لەفەرمانبەران لەئەستۆی نائیب دایە واتە نوێنەری سوڵتان، کەدەتوانێت هەندێك لەخەرجی و جیرەکان ببڕێت یان جێگیر بکات و دایبنێتو فەرمانەکانی وەك بڕیاری سەڵتەنەت جێبەجێ دەکرێن، چونکە ئەو نوێنەری ڕەهای سوڵتانە. فەرمانی حاجیبانیش تەنها لەنێوان چینەکانی خەڵکی و ئەولەشکریانەدایە کەلەکاتی کێشەکانیاندا دەچنە لای ئەوان و هەم ئەوکەسانەشی کەگوێڕایەڵی ناکەن ناچاریان دەکەن بەفەرمانبەری و گوێڕایەڵی و ئەودەستەیەی ئەمان لەڕوانگەی جل و بەرگ و نیشانەکانەوە سەربەدەستەی نیابەتە. وەزیر لەدەوڵەتی تورکاندا بەرپرسی وەرگرتنی باج و خەراجەکانە و کەهەمووماڵیاتێکی وەك باج یان خەراج یان جزیە وەردەگرن و، لەپاشان لەکاروبارەکانی سوڵتانیدا خەرجیان دەکەن و ئەوبەهەموو ئەوانەوە دەتوانێت هەموو کارگوزاران و کاروباری وەرگرتنی باج لەسەر کارەکانیان دوور بخاتەوە و داشیان بنێت، ئەو وەك نوێنەرێکە لەنێوان سوڵتان خەڵکیدا بەپێی جیاوازی چین و توێژەکانی خەڵکی.

یەکێك لەنەریتەکانی دەوڵەتی تورکانی میسر ئەوەیە کەدەبێت ئەم وەزیرە لەقیبتیەکان بێت کەبەرپرسی کاروباری دیوانو ژمێریاری و وەرگرتنی باجن چونکە ئەم گروپە لەسەر دەمەکۆنەکاندا لەمیسر تایبەتمەند بوون بەم کارەوە. هەندێك جاریش سوڵتان ئەم وەزارەتەی دەدایەی دەستی یەکێك لەپیاوانی خاوەن شان و شکۆی تورك یان نەوەکانیان بەپێی پێویست. خوداش بەدانایی خۆی هەڵسوڕێنەری کاروبارەکانە و بێجگەلەو خودایەکی ترنیە و هەرئەوە پەروەردگاری سەرەتاو کۆتاییەکان.

**دیوانی کارگوزاران وخەراجەکان:** دەبێت ئەوە بزانین ئەم وەزیفە لەگرنگترینی ئەرکو وەزیفەکانی دەوڵەتداریە و ئەرکیشی وەرگرتنی باجەکان و پاراستنی مافی دەوڵەتە لەدەخل و خەرجداو، ئاماری سوپایە لەگەڵ باسکردنی ناوەکانیان و هەڵسەنگاندنی خوردو خۆراکیان و مووچەی ساڵآنەیانە لەشوێنی خۆیدا، لەبارەی ئەم مەسەلانەوە دەبێت ئاگاداری ئەو یاسایانە بێن کەبەرپرسانی ئەپۆستانەو، موحاسیبەکان (قارەمانان)ی دەوڵەت ڕێکیان خستووە و بگەڕێینەوە بۆیان و هەموو ئەم یاسایانەش لەدوو توێی کتێبێکدا هاتوون و ووردەکاری داهاتو، خەرجیەکانی تێدایەو بێجگەلەوکەسانەشی کەلەم مەسەلەیدا لێهاتوون پەیان پێنابەنو بەم کتێبەش دەڵێن (دیوان)، هەروەك چۆن جێگەی دانیشتنی کارگوزارانیش ئەم ناوەیان لێناوە دەڵێن سەرچاوەی ئەم ناونانە ئەمەیە کەڕۆژێکیان ئەنوشیروان سەیری دیوانی خۆی و نوسەرەکانی دەکرد و، لەکاتێکدا خۆیان سەرقاڵی حیسابکردن بوون و وادیار بوو کەقسەلەگەڵ خۆیاندا دەکەن هەربۆیە پێی گووتن شێت (دێوانە)و، لەوە بەدواوە ووردە ووردە (ە)کەیان لێکردەوە و، بەهۆی زۆر بەکار هێنانیەوە ئەم وشەیە گۆڕا بۆ (دیوان). ئەوکات ئەم ناوە بەو کیتابە دەگوترا کەیاساکانی موحاسەبەی تێدابوو. دەڵێن دیوان لەزمانی فارسیدا ناوی شەیتانەکانەو کتێبەکەشیان لەو ڕووەوە ناوناوە کەژمێریاران لەتێگەیشتنی کاروبارەکان و ئاگادار بوون لەمەسەلەئاشکراو نهێنیەکان و، کۆکردنەوەی شتە دەگمەن و بلآوەکان کەبەخێرایی نفوزیان هەیە و ئەوکات وشەکە بەوشوێنە گوتراوە کەئەم ژمێریارانەی لەسەر دادەنیشن هەربۆیە وشەی دیوان هەم ناوی کتێب نامەکان و هەم ناوی شوێنی دانیشتنی ژمێریارانی دەرباری سوڵتانی دەگەیاند، هەروەك چۆن لەداهاتوودا باسی دەکەین.

ئەم ئەرکە هەندێك جار بەتەنها دەدرایە یەك کەس و هەموو کارەکانی پەیوەست بەومەسەلەیەی دەخستە ژێر چاودێری خۆیەوەو، هەندێك جاریش هەرجۆرێکیان دەسپاردە دەستی کەسێك بۆئەوەی چاودێر بێت بەسەریانەوە، هەروەك چۆن لەهەندێك

دەوڵەتدا چاودێری کردنی کاروباری سوپاو کەرتەکان و ژمێریاری و خەرجیەسالآنەکانی ئەوانیان و نمونەی ئەمانەیان بەپێی زاراوەکانی ئەودەوڵەتەو ئەوبڕیارانەی کەدامەزرێنەرانی دیاریان کردووە دەدرێتە دەستی کەسێك، وەدەبێت ئەوەش بزانین کەئەم ئەرکە کاتێك لەدەوڵە تەکاندا دروست دەبێت کەدەسەلآتی فەرمانڕەوایی پەیدا دەکەن ولادەکەنەوە بەلای هەموو بوارەکانی دەوڵەتداریدا.

یەکەمین کەسێکیش کەلە دەوڵەتی ئیسلامیدا دیوانی دامەزراند خەلیفە عومەر بوو خوای لێ ڕازی بێت و، دەڵێن ئەم کارەشی بەهۆی ئەو ماڵ وسامانەوە بوو کەئەبو هورەیرە لەبەحرەینەوە هێنابووی لەبەر ئەوەی بەزۆریان دەزانی لەدابەشکردنیدا ماندوبوون. لەوڕۆژەوە بڕیاری ئەوەیاندا کەلەوە بەدواوە سامانەکان بژمێرن و خەرج و دەرامەتە سالآنەو مووچەکان تۆمار بکەن، خالیدی کوڕی وەلید ئاماژەی بەدیوان کردو گووتی: بینیم کەپاشای شام شتەکانی دەوڵەتی تۆمار دەکرد، عومەریش پێشنیارەکەی قبوڵکرد. وەدەڵێن کاتێك هورموزان ئاماژەی بەدیوان کردوە کاتێك بینیویەتی عومەر بەبێ تۆمارو دیوان سوپا کۆدەکاتەوە پێی گوتوە ئەگەر کەسێکیان ئامادە نەبێت چۆن پێی دەزان؟ چونکە هەرکەسێك دوابکەوێت ئەوا جێگەی خاڵی دەبێت، بەڵکو نوسینی ناوەکانیان ڕێکو پێکیان دەکات. ئەوکات هورموزان دیوانێکی بۆدانان. عومەریش لەبارەی ناوی دیوانەوە پرسیاری کردو هورموزانیش مەسەلەکەی بۆ ڕوون کردەوە. وەکاتێك عومەر بڕیاریدا کەدیوان دابمەزرێنێت فەرمانی بەنوسەرەکانی قورەیش عەقیلی کوڕی ئەبی تالیب و مەحرەمەی کوڕی نوفل و جوبەیری کوڕی مەتعەم کرد بەشداری بکەن لەنوسین و ڕێکخستنیداو، ئەوانیش دیوانی سوپای موسوڵمانیان بەتەرتیبی خانەدانەکان نوسیانەوەو، لەخزمانی پێغەمبەرە(ص)وە دەستیان پێکردو لەپاش ئەوەش هەرخانەدانێك نزیك بێت لەخانەدانی پێغەمبەرایەتیەوە بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك تۆماریان دەکرد.

زوهری لەسعیدی کوڕی موسەیبەوە گێڕاویەتیەوە کەئەم شتە لەموحوڕەمی ساڵی بیستەمی کۆچیدا ڕوویداوە، بەڵام دیوانی خەراج وماڵیاتەکان لەپاش ئیسلامەوە لەسەر هەمان شێوە مابوویەوە کەبەر لەهاتنی ئیسلام لەسەری بوو. دیوانی عێراق بەزمانی فارسی و دیوانی شام بەزمانی ڕۆمی دەنوسرانەوە و نوسەرانی دیوانەکانیش لەخانەدانەکانی هەردوو گروپ بوون. وەکاتێك عبدالمليكی کوڕی مەروان گەشتە خەلافەت کاروبارەکان بەرەو پاشایەتی هەنگاویان ناو نەتەوەی عەرەب لەتوندوتیژی دەشتەکیەتەوە گۆڕان بۆ درەوشاوەیی شارنشینی و، لەسادەیی و نەخوێندەواریە بوونە خوێندەوارو نوسین فێر بوون و لەنێو عەرەب و مەوالیەکاندا مامۆستایانێك هەبوون کەلەنوسین و حیسابداریدا دەرکەوتن و عبدالملكی کوڕی سولەیمانی کوڕی سەعد کەلەو سەردەمەدا فەرمانڕەوای ئەردەن بوو، فەرمانی دا کەدیوانی شام وەربگێڕنە سەر زمانی عەرەبی و لەوەش بەدواوە بەعەرەبی شتەکان تۆمار بکەن، و ئەو لەسەرەتای دەستکردن بەم کارەوە لەماوەی ساڵێکدا تەواوی کردو لەبەر ئەوەی کەسەرحون کاتیبی عبدالمليك شارەزای ئەم شتە بوو، بەنوسەرە ڕۆمیەکانی گووت ڕۆزی خۆتان لەپیشەیەکی تردا بدۆزنەوە و، بەشوێنیدا بگەڕێن چونکە خودا ئەم شتەی لەئێوە سەندەوە، بەڵام دیوانی عێراق لەسەر دەمی حەجاجدا گۆڕانکاری بەسەردا هاتوو ئەو بەم بارەیەوە بەنوسەرەکەی خۆی صالحی کوڕی عبدالرحمان فەرمانی کرد چونکە ناوبراو نوسینی فارسیو، عەرەبی دەزانی و ئەم هونەرەی لەزادان فەرخ نوسەری پێشووی حەجاجەوە فێربوبو لەبەر ئەوەی کەزادان فەرخ لەجەنگدا لەگەڵ عبدالرحمانی کوڕی ئەشعەسدا کوژرا حەجاجیش صالحی لەشوێنی ئەو داناو کردیە کاتبی خۆی و، فەرمانی پێکرد کەدیوان بەزمانی عەرەبی وەربگێڕێت و لەوەبەدواش دیوان بەزمانی عەرەبی بنوسێت، ئەویش فەرمانەکەی جێبەجێ کرد، بەڵام نوسەرە فارسەکان نەفرەتیان لەم کارە کرد. عبدالحميد بن یەحیا دەیگووت خودا خێری صالح بنوسێت، ئەوچ منەتێکی گەورەی بەسەر هەموو نوسەرەکانەوە هەیە.

ئەوکات ئەم ئەرکە لەدەوڵەتی بەنی عباسدا دەدرایە ئەوکەسانەی کەشیاوی ئەم پۆستەن، هەروەك چۆن برەمكیان و خانەدانی سهلی کوڕی نوبخت نمونەی ئەمانە لەوەزیرانی دەوڵەت ئەم ئەرکەشیان ئەنجام دەدا، بەڵام ئەوحوکمە شەرعیانەی کەپەیوەست دەبن بەوئەرك و وەزیفەیەوە وەك مەسەلە تایبەتەکانی سوپاو بیت المال لەبارەی دەرامەت و خەرج و ناسینی ئەو ناوچەو شوێنانەی کەبەئاشتی یان بەزەبری هێز کەوتوونەتە ژێردەسەلاتی ئیسلامەوە و، ئەوەی کەئەم وەزیفە پێویستە بەچ کەسێك بسپێردرێت و هەلو مەرجی نوسەرەکەی و یاساو حیسابداریەکان و هەموو ئەمانە شتانێکن کەپەیوەستن بە کتێبەکانی ئەحکامی سوڵتانیەوەو، لەکتێبە ناوبراوەکاندا نوسراون و لەدەرەوەی بابەتی کتێبەکەی ئێمەوەن چونکە ئێمەلەم بارەیەوە تەنها باسی ئەو تێڕوانیەنە دەکەین کەپەیوە ستە بەسروشتی دەوڵەتداریەوە، هەمان ئەوئامانجەی کە لەم کتێبەدا لەسەری دەڕۆین، ئەم وەزیفە لەم ڕوانگەیەوە بەشێکی گەورەی دەوڵەتداریە و بەڵکو بە سێیەمین پایەشی دەژمێردرێت، چونکە هەرپاشایەك بەناچاری دەبێت خاوەنی سوپاو ماڵ و سامان (دیرهەم دینار) قسەکردن و، پەیوەندی بێت لەگەڵ کەسانێکدا کە دوورن لێوەی.

هەربۆیە خاوەنانی دەوڵەت لەکاروبارەکانی قەڵەم و شمشێرو ماڵ کۆکردنەوەدا پێویستی بەکەسانێکە کەبەرپرسیاریەتی هەریەکەلەم پۆستانە بەهۆی پێویستی خەڵکی پێیان بگرێتە ئەستۆو تایبەتیان بکات بەسەرۆکایەتی وولاتەوە. مەسەلەی دیوان لەدەوڵەتی بەنی ئومەیەی ئەندەلوس و ملوك التوایف لەپاش ئەمان هەربەم شێوەیە بووە، بەڵام لەدەوڵەتی مووەحیداندا دەبوایە بەرپرسانی ئەم پۆستە لەخانەدانی مووەحیدان بێت و بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەبەدەستهێنانی ماڵ و، سامان و شێوازی کاری فەرمانڕەوایان و کارگوزاران لەم بارەیەوە چاودێری دەکرد و سامانی ناوبراوی لەو شوێنانەی کەپێویست بوایە بەپێی پێویست خەرجی دەکردو خاوەنی ئەم کارەش پێی

دەڵێن بەرپرسی ئەشغالٚ، چونکە لەهەندێك شوێندا ئەوانەی کەلەخانەدانی مووەحیدان نەبوون و لەم هونەرەدا لێهاتوو بوون ئەم ئەرکەیان پێدەسپاردن.

وەلەبەر ئەوەی خانەدانی ئەبو حەفص لەئە فریقادا گەشتنە دەسەلآت و دەستیانکردە وەرگرتنی جیزیە لەرێگەی (جالیە)[٣٢٩] رەوەندی ئەندەلوسەوە. هەربۆیە گروپێك لەخانەدانە بەرێزەکان کەوتنە پێش ئەوانەوە ولەنێوانیاندا کەسانێك بوون کەلەئەندەلوسدا کاری وەرگرتنی جزیەیان پێ سپێردرابوو، وەك خانەدانی سعید کەخەڵکی قەڵای جواری غەرناتەبوون و بەخانەدانی ئەبو الحسن بەناوبانگ بوون. ئەبو حەفصیەکان سودیان لەتوانای ئەوان وەرگرت و لەکاروبارەکانی خەراج و ئەشغاڵدا دایان نان و هەربەو شێوەیەی کەلەئەندەلوسدا ئەم ئەرکەیان لەئەستۆدابوو لەهەمان کاتیشدا بەکاروباری مووەحیدانیش رادەگەیشتن، واتە جارێك لەگەڵ مووەحیدان و جارێکیش لەگەڵ حەفصیەکاندا کاریان دەکرد. ئەوکات حیسابزان و نوسەری تایبەت دەرکەوتن و کارەکەلەدەستی مووەحیداندا دەرهێنرا. لەپاشان لەبەر ئەوەی کەمەسەلەی حاجیبی بەهێز بوو فەرمانەکانی لەهەموو کاروبارەکانی دەوڵەتدا جێبەجێ دەکران ئەم نەریتە وەستێنراو بەرپرسەکانی کەوتنە ژێردەستی حاجیبەوە و وەك باج وەرگرەکانیان لێهات ئەم پلەی سەرۆکایەتیە کەلەو دەوڵەتەدا هەبوو لەناوچوو، بەڵام لەدەوڵەتی خانەدانی مەرینیدا تائێستەش پلەی ژمێریاری خەرجیەسالآنەکان و وەرگرتنی باجەکان لەدەستی کەسێکدایە و بەرپرسانی ئەم پلەو پایەیە کەسێکە کەهەموو موحاسەباتەکان، واتە هەموو ژمێریاریەکان راست دەکاتەوە و دەیانگێرنەوە بۆ دیوانەکەیان، بۆچوونی ئەو لەپاش بۆچوونی سوڵتان و وەزیرەوە یەو خەت و واژووی ئەو لەراست و دروستی خەراجو خەرجەسالآنەکاندا ئیعتیباری هەیە.

---

[٣٢٩] لەدەستەواژەکانی دیوانی بووە لەکۆتایی دەسەلآتی ئەمەویەکاندا وەلەسەردەمی دووەمی عەباسیەکاندا بەمانای خەراج و بەشی رێك وپێك بەکار دەهات (المرجع).

ئەمانەن بنەمای پێگە سوڵتانیەکان کەپلەو پایەیەکی بڵندن وخاوەنەکانیان چاودێری گشتی دەکەن و ڕاستەوخۆ سەروکاریان لەگەڵ سوڵتاندایە. ئەم پلەیە لەدەوڵەتی تورکدا چەند جۆرێکە، هەروەك چۆن بەبەرپرسانی دیوانی خەرجەساڵانەکان دەڵێن چاودێری سوپا و سامانی تایبەت بەوەزیری هەیەوچاودێری دیوانی وەرگرتنی باجی گشتی دەوڵەتەو، لەبەرزترین پلەی چاودێرانی داراییە چونکە چاودێری دارایی بەلای ئەمانەوە بەهۆی فراوانی دەوڵەت و گەورەیی سەڵتەنەت و بازنەی فراوانی دارایی خەراجەکانەوە دەبێت بەچەند پلەیەکەوە و ناکرێت یەك کەس هەمووی بەڕێوەببات، هەرچەندە لەلێهاتوویدا کەس شان نەدات لەشانی و بەکەس بەراورد نەکرێت. هەربۆیە چاودێری گشتی ئەم بەشە بەتایبەت پێی دەڵێن وەزیر و ئەو بەم هەموو شوێنکەوتوەوە یەکێکە لەپەیڕەوانی سوڵتان و خاوەنانی عەصەبیەتی ئەوە. بەرپرسی شمشێریش لەدەوڵەتدا بەجۆرێکە کەوەزیرپرس و ڕای پێدەکاتو چاوەڕێی ئەوپەڕی هەوڵ و کۆشش دەکات لەوەزیرەوە. خاوەنی ئەم پۆستەش لەلای ئەوان بە (استاذ الدار) واتە مامۆستای دیوان یان ئەوکەسەی مامۆستایەو شت دەخوێنێتەوە ناسراوە و دەبێت یەکێك بێت لەگەورە بەرپرسانی سوپاو خاوەنانی شمشێر بێت لەدەزگای دەوڵەتدا. کۆمەڵێك پلەو پایەی تر لەمامۆستایماڵەوە پەیڕەوی دەکەن کەهەموویان چەمکی دارایی ژمێریاریان هەیەو کۆمەڵێك کاروباری تایبەت دەگرێتەوە وەك: چاودێری تایبەتی داراییە تاکەکەسیەکانی سوڵتان وەك کەرتەکان و ئەوبەش و پشکانەی کەلەباجەکاندا تایبەتن بەسوڵتانەوە و لەدارایی گشتی موسوڵمانان نیە و لەژێر دەستی استاز الدار دارو مامۆستای دیواندایە و وەزیر هەرچەندە لەسوپاییەکانە، بەڵام مامۆستای دیوان چاودێر نیە بەسەریەوە و چاودێری تایبەتی بەردەستی خەزێنەداری داراییەکانی سوڵتانە کەدەبێتە یەکێك لەمەمالیکەکانی، واتە بەندەکانی و بەبەرپرسی کۆگای دیوان یان کۆگادار (خازن الدار)ناوزەد کرابوو چونکە وەزیفەی ئەوو چاودێری تایبەت و چاودێری کردن و پاراستنی داراییە تایبەتیەکانی سوڵتان بووە و، تایبەت بوون بەم کارەوە.

ئەمەیە باسی ئەم پلەیە لەدەوڵەتی تورکی خۆرهەڵات لەپاش ئەوەی سەرەتا بارودۆخی ئەومان لەمەغریبدا باسکرد.

دیوانی نامە وئامادەکردنەکان: بەشێوەیەکی سروشتی ئەم ئەرکە لەدەوڵەتدا پێویست نیە، چونکە زۆرێك لەدەوڵەتەکان لەبنەڕەتدا پێویستیان پێی نیە هەروەك چۆن لەدەوڵەتە سەختە دەشتەکیەکاندا، کەخاوەنی شارستانیەت و شارنشینی و پیشەسازی بەهێز و پیشەکان نین وەها پلەیەك بوونی نیە. وەکاتێك لەدەوڵەتی ئیسلامیدا زۆر پێویستیان پێی هەبوو بەهۆی چۆنیەتی لەزمانی عەرەبی و ڕەانبێژی لەدەستەواژەکاندا زۆر مەبەستیان بوو، چونکە نوسەرەکان ناوەڕۆکی پێویستی مرۆڤیان لەزۆربەی کاتەکاندا بەنوسین زۆر ڕەوانبێژانە ترو پاراوتر لەدەربڕینی زمان دەگەیاندە لایەنی پەیوەندیدار. وەکاتبی ئەمیر یەکێك بوو لەخزمان و گەورەکانی هۆزەکەی ئەو کەبۆ ئەم پۆستە هەڵدەبژێردرا، هەروەك چۆن خەلیفە و ئەمیرەکانی صەحابە لەشام و عێراقدا وەها کەسێکیان دەکردە کاتبی خۆیان بۆئەوەی لەڕووی ئەمانەت پارێزی و پاراستنی نهێنیەکانەوە متمانە پێکراو بێت. کەم کەم لاوازی کەوتە ناوزمانەوە و بوویە پیشەو کاری ئەوانەی کەبەباشی دەیانزانی و خانەدانی عەباسیەکان خاوەنانی ئەوپلەیان زۆر بەگەورەدەزانی و، نوسەرەکانیان سەنەدی دەفتەری ئەحکامەکانیان بەشێوەیەکی ڕەها بەبێ دەست تێوەرڈانی کەسی تر بلاو دەکردەوە و لەکۆتاییەکەشیاندا ناوی خۆیان دەنوسی و بەمۆری سوڵتان مۆریان دەکرد و لەسەر مۆرەکەی سوڵتان ناو یان نیشانەی سوڵتانی لەسەر بوو. ئەویان لەگڵێکی سوردا کەلەئاودا دەتوایەوە دەچەقاندو بەگڵی مۆر ناوزەد دەکرا و لەپاشان ئەو مۆرە دەدرا لەهەردوو سەری دەفتەری ئەحکام یان تۆمارەکان لەکاتی جیاکردنەوەیاندا لێیان دەدا.

ئەوکات لەپاش عەباسیەکانەوە تۆمارەکان بەناوی سوڵتانەوە دەردەچوون و بلاو دەکرانەوە و نوسەر واژووی خۆی لەسەرەتا یان کۆتایی تۆمارەکان دەدا بەپێی شوێن و ئەو دەستەواژەیەی کەهەڵی دەبژێرن. دواتر خاوەنی ئەم پلەیەهەندێکجار بەهۆی

نزیکبوونەوەی خەڵکانی ترەوە لەخزمەتکارانی دەوڵەت لەدەرباری سوڵتاندا پلەکەی دادەبەزێت وەیان فەرمانڕەوایی وەزیرێك کەئەوی بێدەسەلات دەکرد و هەموو کاروبارەکانی دەخستە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە و دەبویە هۆی دابەزینی پلەو پایەی ئەو. وەئەوکات نیشانەی ئەم نوسەرە کەلە بەرامبەر ئەونیشانەی کەبەڵگەی ڕاستی نوسراوو واژووی وەزیر بووە جێبەجێ نەدەکراوو هەڵدەوەشایەوە، ئەوکات شێوە و نیشانەی ئاسایی خۆی لەبەرامبەر نیشانەی ئەم سەرۆکەوە دەنوسی. هەروەك چۆن ئەم مانایە لەکۆتایی دەوڵەتی حەفصیەکاندا ڕوویدا و لەوکاتەی کاری حاجیبی پەرەی گرت و یەکەمین فەرمانڕەوایی بەو سپێردرا و سەرئەنجام بوویە فەرمانڕەوای ڕەهاو حوکمی ئەونیشانەیەی کەتایبەت بووبەو نوسەرەوە، هەڵوەشایەوەو کاریگەری نەماو، بەلام شێوازەکەی هەروەك خۆی لەڕوانگەی پەیڕەوی کردن لەکاری سەلەفەوە بەپایەداری مایەوە. لەوەبەدواوە حاجیب ئەو واژوەی کەدەبوایە لەو دەفتەرەدا بیکات بۆ نوسەرەکەی ئامادە دەکرد و بەخەتێکی تایبەت دەینوسیەوە و لەزاراوەکانی تەنفیزو جێبەجێ کردن هەرچیەك بیویستایە تێیدا دەنوسی. کەواتە نوسەر فەرمانی ئەوی جێبەجێ دەکرد و نیشانە ئاساییەکەی لەسەر دادەنا هەندێك جاریش لەوکاتانەی کەسوڵتان جڵەوی دەسەلاتی دەگرتە دەست و دەوڵەتی ڕەهای ڕادەگەیاند، ئەم شێوازەی تایبەت دەکرد بەخۆیەوە و فەرمانی بۆنوسەر ئامادەدەکرد بۆئەوەی لەنوسینەکانیدا نیشانەکەی دابنێت. یەکێکی تر لەپلەکانی نوسەری (توقیع)واتە واژووە ئەوەش بەو شێوەیە کەکاتب بەئامادەبوونی سوڵتان لەوکاتەی کەئەنجومەنی فەرمان دەرکردنی حەل و عەقدی کارەکان پێك دێت دادەنیشێت و ئەو فەرمان و حوکمانەی کەسوڵتان بۆی دەخوێنێتەوە بەکورتترین و پاراوترین دەستەواژە بەرنامەو سکالاکانی دەنوسی. واژووەکانیش یان بەو شێوەیەی کەباسمانکردن دەردەچوون یان ئەوەی کەنوسەر لەو نمونانەی کەلەدەفتەرەکەداو لەدەستی بەرپرسانی عەریزەو سکالاکاندا

هەیە پەیڕەوی دەکات. واژوو کاریش پێویستە ڕەوانبێژیەکی باشی هەبێت لەقسەکانیدا بۆئەوەی واژووەکانی ڕاست بن.

جەعفەری کوڕی یەحیا لەلای ڕەشید واژووی لەسەر سکالاَکان دەکرد و دەیدانە بەرپرسانی عەریزەو سکالاَکان‌و واژۆکانی ئەو بەئەندازەیەك گرنگ بوون کەبۆ بەدەستهێنانیان لەنێو بەرپرسانی ڕەوانبێژیدا، (واتە عەریزەنوسەکان)بەمەبەستی بەئاگابوون لەشێوەکانی هونەرو ڕەوانبێژیدا کێبڕکێ دەکرا چاویان لەیەکتری دەکرد لەو بوارەدا. هەروەك دەگێڕنەوە و دەڵێن عەریزەیەك کەواژووی ئەوی لەسەر بوایە بەدینارێك کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرا. هەربەم شێوەیە چۆنیەتی بارودۆخی دەوڵەتان. دەبێت ئەوە بزانین کەبەرپرسانی دیوانی واژوو بەناچاریەوە دەبێت لەنێو ئەشرافزادەکان‌و چینەباڵاَکانی خەڵکیدا هەڵدەبژێردران و دەبوایە خاوەن بەهرەیەکی فراوان بوونایە لەزمان پاراوی و ڕەوانبێژیدا، چونکە لەشوێنێکدا کاردەکات کەدەبێت بنەمای زانستەکان بزانێت، چونکە لەئەنجومەنی پاشایان و مەبەستەکانی ئەحکامەکانی ئەماندا ئەم جۆرە مەسەلانە دێنە پێشەوە، ئەمەسەرەڕای ئەو شتانەی کەئەو دەوروژێنن بۆئەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ نەریتەکانی هەڵسووکەوتی پاشاکاندا هەبێت و داب و نەریتەکانیان ڕەچاو بکات و خاوەن سیفەتی جوان بێت. سەرەڕای ئەمەش بیەوێت و نەیەوێت دەبێت لەنامەنیگاری‌و جێبەجێ کردنی مەبەستەکان‌و قسەکردن بەبنەماو ئاماژەکانی ڕەوانبێژیدا بەتوانابێت و، هەندێك جار لەهەندێك دەوڵەتدا ئەم پلەیە بەبەرپرسانی شمشێر دەبەخشن چونکە سروشتی دەوڵەت بەهۆی دووری ڕەنج و هەوڵەکان و فێربوونی زانستەکان و سادەیی عەصەبیەت ئەمەدەخوازێت. هەربۆیە سوڵتان خاوەنانی عەصەبیەتی خۆی تایبەتدەکات بەپێگەو پلەکانی دەوڵەتەکەیەوە و هەندێك کەس لەوان دەکاتە بەرپرسی دارایی و سەربازی. بەرپرسی کاروباری شمشێر و جەنگ پێوستیان بەفێربوونی زانستەکان نیە، بەڵام بەرپرسانی دارایی و تۆمارەکان پێویستیەکی زۆریان بەفێربوونی زانست و زانیاریەکان و ڕەوانبێژی هەیە، کەواتە بۆ ئەم پۆستانەش کەسانێك لەهەمان

ئەو چینەی سولتان هەڵدەبژێردرێن و کاروبارەکانیان پێدەسپێردرێت، بەڵام لەهەمان کاتدا خاوەن هێزێکی تر لەخاوەنانی عەصەبیەت زاڵە بەسەرئەمانداو دەبێت لەژێر چاودێری ئەودا ئەرکەکەی بەڕێوە بەرێت و، هەروەك چۆن ئەم بارودۆخە لەدەولەتی تورکی خۆرهەلاتدا هەیە.

چونکە پلەی ئامادەکردن و نامەکان لەدەولەتدا هەرچەندە خاوەنی بەرپرس گەلێکی جێبەجێ کاری تایبەتە، بەڵام ئەو دەبێت لەژێر چاودێری و دەسەلاتی ئەمیرێکدا بێت کەلەخاوەنانی عەصەبیەتی سولتان بێت کەپێی دەڵێن (دویدار)واتە ئارامکەرەوەو دڵدەرەوەی سولتان و پشتی بەم شتەبەستووە و لەزۆربەی کاتەکاندا ئەم ئەمیرە دەبێتە مایەی دڵدانەو و ئارامکردنەوەی سولتان و، بەرپرسانی نوسین و ئینشاو دارشتن و هونەری نیگارش (ڕەوانبێژی)و جێبەجێ کردنی مەبەستەکانی بەبنەمانی ئەو هونەرە بەنهێنی هێشتنەوەی نهێنیەکان و هاوشێوەی ئەم شتانەیە، بەڵام هەلومەرجی شیاو لای بەرپرسانی وەها پلەیەك کەسولتان لەهەڵبژاردنی ئەو لەنێو چینەجیاوازەکانی خەڵکیدا، لەبەر چاودەگرێت زۆرن و باشترین کەسیش کەئەم هەلومەرجەی تێدابێت عبدالحمیدی نوسەرە. هەروەك چۆن لەنامەیەکدا ڕوودەکاتە نوسەرەکان و دەنوسێت: لەپاشان (امابعد)ئەی خاوەنانی هونەرو نوسین خودا لەخراپەو زیان بتانپارێزێت و ڕێنمایتان بکات، خودای گەورە لەپاش پێغەمبەرانی نێردراو پاشاو گەورەکانی خەڵکی دابەشکرد بەچەند بەشێکەوە کەهەرچەندە هەموویان لەحەقیقەتدا وەك یەکن. بۆبەدەستهێنانی ڕۆزی بەهرەمەندەکانیانی فێری هونەر و پیشەکان کردووە و سەرقاڵی کاروبارەکانی کردوون و ئەوکات گروپی نوسەرەکانی خستە بەرزترین پلەوە، واتە پلەو پایەی خاوەنانی ئەدەب و فەرهەنگ و جوامێری و زانستەوە. بەڵی ڕێکخستن و پایەداری جوانیەکانی خەلافەت لەکارو بارەکانیدا بەهۆی بیرو قەڵەمی ئێوەوەیە.وەلەڕێگەی پەندە خێرخوازیەکانی ئێوەوە خوداش ڕەوشتی سولتانەکەیان پەسەندیدە دەکاتو شارەکانیان ئاوەدان دەکاتەوە. پاشا بێنیاز نیە لێتان و فەرمانبەری شیاوتر لەئێوەی

نیه. کەواتە بارودۆخی ئێوە بەبەراورد بەپاشا کانتان وەك گوێیەکانی ئەوە کەپێیان دەبیستێت و چاوەکانیەتی کەپێیان دەبینێتو زمانیەتی کەقسەی پێدەکاتو دەستەکانیەتی کەبەوان هێزو دەسەلاّتی خۆی نیشان دەدات.

لەو هونەرەی کەخودا پێی بەخشیون بەهرەمەند تان بکات و ئەونیعمەتەی کەبەکاملّی پێی بەخشیون لێتان نەسەنێتەوە. لەنێوان هەموو هونەرمەندان و پیشەوەراندا هیچ گروپێك بەئەندازەی ئێوەپێویستیان بە خوو ڕەوشتە پەسەندو جوانەکان نیە هەربۆیە ناچار دەبێت ئەم خوڕەوشتە جوانانەتان تێدابێت (ئەی نوسەران)کەواتە بەوشێوەیە بن کەلەم نامەیەدا باسدەکرێن. کەواتە نوسەر لەلەڕوانگەی خۆیی و هەم بەمەبەستی یارمەتی دانی بەرپرسانێك کەلەکاروبارەکاندا پشتیان پێ دەبەستن کەلەجێگەو کاتی داوەریدا تێگەیشتوو داناو لەکاتی کێشەکاندا دلاوەرو بەجەرگ بێتو لەکاتی وەستان لەترس ئەمیش بووەستێت. پاکداوێنی و دادو ئینصاف هەلّبژێرێت و لەکاتی سەختی ناڕەحەتیەکاندا وەفاداربێت. لەکاتی ناڕەحەتی و موصیبەتەکاندا بەرلەڕوودانیان پێشبینی بکات و ئاگای لەنیشانەکانیان بێت. کارەکان لەشوێنی خۆیدا ئەنجام بدات و لەشوێنی خۆیاندا لەڕووداوەکان تێبگات. دەبێت لەهەموو بەش و هونەرەکانی زانستدا شارەزایی هەبێت و بەباشی بیریان لێبکاتەوەو فێریان ببێت ئەگەر چی بەئەندازەی پێویستیش بێت خاوەنی مەلّۆیەك لەخەرمانی زانست بێت. لەپەروەردەو ڕەووشتدا کەسێکی دیار بێت و بەرلەڕوودانی هەرکارێك پێشبینی شیاووباشی هەبێت و بۆهەربارودۆخێك ئامادەباش بێت. کەواتە ئەی کۆمەلّی نوسەران لەفێربوونی ئایندا کێبڕکێی یەکتری بکەن و لەکتێبەکەی خودا (قورئان)و فەرزەکان شارەزا بن و دواتریش زانستە عەرەبیەکان فێربن، کەهۆکاری ڕەوانبێژی و زمان پاراوین و خەت ونوسین فێربن چونکە خەتی جوان نوسینەکانی ئێوە جوانتر دەکات و شارەزاییەکی باش لەمێژوودا پەیدا بکەن، بەتایبەت مێژووی جەنگەکانی عەرەب و عەجەمدا چونکە ئەم شارەزاییە لەئامانجەکانتان نزیکترتان دەکاتەوە.

وەهەروەها حیساب و ژمێریاری فێربن چونکە شارەزایی لەودوو زانستەدا بنەمای کاری کارەکانی نوسەران و کارمەندانی وەرگرتنی باجە. زۆر بەدوای هەواو ئارەزووی ناپەسەندەکانتان مەکەون، چونکە دەبنە هۆی پەستی لەناوچوونی نوسەران. وەهەروەها هونەرەکەتان لەقسەو قسەلۆك قسەهێنان و بردن و بوختان کردن و سیفەتی زشتی نەفامانەبەدوور بگرن. لەخۆ بەگەورەزانین و فیزکردن خۆتان بەدوور بگرن، چونکە بەم خووە دووژمنێکی بێ سەبەب بۆخۆتان درووست دەکەن. لەهونەرەکەتاندا لەرێی خودا هاوکاری یەکتربن و یەکتریتان خۆش بوێت و هانی یەکتریش بدەن لەسەر ئەوکارەو سەلەفی صالحی خۆتان بەنمونە بهێننەوە. وەئەگەر رۆژگار بەرامبەر یەکێك لەئێوە نامیهرەبانی نیشاندا راپەڕن، بەڵام نەرم بن لەگەڵیدا بۆئەوەی لەوبارودۆخە دەرباریازی بکەن و بیگێڕنەوە سەر دۆخی جارانی. وەئەگەر بەهۆی پیریەوەیەکێك لەئێوەنەیتوانی بەدیداری دۆستان و خۆشەویستانی شاد بێت، ئەوا پێویستە لەسەرتان ئێوە قەدری بگرن و بەوقەدەرە رازی بن و لەئەزمونەکانی سود وەربگرن و مەعریفەو زانستی هاوپێچ بەئەزموونی لێوە فێربن. وەدەبێت کەسێکی نوسەر سەبارەت بەکەسێك کەئەو هەڵی دەبژێرێت و لەرۆژی پێویستدا پشت بەو دەبەستێت دەبێت ئەوەندە لەئاست چاوەڕوانیەکانیدا بێت کەلەکارەکانی پەیوەست بەبراو منداڵەکانیشیەوەئیحتیاتی زیاتر بکات دوور بین بێت، بەجۆرێك ئەگەر لەکاروبارەکانیدا سوپاس و ستایش کرا بەگەورەیی رێزی خانەدانەکەی بزانێت و وەئەگەر سەرزەنشت کردنێکیش روویدا ئەوا دەبێت هەوڵی لابردنی بدات و خۆی لەهەڵخلیسکان بپارێزێت، چونکە ئێوە ئەی گروپی نوسەران زیاتر عەیبەو رەخنەتان لێدەگیرێت و زیانی بۆئێوە و لەخواترسە راستەقینەکانیش دەبێت، چونکە ئەوە باش دەزانن ئەگەر کەسێك لەئێوە لەخزمەت سوڵتاندا دابنیشێت سوڵتان چ رێزێکی لێدەگرێت و، بەوپەڕی جوامێریەوە مافەکانی دابین دەکات و بەئەرکی خۆی دەزانێت. هەربۆیە لەسەر ئێوەش واجبە کەرێزو حورمەتی بزانن و هەمیشە لەکارەچاکەکاندا هاوکاری بن و لەهەڵەو پەڵەکان ئاگاداری بکەنەوە ئەمەش بۆئەوەی ئەو

مافەی کەلەسەرتانە بەباشی ئەنجامی بدەن و لەکاتە پێویستەکاندا ئامادەی خزمەتکردن بن بەدەوڵەت و سوڵتان و، هەڵوێستێکی لەو جۆرەش دەبێتە گەواهیدەری دڵسۆزی و نیازپاکی ئێوە بۆبەرپرسانی سەرەوەی خۆتان.

کەواتەئێوە ئەی کۆمەڵی نوسەران دەبێت هەمیشە هەست بەم خاڵانە بکەن و لەهەموو حاڵەتەکانی تەنگدەستی ونائومێدی و دڵدانەوە و چاکەو شادومانیدا ئەوان لەبیری خۆتان نەبەنەوە و هەرکەسێکی خاوەنی ئەم هونەرە ئەم سیفەتانەی تێدابێت ئەوا دەبێتە باشترین کەس. وەهەرکات یەکێك لەئێوە کرایە بەرپرس یان ژیان و گوزەرانی خەڵکانێکی پێ سپێردرا دەبێت خودای لەبیر بێت و بەچاودێری خۆی بزانێت و یارویاوەری بێتواناکان‌و هەژران بێت و بەهانای ستەملێکراوانەوە بچێت، چونکە خەڵکی رۆزی خۆری خودان و باشترین کەسیش بەلای خوداوە ئەوانەن کەزیاتر لەهەموو کەسێك سۆزو میهرەبانیان بەرامبەر ئەوکەسانە هەیە کەمووچە و جیرەی خەڵکیان لەژێر دەستدایەو بەباشی دادگەریەوە دابەشی دەکەن بەسەریاندا. ئەوکات دەبێت لەدادگایی کردندا دادگەربێت‌و لەهەوڵی زیادکردنی کۆکردنەوەی باجدا بێت بەمەبەستی زیاتر ئاوەدانکردنەوەی وولات و رێزو شکۆی پیاوانی خاوەنی رێزی دەوڵەتی بەلاوە بێت و لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵ ببێت‌و لەئازارو ئەزیەتدانیان دووربکەوێتەوەو لەهەڵسان ودانیشتنەکانیدا کەسێکی خاکی بێت و، لەدەفتەرەکانی ئەحکام و باج و خەراج و گەرانیدا بەشوێن مافەکاندا بەهێمنیەوە هەڵسووکەوت بکات. وەپێویستە لەسەر ئێوەی نوسەر ئەگەر لەکەڵ کەسێکدا ژیان و هەڵسوکەوتتان کرد، دەبێت بەباشی لەتەبع و هەڵسووکەوتەکانی شارەزابن و لەکارەچاکەکاندا هاوکاری بکەن و لەخراپەش دووری بخەنەوە ئەوەش بەشێوازو رێگەپەسەندو جوانەکانی ژیان دەبێت.

ئەوەش دەزانن کەشوانی حەیوانات ئەگەربێت و لەساسەتیدا بینا بێت هەوڵی تێگەشتن و ناسینی جموجوڵی حەیوانەکانی دەدات، هەروەك چۆن ئەگەر ئەسپێك جووتە بوەشێنێت لەوکاتەی کەئەیەوێت سواری ببێت بەشێوازێك ئەوکارە دەکات کەحەیوانەکە

هەراسان نەكات و نەیورووژێنێت و، ئەگەرپێشتر هەڵسووكەوتێكی توندی بەرامبەر ئەو حەیوانە كردبێت ئێستە هەوڵدەدات ئەوكارە دووبارە نەكاتەوە بەنەرمی هێمنی ئارامیەوە لەگەڵیدا دەجوڵێتەوە و، بەم شێوەیە دەتوانێت چوارپێیەكە ڕام بكات، بەڵام بەومەرجەی كەمێك تاقەتی هەبێت و خۆڕاگری بكات. وەئەو كەسانەش كەسەرقاڵی سیاسەتی خەڵكین‌و تێكەڵن لەگەڵیاندا و خزمەتیان دەكەن و دەست تێوەردانیان هەیە لەكاروبارەكانیاندا دەتوانن لەشێوازی ڕام كردنی گیانلەبەران سود وەربگرن، هەروەك چۆن باسمانكرد و نمونەگەلێك بۆئەركەكەی خۆیان بەدەست بهێنن، بەڵام نوسەر لە دوو توێی ڕێزو ئەدەبو هونەری شەریف وگوڕان بەدوای دۆزینەوەی چارەسەرە ووردەكان و چۆنیەتی ڕەفتاركردنیان لەگەڵ كەسانێكدا هاوسوێنن لەگەڵیدا و گفتوگۆی لەگەڵدا دەكەن، یان ئەو لەقسەكانی ئەوان تێدەگات یان لەگەورەیی و شكۆی ئەوان بێزار دەبێت ئەوابەشێوەیەكی ئەولاتر دەبێت لەگەڵ بەرپرسانی خۆیدا بەنەرمیەوە هەڵسووكەوتیان لەگەڵدا بكات و هەڵەكانیان بۆ ڕاست بكاتەوە.

ئەو لەكوێ و ڕامكەرو شوانی ئەو گیانلەبەرانەی كەناتوانن وەڵام بدەنەوە و باش و خراپ لەیەكتر جیا ناكەنەوە و نەدەرك دەكەن و نەپرسیارێكیش دەكەن، بێجگە لەوەی كەخاوەنەكانیان ئامادەیان دەكەن بۆ سواربوون. ئاگاداربن لەبۆچوون و تێڕوانیەنەكانی خۆتاندا لایەنی هاوڕێیە تی و سودی ئەوان ڕەچاوبكەن و تائەندازەی توانا بیرو هۆشتانی تێدا بەكاربهێنن بۆئەوەی كەبەیارمەتی خودا كەسێك كەهاوڕێیەتی دەكەن بەنامیهرەبانی ساردیەوە هەڵسووكەوتتان لەگەڵدا نەكات‌و ناڕەحەت نەبێت لەهاونشینیتان‌و، لە خراپەكانی بێوەی بن و لەگەڵتاندا بگونجێت و خۆشی بوێن انشا الله، نابێت لەبوارەكانی خۆراك و پۆشاك و كاروبارە تایبەتیەكانتاندا زیادەڕەوی بكەن، چونكەهەرئەوەندەی كەخوداوەند ئێوەی شەرەفمەند كردووە بەم هونەرەو ڕێزیكی زیاتری لێناون ئەمە هەموو شتێكە بۆتان و ئێوە وەك خزمەتكار وەهان و نابێت لەئەركەكەتاندا كەم و كورتی بنوێنن‌و لەوكەسانەیشن كەناكرێت چاوپۆشی لەهەڵەوزیادەڕەوی و بەفیڕۆدانی ماڵ و

سامانتان لێبکرێت. لەهەموو ئەو خاڵانەی کەبۆ ئێوەم باسکرد و ئەو ئامۆژگاریانەی کەبۆ خۆپاراستنتان لەمیانەڕەوی لەئابووریدا بۆ ئەوەبوو یارمەتیتان بدات خۆتان لەبەفیڕۆدان‌و زیادەڕەوی نازپەروەردەیی دوور بکەونەوە، چونکە ئەم دووشێوازە هەژاری و بێنەوایی بەدی دەهێنن و دووچاری پەستیتان دەکات و ئەوکەسانەشی کەهەڵگری ئەم سیفەتانەبن بەتایبەت نوسەرەکان خاوەنانی ئەدەب و فەرهەنگ بێ ڕێز دەکات.

کاروباری ئەم جیهانە وەك ئەو تێڕوانیەنانەیە و ئێوە لەوکارانەی کەتازە دەستی پێدەکەن دەتوانن لەئەزموونەکانی پێشووی خۆتاندا لەهاوشێوەی ئەواندا ڕێنمایی وەربگرن، ئەوکات لەکاتی ڕێکخستنی کارەکاندا ئاشکراترین و بەڵگەدارترین شێوازەکانی بیر کردنەوەو ڕاسترین و باشترین ڕێگەکانی چارەسەر بگرنە بەر. وەئەوە بزانن کەئافەتی لەناوبردنی ڕێکخستنی کاروبارەکان ئەوەیە کە نوسەر بەئامادەبوونی بەرپرسانی خۆی هێندە لەپیاهەڵدانی شتێکدا زیادە ڕەوی بکات، کەلەجێبەجێ کردنی ئەرکەزانستی و فیکریەکەی دووری بخاتەوە. هەربۆیە هەرنوسەرێك لەئەنجومەنی بەرپرسانی خۆیدا دەبێت بەئەندازەی پێویست لەگوفتاری خۆیدا میانەڕەوی بگرێتەبەر و لەکاتی دەست پێکردنی ووتارو وەڵام دانەوەدا دەبێت بەئیجاز و کورت وەڵام بداتەوە و قسەبکات و بەهەموو بەڵگە کۆکەرەکانەوە باسی هەرشتێك بکات و، چونکە بەرژەوەندی حاڵەکەو دوورکەوتنەوەلەدرێژە پێدان لەم شێوازەدایە. لەترسی ئەوەشی مەبادا بکەوێتە هەڵەوە و زیان بەخۆی و فەرهەنگەکەی بگەیەنێت دەبێت دەستی ملکەچی و نیاز بۆ لای خودا بەرز بکاتەوە بۆ ئەوەی لەپایەداری و چاکەدا هاوکارو یارمەتی دەری بێت.

چونکە ئەگەر نوسەرێك گومان لەئێوە بکات یان بڵێت ئەوەی لەهونەرە جوانەکان و هێزی جوڵەی ئەوەوە بەدی دێت تەنها لەدووتوێی چارەسەرەکانی خۆیداو باشی ڕاوێژەکانیدایە، کەبەگوتاری خۆی بەشوێنیدا گەڕاوە پێی وایە کە خودا ئەوبەخۆی دەسپێرێت و تالەو پلەیەوە دەگاتە پلەیەکی تەواو نەکراو ئەم شتەش بۆ کەسێك کەبیر بکاتە شاراوە نیە. وەهەرکات دوو نوسەر لەیەك دەربارێدا خزمەت بکەن نابێت هیچ

کەسێکیان بەسەر ئەویتریاندا خۆی بەباشتر بزانێت و بڵێت کەهونەرکەی من لەو باشترە چونکە خەڵکی کەسێك بەباش دەزانن کەلەخۆبایی نیەو پێی وایە کەهاوەڵانی لەخۆی باشترن و تەنها ئەرکی هونەرمەندەکانی ئەم بوارە ئەوەیە کەیەکتری بەیەك چاوو سەیر بکەن و، کەسیان لەکەسی تریان خۆی بەباشترو زیاتر نەزانێت و نەکەونە گۆماوی خۆبەگەورە زانینەوە.

سوپاسی خوداش لەسەر هەمووان پێویستە کەلەبەرامبەر گەورەیی ئەوەوە ملکەچ بنو قەدری نیعمە تەکانی بزانن و باسی بکەن. من لەم نامەی خۆمدا گووتەیەك کەلەسەردەمەکانی کۆندا وەك پەندی پێشینان هێنراوەتەوە باسی بکەم، ئەوەی ئامۆژگاری دەکات دەبێت کار بەقسەکانی بکات. ئەم مەسەلەیە لەپاش هێنانی ناوی خودا کەوەك تاکەگەوهەری هەڵبژاردەی قسەکانە لەم نامەیەدا هەربۆیە لەکۆتایی نامەکەدا هێناومەو ئەم نامەیەم پێ تەواو کردووە. خوداش ئێمەو ئێوەش ئەی کۆمەڵی زانست خوازان لەخۆی نزیکمان بکاتەوە ئەوکەسەی کەلەهەموو شتەکانەوە لەپێش هەموانەوەیەو زانایە بەسەر هەموو بوونەوەراندا و تاکەخاوەن هێزی گێتیە. سلاْوو بەخشندەیی خودالەسەر ئێوەبێت.

شرطة[٣٣٠]: لەم سەردەمەدا بەرپرسانی ئەم پۆستە لەئەفریقادا پێیان دەڵێن (حاکم)و، لەدەوڵەتی ئەندەلوسدا (صاحب المدینە)، لەدەوڵەتی تورکاندا (بەوالی)ناسراوە. بەرپرسی ئەم ئەرکە لەدەزگای دەوڵەتی لە ژێر دەستی بەرپرسانی شمشێر (وەزیری جەنگ)دایەو، فەرمانی ئەو لەهەندێك شوێندا لەبەرپرسانی پۆلیس زیاتر جێبەجێ دەکرێت سەرەتا ئەم پلەیەلەدەوڵەتی عەباسیەکاندا دایان ناوە و ئەوکەسانەش کەئەم پلەیان بەدەستەوە بووە، دەبێت بڕیارەکانی پەیوەست بە تاوانەکان سەرەتا لە قۆناغی

---

[٣٣٠] بەزەمەی شین وفەتحەی تائەکە باش چاوەش سەرهەنگ (منتهی الارب)وەخاوەنی (اقرب الموارد)دەڵێت: هەندێکن لەیارانی هەڵبـژێرراوی فـەرمانڕەوایان، کەلەسـەردەمی ئێمـەدا وەزیفـەی ئـەوان وەك کـارو ئـەرکی هێزەکانی پۆلیسەوە، دەتوانین بڵێین کەشورتە لەو سەردەمەدا وەك شارەوانی و هێزی پۆلیسی ئەم سـەردەمە وابووە .

لێکۆڵینەوە پێی ڕابگەن ئەوکات لەپاش تەواوبوونی قۆناغی پێڕاگەیشتن و لێکۆڵینەوە حوکمەکانی خودا بەسەر تاوانبارانداا جێبەجێ بکەن. چونکە دەستوەردانی شەرع لەتۆمەتە تاوانکاریەکاندا بەم هۆیەوەیە کەحەدلێدانی تاوانباران ئەنجام بدرێت، تەنها لەم بارەیەوە چاودێری دەکات، بەڵام دەزگای سیاسەتی دەوڵەت لەدەرخستن و کامڵکردنی پێویستیەکانی تاوانیش دەستوەردان و چاودێری دەکات هەرکات لەمەسەلەیەکدا بەڵگە هەبێت حاکم تاوانبار ناچاردەکات دان بەتاوانەکەیدا بنێت، چونکە بەرژەوەندی گشتی وادەخوازێت کەتاوانباران سزا بدرێن هەربۆیە بەکەسێك دەڵێن پۆلیس کەلەقۆناغی سەرەتادا بەتاوانەکان ڕادەگەن و ئەوکات سزا شەرعیەکان، ئەوکاتەی کەقازی دەستوەردانی تێیدا نەبوو پۆلیس جێبەجێی دەکردن.

پلەی پۆلیس سەربەخۆ بوو بەرپرسانیان بەخاوەنانی پۆلیس دەناسران. هەرچەندە کاروبارەکانی پەیوەست بەسزاکان و مەسەلەکانی وابەستە بەپاراستنی گیانی خەڵکی بەشێوەیەکی ڕەها دەیاندایە دەستی پۆلیس چونکە ئەو بەشێوەیەکی سەربەخۆو بەبێ دەستوەردانی قازی ئەم جۆرە ئەرکانەی بەئەنجام دەگەیاند و ئەم پلەیەشیان بەگەورە سەیر دەکردو، ئەوانەی کەدەکرانە بەرپرسی پۆلیس لەکەسانی سەرلەشکرو بەرپرسانی سوپا و مەوالیە بەڕێزەکان و کەسە تایبەتەکان و نزیکانی سوڵتان بوون، بەڵام دەسەڵاتی پۆلیس چەمکێکی گشتی نەبوو فەرمانیان لەهەموو چینەکانی خەڵکیدا جێبەجێ نەدەکرا، بەڵکو ئەمان تەنها لەسەر خەڵکی بەگشتی و تۆمەتباران و گومانلێکراوان فەرمانڕەواییان دەکرد خەڵکی خراپیان لەکارە ناپەسەندەکان دوور دەخستەوە. دواتر بازنەی هێز و دەسەڵاتی پۆلیس لەدەوڵەتی ئەمەویانی ئەندەلوسدا فراوان بوو پێگەی ناوبراو بووبەدوویەشەوە: پۆلیسی بچوك و پۆلیسی گەورە. بەرپرسانی پۆلیسی گەورە هەم بەسەر دەسەڵاتداران و هەم بەسەر خەڵکی بەگشتیدا دەسەڵاتیان هەبوو دەیانتوانی دەستێوەردانیان لەکاروباری پیاوانی دەوڵەت و بەرپرساندا هەبوو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکردن. ئەرکی خاوەنانی پۆلیسی بچوك تایبەتبوو بەکارو بارەکانی خەڵکی بەگشتی.

شوێنێکی تایبەت بۆ بەرپرسانی پۆلیسی گەورە لەدەروازەی بارەگای سوڵتاندا دروستکرابوو چەند پیاوێك لەوبنکەیە لەسەری دادەنیشتن تەنها ئەرکیان جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی سوڵتان بوو.

ئەم پلەیە بەپیاوانی گەورەی دەوڵەت دەسپێردرا هەروەك چۆن تەنانەت بەرپرسەکانیشیان لەو کەسانەبوون کەپالێوراو بوون بۆپلەی حاجیبی یان وەرگرتنی پۆستی وەزارەتەوە، بەلام لەدەوەلەتی مووەحیدانی مەغریبدا بەرپرسانی پۆلیس خاوەن گرنگی و شان و شکۆی خۆیان بوون هەرچەندە زاڵ نەبوون بەسەر هەموو چین و توێژەکاندا ئەم پلەیەش تەنها بە پیاوانی خانەدانی مووەحیدان دەسپێردرا و نەدەدرایە دەست کەسی تر و ئەم پۆستەش دەسەلاتی بەسەر ئەوکەسانەی کەلەدەزگای دەوڵەت و دەرباری سوڵتاندا بوون نەبوو، بەلام ئێستاکە ئەم پلەیە خراپە رووی تێکردووە لەدەستی پیاوانی مووەحیداندا نەماوە و کەوتووەتە دەستی نەمەك پەروەردەو خزمەتکارانی دەرباری سوڵتانەوە، بەلام لەدەوڵەتی بەنی مەرینی مەغریبدا تائێستەش پلەی پۆلیس لەدەست کەسانێکدایە کەلەخانەدانە مەوالی و نەمەك پەروەردەکانی دەستی خۆیانن. وەلەدەوڵەتی تورکی خۆرهەلاتدا بەرپرسانی پۆلیس لەنێو پیاوانی تورك یان پاشماوەکانی دەوڵەتی ناوبراودا کوردەکان بوون، لەهەردوو ناوچەی خۆرهەلات و خۆرئاواوە هەڵدەبژێردراو کەسانێکیشیان کەلەرووی توندی و کارو تواناوە لێهاتوو بێت بۆئەوەی بتوانێت لەرێگەی جێبەجێ کردنی یاسای سزا شەرعی و سیاسیەکانەوە بەو پەڕی هێزەوە خراپە ڕیشەکێش بکات و هەموو جۆرە تاوانەکان لەناوبەرێت و بەپێی بەرژەوەندی گشتی خراپەکان بسڕێتەوە. خوداش هەڵسوڕێنەری شەوو ڕۆژە زاڵ و جەبارە[٣٣١]

[٣٣١] (وَاللهُ يُقَدِّرُ اللَّيلَ وَالنَّهارَ) س المزمل ئا ٢٠. (المُهَيمِنُ العَزِيزُ الجَبَّارُ المُتَكَبِّر) س الحشرئا ٢٣. و هەرئەوە بالاو داناتر لەهەمووان .

فەرماندەیی هێزی دەریایی[٣٣٢]: ئەمەش لەمەغریب و ئەفریقادا لەوپلەو پۆستە دەوڵەتیانەیە و لەزۆربەی چۆنیەتیەکاندا لەژێر فەرمانی بەرپرسانی شمشێردایە، واتە وەزیری جەنگ و بەرپرسەکانیشی بە(الملند)[٣٣٣]، بەلامی قەڵەوناوزەد کراون ئەم وشەیە لەزمانی فەرەنگیە کانەوە هێنراوەتە ناوعەرەبیەوەو لەزاراوەی ئەماندا مانای ناوی بەرپرسان دەگەیەنێت و، پلەی ناوبراو تایبەتە بەووڵاتی ئەفریقاو مەغریب چونکە ئەو دوو ووڵاتە لەلای باشورەوە لەکەنار دەریای ڕۆمدا (مدیتەرانە)دەژین و، لەکەناری باشورەکەیەوە دەریای هەموو مەمالیکەکانی بەربەرە لەسیبتەوە تاوەکو ئەسکەندەریە بەرەو شام، وەلەکەناری باکوریشەوە مەملەکەتەکانی فەرەنگو ئەسلاوەکان و ئەندەلوس و ڕۆم تاوەکو ووڵاتی شام بوونیان هەیە کەپێی دەڵێن دەریای ڕۆمی و دەریای شامی، وەك دانەپاڵێك بۆخەڵکی کەنارەکانی، دانیشتوانی کەنارەکانی لەهەموو گەلان زیاتر دەریاوانی و کەشتی ڕانی دەکەن و ئەزیەت و ئازارێکی زۆر لەم پێناوەدا دەبینن، هەروەك چۆن ڕۆمی و فەرەنگ و قوتەکان (گۆتیەکان)لەکەناری باکوری ئەم دەریایەدا بوون و زۆربەی جەنگ و بازرگانیەکانیان بەکەشتی ئەنجام دەدان، هەربۆیە لەم بوارەدا زۆر لێهاتوو بوون و، لەبەر ئەوەی هەندێك لەسوڵتانی مەملەکەتەناوبراوەکان نزیك بوونەوە لەکەنارەکانی باشور و هێرشیان بۆکردن، وەك ڕۆمیەکان بۆ ئەفریقاو قوتیەکات بۆ مەغریب، کەبەهۆی کەشتیە سەربازیەکانەوە ئەوکەنارانەیان دەبڕی و زاڵبوون بەسەر مەملەکەتە ناوبراوەکانداو بەر بەرەکانی دانیشتووی ئەو ناوچانەیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و، بەربەرەکانیش لەو ناوچانەدا کۆمەڵێك شاری پڕ لەدانیشتوانیان هەبوو وەك قرتاجنە و سبیتلە و جلولاو مرناق[٣٣٤] و شرشال و تەنجە. پاشای قرتاجنە لەگەڵ پاشای ڕۆمدا شەڕی دەکرد و کەشتی گەلی جەنگی بەهەموو پێداویستیەکانەوە بۆهێرش کردنە

---

[٣٣٢] تەرجەمەی اساطیل کەبەمانی دەزگا و هۆکارە جەنگیەکان و کۆمەڵێك لەکەشتی جەنگی دێت .

[٣٣٣] ووشەیەکە کەلەزمانی ئیسپانیولیەوە (اسپانیا)وەرگیراوە.

[٣٣٤] کەوتووەتە باشوری خۆرئاوای تونسەوە.

سەر ئەوان بەکار دەهێنا. ئەمەش نەریتی ئەو خەڵکانەیە کەلەهەردوو کەناری ئەو دەریایەوە دەژین و لەڕابووردودا لەگەڵ یەکتری بەشەڕ دەهاتن و ئێستەش بەهەمان شێوە. وەلەبەر ئەوەی کەموسوڵمانان وولاٌتی میسریان داگیر کرد عومەری کوڕی خەتاب بۆعەمری کوڕی عاصی نوسی کەباسی دەریاکەم بۆ بکە. ئەویش لەوەلاٌمدا بۆی نوسیەوە: دەریا دروستکراوێکی گەورەیە کەئافرێنراوی بێتوانای لەسەر دادەنیشێت هەروەك ئەوکرمەی کەبەدارێکەوە ئاوێزان بووە.

هەربۆیە عومەر لەو کاتەدا فەرمانی کرد کەموسوڵمانان خۆیان لەسوار بوونی کەشتی بەدوور بگرن و لەوەش بەدواوە هیچ کام لەعەرەبەکان سواری کەشتی نەدەبوون مەگەر ئەوکەسانەی کەبەنهێنی سەرپێچی ئەم فەرمانەی عومەریان بکردایەو، لەئەنجامیشدا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرا وەك عەرفەجەی کوڕی هەرسەمەی ئیزدی سەرۆك هۆزی بجیلە لەبەر ئەوەی کەلەعوماندا دەستی کردە جەنگ و هەواڵی جەنگەکەی لەدەریادا بەعومەر گەیشت، ئەم ڕەفتارەی بەخراپ زانی کەبۆچی لەجەنگدا سودی لەدەریا وەرگرتووە. بارودۆخ بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاوەکو سەردەمی موعاویە و مۆڵەتی بەموسوڵمانان دا کەسواری کەشتی ببن و جیهادی پێبکەن، هۆکاری ڕێگری کردنەکەی خەلیفە عومەریش ئەوە بوو لەبەر ئەوەی کەموسوڵمانان دەشتەکی بوون و، هیچ زانیاریەکیان سەبارەت بەدەریاو دەریاوانی و کەشتیوانی نەبوو، بەلاٌم ڕۆمی و فەرەنگیەکان لەبەر ئەوەی کەلەم بوارەدا زۆرخاوەن ئەزموون و لێهاتوو بوون ئەمەش لەوانەبوو بەزیانی موسوڵمانان تەواو ببێت.

وەکاتێك کەعەرەب گەشتنە سەڵتەنەت و دەوڵەتداری و دەسەلاٌتیان گەیشتە لوتکەی کامڵبوون و نەتەوەکانی غەیرە عەرەب بوونە خزمەتکاریان و کەوتنە ژێر فەرمان و دەسەلاٌتیانەوە و زۆربەی هونەرمەندو خاوەن پیشەکان لێیان نزیك بوونەوە و کۆمەڵێك دەریاوانی لێهاتووی بێگانەیان لای خۆیان دامەزراندو، دەستیانکردە ڕاهێنانی موسوڵمانان و سوپاکەیان لەچۆنیەتی کەشتی وانی و جەنگکردن لەناودەریاو بەکەشتی و

لەپاش ماوەیەك شارەزاییەكی باشیان پەیدا كردو كەشتی جەنگیان بەدەستهێناو پاپۆڕیان[335] لە هێزی دەریاییان بەكارهێناو پڕیانكرد لەپیاوی جەنگی و جۆرەها چەك و جەنگاوەرانی سوپا سواریان دەبوون و، لەجەنگی بێبڕوایان و نەتەوە ناموسوڵمانەكاندا بەكاریان دەهێنان لەودیو دەریاكانەوە ودەستەیەك لەم كەشتیە جەنگیانەشیان دەنارده سنورە ئاویەكانی وولاتی ئیسلامەوە وەك شام و ئەفریقاو مەغریب و ئەندەلوس. خەلیفە عبدالمليكی كوڕی حەسانی كوڕی نوعمان فەرمانڕەوای ئەفریقا ئاماژەی بەوە كرد كەلەتونسدا كارگەیەكی تایبەتی دروستكردنی كەرەستەی دەریا نەوەردی دابمەزرێنن، چونكە ئەو زۆر حەزی لەجیهاد دەكرو فەتحی صەقەلیەش لەو ڕێگەیەوە بوو ئەوەش لەسەر دەمی زیادەت اللهی یەكەم ئیبراهیمی كوڕی ئەغلەب و، لەسەر دەستی ئەسەدی كوڕی فورات خاوەنی فتوا بەئەنجام گەیشت.

وەهەروەها قوصرەش لەهەمان سەردەمدا فەتح كرا لەكاتێكدا موعاویەی كوڕی حدیج لەسەردەمی موعاویەی كوڕی ئەبی سوفیاندا دەستی كردە شەڕ لەگەڵ خەڵكی صەقەلیەدا، بەڵام خودا نەیویست بەدەستی ئەو فەتح بكرێت و ئەم فەتحە بەدەستی ئیبن ئەغلەب و سەرداری ئەو ئەسەدی كوڕی فورات ڕوویدا. لەپاش ئەم فەتحەوە هێزی دەریایی ئەفریقاو ئەندەلوس لەسەردەمی دەوڵەتی عبیدیان ئەمەویەكاندا نابەناو بەمەبەستی دروستكردنی كێشەو فیتنە هێرشیان دەكردە سەر شارەكانیان[336] و لەكەنارەكانیاندا كێشەو ئاژاوەیان بەرپا دەكرد. وەهێزی دەریایی ئەندەلوس لەسەردەمی عبدالرحمان الناصر گەشتبووە نزیكەی دووسەد كەشتی جەنگی و هێزی

---

[335] ووشەی پاپۆڕ تەرجەمەی ووشەی (شینی)یەكەبریتیە لەگرنگترین كەشتیە جەنگیەكان كەهێزی دەریایی لێوە پێكهاتووە، لەهەموو كەشتیەكانی تر زۆرتر گرنگی پێدراوە لەم جەنگانەشدا پاپۆڕ لەگەورەترینی كەشتیەكان بووە، كەبورج و قەلای گەورەلەقەراغەكانیدا دروستكراوە كەچەندین قات بوون و لەقاتی سەرەوەیدا جەنگاوەرانی چەكدار بوون و لەقاتی خوارەوەشیدا كۆمەڵێك سەوڵیان لێدەدا (پەراوێزی كتێبی (الظاهربيبرس و حضارة مصر في عصرة)، تأليف محمود جمال الدين سرور طبعة القاهرة ١٩٣٨ ص ١٤٤.

[336] (شارەكەناریەكانی ئەندەلوس و شارەكانی عبیدیەكان).

دەریایی ئەفریقاش بەهەمان ئەندازە یان نزیك لەوە. سەرکردەی هێزی دەریایی ئەندەلوس لەدەستی ئیبن ڕەماحیسدا بوو بەلەنگەرگاو بەندەری کەشتیەکانی ئەندەلوس‌و شارەکانی بجانە[٣٣٧] المریەشەوە. هێزی دەریایی لەوبەندەرانەش لەهەموو شارو مەملەکەتەکانی ترەوە لەوێدا کۆدەکرایەوە و لەهەرشارێکدا کەکەشتی تێدا دروست بکرایە هێزێکی دەریایی تایبەت بەخۆی هەبوو، کەلەژێر فەرمانی دەریاوان و فەرماندە ناوبراوەکاندا بوون و ئەم هێزەیان بەڕێوە دەبرد و لەبارەی کاروبارە جەنگی و چەك و چۆڵە و کاروبارەکانی پەیوەست بەو بوارەوە چاودێریان دەکرد.

هەرکەشتیەو خاوەنی سەرۆکێك بوو کەکاری لێخوڕینەکەی بەچارۆکە یان صەوڵ لێدان‌و لەئەستۆدابوو فەرمانی دەکرد کەلەچ کات و ساتێکدا ئامادەبێت بۆ جەنگ و لەبەندەرێکی دیاری کراودا ئەم کەشتیانە کۆدەکرانەوە و سوڵتان و داروودەستەکەی و دلاوەرانی جەنگ دەچوونە ناویەکێك لەو کەشتیانەوە و، هەموو کەشتیەکان پڕدەکران لەپیاوانی ئازاو چاو نەترس. ئەوکات یەکێك لەوپیاوانەی کەلەسەر ئەوکەشتیە بوون واتە لێهاتووترینیان دەکرایە سەرکردە و دەبوایە هەموویان گوێڕایەڵیان بکردایە. موسوڵمانان لەسەردەمی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەسەلآتیان بەسەرکەنارەکانی دەریای مەدیتەرانەدا هەبوو هێزو دەسەلآتیان لەو ناوچەیەدا گەشتبووە لووتکەو، مەسیحیەکان لەبەرامبەر هێزی ئەمانەوە خۆیان ڕانەدەگرت‌و لەم سەروبەندەشدا دەستکەوتێکی زۆریان بەدەستهێناو هەموو دوورگەجیاوازەکانی دەریای ناوبراویان داگیر کردوو، وەك میورقەو مینورقەو ووشکانیەکانی سردانیە و صەقەلیەو قوصرەو مالّتا و ئقریتش و قوبرص و زۆرێك لەدەوڵەتانی ڕۆم و فەرەنگ. ئەبوالقاسمی شیعی و کوڕەکانی بەهێزی دەریایی خۆیان لەمەهدیەوە هێرشیان دەکردە سەر دوورگەی جنوە سەرکەوتنیان بەدەست دەهێناو دەستکەوتی زۆریان کۆدەکردەوە موجاهیدی عامیری سەرکردەی دانیە

---

[٣٣٧] لەهەموو نوسخەکاندا بجایەیە، بەلآم دسلان ڕاستی کردووەتەوە و کردوویەتی بە(بجانە)کەئێستە پێی دەڵێن (پشینە)کەگوندێکە لەنزیك مریەدایە.

کەلەپاشاو تایفەکانی ئەندەلوس بوو، دورگەی سردانیەی بەهۆی هێزی دەریایی خۆیەوەلەساڵی ٤٠٥ داگیرکرد، بەڵام لەهەمان ڕۆژگاردا مەسیحیەکان گرتیانەوە، بەکورتی موسوڵمانان لەهەموو ئەم ماوەیەدا دەسەلاتیان بەسەر بەشی هەرەزۆری ئەم دەریایەدا پەیدا کردو هێزی دەریاییان لەودەریایەدا هاتوو چۆی دەکرد و هێزی دەریایی سوپای ئیسلام لەصەقەلیەوە تاوەکو بەری گەورە (ئەوروپا)لەڕووبەڕوویەوە لەکەناری باکور دەریاوانیان دەکردو، لەگەڵ پاشای فەرەنگدا شەڕی قورسیان دەکرد و لەمەملەکەتەکانیاندا کوشتارێکی زۆریان دەکرد، هەروەك چۆن لەسەر دەمی خانەدانی ابوالحسین دا کەیەکێك بوو لەپاشاکانی سیسیل (صقلیە)کەلەو دورگەیەدا بیروباوەڕی عبیدیەکانی (فاتمیەکان) بلاّودەکردەوە ئەم شەڕە دیسان ڕوویدایەوە.

نەتەوە مەسیحیەکانیش هێزە دەریاییەکانی خۆیان دەناردە کەنارەکانی فەرەنگ ئەسلافەکان و دوورگەکانی ڕۆمانیا لەلای باکوری خۆرهەلاّتی دەریای ڕۆم و ئەو ناوچانەیان واز لێنەدەهێنا، بەڵام هێزی دەریایی موسوڵمانان بەشێوەیەك هێرشی کردە سەریان هەروەك شێر کاتێك پەلاماری نێچیرەکەی دەدات هێزی دەریایی موسوڵمانان لەوێدا جێگیر بوون و هاتوو چۆی زۆریان لەڕێگە دەریاییەکانی ئەوناوچانەدا دەکرد ئیتر بۆ جەنگ بوبێت یان بەمەبەستی گەڕان و، گەشت بەجۆرێك شوێنەوارێك لەهێزی دەریایی مەسیحیەکان بەرچاو نەدەکەوت تەنانەت پارچە تەختەیەکی مەلەوانەکانیشیان.

تائەوکاتەی کەدەوڵەتی ئەمەوی و عبیدیەکان بەرەو لاوازی چوون. لەم کاتەدا مەسیحیەکان هێرشیان کردەسەر دورگەکانی خۆرهەلاّتی دەریای مەدیتەرانەو، سیسیل و ئقریتش (کرت)و مالّتا و داگیریان کردنەوە. لەپاشان و هەرلەو ماوەیەدا هێرشیان کردە سەر کەنارەکانی شام و داگیریان کردن و دەستیانگرت بەسەر تەرابلس و صور و عەککاو عەسقەلان و هەموو سنورەکانی شامیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە بیت المقدسیان داگیر کردو لەوێدا کلێسایەکیان دروست کرد بۆپەرستشەکانیان و دواتر زالّبوون بەسەر خانەدانی خەزروونی تەرابلس و قابس و صفاقس و ،خەڵکەکانیان ناچار کرد کەسەرانە

بدەن‌و، دواتر مەهدیەی پایتەختی عبیدیەکان (فاتمیەکان)یان داگیر کردو لەژێر دەسەلاتی بلکین بن زیری دەریان هێناو لەسەدەی پێنجەمەوە هێرشیان بۆسەر ئەم دەریایە دەستپێکردبوو، کاتێك بارودۆخی هێزی دەریایی دەوڵەتی شام ومیسر لاوازبوبو تائەوەبوو لەناوچوو تائەمڕۆکەش ڕوویان نەکردووەتەوە کاروباری دەریانەوەردی، ئەمەلەکاتێکداو لەڕابووردو دا بەتایبەت لەسەردەمی دەوڵەتی عبیدیەکاندا گرنگیەکی لەڕادەبەدەر بەو لایەنە دەدرا هەروەك چۆن لەمێژووە کەیاندا بەڕوونی دەبینرێت. لەئەنجامدا نەریتی ئەم پلەیە واتە فەرماندەیی هێزی دەریایی لەمیسردا بەتەواوەتی لەناوچوو، تەنها لەئەفریقاو مەغریبدا ئەم نەریتە مایەوە و تایبەت بوو بەو مەملەکەتانەوە هەروەك چۆن لەناوچەی خۆرئاوای ئەم دەریایەوە بەردەوام کەشتی جەنگی بەهێزو هێزی دەریایی گرنگ بوونی هەبووەو، ئێستاکەش هەربەو جۆرەیە و هیچ دووژمنێکیش توانای هێرشی بۆئەو ناوچەو کەنارانەنیە.

فەرماندەیی هێزی دەریایی ئەو سەرزەمینە لەسەردەمی دەوڵەتی لمتونەدا (مورابتان) بەنی مەیمون سەرۆکەکانی دورگەی قادس بوون و عبد المومین لەمووەحیدان و بەهۆی تەسلیم بوون و، فەرمانبەری ئەمانەوە ئەوپلەیەی لێوەرگرتنەوەو ژمارەی هێزی دەریاییان لەلەفاس دا (عدوەی ئەندەلوس و عدوەی قەیرەوان)، بەیەکەوە دەگەیشتە سەد کەشتی. وەلەبەر ئەوەی کەدەوڵەتی مووەحیدان لەسەدەی شەشەمدا گەیشتە ترۆپکی دەسەلات و، فاس (عدوەی ئەندەلوس و عدوەی قەیرەوان)ی داگیر کردو سوڵتانەکانیان بەباشترین و شیاوترین شێوە دەریاوانی و هونەرەکانی جەنگی دەریا فێربوون و، دەستیانکردە دامەزراندن و ڕێکخستنی کارەکان لەو بوارەدا و سوپاسالاری هێزی دەریاییان ئەحمەد صەقەلی بوو کەلەبنەڕەتدا لەهۆزی صدغیەکان بووە کەلەدوورگەی جربە لەناوچەی سدویکش نیشتەجیّ بوون. مەسیحیەکانیش ئەویان لەکەنارەکانی ئەو دورگەیەوە بەدیلی بردبوو لەلای ئەوان پەروەردەبوبو. ئەوکات بەرپرسان صەقەلیە (سیسیل)ئەویان هەڵبژاردو کردیانە کەسی نزیك و تایبەت بەخۆیان

لەپاشان ئەم بەرپرسە مردو کوڕەکەی بوویە جێنشینی، بەڵام ئەحمەدی صەقەلی بەهۆی هەندێك لەئارەزوەکانیەوە رق و توڕەیی هەندێك لەبەرپرسانی بەرامبەر بەخۆی جولاند و ئەویش لەترسی گیانی خۆی بەرەو تونس هەڵهات و، چوویەلای شازادەی ئەو شارە کەلەخانەدانی عبدالمومین بوو لەوێشەوە بەرەو مەراکیش چوو لەوێشدا خەلیفەیوسفی کوڕی عبدالمومین زۆر رێزی لێگرتوو دیاری گەلێکی زۆری پێ بەخشی و کردیە فەرماندەی هێزی دەریایی خۆی و، لەجیهاد کردن لەدژی نەتەوە مەسیحیەکان بوویە پێشەنگ و لەدەوڵەتی مووەحیداندا چەندین یادگاری لێبەجێ ماوە.

لەسەردەمی ئەودا هێزی دەریایی موسوڵمانان هەم لەڕوی ژمارەو هەم لەڕوانگەی باشی و پایەداریەوە بەپێی زانیاریەکانی ئێمە گەشتە قۆناغێك کە نەلەڕابوردودا نەلەداهاتوشدا نەگەشتبووە ئەو ئاستە. وەلەبەر ئەوەی کە صلاح الدین یۆسفی کوڕی ئەیوب پاشای میسروشام لەوسەردەمەدا بڕیاریدا کەسنورەکانی شام لەدەستی نەتەوە مەسیحیەکان وەربگرێتەوە و بیت المقدس لەپیسی کافران پاك بکاتەوە هێزی دەریایی مەسیحی بۆهاوکاری کردنی دەسەلاتدارانی ئەو سنورانەی خۆیان پەیتا پەیتا هێزو یارمەتیان ڕەوانە دەکرد، چونکە هێزە دەریاییەکانی ئەسکەندەریە توانای ڕووبەڕو بونەوەی هێزی ئەوانیان نەبوو، چونکە ئەوان بەردەوام لەم کەنارەدا کەشتی گەلێکی فراوانیان هەبوو موسوڵمانانیش لەدێر زەمانەوە لاوازبوبون نەیاندەتوانی لەبەرامبەر هێرشی مەسیحیەکان لەوناوچەیەدا خۆیان ڕابگرن، هەروەك لەلاپەڕەکانی پێشودا ئاماژەمان پێدا. هەربۆیە صلاح الدین عبدالکریمی کوڕی مونقیز لەخێزانی بەنی مونقیز پاشاکانی شیزەر کەئەوانی بەهێزی خۆیانەوە وازلێ هێنابوو لەدەوڵەتی خۆیدا هێشتبونیەوە بەشاندێك بەنوێنەرایەتی بەرەولای یەعقوبی منصور کەلەو ڕۆژگارەدا سوڵتانی مەغریب بوو بانگ کرد.

صلاح الدین ئەم خانەدانەی لەسەر دەسەلاتی خۆیان هێشتەوە لەدەوڵەتەکەی ئەودا مانەوە. هەربۆیە لەڕێگەی عبدالکریمەوە داوای یارمەتی لەمنصور کردو کەهێزە

دەریاییەکەی بخاتە بەردەستی ئەم و بۆئەوەی لەدەریاد لەنێوان کەشتیەجەنگیەکانی کافراندا چاودێری هێزەکانیان و ئامانجەکانیان کەیارمەتی هێزەکانی مەسیحی بوو بکات. نامەیەکی بەپێنوسی فازیلی بیسانی بۆ مەنصوربەهۆی عبدالکریمەوە دەنێرێت و بەپێی ئەوەی کەعیمادی ئەصفەهانی لەکتێبەکەیدا فتح القدسی هێناویەتی سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێدەکات: (خودا دەرگاکانی بەختەوەری خێرو بێر بەڕووی گەورەی ئێمەدا بکاتەوە). مەنصور بەهۆی ئەوەی کەئەویان بەئەمیر المومینینەوە بانگ نەکردبوو بەتوندی دڵی ئازاری پێگەیشت، بەڵام لەم بارەیەوە هیچی نەگووت و بەنهێنی لەدڵیدا هێشتیەوە و هەموو چاکەیەکی لەگەڵدا کردن و، ناردنیەوە بۆلای صلاح الدين و هیچ وەڵامێکی داواکەی ناوبراوی نەدایەوە. ئەم شتەش ئەوەنیشان دەدات کەهێزی دەریایی تایبەت بووە بەسوڵتانەکانی مەغریب و وەهەم نەتەوە مەسیحیەکانیش خاوەنی کەشتی گەلی جەنگی گەورەو بەهێز بوون، بەڵام دەوڵەتەکانی میسرو شام لەو سەردەمەدا و لەپاش ئەو قۆناغەوە گرنگیان بەهێزی دەریایی نەداوە و هەوڵی بەدەست هێنانیشیان نەداوە.

وەلەبەر ئەوەی یەعقوب مەنصور کۆچی دوایی کرد و دەوڵەتی مووەحیدان لاوازبوو جلاقەکان (گالیسینەکان)زۆربەی ناوچەکانی ئەندەلوسیان داگیر کرد، موسوڵمانانیان ناچار کرد کەپەناببەنە کەنار دەریاو ئەودورگانەی کەلەکەنار دەریای مدیتەرانەدا بوون داگیریان کردو هێزی جلاقە لەسەرتاسەری دەریای ناوبراودا فراوان بوو گەیشتە لوتکەی شکۆمەندی هێزی دەریایشیان فراوان بوو، هێزی موسوڵمانان لەو دەریایەدا کەم بویەوە و هێزی دەریایی ئەمان لەگەڵ جلاقەدا بەرابەر بوو، هەروەك چۆن لەسەردەمی سوڵتان ئەبوالحسین پاشای زناتەدا لەمەغریب بارودۆخ بەم شێوەیە بوو چونکە کەشتیە دەریاییەکانی ئەو لەوکاتەی کە ویستی جیهاد بکات، لەڕووی ژمارەو چۆنیەتیەوە لەگەڵ هێزی دەریایی مەسیحیەکاندا یەکسان بوو. لەوە بەدواوە هێزی دەریایی موسوڵمانان دیسانەوە ڕووی لەلاوازی کرد و لەو ئەندازەیە کەمتر بوویەوە چونکە دەوڵەتانی ئیسلامی

بەگشتی لاواز بوبون و بەهۆی زۆربوونی نەریتی دەشتەکیەتیەوە نەریتی دەریاوانی و کەشتیوانی لەناو چوو ئەو داب و نەریتەی کەلەئەندەلوسەوە وەریان گرتبوو، لەدەستیاندا، بەلام مەسیحیەکان لەسەر شێوەی خۆیان لەدەریا نەوەردیدا گەڕانەوە سەر ئەوشێوە تۆکمەیەی کەهەیانبوو پێیەوە بەناوبانگ بوون، وەئەوئەتەوانەش لەسەر ڕووی دەریاوبەسواری داروتەختە (کەشتی)یەوە توانیان سەر بکەون. موسوڵمانانیش بێجگەلە گروپێکی کەم نەبێت کەڕاهێنانیان تێدا دەکرد لەم دەریای مدیتەرانەدا وەك بێگانەیان لێهاتبوو ئەو گروپەش ئەوکەسانەبون کەلەکەنار دەریاکاندا دەژیان، کەخۆزگە هاوڕێ و دۆست و یارمەتیدەریان هەبوایە یاخود لەدەوڵەتەکانەوە هاوکاری بکرانایە و کەسانێکیان دیاری بکردایە بۆڕێنمایی کردنیان، بەلام پێگەی هێزی دەریایی تائێستەش لەدەوڵەتانی خۆرئاوادا پارێزراوە داب و نەریتی هەوڵ و کۆشش کردن بۆ دروستکردن و بەگەڕ خستنی کەشتی جەنگی باش‌و تۆکمە لەنێویاندا هەرماوە و هیوا ئەوەیە کەمەبەستە دەوڵەتیەکان لە وولاتە دەریاییەکاندا ئەوان پابەند بکات بەپێویستی ئەم هێزە گرنگەوە و، موسوڵمانان بەپێی ئاراستەی هەڵکردنی باکان دەست بکەن بەجیهاد لەدژی کافرو بێ باوەڕان، چونکە هەروەك چۆن لەناو خەڵکی مەغریبدا بەناوبانگە بەپێی ئەو زانیاریانەی کەلەکتێبە تایبەتەکان بەپێشگۆیی و پێشبینی کردنەکانەوە بەدەستیان هێناوە، دەڵێن کەگوایە موسوڵمانان لەئایندەدا هێرش دەکەنە سەر نەتەوە مەسیحیەکان و وولاتانی فەرەنگیەکان لەپشتەوەی دەریا فەتح دەکەن‌و وەها فەتحێکیش بەیارمەتی هێزی دەریایی میسر دەبێت.

خوداش دۆستی باوەڕدارانە[٣٣٨] و تەنها ئەومان بەسەو کارەکانی زۆر باشن.[٣٣٩]

---

[٣٣٨] (وَاللهُ وَلِيُّ المُؤمنِين) س ال عمران ئا ٦١ .

[٣٣٩] (حَسبُنَاالله وَنِعمَ الوَكِيل) س ال عمران ئا ١٧٣ .

# بەشی سی و پێنجەم

## لەبارەی جیاوازی نێوان پلەکانی شمشێر (وەزیری جەنگ)وقەڵەم لەدەوڵەتەکاندا

دەبێت ئەوەبزانین کەشمشێرو قەڵەم هەردووکیان لەشتە بنەڕەتی و هۆکارەکانی دەوڵەتن کەلەفەرمانڕەوایی خۆیدا یارمەتیان لێ وەردەگرێت، بەڵام لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتدا لەوکاتەی کەهێشتا پایەکانی فەرمانڕەوایی بەهێز نەبوون پێویستی پاشا بەشمشێر لەقەڵەم زیاترە، چونکە لەم قۆناغەدا قەڵەم خزمەتکارێکە کەتەنها لەڕێگەی تەنفیزو جێبەجێ کردنی ئەحکامەکانی دەوڵەتدا بەکار دەهێنرێت و شمشێریش لەم بوارەدا هاوکاری دەکات. وەهەروەها هەروەك باسمانکرد شمشێر لەکۆتایی دەوڵەتدا کەعەصەبیەتەکەی لاواز دەبێت و خانەدان و خزمان و نەژادی سوڵتان بەهۆی پیری فەتوتی و کەم و کورتی لەدەوڵەتدا کەم دەبنەوە و لەقەڵەم زیاتر دەوڵەت پێویستی پێیەتی هەروەك چۆن لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەوە پشت بەبەرپرسانی شمشێر دەبەستێت و یارمەتیان لێ وەر دەگرێت و لەم قۆناغەشدا بۆ بەهێزکردنی دەوڵەت ناچارە دەوڵەت بکاتە پشت و پەنای خۆی داوای یارمەتی لەو دەکات، کەواتە شمشێر لەهەردوو قۆناغی سەرەتاو کۆتایی دەوڵەتدا لەقەڵەم زیاترو بەهێزترە، بەرپرسانی شمشێر لەم دوو قۆناغەدا شکۆمەندترو نازو نیعمەتدارترن و شتی پڕ بەهای تر بەدەست دەهێنن، بەڵام لەنێوەندەکانی دەوڵەتی سوڵتان و بەرپرسەکانی تائەندازەیەك پێویستی بەشمشێر

نابێت، چونکە ئەو لەم قۆناغەدا لەپێك هێنانی دەوڵەتدا کاملّ بووە و فەرمانی لەهەموو شوێنێکدا جێبەجێ دەکرێت. ئێستەش بێجگەلەسود وەرگرتن لەدەرئەنجام و بەرهەمەکانی پاشایەتی وەك کۆکردنەوەی باج و ماڵیات و پاراستنی و شانازی کردن بەسەر دەوڵەتانی ترو جێبەجێ کردنی فەرمانەکان ئامانجێکی تری نیەو، لەم قۆناغەدا یارمەتی دەری ئەو قەڵەمەو پێویستیەکی زۆری پێی هەیە بۆئەوەی لەڕێگەی مەبەستەکانیدا بەکاری بهێنێت، لەوە زیاتر پێویستی بەشمشێر نیە، شمشێرەکان لەکەلاندان و کارێکیان لەدەست نایەت مەگەر کێشەو گرفتێك ڕوو‌بدات بۆ وولآت و داوای دەستوەردانی شمشێر بکرێت لەمەسەلەکەدا بێجگەلەم جۆرە شوێنانە لەهیچ جێگەیەکی تردا پێویستیان بەشمشێر نابێت.

هەربۆیە لەم قۆناغەدا خاوەنی قەڵەم و بەرپرسەکانی شان و شکۆیەکی زیاتریان هەیە پلەیەکی بالآتر بەدەست دەهێنن و نیعمەت و سەروەت و سامانێکی زۆرتر بەدەست دەهێنن و لەدەرباری سوڵتانەوە نزیکترن‌و، لەزۆربەی کاتەکاندا ڕاوێژیان لەگەڵدا دەکرێت‌و چونکە وەها هەلومەرجێك وەك بنەڕەتی کارەکەی ئەو وایەلەبەدەست هێنانی ئەنجام و، بەرهەم و چاودێری کردنی بارودۆخی هەموو ناوچە دوور دەستەکانی وولآت وشانازی کردن بەچۆنیەتی ژیان و گوزەرانی پاشاوە یارمەتی لێ وەردەگرێت. لەم کاتە پێویستی بەوەزیران و بەرپرسانی شمشێر نابێت، هەربۆیە لەدووری بارەگای سوڵتانەوە دەژین و لەتوڕەیی ئەوبەرامبەر بەخۆیان بێباکن. وەکاتێك مەنصور فەرمان دەدات ئەبوموسلیم بێت بۆلای، ئەبو موسلیم تامەیەکی بۆ نوسیوە کەتێیدا خاڵێکی گرنگی ئەم پلەیە بەم شێوەیە دەبینرێت: لەپاشان (امابعد)ئەوەی کەئێمە لەهەڵسووکەوتی ئێرانیەکان لەبیرمان ماوە ئەوەیەکە مەترسیدارترین شوێن بۆ وەزیرەکان کاتێکە کەکێشەو هەراو هۆریاکان کپ ببنەوە وولآت لەحاڵەتی هێمنی ئارامیدا بێت. نەریتی خودایە لەنێو بەندەکانیدا.[٣٤٠] خوداش داناترە.

---

[٣٤٠] (سنه الله فی عباده).

# بەشی سی و شەشەم

## لەبارەی نەریت و نیشانە تایبەتەکانی پاشاو سوڵتانەوە

دەبێت ئەوە بزانین کەسوڵتان خاوەنی کۆمەڵێك نەریت و نیشانەیە کەشان و شکۆی ئەو دەیانخوازێت و هەربۆیە تابەت دەبن بەناوبراوەوە و بەبەکارهێنانیان لەژێر دەستان و بەرپرسانی تری دەوڵەتی جیا دەبێتەوە، هەربۆیە ئێمەش بەشێك لەوانەی کەزۆر بەناوبانگن بەپێی زانیاری و ئاگاداری خۆمان لەو بارەیەوە باسیان دەکەین.لەسەرو هەموو زاناکانەوە زانایەکی گەورەو زاناتر هەیە.[٣٤١]

ئامێری (الت)سازکاری لەشکر[٣٤٢]: بەدەست هێنان و بەکار هێنانی ئامێرەکان وەك کردنەوەو بەرزکردنەوەی (رایات)[٣٤٣]ئاڵاکان بەبچووك گەورەوە و لێدانی تەپڵ و نەی و بوق و کەڕەناو شەیپور و زوڕناکان نیشانەی تایبەتی پاشان. ئەرستۆ لەکتێبی السیاسەدا کەدەگوترێت دانراوی ئەوە دەڵێت: بەکار هێنانی ئەو شتانە ترساندنی دووژمنە لەجەنگدا

---

[٣٤١] (وَفَوقَ كُلِّ ذِی عِلمٍ عَلیم) س یوسف ئا ٧٦ .

[٣٤٢] ووشـەی الـت لـەم مانایـەدا زمخشـری وصـاحبی موهـەزەب الاسما بەسازکار تەرجەمـەیانکردووە ، بـەڵام نوسەران و شاعیرانی ڕابوردوو ووشەی ناوبراویان بەم مانایە بەکارهێناوە هـەروەك چۆن ئەبوالفـەزڵی بەیهـەقی دەڵێت: تاهیر تەجەمولی و ئالەتی سەختی تەواوی هـەبوو. وەفردەوسیش ئالـەت و سازکاریشـی بـەکار هێنـاوە وەك: هەمووئالەت و سازکارەکانی جەنگ یان هەمووئامێرەکانی گۆڕەپانی جەنگ. وەدەتـوانین لێـرەدا بەسـازو جل و بەرگی پاشایەتی مانابکرێت (لغتنامەی دهخدا).

[٣٤٣] ئاڵا تەرجەمەی رایاتە، کەلەمەغریبدا وەك ئەزهەری دەڵێت بەئاڵای جەیش گوتراوە و لـەلیوا گـەورەتربووە (اقرب الموارد).

چونکە دەنگ و ئاوازی سامناك ترس لەناخی مرۆڤدا دروست دەکات، بەڵام سوێند دەخۆم کەکاریگەری ئاوازە ناوبراوەکان شتێکی ڕۆحی و ویژدانیە لەگۆڕەپانی جەنگدا کەهەرکەسێك کاریگەریان لەدەرونیدا هەست پێدەکات، وەئەو هۆکارەی کەئەرستۆ هێناویەتی و ئەگەر بەووردی باسی کردبێت، لەهەندێك ڕووەوە ڕاستە، بەڵام لەم بارەیەوە ڕاستیەکەی ئەوەیە کەدەرون لەکاتی بیستنی سۆزو ئاوازەکاندا بێگومان هەست بەشادی خۆشی دەکات هەروەك چۆن مەستیەکی تایبەت بەسەر میزاج و ڕۆحدا دێت و، بەهۆیەوە هەرکارێکی نارەحەت ئاسان دەبێت بەلای مرۆڤەوە و هەربۆیە لەم ڕێگەیەدا ئامادەی گیان بەخت کردن دەبێت ئەم چۆنیەتیەش تەنانەت لەگیانلەبەرانی بێ زمانیشدا بوونی هەیە، هەروەك دەزانرێت حوشتر بەگۆرانی گووتن و ئەسپ بەفیکە و هاوار دەورووژێنرێن و هەرکات ئاوازەکان گونجاوتر بن ئەوا کاریگەریەکەیان زیاتر دەبێت، هەوەك چۆن لە گۆرانی و مۆسیقادا هەرکەسێك بۆخۆی دەزانێت چ حاڵەتێك بەسەرگوێگردا دێت. هەربۆیە نەتەوە غەیرە عەرەبەکان لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا ئامێری موسیقاو شەیپور کەڕەناو تەپڵ بەکار دەهێنن.

وەهەروەها لەکاتی ڕۆشتنی کەژاوەی پاشاکاندا ئەم کارەدەکرێت بەمەبەستی دەرخستن و گەورەیی و سام و شان وشکۆی پاشاو لەکۆڕو کۆبوونەوەکانیشیدا ئەم کارە دەکرێت و، بەتایبەت لەکاتی شەڕەکاندا و لەوکاتەی کە هێرش دەکەن و پاڵەوانەکان ڕووبەڕوی یەکتری دەبنەوە سود لەم جۆرە ئامێرانە وەردەگیرێت بۆ ترساندنی دوژمن. وەهەروەها زناتە کەلەنە تەوەکانی مەغریبن بەم شێوەیەن. شاعیرەکەیان لەپێشی ڕیزی سەربازەکانەوە دەوەستێتو شیعرەکان بەدەنگێکی حەماسیو بزوێنەرەوە دەخوێنێتەوە و بەئاوازەکەی کێوەکان دەلەرزێنێت خەڵکانێك والێدەکات گیانیان بەخت بکەن کەبەبیری کەسدا نەهاتبێت ئەو کارەیان لێبوەشێتەوە، هۆزەناوبراوەکان ئەم جۆرە ئاوازە بە (تاصوکایت)ناوزەد دەکەن. بنەڕەتی ئەوشتانەش بریتیە لەشادی گۆرانیەك کەلەدەروندا ڕوودەدات و دەبێتە هۆی دروستبونی دلاوەری وەك ئەو شادی و خۆشیەی

کەبەهۆی مەستی شەرابەوە بەسەر مرۆڤدا دێت، خوداش داناترە. وەمەبەست لەپەرچەمو ئالآ فراوان و ڕنگاو ڕەنگەکان ترساندنی بەرامبەرە وبەبینینیان والەکەسی بەرامبەر دەکات هەستی هێرشکردنی لەلا کەم بێتەوە. وەنەفسی مرۆڤیش بەشتی ڕەنگاو ڕەنگ سەرسام دەبێت ئەمەش لەسەر دەمی پێغەمبەر خەلیفەکان و سوپاکانی تری خەلافەتی ئیسلامیشدا بەکار هێنراون.خوداش ئافرێنەری دانایە.[٣٤٤]بەکارهێنانی ئەم شتانەش لەدەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆڕێت بەپێی کەمی و فراوانی دەوڵەتەکان، بەڵام لێدانی تەپڵ و بووق و کەڕەنا موسوڵمانان لەسەرەتای ئیسلامدا بەکاریان نەدەهێناو، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەخۆیان لەنیشانەکانی پاشایەتی و کافران خۆیان بەدوور بگرن، تائەوەبوو خەلافەت گۆڕا بۆ پاشایەتی و موسوڵمانان لەزۆنگاوی خۆشگوزەرانی و نازو نیعمەتدا ڕۆچوون و، بەهۆی تێکەڵیان لەگەڵ مەوالیە ئێرانی و ڕۆمیەکاندا کەلەدەوڵەتی ئیسلامیدا دەژیان و ئەوشێوازانەی کە پاشاکانی ئێران و ڕۆم لەجوانکاری و شان و شکۆدا بەکاریان دەهێنا فێری ئەمانیان کرد.

هەربۆیە موسوڵمانانیش هەرداب و نەریتێکیان بەلاوە پەسەند بوایە پەیڕەویان لێدەکرد و ڕێگەیان بەکارگوزارانیان دا لەڕێزگرتن و ڕازاندنەوەی تاج و تەخت و کەژاوەی سوڵتان و پاشاکاندا ئەوپەڕی جوانکاری و ڕازاندنەوە بەکار بهێنن و زۆربەی کاتەکان خەلیفەی عەباسی و عبیدیەکان (فاتمیەکان)فەرمانیان دەدا هەموو ئەوکەژاوانەی کەلەگەڵ پاشادا دەردەچن، بەیەك ڕەنگ برازێنرێنەوە و زۆربەی کاتەکانیش کەژاوەی خەلیفەکانی عەباسی و داروودەستەیان بەپارچە و پەڕۆی ڕەش دادەپۆشران بەجۆرێك بەئاستەم دەتوانرا گالیسکەی خەلیفە لەناویاندا بناسرێتەوە ئەم ڕەنگەڕەشەش وەك ئازیەت باری بوو بۆشەهیدەکانیان لەبەنی هاشم و سەرزەنشت کردنی بەنی ئومەییە

[٣٤٤] (وَهُوَالخَلّاقُ العَلِيم) س پس ئا ٨١.

کەگروپێك لەخانەدانی ئەمانیان کوشتبوو، هەربۆیە پێیان دەگوتن مسوەدە[٣٤٥]، چونکە ئەمان بەپێچەوانەی سەنەویەوە عەبا سیە کان و خەلیفەکانیان مێزەری ڕەشیان لەسەر دەکرد. وەلەبەر ئەوەی کەجیاوازی کەوتە نێوان هاشمیەکانەوە و تالیبیەکان لەهەرلاو هەرسەردەمێکدا لەگەڵ عەباسیەکاندا بەشەڕ دەهاتن لەم بوارەشدا دژایەتی عەباسیەکانیان کردو، پارچە و مێزەری سپیان بەکار دەهێناو لەسەریان دەکرد و پێیان دەگووتن (مبیچە)[٣٤٦]واتە مێزەر سپیەکان هەربۆیە ئەوانەی کەڕاپەڕیبوون لەسەردەمی عبیدیەکان و کەسانێك لەتالیبیەکان کەلەم سەردەمەداو لەخۆرهەلاتدا شۆڕشیان کردبوو، وەك بانگخوازی تەبەرستان و صەعدەو یان ئەوکەسانەی تریش کەبانگەوازیان بۆ بیدعەی ڕافیزی دەکرد، وەك قرمتیەکان، پێیان دەڵێن بەرگ و مێزەروپۆشاك سپیەکان. وەلەبەر ئەوەی کەمەئمون لەپۆشینی بەرگ و مێزەری ڕەش و بەکارهێنانی ئەم شیعارە لەدەسەلاتەکەیدا پەشیمان بوویەوە و ڕەنگی سەوزی هەڵبژاردو هەربۆیە هەمووشتێکی سەوزپۆش کرد، بەلام ژمارە و زۆری بەندە پەڕۆکان کەبەکاریان دەهێنن ناتوانین دیاریان بکەین و لەڕاستیدا بێ کۆتایین.

هەروەك چۆن کاتێك عەزیز نزار پێنجەمین خەلیفەی فاتمیەکان ویستی شام فەتح بکات لەو ئامادەکاریانەی کەبۆئەم مەبەستە دەیانکرد پێنج سەد بەندی پەڕۆو پێنج سەد

---

[٣٤٥] خاوەنی اقرب الموارد، دەڵێت: ئەمەنازناوی خەلیفەکانی عەباسیەچوونکە ئەمان بەپێچەوانەی سەنەویەکانەوەکەمێزەری سپییان دەپۆشی ئەمان لەدژی ئەوان مێزەری ڕەشیان دەپۆشی .

[٣٤٦] سەربازە دەمامکدارەکانیان بەم ناوەوە بانگدەکرد کەمێزەری سپیان دەپۆشی ئەمەش وەك دژایەتیەك لەگەڵ مسوەدەکاندا ئیدوارد براون ئەم هەڵەیەی لەمێژووی ئەدەبیاتدا کردووەو، تەنها شیعاری پەیڕەوانی دەمامکداری کەگوایە موزدەکی بوون بەسپی پۆشی زانیوە، ئەمەلەکاتێکدا سپی پۆشی و بەرزکردنەوەی ئالای سپی شیعاری ئەو دەستانەبوون کە لەدژی عەباسیەکان دەجەنگان و، زۆربەی کودەتاچیانی سەردەمی عەباسیەکان لەشیعەزەیدیەکان بوون و لەخاندانی پێغەمبەر لەکاتی جەنگدا ئالای سپیان هەڵدەکرد و بەم شێوەیە ڕەش پۆشی کەشیعاری عەباسیەکان بوو دوور دەکەوتنەوە (البدو والتاریخ بەشی ڕاپەڕینی زەیدیەکان).

بووق یان کەڕەنا بووە، بەڵام پاشاکانی بەربەری مەغریب وەك صەنهاجەو نمونەی ئەوان، ڕەنگێکی تایبەتیان بۆ پارچەو پەڕۆکان دیاری نەکردبوو، بەڵکو پارچەی ئاوریشمی ڕەنگاو ڕەنگیان بۆ ئەم مەبستە بەکار دەهێنا و ڕێگەشیان بەکارگوزارەکانیشیان دەدا کەئەم شێوازە پەیڕەو بکەن، تائەوکاتەی کەسەردەمی فەرمانڕەوایی مووەحیدان و سوڵتانەکانی دوای ئەوان لە هۆزەکانی زناتە لەوەبەدواوە پاشایانی ناوبراو ئامادەکاریەکانیان وەك تەپڵ و پارچە پەڕۆکانیان تایبەت کرد، بەسوڵتانەوە و ڕێگەیان بەکەسی تر نەدەدا کە بەکاریان بهێنن. بۆسازکارو ئامادەکردنی کەژاوەکانی سوڵتان ڕێوشوێنی تایبەتیان گرتەبەر کەلەکاتی ڕۆشتنی سوڵتان بەڕێگەیەکدا ئەو کارانە پەیڕەو دەکران و بەو کەژاوەیان دەگووت (ساقە)[٣٤٧] ژمارەی ئەوانەش بەپێی جیاوازی شێوازی دەوڵەتەکان لەم بارەیەوە هەندێك جار زۆرو هەندێك جاریش کەم بوون و، لەهەندێك دەوڵەتدا حەوت دانە لەوپارچانە بەکار دەهێنران، هەروەك چۆن لەدەوڵەتی مووەحیدان و بەنی ئەحمەردا لەئەندەلوس ئەم شێوازە باوبووەو هەندێکلەسوپاکانیش زیاتر لەدە تاوەکو بیست دانەیان بەکار هێناوە وەك هۆزی زناتە.

وەلەسەردەمی سوڵتان ئەبوالحسن دا بەپێی ئەوەی ئێمە زانیومانە لەساقەی ئەودا واتە لەبەشی دواوەی سوپاکەیدا سەد تەپڵ و سەد بەند پەڕۆی ڕەنگاو ڕەنگی ئاوریشم لەگەورە و بچوك هەبوون و بەکار هێنراون و، ڕێگەشیان بەفەرمانڕەواو کارگوزارەکانیان دەدا کەپارچە پەڕۆیەکی بچوك و تەپڵێك لەکاتی جەنگدا هەڵبگرن و لەم ئاستە زیاتری نەکەن، بەڵام دەوڵەتی تورکی خۆرهەڵات لەم سەردەمەدا لەبواری سازکردنی لەشکری خۆیان لەم بوارەدا یەکەمجار یەك بەند پەڕۆی گەورە هەڵدەگرن، کەلەسەرێکیەوە زنجیرەیەك مووی چنراو هەیە و پێی دەڵێن جالیش یان چەتر کەهەموو سوپاییەکان بەشێوەیەکی گشتی بەکاری دەهێنن و، لەپاشان لەسەر سەری سوڵتانەوە بەندێکی ترهەیە کەپێی دەڵێن (عصابە)و (شتفە)کەبەلای ئەمانەوە ئەم بەندە شیعاری تایبەتی

---

[٣٤٧] واتە: کەژاوەکانی بەشی کۆتایی سوپا (اقرب الموارد). (٤)واتە عەلەم نیشانەی فەوج دەگەیەنێت .

سوڵتانە. دواتر بەند گەلێکی زۆرو جۆراو جۆر هەڵدەبژێرن و، پێیان دەڵێن (سناجق)کەمفرەدەکەی (سنجق)و لەزمانی تورکیشدا مانای ئاڵا دەگەیەنێت، بەڵام تەپڵەکان لەدەوڵەتی تورکەکاندا زۆر باو بوون و زیادەڕەویشیان تێدا کردووە و پێیان گوتوون (کوسات)، بهرامبر یان سەرداری لەشکر ڕێگەی پێ دەدرا بەهەر شێوەیەك کەئەیەوێت سازکاری بۆلەشکرەکەی بکات، بێجگە لە(عصابە)کەتایبەتی پاشایە و ڕێگری دەکرا لەوەی کەبێجگە لەپاشا بەکاری بهێنێت، بەڵام جلاقە (گالیسینەکان) لەنەتەوەکانی فەرەنگی ئەندەلوس لەم سەردەمەدا لەزۆربەی کاتەکاندا پەڕۆی کەمیان بەکار دەهێناو لەشێوەی دەستەی بەرزدا دەیانبەست و لەگەڵیشیاندا ئامێرە مۆسیقیەکان لێدەدران وەك تەنبور و لێدانی گیتار.

شێوازی گۆرانی و مۆسیقایان هەڵدەبژاردو لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا بەکاریان دەهێنان. ئەمەیە ئەوباسەی کەلەبارەی ئەمان و پاشاکانی تری غەیرە عەرەب کەلەپشتەوەی سەر زەمینی ئەواندا دەژین بەئێمە گەیشتووە. لەم بەسەر هاتانەدا بەڵگەو نیشانەی تێدایە بۆ باوەڕداران.[٣٤٨]

**تەخت (سریر):** واتە ڕاخەر یان کورسی و مینبەر کەبریتیە لەپارچە تەختەگەلێکی بەرزو بەپارچە پەڕۆ ڕازێنراوەتەوە، بەمەرجێك لەئاستی دانیشتوانی کۆڕو مەجلیسەکەوە بەرزتر بێت. ئەم شێوازە بەردەوام لەداب و نەریتی پاشاکانی پێش ئیسلام و دەوڵەتەغەیرە عەرەبیەکان بووە و پاشاناوبراوەکان لەسەر تەختی زێڕین دادەنیشتن. وەسولەیمانی کوڕی داوود سڵاوی خودایان لەسەر بێت تەختێکی لەدرەختی عاج سنەوبەر هەبووە کەبەزێڕ ڕازێنرابوویەوە، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کەدەوڵەتەکان تەختیان بەکار نەدەهێنا مەگەر ئەوکاتەی کە بەتەواوی دەگەیشتنەئەوپەڕی قۆناغی هێزو توانا ئەوکات دەستیان دەدایە هەموو شێوازەکانی جوانکاری عەزەمەت. لەسەرەتای ئیسلام و قۆناغی دەشتەکیەتیدا هێندە گرنگی پێنەدراوە و یەکەم کەسیش

---

[٣٤٨] (وَمِن آياتِهِ خَلقُ السَّمواتِ وَالأرضِ وَاختِلافِ ألسِنَتِكُم وَألوانِكُم إنَّ في ذلِكَ لآياتٍ لِلعالمِين) س الروم ئا٢٠.

کەتەختی پاشایەتی[349] داهێنا موعاویە بوو لەم بارەیەوە مۆڵەتی لەخەڵکی وەرگرتوو بەخەڵکی گووت من توانای وەستانی زۆرم نەماوە و تکایە مۆڵەتی دانیشتنم لەسەر ئەم تەختە پێ بدەن و، ئەوانیش مۆڵەتیان دایەو لەوەبەدواش هەموو پاشاکانی ئیسلام پەیڕەویان لەونەریتەی ئەو کرد و ئەم کارەش لەئیسلامدا بەشان و شکۆی پاشا دادەنرا. عەمری کوڕی عاص لەکۆشکەکەیدا لەمیسر لەگەڵ موجاهیدەکاندا لەسەر زەوی دادەنیشت و کاتێك مەقوقس[350] هاتە کۆشکەکەیەوە خزمەتکارەکانی تەختێکی بەزێڕ ڕازاوەیان بەدەست هەڵگرتبوو لەگەڵیدا هێنابوویان، بۆئەوەی لەسەری دابنیشێت مەقوقسیش لەوکاتەی کەعەمری کوڕی عاصی لەبەرامبەرەوە دانیشتبوو لەسەر تەختی ناوبراو دانیشت و، موجاهیدەکانیش حەزیان لەو کارەی مەقوقس نەدەکرد لەبەر ئەوەی کەئەیانویست شان و شکۆی ناباشی پاشایەتی وەلاوە بنێن.

لەپاش ئەو سەردەمە بەنی عەباس و عبیدیە کان و هەموو پاشاکانی ئیسلام لەخۆرهەلات و خۆر ئاوادا خاوەنی تەخت و تاجی جۆراو جۆر بوون بەجۆرێك وایان لێهات دابوونەریتی قەیصەر و کیسراکانیان لەبیری خەڵکی بردەوە، و خودا هەڵسوڕێنەری شەوو ڕۆژە.

**دراو (سکە):** ئەمەش بریتیە لەمۆرلێدانی ئەو دینارو دیرهەمانەی کەلەنێو خەڵکیدا بەکار دەهێنرێن و سەوداو مامەڵەیان پێوە دەکەن. ئەو مۆرەشی کەبەکاری دەهێنن بریتیە لەپارچە ئاسنێك کەلەسەری شێوەیان وشەگەلێکی پێچەوانەی لەسەر نەخشێنراوەو، لەوکاتەی کەدەیدەن لەدراوەکە وشە یان شێوەکان بەڕاستی دەردەکەون، بەلام سەرەتا عەیاری ئەو کانزایانەی کەدراوەکانیان لێ دروستکراوە لەبەر چاو دەگرن و بۆپاککردنەوەیان و پاڵفتەکردنیان لەمادەی بێکەڵکی تر بۆ چەند جارێك دەیانخەنە ناو بۆتەقەوە. لەپاش هەڵسەنگاندن و ئەندازە گیری تەنەکانی دیرهەم و

---

[349] بەزۆری بەوشوێنە دەگوترێت کەپاشای لەسەر دادەنیشێت لەجەنگەکاندا.

[350] (نازناوی پاشاوفەرمانڕەواکانی میسرو ئەسکەندەریەیە).(اقرب الموارد).

دینارەکان بەشێوەیەکی ڕاست و دروست کەباوە لەناوخەڵکیدا، وەئەگەر بێت ودراوی ناوبراو لەڕوی قەبارەوە ڕێك ویەك ئەندازە نەبن ئەوا بەپێی بارستایی مامەڵەیان پێوە دەکرێت. وشەی سککە یەکەم جار ناوی مۆرێکی ئاسنین بووە کەبۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنرا، بەڵام پاش ماوەیەك بەهۆی ئەو شوێنەوارەی کەبەسەر سککەو دراوەکانەوە بەجێی دەهێڵێت ناوزەد کراو کەهەمان ئەو نەخش و نیگارە پێچەوانانەیە کەبەسەر دراوەکانەوە بەڕاستی دەردەچن. ئەوکات لەم مانایەوە گواستیانەوە بۆ مانایەکی تر کەبریتی بوو لەئەنجامدانی کاری ناوبراوو چاودێری لەتەواوکردنی هەلومەرجەکان‌و پێداویستیەکانیداو ووردە ووردەش وشەی ناوبراولەدەوڵەتەکاندا گۆڕا بۆ ئەم مانایەو تایبەت کراپێیەوە، کەیەکێك بووە لەپێگەوپلەو پایەکانی دەوڵەتداری‌و پاشایەتیی، چونکە بەهۆی ئەم دەزگایەوە باش و خراپی ئەم دراوانە لەناو خەڵکیدا دەناسرێتەوە و بۆپاراستنیان لەغەل و غەش مۆری سوڵتانیان لێدەدرێت.

پاشاکانی غەیرە عەرەب لەسەر مۆری ناوبراو شێوەی پەیکەری تایبەتیان لەدراوەکان دەدا هەرپاشاو بەپێی سەردەمەکەی خۆی ئێتر وێنە و شێوەی پەیکەرەی خۆی یان هەر گیاندارێکی سامناکیان لەسەر دروست دەکرد، ئەمەش تاوەکو کۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایانی غەیرە عەرەب بەردەوام بووە، بەڵام کاتێك ئیسلام هات بەهۆی سادەیی نەزانی و دەشتەکیەتەوە ئەم شتانەیان نەدەزانی و سەوداو مامەڵە لەنێوانیاندا بەگۆڕینەوەی کاڵاو کەرەسەتەکان بووە و، دینارو دیرهەمی ئێرانیان لەبەر دەستدابوو کەلەمامەڵەکانیاندا بۆ کێشانە بەکاریان دەهێنان. وەبەهۆیانەوە سەوداو مامەڵەیان بەشتەکانەوە دەکرد تائەوەبوو بەهۆی بێئاگایی دەوڵەتەوە دیرهەم و دیناری خراپ بڵاو بوویەوە و ئەندازەی غەل و غەش تێیاندا گەیشتە ئاستێکی بەربڵاو، بەپێی گێڕانەوەکانی سعیدی کوڕی موسەییب وەئەبو الزنادی عبدالملیك فەرمانی بەحەجاج کرد دیرهەمی سکە لێبدات و، دراوی باش و خراپ لەیەکتری جیا بکاتەوە و ئەم ڕووداوەش لەساڵی ٧٤ ی کۆچیدا ڕوویداوە و مەداینی گوتوویەتی ڕووداوی ناوبراو لەساڵی ٧٥ ی کۆچیدا ڕوویداوە.

ئەوکات عبدالملیك لەساڵی ٧٦ دا فەرمانیدا کەلەناوچەکانی تریشدا سکە لێبدەن و لەسەر سکەکان وشەی (الله احد الله الصمد)بنەخشێنن.

ئەوکات ئیبن هوبەیرە لەسەردەمی یەزیدی کوڕی عبدالملیك دا کرایە فەرمانڕەوای عێراق و لەپاڵفتەکردنی سکەو دراوەکاندا هەوڵێکی زۆریداو، لەدوای ئەویش خالیدی قەسری و لەپاش ئەویش یوسفی کوڕی عومەرو، یەکەمین کەسێکیش کەلەعێراقدا سکەی دینارو دیرهەمی لێداوە مصعبی کوڕی زوبەیر بووە کەلەساڵی ٧٥ ی کۆچیدا لەوکاتەی کەعبداللەی برای فەرمانڕەوای حیجاز بووە، بەفەرمانی ئەو ئەم کارەی ئەنجام داوە و فەرمانیشی کردووە لەڕوویەکی سکەکانەوە وشەی (برکەالله)، واتە فەڕو خێرو بێری خودا، وەلەڕوەکەی تریشی ناوی پیرۆزی (الله)بنوسرێت، بەڵام لەپاش یەك ساڵ حەجاج سککە ناوبراوەکانی گۆڕی و لەسەری نوسین (بسم الله الحجاج)واتە بەناوی خودای حەجاجەوە و، فەرمانی دا لەڕووی قەبارەو بارستاییەوە بەهەمان شێوەی سەردەمی عومەر بێت.

دەبێت ئەوە بزانین کەلەسەرەتای ئیسلامدا کێشی هەردیرهەمێك شەش دانیق بووە و کێشی هەرمسقاڵی یەك دیرهەم سێ لەسەر حەوتی دیرهەمێك بووە، هەربۆیە کێشی هەر دە دیرهەم بەرابەری حەوت مسقاڵ بووە. هۆکارەکەیشی بەم شێوەیە کەدیرهەمەکان لەسەر دەمی فەرمانڕەوایی ئێرانیەکاندا کێشەکانیان جیاواز بووە، هەروەك چۆن هەندێکیان بەکێشی مسقاڵ بیست قیرات و هەندێکیان دوازدە و هەندێکیش دە قیرات بووە و لەبەر ئەوەی لەڕووی دەرکردنی زەکاتەوە ناچار بوون ئەندازەیان دیاری بکەن، ئاستی مامناوەندیان لەسێ وە وەرگرت کەچواردە قیراتەو هەربۆیە هەرمسقاڵێك بەرابەر بوو بەیەك دیرهەم و سێ لەسەر حەوتی دیرهەمێك. وەدەڵێن دیرهەمەکان چەندین جۆریان هەبووە و وەك بغلی بەکێشی هەشت دانگ و تەبەری چوار دانگ و مەغریبی سێ دانگ و یەمەنی یەك دانگ بووە. هەربۆیە عومەر فەرمانیدا لەسەوداو مامەڵەکاندا زرترین لەبەر چاو بگرن و هەروەك چۆن بغلی و تەبەری بەسەر یەکەوە دەیکردە دوازدە دانگ

کەواتە هەردیرهەمێك بەرابەر كرا بەشەش دانگ و، ئەگەر بێت و سێ لەسەر حەوتی دیرهەمێکیشی بخەینە سەر دەکاتە یەك مسقاڵ وەئەگەر سێ لەسەر دەی مسقاڵ کەم بکەیتەوە دەکاتە دیرهەمێك. لەم ڕووەوە کاتێك عبدالملیك بڕیاریدا بەمەبەستی پاراستنی دیرهەم و دیناری بەنرخ لەمامەڵەی موسوڵماناندا غەل و غەشی سکەو دراوەکان نەهێڵێت، فەرمانی دا هەمان ئەندازە لەبەرچاو بگرن کەلەسەر دەمی عومەردا باوی هەبووە و فەرمانیشی دا مۆری ئاسنین ئامادە بکەن و لەبری شێوەی پەیکەرەو وێنەکان وشەگەلێك بنەخشێنن، چونکە قسەو ڕەوانبێژی لەدیار ترین مەبەستەکانی نەتەوەی عەرەبن، سەرەڕای ئەوەیش کەشەرع وێنەکێشانی قەدەغە کردبوو.

لەوە بەدواوە لەدەوڵەتی ئیسلامیدا ئەم جۆرە سکەیە بەکار دەهێنراو لێدەدرا و دینارو دیرهەمەکانی بەشێوەی خڕو بازنەیی دروست دەکران، لەسەر ڕوویەکی بەمەبەستی یەکتاپەرستی و شوکرانەبژێری ناوی خودا و صلوات دان لەسەر پێغەمبەرو هاوەڵانی لەسەر بوو، لەسەر ڕووەکەی تریشیەوە مێژوو ناوی خەلیفەیان دەنەخشاند، وەهەروەها لەسەردەمی عەباسی و عبیدیەکان (فاتمیەکان)و ئەمەویەکانی (ئەندەلوس)دا ئەم شێوازە باوو بەردەوام بوو، بەڵام صەنهاجە هەروەك ئیبن حەماد لەمێژووەکەی خۆیدا نوسیویەتی، بێجگە لەکۆتاییەکانی فەرمانڕەوایی خۆیاندا سککەیان لێنەداوە و تەنها لەم کاتەدا بوو کەمەنصوری خاوەن و سەرۆکی بجایە دەستی کردە لێدانی سککە و لەبەر ئەوەی کەدەوڵەتی مووەحیدان هاتە سەر دەور، لەو نەریتانەی کەمەهدی بڕیاری دابوو بۆیان لێدانی سککەی دینارو دیرهەم بەشێوەی چوار گۆشە بووە، بەڵام لەناوەڕاستیدا شێوەیەکی چوارگۆشەیان دەنەخشاند یەکێك لەدوو لاکەی بەوشەگەلێك کەماناپەخشی یەکتاپەرستی و ستایشی خودا بوون دەنەخشاند، لای دووهەمیشی چەند دێڕێك بەناوی مەهدی و خەلیفەکانی دوای ئەو نەخشێنرابوون.

مووەحیدانیش ئەم شێوازەی سککە و دراویان تاوەکو ئەم سەردەمەش پاراستبوو هەروەك دەیگێڕنەوە لەو نازناوانەی کەبەرلەدەرکەوتنی مەهدی ستایشی ئەویان

پێدەکرد، (خاوەنی دیرهەمی چوار گۆشە)بوو پێش بینی کەران بەرلەوەی دەسەلاَت بگرێتە دەست بەم نازناوەوە ناوزەدیان کردووەو لەکتێبەکانی پێشگۆیی کردنەکانیاندا (غەیب نامەکان)[351] هەواڵی دەسەلاَتەکەیان بەخەڵکی داوە، بەلاَم دراو سککەکانی خەڵکی خۆرهەلاَت لەم سەردەمەدا خاوەن کێشێکی نەگۆڕو دیاری کراو نین و، تەنها دینارو دیرهەم لەمامەڵەکانیاندا بەکار دەهێنن هەرچەندە ژمارەیان لەبری سنجە[352]بەکار هێناوە، کەئامێرێکە لەبری تەرازو شتەکانیان پێ هەڵسەنگاندووە لەسەر ڕووەکەیان وشەگەلێکی یەکتاپەرستی و درود بۆسەر پێغەمبەرو ناوی سوڵتانیان هەڵدەکوڵی هەروەك چۆن خەڵکی مەغریب ئەم شێوازەیان بەکار دەهێنا، ئەوەش تەقدیری خودای بەدەسەلاَت و دانایە.[353] وەئێستەش قسەکانمان لەبارەی سککەو دراوەوە بەباسکردنی حەقیقەتی دینارو دیرهەمی شەرعی و باسی ئەندازەی ڕاستەقینەیان کۆتایی پێ دەهێنین. حەقیقەتی شتەکەش ئەوەیە کەسککەو دراوەکانی دینارو دیرهەم لەڕووی ئەندازەو کێشەوە لەسەرزەوی و شارستانە جۆراو جۆرەکاندا جیاوازە و شەرع باسی کردوون و زۆرێك لەئەحکامەکانی وەك زەکات و نیکاح و حەدلێدان و نمونەی ئەمانە پەیوەستە بەدینارو دیرهەمەوە.

هەربۆیە دەبێت بەناچاریەوە بەهاو نرخیان لەشەرعدا دیاری بکرێت بۆ ئەوەی ئەو ئەحکامانەی کەپەیوەستە بەوانەوە بتوانین لەبەرامبەر دینارو دیرهەمە ناشەر عیەکانەوە جێبەجێیان بکەین. هەربۆیە دەبێت ئەوە بزانین کەلەسەرەتای ئیسلامو سەردەمی صەحابەو تابیعین دا ئیجماعی ئومەت لەسەر ئەوەبوو کەهەر دە دانەیان هاوکێشی حەوت

---

[351] ئەمەش تەرجەمەی ووشەی (ملاحم)کەمفرەدەکەی لەزاراوەدا بەمانای ڕوودلوی گەورەی پڕلەکوشتو کوشتار دەگەیەنێت هەروەك چۆن یەکێك لەنازناوەکانی پێغەمبەری ئیسلام (نبی الملحمە)بووە (اقرب الموارد)وەلەزاراوەی زانستەکانی ڕەمزو نیشانەدا ووشەی ملاحم بەو قەصیدانە دەڵێن کەتێیاندا ڕوودلوەکانی داهاتوو پێشگۆیی کرابن .

[352] ترازویەکەو بریتیە لەکێشێك کەکێشی شتەکانی پێ دیاری دەکەن وەك اوقیە و ڕەتڵ و (اقرب الموارد).

[353] (ذلك تَقديرُالعَزيزِ العَليم) س يس ئا ٣٨ .

مسقاڵ زێڕ بێت و هەر ئۆقیەیەکیش بەرابەری چل دیرهەم بێت، هەربۆیە هەر دیرهەمێك بەرابەرە بەحەوت لەسەر دەی دینارێك. وەکێشی یەك مسقاڵ زێڕی خالیص بەرابەرە بە حەفتاو دوو دەنکە جۆی مامناوەند، کەواتە دیرهەمێك کەبەرابەرە بەحەوت لەسەر دەی مسقاڵێك کەبەرابەرە بە پەنجا دەنك جۆو دوو لەسەر پێنجی دەنکە جۆیەك. هەموو ئەم ئەندازانەش بەئیجماعی زانایانی فیقهی سەلمێنراون. چونکە لەسەردەمی نەفامی (جاهلیەتدا)چەندین جۆری دیرهەم لەنێو نەتەوەی عەربدا سەوداو مامەڵەیان پێوە کراوە وەك دیرهەمی تەبەری کەپرپەهاترینیانە بەرابەرە بەهەشت دانگ و، بغلێکیش بەرابەرە بەچوار دانگ. هەربۆیە دیرهەمی شەرعی بەئاستێکی ناوەڕاستی ئەو دوانە دانراوە کەدەکاتە شەش دانگ هەربۆیە هەرسەد دیرهەمێك بغلێك و سەد دیرهەمی تەبەریدا پێنج دیرهەمی شەش دانگی زەکاتی دەکەوێت کەئاستی مام ناوەندی هەردوو دیرهەمی هەشت دانگی و چوار دانگیە.

خەڵکی لەم بارەیەوە جیاوازیان تێکەوت کەئایا ئەم تەعدیل و تەقدیرەی کەعبد الملیك دایناوە هەروەك باسمانکرد بەهۆی ئیجماعی خەڵکیەوە بەردەوام کاری پێکراوە. ئەم قسەیەش خەتابی[٣٥٤] لەکتێبی (معالم السنن)و ماوەردی لە (احکام السلطانیة)دا باسیان کردووە، بەڵام لێکۆڵەرەوانی دواتر گوتەکەی ئەمانیان ڕەت کردووەتەوە چونکە پێویستە کەبەهاو کێشی دیرهەم و دیناری شەرعی لەسەردەمی صەحابەو لەپاش ئەوانیش نادیار بێت ئەمەلەکاتێکدایە هەروەك باسمانکرد زۆرێك لەمافەشەرعیەکان لەزەکات و نیکاح و حەد لێدان و نمونەی ئەمانەدا وابەستە بووە بەو دوانەوە. وەحەقیقەتی بابەتەکەئەمەیە کەبەهای دیرهەم و دینار لەوسەردەمەدا ئاشکرابووە لەبەر ئەوەی حوکمە پەیوەستەکان بەوانەوە لەو سەردەمەدا بەردەوامیان هەبووە و، بەڵام ئەندازەی ئەو دوانە لەدەرەوەدا نادیار بووە و کەس بەهاکەیانی نەزانیوە هەرچەندە

---

[٣٥٤] ئەبو سلیمان حمد یان احمدی بستی خەتابی لەفەقیە و موحەدیس و ئەدیبەگەورەکانی سەردەمی خۆی بووە لەبەڵخدا ژیاوە و لەساڵی ٣٨٨ ك کەبەرابەرە بە ٩٩٨ ز دا کۆچی دوایی کردووە (لغتنامەی دهخدا).

بەپێی حوکمی شەرعی بەهای ناوبراو بڕیاری لێدراوە و کاریشی پێکراوە تائەوکاتەی دەوڵەتی ئیسلامی گەورە بووە و، ئەوکات پێویستی وایکرد کەبەهاو کێشیان بەپێی پێوەری بنەما شەرعیەکان لەهەموو جێگەیەکدا دیاری بکرێت بۆ ئەوەی لەهەموو شوێنە جیاوازەکاندا لەناڕەحەتی دیاری کردنیان ڕزگاریان بێت، ئەم بارودۆخەش هاوکات بووە لەگەڵ سەردەمی خەلافەتی عبدالملیکدا و هەربۆیە ئەو بەهاو ئەندازەکەیانی بەپێی ئەوەی کەلەبیرو هۆشی خەڵکیدا دیار بووەو لەدەرەوەش دیاری کردوو فەرمانی دا لەسەر دراوو سککەکانیش ناوی ئەوو مێژووەکەی لەدوای (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) کەنیشانەی باوەڕی موسوڵمانانە بنەخشێنرێت. سککەکانی سەردەمی جاهیلیەتی بەتەواوی خستە لاوە و لەزەراب خانەو کارگەی دراوە ئیسلامیەکاندا تواندەوەو کانزا بەنرخەکانی لێ جیاکردنەوەو سەرلەنوێ بەپێی دینارو دیرهەمی ئیسلامی داڕشتنەوەو سککەی لێدا.

ئەمەش ئەو حەقیقەتەیە کەبەهیچ شێوەیەك ناتوانین لێی لابدەین. لەپاش ماوەیەك بەرپرسانی بواری دراوی دەوڵەتان ڕێگەگەلێکی تریان گرتە بەرو ئەندازەو بەهای دیرهەمو دیناریان وەلا ناو، لەهەر ناوچەیەکدا دراوی جۆراوجۆر بەبەهاو نرخی جیاوازو نەخش و نیگارەوە لێدران و ناچار بوون بەهاکەیان وەك سەردەمی ئیسلام تەنها لەبیرو هۆشیاندا وەربگرن و، لەڕێگەی پێوانەکردنی دراوی خۆیان لەڕوانگەی شەرعەوە بەدراوی سەردەمی ئیسلام پێوانە بکەن و نرخەکانیان دەزانی. وەئەوەی کەلەبارەی کێشی دینارەوە باسمانکرد و گوتمان بەرابەرە لەگەڵ حەفتاو دوو دەنکە جۆی مامناوەنددا قسەیەکە کەلێکۆڵەرەوان گێڕاویانەتەوە و ئیجماعی لەسەر کراوە بێجگەلەوەی کەئیبن حەزم [٣٥٥] دژی ئەم بۆچوونە بووە و، پێی وابووە کەکێشی دینار بەرابەر بووە لەگەڵ

---

[٣٥٥] ئەبومحمد بن احمد بن سعید بن حزمی ئەمەوی ئەندەلوسی ئەصڵ و نەسەبی لەفارس و لەفەقیهە بەناوبانگەکانە کەلەفیقە و حەدیس و ئەدەبدا چوارسەد دانراوی هەبووە، وەك جەمهرت الانساب و نمونەی ئەمانە ئەم زاتە لەساڵی ٣٨٤ ك لەدایك بووە و لەساڵی ٤٥٦ ك (١٠٦٤ز)دوونیای بەجێهێشتووە(لغتنامەی دهخدا).

هەشتاو چوار دانە دەنکی جۆدا و ئەم بۆچوونەش قازی عبدالحق[٣٥٦] لەوەوە گێڕاویەتیەوە، بەڵام لێکۆڵەرەوان ڕەتیان کردوەتەوەو بۆچونەکەی ئەویان بەهەڵە ئەژمار کردووە بۆچوونەکەی ئەوان ڕاستە. خوداش حەق و ڕاستی بەوشەکانی خۆی سەلماندووە.[٣٥٧] وەهەروەها ئەوەش ئاشکرایە کەئەوقیە شەرعیەکان جیایە لەو ئەوقیانەی کەلەنێو خەڵکیدا کاریان پێدەکرێت، چونکە ئەوقیەی دووەم لەهەر سەرزەوی‌و وولاتێکدا جیاوازە، بەڵام ئەوقیەی شەرعی بەشێوەیەکی زەینی یەکسانن و هیچ جیاوازیەکی تێنەکەوتووە. خوداش هەموو شتێکی بەشێوەیەکی باش ئەندازەگیری کردووە.[٣٥٨]

ئەنگوستیلە یان مۆر: بەڵام پارێزگاری لەمۆر یان ئەنگوستیلە لەپلەو پایەکانی پاشاو دەوڵەتداریەو مۆرکردنی بەرنامەو چەکەکان لەلایەن پاشاکانی بەرلەئیسلام و دوای ئیسلامیش بەناوبانگ و ناسراوە. وەلەصەحیحەیندا هاتووە کەپێغەمبەر (ص)دەیویست نامەیەك بۆ قەیصەر بنێرێت و هاوەڵان پێیان گووت ئەی پێغەمبەری خودا خەڵکانی غەیرە عەرەب نامەی مۆر نەکراو ناخوێننەوە، هەربۆیە پێغەمبەر ئەنگوستیلەیەکی لەسیم هەڵبژاردو لەسەر نقێمەکەی (محمد رسول الله)ی نەخشاند، بوخاری دەڵێت: هەرسێ وشەی نابراویان لەسێ دێڕدا نوسی و نامەکەی پێ مۆر کرد. وەهەروەها دەڵێت: هیچ کەس وەك ئەو نەخشی ئەنگوستیلەی نەکردبوو. وەئەبوبەکرو عومەرو عوسمان هەریەکەیان لەسەردەمی خەلافەتی خۆیدا لەدەستیان کرد، بەڵام لەپاش ماوەیەك ئەنگوستیلەی ناوبراو لەدەستی عوسماندا کەوتە ناوچاڵی ئەریسەوە[٣٥٩]. ئەوچاڵەش

---

[٣٥٦] ابومحمد عبدالحق بن ابی بکر کوڕی ابن عەتیە لەفیقە و حەدیس و تەفسیرو نەحودا(قەواعیدی زمانی عەرەبی)لێهاتوویەکی زۆری هەبووە، لەساڵی ٥٢٩ دا پلەی قەزای المریەی هەبووە و تەفسیری بەناوبانگی الوجیز هی ئەوە و لەساڵی ٤٨١ لەدایك بووە و لەساڵی ٥٤٦ کۆچی دوایی کردووە (لغتنامەی دهخدا).

[٣٥٧] (وَاللهُ يُحِقَ الحَقَ بِكَلِمَاتِهِ) س الانفال ئا ٧ .

[٣٥٨] (خَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقدِيرًا) س الفرقان ئا ٢ .

[٣٥٩] چاڵێکە لەمەدینە لەنزیك مزگەوتی قوبائەوە. (منتهی الارب)

ئاوێکی زۆری هەبوو بنەکەی دیارنەبوو هەربۆیە عوسمان زۆر خەمبار بوو بەنەهامەتی دایە قەڵەم و مۆرێکی تری لەو شێوەیە دروستکرد.

وەلەچۆنیەتی ئەم ئەنگوستیلەمۆریەدا و مۆر کردن پێی چەند ڕوویەکی هەیە چونکە ئەنگوستیلە بەوخشڵە دەڵێن کەلەدەست دەکرێت و، وشەی (تختم)بەمانای لەپەنجە کردنی ئەنگوستیلەیەك لەهەمان زنجیرەیە، وەهەروەها ئەنگوستیلە مانای کۆتایهاتنیش دەگەیەنێت هەروەك دەڵێن (ختمت الامر)، واتە: کارەکەم بەکۆتا گەیاند و قورئانم خەتم کرد یان خاتەمی پێغەمبەران وەیان خاتیمەی کارەکانیش لەم جۆرە مانایانەیە. وەئەم وشەیەش بەو شتەدەگووترێت کەدەم و سەری شتەکانی پێدادەخەن و دەیبەستن و لەم مانایەدا پێی دەڵێن (ختام)وە فەرمودەکەی خودای گەورەش کەدەفەرمێت (خیتام و کۆتاییەکەی میسکە)[٣٦٠] هەرلەم مانایەیەو ئەوکەسەیشی کەوشەی ختامی بەکۆتایی ماناکردووە دەڵێن کەکۆتا شتێك کەلەشەرابەکەیاندا دەیبیستن بۆنی میسکە بەهەڵەدا چووەو مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە نیە، بەڵکو مەبەست ئەو کۆتاییە کەهاومانای سەربەندە چونکە بۆپاراستنی شەراب سەربەندێك لەگڵ یان قیر دەخەنە سەری و بۆن و تامی خۆش دەکات.

هەربۆیە لەم ئایەتەدا موبالەغە لەباسی شەرابی بەهەشتدا کراوە، واتە سەری کوپەکەی لەمیسکە و لەوەی دونیا کەگڵ و قیر دراوە لەسەرەکەی تام و بۆنی خۆشترە. وەهەرکات دروست بێت کەووشەی خاتم لەهەموو ئەم مانایانەدا بەکار بهێنرێت ناوزەدکردنەکەی بەم شتانەوەو ئەو کاریگەریەی کەلەوەوە بەدی دێت ڕاست دەردەچێت، بەدەستەواژەیەکی تر هەرکات لەسەر ڕووی ئەنگوستیلە وشە یان شێوە بنەخشێنن و لەپاشان بیخەنە ناو تێکەڵەیەك لەخۆڵەمێش و خاکی ڕەشەوەو دواتر بیدەن لەپەڕە کاغەزێکی سپی شوێنەواری وشە یان شێوەکان لەسەر کاغەزەکە بەڕوونی دەردەکەون. وەهەروەها ئەگەر بیدەن لەتەنێکی نەرمی چنراولە موو دەبینین بەهەمان

---

[٣٦٠] (خِتَامُهُ مِسكٌ) س المطففين ئا ٢٦.

شێوە وشەو شێوەکان دەردەکەون چونکە ئەگەربێتو وشەکان لەلای ڕاستەوە نەخشێنرابن ئەوا لەلای چەپەوە دەخوێنرێنەوە وەبەپێچەوانەشەوە، چونکە نوسراوو شێوەکانی سەرئەو مۆرو ئەنگوستیلەیە بەپێچەوانەوە دەردەکەون وەیان لەوانەیە مرەکەبی ئەم مۆرکردنە لەگڵ و تێکەڵەیەکی ڕەنگدارو لێدانی لەسەر لاپەڕەکە و دەرچوونی نوسراوو نەخشی مۆرو ئەنگوستیلەکە لەسەر کاغەزەکە بنوێنێت. بەدەستەواژەیەکی تر مۆر مانای ڕاستیەتی و نفوز دەگەیەنێت و بەو مانایە کەئەم نیشانە کارکردن بەنامەکە تەواو دەکاتو، ئەگەر نیشانەی ناوبراو واتە مۆرەکە لەکۆتایی نامەکەوە نەبێت ئەوا ئەو نامەیە بێ ماناو هەڵوەشاوەیە. وەهەندێك جاریش ئەم مۆر کردنە بەهۆی خەتەوە لەسەرەتا یان کۆتایی نامەکەوە وەك ناردنی سڵاوو درود بۆسەر سوڵتان و ئەمیر یان کەسی پەیوەندیدار، یان هەندێك لەنازناوەکانی باس دەکەن و ئەم خەتانەش مانای ڕاست و دروستی نامەکە دەگەیەنێت و لەنەریتی نوسەری نامەکاندا بە (نیشانە)ناسراوە و، وەك چواندنیش بەنوسینی سەر مۆرەکانەوە هەندێك جاریش پێی دەڵێن خاتم یان ئەنگوستیلە.

وە خاتەم یان ئەو نیشانەیەی کەدادوەر بۆ خاوەن دەعواکان دەیان نێرێت و ئەو هێڵەی کەفەرمانکانی پێیان جێبەجێ دەکات، وەك هەمان مانای مۆر وایە و خاتەمی سوڵتان یان خەلیفە واتە نیشانەی ئەو کەهەر ئەم مانایە دەگەیەنێت. ڕەشید کاتێك بڕیاریدا جەعفەر لەبری فەزڵی باوکی بکاتە وەزیر بەیەحیای کوڕی خالدی باوکیانی گووت: باوکی من، بڕیارم داوە کەمۆرو ئەنگوستیلەکەم لەدەستی ڕاستمەوە بکەمە دەستی چەپم. ئەو مۆری وەك مەجاز لەبری وەزارەت بەکارهێنا، چونکە نیشانەدانان لەسەر نامەو چەکەکان لەوسەردەمەدا لەئەرکی وەزارەتو پێگەی وەزارەت بووە بەڵگەش لەسەر ڕاستیەتی مانای خاتەم ومۆر بەم مانایە شتێکی بابەتیە کەتەبەریش بەم شێوەیە گێڕاویەتیەوە: موعاویە کاتێك بەمەبەستی ئاشتی کردن لەگەڵ حسن دا نەرمی دەنواند نامەیەکی سپی کەهیچی لەسەر نەنوسرابوو بۆ حسن ناردو کۆتاییەکەی مۆر

کردو لەنامەیەکی تری هاوپێچی نامە خاڵیەکەدا بۆی نوسی کە هەرچیەکت پێخۆشە لەداواکاری و مەرج بەدڵی خۆت بینوسە. مانای خەتم لێرەدا بەو نیشانەیە دەگوترێت کەلەکۆتایی نامەکانەوە دادەنرێت. لەوانەیە مۆرەکە لەسەر تەنێکی نەرم بدەن بۆئەوەی پیتەکان دەربچن و لەشوێنی پێچانەوەی نامەکەدا لەوکاتەی کەدایبخەن دەیدەن لەشوێنی داخستنەکە. ئەمەش مانای سەربەست و سەرمۆری نامەیە و هەموویان بەمانای خاتمە یان کۆتایی دێن، بەلام بەخاتم و ئەنگو ستیلەیان گوتووە.

یەکەمین کەسێکیش کەمۆری لەسەر نامەدانا موعاویە بوو، چونکە جارێکیان نامەیەکی مۆر نەکراوی نارد بۆ زیاد والی کوفە کەسەدهەزار دیرهەم بدات بەعەمری کوڕی زوبەیر و ئەویش لەڕێگەدا لەبەر ئەوەی مۆری پێوە نەبوو سەدهەزارەکەی گۆڕی و کردیە دووسەد هەزار بەژمارەو نوسین. ئەوکات زیادیش حیسابەکەی ناردەلای موعاویە، بەلام موعاویە ئینکاری کردو باوەڕی بەو کارەی عەمر نەکرد و لەئەنجامدا بۆی دەرکەوت و خستیە زیندانەوە و، داوای سەدهەزارەکەی تری لەعەمرکردولەبەر ئەوەی ناوبراو لەزینداندابوو لەعبداللەی برای سەندەوە. هەربۆیە موعاویە دوای ئەو ڕووداوە مۆری تایبەتی خۆی خستەسەر نوسراوو نامەکانی. ئەم بەسەرهاتەش تەبەری گێڕاویەتیەوە و لەکۆتاییەکەشیدا دەڵێت: لەدیوانیشدا کەسێکی بۆ داخستن و خەتمی نامەکان دیاری کرد، ئەمە لەکاتێکدا تائەو کاتە نامەکانیان بەتوندی نەدەپێچایەوە، بەواتایەکی تر شێوازێکی بۆنامەکان داهێنا و، وای لێکردن بەتوندی بیپێچرێنەوە. دیوانی خاتەمیش بریتین لەکۆمەڵێك کەبەرپرسیار لەناردنی نامەکانی سوڵتان و مۆرکردنیان بەهۆی نیشانەدانان لەسەریان یان پێچانەوە و سەربەستنیان.

وەهەندێك جار دیوان بەشوێنی دانیشتنی ئەو نوسەرانە دەگوترێت، هەروەك چۆن لەباسی دیوانی وەرگرتنی باجدا باسمانکرد. بەستن و داخستنی نامەکان بەدوو شێوە دەبێت: یان بەهۆی دەقکردن و پێچانەوەی نامەکەو لەپاشان کون تێکردنی نامەکە بەپێچراوەیی ئەمەش بۆئەوەی لەکاتی کردنەوەی بەرلەوەی بگاتە شوێنی مەبەست پێی

بزانن، هەروەك چۆن لەنێو نوسەرانی نامەلە مەغریبدا باوە. یان لەڕێگەی لکاندنی سەری لاپەڕەکەوە بەو بەشەی کەدەقی دەکەن، هەروەك چۆن لەنێو نوسەری نامەکاندا لەخۆرهەلاتدا باوەو کاری پێدەکرێت. وەهەندێك جار لەشوێنی لکاندن نیشانەیەك دادەنێن تاوەکو بەهۆیەوە دڵنیاببنەوە کەهیچ کەسێك نامەکە نەکاتەوە و نایخوێنێتەوە، هەروەك چۆن خەڵکی مەغریب لەڕووی دەمی نامەکەوە مۆمیان دەلکاند پێیەوە و بەئەنگو ستیلەیەك کەمۆری لەسەر بووە مۆریان کردووە و، لەئەنجامدا نیشانەی ناوبراو لەسەر مۆمەکە دەردەکەوت. وەشێوازی دەوڵەتە کۆنەکانی خۆرهەلاتیش بەم شێوەیە بووە کەلەسەر شوێنی لکاندنی نامەکە مۆریان لێداوە و لەسەر ئەو مۆرە نیشانەگەلێکی لەسەر هەڵدەکۆڵرا لەخاکی سور کەتێکەڵەیەك بوو بۆ ئەم مەبەستە ئامادە دەکرا و، مۆرەکەیان دەخستەناویەوەو دواتر دەمی نامەکەیان پێ مۆر دەکردو نیشانە ناو براوەکانی لەسەر دەردەکەوت. ئەم گڵ و خاکەش لەدەوڵەتی عەباسیدا پێیان دەگووت (قوڕی مۆر)ولەشاری سیرافەوە[٣٦١] لەناو توێشەبەرەدادەیانهێنا، وادیارە گڵی ناوبراویان لەشارێکی کەنار کەنداوی عەربیەوە هێناوە.

کەواتە ئەم مۆرە کەبریتی بووە لەهەمان نیشانەی نوسین یان هەڵکۆڵراو بۆ توند کردنو بەستنی نامەکانە و تایبەتە بەدیوانی نامەکانەوە و، وەزیفەی ناوبراو لەدەوڵەتی عەباسیدا تایبەت بووە بە وەزیرەوە. دواتر لەڕوانگەی داب و نەریتەوە ئەم شێوازە گۆڕاو دەوڵەتەکان ئەوکارەیان تایبەت کرد بەوکەسانەوە کە کاروباری ناردنی نامەکان و دیوانی نوسەرەکانیان لەئەستۆدا بووە. ئەوکات لەدەوڵەتانی مەغریبدا ئەنگوستیلەیان بەیەکێك لەنیشانەکانی پاشایەتی و سەڵتەنەت زانیوە، هەربۆیە ئەنگوستیلەیان لەزێڕو زیوو بەجوانترین شێوە دروستکردووە و بەیاقوت و فیروزە و زمروت دەڕازێنرایەوە. وەبەپێی نەریت و ڕێوڕەسمەکانی ئەو سەرزەمینە سوڵتان وەك نیشانەیەکی تایبەتی سەڵتەنەت بەکاری هێناوەو کردویەتیە پەنجەی، هەروەك چۆن لەدەوڵەتی عەباسیدا عەباو داری

---

[٣٦١] شارێکە لەنزیك کەنداوی فارس و زۆر گەرمە خاوەنی حدود العالم بەبارەگای پارسی داوەتەقەڵەم (منجد).

دەست باوبووە و، لەدەوڵەتی عبیدیەکان (فاتمیەکان)سایبان یان شادروان لەنیشانەکانی تایبەتی سوڵتان بووە، خوداش هەڵسوڕێنەری کارو بارەکانە.

**نیگاری سەر پارچە پەڕۆکان:** یەکێکی تر لەنیشانەکانی شان و شکۆو گەورەیی پاشاو سوڵتان و ئەوشێوازانەی کەلەدەوڵەتەکاندا پەیڕەو دەکرێت، ئەوەیە کەئەوناو یان نیشانانەی کەتایبەتن بەوانەوە لەپارچە پەڕۆدا دەنوسن و ئەو پارچانەش لەئاوریشم چنراون و ئامادەیان دەکەن بۆ نوسین لەسەریان و بە دەزوو بەکرەی تایبەتی ڕەنگاو ڕەنگ، نوسینی سەر پارچەپەڕۆکان دەچنن بەجۆرێك کەلەناو ڕەنگی پارچەپەڕۆکەدا دیار بن و، بەرگدروەکان بەشێوەیەکی زۆر هونەرمەندانە ئەم کارە ئەنجام دەدەن و دەیانڕازێننەوە و پارچە شاهانەکان بەم شێوازە لەناو جل و بەرگەکانی تردا زۆر جوان و بەشان و شکۆ دەردەکەون، بەتایبەت لەو کاتانەی کەپاشاو سوڵتانەکان لەبەریان دەکەن و کاتێکیش سوڵتان بیویستایە دیاریەکی بەهادار ببەخشێتە کەسێك ئەوا ئەو جل و بەرگو پارچەڕازاوانەی پێ دەبەخشین، ئەمەش وەك ڕێزێك بۆئەوکەسە یان وەك دیاری کردنی کەسێك بۆ پۆستێکی دەوڵەتی.

پاشا غەیرە عەرەبەکانی پێش ئیسلام ئەم جۆرە جلوبەرگ و پارچە نەخشێنراوانەیان لەسەر ئەو نیشانەو شێوە و وێنانەی کەخۆیان دەیانویست فەرمانیان دەکردو، بەرگدروو هونەرمەندە بەتواناکان بۆیان دەچنین و دەیاننەخشاند بۆیان، بەڵام پاشاکانی ئیسلام لەبری ئەو شێوازانە ناوی خۆیان بەوشەگەلێکی ترەوە کەمانای بەخت یان درود وسلاوو دوعا دەگەیاند دەنوسیو، دەنەخشاند ئەم نەریتەش لەدەوڵەتی ئەمەوی و عەباسیەکاندا لەبەناوبانگترینی ئەوکارانەیە کەلەگەڵ ڕێزو گەورەیدا ئاوێتە بوون دەژمێردرا، وەئەو خانوانەی کەلە کۆشکەکانیاندا تایبەتیان کردبوو بەدورینی ئەم جل و بەرگ و پارچانەوە پێیان دەگووت (دار الطراز)، واتە: خانووی بەرگدورین و دیزاین وەئەو کەسانەیشی کەبەرپرسیاریە تی ئەم شوێنانەیان لەئەستۆدا بووە پێیان گووتراوە (صاحب الطراز)، واتە خاوەن و بەرپرسی بەرگدروو دیزاین. ئەم بەرپرسەش کاروبارەکانی

دورین و دیزاین‌و نەخش و نیگاری جل و بەرگەناوبراوەکان و دابین کردنی مووچەی کارمەندانی ئەم شوێنانە و چاودێری کردنی کاروبارەکانیان لەئەستۆدابوو، ئەم ئەرکەش بەمەوالی و کەسە تایبەتەمتمانە پێکراوەکانی دەوڵەت دەسپێردرا.

لەدەوڵەتی بەنی ئومەییەی ئەندەلوس و ملوك التوایف لەدوای ئەمان و دەوڵەتی عبیدیەکان (فاتمیەکان)ی میسرو، پاشاکانی تری غەیرە عەرەب لەخۆر هەلأت کەهاوچەرخی ئەوان بوون بەهەمان شێوە بووە. دواتر لەبەر ئەوەی کە بازنەی سەروەت‌و نازو نیعمەت وهونەر لەدەوڵەتەکاندا بەرتەسك و سنورداربوویەوە، چونکە لەئەندازەو فراوانی خاکەکەیان کەم بوویەوەو چەندین دەوڵەتی سەربەخۆی جۆراو جۆر هاتنە ئاراوە، هەربۆیە ئەرکی ئەم پێگەیە لەزۆربەی دەوڵەتەکاندا لەناو چوو چونکە لەسەرەتای سەدەی شەشەمدا دەوڵەتی مووەحیدان لەپاش ئەمەویەکان لەمەغریبدا گەشتنە دەسەلأت و، ئەم شێوەیان خستە لاوە چونکە ئەوان زۆر سادە بوون و دینداریان دەکردو، ئەم سیفەتانەشیان لەپێشەواکەیانەوە محمدی کوڕی تومرتەوە وەرگرتبوو. خۆیان لەپۆشینی جل و بەرگی ئاوریشم و زرق و برقدا بەدوور دەگرت.

هەربۆیە پلەی ناوبراویان لەپێکهاتەی دەوڵەتەکەیاندا دانەمەزراند، هەرچەندە جێنشینانی ئەمان لەکۆتایی دەوڵەتەکەدا لێرەو لەوێ دایان مەزراند، بەلأم نەگەیشتە ئەو قۆناغە لەشکۆو ناوبانگی دەوڵەتانی پێش خۆیان، بەلأم لەم سەر دەمەداو لەدەوڵەتی مەرینی مەغریب کەلەسەرەتای لاویەتی و هێزدایە داب و نەریت و شێوەی لەم شێوەیەمان بینی، کەلەدەوڵەتی هاوچەرخی خۆیانەوە ئیبن ئەحمەر لەئەندەلوس وەریان گرتبوو، ئیبن ئەحمەریش لەم شێوازەیدا چاولێکەری لەملوك التوایف دەکرد بەتێڕوانینێکی خێرا شوێنیان کەوتبوو، بەلأم دەوڵەتی تورکی میسرو شام لەم سەردەمەدا لەگەڵ گونجانی فراوانی وولأت‌و ئاوەدانی و شارستانیەتدا ئەوشارانەی کەلەژێر دەسەلأتیاندایە لەڕووی نەخش‌و، نیگاری پارچە ڕەنگاو ڕەنگەکانەوە وەك دەریایەکی فراوانن، بەلأم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەم پارچانە لەکۆشك و ماڵەکانیاندا

دروست ناکەن و، وەك پلەیەکی دەوڵەتی حیسابیان ناکەن بەڵکو ئەوەی کەدەوڵەت لەم پارچانە پێویستی پێیان دەبێت، پیشەوەران لەئاوریشم و زێڕی خالص دەیاندوورن و دروستیان دەکەن. وەپێیان دەڵێن زەرکەش کەوشەیەکی فارسیەو ناوی سوڵتان یان ئەمیریان لەسەر دەدورن و بەرگدروەکان و پیشەوەران، ئەم کارە بەیەکێك لەپیشە جوانو، سەرنج ڕاکێشەکانی دەوڵەتی کەزۆربەجوانیان دەزانن و ئامادەیان دەکەن. خوداش ئەندازەگیری شەوو ڕۆژە وباشترینی میراتگرەکانەو بێجگەلەویش خودایەکی ترنیە.

**دەوار و پەردە سەراکان:** ئەمەش بریتیە لەو شوێنەی کەسوڵتان لەگەڵ وەزیرو خەڵکانی تردا کۆدەبێتەوە و، لەنێوان سوڵتان و ئەوانی تردا پەردەیەك هەیە و ئەمەش یەکێك بووە لەنیشانەکانی دەوڵەتداری و هۆکارەکانی شان و شکۆو جوانکاری کەلەو سەردەمەدا باوی هەبووە و، زیاتریش لەکاتی سەفەر و گەشتەکاندا خەڵکی بەکاریان هێناون بەزۆریش لەپەموو خوری مووی حەیوانات چنراون. هەردەوڵەتێکیش بەپێی تواناو بوونی خەڵکانی هونەرمەند لەو بوارەدا ئەم دەوارانەیان دوریوە ئیتر چ لەڕووی قەبارەو چ لەڕووی ڕەنگ و شێوازەوە. دەوڵەتەکان بەرلەوەی بگەنە دەسەلاَت و دەوڵەتداری لەنێو ئەو دەوارانەدا ژیاون. هەروەك چۆن عەرەب لەسەردەمی زودا خەلیفەکانی بەنی ئومەییە لەهەمان ئەو دەوارو خێمانەدا دەژیان کەلەخوری و موو چنرابوون، چونکە لەسەر دەمەدا بێجگە لەهەندێك نەبێت زۆربەی هۆزە عەرەبەکان دەشتەکی بوونو ژیانی دەوار و خێمەنشینیان هەبووە و، لەکاتی خۆئامادەکردنیشیاندا بۆ جەنگ لەگەڵ تیرەو هۆزە هاوپەیمانەکانیاندا کەژاوەیان بەسەر حوشترەکانیانەوە لەو خێمە چنراوانە هەڵدەدا و بەکۆمەڵ کۆچیان دەکرد و، تائێستەش عەرەب بەم شێوەیە دەژین و لەشکرەکانیان بەم هۆیەوە بەشێوەیەکی فراوان بلاَو دەبنەوە و هەرهۆزەو لەبەرچاوی ئەویتر دیارنەبووە هەروەك چۆن عەرەب بەم شێوەیە دەژین.

هەربۆیە عبدالملیك لەوكاتەی كەسوپاكەی بەڕێكەوت پێویستی بەوە هەبوو كە ساقە واتە كەسانێك بنێرێت بۆئەوەی سۆراخی ئەوانە دواوەی سوپاكەی بزانێت و خەڵكی هان بدەن بۆپەیڕەوی كردن لەلەشكرەكەی و وایان لێبكەن واز لەدانیشتن بهێنن، دەڵێن گوایە لەوكاتەی ڕوحی كوڕی زنباع لەبارەی حەجاجەوە قسەی لەگەڵ عبدالملیك كردو عبدالملیكیش حەجاجی بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژارد و، چیرۆكی حەجاج و ڕووح بەناوبانگە كاتێك حەجاج دەوارو پەردەسەراكانی ڕووح لەسەرەتای بەرپرسیاریەتی ئەم پلەیەوە ڕوویانداوە، چونكە ئەو لەوكاتەی كە بینی لەڕۆژی جوڵەی عبدالملیك ڕووح و هاوڕێیانی دانیشتوونو ناجوڵێن فەرمانی دا كەدەوارو پەردەسەراكانیان بسوتێنن، ئەم كارەش ئەوەی نیشاندا كەحەجاج خاوەنی عەصەبیەتێكی زۆر و بەهێزە چونكە لەو سەردەمەدا ئەوەی عەصەبیەتێكی بەهێزی نەبوایە بەهیچ شێوەیەك نەیدەتوانی ئەو كارە بكات، هەربۆیە عبدالملیك حەجاجی بۆ ئەم پلەیە هەڵبژاردبوو لەم كارەشدا بەهۆی دڵێری عەصەبیەتە بەهێزەكەیەوە باوەڕی پێی هەبوو.

وەلەبەر ئەوەی دەوڵەتی عەرەب خوویان بەجۆرەكانی شارنشینی و نازو نیعمەتەوە گرت و عەرەبەكان لەشارەكاندا ژیان و پەروەردەكردنی حوشتر و سواریان خستە لاوە و، سەرقاڵی بەخێو كردنی ئەسپ و سواریەكەیان بوون و لەكاتی شەڕەكاندا لەبری دەواری لەموو چنراو پارچەی كەتانیان بەكاردەهێنا بۆ ئەو مەبەستە و خەڵكی مەغریب پێیان دەگووتن ئەفراك. ئەم پەردەسەرایە لەمەغریبدا تەنها تایبەتە بەسوڵتانەوە، بەڵام لەخۆرهەڵاتدا هەرئەمیرێك هەرچەندە پلەیشی زۆر لەسوڵتان نزمتریش بێت بەكاری دەهێنێت. دواتر خۆشگوزەرانی وایلێكردن كەلەكاتی جەنگەكاندا ژنو منداڵەكانیان لەكۆشكو تەلارەكانیاندا بهێڵنەوە و نەیانبەن بۆ جەنگ. ئەوكات سوپاكەیان كۆكراوە تربوو ماوەی نێوانیان زۆر كەم بوو جەمو جۆر تر بوونو سوڵتان زۆر نزیك بوو لەسوپاكەیەوەو بەچاو هەموویان دەبینران. بەهۆی ڕەنگاو ڕەنگی خێمەو پەردەسەراكانەوە دیمەنێكی جوانی دروستكردبوو.

ئەم شتە شان بەشانی نەریتەکانی تری خۆشگوزەرانی بەردەوام بوو. وەهەروەها دەوڵەتی مووەحیدان و زناتە کەنزیکن لێمانەوە لەسەرەتاداو لەکاتی گەشتکردندا هەمان ئەو دەوارو خێمانەیان بەکار دەهێنا، کە بەر لەگەشتنیشیان بەسەڵتەنەت بەکاریان دەهێنان و تێیاندا دەژیان، بەڵام هەرئەوەندە دەوڵەتەکەیان ڕووی کردە خۆشگوزەرانیو جوانکاری خوازی دەستیانکردە دروستکردنی کۆشك و تەلارو گەشتنە قۆناغێك پێشتر لەوەی کەدەیانویست، بەجۆرێك بەرزترین پلەی جوانخوازی و هێزیان نیشان دەدا، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کەلەشکرەکان بەهۆی ئەم پەردەسەرایانەوە زۆربەیان هەمیشە بێدارن چونکە دەنگی یەکتری دەبیستن و بەباشی پشوو نادەن و لەبەر ئەوەی کەژن و منداڵ و خانەدانەکانیان لەگەڵدانیە کەبۆپاراستنیان گیانیان فیدابکەن، دەبینین فیداکاری پێویست ناکەن، هەربۆیە دەبێت بۆ پاسەوانی ئەم جۆرە لەشکرگایانە ڕێوشوێنی تر بگیرێتە بەر، هەروەك چۆن لەداهاتوودا باسی دەکەین، خوداش بەتوانای زاڵ و سەرکەوتووە.[٣٦٢]

مقصورە[٣٦٣] بۆنوێژ و دوعاکردن لەکاتی خوێندنەوەی ووتاری هەینیدا: ئەم دوانەش لەوشتانەن کەتایبەتن بەکاروبارەکانی خەلافەت و نیشانەی دەوڵەتی ئیسلامین و بێجگە لەم وولآتانەدا لەشوێنانی تر نەبینراوە، بەڵام (بيت المقصورە)تایبەتە بەنوێژی سوڵتانەوە و هەروەك چۆن دیوارێك بەدەوری میحرابەکەدا دەکێشن کەمیحراب و هەندێك لەدەوروبەری میحرابەکەش دادەپۆشێت و دیاری دەکات. یەکەمین کەسێك کەمەقصورەی هەڵبژارد موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان بووە لەوکاتەی کەکەسێکی نامۆ برینداری دەکات، چیرۆکەکەیشی بەناوبانگە. وەهەروەهاقسەیەکی تریش هەیەکەدەڵێت یەکەم کەسێك کەمەقصورەی داهێنا مەروانی کوڕی حەکەم بووە کاتێك کەیەمانی لێی دەدات.

---

[٣٦٢] (وَهُوَالقَوِيُّ العَزِيز) س شوری ئا ١٨.

[٣٦٣] تەرجەمەی ووشەی قیاگین و بەروالەت ووشەی ناوبراو جمعی قیطون، کەلەاقرب الموارددا دەنوسێت: بەزمانی میسریەکان مانای موخدیع دەگەیەنێت کەماڵێکی بچوکە لەنێو خانوویەکی گەورەدا بۆ پاراستنی شتەکان بەکار دەهێنرێت وەلەسەردەمی ئیبن خەلدوندا بەمانای جۆرێك لەخێمە بەکار هاتووە .

لەپاشان ئەو خەلیفانەی کەلەپاش ئەم دوانەوە گەیشتنە خەلافەت لەمەقصورەدا نوێژیان کردووە و، وەك سوننەت ونەریتێکی لێهاتووە بۆ ناسینەوەی سوڵتان و جیاکردنەوەی لەخەڵکانی تر لەکاتی نوێژدا. ئەم جۆرە داب و نەریتانەش کاتێك بەدی دێن کەدەوڵەتەکان دەگەنە قۆناغی خۆشگوزەرانی و جوانخوازی وەك هەموو چۆنیەتیەکانی پاشایەتی. ئێستەش ئەم شێوازانە لەدەوڵەتانی ئیسلامیدا باوە.

لەپاش دابەشبوونی دەوڵەتی عەباسی و هاتنە کایەی دەوڵەتەجۆراو جۆرەکان لەخۆرهەلآت و وەهەروەها لەپاش پوکانەوەی دەوڵەتی ئەمەویەکانی ئەندەلوس و دەرکەوتنی سەردەمی ملوك التوايفيشدا ئەم شێوازە باوی هەبووەو وەك خۆی ماوەتەوە، بەلآم لەمەغریبدا خانەدانی ئەغلەبیەکان لەقەیرەوان ئەم نەریتەیان هەڵبژاردبوو، دواتریش عەبیدیەکان و لەپاشانیش فەرمانڕەواکانیان وەك خانەدانی بادیسی صەنهاجە لەقەیرەوان و خانەدانی حەماد لەقەلعە پەیڕەوی لەئەغلەبیەکان دەکەن.

لەپاشان مووەحیدەکان هەموو مەغریب و ئەندەلوسیان داگیر کردو ئەم نەریتەیان بەپێی شێوازی دەشتەکیەتی کەبەشیعاری ئەوان دەژمێردرا جێبەجێیان دەکرد، بەلآم کاتێك دەوڵەتەکەیان گەیشتە قۆناغی خۆشگوزەرانی و هێزو دەسەلآت یەعقوبی مەنصور سێیەمین پاشایان گەیشتە دەسەلآت مەقصورەی کردە نەریتو، لەپاش ئەویش بۆپاشاکانی مەغریب و ئەندەلوس وەك نەریتێکی لێهات. وەهەروەها لەلەدەوڵەتە ئیسلامیەکانی تردا ئەم نەریتە هەربەم شێوەیە بووە، نەریتی خودایە لەنێو بەندەکانیدا، بەلآم لەبارەی دوعاکردن لەسەر مینبەر و لەکاتی ووتاری هەینیدا، دەبێت ئەوە بزانین کەلەسەرەتای کاری خەلیفەکانەوە بەتەنها نوێژیان دەکرد، واتە خەلیفەکان ئیمامەتیان دەکرد و ئەم پلەیە تایبەت بووە بەوانەوە و دوای نوێژ صەلآواتیان لەسەر پێغەمبەر (ص) دەدا و دووعایان دەکرد و داوای لێخۆشبوونیان بۆ صەحابە دەکرد لەلای خودا. یەکەمین کەسێکیش کەمینبەری دامەزراند عەمری کوڕی عاص بوو، کەلەپاش دروستکردنی مزگەوتی گەورەی میسر چوویە سەر مینبەر و کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە

عومەری کوڕی خەتاب نامەی بۆنوسی: (لەپاشان (امابعد)هەواڵم پێگەیشتووە کەمینبەرێکت دروستکردووە و لەموسوڵمانان بەرزتری ئایا هێندەت بەس نیە کەتۆ وەستابیت و موسوڵمانان دانیشتبن؟ بەخودا سوێندت دەدەم کەدەبێت بیشکێنی).
وەکاتێك سەردەمی گەورەیی و شکۆی دەسەڵاتی ئیسلامی هاتە پێشەوە و ڕێگری لەسوڵتان و خەلیفەکان کرا کەئیمامەت بکەن بەهۆی سەرقاڵیان بەکاروبارەکانی دەوڵەتەوە و، پێویست بوو کەسانێکی تر لەبری خۆیان بۆ ئەوکارە دابنێن، هەربۆیە خەتیب یان ووتاربێژ بۆ بەرز ڕاگرتنی ناوی خەلیفە لەسەر مینبەر ستایشی ئەوی دەکردو درود و سلاوی بۆدەنارد و دوعای بەخێری بۆ دەکرد، بەو هۆیەی کەخودا بەرژەوەندی جیهانی موسوڵمانانی بەو سپاردووە و لەم سەعات و کاتەشدا دوعاکان گیرا دەبن و لەپێشینانەوە ئەمە پشت ڕاستکراوەتەوە کە: هەرکەسێك پێویستە دوعای بەخێر بۆ خەلیفە بکات و تەنها ئەو تایبەتەبەم دوعایانەوە. یەکەمین کەسێکیش کەدوعای خێری بۆ خەلیفەکرد ئیبن عەباس بوو کاتێك فەرمانڕەوای بەصرە بوو لەناوخوتبەکەیدا دوعای خێری بۆعلی خواری لێ ڕازی بێت کردو گووتی: خودایا علی لەڕێگەی حەقدا سەرکەوتوو بکە). لەوە بەدواوە ئەم شتە وەك نەریتێکی لێهات. لەو سەردەمەدا لەکاتی ووتاری هەینیدا تەنها دووعای خێریان بۆ خەلیفە دەکرد و ناوی کەسی تریان نەدەهێنا، بەڵام کاتێك سەردەمی گۆشەگیرکردنی خەلیفە هاتە پێشەوە، ئەوانە کەچاویان بڕیبووە دەسەڵات لەم دوعایانەدا دەبوونە هاوبەشی خەلیفەو خەتیبەکان لەپاش چاکەگووتنی خەلیفە درودیشیان بۆ ئەوانیش دەنارد و بەشان شکۆیان هەڵیان دەدا، بەڵام ئەم شێوازە بەلەناوچوونی ئەم جۆرە دەوڵەتانە سڕایەوە و خەتیبەکان تەنها ناوی سوڵتانیان دەبرد لەکاتی خوتبەکانیاندا ناوی کەسی تر نەدەبرا چونکە ووتاربێژەکان ئاگادار کرابوونەوە کەبیجگە لەناوی سوڵتان باسی کەسی تر نەکەن و دوعای بۆ نەکەن.

لەزۆربەی کاتەکاندا دامەزرێنەرانی دەوڵەتان بێئاگا بوون لەم نەریتە ئەمەش ئەو کاتەبوو کەدەوڵەت لەسەر شێوەی سادەیی و دەشتەکیەتی بێت کەنەریتی بێئاگایی و

توندیە. لەم جۆرە دەوڵەتانەداتەنها بەشێوەیەکی گشتی دوعای خێر بۆ کاربەدەستانی موسوڵمانان دەکرێت و، ناوی کەسێکی تایبەت ناهێنن بەم جۆرە ووتارانەش دەگووترێت (عباسی)و پێیان وایە هەردووعایەکی گشتی کەدەکرێت خەلیفەش دەگرێتەوە و جۆرێکەلەچاولێگەری لەنەریتی پێشینانەو گرنگی بەکەسێکی تایبەت نادرێت لەدوعاکانداو بەراشکاوانە ناوبرێت. هەروەك دەگێرنەوە یغمراسنی کوڕی زیاد دامەزرێنەری دەوڵەتی عبدالواد کەبەدەستی ئەمیر ئەبو زەکەریا یەحیای کوڕی ئەبوحەفص شکاو تلمسانی لەدەستدا و، دواتریش بەمەرج فەرمانڕەواییەکەی درایەوە دەستی و یەکێك لەمەرجانە ئەوەبوو کەلەهەموو شارەکانی ژێر دەسەلآتی ئەودا ناوی ئەمیر ئەبو زەکەریا لەوتارەهەینیەکاندا ببرێت و دوعای بەخێری بۆ بکرێت، یغمراسن گووتی: ئەم چوارقاچانە مینبەری خۆیانە و حەزیان لەناوهێنانی هەرکەسێکە دەتوانن ئەوکارەبکەن. وەهەروەها نێردراوی موستەنصەر خەلیفەی تونس لەبەنی ئەبو حەفص و سێیەمین پاشای ئەو ڕەگەزە چووە لای یەعقوبی کوڕی عبدالحق دامەزرێنەری دەوڵەتی بەنی مەرینی و بۆ ماوەیەك نوێژی هەینی لەپشتیەوە بەجێ نەهێنا.

هەندێك خەڵکی بەیەعقوبیان گووت هۆکاری ئەوەی کەنێردراوی خەلیفە لەنوێژی هەینیدا ئامادە نابێت ئەوەیە کەلەخوتبەدا ناوی سوڵتان ناهێنن. لەوەبەدواوە یەعقوب مۆڵەتی دا لەخوتبەدا ناوی خەلیفەموستەنصر بهێنن و دوعای بۆ بکەن و، ئەمەش وایکرد کەئەو نەتەوەیە دەست بکەنە بانگەواز بۆ خەلیفەی ناوبراو. بەم شێوەیە چۆنیەتی دەوڵەتان لەسەرەتای دروستبوون و بەسەر بردنی قۆناغی دەشتەکیەتی و سادەیی و توندیەوە، بەڵام هەرکە چاویان لەسیاسەتدا کرایەوە و پەی بەهەلو مەرجەکانی شارنشینی ببەن ئەوکات هەوڵی ئەوە دەدەن کەهەموو ئەم دەستکەوت و هەلوو مەرجانە بەدەست بهێنن و لەژیانێکی خۆشگوزەرانیدا بژین و بگەنە ئەو قۆناغانەی کە شارنشینان پێی گەیشتوون و، ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان بخەنەگەر بۆ ئەوەی نەهێڵن کەس بەشداربێت لەو کارەدا و کاتێکیش بیر لەڕابوردوو بکەنەوە ئەفسوس بەوژیانەی پێشوویان بخۆن، ئەم جیهانە بێستانێکەکەخودا پاسەوانیەتی.

# بەشی سی وحەوتەم

## لەبارەی جەنگ و شێوازەکانی نەتەوە جۆراو جۆرەکان لەڕێکخستن و چۆنیەتیەکەیدا

دەبێت ئەوە بزانین کەهەموو جۆرە جەنگ و پێکدادانەکان هەرلەیەکەمین سەردەمەوە کەخودا مرۆڤی ئافراندووە لەنێوانیاندا ڕوویانداوە و، سەرچاوەکەیشی لەڕق بوونەوە لەیەکتری و تۆڵە سەندنەوە دروست دەبێت و دواتری خانەدانی هەردوولای بەشەڕهاتوو خۆیان بۆ جەنگ ئامادە دەکەن یەکێك لەلایەنەکان وەك تۆڵەکردنەوە لەلایەنی بەرامبەر هەردوولا بەشەڕدێن. ئەمەش لەنێوان مرۆڤایەتیدا شتێکی سروشتیە چونکە هیچ هۆزو نەتەوەیەك بێبەش نیەلێیو، هۆکاری ئەم تۆڵەسەندنەوەیەش بریتیە لەوغیرەت و خۆهەڵکێشانەی کەنەتەوەکان بەسەر یەکتری دەیکەن ئیتربە دەستدرێژی و توڕەیی لەدژی گروپێك لەڕێگەی خودا و، ئاینەکەیدا بێت یان ڕاپەڕین بۆ پاراستنی تاج و تەخت و هەوڵدان بۆ بەهێزکردنی. جۆری یەکەمیان بەزۆری بریتیە لەو جەنگانەی کەلەنێوان هۆزەکاندا کەهاوسنورن ڕوودەدات و جۆری دووەمیش بریتیە لەدەستدرێژی کەزیاتر مەبەست لەو دەستدرێژی و هێرش و داگیر کاریانەیەکە هۆزێك یان عەشیرەتێك لەگەڵە وەحشیەکانی بیابانەکان کە دەیکەنە سەر یەکتری، وەك عەرەب وتورکومان ونمونەی ئەمانە ئیتر ئەوانەی کەبەسەری نێزەکانیان ڕۆزی خۆیان دابین دەکەن ئەویش بەهۆی داگیرکردنی نەتەوە و هۆزەکانی ترەوە و بەتاڵان بردنی دارو نەداریان وهەرگەلێکیش

کەڕووبەڕوویان ببێتەوە لەگەڵیدا بەشەڕدێن، لەئەنجامدا شەڕ بەرپا دەبێت و لایە نێك سەردەکەوێت. ئەوانە هیچ ئامانجێکیان وەك گەیشتن بەتاج و تەخت و پاشایەتی نیە بەڵکو تەنها مەبەستی ئەمان لەداگیرکاری بەدەستهێنانی ماڵ و سامانی نەتەوە و هۆزەکانی ترە. جۆری سێیەمیش ئەوانەن کەلەشەریعەتی ئیسلامدا بەجیهاد یان جەنگی پیرۆز ناوزەد کراوە. وەجۆری چوارەمیش جەنگی دەوڵەتانە لەگەڵ ئەوگروپانەی کە لەدژی ئەوان ڕادەپەڕن و خەڵکی لەسەر نافەرمانی هاندەدەن.

ئەمانەن هەرچوار جۆری ئەوجەنگانەی کەبەشی یەکەم و دووەم دەتوانین بەجەنگە ستەمکاری و ئاشوبگێڕیەکان ناوزەدیان بکەین، وە دوو جۆرەکەی تر بەجەنگە داد پەروەرانەو جیهادیەکان دەژمێردرێن، بەڵام ئەوجەنگانەی کەهەرلەسەرەتای دروستبوونی گێتیەوە بەرپا بوون دووجۆر زیاتر نین: یەکەمیان بریتیە لەجەنگە ڕیکخراوەکان کەلەشێوەی لەشکر کێشیدا ڕوو دەدات و دووەمیش وەك هێرش و پەلامار ئەنجام دەدرێت. جەنگی لەشکرکێشی تایبەتە بەهەموو نەتەوەی عەرەبەوە و کەسەردەمانێکی دوور و درێژ بەشێوەیەکی پشتاو پشت کاریان لەسەر کردووە. وەجەنگی هێرش و پەلامار وەك جەنگەکانی نەتەوە عەرەبەکان و نەتەوەکانی بەربەری مەغریبە، بەڵام بەشی یەکەم پایەدار ترو ترسناکترە لەجۆری دووەم، چونکە لەجەنگی لەشکر کێشیدا ڕێزی ڕێکو پێك لەسەربازەکان دروستدەکرێت و وەکڕیزی تیر هاوێژەکان یان ڕیزی نوێژی جەماعەت ڕیزیان دەکەن و بەو شێوەیە بەرەو ڕووی دوژمن دەچن و، ئەم جۆرە جەنگەش لەناو پێکدادانەکاندا دلێرانە ترو توند ترەوشان و شکۆی سوپا لەدڵی دوژمنەکاندا جێگیر دەبێت، چونکە ڕیزی ڕێك و پێکی لەشکر وەك دیوارێکی دوورو درێژ و کۆشکێکی شکۆدارو پایەدارە کەکەس ناتوانێت بیر لەلەناوبردنیان بکاتەوە. لەقورئاندهاتووە: (خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کەبەشێوەیەکی یەکڕیزی ڕێك و

ڕاست هەروەك باڵەخانەیەكی پایەدار لەپێناویدا دەجەنگن)[٣٦٤] واتە: ئەوكەسانەی كەلەپایەداری و خۆڕاگریدا پشتیوانی یەكترن.

وەلە فەرموودەدا هاتووە كەدەفەرمێت: (ئیمانداران وەك خشتی بیناكان وەهان كەهەندێكیان هەندێكی تریان ڕاگرتووە)، لێرەدایە كەحیكمەتی حەرامبوونی پشت هەڵكردن و ڕاكردن لەگۆڕەپانی جەنگ بەدەر دەكەوێت، چونكە هەروەك گوتمان مەبەست لەڕیز بەستن لەكاتی جەنگ و هەراكاندا پاراستنی ڕێكخستنە، هەربۆیە ئەگەر كەسێك ڕوولەدووژمن وەرگێڕێت و لەمەیدانی جەنگ هەڵبێت بێگومان كەلێن دەخاتە ڕیزی لەشكرەوە و دان بەتاوانی دۆڕاندا دەنێت، ئەگەر بێت و گروپەكەی بدۆڕێن، وەك ئەوەش وایە كەشكستی ڕووبەڕووی موسوڵمانان كردبێتەوە.

كەواتە كردەوەی ئەوكەسە بەهۆی گشتگیركردنی خراپەكەو، گەیاندنی بەئاین لەڕێگەی تێكشكاندنی سنورەكانیەوە گوناهێكی گەورەیەو لەڕیزی تاوانە كەبیرەكاندایە. لەوبەڵگانەی كەهێنامانەوە ئەوە دەركەوت كەجەنگ و هێرش بردن بۆسەر دووژمنانی ئاین بەلای خودا (شارع)وە باشترە، بەڵام ئەو خۆپاریزی و گرەنتیەی كەلەبارەی كەمی زیان بەركەوتنەوە لەجەنگێكی ڕێكخراودا هەیە، لەجەنگی هێرشو پەلاماردادا نیە، بێجگەلەوكاتانەی كەبەرلە هێرشكردن لەجەنگی هێرش و پەلاماردا كۆمەڵێك جەنگاوەر لەدواوە بۆ پشتیوانی كردنی هێرش بەران دادەنرێن و، دوای ئەنجامدانی چالاكیە سەربازیەكەی گروپی هێرشبەر دێنەوە ناوەندەكەیان كەسەربازانی پشتیوانی لێیە و ئەم شوێنەش جێگەی ڕیزبەستن بۆ هێرشبەران پڕدەكاتەوە، هەروەك چۆن لەداهاتوودا باسی دەكەین. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین دەوڵەتانی سەردەمی كۆن كەخاوەن جەنگاوەری زۆرو ووڵاتگەلێكی فراوان و بەرین بوون، سوپاو لەشكری خۆیان دەكرد بەچەند دەستەیەكەوە كەپێیان دەگووتن كەرادیس[٣٦٥] و، هەركردو سێ كەسیشیان بەجیاو

---

[٣٦٤] (إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفّاً كَأَنَّهُم بُنيانٌ مَّرصُوص) س الصف ئا ٤ .

[٣٦٥] كردوسە: بریتین لەگروپێكی گەورە لە سوپا (اقرب الموارد).

بەتایبەت ڕێکدەخست و دەڕازاندەوە. وە هۆکاری ئەم دابەشکردنانەش بەو هۆیەوەبوو لەبەر ئەوەی کە بەردەوام ژمارەی سوپاکانیان لەزیاد بووندا بوو، لەناوچە سنوریە دوورەکاندا کۆی دەکردنەوە ئەمە وایدەکرد لەکاتی جەنگدا لەنێو گۆڕەپانەکاندا یەکتری نەناسنەوە بەهۆی جیانەکردنەوەی دۆست لەدوژمن ترسی ئەوە هەبوو کەلێدانەکانیان بەرخۆشیان بکەوێت. هەربۆیە سوپاکەیان دەکرد بەگروپ گروپەوە و خەڵکی هەرناوچەیەك کەیەکتری دەناسن دەکرانە یەك دەستەوەو بەشێوەیەکی ڕێك و لەهەر چوار لاوە ڕێکدەخران‌و، فەرماندە ئیتر سوڵتان یان سوپا سالار بوایە لەناوەڕاستی سوپاکەدا جێگیر دەبوو بەم ڕێکخستنەش دەڵێن (تعبیە)کەڕاڤە کردنەکەی لەباسی مێژووی دەوڵەتانی سەرەتای ئیسلام ئەمەوی و عەباسیەکاندا هاتووە.

لەپێش پاشاوە لەشکرێکی ڕێکو پێك ڕێك دەخەن کەسەرکردەو ئاڵاو بەند و شیعارگەلێکی تایبەتە و پێی دەڵێن مقدمە یان پێشەکی. وەلەلای دەستەڕاستیەوە لەشکرێکی ترهەیە کەبەمەیمەنە یان دەستەڕاست ناوزەد کراوە و لەلای چەپیشەوە لەشکرێك هەیەو پێی دەڵێن میسرە یان دەستە چەپی سوپا هەیە. وەهەروەها لەشکرێکی تر لەدوای ئەم سوپایەوە هەیە و پێی دەڵێن ساقە یان پاشکۆی لەشکر و پاشاو دارو دەستەکەی لەناوەڕاستی ئەم چوار لەشکرەدان و پێی دەڵێن قلب یام ناوجەرگەی سوپا. وەهەرکە ئەم ڕێکخستنە کۆتایی بێت ئەوکات لەشکرکێشی دەست پێدەکات و تعبیە دەکەوێتە نێوان هەردوو بەشی پێشەکی و ساقە یان پاشکۆوە کەماوەی نێوانیان نزیکە واتە لەئاستی بینینی چاودایە یان کەمێك دوورتر کە زۆرترین ماوەی دووڕۆژ بێت بەپێی هەلو مەرجی سوپاکە.

ئەم چۆنیەتیەش دەتوانین لەباسی مێژووی فتوحاتی ئیسلامی لەدەوڵەتی ئەمەوی و عەباسیەکاندا لەخۆرهەلآت بخوێنینەوە. بینیمان کەچۆن عبدالملیك بەهۆی دووری سوپاکەیەوە لەیەکتری فەرماندەیەکی تایبەت کرد بەو بەشەی دواوە کەدوور بوون لەسوپاکە هەروەك لەباسی حەجاجدا کەیوسفی بۆ ئەم مەبەستە دیاری کرد ئاماژەمان

پێکرد. لەدەوڵەتی ئەمەویانی ئەندەلوسیشدا ئەم جۆرە لەشکرکێشیانە زۆر بوون، بەڵام بەئەندازەی ئەوەی کەلای ئێمە هەیە نادیارە چونکە لەسەر دەمی ئێمەدا دەوڵەت گەلێك لەسەر دەسەلاتن کەسوپاکانیان بچووکن و ناگاتە ئەو ئاستەی کەیەکتری نەناسن، بەڵکو زۆربەی لەشکریەکان لەدوو هۆز یان دوو گروپی دەشتەکی یان شارنشین پێکهاتوون و بەباشی یەکتر دەناسن و بەئاسانیش دووژمنیان بۆ دەناسرێتەوە، هەربۆیە ئەم جۆرە سوپایانە پێویستیان بەو جۆرە ڕێکخستنە نیە کەباسمانکرد.

## بەشێك

لەشێوە و شێوازی ئەو جەنگاوەرانەی کەدەستیان دەکردە جەنگ و هەرا دروستکردنو دانانی گۆرەپانەکانە لەبیگیانەکان و گیانلەبەران و، وەك پەناگەیەك بۆ سوارەکان لەکاتی جەنگدا بەکاریان دەهێنان و مەبەستیشیان لەم کارە ئەوە بوو کەجەنگاوەرەکانیان لەجەنگەکاندا پایەدار تر بن و، شەڕی زیاتر بکەن و لەدووژمن نزیك ببنەوە، هەندێك جاریش ئەم شێوازە لەجەنگە ڕێکخراوەکانیشدا بەکار دەهێنرێت هەروەك ئێرانیەکان کەلەزۆربەی جەنگە لەشکر کێشیەکانیاندا فیلیان بەکار هێناوە بەتایبەت لەڕیزی پشتەوەی سوپاکاندا و ئالآو پەرچەمی تایبەتیان پێوە دەکردن و ترسیان دەخستە دڵی دووژمنەکانیانەوە. ڕیزگەلێکە ڕێکیان بەو فیلانە لەپشتی سوپاکانەوە ڕێك دەخست کەوەك هێزێکی گەورە بۆ سوپاکە دەژمێردرا و وورەی سوپا بەرز دەبویەوە و باوەڕی بەسەرکەوتن بەهێز دەکردن، هەروەك دەبینین ئێرانیەکان لەجەنگی قادسیە لەگەڵ موسوڵمانەکاندا فیلیان بەکار هێنا، بەڵام موسوڵمانەکان دەستیان کردە قرتاندنی لوتی فیلەکان و بەو شێوەیە لەشکری فارسەکان لاواز بوو دوای چوار ڕۆژ لەشەڕ کردن فارسەکان شکان و هەڵهاتن، بەڵام ڕۆمیەکان و پاشاکانی (گت)لەئەندەلوس و بەڵکو زۆربەی نەتەوە غەیرە عەرەبەکان سەریریان بۆ ئەم مەبەستە

بەکار دەهێنا، بەجۆرێك تەختی پاشایان لەشوێنێکی بەرزی پارێزراودا دادەنا و گروپێك لەسەربازانی گیان فیدایان لەدەوری پاشا کۆ دەکردەوە و لەهەموو لایەکەوە ئالآی بەرزیان لەچوار دەوری تەختەکەی پاشادا هەڵدەدا و، بەدەوریدا بازنەیەکیان لەسەرباز دروست دەکرد و ڕمیان بەدەستەوە بوو لەئەنجامدا دیمەنێکی زۆر بەشکۆی هەبوو هەندێکیش لەدواوە وەك هێزی یەدەکی پشتیوان ئامادەباش بوون بۆ ڕوودانی هەر ئەگەرێك و وەك پەناگەیەك وابوون بۆ سوپا.

ئێرانیەکانیش لەقادسیەدا ئەم شێوازەیان بەکار هێناو، بەڵام کاتێك لەشکری ئێرانیەکان شکا ڕۆستەم ڕایکرد و کەوتە ڕووباری فوراتەوە و دواتر کوژرا، بەڵام شێوازی جەنگی موجاهیدان و زۆربەی نەتەوە دەشتەکی و بیابان گەڕەکان بۆ ئەم مەبەستە ریزێك لەحوشترو گیانلەبەرانی کەژاوەداریان ڕێکدەخست و وەك پشتیوانێك وابوون بۆ سوپا و پێیان دەگووتن (مەحبوزە)[٣٦٦] هەموو نەتەوەکان ئەم شێوازەیان لەجەنگدا بەکار هێناوە و، لەکاتی پاشە کشێ و هێرشدا دڵنیاتربوون لەشکانی یەکجارەکی باشتر بوو، بەڵام دەوڵەتانی ئەم سەردەمەی ئێمە بەتەواوی بێئاگان لەم شتانەو لەبری دانانی ساقەو پاشکۆی سوپا وولآخ و چوار پێکان –کەکەل و پەل و ئازوقەی سوپایان هەڵگرتووە– لەدواوە دادەنێن و، هیچ سودێك لەفیل و حوشتر وەر ناگرن.

هەربۆیە هەمیشە لەشکرەکانیان ڕووبەڕووی شکان و ڕاکردن دەبنەوە. هەموو جەنگەکانی سەرەتای ئیسلام لەشێوەی لەشکرکێشی وشەڕی ڕێکخراودا بووە و جەنگاوەران لەگەڵ شێوەی جەنگ و هەڵهاتندا ڕاهاتبوون، بەڵام دووشت ئەوانی ناچار بەجەنگی لەشکر کێشی دەکرد: یەکەمیان ئەوەی کەدووژمنان بەشێوەی لەشکر کێشی شەڕیان دەکرد، و دووەمیشیان ئەوەی کە جەنگاوەرو موجاهیدانی ئەو سەردەمە لەڕێگەی جیهاددا گیانی خۆیان بەخت دەکرد و لەم جۆرەجەنگەشدا زیاتر دەیانتوانی گیانی خۆیان بەخت بکەن، چونکە باوەڕێکی بەهێزیان پێی هەبوو. یەکەمین کەسێك

---

[٣٦٦] واتە فیدایی و گیانبەخت کارەکان.

کەشێوازی ڕیزکردنی لابرد و دەستی کردە ئامادەکاری تۆکمە (تعبیە)ی بۆ ئەو مەبەستە مەروانی کوڕی حەکەم بوو کەلەشەڕەکانیدا لەگەڵ زوحاکی خاریجی و دواتریش لەگەڵ خەیبەریدا ئەم شێوازەی هەڵبژارد. تەبەری کاتێك باس لەکوژرانی خەیبەری دەکات دەڵێت: خەواریجەکان: (واتە ئەوانەی کەلەژێر فەرمانی خەلیفە دەرچووبوون) شەیبانی کوڕی عبدالعزیزی یشکری ناوزەد کراو (بەئەبو الدلفا)یان کردە سەرکردەی خۆیان، مەروان لەوە بەدواوە بەشێوەی تەعبیە واتە ئامادەکاری تۆکمە شەڕی لەگەڵ دەکردن، کۆتایی. کەواتە کەم کەم بەهۆی بەتاڵکردنەوەی جەنگکردنی بەڕیز لەشکر کێشی باوی نەما، ڕیزی پشتەوەی گۆڕەپانەکانی جەنگ لەبیر کران و وازیان لێ هێنرا چونکە دەوڵەت گەیشتبوویە قۆناغی تواناو هێز. هۆکارەکەیشی ئەمەیە کەدەوڵەتەکان هەرکات لەقۆناغی دەشتەکیەتی و دەوار نشینیدا بژین خاوەنی حوشتر گەلێکی زۆرن و هەمیشە زیاتریشیان دەکەن و لەگەشتەکانیانی نێوان هۆزەکاندا ژن و منداڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیان دەبردن، بەڵام هەرکە گەشتنە نازو نیعمەت و خۆشگوزەرانی لەدەوڵەتداریدا و بوونە شارنشین و سروشت و نەریتەکانی دەشتەکیەتیان وەلا ناو، وازیان لەکۆچکردن بەناو بیابانەکاندا هێناو یادەوەری حوشترو کەژاوەیان لەبیر چوویەوە و بەکارهێنانی ئەم شتانەیان بەلاوە سەخت بوو.

هەربۆیە لەکاتی دەرچوون و گەشتەکانیاندا ژن و منداڵیان لەشارو ماڵەوە بەجێدەهێشت و لەدیوەخان و پەردەسەراکاندا دەژیان و، لەم گەشتانەشدا تەنها چوار پێ و وولاخیان بۆ گواستنەوەی شتەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد و ئەم باربەر و چوار پێیانە وەك پشتو پەنای سوپاو لەشکرەکانیان وابوون لەکاتی جەنگەکاندا، ئەمەلەکاتێك وەها بارودۆخێك هیچ کات جێگەی ئەو بارودۆخەی کەپێشتر باسمانکرد ناگرێتەوە، چونکە کاتێك ژن و منداڵ و خانەدانیان لەگەڵدا نەبێت گیان بەختکردنیان نابێت و لەجوامێری و دلێری سوپا کەم دەبێتەوە و هەرئاوازێکی ترسناك لەدووژمنەوە بڵاوەیان پێدەکات و دەشکێن و کەلێن دەخاتە یەکڕیزیانەوە.

## بەشێك

لەبەر ئەو هۆیەی کەباسمانکرد بۆچی لەپشتەوەی گۆڕەپانی جەنگدا کۆمەڵێك ڕیز پێك دەهێننو گرنگیەکەیمان باسکرد، پاشاکانی مەغریبیش گروپێك لە بێگانەکانیان (فەرەنگەکان) لەسوپادا بۆ خزمەتکردن دادەمەزراند و تایبەتیان دەکردن بەم ئەرکەوە چونکە هەموو شەڕەکانی خەڵکی مەغریب لەشێوەی جەنگ و هەڵهاتندایە و، سوڵتانیش گرنگیەکی زۆر دەدات بەڕیزەکانی پشتەوەی گۆڕەپانی جەنگەکان و، زۆر جەختی لەسەر دەکردەوە چونکە پێی وابوو وەك پشتیوانیەکی بەهێزی جەنگاوەرانی پشتەوەی مەیدانی جەنگە، هەربۆیە ناچار دەبوایە کەسانێکیان بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژاردایە کەخوویان بەپایەداری لەکاتی لەشکر کێشیەکانەوە گرتبێت وەگەر نا بەشێوەی ئەو کەسانەی کەخوویان بەجەنگ و ڕاکردنەوە گرتووە ئەمانیش ڕادەکەن و، دەبنە هۆی شکستی سوڵتان و لەشکرەکەی. هەربۆیە پاشاکانی مەغریب بۆدروستکردنی ڕیزەکانی پشتەوەی سوپا پێویستیان بەم جۆرە کەسانە هەیە بۆئەوەی ڕیزگەلێکی فراوان بەدەوری سوڵتانو لەشکرەکەیدا دروستبکەن. ئەم کارەش هەرچەندە پشت بەستنە بەبێ باوەڕو کافران، بەڵام ئەوان لەڕووی پێویستیەوە بەشتێکی ئاسایی دەزانن چونکە هەروەك باسمانکرد ئەگەر بەدەر لەم گروپە هەڵبژێرن و ئەم ئەرکەیان پێ بسپێرن ئەوا ترسی شکستی سوڵتان ولەشکرەکەی هەربۆیە فەرەنگیەکان بۆ ئەم کارە هەڵدەبژێرن، چونکە بێجگە لەخۆ ڕاگری لەجەنگەکاندا شتێکی تر نازانن، سەرەڕای ئەمەش پاشاکانی مەغریب ئەم جۆرە کەسانەیان زیاتر لەکاتی شەڕلەگەڵ بەر بەرو نەتەوە عەرەبەکاندا بەکار دەهێنا، بەڵام لەجیهاددا یارمەتیان لێ وەر ناگرن لەترسی ئەوەی مەبادا لەکاتی جەنگەکاندا هاوکاری کافران لەدژی موسوڵمانان بکەن. ئەمەیە ئەو واقیعیەتەی کەئێستاکە لەمەغریبدا بوونی هەیە و ئێمەش هۆکارەکەیمان ئاشکرا کرد، خوداش دانایە بەسەر هەموو شتێکدا.[٣٦٧]

---

[٣٦٧] (وَاللهُ بِكُلِ شَيءٍ عَلِيم) س بقرة ئا ٢٧ .

## بەشێك

ئەوەشمان زانی کەنەتەوە تورکەکان لەم سەردەمەداو لەحاڵێکدا بەهۆی تیر هاویشتنەوە (نەوەك جەنگی شمشێرو نەیزە)شەڕ دەکەن و، ئامادەکاری جەنگیان بەشێوەی ڕیز بەستنەو لەشکرەکەیان دەکەن بەسێ ڕیزەوەو هەر ڕیزەو لەدوای ئەویترەوە دەوەستێت و سوارەکان لەئەسپەکان دێنە خوارەوە و، جێگەتیرەکانیان خاڵی دەکەنەوە و هەموویان لەبەردەمیاندا دادەنێن و لەپاشان دادەنیشن و دەست دەکەن بەتیر ئەندازی و هەرڕیزێکیش یارمەتیدەرو پشتیوانی ڕیزەکەی ترە، کەلەپێشیەوەیە ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەك دووژمن کتوپڕ پەلاماریان بدات، بەم شێوەیە درێژە بەجەنگ دەدەن تاوەکو جەنگ لەبەر زەوەندی لایەنێك کۆتایی دێت. ئەم شێوازەی ئامادەکاری (تعیبە)بەهێزترین و سەر سوڕهێنەر ترین شێوازەکانی جەنگە.

## بەشێك

یەکێکی تر لەشێوازەکانی نەتەوە کۆنەکان هەڵکەندنی خەندەقە لەجەنگەکاندا ئەمەش لەترسی زەرەرو زیانی شەوانەو کتوپڕی دووژمن بۆ لەشکرگاکانیان، هەربۆیە لەنزیك ئەو لەشکرگایانەدا خەندەق هەڵدەکەنن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەترسی لەشکرەکان لەشەودا دەبێتە دووهێندە و هێزە شەڕکەرەکان سودێکی باش لەتاریکی وەردەگرن بۆ زەفەربردن بەدووژمن و، لایەنی هێرش بەر ئەگەر بێت و کتوپڕ بدات بەسەر لایەنی بەرامبەریدا ئەوا ڕووبەڕووی شکستی دەکاتەوە، چونکە لەشەودا هەرکەسێك بیەوێت هەڵدێت و عەیب و نەنگیەکەیشی دیار نیە. هەربۆیە هەرکاتێك لەناوچەیەکدا خیوەتگایان دروستدەکرد و بەدەوریشیدا خەندەقی ناوبراویان لێدەدا لەشێوەی بازنەیەکدا ئەمەش بۆڕێگەگرتن لەهێرشی دووژمن و شکستخواردن. دەوڵەتەکانیش

لەنمونەی ئەم جۆرەکارانەی ئەوەبووە کەپیاوانێکی بەهێزی داناوە کەخاوەن تواناو هێزێکی تایبەت بوون و، توانیویانە گروپێکی گەورە لەپیاوان لەدەوری خۆیان کۆ بکەنەوە و لەهەرقۆناغێکدا هێزێکی گەورە بۆ دەوڵەت دروست بکەن، بەڵام کاتێك کەئاوەدانیان گۆڕا بۆ وێرانی و لاوازی بەدوادا هات و بێ توانایی ڕووی لەدەوڵەتان کرد و، بێبەشبوون لەو هەمووە کرێکارو سوپا و لەشکرە گەورانە ئەم شێوازە (واتە لێدانی خەندەق)بەجۆرێك لەبیر چوویەوە هەروەك بڵێی کارێکی لەو جۆرە نەکرابێت، خوداش باشترینی بەتواناکانە. وەئەگەر سەیری حەزرەتی علی بکەین لەجەنگی صەفەیندا[٣٦٨] کەبەچ شێوەیەك یارانی هاندەدا بۆ جەنگ، دەبینین زۆرێك لەنیشانەو ئاماژەی جەنگیان لێوە فێر دەبین و دەبینین هیچ کەسێك بێجگەلەو بەوئەندازەیە ئەو زانستەی نەزانیوە. ئەو لەیەکێك لەووتارەکانیدا فەرمووی: (ڕیزەکانتان وەك بینا ڕێکبخەن و زرێدارەکان لەپێشەوە و ئەوانی تریش لەدواوە و ددانەکانتان توند بکەن لەیەکتری، بۆئەوەی بەهێزەوە سەرەکان لەجەستەکان لێبکەنەوە بەدەور نەیزەکاندا کۆ ببنەوە، چونکە لەسەری ڕمەکان دەتان پارێزن، چاوەکانتان لەیەك نێن چونکە ئەم کارە هێزتان زیاد دەکات و دلاوەریتان پێدەبەخشێت و هێمنی دەرونیتان زیاد دەکات. ئاوازەکان بمرێنن چونکە ئەم شێوازە سستی و شکستتان لێوە دوور دەخاتەوە و شیاوترە بۆ ویقارو قورسیتان. ئاڵاکانتان بەتوندیەوە بەرزبکەنەوە و هیچ کات دایان مەگرن و بێجگە لەکەسی دلێرو ئازا مەیاندەنە دەست کەسانی بێتوانا، بەڕاستی و چاوونەترسیەوە داوای یارمەتی بکەن چونکە سەرکەتن بەدوای چاو نەترسیدا دێت).

وەئیشتەر لەو ڕۆژەدا کەهۆزی ئیزدی سەرکردایەتی دەکردو هانی دەدان گووتی: لەبەرامبەر کارەکاندا چاونەترس بن و بەسەری خۆتان بەرەو پیری خەڵکی بچن و بەهێزێکەوە بەرەو دوژمن بچن هەروەك بڵێی خزمە نزیکەکانتانیان کوشتووە نەتانتوانیوە تۆڵەی خوێنەکەیان بکەنەوە و، ئەتانەوێت تۆڵەی خوێنی ڕژاویان بکەنەوە و لەو پێناوەدا

---

[٣٦٨] جەنگی صەفەین لەساڵی ٣٧ ك بەرابەریە٦٥٧ بۆ ٦٥٨زاینی ڕوویداوە.

خۆتان ئامادەی مەرگ بکەن و گیان لەسەر دەست بن بەرامبەر دووژمنان بۆ ئەوەی ستەمتان لیٚ نەکریٚت و، لەم دونیایەدا لەکەی نەنگیتان پیٚوە نەلکیٚت. وەئەبو بەکری صەیرەفی شاعیری لمتونە و خەڵکی ئەندەلوس لەناو ئەو شیعرانەی کەتاشفینی کوڕی علی کوڕی یوسفی ستایش دەکرد ئاماژەی بەزۆریٚك لەم بابەتانە کردووە و، لەباسی تاشفین کە بەچاوی خۆی بینیویەتی باسی دەکات، بەجۆریٚك خوێنەر ئاشنا دەکات بەزۆر خاڵی گرنگ وەك ئامۆژگاری و ئاگادار کردنەوە کەپەیوەستن بەسیاسەتی جەنگەوە: ئەی خەڵکی دەمامکدار ئەوەکێیە لەناو ئێوەدا پاشایەکی دلاوەر و بەخشندە و جوامێرە؟ وەئەوە کێیە دووژمن لەتاریکیدا زەفەری پیٚ برد، بەڵام ئەو نەلەخشاو لەشوێنە خۆی مایەوەو، شوێنکەوتوان و سەربازانی هاندەدات بۆ جەنگ و نەبەرد و گیانبەختکردن و لۆمەیان دەکات، لەسەر کەم و کوڕیەکانیان، بەڵام ئەوان هەروەفا دارن بەرامبەری. وەشەوانە بەهۆی بریقەی کڵاوە ئاسنینەکانی سوپاکەیەوە شەوی تاریك ڕووناك دەکاتەوە. ئەی نەوەکانی صەنهاجە چۆن ترستان لێنیشت لەکاتێکدا لەساتەوەختی ترس و جەنگەکاندا هەمیشە پشت و پەنای یەکتر بوون‌و ڕووتان لەتاشفین وەرگێڕا لەکاتێکدا ئەگەر بیەوێت مەترسیە بۆ سەرتان. ئەو وەك چاوێك وەهایە کەپێڵوەکانی نەیانپاراست و دڵێکە کەددانەکان ئەویان تەسلیم کرد و نەیانپاراست.

ئێوە وەك شێری شاراوەی ناوبێشەن و بۆ هەرجەنگ و ڕووداوێك لەئامادەباشیدان. ئەی تاشفین بۆ خیانەتی شەوانەی سوپاکەت و بیانوی بیٚ بەڵگەیان دادگای عەدالەت دابمەزرێنە. وەهەروەها لەم قەصیدەیەدا لەبارەی نەریتی جەنگەوە دەڵێت: لەنەریتی سیاسەت چەند خاڵێکت بەدیاری پێدەبەخشم کەبەر لەتۆ پاشاکانی ئێران عەوداڵیان بوون. بانگەشەی ئەوە ناکەم کەلەو هونەرەدا لەتۆ شارەزا ترم، بەڵام ئەوە یاد خستنەوەیە کەباوەڕداران سودی لیٚ وەر دەگرن.[٣٦٩] لەزرێی دوو ئەڵقەیی لەبەر بکە کەپاشاکانی یەمەن پۆشیویانە کەکۆمەڵێك زرێی تەواوو بەرزو فراوانن کەوەستای شارەزا

---

[٣٦٩] (وَذَكِّر فَإِنَّ الذِكرى تَنفَعُ المُؤمِنِين) س الذاريات ئا ٥٥ .

دروستیان دەکەن. وە شمشێری هیندی تیژ بەکار بهێنە کەزرێ نەرمەکان دەبڕێت. بۆ گروپێك لەسوارەکانت ئەسپی پێشبڕکێیان پێ ببەخشە بۆئەوەی لەکاتی کێشەدا کەس نەتوانێت بیانگرێتەوە. لەهەرشوێنێکدا لەنگەر دەگری دەیکەیتە لەشکرگای خۆت خەندەقی بەدەوردا لێبدە ئیتر سەرکەوتو بیت و دووژمن ڕاو بنێیت یان بشکێیت و دووژمن بەدووت بکەوێت. بەناو دەریاو ڕووبارەکاندا لەشکرەکەت مەبە بەڵکو لەکەناریانەوە لەنگەر بگرەو بیانکەرە بەربەستێك لەبەر دەم دووژمنەکانتدا.

لەکاتی خۆرئاوابووندا جەنگ لەگەڵ دووژمندا بکە و سوپاکەت لەقەتپاڵی کێوەکاندا ڕابگرە چونکە بەهێزترین پەناگەیە. وەهەرکاتێك سوپاکەت لەشوێنێکی تەنگدا بەشەڕهاتن دەبێت بەسەرە ڕمەکانیان فراوان و گوشادی بکەن. وەلەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی دووژمندا ماتڵ مەکەو یەکسەر هێرش بکەرە سەری و ترست لەهیچ شتێك نەبێت چونکە چاوەڕێ کردنی دووژمن دەبێتە مایەی سەرشۆڕی و نەنگی و شکستی بۆتۆ. بۆ پێشەوایەتی و ڕیزی پێشەوەی لەشکر دلاوەرانێك هەڵبژێرە کە شکست و ترس نەناسن و خۆڕاگرو بەهێز بن. باوەڕ بەقسەی درۆ مەکە کەبۆت دەگێڕنەوە چونکە درۆزن هیچ بۆچوونێکی پەسەندی نیە لەکارو تێڕوانینەکانیدا. گوفتاری شاعیر لەم شیعرەدا: (لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دووژمندا بەبێ وەستان هێرش بەرە و بەهیچ شێوەیەك ترست نەبێت)، پێچەوانەی ئەو نەریتانەیە کەخەڵکانی تر لەبارەی هونەرە جەنگیەکانەوە باسیان کردووە، هەروەك چۆن عومەر لەوکاتەی ئەبو عبید بن مەسعودی سەقەفی کردە فەرماندەی جەنگی عێراق و ئێران هەڵبژاردپێی گووت: گوێ بۆ قسەی هاوەڵانی پێغەمبەر بگرەو بەکاریان بهێنە و لەکارەکانتدا بەشداریان پێبکە هەوڵ بدەو وەڵام مەدەرەوە مەگەر ئەوکاتەی کە قسەیەك بەباش بزانی، چونکە ئەمەکاری شەڕەو بۆ ئەم کارەش تەنها پیاوێك شیاوە لەکارەکانی نەشڵەژێت و کاتی واز هێنان لەکارەکان بزانێت. وەعومەر لەشوێنێکی تردا پێی گوتووە: تەنها هۆکارێك کەوالەمن دەکات سوڵەیت نەکەمە

فەرماندە ئەوەیە کەئەو لەکاروبارەکاندا دەشڵەژێت و پەلامار دەدات ئەمەش دەبێتە مایەی لەناوچوون.

سوێندبەخودا ئەگەر لەبەر ئەمە نەبوایە دەمکردە فەرماندە، بەڵام بۆ جەنگ تەنهاکەسێك شیاوە کەنەشڵەژێت و پەلەنەکات. ئەمەبوو قسەکەی خەلیفە عومەر کەگەواهیدەری ئەوەیە کەلەجەنگدا سەنگینی و لەسەر خۆیی باشترە لە پەلە کردن و شڵەژان تاوەکو ئەوکاتەی لەچۆنیەتی شەڕەکە ئاگادار دەبنەوە. ئەم شێوازەش بەتەواوەتی پێچەوانەی قسەکەی صەیرەفیە، مەگەر ئەوەی کەبڵێین مەبەستی ئەو ئەوەیە کەلەپاش دەرکەوتنی بەڵگەی هێرشکردن دەبێت خێرا هێرش بکرێتە سەر دووژمن لەم کاتەدا دەتوانین قسەکەی بەشیاو بزانین، خوداش داناترە.

## بەشێك

لەجەنگەکاندا بەهیچ شێوەیەك ناتوانین دڵنیابین لەسەر کەوتن هەرچەندە هەموو هەلومەرجەکانیش ئامادە بەوەبکەن، وەك زانینی ژمارەی جەنگاوەر و خۆبەخشەکان بەڵکو سەرکەوتن و زاڵبوون لەشتە سودفەکانەو پەیوەستە بەچانس و چارەنوسەوە. هۆکارەکەشی ئەوە یە کەپێدراوەکانی سەرکەوتن یان لەشتە ئاشکراکان پێك دێن وەك ژمارەی زۆری سوپا و چەکی تەواو نەلەخشاو زۆری دلاوەران و ڕێکخستنی ڕیزەکان وەك توندی و پتەوی جەنگاوەران. وەیان بریتیە لەکۆمەڵێك شتی نهێنی کە دووجۆرن: یەکەمیان فێڵ و ئەو خەڵەتاندنانەی کەمرۆڤ پێیان هەڵدەستێت وەك خەڵەتاندنی دووژمن لەڕێگەی بڵاو کردنەوەی هەواڵی ترسێنەر، کەدەبنە هۆی ڕووخانی وورەی دووژمن‌و شکانی وەیان وەك بەرلەوەی دووژمن بگاتە شوێنە گرنگ و بەرزەکان، ئەمان بیانگەنێ‌و لەوێوە جەنگ دەستپێبکات و دووژمنیش لەنزمایدا بێت و توشی ترس و تۆقاندن ببێت‌و جەنگەکەبدۆڕێنێت. وەیان لەبێشەو کەمینەکاندا وەك ناودارستان و پەنای تاشەبەردو تەپۆڵکەکاندا خۆیان حەشار بدەن و کتوپڕ بدەن بەسەر دووژمندا وەیان بەرەو جێگەیەك

ڕایان بکێشن و بیانخەنە داوەوە، ئەمانەو چەندین فێڵی تر کەدەکرێت لەکاتی جەنگەکاندا بەرامبەر دووژمن بەکار بێن. دووەم ئەوەی کەئەو شتە نهێنیانە ئاسمانی بن و مرۆڤ نەتوانێت بەدەستیان بهێنێت، وەك ئەوەی کەکۆمەڵێك بیرو فیکر بەدڵی دووژمندا دێن و دەبنە هۆی ترس و پەرتەوازە بوونی یەکیەتی سوپاو دواتریش شکستهێنانی. وەزۆربەی ئەو شکستانەی کەڕوو دەدەن بەهۆی ئەم هۆکارە نهێنیانەوەیە ئەمەش بەهۆی شەیدایی هەردوولای بەشەڕهاتوو بۆ سەرکەوتن، هەربۆیە لەهەوڵی بەدەستهێنان و ئەنجامدانی ئەم جۆرە هۆکارانەدان و لەئەنجامدا کاردەکاتە سەر یەکێك لەدوو لایەنی بەشەڕهاتوو، هەربۆیە پێغەمبەر (ص)دەفەرمێت: جەنگ هەڵخەڵەتاندنە. لەنمونەو مەسەلی عەرەبیشدا هاتووە: فێڵ لەهۆزێك بەسود ترە.

کەواتە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ڕوودانی سەرکەوتن لەجەنگەکاندا بەزۆری وابەستەی هۆکارە نهێنیەکانە، مانای بەختیش بریتیەلە ڕوودانی شتانێك وەك دەرئەنجامی شتە نهێنیەکان، هەروەك لەجێگەی خۆیدا سەلمێنراوە. کەواتە دەبێت ئەم خاڵانە لەبەر چاو بگرین‌و لەوەتێبگەین کەڕوودانی زاڵبوون و سەرکەوتن بەهۆی شتە ئاسمانیەکانەوە هەروەك باسمانکردو لەمانای ئەم فەرموودەی پێغەمبەرەوە (ص)دەردەکەوێت کەدەفەرمێت: بەدرێژایی یەك مانگ ڕێگا خودا ترسی منی خستووەتە دڵی دووژمنانمەوە. هەروەك دەبینین بەیارمەتی کۆمەڵێکی کەم لەموسوڵمانان بەسەر موشریکەکاندا سەرکەوت و موسوڵمانانی دوای ئەویش بەسەر کافراندا زاڵبوون. وەهەروەها لەوهەموو فتوحاتانە ئەم مانایە بەتەواوەتی ڕوون دەبێتەوە چونکە خودای گەورە لەڕێگەی دروستکردنی ترس لەدڵی بێ باوەڕاندا سەرکەوتن‌و پێشکەوتنی پێغەمبەرەکەی زامن کردو[370] تاوەکو پێغەمبەر زاڵبوو بەسەر دڵەکانیانداو، موعجیزەئاسا لەبەرامبەر پێغەمبەرەوە شکستیان هێنا.

---

[370] (سَأُلقِی فی قُلُوبِ الّذینَ کَفَرُوا الرُّعب) س انفال ئا ٢. (وَقَذَفَ فی قُلُوبِهِمُ الرُّعبْ) س الاحزاب ئا ٢٦ و س حشر ئا ٢). (سِنُلقِی فی قُلُوبِ الّذینَ کَفَرُوا الرُّعب) س ال عمران ئا ١٤٤).

کەواتە دروستبوونی ترس لەدڵی دووژمنانی خودادا یەکێکە لەهۆکارەکانی سەرکەوتن، بەڵام لەبەرچاوان دیار نیە. تەرتوشی گوتوویەتی یەکێك لەهۆکارەکانی سەرکەوتن لەجەنگدا بریتیە لەوەی کە ژمارەی سەربازانی دلاوەر لەهەرلایەکدا زۆربێت ئەوا سەرکەوتن نسیبی ئەو لایەنەدەبێت. ئەم بابەتەی چەندین جار دووبارە کردووەتەوە. ئەمەلەکاتێکدا هۆکاری ناوبراو پەیوەستە بەشتە ئاشکراکانەوە کەباسمانکرد و ڕاست نیە، بەڵکو ئەوەی کەلەبارەی سەرکەوتنەوە ڕاست و شایانی گرنگیە چۆنیەتی عەصەبیەتە هەروەك چۆن عەصەبیەت لەلایەك تەنها شتێك بێت و هەموانی لەدەور کۆ بینەوە و، لەلایەکی ترەوە عەصەبیەتە جۆراو جۆرەکان ئەگەر بێتو لایەنەکان یەکسان بن لەهەموو شتەکاندا، بەڵام لایەنێکیان کەخاوەنی یەك عەصەبیەت بێت لەویتر بەهێزترە، چونکە کاتێك گروپگەلێك لەعەصەبیەتە جۆراوجۆرەکان دروست بین لەڕوانگەی وازهێنان لەیەکتری و جیابوونەوەیان، هەمان چارەنوسیان دەبێت کەخەڵکانی پەراگەندە دووچاری دەبنەوە و، هەرگروپێکیان وەك کەسێك وایە و ئەو گورەپانەیشی کەلەم عەصەبیەتە پەراگەندانە دروستبووە ناتوانێت ڕووبەڕووی ئەو لەشکرە ببێتەوە کەخاوەن یەك عەصەبیەتی بەهێزو پایەدارە.

کەواتە دەبێت ئەم خاڵە بزانین کە بەڵگە هێنانەوەکەی ئێمە لەوەی کەتەرتوشی هێناویەتی باشترو لۆژیکی ترە و، لەبەر ئەوەی کەلەشارەکەی ئەودا عەصەبیەت بوونی نەبووە چونکە ئەو لەشاردا ژیاوە، ئەمەشمان پێشتر باسکرد. سەرەڕای ئەمەش باوادابنێین ئەم هۆکارانەش ڕاست بن، بەڵام لەهۆکارە ئاشکراکانن وەك یەکسانی سوپا لەڕووی ژمارەی سوپا و جەنگاوەرانی دلێرو ژمارەی چەك و تەقەمەنی و هاوشێوەی ئەمانە. چۆن دەگونجێت ئەم جۆرە هۆکارانە سەرکەوتن زامن بکەن، ئەمەلەکاتێکدا ئێمە ئەوەمان سەلماند کەهیچکام لەم هۆکارە دیارانە لەگەڵ هۆکارە نهێنیەکانی وەك فێڵکردنو خەڵەتاندنەکان و هەروەها شتە ئاسمانیەکانی وەك ترس و زەلیلی خودایی دژ ناوەستێتەوە، کەواتە لێیان تێبگەو ئاگاداری چۆنیەتیەکانی ئەم دونیای هەستیە ببە، خوداش ئەندازەگیری شەوو ڕۆژە.

## بەشێک

لەوشتانەی کەدەبێت لەمەسەلەی سەرکەوتن و زاڵبوون لەجەنگەکاندا باسبکرێن هۆکارە نهێنی و ناسروشتیەکانە، وەك چۆنیەتی ناو هێنان و هاوار کردنە، کەدەکرێت ئەم ناوبانگ و ئاوازانە لەهیچکام لەچین و توێژەکانی خەڵکیدا هەرلەپاشاو زانایان و کەسە شیاوەکانەوە بیگرە تائەوانە کەبەشێوەیەکە گشتی بەبەدەستهێنانی فەزیلەتەکان بەناوبانگن، گونجاوبێت لەگەڵ حەقیقەتو واقیعدا. هەروەك خەڵکانێکی زۆر هەن کەبەسیفەتی جوان بەناوبانگ بوون و ناویان لەسەر زارانە ئەمەلەکاتێکدا شیاوی ئەو گەورەیی و پیاهەڵدانانەش نین سەرەڕای ئەوانەی کەخۆیان باشن و بەخراپ ناویان دەرکردووەو، هەندێکیش هەن کەناویان وونە و دەبوایە ناوداربوونایە. وەهەندێك جار ناوبانگی کەسان لەگەڵ حەقیقەتدا یەکدەگرێتەوە وشیاون بۆئەوسیفەتانە. چونکە ناوداری و بەناوبانگبوون تەنها لەڕێگەی هەواڵ و مێژووەوە دەبێت و گێڕەرەوەکانی هەواڵیش مەبەستە ڕاستەقینەکان دەخەنەلاوەو دەکەونە زۆنگاوی بێئاگاییەوە. هەربۆیە نەزانی ڕوودەکاتە گێڕانەوەکان بەتەعەصوب و هەوەسبازی ڕەنگڕێژ دەبن و لەئەنجامدا وەهم و خورافەیان تێکەڵ دەبێت و هەواڵەکان لەگەڵ واقیعدا یەك ناگرنەوە و، جێبەجێیش نابن بەسەریدا وەیان بەهۆی شاراوەییانەوە لەئاڵۆزیدا دەمێننەوە و یان بەهۆی هەوڵی نەفامانەوە بۆ خۆنزیککردنەوە لەدەرباری دەسەڵاتداران لەڕێگەی پیاهەڵدانو بەچاکە باسکردنیان لەسەردەمی دەسەڵاتەکەیاندا و، چاوپۆشی لەهەڵەو پەڵەکانیان دەکەن و بەباشە ناویان دەبەن و، مرۆڤیش حەزی لەوەیە کەخەڵکانی دەوروبەری بەشان و باڵیدا هەڵبدەن. ئەوە دەزانین کەمرۆڤ بمانەوێت و نەمانەوێت حەزی لەوەیە کەستایش بکرێت و خەڵکی سورن لەسەر دونیا بەهۆی ماڵ و سامان و دەسەڵاتەوە. زۆرێك لەخەڵکی خوازیاری کارەچاکەکان نین لەم هەلومەرجە چۆن دەکرێت

ناوهێنانەکان بەرابەر بێت لەگەڵ واقیع و حەقیقەتدا؟ هەربۆیە ناوبانگو ناودەرکردن لەوەها هەلومەرجێکی نهێنیدا بەدی دێن و ناگونجێن لەگەڵ حەقیقەتدا و، هەرشتێکیش کەبەهۆی شتێکی نهێنیەوە بەدی بێت بریتیە لەهەمان ئەو مانایەی کەبۆ بەخت بەکاری دەهێنن هەروەك سەلمێنرا. خوداش داناترە و تەواوی هەرشایانی خۆیەتی.

# بەشی سی و هەشتەم

## لەبارەی وەرگرتنی باج و هۆکارەکانی زۆری و کەمیەکەی

دەبێت ئەوە بزانین کەبارو دۆخی وەرگرتنی باج لەسەرەتای دروستبوونی دەوڵەتەوە لەڕووی دابەشکردنی ئەرکی کارمەندەکانیەوە کەمە و، لەڕوانگەی کۆی ئەو داهاتانەی کەبەدەست دێن زۆرو فراوان و جۆراو جۆرە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کۆی داهاتەکانی دەوڵەت کەمن. چونکە ئەگەر بێت وز دەوڵەت پەیڕەوی لەنەریتە ئاینیەکان بکات و بێجگە لەو ئەرك و واجبانە کەشەرع بەسەر خەڵکیدا فەرزی کردوون وەك زەکات و صەدەقەو خەراج و جیزیە و، نمونەی ئەمانە ناتوانێت کۆمەڵێك ئەرکی تر بدات بەسەریاندا، چونکە ئەندازەی ڕیزبەندی ئەم ئەرکانە کەمە چونکە ئەندازەی زەکاتی ماڵ هەروەك دەزانی کەمە، وەهەروەها زەکاتی دانەوێڵەو چوارپێکان و جیزیەو باج و هەموو فەرزە شەرعیەکان کەم و سنوردارە و لەو ئەندازەیەی کەشاریع (خودا)دیاری کردووە تێپەڕناکات. ئەمەلەکاتێکدا دەوڵەت بەشێوەی زاڵبوون و عەصەبیەت دروست ببێت ئەوکات دەبێت بەناچاریەوە لەسەرەتای کارەکەوە، هەروەك لەبەشەکانی پێشتردا باسمانکرد لەحاڵەتی دەشتەکیەتیدا دەبێت ودەشتەکیەتیش ئەوە دەخوازێت کەدەوڵەت لەگەڵ خەڵکیدا بەشێوەیەکی لێبوردەیی تەعەلولەوە ڕەفتار بکات و، لەبەتاڵان بردنی سەروەت و سامانی خەڵکی خۆی بەدوور بگرێت و بێجگە لەهەندێك شوێنی دەگمەندا نەبێت دەست بۆ وەها کارێك نەبات.

هەربۆیە ئەندازەی یەك ئەرك و ئەو تەكلیفەی كەلەڕێگەیەوە باج كۆدەكرێتەوە و بەهەموویەوە داهاتەكانی دەوڵەت پێك دەهێنێت كەم دەبێتەوە و كاتێكیش كەئەركێكی زیادە دەخرێتە سەرشانی خەڵكی ئەوكات خەڵكی بەتاسەوە هەوڵی كاركردن و بەرهەمهێنانی زیاتر دەدەن و لەئەنجامدا ئاوەدانی زۆر دەبێت چونكە لەئەنجامی كەمی باجەوە ئەندازەی خەراجیش باش دەبێت و، ژیان بەرەو خۆشگوزەرانی دەڕوات. وەهەركات ئاوەدانی فراوان بێت ئەوا ژمارەی ئەرك و كاروبارەكانی وەرگرتنی باجیش زۆردەبن و لەئەنجامدا خەراج كەلەڕێگەی كۆی تەكلیفەكانەوە بەدەست دێت زۆر دەبێت. وەهەركاتێك دەوڵەت جێگیر بێت و پاشاكانی یەك لەدوای یەك دەسەلاَت بگرنە دەست و زیرەك و هۆشیار بن و سیفەتە جوانەكانی دەشتەكیەتی وەك سادەیی خووخدەكانی وەك چاوپۆشی و لیبوردەیی و، دوركەوتنەوە لەماڵ‌و سامانی خەڵكی تێدا بێت و ببنە شارستانیەتێكی ڕاستەقینە كەمرۆڤی تێدا بحەسێتەوە و، فەرمانڕەوایانی دەوڵەت ماهیرو لێزان بن و بەهۆی زۆری خۆشگوزەرانی نازونیعمەتەوە پێداویستیەكانیش زۆر ببن ئەوكات ئەركەكانیش زۆردەبن و، باجیش لەسەر خەڵكی زیاد دەكات‌و بڕەكەیشی زۆر دەبێت و پارەی تەرخانكرا بۆ بەشەكانی دەوڵەت زۆر دەبێت و باجیش لەبازرگان و جوتیاران‌و ئەوكەسانەی كەلەدەروازە كانەوە دێنە ژورەوە وەردەگیرێت. هەروەك لەبەشەكانی داهاتوودا باسی دەكەین. ئەم بارودۆخەش بەهۆی ڕۆچوونی دەسەلاَتدارانەوە بەناو نازو نیعمەت و خۆشگوزەرانیدا وادەكات باری سەرشانی خەڵكی بەهۆی وەرگرتنی باجی زۆرەوە قورس ببێت و بەناچاریەوە شانی بۆشل دەكەن و، لەپاش ماوەیەك وایان لێدێت وەك ئەركێكی سەرشانیان سەیری دەكەن چونكە ئەم تەكلیفانە كەم كەم دانەنرێن بەجۆرێك كەخەڵكی هەستیان پێناكات‌و لەئەنجامدا لەبەر چاوی خەڵكی وەك واجبیان لێدێت. ئەوكات زیادەكانی ناوبراو لەئاستی مام ناوەندی لادەدەن و خەڵكی خۆشی ژیان لەدەست دەدەن و لەحەزكردنیان بۆئاوەدانی دەوەستن چونكە كاتێك دەبینن ئەندازەی باجەكان لەئەندازەی داهاتەكانیان زیاترە نائومێد دەبن.

هەربۆیە خەڵکانێکی زۆر وازلەئاوەدانی دەهێنن و بەهۆی کەم بوونەوەی هەندێك لەداهاتەکانی خەڵکیەوە خەراجەکانیش کەم دەکەن و سەرەڕای ئەمەش دەسەڵاتداران ئەیانەوێت بەهۆی زیادکردنی باجەوە ئەم کەم و کرتیانەش پڕ بکەنەوە لەئەنجامدا تەکلیفەکان دەگەنە ئاستێك کەئیتر هیچ سودو بەهرەیەکیان لێ نابرێت، چونکە لەوەها هەلومەرجیکدا هەم قەرزەکان زۆر دەبن و هەم خەراجیش زیاد دەکات و ئەو داهاتانەی کەئومێدیان پێیەتی بەس نابێت و ئەندازەی تەکلیفەکان زیاد دەکات، چونکە وادەزانن بەم شێوەیە دەتوانن کەم و کورتیەکان پڕبکەنەوە تا لەئەنجامدا ئاوەدانی بەرەو وێرانی دەڕوات و خەڵکی بێ ئومید دەبن لەسەروەت و سامان و ئاوەدانی. دەرئەنجامی ئەم هەموو ناهەمواریانەش بۆ دەوڵەت دەگەڕێتەوە، چونکە سود و ئاوەدانی و بەرهەمهێنانی سەروەت و سامان بۆئەو دەگەڕێتەوە و هەرکاتێك پەی بەم بنەمایانە ببەیت دەتوانیت لەوەتێبگەیت کەبەهێزترین هۆکارەکانی ئاوەدانی و بەرهەمهێنانی سەروەت و سامان بریتیە لەکەمکردنەوەی ئەندازەی تەکلیف و ڕیزبەندی و باج وماڵیاتەکان لەسەر ئاوەدان کەرەوەکان، تائەو جێگەیەی کەبگونجێت چونکە لەم ڕێگەیەوە ڕۆحی کاری زیادە بۆ چالاکی ئاوەدانی لەناخی خەڵکیدا بێدار دەبێتەوە، چونکە لەوەدڵنیان سودی لێ وەردەگرن. خوداش خوداوەندی هەموو کاروبارەکانە و پاشایەتی بەسەر هەمووشتەکاندا بەدەستی ئەوە.[٣٧١]

[٣٧١] (بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيء) س يس نا ٨٣.

# بەشی سی و نۆیەم

## لەبارەی بارودۆخی ماڵیات و باج لەکۆتایی دەوڵەتدا

دەبێت ئەوە بزانین کەدەوڵەت لەسەرەتای کارەوە هەروەك باسمانکرد لەحاڵەتی دەشتەکیەتیدایە و، بەهۆی نەبوونی سەروەت و سامانی فراوان و نازو نیعمەت و داب و نەریتەکانیەوە پێویستی گەلێکی کەمی هەیە و خەرجیشی زۆر نیە، هەربۆیە دەرامەتی خەڵکی لەگەڵ باجەکاندا بەرابەر دەبن و بەڵکو لەزۆربەی کاتەکانیشدا داهاتەکان زیاترن لەئەندازەی باجەکان. ئەوکات هێندەنابات کەلەگەڵ شارنشینیدا ڕادین و بەوڕێگایانەدا دەڕۆن کەدەوڵەتانی پێشوو پێیدا ڕۆشتوون هەربۆیە دەبینین خەرجیەکانی دەوڵەت بەشێوەیەکی بەرچاو زۆردەبن بەتایبەت سوڵتان و دارو دەستەکەی، هەربۆیە سوڵتان بەناچاریەوە دەست دەکات بەزیادکردنی باجەکان چونکە بمانەوێت و نەمانەوێت خەرجی سوپاو پاسەوانانی وولآت زۆرە هەربۆیە وەك گووتمان سەرەتا دەبێت باجەکان زیادبکاتو لەبەرامبەریشدا خەرجیەکانی دەوڵەت بەهۆی نازونیعمەت و خۆشگوزەرانیەوە زۆر دەبن و سستی و پیری ڕوو دەکاتە دەزگای دەوڵەت و گروپی ئەهلی عەصەبیەت و، فەرمانڕەواکان ناتوانن لەشوێنە دوور دەستەکان باج لەخەڵکی وەربگرن و لەئەنجامدا ئەندازەی باج کەم دەبێتەوە و بەپێچەوانەشەوە داب و نەریتی خۆشگوزەرانی پەرە دەگرێت، بەوهۆیەشەوە پێویستیەکانی سوپاو دەوڵەت زۆر دەبن، هەربۆیە دەبینین دەسەلآتداران لەدەروازەکانیشەوە هەمان نرخ دەخەنە سەر کالآکان کەلەبازاڕدا دەفرۆشرێن و دەوڵەت ناچارە بەردەوام بێت لەسەر ئەم بارو دۆخە، ئەمەش بەهۆی

زۆربوونی خەرجیەکانی دەوڵەت وموورچەی سوپاو پاسەوانەکانەوەیە و ئەم جۆرە باج وەرگرتنەش وا لەخەڵکی دەکات نائومێد بن و بێ سەرو بەری لەبازاڕدا دروست دەبێت و سەرئەنجام گرفتی ئیداریو کۆمەڵایەتیو هەرەسی کۆمەڵگەی لێ دەکەوێتەوەو، دەوڵەتیش لەناودەچێت.

هاوشێوەی ئەم جۆرە باج وەرگرتنانە لەشارو مەملەکەتەکانی خۆرهەڵات لەکۆتاییەکانی دەوڵەتی عەباسیو عبیدیەکان (فاتمیەکان)دا زۆر ڕوویداوە و کارگەیشتووەتە ئەوەی کەباجیش لەحاجیەکان وەربگیرێت. صەلاح الدینی کوڕی ئەیوب ئەم جۆرە باج و نەریتانەی هەڵوەشاندەوە و شتی باش و پەسەندی لەجێگەیان دانا. وەهەروەها لەئەندەلوس لەسەردەمی مولوك التوایفدا ئەم جۆرە باجانەیان دانابوو تائەوکاتەی کە یوسفی کوڕی تاشفین ئەمیری مورابیتەکان ئەو نەریتانەی هەڵوەشاندەوەو لەشارەکانی جەرید لەلەئەفریقاشدا بەهەمان شێوە ولەوڕۆژگارەدا لەکاتی دەوڵەتی ڕەهای سەرۆکەکانیاندا باج و خەراجی جۆراو جۆریان لەسەر خەڵکی دانابوو، خودای گەورەش داناترە.

# بەشی چل هەم

## لەبارەی ئەوەی کەبازرگانی سوڵتان دەبێتەهۆی زیان گەیاندن بەخەڵکی و مایەی لەناوچوونی باج وەرگرتنە

دەبێت ئەوە بزانین کەهەرکات دەوڵەت لەبارەی وەرگرتنی باجەوە، هەروەك باسمانکرد، بەهۆی گەیشتن بەقۆناغی بەتوانایی و خۆشگو زەرانیەوە بکەوێتە تەنگدەستیەوە و دەرامەتی باج لەگەڵ خەرجیەکاندا یەکسان نەبێت و پێویستی بەماڵ و سامانی زیاتر بێت، ئەوکات بەشێوەیەکی کتوپڕ باج لەسەر کاڵاکانی بازاڕ دادەنێت، هەروەك لەبەشی پێشەوەدا باسمانکرد، ئەوکات دیسانەوە باجەکان زیاد دەکات و هەوڵی دۆزینەوەی ناوی نویٚ دەدات بۆ ئەوباجانەی کە وەریان دەگرێت ئەگەر پێشتر بوونیان نەبوبێت، وەهەندێك جاریش لەماڵی کارگوزاران و کارمەندانی وەرگرتنی باج مەبلەغێك وەردەگرێت و بەتوندیەوە هەڵسوکەوتیشیان لەگەڵدا دەکات، بەجۆرێك ئێسقانەکانیشیان دەگوشێت! چونکە دەبینێت ئەوان لەماڵ و سامانی جیبایەدا سودێکی زۆریان وەرگرتووە بەجۆرێت سەروەت و سامانەکەیان ئاشرا نیە، وەهەندێك جاریش سەرانی دەوڵەت هۆکارەکانی بازرگانی و کشتوکاڵ بۆسوڵتان فەراهەم دەکەن بەو هیوایەی دەرامەتی خەراج زۆربکەن چونکە دەبینن بازرگان و جوتیارەکان سودێکی زۆر دەبەن لەکارەکانیان لەم ڕێگەیەوە دەوڵەت دەتوانێت لەکڕینی کاڵا بازرگانیەکاندا بەهرەمەند ببێت وبەو هۆیەوە لەگۆڕان و دەستاو دەستکردنی کاڵاکان لەبازاڕدا سودمەند بێت وادەزانن ئەم شێوازە سودێکی باشی دەبێت، بەڵام پێچەوانەکەی ڕاستە چونکە

لەچەندین ڕێگەی جۆراو جۆرەوە زیان بەخەڵکی دەگەیەنێت و یەکەمین زیانیشی ئەوەیە کەبازرگانان و جوتیاران لەکڕینی چوار پێ و کاڵاکاندا دووچاری تەنگدەستی دەبنەوە و ناتوانن بەئاسانی هۆکارەکانی کڕینیان بەدەست بخەن. چونکە خەڵکی لەڕوانگەی سەروەت و تواناوە لەیەك ئاستدان وەیان کەمێك جیاوازیان هەیە و کێبڕکێی ئەوان لەئاستی سەروەت و سامانەکانیاندایە، بەڵام کاتێك سوڵتان بەو هەموو سەروەت و سامانە فراوانەوە کەلەهەموویان بەتواناترە لەم جۆرە کێبڕکێیانەدا بەشداری دەکات ئەوکات کاردەگاتە جێگایەك کەهیچکام لەخەڵکی ناتوانێت پێویستیەکانی ڕۆژانەی دابین بکات و، ئەمەش دەبێتە هۆی چارەڕەشی خەڵکی.

سەرەڕای زەرەرو زیانی ناوبراو کاتێك سوڵتان کاڵاو شتوومەکەبازرگانیەکان لەفرۆشتندا دەبینێت زۆرێکیان لەدەستی خەڵکیدا داگیر دەکات وەیان بەکەمترین نرخ دەیانکڕێت و هیچ ڕکابەرێکیش لەبەرامبەر خۆیەوە نابینێتو بەنرخێکی بێبەها لەفرۆشیارە کانیان دەکڕێت. سەرەڕای ئەمەش لەوکاتەی کەهەموو بەرهەمەکانی وەك دانەوێڵەو هەنگوین و شەکرو نمونەی ئەمانەو هەموو بەهرەبەردارییەکان بەدەست دەهێننو سەرەڕای ئەمانەش هەموو کاڵابازرگانیەکانیش دەکڕن، لەم هەلومەرجەدا ئیتر چاوەڕێی ڕوودانی نەمانی شتەکان و گرانکڕینی شتەکان نابن و بۆ فرۆشتنیان بەپێی بڕیاری دەوڵەت هەڵسووکەوت دەکەن و هەموو چینەکان ناچار بەکڕین و فرۆشتن دەکەن هەر لەبازرگانەکانەوە بیگرە تاوەکو جووتیارەکان و نرخێکی گرانیان لەسەر دادەنێن زیاتر لەنرخی ئاسایی و، هەرچی دینارو دیرهەم هەیە لەدەستی خەڵکی بەهۆی گرانی نرخی شتوومەکەوە لەدەستی خەڵکی دەهێننە دەرەوە و کاڵا ناوبراوەکان وەك شتانێکی بێ سوود لەلای خەڵکی دەمێنێتەوە و، سەردەمانێك بەبێکاریەوە بەسەر دەبەن و لەو هەوڵ و ماندوبوونانەی کەژیان و گوزەرانیان مسۆگەر دەکات دوادەکەون. سەرەڕای ئەمەش بەهۆی پێویستیەکانی ژیان و گوزەرانەوە ئەوکاڵایانەی کەلایانە بەنرخێکی زۆر هەرزان دیانفرۆشنەوەو، تا وایان لێدێت بەگشتی سەرمایەکەیان لەدەست دەدەن و لەکاری بازرگانی و سەوداو مامەڵە دوادەکەون و ئەم حاڵەتەش بۆ چەندین جار دووبارە

دەبێتەوە و خەڵکی نائومێد دەبن لەکارو کەسابەت و، وایان لێدێت باوەڕیان بەبازرگانی و قازانج نامێنێت و لەهەوڵدان سارد دەبنەوە و ئەم بارودۆخەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی باجدان لەلایەن خەڵکیەوە بەهۆی ئەو سیاسەتەی کەدەوڵەت پەیڕەوی کردووە. ئەگەر بێت و بازرگانان وازلە بازرگانی بهێنن و جووتیارانیش کشتوکاڵ نەکەن ئەوکات ئەندازەی ئەو باجەی کەدەوڵەت لەخەڵکی وەردەگرێت کەم دەبێتەوە یان هەرنامێنێت وەهەرکات سوڵتان ئەوەی کەلە خەراجەوەدەستی دەکەوێت بەراورد بکات بەم قازانجەناوبراوە کەمانە زۆر لەکەمیش کەمترن.

سەرەڕای ئەمانەش باوادابنێین کەبازرگانی بۆ سوڵتان سودی هەبێت لەئەنجامدا بەشێکی گەورە ناچێتە ناو خەزێنەی دەوڵەتەوە، چونکە زۆر دوورە کەدەوڵەت لەڕێگەی سەوداو مامەڵەو کڕین و فرۆشتنی کالاًکانی سوڵتانەوە باج وەربگرێت ئەمەلەکاتێکدا ئەگەر ئەم هەموو مامەلاًنەی کەخەڵکی ئەنجامیان دەدا بێگومان باجیان لێ وەردەگیرا. وەهەروەها ئەم بارودۆخە دەبێتەهۆی لەناوچوونی ئاوەدانیو شارستانیەتو دوورکەوتنەوەی خەڵکی لەکشتوکاڵ و بازرگانی و نەمانی سەروەت و سامانی خەڵکی و بەهۆی خەرجیەکانەوە دووچاری تاڵی ژیان دەبنەوە.

هەربۆیە خوێنەر دەبێت ئەم حەقیقەتە بەباشی بزانێت. ئێرانیەکۆنەکان هیچ کەسێکیان لەبەر خزمایەتی نەدەکردە فەرمانڕەوا مەگەر ئەوەی کە خزم و نزیکی پاشابێت و خەڵکانێکی باوەڕدارو بەڕێزو پەروەردەکراو سەخییان لەنێوان کەساندابۆ فەرمانڕەوایی هەڵدەبژارد و فەرمانڕەواییەکەیان مەرجدار دەکرد بەوەی کە دەبێت لەکارەکانیدا دادگەربێت و، تەنها هەوڵ بۆ خۆی نەدات و نەبێتە هۆی زیان و ئازار بۆ دراوسێکانی و، بازرگانی نەکاتە پیشە نەوەك حەزلەگرانکردنی کالاًکان بکات و بەندە بۆکاروبارەکانی بەکار نەهێنێت چونکە ئەوان بۆکار یان بەرژەوەندیەك چەتەیی ناکەن. دەبێت ئەوەش بزانین کەسەروەت و سامانی دەوڵەت تەنها لەڕێگەی وەرگرتنی باجەوە زیاد دەکات ئەمەش تەنها بەدادگەری و یەکسانی لەنێو خەڵکیداو پاراستنی ماڵ و سامانیان و چاودێریکردنیان دەبێت و. بەم شێوەیە ئارەزووە کانی خەڵکی زۆر دەبن و

لەڕێگەی بەدەستهێنانی سەروەت و سامان و بەهرەوەرگرتن لێی هەوڵ و تێکۆشان دەکەن و ئەمەش وادەکات ڕێژەی ئەو باجەی کەدەدرێتە سوڵتان بەئەندازەیەکی بەرچاو زۆر ببێت، بەڵام ئەگەر سوڵتان بێجگە لەوەرگرتنی باج سەرقاڵی کشتووکاڵ و بازرگانی بێت ئەوا زیان بەخەڵکی دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی کەمبوونە وەی باج و، لەناوچوونی ئاوەدانی و وولات زیانی پێدەگات.

هەندێك جاریش گروپێك لەئەمیران و خاوەنانی دەسەڵات کە دەست دەکەنە کشتوکاڵو بازرگانی دەبێتە هۆی ئەوەی کە کاڵاو شتومەکی شارەکەی خۆیان لەدەستی یەکەم واتە بەرهەمهێنەران کەباج دەدەن، دەسەنرێتەوە ئەوەش بەنرخێکی هەرزان لێیان دەکڕنەوە و بەدڵی خۆیان هەرنرخێکیان بوێت لەسەریان دادەنێن و، دەیانفرۆشن و ئەمەش دەبێتە هۆی بێسەرو بەری و زوڵم و خراپ بوونی ژیان و گوزەرانی خەڵکی. هەندێك جاریش هەندێك لەم بازرگان و جووتیارانە خۆیان لەدەرباری سوڵتان و دەسەڵاتداران نزیك دەکەنەوە و هانیان دەدەن لەسەر کشتووکاڵ و بازرگانی و دەیکەنە شەریکە بەشی خۆیان، ئەمەش بۆئەوەی لەڕێگەی کۆکردنەوەی سەروەت و ساماندا سود لەهێزو دەسەڵاتی پاشا وەر بگرن و بەخێرایی داراییەکانیان زیاد بکەن، بەتایبەت کەبەهۆی ئەم شەریکیەوە لەباج دان دەبەخشرێن و ئەم شێوازەش باشترین و خێراترین ڕێگایە بۆ زیاد کردنی ماڵ و سامان، ئەوکەسەش کەبەم شێوەیە خۆی لەسوڵتان نزیك دەکاتەوە و پێی وایە سودێکی زۆری بەسوڵتان گەیاندووە بەم کارەی، بەڵام بێئاگایە لەوەی کە لەولاوە زەرەرو زیانێکی زۆری لەڕێژەی ئەوباجەداوە کە جووتیاران و بازرگانان دەیدەنە خەزێنەی دەوڵەت، چونکە هەتا بازرگانی کشتووکاڵ لەدەستی خەڵکیدا کەم ببێتەوە و بکەوێتە دەستی دارو دەستەی دەسەڵاتدارەوە لەبەرامبەردا ڕێژەی باجیش کەم دەبێتەوە. هەربۆیە باش وایە سوڵتان یان دەسەڵاتداران لە بیرو ئەندێشەی زیانبەخشی ئەم جۆرە کەسانە خۆیان بەدوور بگرن کەزیانێکی گەورە لەبواری باج و دارایی دەوڵەت دەدەن. خوداش ئێمە بەڕێنمایی خۆی ئیلهام دەبەخشێت و لەکارە شایستەکانمان بەهرەمەندمان دەکات و بێجگە لەو هیچ خودایەکی تر نیە.

# بەشی چل و یەکەم

## لەبارەی ئەوەی کەسوڵتان وفەرمانبەرانی دەرباری فەرمانڕەواییەکەی لەناوەڕاستی یەك دەوڵەتدا هێزو توانا بەدەست دەهێنن

چونکە لەسەرەتای دروستبوونی دەوڵەتدا هەریەکەلەئەندامانی خانەدانو هۆزی سوڵتان بەهۆی ئەو هێزو عەصەبیەتەی کەهەیانە لەماڵ و باجەکان بەشیان دەدرێت و هەرچیەك کەلەڕێگەی باجەوە بەدەوڵەت دەگات لەنێو ئەواندا دابەش دەکرێت. هەروەك لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد هەر دامەزرێنەرێکی دەوڵەت بۆ دامەزراندن و جێگیری دەوڵەت نیازی پێیان هەیە. هەربۆیە سەرۆکەکەیان لەمەسەلەی خەراجدا سەبارەت بەو پێشبینیە فراوانانەی کەئەوان هەیانە خۆی بەدوور دەگرێت و لەبری ئەوە هەوڵی زاڵبوون دەدات بەسەریاندا هەربۆیە پێویستی پێیان هەیە و لەهەمان کاتیشدا لەوان بەڕێز تریشە. بێجگە لەهەندێك حاڵەت نەبێت کەزۆر کەمترن لەپێویستیە کانی ئەو. لەباج بەش نابات. هەربۆیە فەرمانبەرانی دەربار وەك مەوالی و نوسەر و وەزیرەکان بەزۆری تەنگدەستن و پارەو پوڵیان کەم و سنور دارەو، چونکە داراییەکەیان یەکسانە بەئاستی خزمەتەکەیان و بەهۆی دەستوەردانی خانەدانی عەصەبیەتەکەیەوە تەنانەت دەرامەتی سوڵتانیش سنور داریوو. وەکاتێك کەسروشتی پاشایەتی دەگاتە شکۆو، گەورەیی بازنەی فەرمانڕەواییەکەیشی فراوان دەبێت و خاوەنانی دەوڵەت دەبنە فەرمانڕەوای ڕەها و چاودەبڕنە خانەدان و ئەندامانی هۆزەکەیان و، دەستیان لەکاروباری باجدا کورت دەکەنەوە بێجگەلەوەی کەلەنێو خەڵکیدا بۆیان دیاری دەکرێت بەشێکی تریان نیە و

بەهۆی نەشیاویان لەکاروباری دەوڵەتدا ڕێگەنادرێت دەستێوەردانیان لەکاروبارەکانی دەوڵەتدا هەبێت و دەریان دەکەن وەیان مەوالی و نمەك پەروەردەکانی دەوڵەت دەکەنە شەریکە بەشیان. ئەمەیە کەلەم قۆناغەدا هەموو دەرامەتێکی باج یان بەشێکی زۆری تایبەت دەبێت بەخاوەنانی دەوڵەتەوە و دەست دەکات بەکۆکردنەوەی سەروەت و سامان و بۆ پێشهاتەکان ئامادەیان دەکات و، گەنجینەکان لێوان لێو دەکات لەپارەو سامان و بازنەی شان و شکۆی فراوان دەبێت و چاودەبڕێتە خزم و نزیکانی و لەئەنجامدا هێزی ئەوو هەموو کاربەدەستانی دەوڵەت وەك مەوالی و پۆلیس و حاجیب و نوسەر و سەرۆکی پاسەوانان زۆرتر دەبێت و شان وشکۆیان فراوان دەبێت و، دەست دەکەن بەکۆکردنەوەی سەروەت و سامان و سودێکی زۆر لەماڵ و سامانە کانیان دەبەن. دواترو لەپاش هەرسهێنانی عەصەبیەت دەبینین پیری ڕوودەکاتە دەوڵەت و پایەکانی لەق دەبن‌و لەم کاتەشدا خاوەنان و بەرپرسانی دەوڵەت بەهۆی سەرکەشان هەڵگەڕاوەکانەوە کەنەوەك ڕەخنە لەدەوڵەت بگرن و بیڕوخێنن، هەربۆیە پێویستی بەهاوکارو پشتیوانان دەبێت‌و هەربۆیە دەرامەتی خەراجی ئەو بەئەندازەی خەرجی پشتیوانانی دەوڵەت دەبێت‌و کەبریتین لەخاوەنانی شمشێرو عەصەبیەتەکان.

گەنجینەکانی دەوڵەتی لەڕێگەی کارەچاکسازیەکانی دەوڵەتدا خەرج کردووە و لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەهۆی زیادکردنی ئەندازەی خەرجیەکان زۆری خەرجی داب و نەریتەکانەوە، هەروەك لەڕابووردودا باسمانکرد ئەندازەی خەراج و باجیش کەم دەبێتەوەو دەوڵەت دووچاری تەنگدەستی دارایی دەبێتەوە و سێبەری خۆشگوزەرانی لەسەر سەری پیاوانی دەوڵەت لای دەچێت و بازنەی خۆشگوزەرانیەکانیان لەبەردەمدا تەسك دەبێتەوە. قەیرانی دارایی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ توند دەبێتەوە و داروودەستەی دەوڵەت ئەوسەروەت وسامانەی کەلەباپیرانیانەوە بۆیان بەجێمابووبەهۆی وەلانانی نەریتە پەسەندەکانی پێشینانیانەوە لەکاری ناباش و ناپەسەندا خەرجیان کردووە و هیچیان لەبەردەستدا نەماوەتەوە. ئەوکات داروودەستەی دەوڵەت دێنەسەر ئەو باوەڕەی کەئەو

واتە سوڵتان شایستەترە کەخاوەنداریەتی سەروەت و سامانی دەوڵەتی لەئەستۆدا بێت چونکە باوباپیرانیان ئەم هەموو سەروەت وسامانەیان لەدەوڵەتی پێشینان و بەهۆی هێزی دەسەلاتی ئەوەوە بەدەستیان هێناوە. هەربۆیە وورده وورده دەست دەکەن بەکۆکردنەوەی هەموو ئەو سامانەی کەلەژێردەستی بەرپرسانی دەوڵەتدایە بۆ ناوگەنجینەی دەوڵەت بەتەنها و ئەمەش وادەکات کەپیاوانی دەوڵەتی و خاوەن پلەو پایەکان ڕقیان لەدەوڵت ببێتەوە و لێی دوور دەکەونەوە و، ئەمەش دەبێتە هۆی ڕووخان یان هەرەسهێنانی ئەو کۆشکو تەلارانەی کەئەم کەسانە بۆ خۆیان و دەوڵەتیش دروستیان کردبوون. هەروەك چۆن هاوشێوەی ئەم مانایە بۆ وەزیرانی دەوڵەتی عەباسی وەك خانەدانی قەحتوبە برمك و خانەدانی سوهەیل و تاهیریەکان ڕوویدا. وەهەروەها لەدەوڵەتی ئەمەویانی ئەندەلوسدا لەکاتی لەناوچوونیدا لەسەر دەمی ملوك التوایفدا خانەدانی شەهید و خانەدانی ئەبو عبیدە و خانەدانی حەریر و خانەدانی برد و نمونەی ئەمانە دووچاری ئەم چارەنوسە بوونەوە، وەهەروەها لەودەوڵەتانەیشی کەهاوچەرخی ئێمەن هاوشێوەی ئەم ڕووداوانە ڕوویانداوە. دەستوری خودایە کەڕابورد لەنێو بەندەکانیدا[٣٧٢].

## بەشێك

بەهۆی ئەوەی کەدارودەستەی دەوڵەت چاوەڕێی ئەم جۆرە لەناوچوونە ناهەموارانەن زۆرێکیان خوازیاری ئەوە دەبن کە واز لەدەسەلات بهێنن و لەژێر فەرمانی سوڵتان بێنە دەرەوە و ئەوەی کەلەماڵ و سامانی دەوڵەت بەدەستیان هێناوە هەڵیبگرن و بەرەو شوێنێکی تریچن و پێیان وایە کەبەم جۆرە ئاسودە ترن و بەئاسانی دەتوانن ماڵ و

---

[٣٧٢] (سُنَّتَ اللهِ قَدخَلَتْ فی عِبادِهِ) س مومنون ئا ٨٥. (سُنَّةَ اللهِ الَّتي قَد خَلَت مِن قَبلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللهِ تَبـدِيلاً) س فتح ئا ٢٣ س احزاب ئا ٦٢.

سامانەکەیان لەخۆشگوزەرانیدا خەرج بکەن. ئەمەلەکاتێکدا وەها بیر کردنەوەیەک هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و ژیانیان لەناودەبات. وەدەبێت ئەوە بزانین کەڕزگاربوون لەم چارەنوسە لەپاش مانەوە تێیدا زۆر دژوارو سەختە، چونکە ئەگەر کەسێك ئەم مەبەستە لەسەریدا پەروەردەبکات وەهەم پاشا وەهەم ژێر دەستەکان و خاوەنانی عەصەبیەتیش کەبەردەوام ئەمیان خستووەتە ژێر فشارەوە و بێزاری دەکەن و، بۆ تەنها ساتێکیش بواری ئەوەی پێ نادەن کەئەم بیرۆکەیەی جێبەجێ بکات و ئەگەر بێت و ئەم بیرۆکەیەش ئاشکرا بکات دووچاری چارەنوسێك دەبێتەوە کەدەبێتە هۆی زیانگەیاندن بەووڵات و لەناوچوونی ئەویش چونکە نەریت بەو جۆرەیە. لەم ڕووەوەی کەدەوڵەتداری لەو کاروبارانەیە کە ڕزگار بوون لێی دژوارە بەتایبەت لەکاتی گەورەبوونی ڕووداوەکاندا و دروستبونی کێشەو ئاژاوە و دورکەوتنەوەی بەرپرسان لەسیفەتە جوانەکان و نزیك بوونەوەیان لەسیفەتە ناپەسەندەکان. وەئەگەربێت ئەو کەسەی کەئەم جۆرە فیکرانە لەسەریدا پەروەردەکات لەکەسەنزیکەکانی پاشابێت زۆربەکەمی دەتوانێت گیانی سەلامەت بێت. چونکە پاشاو دەسەلأتدارەکان پێیان وایە کەدارودەستەکەیان وەك خزمەتکار وەهان و هیچکات ڕێگەنادەن کە تەنانەت بیر لەو جۆرە کارانەش بکەنەوە نەوەك ئەنجامیشی بدەن. وەهەروەها غیرەت و پیاوەتیان ڕێگەی ئەوەیان پێنادات کە لەوەها کارێك گوزەشت بکەن و لێپرسینەوە لەئەنجامدەرەکەی نەکەن هەروەك چۆن ئەمەویەکانی ئەندەلوس تەنانەت ڕێگەشیان نەدەدا کەخزمەتکاران و دارودەستەی دەوڵەتی فەریزەی حەجیش بەجێبهێنن چونکە وایان دەزانی بەنی عەباس لەدەستی ئەمانیان دەرفێنن. هەربۆیە هیچکام لەکارمەندانی دەزگای دەوڵەتی لەئەندەلوس لەهەموو قۆناغەکانی فەرمانڕەواییاندا نەیاندەهێشت هیچ خزمەتکارێك حەج بکات تائەوکاتەی کەئەمەویەکان لەناوچوون و دەسەلأت کەوتە دەستی ملوك التوايف لەپاش ئەوە ڕێگە بەو کارە درا.

بەدەر لەمەش بابڵێین یەکێك لەپاشاکان ڕێگەی وەها کارێك بەیەکێك لەخزمەتکارەکان بدات، بەڵام هیچکات ڕێگەی ئەوەی پێ نادات کەسەروەت و سامانی وولاتەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات، هەروەك چۆن پێیان وایە کەخودی خۆیشی یەکێك لەئەندامان و خزمەتکارانی دەوڵەت واتە موڵکی ئەو دەوڵەتەیە و سامانەکەیشی بەسامانی دەوڵەت و خۆیانی دەزانن چونکە لەژێر سێبەری ئەمان و دەوڵەتەکەیاندا ئەو پارەو سامانەی پەیدا کردووە، هەربۆیە یان خۆی و ماڵ و سامانەکەیشی دەست بەسەردا دەگرن وەك ئەوەی کەموڵکی دەوڵەت بن یان سامانەکەی لێدەسەننەوە و واز لەخۆی دەهێنن. سەرەڕای ئەمەش باوادابنێین کەئەو بتوانێت ئەوداراییەببات و بچێتە سەرزەمینێکی ترەوە هەرچەندە ئەم حاڵەتە زۆر بەکەمی ڕوودەدات، ئەوکات پاشای ئەو وولاتە بەزەبرو زەنگ و چاوترساندن دەستی بەسەردا دەگرێت و پێی وایە ئەوسامانە لەباج بەدەستهاتووە و، باشتر وایە لەڕێگەی بەرژەوەندی گشتیدا سەرف بکرێت نەوەك بۆ کەسێکی تایبەت چونکە پاشاکان ئەو داراییانەی کەلەڕێگەی باجەوە دەستیان دەکەوێت بەشەرعی و حەلاڵی دەزانن کەبەکاری بهێنن. سەیرکەو بزانە چ چارەنوسێك دووچاری قازی جبلە بوویەوە کاتێك لەدژی ئیبن عەمار سەرۆکی تەرابلوس راپەڕی و، دەستی دایە کودەتا هەرئەوەندەی کەفەرەنگیەکان دەسەلاتیان لەو ناوچەیەدا پەیدا کرد قازی جبلە بەرەو دیمەشق هەڵهات و دواتر چوویە بەغداد و سوڵتان برکیاروق لەوێدا حوکمی دەکرد ئەم ڕووداوە لەسەدەی پێنجەمدا ڕوویداوە. لەپاش ئەوەی لەبەغداد مایەوە هێندەی نەبرد کەوەزیری سوڵتان چوویەلای ئەوو بەشێکی زۆری دارایەکەی وەك قەرز لێی وەرگرت و دواتریش هەموو داراییەکانی داگیرکرا ڕێژەکەیشی ئەوەندە زۆربوو لەژمارە نەدەهات. وەهەروەها سوڵتان ئەبو یەحیا زەکریای کوڕی ئەحمەدی لحیانی نۆیەم یان دەیەمین پاشای حەفصیەکانی ئەفریقا هاتە سەر ئەوەی کە لەسەڵتەنەت واز بهێنێت و چوویە میسر بۆئەوەی بتوانێت لەداخوازی خاوەنانی سغور خۆرئاوا کەسوپایەکیان بۆ جەنگ لەدژی تونس کۆکردبوویەوە هەڵبێت و، هەربۆیە لحیانی چوونی بۆ سنوری تەرابلوسی

هەڵبژارد و ئەمەش لەکاتێکدا نیەتی خۆی بەنهێنی هێشتبویەوە. وەلەوێوە سواری کەشتی بوو گەیشتە ئەسکەندەریە و هەموو ماڵ و سامانی بیت المالی لەگەڵ خۆیدا بردبوو هەرچیش لەگەنجینەی ئەو نەتەوەیەدا بوو تەنانەت کتێبەکانیشی فرۆشتبوون و پارەکەی لەگەڵ خۆی بردبوویە میسر.

ئەوەبوو لەساڵی ٧١٩ (١)دا گەیشتەلای مەلیك ناصر بن قلاون و مەلیك ناصریش بەخێرهاتنی کردوو لەپلەیەکی بەرزدا دایناو هاوکات کەم کەم لەماڵ و سامانەکەی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ وەردەگرتو، تائەوەبوو هەموو سامانەکەی لێ سەند و بێجگەلەمووچەی ئەو ئەرکەی کەپێی سپێردرابوو پارەیەکی بۆ نەمابوویەوە، ئەوەبوو لەساڵی ٧٢٨ دا مرد هەروەك چۆن دواتر لەباسی تایبەت بەخۆیدا گفتوگۆی لەبارەوە دەکەین. ئەم ڕووداوانە و نمونەی ئەمانە لەو خەیاڵە پووچانەن کەفەرمانڕەوایانی دەوڵەتان لەسەریاندا پەروەردەیان دەکەن بەهۆی ترسی لەناوبردنیان لەلایەن سوڵتان وپاشاکانیانەوە. لەوانیە لەهەندێك حاڵەتدا گیانی خۆیان ڕزگار بکەن، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەو پارەو سامانەیان بەنسیب نابێت و لەدەستیان دەسەنرێتەوە لەوانەیەدواتر ئەو مووچەوپلەو پۆست و ناوبانگەی کەهەیانبووەبتوانن بەهۆیەوە ژیانێکی ئاسایی بگوزەرێنن، ئیتر بەهەرشێوەیەك لەو شێوانە بێت کەباسما نکردن، وەیان لەڕێگەی بازرگانی یان کشوکاڵەوە گوزەرانی خۆیان دابین بکەن. وەدەوڵەتەکان ئەنسابن، بەڵام نەفس والێبکەیت حەزلەهەرشتێك بکات ئەوا بەرەو ئەو شتە دەڕوات، ئەگەربێت و لەسەر قەناعەت کردن بەکەم ڕاتهێنا ئەوا سەربەرز دەبێت. (وەخوداش ڕۆزی دەرو خاوەن هێزێکی پایەدارو لەبن نەهاتووە).[٣٧٣]

---

[٣٧٣] (إنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو القُوَّةِ المَتِين) س زاریات ئا ٥٨ .

# بەشی چل و دووەم

## لەبارەی ئەوەی کە ئەگەربێت و سوڵتان مووچەو خەرجیەکان کەم بدات بەخەڵکی دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی خەراج

هۆکارەکەیشی ئەوەیە کەدەوڵەت و سوڵتان وەك گەورەترین بازاڕن بۆ جیهان کەمادەی کۆمەڵگەو ئاوەدانی لەوەوە بەدەست دێن. هەربۆیە ئەگەر هاتو دەوڵەت باجەکان کۆبکاتەوە و لەشتی باش و ڕاستەقینەدا بەکاریان نەهێنێت ئەوکات ئەوپارەیەی کەلەدەستی سوپادایە کەم دەبێتەوە و ئەوەیشی کەلەمانەوە بەخزم و نزیکانیان دەگات دەبڕدرێت و نامێنێت و بەشێوەیەکی گشتی لەدەرامەتیان دەدات و، ئەمانەش زۆربەی خەڵکی شارەکان پێك دەهێنن کەدەرامەتیان لەخەڵکانی تر زۆرترەو سەرمایەی بنەڕەتی بازاڕە. ئەمەیە دەبێتەهۆی کەسادی بازاڕو نەمانی قازانجەبازرگانیەکان و کەم بوونەوەی باج چونکە هەمووباج وماڵیاتەکان لەڕێگەی سەوداو مامەڵەی هاووڵاتیانەوە لەبازاڕدا دەبێت و کەبازاڕیش بشێوی تێکەوت و خەڵکی قازانجیان نەکرد ئەوا باجەکانیش کەم دەبنەوە یاخود هەرنامێنن. دەرئەنجامی ناسازگاریشی بەرۆکی سەروەت و سامانی سوڵتان دەگرێت و کەم دەبێتەوە چونکە لەڕێگەی باجەوە سەروەت و سامانی ناوبراو بەدەست هاتووە و، هەروەك باسیشمانکرد بنەماو دایکی جووڵەی بازاڕ بەهۆی زۆری دەرامەت و خەرجیەکانەوەیە، وەئەگەر ئەم بازاڕە بنەڕەتیە واتە دەوڵەت پشێوی و کەساد ڕووی تێبکات خەرجیەکانی کەم ببنەوە ئەوا بازاڕ بەشێوەیەکی خراپتر ئەو بارودۆخە ڕووی تێدەکات، وەهەروەها ئەوەش دەزانین کەسەوداو مامەڵە لەنێوان

دارودەستەی سوڵتان و خەڵکیدا دەکرێت و لەخەڵکیەوە دەگات بەسوڵتان و بەپێچەوانەشەوە، وەئەگەر سوڵتان لەلای خۆی بیهێڵێتەوەو نەیخاتەکار ئەوکات خەڵکی لەدەستی دەدەن، سوننەتی خودایە لەنێو بەندەکانیدا.

# بەشی چل و سێیەم

## لەبارەی ئەوەی کەستەم کردن ڕاگەیەنەری وێرانی کۆمەڵگەو ئاوەدانیە

دەبێت ئەوەبزانین کەدەستدرێژی بۆسەر ماڵ و سامانی خەڵکی وایان لێدەکات کەنائومێد بن لەبەدەستهێنانی سەروەت و سامان، چونکە دەبینن لەوەها هەلومەرجێکدا سەرئەنجام داراییەکەیان داگیر دەکەن. هەربۆیە لەهەوڵ و کۆشش بۆ بەدەستهێنانی سەروەت و سامان سارد دەبنەوە و واز لەسەوداو مامەڵە دەهێنن. داگیرکردن و تاڵانکردن هەرچەندێك بێت بەهەمان ئەندازە خەڵکی لەکارو کەسابەت دوور دەخاتەوە، وەئەگەر بێت و دەستدرێژیەکە بۆسەر هەموان بێت ئەوا بەشێوەیەکی گشتی ڕێگەلەهەموو شێوازەکانی کەسابەت و مامەڵە دەگرێت، خەڵکی نائومێد دەکات لەپیشەگەری و وازلەهەموو پیشەو هونەرەکان دەهێنن. وەئەگەر دەستدرێژیەکە کەم بێت ئەوا نائومێدی خەڵکیش لەپیشەو بەدەستهێنانی سامان کەم دەبێتەوە. ئاوەدانی فراوانی ڕەواجی بازار تەنها لە کاروکۆششی خەڵکیدایە بۆ بەرژەوەندی ژیان و پیشەکان و ئەمەش بەهەوڵ و ماندو بوون و کۆشش دەبێت، هەربۆیە ئەگەر خەڵکی لەڕێگەی ژیان و گوزەراندا هەوڵ نەدەن و واز لەپیشەکان بهێنن ئەوا بازاڕە کانی کۆمەڵگەو ئاوەدانی ڕەونەقی نامێنێت و بارودۆخ تێك دەچێتو خەڵکی بۆبەدەستهێنانی ڕۆزیو ژیانیان بەناوچەکانی دوور لەناوچەی خۆیاندا بلاو دەبنەوە و، لەئەنجامدا دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کەم دەبنەوە و شارەکانی لەدانیشتوان چۆڵ دەبن و شارەکانی وێران دەبن بێسەرو بەری و پەرێشانی ئەوناوچەیە ڕوولەسوڵتان و دەوڵەت دەکات، چونکە دەوڵەت بۆ کۆمەڵگا وەك شێوەیە

کەکاتێك مادەکەی لەناو دەچێت ئەوا شێوەکەیشی لەناو دەچێت. لەم بارەیەوە دەتوانین ئەو بەسەرهاتەی کەمەسعودی لەبارەی ئێرانیەکانەوە هێناویەتی لەبەرچاوبگرین کەبریتیە لەوەی: موبیدان پێشەوای ئاینیان لەسەر دەمی بەهرامی کوڕی بەهرامدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پاشای لەو زوڵم و زۆرەی کەدەیکرد ئاگادار کردەوە کەنەیکاتو نمونەیەکی لەسەر زمانی کونەبەبویەکەوە هێنایەوە و گووتی: کاتێك پاشا ئاوازەکەی کونەبەبوەکەی بیست پرسی ئایا قسەی ئەم باڵندەیە تێدەگەیت؟ موبیدان گووتی بەڵێ کونەبەبویەکی نێر ئەیەوێت لەگەڵ مێیەکدا جووت بگرێت و، کونەبەبوی مێینە ئەیەوێت دەگوند لەو گوندانەی کەلەسەردەمی بەهرامدا وێران بوون وەك مارەیی داوابکات. تاوەکو لەناویاندا دەست بکات بەگریەو زاری و نێرەکەش مەرجی مێیەکەی قبوڵکرد و پێی گووت ئەگەر فەرمانڕەوایی ئەم پاشایە بەردەوام بێت ئەوا هەزار گوندیش وەك مارەیی دەدەم بەتۆ، وەها مەرجێکیش لەهەموو شتەکان ئاسانترە. پاشالەخەوی بێئاگایی ڕاپەڕی و لەگەڵ موبیدان دووبەدوو دانیشتن و پرسیاری لەبارەی مەبەستی ئەوەوە لەو قسانەی کرد؟

موبیدانیش گووتی: وولآت سەربەرزنابێت بێجگەبەئاین و فەرمانبەری خوداو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و دوور کەوتنەوە لەخراپەو قەدەغەکراوەکانی و ئاینیش پەرەناگرێت بێجگە لەڕێگەی پاشایەتیەوە و پاشایەتیش گەورەیی بەدەست ناهێنێت، مەگەر لەڕێگەی پیاوانی جوامێرو مەردەوە و مەردانیش نابنە خاوەنی ڕێز مەگەر بەهۆی ماڵ و سامانەوە و سامانیش وەدەست ناکەوێت مەگەر بەهۆی ئاوەدانیەوە وناتوانرێت کەس بگاتە ئاوەدانی مەگەر بەدادگەری نەبێت. دادگەریش ترازویەکەلەنێو خەڵکیدا کەخودا دایناوە و بەهاو پاسەوانی بۆ داناوە کەپاشاکانن، وەتۆ ئەی پاشا گوندو ماڵ و سامانی خەڵکیت وێران کردووە و ئەوباجەی کەلەوانی وەردەگریت لەبری ئەوەی کەلەخزمەتی ئەواندا بەکاری بهێنی لەخۆشگوزەرانی خۆت و، دارودەستەکەتدا سەرفی دەکەیت ووایان لێهاتووەکە ئاوەدانی کاری چاکەیان لەبیر چووەتەوە و هیچ جۆرە

چاکسازییەك ئەنجام نادەن و، لەلایەکی تریشەوە لەباجدان بەخشراون ئەوەش بەهۆی ئەو نزیکیەی کەلەپاشاوە هەیانە و لەبەرامبەردا باجێکی زۆر لەخەڵکانی وەردەگیرێت و وایان لێهات کەواز لەکارو کەسابەت بهێنن و، لەشارو کێڵگەکاندا لەکارکردن بوەستن و پەناببنە ئەو شوێنانەی کەدەستی ستەمیان پێناگات و لەوێدا دەستیان کردە ژیان و گوزەرانی خۆیان و ئاوەدانی کەم بوویەوە و گوندو کێڵگەکان وێران بوون‌و، سەروەت و دارایی لەناوچوو سوپاو خەڵکەکەت لەناوچوون و، بەهۆی لاوازی وولاتەکەتەوە دەوڵەتانی دراوسێ تەماعیان لەمەملەکەتەکەت کرد و بەشێکی زۆریان لێ داگیر کرد..

کاتێك پاشا ئەم قسانەی بیست ئاوڕێکی بەلای کارو باری وولاتدا دایەوە و ئەوەی ماڵ‌و سامانی گشتی بوو لەدارودەستەکەی خۆی وەرگرتەوە و گەڕاندیەوە بۆ خاوەنە کانیان و بەهەمان شێوەی پێشو هانی دان و، بێهێزەکان هێزیان پەیدا کردەوە و وولات ئاوەدان بوویەوە و شارەکان ئاوەدان و فراوان بوون و دارایی زیادی کردو سوپا بەهێز بوویەوە و دووژمنان لاواز بوون و سنورەکان پڕبوون لەپیاوانی بەهێز. پاشا بەتەنیا خۆی کاروبارە گرنگەکانی دەوڵەتی گرتە ئەستۆو خەڵکی ژیانیان باش بوو یاسا لەوولاتدا بەرقەرار بوویەوە. لەم چیرۆکەوە دەبێت ئەوە تێبگەین کە ستەمکردن وولات بەرەو وێرانی دەبات و دەوڵەت هەرەس دەهێنێت.

نابێت هەندێك جار لەهەندێك ناوچەدا کەدەبینین ستەم دەکرێت، بەڵام وولات ئاوەدانەو وێران نەبووە گومان لەوبنەمایە بکەیت کەئێمە گوتمان‌و پێت وابێت قسەکەمان لۆژیکی نیە. چونکە ئەوەی کەستەم لەو شارانەداهەیەو لەهەمان کاتدا وێرانیشیان پێوە دیار نیە ئەوەیەکە لەوانەیە ئەو شارە هێندەگەورە بێت کەئەو حاڵەتەی پێوە دیار نەبێت و بەهۆی تێکەڵی هەلو مەرجەکانەوە بەیەکتری ئەو ستەم و وێرانیەی کەتێیدا ڕوودەدات نابانگ دەرنەکات و زۆر ئاشکرانەبێت، چونکە وێرانی‌و کەم و کورتی وورده وورده ئاشکرا دەبێت و بەدەر دەکەوێت، وەهەرکات بەبۆنەی زۆری ئاوەدانی و نازو نیعمەت و هەبوونی ئیش و کارێکی زۆرەوە لەشارستانێکدا ئەوا بەدڵنیاییەوە کەم و

کورتیەکانی دیار نەبن ئەوا بێگومان دواتر و کەم کەم ودوای ماوەیەکی دوور و درێژ شوێنەواری وێرانکاری،و، ستەم دەردەکەوێت و هەندێك جاریش لەوانە ئەو دەوڵەت ستەمکارە بەر لەشارەکان خۆی هەرەس بهێنێت و لەناو بچێت و دەوڵەتێکی تر بێتە سەر کارو سەر لەنوێ دەست بکاتەوە بەئاوەدانی،و، کەم و کورتیە نەبینراوەکان بەیەکجاری نەهێڵێت بەجۆرێك هەست بەهیچ کەم و کورتیەك نەکرێت، بەڵام بارودۆخێکی لەم جۆرە زۆر بەدەگمەن ڕوودەدات.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کەبەدیهاتنی وێرانی و کەم و کورتی لەکۆمەڵگەدا بەهۆی ستەم و دەستدرێژیەوە، هەروەك چۆن بەڵگەکانیمان باسکرد، لەواقیعیەتە زەق و ئاشکراکانەو دەرئەنجامە خراپەکانی بەرۆکی دەوڵەتان دەگرێت و نابێت وابزانین کەستەم کردن هەر تەنها بریتیە لەوەرگرتنی ماڵ و، سامانی خەڵکی بەزۆر بەڵکو ستەمگەری چەمکێکە کەمانایەکی گشتگیر تری لەمە هەیە و هەرکەسێك ماڵی خەڵکی داگیر بکات و خاوەنەکەی بکاتەوە بەنۆکەرو کرێکار لەسەری، وەیان بەناهەق شتێکی لێبسەنێت و ناچاری بکات بۆ ئەنجامدانی کارێك کەشەرع واجبی نەکردووە پێی دەگوترێت ستەمگەری ئەمەش بەزۆری لای دەسەلأتدارانی دەوڵەت دەبینرێت. کەواتە ئەو کەسانەی کەبەناهەق خەراج وەردەگرن و یان بەناوی باج و خەراجەوە ماڵی خەڵکی داگیر و تالأن دەکەن و ئەوانەشی کە مافی خەڵکی پێشێل دەکەن و، هاوشێوەی ئەمانە لەداگیر کەران پێیان دەگوترێت ستەمگەر و دەرئەنجامی خراپی کارەکانیشیان بەرۆکی دەوڵەت دەگرێت و سەرئەنجام دەبێتە هۆی وێرانی دەوڵەت و ئاوەدانی وولأت و خەڵکی توشی چەقبەستن دەبن. دەبێت ئەوەش بزانین کەمەبەستی شارع (خودا)لەقەدەغەکردنی ستەمگەری بریتیە لەوێرانبوونی وولأت و لەناوچوونی ڕەگەزی مرۆڤ و ئاوەدانی سەرزەوی. ئەم حیکمەتە گشتیەش شەرع لەهەموو پێنج مەبەستە زەروریەکانی ئایندا (المقاصدالشرعیە) ڕەچاوی کردووە کەبریتین لە: پاراستنی ئاین و گیان و ناموس و وەچەو و ماڵ وسامان. وەلەبەر ئەوەکە ستەمگەری هەروەك بینیت نەژادی مرۆڤایەتی لەناو دەبات و دەبێتە

وێرانی کۆمەڵگە، هەربۆیە حیکمەت و فەلسەفەی ئەم ڕێگری کردنەلەستەم بەرگرتنە لەوێرانی و، لەناوچوونی نەژادی مرۆڤایەتی ئەمەش لەقورئان و سوننەتدا ئایەت و فەرموودەی زۆری لەبارەوە هاتوون و لێرەدا ناتوانین هەموویان ئاماژەپێبکەین. ئەگەر هەرکەسێك توانای ئەنجامدانی ستەمی هەبوایە لەبەرامبەریانەوە وەك کوشتن و زیناو مەستی کەهەرکەسێك دەتوانێت ئەنجامیان بدات ئەوا تۆڵەو ئەشکەنجەیەکی بۆ دیاری دەکرا، بەڵام بەزۆری ستەمگەری بەدەستی ئەوکەسانە ڕوودەدات کەلەسەروویانەوە دەسەڵاتێکی تر نیەو ئەم تاوانەش تەنها خاوەن هێزو زۆرەکان ئەنجامی دەدەن، هەربۆیە شارع (خودا)زۆر بەتوندی ئەم کارەی سەرکۆنە کردووە ئەمەش بۆ ئەوەی کەئەو کەسانەی کەدەتوانن ستەم بکەن و، هێشتا نەیانکردووە بەهۆی ئەو هەڕەشانەوە بترسن‌و لەو کارە دوور بکەونەوە و (خوداش ستەم لەبەندەکانی ناکات)[٣٧٤].

وەنابێت بڵێین سزایەك بۆ چەتەو ڕێگرەکان دانراوە بەدیاری کراوی[٣٧٥]. بەڵکو پەیوەستە بەجۆری ستەمی ئەو کەسەوە کەتوانای ستەمکردنەکەی هەیە، چونکە چەتە لەکاتی ڕێگری و چەتەگەریەکەیدا توانای ستەمکردنی هەیە لەماڵ و گیانی خەڵکیدا، ئەم قسەیەش دەتوانین بەدوو شێوە وەڵام بدەینەوە: یەکەمیان ئەوەیە کەبڵێین سزایەك بۆ ئەم کارە دانراوە و لەبەرامبەر جۆری ئەو تاوانەوەیە کەتاوانبار ئەنجامی دەدات، وەك تاوانی گیانی و ماڵی لەدژی خەڵکی، هەروەك چۆن زۆرێك لەزاناو فەقیهەکان لەسەر ئەم بیرو باوەڕەن ئەم کارەش لەپاش توانایی حەزکردن بەتاوانەکە ڕوودەدات، بەڵام خودی چەتەیی سزایەکی تایبەتی بۆ دانەنراوە. دووەمیشیان ئەوەیە کەبڵێین ناتوانین بەچەتە بڵێین کەسێکی بەهێزە چونکە مەبەستی ئێمە لەهێزی ستەمکار دەستدرێژیٔ و هێزێکی فراوانە کەهیچ هێزێك نەتوانێت لەبەرامبەریەوە بوەستێتەوە و، ئەم جۆرە هێزەش کاتێك

---

[٣٧٤] (وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ) س فصلت ئا ٤٦.

[٣٧٥] (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَافٍ أَوْ يُنفَوْا مِنَ الأَرْضِ) س المائدة ئا ٣٣ .

لەستەمگەریدا بەکارهات دەبێتە هۆی وێرانی، بەڵام هێزی ڕێگرو چەتە بریتیە لەهەڕەشەیەك کەدەیکاتە هۆکارێك بۆ داگیرکردنی ماڵ و سامانی خەڵکی، وەڕێگری کردن لێی لەلایەن موسوڵمانانەوە لەشەرعدا بڕیاری لەبارەوە دراوە، هەربۆیە ناتوانین وەك هێزێکی بدەینە قەڵەم کەدەبێتە هۆی وێرانی بەشێوەیەکی گشتی، خوداش هەرچیەك کەبیەوێت توانای هەیە بەسەریدا.

## بەشێك

لەقورسترینی ستەمگەریەکان ئەوەیە کەخەڵکی ناچار بکەیت بەکارێك کەناڕەوایە یاخود کارێکیان پێبکەیت و هیچ جۆرە هەقدەستێکیان نەدەیتێ و بێگاریان پێبکەیت، چونکە کاری مرۆڤ لەماڵ و سامانەکەیدایە هەروەك چۆن ئەم مانایە لەبەشی ڕۆزیدا ئاماژەی پێدەکەین و، ئاشکرای دەکەین و دەڵێین کەڕۆزی و کەسابەت بریتین لە بەهاو نرخی کاری ئەو کەسانەی کە لەکۆمەڵگەیەکدا دەژین، هەربۆیە هەموو هەوڵ و کارەکانیان هەقدەستیان هەیەو بژێویان لەسەریەتی و بێجگەلەکارەکەیان دەرامەتێکی تریان نیە، چونکە خەڵکانێك کەلەئاوەدانیدا کار دەکەن ئەوا گوزەران و پیشەیان هەمان ئەوکارەیانە. هەربۆیە ئەگەر بێت کارێکی نەشیاو یان هەمان کاری خۆیانیان پێبکرێت و لەبەرامبەردا هەقدەست و، مووچەیان نەدرێتێ کەگوزەرانیان لەسەریەتی ئەوا کەسابەتەکەیان بەتاڵ دەبێتەوە و لەڕاستیدا بەهای کارەکەیان داگیر کراوە کەبریتیە لەهەقدەست و سامانەکەیان هەربۆیە زیانێکی گەورەیان پێدەگات و هەموو داهاتیان زەوت دەکرێت وداگیر دەکرێت. وەئەگەر ئەم ستەمە لەدژیان دووبارە ببێتەوە ئەوا هیوایان بەئاوەدانی نامێنێت و نائومێد دەبن و بەشێوەیەکی گشتی واز لەهەوڵ و کۆشش کردن بۆ ژیان و گوزەران و، ئاوەدانی دەهێنن ئەمەش دەبێتە هۆی وێرانبوونی وولات و کۆمەڵگا، خوداش بۆ هەرکەسێك کەبیەوێت ڕۆزی بێشوماری پێ دەبەخشێت.[٢٧٦]

---

[٢٧٦] ( وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ) س البقرة ئا ٢١٢.

## بەشێك

جۆرێکی تری ستەمگەری کەلەوانەی پێشو زۆر خراپترە بریتیەلە زاڵبوون و دەسەلآت پەیداکرن بەسەر ماڵو موڵکی خەڵکیدا ئەوەش بەکڕینی کالآو شتومەکەکانیان بەهەرزانترین نرخ و فرۆشتنەوەی هەمان ئەو کالآیانە بەنرخێکی زۆر گران بەهەمان ئەو خەڵکە و بەزۆر کڕین و، فرۆشتنەکەیان لەگەڵدا کراوە. وەهەروەها ناچاریان دەکەن کەبەهای کالآکان بەقەرز بدەن لەکاتێکی دیاری کراودا، ئەوکاتیش بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو زەرەرە هەوڵ دەدەن ئەو کالآیانەی کەبەنرخێکی زۆر گران کڕیویانە بەهەرزان بفرۆشنەوە و، پارەی قەرزی ئەو کالآیانە بدەن کەبەتۆپزی پێیان فرۆشراوە بەم شێوەیە سەرمایەکانیان لەنێوان ئەم دوومامەڵەیەدا زیانی بەر دەکەوێت و کەم دەبێتەوە. وەهەندێك جار دەسەلآتدارانی دەوڵەت ئەم شێوازە لەبارەی هەموو بەشەکانو بازرگانانی دانیشتووی شاردا پەیڕەو دەکەن و لەگەڵ ئەو بیانیانەیشی کەلەوولآتانی ترەوە دێن و کالآو شتوومەك دەهێنن و، هەموو بازاردارەکانیشدا وەك ئەوانەی کەمادەی خۆراکی و میوەش دەفرۆشن و پیشەوەرانیش کەکالآی دروستکردنی خانو دروستدەکەن بەم شێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکەن. زەرەری ناوبراو بەرۆکی هەموو چینەکان دەگرێت و ئەم کردارە چەندین جار دووبارە دەبێتەوە و زیانێکی گەورە دەدات لەسەرمایەی خەڵکیو هیچ ڕێگەچارەیەکیشیان بێجگە لەوەی کە وازلەسەوداو مامەڵە بهێنن بۆ ناهێڵێتەوە، چونکە سەرمایەکەیان کراوەتە فیدای قەرەبووی قازانجی فەرمانڕەوایانی دەوڵەت و ئەوانەیشی کەبۆ کڕین و فرۆشتن لەشارەکانی ترەوە دەهاتن بەم هۆیەوە ئیتر نایەن بۆ ئەو شارە و، لەئەنجامدا بازاڕ توشی داڕووخان دەبێت و خەڵکی توشی کێشە دەبن، چونکە زۆرترینی هۆکاری ژیان و گوزەرانیان لەکڕین و فرۆشتنی کالآکاندایە وەهەرکات بازاڕەکانی سەوداو مامەڵە بوەستێت خەڵکی گوزەرانیان دەکەوێتە

نارەحەتیەوە و باج وەرگرتنی سولّتانیش کەم دەبێتەوە یان بەتەواوەتی لەناو دەچێت، چونکە هەروەك باسمانکرد زۆربەی هەرەزۆری خەراجەکەی لەناوەڕاستەکانی قۆناغی فەرمانڕەوایی دەولّەت و دواتریشدا کەلەسەر کالاّو شتوومەکە جۆراو جۆرەکان وەردەگیرا لەناودەچێت، ئەم بارو دۆخەش دەبێتە هۆی ڕوخانی دەولّەت و لەناو چوونی کۆمەڵگا و شارەکان و زیانەکەیشی کەم کەم ڕوولەدەولّەت دەکات، ئەم جۆرە فەسادی و وێرانیە لەکاتێکدایە کەهۆکارو پێداویستیەکانی خەڵکی داگیردەکرێن و شوێنەواریان نامێنێت، ئەمەش دەبێتەهۆی دروستبوونی کەلێن و خراپەو پشێوی‌و بێسەروبەری و هەرەسهێنانی دەولّەت.

هەربۆیە شەرع هەموو ئەم کارە خراپانەی حەرام کردووە و وەك خواردنی ماڵی خەڵك‌و بێ بەهاکردنی‌و، هەموو ئەو ڕێگەو هۆکارانەی کەدەبنە هۆی دروستبوونی خراپە لەکۆمەڵگەداو داخرانی هەموو ڕێگەکانی کارو کەسابەت. وەدەبێت ئەوەش بزانین کە هۆکاری هەموو ئەم خراپانە بریتیە لەویستی دەولّەت بۆ زیادکردنی سەروەت و سامانەکەی چونکە دەولّەت دەگاتە قۆناغی خۆشگوزەرانی و، نازو نیعمەت و سەرئەنجام خەرجیەکانی فەرمانڕەوایان و دارو دەستەی دەولّەت زۆر دەبن و بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ داهاتی دەولّەتدا بەرابەر نیە، هەربۆیە بەناچاریەوە هەوڵی ئەوە دەدەن کەلەژێر ناوی جۆراو جۆردا باجی زیاتر لەخەڵکی وەربگرن بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە دەرامەتی دەولّەت لەگەڵ خەرجیەکاندا بەرابەر بکەن، بەلاّم ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بارنەی خەرجیەکانی دەولّەت بەهۆی خۆشگوزەرانی و ڕۆچوون بەناو نازو نیعمەتدا فراوانتر دەبێت و تاوەکو وای لێدێت توانای دابینکردنی خەرجیەکانی نامێنێت و، وورده وورده بەرەو پیری و لاوازی هەنگاو دەنێت و سەر ئەنجام هەرەس دەهێنێت، خوداش تەقدیر کاری هەموو کارو بارەکانەو خودایەکیش بێجگە لەو بوونی نیە.

# بەشی چل و چوارەم

## لەبارەی ئەوەی کەبەچ شێوەیەك پەردە دەکەوێتە نێوان خەڵکی و سوڵتانەوە و ئەوەی کەچۆن ئەم پەردانە لەقۆناغی پیری دەوڵەتدا زۆر دەبن

دەبێت ئەوە بزانین کەدەوڵەت لەسەرەتای فەرمانڕەوایدا لەحەزو هەواو ئارەزووە کان بەدورە، هەروەك لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد، چونکە دەبێت پشت بەستوو بێت بەعەصەبیەتێك کەبەهۆیەوە کامڵ ببێت و زاڵ ببێت بەسەر دوژمنانیدا و شیعاری عەصەبیەتیشس بریتیەلەخووی دەشتەکیەتی. کەواتە ئەگەر دەوڵەت پشت بەئاین ببەستێت ئەو کات لەهەواو ئارەزوی دەوڵەتداری دوور دەکەوێتەوە وەئەگەر تەنها لەڕێگەی زاڵبوونو دەسەلاتەوە بگاتە سەربەرزی ئەوکاتیش خووی دەشتەکیەتی کەبەهۆیەوە زاڵبووە فەرمانڕەوایانی دەوڵەتیان لەم شێوە هەواو هەوەسانە دوور دەخاتەوە. کەواتە ئەگەر دەوڵەت لەسەرەتای فەرمانڕەواییەوە خووی دەشتەکیەتی هەبێت ئەوا بەرپرسان سیفەتی جوان و نزیك بوونەوە لەخەڵکی دەگرنە خۆیان و بەئاسانی ئەوکەسانەی کەدێن بۆلایان و هیچ جۆرە تەشریفاتێك لەم بارەیەوە قبوڵناکەن، بەڵام هەرئەوەندە دەسەلات و سەربەرزیان پەیدا کرد و دەستیان کردە فەرمانڕەوایی ڕەهاو بێ نیاز بێت لەخەڵکی، بەهۆی گفتوگۆی سوڵتان لەگەڵ دارو دەستەو نزیکانیدا کەمتر خەڵکی دەبینێتو کەسانێك تایبەت دەکات بەباربۆی خەڵکیەوەو بۆ بینینی کاربەدەستانی دەوڵەتیش حاجیبێك دیاری دەکات بۆ ئەوەی وەك هێڵێکی پەیوەندی بێت لەنێوان ئەوو خەڵکدا و، ئەم کەسەش لەنزیك دەرباری سوڵتانەوەیە. ئەوکات کاتێك

پاشایەتی دەگاتە قۆناغی گەورەیی و نەریتەکانی هەواو هەوەسی ئەو سەردەمە جێبەجێ دەکرێن و خاوەنانی دەوڵەت دەگۆڕێن و بەرەو خووی پاشاکان دەچن گەخوویەکی سەر سوڕهێنەرو تایبەتە. وەکەسێکیش کە بەرپرسی کارەکانی ئەوە دەبێت لەخووخدەکانی بزانێت و خۆڕاگربێت و واجباتە تایبەتەکانی بەباشی بزانێت چونکە زۆرێك لەپێشکارو کارگوزارانی سوڵتان بێئاگان لێیان و، هەندێك جار دەبنە هۆی تووڕەیی پاشاو تۆڵەیان لێدەکاتەوە. ئەمەیە کەئەم جۆرە نەریتانە تەنها خەڵکانێکی تایبەت لەخزمەتکاران دەیانزانن و هەرکەس لەخزمەتکارانی دەرباری پاشا نەبوونایە نەیاندەتوانی دیداری پاشا بکەن و ئەم کەسەتایبەتانە دەبنە نێوەندێك لەنێوان پاشاو خەڵکیداو ڕێگرن لەتوڕەبوونی پاشا لەخەڵکێن بەگشتی. هەربۆیە دەبینین سەرەڕای ئەو پەردەیەی کەدروستیان کردبوو پەردەیەکی تریش لەنێوان پاشاو خەڵکیدا دروست بوو ئەم پەردەیەش تایبەت تر بوو لەوەی پێشوو تەنها کەسە تایبەتەکان دیداریان دەکردو، خەڵکیش بێبەش بوون لەدیداری پاشا.

ئەم پەردەیە تەنها بەڕووی گەورە پیاوانی دەوڵەتدا هەڵدەدرایەوە کەواتە پەردەی یەکەم لەسەرەتای دەوڵەتدا بوونی هەبووە و هەروەك چۆن لەسەردەمی موعاویەو عبدالملیك و خەلیفەکانی ئەمەویدا باوی بووە، بەرپرسی ئەم پلەیەش پێی گوتراوە حاجب بەپێی مانای ڕاستی وشەکە. ئەوکات هەرکە سەردەمی عەباسیەکان هاتە پێشەوەو دەوڵەت گەیشتە قۆناغی نازو نیعمەت و شکۆ کەبەناوبانگە نەریتی پاشایەتی گەیشتە ئەو قۆناغەی کەپێویست بوو بگات، هەربۆیە ئەم بارو دۆخە بوویە هۆی ئەوەی کە پەردەی دووەم دابنرێت و ناوی حاجیب یان پەردەدار چەمکێکی تایبەتی وەرگرت و لەدەرباری خەلیفەکاندا دوو ژووری پێشوازی بۆ میوانان فەراهەم کرا: دەربارێك بۆ کەسانی تایبەتو دەربارێکیش بۆ خەڵکی ئاسایی، هەروەك لەمێژوویاندا باسکراوە. دواتریش پەردەیەکی تر دروست بوو ئەو کەسەیشی کەتایبەتکرابوو بەم پۆستەوە وای لەجێنشین و کوڕانی پاشاکان دەگەیاند کەئەگەر بێت و دیدار لەگەڵ بەرپرسانی دەوڵەتدا

بکات ئەوا لەشان و شکۆی کەم دەبێتەوە و، دەبوویە ڕێگر لەو چاوپێکەوتنانەدا و ئەمەش وایلێدەکرد کەبەرەو حکومەتی ڕەها بڕوات و لەبری جێنشین فەرمان دەربکات. مەبەستی ئەم پەردەدارەی سێیەمیش لەم کارەی ئەوەبوو کە والەجێنشین و پاشابکات کەبەتەواوەتی باوەڕ بەو بکەن و لەسەر نەریت و بیرو باوەڕەکانی خۆی ڕایبهێنێت و خۆی فەرمانڕەوای ڕەها بێت، هەربۆیە وەها پەردەو حیجابێك لەپێویستیەکانی فەرمانڕەوایی ئەون.

ئەم حیجابەش تەنهالەکۆتایی فەرمانڕەوایی دەوڵەتدا ڕوودەدات، هەروەك لەبەشەکانی گۆشەگیر کردنی سوڵتاندا باسمانکرد، و بەڵگەیشە لەسەر پیری و بەرەو نەمان و لەناوچوونی دەوڵەت و بەرپرسانی دەوڵەتانی تر لێیان ناترسن، چونکە دەسەڵاتدارانی دەوڵەتان لەکاتی پیری دەوڵەتدا پاشاکانیان شێوازی دەوڵەتی ڕەها لەدەست دەدەن هەربۆیە لەپێناویدا کۆششێکی زۆر دەکەن، چونکەحەزکردن لە فەرمانڕەوایی ڕەها لەناخ و سروشتی مرۆڤدا بوونی هەیە، بەتایبەت کەکەسێك کاندیدی ئەو پۆستەش بێت و هەلومەرجەکانیش لەبارین بۆ ئەو مەسەلەیە. خوداش زاڵە بەسەر کارەکانیدا.[٣٧٧]

---

[٣٧٧] (وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ) س یوسف تا ٢١ .

# بەشی چل و پێنجەم

## لەبارەی دابەشبوونی دەوڵەتێك بۆ دوو دەوڵەت

دەبێت ئەوە بزانین کەیەکەمین شوێنەوار کەبەهۆی پیری دەوڵەتەوە سەر هەڵدەدات بریتیە لەدابەشبوونی، چونکە پاشایەتی کاتێك دەگاتە قۆناغی گەورەیی و فراوانی و ئەو پەڕی خۆشگوزەرانیو چۆنیەتیەکانی جوانخوازیو بەرپرسەکانی دەستدەکەنە فەرمانڕەوایی ڕەها و دەستدەکەن بەهەوڵی سەربەخۆیی و جیابوونەوە لەو بەرپرسانەی کەپێشتر لەگەڵیاندا تەبا نەبوون لەدەوڵەتداو، ڕێگەنادات هیچ کەسێك بەشدار بێت لەبەڕێوە بردنی دەوڵەتدا بەجۆرێك تەنانەت گومانیش لەکەسە نزیکەکانی دەوڵەت دەکات و ئەوانیش لەترسی گیانیان بەرەو ناوچە سنوریەکان هەڵدێن و ئەوەکەسانەشی کەوەك ئەوان گیانیان لەمەترسیدایە دەکەونە شوێنیان و لەم کاتەشدا بازنەی سنورەکانی دەوڵەت وورد وورده بەرتەسك دەبنەوە و، دەسەڵاتی دەوڵەت لەناوچە دوورەکاندا کەم دەبێتەوە و نامێنێت. ئەم کەسانەش دەچنە ناوچە سنوریەکان بەهۆی نزیکیان لەیەکترەوە بیر لە سەر بەخۆیی و جیابوونەوە دەکەنەوە و پایەکانی دەوڵەت دەخەنە لەرزە و لەئەنجامدا دەبێتە هۆی دابەشبوونی دەوڵەت. لەم بارەیەوە دەتوانین دەوڵەتی ئیسلامی عەرەبی بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە، چونکە لەوکاتەی کەفەرمانڕەوایی دەوڵەت جێگیر بوو بازنەی سنورەکانیشی فراوان دەبوونو عەصەبیەتی خانەدانی عبدمناف هەڵنەوەشابوویەوە و، دەسەڵاتی بەسەر هەموو هۆزەکانی تری وەك موزەڕ دا هەبوو لەهەموو جومگەکانی فەرمانڕەوایی دەوڵەتدا هیچ ڕەگێکی شۆڕش بوونی نەبوو

بێجگە بزوتنەوەی هەندێك لەشوراتەكان (خوارج)كەلەڕێگەی بیدعەدا گیانیان بەخت دەكرد و بزوتنەوەكەیان مەبەست لێی دروستكردنی سەڵتەنەت یان دەسەلأتێك نەبوو هەربۆیە كاروباریان بەرەو پێشەوە نەدەچوو، چونكە ڕووبەڕووی عەصەبیەتێكی بەهێز دەبوونەوە. لەپاشان هەرئەوەندە فەرمانڕەوایی ئەمەویەكان هاتە پێشەوە و عەباسیەكان لەفەرمانڕە واییدا سەر بەخۆییان بەدەستهێنا، ئەوەش لەوكاتەدا بوو كەدەوڵەتی عەرەبی گەشتبووە ئەو پەڕی هێزو دەسەلأت و نازونیعمەت و ئەم قۆناغەش نیشانەكانی كەم بوونەوەی دەسەلأتی لەسنورەكاندا دەركەوتبوون، وەلەوەها هەلومەرجێكیشدا عبدالرحمانی داخیل بەرەو ئەندەلوس كەیەكێك بوو لەناوچە دوور دەستەكانی دەوڵەتی ئیسلامی بەڕێ كەوت و لەو ناوچەیەدا سەڵتەنەتێكی دامەزراند و لەدەوڵەتی عەباسیەكانی جیا كردەوە و دەوڵەتی گەورەی ئیسلامی بوو بەدوو بەشەوە.

ئەوكات ئیدریس بەرەو مەغریب ڕۆیشت و كودەتای ئەنجام داو بەربەرەكانی ئوروبەو مغیلەو زناتە پشتگیریان لێكردو لەدوای ئەویش كوڕەكانی شێوازی باوكیان درێژە پێداو سەر ئەنجام دەستیان گرت بەسەر هەردوو مەغریبدا (واتە مەملەكەتەكانی الجزیرەی خۆرئاواو مەراكیش). دواتر بەوشێوەیە لەدەسەلأتی ئەودەوڵەتە لەناوچە سنوریەكاندا كەم دەبوویەوە و ئەغلەبیەكان لەدژیان وەستانەوە و دواتریش شیعە ڕاپەڕین و هۆزەكانی كەتامەو صەنهاجە پشتیان گرتن و دەستیان بەسەر ئەفریقاو میسر و مەغریبو شام و حیجازدا گرت و ئیدریسیەكانیشیان تێكشكاند و دەوڵەتەكەیان كرد بەدوو دەوڵەتەوە، لەم كاتەدا دەوڵەتی عەرەبی بوبەسێ دەوڵەتەوە: یەكێكیان دەوڵەتی عەباسی لەناوەندی عەرەبدا كەبناغەی ئیسلامی پێك دەهێنا، دووەمیش دەوڵەتی بەنی ئومەییەی تازە كە لەئەندەلوسدا بوون،و سێیەمیش دەوڵەتی عبیدیەكان (فاتمیەكان) لەئەفریقاو میسر و شام و حیجازدا. ئەم دەوڵەتان بەردەوام دەسەلأتدار بوون تاوەكو لەكۆتاییدا هەموویان لەناو چوون و پوكانەوە. وەهەروەها دەوڵەتی بەنی عەباس بوبەچەندین دەوڵەتی ترەوە هەروەك چۆن لەجەزیرە و موصڵدا خانەدانی حەمدان و

لەدوای ئەوانیش بەنی عەقیل و، لەمیسرو شامدا بەنی تولون و لەپاش ئەوانیش بەنی تەغج فەرمانڕەواییان کرد و لەناوچەدوور دەستەکانی ماوراء النهرین و خۆراسان سامانیەکان بوونە فەرمانڕەوا. ئەم بارودۆخەش بوویە هۆی ئەوەی کە دیلەمیەکان دەست بەسەر فارس و هەردو عێراقدابەغداد و خولەفادا بگرن. دواتریش نۆبەی سەلجوقیەکان هات و ئەم ناوچانەیان داگیر کرد و دواتر دەوڵەتەکەیان لەپاش گەیشتنی بەقۆناغی گەورەیی و هێز پارچە پارچە بوو هەروەك لەمێژوویاندا بەناوبانگە. وەهەروەها چۆنیەتی دابەشبوونی دەوڵەتان دەتوانین لەدەوڵەتی صەنهاجەی مەغریب و ئەفریقادا لەبەر چاو بگرین کەلەسەردەمی بادیسی کوڕی منصوردا دەوڵەتەکەی گەیشتە ئەوپەڕی هێزو دەسەلأت و مامەی حماد لەدژی ڕاپەڕی و مەمالیکی مەغریب کەلەنێوان کێوی ئوراس تاوەکو تلمسان وملویە دان دابەشی کردو خستیە ژێر دەسەلأتی خۆیەوە. دواتر شاری قلعه[٣٧٨]ی لەسەر شاخی کەتامە کەلەبەرامبەر مسیلەدا دروست کردو کردیە پایتەختی خۆی و، لەپاشان دەستی گرت بەسەر ئەشیر دا لەکێوی تیری کەناوەندی ئەو نەتەوەیە بوو وولأتێکی تازەی لەدەوڵەتی خانەدانی بادیس جیا کردەوەو، تەنها ناوچەکانی قەیرەوان و دەوروبەری بۆ خانەدانی بادیس مایەوە ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تاوەکو لەناوچوونی دەوڵەتی هەردوو نەتەوەکە.

وەکاتێك دەسەلأتی نەتەوەی مووەحیدان کەم بوویەوە خانەدانی ئەبو حفص لەئەفریقادا دەستیان کردە کودەتا و لەو ناوچەیەدا سەر بەخۆییان بەدەست هێناو وولأتێکیان دروستکرد. لەپاشان کاتێك دەوڵەتەکەیان گەشتە قۆناغی گەورەیی و شکۆمەندی لەفەرمانڕەوایدا یەکێك لەنەوەکانیان ئەبو زەکریا یەحیای کوڕی سوڵتان ئەبو ئیسحاق ئیبراهیم چوارەمین خەلیفەی ئەو نەتەوەیە لەمەمالیکی خۆرئاوادا ڕاپەڕیو، وولأتێکی تازەی لەبجایەو قوستەنتینیە دامەزراندو نەوەکانی لەدوای خۆی

---

[٣٧٨] قەلأی بەنی حەماد کەوتووەتە نزیکەی حەوت فەرسەخی باکوری خۆرهەلأتی المسیلەوە (یاداشتەکانی دسلان)ج ٢ لا ١١٨.

فەرمانڕەواییان دەگرتە دەست و بەم شێوەیە یەك دەوڵەتیان کردە دووبەشەوە. دواتریش جێنشینی ئەبوزەکەریا دەستی بەسەر تونسدا گرت کەپایتەختی حەفصیەکان بوو، هەندێك جار ئەم دابەشبوونە دەبوویە دوبەش یان سێ بەش، فەرمانڕەوایانی ئەم ناوچانە هەندێك جار لەنەتەوەی خانەدانی دەسەڵاتدار نەبوون هەروەك چۆن لەسەردەمی ملوك التوایفی ئەندەلوس‌و پاشا غەیرە عەرەبەکان لەخۆرهەڵاتو، وڵاتی صەنهاجە لەئەفریقادا ڕووی داوە. هەروەك چۆن لەکۆتایی دەوڵەتی صەنهاجەدا لەهەریەکە لەقلاعی ئەفریقادا کەسێك کودەتای کردبوو بەشێوەیەکی سەربەخۆ فەرمانڕەوایی دەکرد، دواتر باسی دەکەین.

وەهەروەها بارودۆخی جریدوزاب لەئەفریقا کەمێك بەر لەم سەردەمە هەربەم جۆرە بووە، هەروەك چۆن باسی ئەم بەشەش دواتر دەکەین. چارەنوسی هەردەوڵەتێك کەبەناچاری دەبێت بەرەو خۆشگوزەرانی بڕوات کەئەمەش دەبێتە هۆی پیری و لاوازی و کەم بوونەوەی هێزو دەسەڵاتەکەی و، دوای پاشاکانیش شلزادەو پیاوانی دەسەڵاتداری دەوڵەت دەست دەکەن بەدابەشکردنی دەوڵەتەکان و چەندین دەوڵەتی جۆراو جۆر دروستدەکەن، خوداش میراتگری زەوی و ئەوانەیشە کەلەسەری دەژین.[٣٧٩]

---

[٣٧٩] (إنّا نَحنُ نَرِثُ الأرضَ وَمَنْ عَليها) س مريم ئا ٤١ .

# بەشی چل و شەشەم

## لەبارەی ئەوەی کەئەگەر فەتوتی و پیری ڕوولەدەوڵەتێك بكات خۆلادان لێی شتێكی مەحاڵە

لەبەشەکانی پێشوودا ئەو شتانەی کەدەبنەهۆی پیری و فەتوتی هەردەوڵەتێك بەدوورو درێژی باسمانکردن ئەوەمان سەلماند کە ئەم هۆکارانە بەشێوەیەکی سروشتی بمانەوێت و نەمانەوێت بۆ هەردەوڵەتێك ڕوودەدەن و شتانێکی سروشتین. کەواتە هەرکاتێك پیری و فەتوتی لەدەوڵەتدا شتێکی سروشتی بێت ئەوا ڕوودانیشی وەك ئەو هەمووە شتەسروشتیانەی ترە هەروەك چۆن میزاجی حەیوانی پیر دەبێت و، لەنەخۆشیە درێژخایەن و چارەسەر نەکراوەکانە چونکە شتە سروشتیەکان ناگۆڕدرێن. وەهەندێك جاریش زۆرێك لەفەرمانڕە وایانی دەوڵەتان کەلەکاروباری سیاسەت و دەوڵەتداریدا هۆشیارانە لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا هەڵسووکەوت دەکەن و کاتێك فەتووتی و پیری ڕوولەدەوڵەتەکەیان دەکات، هەوڵ دەدەن ئەو بارودۆخەبگۆڕن و دەوڵەت بەرەو هێزو لاویەتی ببەنەوە و پێیان وایە لەوانەیە ئەم بارودۆخە بەهۆی هەڵەو پەڵەی کەسانی پێش ئەمانەوە بوبێت و، لەهەوڵی چاکسازیکردنن لەدام دەزگای دەوڵەتدا، لەکاتێکدا وەك باسمانکرد ئەم شتە وانیەو ئەم حاڵەتە لەشتە سروشتیەکانەو خۆلادان لێی شتێکی مەحاڵە، چونکە کەسێك باوباپیرانی ببینێت لەسەر فەرشی ئاوریشم دانیشتوون و بەرماڵیان لەپارچەی گرانبەهاو ئاوریشم بوبێت و لەنێوان ئەوان و خەڵکیدا پەردەهەبوبێت ئەمیش ناتوانێت بەپێچەوانەی ئەوانەوە هەڵسووکەوت بكات و، بەهەمان شێوەی ئەوان

دەکات. ئەگەریش بیەوێت بەپێچەوانەی پێشینانیەوە هەڵسووکەوت بکات ئەوا نەریتەکان ڕێگەی پێنادەن و سەرزەنشت دەکرێت لەلایەن خەڵکیەوە و ئەگەربێت و بۆ تەنها جارێکیش گوێ بەلۆمەی لۆمەکاران نەدات و، بەپێچەوانەی نەریتەکانەوە بجوڵێتەوە ئەوا بەشێت دەیدەنە قەڵەم و دەرئەنجامی ئەوکارەش دەسەڵاتەکەی دەخاتە مەترسیەوە. ئەوەش بزانە ئەگەر بێت و پشتیوانی ئیلاهی بۆ پێغەمبەران نەبوایە لەوکاتەی کەدژایەتی نەریتە خراپەکانی خەڵکیان دەکرد ئەوا بەدڵنیاییەوە لەناو دەچوون، چونکە ئەگەر بێتو دەوڵەتیش پشت بەستو نەبێت بەعەصەبیەتێکی زۆر بەهێز ئەوا بەلاوازیەوە ناتوانێت بەردەوام بێت و دەبێتە جێگەی تەماعی هەرلایەك و، زوبەزو لەناودەچێت چونکە ئەگەر عەصەبیەتی نەتەوەیەك لەناو بچێت ئەوا هێزو دەسەڵاتی پاشایەتی جێگەی دەگرێتەوە و ئەگەریش ئەو شان و شکۆیە نەما ئەوا خەڵکی لەدژی ڕادەپەڕن، هەربۆیە دەبینین هەردەوڵەتێك بەپێی توانای خۆی پارێزگاری لەو هێزو دەسەڵاتە دەکات کەهەیەتی لەپێناو مانەوەیدا.

سەرەڕای ئەمەش لەکۆتایی هەردەوڵەتێکدا هێزێك دروستدەبێت کەوادەزانن دەوڵەت فەتوتی و پیری ڕووی تێکردووە و جموجوڵی بەهێز دەردەکەون و، خەڵکی وادەزانن دەوڵەت هێزی بۆ گەڕاوەتەوە و ڕووناکیەکەی لەدرەوشانەوەدایە، بەڵام بەپێچەوانەوە بێئاگان لەوەی کەئەوە کۆتا درەوشانەوەیەتی و ئەو شەوقە زۆرە نیشانەی کوژانەوە کورت ماوەیی ئەو ڕووناکیەیە. (بێ ئاگا مەبە لەحیکمەتەکانی خودا لەبوونەوەردا و بۆ هەر ئەجەلێکیش نوسراوێك هەیە).[٣٨٠]

---

[٣٨٠] (لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَاب) س رعد ئا ٣٨ .

# بەشی چل و حەوتەم

## لەبارەی ئەوەی کەچۆن کەلێن لەدەوڵەتدا دروست دەبێت

دەبێت ئەوەبزانین کە بنیاتی دەوڵەت لەسەر دوو پایە دامەزراوە کەبەناچاریەوە دەبێت ئەو دوو پایەیە لەدەوڵەتدا بوونیان هەبێت: یەکەم شان و شکۆو عەصەبیەت کەدەکاتە لەشکرو سوپا، دووەمیش ماڵ و دارایی کەپارێزەری سوپایە و پاشا پێویستیەکان دەسەڵاتەکەی و خەڵکەکەی پێ دابین دەکات، هەرکاتێکیش کەلێنێك بکەوێتە دەوڵەتەوە ئەوا لەڕێگەی ئەم دووانەوەیە. ئێمەش سەرەتا چۆنیەتی دروستبوونی گرفت و کەلێن لەسوپا و عەصەبیەتدا باس دەکەین و دواتر باسی زیان گەیشتن بەسەروەت و سامان و خەراج دەکەین. وەدەبێت بزانین هەروەك باسمانکرد دامەزراندنی دەوڵەت تەنها لەڕووی عەصەبیەتەوە دەبێت، کەواتە دەبێت عەصەبیەتێکی گەورە بوونی هەبێت کەهەموو عەصەبیەتو کۆمەڵگەکانی هەرناوچەیەك لەژێر دەسەڵاتیدابن‌و پەیڕەوی لەعەصەبیەتە گەورەکە بکەن و داروەدەستەو تایفەی دەوڵەتیش لەو عەصەبیەتە گەورەیە بن. هەربۆیە دەبینین کاتێك دەوڵەت دەگاتە قۆناغی لوتکەی دەسەڵات و خۆشگوزەرانی و خاوەنانی عەصەبیەت لەبن دێن و عەشیرەت لەناو دەچێت‌و لەمەسەلەی پاشایەتیدا ڕۆدەچن و ئەو دلێری و توندیەی جاران دەخەنەلاوە و بەهۆی پلەو پایەشیانەوە لەهەمووان زیاتر بەناو نازو نیعمەتدا ڕۆدەچن و لەدەسەڵات و ڕێز بەهرەمەند دەبن. لەم هەلومەرجەشدا دوو دووژ منی ڕووخێنەر بەرۆکیان دەگرێت کەبریتین لەخۆشگوزەرانی و هێزو دەسەڵات و، دواتریش ئەم دوانە دەبنە هۆی کوژرانیان

چونکە لەدڵی[٣٨١] دەربارو داروودەستەی دەوڵەتدا لەکاتی دەسەڵات و خۆشگوزەرانیدا شتێك دروست دەبێت کە خۆشەویستیان لەبەرامبەر پاشاکانەوە دەگۆڕێت بۆ ترس و بیمو هەوڵی کوشتنیان دەدەن. هەربۆیە عەصەبیەتی دەوڵەت بەم هۆیەوە لەناو دەچێت واتە هەمان ئەو عەصەبیەتە گەورەیەی کەهەمووانی لەدەوری خۆی کۆ کردبویەوە لاواز دەبێت و لەناو دەچێت و لەبری ئەو عەصەبیەتە مەوالی و نەمەك پەروەردەکانی دەوڵەت کاروبارەکان دەگرنە دەست و، هێزو عەصەبیەتێکی نوێیان لیّ دروست دەکەن، بەڵام ئەم عەصەبیەتە نوێیە وەك عەصەبیەتی یەکەمین بەهێز نیە چونکە خاوەنی پەیوەندیە خزمایەتی و نەژادیەکان نیە، چونکە لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە گرنگی عەصەبیەت و بەهێزیەکەی تەنها بەهۆی خزمایەتی و پەیوەندیە خێزانیەکانەوەیە و خوداش ئەم هێزەی تێدا داناوە، هەربۆیە لەئەنجامدا دەبینین خزمان و نزیکانی عەصەبیەتی پێشوو هیچ رۆڵێکیان نابێت لەدەوڵەتدا و ئەم حاڵەتەش خاوەن عەصەبیەتەکانی تر هەستی پێدەکەن و بەشێوەیەکی سروشتی خەڵکی عەصەبیەتەکانی تر ملکەچی ئەو دەوڵەتە نابن و، لەدژی رادەپەڕن چونکە ئەمانیش وەك خانەدانی عەصەبیەتە بەهێزەکە دەستیان داوەتە خۆشگوزەرانی و رۆچوون بەناو نازو نیعمەتدا، هەربۆیە ئەمانیش دەڕووخێن و لەناو دەچن، کەپێشتر باسمانکرد.

هەربۆیە بەهۆی خوشگوزەرانیو کوشتارەوە نەژادی ئەو نەتەوەیە لەناو دەچێت تائەوەی کەبەتەواوەتی لەنەریتی ئەو عەصەبیەتە دەردەچن و، دلێری و سەرکەشیان نامێنێت و خاوەنانی عەصەبیەتەکان وەك سەرکردەی سوپایان لێدێت و کەم دەبنەوە و لەئەنجامدا ئەو لەشکریانەی کەدەبوایە بەرەو ناوچە سنوریەکان و پاراستنیان بچوونایە ژمارەیان زۆر کەم دەبێتەوەو دابەشبوونی سیاسی و ئیداری رووودەکاتە ئەو ناچانەو، شازادەکان هەریەکەو لەگەڵ گروپێکدا هاوپەیمانی دەبەستن و کودەتا دەکەن و بەمەبەست و ئامانجی خۆیان دەگەن خەڵکی ناوچەکانی دوور لەناوەندی دەوڵەت

---

[٣٨١] (فی قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزادَهُمُ اللهُ مَرَضاً) س بقرة ئا ٩ و چەندین ئایەتی تری لەم شێوەیە..

پشتیوانیان لێدەکەن ئەمەلەلایەك و، لەلایەکی تریشەوە دڵنیان لەوەی کە بەهۆی کەمی هێزی پاسەوانیەوە پارێزراون لەزیانی هێرش و پەلاماری سوپاکان ئەم بارودۆخەش بەردەوام ڕووبەری فراوان دەبێت و، بازنەی سنورەکان دەوڵەت تەسك دەبنەوە و کاردەگاتە ئەوەی کە شۆڕشگێڕان دەگەنە نزیکترین خاڵەکان لەپایەختەوەو لەمکاتەشدا دەوڵەت دەبێت بەدوو یان سێ بەشەوە بەپێی هێزو ڕووبەرە بنەڕەتیەکەی، هەروەك باسمانکرد، کەسانێکیش دەبنە فەرمانڕەوای ئەو دەوڵەتە تازانە کەبەهیچ شێوەیەك لەعەصەبیەتی ئەو ناوچانە نین، لەکاتێکدا گوێ بۆ ئەهلی عەصەبیەتی ئەوێ دەگرن لەکاروبارەکانی دەوڵەتداریدا.

وە ئەم حەقیقەتە دەکرێت لەسەردەمی عەرەب لەڕۆژگاری ئیسلامدا پەندی لێ وەربگیرێت کەچۆن ئەو دەوڵەتە لەسەرەتای دەسەلات و هێزیدا تائەندەلوس و چین و هیند دەسەلاتی هەبوو، فەرمانی بەنی ئومەییە لەناو هەموو نەتەوەی عەرەبدا بەهۆی هێزی عەصەبیەتەکەیانەوە جێبەجێ کراوە بەئەندازەیەك کە سولەیمانی کوڕی عبد الملیك لەدیمەشقەوە فەرمانی کوشتنی عبدالعزیز موسای کوڕی نەصیری دەرکرد لەقورتوبەدا و فەرمانەکەی جێبەجێکرا و کوشتیان، بەلام دواتر و بەهۆی گەشتنی بەنی ئومەییە بەلوتکەی هێزو خۆشگوزەرانی ئەو دەسەلاتە بەهێزە هەڵوەشایەوە و، بنی عباس گەشتنە خەلافەت و ئەوانیش دەستیان کردە ئازاردانی بنی هاشم و تالیبیەکانیان کوشت و پەرتەوازە بوون هەربۆیە عەصەبیەتی عبد منافیش لەناو چوو، عەرەب تەماعیان تێکردنو فەرمانڕەواکانی ناوچە سنووری و دوورەکان وەك خانەدانی ئەغلەبیانو خەڵکی ئەندەلوس و چەندانی تر سەربەخۆییان ڕاگەیاند و دەوڵەتەکەی ئەمانیش دابەش بوو. دواتریش خانەدانی ئیدریس لەمەغریبدا ڕاپەڕین وئەو بەربەرانەی کەبەهۆی دانپێدانان بەعەصەبیەتی ئەواندا و لەبەر ئەوەی سوپاو پاسەوانی دەوڵەتی نەبوون کەشەڕیان لەگەڵدا بکەن پشتگیریان کردن. هەربۆیە دەبینین لەناوچە دوور دەستەکاندا ئەگەر کۆمەڵێك دەست بدەنە کودەتا و دەوڵەتەکەیان قبوڵکراو بێت و،

دەبینین دەوڵەتی گەورەو پێشوو دابەش دەبێت بەتایبەت کاتێك دەسەلاتی دەوڵەتی ناوەند لەو ناوچەیەدا کەم ببێتەوە و ئەم ناڕەزایەتیانەش وورده وورده زۆر دەبن و زۆر جاریش دەگەنە پایتەخت و ئەویش داگیر دەکرێت و، دواتریش فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی نوێ بەهۆی خۆشگوزەرانی و نازو نیعمەتەوە لاواز دەبن و، ئەم لاوازیەش سەرانسەری دەوڵەتەکە دەگرێتەوە. وەهەندێك جاریش دەوڵەتی ناوەند لەپاش قۆناغە ناوبراوەکان بۆماوەیەکی دوورو درێژ دەمێنێتەوە پێویستی بەعەصەبیەتێکی تایبەت نابێت، چونکە نەریتی فەرمانڕەوایی و دەسەلاتەکەی لەناو خەڵکیدا جێگیر بووە و بەتێپەڕبوونی کات دەسەلاتەکەی وەك نەریتێکی ئاسایی لێهاتووە لەناو خەڵکیدا و، نەوەکانی داهاتووشیان هیچکات بیر لەوە ناکەنەوە کەسەرچاوەی ئەم نەریتە لەکوێوە هاتووە و بەهۆی چیەوە وای لێهاتووە کەهەمووان پەیڕەوی لێدەکەن، بەم هۆیەوە فەرمانبەری خەڵکی لەعەصەبیەتەکان بێ نیاز دەبێت و دەوڵەت تەنها ئەو سەربازو فەرمانبەرانەی بەسە کەمووچەیان دەداتێ و ئەوەیشی کەلەدەرونی خەڵکیدا لەبارەی هێزو دەسەلاتی دەوڵەتەوە جێگیر بووە یارمەتیدەری ئەم بابەتەیە چونکە کەس بیر لەدژایەتیو نافەرمانی ناکاتەوە، بەلام هێندە ناخایەنێت خەڵکی بەگشتی دەست دەکەنە دژایەتی کردنی و ڕاپەڕین دەست پێدەکات و لایەنی ڕاپەڕی و ناتوانێت بەمەبەستی خۆی بگات هەرچەندە هەوڵی تەواویش بدات.

هەرچەندە دەوڵەت لەم کاتەدا بەهۆی پشتیوانی خەڵکەوە لەدەستدرێژی تەماعکاران پارێزراوە، هەر بۆیە بۆ ماوەیەك بەپایەداری دەمێنێتەوە هەرچەندە وەك حاڵەتی گەرمی غەریزی جەستەی مرۆڤ کەخۆراك نەخوات وورده وورده لەناو دەچێت، واتە کاتێك کەخودا ویستی لەسەر بێت و بۆهەر ئەجەلێکیش نوسراوێکەو هەردەوڵەتێکیش کۆتاییەکی هەیە و خوداش شەوو ڕۆژی ئەندازەگیری کردووە[٣٨٢] و هەرئەوە خودای

[٣٨٢] (وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ) س ٧٣ ئا ٢٠.

تاقانەو بەهێز.[٣٨٣] بەڵام لەبارەی ئەو کەلێنەی کەلەرێگەی داراییەوە لەدەوڵەتدا دروست دەبێت دەبێت ئەوەبزانین کەدەوڵەت هەروەك پێشتر باسکرا لەقۆناغی دەشتەکیەتیدایەو لەگەڵ خەڵکدا خووی نەرمی هەڵکرنی هەیە و، لەبواری ئابوریدا بەشێوەیەکی میانەڕەوانە هەڵسووکەوت دەکات و لەگەڵ ماڵ و سامانی خەڵکیدا بەدەست پاکیەوە دەجولێتەوە و لەمەسەلەی وەرگرتنی باجدا بەو پەڕی ژیری و هۆشیاریەوە هەڵسووکەوت دەکات و هۆکارێك نیە کەبەزیادەڕەویەوە خەرج بکات، هەربۆیە لەم کاتەدا دەوڵەت پێویستی بەکۆکردنەوەی سەروەت و سامانی فراوان نابێت، بەڵام لەپاش ئەوەی کەدەوڵەت دەگاتە قۆناغی خۆشگوزەرانی و نازو نیعمەت خەرجیەکانی دەوڵەتو دارو دەستەی سوڵتان زیاد دەبن و ئەم حاڵەتەش شارەکانیش دەگرێتەوەو زیادەڕەوی و ئیسراف لەخەرجیەکاندا زۆر دەبێت، چونکە خەڵکی وەك نەریتی پاشاکانیان هەڵسووکەوت دەکەن و دەوڵەت پێویستی بە داراییەکی زیاتر دەبێت بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت و پێدانی مووچەی سوپاو کارمەندانی وولآت. هەربۆیە دەبینین تەنانەت باجیش دەخەنە سەر کاڵآبازرگانیەکانی بازاڕو لەرێگەی ئەو باجەوە هەوڵی باشکردنی بارودۆخەکە دەدەن، هۆکاری ئەمەش ڕۆچوونی دامودەزگای دەوڵەت و خەڵکیە بەناو خۆشگوزەرانی نازو نیعمەتدا کەهۆکارێکی گەورەیە بۆ زیاد بوونی خەرجیەکانی دەوڵەت، کەتەنها دەرامەتی دەوڵەت خۆی بەس نابێت بۆ بەڕێوە بردنی وولآت.

دەوڵەتیش لەبەر ئەوەی کەدەسەلآتی بەسەر خەڵکەکەیدا هەیە هەربۆیە لەرێگەی دانانی باج و وەرگرتنیەوە لەخەڵکی وەیان بازرگانی کردنی گەورە و یان لەرێگەی هەندێك دەستدرێژی ڕاستەو یان ناڕاستەوخۆ بۆسەر ماڵ و سامانی خەڵکی دارایەکەی زۆر دەکات و، لەم قۆناغەشدا بەهۆی لاوازی و فەتوتی عەصەبیەتەوە و نەبوونی لەناو دەوڵەتدا ترسی ئەوەهەیە کەسوپا سەرکەشی بکات، هەربۆیە دەوڵەت لەرێگەی زۆر کردنی مووچەو باشتر کردنی ژیان و گوزەرانیانەوە هەوڵی ڕێگری کردن لەو حاڵەتەدەدات

---

[٣٨٣] (اللهُ الواحِدُ القَهّار) س ١٢ ئا ٣٩ .

کەبێجگە لەمە هیچ چارەیەکی تری نیە. لەم کاتەشدا فەرمانبەرانی وەرگرتنی باج زۆر بەهێز دەبن و دەسەلاَتێکی زۆریان هەیە ئەوەش بەهۆی ئەو داراییەزۆرەی کەلەبەر دەستیاندایە، هەربۆیە دەبینین تۆمەتگەلێکی زۆریان ڕووبەڕوو دەکرێتەوە لەو قسانەش بریتین لەوەی کەدەڵێن ئەوان واتە باج کۆکەرەوەکان لەو پارەو سامانەی کە کۆی دەکەنەوە بەشێکی زۆری بۆ خۆیان هەڵدەگرن و، هەرلەناو خۆشیاندا ئیرەیی بەیەکتری دەبەن و قسەو تۆمەت دەدەنە پاڵ یەکتری و لەئەنجامدا توشی چەندین چارەنوسی مەرگبار دەبنەوە و داراییەکەیان دەستی بەسەردا دەگیرێت و، لەئەنجامدا یەك بەیەکیان ڕۆژگاریان ڕەش دەبێت و ئەو شان و شکۆو گەورەییەی کەدەوڵەت پێی بەخشیبوون نامێنێت و، بەهۆی لەناوچوونی سەروەت و سامانەکەیانەوە دەوڵەت خەڵکانی تری بەتوانا لەجێگەیان دادەنێت و، لەم قۆناغەشدا لاوازی ڕوودەکاتە دەزگای سوپاو شان و شکۆی دەوڵەت و ئیتر ناتوانێت لەهێزو دەسەلاَتیدا پشت بەهێزی سوپا ببەستێت لەناوخەڵکیدا و خاوەنان و بەرپرسانی دەوڵەت سیاسەتێکی تر دەگرنەبەر، ئەو ڕێگریەش کەبۆ نەڕووخانی دەوڵەت دەگیرێتەبەر تەنها بریتی دەبێت لەبەخشینی ماڵ و داراییەکانی دەوڵەت.

چونکە دەبینێت ئەم شێوازە لەسوپا و شمشێر بەسودتر و باشترە بۆ پاراستنی دەوڵەت چونکە لەم قۆناغەدا سودی شمشێر کەمە، بەلاَم لەلایەکی ترەوە سەرەڕای خەرجکردنی زۆر لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا، بەلاَم زۆر لەوە زیاتریشی پێویستە کەخەرجی بکات لەبەرەو پێش بردنی ئەم سیاسەتەدا چونکە خەرجی سوپاو فەرمانبەرو کاروباری دەوڵەت زۆر زیاتر دەبێت لەجاران، هەربۆیە کەم کەم فەتوتی و لاوازی ڕوولەدەزگای دەوڵەت دەکات و لەناوچە دوور دەست و سنوریەکانیدا ڕاپەڕین لەدژی دەوڵەت دروست دەبێت و، بەم شێوەیە کەم کەم لەم قۆناغەدا شان و شکۆی دەوڵەتان لەناو دەچێت و لەکۆتایدا دەکەونە بەرتەماعی داگیر کران و دەڕوخێن و دەکەونە ژێر تەماعی ئەوانەی کەخوازیاری گەورەییو پاشایەتین، وەئەگەر بەڕێکەوتیش

کودەتاچیەکی لەم جۆرەکەسانە سەرکەشی بکات و هێزو دەسەلآت و سەڵتەنەت لەچنگی دەسەلآتدارانی وەها دەوڵەتێك دەردەهێنن، وەگەرنا هەروەك خۆی دەمێنێتەوە ئەمەلەکاتێکدا لەناوەوە لێك هەڵدەوەشێت هەروەك ئەو پڵیتە چرایەی کەنەوتی لێدەبڕێتو کەم کەم دەکوژێتەوە. خوداش خاوەنی کارەکانەو ڕێکخەری هەموو ئافرێنراوەکانەو بێجگەلەو خودایەکی ترنیە.

## بەشێك

## لەبارەی ئەوەی کەچۆن بازنەی سنورەکانی دەوڵەتێك هەرلەسەرەتای دروستبوونیەوە تاوەکو کۆتایی فراوا نخوازیەکەی فراوان دەبێت و، لە پاشان قۆناغ بەقۆناغ سنورو ناوچەکانی کەم دەبنەوە و بچوك دەبێتەوە و تاوەکو لەئە نجامدا هەرەس دەهێنێت و دەڕووخێت

لەبەشی پاشایەتی و خەلافەتدا کەدەکاتە بەشی سێیەمی ئەم پێشەکیە باسی ئەوەمان کرد، کە هەردەوڵەتێك خاوەنی بەشێك لەناوچەو زەویەکانی ئەو شوێنەیە کەفەرمانڕەوایی تێدا دەکات و ناکرێت لەوە زیاتری هەبێت. هۆکاری ئەمەش دەبێت لەم ڕاستیەدا بدۆزینەوە کە دەوڵەت خزمەتکاران و ئەندامانی هۆزەکەی خۆی دابەشدەکات بەسەر شارو ناوچەکانی وولآتدا بۆ ئەوەی پارێزگاری لێبکەن و کاتێکیش کەهەموویان دەنێرێت ئیتر کەسێك نامێنێتەوە و، کۆتاشوێنی دەسەلآتی ئەو دەوڵەتە دەبێتە سنوری وولآت کەوەك پشتێنەیەك وولآتیان دەورە داوە. سنوری هەردەوڵەتێك لەسەرەتاوە لەوانەیە چوار دەوری ئەو ناوچەیەبێت کە دەوڵەتەکەی تێدا دادەمەزرێت و ئەگەربێت و ژمارەی خزمەتکاران و ئەندامانی هۆزەکە عەصەبیەتێکی بەهێزیان هەبێت لەوانەیە ڕووبەری ئەو دەوڵەتە فراوان ببێت و، ئەم کارەش کاتێك ئاسان دەبێت کە ئەندامانی

دەوڵەت هێشتا خووی دەشتەکیەتیان لەدەست نەدابێت و لەسەر زبری و دلێری مابنەوە، وەگەرنا لەو کاتەی کەشان و شکۆی دەوڵەت گەشتووەتە لووتکە و بەهۆی زۆری ماڵیاتو هۆکارەکانی ژیانەوە کەوتبنە خۆشگوزەرانیەوە و، خوویان بەشارنشینیەوە گرتبێت و نەوەکانیشیان بەم شێوەیە پەروەردە کرابن، ئەوکات پاسەوان و سوپاییەکان نەرم خوو باردێن و خەڵکانی سنورەکان بەنازو نیعمەت پەروەردە دەبن و بەم شێوەیە ترس‌و تەمبەڵی بەسەریاندا زاڵ دەبێت و، بەهۆی پەیڕەوکردنی نەریتەکانی پەیمان شکاندن و لادان لەحەق کەتایبەتمەندی شارنشینەکانە ئەوا دلێری و ئازایەتیەکەیان لەدەست دەدەن، بەتایبەت ئەو کاتەی کە نەریت و خووی دەشتەکیەتیان تێدا نامێنێت و سەردەکەنە ژیانی شارنشینی‌و بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و دارایی دەکەونە کێبڕکێیەکی ناشەریفانەوە و، ئەم بارودۆخەش سەرئەنجامەکەی کوشت و کوشتار دەبێت‌و سوڵتانیش هەوڵدەدات لەم کارانەیان بیانگێڕێتەوە و، ئەوە دەزانێت بەکوژرانی سەرانی دەوڵەت کەسانی ژێردەستە زۆر دەبن.

دیارە ئەم بارو دۆخەش دەبێتە هۆی لاوازی دەوڵەت و هێزو شکۆی ناهێڵێت و ئەمەش وەك پێشتر باسمانکرد واتە کەلێنی سوپاو لەشکر یەکێکە لەهۆکارەکانی لاوازبوون و ڕووخانی دەوڵەت. کاتێك ئەیانەوێت بگەنە پلەو پایەی بەرز لەبەرپرسیاریەتی و دارایدا دەبینین خەرجیەکانیان زۆر دەبن‌و دەست دەکەنە زیادەڕەوی‌و ئیسراف و بەشێوەیەکی لەڕادە بەدەر چاولێکەری یەکتری دەکەن لەژیان و گوزەراندا، بەتایبەت لەخۆراك‌و پۆشاك و کەمالیاتەکانی ژیانی ڕۆژانەیا ندا وەك کڕین یان دروستکردنی چەك و چۆڵەی جوان و ڕازاوە و ئەسپی قەشەنگ و ماڵ و باڵەخانەی بەرزو جوان، کەلەنەریت دەردەچن‌و لەم هەلومەرجەشدا داهاتی دەوڵەت بەبەراورد بەم زیادە ڕەویانە زۆر کەم دەبێتەوە، کەئەمەش دووەمین کەلێنە کەڕوودەکاتە دەوڵەت واتە کەلێنی کەم و کورتی لە داراییدا و تێکچوونی ئەو بوارە وەك خەراجەکان، کەلەئەنجامی ئەم دوو کەلێن‌و زیانەدا، (واتە لەناوچوونی سوپاو خراپی باری دارایی)دەزگای دەوڵەت لاواز دەبێت‌و سەرکردەکانی دەوڵەت لەناوچە دوور دەستەکان دەست دەکەن بەکودەتاو کار دەگاتە

پشێوی و جەنگ بەرپا دەبێت، بەڵام دەوڵەت لەسەرکوتکردنی ئەواندا بیتوانایەو ناتوانێت لەگەڵ هەڵگەڕاوە ناوخۆییەکان ودراو سێکاندا ڕووبەڕوو ببێتەوە و لەدەرئەنجامدا زۆرێك لەناوچەکان لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت دەر دەچن. لەلایەکی تریشەوە دانیشتوان‌و فەرمانڕەوایانی ناوچەدوور دەستەکانی دەوڵەت هەرکە زانیان دەوڵەت بەرەو لاوازی چووە دەست دەکەن بەشۆڕش و ڕاپەڕین و جاڕی سەربە خۆیی دەدەن لەو سەر زەویانەی کەلەژێر دەسەلاّتیاندایە، لەئەنجامدا بازنەی ئەو فراوانی و دەسەلاّتەی کەدەوڵەت لەسەرەتای دامەزراندنیەوە هەیبووە کەم دەبێتەوەو لەپاش ماوەیەکیش ئەوانەی کەلەناوچە دوور دەستەکان سەربەخۆییان ڕاگەیاندووە دووچاری هەمان چارەنوسی دەوڵەتی پێشوو، واتە دەوڵەتی ناوەندی جاران دەبنەوە، واتە هەمان چارەنوس بەرۆکی دەسەلاّتداران و فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی نوێ لەکێشەدارابیەکانی وەك کەمی باج و زۆری خەرجیەکاندا دەبێتەوە. هەربۆیە دەسەلاّتدارانی دەوڵەت ناچارن ئەو یاساو ڕێسایانەی کەپێشتر دەوڵەت پەیڕەوی کردوون بگۆڕن و چاوبە کاروبارەکانی ماڵیات و سوپاو والی و فەرمانڕەوایاندا بخشێننەوە و، بۆئەوەی لەڕێگەی بەرابەرکردنی داهاتوو خەرجیەکان گونجاندنی داهاتەکان لەگەڵ خەرجی لەشکرو فەرمانڕەوایان و دابەشکردنی ماڵیات بەسەر ئەرزاقەکانداو هەڵسەنگاندنیان لەگەڵ بارودۆخەکانی دەوڵەتدا لەسەرەتای دامەزراندنیەوە لێکۆڵینەوەی بکەن، ئەمەش بۆئەوەی لەهەموو قۆناغەکاندا بارودۆخ بەرەو باشی بڕوات، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا خراپەو بێسەرو بەری لەهەمولایەکەوە هەڕەشە لەدەوڵەت دەکات.

دیسانەوە بارودۆخی دەوڵەت لەم قۆناغەدا وەك پێشتری لێ دێتەوە و دەسەلاّتدارانی دەوڵەت ئەو ڕێوشوێنانەی کەبۆ چاکسازی لەبەرچاو یان گرتبوو دەیانگرنە بەرو لەدووەم قۆناغی کێشەکەشدا بەهەمان پێوەرە پێشووەکان هەڵدەسەنگێنن و، ئەیانەوێت بەهەمان ئەو ڕێو شوێنانەی پێشوو کێشەکان چارەسەر بکەن، بەڵام دەبینین بەردەوام بازنەی دەسەلاّتی دەوڵەت بەسەر ناوچەکاندا لەپێشتر بەرتەسکتر دەبێتەوەو هەمان ئەو پێشهاتانە لەووڵاتدا دووبارە دەبنەوە و، هەریەکە لەم کەسانەی یاساکانی قۆناغی یەکەم

دەگۆڕین بەجۆرێك ڕەفتار دەكەن وەك بڵێی دەوڵەتێكی تر دادەمەزرێنن تائەوەی كە سەرئەنجام دەوڵەت لەناو دەچێت و، نەتەوەكانی دراوسێی دەستدرێژی دەكەنە سەر و داگیری دەكەن‌و دەوڵەتێكی تر دادەمەزرێنن و تەقدیری خودا دێتە دی. دەبێت ئەم ڕاستیە لەدەوڵەتی ئیسلامیدا لەبەر چاو بگرین كەچۆن بازنەی سنورەكانی لەڕێگەی فتوحات و زاڵبوون بەسەر نەتەوە جۆراو جۆرەكاندا فراوان بوو، دواتریش بەهۆی بەدەستهێنانی نازو نیعمەت و ڕۆچوون بەناو خۆشگوزەرانیدا و خەرجی هێزو سوپایان زۆربوو تاوەكو فەرمانڕەوایی ئەمەویەكان لەناوچوو خانەدانی عەباسیەكان گەیشتنە دەسەلآت. لەپاشان نازو نیعمەت و خۆشگوزەرانی زۆر بوو ڕوویانكردە شارنشینی و خراپە و نادادگەری ڕووی لەدەوڵەتەكە یان كرد و، لەئەنجامی دروستبوونی دەوڵەتی ئەمەویانی مەروانی و عەلەویەكان لەئەندەلوس و مەغریب بازنەی سنورەكانی ئەو دەوڵەتە لەهەردوو ناوچەی ناوبراودا تەنگ بوویەوە و، ئەو سنورەیان لەدەوڵەتی عەباسی جیاكردەوە و ئەم بارودۆخە بەو شێوەیە بەردەوام بوو تائەوكاتەی كەجەنگ و هەرا لەنێوان خانەدانی ڕەشیددا دروست بوو، بانگخوازان‌و موبەلیغانی عەلەوی لەهەر جێگەیەك سەریان هەڵداو چەندین دەوڵەتیان دامەزراندو دواتر موتەوەكیل كوژراو ئەمیرەكانی دەزگای خەلافەت تەماعی دەسەلآت گرتنی و خەلیفەكانیان مەحجور كردو فەرمانڕەواو والیەكان لەناوچە جیاوازەكاندا سەربەخۆییان وەرگرتوو وەرگرتنی باج لەو ناوچانە وەستاو، هۆكارەكانی نازو نیعمەت‌و خۆشگوزەرانی زیادیان كردو كاتێكیش موعتەزید بوویە خەلیفە یاساكانی گۆڕیو، كۆمەڵێك یاسای تری بۆ بەڕێوەبردنی كاروبارەكانی وولآت دانا.

لەویاسایانەدا بڕیاری ئەوەی دا كە ئەو ماڵ و داراییەی كەفەرمانڕەوایانی ناوچەكان هەیانە خۆیان بەشێوەیەكی سەربەخۆ لەكاروبارەكانی دەوڵەت و سوپادا سەرفی بكەن، هەروەك چۆن سامانیەكانی ماوراء النهرین و تاهیریەكانی عێراق و، خۆراسان و صەفاریە كانی سیند و فارس و، خانەدانی تولونی وولآتی میسر و بەنی ئەغلەبی ئەفریقایان خستبووە ژێر دەسەلآتی خۆیانەوە. تا ئەوەبوو كەسەرئەنجام فەرمانڕەوایی غەزاكەران

پارچە پارچە بوو نەتەوە غەیرە عەرەبەکان (ئێرانیەکان)، دەسەلاتیان پەیداکردو خانەدانی دیلمیان و بویە کەلکەلەی سەربەخۆیی لەسەریاندا چەکەرەی کرد و لەدەولەتی ئیسلامی جیابوونەوە و خەلیفەکانیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە و سامانیەکان لەماوراء النهرین دا سەربەخۆ بوون و فاتیمیەکان لەمەغریبەوە هێرشیانکردە سەر میسرو شام و داگیر یان کردن و، لەپاشان دەولەتی سەلجوقیەکان کەلەنەتەوە تورکەکان بوون پێك هاتوو مەملەکەتە ئیسلامیەکانیان داگیر کرد و خەلیفەکان لەسەر هەمان بارودۆخی مەحجوریەت مانەوە و، کار گەیشتە ئەو جێگەیەی کە دەولەتەکانیان هەلوەشایەوە و لەسەردەمی الناصردا بازنەی سنورەکانیان گەیشتە ئەندازەیەك کەلەبازنی مانگیش کەمتر بوو، واتە سنوری دەسەلاتیان لەعێراق و عەربەوە تاوەکو ئەصفەهان و فارس و بەحرەین بوو. دەولەتەکەشیان تائەندازەیەك لەسەر ئەم بارودۆخە مایەوە تائەوکاتەی کەفەرمانڕەوایی خەلیفەکان بەدەستی هۆلاکۆ کوڕی تولی بن توشی خان پاشای تەتارو مەغۆلەکان لەناوچوو.

هۆلاکۆ لەپاش ئەوەی کەزالبوو بەسەر سەلجوقیەکانداو[٣٨٤] ئەو وولاتە ئیسلامیانەی کەلەژێر دەستیاندابوون داگیر کرد. بەم شێوەیە بازنەی فەرمانڕەوایی هەردەولەتێك بەبەراورد لەگەلْ دەسەلاتی سەرەتایدا تەنگ و بەرتەسك دەبێتەوە تاوەکو سەرئەنجام لەناو دەچێت. ئەم بنەمایەش دەبێت لەبارەی هەردەولەتێکەوە ئیتر بچوك بێت یان گەورە لەبەرچاو بگرین و پەندی لێوەربگرین، بەمشێوەیە دەستوری خودا لەبارەی دەولەتانەوە تاوەکو دووچاری چارەنوسی لەناوچوون دەبنەوە کەخودا بۆیانی تەقدیرکردووە، هەمووشتێك لەناودەچێت تەنها زاتی خودا دەمێنێتەوە[٣٨٥]

---

[٣٨٤] سەلجوقیەکان ماوەیەکی دوورودرێژ بەرلە فەرمانڕەوایی هۆلاکۆ لەناوچوبوون، مەگەر ئەوەی کەبلێین دانەر خوارەزمشاهیەکانی بەدرێژەی سەلجوقیەکان زانیبێت و بەسەلجوقی ناوی هێنابن.

[٣٨٥] (كُلُّ شَيءٍ هالِكٌ إِلّا وَجهَه) س القصص ئا ٨٨.

# بەشی چل و هەشتەم

## لەبارەی ئەوەی کەچۆن دەوڵەتە تازەکان دروستدەبن

دەبێت ئەوەبزانین کاتێك دەوڵەتە کۆنەکان فەتوتی و پیری ڕوویان تێدەکات لەوانەیە دەوڵەتەکانی دوای ئەوان بەدوو شێوە دروست ببن:

یەکەمیان ئەوەیەکە فەرمانڕەوایانی ناوچە دوور دەستەکان کاتێك دەبینن حکومەتی ناوەندی دەسەلاتی لەناوچەکانیاندا لاواز بووە یان نەماوە، ئەوکات دەوڵەتی سەربەخۆ ڕادەگەیەنن و پاشاو دارو دەستەی دەوڵەت پێکدەهێنن و دیاری دەکەن و مەوالی یان نەوەکانیان بەشێوەیە کی پشتاو پشت دەبنە سوڵتان و پاشای ئەو دەوڵەتانە و، کەم کەم ئەم دەسەلاتەش فراوان دەبێت و دەوڵەت دەگاتە ئەوپەڕی هێزو خۆشگوزەرانیەوە، بەتایبەت لەمەسەلەی تایبەت بوونی پاشایەتی هەرهۆزەو بەخۆیەوە کێشەو جیاوازی ڕوودەدات و دەست دەکەن بەجەنگ لەگەڵ یەکتریدا و ئەوانەی کەبەهێزترن لاوازەکان داگیر دەکەن و هەروەك چۆن ئەم بارودۆخە لەدەوڵەتی بەنی عباسدا ڕوویدا کاتێك کەدەوڵەتەکەیان گەیشتە قۆناغی فەتوتی و پیری و، دەسەلاتی بەسەر ناوچەدوور دەستەکاندا نەما و سامانیەکان لەماورا النهرین و خانەدانی حمدان لەموصڵ و شام و خانەدانی تولون لەمیسردا فەرمانڕەواییان تایبەتکرد بەخۆیانەوە، وەهەروەها دەوڵەتی ئەمەویەکانی ئەندەلوسیشدا ئەم چارەنوسەی ڕووبەڕوو بوویەوە، وولاتی ئەو نەتەوەیە لەنێوان ملوك التوایف کەبەوالی ئەو دەوڵەتە دەژمێردران لەو ناوچانەدا دابەش بوبو

چەندین دەوڵەت لەو ناوچەیەدا دروست بوون و، چەندین پاشا دەستیان بەسەرئەو مەملەکەتانەدا گرت و کەلەپاش خۆیان مەوالیو نەوەکانان بەشێوەیەکی بۆماوەیی دەبوونە پاشای ئەو ناوچانە. لەدامەزراندنی ئەم جۆرە دەوڵەتە نوێیانەدا لەنێوان دامەزرێنەرانی دەوڵەتی تازە و دەوڵەتی پێشوودا جێگیری ڕوونادات، چونکە ئەو گروپەی کەبەسەربەخۆیی خۆیان گەشتونەتە دەسەلاَت و لەسەرۆکایەتیاندا جێگیر بوون و تەماعی داگیرکردنی دەوڵەتی مەرکەزیان نیە، بەڵکو فەتوتیو پیری دەوڵەتی مەرکەزی دەگرێتەوەو ناتوانێت بیر لەدووبارە داگیر کردنەوەی ئەو ناوچە دوور دەستانە بکاتەوە. دووەمیشیان ئەوەیەکە لەنەتەوە دراوسێکان کەسێك دەست بداتە سەر کەشی وەیان لەڕێگەی بانگکردنی خەڵکیەوە بۆسەر نەریت و ئاینێکی تایبەت هێزێك لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، هەروەك باسمانکرد، وەیان خاوەنی هێزو لەشکر و عەصەبیەتێکی زۆر بێت لەناو هۆزەکەیدا و بەهۆیانەوە بیەوێت بگاتە پاشایەتی، ئەمەش کاتێك دەبێت کەگەلەکەی باسی ئەم مەسەلەیان کردبێت و ئاگاداری فەتوتی ئەو دەوڵەتەبن کەبەنیازن داگیری بکەن، هەربۆیە سەرکردەی شۆڕش لەسەر خۆیو نەتەوەکەی بەپێویستی دەزانێت کەهێرش بکات و داگیری بکات و تاج و تەختەکەی داگیر دەکات. هەروەك چۆن سەلجوقیەکان لەدژی خانەدانی سبکتکین و خانەدانی مەرینیاندا لەمەغریب لەدژی مووەحیدان کردیان ئەم شێوازەیان گرتەبەرو سەریش کەوتن، خوداش زاڵە بەسەر کاروبارەکانیدا.[٢٨٦]

[٢٨٦] (وَاللهُ غالِبٌ عَلى أمرِه) س یوسف ئا ٢١ .

# بەشی چل و نۆیەم

## لەبارەی ئەوەی کەدەوڵەتی تازە دامەزراو تەنها لەرێگەی دواخستنی وادەی جەنگ و سەرکەوتن بەسەر دەوڵەتی کۆن و جێگیردا سەردەکەوێت نەوەك بەهۆی جەنگی بەپەلە و هێرشەوە

لەبەشی پێشوودا باسی ئەوەمانکرد کەدەوڵەتە تازەکان لەسەردەمی تازە دروست بوونیان دوو جۆرن: یەکێکیان بەهۆی فەرمانڕەوایانی ناوچە دوور دەستەکانەوە کاتێك دادەمەزرێت کەدەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی لەو ناوچانەدا کەم دەبێتەوە و دەسەڵاتی ناگاتە لایان، بەزۆریش دامەزرێنەرانی ئەم جۆرە دەوڵەتانە هەروەك باسمانکرد تەماعی فراوانخوازیان سەبارەت بەدەوڵەتی جێگیرو کۆن نیە. چونکە ئەوپەڕی ئامانجیان ئەو سەرزەویانەی ژێر دەسەڵاتی خۆیانە و ئەوپەڕی هێزو شکۆیان لەوێدایە. جۆری دووەمیشیان ئەوانەن کە هەرلەناو خۆدا دەست دەکەنە کودەتا و ئەمانە ناچارن دەبێت هەوڵی فراوانخوازی بدەن، چونکە هێزەکەیان بۆ ئەم کارە بەسەو عەصەبیەتی پێویستیان بۆ ئەم کارە هەیە. هەربۆیە لەنێوان دەوڵەتی کۆن و ئەو گروپەدا جەنگی ناوخۆیی چەندین جار ڕوودەداتو هەر جارەو لایەنێك سەردەکەوێت و ئەویتر شکست دەخوات و، تاوەکو سەرئەنجام بەهۆی دواکەوتنو زۆر خایاندنی جەنگەکەوە دەوڵەتی کۆن کەبەهۆی فەتوتیەوە لاواز بووە هەرەس دەهێنێت و دەڕوخێت و لایەنگرانی شۆڕش سەردەکەون و ئەمانە بەیەکجار هێرش بردن کارەکە یەکلایی ناکەنەوە، چونکە هەروەك پێشتر گووتمان سەرکەوتن زۆرجار بەهۆی شتە ڕۆحی و نەفسیەکانەوە دەبێت کەلایەنی

وەهمیان هەیە، هەرچەندە ژمارەی سوپاو بوونی پیاوانی دلێرو نەلەخشاولەمەیدانی جەنگدا سەرکەوتن مسۆگەر دەکات، بەڵام هۆکارە ناوبراوەکان لەهەمان کاتدا لەبەرامبەر شتە وەهمیەکانەوە بەس نین، هەروەك پێشتر باسکرا. هەربۆیە فێڵ و تەڵەکەی جەنگی لەبەسودترینی هۆکارە کانە کەلەجەنگەکاندا بەکار دێن و زۆربەی سەرکەوتنەکان بەهۆی ئەوانەوەیە، لەفەرمودەشدا هاتووە کەدەفەرمێت جەنگ فێڵ و هەڵخەڵەتاندنە. نەریتی دەوڵەتی کۆنیش وایە کەگوێڕایەڵی کردووەتە واجب و ئەرکی خەڵکی. هەروەك چۆن لەبابەتێکی تردا ئامازەمان بەم بابەتەکردووە، هەربۆیە بۆ دەوڵەتی تازە دامەزراو رێگریەکان زۆر دەبن و لەشکرو شوێنکەوتووە کانی دەشکێن، هەرچەندە نزیکانی بەصیرەتی تەواویان لەگوێڕایەڵی و یارمەتیدانی ئەودا هەبێت، بەڵام سوپاکەی تری کەزۆرینەن بەم هۆیەوە سستی و زەبوونی ڕوویان تێدەکات و ئەم جۆرە بیروباوەڕانە لەناخیاندا ڕۆچووە کەتەسلیمی دەوڵەتی کۆن و جێگیر بن و، لەم ڕوەوە تائەندازەیەك لەتوندیان کەم دەبێتەوە خاوەنانی دەوڵەتی تازە دامەزراو بەناچاریەوە لەبەرامبەر وەها کارێکدا بەرگری دەکەن و، خۆڕاگری و بەرگری بەباشتر دەزانن تاوەکو جەنگ و هێرش تائەوکاتەی فەتوتی و پەستی بەتەواوەتی لەدەوڵەتی کۆندا دەردەکەوێت لەئەنجامدا بیرو باوەڕی خەڵکی لەبارەی تەسلیم بوون بەدەوڵەتی کۆن سست و لاواز دەبن و، شەڕێکی بەتەواوی مانادەست پێدەکات و سەرئەنجام دەوڵەتی کۆن دەڕووخێت دەسەڵاتی تازە فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست.

سەرەڕای ئەمەش دەوڵەتی کۆن خاوەن سەروەت و سامانێکی بێشومارو فراوانەو لەدووتوێی بەهێزبوونی پایەکانی دەوڵەتدا بەدرێژایی سەردەمەکان بەدەست هاتوون و لەماڵ و دارایی خەراج سەروەتێکی زۆری هەیە و، کەخاوەنانی دەوڵەتی تازە لێی بێبەش بوون و دەوڵەتی کۆن خاوەنی چەندین تەویلەی گەورەی ئەسپە لەناوچە سنوریەکانداو خاوەنی چەك و جبەخانەیەکی زۆرە و شان و شکۆی پاشایەتی بەردەوام پایەدارەو یارمەتیەکی زۆری سوپاو لەشکر دەداتو، بەهۆیانەوە دووژمنەکانی دەتۆقێنێت و ئەمە

لەکاتێکدا دارو دەستەی دەوڵەتی تازە دامەزراو لەم شتانە بێبەشە، چونکە ئەو دەوڵەتە هێشتا لەقۆناغی دەشتەکیەتی و هەژاریدایە ناتوانێت خۆی بەم جۆرە شتانە تەیار بکات، هەربۆیە کاتێك هەواڵی کۆن و چۆنیەتی شان و شکۆی لەنێو خەڵك و سوپای دەوڵەتی نوێدا بڵاو دەبێتەوە ترسیان لێدەنیشێتو ناتوانن جەنگ لەدژی دەوڵەتی کۆن ڕابگەیەنن، هەربۆیە فەرمانڕەوایانیان پێیان باشترە جەنگەکە دوابخەن، تائەوکاتەی دەوڵەتی کۆن بەتەواوەتی فەتوتی ڕووی تێدەکات و کەلێن دەکەوێتە نێو عەصەبیەت و داراییەکەیەوە. لەم کاتەدایە خاوەنانی دەوڵەتی تازە چاوەڕێی هەلێکی گونجاون بۆ دەست بەسەردا گرتنی دارو دەستەی دەوڵەتی کۆن و ئەمەش لەپاش چەندین ساڵ لەچاوەڕوانی وەها هەلێك. دەستوری خودایە لەنێو بەندەکانیدا. وەهەروەها خەڵکی دەوڵەتی تازەدامەزراو لەڕوانگەی نەسەب و نەریت و هەموو حەزو ئارەزووەکانەوە جیاوازی زۆریان لەگەڵ خەڵکی دەوڵەتی کۆندا هەیە.

وەهەروەها ئەمان بەهۆی ڕوودانی ئەم وڵات داگیر کردنەوە شانازی بەسەر ئەواندا دەکەن وەیان دەکەونە جەنگەوە لەگەڵیاندا و، جیاوازی لەنێوان خەڵکی دەوڵەتی کۆن و نوێدا بەئاشکراو پەنهان دروستدەبێت و بەهۆی نەبوونی پەیوەندیەوەخاوەنانی دەوڵەتی نوێ هیچ زانیاریەکیان دەربارەی دەوڵەتی کۆن نیە، تاوەکو بزانرێت لەبارودۆخیان بەئاشکرا پەندیان وەرگرتووە یان نا؟ وەنازانن ئایائەوان گیرۆدەی بێئاگایی ئاشکراو نهێنی بوونەتەوە یان نا؟ لەم ڕووەوە لەکاتێکدا جەنگی یەکلاکەرەوە دوا دەخەن، بەڵام دەست لەفراوانخوازی بەرنادەن تائەو کاتەی کەخودا جاڕی لەناوچوونی دەوڵەتی کۆن دەداتو لەهەمولایەکەوە گیروگرفت ڕووی تێدەکات، وەخەڵکی دەوڵەتی تازە دامەزراویش لەپاش گوزەراندنی تەمەنێکی گونجاو بەهەمان چارەنوسی پێشینانیان دەچن و، دەوڵەتەکەیان فەتوتی و پیری ڕووی تێدەکات و لەناو دەچێت. لەم کاتەشدا فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی تازە دامەزراو بەهۆی جیاکردنەوەی چەند ناوچەیەکی دوور دەست لەدەوڵەتی ناوەندی و دەوڵەتیان بچوك کردووەتەوە، خۆیان بەخاوەن هێز

دەزانن‌و هەموویان پێکەوە ئامادەی جەنگ دەبن و، وەهەم ترسیان نامێنێت و چاوەڕێکردنیان دەگاتە کۆتایی ودەست دەکەن بەجەنگ و سەرئەنجام سەردەکەون.

ئەم مانایەش دەتوانین لەدەوڵەتی بەنی عەباسدا لەبەر چاو بگرین کەلەکاتی دەرکەوتنیدا چۆن شیعەکان، واتە هەوەس بازەکانیان لەخۆراساندا بۆ ماوەی دەساڵ جەنگیان لەدژی ئەمەویەکان ڕاگەیاند و، بەنەفەسێکی درێژەوە چاوەڕێیان کردو تاوەکو سەرئەنجام سەرکەوتن بەسەر دەوڵەتی ئەمەویەکاندا. وەهەروەها عەلەویەکانی تەبەرستان کاتێك لەنێو دیلمیەکاندا دەرکەوتن بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ چاوەڕێیان کرد تاوەکو دەستیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت‌و کاتێك کاروباری عەلەویەکان بەکۆتا گەیشت دیلمیەکان وولاّتی فارس و هەردو عێراقیان داگیر کردو، ساڵانێکی دوور و درێژ چاوەڕێیان کرد تاوەکو ئەصفەهان و فارسیان داگیر کرد و، دواتریش بەسەر بەغداد و خەلیفەشدا زاڵبوون.

وەهەروەها عبیدیەکان کەئەبو عبداللەی شیعی بانخوازیان کەلەنێو خانەدانی کەتامەدا بوو لەهۆزەکانی بەر بەر بۆ ماوەی دەساڵ و بگرە زیاتریش، لەئامادە باشیدا بوون و لەم ماوەیەدا لەگەڵ خانەدانی ئەغلەبیەکانی ئەفریقادا جەنگیان دەکرد لێرەو لەوێ دوایان دەخست، تاوەکو سەرئەنجام سەرکەوتن بەسەریانداو سەرانسەری مەغریبیان داگیرکردو، دواتریش چاویان بڕییە سەر میسر و بۆ ماوەی سی ساڵ چاوەڕێیان کرد و وازیان لەداگیر کاری نەهێناو، لەم ماوەیەدا هێزی دەریایی خۆیان هەمیشە لەئامادەباشیدا بوو بۆ داگیرکردنی میسر، وەلایەنی بەرگری میسریەکان لەڕێگەی ووشکانی‌و دەریاوە لەبەغدادو شام یارمەتی دەدرا، تاوەکو سەرئەنجام عبیدیەکان (فاتمیەکان) ئەسکەندەریەو فیوم و صەعیدیان داگیر کرد ۆ، بانگەوازیان لەوێشەوە گەیشتە حیجاز و لەمەککەو مەدینەدا بلاّو بوویەوەو لەپاشان سەرکردەکەیان جەوهەری کاتیب لەگەڵ سوپاکەیدا جەنگی لەدژی شاری میسر کەقاهیرەی کۆن دەکات ڕاگەیاندو، داگیری کرد و نەوەکانی بەنی تەغجی لەڕەگەوە دەرهێنان و شاری قاهیرەی دروستکرد. دواتریش خەلیفەکەیان موعید

الموعزلدین الله، هاتە ئەو شارەوە و لەسەرەتای داگیرکردنی ئەسکەندەریە لەلایەن عبیدیەکانەوە تاوەکو هاتنی خەلیفە بۆ شاری قاهیرە شەست ساڵی خایاند. وەهەروەها سەلجوقیەکان پاشاکانی تورك دوای ئەوەی کە زاڵبوون بەسەر سامانیەکاندا و لەماورا النهرین (جیحون) تێپەڕیان کرد و، نزیکەی سی ساڵ لەگەڵ خانەدانی سبکتکین کەوتنە جەنگەوەو، بەردەوام چاوەڕێی هەلی گونجاویان دەکرد و ئەوەبوو دەوڵەتی غەزنەویانیان داگیر کردو، دواتر هێرشیان کردە سەر بغداد و لەپاش ماوەیەك شاری بەغدادیان داگیر کرد و بەسەرخەلیفەشدا زاڵبوون. وەهەروەها تەتارەکان لەپاش سەلجوقیەکان لەساڵی ٦١٧ دا لەودەشتانەی کەتێیاندا دەژیان دەرچوون و لەپاش چل ساڵ توانیان زاڵ بن. وەهەروەها لەمەغریب مورابیتەکان لەهۆزی لمتونە کودەتایان کرد و دەستیان کردە جەنگ لەگەڵ پاشاکانی مغراوەدا، بەڵام ساڵانێکی دوور و درێژ چاوەڕێیان کرد تاوەکو هەلی گونجاویان بۆ هەڵکەوت و داگیریان کرد. لەپاشان مووەحیدان بەبانگەوازەکەیان لەدژی هۆزەکانی لمتونە ڕاپەڕین و نزیکەی سی ساڵ بەجەنگ و هێرشی کەم کەم چاوەڕێیان کرد، تائەوەبوو مەراکیشی پایتەختی مورابیتانیان داگیر کرد.

وەهەروەها مەرینیەکان لە هۆزەکانی زناتە لەدژی مووەحیدان ڕاپەڕین و خۆڕاگری و چاوەڕوانیەکی زۆریان کرد تاوەکو سەرئەنجام لەهەلێکی گونجاودا فاسیان داگیر کرد و، ئەو شارەیان لەگەڵ ناوچەکانی ئەو شارەی مووەحیداندا دابەشکرد و دواتریش بۆ ماوەی سی ساڵ لەگەڵ ئەو نەتەوەیەدا کەوتنە جەنگی هێواشەوە، تاوەکو مەراکیش کەپایتەختیان بوو داگیریان کرد، هەمووئەم ڕووداوانە لەمێژووی ئەو نەتەوانەدا تۆمار کراون. بەم جۆرەیە شێوازی دەوڵەتی تازە دامەزراو لەگەڵ دەوڵەتی کۆندا لەچۆنیەتی داگیر کاریداو چاوەڕێ کردن بۆ هەڵکەوتنی هەلێك بۆ ئەو کارە، نەریتی خودایە لەنێو بەندەکانیداو هیچکات ئەو دەستور و نەریتە نایەتە گۆڕین.[٢٨٧]

---

[٢٨٧] (سُنَّةُ اللهِ الَّتی قَد خَلَت فِی عِبادِهِ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللهِ تَبدِیلاً).

ئەوەی لەم بارەیەوە باسمانکرد دژ نیە لەگەڵ فتوحاتی ئیسلامیدا کەچۆن لەماوەی سێ یان چوارساڵدا توانیان بەسەر ئێرانی و ڕۆمیەکاندا زاڵبن، لەپاش وەفاتی پێغەمبەر (ص)بەبێ چاوەڕێ کردن. بەڵکو دەبێت ئەوە بزانین کە ئەم پێشکەوتنە خێرایانە لەو بوارەدا لەموعجیزەکانی پێغەمبەری خوداو گیان فیداکردنی موسوڵمانانە لەپێناو بانگەوازەکەیدا لەڕێگەی جیهاد و تێکۆشانەوەو لەڕووی بەصیرەت و ئیمانەوە بەبێ وەستان چاوەڕێی هەلی گونجاویان دەکردو، زۆر بەخێرایی دەسەلآتی بێباوەڕانیان لەناو دەبردو ئەو هەموو فتوحاتانەیان کردو ترس‌و سام‌و شان و شکۆیان لەدڵی دوژمنەکانیاندا چەسپیبو، هەموو ئەمانە لەموعجیزە و خەوارقەکانی ئەو چاوەڕێ کردنەی دەوڵەتە تازە دامەزراوەکان بوو لە بەرامبەر دەوڵەتە کۆن و جێگیرەکانەوە دەهاتنە ئەژمار.

وەهەرکات فراوانخوازیەکانی ئیسلام وەك خەواریق بن، ئەوا دەبێت بە موعجیزەی پێغەمبەری بزانین (ص)کەزۆرێکیان لەناو نەتەوەی ئیسلامدا هاتونەتەدی‌و شتەئاساییەکان لەگەڵ موعجیزەکاندا هەڵناسەنگێنن و موعجیزە ناکەنە بەڵگە بۆ ڕەت کردنەوەی شتە ئاسایی و سروشتیەکان.

# بەشی پەنجاهەم

## لەبارەی ئەوەی کە لەکۆتایی فەرمانڕەوایی دەوڵەتاندا کۆمەڵگە فراوان دەبێت و مەرگ و لەناوچوون و قات و قڕی و برسیەتی ڕوودەدات

لەوەی کەلەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد ئەوە سەلمێنرا کە دەوڵەتەکان لەسەرەتای کاریانەوە بەناچاری بیانەوێت و نەیانەوێت شێوازی هاوکاری لەگەڵ خەڵکیدا دەگرنە بەرو شێوەی مام ناوەندی لەدەست نادەن ئەوەش یان بەهۆی ئاینەوەیە، ئەگەر دەوڵەت لەئەنجامی بانگەوازی ئاینیەوە پێکهاتبێت، وەیان بەهۆی نەرمی و ڕەفتاری جوان و جوامێریەوە کەتایبەتی دەشتەکیەکانە و دەوڵەتە تازەکارەکان لەبەر ئەوەی کە هێشتا لەسەر خووی دەشتەکیەتین و، خوازیاری دەشتەکیەتی سروشتی دەوڵەتانە. وەهەرکات وەها دەوڵەتێك لەگەڵ خەڵکیدا هاوڕێ بێت ڕەفتاری جوان لەگەڵ خەڵکیدا لەدەست نەدات، ئەوا خەڵکی هیوادار دەبن و هەوڵ و کۆشش دەکەن لەڕێگەی شارستانیەت و ئاوەدانیدا و لەئەنجامدا کۆمەڵگە فراوان دەبێت و، ئەوە خستنە پەرەی پێ دەدرێت و زۆر دەبێت و، لەبەر ئەوەی کەهەموو ئەم کارانە بەشێوەیەکی قۆناغ بەقۆناغ بەڕێوە دەچن، هەربۆیە کاریگەری و شوێنەوارەکانی بەلایەنی کەمەوە لەپاش نەوەیەك یان دوو نەوە دەردەکەون، لەپاش ئەم ماوەیەش دەوڵەت دەگاتە کۆتایی تەمەنی سروشتی خۆی و لەم کاتەشدا کۆمەڵگە لەئەوپەڕی گەشەو فراوان بووندایە.

نابێت ئەوەبلێین لەبەر ئەوەی کەلە لاپەڕەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کردووە کە لەکۆتای تەمەنی دەوڵەتاندا دەستدرێژی و ستەم دەکرێت لەخەڵکی و، ئەم بابەتە دژی

گوتەی پێشوومانە بەڵکو ئەم بنەمایە بەتەواوەتی دروستەو بەهیچ شێوەیەك دژ نیە لەگەڵیدا چونکە لەم قۆناغەدا هەرچەندە ستەمگەری ڕوو دەدات و ئەندازەی خەراجەکان کەم دەبنەوە، بەڵام شوێنەوارەکانی لەڕووی کەمبوونەوەی کۆمەڵگەوە پاش ڕۆژگارێکی دوور و درێژ دەردەکەون چونکە شتە سروشتیەکان، هەروەك گووتمان بەشێوەیەکی قۆناغ بەقۆناغ ڕوو دەدەن. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کە برسیەتی و قات و قڕی و مردن لەکۆتایی فەرمانڕەوایی دەوڵەتاندا ڕوودەدات.

هۆکاری قات و قڕیەکەش ئەوەیە کەزۆربەی خەڵکی واز لەکشتوکاڵ دەهێنن چونکە لەم قۆناغەدا واتە لەکۆتایی فەرمانڕەوایی دەوڵەتاندا لەڕێگەی باجەوە ماڵ و سامانی دەستدرێژی دەکرێتە سەر ماڵ سامانی خەڵکی، وەیان بەهۆی پیری دەوڵەتەوە سەرکەشەکان کودەتا دەکەن‌و فیتنەو ئاشوب بەرپا دەبێت‌و خەڵکی ئاوارەو سەرگەردان دەبن و، کارو باری کشتوکاڵ کەم و کورتی تێ دەکەوێت. هەربۆیە زۆربەی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان لەم بارو دۆخەدا کەمتر ئیحتیکار دەکرێت. ئەم باشی و فراوانیەی بەروبوم هەمیشەیی نیە و هەموو ساڵێك هیوا بەخش نابێت و، چونکە کەم و زۆری باران هیچ گرنتیەکی لەگەڵدا نیە و لەساڵێکەوە بۆساڵێکی تر دەگۆرێت هەربۆیە بەروبومی کشتوکاڵ‌و حەیوانداری بەپێی ووشکەساڵی و پڕ بارانی ساڵ دەگۆرێت و، هەندێك کەسیش لەکاتی زۆری بەروبومدا ئیحتیکاری پێویستیەکانی ڕۆژانەی خۆیان و زۆرێك لەخەڵکی دەکەن و، بۆ کاتی نەبوونی و ووشکەساڵی هەڵی دەگرن و لەهەندێك ساڵدا ئەگەربێت‌و ئەم کارە نەکرێت ئەوا نەبوونی برسیەتی ڕوو دەکاتە خەڵکی توانای بەدەستهێنانی پێداویستیە خۆراکیەڕۆژانەکانیان نابێت‌و، لەبرساندا دەمرن و ئەم بارو دۆخەش هەمووان دەگرێتەوە، بەڵام مردنی زۆر لەکۆتایی فەرمانڕەوایی دەوڵەتاندا هۆکار گەلێکی جۆراو جۆریان هەیە، لەوانەش قات و قڕی، هەروەك باسمانکرد وەیان بەهۆی ئاڵۆزبوونی بارو دۆخی دەوڵەتانەوە ڕوو دەدات، بەتایبەت لەو کاتانەی کەکوشت و کوشتارەکان زۆر دەبن و خەڵکی دووچاری بەڵاو پەتاکان دەبنەوە و بەزۆری

هۆکارەکەشی زۆربوونی کۆمەڵگە و فراوانبوونی دانیشتوان هەوا خراپ و پیس دەبێت چونکە هەوای شارەکان بەهۆی مادە گەنیوەکان و شێی خراپ بوەوە تێکەڵ دەبێت و، هەواش وەك خۆراکی ڕۆحی حەیوانیە و بەردەوام هەڵی دەمژێت و خراپ دەبێت و ئەم خراپ بوونەش دەچێتە میزاجی مرۆڤەوە. وەئەگەر ئەم خراپ بوونە بەهێز بێت سیەکانی مرۆڤ نەخۆش دەکەون و، چەندین نەخۆشی توش دەبێت وەك تاعون و ئەو نەخۆشیانەی کەتایبەتن بەسیەکانەوە. وەئەگەر خراپ بوونی میزاج بەوئەندازەیە زۆر و بەهێز نەبێت ئەوا بۆگەنکردنەکەی دەبێتە چەند بەرابەر و هەمووجۆرە تایەکان لەمیزاجدا دروست دەبن و جەستە گیرۆدەی چەندین نەخۆشی دەبێت و دەمرێت.

هۆکاری زۆرێك لەبۆگەنکردن و شێداریە خراپەکان لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا بریتیە لە فراوانبوونی کۆمەڵگە و زۆربوونی دانیشتوانی شارەکانە لەکۆتایی فەرمانڕەوایی دەوڵەتاندا. چونکە دەوڵەتەکان لەسەرەتاوە بەشێوەیەکی نەرم هەڵسوو کەوت لەگەڵ خەڵکیدا دەکەن و خەڵکی لەهەموو دەستدرێژی و ستەمێك دەپارێزن و،ماڵیاتەکان زۆر نین کەبۆ هاووڵاتیان کەمەر شکێن بن و هۆکارەکەشمان باس کرد. هەربۆیە لەزانستی حیکمەتدا لە شوێنی خۆیدا سەلمێنراوە کەفراوانی شوێنی نیشتەجێ بوون و دەشتایی لەنێو کۆمەڵگەدا پێویستە، واتە دەبێت کۆمەڵگەو ناوچە نیشتەجێییەکان پەیوەست بن بەوناوچە دەشتاییانەوە کەهەوایەکی سازگارو ئازادیان هەیە بۆ ئەوەی بۆنە گەنیوو ناخۆش و زیانبەخشەکان کەلەگەڵ گیاندارە مردارەو بووەکاندا فەزایەکی ناتەندروستیان پێك هێناوە، بەهۆی زۆری شەپۆلەکانی هەواوە لەناو بچن و نەمێنن و هەوای پاك و بێگەرد و تەندروست بچێتە شارەکانەوە، و بەم هۆیەوە ڕێژەی مردن و لەناوچوون بەچەندین پلە لەشارە گەورەکاندا لەپێش شوێنەکانی ترەوەیە وەك میسر لەخۆر هەلاتو فاس لەمەغریب، خوداش هەرچیەکی بوێت تەقدیری دەکات.

# بەشی پەنجاو یەکەم

## لەبارەی ئەوەی کەلەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بەناچاریەوە دەبێت سیاسەتێك بەکاربهێنرێت کەبەهۆیەوە ڕێکسازی لەکاروبارە کۆمەڵایەتیەکاندا بەرقەرار دەبێت

لەچەندین شوێنی تردا لەپێشەوە باسکرا کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی شتێکی پێویستە و بەمانای ئاوەدانیە کەئێمەباسی دەکەین و، باسی ئەوەشمانکرد کەلەهەرکۆمەڵگەیەکدا ناچار دەبێت بەرپەرچ دەرەوە و فەرمانڕەواو حاکمێك هەبێت کەخەڵکی بگەڕێنەوە بۆی‌و، فەرمانی ئەو حاکمە لەنێو خەڵکیدا هەندێك جار پشت بەستووە بە شەرعێك کەلەلایەن خوداوە نێردراوە و باوەڕی خەڵکی بەپاداشت و سزایەك کە بانگخوازی ئەو ئاینە هێناویەتی و، گوێڕایەڵی لەو حاکمە بکەن و ملکەچی فەرمانەکانی بن. وەهەندێك جاریش فەرمانی حاکم پشت بەستووە بەسیاسەتێکی ئەقڵی لەپاش ئاشنا بوونی ئەو بەبەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگەو بەهۆی ئەو چاوەڕوانیانەی کەلە فەرمانڕەوا هەیانە لەپاداشت کردنیاندا ملکەچی فەرمانەکانی دەبن. هەربۆیە یەکەمین پاداشت هەم لەم دونیاو هەم لەو دونیاش بەمرۆڤ دەگاتەوە چونکە شارع (خودا)لەبەرژەوەندیەکان و چارەنوسی مرۆڤ ئاگادارەو، سەرفرازی بەندەکانی خوداشی لەو دونیا لەبەر چاو دەگرێت، بەڵام دووەم پاداشت تەنها لەم جیهانەدا بەدی دێت، وەئەوەی لەسیاسەتی مەدەنی دەیبیستین پەیوەست نیە بەم بابەتەوە، بەڵکو ماناکەی لەلای حەکیمەکان شتێکی

سیرەتیە کەدەبێت هەرتاکێکی خەڵکی لەو کۆمەڵگەیەدا لەڕوی دەرون و خوەوە لەسەری بێت بۆ ئەوەی بێ نیاز بێت لەفەرمانڕەوایان و حاکمەکان. وەلە کۆمەڵگەیەکدا کەپێویستە ئەم سیرەتە بەدی بێت پێی دەڵێن (مەدینە فازیلە)و یاسا ڕەچاو کراوەکان لەو کۆمەڵگەیەدا پێی دەڵێن سیاسەتی مەدەنی، مەبەستی حەکیمەکان سیاسەتێك نیە کەخەڵك بەئەنجامدانی ناچار دەکەن پەیڕەوی لێبکەن بەناوی بەرژەوەندی گشتیەوە، چونکە ئەم سیاسەتە جیایە لەسیاسەتی مەدەنی.

وە ئەم مەدینە فازیلە لەلای ئەوان نایابەو یان ڕوودانی دوورەو حەکیمەکان تەنها لەڕێگەی گریمانەوە بەشێوەیەکی تیۆری باسی دەکەن. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەسیاسەتی ئەقڵی کەباسمانکرد لەسەر دوو شێوەیە: یەکێکیان بریتیە لەوەی کەتێیدا بەرژەوەندی خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی و بەرژەوەندی پاشا لەپاراستنی موڵکی ئەودا بەتایبەت ڕەچاو بکرێت، ئەم سیاسەتەش تایبەت بوو بەئێرانیەکانەوەو پشت بەستوبووە بەشێوازی حیکمەت. ئەڵبەت خودای گەورە ئێمەی لە مەزهەبی ئیسلامدا و لەسەردەمی خەلافەتدا بێ نیاز کردووە چونکە ئەحکامی شەریعەت لەمەسەلە گشتی و تایبەتەکان و نەریتی ژیانمان لەو بێ نیاز دەکات و، یاساو ئەحکامەکانی پاشایەتی و دەوڵەتداریش دەگرێتەوە. جۆری دووەمیش ئەوەیە کەتێیدا بەرژەوەندی سوڵتان و چۆنیەتی بەهێز بوونی پاشایەتی لەڕێگەی هێزو دەسەلاٌت و زاڵبوونەوە ڕەچاو دەکرێت بەرژەوەندی گشتی لەئایندا شێوازێکی فەرعیەلەبەرژەوەندی سوڵتاندا، ئەم سیاسەتەش بۆ پاشاکانی تریش دەبێت ئیتر کافر بن یان موسوڵمان بەدەر لەوەی کە پاشاکانی موسوڵمانان بەپێی توانایان پەیڕەوی لەسیاسەت دەکەن و لەژێر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانی ئایندا، کەواتە یاساکانی بریتین لەزنجیرەیەك لەیاساو ڕێساو حوکمەشەرعیو ئادابو ئەخلاقو ئەویاسایانەشی کەلەکۆمەڵگەدا سروشتین‌و، ئەوبنەمایانەشی کەلەڕوانگەی ڕەچاوکردنی شکۆو عەصەبیەتدا پێویستن لەبەرچاو دەگرێت.

وەلەبنەماو یاسا ناوبراوەکاندا سەرەتا چاو لەشەرع و دواتریش داب و نەریت و سیرەتی پاشاکان دەکات و لەباشترین بەرهەم و کۆترینیانە کەلەم بارەیەوە نوسرابێتەوە و بەیادگار ماوەتەوە، نامەکەی تاهیری کوڕی حسەینی سەرداری مەئمونە کەناردوویەتی بۆ کوڕەکەی عبداللەی کوڕی تاهیر و لەبەر ئەوەی مەئمون خۆی فەرمانڕەوای ڕقە و میسر بووە سەرزەویەکانی ئەو دووناوچەیەی دایە دەستی عبدالله، باوکی نامە بەناوبانگەکەی بۆ عبدالله ناردو، تێیدا ئامۆژگاریەکانی تایبەت بەدەوڵەتداری وەك ئادابە ئاینی و ئەخلاقی و سیاسەتی شەرعی و دەوڵەتداری نوسی و ئەو سیفەتانەی کەهیچ پاشاو دەسەلأتدار و خەڵکێکی ئاسایی بێ نیاز نیە لێیان وەیادی هێناوەتەوەو، دەقی نامەکەشی لەکتێبی تەبەریدا بەم جۆرەیە:

بسم الله الرحمن الرحیم، لەپاشان (امابعد)لەخوا ترسانی خودای تاقانە و بێ شەریك لەسەر خۆت بە واجب بزانە و، بەردەوام لێی بترسەو بەچاودێری خۆتی بزانە و لەڕق و توڕەیی ئەو زاتە خۆت بەدوور بگرە، شەوو ڕۆژ لەهەوڵی پاسەوانی پاراستنی خەڵکەکەتدابەو، لەبەرامبەر نیعمەت و لەش ساغی کەخودا پێی بەخشیوی هەمیشە ئەو دونیات لەبیر بێت و ئەوە بزانە کەبەدڵنیاییەوە دەچیتەوە ئەو دونیاو، ژیانی نەبڕاوەو هەمیشەیی تۆ لەو دونیادایە و لەوێدا لەبارەی هەموو کردارەکانتەوە لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێت، کەواتە شێوازێك بگرە بەر کەخودا لەهەر هەڵخلیسکانێك بتپارێزێت و لەتۆڵەو عەزابی لەو دونیا پارێزراو بیت چونکە خودا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووەو گروپێك لەبەندەکانی بەتۆ سپاردووە، میهرەبانی کردنی لەگەڵ خەڵکیدا بەواجب داناوە لەسەر شانت و داوای لێکردویت کەدادپەروەربیت لەگەڵیاندا کەواتە دەبێت حوکم و بڕیارەکانی خودا لەنێویاندا جێبەجێ بکەیت، لەگیان و ناموس و سەرزەویەکەیان بەرگری بکەیت و نەهێڵی خوێنی هیچ کەسێك بڕژێت و لەهەوڵی بەرقەرار کردن و دابینکردنی ئەمن و ئاسایشدا بیت بۆیان. چونکە خودا لەسەر ئەو ئەرکانەی کەخستویەتیە سەر شانت لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکات و، لەبەردەم دادی خوداییدا دەوەستیت و پرس و جۆت

لەگەڵدا دەکرێت پاداشتو سزای تۆ بەندە بەئاستی پابەند بوونت بەجێبەجێکردنی ئەرکەکانتەوە، کەواتە بەردەوام تێگەیشتن و ژیری و بینایی خۆت لەکارەکانتدا بەکار بهێنە و وورپابە سەرقاڵیت بەشتی ترەوە لەجێبەجێ کردنی ئەرکەکانت بتگێڕێتەوە. چونکە ئەو ئەرك و تەکالیفانە ئەرکی سەرەکی تۆو یەکەمین سەرکەوتنێکە کەخودا بەهۆیانەوە تۆی ڕێنوێنی کردووە بۆسەر ڕێگەی ڕاست. وەدەبێت یەکەمین کارێك کەدەیگریتە ئەستۆ و کارەکانتی دەدەیتەپاڵ، ئاگاربوون بێت لەو فەریزانەی کەخودا لەسەر تۆی واجب کردوون وەك پێنج فەرزە و ئامادەبوون لەنوێژی جەماعەت لەگەڵ ئەو خەڵکەی کەتۆیان قبوڵکردووە و، جێبەجێکردنی شتەکانی تری نوێژ بەپێی سوننەتەکانی وەك چۆنیەتی دەستنوێژ گرتن و جێبەجێکردنی هەموو هەلومەرجەکانی بەشێوەیەکی شیاو سەرەتا ناوی خودا بهێنی و، لەکاتی خوێندنی (حمد و سورە)وشەکان بەلەسەر خۆیی و بەبێ پەلەکردن بەزارتدا بهێنی و، لەڕکوع و سجود و تەحیاتێکی هێمن بخوێنیو، نیەتی خۆت لەگەڵ خودادا بەڕاستگۆیانە یەکلایی بکەیتەوە. وەهەروەها شوێنکەوتوان و هاوڕێیانت هان بدە بۆنوێژ و، لەم کارەت بەردەوام بە چونکە نوێژ مرۆڤەکان لەخراپە و خراپەکاری دەگێڕێتەوە.[٣٨٨]

دواتریش ئاگاداری جێبەجێکردن و شوێنکەوتنی سوننەتەکانی پێغەمبەر بەو شوێن سەلەفی صالح بکەوە و، هەرکاتێك کارێکت بۆ هاتە پێشەوە داوای یارمەتی لەخودا بکەو ئاگاداری ئەمر و نەهیەکانی خودابەو، شوێن فەرموودەکانی پێغەمبەر بکەوەو ئەو کات ئەوەی کەخودا فەرموویەتی لەسەر حەق و ڕاستی ئەنجامی بدە. هیچکات لەکارەکانتدا لەسەر ڕێگەی دادگەری لامەدە ئیتر ئەو کارەت بەدڵی خۆت بێت یان بەپێچەوانەوە، یان پەیوەست بێت بەکەسانێکەوە کەلەخزمان و نزیکانی تۆبن، وەیان لەبارەی کەسانێکەوە بن کەهیچ پەیوەندیەکیان بەتۆوە نەبێت و بێگانە بن. فەقیهەکان و زانایانی دین و کتێبەکەی خودا عزوجل و ئەوانەی کەکاری پێدەکەن هەڵبژێرە، چونکە شارەزایی

---

[٣٨٨] (إِنَّ الصَّلاةَ تَنهى عَنِ الفَحشاءِ وَالمُنكَرِ) س عنكبوت ئا ٤٤ .

لەئاین‌و بەشوێندا گەڕانی و هەڵبژاردن تێیدا وناسینی ئەوەی کەمرۆڤ لەخودا پەروەردگار نزیك دەکاتەوە، باشترین کاری مرۆڤە و بەرەو هەموو چاکەکان ڕێنمایی دەکات و فیقه ڕێنماو ڕێبەری مرۆڤە بەرەو چاکە و ڕێگری مرۆڤەکانە لەهەموو خراپەیەك و، بەیارمەتی خودا مەعریفەی مرۆڤ بەرامبەر بەخودا زۆر دەبێت و زیاتر پەی بە جەلال و گەورەیی ئەو زاتە دەبات و لەڕۆژی دوایشدا پلەو پایەی گەورە و بەرز بەدەست دەهێنێت. سەرەڕای ئەمەش لەبەر ئەوەی کەلەدیدەی خەڵکیدا بەکەسێکی زانا لەدیندا بناسرێیت فەرمانە کانت بەڕێزەوە جێبەجێ دەکەن و، شکۆی تۆ لەدڵیاندا جێگیر دەبێت و ڕووت تێدەکەن‌و لەدادگەری‌و دادپەروەریت دڵنیا دەبنەوە. پێویستە لەسەرت لەهەموو کارەکانتدا میانەڕەو بیت چونکە لەهەمووشتەکان بەسودترە و ئاسودەیی بەهۆیەوە زیاتر ئامادە دەبێت و خاوەن تایبەتمەندی گەلێکی کۆو جامیع ترە. میانەڕەوی مرۆڤ بەرەو ڕێگەی ڕاست ڕێنمایی دەکات و، دەبێتە هۆی خۆشبەختی مرۆڤ و پایەداری ئاینەکەی و ئەمانەش وابەستەن بەمیانەڕەویەوە.

کەواتە لەهەموو کاروبارەکانی ژیانتدا هەڵبژێرە، بەڵام لەبەدەستهێنانی ئاخیرەت و کرداری چاك و سوننەتە ناسراوەکان و نیشانەکانی ڕاستیدا بەکەم ڕازی مەبە، چونکە کۆشش لەڕێگەی چاکە دا کۆتایی نیە بەتایبەت کەلەڕێگەی ڕەزامەندی و خۆشەویستی خودادا بێت و، بەهۆیەوە داوای هاوڕێیەتی پیاو چاکانی خودا لەو دونیادا دەکەن. ئەوەش بزانە کەمیانە ڕەوی لەکاروبارەکانی دونیادا دەبێتە هۆی سەربەرزی و مرۆڤ لەتاوان دوور دەخاتەوە، هیچ شتێك وەك ئەو پێگەی تۆ ناپارێزێت و نابێتە هۆی چاکبونی کاروبارەکانت کەواتە میانەڕەوی هەڵبژێرە و بۆ ئەوەی هەموو کارەکانت بگەنە کەماڵ و، تواناکانت زیاد بکات و خەڵکی گشتی و تایبەت ئیصلاح بکات. یەقینت هەبێت بەرامبەر بەخودای خۆت بۆئەوەی خەڵکی لەدەوری دادگەری کۆببنەوە و لەهەموو کارەکانتدا دەستی پێوە بگرە و، هۆکاری هەموو کارەکان لەو داوابکە بۆئەوەی نیعمەت‌و بەخششەکانی خودا بەردەوام بن بۆت. بەرلەوەی حەقیقەتی شتەکان بزانی تۆمەت

مەدەرەپاڵ هیچ کەسێك، چونکە تۆمەتدانە پاڵ خەڵکی بێتاوان لەگوناهە گەورەکانە، کەواتە لەگەڵ هاوڕێ و هاوکارانتدا گومانت باش بێت گومانی خراپیان پێ مەبەو باهەمیشە گومانەکانت باش بن بۆ ئەوەی بتوانی یارو هاوڕێیانت لەسەر چاکە و کاری جوان پەروەردە بکەیت، هیچ کات مەهێڵە کەسە خراپ و ڕەشبینەکان عەیبت تێدا بدۆزنەوە، چونکە ئەم کەسانە تەنها کەمێك سستی تۆیان بەسە بۆ ئەنجامدانی کارە خراپەکانیان و لەڕێگەی بەدگومان کردنتەوە بەرامبەر بەخەڵکی دووچاری خەمت دەکەنەوە و، لەزەت و شیرینی ژیان لەدەست دەدەیت. بزانە کەگومانی باش هەمیشە بەهێزت دەکات و ئەوەی کەپێت خۆشە دەیکەیت و پێی دەگەیت. لەم ڕێگەیەوە دۆستی خەڵکی بۆ خۆت مسۆگەر دەکەیت و کارەکانت بەباشی دەچنە پێشەوە و جیگیر دەبن، بەڵام ئەوەش بزانە گومانی باش بردن بەیارو دۆستانت نابێت لەتێڕوانین و وورد بوونەوە لەکاروبارەکانیان دوورت بخاتەوە و دژی ئەوە نیە کە بەووردەکاریەوە کاروبارەکانی دەسەڵاتەکەت بەڕێوە بەریت و، لێپرسینەوە بکەیت و لەخراپە دووریانت بخەیتەوەو ئەوەی بەرژەوەندی ئەوانی تێدایە هانیان بدەیت ئەنجامی بدەن، بەڵکو دەبێت لەئەستۆ گرتنی کاروباری خەڵکی و پێویستیەکانیان و دوور خستنەوەی ناڕەحەتی لێیان و هەوڵی پارێزگاری کردنیان بدەیت.

چونکە ئەم شێوازە دین پایەدار تر دەکات و سوننەتی پێغەمبەر زیندو تر ڕادەگرێت. نیەتت لەهەموو کاروبارەکانتدا پاك بکەرەوەو لەئیصلاح و پاککردنەوەی ئەخلاقتدا هەوڵی فراوان بدەو لەبەرامبەر کردەوەکانتەوە خۆت بەبەرپرس بزانەو، پێت وابێت ئەگەر چاکە بکات پاداشت وەردەگرێتو ئەگەریش خراپە بکات ئەوا سزا دەدرێت. چونکە خودائاینی وەك قەڵایەکی بەهێز بۆ خەڵکی داناوە ئەگەر پەیڕەوی لێبکەن ئەوا دەگەنە سەربەرزی و سەرفرازی. کەواتە لەگەڵ ئەوکەسانەی کەکاروبارەکانیان لەدەستی تۆدایە، شێوازی ئاین بگرەو ڕۆشتن بەرەو ڕێگەی ڕاست هەڵبژێرە و سزاو حەدەکانی خودا بەپێی ئەو تاوانانەی کە تاوانباران ئەنجامیان داوە جێبەجێ بکە و ئەم شێوازە لەدەست مەدەو

سستی تێدا مەکە و سزای تاوانباران دوا مەخە، چونکە ئەگەر لەم بارەیەوە زیادەڕەوی‌و چاوپۆشی نابەجێت هەبێت دەبێتە هۆی لەناو چوونی گومانی چاك بردن پێت و هەمیشە نەریتە باشە باوەکان پەیڕەو بکەو لەبیدعە و شوبهە دوور بکەوە بۆ ئەوەی دینەکەت پارێزراو بێت وجوامێریت پایەدار بێت. وەهەرکات لەگەڵ کەسێکدا پەیمانێکت بەست بیبەرە سەر و پابەندبە بەقسەو وەعدی خۆتەوە. کاری چاکە قبوڵ بکە و خراپەی پێ دوور بکەرەوە واز لەعەیبە دۆزینەوە بهێنە لەخەڵکیدا و لەقسەی درۆو بوختانکردن خۆت بەدوور بگرەو لەگەڵ فیتنەچیەکاندا دوژمنایەتی بکە چونکە نزیك کردنەوە درۆزن لەخۆت‌و بێشەرمی لەدرۆکردندا کاروبارەکانی ئیستە و ئایندەشت لەناو دەبات. وەلەبەر ئەوە کە درۆ سەرەتای گوناهەکان و بوختان و فیتنەییە، هەربۆیە دووزمانی دەردێکە نەگۆیاکەی و نەبیسەرەکەی پارێزراو نابن و بێسەر و بەری و پشێوی دروستدەکات، لەگەڵ کارزان و کارجوانان و ڕاستگۆیاندا هاوڕێیەتی بکەو لەحەق و عەدالەتدا هاوکاری خەڵکی شەریف و باش بکەو لەبێتواناکان تێبگە و صیلەی ڕەحم بەجێ بهێنە، چونکە بەهۆیەوە ڕێگەی خودا دەدۆزیتەوەو فەرمانەکانی بەڕێزەوە بەجێ بهێنەو داوای پاداشتی لێبکە لەو دونیادا. لەمەبەست و حەزە خراپەکان دوور بکەوەو، بۆچوونەکانت لێیان بەدوور بگرە و بەری بوون و دووری خۆت لەخراپەکاران و نادادگەری لەبەرچاوی خەڵکیدا ئاشکرابکە و، هەمیشە هاوکارو پشتیوانی هەق و ڕاستی و دادگەری بە بۆئەوەی ڕێنوێنیت بکەن بۆ سەر ڕێگەی ڕاست. لەکاتی توڕەییدا ئاگاداری خۆت بەو بەوویقارەوە هەڵسووکەوت بکە. لەتوڕەیی و لەخۆبایی بوون دوور بکەوە لەکارەکانتدا نەوەك بڵێی من فەرمانڕەوام و لەهەمووان بەهێزتر و باشترم و هەرچیەکم بوێت دەیکەم، چونکە ئەم جۆرە لەخۆبایی بوون و فیزو هەوایە دەبێتە هۆی لاوازی بیرو باوەڕ و کەمی یەقینت بەخوداو لەناوچوونت. نیەتی خۆت لەگەڵ خودای گەورەدا پاك بکەرەوە و ئەوەش بزانە

پاشایەتی دەوڵەتداری خودا بەهەرکەسێك کەبیەوێت دەیدات و، لەهەرکەسێکیشی وەردەگرێتەوە کەئارەزوی نەبێت پێی ببەخشێت.[٣٨٩]

وەهەرکات بەرپرسان و دەسەلاتداران سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خودا نەبن و کوفری ئەو نیعمەتانە بکەن کەخودا پێی بەخشیون و، لەخۆیان بایی ببن خوداش بەشێوەیەکی زۆر خێرا دەسەلات و دارایی و ماڵ و سامانیان لێ دەسەنێتەوە و دەسەلاتەکەیان لەناو دەبات و شان و شکۆی خۆیان کۆشکو تەلارەکانیان لەبن دەهێنێت و لەدونیاو دواڕۆژیشدا سزایان دەدات و خوداش بەهیچ شێوەیەك بەستەم دەسەلات و شان وشکۆ لەهیچ کەسێك ناسەنێتەوە مەگەر ئەوانەی کەسوپاسگوزاری نیعمەتەکانی ناکەن و کافر دەبن بەرامبەری و، لەبەرامبەر دەسەلاتی خودادا خۆیان بەخاوەن هێزو دەسەلات بزانن و زوڵم و ستەم لەخەڵکەی بکەن. ئیسراف و زیادەڕەوی لەخۆت دوور بخەرەوە چونکە دەبێت گەنجینەو ماڵ و داراییەکەی تۆ ببێتە هۆی چاکەو خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکی ئاوەدان کردنەوەی شارو ڕاگەیشتن بەکاروبارەکانیان‌و، پاراستنی خوێن و گیانیان و دادگەری بێت بەرامبەر بەستەم لێکراوان.

وەئەوەش بزانە کەهەرکات سەروەت و سامان لەخەزێنەکاندا هەڵگیراو بۆ بەرژەوەندی گشتی خەرج نەکرا ئەوا هیچ سودێکی نابێت، بەڵام ئەگەر لەباشکردنی ژیان و گوزەرانی خەڵکیدا بەکار هێنرا و بەهۆیەوە ڕەنج وماندوبوون و ئازاری خەڵکی کەم کرایەوە، ئەوا زۆر دەبێت و دەبێتە هۆی فراوانبوونی نازو نیعمەت و خەڵکی بەهۆیەوە سەرفراز دەبن و شکۆی پاشاکانیش گەورەتر دەبێت و، سەردەمێکی گەشاوە دێتەئاراوە و خەڵکی ڕێز و گەورەیی بەدەست دەهێنن. کەواتە دەبێت ماڵ و سامان و دارایی دەوڵەت لەڕێگەی خۆشگوزەرانی خەڵکی و ئیسلام و موسوڵماناندا بەکار بهێنرێت بەشێکی دابەش بکە بەسەر هاوڕێ و دۆستانی ئەمیری ئیمانداراندا و، مافی خۆیانیان بدەرێ و بەشی خەڵکیش کەگونجاو بێت بۆ ژیانێکی شەرافەت مەندانە بدە، چونکە ئەگەر بەم شێوەیە

---

[٣٨٩] (تُؤتِي المُلْكَ مَن تَشاءُ وَتَنزِعُ المُلكَ مِمَّنْ تَشاء) س ال عمران ئا ٢٥.

هەڵسووکەوت بکەیت نازو نیعمەتەکانت پایەدار دەبن و لەلایەن خوداشەوە دەکرێتە چەندهێندە و، لەمەسەلەی وەرگرتنی باج لەخەڵکی بەتواناتر دەبیت و بەهۆی ئەوەی دادگەری و چاکەت هەمووانی گرتوەتەوە فەرمانەکانت بەدڵێکی فراوانەوە جێبەجێ دەکەن و، هەرچیەکت بوێت بەخێرایی جێبەجێی دەکەن.

وەئەوپەڕی هەوڵی خۆت لەو شتانەی کەئامۆژگاریم کردیت بخەرەگەڕ و دەبێت لەم بوارەدا لەخودا بترسیت، چونکە سەروەت و سامانێك بەنەمری دەمێنێتەوە کەبەشێوەیەکی شیاو لەڕێگەی خودادا خەرج بکرێت، سوپاسگوزاران بناسەو بێ پاداشت مەیان هێڵەرەوە و بەردەوام دەستخۆشی و پاداشتیان بکە. نەوەك لەخۆبایی بوون و پلەو پایە ئەو دونیات لەبیر بباتەوەو، لەئەنجامی ئەم لەخۆبایی بوونە ئەو ئەرکانەی کەلەسەر تۆیە بەباشی جێبەجێیان نەکەیتو هەست بەلێپرسراویەتی نەکەیت و گوێ نەدەیتە ئەرك و واجبەکانت چونکە ئەم کارە دەبێتە مایەی لەناوچوونی مرۆڤ. دەبێت هەمووکردەوەکانت بەپێی شەرعی خوداو لەبەر خاتری ئەوو بەتەمای پاداشتی قیامەت بیت، چونکە خودا لەم دونیایەدا نیعمەتی کامڵی خۆی بەتۆ بەخشیوە و فەزڵ و چاکەی خۆی بۆ تۆ ئاشکرا کردووە.

بەردەوام سوپاسی خودا بکە و باوەڕت پێی هەبێت بۆ ئەوەی خودا زیاترت بەسەردا بڕێژێت چونکە خودا بەئەندازەی شوکری شوکرانەبژێران و چاکەی چاکەکاران ولەسەر حەق بوون نازو نیعمەتی خۆی دەڕێژێت بەسەریانداو، لەڕێگەی بەخشینی ئەو نیعمەتانەوە لەدونیادا پاداشتیان دەداتەوە و بەختەوەری دوا ڕۆژیشیان مسۆگەرە. هیچ کات تاوان بەکەم مەزانە و هاوکاری ئیرە چیان و حەسودان مەکە و بەزەییت بەخراپەکارو تاوانباراندا نەیەتەوە و، پاداشتی خراپەکاران مەدەرەوە و بەزمانی نەرمەوە قسە لەگەڵ دووژمندا مەکە و باوەڕ بەقسەی دووزمانەکان مەکە و باوەڕت بەبێوەفایان نەبێت و، هاوڕێیەتی فاسیقان مەکە و پەیڕەوی لەگومڕاکان مەکە و، ڕیابازەکان مەلاوێنەو، هیچ کات کەس تەریق مەکەرەوە و دەست بەڕووی خوازیاری بێنەواوە مەنێ و

هاوکاری بکە، وەڵامی باتڵ مەدەرەوە و لەقسەپێکەنیناویەکاندا قوڵ مەبەرەوە. پەیمان شکێن مەبە و شانازی بەدرۆوە مەکە و هیچکات بەتەواوەتی تورەیی خۆت ئاشکرامەکە و خۆت بەگەورە مەزانە و لەخۆت بایی مەبە و بەخۆبەزل زانیەوە بەسەر زەویدا مەڕۆو،[390] هاوڕێیەتی سەفیهەکان مەکە و، لەبەدەستهێنانی ڕۆژی دوایی و پاداشتەکەیدا درێغی مەکە و ڕۆژەکانت بەشتی ناپەسەند و گوتنی خراپەوە بەسەر مەبە و، لەڕوی ترس یان نزیکی لەکەسێکەوە چاوپۆشی لە ستەم مەکە و پاداشتی ئەو دونیات لەم جیهانەدا نەوێت و، بەردەوام لەگەڵ فەقیهەکاندا ڕاوێژ بکە و خۆت لەسەر نارەحەتیەکان ڕابهێنە و لەخاوەن ئەزموون و ئاقڵەکان و خاوەن فیکرو ئەندێشەو حیکمەتەکان زانست و ئەزمون وەربگرەو، خەڵکی حەسودو بەخیل لەدەربڕینی بۆ چووندا بەشدار مەکە. بەهیچ شێوەیەك گوێ لەقسەیان مەگرە چونکە زیانیان زیاترە لەسودو قازانجیان. چونکە بەخیلی و خۆگرتنەوە لەکاروباری خەڵکیدا بەر لەهەمووشتێك دەبێتە هۆی خراپە. ئەوەش بزانە ئەگەر چاوچنۆك و تەماعکار بیت ئەو خووەی تۆ وات لێدەکات کەکەم ببەخشی و زۆر داوابکەیت و، هەرکات لەسەر ئەم شێوازەبیت مەگەر بۆ کاتێکی کەم وەگەرنا کاروبارەکانت بەردەوام نابن، چونکە خەڵکی تەنها لەم ڕێگەیەوە پشت بەمیهرەبانی تۆ دەبەستن کەدەستدرێژی نەکەیتە سەر ماڵ و سامانیان و واز لەستەمگەری بهێنی.

وەهەرکەس چاکەت لەگەڵدا بکات بەدۆستایەتیەوە لەگەڵیدا بجوڵێرەوەو لەبەخششەکانتدا درێغی لێ مەکە. چاکە و باشەی ئەوان لەگەڵ تۆدا لەڕێگەی چاکەو بەخشین لەگەڵیاندا بەهێز تر دەبێت. دەرگاکانی چاکە و بەخشین بەڕووی ئەو هاوڕێیانەی کەبەدڵسۆزی و دڵ صافیەوە دۆستایەتیت دەکەن بکەرەوە و بەخشندە بە لەبەرامبەریانداو لەبەخیلی دوور بکەوەرەوەو ئەوەش بزانە کەبەخیلی یەکەمین سیفەتێکە کە مرۆڤ بەهۆیەوە بۆ یەکەمجار نافەرمانی کردووەو، کەسی سەرکەش و نافەرمان

[390] (وَلاتَمش فی الأرضِ مَرَحاً) س الاسری ئا ٣٩ .

هەمیشە لەپلەیەکی پەست و نزمدایە وەك خودای گەورە دەفەرمێت: (ئەوەی کەدەرونی لەبەخیلی پاك بکاتەوە ئەوە سەرفرازی بەدەست دەهێنێت)، کەواتە بەحەق و ڕاستی دیوانەکانی جادەی بەخشش هەموار بکەرەوە و، لەو خەراجەی کەکۆی دەکەیتەوە موسوڵمانانی لێ بەهرەمەند بکە. لەوەش دڵنیابە کە بەخشش لەباشترین کارەکانی بەندەکانی خودایە، هەربۆیە لەڕووی چۆنیەتیەوە خووی خۆتی پێ تەیار بکە و خۆشنود بە و شێوەی ڕەفتاری خۆتی پێ برازێنەرەوە. لەکاروبارەکانی سوپادا ووردە کاری بکە و سەیری دەفتەری تۆمارەکانیان بکە و بەهەریەکێکیان ڕابگە و، هۆکارەکانی ژیانیان بەشێوەیەکی شیاو فەراهەم بکە، تاوەکو خودای گەورە بەو هۆیەوە لەتەنگدەستی ڕزگاریان بکات و لەئەنجامدا خۆشگوزەران بن و گوێڕایەڵی لەفەرمانەکانت لەخۆشی و ناخۆشیدا بکەن هەرئەوەندەش بۆ بەرپرسانی دەوڵەت و سوپا بەسە کەبتوانن خەڵکی ژێر دەستیان بخەنە خۆشگوزەرانیەوە. کەواتە ئەگەر شتێکی ناپەسەند لەسوپا یان خەڵکیەوە ڕوویدا لەڕێگەی داپۆشین و چارەسەر کردنی بەفەزیلەتو، گەورەییەوە چارەسەری بکەو، انشط الله سەرفرازی و کامەرانی بەدەست دەهێنی. ئەوەش بزانە کەڕێگەی قەزاوەت و دادگەری لەلای خودا لەهەموو پلە و پایەکان لەپێشترە، چونکە دادگەری وەك تەرازوی خودا وایەو کەکاروبارو کردارەکانی خەڵکی لەسەر زەویدا پێ هەڵدەسەنگێنرێت و چاکسازیان تێدا دەکرێت و، بەجێبەجێ کردنی عەدالەت لەمەسەلەی قەزاوەت و کاری دیواندا ژیانی خەڵکی خۆش دەبێت و بارودۆخ و ڕێگەکان هیمن و ئارامو ئاسایش دەبن و ستەم لێکراو مافی خۆی لەستەمکار وەردەگرێتەوەو، خەڵکی هەموو مافەکانیان بەدەست دەهێنن کاروباری ژیانیان پایەدارو جێگیر دەبێت و مافی گوێڕایەڵی خۆیان بەجێ دەهێنن و خوداش لەش ساغ و تەندروست باشیان دەکاتو کاروباری ئاینیش جێگیر دەبێت و، سوننەت و شەریعەتەکان بەهۆی جێبەجێ کردنی حەق و ڕاستی و کاری دادگەریەوە لەسەر ڕێڕەوی خۆی دڕوات.

لەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودادا بەهێز بە و لەخراپە و شەڕ دوور بکەوە و حەدەکانی خودا بەسەر خەڵکیدا جێبەجێ بکە. لەپەلە کردن دوور بکەوە و دڵتەنگی و دڵەڕاوکێت نەبێت و مەهێڵە هیچ کات ڕووت تێبکەن و، قەناعەت بەبەش و ڕۆزی خۆت بکە. وەدەبێت و هێزو دەسەڵاتی تۆ زاڵ و جێگیر ببێت و ئەو سزایانەی کە دەیان سەپێنی جێبەجێ بکرێن. وەلەئەزموونی خۆت سود وەربگرە لەکاتی خامۆشی و بێداریداو لەکاتی قسەکردندا پایەدار بەو، لەگەڵ دژەکانتدا بەویژدانو ئینصافەوە هەڵسووکەوت بکەو، لەکاتی شوبهەدا درەنگتر بجولێرەوەو لەبارەی حوکمێکەوە کەبەڵگە دەهێنیتەوە بابەڵگەکەت بەهێز بێت و، نابێت بەرامبەر بەهیچ کەسێك بکەویتە ژێر کاریگەری خۆش ویستن و توڕەییەوە بێ لایەنی واز لێ بهێنیت و لەکاتی داوەریکردندا بەهۆی خۆش ڕەفتاریتەوە لەگەڵ کەسێکدا ناحەقی بکەیت وەیان بیر لەلۆمەی لۆمەکاران بکەیتەوە. بەڵکو لەداوەری کردندا هەمیشە تامڵ بکە و هیچ پەلەیەکی تێدا مەکە و چاودێری بکەرە پیشەی خۆتو لەمەسەلەکان بەجوانی تێبگەو بەباشی بەڵگەکان لەگەڵ یەکتریدا هەڵبسەنگێنەو، لەبەردەم پەروەردگارتدا ملکەچ بەو هاوکاریو هاوڕێیەتی خەڵکی بکە بەبێ جیاوازی و حەقیقەت بکەرە فەرمانڕەوای خۆتو هیچ کات لەڕشتنی خوێنی کەسدا پەلە مەکە، چونکە ڕشتنی خوێن بەناحەق لەلای خودا تاوانێکی گەورەیەو لەکاروباری خەراجدا زۆر ورد بە، چونکە بەو شێوەیە کاروباری خەڵکی بەڕێك و ڕاستی بەڕێوەدەچێت، چونکە خودا کردوویەتیە مایەی هێزو توانای موسوڵمانان لە کاروبارەکانیاندا و بۆ دوژمنانی ئیسلامیش ڕق و توڕەیی شاراوە و، بۆ کافرانیش سەرشۆڕی بچوکی دەهێنێت.

کەواتە لەمەسەلەی باج و خەراجدا دادگەر بەو کەسێك بەهۆی شەرافەتو گەورەییەوەو کەسانێکیش بەهۆی هێزو دەسەڵاتەوە نەکەی لەباجدان بایەك دیناریش بێت، لێیان خۆش ببیتو نابێت چاوپۆشی لەهیچکام لەدەربارییانی خۆت بکەیت لەم مەسەلەیەدا، بەڵام بەهیچ شێوەیەکیش ڕەوانیە کەلەتوانای خەڵکی زیاتر باجیان لێ

وەربگریت و زیادە ڕەوی تێدا بکەیت و کارەکەت بەرەو ستەمگەری بڕوات. وەدەبێت خەڵکی هان بدەیت لەسەر هەموو حەق و حەقیقەتێکی تاڵ چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئولفەتی زیاتر لەنێوانیانداو، پێویستە لەپێناو خۆشنودی گشتیدا هەوڵ بدەیت. ئەوەش بزانە ئەم پلەو پۆستە تۆی وەك پاسەوان و خزمەتکاری ئەم خەڵکە لێکردووە هەربۆیە بەژێر دەستەکانت دەڵێن ڕەعیەت واتە کەسانێك کەپاسەوان و چاودێرێکیان هەیە. کەواتە دەبێت بەجۆرێك باج وەربگیریت کەلەتواناى دارایی ئەوان بەدەر نەبێ‌و بەئاسانی‌و هیچ نارەحەتیەکەوە بتوانن بیدەن، وەدەبێت ئەو باجە لەڕێگەی چاکە و گیرو گرفتەکان و خۆشگوزەرانی خەڵکیدا بەکار بهێنرێت و ببێتە هۆی خۆشی ژیانیان. کەسانێك بکەرە بەرپرس کەلەخەڵکانی ژیر و بەتەگبیر بن و سیاسەتی دەوڵەتداری بزانن و پاکداوێن بن‌و ئەوکات بژێوی ژیانی ئەمانیش بەباشی دابین بکە. چونکە دانانی کەسی شیاو لەشوێنی شیاودا ئەرك و واجبی تۆیە و نابێت هیچ شتێك لەو واجبەت بێئاگات بکات چونکە ئەگەر ئەم شێوە فەرمانڕەواییە هەڵبژێری و ئەرکەکانت بەباشی جێبەجێ بکەیت ئەوا نازو نیعمەت و بەخششەکانی خودات بەسەردا دەڕژێت و خەڵکی کارەکانت پەسەند دەکەن و بەباش ناویان دەبەن‌و دەبیتە خۆشەویستی ناو خەڵکی‌و یارمەتی سەرکەوتن‌و سەرفرازی خەڵکی دەدەیت‌و، ئەو کات خێرو چاکە ڕوو دەکاتە ناوچەکەت و خەراجەکانت زۆر دەبن‌و سەروەت و سامانێکی فراوان بەدەست دەهێنی و، دەتوانیت بەهۆیەوە سوپاکەت تەیار بکەیت و بەهێز ببیت و لەڕێگەی بەخشین و خۆشگەزەرانکردنی خەڵکیەوە ببیتە جێگەی ڕەزامەندی خەڵك و، بەرپرسانت بەدادگەریەوە لەکاروبارەکانیاندا دەجوڵێنەوە. کەواتە لەم شێوەیەدا کێبەرکێ بکەو هیچ شتێك لەو بەلەپێشتر مەزانە و تاوەکو کارەکانت عاقیبەت خێریان بەدواوە بێت، انشا الله تعالى.

لەهەرشارێك لەو شارانەی کەلەژێر دەسەڵاتەکەی تۆدان کۆمەڵێك چاودێر دیاری بکە بۆ ئەوەی کە لەکاروبارو بەڕێوەبردنی ناوچەکان‌و، چۆنیەتی هەڵسووکەوتی ئەو بەرپرسانەی کەتۆ لەو شوێنانەدا دیاریت کردوون ئاگاداربیت‌و، بەرچاوت ڕوون بێت

لەبەڕێوە چوون کاروبارەکانی هەموو ناچەکان. وەهەرکاتێك ویستت فەرمانێك بۆ فەرمانڕەوای یەکێك لەناوچەکانی ژێر دەسەلاتت دەربکەیت بەباشی هەڵی سەنگێنە، بزانە دەبێتە هۆی خۆشبەختکرنی خەڵکی ئەو ناوچەیە ئەوکات فەرمانێکی لەو جۆرە دەربکە ئەگەر هات و بەرژەوەندی گشتی تێدا بوو هەموو هەلو مەرجەکان لەبەرچاو بگرەو، لەگەڵ کەسانی خاوەن بیر و تەگبیردا ڕاوێژ بکە و دواتر بڕیار بدە، چونکە ئەگەر بڕیارێکی ناپەسەند بدەیت لەوانەیە خەڵکی ئەو ناوچەیە لەدژی فەرمانڕەواکەی تۆ ڕاپەڕن و ئاژاوە دروست ببێت لەناوچەکەیدا. کەواتە لەکاتی دەست پێکردنی هەرکارێکدا دوور بینی و تامڵکردن بکەرە پیشەو بەیارمەتی خودا ئەنجامی بدەو، لەهەموو کاروبارەکانتدا داوای یارمەتی لەخودا بکە. کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ و هەوڵ بدە بەجوانی تەواوی بکەیت و چونکە لەوانەیە پێشهاتگەلێك ڕووبدەن کەنەتوانی ئەو کارە لەجێگەی خۆیدا ئەنجام بدەیتو، ئەمەش لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانتدا باش نیە و هەرڕۆژێك کەتێپەڕێت ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەو کاروبارانەشی کەتێیدایە تێدەپەڕنو، ئەمەش وادەکات دەبێت لەڕۆژێکدا کاروباری دوو ڕۆژ ئەنجام بدەیت و بەمەش لەکاروبارەکانتدا سەرکەوتوو نابیت، بەڵام ئەگەر هەرڕۆژەو کارەکەی خۆی تێدا ئەنجام بدەیت ئەوا ڕۆح و جەستەت ئارام دەبنو کاروباری سوڵتان بەهێزو پایەدار دەکەیت.

هاوکاریەکانت بەردەوام بکە لەگەڵ ئەوانەی کەدەزانیت دڵێکی سافیان هەیەو بەدڵسۆزیەوە لەهەوڵی سەرکەوتنی کاروبارەکانتدانو، نەکەی هیچکاتێك وازیان لێ بهێنیت و بێئاگابیت لێیان و هەمیشە چاکەیان لەگەڵدا بکە. وەهەروەها ئەو دەوڵەمەندە باشانەی کەلەکاروباری بازرگانیدا شکستیانخواردووە و زەرەریان کردووە هاوکاریان بکە تاوەکو بکەونەوە سەر ڕێچکەی کاروپیشەباشەکانیانو لەو ماوەیەدا ژیان و گوزەرانیان بگرە ئەستۆ بۆ ئەوەی تادەکەوتنەوە سەر پێی خۆیان بەخۆشگوزەرانیەوە بژین. کاتێك تایبەت بکە بەوکەسانەی کەستەم لێکراوو بێنەوان و ناتوانن تۆ ببینن و بەدوادا چوون بۆ گیروگرفتەکانیان بکەو چارەسەری کێشەکانیان بۆ بکەو ئەو بێچارانەشی کەنازانن مافیان

کامەیە ئاشنایان بکە لەگەڵ مافەکانیاندا. ئەم کارو بارانەش پێویستە کەسانێکی باش‌و شیاویان بۆ دیاری بکەیت بۆ ئەوەی بەردەوام بەدەم خەڵکیەوە بن‌و گوێ لەداواکاری‌و گیروگرفتەکانیان بگرن‌و لەهەوڵی چارەسەرکردنیاندا بن بۆ ئەوەی بەژیانێکی خۆش‌و شەرفمەندانەوە بژین.

ئاگاداری ژیان و گوزەرانی هەتیوان و بێوەژنان و نەداران بەو لەبیت المال مووچەی شیاویان بۆ دابین بکە کەبتوانن بەشێوەیەکی شیاو بژین و، لەنەرم و نیانی و چاکەلەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا چاو لەئەمیر المومنین بکە و، میهرەبان بە لەگەڵیاندا بۆ ئەوەی خودای گەورە بەهۆی تۆوە ڕۆژگاریان ڕووناك بکاتەوە و ببێتە مایەی بەرەکەتی ڕۆزی خۆت و دارو دەستەکەت. کارێکی تایبەت بۆ نابینایان دابین بکە و ئەوانە کەقورئانیان لەبەرە زۆرترین کاریان پێ بدەو، نەخۆشخانە بۆ نەخۆشی وئیمانداران بکەرەوە و چارەسەری نەخۆشەکانیان بکە و، پزیشك و پەرستاری شارەزاو لێهاتوویان بۆ دابنێ بۆ ئەوەی بەباشی و دڵسۆزیەوە بەنەخۆشەکانیان ڕابگەن و، چارەسەری دەردەکانیان بکەن‌و حەزو ئارەزوو داواکاریەکانی ئەم پەرستارو پزیشکانە تائەو جێیەی کەنابێتە ئیسراف و زیادەڕەوی لەبیت المال بەجێ بهێنە. ئەوەش بزانە کەخەڵکی هەرچەندە تۆ ژیان و گوزەرانیان خۆش بکەیت، بەڵام نەتوانن ڕووبەڕوو بتبینن و خۆیان داواکاریەکانیان ڕاستەوخۆ لەتۆداوا بکەن ئەوا زۆر خۆشحاڵ نابن و، پێیان خۆشە لەدیداری فەرمانڕەواو هاوڕێیەتی لەگەڵیدا سودمەند بن و ئەو کەسانەی کەهەمیشە سەرقاڵی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خەڵکین و لەو پێناوەدا زۆر ماندو دەبن و، بیرو هۆشیان هیلاك دەبێت‌و دڵتەنگ دەبن لەوپێشوازی کردنی ئەو هەمووە خەڵکە جۆراو جۆرە، بەڵام ئەگەر کەسێك عاشقی دادگەری عەدالەت بێت ئەوا ئاگادرای چاکەیەتی لەم دونیاو پاداشتیەتی لەو دونیادا وەك کەسێك نیە کە هەرچیەك کەلەخودا نزیکی دەکاتەوە پێشوازی لێدەکات‌و داوای بەخششەکانی خودا دەکات، کەواتە تاوەکو دەتوانی مۆڵەتی خەڵکی بدە بۆ ئەوەی دیدارت بکەن و خۆتیان نیشان بدەو، باپاسەوان و حەرەسەکانت بەنەرمی‌و

ڕێزەوە لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە. بەدەم و چاوێکی گەشاوە و ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیان لێبکە و بەنەرمی پرسیاریان لێبکە و، لەڕێگەی بەخشین و ڕێزەوە خۆشەویستی خۆتیان بۆ دەر ببڕە و هەرکاتێك شتێکت پێ بەخشین میهرەبانی و سۆزی خۆتیان بۆ دەرببڕە و، بڕیەدڵ هاوکاریان بکە و هیچ منەتێکیان بەسەردا مەکە چونکە وەها بەخششێك وەك بازرگانیەکی پڕسود وایە، انشا الله تعالى.

لەڕووداوەکانی پاشاو بەرپرسانی پێش خۆت پەندو عیبرەت وەربگرە. لەهەموو کاروبارەکانتدا پشت بەخودا ببەستەو، بەهۆی میهرەبانی ئەوەوە نەلەخشاو بەو کاربەشەریعەتو سوننەتەکانی بکەو لەڕێگەی جێبەجێ کردنی ئاین و کتێبەکەیدا تێکۆشان بکە و هەرچیەکیش کەدژی ئەوە و دەبێتە هۆی تورەیی خودای گەورە خۆتی لێ بەدوور بگرە. ئاگاداری ئەوماڵ و سامانە بە کەفەرمانبەرانی ئەو بوارە بۆ تۆی کۆدەکەنەوە و لەماڵ و دارایی حەرام خۆت بەدوور بگرە و ئیسراف و زیادەڕۆیی مەکە و لەگەڵ زانایاندا هاونشینی بکە و ڕاوێژیان پێبکە و، لەسەریشت پێویستە کە لەجێبەجێ کردنیاندا پەیڕەوی لەسوننەتەکان بکەیت و پابەند بیت بەڕەووشتە جوانەکان و فەزیلەتە بالآکانەوە. وەدەبێت بەڕێزترین هاودەم و کەسانی تایبەتی تۆ ئەوانە بن کەهەرکاتێك عەیبەیەکت تێدا ببینن شان و شکۆی تۆ وایان لێنەکات لەو عەیبەیە ئاگادارت نەکەنەوە. چونکە ئەم جۆرە کسانە خێرخوازترین و باشترینی هاوڕێ و دۆستان و پشتیوانانی تۆن. گرنگی بەنوسەران و دەربارییەکانت بدەو، لەڕۆژدا بۆ دیداری هەریەکەیان باکاتێکی تایبەتت هەبێت بۆ ئەوەی بێنە نزیکتەوەو، ئەو نامە و کاروبارانەی کە دەبێت ڕاوێژیان لەبارەیانەوە پێ بکەیت لەگەڵتدا تاووتوێی بکەن و، پێویستیەکانی دەربایان و ئەوانە کەکاروباری ناوچەکانیان بەدەستەوەیە بەباشی ووردیەوە لەکاروبارەکانی خەڵکی ئاگادارت بکەنەوە.

ئەوکات دەبێت بەباشی گوێیان لێبگریت و لەو مەسەلانەی کەباسی دەکەن تێبگەیتو بیانخەیتە بەرباسو لێکۆڵینەوە و بیری باشیان لێبکەیتەوەو ئەوەی لەگەڵ حەقو حەقیقەتو دووربینیدا دەگونجێت قبوڵ بکەیت و جێبەجێی بکەیتو داوای خێرو چاکە

لەخودا بکەیتو ئەو بابەتانەشی کەدژی حەقو ڕاستی و دوور بینین و لەگەڵیدا ناگونجێن کەمێك تامڵ بکە و بیری لێبکەرەوەو لەبارەی قبوڵکردنو ڕەتکردنەوەیان پرسیار لەئەهلی بەصیرەت بکە. لەبەرامبەر ئەوچاکەو، خێرەی کەلەگەڵ خەڵکیدا دەیکەیت منەتیان بەسەردا مەکەو، بێجگە لەوەفاداری و ئیستیقامەت و یارمەتی دانی موسوڵمانانو خەڵکی هیچ شتێکی تر وەرمەگرەو بێجگە لەبەرامبەری ئەم سیفەتانەوە بۆ هیچ شتێکی تر چاکە لەگەڵ خەڵکیدا مەکە. بەباشیەوە لەم نامەیەم تێبگە و بەووردیەوە بیخوێنەرەوە ولەکاروبارەکانتدا پەیڕەوی لێبکەو، لەهەموو کاروبارەکانتدا داوای یارمەتی لەخودا بکە کەخێرو چاکە بهێنێتە ڕێگەتو بتکاتە هاودەمی شایستەیی وهاوڕێی کەسانی شایستە و شیاو. وەدەبێت باشترین سیرەت و حەزو ئارەزوت شتێك بێت کەببێتە مایەی ڕەزامەندی خودا و گونجاوبێت لەگەڵ سیستەمی ئاین و ڕێز و، گەورەیی ببێتە هۆی هێزی پەیڕەوانی ئاین و جێبەجێ کردنی دادگەری و شایستەیی لەنێو موسوڵمانان و نەتەوەی ئیسلام و هاوپەیمانان (ئەهلی زیمە)ی ئەوان. وەمن لەخودای گەورە داواکارم کەیارمەتیت بداتو پشتوپەنات بێتو سەرکەوتووت بکاتو ڕێنماکارت بێت لەکاروبارەکانتداو هەمیشە لەژێر سایەی پارێزگاری ئەودا بیت والسلام.) مێژوو نوسان گوتوویانە کاتێك ئەم نامەیە بڵاو بویەوە بوویە مایەی سەرسوڕمانی خەڵکی و هەواڵەکەی گەیشتە مەئمون و کاتێك بۆیان خوێندەوە، گووتی ئەبو التیب واتە تاهیر هیچکام لەکاروبارەکانی دونیاو دینو بەڕێوەبردنی بۆچوون و سیاسەت و چاکەی وولات و ڕەعیەتو پاراستنی سوڵتان و گوێڕایەڵی خەلیفەکان و پایەدار کردنی خەلافەتی لەبیر نەکردووە و، هەموویانی زۆر بەباشیەوە باس کردووە حەقی بەهەموو مەسەلەکان داوە. لەپاشان فەرمانیدا کەچەندین نوسخەی لەبەر بنوسنەوە و بینێرن بۆ هەموو فەرمانبەرانی ناوچە جۆراو جۆرەکان بۆ ئەوەی هەمووان پەیڕەوی لێبکەن و دەستورو بەندەکانی جێبەجێ بکەن. ئەمە باشترین سیاسەت و دەستورێکە کە لەبارەی سیاسەتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیەوە دەستمان کەوتووە، خوداش بۆ هەرکەسێك کەبیەوێت ئیلهامی پێدەبەخشێت.

# بەشی پەنجاو دووەم

## لەبارەی فاتیمیەکان و ئەو بیر و باوەڕانەی کەخەڵکی لەم بارەیەوە هەیانە و ئاشکرا کردنی حەقیقەتەکەی

ئەوەی کەلەناو موسوڵمانانادا بەدرێژایی مێژوو ناوبانگی دەر کردووە ئەوەیە کە ناچار دەبێت لەئاخیر زەماندا پیاوێك لەخانەدانی پێغەمبەر (ص)دەربکەوێت و، پشتیوانی ئاین بکاتو عەدل و دادگەری ئاشکرا بکاتو موسوڵمانان پەیڕەوی لێدەکەنو دەسەلآت بەسەر هەموو وولآتانی ئیسلامیدا پەیدا دەکات و پێی دەڵێن مەهدی. وەدەرچوونی دەجالو ڕووداوەکانی پاش ئەو لەنیشانەکانی ڕۆژی دواین کەلەفەرموودەدا هاتووە و پشتڕاست کراوەتەوە بەدوای ئەودا دێتو دواتریش عیسا لەئاسمانەوە دادەبەزێتە سەر زەویو دەجال دەکوژێت وەیان ئەوەی کەلەگەڵ دەرکەوتنی مەهدیدا دێتە خوارەوە و لەکوشتنی دەجالدا هاوکاری دەکات و، لەپشتی مەهدیەوە نوێژ دەکات، لەم بارەیەشەوە بەکۆمەڵێك فەرموودە بەڵگە دەهێننەوە کەئیمامانی حەدیس و فەرموودە تەخریجیان کردوون (گێڕاویانەتەوە) وەئەوکە سانەشی ئینکاری ئەم شتە دەکەن باسی کردوون و، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەلەگەڵ ئەوانیشدا لەگەڵ هەندێك فەرموودەی تردا دژی یەکترن (تعارج)دەکەن. صۆفیەکانی لەمەسەلەی فاتمیەکاندا ڕێگەیەکی تریان هەیەو بەشێوەیەکی تایبەت بەڵگە دەهێننەوە و پشت بەستوون بەکەشف کەئەصڵ و بنەمای تەریقەتەکەیانە. ئێمەش لێرەدا ئەو فەرموودانەی لەم بارەیەوە هاتوون دەگێڕینەوە و تەعنو ڕەخنەی ئینکارانی ئەم بوارەو بەڵگەکانیشیان باسدەکەینو، دواتر قسەی

صۆفیەکان و بیرو باوەڕەکانیان لەبارەیەوە باسدەکەین و، بۆ ئەوەی بۆچوونی ڕاست لەم بارەیەوە ئاشکرا ببێت، انشا الله تعالی. گروپێك لەپێشەوایانی زانستی حەدیس فەرموودەکانی تایبەت بەمەهدیان تەخریج و ڕیوایەت کردووە وەك ئیمامی ترموزی[٢٩١] و ئەبو داوود[٢٩٢] و بزار[٢٩٣] و ئیبن ماجە[٢٩٤] و حاکیم[٢٩٥] و تەبەرانی[٢٩٦] و ئەبو یەعلی موصلی[٢٩٧] و، ئەم جۆرە فەرموودانەی کەتەخریجیان کردوون داویانەتەپاڵ کۆمەڵێك لەصەحابە وەك علی و ئیبن عباس و ئیبن عومەر و تەلحە و ئیبن مەسعود و ئەبو هورەیرە و ئەنەس و ئیبن حارسی کوڕی جز و سەنەد (اسانید)،[٢٩٨] گەلێکیان هێناون کە ڕەخنەگران عەیبیان لێگرتوون کەدواتر باسیان دەکەین. چونکە لەلای موحەدیسەکان بەناوبانگە کە جەرح لەپێش تەعدیلەوەیەو هەربۆیە هەرکات لەهەندێك پیاوانی

---

[٢٩١] ئەبوعیسا محمد ترموزی دانەری یەکێکە لەشەش صیحاحەکە لەساڵی ٢٧٩ ك وەفاتی کردووە.

[٢٩٢] ئەبو داود سولەیمان دانەری یەکێك لەصیحاحەکان لەساڵی ٢٧٥ لەبەصرە کۆچی دوایی کردووە.

[٢٩٣] ئەبو بەکر احمدی کوڕی هارون بزار دانەرێکی تری یەکێکی ترە لەکتێبەکانی فەرموودەلەبەصرە لەدایك بووە، لەساڵی ٢٩٢ ك کۆچی دوایی کردووە.

[٢٩٤] ئەبو عبداللەمحمد بن یزید بن ماجەی قەزوینی لەموحەدیسانی گەورە و خاوەنی یەکێکە لەصیحاحی ستە واتە شەش کتێبە صەحیحەکەی فەرموودە کەبەناوی ئیبن ماجەوە بەناوبانگە ولەساڵی ٢٠٩ لەدایك بووە و لەساڵی ٢٧٣ دا کۆچی دوایی کردووە (لغتنامە دهخدا).

[٢٩٥] محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی محمدی حەمدەویەی ناسراو بەحاکیمی نەیشابووری کەخاوەنی دانراوگەلێکی زۆری زانستی فەرموودەو، مێژوودامەیە لەساڵی ٤٠٣ ك مردووە .(لغتنامەی دهخدا).

[٢٩٦] ئەبوالقاسمی سلیمانی تەبەرانی کەلەتەبەریەدا لەدایك بووە خاوەنی موعجەمی حەدیسەو لەساڵی ٣٦٠ دا کۆچی دوایی کردووە.

[٢٩٧] ئەبو یعلی ئەحمەدی کوڕی علی کوڕی موسەننای تەمیمی واعیزو موحەدیسی موصلی کەخاوەنی کتێبی معجەم الصحابە کتێبی المسند و لەساڵی ٣٠٧ ك لەموصڵ کۆچی دوایی کردووە (لغتنامەی دهخدا).

[٢٩٨] ئەمەش کۆی اسنادە کە لەحەدیسدا بریتیەلەوەی کەکەسێك بڵێت: فلان لەفلانەوە و ئەویش لەپێغەمبەرەوە گەشتووە بەئێمە (تعریفات جرجانی).

فەرموودەدا عەیب و عاری وەك بێئاگایی یان کەم و کورتی لەلەبەرکردن یان کەمی دەرخ (ضبط)[٣٩٩] یان لاوازی یان بۆچوونی ناباش هەبێت.

ئەوا عەیبەکانی تریش دەچنەناو ڕاستیەتی فەرموودەکەوە و سستی دەکەن، وەنابێت ئەوە بڵێن هەرچەندە هاوشێوەی ئەم جۆرە عەیب گرتنانە لەوانەشە لەپیاوانی هەردوو صەحیحەکەش (بوخاری و موسلیم)بگیرێت، چونکە ئیجماعی موحەدیسان لەسەر ئەوەیە کە ئەوەی کەبوخاری و موسلیم لەو صەحیحانەدا هێناویانە هاوپێچە لەگەڵ ڕاستیدا، وەهەم ئیجماعی ئومەت لەسەر ئەوەیە کە دەبێت حەدیسەکانیان بەڕاست و، قبوڵکراو بزانین و کاریان پێبکەین و ئیجماع خۆی باشترین هۆکاری پارێزگاری و بەرگریکردنە. بێجگە لەصەحیحەینیش کتێبەکانی تری حەدیس ئەم پلەو پایەیان نیە، هەرچەندە لەئیمامانی حەدیس لەم بارەیەوە گێڕاویانەتەوە لەسەنەدەکانی ئەو دوانەشدا بواری قسە دەدۆزینەوە. ئەبوبەکری کوڕی ئەبی خەیسەمە[٤٠٠] بەپێی ئەوەی کەسوهەیلی[٤٠١] لەوەوە گێڕاویەتیەوە لەکۆکردنەوەی حەدیسەکانی پەیوەست بەمەهدیەوە بەدوادا چوونی فراوانی کردووە، هەروەك دەڵێت نامۆترینی ئەو حەدیسانە لەڕوی ئیسنادەوە حەدیسێکە کە ئەبو بەکری ئەسکاف لەکتێبی فواید الاخبار دا هێناویەتی و، لەمالیکی کوڕی ئەنەسەوە[٤٠٢] و ئەویش لەمحمدی کوڕی منکدر لەجابرەوە گێڕاویەتیەوە، دەڵێت پێغەمبەر فەرمویەتی: هەرکەس مەهدی بەدرۆ بخاتەوە ئەوا کافر دەبێت و هەرکەس هاتنی دەجال

---

[٣٩٩] لەزاراوەدا بریتیە لە گەیاندنی قسە بەگوێی بیسەر هەریەو جۆرەی کەکەسی بیسەر لەکەسانی ترەوە بیستوویەتی بەجۆرێك لەکاتی گەیاندنیدا بۆ بیسەر ڕووناك بێت و هەوڵێکی زۆریدات بۆئەوەی بەباشی لەبەری بکات و، لەبیری نەچێتەوەو بەبێ گۆڕانکاری بیگەیەنێت (کشاف اصطلاحات الفنون).

[٤٠٠] دانەری کتێبێکە لەمێژووی فەرموودەو زانستی فەرموودەدا لەساڵی ٢٧٩ ك کۆچی دوایی کردووە .

[٤٠١] ئەبوالقاسم عبدالرحمانی خەسعەمی سوهەیلی کەلەمالیقەدا و لەشارەکانی ئەندەلوسدالەدایك بووەئیبن خەلەکان و حاجی خەلیفە کتێبێکی زۆریان داوەتەپاڵی. لەساڵی ٥٨١ ك مردووە .

[٤٠٢] ئیمام مالیك بن ئەنەس لەدامەزرێنەرانی یەکێك لەچوار مەزهەبەکەی سوننەت و جەماعەتە، لەساڵی ١٧٩ ك لەمەدینە کۆچی دوایی کردووە .

بەدرۆ بخاتەوە ئەوا درۆی کردووە. وەلەبارەی هەڵهاتنی خۆرەوە لە ڕۆژئاواوە وەك ئەوەی کەگومان دەکەین هاوشێوەی ئەم مانایانەی باسکردووە و، هەمان ئەو ئەندازە زیادە ڕەویە بەسە، خوداش زاناترە لەمالیکی کوڕی ئەنەس لەبارەی صیحەتیەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئەبو بەکری ئەسکاف لەلای ئیمامانی حەدیس تۆمەتبارو سازندەیە، بەڵام ترموزی و ئەبو داوود سەنەدەکەیان دەگێڕنەوە سەر ئیبن مەسعود لەڕێگەی عاصیمی کوڕی ئەبی النجود کەیەکێکە لەحەوت قورئان خوێنەکە (قراء السبعە)، لەزری کوڕی حوبەیش لەعبداللەی کوڕی مەسعود ئەویش لەپێغەمبەرەوە (ص)تەخریجیانکردووە بەم شێوەیەك: ئەگەر لەدونیادا تەنها ڕۆژێك مابێت (زیاد دەکات)و دەڵێت خودا ئەو ڕۆژە درێژ دەکاتەوە تاوەکو پیاوێك لەنەژادی من یان لەهۆزەکەی من پیاوێك هەڵدەبژێرێت کەناوی ئەوو ناوی باوکی وەك ناوی من و ناوی باوکم وایە.

ئەمە لەفزی ئەبو داوودە و بێدەنگ بووە لێی لەپەیامە بەناوبانگەکەی خۆیدا گوتویەتی ئەوەی کەلەکتێبەکەیدا بێدەنگ بووە لێی لەحەدیسەکان شیاوترە. لەفزەکەی ترموزی بەم جۆرەیە: دونیا لەناوناچێت مەگەر ئەو کاتەی کە پیاوێك لەخانەدانی من کەناوی ئەو لەگەڵ ناوی مندا یەکێکە و دەبێتە فەرمانڕەوا بەسەر عەرەبەوە. وەلەلەفزێکی تردا بەم شێوەیە: تائەوەی کەدواتر پیاوێك لەنەژادی من دەگاتە دەسەڵات. وەلەبارەی هەردوو لەفزەکەوە دەڵێت حەدیسێکی صەحیح و حەسەنە. وەهەروەها ئەو فەرموودەیە لەڕێگەیەکی مەوقوفەوە لەئەبو هورە یرەوە گێڕاویەتیەوە. وەحاکم دەڵێت: سەوری و شعبەو زایدە ئیمامەکانی تری موسوڵمانان لەعاصیمەوە گێڕاویانەتەوەو، دەڵێت: هەموو ڕێگەکانی عاصیم بەریوایەت لە زور و ئەویش لە عبداللە وە بەپێی ئەوەی کەئەصڵی ئەوان لەبەڵگە هێنانەوە بەحەدیسەکانی عاصیم ئاشکرام کرد ڕاستە، چونکە ئەو یەکێکە لەپێشەوایانی موسوڵمانان، کۆتایی، بەڵام ئەحمەدی کوڕی حەمبەل گوتوویەتی: کەعاصیم پیاوێکی صالح و قاریئی قورئانە و چاکەکارە و سیقەی هەبووە واتە لەئەهلی سوقات بووە، بەڵام ئەعمەش حافیزەیەکی باشتر و بەهێزتری لەعاصیم

هەبووە، وەهەروەها شعبە ئەعمەشی لەتەسبیتی حەدیسدا لەعاصیمی بەباشتر زانیوە. وە عیجلی دەڵێت: لەمەسەلەی ڕیوایەتەکانی ئەو لەزور و ئەبی وائیل دەربارەی ئەو جیاوازی ڕووی داوە ئەم قسەیەش ئاماژەیە بەلاوازی ڕیوایەتی ئەوە لەوانەوە. محمدی کوڕی سەعد دەڵێت: عاصیم پیاوێکی متمانە پێکراو بووە، بەڵام لەحەدیسەکاندا زۆر هەڵەی دەکرد و یەعقوبی کوڕی ئەبو سوفیان دەڵێت لەحەدیسەکانیدا پشێوی هەیە. وە عبدالرحمانی بن ئەبی حاتەم دەڵێت: بەباوکمم گووت کە ئەبو زەرعە دەڵێت: عاصیم پیاوێکی سیقەیە، گووتی ئەم پلەیەی نیە. وەئیبن عەلیە لەبارەی ئەوەوە گفتوگۆی کردووە و گوتوویەتی ئەو کەسەی ناوی عاصیم بووە حیفزی خراپ بووە.

وەئەبو حاتەم دەڵێت: عاصیم لەلای من ڕاستگۆیە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا حافیز نەبووە. وە گوفتاری نەسائی لەبارەی ئەوەوە جیاوازە و ئیبن فرایش دەڵێت لەحەدیسەکەی ئەودا نائاشنایی (نکرە)هەیە، ئەبو جەعفەری عەقیلی دەڵێت بێجگە لەخراپی حیفز و لەبەر کردن عەیبێکی تری تێدا نەبووە. دارە قوتنیش دەڵێت لەحیفزو لەبەر کردنەکەیدا کەمێك عەیب هەیە. یەحیای قەتان دەڵێت هیچ پیاوێکم دەست نەکەوت کەناوی عاصیم بێت و لەبەرکردنی خراپ بووە. وەهەروەها دەڵێت بیستومە کەشوعبە دەیگووت عاصیمی کوڕی ئەبی النجود هەواڵی بەئیمە داوە، بەڵام لەدەروندا سەبارەت بەئەو هەندێك گومانی خراپ هەیە. زەهەبی دەڵێت ئەو لەخوێندنەوەی قورئاندا باوەڕ پێکراوە و، بەڵام لەحەدیسدا پلەیەکی کەمتری هەیە ڕاستگۆیە و حەدیسەکەی حەسەنە و ئەگەر بەڵگە بهێنێتەوەو بڵێت شەیخەین(بوخاری و موسلیم)، حەدیسیان لێوە ڕیوایەت کردووە دەبێت بڵێین کەئەوان تەنها لەوەوە ڕیوایەتیان نەکردووە، بەڵکو ڕیوایەتکردن لەوەوە وابەستەیە بەڕاویەکانی ترەوە.

وەئەبو داود لەم بابەتەدا فەرموودەیەکی لەعلی خودای لێ ڕازی بێت تەخریج کردووە لەفیتری کوڕی خەلیفە لەقاسمی کوڕی ئەبو بزەوە و، ئەویش لەتوفەیلە وە و ئەویش لە علی یەوەو علی یش لەپێغەمبەرەوە (ص)کەگوتویەتی: ئەگەر لەدونیادا لەڕۆژێکیش زیاتر

نەمابێت ئەوا خودا پیاوێك لەخانەدانی من دەنێرێت، کەلەپاش ئەوەی سەرزەوی پڕبووە لەستەمگەری و نادادگەری پڕی دەکات لەعەدل و داد پەروەری. هەرچەند ئەحمەد و یەحیای کوڕی قەتان و ئیبن موعین و نەسائی ئەوانی تریش فیتری کوڕی خەلیفەیان بەباوەڕپێکراو زانیوە، بەڵام عیجلی گوتوویەتی: حەدیسەکەی حەسەنە و، بەڵام هەندێك شیعەگەری تێدا هەیە. ئیبن موعینیش یەکجار گوتوویەتی ئەو موحەدیسێکی متمانە پێکراوی شیعەیە. ئەحمەدی کوڕی عبداللەی کوڕی یونس گوتوویەتی ئێمە لەسەر فیتر دەڕۆشتین و ئەویش کرابوویە دەرەوەو هیچ حەدیسێکمان لێوە نەدەنوسیەوە، وەجارێکی تریش گوتوویەتی من ئەوم وەك سەگ دەر کردوەتە دەرەوە. وەدارەقوتنی گوتوویەتی: پشت بەقسەی ئەو نابەسرێت و ئیستینادی پێناکرێت، ئەبوبەکری کوڕی عەیاش گوتوویەتی ڕیوایەتەکانی ئەوم تەنها لەبەر ئەوە خستوەتەلاوە کەئەو سەربەمەزهەبێکی نەشیاوە. وەگوزگانی (جوزجانی)، دەڵێت: ئەو لەڕێکەی حەق لایداوە و سیقە پێکراو نیە، کۆتایی.

وەهەم ئەبو داوود ئەو فەرموودەیەی داوەتە پاڵ علی و بەم شێوەیە تەخریجی کردووە (دەری هێناوە)، لەهارونی کوڕی موغەیرە لەعەمری کوڕی ئەبی قەیس لەشوعەیبی کوڕی خالید لەئەبو ئیسحاقی سوبەیعیەوە ڕیوایەتی کردووە، کەعلی لەوکاتەی کەسەیری حەسەنی کوڕی کرد گووتی ئەم کوڕەم سەیدە هەروەك چۆن پێغەمبەر (ص)ئەوی بەم ناوە ناوناوەو، لەداهاتوودا لەنەوەی ئەم پیاوێك دێتە دونیاوە کەبەناوی پێغەمبەری ئێوەوە ناوزەد کراوە و لەهەڵسوکەوتدا لەپێغەمبەر دەچێت، بەڵام لەپێکهاتەی جەستەدا جیاوازە لەو، دواتر بەسەرهاتی ئەوی باسکرد و ئەوەی گووت کەئەو سەرزەوی پڕدەکات لەدادگەری و عەدالەت. هارون دەڵێت: عەمری کوڕی ئەبو قەیس لەموتریفی کوڕی تەریف لەئەبوالحسن لەهیلالی کوڕی عەمرەوە بۆ ئێمەی ڕیوایەتکردووەو، گوتوویەتی بیستومە علی لەپێغەمبەرەوە (ص)گێڕاویەتیەوەو، فەرموویەتی پیاوێك لەماورا النهرین (جیحون)دەردەکەوێت کەپێی دەڵێن حارس و

سەرلەشکرەکەی پیاوێکە بەناوی مەنصورو کاروبار بۆ خانەدانی محمد ئاسان دەکاتو، سوڵتە دەسەلاتێك دروستدەکات، هەروەك ئەوەی کەقورەیش بەهۆی پێغەمبەر و ئاینەکەیەوە دروستیان کرد یارمەتی دانیان لەسەر هەر باوەڕدارێك واجب بووە، وەیان فەرمووی: شوێنکەوتنی بانگەوازەکەی واجبی سەرشانی هەموو باوەڕدارێکە. ئەبو داوود لەم حەدیسەدا قسەیەکی نەکردووە و بێدەنگ بووە، بەڵام لەجێگەیەکی تردا لەبارەی هارونەوە گوتوویەتی کەئەو لەگروپی شیعەیەو سولەیمانیش گوتوویەتی دەبێت لەبارەیەوە وورد ببینەوە. ئەبو داوود لەبارەی عەمری کوڕی قەیسەوە گوتوویەتی بەهێز نیەو لەحەدیسەکانیدا هەڵە هەیە. زەهەبی گوتوویەتی ڕاستگۆیە، بەڵام خاوەنی خەیاڵاتیشە، بەڵام ئەبو ئیسحاقی سوبەیعی هەرچەند لەصەحیحەیندا حەدیس گەلێك لەوەوە تەخریج کراون، بەڵام ئەوە سەلمێنراوە لەکۆتاییەکانی ژیانیدا ئەقڵی لەسەر خۆی نەماوە. وەڕیوایەتی ئەو لەعلی مونقەتیعە واتە پچڕاوە، هەروەك چۆن ڕیوایەتی ئەبو داوود لەهارونی کوڕی موغەیرەوە بەم شێوەیەبووە. لەبارەی ڕیوایەت و سەنەدی دووەمەوە ئەبو الحسن و هیلالی کوڕی عەمر نادیارن و، ئەبو الحسن نەناسراوەتەوە بێجگە لەوەی کە موتریفی کوڕی تەریف لەوەوە ڕیوایەتی کردووە، کۆتایی.

وەهەم ئەبو داوود لەئوم سەلەمە و وەهەروەها ئیبن ماجە و حاکیم لەموستەدرەکدا لەڕێگەی علی کوڕی نوفەیلەوە بەم شێوەیە تەخریجیان کردووە: لەسەعیدی کوڕی موسەیب لەئوم سەلەمەوە ڕیوایەتیان کردووە کەگوتوویەتی بیستوومە پێغەمبەر (ص)، دەیفەرموو مەهدی لەخانەدانی من لەنەوەی فاتیمەیە. ئەبو داوودیش ئەم قسەیەی باسکردووە و لەسەری بێدەنگ بووە ئیبن ماجەش مەهدی بەنەوەی فاتیمە داوەتە قەڵەم، لەفزەکەی حاکیمیش بەم شێوەیە: بیستوومە کەپێغەمبەر (ص)لەبارەی مەهدیەوە قسەی دەکرد و، دەیفەرموو ئەو بەڕاستی دەر دەکەوێت و حەقە و لەخانەدانی فاتیمەیە. وەلەبارەی ڕاستیەتی و هەڵەبوونیەوە قسەی نەکردووە.

ئەبو جەعفەری عەقیلی ئەوی بەلاواز زانیوە و گوتوویەتی ناتوانین لەم فەرموودەیەدا شوێن علی کوڕی نوفەیل بکەوین چونکە تەنها بەڕیوایەتی ئەم حەدیسە نەبێت نەناسراوە. وەهەم ئەبو داوود لەئوم سەلەمەوە حەدیسێکی تری تەخریجو ڕیوایەتکردووە لەصالح ئەبو الخلیل لەیەکێك لەهاوڕێیانیەوەو ئەویش لەئوم سەلەمەو ئەویش لەپێغەمبەرەوە کەفەرموویەتی: لەکاتی مەرگدا لەسەردەمی یەکێك لەخەلیفەکاندا جیاوازیەك ڕوودەدات پیاوێك لەخەڵکی مەدینە بەهەڵەداوان بەرەو مەککە دەڕواتو کۆمەڵێك لەخەڵکی مەککە لەدەوری کۆدەبنەوە دەیهێننە دەرەوە، ئەمەلەکاتێکدا ئەو پێی خۆش نیە، لەپاشان لەنێوان بەردەڕەشەکە و مەقامی ئیبراهیمدا بەیعەتی پێ دەکەن. دواتر لەشکرێك لەشامەوە بۆ جەنگ لەگەڵیدا دێن، بەڵام لەبیابانێکی نێوان مەککە و، مەدینەدا بەناخی زەویدا ڕۆ دەچن و کاتێکیش خەڵکی ئەم بارودۆخە دەبینن ئەوکات گروپێك لەئەبدالەکانی شام کەئەولیای خودان و کۆمەڵێکن خودا جیهانی بەبوونی ئەوانەوە ڕاگرتووە و، حەفتا کەسن و چلیان لەشامن و ئەو سیەکەشیان لەشوێنەکانی ترن گروپەکانی خەڵکی عێراق دەچنە لای ئەوو بەیعەتی پێدەدەن.

لەپاشان پیاوێك لەقورەیش کەخاڵەکانی لەهۆزی کەلبن دەردەکەوێت و سوپایەك بەرەو لای ئەوان دەبەن و زاڵدەبن بەسەریاندا و ئەوانە حەسرەت دەکێشن کە دەستکەوتەکانی هۆزی کەلب نەبینن، دواتریش ئەو کەسە دەست دەکات بەدابەشکردنی ئەو سەروەت و سامانە و بەپێی سوننەتی پێغەمبەر لەناو خەڵکیدا دابەشی دەکات، ئیسلام لەسەرتاسەری زەویدا جێگیر دەبێت و حەوت ساڵ لەنێو خەڵکیدا دەمێنێتەوەو دواتریش وەفات دەکات و موسوڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن. ئەبوداوود گوتوویەتی کەهەندێك لەهیشامەوە گێڕاویانەتەوە کەئەو نۆ ساڵ دەژی و گروپێکی تریش گوتوویانە کە حەوت ساڵ دەمێنێت. لەپاشان ئەبو داوود هەمان حەدیس لە ئەبو الخلیل لەعبداللەی کوڕی حارس ئەویش لە ئوم سەلەمەوە ڕیوایەتی کردووە.

کەواتە بەم شێوەیە مەسەلەی نادیاری ئیسنادی یەکەم ئاشکرا بووە، چونکە پیاوانی حەدیسی ئەو لەپیاوانی صەحیحەینن عەیبیان تێدانیەو هەندێکیش گوتوویانە کەحەدیسی ناوبراو بەریوایەتی قەتادە لەئەبو الخلیلەوەیەو، هەندێك جاریش گوتوویانە ئەم ریوایەتەی قەتادە لەئەبو الخلیلەوەیە قەتادەش مودەلەسە و کردویانەتە موعەن عەن. حەدیسی مودەلەس قبوڵناکرێت و بێجگە لەوەی کە ئەبو داوود لەبەشەکانی ئیمامی مەهدیدا بەراشکاوانە حەدیسەکەی هێناوە. وەهەم ئەبو داوود حەدیسێکی تەخریج کردووە حاکمیش تەبەعیەتی لێکردووە و بەم شێوەیە لەرێگەی عمرانی قەتان و ئەویش لەقەتادەوە و ئەویش لە ئەبو نەزرە و ئەویش لە ئەبو سەعیدی خودریەوە و ئەویش لەپێغەمبەرەوە ریوایەتی کردووە کەفەرموویەتی: مەهدی لەمنە و دەم و چاو پانێکە و نوکی لوتی بەرزەو، زەوی پڕ دەکات لەعەدل و دادگەری دوای ئەوەی کەستەمگەری هەموو دونیا دەگرێتەوە و حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی دەکات. ئەمەیە دەستەواژەکەی ئەبو داوود و قسەیەك لەم بارەیەوە ناکات، عیبارەتەکەی حاکمیش بەم شێوەیە: مەهدی لەخانەدانی ئێمەیە و لوتێکی بەرزی هەیە و خاوەن دەم و چاوێکی پانە سەرزەوی پڕدەکات لەعەدالەتو دادگەری دوای ئەوەی کەستەمگەری هەموو دونیای گرتووەتەوە، ئەوەندە ساڵ دەژی دوو پەنجەی دەستی چەپی و هەمووپەنجەکانی دەستی ڕاستی کردەوە واتە حەوت ساڵ، ئەم فەرموودەیە صەحیحە بەو مەرجەی کە لەگەڵ ئوصوڵەکانی موسلیم دا بگونجێت و ئەو ئەو فەرموودەیەی تەخریج نەکردووە، کۆتایی.

لەبارەی بەڵگە هێنانەوە بەحەدیسەکانی عمرانی قەتان جیاوازی بۆچوون هەیە بوخاری وەك بەڵگە هێنانەوە ریوایەتی لێوە کردووە، نەوەك بەشێوەیەکی بنەڕەتی و یەحیای قەتانیش لەوەوە حەدیسی ریوایەت نەکردووە. یەحیای کوڕی موعین لەبارەی ئەوەوە گوتوویەتی: حەدیسەکەی ئەو هەمیشە بەهێز نیە و دیسانەوە گوتوویەتی: شتێکی گرنگ نیە. ئەحمەدی کوڕی حەمبەل گوتوویەتی: هیوادارم کەلەڕوانگەی حەدیسەوە صالح بێت و یەزیدی کوڕی زورەیع گوتوویەتی: ئەو پیاوێك بووە لەخەواریج

کەنەجدەی کوڕی عامیری حەروری سەرۆکایەتی کردوون و بە (حەروریە)ناسراون و ڕاکێشانی شمشێری لەبەرامبەر ئەهلی قیبلەدا بەڕەوا زانیوە.

نەسائیش گوتوویەتی: ئەبو عوبەدی ئاجوری دەڵێت: لەبارەی ئەبو داوودەوە لەوم پرسی، گووتی: ئەو لەئەصحابی حەسەنە و بێجگەلەچاکە شتێکی ترم لەبارەیەوە نەبیستووە، جارێکی تریش لەئەبو داوودم بیست کە باسی ئەوی کردووە و گوتوویەتی: لاوازە و لەزەمانی ئیبراهیمی کوڕی عبداللەی کوڕی حەسەندا فتوایەکی توندی داوەو بووەتە هۆی خوێنڕێژی. ترموزی و ئیبن ماجە و ئەبو سەعیدی خودریش لەڕێگەی زەیدی عەمیەوەو ئەویش لەئەبو صدیقی ناجیو ئەویش لە ئەبو سەعیدی خودریەوە حەدیسیکیان تەخریج کردووە، کەئەو گوتوویەتی ترسی ئەوەمان هەبووە کەلەپاش پێغەمبەر هەندێك ڕووداو ڕوو بدەن.

هەربۆیە لەپێغەمبەری خودا (ص)لەم بارەیەوە پرسیارمان کردوو ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: لەنێو ئومەتی مندا مەهدی دەردەکەوێت پێنج یان حەوت یان نۆ ساڵ دەژی. گووتی پرسیم مەبەستت چیە؟ گووتی چەند ساڵێك کەواتە کەسانێك دێنەلای مەهدی و دەڵێن: ئەی مەهدی پێمان ببەخشە و مەهدیش لەداوێنی کراسەکەیدا هەرچەندێك کەبتوانێت لەدینار و دیرهەم هەڵدەگرێت و دەڕێژێتە بەردەمیان. ئەمەیە لەفزەکەی ترموزیو دەڵێت ئەم فەرموودەیە حەسەنەو لەئەبو سەعیدی خودری وئەویش لەپێغەمبەرەوە (ص)بێ هیچ نێوەندێك ڕیوایەتی کردووە. تەعبیرەکەی ئیبن ماجەو حاکم بەم جۆرەیە: مەهدی لەنێو ئومەتی مندا دەردەکەوێت ئەگەر سەردەمی دەرکەوتنەکەی کورت بێت ئەوا حەوت ساڵ و وەگەرنا نۆ ساڵ دەژی، ئەوکات ئومەتی من لەو سەردەمەدا هێندە نازو نیعمەتیان دەبێت کەهیچکات هاوشێوەی ئەوە نەبیستراوە. زەوی بەرەکەتی خۆی دەداتە دەرەوە و سەروەت و سامان لەو ڕۆژگارەدا زۆر و فراوان دەبێت و لەدەستی خەڵکیدایە و بەجۆرێك کەفلان پیاو دەچێتە لای مەهدی و دەڵێت: ئەی مەهدی شتێکم پێ ببەخشە ئەویش دەڵێت هەڵگرە، کۆتایی.

هەرچەندە دارەقوتنی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی موعین لەبارەی زەیدی عەمیەوە گوتوویانە کەئەو صالحەو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل زیاتر دەڵێت: ئەو باشترە لەیەزیدی ڕەقاشی و فەزڵی کوڕی عیسا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەبو حاتەم حەدیسەکەی ئەوی بەزەعیفو لاواز زانیوەو گوتوویەتی: حەدیسە ڕیوایەتکراوەکانی دەنوسنەوە، بەڵام وەك بەڵگە نایانهێننەوە و یەحیای کوڕی موعین لەڕیوایەتێکی تردا گوتوویەتی: شتێکی گرنگ نیە، وەجارێکی تریش گوتوویەتی: حەدیسەکەی دەنوسنەوە، بەڵام زەعیفە. وەجوزجانی گوتوویەتی: ئەو پابەندە. وەئەبو زەرعەش گوتوویەتی: بەهێز نیە حەدیسێکی سست و لاوازو زەعیفە. وەئەبو داوود گوتوویەتی: بەم شێوەیە نیە بەڵکو شوعبە لەوەوە ڕیوایەتی کردووە. وەنەسائی گوتوویەتی: زەعیفەو ئیبن عودەی گوتوویەتی: هەموو ڕیوایەتەکان و زۆربەی ئەو کەسانەی کەلەوانەوە ڕیوایەتی کردووە زەعیفن، لەگەڵ ئەوەی کەشوعبە لەوەوە ڕیوایەتی کردووە دەتوانرێت بگوترێت کەشوعبە زەعیف تر لەوەی لەوەوە ڕیوایەت نەکردووە.

وەلەوانەیە بگووترێت کە حەدیسەکەی ترموزی وەك تەفسیرێك وایە بۆ ڕیوایەتێك کراوە کەموسلیم لەصەحیحەکەیدا هێناویەتی، ئەو عیبارەتەش لەحەدیسەکەی جابردایە کەدەڵێت پێغەمبەر فەرمووی لەکۆتایی ڕۆژگاری ئومەتی مندا خەلیفەیەك پەیدا دەبێت کەماڵو سامان وەك خاك دەبەخشێت بەخەڵکی بەڕادەیەکی بێشومار. وەهەم لەحەدیسەکەی ئەبو سەعیددا کەگوتویەتی: لەخەلیفەکانی ئێوە خەلیفەیەك دەردەکەوێت کەماڵ و سامان وەك خاك دەبەخشێتەوە بەخەڵکی وەهەروەها لەڕێگەیەکی ترەوە لەوانەوە ڕیوایەتکراوە کەپێغەمبەر فەرموویەتی: لەئاخیر زەماندا خەلیفەیەك دێت سەروەت و سامانەکان دابەشدەکات و نایانژمێرێت، کۆتایی. لەحەدیسەکانی موسلیم دا ناوی مەهدی نەهاتووە بەڵگەیەکیش لەدەستدا نیە کەنیشانی بدات، مەبەست لەو کەسەی کەدێت مەهدیە. وەحاکمیش هەمان ئەو حەدیسە لەڕێگەی عەوفی ئەعرابیەوە و ئەویش

لەصدیقی ناجیەوە و ئەویش لەئەبو سەعیدی خودریەوە بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە، کەئەبو سەعید گوتوویەتی پێغەمبەر فەرموویەتی: قیامەت نایەت مەگر ئەوکاتەی کە زەوی پڕ دەبێت لەستەم و ئەوکات لەخانەدانی من پیاوێك دەردەکەوێت کەسەرزەوی پڕ دەکات لەدادگەری بەئەندازەی زۆری زوڵم و ستەم.

وەحاکم لەبارەی ئەم حەدیسەوە گوتوویەتی ئەم ڕیوایەتە لەسەر مەرجی شەیخەین (بوخاری و موسلیم)صەحیحە و ئەوان حەدیسی ناوبراویان تەخریج کردووە. وەهەم حاکم حەدیسی باسکراوی لەڕێگەی سولەیمانی بن عبید لەئەبو الصدیق لەناجیەوە و ئەویش لەئەبو سەعیدی خودریەوە گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەر فەرموویەتی لەکۆتایی ڕۆژگاری ئومەتی مندا مەهدی دەردەکەوێت و بارانێکی زۆر دەبارێت و، گژو گیا سەوز دەبن و ماڵو سامانێکی زۆر دەدات بەخەڵکی و چوار پێکان زۆر دەبن و نەتەوەی ئیسلام دەبێتە خاوەنی دەسەلات و ئەو حەوت یان هەشت ساڵ دەژی. حاکم لەبارەی ئەم حەدیسەوە گوتوویەتی ئەمە صەحیحەلەسەر مەرجی شەیخەین (موسلیم و بوخاری)، بەڵام ئەوان تەخریجیان نەکردووە لەگەڵ ئەوەی کەسولەیمانی بن عبید کەسێکە کەهیچ کەسێك سوننەتێکی لێوە ڕیوایەت نەکردووە، بەڵام ئیبن حەبان ئەوی لەڕیزی متمانە پێکراوەکاندا داناوە و باسی ئەوەی نەکردووە کەکەس لەبارەیانەوە بۆچوونێکی هەبووبێت. دواتر حاکم ئەم حەدیسەی لەڕێگەی ئەسەدی کوڕی موسا لەحەمادی کوڕی سەلەمەوە و ئەویش لە متروراق و ئەبو هارونی عبدیەوە و ئەوانیش لە ئەبو صدیقی ناجیەوە و ئەویش لەئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتی کردووە کەپێغەمبەر فەرموویەتی: سەرزەوی پڕ دەبێت لەزوڵم و ستەم و، دواتر پیاوێك لەخانەدانی من دەردەکەوێت و حەوت یان هەشت ساڵ دەژی و دونیا پڕ دەکات لەدادگەری، دوای ئەوەی کەپڕدەبێت لەزوڵم و ستەم.

حاکم لەبارەیەوە گوتوویەتی: ئەم حەدیسە لەسەر شەرتی موسلیمە و لەسەر ئەو مەرجە بەکاری هێناوە کە ئەو حەدیسەکەی لەحەمادی کوڕی سەلەمەو شەیخەکەیەوە

متروراق تەخریجی نەکردووە، ئەو زۆر زەعیفەو تۆمەتبارە بەدرۆ کردن و پێویست ناکات کەقسەکانی ئیمامانی حەدیس لەبارەی زەعیفیەکەیەوە باس بکەین، بەلام ئەسەدی کوڕی موسا کەلەحەمادی کوڕی سەلەمەوە حەدیسی ڕیوایەت کردووە و ناوزەد کراوە بەاسد السنە (واتە شێری حەدیس)، هەرچەندە بوخاری گوتوویەتی حەدیسی ئەو بەناوبانگە و لەصەحیحەکەیدا بەلگەی پێ هێناوەتەوەو، هەم ئەبو داوود و نەسائی بەلگەیان بەحەدیسەکەی ئەو هێناوەتەوە، بەلام لەگەلّ هەموونەمانەشدا ئەبو داوود گوتوویەتی: ئەو (اسد)لەو متمانە پێکراوانەیە کەئەگەر ڕیزبەند نەدەکرا باشتر بوو. ئەبو محمدی کوڕی حەزم لەبارەیەوە گوتوویەتی: حەدیسەکەی مونکیرە. تەبەرانی هەمان حەدیسی لە موعجەمەناوەندیەکەی خۆیدا هێناویەتی لەئەبوالواصیل ئەویش لە عبدالحمیدی کوڕی واصیل و، ئەویش لە ئەبو الصدیقی ناجی و ئەویش لە حەسەنی کوڕی زەیدی سەعدی کەیەکێکە لەپیاوەکانی خانەدانی بەهدەلە و، ئەویش لەئەبو سەعیدی خودریەوە گێڕاویەتیەوە کەئەبو سەعید گوتوویەتی: بیستوومە کەپێغەمبەر فەرموویەتی: پیاوێك لەنەتەوەی من دەردەکەوێت کەباوەڕی بەسوننەتی من هەیە. خودای گەورە لەئاسمانەوە بارانی بۆ دەبارێنێت و، ڕەحمەت دێتە خوارەوە زەوی خێرو بێری خۆی ئاشکرا دەکات و بەهۆی ئەوەوە عەدالەت و دادگەری لەسەر زەویدا بلاّو دەبێتەوە دوای ئەوەی کەپڕ بوبو لەزولّم و ستەم. بۆ ماوەی حەوت سالّ فەرمانڕەوایی خەلّکی دەکات و لەبیت المقدس نیشتەجێ دەبێت. تەبەرانی لەبارەی ئەم حەدیسەوە گوتوویەتی: کۆمەلّێك لەئەبوالصدیقەوە ڕیوایەتیانکردووە، بەلام بێجگە لەئەبو واصیل هیچکام لەڕاویەکانی ئەم فەرموودەیە کەسێکی تریان لەنێوان ئەبو الصدیق و ئەبو سەعیددا باس نەکردووە، چونکە ئەو حەدیسەکەی لەحەسەنی کوڕی یەزیدەوە و ئەویش لەئەبو سەعیدەوە هێناویەتی، کۆتایی.

ئیبن ئەبی حاتەم ناوی یەزیدی کوڕی حەسەنی هێناوە، بەلام زیاتر لەوەی کە لەم ئیسنادەدا لەئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتی هێناوە ئەبو الصدیق لەوەوە گێڕاویەتیەوە

قسەیەکی لەبارەی ئەوەوە نەکردووەو ئەوی نەناساندووە. زەهەبی لەمیزاندا گوتوویەتی: کەئەو نەناسراوە (مجهول)و، بەڵام ئیبن حەبان لەڕیزی متمانە پێکراوەکاندا ناوی هێناوە، بەڵام ئەبو الواصل کەحەدیسەکەی لە ئەبوالصدیقەوە ڕیوایەتکردووە کەسێکە کەهیچ سوننەتێکی لێوە تەخریج نەکراوە، بەڵام ئیبن حەبان لەڕیزی چینی دووەمی متمانە پێکراوەکاندا (ثقاة)ناوی هێناوە و لەبارەیەوە گوتوویەتی: لەئەنەسەوە ڕیوایەتی هێناوەو شوعبەو عیتابی بن بشر لەوەوە ڕیوایەتیان کردووە. ئیبن ماجە لەکتێبەکەیدا کەبە(سنن)ناسراوە بەم شێوەیەحەدیسێکی تەخریجی کردووە: لەعبداللەی کوڕەی مەسعود لەڕێگەی یەزیدی بن ئەبی زیاد لەئیبراهیم لەعەلقەمە لەعبداللەوە کەگوتوویەتی: کاتێك کەئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا بووین کتوپڕ کۆمەڵێك گەنج لەبەنی هاشم دەرکەوتن‌و کاتێکیش کەپێغەمبەر ئەوانی بینی فرمێسك لەچاوەکانی هاتە خوارەوە ڕەنگ بەڕوخساریەوە نەما. عبدالله دەڵێت: گووتم ئێمە لەدەم و چاوتدا ناڕەحەتیەك دەبینین، حەزناکەین بەم جۆرە بیت. لەوەڵامدا گووتی: ئێمە خانەدانێکین خودا لەبری ئەم دونیایە ئەو دونیای بۆ داناوین و خانەدانی من لەپاش مردنم توشی کۆمەڵێك بەڵاو ناخۆشی و ئاوارەیی و سەختی دەبنەوە، تاوەکو نەتەوەیەك لەخۆر هەڵاتەوە دێن و جل و بەرگی ڕەشیان لەبەردایە وئاڵای ڕەشیشیان بەدەستەوەیەو بانگەوازی خێرو چاکە بڵاو دەکەنەوە، بەڵام کەس بەدەم بانگەوازەکەیانەوە ناچێت هەربۆیە دەست دەکەن بەشەڕو سەردەکەون دواتر خواستەکانیان جێبەجێ دەکەن، بەڵام ئەو گروپە ئەوان قبوڵناکەن تائەوەی کە جڵەوی دەسەڵات دەدەنە دەستی پیاوێك لەخانەدانی من‌و ئەویش سەرزەوی پڕ دەکات لەعەدالەت و، دادگەری هەروەك چۆن پێشتر پڕ بووە لەزوڵم و ستەم کەواتە هەرکەسێك لەئێوە لەو سەردەمەدابێت دەبێت شوێنیان بکەوێت هەرچەندە بەسەر بەفرو بەستەڵەکیشدا بڕوات، کۆتایی.

ئەم حەدیسە لەلای موحەدیسەکان بەڕایات ناسراوە ڕیوایەتکەرەکەی یەزیدی بن ئەبی زیادە. شوعبە لەبارەی یەزیدی بن ئەبی زیادەوە گوتوویەتی: ئەو پیاوێکە ڕفاع بووە

واتە ئەو حەدیسانەی کەنەناسراو بوون بەمەرفوع ناوزەدی کردوون و محمدی کوڕی فەزڵ گوتوویەتی: ئەو لەپێشەوایانی گەورەی شیعە بووە و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گوتوویەتی: ئەو حافیز نەبووە واتە حەدیسی لەبەر نەبووە. وەجارێکی تر گوتوویەتی حەدیسەکەی ئەو ئەمە نیە. یەحیای کوڕی موعین گوتوویەتی: زەعیفە. وەعیجلی گوتوویەتی: ئەو جائزالحدیسە و لەوەرگرتنیدا بەهەڵەداوان دەچوو بەرەو پیریان. وەئەبو زەرعە گوتوویەتی: حەدیسەکەی ئەو نانوسنەوە بەڵگەشی پێ ناهێننەوە. وەئەبو حاتەم گوتوویەتی: بەهێز نیە. وەجوزجانی گوتوویەتی: بیستوومە کەپیاوانی حەدیس حەدیسەکەی ئەویان بەزەعیف ناوبردووە. ئەبو داوودیش گوتوویەتی: کەسێك ناناسم کەحەدیسەکەی ئەوی وەلانابێت، بەڵام من ئەوانی ترم بەلاوە خۆشەویست ترن. وەئیبن عودەی دەڵێت: ئەو لەشیعەکانی کوفەیە و لەگەڵ ئەوەی کەلاوازە حەدیسەکەی دەنوسنەوە و موسلیم یش ڕیوایەتی لەوەوە کردوە، بەڵام بەستراو بەخەڵکی ترەوە نەوەك بەسەریەخۆ. بەکورتی زۆربەی پیاوانی حەدیس ئەویان بەلاواز زانیوە وە ئیمامەکانیان بەڕاشکاوی گوتوویانە ئەو حەدیسەی کەلە ئیبراهیم ئەویش لەعەلقەمەو ئەویش لە عبدالله ڕیوایەتی کردووەو ناسراوە بەحەدیسی ڕایات و زەعیفە و، وەکیعی کوڕی جەڕاح و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گوتوویانە: شتێك نیە.

وەئەبو قودامە گوتوویەتی: بیستوومە ئەبو ئوسامە لەبارەی حەدیسەکەی یەزید لەئیبراهیم لەبارەی ڕایاتەوە دەیگووت: ئەگەر لەلای من پەنجاجار سوێند بخوات باوەڕی پێناکەم. ئایا ئەمە مەزهەبی ئیبراهیم یان مەزهەبی عەلقەمە یان مەزهەبی عبداللەیە؟ وەعەقیلی ئەم حەدیسەی لەناو حەدیسە زەعیفەکاندا هێناوە و زەهەبی گوتوویەتی: صەحیحە. وەئیبن ماجە حەدیسێکی لەعلی یەوە تەخریج کردووە کەزنجیرەی سەنەدەکەی بەم جۆرەیە: یاسینی عیجلی لەئیبراهیمی کوڕی محمدی کوڕی حەنەفی ئەویش لەباوکیەوە و ئەویش لەباپیریەوە گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەر فەرموویەتی: مەهدی لەخانەدانی ئێمە پەیامێکە کەخودا بەهۆی ئەوەوە لەماوەی شەوێکدا خێرو چاکە باڵ

بەسەر جیهاندا دەکێشێت. هەرچەندە ئیبن موعین لەبارەی یاسینی عیجلیەوە گوتوویەتی کەڕێگریەك لەفەرموودەکەی ئەودا نیە، بەڵام بوخاری گوتوویەتی تێبینی تێدا هەیە و ئەم ڕستەیە لەدەستەواژەی بوخاریدا لەزەعیف توندترە لەبارەی ئەوکەسانەی کەباسی دەکات. ئیبن عودەی لەکامیل و زەهەبی لەمیزاندا ئەم فەرموودەیان هێناوە و، بەڵام وەك ئینکاری کردنی ئەو زەهەبی کوتوویەتی ئەو بەم حەدیسەوە بەناوبانگە. تەبەرانیش لەموعجەمی ئەوسەتدا حەدیسێکی لەعلی یەوە تەخریج کردووە، کەئەو بەپێغەمبەری گوتووە ئەی ڕەسول الله ئایا مەهدی لەئێمەیە یان لەخەڵکی تر؟ پێغەمبەر فەرمووی بەڵکو لەئێمەیە و، خودا بەئێمە دونیا کۆتایی پێدەهێنێت هەروەك بەئێمەش دەستی پێکرد و خەڵکی لەشیرك و بت پەرستی دوور خستەوە و هەر بەهۆی ئێمەوە بوو کە دوژمنانی کردە دۆست و یەکگرتووی کردن. ئەوکات علی گووتی: ئایاخەڵکی ئەو سەردەمە باوەڕدارن یان کافرو بێ باوەڕن؟ پێغەمبەریش فەرمووی گروپێك مەفتون و گروپێکیش کافرن، کۆتایی.

لەزنجیرەی سەنەدی ئەم ڕیوایەتەدا ناوی عبداللەی کوڕی لوهەیعە هاتووە کەزەعیفە و هەمووان بەم سیفەتەوە دەیناسن، وەهەروەها ناوی عەمری کوڕی جابری حەزرەمی دەبینرێت کەلەعبداللەش زەعیفترە و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: لەجابرەوە حەدیسگەلێکی مونکیر ڕیوایەت کراون و من دەزانم کەدرۆ بوون. وە نەسائی گوتوویەتی: جێگەی متمانەنیە و هەروەها گوتووشیەتی: ئیبن لوهەیعە شێخێکی بێ ئەقڵ و ژیری کەم بووەو گوتوویەتی علی لەنێو هەورەکاندایەو ئەمەلەکاتێکدا لەگەڵ ئێمەدا دانیشتبوو هەرکە هەورێکی لەئاسماندا دەبینی دەیگووت ئەوە عەلیە کەلەنێوان هەورەکاندا تێپەڕ دەکات وەتەبەرانیش لەعلی یەوە حەدیسێکی تەخریج کردووە کەپێغەمبەر فەرموویەتی: لەئاخیر زەماندا ئاشوبێك بەرپا دەبێت کەخەڵکی ئاوارە دەبن و بەجۆرێك وون دەبن کەدۆزینەوەیان وەك گەڕانە بەدوای زێڕدا لەکانی ئاڵتوون! کەواتە بەناحەق خەڵکی شام لۆمە دەکەن بەڵکو لۆمەی فیتنە چیەکانیان بکەن، چونکە لەنێو خەڵکی شامدا

ئەبدالّەکانیش دەژین، هێندە ناخایەنێت کەهەورێکی پڕباران و زریان ڕەهێڵە وترسناك لەئاسمانەوە بەسەر خەڵکی شامدا دەدات و هەموو خەڵکی پەراگەندە دەکات و بەجۆرێك دەترسن کەئەگەر لەگەڵ ڕێویەکانیش بکەونە شەڕەوە ئەوا دەشکێن و، لەم هەلو مەرجەدا کەسێك لەخانەدانی من دەردەکەوێت کەسوپاکەی سێ ئالآیان پێیە و، ئەوەی حەزدەکات زۆربن بابڵێت پانزەهەزار کەس دەبن و، ئەوەشی کەکەم دەڵێت بابڵێت دوانزە هەزار سوار دەبن و شیعاریان ئومەت ئومەتە و بکوژە بکوژەیە، وە سوپایەکی حەوت ئالآیی شەڕیان لەگەڵدا دەکات و لەژێر هەرئالآیەکدا پیاوێکە کەحەز بەپاشایەتی دەکات، کەواتە خودا هەموویان لەناو دەبات و ئولفەت و نیعمەت و سەرزەوی دورو نزیکی بۆچوونو تەدبیری موسوڵمانانیان بۆ دەگێڕێتەوە، کۆتایی.

لەزنجیرەی سەنەدی حەدیسەکەی عبداللەی کوڕی لوهەیعە زەعیفە و حاڵیشی دیارو ئاشکرایە. حاکمیش لەموستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتی کردووە و گوتوویەتی: سەنەدەکەی صەحیحە، بەڵام موسلیم و بوخاری تەخریجیان نەکردووە لەڕیوایەتەکەی حاکم دا بەم شێوەیە: لەپاشان هاشمی دەردەکەوێت و خوداش یەکگرتوویی و نیعمەت و....هتد حەدیسەکە. لەڕێگەکەی ئەودا ئیبن لوهەیعە نیە و لەڕووی ئیسنادەوە صەحیحە. وەحاکم لەموستەدرەکدا لەعلی یەوە بەڕیوایەتی ئەبو توفەیل لەمحمدی کوڕی حەنەفیەوە حەدیسێکی تەخریج کردووە کەمحمدی کوڕی حەنەفیە گوتوویەتی: ڕۆژێکیان لەلای علی بووین کەسێك لەبارەی مەهدیەوە پرسیارێکی لێکرد. علی یش لەوەڵامدا گووتی: هەیهات لەپاشان بەپەنجەکانی ژمارە حەوتی نیشاندا و گووتی: ئەمە لەئاخیر زەماندا دەبێت، لەکاتێکدا ئەگەر هەرکەسێك ناوی خودا بهێنێت دەکوژرێت. خوداش بۆ مەهدی نەتەوەیەك کۆدەکاتەوە کەوەك پارچە هەورەکان پرژو بڵاون، بەڵام خودا دڵەکانیان لەیەکتر نزیك دەکاتەوە و دەبنە یەك دڵ و یەك بۆ چوون و ترسیان لەکەس نیەو، هەرکەسیش بچێتە ناویانەوە لەخۆیان بایی نابن و ژمارەیان بەئەندازەی جەنگاوەرانی بەدرە و، نەلەڕابوردودا کەس پێشیان کەوتووە و نەلەداهاتووشدا کەس

وەك ئەوان دەبێت و ژمارەیان بەئەندازەی شوێنكەوتوانی تالوت دەبێت، كەلەڕووبارەكەدا پەڕینەوە. ئەبو التوفەیل دەڵێت: ئیبن حەنفیە پرسی ئایا دەتەوێت ئەوە بزانی؟ گووتم بەڵێ گووتی: مەهدی لەنێوان ئەم دووشاخەدا دێتە دەرەوە. گووتم: بەناچاریەوە سوێند بەخودا لێرە ناڕۆم تائەوكاتەی كەزیندوویم، ئەو هەرلەمەككەدا وەفاتی كرد. حاكم گوتوویەتی: ئەم حەدیسە صەحیحە و لەسەر شەرتی شەیخەین بوخاری و موسلیمە، كۆتایی.

بەڵام ئەو تەنها بەپێی شەرتەكانی ئوصوڵی موسلیمە چونكە لەزنجیرەی ئیسنادەكەیدا ناوی عەماری زەهەبی و یونسی بن ئەبی ئیسحاق هەیە، بۆخاری وەك بەڵگەهێنانەوە تەخریجی نەكردووە و بەڵكو بەوحەدیسە بەدوای ئیستیشهاددا گەڕاوە. سەرەڕای ئەمەش مەسەلەی شیعەبوونی عەماری زەهەبی بۆ ئەم مەسەلەیەش زیاد دەبێت و ئەوكەسێكیشە هەرچەندە ئەحمەدی كوڕی حەنبەل و ئیبن موعین و ئەبو حاتەمی نەسائی و ئەوانی تریش بەمتمانە پێكراوو مەوسوقیان زانیوە، بەڵام علی كوڕی مەدەنی بەڕیوایەت لەئەبو سوفیانەوە هێناویەتی كەبەشیری كوڕی مەروان وازی لەهاوڕێیەتی ئەو هێناوە، گووتم بۆچی؟ گووتی: لەبەر شیعە بوونەكەی. ئیبن ماجە حەدیسێكی لەئەنەسی كوڕی مالیكەوە تەخریج كردووە كەزنجیرەی سەنەدەكەی بەم جۆرەیە: لەسەعدی كوڕی عبدالحمید لە جەعفەر ئەویش لە علی كوڕی زیادی یەمامیەوە و ئەویش لەعەكرەمەی كوڕی عەمار و ئەویش لە ئیسحاق وەئەویش لە عبداللەی كوڕی مەسعودەوە و ئەویش لەئەنەسەوە گووتی بیستوومە كەپێغەمبەر فەرموویەتی: ئێمە نەوەكانی عبدالموتەلیب گەورە و سەردارانی ئەهلی بەهەشتین من و حەمزە و حەسەن و حوسەین و جەعفەر و مەهدی، كۆتایی.

وەعەكرەمەی كوڕی عەمار هەرچەندە موسلیم حەدیسی بۆ تەخریج كردووە، بەڵام وەك حەدیسە هاوماناو دووبارەكان هێناویەتی. هەندێك بەزەعیف و هەندێكیش بەمەوسوقیان زانیوە. وەئەبو حاتەمی ڕازی گوتوویەتی: مودەلەسەو حەدیسەكەی

وەرناگیرێت مەگەر ئەوەی کە بەڕاشکاوی دان بەبیستنیدا بنێت. وەلەبارەی علی کوڕی زیادی زەهەبیەوە لەمیزاندا گوتوویەتی: نازانم ئەو کێیە؟ لەپاشان گوتوویەتی: ڕاستتر ئەوەیە کەناوی عبداللەی کوڕی زیاد بێت، بەڵام سەعدی کوڕی عبدالحمید هەرچەندە یەعقوبی کوڕی شەیبە بەکەسێکی متمانە پێکراوی زانیوە و یەحیای کوڕی موعینیش گوتوویەتی: هیچ ڕێگریەك لەبەردەم حەدیسەکەیدا نیە، بەڵام سەوری قسەی لەبارەیەوە کردووە، دەڵێن گوایە لەبەر ئەوە بووە کەسەوری بینیویەتی ئەو لەبارەی مەسەلە گەلێکەوە فتوا دەدات و هەڵەش دەکات. وەئیبن حەبان گوتوویەتی: ئەو لەو کەسانەیە کەهەڵەکانی زەق و دیارن هەربۆیە بەڵگە بەقسەکانی ناهێنرێتەوە. وەئەحمەدی کوڕی حەنبەل گوتوویەتی: سەعدی کوڕی عبدالحمید بانگەشەی ئەوە دەکات کەلەکاتی خوێندنەوەی کتێبەکانی مالیکدا بۆ گەورە زانایان گوێی گرتووە، ئەمەلەکاتێکدا خەڵکی ئینکاری ئەم بانگەشەیە دەکەن و دەڵێن ئەو لێرە (بەغداد)دایە و نەچووەتە حەج ئەی چۆن گوێ بیستیان بووە. زەهەبی ئەویش لەڕیزی ئەوکەسانەدا داناوە کەقسەی ئەوانەی کە لۆمەدەکەن نای گرێتەوە. وەحاکم لەموستەدرەکی خۆیدا بەڕیوایەت لەموجاهیدەوە و ئەویش لە ئیبن عەباس و مەوقوف لەسەر ئەو حەدیسێکی تەخریج کردووە. موجاهید دەڵێت کەعبداللەی کوڕی عەباس دەڵێت: ئەگەر ئەم بیستایە کەتۆ وەك ئەندامی خانەدانی پێغەمبەری هەرگیز ئەم حەدیسەم بۆ نەدەگێڕایەوە. موجاهید گووتی: ئەم قسەیە لەپەردەدا دەمێنێتەوە و بەکەسی ناڵێین کەبەبیستنی نارەحەتە لەپاشان گووتی عبداللەی کوڕی عەباس گوتوویەتی: چوار کەسمان خانەدانی پێغەمبەرن: سەفاح و مونزیر و مەنصور و مەهدی. موجاهید دەڵێت: ئەم چوار کەسە بۆ من ڕاڤە و شیکاری بکە. ئیبن عەباسیش گووتی: سەفاح دەبینین هاوەڵانی خۆی دەکوژێت و لەدووژمنەکانی خۆش دەبێت، مونزیریش سەروەت و سامانێکی زۆر دەدات بەخەڵکی و، پێی وایە کەبەم جۆرە هەواو خۆ بەگەورە زانین لەخۆی دوور دەخاتەوە و کەمێك لەو ماڵ و سامانە بۆ خۆی دادەنێت. مەنصوریش نیوەی ئەو سەرکەوتنەی کەبەپێغەمبەری خودا دراوە بەو

دەدرێت و دووژمنانی لەدووری دوومانگەوە ترسی ئەمیان لەدڵ دەنیشێت، هەروەك ئەوەی کەخودا بۆ پێغەمبەر و هاوەڵانی دەکرد. مەهدیش کەسێکە کەسەرزەوی پڕ دەکات لەعەدل و دادگەری دوای ئەوەی پڕ دەبێت لەزوڵم و ستەم و حەیوانات بێخەم دەبن لەدڕندەکان. و زەویش خێرو بێری خۆی دەخاتە دەرەوە. گووتی: پرسیم ئەوشتانە چین؟ گووتی ئەو زێڕو زیوەیە کەوەك ستونی گەورە دەردەکەون لەگەورەییدا، کۆتایی.

وەحاکم گوتوویەتی: ئەم فەرموودەیە لەڕوی ئیسنادەوە صەحیحە، بەڵام موسلیم و بوخاری تەخریجیان نەکر دو وە و لەئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موهاجیرەوە ڕیوایەت کراوە و ئەویش لەباوکیەوە گێڕاویەتیەوە، بەڵام ئیسماعیل زەعیفە. ئیبراهیمی باوکیشی هەرچەندە موسلیم حەدیسی بۆ تەخریج کردووە، بەڵام زۆربەی پیاوانی حەدیس بەزەعیفیان زانیوە، کۆتایی.

ئیبن ماجە لەسەوبانەوە حەدیسێکی تەخریج کردووە کەسەوبان گوتوویەتی: پێغەمبەر (ص)فەرمووی: سێ کەس کەهەرسیانیان نەوەی خەلیفەن لەسەردەمی گەورەیی ئێوەدا دەست دەکەن بەجەنگ و لای ئێوە دەکوژرێن و، دواتر ئاڵای ڕەش لەلای خۆر هەڵاتەوە بەرز دەکرێنەوە و ئێوە بەشێوەیك دەکوژن کەهیچ کەسێك بەو جۆرە نەکوژرابێت. دواتریش قسەیەکی فەرموو کەیادم نەماوە و دواتریش گووتی هەرکاتێك ئەوتان بینی بەیعەتی پێبکەن و بچن بۆ لای هەرچەندە بەسەر ئەژنۆ و، لەسەر بەفریشدا بڕۆن چونکە ئەو مەهدی خەلیفەی خودایە، کۆتایی.

پیاوانی ئەم حەدیسە پیاوانی صەحیحەین بێجگە لەوەی کەلەزنجیرەی ئیسنادەکەدا ناوی ئەبو قەلابەی جرمی دەبینرێت کەزەهەبی ئەوانی تریش بەمودەلەسیان زانیوە و، لەهەمان زنجیرەشدا ناوی سوفیانی سەوری هاتووە کەبەناوبانگە بەتەدلیس و هەریەکە لەو دووکەسە باسی زنجیرەی حەدیسەکەیان کردووە، (حەدیسەکەی بەموعەن عەن هێناوە)و بەڕاشکاوی باسی بیستنی نەکردووە هەربۆیە حەدیسەکەی وەرناگرن.

وەهەروەها ناوی عبدالرەزاقی کوڕی هومام لەزنجیرەی ئیسنادەکەیدا هەیە کەبەشیعەگەری ناسراوە و لەکۆتاییەکانی ژیانیدا کوێر بووەو، حەدیسەکانی تێکەڵی یەکتر کردووە. ئیبن عەدی گوتوویەتی: عبدالرەزاق لەبارەی فەزیلەتەکانەوە حەدیس گەلێکی گێڕاوەتەوە کەهیچ کەسێك لەسەریان لەگەڵ ئەودا هاوڕا نەبووە و، بەشیعەیان زانیوە، کۆتایی.

ئیبن ماجە بەڕیوایەت لەعبداللەی کوڕی حاریسی کوڕی جزی زوبەیدیەوە حەدیسێکی تەخریج کردووە کەلەڕێگەی ئیبن لوهەیعەو، ئەویش لە ئەبو زەرعە و ئەویش لە عەمری کوڕی جابری حەزرەمی و ئەویش لەعبداللەی کوڕی حاریسی کوڕی جزئەوە گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەر فەرموویەتی: خەڵکانێك لەخۆرهەلاتەوە دەردەکەون و کاروبارەکان بۆ مەهدی ئامادە دەکەن واتە سەڵتەنەت و دەسەلات و هێزی پایەدار و جێگیر دەکەن. تەبەرانی گوتوویەتی: ئەم حەدیسە تەنها لوهەیعە ڕیوایەتی کردووە وەئێمەش لەزیمن و ناوەڕۆکی حەدیسەکەی علی دا کەتەبەرانی لەموعجەمی ئەوسەتی خۆیدا تەخریجی کردووە بیرمان هێنایەوە کە ئیبن لوهەیعە زەعیفەو، هەم گوتیشمان کەشێخەکەی عەمری کوڕی جابر لەو لاواز ترە. بەزاز لەمەسنەدەکەیداو تەبەرانیش لە موعجەمە ئەوسەتەکەیدا لەئەبو هورەیرەوە حەدیسێکیان تەخریج کردووە کەعیبارەتەکەی لەتەبەرانیەوە یەو، ئەبو هورەیرە لەپێغەمبەرەوە دەیگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: مەهدی لەنێو ئومەتی مندایە و ئەگەر دەورانی دەسەلاتەکەی کورت بێت ئەوا حەوت ساڵ یان هەشت ساڵ یان نۆ ساڵ دەبێت ئومەتی من لەسەردەمی ئەودا بەجۆرێك دەکەونەنازو نیعمەتەوە کەلەمێژوودا وێنەی نیە. ئاسمان بەردەوام بارانی ڕەحمەتیان بۆ دەبارێنێت و زەوی هەموو خێرو بێرو گژو گیاو ڕووەکەکانی دەداتە دەرەوە و سەروەت و سامان و دارایی خەڵکی زۆر دەبێت، بەجۆرێك پیاو هەیە هەڵدەستێتەوە و دەڵێت ئەی مەهدی سەروەت و سامانم بدەرێ ئەویش دەڵێت بەئارەزوی خۆت هەڵگرە. بەزازو تەبەرانی گوتوویانە ئەم حەدیسە تەنها محمدی کوڕی مەروانی عیجلی گێڕاویە تیەوە و بەزازیش

دەڵێت دیار نیە هیچ کەسێك شوێنی کەوتبێت، هەرچەند ئەبو داوود بەمەوسوقی داناوە و ئیبن حەبانیش ناوی ئەوی لەڕیزی متمانە پێکراوەکاندا باسکردووە یەحیای کوڕی موعینیش لەبارەیەوە گوتوویەتی: صاڵحە و لەحەدیسەکەیدا هیچ ڕێگریەك نیە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەحەدیسەکەی ئەودا جیاوازیان هەبووە، هەروەك چۆن ئەبو زەرعە گوتوویەتی: حەدیسەکەی ئەو لەلای من ئەو قبوڵکراوە نیە. عبداللەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گوتوویەتی: بینیم محمدی کوڕی مەروانی عیجلی حەدیس گەلێك دەگێڕێتەوە و لەوێش بووم، بەڵام بەئەنقەست نەم نوسینەوە و وازم لێهێنان ئێستە دەبینین هەندێك لەهاوەڵانمان دەیاننوسنەوە.

هەروەك بڵێی ئیبن حەنبەل بەم قسەیە ئەوی بەزەعیف داناوە. ئەبو یەعلی موصڵی لەمەسنەدەکەی خۆیدا بەڕیوایەت لەئەبو هورەیرەوە حەدیسێکی بەم جۆرە تەخریج کردووە: ئەبو هورەیرە دەڵێت ئەبوالقاسمی هاوڕێم (ص) پێی گووتم: کەقیامەت نایەت مەگەر ئەوکاتەی کە لەنێو خەڵکیدا پیاوێك لەخانەدانی من دەربکەوێت و ئەوەندە خەڵکی هاندەدات و وایان لێدەکات بگەڕێنەوە بۆلای حەق، پرسیم (ئەبو هورەیرە)ماوە چەند ساڵ فەرمانڕەوایی دەکات؟ فەرمووی پێنج و دوو، گووتم مەبەستت لەپێنج و دوو چیە؟ ووتی: نازانم. هەرچەندە لەم سەنەدەدا ناوی بەشیری کوڕی نوهەیك هەیە ناتوانرێت بکرێتە بەڵگە لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا موسلیم و بوخاری کردوویانەتە بەڵگەو، خەڵکیش متمانەیان پێکردووە و گوێیان نەداوەتە قسەکەی ئەبو حاتەم کە گوتوویەتی ناکرێتە بەڵگە، بێجگەلەوەی لەزنجیرەی سەنەدەکەیدا ناوی مرجا ی کوڕی ڕەجائی یەشکری هاتووە کەلەبارەیەوە جیاوازیان هەبووە.

هەروەك چۆن ئەبو زەرعە گوتوویەتی متمانە پێکراوە و یەحیای کوڕی موعین ئەوی بەزەعیف زانیوە و جارێکی تریش گوتوویەتی: صاڵحە، بوخاریش لەصەحیحەکەیدا تەنها یەك حەدیسی لەوەوە ڕیوایەتکردووە ئەبوبەکری بەزار لەمەسنەدەکەی خۆیداو تەبەرانیش لەموعجەمی کەبیر و ئەوسەتەکەیدا حەدیسێکی بەڕیوایەتی قورەی کوڕی

ئەیاس بەم شێوەیە تەخریج کردووە: قورە گووتی کەپێغەمبەر فەرموویەتی: هەرکاتێك زەوی پڕبێت لەزوڵم و ستەم و هەرکات ئەوە روویدا ئەوا خودا پیاوێك لەنێو خانەدانی مندا هەڵدەبژێرێت کەناوی خۆی و باوکی لەناوی من و باوکم دەچێتو سەرزەوی پڕ دەکات لەدادگەری دوای ئەوەی کەپڕدەبێت لەزوڵم و ستەمکاری. لەو کاتەدا ئاسمان بەهیچ شێوەیەك لەباراندنی باران دریٚغی ناکاتو زەوی هیچکام لەگیاکانی خۆی ناشارێتەوە. ئەو لەناوتاندا حەوت یان هەشت یان نۆ ساڵ دەژی، واتە ساڵانێکی دوورو درێژی پێدەچێت، کۆتایی.

وەلەزنجیرەی سەنەدی ئەم حەدیسەدا ناوی داوودی کوڕی مجبری کوڕی قەحزەم بەڕیوایەت لەباوکیەوە دەبینرێت کەهەردووکیان زۆر زەعیفن. وەتەبەرانی لەموعجەمی ئەوسەتی خۆیدا حەدیسێکی بەڕیوایەت لەئوم حەبیبەوە بەم شێوەیە گێڕاوەتەوە: ئوم حەبیبە دەڵێت بیستوومە کەپێغەمبەر دەیگووت خەڵکانێك لەلای خۆر هەڵاتەوە دەردەکەون و بەدوای پیاوێکدا دەگەڕێن کەلەنزیك ماڵی خودادایە و هەرکە دەگەنە بیابان زەوی ئەو ناوچەیە لەناوخۆیدا نوقمیان دەکات. گووتم: ئەی پێغەمبەری خودا کەسانێك کەبەزۆر دەچنە دەرەوە چ چارەنوسێکیان دەبێت؟ ئەوانیش دووچاری هەمان چارەنوسی خەڵکی دەبنەوە لەپاشان خودا خەڵکی هەڵدەبژێرێت، بەڵام هەرکەسەو بەپێی ئەو نیەتەی کەهەیەتی، کۆتایی.

وەلەزنجیرەی ئیسنادی ئەم حەدیسەدا ناوی سەلەمەی کوڕی ئەبرەش هەیە کەزەعیفەو ناوی محمدی کوڕی ئیسحاق هەیە کەمودەلەسە و حەدیسەکەی بەموعەن عەنی ڕیوایەتکردووەو، وەها حەدیسێکیش قبوڵ ناکرێت مەگەربە بیستن و سەماع گووترابێت. تەبەرانی لەئیبن عومەرەوە حەدیسێکی بەم شێوەیە تەخریج کردووە: ئیبن عومەر دەڵێت پێغەمبەر لەنێو چەند کەس لەموهاجیرین و ئەنصاردا بوو علی کوڕی ئەبی تالیب لەلای چەپیەوە و عەباسیش لەلای دەستی ڕاستیەوە بوون، کتوپڕ عەباس و پیاوێك لەئەنصار دەستیانکردە دەمەقاڵێ و لۆمەکردنی یەکتری و پێغەمبەریش دەستی

عەباس و علی خستە ناودەستی خۆیەوە و، فەرمووی لەداهاتوودا لەپشتی ئەم عەباسە کەسێك دەردەکەوێت کە سەرزەوی پڕدەکات لەزوڵم و زۆر و، لەپشتی علی یش کەسێك پەیدا دەبێت کەزەوی پڕدەکات لەدادگەری و، هەرکات ئەو سەردەمە هات پێویستە لەسەرتان کەلایەنگری لەگەنجی تەمیمی کەلە خۆرهەڵاتەوە دێت بکەن و شوێنی بکەون چونکە ئەو عەلەمداری مەهدی دەبێت، کۆتایی. لەزنجیرەی ئیسنادی ئەم حەدیسەدا ناوی عبداللەی عومەری و عبداللەی کوڕی لوهەیعە هەیە کەهەردووکیان زەعیفن، کۆتایی.

تەبەرانیش لەموعجەمی ئەوسەتی خۆیدا حەدیسێکی لەتەلحەی کوڕی عبداللەوە بەریوایەت لەپێغەمبەرەوە بەم شێوەیە تەخریج کردووە: فەرمووی هێندە نابات کەفیتنەو ئاشوبێکی وەها بەرپادەبێت کەلەهەرلایەکەوە کپی دەکەنەوە لەلاکەی ترەوە هەڵدەگیرسێتەوە تائەوکاتەی بانگەوازکەرێك لەئاسمانەوە بانگ دەکات کەئەمیری ئێوە فلآن کەسە، کۆتایی.

وەلەزنجیرەی ئیسنادی ئەم حەدیسەوە ناوی موسەنناي کوڕی صەباح هەیە کەزۆر زەعیفە و، سەرەڕای ئەمەش لەحەدیسەکەدا ناوی مەهدی بەڕاشکاوی نەهاتووە بەڵکو موحەدیسەکان لەڕوانگەی ئونسەوە لەگەڵ ئەم بابەتەدا ئەویان خستووەتە ناو بەشەکانی ژیاننامەی مەهدیەوە. ئەمانەن هەموونەو فەرموودانەی کەئیمامانی حەدیس ئەوانیان لەبارەی مەهدیو دەرکەوتنیەوە لەئاخیر زەماندا تەخریجی کردووەو حەدیسە ناوبراوەکان هەروەك بینیت تەنها کەمێکیان نەبێت هەموویان ڕەخنەیان لێگیراوە. هەرچەندە ئینکاری کەرانی ئەم بابەتە پشتیان بەحەدیسێك بەستووە کەمحمدی کوڕی خالیدی جوندی لەئیبانی کوڕی صالح و ئەویش لە ئەبو عەیاش و ئەویش لە حەسەنی بەصریەوە و ئەویش لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە بەم شێوەیە ریوایەتی کردووە: ئەنەسی کوڕی مالیك لەپێغەمبەرەوە (ص)دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: بێجگە لەعیسای کوڕی مەریەم مەهدیەك بوونی نیە. یەحیای کوڕی موعین لەبارەی محمدی کوڕی خالیدی جوندیەوە گوتوویەتی کەئەو جێگەی متمانە نیە. بەیهەقیش گوتوویەتی تەنها محمدی

کوڕی خالید ڕیوایەتی کردوون. وەحاکیم لەبارەیەوە گوتوویەتی ئەو پیاوێکی بێ ناوو نادیارە. وەلەچۆنیەتی ئیسنادەکەشیدا جیاوازی دروست بووە هەروەك چۆن یەکجار کەپێشتریش باسمانکرد ڕیوایەتی دەکەن و دەیدەنەپاڵ محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی، وەجارێکی تریش ئەو فەرموودەیە لەمحمدی کوڕی خالید ئەویش لەئیبانەوە و ئەویش لەعەباسەوە و، ئەویش لەپێغەمبەرەوە (ص)بەشێوەیەکی مورسەل واتە مەتنێکی بێ سەنەد ڕیوایەتی دەکەن.

بەیهەقی گوتوویەتی: گەڕانەوە بۆ ڕیوایەتەکەی محمدی کوڕی خالید کراوە و ئەو نادیارەو سەنەدەکە لەئیبانەوە تەرك کراوەو لەحەسەن لەپێغەمبەرەوە (ص)پچڕاوە بەگشتی کەواتە حەدیسەکە زەعیف و موزتەریبە. وەهەندێکیش گوتوویانە مانای ئەوەی کە (بێجگە لەعیسا مەهدی نیە)ئەوەیە کەبێجگە لەعیسا هیچ کەسێك لەبێشکەدا قسەناکات، ئەیانەوێت بەم تەئویلە بەڵگە هێنانەوە پێی ڕەت بکەنەوە یان لەنێوان ئەوو حەدیسەکانی پەیوەست بەمەهدیە وە بەجۆرێك لەجۆرەکان بەیەکەوە کۆیان بکەنەوە. ئەمەش بەحەدیسەکەی جورەیج و خەواریقەکانی تری وەك ئەو ڕەت دەکرێتەوە، بەڵام صۆفیەکان و پێشینانیان لەبارەی هیچکام لەم مەسەلانەوە باس و لیکۆڵینەوەیان نەکردووە بەڵکو قسەی ئەوان لەبارەی موجاهەدە لەگەڵ ئەو کاروکردەوە و دەرئەنجامانەدا بووە کەلەوانەوە بەدەست دێن وەك (حاڵ)و (ویجد). قسەکانی ئیمامیەو ڕافیزیەکانی شیعە لەبارەی لەپێشتر زانینی علی و بیروباوەڕ بەئیمامەتی ئەو بانگەشەی وەصیەتەکەی پێغەمبەر (ص)لەبارەی جێنشینی ئەوو لەپێشتری هەردوو خەلیفە (ئەبوبەکر و عومەر)بووە، هەروەك چۆن لەناو مەزهەبەکانی ئەماندا باسمانکرد دواتر پاش ماوەیەك باوەڕیان بەئیمامی مەعصوم پەیداکردوو کتێبانێکی زۆریان لەبارەی بیرو باوەڕو مەزهەبەکانی ئەوانەوە دانران.

لەپاشان لەنێویاندا گروپی ئیسماعیلیەکان دەرکەوتن کەبەشێوەی حلول باوەڕیان بەخودایەتی ئیمام هەبوو گروپێکیشیان پاشگەزبوونەوەی هەریەك لەئیمامەکان بەجۆرێك

لە تەناسوخ یان بەشێوەی حەقیقەت بانگەشەی دەکەن‌و، گروپێکیشیان چاوەڕێی و گەڕانەوەی فەرمانڕەواین بۆ خانەدانی پێغەمبەرو لەم بارەیەشەوە حەدیس گەلێك بێجگەلەو حەدیسانەی کەئێمە پێشتر لەبارەی مەهدیەوە باسمان کردن، کۆمەڵێك حەدیسی تریش دەهێننەوە. لەنێو صۆفیە هاوچەرخەکانیشدا لەبارەی کەشف و پشتەوەی هەست باس و خواس هاتوەتە گۆڕێ و زۆرێك لەصۆفیەکان بەشێوەیەکی ڕەها باوەڕیان بەحلول و یەکبوون هەیەو، لەم بیرو باوەڕەیاندا هاوڕان لەگەڵ ڕافیزیە و ئیمامیەدا چونکە ئەمان باوەڕیان بەئولوهیەتی ئیمامەکان و حلولی خودا تێیاندا هەیە. وەهەروەها موتەصەویفە باوەڕیشیان بەقوتب و ئیبدال هەیەو هەروەك بڵێی ئەوان لەم بیرو باوەڕەیاندا چاولیکەریان لەمەزهەبی ڕافیزیەکان کردووە لەبارەی ئیمام و نەقیبانەوە (کاربەدەستانی خەڵکی)کردووە، قسەی شیعەکانیان لەگەڵ بیرو باوەڕەکانی خۆیاندا تێکەڵکردووە و لەدیانەت و مەزاهیبەکانیاندا هەڵیان گرتوەتەوەو، بەناویدا ڕۆچوون بەجۆرێك کە موستەنەدی تەریقەتی خۆیانیان لەلەبەرکردنی ئەوخەرقەدا کەئیمامی علی کردبوویە بەری حەسەنی بەصریەوەو داوای وەفاداری لێکردبوو بەرامبەر بەتەریقەت‌و ئەم پارچە پەڕۆ یان ئەم خەرقەیە وەك خەرقەی تەریقەت ناسرا دەبینیەوەو، تەریقەتیش بەبیروباوەڕی ئەوان لەحەسەنی بەصریەوە گەشتووە بەجونەید کەیەکێکە لەمەشایخەکانیان. ئەمە لەکاتێکدا لەتەریقەتی صەحیحدا وەها ڕووداوێك نەزانراوە و ئەم تەریقەتە تایبەت نەبووە بەحەزرەتی عەلی یەوە (کرم الله وجهە)، بەڵکو هەموو صەحابە لەتەریقەتی ئایندا وەك ڕینماو پێشەیەوای موسوڵمانانن تایبەتکردنی ئەو شتە تەنها بەعلی یەوە توندی شیعە نیشان دەدات لەو شتانەو بابەتەکانی تری وەك ڕۆچوونیان بەناو شیعەگەریدا و، ڕۆشتنی ئەمان لەسەر ڕێگەی شیعەکان کەپێشتر باسمانکرد ئەوە تێدەگەین کە لەم ڕووەوەیە کە کتێبی ئیسماعیلیەکان پڕیەتی لە بیرو باوەڕی ڕافیزی. کتێبی ئیسماعیلیەکان هەم کتێبی ئەوصۆفیانەش کەدواتر هاتن سەراپا لەبارەی فاتیمی چاوەڕوانکراوەوەیە ئەم شتانە لەیەکترەوە فێر دەبن و، هەموویان لەسەر بنەمای وەهمی

هەردوو گروپ دامەزراون و هەندێکیشیان لەهەندێك حاڵەتدا پشت بەقسەی ئەستێرە ناسان دەبەستن، لەبارەی قیرانەکانەوە ئەم جۆرە پێشگۆییانەی ئەوانیش لەجۆری ئەو قسانەیە کە لەمەلحەمەکاندا پێشگۆیی دەبینرێت کەدواتر و لەبەشەکانی داهاتوودا باسیان دەکەین.

ئەوانەی کەلەم گروپەی صۆفیە کانی دوایی لەمەسەلەی فاتیمیدا قسەیان کردووە، بریتین لەئیبن العربی حاتەمی و لەکتێبی عەنقای مەغریبدا و ئیبن قەسی لەکتێبی خلع النعلین دا و عبدالحق ی کوڕی سبعین و قوتابیەکەی ئیبن ئەبی واتیل کەلەشەرحی کتێبی خلع النعلین دا لەم بارەیەوە گفتوگۆی کردووە. کەزۆربەی وشەکانی ئەمان لەبارەی فاتیمی وەك مەتەڵ و نمونە وایە زۆر کەم بەڕاشکاوانە قسە دەکەن وەیان ڕاڤەکارانی قسەکانی ئەمان هەندێك جار بابەتەکە بەڕاشکاوانە باسدەکەن. کورتە مەزهەبی ئەمان بەو پێیەی کەئیبن ئەبی واتیل باسی کردووە بریتیە لەوەی کە بەهۆی پێغەمبەرایەتیەوە حەق و ڕاستی لەپاش گومڕایی و کوێری مرۆڤەوە بەدیهاتووەو، بەدوای پێغەمبەرایەتیشدا خەلافەت ڕوودەدات و دواتریش پاشایەتی جێگەی خەلافەت دەگرێتەوە و لەپاشان سەردەمی ستەمگەری و خۆبەگەورە زانین دێتە پێشەوە. دەڵێن لەبەر ئەوەی نەریتی خوداوەهایە کەشتەکان بگەڕێنەوە سەرباری یەکەمیان هەربۆیە واجبە پێغەمبەرایەتی حەق لەڕێگەی ویلایەتەوە زیند بکرێتەوەو دواتریش بگۆڕێت بۆ خەلافەت و، بەدوایدا سەردەمی درۆو دووڕویی و جێنشینی پاشایەتی دێتە پێشەوە و بێباوەڕی دەگەڕێتەوە ئەو حاڵەتەی کەبەرلە هاتنی ئاین هەیبووە.

ئەوان بەم قسانە ئاماژە بەو ڕووداوانە دەکەن کەلەدوای پێغەمبە رایەتیەوە ڕوویانداوە وەك خەلافەت و گۆڕانی بۆ پاشایەتی و دەیانکەن بەسێ قۆناغەوە هەربۆیە ویلایەتیش کەتایبەتی ئەو فاتیمیەیەو، پێغەمبەرایەتی و حەق زیندوو دەکاتە وە دەیچوێنن بە پێغەمبەرایەتیەوە و بەخاوەنی سێ قۆناغی دەزانن: سەرەتا ویلایەت و دواتریش خەلیفە جێنشینانو دوای ئەوەش سەردەمی درۆو تەزویر کەبەشێوەیەکی

ناڕاستەوخۆ مەبەستیان هاتنی دەجالە دێت و لەپاش ئەم سێ قۆناغەیە کە بەپێی نەریتی سەرەتا بێباوەڕی دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی واتە بەر لەهاتنی پێغەمبەر.

وەهەروەها دەڵێن: لەبەر ئەوەی مەسەلەی خەلافەت بۆ هۆزی قورەیش وەك حوکمێکی شەرعی بووە بەئیجماع کەئینکاری ئەوەی کە زانستی ئەویان بەدەست نەهێناوە سستی ناکات. کەواتە واجبە کەئیمامەت تایبەت بکرێت بەکەسێکەوە کە کەلەقورەیش بێت وەیان بەئاشکراو پەنهان لەخانەدانی عبدالمتلیب بێت، واتە دەبێت لەکەسانێك بێت کەبەڕاستی سەر بە ئال و بەیت بن. خانەدانیش ئەو کەسانەن کەنەبوونی ئیمامیان هیچکات پێوە دیار نەبێت. ئیبن عەرەبی حاتەمی لەکتێبەکەیدا بەناوی عەنقای مەغریبەوە فاتیمی بەناوی (خاتەمی ئەلیا) ناوزەد دەکات و بەشێوەیەکی ناڕاستەو خۆ بەخشتی ئاڵتوونی ناوی دەبات، ناوی کۆتایی ئاماژەیە بە حەدیسەکەی بوخاری لەبەشی (خاتەم النبیین)دا کەپێغەمبەر(ص) فەرموویەتی: نمونەی من لەناو پێغەمبەرانی پێشوودا وەك پیاوێك وایە کەخانویەکی دروستکردووە و تەواوی دەکات و بێجگە شوێنی یەك خشتی، کەواتە من ئەو خشتەم. خاتەمی پێغەمبەرانیش بەخشتێك تەفسیر دەکەن کەبیناکەی کامڵ کردووە. ماناکەیشی ئەو پێغەمبەرەیە کەپێغەمبەرایەتی تەواوی بۆ هاتووە. ویلایەتیش لەجیاوازیەکانی قۆناغەکانیدا بە پێغەمبەرایەتیەوە چواندوویانە و خاوەن کەماڵی ویلایەتیش بەخاتەمی ئەولیا دەزانن و واتە خاوەنی پلەی کامڵی و کۆتایی ویلایەت، هەروەك چۆن کەکۆتا پێغەمبەر خاوەنی پلەی خاتم الانبیایە. هەربۆیە شارع (خودا)لەحەدیسی باسکراودا باسی ئەم پلەیەی بەخشتی خانوو کردووە هەردوو پلەکە خاوەنی یەك نیسبەتن هەربۆیە شێوەیان لەیەك خشت زیاتر نیە، بەڵام لەپێغەمبەرایەتیدا خشتەکە ئاڵتوونیە و لەویلایەتدا خشتەکە زیوینە و ئەم دووپلەیەش جیاوازن هەربەو جۆرەی کەزێڕو زیو جیاوازیان هەیە. هەربۆیە خشتی زێڕین کینایەیە لەپێغەمبەر و زێڕینیش کینایەیە لەو وەلیە فاتیمیە چاوەڕوانکراوە دەهێننەوە و ئەو بەخاتەمی ئەنبیا و ئەویشیان بەخاتەمی ئەولیا ناوزەد دەکەن.

ئیبن عەرەبی لەو بابەتانەی کەئیبن ئەبی واتیل لێیەوە دەیانگێڕێتەوە گوتوویەتی: ئەو ئیمامە چاوەڕوانکراوە لەخانەدانی پێغەمبەر و لەنەوەی فاتیمەیە دەرکەوتنی لەپاش تێپەڕینی (خ، ف، ج)لەکۆچ دەبێت. وەهەرسێ پیتەکە بەمەبەستی بەدەستهێنانی ژمارەکەیان بەپێی ڕستەکان تەرسیم کراون و کە(خ)مانای شەشسەد و (ف)مانای هەشتاو (ج)مانای سێ دەگەیەنێت کەبەیەکەوە واتە شەش سەدو هەشتاو سێ ساڵ دەکات، هاوکاتە لەگەڵ سەدەی حەوتەمدا و لەبەر ئەوەی ئەم سەردەمە ڕابورد و فاتیمی دەرنەکەوت، هەندێك لەموقەلیدەکانیان پێشبینیەکەیان بەم شێوەیە ئاراستە دەکرد و دەیانگووت مەبەست لەو ماوەیە کاتی لەدایك بوونەکەی بووە و، دەرکەوتنەکەیان بەلەدایك بوونەکەی تەعبیر کردووە و گوتوویانە دەرکەوتنی نزیکەی حەوت سەدو دە دەبێت و ئیمامێکە کەلە ناوچەی مەغریبەوە سەر هەڵدەدات. وەئیبن ئەبی واتیلیش گوتوویەتی: هەرکات ڕۆژی لەدایك بوونی ئیمام بەپێی قسەکەی ئیبن عەرەبی لەساڵی شەش سەدو هەشتاو شەشدا بێت. کەواتە تەمەنی ئەو لەکاتی دەرکەوتنیدا دەکاتە بیست و شەش ساڵ. وەهەروەها گوتوویەتی: دەجال لەساڵی حەوت سەد و چل و سێ دا دەردەکەوێت لەو ڕۆژەی محمدی دەردەکەوێت دەستپێکردنی ڕۆژی محمدی بەبیرو باوەڕی ئەمان لەڕۆژی وەفاتی پێغەمبەرەوە (ص)تا کۆتایی هەزار ساڵە.

وەهەروەها ئیبن ئەبی واتیل لەشەرحی کتێبی خلع النعلین دا گوتوویەتی: چاوەڕوان کراو کەسێکە کەفەرمانی خودا جێبەجێ دەکات و پێی دەڵێن محمدی مەهدی، ئەو خاتەمی ئەولیایە و پێغەمبەر نیە و بەڵکو وەلیە.

پێغەمبەر (ص)فەرموویەتی: زانا لەنێو نەتەوەکەیدا وەك پێغەمبەر وایە. وەهەروەها فەرموویەتی: زانایانی ئومەتی من وەك پێغە مبەرانی بەنی ئیسرائیلن. مژدەدان بەدەرکەوتنی مەهدی لەسەرەتای ڕۆژی محمدیەوە تاوەکو کەمێك بەر لەساڵی پێنج سەد واتە نیوەی ڕۆژی ناوبراو بەردەوام بووە و، لەکاتی تێپەڕبوونی ئەو سەردەمەوە تاوەکو ئێستا مژدەو ئاگادار کردنەوەکانی پیاوانی ئاین و مەشایەخەکان بەهاتن و دەرکەوتنی

مەهدی چاوەڕوانکراو زیاتربوون. ئیبن ئەبی واتیل دەڵێت: کندی باسی ئەوەی کردووە کە ئەم وەلیە کەسێکە کەلەگەڵ خەڵکیدا نوێژی نیوەڕۆ بەجێدەهێنێت و ئیسلام نوێ دەکاتەوە و دادگەری پەرەپێدەدات و، دوورگەی ئەندەلوس فەتح دەکات و دەگاتە ڕۆمەو ئەو ناوچەیەش ئازاد دەکات و بەرەو خۆرهەڵات بەڕێ دەکەوێت و سەرزەوی قوستەنتینیەش فەتح دەکات و فەرمانڕەوایی دەکات و، موسوڵمانان هێزو توانا پەیدا دەکەن و ئاینی حەنیفیە واتە ئیسلام پەرە دەگرێت، چونکە لەکاتی نوێژی نیوەڕۆ تاوەکو نوێژی عەسر کاتی نوێژێکی تایبەتە. پێغەمبەر (ص)فەرموویەتی: لەنێوان نوێژی عەسرو نیوەڕۆدا کاتێکە بۆ نوێژ.

وەکیندیش گوتوویەتی: ژمارەی هەموو پیتە عەرەبیە بێ نوقتەکان واتە ئەو پیتانەی کەسورەتەکانی قورانیان پێ دەستپێکراوە بەحیسابی ڕستەکان حەوت سەدو چل و سێیەو دەکاتە حەوت ساڵی دەسەڵاتی دەجال، ئەوکات لەکاتی نوێژی عەسردا عیسا دێتە خوارەوە و دونیا پڕدەکات لەچاکە بەجۆرێك گورگ و مەڕ بەیەکەوە ئاودەخۆنەوە و دەژین. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەماوەی پاشایی غەیرە عەرەب لەپاش هێنانی ئیسلام لەلایەن ئەوانەوە و لەگەڵ هاتنی عیسادا سەدو شەست ساڵە کەژمارەی پیتە نوقتەدارەکانی (ق – ی – ن)و دەوڵەتی عەدالەت و داد لەم ماوەیەدا چل ساڵە. ئیبن ئەبی واتیل دەڵێت: ئەوحەدیسەی کەلەقسەکەی پێغەمبەرەوە هاتووە کە: مەهدی بێجگەلەعیسا کەسێکی تر نیە بەم مانایەکە هیچ مەهدیەك نیە کەهیدایەتی ئەو لەگەڵ ویلایەتی ئەمدا بەرابەر بێت قسەیەکی تریش دەڵێت: مانکەی ئەوەیە کە بێجگە لەعیسا کەسێك نیە کەلەبێشکەدا قسەبکات، بەڵام ئەم قسەیە بەحەدیسەکەی جورەیج و ئەوانی تر ڕەت دەکرێتەوە. لەصەحیحدا هاتووە کەپێغەمبەر فەرموویەتی: ئەم شتە واتە ئیسلام یان ئاینی محمد بەردەوام بەپایەداری دەمێنێتەوە تاوەکو قیامەت دێت و دوانزە خەلیفە فەرمانڕەوایی بکەن. واتە خەلیفەی قورەیشی. کەواتە واقیعیەت ئەوە نیشان دەدات کە هەندێك لەم دوانزە کەسە لەسەرتای ئیسلامدا بوون و هەندێکیشیان لەکۆتاییەکەیدا

دەبن. وەهەروەها پێغەمبەر دەفەرمێت: ماوەی خەلافەت لەدوای منەوە سی ساڵە، وەیان بەپێی ڕیوایەتێکی تر سی و شەش ساڵە. کەکۆتاییەکەی لەخەلافەتی حەسەن و سەرەتای فەرمانڕەوایی موعاویەدایە.

کەواتە سەرەتای فەرمانڕەوایی موعاویە بەخەلافەت دادەنرێت، بەپێی مانای ئەصڵی وشەکان و وەرگرتنی سەرەتای ناوەکان ئەو شەشەمین خەلیفەیە و حەوتەمینیش عومەری کوڕی عبدالعزیزە. دواتریش هەرپێنج خەلیفەکە لەخانەدانی پێغەمبەر و لەنەوەی عەلی ین بەڵگەش ئەو فەرموودەی پێغەمبەرە کەدەفەرمێت: تۆ زولقەرنەینی ئەوی. مەبەست زولقەرنەینی ئۆمەتە. واتە تۆ لەسەرتای ئۆمەتی ئیسلامدا خەلیفەیت و نەوەکانیشت لەکۆتاییدا دەبنە خەلیفە هەرچەندە ئەوانەی کەباوەڕیان بەڕیجعەت (واتە گەڕانەوەی ئیمام دوای مردنی بۆ دونیا)هەیە، ئەوە دەکەنە بەڵگە کەلەپاش سەدەی یەکەم بەبیرو باوەڕی ئەوان ئامازەیە بەو کاتەی کەخۆر لەخۆر ئاواوە هەڵدێت و پێغەمبەر (ص)فەموویەتی: هەرکات کیسرا (خەسرەو)بکوژرێت لەپاش ئەو خوسرەوێك نیە و هەرکاتیش قەیصەر لەناوبچێت لەپاش ئەویش قەیصەرێکی تر نابێت کەفەرمانڕەوایی بکات. وەسوێند بەو کەسەی کەگیانی منی بەدەستە خەزێنەکانیان بێگومان لەڕێگەی خێر خەرج دەکەن. ئەوەبوو وەعدەکەی پێغەمبەر وەڕاست گەڕاو خەلیفە عومەر خەزێنەکانی لەخێرو بێردا خەرج کردن دوای ئەوەی کەقەیصەر دەکوژێت ئەم چاوەڕوانکراوە مەهدیە کەقوستەنتینیە فەتح دەکات. کەواتە هەم فەرمانڕەوا باشەو هەم سپایەکی باش و چاك، ئەمەش پێغەمبەر بەم شێوەیەی فەرمووە. وەماوەی فەرمانڕەواییەکەشی (بیزع) هەندێکە یان چەند ساڵێکە و بیزعیش لەسێ ساڵ تاوەکو نۆو بەقەسەی هەندێکیش تاوەکو دەساڵ دەگەیەنێت، لەچەند حەدیسێکدا چل و لەڕیوایەتەکانی تریشدا حەفتا هاتووە، بەڵام چل ساڵ بریتیە لەماوەی فەرمانڕەوایی مەهدی وەسەردەمەکەی تری هەرچوار خەلیفەکەی بووە، کەلەخانەدانی ئەو لەپاش مەرگی خەلافەت دەکەن، درودی خودا لەسەر هەموویان بێت.

دەڵێن ئیبن ئەبی واتیل ئەستێرە ناسان و ئەهلی قیرانەکان باسی ئەوەیان کردووە کەماوەی مانەوەی فەرمانڕەوایی مەهدی وخانەدانەکەی لەپاش ئەو سەدو پەنجاو نۆ ساڵ دەبێت. هەربۆیە ماوەی فەرمانڕەوایی خەلافەت و عەدالەت چل یان حەفتا ساڵ دەبێت و ئەوکات بارو دۆخ دەگۆڕێت پاشایەتی بەدی دێت. کۆتایی قسەکەی ئیبن ئەبی واتیل. ئیبن ئەبی واتیل لەشوێنێکی تردا دەڵێت: هاتنە خوارەوەی عیسا لەکاتی نوێژی عەسردا ڕۆژی محمدی کاتێك دەبێت کەسێ لەسەر چواری تێپەڕی بێت. وە کندی و یەعقوبی کوڕی ئیسحاق لەکتێبی جەعفەریدا کەتێیدا قیرانەکان (بورجەکانی)باس کردووە گوتوویەتی: هەرکات بورجەکان بگاتە بورجی گا لەسەرەتادا (ضح)بەزادی موعجەمەو حای مهملە، واتە شەش سەدو نەوەد و هەشت ساڵی هیجری مەسیح دێتە خوارەوە و هەرچەندێك کەخودا بیەوێت فەرمانڕەوایی دەکات.

لەحەدیسدا هاتووە کەعیسا لەنزیك منارەی سپی لەلای خۆرهەڵاتی دیمەشقەوە دێتە خوارەوە، کەدوو بەرگی زەردی زەعفەرانی ڕەنگی لەبەر دایە و هەردوو دەستی لەسەر باڵی دوو فریشتەیەو قژێکی نەرمی هەیە کەتاوەکو ئاستی هەردوو نەرمەی گوێی هاتوون هەروەك بڵێی لەزیندان هاتووەتە دەرەوە. هەرکات سەری دانەوێنێت ئاو دڵۆپ دڵۆپ دێنە خوارەوە و هەرکاتێکیش سەری بەرز بکاتەوە وەك مرواری لەقژەکانیەوە دەڕژێنە خوارەوە. دەم و چاوی پڕە لەخاڵ. وەلەحەدیسێکی تردا هاتووە کەباڵایەکی مام ناوەندی هەیە و ڕەنگی پێستی سوورو سپیە. وەلەحەدیسێکی تردا هاتووە کە ئەو لەنێو عەرەبە دەشتەکیەکاندا هاوسەر گیری دەکات وژنەکەی منداڵێکی دەبێت و مردنەکەی لەپاش چل ساڵ باسکراوە. لەحەدیسیشدا هاتووە کە عیسا لەمەدینە لە مەدینە وەفات دەکات و لەتەنیشت عەمەری کوڕی خەتابەوە دەنێژرێت. وەهەروەها لەحەدیسدا هاتووە کەئەبو بەکرو عومەر لەنێو دوو پێغەمبەردا دەردەکەون. ئیبن ئەبی واتیل گوتوویەتی کەشیعە دەڵێت مەسیح مەسیحی هەموو مەسیحیەکانە لەنەژادی پێغەمبەر و هەندێك لەوان حەدیسی: بێجگە لەعیسا مەهدیەك نیە بەو شێوەیە مانایان کردووە، واتە مەهدی بوونی نیە بێجگە لەو مەهدیەی کەپەیوەندی ئەو لەگەڵ شەریعەتی محمددا وەك

پەیوەندی موسایە، لەگەڵ شەریعەتی موسادا لەپەیڕەوی کردن و نەسخ نەکردندا (قسەیەکە لەشەریعەتەکەی ئەو).

سەرەڕای ئەمەش زۆرێك لەم جۆرە گوفتارانە کەتێیاندا دەرکەوتن و دەرکەوتنی کەسێك پلەو پایەی دەرکەوتنەکەی دیاری دەکات و، ئەوکاتەی کە باسی دەکەن تێدەپەڕێت و هیچ شوێنەوارێکیش لەدەرکەوتن نیە و دەگەڕێنەوە سەر ئەو بۆ چوونە تازەیەی کەلەگەڵیدا دەسازێن هەروەك دەبینی لەم بارەیەوە پشت بەچ دەستەواژەی زمانەوانی و بابەتگەلێکی خەیاڵی دەبەستن و، لەم تەمەنەی سەرەتادا سەرەتاو کۆتاییان تێپەڕیوە، بەڵام صۆفیەکانی سەردەمی ئێمە زۆربەیان ئاماژە بەدەرکەوتنی کەسێك دەکەن کەتازەکەرەوەی حوکمەکانی مەزهەبی ئیسلام و موراسیمەکانی حەقە و دەرکەوتنی لەچەند کاتێکدا دیاری دەکەن کەنزیکە لەسەردەمی ئێمەوە هەندێکیان دەڵێن لەنەوەی فاتیمەیە و، هەندێکیشیان سەربە هیچ خانەدانێکی نازانن ئێمەش ئەم بۆچوونەمان لەوانەوە بیستووە کەگەورەکەیان ئەبو یەعقوبی بادیسی سەروەری ئەولیاکانی مەغریبە لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە واتە سەدەی شەشەمدا ژیاوە. ئەم بابەتەش نەوەی گەورەمان ئەبو زەکەریا یەحیا بەگێڕانەوە لە باوکیەوە ئەبومحمد عبداللەی وەلی و وەئەویش لەباوکیەوە ئەبو یەعقوب گێڕاویەتیەوە و بۆ منیشی گێڕاوەتەوە. ئەمەیە کۆتایی ئەو بابەتانەی کە ئێمە دەستمان کەوتوون یان لەقسەی گروپی صۆفیەکانەوە پێمان گەشتوون و ئەوەشی کەموحەدیسەکان لەبارەی باسی مەهدیەوە هێناویانە کەبەشێوەیەکی تێرو تەواو باسمانکردن، بەڵام حەقیقەتێك کەدەبێت بۆ تۆ بسەلمێنرێت ئەوەیەکە هیچ بانگەوازێك ئیتر بۆئاین یان سەڵتەنەت و پاشایەتی ناگاتە قۆناغی کردارو کەماڵ، مەگەر بەهۆی شکۆو لەشکرو عەصەبیەتەوە چونکە فەرمانی بانگخواز لەشکرو عەصەبیەت دەیپارێزێت و ئاشکرای دەکات و بەرگری لێدەکات، تائەوکاتەی فەرمانی خودا دەگاتە کەماڵ. ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا بەڵگەی سروشتی ئەوەمان نیشانداو سەلماندمان.

عەصەبیەتی تالیبیەکان و فاتیمیەکانو بەڵکو عەصەبیەتی هەموو قورەیش ئێستاکە لەسەرانسەری دونیادا هەڵوەشاوەتەوە و، گەلانی تر وەدەر کەوتوون کەعەصەبیەتیان لەعەصەبیەتی قورەیش لەپێشترە. بێجگە لەو عەصەبیەتانەی کە لەقورەیش لەحیجاز لەمەککە و شارەکانی یەنبووع و مەدینە ماونەتەوە و گروپێك لەتالیبیەکان وەك خانەدانی حەسەن و خانەدانی حوسەین و خانەدانی جەعفەر لەشارە ناوبراوەکاندا بلاّوەیان کردووە، ئەو ناوچانەیان لەژێر دەستدایە ئیتر لەناوچەکانی تری جیهاندا شوێنەوارێك لەعەصەبیەتی قورەیش بوونی نیە، ئەوانەش گروپ تاقم گەلێکی دەشتەکین کەلەناوچەکانی خۆیاندا بەشێوەیەکی پەڕاگەندە دەژین و لەڕووی زۆری فەرمانڕەوایان و فیکر و بیروباوەڕە جۆراو جۆرەکانەوە دەگەنە هەزارەها گروپ و کۆمەڵ. کەواتە ئەگەر دەرکەوتنی ئەم مەهدیە ڕاست بێت ئەوا هیچ ڕێگەیەك نیە بۆ ئاشکرا بوونی بانگەوازەکەی بێجگە لەوەی کە لەوخانەدانانە بێت و، خوداش دڵەکانیان بۆ پەیڕەوی کردن لەو لەیەکتر نزیك بکاتەوەو لەئەنجامدا عەصەبیەت و شکۆیەك دروست ببێت و بگاتە کەماڵ و بتوانێت بانگەوازی خۆی بەئاشکراو بەبێ ترس بلاّو بکاتەوە و، خەڵکی بکەونە ژێر دەسەلاّتیەوەو ناچاربن کەگوێڕایەڵی بکەن، وەگەرنا وەك ئەوە وایە کەکەسێکی فاتیمی بیەوێت لەشوێنێکی دوور دەستی ئەم جیهانەداو، بەبێ بوونی عەصەبیەتێکی بەهێز وەها بانگەوازێك بلاّوبکاتەوە، بەدڵیاییەوە بەهیچ شێوەیەك پێشمان کەوێت و بەپێی ئەو بەڵگەو دەلیلانەی کەپێشتر باسمانکردن، وەها کارێك سەرکەوتوو نابێت. وەهەروەها بانگەشەی هەندێك لەخەڵکی بەگشتی لەم بارەیەوە قبوڵکراو نیە، چونکە ئەوانە کۆمەڵێك کاڵفام زیاتر نین و بەجڵەوی ژیری ئاراستە ناکرێن تاوەك و بەپێی ئەو ڕێنمایی بکرێن و نەزانستێکیشیان هەیە کەبەهرەی لێوەر بگرن. ئەوانە چاوەڕێی کاتی دەرکەوتنی ئەو فاتیمیەن بەبێ ئەوەی سەربە هیچ خانەدانێك بێت وەیاخود بەبێ ئەوەی پێگەی ڕاست و، دروستی ئەو بزانن دەستدەکەن بەچاولێکەری لەو بانگەشە و پڕوپاگەندانەی کەلەبارەی ئەو پیاوە فاتیمیەوە بلاّو دەکرێنەوەو، هەروەك باسیشمانکرد حەقیقەتی مەسەلەکە نازانن.

زیاتر شوێنی دەرکەوتنی پیاوی فاتیمی لەناوچە دوور دەستەکانی وەك زاب لەئەفریقاو سوس لەمەغریب دیاری دەکەن و، زۆرێك لەو کەسانەی کەبەصیرەتێکی لاوازیان هەیە زۆر گرنگی بە ناوچەیەکی لماوی دەدەن لەسەر زەوی سوس و، دەڵێن کەگوایە فاتیمی لەوێوە دەردەکەوێت بەگومانی ئەوەی کەئەو لەو ناوچەو دەربەندەدا بینراوە و، پێیان وایە کەخەڵکی لەو ناوچەیەدا بەیعەتی پێدەکەن، چونکە ئەو شوێنە لەنزیکی نەتەوە دەمامك دارەکانەوەیە (کداله)خەڵکی پێیان وایە کە فاتیمی لەو نەتەوانەیە و ئەو هۆزانە بانگەوازەکەی قبوڵدەکەن و بڵاوی دەکەنەوە، ئەم بانگەشەیەش پشتی بەهیچ بەڵگەیەك نەبەستووە بێجگە لەدووری و سەرسوڕهێنەری ئەو نەتەوە و هۆزانە چونکە خەڵکی بەگشتی زانیاریان لەبارەی ئەو هۆزانەوە نیە لەڕووی زۆری و کەمی دانیشتوان و، هێزو دەسەلآت و هەروەها ئەو گومانەش دەکەن کەلەبەر دووری و کەمی هێزی دەسەلآتدارانی دەوڵەتان لەناوچە سنوری و دوور دەستەکاندا، هەربۆیە گرێمانی دەرکەوتنی فاتیمی لەوێدا زۆرترە و تەنها بەهرەیەکیش کەدەکرێت لەم گومانەیان ببیەن ئەوەیە کە فاتیمی چاوەڕوانکراو لەدەرەوەی هێز و دەسەلآتی دەوڵەتان و یاساو ڕێسای فەرمانڕەواکاندایە. هەرلەبەر ئەمەشە کەکۆمەڵێك خەڵکی نەفام کاڵفام ڕیاکارانە دەست دەدەنە بانگەشەی ئەوەی کەگوایە فاتیمی لە (ڕیباتی لم)دا دەردەکەوێت و، ئەمەش بۆ بەدەست هێنانی کۆمەڵێك دەستکەوتی بێمانا و پڕوپووچ و هەندێك جاریش زۆرێکیان لەم پێناوەدا گیانی خۆیان لەدەستداوە. شێخی ئێمە محمدی کوڕی ئیبراهیمی ئەبلی بۆمنی گێڕاوەتەوە کەلەسەرەتای سەدەی هەشتەم و سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان یوسفی کوڕی یەعقوب پیاوێك لەچۆفیە پێشینەکان کەبە تویزری (کەبچوککراوەی توزەرە)لەو شارەی ڕیباتدا دەرکەوت و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو فاتیمی چاوەڕوانکراوە. هەندێك لەخەڵکی بەتایبەت هۆزەکانی صەنهاجە و کزولە شوێنی کەوتن بانگەوازەکەی بڵاو بوویەوە و نزیك بوو کەجڵەوی دەسەلآت بگرێتە دەست، هەربۆیە سەرۆك هۆزەکانی موصامیدە ترسیان لێ نیشت و تاسکسیوی بەفێڵ و لەکاتی شەودا کەسێکی دانا و کوشتیان و شوێنکەوتووانی پەرتەوازە بوون. وەهەروەها

لەکۆتایی سەدەی حەوتەمدا، واتە لەنێوان ساڵی شەش سەد و نەوەد، تاوەکو حەوت سەد پیاوێك لەغومارە کەناوی عەباس بوو دەرکەوت و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کەئەو فاتیمی چاوەڕوانکراوە و هەموو خەڵکی غمارە پەیڕەویان لێکرد و، بەزەبری هێز شاری بادسی داگیر کردوو بازاڕەکانی سوتاند و دواتر بەرەو شاری الزمە ڕۆشتوو، لەوشارەدا بەفێڵ و پلان کوژراو بانگەوازەکەی بەکۆتا گەیشت.

لەم جۆرەبانگەشانەی کەخاوەنەکانیان هیچ پێشکەوتنێکیان بەخۆیانەوە نەبینیوە نمونەیان زۆرە. وەهەروەها شێخی ناوبراو محمدی کوڕی ئیبراهیمە ئەبلی بەسەرهاتێکی سەرسوڕ هێنەری لەم جۆرە بانگەشانە بۆ من گێڕاوەتەوە کەبریتیەلە: لەکاتی سەفەری حەجدا لەڕیباتی عیباد (کەکەوتووەتە دووکیلۆمەتری باشوری خۆر هەلاٌتی تلمسان کەنار ڕووباری ئەسرەوە) کەئارامگای شێخ ئەبو مەدینە لەکێوی تلمسان و، کێوی ناوبراو دەڕوانێت بەسەریدا پیاوێك لەخانەدانی پێغەمبەر (سەید)کەلەدانیشتوانی کەربەلا بووە دەبێتە هاوڕێی سەفەری ئەوو خاوەن قوتابی و شوێنکەوتوو خزمەتکارانێکی زۆر بووەو، لەنێو هۆزەکەیدا پلەو پایەیەکی بەرزو بەڕێزی هەبووەو لەزۆربەی شارەکاندا هاوشاریەکانی پێشوازیان لێکردووە و، خەرجیان گرتووەتە ئەستۆ. شەیخ دەڵێت: لەم سەفەرەدا بووینە دووهاوڕێی خۆشەویستی یەکتری. مەسەلەی ژیان گوزەرانیم بۆ دەرکەوت و زانیم کەئەو لەگەڵ شوێنکەوتوانیدا لەکەربەلاوە هاتووە و بانگەشەی ئەوە دەکات کەفاتیمی چاوەڕوانکراوە هاتووەتە مەغریبەوە و بینیویەتی دەوڵەتی مەرینیەکانو یوسفی کوڕی یەعقوب کەلەو کاتەدا تلمسانی کردبوویە پایتەختی خۆی لەئەوپەڕی هێزو دەسەلاٌتدایەو، بۆی دەردەکەوێت کە ئەم شوێنە گونجاو نیە بۆ ئەو بانگەوازە هەربۆیە بە شوێنکەوتووەکانی گوتووە بگەڕێنەوە ئێمە دووچاری هەڵەیەکی گەورە بووینەتەوەو ئێستە کاتی ئەم بانگەشەیە نیە.

قسەی ئەو پیاوە ئەوە نیشاندەدات کەئەو ئاگاداری ئەو حەقیقەتە بووە کە فەرمانڕەوایی و، بانگەواز تەنها بەهێزی عەصەبیەت و هێزو دەسەلاٌت بلاٌو دەبێتەوە و جێگیر دەبێت، ناوبراویش کەلەوە تێگەیشتووە کە لەم شوێنەدا پیاوێکی بێکەس و کارو

بێگانەیە و ناتوانێت لەبەرامبەر عەصەبیەتی مەرینیەکانەوە خۆڕاگربێت و بەرگری بکات هەربۆیە لەبانگەشەکەی پاشگەزبووەتەوەو حەقیقەتی بۆ دەرکەوتووەو، وازی لەخەیاڵەکانی هێناوە و ئەو بابەتەی کەدەبوایە لێی تێبگەشتایە ئەوە بووە کە هەموو عەصەبیەتی فاتیمیەکان و قورەیش بەتایبەت لەمەغریبدا بەتەواوەتی لەناو چووە، بەڵام تەعەصوبی بۆ حەزو خولیاو کارەکانی ناهێڵێت بەتەواوەتی واز لە بانگەشەکەی بهێنێت. خودا دەزانێت و ئێوە نازانن. لەسەردەمەکانی نزیك لەم چەرخەی ئێمەوە لەنێو جەنگاوەرانی دانیشتووی مەغریبدا حەزو ئارەزویەکی شۆڕشی بەدی هاتبوو کەخەڵکی بانگ دەکرد بۆسەر ڕێگەی ڕاست و پەیڕەوی لەسوننەتەکانی پێغەمبەر بەبێ ئەوەی لەم جۆرە بانگەشانەدا بانگەشەی بانگەوازی فاتیمی بوونی هەبێت، هەروەك چۆن لەهەندێك کاتدا یەك لەدوای یەکی ئەو خەڵکەیان بانگ دەکرد، بۆ لای زیندوکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر و گۆڕینی خراپە و زۆر گرنگیان بەم بەم شتانە دەداو، شوێنکەوتوانیان زۆر دەبوون و بەرلەهەموو شتێك دەستیان دەکردە چاکسازی لەبواری ڕێگاوباندا و گرنگیەکی زۆریان بە پاسەوانی و پاراستنی ڕێبواران لەڕێگەو بانەکاندا دەدا، چونکە زۆر ترینی تالاَنو دەستدرێژیەکان لەسەر ڕێگاکان ڕوویاندەدا لەلایەن جەنگاوەرانەوە، هەروەك لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکردکەبارودۆخی سروشتی ئابووری و ژیان و گوزەران وای دەخواست کەئەم جۆرە کارانە ئەنجام بدەن. هەربۆیە ئەوەی کە خوازیارانی چاکسازیەکانم دەیانتوانی خەڵکی لەکارە ناپەسەندەکان دوور بخاتەوە بەتایبەت لەدابینکردنی ئاسایش بۆ ڕێگەو بانەکان لەدەستدرێژی ڕێگرەکان، بەڵام ئەوەی کەهەیە ئەوەیە کەهەستی ئاین و نەریتە جوانەکان لەناویاندا زۆر جێگیر نەبوبو، لەو ڕووەوەی کەتۆبەی عەرەب و ڕووکردنیان لەئاین تەنها گرنگیان بەم مەسەلەیە دەدا کە لە چەتەیی و تالاَنکردن واز بهێنن و، لەگەڕانەوەیان بەرەو ئاین و گرنگیدانیان پێی ژێری ئەمان فەزیلەتێکی تری دەرك نەدەکردو نەیاندەتوانی پەی بەهەموو مەبەستەکانی ئاین بەرن و بێجگە واز هێنان لەداگیر کاری پەی بەشتێکی تر بەرن. چونکە بەر لەوەی ببنە ئاین پەروەر ئەم کارەیان دەکرد هەربۆیە کاتێك ڕوویانکردە ئاین تەوبەیان لەو ڕەفتارە

ناشیرینە کرد. هەربۆیە دەبینین پەیڕەوانی ئەم گروپی ئیصلاح خوازانە کەبەگومانی خۆیان خەڵکی بانگدەکەن بۆ لای سوننەت و حەق دەکەن و، لەبوارو لقەکانی تری ئایندا قوڵ نین و تەنها کاری ئەوان وازهێنان بووە لەتالآنکردن و داگیر کاری و ستەم ڕێگری لەگەشتیارو ڕێبواران، ئەوکات بەهەموو ئەو هێزەی کەهەیانە ڕوودەکەنە کاروبارو قازانجە دونیاییەکان و جیاوازی لەنێوان سەرفرازی و، شایستەیی خەڵکی و داوالکردنی دونیا لەزەوی تاوەکو ئاسمانە و گونجانی ئەو دوانە لەگەڵ یەکتردا نەگونجاوە.

هەربۆیە لەنێوان وەها کەسانێکدا نەریت و ئوصوڵەئاینیەکان جێگیر نابن و بەتەواوەتی لەڕێگەی بەتاڵ واز ناهێنن و، گروپەکەیان زیاد ناکات و لەنێوان خوو سیفەتەکانی بانگخوازو ئەواندا جیاوازیەکی زۆر هەیە و هێندە گرنگی بەچاولێکەری لەهەڵسووکەوتی بانگخوازەکەیان نادەن و هەرکە لەژیاندا نەما زنجیرەی کاروبارەکانیان دەپچڕێت و عەصەبیەت و هێزیان لەناو دەچێت. نمونە ئەمەش لەئەفریقا بۆ پیاوێك بەناوی قاسمی کوڕی مورەی کوڕی ئەحمەد لەهۆزی بەنی کەعبی کوڕی سەلیم لەسەدەی حەوتەمدا ڕوویدا و، لەپاش ئەویش بۆ پیاوێکی تریش بەناوی سوعادە لەهۆزی (بەتن)موسلیم وابەستە بەهۆزە دەشتەکیەکانی ڕیاحەوە، کەئەو لەچاکخوازی یەکەمینیش ديندار تر بوو شێوازێکی جێگیر تری هەبوو، بەڵام کاروباری شوێنکەوتوانی بەهیچ شێوەیە بەرەو باشی نەچوو بەهۆی ئەو بەڵگە و دەلیلانەی کەباسمانکردن، ئێمەلەکاتی باسکردنی هۆزەکانی سولەیم و ڕیاح دا لەم بارەیەوە قسەدەکەین. لەپاش ئەوانیش ئیصلاح خوازانێك دەرکەوتن کەوەك چاولێکەریەك لەوان ئەم جۆرە بانەشانەیان دەکرد و ڕێگەی ڕیباکاریو فێڵکردنیان دەگرتە بەر و وشەی سوننەتیان بەسەرزاردا دەهات، ئەمەلەکاتێکدا تەنها کەمێك نەبێت هیچ پابەندیەکیان پێیەوە نەبوو هەربۆیە نەئەم گروپەو نەکەسانێکیش کە لەدوای ئەمانەوە ئەم جۆرە بانگەشانە دەکەن، هیچ پێشکەوتنێك بەخۆیانەوە نابینن و کارێکی ئەوتۆ ئەنجام نادەن. دەستووری خودایە لەنێو بەندەکانیدا.

# بەشی پەنجاو سێیەم

## لەبارەی غەیب بینی و فاڵچیەتی دەوڵەت و نەتەوەکان و لەم بەشەشدا باسیش لە مەلحەمەکان (داستان)ی پێشگۆیی وکەشف و چەمك و مانای جفرە دەکەین

دەبێت ئەوە بزانین کە هەوڵو هیمەت کردن وگرنگیدان بە زانینی دەرئەنجامی کارەکان و ئاگادار بوون لەو پێشهاتانەی کەلەداهاتوودا بۆ هەرکەسێك کەڕوودەدات وەك چۆنیەتی ژیان و مردن و چاکە خراپە، لەتایبەتمەندیەکانی ڕۆحی جۆری مرۆڤە بەتایبەت کە خەڵکی حەزیان لەوەیە کە ئاگاداری پێشهات و ڕووداوەکانی ئایندە ببنەوە وەك: زانینی ئەو ماوەیەی کەلەتەمەنی دونیا ماوە و یان پەی بردن بەهێزو ماوەی مانەوە دەوڵەتان، کەدەتوانین بڵێین ئاگادار بوون لەم جۆرە شتانە خووخدەیەکی مرۆڤە و لەناخیدا خۆی حەشار داوە. هەربۆیە دەبینین زۆربەی خەڵکی حەزدەکەن کەلەخەویاندا ئاگاداری ئەم شتانە ببنەوە و، هەواڵ و خەبەر دانی کاهینەکان لەسەرەتاو کۆتایی و چارەنوسی پاشاو دەسەلاَتداران نمونەی ئەم حەزو خولیایانەن لەلای خەڵکی گشتی و بازاڕی. هەربۆیە دەبینین لەزۆربەی شارەکاندا بەشێك لەخەڵکی ئەم کاری پێشگۆیی کردنەیان وەك کارێك بۆ پەیدا کردنی ژیان و گوزەرانیان بەکار دەهێنن چونکە ئەم کەسانە باش دەزانن کە خەڵکی زۆر حەز بەزانینی ئەم جۆرە هەواڵانە دەکەن هەربۆیە لەکەنار ڕێگاکان و، لەناو بازاڕەکاندا شوێنێکی تایبەت بەم کارانە لەلایەن ئەو کەسانەوە ئامادە کراوە بۆ ئەم مەبەستە و زۆرێك لەخەڵکی سادە و کاڵفام لەدەوریان کۆدەبنەوە و

پرسیاریان لێدەکەن‌و، لەبەرامبەر پێشگۆییەکاندا پارەیان لێوەردەگرن‌و شوێنەکانیشیان زۆر ناسراون و خەڵکانێکی زۆر دەیانزانن. هەربۆیە بەیانی تاوەکو ئێوارە شوێنەکانیان پڕە لەژن و منداڵ و داوای پێشبینیان لێدەکەن لەبارەی ئەوەی کەپرسیاریان لێدەکەن هەرلە پلەو پایە و دەسەڵاتەوە بیگرە تاوەکو بچوکترین شتی ژیان و، گوزەرانیان و ئەم کەسانەش (واتە فاڵچیەکان)دەستدەکەن بەجۆرەها پێشگۆیی وەك بینەری خەتی ڕەمڵ کەپێی دەڵێن ئەستێرەناس (منجم)یان نجوم گەر فاڵبینیش بەزیخی وورد و دانەی فاڵی تۆك کەپێی دەڵێن ژمێریار (حاسب)و، ئەوانەشی کەسەیری ئاوێنە و ئاودا فاڵ دەبینن پێیان دەڵێن موندیل زەن (بازنەیەکە کەئەفسونگەران لەسەر زەویدا بەدەوری خۆیاندا دەیکێشن) ئەم کارە ناپەسەندو خراپانە لەهەموو شارەکاندا بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجام دەدەن و، ئەمە لەکاتێکدا لەشەریعەتدا بەناپەسەند ناوزەد کراوە و بڕیاری لەسەر دراوە کەمرۆڤ ناتوانێت ئاگاداری شتە غەیبیەکان بێت، بێجگە لەو کەسانەی کەخودا لەڕێگە خەو یان لەڕێگە پلەی ویلایەتەوە دەیزانن، زۆربەی ئەو کەسانەی کەزۆر گرنگی بەم پێشگۆییانە دەدەن پاشاو ئەمیرەکانن کەئەیانەوێت ماوەی دەسەڵاتەکەیان بزانن، هەربۆیە خاوەن زانست و گەلان زۆر گرنگی پێدەدەن و، لەنێو هەر نەتەوەیەکیشدا قسەی کاهین یان ئەستێرەناس یان وەلی ئەمرێك لەم بارەیەوە بەرچاو دەکەوێت، وەك چۆنیەتی پاشایەتی وئەو سەڵتەنەتەی کە چاوەڕوانیەتی یان ئەو دەسەڵات و دەوڵەتەی کە بۆ بەدەستهێنانی لەبەر خۆیەوە قسەدەکات و، ئەو پێشهاتانەی کەلەئایندەدا بۆ ئەوان دێنە پێشەوە وەك شەڕو ئاژاوە و کوشت و کوشتارە گەورەکان و ماوەی مانەوەی دەوڵەت‌و ژمارەی پاشاکانی‌و زۆر جاریش ناوهێنانی ئەو سەرۆك‌و پاشایانەی کەلە ئایندەدا دەسەڵات دەگرنە دەست، بەم شتانە دەڵێن پێشگۆیی ڕووداوەکان. لەنێو عەرەبدا کاهین و فالگر بوون کەلەم مەسەلانەدا خەڵکی دەگەڕانەوە بۆ لایان و لەبارەی داهاتووی نەتەوەی عەرەب و پاشایەتی دەوڵەتیانە پێشگۆیی و پێشبینیەکانیان دەخستە ڕوو، هەروەك شەق و سەتیح لەبارەی خەوەکەی ڕەبیعەی کوڕی نەصرەوە،

کەیەکێك بووە لەپاشاکانی یەمەن باسیان کردووە گووتیان حەبەشە هێرشیان دەکاتە سەر و لەپاشان ئەو وولاّتە دەکەوێتە ژێر دەسەلاّتی یەمەنەوە و پاشایەتی دەولّەتی عەرەب دەردەکەوێت. وەهەروەها سەتیح خەونەکەی موبزانی ڕاڤە کرد کاتێك کیسرا (خەسرەو ئەنۆ شیروان) بەعبدالمسیحدا ناردی بۆلای واتە عبدالمسیح خەوەکەی کیسرای گێڕایەوە بۆ سەتیح و ئەویش بەدەرکەوتنی دەولّەتی عەرەبی لێك دایەوە. وەهەروەها نەتەوەکانی بەر بەر کاهین گەلێکیان هەبوون کەبەناوبانگترینیان موسای کوڕی صالّحە لەهۆزی بەنی یەفرن و هەندێکیش دەلّێن لەهۆزی غمرت بووە. ئەو پێشگۆیی گەلێکی ڕێك‌و پێکی بەزمانی مەحەلی هەیە کەباسی ڕووداو گەلێکی زۆری کردووە و زۆریەی پێشگۆییەکانی لەبارەی ئەوەوەیە کە هۆزی زناتە لەمەغریبدا دەگەنە پاشایەتی دەولّەتداری و، شیعرەکانی لەنێو هۆزەکاندا بەناوبانگن و خەلّکی ئەو ناوچانە هەندێك جار وەك وەلی ناوی دەبەن و هەندێك کاتیش بەکاهینیان زانیوەو، هەندێکیش لەڕووی باوەڕی تایبەتی خۆیان سەبارەت بەو بەپێغەمبەریان زانیوە و پێیان وابووە کە مێژووی زۆر لەمێژووی کۆچی کۆنترە، خوداش داناترە.

وەهەندێك جاریش هەندێك لەنەوەی نەتەوەکان پشت بەهەوالّی پێغەمبەران لەبارەی ڕووداوەکانی داهاتوو دەبەستن ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر لەسەردەمی ئەماندا پێغەمبەرێك هەبێت هەروەك لەنێو هۆزی بەنی ئیسرائیلدا ئەم بارودۆخە ڕوویدابوو، چونکە پێغەمبەرانێکی یەك لەدوای یەك لەنێویاندا دەردەکەوتن کاتێکیش کەخەلّکی پرسیاری جۆراو جۆریان لەم بارەیەوە دەکرد وەلاّمیان دەدانەوە و باسی داهاتوویان بۆ دەکردن، بەلاّم لەدەولّەتی ئیسلامیدا زۆربەی پێشگۆییەکان کەلەنێوانیاندا ڕوویان دەدا پەیوەستە بەماوەی مانەوەی دونیاو چارەنوسی دەولّەتان ماوەی فەرمانڕەوا بیان و لەم بارەیەوە پشت بەڕووداوەکانی سەرەتای ئیسلامو ئەو فەرموودانە دەبەستن کەلەصەحابەوە گێڕدراونەتەوە، بەتایبەت موسولّمانانی بەنی ئیسرائیل (یەهوود)کەئیسلام بوبون وەك کەعب الاحبار و وەهەبی کوڕی مونەبیە و نمونەی ئەمانە. هەرچەندە هەندێك لەم

پێشگۆییانە لەڕواڵەتی هەواڵە گێڕدراوو گریمانیەکانەوە وەردەگرن. وەبۆ جەعفەری صادق (ع)نمونەی ئەو لەخانەدانی پێغەمبەر پێشگۆیی گەلێکی زۆر ڕوویانداوە کە پاشخانی گێڕەرەوەکانیان، خودا داناترە، کەشف و کەرامەت بووە بەهۆی مەسەلەی ویلایەتەوە وەهەرکات هاوشێوەی ئەوان لەیاران و دوای ئەوان کە ئەولیا نین ئینکاری نەکرێت و لەکاتێکدا پێغەمبەر (ص)فەرموویەتی: لەناوئێوەدا ڕاست گومانەکان هەن، کەواتە ئەوان شیاوترینی خەڵکن بۆ ئەم جۆرە پلە و پایە و کەرامەتە بەخشراوانە، بەڵام لەپاش سەردەمی سەرەتای ئیسلام کاتێك کەخەڵکی ڕوودەکەنە زانست و زاراوەکان و کتێبی حەکیمەکان وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبیو لەم بارەیەشەوە زیاتر پشتیان بەقسەی ئەستێرە ناسان بەستووە، هەروەك چۆن لەپاشایەتی و دەوڵەتان و مەسەلە گشتیەکاندا لەبورجەکان لەمەوالیدەکان و مەسەلەو شتەتایبەتەکان لەتالعەی هەریەکەیان کەبریتی بووە لە شێوەی فەلەك لەکاتی ڕوودانیاندا سودیان لێدەبینی.

ئێستەش سەرەتا ئەو بابەتانەی کەئەهلی خەبەر لەم بارەیەوە هێناویانە باس دەکەینو دواتریش دەست دەکەین بە باسکردنی قسەی ئەستێرە ناسان، بەڵام ئەهلی ئەسەر لەبارەی ماوەی نەتەوەی ئیسلام و مانەوەی دونیا پشت بەکۆمەڵێك ئاسار دەبەستن کەلەکتێبی سوهەیلیدا هاتوون، چونکە ئەو لەتەبەریەوە هەواڵی گێڕاوەتەوە کە ئەوە نیشاندەدات ماوەی مانەوەی دونیا لەسەرەتای نەتەوەی ئیسلامەوە پێنج سەد ساڵ دەبێت. ئەم بۆچوونەش بەدەرکەوتنی ناڕاستبوونی ئەو هەڵوەشاوەتەوە. بەڵگەی تەبەریش لەم بارەیەوە حەدیسێکەکەلەئیبن عەباسەوە بەم شێوەیە گێڕدراوەتەوە: (دونیا هەینیەکە لەڕۆژەکانی هەینی پیامەت)وەئەو بۆ ئەم بابەتە بەڵگەیەکی نەهێناوەتەوە و ڕازی ئەمەش ئەوەیە کەئەندازەگیری ماوەی مانەوەی دونیا بەحیسابی ئەو ڕۆژانەی کە خودا ئاسمان و زەوی دروستکردووە، واتە حەوت ڕۆژ، دەبێت و هەر ڕۆژە و هەزار ساڵە وەك خودای گەورە دەفەرمێت: (هەر ڕۆژێك لەلای خودا وەك هەزار ساڵی دونیا وایەلەو شێوەیەی کەئێوە دەیانژمێرن). س حج ئا ٦٤.

وەدەڵێت تەبەری لەصەحیحدا هاتووە کەپێغەمبەر فەرموویەتی: ئەجەلی ئێوە لەبەرامبەر ئەجەلی ئەوکەسانەی لەپێش ئێوەدا بوون وەك ماوەی نێوان نوێژی عەسرە تاوەکو مەغریب، وەهەروەها فەرموویەتی: من و ڕۆژی دوایی وەك ئەم دووانەن ئاماژەی بەپەنجەی شایەتمان و ناوەڕاستگرد. ماوەی نێوان عەسرو خۆرئاوابوون کاتێك کەسێبەری هەرشتێك دەبێتە دووهێندەی خۆی و نزیکەی نیوەی یەك لەسەر حەوت دەکات کەزیادەی پەنجەی ناوەڕاست لەپەنجەی شایەتمان، هەربۆیە ماوەی ناوبراو نیوەی یەك لەسەر حەوتی هەموو ئەو هەینیەیە کەپێنج سەد ساڵ بێت بەڵگەی ئەمەش فەرموودەکەی پێغەمبەرە (ص)کەفەرموویەتی: هیچ کات خودا بێتوانا نابێت لەوەی کە ماوەی ئەم ئۆمەتە نیوە ڕۆژێك دوا بخات.

ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کەماوەی دونیا لەپێش نەتەوەی ئیسلامەوە پێنج هەزارو پێنج سەد ساڵە لەوەهەبی کوڕی مونەبیهەوە ڕیوایەتکراوە کە ماوەی دونیا بەرلەئیسلام پێنج هەزارو شەش سەد ساڵە، واتە ماوەی ڕۆژگاری ڕابوردوو. وەلەکەعبەوە دەگێڕنەوە کەماوەی دونیا شەش هەزار ساڵە. سوهەیلی دەڵێت: لەحەدیسی ناوبراودا هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کەباسکراوە نیە سەرە ڕای ئەو جیاوازیەشی کەڕوویداوە. هەربۆیە گوتەکەی پێغەمبەر: هەرگیز خودا لەوە بێ توانا نیە... هتد، ئەوە ناخوازێت کە زیادە لەنیوە نەفی کرابێت، بەڵام حەدیسی: ماوەی نێوان من و ڕۆژی دوایی...هتد ئاماژەیە بەنزیکی ڕۆژی قیامەت و ئاماژەیشە بەوەی کە لەماوەی نێوان پێغەمبەرایەتی ئەوو ڕۆژی قیامەتدا بێجگە لەو پێغەمبەرێك نایەت و، شەریعەتێکیش بێجگە لەشەریعەتی ئەو نایەت. دواتر سوهەیلی لەڕێگەی بەڵگەیەکی ترەوە دەستدەکات بەدیاری کردنی ماوەی نەتەوەی ئیسلام، ئەگەر لەلێکۆڵینەوەکەیدا گونجان هەبێت، ئەوەش بریتیە لەوەی کە پیتەپچڕ پچڕەکانی سەرەتای سورەتەکانی قورئان لەپاش لابردنی دووبارەکانیان دەستەواژەی خوارەوە پێکدەهێنن: الم یسطع نص حق کره، ئەوکات ژمارەیان بەپێی حیسابی ڕستەکان بەدەستهێناوە کەبەرابەرە لەگەڵ ژمارەی حەوت سەد و سێداوە، ئەم ژمارەشی

خستووەتە سەرئەو ماوە یەی کە لەکۆتا هەزار ساڵی بەر لەپێغەمبەرایەتیدا ڕابوردووە و کۆی ئەوانی بەماوەی نەتەوەی ئیسلام هەژمار کردووە.

سوهەیلی دەڵێت: دورنیە کەئەم حیسابە لەپێداویستی و سودەکانی پیتە ناوبراوەکان بێت و ئێمەش دەڵێین بوونی ئەو (بەپێی گووتەی سوهەیلی)(دوورنیە)ئەوە ناخوازێت کەدەربکەوێت و، نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە بتوانین متمانەی پێبکەین. ئەوەی کەسوهەیلی بەوەها موحاسەبەیەك ناچار کردووە داستانێکە کەلەکتێبی (سیر)ی ئیبن ئیسحاقدا لەحەدیسەکەی هەردوو کوڕی ئەختەب لەدوو کەس لەئەحبارەکانی یەهوددا هاتووە، کەبریتیە لە وەی کەئەبو یاسر و حەیی برای (هەردوو کوڕەکەی ئەختەب)کاتێك لەبارەی پیتەپچڕ پچڕەکانی قورئان (الم)یان بیست و، بەحیسابی ڕستەکان هەژماریان کردن ژمارەی حەفتاو یەك بەدەستهات بەماوەی سەردەمی ئیسلام تەئویلیان کرد و، (ئەودووئەحبارە)ماوەکەیان بەنزیك یان کەم هەژمار کرد دواتر حەیی چوویەلای پێغەمبەر (ص)پرسی ئایا سەرەڕای ئەم پیتانە پیتگەلێکی ترهەن؟ لەوەڵامدا فەرمووی: (المص)و (الر)و (المر)، ئەوکات ژمارەی دوسەدو حەفتا و یەك بەدەستهات و لەئەنجامدا حەیی ماوەکەی بەدرێژتر هەژمار کرد و گووتی: ئەی محمد کارەکەی تۆ بەلای ئێمەوە ئاڵۆزە بەجۆرێك کەنازانین ئایا زۆر یان کەمت داناوە.

دواتر لەلای ئەو ڕۆیشتن و ئەبو یاسر پێی گووتن: ئێوە نازانن لەوانەیە ئەو هەموو ژمارەکانی مەبەست بێت کەحەوت سەد و چوار ساڵە. ئیبن ئیسحاق دەڵێت: لەم کاتەدا فەرموودەی خودای گەورە بەم شێوەیە نازڵ بوو: لەقورئاندا ئایەتگەلێکی موحکەم هەن (ئەو ئایەتانەن کەماناکەیان ڕوون و ئاشکرایە وەك ئایەتەکانی ئەحکام)کەبنەڕەتی کیتابن و هەندێکی تریش موتەشابهن (واتە ئەو ئایەتانەن کەیەك مانا زیاتر یان ماناکەیان دیار نیە وەك ئایەتی: (الرحمن علی العرش استوی)). لەم داستانەش بەڵگەیەك بەدەست ناکەوێت کەئەوە بگەیەنێت ئەمە ژمارەی نەتەوەی ئیسلامە، چونکە ماناکانی ئەم پیتانە لەسەر ژمارە ناوبراوەکان نەسروشتیە و نەئەقڵی و بەڵکو تەنها لەسەر ڕێککەوتنو

دەستەواژە وەستاوە کەپێی دەڵێن حیسابی ڕستەکان کەئەم دەستەواژەیە زۆر کۆن‌و بەناوبانگە، بەڵام کۆنی دەستەواژە کەی نایکاتە بەڵگە سەرەڕای ئەمەش ئەبو یاسرو حەیی، لەو کەسانەنین کە بتوانرێت بۆچوونیان لەم بارەیەوە بکرێتە بەڵگە و هەم لەزانایانی یەهود نایەنە ئەژمار. لەزانستی شەریعەت و فیقهی کتێب و مەزهەبی خۆشیان ئاگادار نەبوون بەڵکو هەروەك گەلی نەخوێندەوار لەنێو هەرگەلێکدا دەستدەکەن بەشوێنکەوتنی کوێرانەی ئەم جۆرە حیساباتانە و، ئەوانیش وەها حیسابێکیان بەیەکەوە بەستووەتەوە. کەواتە سوهەیلی بەڵگەیەکی نیە لەسەر بانگەشەکەی. لەمەزهەبی ئیسلامدا بەتایبەت لەبارەی پێشگۆیی دەوڵەتەکانی بەڵگەگەلێکی گشتی لەحەدیسەکاندا هاتوون کەئەبو داوود بەڕیوایەت لەحوزەیفەی کوڕی یەمانەوە، ئەویش لەڕێگەی شێخی خۆیەوە محمدی کوڕی یەحیای زەهەبی بەم شێوەیە تەخریجی کردووە: لەسەعیدی کوڕی ئەبی مەریەم لە عبداللەی کوڕی فروخ لەئوسامەی کوڕی زەیدی لەیسی لەئیبن لوقەیتەی کوڕی زویب ئەویش لەباوکیەوە ڕیوایەتکراوە کەحوزەیفەی کوڕی یەمان گوتوویەتی: سوێند بەخودا نازانم ئایایارانم بیریان چووەتەوە یان خۆیان لەلەبیر چوونەوە دەدەن.

سوێند بەخودا پێغەمبەر (ص)هیچ سەرکردەی گروپێکی تاوەکو کۆتایی دونیا، کەشوێنکەوتووانی دەگەنە سێسەد و زیاتریش وازی لێنەهێناوە مەگەر ناوی خۆیی و هۆزەکی پێگوتوین. ئەبو داوود لەم بارەیەوە قسەیەکی نەکردووە و ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئەوەمانکرد کە ئەو لەپەیامەکەی خۆیدا گوتوویەتی: لەکتێبەکەمدا لەبارەی هەرشتێکەوە بێدەنگ بووبم ئەوە شتێکی باش بووە. ئەم حەدیسەش باوادابنێین کەصەحیحە، بەڵام موجمەلە. لەباسی ئیجمال و دیاری کردنی موبهەماتدا پێویستمان بەبەرهەمگەلێکی تر هەیە کەسەنەد گەلێکی باشیان هەبێت. ئەم فەرموودەیە لەکتێبگەلێکی تردا بێجگە لە کتێبی السنن بەشێوەیەکی جیاواز هاتووە هەروەك چۆن لەصەحیحەیندا ڕیوایەتەکەی حوزەیفە بەم شێوەیە: پێغەمبەر لەناو ئێمەدا خوتبەیەکی

خوێندەوە و هیچ شتێکی لەبارەی ڕۆژی دواییەوە کەڕوودەدات نەهێشتەوە و هەمووی باسکرد و، هەندێك بەباشی لەبەریان کردو هەندێکیش بیریان چوویەوە ئەو صەحابانەش ئەمەیان دەزانی، کۆتایی.

وەلەفزەکەی بوخاری بەم شێوەیە: هیچ شتێکی تاوەکو ڕۆژی دوایی نەهێشتەوە مەگەر ئەوەی کەلەبیری چووبێت. وەلەکتێبەکەی ترموزیدا حەدیسێك بەڕیوایەت لەئەبو سەعیدی خودریەوە بەم جۆرە هاتووە: پێغەمبەر (ص)ڕۆژێکیان لەگەڵ ئێمەدا نوێژی عەسری دەکرد لەپاشان هەستایەوە و، هیچ شتێکی نەهێشتەوە کەتاوەکو ڕۆژی قیامەت ڕوودەدات و هەمووی باسکرد و بێجگە لەوەی کەهەندێك بەباشی دەرخیان کرد و هەندێکیش لەبیریان چوویەوە، کۆتایی.

هەموو ئەم حەدیسانە حەمل دەکرێنە سەر ئەوەی کە کەلەهەردوو صەحیحەکەی بوخاری و موسلیم دا، تەنها لەبارەی ئاژاوە و نیشانەکانی ڕۆژی دواییەوە فەرموودەیان تێدا تۆمار کراوە. وەلەشارع (پێغەمبەر)هەرئەم وەعدانە دەدرێن لەم جۆرە مەسەلە گشتیانەدا ئەم بەشەزیادەش کەتەنها ئەبو داوود هێناویەتی شاز و مونکیرە. سەرە ڕای ئەمەش پێشەوایانی زانستی حەدیس لەپیاوەکانیدا جیاوازیان هەبووە هەر وەك چۆن ئیبن ئەبو مەریەم لەبارەی ئیبن فروخەوە دەڵێت: حەدیسەکانی مونکیرن. وەبوخاریش دەڵێت: لەحەدیسەکانیدا هەم مەعروف و هەمیش مونکیر بەرچاو دەکەون. ئیبن عەدی دەڵێت: حەدیسەکانی مەحفوز نین، بەڵام ئوسامەی کوڕی زەید هەرچەندە لەصەحیحەیندا بەناوی ئەوەوە حەدیس تەخریج کراوە ئیبن موعین ئەوی بەمتمانە پێکراو زانیوە، بەڵام بوخاری وەك شاهێد حەدیسی لێوە تەخریج کردووە یەحیای کوڕی سەعید و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەویان بەلاواز زانیوە و ئەبو حاتەم دەڵێت حەدیسەکەی دەنوسنەوە، بەڵام نایکەنە بەڵگە.

وەئیبن قەبیصەی ئیبن زوئەیب مەجهول و نادیارە هەربۆیە ئەو بەشە زیادەیەی کەئەبو داوود لەم حەدیسەدا ڕیوایەتی کردووە بەپێی لایەنە باسکراوەکان لاواز دەبێت،

سەرەڕای ئەوەی لەبەر ئەو شتانەی کەباسمانکردن دەبێتە شازیش. هەندێکجاریش لەبارەی پێشگۆی دەوڵەتانەوە بەتایبەت پشت بەکتێبەکەی جەعفەر دەبەستن و، پێیان وایە کەلەو کتێبەدا زانستی هەموو ئەو شتانە لەڕێگەی حەدیسەکان یان ئەستێرە ناسیەوە ڕوونکراوەتەوە و لەمەش زیاتر قسە ناکەن و لەبارەی ئەصڵی کتێبەکە و سەرچاوەکەیەوە هیچ زانیاریە کیان نیە. دەبێت ئەوەش بزانین کەئەصڵی کتێبی جفر ئەمەیەکە هارونی کوڕی سەعیدی عیجلی سەرکردەی گروپی زەیدیە کتێبێکی هەبوو کەلەجەعفەری صادقەوە دەیگێڕایەوەو لەو کتێبەدا مەعریفەی ئەو ڕووداوانەی کەبەشێوەیەکی گشتی بۆ خانەدانی پێغەمبەرو بەتایبەت بۆ هەندێك لەکەسایەتیەکانی ئەو خانەدانە ڕوو دەدەن تۆمار کرابوون.

پێشگۆییەکان لەجەعفەری صادق (ع)و گەورە پیاوانی تری ئەو خانەدانە لەڕێگەی کەرامەت و کەشفەوە کەتایبەتی ئەم جۆرە ئەولیایانەیە بەدی هاتووە، کتێبی ناوبراو لەلای جەعفەر بوو لەسەر پێستی گوێرەکە نوسرابوو هارونی عیجلی بابەتەکانی لەوە وە ڕیوایەت دەکرد و لەنوسخەیەکدا دەینوسی و، ئەویان بەناوی ئەو پێستەی کەلەسەری نوسرابوو دەخوێندەوە چونکە جفر لەمانەوانیدا بەمانی ۱یی دێت و کەم کەم ئەم ناوە بەو کتێبەوە نراوە. لەو کتێبەدا تەفسیری قورئان و ماناگەلێکی غەریب و نامۆ کەلەناخیدا سودیان لێوەر دەگیرا بوونیان هەبوو لەجەعفەری صادقەوە دەگێڕنەوە، بەڵام ڕیوایەتەکانی ئەو کتێبە پەیوەست نین بەیەکەوە و، خودی کتێبەکە نەبینراوە بەڵکو وشە و هەواڵگەلێکی نامۆ کەپشتیان بەهیچ بەڵگەیەك نەبەستووە تێیدایە و لەنێو خەڵکیشدا بلاوە. ئەگەر دانەپاڵی ئەو کتێبە بۆلای جەعفەری صادق ڕاست بێت بێگومان باشترین سەرچاوە دەبێت ئیتر بدرێتە پاڵ خۆی یان پیاوانی گەورەی خزم و نزیکانی چونکە ئەوان لەخاوەنانی کەرامەتن و، ئەوەش ڕاستە کە جەعفەری صادق هەندێك لەخزمانی بەرلەوەی کەڕووداوەکان بۆیان ڕووبدەن ئاگاداری کردوونەتەوە و پێشگۆییەکانی وەڕاست دەگەڕان. ئەو یەحیای کوڕەمامی خۆی زەیدی لەلەناوچوونێك

کەدووچاری دەبوویەوە ئاگادار کردەوە، بەڵام کوڕەمامەکەی بەقسەی نەکرد و سەرپێچی لێکرد و دەستی دایە کودەتا و سەرئەنجام لەگوزەکاندا کوژرا، هەروەك بەسەرهاتەکەی بەناوبانگە. هەرکات کەسانێك بێجگە لەخانەدانی پێغەمبەر (ص)خاوەنی کەرامەت بن گومانی تێدا نیە کە ئەو خانەدانە کەبەزانست و زانیاری و دینداری ناسراون و ئتگاداری هەواڵەکانی پێغەمبەرایەتین ڕەحمەت و چاودێر خودایان لەگەڵدایە کەواتە ئەولا ترن بۆ کەشف و کەرامەت بەهۆی ئەو ئەصڵە کەریمەی کە لقەکانی گەواهیدەرن لەسەری.

وەهەندێك جاریش لەنێو خانەدانی پێغەمبەردا (ص)ڕاستگومانی پێشگۆیی گەلێکی زۆر دەگێڕدرێنەوە بەبێئەوەی بدرێنە پاڵ جفر لەمێژووی دەوڵەتی عبیدیەکاندا (فاتیمیەکان) لەم جۆرە پێشگۆییانە زۆر ڕیوایەتکراون، لەوانەش ئەو داستانەیە کەئیبن الرقیق لەبارەی چاوپێکەوتنی ئەبو عبداللەی شیعی لەگەڵ عبداللەی مەهدی و کوڕەکەیدا محمد حبیب گێڕاویەتەوە کەچ شتێکی بەو گوتووە و، بەچ شێوەیەك ئەوی بەرەو لای ئیبن حوشب کەیەکێکە لەبانگخوازان و موبەلیغانی خۆی لەیەمەن ناردووە و ئەویش لەڕووی ئەو زانستەی کەپێی دراوە کەدەوڵەتی فاتیمیەکان لەمەغریبدا دادەمەزرێت و، ئیبن حوشبی بۆ بڵاو کردنەوەی بانگەواز و بیرو باوەڕەکانی مەهدی ناردووە بۆ ئەو سەرزەمینە.

وەهەروەها ئیبن الرقیق نوسیویەتی: لەبەر ئەوەی کە عوبەیدوالله لەپاش پایەدار بوونی دەوڵەتی فاتیمیەکان لەئەفریقادا، شاری مەهدیەی بنیاتنا و گووتی: ئەم شارەم لەو ڕووەوە بنیاتناوە کە خانەدانی فاتیمیان لەکاتی سەختی و نارەحەتیەکاندا بیکەنە پەناگەی خۆیان، لەپاشان شوێنی تێکشکانی صاحب الحماری (نازناوێکی گاڵتەجاڕ بووە کەفاتیمیەکان بەدوژمنەکانیان گوتووە)لەشاری مەهدیە نیشانی خزم و نزیکانی خۆیدا. دواتریش ئیسمعیل منصور نەوەی عوبەیدوالله لەم پێشگۆییە ئاگادار بوبویەوە و، کاتێك صاحب الحمار ئەبو یەزید ئەوی لەمەهدیەدا گەمارۆدا لەبارەی ئەو شوێنەوە پرسیاری لە خزم و نزیکانی خۆی دەکرد و، تائەوەی کەهەواڵی پێگەیشت کە ئەبو یەزید گەشتووەتە ئەو شوێنەی کەئەم دەیەوێت بەنهێنی سودی لێوەربگرێت، ئەوکات ئیسمعیل

لەسەرکەوتنی خۆی دڵنیا دەبێتەوە و لەشار دەردەچێت و دووژمن دەشکێنێت و تاوەکو ناوچەی زاب وەدوویان دەکەوێت و لەپاش گرتنی دووژمن سەرکردەکەیان دەکوژێت، نمونەی ئەم هەواڵانە لەبارەی ئەم خانەدانەوە زۆرو زەوەندن. ئەستێرەناسانیش پێشگۆییە تایبەتەکانیان سەبارەت بە دەوڵەتان پشت بە ئەحکامە ئەستێرەییەکان دەبەستن هەروەك چۆن لەکاروبارە پاشایەتی و دەوڵەتداریەکاندا پشتیان بە قیرانەکان بەتایبەت لەنێوان عەلەویین (واتە زوحەل و موشتەری)بەستووە، واتە ئەم دووئەستێرەیە هەربیست ساڵ جارێك قیران دروست دەکەن واتە یەکبوون پێکدەهێنن.

لەپاشان قیران دەگەڕێتەوە سەربورجێکی تر لەتەسلیس کەدەکاتە هەموو بورجەکان بەتایبەت لای دەستی ڕاستی. ئەوکات لەدوای ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر بورجێکی تر و تاوەکو وای لێدێت لەیەك سێگۆشەدا دوانزەجار دووبارە دەبێتەوە و، هەروەك چۆن بورجی سێ لانەی ئەو هەرشەست ساڵ جارێك کامڵ دەبێت و لەپاشان دەگەڕێتەوە و لەماوەی شەست ساڵی تردا کامڵی دەکات، دیسانەوە جاری سێیەم و چوارەم دەگەڕێتەوە و هەروەك چۆن سێگۆشەکە بەهۆی دوانزە جار دووبارە بوونەوە و چوار گەڕانەوە لەماوەی دووسەد و چل ساڵدا کامڵ دەبێت، گواستنەوەی لەهەربورجێکدا بەسێ دانەیی دەستی ڕاستە و لەهەر سێگۆشەیەکەوە دەگوازرێتەوە ئەو سێگۆشەیەی کەلەدواوەیەتی، واتە: بەبورجی کۆتا قیران کەدوو سێگۆشە لەپێشیەوە هاتوون دەگوازرێتەوە و قیرانی عەلەویین دەبێت بەسێ قیرانی گەورە و بچوك و مامناوەندەوە: گەورە بریتیەلە کۆبوونەوەی عەلەویین لەیەك دەرەجەی فەلەکدا تائەوەی کەلەپاش نۆسەد و شەست ساڵ ڕۆشتنی یەکجار دەگەڕێتەوە بۆی.

وەمامناوەندیش بەو جۆرەیە کەعەلەویین لەهەر سێگۆشەیەکدا دوانزەجار ئیقتیران وەدی دەهێنێت و لەپاش دووسەدو چل ساڵ دەگوازرێنەوە بۆ سێگۆشەیەکی تر. وە بچوکیش بریتیە لەئیقتیرانی عەلەویین لەیەك بورجدا و لەپاش بیست ساڵ لەبورجێکی تردا لەسەر سێگۆشەی دەستی ڕاست و لەدەرەجە یان دەقایقی هاوشێوەی ئەو دەبێت.

نمونەکەشی بەم شێوەیە کەڕوودانی قیران لەیەکەمین دەقیقەی حەمل دایە لەپاش بیست ساڵ لەیەکەم دەقەدا لەقەوس و لەپاش بیست ساڵی تر لەشێردایە. هەموو ئەمانەش ئاگری و قیرانی بچووکە دواتریش لەپاش شەست ساڵ دەگەڕێتەوە سەر ئەو حەملە و، پێی دەڵێن دەوری قیران و گەڕانەوەی قیران لەپاش دووسەدو چل ساڵیش لەئاگرینە وە دەگوازرێتەوە بۆ خاکی و، چونکە بورجە خاکیەکان لەپاش ئاگرینەکان دەگوازرێنەوە ئاویەکان و ئەمەش قیرانی مام ناوەندیە دواتر بۆ هەوایی و لەپاشانیش بۆ ئاوی دەگوازرێنەوە. ئەوکات لەماوەی نۆسەد و شەست ساڵدا دەگەڕێتەوە سەر یەکەمین حەمل و ئەوەش قیرانی گەورەیە. ئەم قیرانانەش بەڵگەن لەسەر شتانێکی گەورەی وەك لەناوچوونی میلەتان و دەوڵەتان و گوازرانەوەی پاشایەتی لەنەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیە کی تر. قیران و بورجی مام ناوەندی دەرکەوتنی سەرکەوتن خوازان و خوازیارانی پاشایەتی دەگەیەنێت، قیرانی بچووکیش مانای ئاشکرابوونی سەرکێشان و موبەلیغان و وێرانی شارو دێهات و ئاوەدانیەکان دەگەیەنێت.

لەماوەی ئەم قیرانانەدا قیرانی نحسین لەبورجی سەرەتاندا لەهەر سی ساڵ جارێکدا یەك جار ڕوودەدات پێی دەڵێن چوارەم. بورجی سەرەتان تالیعی جیهانە و تێیدا دەرکەوتنی زوحەل و دابەزینی مەریخە ئەمەیە کەئەم قیرانانە مانی گەورەترین ئاشوب و خوێنرێژی و دەرکەوتنی سەکەشان و کودەتا و پەتاو قات و قڕیەکان دەگەیەنێت و، بەردەوام بوون یان کۆتایی هاتنی ئەم بارودۆخە پەیوەستە بەئەندازەی بەختەوەری یان شومی نحوستەوەیە لەکاتی قیرانی ئەودا و بەئەندازەی ڕۆشتنی بەڵگەیە تێیدا. جراشی کوڕی ئەحمەدی حاسیب (بیرکاری زان)لەکتێبێکدا بەناوی (نظام الملك)دایناوە، دەڵێت: گەڕانەوەی مەریخ بۆ دووپشك لەناو نەتەوەی ئیسلامدا کاریگەریەکی گەورەی هەیە چونکە دەلیل و ڕێنمای نەتەوەی ناوبراو بووە، هەروەك چۆن لەدایك بوونی پێغەمبەر لەکاتی قیرانی عەلەوییندا لەبورجی دووپشك دا بووە کەواتە هەرکاتێك بگەڕێتەوە ئەویٚ ئەوا بۆ خەلیفەکان پەرێشانی و نیگەرانی ڕوویداوە لەنێو زانایان و، دیندارانیشدا

نەخۆشی زۆر بووە و خراپ حاڵی ڕووی تێکردوون هەرچەندە هەندێك لەپەرستگاکان ڕووخێنراون و، هەربۆیە دەگوترێت کەکوژرانی علی و مەروان لەخانەدانی ئەمەویەکان موتەوەکیل لەخانەدانی عەباسیەکان لەم کاتەدا ڕوویانداوە، هەربۆیە ئەگەر حوکمە باسکراوەکان لەگەڵ ئەحکامی قیرانات ڕەچاو بکرێن ئەنجامەکە لەوپەڕی پایەداریدایە. شازانی بەڵخی گوتوویەتی: کەسەردەمی مانەوەی نەتەوی ئیسلام سێسەد و بیست ساڵ دەبێت و کەئێستاکە ئەم قسەیە بەدرۆ کەوتووەتەوە هەڵە بوونی سەلمێنراوە. ئەبو مەعشەر گوتوویەتی: لەپاش تێپەڕینی سەدو پەنجا ساڵ لەسەردەمی ئیسلام جیاوازی گەلێکی زۆر ڕوودەدەن ئەم قسەیە ڕاست نەبووە، جراش گوتوویەتی: لەکتێبی پێشیناندا بینیومە کەئەستێرە ناسان سەڵتەنەتی عەرەب و هاتنی ئیسلامیان بە ئەنۆشیروان گوتووە، بەڵگەشیان زوهرەیە کەلەشرفی خۆیدا بووە کەواتە پاشایەتی چل ساڵ تێیاندا دەمێنێتەوە. وەئەبو مەعشەر لەکتێبی قیراناتدا هێناویەتی کەهەرکات قیسمەت (واتە شوێنی تەسیر بگاتە ئاستی هەرئەستێرەیەك پێی دەڵێن دەرەجە قیسمەت)، بگاتە بیست و حەوت تێیدا شرفی زوهرە هەبێت و لەهەمان کاتدا قیران لەبورجی عەقرەبدا ڕوویدات، کەدەلیلی عەرەبە لەم کاتەدا دەوڵەتی عەرەب دەردەکەوێت و، پێغەمبەرێکیان لێ پەیدا دەبێت کەهێزو دەسەلاتی پاشایەتیەکەی بەئەندازەیەکە کەلەدەرەجەکانی شرفی زوهرەدا دەمێنێتەوە، کە دەکاتە یانزە دەرەجە لەبورجی حوت (نەهەنگ) ماوەکەی شەشسەدو دە ساڵە، دەرکەوتنی ئەبو موسلیمیش لەکاتی گۆڕانی زوهرەدا بوو کەوتنی قیسمەت لەسەرەتای حەمل دا خاوەنی بەختی موشتەریە.

یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کندی گوتوویەتی: کەماوەی نەتەوەی ئیسلام دوای شەشسەد و نەوەد و سێ ساڵ کۆتایی دێت، چونکە زوهرە لەکاتی قیرانی نەتەوەی ئیسلامدا لەهەژدە دەرەجەو چل و نۆ دەقەدایە و دەقەکانیشی هەریەکەیان شەشسەدو نەوەد و سێ ساڵە. یەعقوب گوتوویەتی ماوەی نەتەوەی ئیسلام بەلای حەکیمەکانەوە گونجاوە لەگەڵ پێشبینی ناوبراو دا و ئەو پیتە پچڕ پچڕانەشی کەکەوتوونەتە سەرەتای

سورەتەکانەوە بەلابردنی بەردەوام و، ئیعتیباریان بەپێی ڕستەکان یارمەتی ئەمان دەدات. منیش دەڵێم ئەمە هەمان ئەو بۆچوونەیە کەسوهەیلی باسی کردووە و، لەوانەیە کەسەرچاوەی سوهەیلی هەروەك باسمانکرد پێشەکیەك بێت بۆ قسەکەی کندی.

جراش دەڵێت: پرسیاریان لەهورموزد ئافریدی حەکیمیان لەبارەی دەورانی سەڵتەنەتی ئەردەشیرو نەوەکانیەوە کرد، لەخانەدانی ساسانیەکان لەوەڵامدا گووتی: دەلیلی پاشایەتی ئەو موشتەریە کەلە کەلەشرفی خۆیدا بووە هەربۆیە موشتەری باشترین و درێژترین سالەکان بەو دەبەخشێت واتە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو خانەدانە چوارسەدو بیست و حەوت ساڵ بەردەوام دەبێت. دواتر نۆبەی فەرمانڕەوایی زوهرە دێتە پێشەوە ئەویش لەشرفی خۆیدادەبێتو ئەوەش دەلیلی عەرەبە و ئەوانیش دەگەنە دەسەلأت، چونکە تالیعی قیرانی میزان (تەرازو)خاوەنەکەی زوهرەیە لەکاتی قیرانی زوهرەدا لەشرفی خۆیدادەبێتو ئەوە نیشان دەدات کەعەرەب هەزارو شەشسەد ساڵ فەرمانڕەوایی دەکەن.

خەسرەو ئەنۆشیروان لەبوزر جەمهەری حەکیم و وەزیری خۆی لەبارەی چوونە دەرەوەی پاشایەتی لەدەستی ئێرانیەکان و، کەوتنە دەستی جەنگاوەران پرسیاری کردو بوزری جەمهەریش گووتی دامەزرێنەری پاشایەتی عەرەب لەپاش چل و پێنج ساڵ لەتێپەڕینی پاشایەتی ئەنۆشیروان لەدایك دەبێت و، خۆرهەلأت و خۆرئاوا داگیر دەکات و لەو سەردەمەدا موشتەری چارەنوسی کارەکان بەزوهرە دەسپێرێت و بورجەکە لەهەواییەوە دەبێتە دووپشك، کەڕەنگی شینە و ئەوەش دەلیلی عەرەبە. لەدوای ئەم بەڵگانەوە ماوەی سوڕانەوەی زوهرە حوکم دەکات کەبریتیە لەهەزار و شەشسەد ساڵ دەبێت. وەخەسرەو پەرویز لەم بارەیەوە پرسیاری لە ئلیوسی دانا کرد، ئەویش وەك قسەکەی بوزری جەمهەر وەڵامی دایەوە. توفیلی ڕۆمی ئەستێرەناس لەسەردەمی ئەمەویەکاندا گوتوویەتی: کەدەوڵەتی ئیسلام تاوەکو ماوەی قیرانی گەورە نۆسەد و شەست ساڵ دەمێنێتەوە و هەرکاتیش قیران بگەڕێتەوە بورجی دووپشك هەروەك چۆن

لەسەرەتای نەتەوەی ئیلامدا لەهەمان ئەو بورجەدا بوو، بارودۆخی ئەستێرەکان لەو شێوەیەی کە لەقیرانی نەتەوەی ئیسلامدا هەیانبووە دەگۆڕێت و، ئەو کات یان دەسەلاتی ئیسلام دووبارە بەهێز دەبێتەوە وەیان ئەحکامە ئەستێرەناسیەکان نویێ دەبنەوە کەهۆکارن بۆ پێچەوانە بوونەوەی ئەم پێشبینیە.

ججراش دەڵێت: زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە وێرانی دونیا بەهۆی زوربوونی ئاوو ئاگرەوە ڕوودەدات هەروەك چۆن هەموو بوونەوەرانی پێکهاتە (تکوینی) لەگیاو حەیوانات و جەمادات) لەناو دەچن و، ئەوەش کاتێك دەبێت کە قلب الاسد بوورجی شێر بیست و چوار دەرەجە ببڕێت و ئەم بیست و چوار دەرەجەیەش سنوری مەریخە، ڕوودای ناوبراو لەپاش تێپەڕینی نۆسەد و شەست ساڵ دەبێت. جراش گوتوویەتی: کەپاشا لەئەبلستان واتە لەغزنەوە لەو دیاریانەی کەناردنی بۆ مەئمون حەکیمەکەی خۆشی دوبان وەك یادگاری ناردەلای ئەو لەجەنگەکانی مەئمونو ئەمینی برایداو لەدامەزراندنی لیواکاندا بەپێی یاساکانی ئیختیارات هاوکاری دەکرد.

مەئمون زانست و حیکمەتی ئەوی زۆر بەگرنگیەوە وەردەگرت و، لەبارەی ماوەی فەرمانڕەوایی خانەدانی خۆیەوە لەوی پرسی: دوبانیش لەوەلامدا گووتی کەدەوڵەتداری لەنوەی ئەودا نامێنێتەوە دەکەوێتە دەستی نەوەکانی براکەی و سەرئەنجام دیلمان کەنەتەوەیەکی غەیرە عەرەبن دەسەلات پەیدا دەکەن و، دەوڵەتێکی باش دادەمەزرێنن کە پەنجاساڵ دەخایەنێت و دواتریش فەرمانڕەوایی ئەوانیش بەرەو لاوازی دەچێت و، تورکەکان لە باکورەوە دەردوکەون و تاوەکو شام و فورات داگیر دەکەن و وولاتی ڕۆمیش دەگرن و دواتر ئەوەی خودا ویستی لەسەری بێت ڕوودەدات. مەئمون پرسی ئەم پێشگۆییان لەکوێوە دەزانی؟ گووتی لەکتێب و حوکمەکانی صصەی کوڕی داهری هیندی کەشەترەنجی داهێناوە. منیش دەڵێم ئەو تورکانەی کەلەپاش دیلمانەوە ئاماژەی پێکردوون سەلجوقیەکانن کەلەسەرەتای سەدەی حەوتەمدا لەناو چوو.

جراش دەڵێت: گواستنەوەی قیران بۆ سێگۆشەی خاکی لەبورجی نەهەنگدا لەساڵی هەشت سەد و سی وسێدا یەزدگردیە و دواتر دەگوازرێتەوە بورجی دووپشك و هەمان ئەو جێیەی کەقیرانی نەتەوەی ئیسلام لەساڵی ٥٣ ی کۆچیدا بووە، وە دەڵێت ئەوەی کەلەحوتدا ڕوویداوە بەسەرەتای گواستنەوە دەژمێردرێت وەبەڵگەکانی نەتەوەی ئیسلام لەو گواستنەوە کەلەدووپشکدا ڕوویداوە دەردەهێنرێت. وەهەروەها دەڵێت کەگۆڕانی ساڵی یەکەم لەقیرانی یەکەم لەسێگۆشە شینەکاندا لەدووەمی ڕەجەبدا ساڵی هەشتسەدو شەست و هەشتە و لەم بارەیەوە بەپێی پێویست قسەی نەکردووە، بەڵام سەرچاوەی ئەستێرەناسان لەبارەی ئەو دەوڵەتەی بەتایبەت کەدەکەوێتە قیرانی ناوەڕاستەوە بریتیە لەچۆنیەتی فەلەك لەکاتی ڕوودانی ئەودا چونکە بەبیرو باوەڕی ئەمان لەم قیرانانەدا بەڵگە هەیە لەسەر نیشاندانی ڕوودانی ئاوەدانی و دروستبوونی دەوڵەتان و ناوی پاشاکان و تەمەنیان و ئاین و مەزهەب و داب و نەریتیان لەژیان و جەنگەکاندا، هەروەك چۆن ئەبو مەعشەری بەڵخی لەکتێبەکەی خۆیدا بەناوی قیراناتەوە باسی کردووە. هەندێك جاریش ئەم بەڵگانە لەقیرانە بچوکەکانیش وەر دەگرن ئەوەش کاتێکە کەئەوسەت نیشانیان بدات، ئەوکات پێشبینی لەبارەی دەوڵەتانەوە لەم قیرانانە دەردەهێنن. یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کندی، ئەستێرەناسی ڕەشید و مەئمون کتێبێکی لەبارەی ئەو قیرانانەی کەلەنەتەوەی ئیسلامدا ڕوودەدەن نوسی کەشیعەکان بە (جفر)ناوی دەبەن و، دەیدەنە لای جەعفەری صادق واتە بەدانراوی ئەوی دەزانن هەروەك چۆن دەڵێن لەو کتێبەدا ڕووداوەکانی پەیوەست بەبەنی عەباسی تێدا پێشبینی کراوە، وەك سەرەتاو کۆتایی و ماوەی تەمەنی دەوڵەتی ناوبراو ڕووداوی بەغداد (کەبەهۆی سوپای هۆلاکۆوە لەساڵی ٦٥٦ ك بەرابەربە ١٢٥٨ز وێرانکرا)، ئاماژەی پێکردووە باسی ئەوەیشی کردووە کەڕووداوی ناوبراو لەنیوەی سەدەی حەوتەمدا دەبێت و، بەلەناو چوونی ئەو نەتەوەی ئیسلامیش لەناو دەچێت، بەڵام ئێمە بەهیچ شێوەیەك نەمانتوانیوە ئەم کتێبە وەدەست بخەین و کەسیشمان نەبینی کەئاگاداری لێی هەبێت.

لەوانەیشە کتێبی ناوبراو وەك هەموو ئەو کتێبانەی تر کەهۆلاکۆ لەکاتی داگیر کردنی بەغدادا لەناوی بردن، ئەویش لەناو چووبێت کرابێتە ناوئاوی دیجلەوە و فەوتابێت. لەمەغریبیشدا بەشێك لەم بارەیەوە هەیە کەدەیدەنەلای کتێبی ناوبراو پێی دەڵێن جفری بچووك اەرواڵەتدا کتێبەکە بۆ خانەدانی موئمن دانراوە چونکە مێژووی پاشایانی پێشووی ئەو خانەدانەی بەدوور و درێژی تێدایەو، پێشگۆیەکانی تایبەت بە ڕووداوەکانی ڕابوردوو گونجاوە لەگەڵ واقیعدا، بەڵام ئەوەی کەلەبارەی داهاتوەوە گوتراوە درۆیە. لەپاش مەرگی کندی لەدەوڵەتی عەباسیەکاندا ئەستێرەناسانێك دەرکەوتن و چەند کتێبێکیان لەو بارەیەوە نوسی و بەگەڕانەوە بۆ مێژووی ئیمامی تەبەری لەبارەی هەواڵەکانی مەهدیەوە کەلەئەبو بەدیل یەکێك لە هەڵبژێردراوەکانی نمەك پەروەردەی دەوڵەتی عەباسیە دەگێڕێتەوە ئەم حەقیقەتە ئاشکرا دەکات. ئەبو بەدیل دەڵێت کاتێك ڕەبیعو حەسەن لەگەڵ ڕەشیددا لەسەردەمی باوکیدا غەزاو جیهادیان دەکرد منیان بانگکردو منیش لەنیوەشەودا چووم بۆلایان، کتوپڕ بینیم یەکێك لەکتێبەکانی دەوڵەت واتە کتێبی پێشگۆیی لەلای ئەوانەو، سەیردەکەم ئەوەی تێدایە کەماوەی فەرمانڕەوایی مەهدی دەساڵە. گووتم ئەم کتێبە هەمیشە لەمەهدی شاراوە نابێت ئەمەلەکاتێکدا ئەوەی کەلەماوەی دەوڵەتەکەی ئەو تێپەڕی بوو هەرکات ئاگاداری ئەوە بێتەوە وەك ئەوە وایە هەواڵی مەرگی پێبدەن. گووتیان ئەی چارەچیە؟

منیش عەنبەسە کەیەکێك بوو لەمەوالیەکانی خانەدانی بدیل بانگم کردوو داوام لێکرد کەئەو دێڕەی کەباسی ئەو دەساڵەی تێدایە بیگۆڕێتو بیکات بەژمارە چل، خودا بەشاهێد دەگرم بەجۆرێك نوسیەوە کەهەر دەتگوت نوسراوە ئەصڵەکەیە و ئەگەر خۆم داوای ئەو کارەم نەکردایە هیچکات نەمدەتوانی جیاوازی بکەم لەنێوانیاندا. لەوە بەدواوە خەڵکی دەستیانکردە نوسینی کتێبەکانی پێشگۆیی دەوڵەتان و تەنانەت بەشیعرو پەخشان و بەحر و رجز چەندین بەرهەمی زۆر لەم بارەیەوە نوسران و، زۆرێکیان لەناو خەڵکیدا بوونیان هەیە و پێیان دەڵێن مەلحەمەکانی پێشگۆیی.

هەندێك لەبەرهەمە ناوبراوەکان لەبارەی هەندێك لەهەواڵەکانی مێژووی ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی و هەندێکیشیان لەبارەی دەوڵەت و، ئەو زنجیرە تایبەتەوەیە و هەموویان دەدرێنە پاڵ کەسانێکی هەڵکەوتوو، بەڵام بەڵگەو یاسایەکی باوەڕپێکراو لەبەر دەستدانیە کە ڕاستیەتی هەریەکە لەو پێشگۆییانە سەبارەت بەخاوەنەکانیان بسەلمێنت. لەو مەلحەمانەش بریتین لەوانەی کەلەمەغر یبدا ناسراون دەتوانین قەصیدەی ئیبن مرانە بەنمونە بهێنینەوە، کەبەبەحری درێژو لەڕووی وەرانەوە گوتوونیو لەبەردەستی خەڵکیدان و، خەڵکیش بەگشتی واگومان دەبەن کە ئەو شیعرانە بریتین لەپێشگۆییە گشتیەکانن و زۆرێك ئەو شیعرانە بەسەر بارودۆخی ئێستە و داهاتوودا جێبەجێ دەکەن، بەڵام ئەوەی کەئێمە لەمەشایخی خۆمانەوە بیستوومانە تایبەتە بەدەوڵەتی لمتوونە (مورابیتەکان)وەو، چونکە گۆیاکەی کەمێك لەوە و بەر لەدەوڵەتی ئەواندا ژیاوە و تێیدا قەصیدەی زاڵبوونی ئەوان بەسەر سیبتە و سەندنەوەی ئەو شارە لەدەستی مەوالیەکانی بەنی حەموود و زاڵبوونی فەرمانڕەوایی ئەوانە بەسەر عەدوەی ئەندەلوسدا باسکردووە. وەیەکێکی تر لەو مەلحەمانەی کەلەدەستی خەڵکی مەغریبدایە قەصیدەیەکە بەناوی (تبعیە)کەسەرەتاکەی بەم شێوەیە:

شادی و خۆشیم کرد، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە شادی من نیە،

هەر وەك چۆن هەندێك جار باڵندەیەکی گیرۆدە شادی دەکات،

ئەمەش لەڕووی ئەو گاڵتە و گەپ وبێهودەییەی کە دەیبینم نیە،

بەڵکو بەهۆی وەبیر هێنانەوەی هەندێك هۆکارەوەیە.

هەروەك دەڵێن نزیکەی پێنج سەد یان هەزار بەیت دەبێت کەتێیدا زۆرێك لەڕووداوەکانی دەوڵەتی مووەحیدانی هێناوە و، وەئاماژەیشی بەفاتیمی و کەسانی تریش کردووە. بەڕواڵەت قەصیدەی ناوبراو ساختەیە.

وەهەروەها یەکێکی تر لەمەلحەمەکان کەلەنێو خەڵکی مەغریبدا باوە (ملعبە)یەکە (واتە جۆرێك بووەلەشیعر)کەلەجۆری (زجلی)(واتە ئەو شیعرانەی کەبەزوبانە میلیەکان

نوسراون)و دەدرێنە پاڵ هەندێك لەشاعیرانی یەهود، کەتێیدا ئەحکامی قیرانەکانی عەلەویەکان ونەحسینەکان قیرانەکانی تری سەردەمی ئەوانی هێناوە. وەهەروەها تێیدا باسی کوژرانی خۆیانیان کردووە لەشاری فاسدا و هەروەك دەڵێن پێشگۆیی ئەو لەم بارەیەوە ڕاست بووە. قەصیدەکەی بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

((لەڕەنگی ئەم ئاسمانە بەرینەدا گەورەیی و هەڵکەوتوویی ئەو هووەیدایە،

ئەی خەڵکی لەم ئاماژەیە تێبگەن،

ئەستێرەی کەیوان باسی ئەم نیشانەیەی کردووە،

وەشێوەکەی گۆڕیوە کەنیشانەی سەلامەتیە،

عەرەق چینی لاجوردی لەبری دستار و تاشری و گومەزی لەبری سەرپۆش، بەخشیوە)).

وەلەکۆتایی قەصیدەکەدا دەڵێت:

((ئەم تەجنیسە لەلایەن مرۆڤێکی جوەوە(یهودی)ئەنجامدرا، لەکەنار ڕووباری فاسداو لەڕۆژی جەژندا لەسێدارە دەدرێت تاوەکو خەڵکی لەماوچە دەشتەکیەکانەوە دێنەلای)).

(ئەی خەڵکینە کوشتنی ئەو لەسەرفراد یان لەسەر دەستی فراد دەبێت).

قەصیدەی ناوبراو نزیکەی پێنج سەد بەیتە و، لەبارەی قیرانگەلێکەوەیە کەئایندەی دەوڵەتی مووەحیدان نیشان دەدات. یەکێکی تر لەمەلحەمەکانی مەغریب قەصیدەیەکە بە(بەحری نزیك و ڕووی باء ) نوسراوە و تایبەتەبەپێشگۆیی و ڕووداوەکانی دەوڵەتی خانەدانی ئەبو حەفص لەمووەحیدانی تونس و، دراوەتە پاڵ ئیبن ئبار. وە قازی قوستەنتینە خەتیبی گەورە ئەبو علی کوڕی بادیس کەلەقسەکانیدا زۆر بینا بوو لەزانستی ئەستێرەناسیدا دەستێکی باڵای هەبوو، بەمنی گووت ئەم ئیبن ئبارە جگە لەحافیزی ئەندەلوسی و نوسەری ناسراوە کەموستەنصر کوشتوویەتی واتە ئەم کەسەنیە بەڵکو پیاوێکی تونسیە کەناوبانگ و شۆرەتەکەی هاوشێوەی حافیزە و، باوکم ڕەحمەتی خودای لێبێت شیعر گەلێکی لەمەلحەمەکەی ئەو بۆ دەخوێندمەوە کەهەندێکیانم لەبیر

ماوە و بەم شێوەیەن: ((کاریگەری برینم لەبەرامبەر ڕۆژگارەوە پێچەوانە بووەتەوە، چونکە بەپیری و فەتووتی خۆی و بەددانە سپی و درەوشاوەکانیەوە خۆی وەك گەنج و لاو دەنوێنێت)).

وەلەم قەصیدەیەدا لەبارەی لحیانی پاشای نوێیەمی ئەو نەتەوەیە دەڵێت: سەرکردەیەکی لەشکرەکەی خۆی دەنێرێت و خۆی لەوێدا چاوەڕێی دەکات و دواتر هەواڵەکانی جەنگ دێنەلای شەیخ (سەرکردەی سوپا)و ئەویش لەڕقاندا وەك حوشتری گەڕبوو ڕووی تێدەکات، بەڵام شێوازێك لەدادگەری ئاشکرا دەکات و ئەوە سیاسەتە کەهەموو کەسێك بۆ لای ئەو کەمەنکێش دەکات. وەلەبارەی ئەحواڵی گشتی تونسەوە دەڵێت:

((هەرکات ببینی شوێنەوارو نیشانەکان سڕاونەتەوە،

وەحەقی هیچکام لەخاوەن پلەو پایەکان ڕەچاو نەکراوە،

ئەوکات لەتونس کۆچ بکە و خوداحافیزی لەهەموو نیشانەکانی بکە،

هێندە نابات فیتنە و ئاژاوەیەکی وەها لەوێدا سەر هەڵدەدات کە بێگوناح بەگوناحکار بزانرێت)).

وەهەروەها لەمەغریبدا ئاگاداری مەلحەمەیەکی تر بوومەوە کەشاعیرەکەی لەبارەی هەمان ئەو دەوڵەتەی خانەدانی ئەبو حەفصی تونسەوە پێشگۆیی کردووە و، گوتوویەتی لەپاش سوڵتان ئەبو یەحیا کەدەیەمین پاشای ئەو خانەدان و نەتەوەیە محمدی برای دێتە سەرتەختی دەسەڵات و لەم بارەیەوە گوتوویەتی:

((وەلەپاش عبدالالەوە براکەیەتی،

وەلەنوسخەی ئەصڵدا بەویساب ناسراوە،

بەڵام پێشگۆیی شاعیر نەهاتووەتە دی و تاوەکو مردن ئەو ئارەزووەی لەسەریدا پەروەردەکردووە، بەڵام وەدی نەهاتووە.

یەکێکی تر لەمەلحەمەکانی مەغریب مەلعەبەیەکە کەدەرێتەپاڵ هوشنی بەزمانی (عامە)گشتی و لەبەحری تایبەت بەمەغریبدا کەبەم شێوەیە دەستپێدەکات:

((تەنیامان بهێڵە لەگەڵ خۆم و فرمێسکەکانمدا،

بارانەکان کەم بوونەوە، بەڵام فرمێسکەکانی من هەردەڕژێن،

کاتێك کەواز لەمن دەهێنی و بێوەفایی هەڵدەبژێری ئەشکی دیدەکانم دەڕژێن،

ئەوسەردەمانەشی کە جیایی هەڵدەبژێری و بێوەفایی دەکەیت،

فرمێسکەکانم ڕووبارەکان پێکدەهێنن،

خەڵکی ناوچەکان شادمانن،

بەڵام ڕۆژگاری ئێمە بەو شێوەیە کەخۆت دەیزانی،

وەتۆ بەردەوام هاوین و زستان و وەرزی میوەکان و بەهار لەدەستدەدەیت،

یارم گووتی: ئەگەر گریەو زاری ڕاستە،

کەواتە بهێڵە گریەو زاری بکەم و عوزرەکەم قبوڵ بکە،

ئەی بەدبەختی دامێندار،

ئەم سەردەمە تووندو تیژ و تووڕەیە)).

ئەم مەلعەبەیە دوورو درێژە و هەموو خەڵکی مەغریبی ئەقصا (مەراکیش)لەبەریانەو، زیاتر گریمانی ئەوە هەیە کەساختەبێت چونکە هیچکام لەپێشگۆیەکانی وەڕاست نەگەڕاون، بێجگە لەڕێگەی تەئویلە عامەکانەوە کەبەلاڕێدا بردونیان وەیان لاف و گەزاف گەلێك کەهەڵیان بەستوون تێیاندا و داویانەتەپاڵی. لەخۆرهەڵاتدا مەلحەمەیەکم دەستکەوت کە دەڵێن نوسراوی ئیبن عەرەبی حاتەمیە کەشیعر گەلێکی زۆری تێدایە و وەك مەتەڵ وەهان و، بێجگە لەخوداش کەس ئاگای لەتەئویلەکەیان نیە و چونکە بەرابەر بوونە ژمارەییەکان و ڕەمزە مەتەڵ ئاساکان و شێوەی حەیواناتی تەواو ئەندام و سەرە بڕدراوەکانو، نەخش و نیگاری گیاندارانی سەر سوڕهێنەری تێدایە و، لەکۆتاییەکەشیەوە قەصیدەیەکە لەسەر لام بووە و، گومانی زیاتر ئەوەیە کە هەموونەمانە نایابن، چونکە

مەلحەمە ناوبراوەکان لەسەر بنەمایەکی ئەصڵی وەك ئەستێرەناسی و هاوشێوەی ئەو دانەمەزراوون.

لەو شتە سەر سوڕهێنەرانەی کەهەندێك لەکەسە تایبەتەکان گێڕاویانەتەوە مەلحەمەیەك بوو بەناوی ئیبن عەرەبیەوە و، لەوانەیە ئەو مەلحەمەیەی کە لەمیسردا بیستم جیابێت لەمەلحەمەی باسکرا و چونکە ئەو لەم مەلحەمەیەدا لەبارەی تالیعی بینای قاهیرەش قسەی کردووە و، ماوەی بنیاتنان وئاوەدانیەکەی لەڕێگە دەلالەتەکانی تالیعی و ئەستێرەناسیەکانەوە بەچوارسەد و شەست ساڵ دیاری کردووە. بەو پێیەش کۆتایی تەمەنی شاری قاهیرە لەنزیك ساڵی هەشت سەدو سی دایە چونکە ساڵە نابراوەکان شەمسین و ئەگەر ژمارەی چوارسەدو شەست لەگەڵ حیسابی قەمەریدا بەراورد بکەین و، بەپێی ئەو یاسایەی کەلەهەرسەدساڵێکدا سێ ساڵ زیاد بکەین‌و چواردەساڵی بخەینەسەر ژمارەی ناوبراو، دەکاتە چوارسەد و حەفتاو چوار و ئەم ژمارەیەش لەگەڵ ساڵی سێسەدو پەنجاوهەشتی کۆچیدا کەمێژووی بنیاتنانی قاهیرەیە کۆیان بکەینەوە ئەوکات دەکاتە هەشت سەدو سی ودووساڵ، ئەمەش لەکاتێکدایە ئەگەر قسەکەی ئیبن عەرەبی ڕاستبێت و بەڵگەکانی وەڕاست بگەڕێن. وەهەروەها بیستوومە مەلحەمەگەلێکی تر کەدراونەتە پاڵ ئیبن سیناو ئیبن ئەبی العقب لەخۆرهەلأتدا بوونیان هەیە. لە هیچکامیشیاندا بەڵگە ڕاستبوونیان نیە چونکە ئەم جۆرە پێشگۆییانە لەقیرانەکانەوە دەردەهێنن.

سەرەڕای ئەمەش مەلحەمەکانی ئیبن العقب ساختە و هەڵبەستراون هەروەك چۆن ئیبن خەلەکان لەباسی حاڵی ئیبن القریەدا کەلەکتێبی ئەغانیەوە وەرگرتووە دەڵێت: ئیبن ئەبی العقب و یەحیای کوڕی عبدالله لەو شتانەن کەسەلماندنی بوونیان زۆر دژوارەو بوونێکی دەرەکیان نیە وەك لەیل و مەجنون و ئیبن القریە، خوداش داناترە. وەهەروەها لەخۆرهەلأتدا مەلحەمەیەکی ترم لەبارەی تورکەکانەوە دەستکەوت کە دراوەتە پاڵ

یەکێك لەصۆفیەکان بەناوی باجریقیەوە کەسەرانسەری پڕیەتی لەمەتەڵ و پیتە پچڕ پچڕەکان و سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەستپێدەکات:

((ئەی هاودەمی من ئەگەر بتەوێت نهێنیەکانی جفر بزانی کەزانستی باشترین وەصی باوکی حەسەنە (واتە حەزرەتی علی).

تێبگە لەپیت و حیساب، وەصفی ئەو لەبەر بکە وەك فێرخوازێکی چالاکی هۆشمەند، بەڵام ئەوەی کەلەبارەی سەردەمی ڕابووردوە باسی ناکەم بەڵکو لەبارەی ئایندەوە قسەدەکەین.

بیبرس بەهۆی حا وە لەپاش پێنجەکەی ئەو (کەمەبەستی پێنجە سەرگەردانەکە یان دزراوەکەیە) وە حا و میمی زۆرهێنەر و بێباك کە لەحەشارگەکەی خۆیدا خەوتووە شادومان دەبێت،))

وەهەروەها لەو مەلحەمەیە:

((شین لەژێر نافەوە وەك نیشانەیەك وایە،

قەزاو حوکم پەیوەست دەبن بەوەوە، حوکمێك کەهاوشان بێت لەگەڵ بەخشندەیی و چاکەکاریدا، کەواتە میسر و شام و سەرزەوی عێراقیش دەبێتە هی ئەوو لە ئازەربایجانەوە تاوەکو وولاتی یەمەن فەرمانڕەوایی دەکات)).

وەهەروەها لەو مەلحەمەیەدا دەڵێت:

کاتێك کەتاهیر لەخانەدانی نوار بگاتە سەرکەوتن ئەوەی کەدلاوەرێکی ئازای هێرش بەرو جەستە بەهێزە.

سەعید کەتەمەنی کەمە سین لەسەر کارلادەبات کە لە: لا، لو، قاف، و نون، وە دێت و خزمایەتی و وابەستەیی لەگەڵدا هەیە، پیاوێکی گەورە و دلاوەر و دانا و ژیرە و لەپاش ئەویش پیاوێکی بەتوانا بۆ ماوەی (حا) و (این)دەمێنێتەوە، لەپاش (با)چەندین ساڵ لەدوای کوشتنی ئەو.

وەمیمی دەمدار و ڕەوانبێژو زمانپاراو دەبێتە جێگری ئەو، ئەم کەسە شەلە سەگێکە ئاگات لێی بێت چونکە لەسەردەمی ئەودا ئاشوبگەلێکی سەرسوڕهێنەر ڕوودەدەن!

لەلای خۆرهەلاتەوە سوپای تورکەکان دێن،

سەرۆکی ئەمان جەنگاوەرێکە لە قاف، قافێك کەکێشراوە بەناو ئاشوب و فیتنەو پشێویەکاندا..

لەپێش ئەو سەردەمەوە سەرانسەری وولاتی شام دووچاری ڕۆژی ڕەش دەبن و، کەواتە بەخەم و پەژارەوە لەسەر خانەدان و نیشتیمان بگری..

هەرکاتێك بومەلەرزەیەك لەمیسردا ڕوویدات وای لەمیسر کەیەك سالّ دانیشتوانی تێدا نامێنێت..

گاو و ڤاو و عین هەموویان زیندانی دەکرێن و لەناو دەچن و سەروەت و سامانێکی فراوان و بێسود خەرج دەکەن..

قاف قافێك بەرەو لای ئەحمەد ڕەوانە دەکات و بەهۆی ئەوەوە لەو گرفتەدا دەگاتە سەرفرازی و خۆڕاگری)).

وەهەروەها تێیدا هاتووە کەدەلێت:

لەپاش (حا) سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەوان کۆتایی دێت و هیچ نەوەیەکیان لەهیچ سەردەمێکدا ناگاتە پاشایەتی.

ئەمەش خاوەن بەیتگەلێکی زۆرە کە گومانی بەهێز ئەوەیە ساختە و هەلّبەستراوبن. هاوشێوەی ئەم جۆرە شیعرە ساختە و درۆیانە لە سەردەمە کۆنەکاندا زۆر و زەوەند بوون و، کەسانێك بەناوی خەلّکانی ترەوە دەیانخوێندنەوە. مێژوونوسانی مێژووی بەغداد باسی ئەوەیان کردووە کەلەسەردەمی موقتەدیردا (وەڕاق یان (صەحافێك)بەناوی دانیالیەوە لەو شارەدا کاغەز و پێستەی وەك کاغەزو پێستە زۆر کۆنەکان ڕێکدەخست و بەخەتی زۆر کۆن پیتگەلێکی لەناوی خانەدانی دەولّەت و، سەلّتەنەتەوە نوسیوە و ئەو پیتانەی وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوان داناوە، لەبەر ئەوەی کەبەباشی لەحەزو ئارەزوی زۆری

ئەوان بۆ دەسەڵات و پلەو پایە شارەزابووە، هەربۆیە بەپێی حەزی ئەوان ئەو نیشانانەی نوسیوە و ڕاڤەی کردوون و وەك مەلحەمە نیشانی داون و بەم هۆیەشەوە سەروەت و سامانێکی زۆری دەستکەوتووە و بەهەموو ئاواتەکانی گەیشتووە.

هەروەك چۆن ئەو لەیەکێك لەم جۆرە دەفتەرانەدا پیتی میمی سێ جار نوسیوە و بردویەتیە لای موفلیح، یەکێك لەمەوالیەکانی موقتەدیر کە لەدەرباری خەلیفەدا پلەیەکی بەرزی هەبووە، گوتوویەتی: ئەم پیتانە کینایەن لەتۆ. واتە میمی یەکەم کینایەیە لەموفلیح و میمی دووەم کینایەیە لە مەولا و میمی سێیەمیش کینایەیە لە موقتەدیر.

لەپاشان لەبارەی حەزو ئارەزووەکانی موفلیح و هێزو دەسەلآتیەوە چەند شتێکی داوە بەگوێی ناوبراودا و، باسی ئایندەی درەوشاوەی ئەوی کردووە و بەشێوەیەکی ساختە ناوونیشانگەلێکی لەحاڵەتە ئاساییەکانی ئەو باسکردووە، موفلیحیش سەروەت و سامانێکی زۆری پێداوەو کردوویەتیە خاوەنی هێزو دەسەلآت. لەپاشان بەهەمان شێوەی دانیالی وەرەقەداری تەزویرچی موفلیح و حەسەنی کوڕی قاسمی کوڕی وەهەبیش کەیەکێك بوو لەوەزیرە لەسەرکار لادراوەکان، هەڵی خەڵەتاندن و وەرەقەیەکی هێنایە لای و ناوی ئەوی لەبەرامبەر هەمان ئەو جۆرە پیتانەوە بەشێوەیەکی ڕەمزی نوسی و ئەوەی نیشاندەدا ئەو لەسەردەمی خەلیفەی هەژدەیەمدا دەگاتەوە بەپلەی وەزیریەکەی خۆی و کاروبارەکان بەدەستی ئەو بەرەو باشتر دەچن، دووژمنان سەرکوت دەکرێن و ئاوەدانی بلآو دەبێتەوە. "موفلیح"ی لەناوەڕۆکی وەرەقەکان ئاگادار کردەوە و لەم وەرەقانەدا زۆرێك لەپێشبینیەکان کەهەندێکیان هاتوونەتەدی و هەندێکیشیان هێشتا وەدی نەهاتوون لەخۆ گرتبوو. هەمووئەم پێشبینیانەشی دەگێڕایەوە بۆ "دانیال پێغەمبەر"ع". موفلیح زۆر سەرسام بوو. لەپاشان موقتەدیریش لەسەریان وەستا و لەو نیشانانەوە لەحەقیقەتی ئیبن وەهەب تێگەیشت و نیشانەکانی لەودا بەراورد کرد.

هێندەی درۆ و شتی نەزانراوی شێوە مەتەڵ و وەهمی تێدا بوو کە بوونە هۆی لەدەستدانی پلەی وەزیرییەکەی. لەڕواڵەتدا ئەو مەلحەمەیەی کەدەیدەنە پاڵ باجریقیش

لەم جۆرە تەزویر و ساختەکاریانەیە. من لەشێخ کمال الدین پێشەوای حەنەفیەکانەوە کە لەبیانیەکانی دانیشتووی میسر بوو، لەبارەی ئەم مەلحەمەوە و لەگەڵ جریقیش کە درابوویە پاڵ ئەو پرسیارەم کردووە شێخیش کەئاگاداری تەریقەتەکانی ئەوان بوو، لەگروپی ناسراو بەقەلەندەری کەپیش تاشینیان کردووەتە نەریت گووتی: لەگەڵ جریقیدا لەبارەی پاشایانی هاوچەرخی خۆمانەوە بەشێوەی کەشف قسەی کردووە ئامازەشی بەو پیاوانە کردووە کەناسیونی و چاوی پێیان کەوتووە، بۆ ئەوەی بەشێوەی ئیشارەت باسیان بکات بەو پیتە تایبەتانەی کەلەمێشکی خۆیدا بوون ئامازەی پێکردوون‌و، سەرەڕای ئەمەش مەوعیدی لەگەڵدا دادەنان و مەبەستەکەی خۆی لەچەند دێڕە شیعری کورتدا دەگووت.

دواتریش کەسانی ناوبراو شیعرەکانیان لێوەردەگرت‌و، وەك مەلحەمەیەکی ئامازەیی بەجوانی لەبەریان دەکرد و دواتریش تەزویرچی و، درۆزنان هەمان ئەو شیعرانەیان دەنوسیەوەو چەندین بەیتە شیعری تریان بۆ زیاددەکرد و بەناوی خۆیانەوە بلاّویان دەکردنەوەو، دەیانچڕین خەڵکیان بەگوتنەوەی ئەو ڕەمزو ئیشارەتانە سەرقاڵ دەکرد. ئەمە لەکاتێکدا کە خۆیان و خەڵکیش مانایان نەیاندەزانی، چونکە هەر نیشانەیەك بەهۆی یاسایەکەوە ئاشکرا دەکرێت کەپێشتر بیناسن، یان بۆ هەمان ڕەمز دایبنێن. ئەمە لەکاتێکدا مانای ئەم جۆرە پیتانە بۆمەبەستێك کەلەوانەوە وەرگیراوە تەنها دانەرەکەیان دەیانزانیّ و تایبەتن بەوەوە. من قسەکانی ئەم پیاوە (شیخ کمال الدین)م وەك دەرمانێکی شیفابەخش دەست کەوتن، کەحاڵەتی گوماناوی منیان سەبارەت بەناڕاستی مەلحەمە لەگەڵ جریقیدا گۆڕی بۆ دڵنیایی. (ئەگەر خودا ڕێنماییمان نەکان هەرگیز ڕێگەی هیدایەت نادۆزینەوە)س الاعراف ئا ٤١.

دواترو لەپاش ماوەیەك لەگەڵ کەژاوەکەی سوڵتاندا لەساڵی ٨٠٢ ك، چوومە دیمەشقەوەو بەرپرسی دادگای مالیکیانی میسر بووم.

لەشاری دیمەشقدا مێژووی(البدایە والنهایە)ئیبن کەسیر(عمادالدین ابوالفدا)م دەستکەوتو لەباسی ڕووداوەکانی ساڵی ٧٢٤ ک، بارودۆخەکەمان لەگەڵ جریقیدا بەم شێوەیە باسکرد: شمس الدین محمدی باجریقی کەسێکە کە کەگروپی گومڕای باجریقیە دراوەتە پاڵی و دیارە کەئەمان ئینکاری صانیع دەکەن. باوکی باجریقی جمال الدین عبدالرحیمی کوڕی عومەری موصڵیە، پیاوێکی شایستەیە و لەزانایانی شافیعی بووە، لەهەندێك لەمزگەوتەکانی دیمەشقدا وانەی وتوەتەوە، کوڕەکەی لەنێو زاناو فەقیهەکاندا پەروەردە بووە و ماوەیەك سەرقاڵی فێربوونی زانست بووە و لەپاشان ڕووی کردووەتە تەریقەتی سلوك، کۆمەڵێك کەباوەڕیان بەتەریقەتەکەی ئەو هەبووە هاوڕێیەتیان کردووە، لەپاشان قازی فتوای کوشتنی دەرکرد و ئەویش بەرەو خۆرهەڵات هەڵهات. دواتریش بەڵگەو دەلیلگەلێکی زۆری بڵاو کردەوە لەسەر ئەوەی کە لەنێوان ئەوو ئەوانەی کەشاهێدن لەدژی ئەم، دووژمنایەتیەکی تایبەت هەیە.

لەئەنجامدا قازی حەنبەلی ڕێگری لەکوشتنی ئەو کردووە. لەپاشان بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەقابووندا مایەوە و، لەشەوی چوارشەممەی شانزەیەمی ربیع الاخری ساڵی ٧٢٤ ماڵئاوایی لەژیان کرد. ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەم بەیتانە لەقەصیدەی باجریقی لەبارەی جفرە وە هۆنراونەتەوە:

***((ببیستە قسە و حیساب و ڕستە و وەصفەکان،***

***لەڕووی تێکەشتنەوە پیاوی لێزان هۆشیاری بکەرە پیشە،***

***لەئامەنگی مێرش بۆ سەر میسر و ڕووداوەکانی شامدا خودای ئاسمانەکان چاکە و ناڕەحەتیەکان بەدی دەهێنێت.،***

***بیبرس لەپاش پێنجەکەی ئەو لەجامەکە تێر ئاو دەبێت،***

***وە حا و میم دلاوەرێکی مێرشبەرە کەلەسەر خشت خەوتووە، ئەی هاوار بۆ (جلق) دیمەشق کەچەندین بەڵاو موصیبەت ڕووی تێدەکەن،***

***مزگەوتی جامیعەی خودا کەبەچ شێوەیەك بنیاتنراوە وێرانی دەکەن،***

***هاوار بۆ ئەوشارە کەچەندین دووژمنی ئاینی تێدا دەردەکەون، چەندە دەکوژن،***
***وەچەندە خوێنی خەڵکی بەگشتی و زانایان دەڕژێنرێت،***
***چ شیوەن و زاری ئەسارەت و تەخت و تاراجەکان ڕوودەدەن،***
***شار دەسوتێنن و چەندین کەس لەلاوو پیر دەبنە خۆراکی ئاگر،***
***سەرانسەری جیهان و هەموو ناوچەکان بەهۆی ئەمانەوە دەبێتە تاریکستان،***
***تەنانەت کۆترەکانیش لەسەر لقی درەختەکان گریە و زاری دەکەن،***
***ئەی خەڵکینە ئایا ئاین یارو یاوەرێکی نیە؟***
***هەستن ڕاپەڕن ئیتر لەدەشتایی یان لەبەردەڵانەکاندا بێت بەرەو شام بچن،***
***ئەی خەڵکی عێراق و میسر و صەعید بەرەو دەرچن و بڕۆن،***
***بەعەزمێکی پۆڵاینەوە کوفرو بێباوەڕی لەو شارەدا لەناوبەرن و نابوودی بکەن)).***
***بابی سێیەمی کتێبەکە کۆتایی هات،***
***سوپاسیش تایبەتی خودای یەکتایە.***

**(کۆتایی بەرگی یەکەم)**

**وەرگێڕانی بەکۆتاگەیشت**

**لەڕۆژی پێنج شەممە ١٠ – ٤ – ٢٠١٤**

# مقدمة ابن خلدون

پێشەکی ئیبن خەلدون یەکێکە لەشاکارە بەنرخ و گەورەکانی زانستی و مێژوویی لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا، کەبەشێوەیەکی گەورە و بەرفراوان و بۆیەکەمجار لەبارەی فەلسەفەی مێژوو کۆمەڵناسی و بنەماکانی زانستە ئابووری و سیاسیەکانەوە دواوە. سەرەڕای ئەمەش، ئەم زاناگەورەیە باسی هەموو ئەو زانستانەشی کردووە کەلەسەردەمەکەی خۆیدا بوونیان هەبووە. هەربۆیە دەتوانین پێشەکیەکەی ناوبراو وەك ئنسکلۆپیدیایەك دابنێین بۆ زانستەکان لەو سەردەمەدا. لەم پێشەکیەدا ئیبن خەلدون شێواز و کارکردنی پێشینانی خستووەتە بەر ڕەخنەوە و پێی وابووە کە مێژوونوس دەبێت نەك تەنها بەدوای ڕووداوەکانەوە بێت، بەڵکودەبێت هۆکارەکانی ڕوودانی ڕووداوەکانیش بەشێوازێکی زانستی شیکاری لێکۆڵینەوە بکات . دەتوانین بڵێین کە پێشەکی ئیبن خەلدون لەگرنگترینی ئەو دانراوانەیە کە لەپێتەختی دەوڵەتی عوسمانیدا ناوبانگی هەبووە و لەنێو پیاوانی دەوڵەتی ئیمپراتۆریەتی ناوبراودا یەکێك بووە لەو پەرتووکە بەنرخانەی کە موتاڵا کراوە و سود لەزانستەکانی وەرگیراوە.

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخی هەردووبەرگ (٣٥٠٠٠) دینارە